


# تاوان و سزا

فیۆدۆر دۆستۆیفسکی

ڕەووف بێگەرد
لە فارسییەوە کردوویە بە کوردی




له زنجیره بڵاوكراوەكانی

ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە

زنجیرەی كتێب ٤٠

# تاوان و سزا

ڕۆمان

**فیۆدۆر دۆستۆیڤسكی**

## ڕەووف بێگەرد

**لە فارسییەوە كردوویە بە كوردی**


- بەرگ: ئازاد سوورخی
- ڕێنووس: ئەكبەر حەسەن
- چاپ: دووەم- ٢٠١٤
- چاپخانە: تاران
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ١٧٠٠٠ هەزار دینار
- بڵاوكار: ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە

**لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی سپاردنی ١٧٢٣ی ساڵی ٢٠١٤ی پێ دراوە.**

# تاوان و سزا

## فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی

ڕەووف بێگەرد

لە فارسییەوە کردوویە بە کوردی

نووسین لەسەر دۆستۆیڤسکی کارێکی ئاسان نییە، نەك هەر ئاسان نییە، بەڵکو گەلێك گرانیشە، لەبەر ئەوەی ئەم نووسەرە گەورەیە چ وەك خۆی و چ لەسەر ئاستی بەرهەمە زۆر و گرنگەکانی بووەتە مایەی گەلێك مشتومڕ و ڕەخنە و سەرنج و تێڕوانینی جۆراوجۆر و تەنانەت دژبەیەکیش. لە کاتێکدا کە ئێمە بەرهەمەکانی وەك کاری هونەری لەبەرچاو دەگرین و بە تاموچێژی خوێنەری ڕۆمانەوە ئامادەگیی بۆ دەکەین و هەڵیدەسەنگێنین، کەچی لەناکاوێکدا دەکەوینە ناو دنیایەکی فرە جەنجاڵی لێکدانەوەی فیکری و فەلسەفیی قووڵ و چەندوچوونێکی سەختی کێشە هەرە سەرەکییەکانی بوون و نەبوون، ژیان و مەرگ و هەقیقەت و ناهەقیقەت. ئەوەی مرۆڤ هەڵیدەبژێرێت و ئەوەی بەسەریدا دەسەپێت، هەموو ئەو چەمك و مانا و دژوارییانەی لەوانەوە سەرچاوە دەگرن و مرۆڤ دەکێشنە ناو ماڵێکی جاڵجاڵۆکەئاسا و ڕێگەیەکی دەرنەچووەوە، چونکە دۆستۆیڤسکی تەنیا هونەرمەندێکی ڕووت نییە، بەڵکو بیریارێکی مەزنیشە. بێجگە لەوەی کە ڕای جیاواز لەسەر خۆی و ئەو تێزانە هەیە، کە لە ڕێگەی ڕووداو و کەسایەتیی ناو ڕۆمانەکانییەوە ڕۆیان دەنێت و دەبنە مایەی سەختگیریی لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی گەلێك جیاواز لەیەکتری. لە کاتێکدا کە هەندێك ڕەخنەگر و لێکۆڵەر و نووسەر ڕۆمانی دۆستۆیڤسکی بە تاقیگەی تاوانی کوشتن و نەخۆشخانەی نەخۆشیی دەروونی و کاری پۆلیسی لە قەڵەم دەدەن،

لای کەسانی دی خوێندنەوەیەکی تەواو پێچەوانە هەیە، کە دۆستۆیڤسکی بلیمەتێکی سەدەی نۆزدەیە، تا ئێستا کەسی تر نە لە پزیشك و نە لە پسپۆڕیی بواری سایکۆلۆژی و ڕۆحی هەڵنەکەوتووە بە ئەندازەی ئەو لە گەوهەر و سروشتی مرۆڤ تێگەیشتبێت و بە قووڵی چووبێتە ناخییەوە و ختوورەکانی بەرجەستە کردبێت، بەتایبەتی مرۆڤی ڕووسی. هەندێکجار دۆستۆیڤسکی بە پێغەمبەری مەسیحیەتی نویێ ناوزەد کراوە، کە موژدەی ئایندەی پێیە. بۆیە ئەو کەسەی بیەوێت قسە لەسەر ئەم نووسەرە بکات، وەك ستیڤان زڤایج دەڵێت: "دەبێت پێوانەی تازەی لا هەبێت بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی و مەزنایەتی و ئەو مەودا بەرینانە هەڵبسەنگێنێت، کە ئەم نووسەرە هەیەتی"[1].

تێکڕای ڕۆمانی دۆستۆیڤسکی هەڵگری پرسیارن، هەڵگری توانای بیرکردنەوە و گۆڕینی یەقینەکانن. ئەو بەردەوام لەسەر ئاڵۆزی و نائارامیی ڕۆحی مرۆڤەکان دەوەستێت و توێکارییان تێدا دەکات. هەمیشە لە ڕۆنانی بیروباوەڕە جیا و دژ بەیەکەکاندایە، لەوپەڕی بڕواوە بۆ ئەمسەری گومڕایی و نەهلیستیەت، لەوسەری دڵڕەقی و شێلگیرییەوە تا ئەمسەری سۆز و خۆشەویستی و مرۆڤدۆستی. هەندێکجار لە بەردەم شەڕئەنگێز و بەدڕەگەزێکی دووفاق و تۆقێنەردا ڕات دەگرێت (بۆ نموونە لۆژین لەم ڕۆمانەدا) جاری تریش لە پێشی مرۆڤێکی سادە و پاکیزە و خۆنەویستدا (بۆ نموونە سۆنیا). مرۆڤ لای دۆستۆیڤسکی بوونەوەرێکی ڕاڕا و

---

[1] بناة العالم: ستيڤان زڤايج.

بەگومانە، تەنیا موویەك لە خودا و ئەهریمەنی جیا دەکاتەوە، گرتنی ئەو هەستەیش، یان ئەو ڕەگەزە ئاسان نییە و هەندێکجار هەر لە نهێنیدا دەمێنێتەوە. جار هەیە لە نێو دوالیزمی کەسایەتییەکاندا کە یەکێکە لە سەرەکیترین ڕەگەزی بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە، خوێنەر تووشی سەرەگێژە دەبێت و ڕەنگە دەم بکاتەوە و بپرسێت: ئەرێ ئەم نووسەرە دەیەوێ چی بڵێت؟ دەشێت مرۆڤی لەم بابەتانە هەڵگری ئەلف و بای ماناکانی ژیان بن؟ دەکرێت لە نێوان چەند دێڕێکی لێکدانەوەی مێشکی ئەم کەسەدا و لە چرکەساتێکدا ئەم هەموو دژایەتییانە هەبن و بە ئاسانی جێگایان ببێتەوە! پرسیار لەسەر چارەنووس و ئاییندەی مرۆڤ، پرسیار لەسەر ئەو یاسا و نەریت و چەمکانەی کە بوونەتە یەقینی باو و ئەم دەیانکات بە گومان، پرسیار لەو هەقیقەتانەی هەزاران ساڵە مرۆڤیان کردۆتە کۆیلەی بێبزاوت و وەستاوی خۆیان و لە ڕاستیشدا بەرگەی سروەیەکی لەسەروەستان و قسەکردن ناگرن، پرسیار لەسەر خود و ئیرادە و دادوەری. وەستان لەسەر کێشە هەرە ئاڵۆزەکانی ناوەوەی مرۆڤ کە لێکدانەوە و ڕاڤەکردنیان گەلێك ئەستەمە.

دۆستۆیڤسکی لە بەرجەستەکردنی حاڵەتە جیاجیاکانی مرۆڤدا، لە خەون و ئاواتە بەنهێنی و بەژاروژەنگەکانیدا، لەو کێشانەدا کە تەنیا ڕۆح لەسەر لێواری مانەوە و لەناوچووندا ڕادەگرن، هونەرمەند و بلیمەتێکی بێوێنەیە. ئەو دەزانێت لە کوێدا کەسەکانی دەپەیڤن و لە کام چرکەساتدا ناخیان دەتەقێتەوە. کەی پەردەپۆشی دەکەن و لە چ ساتێکدا دەبن بە هاوار. وێنای دۆستویڤسکی بۆ دنیا و کۆمەڵگا و تاکڕەهەندەکان وێنایەکی خەیاڵی نییە، کە هونەرمەندێك کردبێتی، بەڵکو ڕەگاژووی زەمینە و دنیابینیی

بیرمەندێکی مەزنە، کە توانای سووسەکردن و پەیبردن و ئەنجامگیریی هەیە. نیکۆلا بردیاییف لەم بارەوە دەڵێت: دۆستۆیڤسکی تەنیا هونەرمەندێکی مەزن نەبووە، بەڵکو بیرمەندێکی گەورە و خاوەن دیدێکی مەزنە."[1]

لە بەرهەمی دۆستویڤسکیدا بیر دەوری سەرەکی دەبینێت. بیر لە بوون و نەبوون، ژیان و مەرگ، چاکە و خراپە، بیر لە ئازادی، لە داڕشتنەوەیەکی تری تازەی دنیا، بیر لە میتافیزیکای ڕۆح و ڕەهەندە فراوان و بێسنوورەکانی، بیر لەو ختووره ساتەوەختییانەی بە هەناوی کەسێکدا دێن و بڕیاری چارەنووسسازی پێدەدەن. بیر لە یاسا دەستکردەکانی مرۆڤ و ویژدانییە خۆڕسکەکان، بیر لەو ئاکار و ڕەوشتە باوانەی چەندان تاوانیان بە ناوەوە کراوە و لە چاکترین حاڵەتیاندا بێماناترین چالاکیی مرۆڤن، ئەم بیرانە لە مرۆڤەکاندا بەرجەستەن، واتا هەموو کەسایەتییەکی ئەم نووسەرە بیرێکە بۆ خۆی. لای دۆستۆیڤسکی بەتایبەتی لەم ڕۆمانەدا نە تاریکییەکی بەردەوام هەیە و نە ڕووناکییەکی هەمیشەیی، تەواو وەك ئەو پەیوەندییە دیالەکتیکییەی سروشت و ژیانی پێکەوە بەستووە. ئەوەندەی نائومێدی لە ڕۆحی مرۆڤدا خۆی حەشارداوە، ئەوەندەش خۆشنوودی و درەوشانەوەی تێدایە، ئەوەندەی ملکەچی و خۆبەدەستەوەدان هەیە، ئەوەندەش یاخیبوون و خۆگریی لە مەکۆدایە.

---

[1] رؤية دوستويفسكي للعالم: نيكولا بردياييف.

مرۆڤ لە شەڕی مانەوە و بەرگریدا بوونەوەرێکی چەند زرنگ و بوێرە، ئەوەندەش گێل و دەستەپاچە و ترسنۆکە، چەند ڕاستگۆیە، درۆزنیشە. لای دۆستۆیڤسکی شەڕئەنگێزترین و تاوانبارترین کەس خاڵی نییە لە تۆوی پاکژی و ڕووناکی، دیارە پێچەوانەکەیشی ڕاستە. بۆیە زۆر لە کاراکتەرەکان لە نێوان هەردوو چەمکی چاکە و خراپە، ڕواڵەت و جەوهەردا سەرەگێژەیانە، هەرگیز بە ڕەهایی نەکاراکتەری بێتاوان هەیە و نە تاوانبار، گرنگ ئەوەیە ئەو کەسە وەك ئەنجام کام لەو دوو هەڵوێستە هەڵدەبژێرێت و چارەنووسی خۆی لەسەر دیاری دەکات. لەگەڵ هەموو پاساوەکانیشدا، ئەو کەسانە هەندێکجار دەبنە قوربانیی دەستی قەدەرێکی پشت ئیرادەگەرا، قوربانیی بڕیاری ئەو چرکەساتەی کە تیایدا دەژی و لەوەوپێش چاوەڕوانیی لێنەکراوە (بۆ نموونە، سڤیدریگایلۆڤ لەم ڕۆمانەدا) قوربانییەك دەشێت دەستێکی نهێنی لەودیو هەستییەوە کارامانە ئەنجامی دابێت. بۆیە کەسایەتییەکانی دۆستۆیڤسکی لە نێو دژوارییی بیرکردنەوەکانیاندا هەمیشە ماندوون. لەگەڵ خۆیان و دەوروبەریاندا لە هەڵبەزودابەزی نێوان گەیشتن بە هەقیقەت و شکستخواردندان. بەرەو ڕێگەیەك دەڕۆن سەری لێ دەرناکەن، بۆیە نیگەران و هەراسانن، شپرزە و بێزراون، تالێهاتوو و ڕەنگپەڕیوون. بەڵام تێکڕای کاراکتەرەکان بریسکەی بیرێکیان تیا دەدرەوشێتەوە، کە دەتوانن چەندوچوونی لەسەر بکەن و هۆشیاریی خۆیانی تیادا نمایش بکەن. چێژ لەو خەم و ئازارانەیان وەردەگرن و ناتوانن دەستبەرداری بن. ئەمەیش لە خۆیدا بۆچوونێکی مەسیحییانەی دۆستۆیڤسکیە، کە خاوەن بڕواکان دەبێت هەمیشە ئازارچێژ بن. وەك ستیڤان زڤایج بە زمانی ئەوانەوە دەڵێت: "من ئازار

دەچێژم، کەواتە هەم" تەنانەت کەسەکان هەندێکجار بەو ڕەفتار و ئاکارانەوە لە سنووری واقیع دوور دەکەونەوە و نزیك دەبنەوە لە مرۆڤی خەیاڵی و ئەوانەی لە وەهمی نووسەرەکەیدا هەن، واتا خوێنەر لە ژینگەکەیدا ناتوانێت نموونەی لەو شێوانە پەیدا بکات یان بیانناسێت. بەڵام لە ڕاستیدا هەموو ئەو کەسانە مرۆڤی ڕاستەقینەی سەدەی نۆزدەی ڕووسیان. بە تەواوی بیر و ڕۆح و سایکۆلۆژیەتیانەوە. زڤایج دەڵێت: "ناتوانیت کاراکتەرەکانی دۆستۆیڤسکی بناسیت ئەگەر بیر لەوە نەکەیتەوە کە ئەوانە ڕووسین، ڕۆڵەی گەلێکن دوای بێئاگایی هەزاران ساڵەی بەربەریەت کەوتوونەتە ناو شارستانیەتی ئەوروپاوە، لەبەر ئەوەیش کە خۆیان لە دەسەڵاتی شارستانیەتی کۆنی پەتریارکی دابڕیووە و لەگەڵ شارستانیەتی نوێیشدا ڕانەهاتوون، ئیتر لە ناوەڕاستی ڕێگەدا چەقیوون، واتا لەسەر دووڕیانێك وەستاون. هەستی هەر یەکێك لەو کەسانە لە نەبوونی ئاسوودەیی و دڵنیاییدا هەستی تەواوی هەموو گەلی ڕووسیایە. . . مرۆڤە ڕووسیەکەی دۆستویڤسکی، ئەو کوختەی تیایدا دەژیا و بەرهەمی سەردەمی کۆنی بوو، سووتاندوویەتی. وەلێ تا ئێستا ماڵێکی نوێی بۆ خۆی دروست نەکردووە، میللەتێکن لە ڕەگەوە هەڵکێشراون و شوێن نییە ڕووی تێبکەن، تا ئێستا توانای لاوێتییان تیادا ماوە، توانای بەربەریەتیان لە نێو چنگدایە. . کەسایەتییەکانی دۆستۆیڤسکی لە بەسەرهات و ململانێدا بەشێکن لە چارەنووسی گەلی ڕووسی. ڕووسیای ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە نازانێت بەرەو کوێ بچێت، بۆ

خۆرئاوا یان خۆرهەڵات، بۆ ئەوروپا یان ئاسیا، بۆ پترۆزبورگی شارستانیەت یان جارێکی دی بەرەو کێڵگەی کشتوکاڵی و دەشتە وشك و قاقڕەکان."[1]

دۆستویڤسکی لە ڕێگەی ئەدەبەوە ڕووسیای بە دنیا ناساند، بە قووڵی چووە ناو هەست و نەستی مرۆڤەکانییەوە، ئەو زۆر بە بێزاریەوە لە شارستانیەتی ڕووکەشی ئەوروپای دەڕوانی، بەردەوام دەگەڕایەوە سەر بەها و ئاکارە ڕەسەنەکانی مرۆڤی ڕووسی، کە شکۆمەندی و پایەی مانەوە و ژیانیان بۆ ئەو گەلە هێشتۆتەوە. نیکۆلا بردیاییف دەڵێت: "دەڵێن هەموو بلیمەتیەك پێویستە لە خۆیدا نەتەوەیی بێت، بەتایبەتی بە ئەندازەی مرۆڤایەتییەکەی، لەم لایەنەوە دۆستویڤسکی ڕووسیەکە تا سەر ئێسك، بەڵکو لە تەواوی نووسەرەکانی تری ڕووسیا ڕووسیترە، لە هەمان کاتیشدا لە هەموویان مرۆڤانەترە، چ لەسەر ئاستی خۆی یان ئەو بابەتانەی کە هەڵیاندەبژێرێت."[2]

خودی دۆستۆیڤسکیش لە نامەیەکیدا بۆ مایکۆف دەڵێت: "بە ڕاستی من ڕووسییەکی هەمیشەییم."

دۆستۆیڤسکی لە کتێبی -یادەوەریی نووسەرێکدا- بە ئاشکرا هێرش دەکاتە سەر دوو بۆچوونی جیاواز، کە لە ڕووسیای ئەوسادا باو بوون، یەکەمیان ئەو ڕووسییانەی خۆرئاواییانە بیریان دەکردەوە و شەیدای شارستانیەتی ئەوروپا بوون. یەکێك لە هەرە دیارەکانیان نووسەری ناودار (تۆرگنیڤ) بوو، چونکە بە لای دۆستۆیڤسکیەوە ئەوانە ڕووسیایان لە ڕەسەنایەتیی مێژووی دێرینی

---

[1] کتێبی بناة العالم: ستیڤان زڤایج.

[2] رؤية دوستويفسكي للعالم: نيكولا بردياييف.

دابڕیووە و کردوویانەتە پاشکۆی ئەوروپا. دووەمیان خەتی سلاڤییەکان بوو، کە توندڕەوییان لەسەر کولتووری ڕووسی ئەرتودوکسی دەکرد و ڕقی زۆریان لە ئەوروپا بوو، بە لای دۆستویڤسکییەوە ئەمانە ڕووسیایان کردۆتە ئەفسانە، کە بێجگە لە خۆی پەیوەندیی بە هیچی ترەوە نییە. دۆستۆیڤسکی لەم نێوانەدا ڕێگەی ناوەڕاستی هەڵبژاردبوو: نە کۆیلایەتی بۆ خۆرئاوا و نە کۆیلایەتی بۆ ڕابردوویش.

لە یادی سەدساڵەی لەدایکبوونی شاعیری گەورەی ڕووسیا "پووشکین" کە لە ١٨٨٠دا لە مۆسکۆ سلاڤییەکان سازیان کرد، دۆستویڤسکی دوای وتاری "تورگنیف" وتارێکی خوێندەوە، لە ڕاستیدا وتارەکە پەیامی ڕاستەقینەی گەلی ڕووس بوو بۆ هەموو دنیا، پەیامی ئاشتبوونەوەی گشتی بۆ ئاییندەی هەمووان، لەوێدا پووشکین نموونەیەکی هەرەزیندوو و بەرجەستەکراوی گیانی ڕووسیایە، دۆستۆیڤسکی ئەوەی ڕاگەیاند کە پووشکین لەبەر ئەوە ڕووسیەکی ڕەسەنە، چونکە لە هەمان کاتدا ئەوروپاییەك و جیهانییەکی ڕاستەقینەیە. ئەو کەسەی ڕووسییەکی ڕاستەقینە بێت، دەبێت برای هەموو گەلانی سەرزەوی بێت، پووشکین بەو ڕەهەندەوە ڕووسییەکە ڕۆحێکی گشتگیری هەیە.

هۆڵەکە بەدەم چەپڵەڕێزان و دەستخۆشیلێکردنی ئامادەبووانەوە هاتە لەرزین. تەنانەت تورگنیڤیش کە لە بیروڕادا و بەتایبەتی لەو مەسەلەیەدا زۆر لە دۆستویڤسکی جیاواز بوو، بەدەم چەپڵەلێدانەوە لەبەر دۆستویڤسکی هەستا. کە دۆستویڤسکی وتارەکەی تەواو کرد و هاتە خوارێ، خەڵکەکە پەلاماریان داو بەسەر دەستوپێیدا کەوتن و تەنانەت خوێندکارێکیان تیادا بوورایەوە. دوای

ئەویش وتاربێژەکانی دی وازیان لە خوێندنەوەی وتارەکانیان هێنا، چونکە دۆستویفسکی وتەیەکی بۆ نەهێشتبوونەوە کە بیلێن.
دۆستویڤسکی لە ڕیزی نووسەرە گەورەکانی وەك تۆلستۆی و پووشکین و تورگنیڤە لە ڕووسیادا، لەسەر ئاستی ئەورووپاش ناوی لەگەڵ شکسپیر و سۆفۆکلیسدا دێت. چونکە لەو نووسەرانەیە، کە بابەتی تازەی هێنایە ناو دنیای ئەدەبەوە، کە پێشتر دەستی بۆ نەبرابوو، بۆیە بوو بە سەرچاوەی گەلێك باس و بابەتی فیکری لای ڕەخنەگر و بیرمەندان، بەتایبەتی لای زانایەکی گەورەی وەك سیگمۆند فرۆید، کە خاوەن قوتابخانەی دەروونشیکارییە و هەموو دینامیکیەتی کار و ئارەزووە جوڵێنەرەکان لە (نەست-لاشعور)دا کۆ دەکاتەوە. ئەمەیش بەشێکە لە ئاراستە بنەڕەتییەکانی دۆستویڤسکی لەسەر ئاستی کەسایەتییەکانی، بەتایبەتی لە کوشتنی باوکدا، کە فرۆید دەیکاتە بنەمای کاری خۆی. هەروەها فەیلەسووفی گەورەی ئەڵمانی "هایدگەر" لێکدانەوەیەکی وا دەداتە بەرهەمەکانی دۆستویڤسکی، کە لەگەڵ فەلسەفەکەیدا بگونجێت.
لە خۆرئاوادا تا ئێستا ئەوەندەی لێکۆڵینەوە و باس لەسەر ئەم نووسەرە کراوە، لەسەر کەسی تر نەکراوە، هەنووکەیش پەیبردن بە کار و بۆچوونی تازە لەسەر دۆستۆیفسکی هەر بەردەوامە.

* *

فیودۆر میخائیلوفیچ دۆستویڤسکی لە یانزەی نۆڤەمبەریساڵی ١٨٢١، لە نەخۆشخانەیەکی هەژارانی مۆسکۆدا لەدایك بووە. خێزانەکەی تا ڕادەیەك هەژار و باوکی پزیشکی سەربازی بووە. دۆستویڤسکی دوای میخایلی

برای دووەم منداڵی خێزانەکەیە، کە پێنج برا و خوشکی تر بوون. باوکی هەمیشە سەرگەرمی ڕابواردنی خۆی بووە لەگەڵ منداڵەکانیدا دڵڕەق بووە. پاشان باوکیان بە ناچاری و لەژێر گوشاری نەبوونیدا شار بەجێ دێڵێت و ڕوو لە ناوچەیەکی گوندنشین دەکات. نەبوونی و هەڵوێستی زبری باوکی کاریگەریی دەروونی لەسەر دۆستویڤسکی هەبووە و بەرەو تەریکی و دوورەپەرێزیی بردووە، بێبەش بووە لە هاوڕێ و خۆشگوزەرانی و تێکەڵاوبوونی دنیای دەرەوە. بۆ قەرەبووکردنەوە پەنای بۆ خوێندنەوە و کتێب بردووە، بەتایبەتی بەرهەمی دیکنز، ولتەرسکۆت، شکسپیر، گۆتە، بلزاك، جۆرج ساند، هۆگۆ. پاشانیش نووسەری ناوداری ڕووسی "گۆگۆل"، کە لە نووسینە سەرەتاییەکانیدا کاریگەریی ئەم نووسەرە بە کارەکانییەوە دیارە، هەر خۆیشیەتی لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئێمە هەمووومان لە پاڵتاوەکەی گۆگۆلەوە هاتووینەتە دەرەوە. "

ساڵی ١٨٣٧ ماریا فیۆدۆرڤنای دایکی دۆستویڤسکی دەمرێت. مردنی دایکی ئەوەندەی تر دەروونی ئازار دەدات، چونکە ئەو پشتوپەنایەکی چاکی بووە. لەو ماوەیەدا کە قوتابیی سەربازگەیەك بووە، گەلێکجار داوای یارمەتی لە باوکی دەکات و ئەو داواکانی ڕەت دەکاتەوە. لە نامەیەکیدا بە باوکی دەڵێت: بەپەلە شتێکم بۆ بنێرە، بەوە لە دۆزەخ ڕزگارم دەکەیت، ئای! چی لە نەبوونی ناخۆشترە!! جارێکی تریش بۆی دەنووسێت: باوکە گیان، وا مەزانە لە زیادە داوای یارمەتیت لێدەکەم. . . من سەر و باسکم هەیە، ئەگەر ئازادبوومایە، داوای کوپیکێکم لێ نەدەکردیت. . خۆم لەسەر نەبوونی ڕادەهێنا، بەڵام باوکە گیان، ئێستا بە مانای وشە لە خزمەتکردندام، بۆیە

بمەوێت یان نا، دەبێت لەگەڵ ڕێسای ئەو کۆمەڵەیەدا ڕابێم، کە تیایدا دەژیم. ژیانی سەربازگە بە لایەنی کەمەوە بۆ هەر قوتابییەك ٤٠ ڕۆبڵ پێویستە (من بۆیە هەموو ئەمانەت بۆ دەنووسم، چونکە تۆ باوکمی). ئەمە بێجگە لە خەرجیی شەکر و چا، هەرچەند کەسیش ناتوانێت دەستبەرداری ئەو شتانە بێت، یەکێك لەژێر خێوەتێکدا تا سەرئێسك باران تەڕی کردبێت، یان لە مانۆڕێکی سەختەوە بگەڕێتەوە و لەسەرماندا هەموو گیانی بەستبێتی و چایەکیش نەبێت بیخواتەوە، بێگومان ئەو کەسە نەخۆش دەکەوێت. . . من پار ئەمەم بەسەرهات. بەهەرحاڵ، ئەوە دەزانم تۆ دەستت کورتە، بۆیە واز لە چاخواردنەوە دەهێنم، من تەنیا داوای شتە هەرە پێویستەکانت لێدەکەم، دەمەوێت جوتێك پێڵاوی ئاساییم بۆ بکڕیت." بەڵام باوکی گوێی لێناگرێت و سەرکۆنەی دەکات، کە چۆن دەبێت لە ڕووی ئەودا بوێرێت قسە بکات. خۆیشی دەکەوێتە سکاڵا کە لە تەنگژەیەکی ئابووریدا دەژیت و تاقەفلسێکی نییە بیداتێ. لە نامەیەکی تریدا کە بە تەواوی نائومێدییەوە بۆ میخایلی برای نووسیووە: "برا، بێهیوا ژیان کارەساتە، کە لە بەردەمی خۆم دەڕوانم، لە ئاییندەم دەتۆقێم، لە ناو سەهۆڵبەندانێکدام تیریژێك هەتاوی بەرناکەوێت. . . دەمێك لە ئیلهام دابڕاوم. . . لەوە ناچێت ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم خەمۆکییە بەرم بدات، بیرم لە پڕۆژەیەك کردۆتەوە. . . شێت بم."[1]

ساڵی ١٨٣٤ کە دۆستۆیڤسکی و میخایلی برای ماوەی سێ ساڵ لە قوتابخانەیەکدا بوون، 'کاجنوفسکی'ی هاوڕێیان لەبارەی ئەو قۆناغەی

---

[1] داستایفسکی: قصه گویی مصائب بی خدایی. مستەفا رستگاری.

ژیانی نووسەرەوە دەڵێت: بەردەوام دۆستۆیڤسکی مۆن و بە قووڵی بیری دەکردەوە، گوێی بە یاریکردن نەدەدا و هەموو کاتی خۆی دابووە کتێبخوێندنەوە.

ساڵی ١٨٣٩ باوکی دەمرێت، پێدەچێت ئەو جووتیارانە کوشتبێتیان، کە لە ناوچەکەدا کاریان بۆ کردووە. فرۆید گومان لەوە دەکات کە پەیوەندی لە نێوان کوشتنی باوك لە ڕۆمانی -برایانی کارامازۆف- و چارەنووسی باوکی دۆستۆیڤسکیدا هەبێت.[1] مردنی باوکی خەمێکی تازەی بۆ دۆستۆیڤسکی دروست کرد، ئیتر لەو ساڵەوە تووشی نەخۆشیی پەرکەم هات، کە بە درێژایی تەمەنی لێی نەبووەوە و ئازاری زۆری پێگەیاند.

ساڵی ١٨٤٣ لە پتروزبورگ پەیمانگەی ئەندازیاری تەواو دەکات و دەبێتە ئەفسەر، لە بەشی ئەندازیاریی وەزارەتی جەنگدا دەست بە کار دەکات. بەڵام دوای ساڵێك ناچاری دەکەن دەست لە کار بکێشێتەوە، کە خۆی زۆری پێ خۆش دەبێت، ئیتر دەست بە نووسین دەکات و یەکەم ڕۆمانی لە ساڵی ١٨٤٥ دا بە ناوی (هەژارەکان)ەوە بڵاو دەکاتەوە، نیکراسۆفی شاعیری گەورەی ڕووسیا لە دوای ئەم بەرهەمەوە ناوی (گۆگۆڵی نوێ)ی لە دۆستۆیڤسکی نا.

ساڵی ١٨٤٩ دادگای سەربازی فەرمانی کوشتن بەسەر دۆستۆیڤسکیدا دەدات، بە تۆمەتی ئەوەی بەشداریی لە ڕێکخراوێکی لاوانی ئازادیخوازدا کردووە بە ناوی کۆمەڵەی پتروشفسکی، فەرمانی گرتنەکەی بەم جۆرە بوو:

---

[1] دوستۆیڤسکی و تاوانی باوککوژی. سیگموند فروید.

"ئەفسەری ئەندازیاری خانەنشین، فیۆدۆر دۆستویڤسکی تەمەن ٢٧ ساڵ، لەبەر ئەوەی بەشداری لە پیلانێکدا کردووە و نامەی ناپەسەندی لەبارەی کڵێسا و دەستەڵاتی بەرزی وڵاتەوە نووسیوە و بەیانی دژی ڕژێم بڵاو کردۆتەوە، بۆیە فەرمانی گوللەبارانکردنی بەسەردا در."
لە ٢٢ دیسامبەری ئەو ساڵەدا دۆستویڤسکی و ٢١ کەس لە ئەندامانی کۆمەڵەکە لە بەردەم تیپی گوللەباراندا ڕادەگیرێن، دوای خوێندنەوەی فەرمانەکە و کراسی سپی لەبەرکردن و بەجێهێنانی ڕێوڕەسمی ئاینی، بە فەرمانی نیکۆلا بڕیارەکە هەڵدەوەشێتەوە و دەگۆڕێت بە زیندانیکردن و ناردنیان بۆ سیبریا و کاری قورس پێکردن. ماوەی پێنج ساڵ دۆستۆیڤسکی لە زیندانی سیبریادا لەگەڵ پیاوکوژ و ڕێگر و دز و سەربازی ڕاکردوو و خەڵکانی بێتاواندا دەمێنێتەوە، تاقەکتێبێك کە لەوێ لای بووە و خوێندویەتییەوە، ئینجیل بووە (ئەم ڕووداوە بە تەواوی لە ڕاسکۆڵنیکۆڤی پاڵەوانی سەرەکی ئەم ڕۆمانەدا بەرجەستەیە). ئەزموونی ئەو ساڵانە ڕۆمانێکە بە ناوی (یاداشت لە ماڵە مردووەکانەوە) کە لە دوای ئەو بەرهەمەوە وەك نووسەرێکی مەزن ناودێر کرا.
ساڵی ١٨٥٧ کە هێشتا هەر لە تاراوگەی سیبریا مابووەوە و خزمەتی سەربازیی دەکرد، دۆستۆیڤسکی ماریا دیمیتری فنایسان دەخوازێت، کە پێشتر ژنی پیاوێکی تر بووە و منداڵێکی لێی بووە. دوای دە ساڵ ئاوارەیی دەگەڕێتەوە بۆ مۆسکۆ و پاشان بە یەکجاری بۆ پترۆزبورگ. لەوێ خولیای ڕۆژنامەنووسی لێی دەدا و دەبێتە سەرنووسەری گۆڤاری (کات)ی سیاسی، کە ساڵی ١٨٦١ میخاییلی برای دایمەزراند. یەکەمین کاری لە

گۆڤارەکەدا بەزنجیرە بڵاوکردنەوەی ڕۆمانی (زەلیل و ڕسواکراوەکان) بوو، کە بەشێك لە ژیانی خۆیی تێدایە. گۆڤارەکە سەربەخۆ بوو، لەبەر ئەوە دەسەڵاتدارەکانی ئەو سەردەمە حەزیان پێنەدەکرد، تا وتارێکی (ستراخوف)ی ئەندامی دەستەی نووسەرانیان لەسەر ڕاپەڕینی پۆڵۆنیا کرد بە بیانوو و ساڵی ١٨٦٣ بۆ دواجار دایانخست. ساڵی ١٨٦٤ گۆڤارێکی تر دەردەکات بە ناوی (سەردەم)ەوە و کتێبی (نووسینە قەدەغەکانی) بە زنجیرە تیادا بڵاو دەکاتەوە، کە بە لای ڕەخنەگرانەوە کارێکی ناوازە بوو.

هەر لەو ساڵەدا ماریای ژنی و دوای چەند مانگێك میخایلی برای خۆشەویستی دەمرن. لە دەستدانی ئەو دوو هاوکارەی لەناو گێژاوی ڕۆحی و نەبوونیدا شپرزەی دەکات، خۆی دەڵێت ئەوە ناخۆشترین قۆناغی ژیانی بووە. ئیتر توانای کاری ڕۆژنامەنووسیی نامێنێت و لە شوباتی هەمان ساڵدا گۆڤاری (سەردەم) لە بڵاوکردنەوە دەوەستێت.

لە ساڵی ١٨٦٦دا ڕۆمانی (تاوان و سزا) لە ماوەی ساڵێکدا دەنووسێت و بە زنجیرە بڵاوی دەکاتەوە و ساڵی ١٨٦٧ دەکرێت بە کتێب.

دۆستۆیڤسکی پێش مردنی ماریای ژنی پەیوەندیی خۆشەویستی لەگەڵ کچێکی یاخیدا هەبووە بە ناوی (ئاڤلینار یاسولسفار)، کە خەڵکانی شۆڕشگێڕی لا خۆشەویست بووە، لەبەر ئەوەی دۆستۆیڤسکی پێنج ساڵ لە زیندانی سیبریادا بووە، خۆشی ویستووە. بەڵام خوازبێنیکردنی لە ڕووسیا سەرناگرێت. کە دۆستۆیڤسکی دەچێت بۆ ئەورووپا، لە پاریس یەکتر دەبیننەوە و بڕیاری هاوسەرێتی دەدەن. بەڵام دۆستۆیڤسکی هەرچی پارەیەکی دەبێت، لە قوماردا دەیدۆڕێنێت و ئیتر سولسفار بە تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ ڕووسیا و

واز لە دۆستۆیڤسکی دەهێنێت. لە مارتی ١٨٦٧دا دۆستویڤسکی ژنی سێیەم دێنێت کە ناوی (ئانا گریگوریڤنا)یە. ئانا کچێکی لێهاتووی بواری نووسینەوەی کارەکانی دۆستویڤسکییە. بە هۆی هاتوچۆکردنی ماڵی نووسەرەوە بە تەواوی شارەزای ڕۆحی شپرزە و پەرێشانی دەبێت. بۆیە دەتوانێت بە ئاسانی کارەکانی بۆ ئەنجام بدات. بەڵام کەسوکاری نووسەر بەتایبەتی نیکۆلای بەدمەستی برای و ژن و منداڵی میخایلی برای دژی ژنهێنانەکە دەوەستن. بۆیە بە ناچاری دۆستۆیڤسکی و ئانا پترۆزبورگ بەجێ دێڵن و ڕوو لە ئەوروپا دەکەن. بەتایبەتی بۆ وڵاتانی سویسرا، ئیتاڵیا، فەرەنسا، ئینگلتەرا. بەرهەمی ئەو ساڵانەی تاراوگە ڕۆمانی (گەمژە) و (ئەهریمەن) و (مێردی هەمیشەیی)ن.

لەم سەفەرەیشیدا هەرچییەکی پێدەبێت و ئەو پارانەی لەسەر کتێبەکانی وەریگرتوون، بە قومار دەیاندۆڕێنێت، تا گەیشتە ئەوەی خشڵی ئانایش بفرۆشێت. دۆستۆیڤسکی لەبارەی قومارەوە کە زۆری حەز لێبووە ڕای وایە لە یاری ڕۆڵێتدا بەختی باشە و دەباتەوە. بەڵام دوای دۆڕانی بەردەوام و نابووتی بەهانەی بۆ ئانا ئەوە بوو، کە مێشکی ماندووە و توانای ڕامانی زۆری نەماوە.[1]

ئانا لە یاداشتەکانیدا زۆر لەسەر سەفەرەکەی ئەوروپایان وەستاوە، لەسەر قوماری بەردەوامی نووسەر و بێدەرامەتی و ئاژاوەی نێوانیان و

---

[1] زۆربەی ئەم زانیارییانە لە کتێبی داستایفسکی قصە گوی مصائب بی خدایی-نوسینی- مستەفا رستگاری وەرگیراوە.. -و-

پەشیمانبوونەوەی چەندجارەی دۆستۆیڤسکی لە قومارکردن و دیسان گەڕانەوە سەری.

مردنی یەکەم کچیان -سۆنیا- لە تەمەنی سێ مانگیدا کاری دەروونی لە دۆستۆیڤسکی دەکات (سۆنیا ناوی کەسایەتیەکی هەرەپاکیزەی ناو ئەم ڕۆمانەیە) وەك دۆستۆیڤسکی لە نامەیەکیدا بۆ مایکۆف و لە یاداشتەکانی ئانای هاوسەریدا دەردەکەوێت، ئەو کارەساتە تاڵترین ڕووداوی نێو ژیانی هەردووکیان بووە.

ساڵی ١٨٦٩ کچێکی تر و دوای ساڵێکیش کوڕێکیان بوو. لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی ئەوروپا و بڵاوبوونەوەی کارە ناوازەکانییەوە دۆستۆیڤسکی لەسەر ئاستی هەموو ئەوروپا وەك نووسەرێکی گەورە ناسرا، لە ڕووسیاشدا بە شانازی و شکۆمەندییەوە سەیریان دەکرد. بۆیە لەگەڵ ئانادا بڕیاریاندا ئاهەنگی لەدایکبوونی کوڕەکەیان لە وڵاتی خۆیاندا ساز بکەن.

لە ڕێبەندانی ١٨٧١دا بە یەکجاری بۆ پترۆزبورگ گەڕانەوە. ئیدی ئانا خۆی کەوتە سەرپەرشتیکردنی لە چاپدانی بەرهەمەکانی دۆستۆیڤسکی بەبێ ئەوەی بەرەو ڕووی دەزگا و بنکەی بڵاوکردنەوەکانی بکاتەوە. لەو دەمەوە تا چل ساڵیش هەر خۆی بەرهەمەکانی چاپ دەکردەوە.

لە ساڵانی دوایی تەمەنیدا چەند بەسەرهاتێکی گرنگ ڕوویان دا، یەکەمیان مەرگی (ئەلیوشا)ی کوڕی بوو، کە زۆری خۆش دەویست و برینی مەرگی سۆنیای بۆ تازە کردەوە. ڕووداوی گرنگی دووەمیش نووسینی ڕۆمانی (برایانی کارامازۆف) بوو، کە بە سێ ساڵ تەواوی کرد

و شاکارێکی هەرە ناوازەی ئەم نووسەرەیە. یەکێك لە کەسایەتییە هەرە خۆشەویستەکانی ناو ڕۆمانەکە بە ناوی (ئەلیوشا)ی کوڕیەوەیەتی.
برایانی کارامازۆف پوختەی بیروڕا و لووتکەی داهێنانی دۆستۆیڤسکییە.
لە ٢٨ی ڕێبەندانی ساڵی ١٨٨١دا، دوای ڕۆژێکی گەلێك جەنجاڵ و ڕۆحی ئاڵۆزی ئەو نووسەرە، شەوەکەی تووشی نەخۆشی خوێنبەربوونی سییەکانی بوو. داوای قەشەی کرد و دانی بە ڕاز و نیازەکانی خۆیدا نا.
سێیەم ڕۆژ داوای لە ئانا کرد ئەو ئینجیلەی بۆ بهێنێت، کە لە سەردەمی لاوێتیدا چەند ژنێکی گوندیی لە سیبریا پێیان دابوو. دوای ئەوەی کردیەوە و داوای لە ئانا کرد لاپەڕەکەی بۆ بخوێنێتەوە، ئەویش بە دەنگی بەرز ئایەتەکەی بۆ خوێندەوە: "عیسایش وەڵامی دایەوە: ئێستا کەمێك بوەستە، چونکە هێشتا ئێمە شایستەی ئەوەین بە تەواوی دادپەروەریی بگەیەنینە جێگای شیاوی خۆی."
دوای چەند سەعاتێك، بۆ دواجار فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی زۆر بە هێوری پێڵووی چاوەکانی لێك نان.[1]
ڕۆمانی (تاوان و سزا) بەرهەمی ئەزموون و بیروباوەڕی دۆستۆیڤسکییە، کە دوای دە ساڵ ژیان لە سیبریا، زیندان و کاری قورس و پاشان دەستبەسەربوون و مانەوەی لەوێدا، لە ساڵی ١٨٦٦دا نووسیوویەتی، زۆربەی بیروڕا فەلسەفی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایینییەکانی ئەو سەردەمەی ڕووسیا، کە چینە جیاوازەکان و لاوانی ئەوسای سەرقاڵ کردبوو، لە ڕێی

---

[1] سەرچاوەی پێشوو.

کەسایەتی و بەسەرهاتەکانەوە دەرخراون. بەتایبەتی لە کاراکتەری سەرەکیی ڕۆمانەکەدا، کە تەوەری کێشە و ڕەهەندە فرەلایەن و بۆچوونە جیاوازەکان (راسکۆڵنیکۆف)ە. ڕادیون ڕاسکۆڵنیکۆف لاوێکی خوێندکاری زانکۆی پتروزبورگە، هۆشیار و ڕووناکبیرە، زۆرجار دەم لە مەسەلەی فیکری دەدات و دەنووسێت. لە بڕیارداندا توندوتیژە. بەیارمەتیی دایك و خوشکێکی دەژی، کە لە شارۆچکەیەکی زۆر دوورەوە پارەی بۆ ڕەوانە دەکەن، بڕی پارەکە زۆر کەمە و دایك و خوشکی لە دەمی خۆیانی بۆ دەگرنەوە. ڕاسکۆڵنیکۆف هەمیشە گیرفانی خاڵییە، ژوورێکی بەکرێ گرتووە لە کون دەچێت و کرێی چەند مانگێکیشی لەسەرە و ناتوانێت بیدات. نە خۆراکی باشە و نە جلوبەرگ، تەمەنی بیستوسێ ساڵە. وازی لە خوێندن هێناوە و نایشزانێت چی بکات. خاوەنی کەسایەتیی خۆیەتی و سەر دانانەوێنێت. زۆر بڕوای بە خۆی و بیروڕاکانی هەیە. ئاگاداری شەپۆلی بیری خۆرئاوا، سۆشیالیستی، شۆڕش، نەهلیستیەت، سلاڤچییەکانی لای خۆیانە، کوڕێکی هەمیشە خەمبار و بێدەنگ و خەمۆکە، لە ئەتەکێتی بۆرژوا بێزارە و مرۆڤی خۆپەسەندی خۆش ناوێت. پەیوەندیی سەرمایەداری بە هۆی پیسبوونی ڕۆحی مرۆڤ دەزانێت. بڕوای بە زۆر لەو یاسا و ڕێسا و نەریتە باوانە نییە، کە کۆمەڵگا پەیڕەوییان لێدەکات.

دۆستۆیڤسکی لەم ڕۆمانەدا باسی تاوانی کوشتنێك دەکات، کە ڕاسکۆڵنیکۆف ئەنجامی داوە. کوشتنێك نە فاکتەرێکی قەناعەتپێکەری لە دواوەیە و نە ئاقارێکی فیکریی گونجاو. تاوانەکە ئەوەندەی سروشتێکی ڕۆحی و فشاری دەروونیی تیا بەرجەستەیە، ئەوەندە لە ڕوانگەی

کۆمەڵایەتی و سزای یاساوە بایەخی پێنەدراوە. واتا ئەو مەودا فراوانەی لە دوای کوشتنەکەوە بۆ پرسیار و مشتومڕ و ئازار و مەنەلۆژیی ناوەوەی کەسێك ڕەخسێنراوە، کە کۆمەڵێك کێشە و دیدی فیکری و ئەخلاقی دەوروژێنێت، ئەوەندە بەستێنی یاسایی نییە، کە ئاسایی تاوانکارییەك بێت و لە ڕێگەی دادگاوە بە ئەنجام بگات.

ڕاسکۆڵنیکۆڤ بەبێ هیچ پێشبینییەك، بیر لە کوشتنی پیرێژنێکی سووخۆر دەکاتەوە، کە چەند جارێك چووە بۆ لای و بارمتەی لاداناوە، لای خۆیەوە، بۆ پاکانەی کوشتنەکە، بە -ئەسپێ-ی دەچوێنێت، چونکە ئەمیش خوێنی مرۆڤ دەمژێت. بەڵام دوای ئەنجامدانی کارەکە ڕاسکۆڵنیکۆڤ چەواشە دەبێت و نازانێت بۆ کوشتوویەتی. چونکە وەك لەدواییدا بە (سۆنیا) دەڵێت، ئەو نازانێت لە برساندا ئەمەی کردووە، یان بۆ هاوکاریکردنی دایکیەتی؟ بۆ ئەوەیە لاسایی ناپلیۆن بکاتەوە یان تاقیکردنەوەی ئیرادە و بوێریی خۆیەتی؟ یان بەپێی ئەو تیۆرەی جەختی لەسەر دەکات، هەر کەسێك توانایەکی ئەقڵی و ڕۆحیی گەورەی هەبێت، ڕەوایە بۆی هەرچییەك بە بەرژەوەندیی دەزانێ، ئەنجامی بدات تەنانەت ئەگەر خوێنڕشتنیش بێت. کەچی هەر خۆیشی لەدواییدا لای سۆنیا دان بەوەدا دەنێت کە کوشتنی مرۆڤێکە و دەشێت ئەم خۆی ئەسپێ بێت. سەیر ئەوەیە دوای کوشتنی پیرێژن و لیزاڤێتای خوشکی، ئەو پارە و زێڕانەی لەناو کیفی پیرێژندان و دەستی ئەم دەکەون، هیچ سوودیان لێنابینێت، تەنانەت نازانێت پارەکە چەندە. هەمووی لەژێر بەردێکدا دەشارێتەوە و ئیتر بەدوایدا ناچێت.

شاری پتروزبورگیش که شانۆی ڕووداوەکەیە، ڕەگەزێکی سەرەکیی ناو چیرۆکەکەیە و جووڵەیەکی دینامیکیی لەگەڵ ڕووداوەکاندا هەیە. تا ڕادەیەکی زۆر ئەویش دیمەنێکی تاریك و شێواوی لەخۆ گرتووە. کووچە و کۆڵانی بۆگەن و پڕ لە هەراوزەنای ڕێبوار و کڕیار و دەزگێڕە. شارێك ناخۆشترین گۆرانیی تیا دەوترێت، لە کاباریەکاندا سۆزانیی ڕسوا و گۆرانیبێژی سووك کار دەکەن. پڕە لە دز و بێکار. شارێکی دڵڕەق و بێبەزەیی و بەئاژاوە، لەپڕێکدا دروست بووە و ڕەگاژوویەکی مێژوویی ڕەسەنی نییە. دانیشتووەکانی هەمیشە بێئارام و ناسەقامگیرن. خومیاکۆف پێی دەڵێت: "شارێکی لەبەرد دروستکراو. نەك تەنیا خانووەکان، بەڵکو دارودرەخت و مرۆڤەکانیشی هەر لە بەرد دروست کراون."[1]

ئەوەی لەم ڕۆمانەدا سەرنج لە زەمینەی فیکری و ژیانە تایبەتییەکەی ڕاسکۆڵنیکۆف بدات، پاشان بگەڕێتەوە سەر کەسایەتی و ژیاننامەی خودی دۆستۆیڤسکی، بۆی دەردەکەوێت کە لایەنێکی ڕاسکۆڵنیکۆڤ خودی کاراکتەری دۆستۆیڤسکییە. بەتایبەتی ژیانی سیبریا لەناو دز و پیاوکوژ و کەسانی نابووت و بێبڕوادا. ڕاسکۆڵنیکۆف تەنیا کەسێك کە لە سیبریا ئارامیی پێبەخشیوە و خۆشەویستی ژیانی فێر کردووە -سۆنیا-ی بەناهەق سۆزانی بووە، ڕەنگە بۆ دۆستۆیڤسکیش -ماریا-یەك بووبێت، کە ژنی مێردار بووە و منداڵی هەبووە و ئەم زۆری خۆش ویستووە و پاشانیش بووە بە هاوسەری.

---

[1] کتێبی دوستویفسکی، وتاری فیلیپاراف.

لەم ڕۆمانەدا هەردوو کاراکتەری سەرەکی (ڕاسکۆلنیکۆڤ و سۆنیا) هەریەکە و لە ئاقارێکەوە تاوانبارن، تاوانبار نەك بە مانا ویژدانییەکەی، بەڵکو بە مانای بەزاندنی یاسا و ئەخلاقی باوی کۆمەڵگا. یەکەمیان مرۆڤی کوشتووە و دووەمیان سۆزانییە. وەلێ هۆکاری ئەم دوو تاوانە چین؟ غەریزەن؟ حەزی هەردووکیانە لەپێناوی بەدیهێنانی دەستکەوتێکی گەورە و بێوێنەدا؟ یان ستەمێکی کۆمەڵایەتییە، کە لە دەرەوەی ویستی خۆیانەوە سەری هێناوەتە ناو ژیانیانەوە و ئەوانیش بەبێ بەرگریکردن پێشوازییان لێدەکەن! هۆکاری کارەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ لە ڕەهەندێکی فیکرییەوە گەلێك لێکدانەوە هەڵدەگرێت، کە تەوەری ڕۆمانەکە لەسەر ئەوە بنیات نراوە.

بەڵام سۆنیا دوور لە ئارەزووی خۆی، یان تەواو بە پێچەوانەی حەزی خۆیەوە دەبێت بە سۆزانی. بۆ ئەوەی ژیانی چەند خوشك و برایەکی سەروپێچکەی خۆی دابین بکات، کە تەنیا لە باوکین و دایکیان جیایە. تەنانەت ئەم هەڵوێستەیشی لە قەناعەت و هەستی تایبەتی خۆیەوە نەبووە. بەڵکو لە ئەنجامی ئەو سەرکۆنەکردن و دنەدانەوەیە کە کاترینا ئیڤانۆڤنای باوەژنی دەیکات و لە بەردەم پرسیارێکی سەرسامکەردا ڕایدەگرێت کە ئایا کچێنی و ئابڕووی سۆنیا لە ژیانی منداڵەکانی ئەو ئازیزترن، کە خەریکە لە برساندا دەمرن! ئەم پرسیارە لە کێشی کیبریا و کەسایەتیی سۆنیا دێنێتە خوارێ و لە پێناوی ژیانی خێزانەکەیدا لە نووسینگەیەکی تایبەتیدا وەك سۆزانییەك خۆی ناودێر دەکات. ئەو بڕە پارەیەش کە پێشەکی وەریدەگرێت، بە خڕی دەیکاتە چنگی کاتریناوە و بۆ لەوەودوایش هەروا دەکات.

* *

من زۆر دەمێك بوو خەونم بە وەرگێڕانی ڕۆمانی تاوان و سزاوە بۆ زمانی کوردی دەبینی، نەك تەنیا وەرگێڕانی خۆم، بەڵکو یەکەم ڕاستەوخۆ لە زمانی ڕووسییەوە و دوەم لە لایەن قەڵەمێکی بەتوانا و کارامەی پڕ لە عەشقەوە. لە ساڵانی هەشتای سەدەی ڕابوردوودا کە بۆ یەکەمجار وەرگێڕانی ئەم ڕۆمانەی ڕەوانشاد سامی دروبیم خوێندەوە، نەمتوانی چەند جارێکی دی دووبارەی نەکەمەوە و هەموو جارێکیش لە جاری پێشوو سەرسام و بەئەنگێزەو لێوانلێو نەبم لە هەتەری ڕۆح و تای ئەندێشە و بۆ ماوەیەکیش سامداگرتن و بێدەنگی. هەندێکجار وەك ڕاسکۆڵنیکۆڤ لە بەردەم سۆنیای ئەوین و ئازاری هەموو مرۆڤایەتیدا بەچۆکدا دەهاتم و داوای لێبوردنم لە خودای نووسین دەکرد، جاری تریش لە ئاست مەستی و جەستەی بەخوێن شەڵاڵی مارمیلادۆڤدا ڕۆحی ئەفسوردە و پەرێشانم کڕنووشیان بۆ هەناسەی حەسرەت و چاوی بەجووڵە و سووسەکەری پێش گیانەڵای دەبرد. ئەوە ئەو کاتانە بوو کە منیش وەك ڕاسکۆڵنیکۆڤ بەدوای خۆمدا دەگەڕام، نەمدەزانی بۆ تاوانی خوێندنەوە و نووسینم بۆ خۆم هەڵبژارد، کێ فێری کردم و بۆ؟ نەمدەزانی بۆ دەبێت هەمیشە لە شەوانی پڕ لە کوێرەوەری و کارەساتی ئەم بستۆکە زەویەی ناو دڵ و ڕۆحمدا خەمی هەموو گەردوون هەڵبگرم، هەناسەم تەنگ ببێت و فرمێسکی درشت بڕێژم! بۆ لەم بستۆکە زەویەی دەوروبەرمدا کە تیری چاوێکی بە ئەندێشە بە ئاسانی ئەمسەر و ئەوسەری دەکات، دۆستۆیڤسکی پێم بڵێت: گێلە، تۆ هەزارانی وەك سۆنیا و مارمیلادۆڤ و کاترینات لە بەردەمدایە، دراوسێتن، لەگەڵیاندا دەخۆیت و دەخۆیتەوە، هەموو شەو و ڕۆژێك دەیانبینیت، ئەی بۆ نایانناسیت؟ ئەمە کارەساتە هاوڕێیان، لە کارەساتەکانی ئۆدیب و هاملێت بەسوێترە، کارەساتی نووسەری گەمژەی خۆنەناس و کەسنەناس، ئەوانەی

نزیکترین کەسی لای خۆیان نابینن و لە دوورەوە، لەوپەڕی بێکۆتایی دەریا و نەدیویی ئاسۆکانەوە، پەیامبەرەکانی داهێنان ئاماژەیان دەدەنێ. تومەز (هەرچەندە ئەمەیش درەنگتێگەیشتنە) هەموو بستۆکە زەویەکانی سەر ئەم ئەستێرەیە قەڵای سەخت و زیندانی هەستی پاکیزە و ئومێدەکانی مرۆڤایەتین، مرۆڤەکانیش -دواجار- لە گەرووییەکەوە هاوار دەکەن و بە سییەك هەناسە دەدەن.
ئیتر هەر کەسەو لە ناو ئەم وێڵگەیەدا بەتەمای فریادڕەسێکە، تاقە فریادڕەسی من چەند پەڕەیەکی نێو ئەو بەرگانە بوون، کە تا دوا تەڕایی شیرینیی تاڵیان پێدەچێشتم، قیژەیەکی بێدەنگیان لە گەروومدا گیر دەدا و خوداو ئەهریمەنیان لە پێکهاتەیەکی کیمیاویدا تێکەڵ بەیەك دەکرد و دەیانوت: فەرموو، خۆت جیایان بکەرەوە، نە بە قسەی ڕابوردوو بکە و نە ئێمەیش.
سیحری داهێنانەکەی دۆستۆیڤسکی لەوەدا نییە، کە تۆ چیرۆکێکی پڕ لە ڕاز و نهێنی و بەساتوپاتی ڕووداوی خرۆشان و کەمەنکێشی دەخوێنییەوە. یان دوو مرۆڤی بێتاوان کوژراون و تۆ بەدوای تۆڵەدا بڕگە بە بڕگە و لاپەڕە بە لاپەڕە چاوەڕێی سزایەکی خودایی یان مرۆییت، نا، بەڵکو لەوەدایە کە ویژدانی مرۆڤانەی تۆ دەکەوێتە شەقڕن و لە بەدحاڵیبوونەکانت وەئاگا دێیت، تێدەگەیت مرۆڤەکەی ناوەوەی تۆ مردووە، لە نێو بەستێنی بێدەنگیدا بەردێکی ساپ و لاکەوتەیە، چاوی دنیابینیت کز و نزیك بەکوێرییە. لەوە بەئاگا دێیت کە تەواوی ئەم گەردوونە لەژێر گوشارێکی سەختی پرسیار و گوماندایە، بەردەوام لەبەر پلووسکی ڕازگەلێکدا تەراتێنی گەیشتن و نەگەیشتنیەتی، گەیشتن بە هەوارێك کە ئاسوودەیی مرۆڤی تیا مەحاڵە و نەگەیشتنیش هەلاهەلابوونێکی بەردەوام. تۆ لە وەهمی هەقیقەت تێدەگەیت و لە پووچیی ڕواڵەتە

چاوخەڵەتێنەکان. لە توێی دەموچاوە گەش و بێگەردەکاندا ئەو پەڵەڕەشانە دەبینیت، کە شوێنەواری ئاوڵەی ڕق و خەمخۆرکی ئێستای کرمێبوونن.

بە داخەوە ساڵ بەرەبەرە گلۆڵەی تەمەنی پێچایەوە و ئەو وەرگێڕانەم نەدی. لە حەزی خۆیشم بەولاترەوە، هەستم بە گەلێك لەو نیگا شەرمنانە کرد، کە بێجگە لە زمانی دایکیان چ زمانێکی تر نازانن، هەر لەبەر ئەوەیە تا ئێستا لایان وایە کۆشك و تەلاری فەرهەنگی ئێمە سەری لە نێو هەوردایە و ڕووباری بیر و داهێنانمان دەتوانێت ئاودێریی گەلێك لە زەوییە دێم و قاقڕەکانی خەڵکی تر بکات. بۆیە دەبێت لە ڕێی ئەم شارە بە ئاو و ئاوەدانانەوە تێبگەن ئێمە لە چ وێرانەیەکداین و گوندی ئەفراندنی ئێمە بە درەخت و مرۆڤیشیانەوە چەند لە خشتی کاڵا دەچن. ئەمە نائومێدی نییە، بەڵکو هەقیقەتێکی تاڵە.

دوای ئەو چاوەڕوانییە تەمەندرێژەی گەیشتبووە سنووری نائومێدی، دیسانەوە تاسەی ئەو دیدارە لە گیانمدا جۆشی سەندەوە، بەتایبەتی پاش خوێندنەوەیەکی تری تاوان و سزا و برایانی کارامازۆف لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٤دا، ئەو وەرگێڕانانەی لەبەر دەستمدا بوون، بریتی بوون لە وەرگێڕانە عەرەبییە دڵگیرەکەی د. سامی دروبی کە لە فەڕەنسیەوە ساڵی ١٩٨٥ کردبووی. وەرگێڕانە عەرەبییەکەی فایز کم نقش کردی کە لە ئینگلیزییەوە ساڵی ١٩٧٩ کرابوو لەگەڵ دەقە ڕووسییەکەیشدا بەراورد کرابووەوە. وەرگێڕانی سێیەم بۆ زمانی فارسی ساڵی ١٩٨٢ لە لایەن مهری ئاهی ڕاستەوخۆ لە دەقە ڕووسیەکەوە کرابوو، من ئەمەیانم پەسەند کرد لەبەر ئەوەی یەکەم لە دەقە ئەسڵییەکەوەیە، دووەم وەرگێڕان لە زمانی فارسیەوە بۆ کوردی خۆشترە و ڕەوانتر دێتە دەست. بەڵام دوای هەندێك بەراورد زانیم هەردوو وەرگێڕانە عەرەبییەکەیش، بەتایبەتی وەرگێڕانەکەی د. سامی دروبی گەلێك درەوشاوەن و

ویژدانی ئەدەبی خۆیان و ڕۆحی دۆستۆیڤسکیان شاد کردووە. بۆیە نەمتوانی دەستبەرداریان بم، چونکە بە ئەزموونی خۆم لە وەرگێڕاندا گەلێك جار لە نێوان دەقێکی دوو وەرگێڕدا جیاوازی ترسناکم دیووە و منیش لەڕادەبەدەر بەو کارەساتە دڕدۆنگ و قەڵس دەبم. بۆیە ئەوەم بە چاکتر زانی. -هەرچەندە کاتی زۆری لێگرتم و ماندووتریشی کردم- کە بەردەوام لەگەڵ هەر فەسڵ و بەشێکدا، بۆ تەواو دڵنیابوون لە ڕۆحی دەقەکە پەنایان بۆ بەرم، بەتایبەتی وەرگێڕانەکەی دروبی کە وەك بیستم، لە لایەن لیژنەیەکی تایبەتی کە لە مۆسکۆ بۆ بەراوردکردنی لەگەڵ دەقە ڕووسییەکەدا دروست کراوە، زۆریان پێ پەسەند بووە. هەرچەندە من جیاوازی زۆرم بەدی نەکرد، بەڵام هێشتا هیچیان لەوە خاڵی نەبوون کە پەرەگرافیان تێدا پەڕیبێت، مانا لە هەندێکیاندا شاراوەتر و ئەمیان لەوی دی ڕەوان و بەداروبارتر بێت.

بێگومان من پشتم بە دەقە فارسییەکە بەستووە و سەرچاوەی سەرەکیمە، بەڵام دەشێت بەو دەقانەی دی دەوڵەمەند و خۆشدەستتر هاتبێتە گۆ.

وەرگێڕانەکە لە خەرمانانی ٢٠٠٤وە تا پووشپەڕی ٢٠٠٦ی خایاند. هێشتا گومانی ئەوەم هەیە کە درز و بۆشایی تێنەکەوتبێت، چونکە ئەوەی شارەزای دنیای وەرگێڕان بێت، ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێت. بەتایبەتی بۆ ئێمەی کوردی کەمئەزموون و کەمپسپۆڕ لە بواری وەرگێڕاندا. هەرچۆنێك بێت، ئەمە لەو کارانەیە کە بەدڵ خۆشم دەوێت و بەدیهێنانی خەونێکمە، دڵسۆزترین کەسیش ئەوەیە کە نایەوێت خەوش لە خۆشەویستیی هاوڕێکەیدا هەبێت و بۆ جوانترکردنی خەوشەکانی لادەدرکێنێت.

ڕەووف بێگەرد
پووشپەڕی ٢٠٠٦

## ١

لە ئێوارەیەکی گەرمی یەکێک لە ڕۆژە بەراییەکانی مانگی گەلاوێژدا لاوێک لە ژوورە چکۆڵەکەی خۆیدا، کە لە کۆڵانی (س) بە کرێی گرتبوو، هاتە دەرێ، هەنگاوی نایە ناو کۆڵانەکە و ئینجا سەبرۆکە سەبرۆکە و بە دوودڵییەوە بەرەو پردی (گ) کەوتە ڕێ.

کە لەسەر پلیکانەکانەوە دەهاتە خوارێ، چاک بوو لووتی بە لووتی خاوەن ماڵەکەیدا نەتەقی. ژوورە بچکووکەکەی ڕاست لەژێر سەربانی باڵەخانەیەکی بەرزی پێنج نهۆمیدا بوو، زیاتر لە کونێک دەچوو تا ژوورێک کە تیایدا بژی، ئەم ژوورە بچووکەی بە خواردن و خزمەتەوە بە کرێ گرتبوو، خاوەن ماڵەکەی لەژێر پلیکانەکانی ئەودا، لە نهۆمێکی تردا دەژیا، دەبوو لاوەکە هەموو جارێک بۆ ڕۆیشتنە سەر شەقامەکە بە ناچاری بە پاڵ موبەقی خاوەن ماڵەکەدا تێبپەڕێت. هەمیشە دەرگای موبەقەکەیش ڕووبەڕووی پلیکانەکان لەسەر پشت بوو.

هەر جارێک کە بەوێدا تێدەپەڕی، هەستی بە ترس و ناڕەحەتییەکی زۆر دەکرد و شەرم دایدەگرت، ئەو هەستە سیمای دەموچاوی بە جارێ دەگۆڕی. لاوەکە قەرزێکی زۆری ژنە خاوەنماڵەکەی لەسەر بوو، بۆیە لە ڕووبەڕووبوونەوەی دەترسا، ئەمە نەک لەبەر ئەوەی زۆر ترسنۆک و کەمڕوو بێت، بەڵکو تەواو پێچەوانەی ئەوە ڕاست بوو، تەنیا ئەوەندە هەبوو، کە لە پێش ماوەیەکی کەمەوە تووشی حاڵەتێکی زووهەڵچوون و جۆرە بێزارییەکی وا هاتبوو، کە لە خەمۆکی دەچوو، هێند خۆی دەخواردەوە و لە خەڵکی دوورەپەرێز بوو، کە نەک تەنیا لە ڕووبەڕووبوونەوەی خاوەن ماڵەکەدا، بەڵکو لە هەموو دیتنێکی تریش هەر دەترسا، نەبوونی و کەمدەرامەتی بە تەواوی هاڕیبوویان، هەرچەندە بەو دووایییە تەنانەت ناڕەحەتییەکەیش ئیتر ئازاری نەدەدا، ئەو هەرگیز فریای پێویستییەکانی ژیانی خۆی نەدەکەوت و نەیشیدەویست بکەوێت. لە ڕاستیدا ئەو لەوە بێباکتربوو کە لە هیچ خاوەن خانوویەک بترسێت، تەنانەت ئەگەر خاوەن خانووەکە خەیاڵی پیلانگێڕانیشی لە دژی هەبێت. وەلێ ئەو هەر وای پێ باش بوو کە وەک پشیلە هەڵێت و کەس نەیبینێت، نەک لە ناوەڕاستی پلیکانەکاندا بوەستێ و گوێ لەو قسە هیچوپووچانە بگرێت، کە ئەسڵەن پەیوەندییان بەوەوە نییە، وەک داواکردنی قەرز و هەڕەشە و شکاتلێکردن، ئینجا ناچارکردنی لەسەر فێڵ و پۆزشهێنانەوە و درۆکردن.

بەڵام ئەمجارەیان ترسی ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ ژنە خاوەن قەرزەکەیدا، لەو کاتەوەی کە چووە کۆڵانەکەوە، هەر بەرۆکی بەرنەدابوو. بە زەردەخەنەیەکی پڕ لە ماناوە بە خۆی وت: "دەمەوێت چ کارێک ئەنجام بدەم وا لە بێمانایییەکەی دەترسم، هەم؟ بەڵێ.. هەموو

شتێک لە نێو دەستی مرۆڤدایە، وەلێ ناتوانێت کەڵک لە توانای خۆی وەربگرێت، چونکە ترسنۆکە.. ئیدی ئەمە ئاشکرایە.. بەڕاست، مرۆڤ زیاتر لە چی دەترسێت؟ لە هەموو شتێک زیاتر لە هەنگاوی نوێ و وتەی جوان و داهێنانی خۆی دەترسێت.. بەڵام دەبێت ئەوە بڵێم کە من زۆر دەڕێسم و زۆروتنیش مانای بەئەنجامنەگەیاندنی کارە.

یان ڕەنگە لەبەر ئەوەی کە کارێک ناکەم، تووشی زۆر بڵێی هاتووم، زۆر بڵێی لەم دوامانگەدا فێربووم کە شەووڕۆژ لە سووچێکدا کەوتووم و بیر.. لە هەموو شتێک و لە هیچیش دەکەمەوە. باشە، ئێستا من بۆ چ شتێک دەچم؟ ئایا دەتوانم بیکەم؟ ئایا "کارەکە" جیدیە؟ نا، هیچ جیدی نییە، بیر و ئەندێشەیەکی بێهودەیە، دڵی خۆم خۆش دەکەم، کاتی پێ بەسەر دەبەم، بەڵێ، دەشێ هەر بە ڕاستی بۆ کات بەسەربردن بێت".

گەرمایەکی ترسناک، هەناسەتەنگی و هەراوزەنا، گەچ و شیشی خانوو، خشت و تۆز و خۆڵ تەواوی شەقامەکەیان داگیر کردبوو، بۆگەنێکی تایبەتیشی تێکەڵ ببوو، بۆگەنێک بوو ئاشنا بە لووتی هەر پترزبورگییەک کە توانای بەکرێگرتنی ماڵێکی لە زۆزان نەبێت. هەموو ئەمانە مێشکی جەنجاڵی لاوەکەیان ئەوەندەی تر هەژاندبوو. بۆگەنی ناخۆشی مەیفرۆشان کە بەتایبەتی لەو شوێنەی شاردا بێژمارەن و ئەو سەرخۆشانەی تەنانەت لە ڕۆژە ئاساییەکانی هەفتەیشدا هەر لەوێ دەبینرێن، زیاتر دیمەنەکەیان قێزەون و دزێو دەکرد.

لە چرکەساتێکدا هەستی بێزارییەکی قووڵ بە دەموچاوی جوانی لاوەکەوە دەرکەوت (دەبێت ئەو ڕاستییە بزانین کە لاوەکە زۆر دەلال بوو، چاوی تۆخ و زۆر جوان و قژی زەرد، باڵای لە میانە بەرزتر و قەدی باریک و ڕێک بوو) وەلێ زوو کەوتە نێو خەیاڵێکی قووڵەوە،

بابڵێم کەوتە نێو جۆرێک لە فەرامۆشی و ئیتر بەبێ ئەوەی ئاگای لە دەوروبەری بێت یان خۆی بیەوێت ئاگادار بێت، کەوتەوە ڕێ، تەنیا هەندێکجار لەژێر لێوەوە ورتەورتێکی لەگەڵ خۆیدا دەکرد. ئەم قسە لەگەڵ خۆکردنەی ببووە نەریتێک و خووی پێوەگرتبوو، خۆیشی دانی پێدا دەنا، هەر لەو کاتەیشدا ئەوەی دەزانی کە بێهێزیەکی زۆر گەمارۆی داوە و بیروبۆچوونەکانی تێکەڵوپێکەڵ دەکەن. نزیکەی دوو ڕۆژیش بوو هیچی نەخواردبوو.

جلەکانی بەری ئەمەندە کۆنوپواو بوون، کە کەسێکی تری ئاسایی بەو جۆرە بەرگە شڕەوە لە ڕووی نەدەهات بە ڕۆژی نیوەڕۆ ڕوو لە کۆڵانان بکات، بەڵام جلوبەرگ لەو گەڕەکەدا هەرچۆنێک بووایە، کەمتر خەڵکی سەرسام دەکرد.

نزیک بە مەیدانی (سننایا)[1] شوێنێکی دیاری پڕ لە دەزگا و دووکانە، دانیشتووەکانی کە زیاتر بە کاری پیشەیی و کارگەرییەوە سەرقاڵن. تێکڕا ڕژاونەتە ئەو کووچە و کۆڵانانەی ناوەڕاستی پترزبورگەوە. دیمەنێکی هێند ڕەنگاڵەییان بەو شوێنە داوە، کە کەس سەری بە کەسێکی سەیر سوور نایەت. بەڵام دڵی لاوەکە ئەوەندە لێوانلێوی نەفرەت و کینە بوو، لەگەڵ هەستی ناسکی لاویەتییەکەیشیدا، ئێستا و لە ناوەڕاستی شەقامەکاندا، لە هەر شتێک کەمتر شەرمی بە بەرگە کۆن و شڕەکانی خۆی دەهات. هەڵبەتە گەیشتن بە هەندێک دۆست و هاوڕێی کۆن، کە ئاسایی بینینیانی پێ ناخۆشبوو، مەسەلەیەکی تر بوو. لەگەڵ ئەمانەیشدا سەرخۆشێکی دنگ کە کەس نەیدەزانی لەو کاتەدا بۆچی و بۆ کوێی دەبەن و بۆ سواری ئەرەبانەیەکی گەورە و

[1] *sennaya*

خاڵیان کردووه که ئەسپێکی کەتە و بەهێز ڕایدەکێشێ، له شەقامەکەدا دەیانسووڕاندەوە، نەیزانی بۆ به دەست ئاماژەی بۆ ئەم کرد و هاواری لێکرد: "هێی، کڵاودرووی ئەڵمانی!" لاوەکە زوو وەستا، شڵەژاو دەستی بۆ کڵاوەکەی برد، کڵاوەکەی بەرزو خڕ، بێلێوار و له کەلوپەلەکانی پێشانگای بەناوبانگی "زیمەرمان"[1] بوو، تەواو کۆن و سوورێکی کاڵەوەبووی کون کون و پڕ له پەڵە و لایەکیشی به یەکجاری داتەپیبوو. شەرم لاوەکەی دانەگرت، بەڵکو شتێکی له بابەتی ترس سەرتاپای لەشی داگیر کرد، به ناخۆشییەوە کەوتە ورتەورت: "دەمزانی، بیرم لەمەیش دەکردەوە، ئەمە له هەمووی گەنترە! شتێکی تورەهاتی وا، بێنرخێکی ناچیز، دەتوانێت هەموو نەخشەکە تێک بدات: بەڵێ، ئەم کڵاوە زۆر لەبەرچاوە.. پێکەنینهێن و سەرنجڕاکێشە.. لەگەڵ ئەم جله کۆنانەدا دەبێت یان کاسکێتێک یان شەو کڵاوێکم هەبێت. نەک ئەم کڵاوە بەدشێوەیە، کەس ئەم جۆرە کڵاوە لەسەر ناکات، له دووری فەرسەخێکەوە سەرنج ڕادەکێشن و لەبیر ناچنەوە.. له هەموو گرنگتر ئەوەیە که پاشان لەبیر ناکرێن و دەکرێنە بەڵگەیەکی تەواو، له باری وادا پێویستە شتەکان سەرنجڕاکێش نەبن.. ئەم شتە بچووکانە له هەموو گرنگترن.. هەر ئەم شتە گچکانەن بەردەوام هەموو شتێک تێک دەدەن..".

لاوەکە ڕێی دوور نەبوو، تەنانەت دەیزانی تا دەرکی ماڵەکەی چەند هەنگاوە: حەوتسەد و شەش هەنگاوی ڕێک، ڕۆژێک که زۆر کەوتبووە بیر و خەیاڵەوە، هەنگاوەکانی ژماردبوو، تەنانەت خۆیشی لەو کاتەدا هێشتا باوەڕی بەو خەیاڵە نەبوو، بەڵکودڵی خۆی به

---

[1] *zimmerman*

بوێرییەکی فریوودەرانەی شووم خۆش دەکرد، وەلێ ئێستا، دوای مانگێک، وردەوردە باری سەرنجێکی تری پەیدا کرد، لەگەڵ هەموو ئەو قسە تاقەتپڕوکێنەدا کە لەبارەی بێتوانایی و ڕاڕایی خۆیەوە دەیکرد، ئیدی کارە "شووم"ەکەی، بە زۆر یان بە خوایشت بە کاری خۆی دەزانی. هەرچەندە هێشتا تەواو بڕوای بە خۆی نەبوو، تەنانەت ئێستایش بۆ پرۆڤەکردنی ئەو شتە دەچوو، کە لە ئەستۆی خۆیی گرتبوو. هەر هەنگاوێکیش کە هەڵی دێنا، زیاتر هەڵچوون و شڵەژانی پێوە دەردەکەوت.

لاوەکە بە دڵەتەپێ و پەشۆکاوییەوە گەیشتە ساختمانێکی زۆر گەورە، یەکێک لە دیوارەکانی بەسەر ڕووبارێکدا دەیڕوانی و ئەوی تریان بەسەر شەقامەکەدا، ساختمانەکە لە چەند ئاپارتمانێکی بچووک پێک هاتبوو، دانیشتووەکانی بریتی بوون لە کارمەندی بچووک و هەمەجۆر لە پیشەوەرانی ڕووسی و ئەڵمانی، زۆربەیان بەرگدروو، دارتاش، چێشتکەر و ئەو کچانە بوون، کە بە لەشفرۆشی خۆیان دەژیاند. هاتوچۆکەران لە دوو دەرکی هاتنە ژوورەوەوە دەروژووری حەوشەی ساختمانەکەیان دەکرد، سێ چوار دەرگاوانیشیان هەبوو. لاوەکە زۆر بەوە دڵخۆش بوو، کە لەگەڵ کەسیاندا ڕووبەڕوو نەبوو، بێدەنگ و خێرا لە دەرگای هاتنەژوورەوەدا بەرەو لای ڕاست تێی کێشا و بە خێرایی لە نەردەوانەکان سەرکەوت، ڕێی نەردەوانەکان تەنگ و تاریک بوو، ڕێی هاتوچۆی بەردەستەکان بوو، وەلێ ئەو هەموو ئەمانەی دەزانی و فێریان ببوو، پێیشی خۆشبوو، چونکە لەو تاریکییەدا تەنانەت بینینی کەسێکی چاودڕاویش مەترسی نەبوو. کە گەیشتە قاتی چوارەم، بێئیرادە بۆ خۆی بیری کردەوە: "من کە ئێستا لێرەدا وا دەترسم، ئەی ئەگەر بە ڕاستی کارەکە ئەنجام بدەم چۆن؟"

لەوێدا ئەو بارهەڵگرانەی سەربازی خانەنشین بوون و مۆبیلیاتی یەکێک لە ئاپارتمانەکانیان دەهێنایە دەرێ، ڕێگەکەیان لێگرت. ئەو پێشتر دەیزانی لەوماڵەدا ئەڵمانییەک لەگەڵ خێزانەکەیدا دەژیا، کە کاری ئیداریی دەکرد، بە خۆی وت "لەوە دەچێت ئێستا بگوێزێتەوە، کەواتە لە قاتی چوارەم و ئەم ناوەدا بۆ ماوەیەک تەنیا ماڵی پیرێژنەکە بە ئاوەدانی دەمێنێتەوە.. زۆر چاکە.. فرسەتە.." هەر بەدەم بیرکردنەوەوە لە زەنگی ماڵی پیرێژنی دا، دەنگی زەنگەکە کز بوو، وەک ئەوەی لە تەنەکە دروست کرابێت نەک لە مس، زەنگی ئاپارتمانە بچووکەکانی ئەم جۆرە خانووانە تا ڕادەیەک هەموویان وان. وەک ئەوەی لاوەکە دەنگی زەنگەکەی فەرامۆش کردبێت و ئێستا هەر ئەو دەنگە شتێکی کتوپڕی بەیاد هێنابێتەوە و لەبەرچاویدا بەرجەستەی کردبێت.. سڵەمییەوە. ئەمجارەیان بە تەواویی دەماری لە ژەنگوژاری دابوو. دوایێ کەمێک درزێکی چکۆڵە کەوتە دەرگاکە، خاوەن ماڵ بێمتمانەکردن لە پاڵ دەرگاکەوە تەماشای میوانە ناوەختەکەی کرد، لەو تاریکییەدا تەنیا چاوە بچووکە درەوشاوەکانی دەبینرا، وەلێ کە لە بەردەم پلیکانەکاندا کۆمەڵێک خەڵکی زۆری بینی، غیرەت گرتی و دەرگای بە تەواوی کردەوە. لاوەکە بەردەمی دەرگاکەی بڕی و پێی نایە ناو ئەو ژوورە تاریکەوە، کە پەردەیەک جیای کردۆتەوە و ئەودیوی موبەقە. پیرێژن بێدەنگ وەستابوو، بە نیگایەکی پرسیارئامێزەوە لێی دەڕوانی.

ژنێکی لاوازی وشکەڵاتوو، تەمەن شەست ساڵ، چاوی تیژ و شەڕانی، لووتی باریک و بچووک و قژی پاکژ و ناڕێک بوو، پرچی سپی و چاک ڕۆن کرابوو. شاڵێکی بە دەوری ملە بەرزو باریکەکەیدا کە لە قاچی مریشکی دەکرد، ئاڵاندبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە دنیا گەرم

بوو، کەوڵێکی دابووە بە سەرشانیدا کە لە کۆنیدا زەرد هەڵگەڕابوو.
پیرێژن بەردەوام دەکۆکی و دەیناڵاند، پێدەچوو لاوەکە تەماشایەکی سەیری پیرێژنەکەی کردبێت، چونکە لەناکاوێکدا دیسان چاوی پڕ بووەوە لە گومان و بێمتمانەیی.
لاوەکە کە ئەوەی بەیاد هاتەوە دەبێت لەگەڵیدا میهرەبان بێت، بۆی نوشتایەوەو بەپەلە پێی وت:
- بەندە ڕاسکۆلنیکۆڤم[1]، قوتابیم، مانگێک لەمەوبەر هاتمە لات.
پیرێژن کە نیگای پرسیار ئامێزی لە ڕووی لاوەکە نەدەکردەوە، بە نقەنق پێی وت:
- لە بیرمە، بەڕێز، هاتنەکەتم باش ل یادە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ کە کەمێک لە نادڵنیاییەکەی پیرێژن دڵگران و هەراسان بوو، لەسەر قسەکانی ڕۆشت:
- بەڵێ.. ئێستایش هەر بۆ هەمان کار..
هەستێکی ناخۆشی تێگەڕا و بیری کردەوە: "ڕەنگە هەمیشە وا بێت و جاری پێشوو من هەستم پێی نەکردبێت".
پیرێژن بێدەنگ بوو، وەک بیر بکاتەوە وا بوو، پاشان خۆی لادا و ئاماژەی بۆ لای دەرگاکە کرد، میوانەکەی دایە پێش و وتی:
- فەرموو بەڕێز.
کوڕەکە چووە ناو ژوورێکی چکۆڵەوە، کە دیوارەکانی بە پەڕە کاغەزی زەرد داپۆشرابوون، پەردەی سەر پەنجەرەکان ناسک و لە بەردەمیشیاندا گوڵدان دانرابوو. هێشتا ژوورەکە بە تیشکی خۆری دەم کەل تەواو ڕووناک بوو "تۆ بڵێی لەو کاتەدا خۆر هەر ئاوا

---

[1] *Raskolnikof*

بدرەوشێتەوە!" بەم بیرۆکەیەوە کە کتوپڕ بە زەینی ڕاسکۆلنیکۆڤدا تێپەڕی، تەماشایەکی خێرای هەموو شتی ناو ژوورەکەی کرد، تا چەند بکرێت زیاتر لە باری ژوورەکە بزانێت و لەبیری نەکات، وەلێ ژوورەکە شتی تایبەتمەند و سەرنجڕاکێشی تیا نەبوو، هەموو مۆبیلیاتی ناو ژوورەکە کە زۆر کۆن و لە داری زەرد دروست کرابوون، بریتی بوو لە قەنەفەیەکی پشتداری گەورە و کووڕ، مێزێکی شێوە هێلکەیی کە لە بەردەم قەنەفەکە دانرابوو، مێزتەوالێتێکی ئاوێنەدار، کە کەوتبووە نێوان دوو پایەی ژوورەکەوە، چەند کورسییەک لە پاڵ دیواردا و دوو سێ تابلۆی هەرزانبەها بریتی بوون لە کچانێکی ئەڵمانی کە باڵندەیان لەسەر دەستە و لە چوارچێوەیەکی زەردهەڵگەڕاودا بە دیوارەکەوە هەڵواسراون. هەموو کەلوپەلەکان بریتیبوون لەمانە، لە سووچێکدا، بەرانبەر پەیکەرە چکۆڵەیەکی پیرۆز، مۆمدانێک دەسووتا، هەموو شتێک زۆر پاکژ دەهاتە بەرچاو، زەویی ژوورەکە و شتومەکەکانی ناوی هێند چەور کرابوون، دەبریقانەوە.
لاوەکە ئەوەی بە بیرداهات کە ئەمە کاری لیزاڤێتایە[١]، لە تەواوی ماڵەکەدا تۆز و خۆڵ بەدی نەدەکرا، ڕاسکۆلنیکۆڤ کەوتەوە بیرکردنەوە: "تەنیا لای پیرە کچانی شەڕانی و بەدکار ئەم جۆرە پاکوخاوێنییە دەبینرێت". ڕاسکۆلنیکۆڤ دزەچاوی خستە سەر ئەو پەردە قوماشەی بەرانبەر بە دەرگای ژوورێکی بچووکی دی دادرابووەوە، ئەو ژوورە قەرەوێڵەی نووستن و دۆڵابی پیرێژنەکەی تیا بوو، کە ئەم تا ئەو کاتە هەرگیز نەیدیبوون، هەموو ئاپارتمانەکە بریتی بوو لەم دوو ژوورە.

---
[١] *Elizabet*

که پیرێژن چووە ژوورێ، وەک پێشوو بەرانبەر بە لاوەکە وەستا تا چاک لێی بڕوانێت، دڵکارانە لێی پرسی:

- چیت دەوێت؟

- بارمتەیەکم هێناوە، ئەمەیە..

ئەمەی وت و سەعاتێکی تەخت زیوینی لە گیرفانی دەرهێنا، که وێنەیەکی گۆی زەوی بە پشتەکەیەوە بوو، زنجیری سەعاتەکە پۆڵا بوو.

- ماوەی بارمتەکەی پێشوویشت تەواو بووە، سێ ڕۆژ بەسەر مانگەکەدا تێپەڕیووە.

- قازانجی مانگێکی ترت ئەدەمێ، سەبرم لێبگرە.

- ئەوەیان پەیوەندی بە منەوە هەیە بەڕێز، ئەتوانم بیهێڵمەوە یان بیفرۆشم.

-ئەلینا ئیڤانۆڤنا[1] بۆ ئەم سەعاتە زۆرم دەدەیتێ؟

- جەناب، تۆ هەمیشە لەو شتە ناچیزانەم بۆ دێنی، کە چ نرخێکی نییە.. جاری پێشوو دوو ڕۆبڵم لە بارمتەی ئەنگوستیلە گچکەکەتدا دایتێ، لە کاتێکدا هەموو کەسێک دەتوانێت لای زەرەنگەر ئەنگوستیلەیەکی تازەی لەو جۆرە بە ڕۆبڵ و نیوێک بکڕێت.

- باشە، چوار ڕۆبڵم بدەرێ، ئەویان لە بارمتەیی دەردێنم، سەعاتەکە لە باوکمەوە بۆم بەجێماوە، بەم زووانە پارەم پێدەگات.

- گەر پێت خۆشە، ڕۆبڵونیوێکت دەدەمێ و سوودەکەیشی لە پێشەوە وەردەگرم.

لاوەکە هاواری لێ هەستا:

---

[1] Alina Ivanovna

- ڕۆبلۆنیوێک!
پیرێژن سەعاتەکەی بۆ درێژ کرد و وتی:
-مەیل، مەیلی خۆتە.
لاوەکە سەعاتەکەی لێ وەرگرت و ئەمەندە ڕق گرتی ویستی بڕوات، وەلێ زوو هاتەوە سەرخۆی، بیری کەوتەوە کە شوێنی تر نازانێت و لەم هاتنەیشیدا مەبەستێکی تری هەیە. بە ڕقەوە وتی:
- بمدەرێ.
پیرێژن دەستی بە گیرفانیدا کرد و کلیلەکەی دەرهێنا، لە پشت پەردەکەوە چووە ژوورەکەی دی. لاوەکە کە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بە تەنیا مابووەوە بۆ سووسەکردن، گوێقولاغ بوو، بیری کردەوە، گوێی لە دەنگی کردنەوەی دولابەکە بوو، بە خۆی وت: "بێگومان چەکمەجەی سەرەوەیە.. دیارە کلیلەکەیش دەخاتە گیرفانی لای ڕاستییەوە.. هەموو کلیلەکان بە ئەڵقەیەکی پۆلاوەن، کلیلێکیان لە هەموویان گەورەترە.. سێ قات لەوان گەورەترە و ددانەدارە، هەڵبەتە ئەوەیان کلیلی دۆلابەکە نییە.. کەواتە چەکمەجەیەکی دی یان سنوقێکی چکۆڵەی تر هەیە، ئەمە گرنگە کە هەموو داخراوەکان لەو کلیلەیان هەیە.. بەڵام بە ڕاستی هەموو ئەم کارانە قێزەونن!"
پیرێژن گەڕایەوە و وتی:
- فەرموو جەناب، ئەگەر هەر ڕۆبڵێک لە مانگێکدا دە کوپیک[١] سوود بێنێت، لە مانگێکدا بۆ ڕۆبلۆنیوێک دەکاتە پانزە کوپیک. بەو پێیە لە دوو ڕۆبڵەکەی پێشوویش بیست کوپیک دادەشکێت. هەمووی دەکاتە

---

[١] *kopeyka* بچووکترین دراوی ڕووسییە و یەکسانە بە فلسێک.

سیوپێنج کوپیک، کەواتە بۆ سەعاتەکەتان ڕۆبڵێک و پانزە کوپیکتان بەردەکەوێت، فەرموو، بیگرە.
- چۆن.. یەعنی تەنیا ڕۆبڵێک و پانزە کوبیک!
- بەڵێ، وایە.
لاوەکە بەبێ چەندوچوون پارەکەی وەرگرت، لە پیرێژنەکە ڕاما و پەلەی ڕۆیشتنی نەکرد، وەک بیەوێت شتێکی تر بڵێت یان کارێک بکات، وەلێ لەوە دەچوو خۆیشی نەزانێت چی بکات..
- ئەلێنا ئیڤانۆڤنا، ڕەنگە ڕۆژانی داهاتوو شتێکی باشتر بهێنم.. تەپڵەکێکی جگەرەی زیوین.. هەر کە لە هاوڕێکەمم سەندەوە، بۆتی دێنم..
پاشان بە جاڕزی بێدەنگ بوو.
- چاکە ئازیز گیان، کە هێنات قسەی لێدەکەین.
ڕاسکۆلنیکۆڤ چووە ڕاڕەوەکە، ئەوەندەی پێی کرا، بێدەربەستانە وتی:
- خوات لەگەڵ.. تۆ هەمیشە لێرەدا بە تەنیایت؟ ئەی خوشکەکەت؟
- چ کارێکت پێی هەیە، بەڕێز؟
- نا، هیچ، هەروا پرسیم، تۆ ئێستا.. خوات لەگەڵ ئەلێنا ئیڤانۆڤنا.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە جاڕزییەکی زۆرەوە چووە دەرێ، تا دەهات وەڕزییەکەی زیاتر دەبوو. کە لە پلیکانەکان هاتە خوارێ، وەک سەری لە شتێک سوورمابێت، چەند جارێک وەستا، پاشان هەر کە هەنگاوی نایە سەر شەقامەکە، بە دەنگی بەرز وتی:
- خودایا، گشت ئەم کارانە چەندە قێزەونن.. ئایا دەکرێت.. دەکرێت.. کە من..
پاشان بە دڵنیاییەوە لەسەری ڕۆشت:

- نا، ئەمە کارێکی خراپ و گەوجانەیە! تۆ بڵێی بیرێکی وا ترسناک پەیی بە مێشکم بردبێت؟ بە ڕاست دڵی من هێند پۆخڵی هەڵدەگرێت! بەڵێ، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە، کە ئەمە کارێکی قێزەون و دزێوە، بەڵێ دزێوە.. منیش هەموو ئەم مانگە..
وەلێ نەبە وشە و نە بە دەنگ نەیتوانی هەموو بێزارییەکەی خۆی دەرببڕێت. ئەو وەڕزی و پەستییە بێکۆتاییەی کە لە کاتی ڕۆیشتنیدا بۆ لای پیرەژنەکە سەرودڵی گرت، ئەوەندەی تین بۆ هێنابوو، نەیدەزانی چۆن خۆی لەو دڵتەنگییە ڕزگار بکات. لەسەر شۆستەکە وەک سەرخۆش هەنگاوی دەنا، بەبێ ئەوەی ئاگادار بێت، خۆی بە ڕێبوارەکاندا دەکێشا. تەنیا لە شەقامەکەی دواتردا هاتەوە سەرخۆی، کە سەیری دەوروبەری خۆی کرد، زانیی لە پاڵ مەیخانەیەکدایە، پلیکانەیەک لە شۆستەکەوە دەچووە ناو مەیخانەکە، واتا قاتێکی ژێر زەوی. هەر لەوێدا دوو سەرخۆش کە پاڵیان دابووە یەک و جوێنیان دەدا، لەو پلیکانانەوە هاتنە سەر شەقامەکە. ڕاسکۆلنیکۆڤ زۆری بیر لێنەکردەوە و لە پلیکانەکانەوە چووە خوارێ. تا ئەو ساتە هەرگیز سەری بە مەیخانەیەکدا نەکردبوو، وەلێ وا ئێستا سەری گێژ دەخوات و تینویەتی بەتەنگی هێناوە، حەزی لە نۆشینی بیرەیەک بوو، بەتایبەتی کە هۆی ئەم بێهێزیە کتوپڕەی خۆی بە برسیەتی دەزانی.
لە سووچێکی تاریک و چەپەڵدا، لە پشت مێزێکی بچووکەوە دانیشت، داوای بیرەی کرد و یەکەمین پەرداخی بە تاسەوە هەڵدا، دڵی هاتەوە سەرخۆی و بیریشی هەندێک ڕووناک بووەوە، ئومێدی دایە خۆ و وتی: "ئەمانە هیچ نین، پێویست ناکات خۆتیان بۆ ناڕەحەت بکەیت، تەنیا لەشداهێزانە، پەرداخێک بیرە و پارچەیەک پسکیت بەسە بۆ ئەوەی یەکسەر عەقڵت کۆک و بیرت ڕوون و ویستت پایەداربێت! ئاە.

هەموو ئەمانە چەندە ڕسوان!" وەلێ لەگەڵ ئەم وتە نەفرەتییانەیشدا، وەک لەپڕا لە بارێکی گران و ترسناک ڕزگاری بووبێت، ڕووی کرایەوە و تەماشایەکی دۆستانەی ئەو کەسانەی کرد، کە لە دەوروبەریدا بوون، بەڵام تەنانەت لەم کاتەیشدا بە جۆرێکی نادیار هەستی بەوە کرد کە ئەم حاڵەتەی ئێستایشی جۆرە نەخۆشییەکە بۆ خۆی.

لەو ساتەدا خەڵکێکی کەم لە مەیخانەکەدا مابوون، بێجگە لەو دووانەی لەسەر پلیکانەکان پێیان گەیشت، کۆمەڵێکی پێنج کەسیی تریش بە ئوکۆردیۆن و لەگەڵ کچێکدا چوونە دەرێ، دوای ئەوان مەیخانەکە هێور و ئاسوودەتر بوو. بێجگە لە پیاوێکی مەست، کە هێشتا تەواو سەرخۆش نەبووبوو، بیرەیەکی لە بەردەمدا و لە فرۆشیاری ناوبازاڕ دەچوو، هاوڕێکەیشی زۆر بە خۆوە و قەڵەو و تەواو سەرخۆش بوو، ڕیشی سپی و چاکەتێکی ئەستووری لەبەردا و لەسەر کورسییەکەی وەنەوزی دەدا، جارەناجارێک، وەک لە دنیای خەونیدا چەقەوانەی بێتێ، لەپڕا هەردوو باڵی دەکێشایەوە و بەبێ ئەوەی لە شوێنەکەی هەڵسێت، لەشی بەرەو ژوور ڕادەنا و لەژێر لێوەوە شتێکی بێمانای دەوت، دەیویست ئەو شیعرانەی بیر بکەوێتەوە، کە لەم بابەتە بوون:

"ساڵێکی تەواو ژنەکەمم لاواند

ساڵێکی تەواو ژنەکەمم لا.. واند"

یان لەپڕا بە ئاگا دەهاتەوە و دەیوت: "بە پادیاچیسکدا[1] تێدەپەڕیم، دۆستە دێرینەکەمم دۆزییەوە".

---

[1] *Padyachesk* ناوی شوێنێکە.

بەڵام هیچ کەسێک هاوبەشی خۆشییەکەی نەبوو، تەنانەت هاوڕێ بێدەنگەکەی بە ڕق و بێزارییەوە لە هەموو ئەو جموجووڵە کتوپڕانەی دەڕوانی. یەکێکی تریشی لێبوو، پێدەچوو کارمەندێکی خانەنشین بێت، بە شێوازێکی تایبەتمەندانە لە بەردەم پێکەکەیدا دانیشتبوو بە دەگمەن قومێکی لێدەدا و تەماشای ئەملاوئەولای دەکرد. دەتوت ئەویش نیگەران و شپرزەیە.

٢

ڕاسکۆلنیکۆڤ حەزی بە تێکەڵبوونی خەڵک نەدەکرد، وەک پێشتریش وتمان، بەتایبەت لەم دووایییەدا خۆی لەو تێکەڵییە دەدزییەوە. بەڵام ئێستا لە خۆوە شتێک بەرەو لای خەڵکیی بەکێشی دەکرد، وەک ئەوەی گۆڕانێکی تازەی تیا ڕوودابێت و لەو نێوانەدا حەزی بەرەو لای خەڵک چوونی تیا زۆر بووبێت. ئەمەندە لەو مانگەدا دڵتەنگییەکی زۆر و بێزارییەکی پڕ لە خەمی چەشتبوو، دەیویست هەر چۆنێک بێت، لە دنیایەکی تردا – هەر دنیایەک بێت- هەناسەیەکی تازە هەڵکێشێت. بۆیە چەندە مەیخانەکە پیسوپۆخڵ بوو، بە ئارەزوویەکی تەواو پڕەوە تیا دانیشت. مەیخانەچییەکە لە ژوورێکی تر بوو، وەلێ زۆرجار لە شوێنێکی نادیارەوە بە پلیکانەکاندا بۆ هۆڵەکە دەهاتە خوارێ، پێش ئەوەی خۆی دەربکەوێت، جزمە بریقەدار و گەورە و سوورەکانی دەردەکەوتن. پاڵتۆیەکی درێژ و هێلەکێکی ئاوریشمینی ڕەشی زۆر ئەستوور و پیسی لەبەر دەکرد و بۆینباخی نەدەبەست. دەتوت وەک قفڵێکی ئاسن دەموچاویان بە زەیت چەور کردووە. لە پشت پێشخوانەکەوە منداڵێکی چواردە ساڵە وەستابوو، لە پاڵیا کوڕێژگەیەکی لەو منداڵتر بوو، ئەگەر مشتەری شتێکی بویستایە،

دەیدانێ. لەسەر پێشخوانەکە خەیارە چەمیلە و پسکیتی ڕەش و ماسی پارچەپارچەکراو دەبینران، بۆنێکی ناخۆش لە هەموویان دەهات. هەواکەی هێند خەفەکەر بوو، بەرگەی دانیشتنت نەدەگرت، شتەکانیش ئەوەندەیان بۆنی مەی گرتبوو، دەتوت هەر بەو هەوایە بە پێنج دەقیقە مەست دەبیت.

هەندێکجار، تەنانەت لە نێوان چەند کەسێکی تەواو نەناسراودا، ڕێکەوتێکی وا دێتە پێشێ، کە پێش ئەوەی وشەیەک بدرکێنن، هەر بە یەکەم نیگا، هەستی لێکترنزیکبوونەوە دەکەن. وا ئێستا ڕاسکۆلنیکۆڤیش لە بینینی ئەو مشتەرییەی دوور لەمەوە دانیشتبوو و لە کارمەندێکی خانەنشینی دەکرد، ئەو هەستە بۆ دروست ببوو.

لاوەکە لەوەودوا زۆرجار ئەو یەکەمین کاریگەرییەی وەبیر خۆی دێنایەوە، بە جۆرێک لە سرووش یان هەستی دەروونیی دەدایە قەڵەم. تەواو چاوی لە کارمەندەکە بڕیبوو، لەبەر ئەوەی کارمەندەکەیش بە قووڵی لەمی دەڕوانی، دیار بوو دەیەوێت دەرگای قسەی لەگەڵدا بکاتەوە. ئەوانەیش کە لە مەیخانەکەدا بوون، تەنانەت خودی مەیخانەچییەکەیش، کارمەندەکە بە چاوی ئاسایی و تا ڕادەیەک سەرزەنشتکەرانە تەماشای دەکردن. ڕوانینەکەی تێکەڵ بوو لە بایەخپێنەدانێکی بێباکانە، وەک بڵێی ئەوان لە چینی خوارەوەی کۆمەڵدان و ئەم قسەیەکی پێنییە لەگەڵیاندا بیکات. وا دەرئەکەوت تەمەنی پیاوەکە لە پەنجا ساڵ زیاتر بێت، باڵای مامناوەند و تا ڕادەیەک لەشی بەخۆوە بوو. قژی ماشوبرنجی و زۆرێک لە سەری ڕووتابووەوە. دەموچاوی بە هۆی مەستییە بەردەوامەکەیەوە ئاوساو و زەرد و تەنانەت بە لای سەوزیدا دەیڕوانی، پێڵووی پفدراو و لەژێریدا چاوە چکۆڵە و سوور و بێحاڵەکانی وەک دوو کونی ورد

دەدرەوشانەوە. لەو دەموچاوەدا شتێکی نائاسایی بەدەردەکەوت: لە ڕوانینیدا جۆرێک لە ڕاکێشان و تەنانەت هزر و زیرەکیان تیا دەبینرا، لەگەڵ ئەمانەدا هەندێک ئاسەواری شێتیشیان تیابوو. جلەکانی بەری بریتی بوو لە "فراک"کێکی ڕەش، کە هەمووی دڕاو و قۆپچەکانی کەوتبوون. تەنیا قۆپچەیەکی مابووەوە، کە جلەکانی پێ دادەخست و دەیویست ئەوە دەربخات، کە مرۆڤێکی بەئەدەبە. کراسە ڕەقهەڵاتوە پیسووچڵکن و لەکەدارەکەی لەژێر هێلەکە دەزووەکەیەوە هاتبووە دەرێ. شێوەی دەموچاوی لە مووچەخۆری دەکرد، بەڵام چونکە ماوەیەک بوو ڕیشی نەتاشیبوو، مووە سپی و زبرەکانی کە لە مووی شاڵ دەچوون، بە دەموچاویەوە دەرکەوتبوون. ڕەفتارە بەویقارەکەیشی هەر لە هەڵسوکەوتی کارمەندی دەکرد. بەڵام بێئارام دەینواند، قژی سەری گڤ و هەندێکجاریش غەمگینانە سەری لە نێو هەردوو دەستی دەنا، ئانیشکی کە لە قۆڵە دڕاوەکەیەوە هاتبوونە دەرێ، لەسەر مێزە چەسپ و بەبادەخووساوەکە دادەنا. پاشان ڕاست چاوی لە نێو چاوی ڕاسکۆلنیکۆڤ بڕی، بە دەنگی بەرز و پتەو پێی وت:

- گەورەی ئازیز، ئایا دەتوانم بەڕێزەوە ڕووی قسەت تێبکەم؟ هەرچەند دیمەنەکەت زۆر ئاساییە، بەڵام بەپێی ئەزموونی خۆم دەزانم تۆ مرۆڤێکی باش پەروەردەکراویت و زۆریش لەگەڵ خواردنەوەدا سەروساختت نییە، من هەمیشە ڕێز لەو پەروەردەیە دەگرم، کە لە دڵەوە هەستی تیایە، بێجگە لەمە، من کارمەندی دەوڵەت بووم و ناوبانگم مارمیلادۆڤای[١] ڕاوێژکارە.. دەتوانم بپرسم کە جەنابیشت هەر کارمەندی دەوڵەت بوویت؟

---

[١] *marmaladof*

لاوەکە لەو قسە بە پێچوپەناو لەو پرسیارە ڕوون و بێدەربەستانەیە سەری سوڕما و وای وەڵام دایەوە:
- نەخێر.. خوێندکارم.
هەرچەندە کەمێک پێشتر حەزی بە هاودەمیی کەسێک بوو، کەچی ئێستا لەگەڵ یەکەمین ڕستەدا کە پیاوەکە وتی، لەناکاوێکدا هەمان هەستی ناخۆش و ڕک و نەفرەتییەکەی تێگەڕایەوە، کە ئاسایی لە نزیککەوتنەوەی هەر کەسێکی نەناسراو یان لە سەروبەندی یەکدیناسیندا هەستی پێدەکرد.
کارمەندەکە بە دەنگی بەرز وتی:
- کەواتە تۆ یان خوێندکاریت یان پێشتر خوێندکاربوویت.. منیش هەروام بیر لێدەکردەوە، ئەمە ئەزموونە، گەورەی ئازیز، ئەزموونێکی بەردەوام.
وەک دەستخۆشی لە زرنگیی خۆی بکات، دەستی نایە سەر تەوێڵی.
- خوێندکار بوویت، یان تەنیا ڕشتەیەکی زانستیت دەخوێند! یارمەتی هەیە؟
لەسەر جێگاکەی هەستا، لارەلارەی بوو، قاپی مەزە و پەرداخەکەی هەڵگرت و کەمێک لەولای کوڕەکەوە دانیشت، مەست بوو، بەڵام زۆر ئاقڵانە و بەکاوەخۆ دەدوا. تەنیا هەندێکجار قسەی لێدەشێوا و زۆربلێی دەکرد.
بە تاسەیەکی زۆرەوە ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد، دەتوت مانگێکە قسەی لەگەڵ کەسدا نەکردووە، بە دەنگێکی تا ڕادەیەک خۆنمایشکارانەوە وتی:
- گەورە و ئازیز، هەژاری تاوان نییە و ئەمە هەقیقەتێکی سەلماوە. ئەوەیش دەزانم سەرخۆشییش کارێکی چاک نییە. بەڵێ، ئەمەیش باش

دەزانم، بەڵام داماوی بەڕێزەکەم، داماوی شوورەییە، تۆ ئەگەر پارەیشت نەبێت، دەتوانیت نامووس و هەستی ڕەسەنی خۆت بپارێزیت. بەڵام کە داماو بوویت، هەرگیز کاری وات پێناکرێت، لە ناو کۆبوونەوەدا مرۆڤی داماو بە دار دەرناکەن، بەڵکو بۆ زیاتر سووکایەتیپێکردنی بە گسک دەریدەپەڕێنن و هەقیشیانە، چونکە داماو بوویت، پێش هەر کەسێک تۆ خۆت سووکایەتیت بە خۆت کردووە.. مەیخواردنەوەیش لەوێوە سەرچاوە دەگرێت. گەورەی ئازیز، مانگێک پێش ئێستا جەنابی لیبێزیاتینکۆف[1] تێر لە ژنەکەمی دا، بەڵام ژنەکەم لەگەڵ مندا جیاوازە، تێدەگەیت؟ مۆڵەتم بدە هەر وەک خۆ تێهەڵقورتاندن پرسیارێکت لێبکەم: ئایا لە بەلەمێکدا کە تەرخان کرابێت بۆ کاکێشان لەسەر ڕووباری "نیڤا"[2]، هەرگیز شەوت ڕۆژ کردۆتەوە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی دایەوە:

- نا، تووشی شتی وانەبووم، وەلێ چیت مەبەستە؟

- باشە، بەڵام من لەوێوە هاتووم و پێنج شەویشە کە..

لەو ساتەدا کارمەندەکە پێکەکەی پڕ کرد و بەسەریەوە نا و خەیاڵ بردیەوە، لە ڕاستیشدا پەڕەکا بە جلوبەرگ و قژییەوە بوو. زۆر پێدەچوو پێنج ڕۆژی ڕێک بێت جلی دانەکەندبێت و دەست و دەموچاوی نەشتبێت، بەتایبەتی دەستی پیس و چەور و سوور و نینۆکی ڕەش داگەڕابوو.

---

[1] *lebezyatnikof*

[2] *neva*

لەوە دەچوو قسەکانی سەرنجی هەموویانی -تا ڕادەیەک- ڕاکێشابێت. ئەو کوڕانەی لە پشت پێشخوانەکەوە وەستابوون، کرکەکرکی پێکەنینیان بوو. مەیخانەچییەکە وەک بە ئانقەست هاتبێت، لە ژووری سەرەوەوە هاتبووە خوارێ تا گوێ لە قسە بە "تام"ەکان بگرێت، هەرچەندە بە تەمەڵییەکی ویقارئامێزەوە باوێشکی دەدا، لە سووچێکدا دانیشت. وا دیار بوو ئەوان لە دەمێکەوە مارمیلادۆڤایان لەوێدا ناسیبوو، ڕەنگە ئەو جۆرە گفتوگۆیانەی لەبەر ئەوە پێخۆش بێت، چونکە بەردەوام لە مەیخانەدا و لەگەڵ نەناسەکاندا بەو قسانە ڕاهاتبوو. ئەم نەریتی قسەکردنە لای هەندێک مەیخۆر، بە تایبەتی لای ئەوانەیان کە لە ماڵی خۆیاندا ڕوویان نادەنێ و مامەڵەی ناخۆشیان لەگەڵدا دەکەن، دەبێتە پێویستی، بۆیە لە دانیشتنی مەینۆشاندا ئەم جۆرە کەسانە هەمیشە هەوڵی ئەوەیانە هەق بەخۆ بدەن و چەندیش بتوانن ڕێز بەدەست بێنن.

مەیخانەچییەکە بە دەنگی بەرز وتی:

-قەشمەر! ئەی بۆ کار ناکەیت؟ ئەگەر کارمەندی، بۆ ناچیتە سەرکارەکەت؟

مارمیلادۆڤا چۆن ڕووی دەمی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ بوو، هەروەک ئەویش پرسیارەکەی لێکردبێت پێی وت:

- بۆ کار ناکەم، گەورەی بەڕێز، بۆ کار ناکەم؟ بۆ دڵم ناسوتێ کە ئەوەندە بێهودە خۆم کەساس و بچووک دەبینم؟ بۆ مانگێک لەمەوبەر کە جەنابی لێبێزیاتینکۆف لە ژنەکەی دام و منیش بە سەرخۆشی کەوتبووم، ئازارم پێنەدەگەشت؟ ڕێگەم بدە، کوڕی ڕەند، ئایا تۆ ئەوەت پێش هاتووە کە.. هوم.. کە بەبێ ئەوەی هیچ ئومێدێکت هەبێت، داوای قەرز بکەیت؟

- دەشێت.. بەڵام مەبەستتان لە بێئومێدی چییە؟
- یەعنی هەر تەواو نائومێد، پێشتر لەوە دڵنیایت کە هیچ ئەنجامێکت لەم کارە بۆ بەدەست نایەت. با بڵێین تۆ لەوەوپێش و بە چاکی ئەوە دەزانیت، کە ئەو کەسە، ئەو پیاوەی بێکۆتایی خۆشباوەڕ و سوودبەخشە، بە هیچ جۆرێک پارەت ناداتێ.. چونکە، دەمەوێت بپرسم، ئاخر بۆ بتداتێ؟ ئەو دەزانێت من قەرزەکەی نادەمەوە، ئەی بەزەیی پیامدا بێتەوە؟
بەڵام جەنابی لیبزیاتینکۆف کە ئاگاداری بیری تازەیە، ماوەیەک لەمەوبەر ئەوەی ڕوون دەکردەوە کە لەم سەردەمەی ئێمەدا بەزەیی پیاداهاتنەوە تەنانەت لە باری زانستیشەوە قەدەغەیە، لە ئینگلستان کە زانستی ئابووری باڵادەستە، ماوەیەکە پەیڕەویی لەم تیورە دەکرێت.. باشە کەواتە من لە تۆ دەپرسم ئاخر بۆ پارە بدات؟ لەگەڵ ئەوەیشدا کە تۆ پێشتر ئەوە ئەزانیت هیچت ناداتێ. کەچی هەر دەچێتە لای و..
- جا بۆ دەچیتە لای؟
- چونکە کەسی تر نییە، ناتوانیت ڕوو لە شوێنێکی دی بکەیت، ئاخر هەر کەسێک دەبێت جێگایەکی هەبێت پەنای بۆ بەرێت، چونکە پێشهاتی وات دێتە ڕێ، کە پێویستە مرۆڤ بتوانێت بۆ جێگایەک، هەر جێگایەک بێت.. بڕوات.. کچەکەی من ژیانی خۆی لەگەڵ بلیتی زەردا[1] بەسەر دەبات (مارمیلادۆڤا ئەم قسانەی بە زەبوونییەوە دەکرد و چاوی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ بڕیبوو) هیچ نییە..
کە دوو مێردمناڵەکەی لە پشت مێزەکەوە بینی پێی پێدەکەنن و خاوەنی مەیخانەکەیش زەردەی دێتێ، بەپەلە، بەڵام لەسەرخۆ وتی:

---

[1] بلیتی زەرد جۆرێک لە بەڵگەنامە بوو دەدرایە ژنە لەشفرۆشەکان.

- هیچ نییە، گەورەی ئازیز، هیچ نییە، من بەو سەرڕاوەشاندنانە قەڵس نابم، چونکە ئیدی خەڵکی هەموو شتێک دەزانن و.. هەموو نهێنییەکانیش دەردەکەون و.. من لەم مەسەلەیەشدا هەست بە بێزاری ناکەم، بەڵکو پێی قایلم. باشە، با وابێت. مرۆڤ وایە، ڕێگەم بدە، کوڕی باش، ئایا دەتوانیت.. بەڵام دەبێت چاکتر و ڕوونتری بڵێم: ناڵێم دەتوانیت، دەبێت بڵێم دەوێریت ئێستا کە تەماشام دەکەیت، بە ڕاستی پێم بڵێیت کە من بەراز نیم؟

لاوەکە وەڵامی نەدایەوە.

کابرای قسەکەر دوای ئەوەی بە هەموو ویقارێکییەوە چاوەڕێی کرد تا دەنگی حیلکەحیلکەکە لە ژوورەکە بڕا، لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

-باشە.. باشە.. با بڵێین من بەرازم.. بەڵام ئەو خانمە، من لە ئاژەڵ دەچم، وەلێ کاترینا ئیڤانۆڤنا[1]ی هاوسەرم کەسایەتییەکی ڕووناکبیرە و کچی سەرهەنگە، وا من کەسێکی نابووتم، خۆ ژنەکەم هەم گیانێکی بەرزی هەیە و هەم هەستێکی پڕ، ئەمانەی بەرئەنجامی پەروەردەی خانەدانیەتییە و لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا.. خۆزگا ئەو دڵی بە من بسووتایە، گەورە و ئازیز، بەڕێز گیان، ئاخر پێویستە هەر مرۆڤێک لایەنی کەم کەسێکی هەبێت دڵی بۆی بسووتێت، کاترینا ئیڤانۆڤنا هەرچەندە ژنێکی چاکە، بەڵام بێویژدانە.. ئەگەرچی من خۆم لەوە گەیشتووم کە ئەگەر قژیشم لەبن هەڵکێشێت، لە ڕووی دڵسۆزییەوەیە.

لەبەر ئەوەی جارێکی تر گوێی لە پێکەنین بوو، زۆر بە ڕێز و سەنگینییەوە وتییەوە:

---

[1] *Katerina ivanovna*

- بەڵێ گەورەی ئازیز، بەبێ تەریقبوونەوە ملی بۆ دەدەم، کە مووەکانم دەرکێشێت و دەیشیکات، بەڵام خوا گیان، چی دەبوو ئەگەر تاقەجارێک.. بەڵام نا، هەموو ئەمانە بێهودەن و شیاوی باسکردن نین، شیاو نین.. چونکە ئەوەی من دەمویست، زۆرجار ڕووی داوە و گەلێک کەڕەت بەزەییان پیامدا هاتۆتەوە. بەڵام.. ئیتر ئەمە لە تایبەتمەندییەکانی منە و منیش لە خۆمدا ئاژەڵێکم.
خاوەن مەیخانەکە بەدەم باوێشکدانەوە وتی:
- وایە.
مارمیلادۆڤا مشتەکۆڵەیەکی توندی بە مێزەکەدا کێشاو وتی:
- ئەمە سروشتی تایبەتی منە، دەزانیت، ئایا دەزانیت، گەورەم، من تەنانەت گۆرەوییەکانیم فرۆشت و بە پارەکەی شەرابم کڕی؟ خراپ تێنەگەیت، پێڵاوەکانیم نەفرۆشت، چونکە ئەگەر پێڵاوەکانیم بفرۆشتایە، ئەوەندە سەیر نەدەبوو، من گۆرەوییەکانی، گۆرەوییەکانی ئەوم دایە خواردنەوە، لەچکەکەی سەریشی کە لە کورکی نەرم دروست کرابوو و پێشتر بە دیاری دابوویانێ،ماڵی خۆیشی بوو، نەک ماڵی من، ئەویشم دایە خواردنەوە. بێ لەمانە ئێمە لە ژوورێکی ساردا دەژین ، لەم زستانەدا سەرمای بووە و ماوەیەکە کۆکەکەی خوێنی پێوەیە، سێ منالّی بچووکمان هەیە و کاترینا ئیڤانۆڤنا لە بەیانییەوە تا ئێوارە کار دەکات، دەشوا و دەسڕێ و منداڵەکان پاک دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی لە منداڵییەوە بە پاکژی ڕاهاتووە، وەلێ بە سنگی لاوازەوە کە ڕەنگە سیلی گرتبێت و من چاک هەست بەمە دەکەم، بۆ من بێهەستم؟ چەند زیاتر بخۆمەوە، زۆرتر هەست دەکەم، هەر لەبەر ئەمەیە دەخۆمەوە، چونکە خەم و ئازار لە خواردنەوە دەبینم.. دەخۆمەوە، چونکە دەمەوێت ئازار بچێژم.

بەدەم ئەم قسانەوە نائومێدانە سەری خۆی بەسەر مێزەکەدا شۆڕ کردەوە، پاشان دیسانەوە سەری بەرز کردەوە و کەوتەوە قسەکردن:
- کوڕی چاک، لە ڕووتدا جۆرە خەم و ڕەنجێک دەبینم، هەر کە هاتیتە ژوورەوە، هەستم پێکرد، هەر لەبەر ئەوەیش بوو زوو لەگەڵتا کەوتمە قسەکردن. مەبەستم لە باسکردنی ژیانی خۆم بۆ ئێوە بۆ ڕسواکردنی خۆم نییە لە بەردەم ئەم بێکارانەدا، بەهەرحاڵ، ئەمانە بەبێ وتنی خۆیشم لەوە ئاگادارن، من بەدوای کەسێکی هەستیار و خوێندەواردا وێڵم. ئەوە بزانە ژنەکەم لە قوتابخانەیەکی ناوچەیی گرنگی ئۆروستوکراتییەکاندا خوێندویەتی و لە ئاهەنگی دەرچوونیشیدا لە بەرانبەر پارێزگار و ئەوانی تردا سەمایەکی شالی[١] کردووە و بەو بۆنەیەوە میداڵێکی زێڕ و ڕێزنامەیەکی دراوەتێ، میداڵ.. ئیدی میداڵەکەمان فرۆشت.. ماوەیەکە.. هوم.. بەڵام ڕێزنامەکە هێشتا لە سندووقەکەیدایە. لەم ماوەیەدا پیشانی خاوەن ماڵەکەی دەدا، ئەگەرچی لە نێوان ئەو و خاوەن ماڵەکەدا هەمیشە کێشەیەکی زۆر هەیە، بەڵام لە دواییدا دەیویست لە بەردەم کەسێکدا شانازی بە خۆیەوە بکات و باس لە ڕۆژە خۆشەکانی ڕابووردووی بکات. من ئەم کارە بە سووک نازانم، نا، هیچ بە سووکی نازانم، چونکە ئەوە تاقە شتێکی یادەوەریی ڕابووردووە کە بۆی مابێتەوە، هەموو شتەکانی تری بەبا چووە. بەڵێ، بەڵێ، ژنێکە زوو خوێنی دەجۆشێت،

---

[١] سەمای شال: ماریا کونستانتی ژنی یەکەمی دوستوفیسکی شانازیی بەوەوە کردووە کە لە ئاهەنگی دەرچوونیدا لە "پەیمانگای ستراخان" سەمای شالی کردووە. "سامی الدروبی" وەرگێڕی عەرەبی. لە فارسییەکەدا دەڵێت سەمای بە شال کرد و ئێمە عەرەبییەکەمان پێ چاکتر بوو.

بە خۆی دەنازێ و سەرسەختە، خۆی ناو ژوورەکە دەشوا و بە نانی ڕەق قایلە، بەڵام ڕێ بەوە نادات کەس بێڕێزیی پێبکات، هەر لەبەر ئەوە بوو نەیویست لە شەڕئەنگێزیەکەی جەنابی لێبێزیاتینکۆف بێدەنگ بێت، بۆیە کە جەنابی لیبزیاتینکۆف لێی دا، ئەو زیاتر لە داخا لەسەر جێ کەوت، نەک لەبەر ئازاری لێدانەکە. کە من هێنام، بێوەژن بوو، سێ منداڵی هەبوو، یەک لەوی دی بچووکتر، لەگەڵ شووی یەکەمیدا کە ئەفسەری پیادە بوو، بە خۆشەویستی پێک گەیشتبوون و لە ماڵی باوکی هەڵاتبوو.. مێردەکەی زۆر خۆش ویستووە، بەڵام ئەو دەستی داوەتە قومارکردن، تا گەیشتۆتە دادگاییکردنی و مردووە. لە دواییشدا زۆری لە ژنەکەی داوە، هەرچەندە کاترینا ئیڤانۆڤنایش کەمی پێنەکردووە، من ئەمە بە بڕواو بەڵگەوە دەزانم، بەڵام تا ئێستایش کە مێردە کۆنەکەی دێتەوە یاد، فرمێسک لە چاویا قەتیس ئەمێنێت و بۆ ئەو سەرکۆنەی من دەکات، من پێم خۆشە، بەڵێ، پێم خۆشە، چونکە لە خەیاڵی خۆیدا بەختەوەرییە لەدەستچووەکەی دیسان دەبینێتەوە.. دوای مێردی پێشووی، خۆی و سێ منداڵی بچووکی لە شارۆچکەیەکی دوور و پڕ لە مەترسیدا دەژیان، منیش ئەوسا لەوێ بووم، ئەو لە کەساسییەکی هێند بێئومێدانەدا دەژیا، کە هەرچەندە من گەلێک پێشهاتی زۆر ناخۆشم دیووە، بەڵام ناتوانم وەسفی ئەوەی ئەو بکەم، هەموو خزمەکانی پشتیان لێ هەڵکردبوو، بێجگە لەوەی خۆیشی لەخۆبایی بوو، لە خۆباییبوونەکەی لەڕادەبەدەر بوو.. لەو ماوەیەدا گەورەی بەڕێز، لەو ماوەیەدا، منیش ژنەکەم مردبوو، کچێکی پانزە ساڵەم لێی هەبوو، داوام لێکرد شووم پێبکات، چونکە لە بەردەم ئەو ئازارەدا خۆم بۆ ڕاگیر نەدەکرا. ژنێکی

بەتەربیەتی ڕووناکبیر و لە خێزانێکی ناودار، ئامادە بێت ببێتە ژنم، ئیتر ئەوە خۆتان بڕیار بدەن کە دەبێت لە چ بەدبەختییەکدا بووبێت! بەڵێ، شووی پێکردم، بەدەم گریەوزارییەوە، لەتاوا دەستی هەڵدەگلۆفت. بوو بە ژنم، چونکە چ پەنایەکی تری نەبوو، تێدەگەیت جەناب، تێدەگەیت بێپەنایی مانای چی؟ نا، تۆ هێشتا تێی ناگەیت.. ساڵێکی تەواو بە دڵسۆزی و بڕواوە کاری خۆم بەجێ دەهێنا و دەستم بۆ "ئەمە" نەبرد (مارمیلادۆڤ لێرەدا ئاماژە بۆ قاپی مەیەکە دەکات) چونکە من مرۆڤێکی پڕ لە سۆزم، بەڵام بەم کارەیشەوە نەمتوانی دڵی بەدەست بێنم، لە کارەکەیشم دەرکرام بەبێ ئەوەی گوناهێکم هەبێت. تەنیا لەبەر ئەوەی دەیانویست ئاڵوگۆڕ لە کارمەندانیدا بکەن. ئیتر لەو کاتەوە دەستم پێکرد.

ساڵ و نیوێک لەمەوبەر، دوای گەلێک سەرگەردانی و بەدبەختی، لەم پایتەختە جوانەدا گیرساینەوە کە بە پەیکەری بێئەژمار ڕازاوەتەوە، لێرە کارم پەیدا کرد، پەیدام کرد و دیسان لەدەستم دایەوە، تێدەگەیت؟

ئەمجارەیان کارلەدەستدانەکەم سووچی خۆم بوو، چونکە ئیدی سروشتە ڕاستەقینەکەی خۆم زاڵ ببوو.. وا ئێستا لە سووچی ماڵێکدا دەژین، ژنەکە ناوی ئامالیا فیودوروڤنا لیپڤیگزڵە[1]، بەڵام بە چی دەژین و چۆن کرێی ژوورەکە دەدەین، نازانم.. بێجگە لە ئێمە خەڵکی تری زۆر لێیە، شارە سامناکەکەی لووتە! هوم.. بەڵێ، کچەکەیشم گەورە بوو، کچی ژنی یەکەمم، ئەم کچە داماوە تا گەورە بوو، چ بەڵایەکی لە باوەژن بینی، ئەوە باس ناکەم. چونکە ئەگەرچی کاترینا ئیڤانۆڤنا

---

[1] *Amalia Fedorovna Lippevekhzel*

لیوانلیوه له هەستی گەورەیی، بەڵام ژنێکی زۆر تووڕەیە و زوو هەڵدەچێت.. بەڵێ، وەلێ بەیادهێنانەوەی ئەو شتانە تازە چ سوودی هەیە! سۆنیا، خۆتان چۆنتان دەوێت وای وێنا بکەن. پەروەردە و خوێندنی بە خۆیەوە نەدی، چوار ساڵ لەمەوبەر ویستم خۆم جوگرافیا و مێژووی دنیای فێر بکەم، وەلێ لەبەر ئەوەی شارەزاییەکی باشم لەو زانستانەدا نەبوو، ڕابەرێکی چاکیشم هەر نەبوو، نەمتوانی. ئاخر من کۆمەڵێک کتێبم هەبوو، هوم.. ئەو کتێبانەیشم نەمابوون، بۆیە نەمتوانی هیچ فێری کچەکەم بکەم، لەسەر کۆرشی پاشای فارس وەستاین.. پاشان کە تەمەنی گەیشتە باڵقی، چەند ڕۆمانێکی خوێندەوە، تازەیش بە هۆی جەنابی لیبزیاتینکۆفەوە کتێبی ژیانزانیی "لیوییس". ئایا بەو کتێبە دەزانیت؟ بە وردی خوێندیەوە و تەنانەت هەندێکیشی بۆ باس کردین، ئەمە هەموو خوێندنەکانیەتی، ئێستا گەورەی ئازیز، بەرەو ڕووی پرسیارێکی تایبەتیت دەکەمەوە: ئاخۆ بە ڕای ئێوە کچێکی هەژار و خانەدان دەتوانێت بە ڕێگەیەکی شەرافەتمەندانە پارەیەکی زۆر پەیدا بکات؟ چەندییش خۆی بڕەتێنێت، ئەگەر شەریف بێت و بەهرەی تایبەتی نەبێت، هێشتا ڕۆژیی پانزە کوپیک پەیدا ناکات. ئەو قەمووره، ئیڤان ئیڤانۆڤیچ[1] کە نازانم ناویت بیستووە یان نا، نەک تەنیا پارەی دوورینی شەش کراسی قوماشی هۆڵەندی خۆی بە بیانووی ئەوەوە کە یەخەی کراسەکان لارن و باش نەدوراون تا ئێستا نەداوە، بەڵکو و کەوتۆتە سووکایەتیپێکردن و پێی بە زەویدا کێشاوە و تێر جوێنی کردووە و سۆنیای ڕاو ناوە. منداڵەکانیش برسییان بوو.. کاترینا

---

[1] *Ivan Ivanovich*

ئیڤانۆڤنایش لە داخ و خەفەتا دەستی هەڵدەگلۆفت و بە ناو ژوورەکەدا هەر دەهات و دەچوو، پەڵە سوورەکانی سەر ڕوومەتیشی کە هەمیشە لەگەڵ ئەو نەخۆشیەدان، دەردەکەوتن. وەک ئەوە وابوو کە بیەوێت بە سۆنیا بڵێ: "تۆی تەمەڵ لای ئێمە دەژی، دەخۆیت و دەخۆیتەوە و سەرمات نابێت" بەڵام چ خواردن و خواردنەوەیەک! جاری وا هەبوو منداڵەکان بە سێ ڕۆژ تیکەیەک نانیان نەدەبینی. من لەو کاتەدا خەوتبووم.. بڵێم چی؟ خەوێکی مەستانە، لەپڕێکدا گوێم لە سۆنیاکەم بوو (ئەو گەلێک کەساس و هێورە و دەنگێکی شەرمنانەی پێوەیە، قژی زەردە، هەمیشە ڕەنگی دەموچاوی پەڕیووە و لاوازە". دەیگوت: "باشە، کاترینا ئیڤانۆڤنا، ئایا لای تۆ ڕەوایە من کاری وا بکەم؟" با ئەوەیش بڵێم، داریا فرانسوڤنا[1] کە ئافرەتێکی بەدڕەوشت بوو و پۆلیس باشیان دەناسی، سێ جار هاتبووە لای خاوەن ماڵەکەمان و هەواڵی سۆنیای پرسی بوو. کاترینا ئیڤانۆڤنا بە تەوسەوە وەڵامی سۆنیای دایەوە و وتی:

- ئەی بۆ؟ چ سوودێکت لە پاراستنی ئەم گەنجینەیە دەست دەکەوێت؟

- بەڵام، گەورە و ئازیز، لۆمەی مەکە، نا، لۆمەی مەکە، ئەو قسانەی لە حاڵخاسیدا نەوتووە، بەڵکو لە کاتێکدا کردوونی، کە تەواو پەرێشان و نەخۆش بووە، ئەو کاتە ئەو قسانەی دەکرد، کە گوێی لە گریانی منداڵە برسییەکانی دەبوو، ئەو قسانەی بەڕاست نەبوو، بەڵکو تەنیا بە تەوسەوە دەیوتن، چونکە ئەوە خووی کاترینا ئیڤانۆڤنایە، هەر کە منداڵەکان بگرین، ئەگەر لە برسانیشا بێت، یەکسەر دەست بە لێدانیان

---

[1] *Daria Fransovna*

دەکات. ئەو کاتە لە دەوری سەعات شەشدا سۆنیای ئازیزم بینی هەستا، سەرپۆشەکەی هەڵگرت و چاکەتەکەی لەبەر کرد، لە ماڵ چووە دەرێ و سەعات نۆ گەڕایەوە، ڕاست چوو بۆ لای کاترینا ئیڤانۆڤنا و لەسەرخۆ سی ڕۆبڵی نایە بەردەستی، تەنانەت وشەیەکی نەوت، خۆزگا هیچ نەبووایە تەماشایەکیشی بکردایە، نا، پەتووە ئاوریشمە سەوزەکەمانی هەڵگرت (ئەو پەتووەی هەموومان بە کاری دێنین) سەروچاوی خۆی پێداپۆشی، ڕووی لە دیوارەکە کرد و لەسەر قەرەوێڵەکە ڕاکشا، تەنیا لەرزینی شانە چکۆڵەکانی و لەشیمان دەبینی.. من هەروەک جاران ڕاکشابووم، ئەو کاتە بینیم، لاوی بەڕێز، بینیم، بەڵێ، کاترینا ئیڤانۆڤنام بینی بەبێ ئەوەی وشەیەکی بەدەمدا بێت، چووە نزیک جێگاکەی سۆنیا گیانەوە و بە درێژایی ئەو شەوە لەبەر پێیدا چۆکی دادا، ماچی دەکرد و نەیدەویست هەستێت، پاشان هەردووکیان لە ئامێزی یەکتردا خەویان لێکەوت.. هەردووکیان.. پێکەوە.. بەڵێ.. منیش بە سەرخۆشیی لێی کەوتبووم.

مارمیلادوڤ بێدەنگ بوو، وەک دەنگی بڕا بێت، وابوو، لەپڕا و بەپەلە کەمێک بادەی لە پەرداخەکە کرد و هەڵی دا، نالاندی و دوای کەمێک بێدەنگی کەوتەوە قسە:

- لەو کاتەوە، گەورەم، لەو کاتەوە، بە هۆی ڕووداوی ناخۆش و لە ئەنجامی بوختانی خەڵکانی خراپەوە -بە تایبەتی داریا فرانسڤنا بە بیانووی ئەوەوە کە ڕێزیان لێنەگرتووە، ڕقی هەڵگرتبوو- لەو کاتەوە، سۆنیا سیمیونوڤنای کچم ناچار بوو کارتی زەرد هەڵبگرێت و ئیدی نەیدەتوانی لای ئێمە بمێنێتەوە، بێ لەمەیش ئامالیا فیودروڤنای خاوەن ماڵیشمان قایل نەبوو بە مانەوەی، هەرچەندە پێشتر خۆی هاوکاریی داریا فرانسڤنای کردبوو، هەروەها جەنابی لیبێزیاتینکۆف.. هوم..

ئەوەی لە نێوان ئەو و کاترینا ئیڤانۆڤنا ڕووی دا، لەسەر سۆنیا بوو، لە سەرەتادا دەیویست خۆی لە سۆنیا نزیک بکاتەوە، کەچی لەپڕێکا فیزی هاتێ و وتی: "چۆن دەبێت، کەسێکی وەک منی بەڕەوشت و زانا لەگەڵ ژنێکی ئاوادا لە شوێنێکدا بژیم؟" کاترینا ئیڤانۆڤنایش بەسەر سووکایەتیپێکردنەکەیەوە نەچوو.. لایەنی سۆنیای گرت.. ئیتر ئەوە ڕووی دا، کە ڕووی دا. ئێستا سۆنیا گیان زیاتر بە شەو سەرمان لێدەدات و یارمەتیی کاترینا ئیڤانۆڤنا دەدات، ئەو پارەیەی بە خوێنی دڵی دەستی دەخات، بۆ ئێمەی دێنێ.. ماڵەکەیشی لای کاپەرناومۆڤی[1] خەیاتە، ژوورێکی لێ بە کرێ گرتووە، کاپەرناومۆڤ شەلە و لاڵەپەتەیە، هەمۆو منداڵەکانی لاڵەپەتەن و ژنەکەیشی هەر لاڵەپەتەیە.. هەموویان لە ژوورێکدان، سۆنیایش ژوورێکی تایبەتی و گەنجینەیەکی بچووکی هەیە. هوم، بەڵێ، کەسانێکی کەساس و لاڵەپەتە.. بەڵێ، بەیانی ڕۆژی دوایی هەستام، جلە دڕاوەکانم لەبەر کرد، دەستم بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و چوومە لای جەنابی ئیڤان ئافاناسیڤیچ[2]، ئایا تۆ جەنابی ئیڤان ئافاناسیڤیچ دەناسیت؟ نا؟ کەواتە تۆ خەڵکانێکی ڕوولەخوا ناناسیت، مۆمێکە بەرانبەر وێنەی خودا، وەک مۆم دەتوێتەوە، دوای ئەوەی گوێی لە هەموو شتەکانم گرت، فرمێسک لە چاوی گەڕا و فەرمووی:

-باشە مارمیلادۆڤا، جارێک فریووت دام و ئەوەی چاوەڕێم لێدەکردیت، نەتکرد، جارێکی تریش بەرپرسیارت دەکەم و داتدەمەزرێنمەوە -ڕێکوڕەوان وای وت- ئەمەت لە بیر نەچێت، بڕۆ.

---

[1] *kaper naoumof*

[2] *Ivan Afanasivich*

من بە خەیاڵ خاکی بەرپێیم ماچ کرد، چونکە بە ڕاستی ئەو ڕێگەی بە کاری وا نەدەدا، لەبەر ئەوەی پیاوێکی پایەبڵند و بیری سیاسی و پەروەردەیەکی نوێی هەبوو. گەڕامەوە ماڵێ و هەر ئەوەندەی پێم وتن دیسان گەڕاومەتەوە سەر کار و مووچە وەردەگرم، خوا دەزانێت لە خۆشیا چییان کرد!

مارمیلادۆڤا دیسانەوە بە ناڕەحەتییەکی زۆرەوە قسەکانی خۆی بڕی، لەو کاتەدا کۆمەڵێک مەیخۆر، کە هەموویان تەواو مەست بوون، لە کۆڵانەکەوە هاتنە ناو مەیخانەکەوە، هەر لەبەر دەرگاوە، دەنگی ساز و ئاواز و دەنگی ناسکی منداڵێکی تەمەن حەوت ساڵە کە گۆرانیی "کۆڵیتە بچووکەکە"ی دەوت، بەرز بووەوە، مەیخانەکە بوو بە ژاوەژاو، خاوەنەکەی و کارگوزارانی بەرەوپیریان چوون، مارمیلادۆڤایش بەبێ ئەوەی گوێ بە تازەهاتووەکان بدات، لەسەر گێڕانەوەی چیرۆکەکەی خۆی بەردەوام بوو، وا دەهاتە بەرچاو کە بە تەواوی تێک چووبێت، بەڵام چەند زۆرتر سەرخۆش بوایە، ئەوەندە زیاتر قسەی دەکرد، پێدەچوو یادی کارە سەرکەوتووەکەی ماوەیەک لەمەوبەری هێنابێتیەوە سەر خۆی، بە جۆرێک، کە درەوشانەوەیەکی تایبەتی بە ڕوویەوە دەبینرا.

ڕاسکۆلنیکۆڤ باش گوێی بۆ گرتبوو.

– ئەم ڕووداوە، گەورەم، پێنج هەفتە لەمەوبەر بوو.. بەڵێ، هەر ئەوەندەی کاترینا ئیڤانۆڤنا و سۆنیا گیان پێیان زانی.. خودایا، دەتوت گوێزرامەوە بۆ ئاسمان، جاران وەک ئاژەڵ دەکەوتم و تەنیا جوێنم دەخوارد، وەلێ هەنووکە هەموویان لەسەر نووکی پەنجە دەڕۆیشتن، منداڵەکانیان هێور دەکردەوە کە "سمیون زاخارڤیچ"[1] ماندووە،

---

[1] *semyon zakharovich*

دەحەسێتەوە، وس" وای لێهاتبوو پێش چوونە سەر کار قاوەیان دەدامێ، شیریان گەرم دەکرد و سەرتوێژەکەیان دەدامێ، سەرتوێژی ڕاستیان بۆ پەیدا دەکردم، گوێت لێمە؟ چۆن توانییان یانزە ڕۆبڵ و پەنجا کوپیک کۆ بکەنەوە، نازانم؟ پێڵاو، کراس و یەخەی ناسکی زۆر باش، بەرگی فەرمی، هەموو ئەمانەیان بە یانزە ڕۆبڵ و پەنجا کوپیک بە شێوەیەکی زۆر شایستە دروست کردبوو، ڕۆژی یەکەم کە لە کار گەڕامەوە، بینیم کاترینا ئیڤانۆڤنا دوو جۆر خواردنی دروست کردووە: سوپ و خواردنێک لە گۆشتی بەراز لەگەڵ سوسێکی تایبەتی لە ڕەگی خەرتەلە، کە تا ئەو کاتە هەرگیز بیریشمان لێنەکردبووەوە، لە ڕاستیا کاترینا هەر جلی نەبوو، یەعنی هیچی نەبوو.. وەلێ لەو ڕۆژەدا، وەک بیەوێت بڕواتە میوانداری، بەرگی گۆڕی، ئەویش نەک بەرگی ئاسایی! ئەو دەتوانێت لە هیچ هەموو شتێک دروست بکات، قژی شانە کرد، یەخەیەکی پاک و چکۆڵە بۆ گەردنی و سەردەستێکی جوانیشی فەراهەم هێنابوو، بەگشتی مرۆڤێکی تر دەرچووبوو، گەنجتر و جوانتریش، سۆنیا گیانیش، کۆترە چکۆڵەکەم، تەنیا بە پارە کۆمەکی دەکردین، دەیگوت:

- تاماوەیەکی تر باش نییە من زۆر بێمە لاتان، مەگەر لە شەودا کە کەس نەمبینێت.

- گوێت لێیە؟ گوێت لێیە؟ هاتم دوای نانی نیوەڕۆ بنووم، چیت بە بیردا دێت؟ کاترینا ئیڤانۆڤنا لەوە زیاتر خۆی بۆ نەگیرا، هەرچەندە پێش هەفتەیەک لەگەڵ خاوەنماڵەکەماندا، ئامالیا فیودورڤنا بەشەڕ هاتبوو، بەڵام داوەتی قاوەخواردنەوەی کرد، دوو سەعات پێکەوە دانیشتن و بە گوێی یەکدیدا چرپاندیان کە:

- بەڵێ، وا ئێستا سمیون زاخارڤیچ لەسەر کارە و مووچە وەردەگرێت، خۆی بە شەخسی چووەتە لای بەڕێوەبەری بەڕێز و ئەویش خۆی بە پیرییەوە هاتووە و دەستووری داوە هەموو ئەوانی دی چاوەڕێ بن. بە تەنیا دەستی سمیون زاخارڤیچی بە بەرچاوی هەموانەوە گرتووە و بردوویەتە ژووری کارکردنی خۆیەوە.
(ها گوێت لێمە؟) هەروەها پێی وتووە: بێگومان سمیون زاخارڤیچ، من کارەکانی تۆ لەبیر ناکەم، هەرچەندە تۆ لە بێدەربەستیی خۆتەوە تووشی لاوازییەک دێیت، بەڵام کە ئێستا وا بڕیارت داوە نەگەڕێیتەوە سەر ئەو سەرەڕۆییانە، بێجگە لەوەی کە کاروبارمان بەبێ تۆ لا سەنگ بووە (گوێت لێمە، چاک گوێت لێمە؟) لەبەر ئەوە، ئێستا کە سوێندت بە شەرەف خواردووە، هیوادارم بەڵێنەکانت ببەیتە سەر.
با پێتان بڵێم کاترینا ئیڤانۆڤنا هەموو ئەمانەی لە خۆوە دروست کردبوو، وا نەزانن ئەمانەی لە بێفیکری یان بۆ خۆهەڵنان کردووە، نا، خۆی بڕوای بە هەموو ئەمانە هەیە، بە خودا دڵی خۆی بە خەیاڵەکانی خۆش دەکات. منیش لێی ناگرم، نەخێر ئەوە بە خەوش دانانێم، کاتێک شەش ڕۆژ لەمەوپێش یەکەم مووچەم، واتا بیست و سێ ڕۆبڵ و چل کوپیکم دایە، ناوی لێنام ماسیە چکۆڵەکە، دەیوت:
- تۆ ماسییەکی چکۆڵەیت:
کە بە تەنیا بووین، ئەم قسەیەی کرد، تێدەگەیت؟ ئاخر چ جوانییەک لە مندا هەیە، چ جۆرە مێردێکم؟ نا، تەنانەت ڕوومەتی گرتم و وتی:
- ئای! چ ماسیەکی چکۆڵەیت؟
مارمیلادۆڤ لە قسەکردن وەستا، ویستی زەردەخەنەیەک بکات، وەلێ چەناگەی لەرزی، هەرچۆنێک بوو، خۆی گرت، ئەم مەیخانەیە، ئەم ڕەنگ و دەموچاوە شپرزەیە، چیرۆکی پێنج شەوی کە بەسەر

کەشتیی بارهەڵگرەوە بووە، ژیانی لەگەڵ ئارەقدا، ئەو خۆشەویستییە نائاساییەیشی کە بۆ ژن و خێزانەکەی هەیەتی، هەموو ئەم شتانە بە تەواویی ڕاسکۆلنیکۆڤیان سەرسام کردبوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە قووڵی، بەڵام بە هەستێکی نامۆوە گوێی بۆ قسەکانی گرتبوو، لەوەیش بێتاقەت بوو، کە ئەسڵەن بۆ هاتۆتە ئێرە، مارمیلادۆڤ هاتەوە سەرخۆی و وتی:
- گەورەی ئازیزم، ڕەنگە پێکەنینت بە هەموو ئەم شتانە بێت، وەک چیرۆکی تریش، ڕەنگە بەم هەڵبزڕکاندن و وردەشتە هیچوپووچانەی ژیانی خێزانیم هەراسانم کردبێت، بەڵام هەرگیز ئەمانە من ناهێننە پێکەنین، چونکە لە ناخەوە هەستم دەجووڵێنن.. بە درێژایی ئەو ڕۆژە بەهەشتییەی ژیانم و هەموو شەوەکەیشی، خۆم بەسەر باڵی خەیاڵەوە دەبینی: واتا بیرم لەوە دەکردەوە چۆن گشت کارەکانم ڕێک بخەم، چۆن منداڵەکانم پۆشتەوپەرداخ بکەمەوە، چۆن ژنەکەم ئاسوودە و دڵنیا بکەم، چۆنیش کچە تاقانەکەم لە ناو ئەو شوورەیی و شەرمەزارییەدا ڕزگار بکەم و بیخەمەوە ناو ئامێزی خێزانەکەمەوە، خەونم بە زۆر شتی تریشەوە دەبینی.. زۆر شتی تر.. هەموویان ڕەوان، گەورەم..
لەپڕا مارمیلادۆڤ موچرکێکی پیاهات، سەری بەرز کردەوە و لە گوێگرەکەی خۆی ڕوانیی.
- باشە، بەڵام ڕۆژی دوایی، پاش ئەم هەموو ئارەزووانە، تەواو هەر پێش پێنج شەو و ڕۆژ لەمەوبەر، بە ڕاووڕێویەک، وەک دزی شەو کلیلی سندوقی کاترینا ئیڤانۆڤنام فڕاند و چی لە مووچەکەم مابووەوە هەڵمگرت، چەند بوو، نازانم، ئێستا تەماشام بکەن، تەواو بوو! پێنج ڕۆژە لە ماڵ هاتوومەتە دەرێ و ئەوان بە دوامدا دەگەڕێن. کارەکەم

تەواو و جلە ڕەسمییەکەیشم لە مەیخانەیەکی نزیک بە (پردی میسر) ماوەتەوە و لەباتیی ئەو ئەم جلە شڕانەیان داومەتێ.. هەموو شتێک تەواو بوو!

مارمیلادۆڤا مستێکی بە تەوێڵی خۆیدا کێشا، لێوی کرۆشت، چاوی نووقاند و بە هەموو توانایەوە ئانیشکی دادایە سەر مێزەکە، بەڵام دوای چرکەساتێک لەپڕا دەموچاوی گۆڕا، بە ڕوویەکی ساختەو فێڵاوییەوە تەماشای ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد، پێکەنی و وتی:

- ئەمڕۆیش لای سۆنیا بووم، تا لەبری وازهێنان لە بەدمەستییەکەم پارەی لێوەرگرم، ها، ها:

یەکێک لەوانەی تازە هاتبووە ژووری و لە سووچێکا دانیشتبوو هاواری لێهەستا:

- جا بڵێی پارەی دابێتێ؟

زۆریش پێکەنی.

مارمیلادۆڤا تەنیا ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و وتی:

- ئەم نیو قاپەم لە پارەی ئەو کڕیووە، سی کوپیکی دەرهێنا.. بە دەستی خۆی، دوا پوولی بوو، چی پێبوو دایمێ، خۆم بینیم.. هیچی نەوت، تەنیا بێدەنگ لێی ڕوانیم.. کەس لەم دنیایەدا کاری وا ناکات، تەنیا لە ئاسمانەوە بەزەیی وایان بە خەڵکا دێتەوە و لەبری سەرزەنشت و لۆمە، بۆی دەگرین، ئەمەیان ناخۆشە، زۆر ناخۆشترە ئەگەر سەرکۆنەت نەکەن.. سی کوپیک، بێگومان خۆی ئێستا پێویستیەتی، ها؟ تۆ دەڵێی چی؟ گەورەی ئازیز، ئاخر دەبێت ئێستا ئەو ئاگای لە پاکوخاوێنیی خۆی بێت، پاکوخاوێنیی تایبەتیش پارەی گەرەکە، تێدەگەیت، تێدەگەیت؟ بێ لەوە ئەو پێویستی بە عەتر و سووراوە، تەنوورەی ڕێک و پێڵاوی جوانی دەوێت تا لە پەڕینەوەی

قوڕ و چلپاودا بتوانێت قاچ درێژ بکات و دەریبخات. جەناب تێدەگەیت، تێدەگەیت مانای پاکوخاوێنی چییە؟ باشە، وا من، منی باوک، سی کوپیکەکەم بۆ بەدمەستی لێ فڕاند و وا ئێستا خەریکی خواردنەوەم، هەموویم دایە ئارەق، تەواو بوو، باشە، کێ هەیە بەزەیی بە یەکێکی وەک مندا بێتەوە؟ ها؟ تۆ دڵت پێم دەسووتێت؟ بیڵێ جەناب، دڵت پێم دەسووتێت یان نا؟ ها، ها، ها.

ویستی پێکێکی تر بکات، بەڵام هیچی تیا نەمابوو، بوتڵەکە خاڵی بوو. مەیخانەچییەکە کەلایان دانیشتبوو، گەزارەی لێکێشا:

- جا بۆ بەزەییان پیاتدا بێتەوە؟

دەنگی پێکەنین و تەنانەت جوێنیش بەرز بووەوە، پێکەنین و جوێنی گوێگران بوو، هی ئەوانەیش کە گوێیان لە هیچ نەگرتبوو، بەڵکو تەنیا بۆ تەماشاکردنی هەیکەلی کارمەندە خانەنشینەکە هاتبوون.

مارمیلادۆڤا لەناکاوێکدا کاتێک کە دەستی بۆ پێشەوە درێژ کرد، بە دەنگی سرووشئامێزەوە، وەک ئەوەی تەنیا چاوەڕوانی ئەم وشانە بووبێت، نەڕاندی:

- بەزەیی؟ بۆ دڵتان پێم بسووتێ؟ تۆ دەڵێی بۆ بەزەییان پێتا بێتەوە؟ بەڵێ، هیچ هۆیەک بۆ بەزەیی پیاهاتنەوەم نییە، هەق وایە لە خاچم بدەن، خاچ، نەک بەزەییان پیامدا بێتەوە، کەواتە لە خاچی دە، ئەی قازی، لە خاچی دە و دوای ئەوە بەزەیت پیایدا بێتەوە، ئەوسا من خۆم بۆ لە خاچدان دێمە بەردەمت، چونکە من تینووی خۆشی نیم، بەڵکو تینووی خەم و فرمێسکم، تۆ ئەی ئارەقفرۆش، وا دەزانیت ئەم نیو قاپەی تۆ خۆشیم پێدەبەخشێت! من لەناویا بۆ خەم و ئازار دەگەڕێم، خەم و فرمێسک و چەشتیشم. دەستم کەوت، بەڵام ئەو کەسە دڵی بە من دەسووتێت، کە دڵی بۆ هەموو کەسێک بسووتێت.

ئەو کەسەی لە هەموو کەسێک و لە هەموو شتێک تێگەیشت، ئەوە تاقەکەس و هەر ئەویش دادوەرە. لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و دەپرسێت: "ئەو کچە لە کوێیە کە بۆ باوەژنی زاڵم و سیلاوی، لەبەر منداڵی بێگانە و ساوا، خۆی فرۆشتووە؟ ئەو کچە لە کوێیە کە بۆ باوکەکەی سەرزەمینی، کە سەرخۆش و بێکارەیە، بەبێ ئەوەی ترسی لە ئاژەڵیەتییەکەی باوکی هەبێت، بەزەیی پێبەخشی؟" دیسانەوە دەڵێت: "وەرە، جارێک تۆم بەخشی، جارێک بەخشیمیت.. وا ئێستایش لە هەموو گوناهەکانت دەبوورم، چونکە تۆ میهرەبانیت" ئینجا لە سۆنیای من دەبوورێت، دەبوورێت، دەزانم دەبوورێت، من ئەو کاتەی لای بووم، ئەم هەستە لە دڵم گەڕابوو.. خودا داوەریی هەموویان دەکات و دەیانبەخشێت، چاکەکان و خراپەکان، عاقڵ و نەزانەکان، کە کاری هەمووی تەواو کرد، ئەوسا بە ئێمە دەڵێت: "ئێوەیش وەرنە دەرێ، وەرنە دەرێ، سەرخۆشەکان، وەرنە دەرێ لاوازەکان، وەرنە دەرێ گوناهکاران!" ئێمە هەموو دێینە دەرێ و دەوەستین، ئەو دەڵێت: "ئێوە بەرازن، لە حەیوان دەچن، بەڵام ئێوەیش هەر وەرن". ئەوسا داناکان دێنە دەنگ، هزرمەندانیش دێنە دەنگ کە: "خودایا، لەبەر چی پێشوازی لەمانە دەکەیت؟" ئەو دەڵێت: "پێشوازی لەمانە دەکەم، ئەی دانایان، پێشوازییان لێدەکەم، ئەی هزرمەندان، چونکە هیچ یەکێک لەمانە هەرگیز خۆی بە شایستەی ئەم بەخشینە نەزانیووە". ئینجا خودا دەستی بۆ لای ئێمە درێژ دەکات و ئێمەیش ماچی دەکەین.. دەگرین و تێدەگەین، ئەوسا لە هەموو شت دەگەین.. هەموو تێدەگەن.. تەنانەت کاترینا ئیڤانۆڤنا.. ئەویش تێدەگات، خودایا با فریشتەکانت زووتر بگەن!

مارمیلادۆڤا بەبێ ئەوەی تەماشای کەس بکات، بەبێ هێز و توانا کەوتە سەر قەنەفەکە، وەک دەوروبەرەکەی فەرامۆش کردبێت، کەوتبووە بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە، وتەکانی کاریگەر بوون، چرکەساتێک هەموو کڕ بوون، بەڵام زۆری نەبرد دەنگی پێکەنین و جوێنەکانی پێشوو کەوتنەوە بەر گوێ.

- داوەرییەکی باش!

- بەسەریەکیا ترشاند.

- ئیتر کارمەندە!

چی و چی تریش.

مارمیلادۆڤا لەپڕا سەری بەرز کردەوە و بە ڕاسکۆلنیکۆڤی وت:

-با بڕۆین گەورەم.. بمگەیەنە.. ماڵی کوزیل[1]ی ناو حەسارەکە، ئیدی دەبێت.. بگەڕێمەوە لای کاترینا ئیڤانۆڤنا..

دەمێک بوو ڕاسکۆلنیکۆڤ نیازی ڕۆیشتنی بوو، هەر لە خۆیشیەوە ئەوەی لەبیردا بوو هاوکاریی ئەم پیاوە بکات، کە کەوتنە ڕێ، دیار بوو هەنگاوەکانی مارمیلادۆڤا لە توانای قسەکردنەکەی بێهێزتر بوو. لەبەر ئەوە توند پاڵی بە لاوەکەوە دا، هەموو ڕێگەکە دوو سەد، سێ سەد هەنگاو زیاتر نەبوو، چەندە لە ماڵەکە نزیکتر بکەوتنایەتەوە، زیاتر ترس و ناڕەحەتی بەرکی پیاوە سەرخۆشەکەی دەگرت، بە نیگەرانییەوە لەژێر لێوەوە وتی:

- من لە کاترینا ئیڤانۆڤنا ناترسم، لەوەیش ناترسم چۆن قژم ڕادەکێشێت، قژ چییە؟ هیچ نییە، من ئەمە دەڵێم، ئەسڵەن چاکتر وایە قژم پێوە نەهێڵێت، من لەوە ناترسم.. من.. لە چاوی دەترسم.. بەڵێ..

---

[1] *kozel*

له چاوی.. له پەڵە سوورەکانی سەر ڕوومەتی دەترسم و هەروایش.. له هەناسەی دەترسم.. ئایا ئەو جۆرە نەخۆشانەت دیووە چۆن هەناسە دەدەن.. به تایبەتی که تووشی هەڵچوون دێن؟ له گریانی منداڵەکانیش دەترسم، چونکه ئەگەر سۆنیا خواردنی نەدابێتێ.. نازانم چی ڕووی داوه، نازانم، بەڵام له لێدان ناترسم، گەورەم بزانه، که ئەو جۆره لێدانانه بۆ من ترسناک نین، بەڵکو چێژم پێدەبەخشن، چونکه بەبێ ئەوه هەرگیز کارم ڕایی نابێت.. ئەمیان باشتره، لێگەڕێ لێم بدات و داخی دڵی بڕێژێت، ئەمیان باشتره.. باشه، ئەمەیش ماڵەکه، ماڵی کوزیل، دارتاشی دەوڵەمەندی ئەڵمانی.. بابڕۆین..

له حەوشەوه چوونه ژووری، سەرکەوتنه قاتی چوارەم، چەند زیاتر به پلیکانەکاندا سەربکەوتنایه، تاریکتر دەبوو، سەعات نزیکەی یانزه بوو، هەرچەنده لەم وەرزەدا پترزبورگ شەوی ڕاستەقینەی نییه، بەڵام سەر پلیکانەکان زۆر تاریک بوو، دەرگایەکی بچووکی دووکەڵاوی، له سەرەوه، له کۆتایی پلیکانەکاندا کرابووەوه، له ناوەوه مۆمێک ژوورێکی زۆر گەنیلەی ڕووناک دەکردەوه، که درێژیەکەی ده هەنگاو بوو. هەموو ژوورەکه له هەیوانەکەوه دەبینرا. هەموو شتێک، به تایبەتی پەڕۆ و پیتاڵی کۆنەی منداڵانه لەو ناوەدا کەوتبوون. له سووچی ئەوپەڕی ژوورەکەدا پەردەیەکی کون کون ڕاکێشرابوو، زۆر لەوه دەچوو پشتەوەی قەرەوێڵەیەکی نووستن بێت. هەر له ناو ژوورەکەدا تەنیا دوو کورسی، قەنەفەیەکی شکاوی پەڕپووت، که قوماشێکی چەوری بەسەردا درابوو، مێزێکی کۆنی موبەق که له دارێکی خراپی بۆیەنەکراو بەبێ ئەوەی سفرەی بەسەرەوه، بێت بەرانبەر به قەرەوێڵەکه دەبینرا، له سووچێکی مێزەکەدا پاشماوەی مۆمی ناو مۆمدانێکی فافۆن دەسووتا، دیار بوو و مارمیلادۆڤا له

خودی ژوورەکەدا نیشتەجێ بوو، نەک هەموو بەشەکەی گرتبێت. ژوورەکەی سەرەڕێ بوو، ئەو دەرگایەی دەچووەوە سەر ژوورەکان، یان باشتری بڵێم لانەکانی تر و خانووەکەی ئامالیا لیپە و ڤخزلی پێک دەهێنا، نیوەی کرابووەوە و لەوێوە گوێت لە هەراوزەنا دەبوو، پێدەکەنین، لەوە دەچوو یاری کاغەزێن بکەن و چا بخۆنەوەو هەندێک اریش قسەی قۆڕی بێسەرەوبەرە بکەن.

ڕاسکۆلنیکۆڤ زوو کاترینا ئیڤانۆڤنای ناسی، ژنێکی زۆر لاواز و باریک و تاڕادەیەک باڵابەرز و ڕێک، قژێکی زەردی هێشتا زۆر جوان، ڕاست بوو بەسەر ڕوومەتیشییەوە دوو لەکەی سوور هەبوون، کاترینا ئیڤانۆڤنا دەستی نووساندبووە سنگییەوە، لە ژوورە بچووکەکەی خۆیدا هاتوچۆی دەکرد، لێوی وشک و هەناسەبڕکێی بوو، چاوی وەک تالێهاتوویەک دەدرەوشایەوە، بەڵام ڕوانینی تیژ و بێترووکە بوو. دەموچاوە سیلاوییەکەی، لەبەر ڕووناکیی دواتروسکەی مۆمە تەواوبووەکەدا نەخۆش دەینواند.

بە لای ڕاسکۆلنیکۆڤەوە تەمەنی سی ساڵان بوو، بەهەق نەدەبوو هاوسەری مارمیلادۆڤا بێت. ژنەکە بە هاتنیانی نەزانی و دەنگی نەبیستن، دەتوت لە جۆرە بێهۆشییەکدایە، کە نەدەبیستێ و نەدەبینێ، هەرچەندە هەوای ژوورەکە خەفەکەر بوو، کەچی بەوەیشەوە پەنجەرەی نەکردبۆوە، لە پلیکانەکانەوە بۆگەنێک دەهات، وەلێ ئەو دەرگایەی دەچووە سەر پلیکانەکان، دانەخرابوو، لە ژوورەکانی تەنیشتەوە، لە دەرگا نیوەکراوەکەوە شەپۆلی دووکەڵی جگەرە دەهاتە ژوورێ، ژنەکە دەکۆکی و کەچی دەرگای دانەدەخست، بچووکترین کچۆڵەیان کە تەمەنی شەش ساڵ دەبوو، بە چیچکانەوە کزۆڵەی کردبوو، سەری نابووە کورسییەکەوە و لەسەر زەویەکە خەوی

لێکەوتبوو، کوڕێک کە پێدەچوو ساڵێک لەو گەورەتر بێت، لە سووچێکدا دەلەرزی و دەگریا، دەتوت تازە لێی دراوە، کچە گەورەکە کە تەمەنی نۆ ساڵ و باڵای بەرز و وەک دەنکی شقارتە باریک بوو، باڵاپۆشێکی کۆنەی دابووە سەر شانە ڕووتەکەیدا، کە دیار بوو دوو ساڵ لەوەوبەر بۆیان بدروو بوو، چونکە ئێستا نەدەگەیشتە سەر ئەژنۆی، کچە لە پاڵ برا بچووکەکەیدا، لە سووچێکدا وەستا بوو، دەستە درێژ و مژانئاساکەی توند ئاڵاندبووە ملی براکەی، گوایە بێدەنگی دەکات، شتێکی بە گوێیدا دەچرپاند و هەوڵی دەدا جارێکی دی منداڵەکە نەکەوێتەوە هەنسکدان، لەگەڵ ئەوەیشدا بە چاوە زۆر گەورە و تێرەکانی کە بە دەموچاوە لاواز و هەڵبزڕکاوەکەیەوە گەورەتر دەردەکەوت، بە ترسەوە لە دایکی دەڕوانی و چاودێریی دەکرد، مارمیلادۆڤا بەبێ ئەوەی بڕواتە ژوورەکەوە، لە بەردەم دەرگاکەدا کەوتە سەرچۆک و ڕاسکۆلنیکۆڤی بۆ ژوورەوە ڕادا، ژنە کە چاوی بەو پیاوە غەریبە کەوت، بەسەر سوڕمانەوە لە ڕوویدا وەستا، دوای کەمێک هاتەوە سەرخۆی و دەتوت بیری لێکردۆتەوە کە ئەو پیاوە بۆ هاتۆتە ژووری؟ زۆر زوویش وای لێکدایەوە کە ڕەنگە بۆ ماڵی تر هاتبێت، چونکە ژوورەکەی سەرەڕێی ئەوانی ترە، هەر بەو بیرەوە بەبێ ئەوەی گوێ بە پیاوەکە بدات، ژن بەرەو ڕارەوەکە چوو تا دەرگاکە دابخات، لەپڕا کە مێردەکەی بینی لە بەردەم دەرگاکەدا چۆکی داداوە، هاواری لێهەستا، زۆر بە تووڕەییەوە وتی:

- ها.. گەڕایتەوە! شەیتان، حەیوان، پارەکان کوان؟ چیت لە گیرفاندایە. پیشانم بدە، جلەکانیشت گۆڕاوە، کوا ئەوەی خۆت؟ پارەکان کوان؟ دەی قسە بکە...

یەکسەر کەوتە پشکنینی گیرفانی مێردەکەی، مارمیلادۆڤا زوو خۆی بۆ شل کرد و دەستی بڵاو کردەوە و بە تەنیشتی خۆیدا درێژی کردن تا بە ئاسانی گیرفانەکانی بپشکنێت، تەنانەت کوپیکێکی تیا نەمابوو، ژنە هاواری لێهەستا:

- ئەی پارەکە کوا؟ خودایا، یەعنی هەمووت بەبا دا! ئاخر هێشتا دوانزە ڕۆبڵ لە سنووقەکەدا مابووەوە..

لەناکاودا بەوپەڕی تووڕەییەوە دەستی لە قژی گیر کرد و بەرەو ناو ژوورەکە ڕایکێشا، مارمیلادۆڤا بۆ ئەوەی ژنەکەی ماندوو نەکات، ملی بۆ دا و لەسەر ئەژنۆ کەوتە دوای و لە کاتی قژڕاکێشانیدا یەک دوو جار سەری بەر زەوی کەوت، مارمیلادۆڤا ڕوو بە هاوڕێکەی بە دەنگی بەرز دەیگوت:

- گەورەو بەڕێز، ئەمە خۆشیم پێدەبەخشێت، ئەمە ڕەنج و ئازار نییە، بەڵکو شادی و خۆشییە..

کچە منداڵەکەی کە لەسەر زەویەکە نووستبوو، لە خەو هەستا و کەوتە گریان، کوڕەکەیش کە لە سووچێکدا وەستابوو، ئۆقرەی نەگرت، لەرزی، هاواری کرد و بەترس و لەرزێکەوە کە نزیک بوو لە فێلێهاتن، خۆی دایە پەنای خوشکی، کچە گەورەکە لەتاو بێخەویی وەک گەڵا دەلەرزی، ژنە داماوەکەیش بە نائومێدیەوە هاواری دەکرد:

- خواردتەوە! هەموویت هەڵدا!.. جلەکانیشت ئەوانەی خۆت نین! بە دەستیشی کە لە داخا وای هەڵدەگلۆفتن نزیک بوون لە شکان، ئاماژەی بۆ لای منداڵەکان کرد:

- برسییانە، برسی! هەی دڕندەی نەفرەتلێکراو.

لەپڕا پەلاماری ڕاسکۆلنیکۆڤی دا و وتی:

- ئەی تۆ؟ تۆ تەریق نابیتەوە کە لە مەیخانەوە دەگەڕێیتەوە؟ تۆ لەگەڵ ئەودا دەتخواردەوە، تۆیش لەگەڵ ئەودا ئارەقت خواردەوە، دەی بۆ دەرەوە!

لاوەکە بەبێ ئەوەی قسەیەک بکات، پەلەی ڕۆیشتنی کرد، لەو کاتەدا دەرگایەک کە ڕێگەکەی دەچووەوە سەر ژوورەکانی دی، تەواو کرایەوە، دەموچاوی چەند کەسێکی ماتیگر دەرکەوت، چەند سەروگوێلاکێک کە قسەی ناشرینیان دەکرد، بە پێکەنین و جگەرە و سەبیل بەدەم و شەوکڵاو بەسەرەوە بەرەو ژوورەکە ڕیزیان بەستبوو، جلێکی هەراوی ماڵەوەیان لەبەردا بوو یان بە بەرگێکی هاوینەی بێشەرمانەوە خۆیان داپۆشیبوو، هەندێکیان کاغەزی قوماریان بە دەستەوە بوو، بەتایبەتی کاتێک پێدەکەنین کە قژی مارمیلادوڤ ڕادەکێشرا و ئەو خۆی بە زەویەوە دەنووساند و هاواری دەکرد و دەیوت: "ئەمە خۆشیم پێدەبەخشێت" هەندێکیان وردەوردە هاتنە ناو ژوورەکەوە، تا سەرئەنجام دەنگێکی شووم هاتە بەر گوێ. دەنگی خودی ئامالیا بوو، کە دەهات و ڕێگەی بۆ خۆی دەکردەوە، بۆ ئەوەی بە شێوازەکەی دۆخەکە بێنێتەوە سەر خۆی و بۆ سەدەم جار ژنە داماوەکە بترسێنێت و هەڕەشەی ئەوەی لێبکات کە دەبێت بەیانی ژوورەکە چۆڵ بکات. ڕاسکۆلنیکۆڤ لە کاتی ڕۆیشتنیدا دەرفەتی بۆ ڕەخسا تا دەست بە گیرفانیدا بکات و هەر پارەیەکی مسینی مەیخانەکە، کە لە باقیاتی ڕۆبڵێک وەری گرتبووەوە دەریبهێنێت و بێ ئەوەی کەس پێبزانێت، بیخاتە بەردەم پەنجەرەکە، وەلێ لەسەر پلیکانەکان لە کارەکەی پەشیمان بووەوە و خەریک بوو بگەڕێتەوە. بە خۆی وت: "ئەم کارە خراوە چی بوو کردم، ئەوان سۆنیایان هەیە و من خۆم پێویستم بە پارەیە" بەڵام کە زانیی تازە

ئەو پارەیەی دەست ناکەوێتەوە – بەبێ ئەوەیش هەرگیز ئەو پارەیەی نەدەویستەوە– شانی هەڵتەکاند و بەرەو ماڵەکەی کەوتە ڕێ.

کە بە شەقامەکەدا دەڕۆشت، کەوتەوە دوای بیرۆکەکانی و بە زەردەخەنەیەکی تاڵەوە وتی: "ڕاستە سۆنیا پێویستی بە سووراوە.. ئەو پاکیزەیەتییە پارەی دەوێت، هوم.. بێگومان ئەمڕۆ سۆنیا خۆیشی نابوود دەبێت و هیچی دەست ناکەوێت، ئەمەیش هەر هەمان قوماری هەمیشەییە و مەترسیدارە، وەک ڕاوەئاژەڵ و گەڕان بە دوای زێڕدا وایە، بەیانی ئەگەر ئەو پارەیەی من نەبێت، هەموویان لە برساندا دەمرن.. ئاە.. سۆنیا! چ کانزایەکیان هەڵکەندووە! سوودیان لێ دیووە، بێگومان سوودیان لێ دیووە و تازە خوویشیان پێوە گرتووە. کەمێک گریاون و ئێستا ڕاهاتوون، مرۆڤ ڕسوایە و خوو بە هەموو شتێکەوە دەگرێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ دیسانەوە بیری کردەوە. لە ناکاوێکدا، بێئیرادە هاواری کرد: "جا کێ دەڵێت من ڕاست دەکەم و لەسەر هەقم؟ ئەگەر لە ڕاستیدا مرۆڤ، مرۆڤ بەگشتی، یەعنی هەموو ڕەگەزی مرۆڤ ڕسوا نەبن، کەواتە شتەکانی تر، هەموو شتەکان، دەبنە هیچ و ترسێکی خەیاڵی. هیچ بەربەستێکیش بۆ ئەمە نییە، نابێت هەبێت!"..

## ٣

ڕۆژی دوایی، پاش خەوێکی ناخۆش، تا ڕادەیەک ڕاسکۆلنیکۆڤ درەنگ لە خەو هەستا. لەگەڵ ئەوەیشدا خەوەکە چ توانا و ئاسوودەییەکی تێنەگێڕابوو. کە هەستا، تووڕە و بێزار و ڕکن بوو، بە بێزاریەوە لە ژوورە قێزەونەکەی خۆیی ڕوانی، ژوورەکەی قەفەزێکی

زۆر چکۆڵه بوو، درێژییەکەی شەش هەنگاو، دیوارەکانی بە کاغەزێکی گەردلێنیشتووی زەرد داپۆشرابوو، کاغەزەکە لە هەموو لایەکەوە لە دیوارەکە کرابووەوە. بنمیچەکەی هێند نزم بوو، دەبوو یەکێکی کەمێک بە باڵا لەوە بترسێت سەری لێی بدات، دیمەنەکەی تەواو نالەبار بوو، کەرەستەکانی ناو ژوورەکە لەگەڵ ئەو دیمەنەدا چاک ڕێک کەوتبوون، سێ کورسیی کۆنی شەقوشڕ، لە سووچێکدا مێزێکی زەیتکراو کە چەند دەفتەر و کتێبێکی لەسەر بوو، هێند تۆز و خۆڵ لەسەر کتێبەکان کەڵەکە ببوون، کە دەتزانی ماوەیەکی زۆرە دەستی کەسیان بەرنەکەوتووە، قەنەفەیەکی زەبەلاحی بەدڕووخسار، کە نزیکەی درێژیی دیوارەکە و بە پانییشی نیوەی ژوورەکەی داگیر کردبوو، ڕۆژانێکیش پارچەقوماشێکیان دابووە سەریدا، کە ئێستا هەمووی دڕاوە، تەختەخەوی ڕاسکۆلنیکۆڤ بوو، زۆرجار ئەم لاوە بەبێ ئەوەی خۆی بگۆڕێت، هەر بە جلەکانیەوە لەسەری دەخەوت، لەباتیی مەلافە، پاڵتاوە کۆنەکەی، پاڵتاوە خوێندکارییەکەی بەسەر خۆیدا دەکێشا، تاقە سەرینەکەیشی ئەوەندە گچکە بوو، کە هەموو جلکە پاکوپیسەکانی خۆی لەژێر دەنا تا ژێرسەری کەمێک بەرزتر بێت، بەرانبەر قەنەفەکە مێزێکی چکۆڵە دانرابوو. چ ژیانێک لەمە ناخۆش و بەدتر هەیە! وەلێ ڕاسکۆلنیکۆڤ بەو بارە دەروونییەوە کە هەیبوو، قایل دەهاتە بەرچاو، تەنانەت پێدەچوو چێژی لێوەربگرێت. وەک کیسەڵ خزابووە قاوغەکەیەوە و بە تەواوی لە دنیا دابڕابوو، تەنانەت بینینی کارەکەرەکە کە دەبوو سەر لە ژوورەکەی بدات و خزمەتی بکات، تووڕە و بێزاری دەکرد، ئەمە حاڵەتی زۆرێک لەو کەسانەیە، کە نەخۆشن و بیری خۆیان تەنیا لەسەر یەک مەسەلەی تایبەتی دەچەسپێنن.

خاوەن ماڵەکەی دوو هەفتە دەبوو کە ئیتر خۆراکی بۆ نەدەنارد، بەڵام ڕاسکۆلنیکۆڤ هەرچەندە بە سکی برسی سەری دەنایەوە، کەچی بیری لەوە نەدەکردەوە بچێتە لای و لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵدا بکات.

ناستاسیا[1]ی تاقە چێشتکەر و کارەکەری خاوەن ماڵ تا ڕادەیەک لەو بارە دەروونییەی کرێگرتەکە ڕازی بوو، بە تەواوی لە چوون و ڕێکوپێککردنی ژوورەکە دەستی هەڵگرتبوو، تەنیا هەفتەی جارێک، بە ڕێکەوت گسکەکەی لە دەست دەگرت. وا ئەمڕۆ بەسەر سەری لاوەکەوە وەستا و لە خەو هەڵیساند، هاواری لێکرد:

- هەستە، بۆ نوستوویت؟ سەعات لە نۆ تێپەڕیوە، چام بۆ هێناویت، حەز لە چا دەکەیت. ها؟ چەندە لاواز و بێگیان بوویت! کرێگرتە چاوی کردەوە، سڵەمییەوە و ناستاسیای ناسی. پاشان بە ڕوویەکی دەردناکەوە لەسەر قەنەفەکە دانیشت و لەسەرخۆ لێی پرسی:

- چای خاوەن ماڵەکەیە؟

- بەڵێ، هی ئەوە.

ئەوسا قۆرییە قوپاوەکەی بە چا کۆنەکە و دوو کڵۆ شەکری زەرد هەڵگەڕاوەوە خستە بەردەمی.

ڕاسکۆلنیکۆڤ دوای ئەوەی گیرفانەکانی خۆی باش پشکنی هەر بەو جۆرەی بە جلەکانییەوە نوستبوو - هەندێک پارەی ئاسنی دەرهێنا و وتی:

---

[1] *Nastasia*

- وەرە، ناستاسیا، تکایە بەم پارەیە نانم بۆ بکڕە و لای کالباسفرۆشەکانیش[1] کەمێک کالباسم بۆ بکڕە، بەڵام هەرزانترینیان.
- هەر ئێستا نانت بۆ دێنم، بەڵام لەباتیی کالباس، شۆربای کەلەرمت ناوێت؟ شۆربایەکی خۆشە، هی دوێنێشەوە، لە دوێنێشەوەوە بۆم هەڵگرتوویت، وەلێ تۆ دوێنێ درەنگ هاتیتەوە، شۆربایەکی باشە.
کە شۆرباکەی هێنا و لاوەکە کەوتە نانخواردن، ناستاسیا لەسەر قەنەفەکە لە پاڵیا دانیشت و کەوتە هەڵەوەڕی، ژنێکی لادێی زۆر چەنەباز بوو.

- پراسکوفیا پاڤلوڤنا[2] دەیەوێت لای پۆلیس شکاتت لێبکات.
کوڕە ناو چاوی بەیەکدا دا و وتی:
- لای پۆلیس؟ بۆچی دەوێت؟
- کرێ نادەیت، ماڵەکەیش چۆڵ ناکەیت، ئیدی دیارە چی دەوێت.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەژێر لێوەوە وتی: نەفرەت لە شەیتان، هەر ئەمەم کەم بوو، نا، ئەمە ئێستا بۆ من خراپە.
پاشان بە دەنگی بەرز لەسەر قسەکانی ڕۆشت:
- گەلحۆیە، من ئەمڕۆ سەری لێدەدەم و لەگەڵیا دەپەیڤم.

---

[1] کالباس وشەیەکی ڕووسییە، بریتییە لە گۆشتی گا یان بەراز کە لە کارگەی تایبەتیدا پوخت دەکرێت و دەخرێتە ناو ڕیخۆڵەی حەیوانەوە (فەرهەنگی عەمید). لای خۆمان پێی دەوترێت پاستورمە – وەرگێڕ.

[2] *Praskofia Pavlovana*

- بۆ گەلحۆیی گەلحۆیە، وەک من، وەلێ ئەی تۆ چۆن، ئاقلّیت، وەک تووڕەکە هەڵا ژیاویت و خێرت نییە؟ تۆ دەڵێیت پێشتر وانەت بە قوتابی وتۆتەوە، ئەی بۆ ئێستا هیچ ناکەیت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە نابەدڵی هاتە قسە و بە شێوازێکی وشک وتی:

- بۆ، من کار دەکەم.

- چی دەکەیت؟

- کار..

- کاری چی؟

کوڕە دوای کەمێک بێدەنگی بە جەخت لەسەر کردنەوە وتی:

- بیر دەکەمەوە..

ناستاسیا دایە پێکەنین، لەو پێکەنینانەی هەندێکجار لەسەر شتی ناقۆڵا دەیگرت، ئەوەندەیش بێدەنگ پێدەکەنی، هەموو گیانی دەهاتە لەرزین، تا دەکەوتە هێلنجدان، پاشان بە زەحمەت لێی پرسی:

- باشە بیرکردنەوە پارەی زۆری دەست خستوویت؟

- ناکرێت پێڵاوت لەپێدا نەبێت و وانە بە قوتابی بڵێیتەوە، تف لە هەموو شتێک.

- چاک نییە تف لە کانی ڕۆبکەیت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەک ئەوەی وەڵامی بیر و بۆچوونی خۆی بداتەوە، بە نابەدڵی گوتییەوە:

- بۆ وانەوتنەوە بە قوتابی، پارەی ئاسن دەدەن ، بە پارەی وردەیش هیچ دەکرێت؟

- پێت ناخۆش نییە ئەگەر یەکسەر پارەیەکی زۆرت بدەنێ؟

لاوەکە تەماشایەکی سەیری کرد، دوای کەمەکێک بێدەنگی، بە سووربوونەوە وتی:

- بەڵێ، پارەیەکی زۆر..
- باشە، کەمێک لەسەرخۆ تر برۆ نەک بکەوی، ئاخر زۆر ترسناکە، بەڕاست بچم بۆ نانەکە یان نا؟
- ئارەزووتە.
- بەڕاست لە بیرم چوو، دوێنێ کە لێرە نەبوویت، نامەیەکت بۆ هات.
- نامە، بۆ من، لای کێوە؟
- نازانم لە کێوە، لە گیرفانی خۆیشم سێ کۆپیکم دایە پۆستەچییەکە، دەمدەیتەوە؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ زۆر شڵەژا و هاواری لێکرد:
- برۆ بیهێنە، بۆ خاتری خودا بیهێنە، خودا هاوار!
دوای چەند چرکەیەک نامەکە گەیشت، وەک خۆی دڵی لێی دابوو، نامەکە لە دایکییەوە بوو لە ناوچەی "ر". هەر بە نامەوەرگرتنەکە ڕەنگی پەڕی، ماوەیەک بوو نامەی پێنەگەیشتبوو، وەلێ ئێستا لەپڕا شتێکی تریش دڵی گرت.
- ناستاسیا برۆ، تووخوا برۆ، ئەمە سێ کوپیکەکەت، بۆ خاتری خودا زوو برۆ.
نامەکە لە دەستیا دەلەرزی، نەیدەویست لە پێش چاوی کارەکەرەکەدا بیکاتەوە، حەزی دەکرد خۆی بە تەنیا لەگەڵ نامەکەدا بێت، کە ناستاسیا چووە دەرێ، بەپەلە نامەکەی لە زاری نزیک خستەوە و ماچی کرد، پاشان بۆ ماوەیەک لە ناونیشانەکە ڕاما، لە خەتە ورد و لارەکەی دایکی خۆشەویستی ڕاما، کە دەیناسییەوە، خەتی دایکی کە ڕۆژانێک فێری خوێندن و نووسینی کردبوو، لە کردنەوەی نامەکە ماتڵیی دەکرد وەک ئەوەی لە شتێک بترسێت، لە دواییدا کردییەوە،

نامەیەکی دوورودرێژ بوو، دوو لاپەڕەی بەرووپشتی بە خەتی ورد پڕ کردبووەوە، دایکی نووسیبووی:

"رووداوی ئازیزم، زیاد لە دوو مانگە بە نووسین هیچم لەگەڵدا باس نەکردوویت، ئەمە زۆری ئازارداوم و هەندێک شەو خەو لە چاوم نەکەوتووە و هەر بیرم کردۆتەوە، وەلێ بێگومان تۆ لەو بێدەنگییەم دەبووریت کە بە دەستی ئانقەست نەبووە، تۆ دەزانیت چەندم خۆش دەوێیت، من و دونیا[1] هەر تۆمان هەیە، تۆ هەموو شتێکی ئێمەیت، هەموو ئومێد و بڕوای ئێمەیت، نازانیت چیم بەسەر هات کاتێک لەوە بەئاگا هاتم کە چەند مانگێکە لەبەر نەبوونی وازت لە زانکۆ هێناوە و وانەوتنەوە و سەرچاوەکانی تری ژیانت لەدەست داوە. ئەی من دەمتوانی بە سەدوبیست ڕۆبڵی ساڵانەی خانەنشینی هاوکاریت بکەم؟ ئەو پانزە ڕۆبڵەی چوار مانگ لەمەوپێش بۆم ناردیت، وەک خۆت دەزانیت، هەر لەسەر ئەو مووچەی ساڵانەیە بە قەرز لە ڤاسیلی ئیڤانۆڤیچ ڤاخروشینی[2] بازرگانی لای خۆمانم وەرگرتبوو. ڤاسیلی پیاوێکی میهرەبانە و هاوڕێی باوکت بووە، بەڵام کە کردمە وەکیلی خۆم بۆ وەرگرتنی مووچەکە، ناچار بووم چاوەڕێ بم تا قەرزەکە تەواو دەبێت، ئەمەیش تازە بەئەنجام گەیشتووە، بۆیە بە درێژایی ئەم ماوەیە نەمتوانیووە هیچت بۆ بنێرم، وەلێ ئێستا ڕەنگە لە سایەی خواوە بتوانم دیسان پارەت بۆ ڕەوانە بکەم، تێکڕا دەتوانین ئێستا لە بەختی خۆمان ڕازی بین و ئەمەیش مەسەلەیەکە حەز ئەکەم زوو پێتی ڕابگەیەنم:

---

[1] *Dounia*

[2] *Vasili Ivanavich Vakhroushin*

یەکەم، ڕودیای ئازیز، دەتەوێ بزانیت کە نزیکەی مانگ و نیوێکە خوشکت لەگەڵ مندا دەژی و ئیدی لە یەکتر جیا نابینەوە؟ سوپاس بۆ خودا، کۆتایی بە خەم و ئازارەکانی هات، وەلێ دەمەوێت یەک بە یەکت بۆ باس بکەم بۆ ئەوەی بزانیت کارەکە چۆن ڕووی داوە و تا ئێستا چیمان لە تۆ شاردۆتەوە.

کاتێک دوو مانگ لەمەوبەر بۆت نوسیبووم لە یەکێکت بیستووە دونیا لە ماڵی سڤیدریگایلوف[1] تووشی مامەڵەیەکی زۆر ناخۆش بووە، تۆیش لەو بارەیەوە داوای ڕوونکردنەوەی وردت لێکردبووم، من لەو کاتەدا دەمتوانی چ وەڵامێکت بدەمەوە؟ ئەگەر هەموو ڕاستییەکانم بۆ بنووسیتایە، بێگومان گشت کارەکانت دەخستە لاوە و هەر بەپێ دەگەیشتیتە لامان – چونکە من ڕەوشت و هەستت دەناسم – و نەتدەهێشت دڵی خوشکت بڕەنجێنن. من خۆیشم لە نائومێدییەکی ترسناکدا دەژیام، وەلێ چیم بۆ دەکرا؟ تەنانەت ئەوسا خۆیشم تەواوی ڕاستییەکانم نەدەزانی. گرنگترین کێشە لەوەدا بوو کە دونیا کاتێک دوو ساڵ لەمەوپێش بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکان لەو ماڵەدا دەستبەکار بوو، لە پێشەوە سەد ڕۆبڵی لێوەرگرتبوون، تا لەوەودوا هەموو مانگێک، هەندێک لە مووچەکەی ببڕن، بۆیە نەیدەتوانی پێش دانەوەی سلفەکە واز لەو ماڵە بهێنێت، ئەو ئەو پارەیەی.. (ئەتوانم ڕودیای ئازیز هەموو شتێکت بۆ ڕوون بکەمەوە) زیاتر بۆ ئەوە وەرگرتبوو، تا شەست ڕۆبڵی بۆ تۆ بنێرێت، تۆ لەو کاتەدا زۆرت پێویست پێبوو، ئەوە ئەو پارەیە بوو، کە تۆ پار بە دەستت گەیشت، ئەوسا تۆمان بەوە فریوو دا کە بۆمان نووسیت ئەو پارەیە

---

[1] *Svidrigailov*

پاشەکەوتی پارە کۆنەکانی دونیایە، بەڵام وا نەبوو، ئێستا تەواوی ڕاستییەکەت بۆ دەنووسم، چونکە شتەکان هەموو ڕوو لە چاکین، دەبێت تۆیش ئەوە بزانیت تا چ ڕادەیەک دونیا تۆی خۆش دەوێت و چ دڵێکی بێوێنەی هەیە. لە ڕاستیدا جەنابی سڤیدریگایلوف لە سەرەتادا زۆر لەگەڵیا دڵڕەق بووە و جۆرەها قسەی ناخۆش و گاڵتەئامێزی لەسەر نانخواردن پێوتووە، بەڵام کە ئێستا هەموو شتێک کۆتایی پێهاتووە، نامەوێت بچمە ناو وردودرشتی گشت شتەکانەوە. بۆ ئەوەی بێهودە تۆیش ناڕەحەت نەکەم. بە کورتی، مارفا پتروڤنا[1]ی ژنی سڤیدریگایلوف و تەواوی کەسەکانی تریماڵەکە ڕەفتاریان لەگەڵ دونیادا باش و خۆشەویستانە بووە، بەڵام کە بەڕێز سڤیدریگایلوف هەر لەسەر ڕەوشە کۆنەکەی کە لە سەردەمی سەربازییەوە بۆی مابووەوە، دەکەوتە ژێر کاریگەریی "باخوس"ی خودای شەراب و مەستییەوە. ئیتر زۆر بە سەختی کات بەسەر دونیادا دەگوزەرا. وەلێ دەزانیت ئەنجام چۆن شکایەوە؟

بیر لەوە بکەرەوە کە ئەم پیاوە زۆردارە ماوەیەکی زۆر چاوی بڕیوەتە دونیا، ئارەزووی خۆی لەژێر دەمامکی دڵڕەقی و نەفرەتدا بەرانبەری شاردۆتەوە. ڕەنگە لەبەر ئەوەی پیاوی گەورەی ماڵ بووە و بەو تەمەنەوە و ئەو ئارەزووە نامەردانەیەوە، هەستی بە شەرم و ترسێک کردبێت، هەر لەبەر ئەوەیش بەبێ ویستی خۆی ڕقی لە دونیا بوویێتەوە، یان ویستبێتی بەو ڕەفتارە زبر و گاڵتەئامێزەی خۆی ڕاستییەکە لە خەڵکی تر بشارێتەوە. بەڵام سەرئەنجام خۆی نەگرتووە و پڕکێشیی کردووە کە بەبێ پەردە پێشنیازی خراپ بۆ دونیا بکات و

---

[1] *Marfa Petrovna*

بەڵێنی جۆربەجۆری بداتێ کە هەموو شتەکان لە بەرژەوەندیی دونیادا دەبێت، لەبەر ئەو واز لە زۆر شت دێنێت، دەچێتە گوندێکی تر یان تەنانەت بیبات بۆ دەرەوەی وڵات. بێگومان تۆ ئێستا دەتوانیت لای خۆتەوە ڕەنج و کەسەری دونیا بەرجەستە بکەیت. دونیا کە وازی لەو ماڵە نەدەهێنا، تەنیا لەبەر ئەو قەرزە نەبوو کە لەسەری بوو، بەڵکو لەبەر دڵسۆزی و ڕێزلێگرتنی مارفا پتروڤنا بوو. چونکە لەوانە بوو مارفا کتوپڕ گومان بکات و لە ئەنجامدا ببێتە هۆی جیابوونەوە یان کێشەی نێوانیان. بێجگە لەمانە بۆ دونیایش ئەمەندە کارێکی ئاسان نەبوو. بێگومان شتی تری لێدەکەوتەوە. گەلێک هۆی تر هەبوون، کە وایان لە دونیا کرد نەتوانێت پێش شەش هەفتەی تر لەو ماڵە نەگریسە خۆی ڕزگار بکات، دیارە تۆ خۆت دونیا دەناسیت و دەزانیت چەندە وریا و خاوەن کەسایەتیی خۆیەتی، دونیا لە توانایدایە بەرگەی زۆر شت بگرێت و لە شوێنی خۆیدا ئەمەندە جوامێرانە بێتە دەست، کە توانا و خۆگرییەکەی لەدەست نەدات، تەنانەت بۆ ئەوەی ناڕەحەت نەبم، هەموو شتێکی بۆ نەدەنووسیم.. هەرچەندە گەلێکجار نامەمان بۆ یەکدی دەنارد و لەبارەی هەواڵ و حاڵی یەکترەوە دەدواین. لە ناکاوێکدا و یەکسەر گرێی کار کرایەوە، بەڕێکەوت مارفا پتروڤنا گوێی لە قسەکانی مێردەکەی دەبێت، کە لە باخەکەدا بۆ دونیای دەکات و چۆن لێی دەپاڕێتەوە. وەلێ ئەو بە پێچەوانەوە تێدەگات و تاوانەکە دەخاتە سەر دونیا، گوایا ئەو ئەم پێشهاتەی دروست کردووە. هەر لە ناو باخەکەدا نمایشێکی سامناک ڕووی دا: مارفا پتروڤنا لە دونیای دا و بڕوای بە قسەکانی نەکرد، خۆیشی سەعاتێکی تەواو کەوتە هاوار و گریان، پاشان فەرمانی دا لە عەرەبانەیەکی نابووتی گوندیدا دونیایان بەپەلە هێنایەوە شار بۆ لای

خۆم. هەرچی جلوبەرگی هەبوو، وەک خۆی، بەبێ ئەوەی بیپێچنەوە، فڕێیان دابووە ناو عەرەبانەکەوە. ڕێکەوت لەو کاتەیشدا بارانێکی بەخوڕ دایکردبوو، دونیا بە دڵشکاوی و سووکایەتیپێکردنەوە، بە ناچاری حەڤدە فرسەخی تەواوی، لەگەڵ دێهاتییەک و لە عەرەبانەیەکی سەردانەپۆشراودا بڕی. ئێستا بیری لێبکەرەوە، من لە وەڵامی نامەکەی تۆدا کە دوو مانگ لەمەوپێش بە دەستم گەیشت، دەمتوانی چی بنووسم؟ خۆم زۆر پەرێشان بووم، نەمدەوێرا ڕاستییەکەت بۆ بنووسم، چونکە بێگومان بووم تۆ شپرزە و غەمگین دەبوویت، تازە دەتتوانی چی بکەیت؟ لەوانە بوو خۆت بکوژیت. بێجگە لەوەیش، دونیا نەیدەهێشت. نامەپڕکردنەوەیش بە قسەی هیچوپووچ، لە کاتێکدا کە دڵم لێوانلێوی غەم و پەژارە بوو، بۆ من نەدەکرا.

مانگێکی تەواو، لە هەموو شارەکەماندا، لەبارەی ئەم ڕووداوەوە قسە دەکرا، وای لێهاتبوو من و دونیا لەتاو چرپەچرپ و تەماشای نەفرەتئامێزی خەڵکی تەنانەت نەماندەتوانی ڕوو لە کەنیسەیش بکەین. هەندێکجاریش خەڵکانێک بە دەنگی بەرز و ڕووبەڕووی خۆمان پلاریان دەوەشاند، هەموو دۆستەکانمان لێمان تەکینەوە، هەموویان، تەنانەت بە سەریش سڵاویان لێنەدەکردین. لەو باوەڕەدابووم هەندێک لە شاگرد دووکان و کارمەندە بچووکەکان دەیانویست قەتران بە دەرگایماڵەوەماندا بکەن تا سووک و ڕسوا بین، وای لێهاتبوو خاوەن ماڵەکەمان جەختی لێدەکردین خانووەکە چۆڵ بکەین، هۆی گشت ئەمانە مارفا پترۆڤنا بوو، کە لە هەموو ماڵەکاندا تاوانەکەی خستبووە سەر دونیا و ئابڕووی بردبوو. ئەو لێرە هەموو کەس دەناسێت و لە ماوەی ئەو مانگەدا بەردەوام هاتوچۆی شاری دەکرد، لەبەر ئەوەیش کە کەمێک چەنەبازە و حەزی بە قسەی ناوماڵ و

خێزانه و بەتایبەتی دەردەدڵیی لەبارەی مێردەکەیەوە، کە کارێکی باش نییە. بۆیە لە ماوەیەکی کورتا نەک تەنیا لەناو شارەکەماندا، بەڵکو لە گشت هەرێمەکەدا ڕووداوەکەی بڵاو کردەوە، من نەخۆش کەوتم، وەلێ دونیا لە من خۆگرتر بوو، خۆزگا دەتبینی چۆن بەرگەی هەموو ئەو شتانەی دەگرت و تەنانەت دڵخۆشی منی دەدایەوە، ئەو فریشتەیە. خوا بەزەیی پیاماندا هاتەوە و کارێکی کرد کۆتایی بە ئازارەکانمان هات، چونکە جەنابی سڤیدریگالوف ئەقڵی بەسەردا هاتەوە و پەشیمان بووەوە. دیارە بەزەیی بە دونیادا هاتۆتەوە و گەلێک بەڵگەی حاشاهەڵنەگر و ئاشکرای لەبارەی بێتاوانیی دونیاوە بە مارفا پتروڤنا داوە. واتا هەمان نامەی دونیا کە بە ناچاری و بە مەبەستی ڕەتکردنەوەی ئەو پێشنیازانەی سفیدریگالوڤ بۆ بینینی بە نهێنی و قسەکردن لەگەڵیا کردبووی و لێی پاڕابووەوە، پێش ئەوەی مارفا پتروڤنا لە باخەکەدا بیانبینێت، دونیا نامەکەی دابووە سڤیدریگایلوف و دوای ڕۆیشتنی هەر لای ئەو مابووەوە.

لە نامەکەدا دونیا بە ڕاشکاوی و تووڕەییەکی زۆرەوە دەربارەی ڕەفتاری نامەردانەی سفیدریگایلوڤ بە تایبەت بەرانبەر مارفا پتروڤنا قسە دەکات و سەرزەنشتی دەکات و ئەوەی وەبیر دێنێتەوە کە ئەو باوکی خێزان و سەرۆکی ماڵە. لە دواییشدا پێی دەڵێت کە ئازارپێگەیاندن و بەدبەختکردنی کچێکی نەگبەت و چارەڕەشی بێپشتوپەنا لە لایەن ئەوەوە ئەوپەڕی نامەردییە. بە کورتی، ڕودیای ئازیزم، نامەکە ئەمەندە نەجیبانە و کاریگەر نووسرابوو، کە دەمخوێندەوە، بەکوڵ دەگریام و ئێستایش بەبێ فرمێسکڕشتن ناتوانم بیخوێنمەوە. بێ لەوەیش، شایەتیدانی خزمەتکارەکانیش کە لە حاڵەتی لەم جۆرەدا زیاتر لەوەی سڤیدریگایلوف بە خەیاڵیدا بێت، بینیبوویان

و بیستبوویان، بوو بە هۆی ئەوەی دونیا بێتاوان دەربچێت. مارفا پتروڤنا تەواو سەراسیمە و – وەک خۆی لای ئێمە دانی پیادانا – "دووبارە کەوتبووەوە حاڵەتی مردن" بەڵام بە تەواوی لەوە گەیشت کە دونیا بێگوناهە. ڕۆژی یەکشەمەی دوایی، هەر لەگەڵ گەیشتە کەنیسە، کەوتە سەر ئەژنۆ، گریا و لە حەزرەتی مریەم پاڕایەوە و داوای لێکرد لەو ئەزموونە تازەیەدا تێنەشکێ و ئەو توانایەی بداتێ کە ئەرکەکانی بە چاکی ئەنجام بدات. پاشان ڕاستەوخۆ، بەبێ ئەوەی سەر لە کەس بدات، هاتە لامان و هەموو شتێکی بۆ باس کردین. بەکوڵ گریا و بە پەشیمانییەکی زۆرەوە، دونیای لە باوەش گرت و داوای لێبووردن و لێخۆشبوونی لێکرد. هەر ئەو بەیانییە، بەبێ کات بەفیڕۆدان، یەکسەر لای ئێمەوە چووە سەردانی هەمووماڵەکانی تری شار، لە گشت شوێنەکاندا بەخوڕ فرمێسکی دەڕشت، زۆر لەبارەی دونیاوە قسەی باشی دەکرد، باسی بێتاوانی و جوامێری و هەستی بەرزی دونیای بۆ هەموو کەسێک دەگێڕایەوە، لەمانەیش زیاتر، ئەو نامەیەی کە دونیا خۆی بۆ جەنابی سڤیدریگایلوڤی نووسیبوو، پیشانی هەموو کەسێکی دا و بە دەنگی بەرز بۆی خوێندنەوە، تەنانەت مۆڵەتی ئەوەیشی دانێ کە وێنەی لەبەر بگرنەوە (بە ڕای من ئیتر ئەم کارەیان زیاد بوو و پێویستی نەدەکرد). بەم جۆرە، بە ناچاری چەند ڕۆژێک لەسەر یەک چووە ماڵی هەموو ئاشنا و دۆستەکانی شاری، چونکە هەندێک لەوانە لەوە دڵگیر بوون، کە بایەخ بە هەندێکی تر دراوە، بۆیە سەرەی بۆ گرتن و ئیدی هەموو دەیانزانی کە فڵانە ڕۆژ مارفا پتروڤنا لە فڵانە شوێن نامەکە دەخوێنێتەوە، بۆ بیستنی، تەنانەت ئەوانەیش کە چەند جارێک دەقی نامەکەیان لە ماڵی خۆیان و کەسانی ناسیاوی تریشدا بیستبوو، کۆ

دەبوونەوە، بە لای منەوە گەلێک لەم کارانە زیاد بوون، بەڵام ئەمە ڕەوشی مارفا پتروڤنایە. لایەنی کەم، هەموو ئابڕوویەکی بۆ دونیا گێڕایەوە و هەموو عەیبە و خەوشەکانی لە ئەستۆی مێردەکەی نا، کە لە ڕاستیدا هەر ئەویش تاوانباری سەرەکی بوو، تەنانەت وای لێکردبوو کە بەزەییم پیایدا بێتەوە، ئەو کارەی بەو پیاوە داماوەیان کرد، زۆر لەوە سەختتر بوو کە چاوەڕێ دەکرا، هەر دوای ئەوە، گەلێک خێزان داوایان لە دونیا کرد کە وانە بە منداڵەکانیان بڵێتەوە، بەڵام ئەو داوای بەخشینی لێکردن. بەگشتی، لەناکاوێکدا هەموو ڕووی ڕێزیان تێکرد و بەتایبەتی ڕەفتاری باشیان لەگەڵیا نواند. گشت ئەم ڕووداوانە پێشهاتێکی چاوەڕواننەکراوی وایان هێنایە گۆڕێ، کە دەتوانین بڵێین بە تەواوی چارەنووسی ئێمەی گۆڕی، ئەوە بزانە، ڕودیای ئازیز، پیاوێک داوای دونیای کردووە و ئەویش قایل بووە، ئەمەوێت ئەم مەسەلەیەت زوو پێبگەیەنم، هەرچەندە لەم کارەدا ڕاوێژ بە تۆ نەکراوە، بەڵام هەرگیز لە هەڵوێستی من و خوشکت دڵگران نابیت، چونکە وەک خۆت دەزانیت، دواخستنی ئەو کارە تا گەیشتنی وەڵامی تۆ، بۆ ئێمە نەدەگونجا، بێجگە لەمە، تۆ هەروا دووربەدوور نەتدەتوانی بە وردی بڕیار لەسەر هەموو شتێک بدەیت. ئەمەیش درێژەی باسەکەیە:

ئەو پیاوە، واتا پیتەر پیتروڤیچ لۆژین[1] کارمەندێکی پایەبەرزە، لەگەڵ مارفا پتروڤنادا کە لەم کارەدا دەستی باڵای هەبوو، خزمایەتییەکی دووریان هەیە، کارەکە وا دەستی پێکرد، کە لە پێشدا بە هۆی ئەم خانمەوە لۆژین حەزی بە ئاشنایەتی ئێمە کردبوو. پێشوازیی چاکی

---

[1] *Pyotre pettovich lougina*

لێکرا، قاوەی خواردەوە و ڕۆژی دوایی نامەیەکی بۆ ناردین، لە نامەکەیدا زۆر بە ڕێزەوە پێشنیازەکەی خستە ڕوو، داخوازییەکەیشی ئەوەبوو کە بە زووترین کات وەڵامی تەواوی بدەینەوە، ئەو پیاوێکی کارایە، گەلێک سەری قاڵە و ئێستا دەیەوێت بەپەلە بڕواتە پتروزبورگ، بۆیە هەموو دەقیقەیەکی لا بەنرخە. بێگومان ئێمە لە سەرەتاوە ئەمەمان زۆر لا سەیر بوو، چونکە کارەکە زۆر بەپەلە و بەبێ چاوەڕوانیکردن ئەنجام درا، ئەو ڕۆژە هەمووی ئێمە بە جووتە بیرمان کردەوە و گشت لایەکیمان هەڵسەنگاند. ئەو کەسێکە بڕوای پێدەکرێت، هەبووە، لە دوو شوێن کار دەکات و سەرمایەیەکی باشی پاشەکەوت کردووە، ڕاستە تەمەنی چل و پێنج ساڵە، بەڵام هێشتا بەدیمەنە و جێی سەرنجی ژنە، بەگشتی، مرۆڤێکی دروست و لایەقە، تەنیا ئەوەی هەیە کەمێک ڕووتاڵ و لووتبەرزە، ڕەنگە ئەمەیش تەنیا لە یەکەم بینینیدا ئەو هەستەت تێبگەڕێنێ.

ڕودیای ئازیز، وا لە پێشەوە پێت دەڵێم، هەر کاتێک لە پتروزبورگدا یەکترتان بینی –ئەمە لە ئاییندەیەکی زۆر نزیکدا ڕوو دەدات– ئەگەر لە یەکەمین بینینتا خەوشێکت تیا بەدی کرد، لەبارەیەوە –وەک ڕەوش و نەریتی تایبەتیت کە زوو هەڵدەچیت– بڕیاری بەسەرا مەدە، ئەمەت هەر بۆ ئاگاداری پێدەڵێم، ئەگینا لەوە دڵنیام کە ڕات بەرانبەری چاک دەبێت، بێ لەمەیش، بۆ ناسینی هەر کەسێک دەبێت لەگەڵیدا وردەوردە هەڵسوکەوت بکەیت و لەوە ئاگادار بیت کە تووشی هەڵەیەکی وا نەبیت پاشان نەتوانیت ڕاستی بکەیتەوە، بەڵام گەلێک بەڵگە لەسەر ئەوە هەیە، کە پیتەر پیتروڤیچ کەسێکی تەواو بەڕێزە. لە یەکەم دیداریدا لەگەڵماندا ئەوەی دەرخست، کە کەسێکە خاوەن بڕیاری خۆیەتی، وەلێ لە گەلێک بواردا وەک خۆی دەیوت (هاوبیری

نەوەی نوێیە) و دوژمنی هەموو شتێکی خەیاڵییە، گەلێک شتی تریشی وت، وەک ئەوەی هەندێک حەزی لە ناوبانگە و زۆری پێخۆشە گوێ بۆ قسەی ڕادێرن، ئەمەیش تاوان نییە، دیارە من شتی لەوە زیاتر تێنەگەیشتم، وەلێ دونیا پێی وتم کە هەرچەندە زانیاریی زۆری نییە، بەڵام ئاقڵ و قسەزان و میهرەبانە، ڕودیا، تۆ ڕەوشی خوشکت دەناسیت، کچێکی ڕەند و بەئاوەز، خۆگر و پڕ شکۆ، ئەگەرچی دڵێکی ئاگرینی هەیە و من ئەوەم بە چاکی تیا هەست پێکردووە، هەڵبەتە هیچ کامێکیان عەشقێکی زۆر گەورەیان بۆ یەکتری نییە، بەڵام دونیا بێجگە لە ئاقڵییەکەی، کچێکی گەلێک مەردە، فریشتەیەکە بۆ خۆی، ئەرکی خۆی لە بەختەوەرکردنی مێردەکەیدا دەبینێت، کە ئەویش لای خۆیەوە هەوڵی بەختەوەری ئەمیەتی. هەرچەندە پێویستە دان بەوەدا بنێین کە تا ڕادەیەک ئەم کارە زوو ئەنجام درا، وەلێ لە ڕاستیدا لەبارەی نیەتپاکیی پیتەر پیتروڤیچەوە هیچ بەڵگەیەکی گوماناویمان نییە، هەر لەم بارەیەوە دەبێت ئەوەیش بڵێم کە پیاوێکی زۆر ئاقڵ و بەڕا و تەگبیرە، بێگومان خۆی ئەوە دەبینێت، کە دابینکردنی بەختەوەریی خودی ئەو، لەبارەی هاوسەریەتییەوە، بەستراوەتەوە بە بەختەوەریی دونیاوە و ئەو ژیانەی لەگەڵ ئەودا بەسەری دەبات. سەبارەت هەندێک ناهەمواریی لە ئاکار و هەندێک دابونەریتی کۆن و تەنانەت بەشێک لە جیاوازیی بیروباوەڕ کە شادمانترین هاوسەریش ناتوانێت خۆی لێ ببوێرێت، دونیا پێی وتم کە بڕوای بە خۆی هەیە و هیچ جۆرە ترسێکی لێ بەدی ناکرێت و دەتوانێت زۆر خۆگر بێت، بە مەرجێک پەیوەندییەکەیان لەسەر بنەمای ڕاستگۆیی و یەکسانی دامەزرابێت. لە ڕووی دەرەوەیدا بە پیاوێکی زۆر بەزەبروزەنگ دەچێت، بۆ نموونە، لەو سەرەتایەوە من هەندێک بە ڕکن هاتە

بەرچاوم، وەلێ دەشێت ئەمە لەوێوە سەرچاوەی گرتبێت، کە پیاوێکی ڕێکوڕاستە، لەو باوەڕەیشدام کەوایە. هەروەها لە دیدەنیی دووەمدا دوای ئەوەی زانیی دونیا قایلە، لە بێنەوبەردەی قسەکانیدا ئەوەی دەرخست، کە پێشتر، واتا پێش ئاشنایەتیی لەگەڵ دونیادا، مەرجی لەگەڵ خۆیدا کردووە کە کچێکی ڕەسەن و بێجیازی بهێنێت، کە سەختی زەمانەی چەشتبێت، بە ڕای ئەو، نابێت مێرد بە هیچ جۆرێک قەرزاری ژنەکەی بێت، بەڵکو چاکتر وایە ژن مێردەکەی بە گەورەی خۆی بزانێت. دەبێت لێرەدا ئەوە بڵێم کە ئەم مەبەستەی هەندێک هێور و میهرەبانانەتر لەوە وت کە ئێستا من بۆ تۆم نووسی. وەلێ من ڕستەکانیم لە یاد کردووە و تەنیا ماناکانم لە بیرە، بێجگە لەوەیش، هیچ مەبەستێکی لە دوای ئەم قسەیەوە نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی گەرمی قسە ببوو، لە دەمی دەرپەڕی، بە جۆرێک کە پاشان دەیویست هەر چۆنێک بووە وتەکەی پینە بکات و سووکتر بیخاتە ڕوو، لەگەڵ ئەوەیشدا من قسەکەم زبر هاتە پێشچاو، پاشان ئەمەم بە دونیا وت، بەڵام دونیا بە تووڕەییەوە وەڵامی دامەوە کە "قسە شتێکە و کردەوە شتێکی تر" بێگومان ڕاست دەکات، دونیا پێش ئەوەی بڕیار بدات، بە درێژایی شەو نەنووست، ئەو وایدەزانی من خەوتووم، بۆیە لە جێگاکەی هاتەدەرێ و هەموو شەوەکە لە ژوورەکەدا کەوتە پیاسەکردن، تا لە ئەنجامدا بەرانبەر پەیکەرەکەی عیسا بەچۆکدا هات، بۆ ماوەیەک دووعا و نزای کرد و بەیانیی پێی وتم بڕیاری شووکردنەکەی داوە.

پێشتر ئاماژەم بەوە دا، کە پیتەر پیتروڤیچ دێت بۆ پترۆزبورگ. لەوێ کاری گرنگی هەیە و دەیەوێت لە پترۆزبورگ نووسینگەی ڕاوێژکاری پارێزەری بکاتەوە، ماوەیەکە بە دوای کاری ماف و دادگاییەوەیە،

چەند ڕۆژێک پێش ئێستا دادگاییەکی گرنگی بردەوە، لەم بارەیەوە پێویستە بچێت بۆ پتروزبورگ، چونکە لە ئەنجومەنی نمایندەکاندا کارێکی بایەخداری هەیە، بەم جۆرە، ڕودیای ئازیزم، ڕەنگە ئەمە بۆ تۆیش سوودی هەبێت و من و دونیا وامان بیر لێ کردەوە کە تۆ هەر لە ئێستاوە بتوانیت بەبێ سێودووکردن بکەویتە دوای کاری ئاییندەی خۆت و چارەنووست دەستەبەر بکەیت، خوا بکەم ئەم کارە بێتە دی، چونکە دەسکەوتێکی گەورەیە، دەبێت ئەمە تەنیا بە دلۆڤانییەکی خوداوەند لە قەڵەم بدەین بەرانبەر بە ئێمە. دونیا بێجگە لەمە چ ئاواتێکی تری نییە، تەنانەت قیروسیامان لێکرد و لەم بارەیەوە چەند شتێکمان بە پیتەر پیتروڤیچ وت، ئەویش دوای ڕامان و سێودوویەکی خۆی وەڵامەکەی وا بوو کە کاری ئەوێی بەبێ سکرتێر بەڕێوە ناچێت ، چاکتریش ئەوەیە مافی کارەکە خزمێک وەریبگرێت نەک بێگانەیەک. بەو مەرجەی خزمەکە ئامادەی کارکردن بێت و نکوڵیی لێنەکات (دەشێت تۆ نەتوانیت ئەو کارە بکەیت!) بەڵام ئەو زوو دوودڵییەکی بە خەرج دا، کە ڕەنگە خوێندنی زانکۆت بواری ئەوەت نەداتێ کاری نووسینگەکەی ئەنجام بدەیت، قسەکان لێرەدا کۆتاییان هات، بەڵام ئێستا دونیا بێجگە لەمە بیر لە هیچی تر ناکاتەوە، چەند ڕۆژێکە ئەم بیرە تای لێهێناوە، پلانێکی وردی بۆ داڕشتووە، کە پاشان بتوانیت لە کاروباری دادگادا هاوکاری یان ببیتە هاوبەشی پیتەر پیتروڤیچ، بەتایبەتی کە خۆیشت لە کۆلێژی مافیت. ڕودیا، من بە تەواوی لەگەڵیام و لە هەموو نەخشە و ئاواتێکیدا هاوبەشم. چونکە بەدیهاتنی بە گران نازانم، هەرچەندە پیتەر پیتروڤیچ کەمێک لە ئێستادا ڕاڕایە (چونکە هێشتا تۆ ناناسێت) بەڵام دونیا تەواو لەوە دڵنیایە، کە

دەتوانێت کاریگەرییەکی باش لە مێردی ئایندەی خۆی بکات و بە ئاوات بگات. لەم لایەنەوە بڕوای تەواوی هەیە.
بێگومان ئێمە خۆمان لەوە نەبان کرد، کە بەرانبەر بە پیتەر پیتروڤیچ لەبارەی ئەم حەزە دوورودرێژانەمانەوە هیچ بڵێین، بەتایبەتی کە تۆ ببیتە هاوبەشی کارەکەی، چونکە ئەو پیاوێکی کردە و بەبڕیارەو لەوانە بوو قسەکانی ئێمە بە وشکی وەربگرێت، لەوانەبوو تەنیا بە خەیاڵاتی بزانێت، هەروەها نە من و نە دونیا لەبارەی ئاواتی خۆمانەوە، کە ڕەنگە بتوانێت تا تۆ لە زانکۆیت، هاوکاریی ئەوەمان بکات پارەت بۆ بنێرین، تا ئێستا وشەیەکمان نەدرکاندووە، یەکەم لەبەر ئەوەی کە ئەم مەسەلەیە لە دواییدا خۆبەخۆ دەڕواتە پێشێ و بەبێ ئەملاولا خودی پیتەر خۆی پێشنیازی دەکات (بۆ دەبێت قسەی دونیا ڕەت بکاتەوە!) بە تایبەتی کە تۆ دەتوانیت لە نووسینگەکەیدا ببیتە دەستەڕاستی و ئەو هاوکارییە وەک مافی تەواوی خۆت وەربگریت نەک پێبەخشین، دونیا هیوادارە بە باشی ئەم کارە ئەنجام بدات و من بە تەواویی لەگەڵیدام. دووەم، لەبەر ئەوە هیچم نەوت، چونکە من زۆرم پێخۆشبوو لەو بەیەکگەیشتنەتاندا هەردووکتان هاوشان و یەکسان بەیەکدی بن.
کە دونیا بە چاکی لەبارەی تۆوە دوا، پیتەر وای وەڵام دایەوە کە بۆ بڕیاردان لەسەر هەر کەسێک دەبێت بە شەخسی و لە نزیکەوە بیبینی و بیناسی، ئەو مافەی بۆ خۆی بەجێ هێشتووە کە لە دوای ناسینت ئینجا لەبارەتەوە ڕای خۆی دەربڕێت. دەزانیت ڕودیای ئازیزم، بەپێی بۆچوونی من، لەسەر هەندێک وێنای خۆم (بێگومان ئەمە بە هیچ جۆرێک پەیوەندیی بە پیتەر پیتروڤیچەوە نییە و تەنیا بیانوویەکی تایبەتی و پیرێژنانەی خۆمە) بە ڕای من وا چاکترە کە دوای

زەماوەندی ئەوان، وەک چۆن ئێستا دەژیم، هەر ئاوا بە تەنیا بژیم، نەک لەگەڵ ئەواندا، من تەواو لەوە دڵنیام ئەو هێند خانەدانە، خۆی ڕووم لێدەنێت کە لە کچەکەم جیا نەبمەوە، کە تا ئێستا هیچی نەوتووە، تەنیا لەبەر ئەوەیە ئەم مەسەلەیە قسەی ناوێت و هەر لە خۆیدا ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام من ئەوە ڕەت دەکەمەوە.
لە ژیانما گەلێک جار سەرنجی ئەوەم داوە کە زاوا زۆر خەسووی خۆش ناوێت، منیش نەک نامەوێت ببم بە بار بەسەر کەسێکەوە، بەڵکو تا تیکەیەک نان و منداڵێکی وەک تۆ و دونیا گیانم هەبێت، دەمەوێت تەواو بە ئازادی بژیم. ئەگەر بکرێت، ماڵەکەم نزیک بە هەردووکتان بێت، چونکە ڕودیا، من جوانترین شتم بۆ کۆتایی نامەکەم هێشتۆتەوە: ئەوە بزانە، کوڕی خۆشەویستم، ڕەنگە لە ئایینده‌یەکی زۆر نزیکدا هەمووومان جارێکی تر لە دەوری یەکدی کۆ ببینەوە و دوای سێ ساڵ لە لەیەکتردابڕان، هەرسێکمان بکەوینە ئامێزی یەکترەوە، ئەمە بڕیارێکی بنەبڕە، کە من و دونیا دەچین بۆ پتروزبورگ، کەی؟ ئەوەیان بە تەواویی نازانم، وەلێ بەهەرحاڵ، زۆرزۆر زوو، ڕەنگە تا هەفتەیەکی تر بکەوینە ڕێ، هەموو شتەکان بە پیتەر پیتروڤیچەوە بەستراونەتەوە، کە لەگەڵ یەکەم دەرفەتدا لە پتروزبورگەوە هەواڵمان پێبگەیەنێت، ئەو لەبەر چەند هۆیەک دەیەوێت بە زووترین کات زەماوەندەکە بسازێت و تەنانەت ئەگەر بشێت، پێش هەفتەی "گۆشتخۆری" بکرێت، ئەگەر بە هۆی کەمیی کاتەوە ساز نەبوو، ئەوسا یەکسەر لە دوای ڕۆژانی ڕۆژووەوە ئەنجام بدرێت، ئای! بە چ شادمانییەکەوە بە سنگمەوەت دەنووسێنم. دونیا لە خۆشیی ئەو دیدارەت لە گەشکەدایە و جارێک بە گاڵتەوە وتی هەر تەنیا لەبەر ئەمە بوو کە ویستم ببمە ژنی پیتەر پیتروڤیچ. دونیا فریشتەیە، ئێستا

خۆی هیچ نانووسێت و تەنیا پێی وتم ئەوەت بۆ بنووسم کە ئەمەندە قسەی بۆ تۆ هەیە، ئەمەندە قسەی هەیە، ناتوانێت دەست بۆ قەڵەم درێژ بکات، دەزانێت لە چەند دێڕێکدا هیچ ناوترێت، بەڵکو زیاتر دەبێتە هۆی نارەحەتی. دەیەوێت توند لە ئامێزت بگرم و ماچی بێئەندازەت بۆ بنێرم، ئەگەرچی رەنگە بەم زووانە هەموو لە دەوری یەکتر کۆوە بین، لەگەڵ ئەوەیشدا لەم ڕۆژانەدا چەند بتوانم، پارەت بۆ دەنێرم، ئێستا کە هەموو زانیویانە دونیا دەبێتە ژنی پیتەر پیتروڤیچ، لەپڕا ئیعتیباری منیش زیادی کردووە، بۆیە دەتوانم لە جاران زیاتر قەرز بکەم و ڕەنگە بیستوپێنج یان سی ڕۆبڵت بۆ ڕەوانە بکەم، لە خەرجیی ڕێگەمان دەترسم، ئەگینا زیاترم بۆ دەناردیت، هەرچەندە پیتەر پیتروڤیچ هێند میهرەبان بوو، کە بەشێکی خەرجیی هاتنمان بۆ پایتەختی لە ئەستۆ گرت. یەعنی خۆی پێشنیازی کرد کە بار و سنووقی گەورەمان لەسەر گیرفانی خۆی بۆ بار بکات، (گوایا بە هۆی ناسیاوەکانییەوە سازاندوویەتی) لەگەڵ ئەمانەیشدا دەبێت حسابی گەیشتنە پتروزبورگیش بکرێت، چونکە لەوێ، لایەنی کەم لە ڕۆژەکانی بەراییدا نابێت تەواو بێپارە بین، ئێمە بە وردی لەگەڵ دونیادا حسابی تەواومان کردووە و زانیمان ڕێگە ئەوەندە خەرجیی ناوێت، لەماڵەوە تا وێزگەی شەمەندەفەر تەنیا نەوەد فەرسەخە، ئێمەیش هەر لە ئێستاوە لەگەڵ گالیسکەوانێکی دیهاتیدا ڕێک کەوتووین، لەوێوە، بە شەمەندەفەری پلە سێ سەفەرێکی زۆر خۆش دەکەین، بۆیە دەشێت و ڕەنگە هەروایش بێت، کە بتوانم زرنگی بکەم و لەباتیی بیستوپێنج ڕۆبڵ، سی ڕۆبڵت بۆ بنێرم، باشە، ئیتر بەسە، دوو پەڕەی تەواوم پڕ کردۆتەوە و ئیدی جێگای خاڵی نەماوەتەوە، هەموو چیرۆکەکانم نووسی، چی ڕووی دا بوو چی

گوترابوو. ئێستایش، ڕودیای بێوێنەم، تا بەیەکگەیشتنێکی نزیک، لە ئامێزت دەگرم و درووودی پاکی دایکانەت بۆ دەنێرم، ڕودیا، دونیای خوشکت خۆش بوێت، چەند ئەوتۆی خۆش دەوێت، تۆیش ئەوەندە، ئەوەیش بزانە کە ئەو بێئەندازە تۆی خۆش دەوێت، تەنانەت لە بوونی خۆی زیاتر تۆی خۆش دەوێت، فریشتەیە و تۆیش ڕودیا، تۆ هەموو شتێکی بۆ ئێمە، گشت ئومێد و ئارەزووەکانی ئێمەیت. ئەگەر تۆ بەختیار بیت، ئێمەیش بەختەوەر دەبین، ئایا تۆ وەک جاران لە خوا دەپاڕێیتەوە و بڕوات بە چاکیی پەروەردگار و فریادڕەسەکەمان هەیە؟ لە ناخی دڵمەوە دەترسم نەکا تۆیش ئەم بێباوەڕییە تازەیە کاری لێکردبێت؟ ئەگەر وا بێت من لەباتیی تۆ لە خوا دەپاڕێمەوە، ئازیزم، لە بیرت نەچێت چۆن کە منداڵ بوویت، هێشتا باوکت نەمردبوو، تۆ لەسەر ئەژنۆم دادەنیشتیت و درووودەکانت بە زمانی منداڵانە لەبەر خۆتەوە دەوت و چۆن ئێمە هەموومان بەختەوەر بووین. خوات لەگەڵ، بەڵکو و بە ئومێدی دیدار، توند توند لە باوەشت دەگرم و ماچی بێئەژمارت دەکەم، تا مردن بە قوربانتم".

"پولخێریا ڕاسکۆلنیکۆڤا"

لە هەموو ئەو ماوەیەدا کە ڕاسکۆلنیکۆڤ نامەکەی دەخوێندەوە، واتا لە دەستپێکردنیەوە تا کۆتایی، فرمێسک دەموچاوی تەڕ کردبوو، بەڵام کە لە خوێندنەوەی بووەوە، ڕەنگی ڕووی پەڕیبوو، لە ڕکا گرژ ببوو، زەردەخەنەیەکی تاڵ و ناخۆش و زەردباوی وەک ماری کەوتبووە سەر لێو، سەری نایە بان سەرینە کۆنەکەی و کەوتە بیرکردنەوە، ماوەیەک بیری کردەوە، دڵی توند لێی دەدا و هۆشی زۆر پەرێشان بوو، سەرەنجام ئەو ژوورە بچووکە زەردهەڵگەڕاوەی زیاتر لە دۆڵاب یان سندووق دەچوو، لێی بە تەنگ هات و هەناسەی

گیرا. ڕوانین و بیری داوای کرانەوەیان لێکرد، کڵاوەکەی هەڵگرت و لە ژوورەکە بەدەر کەوت، ئەمجارەیان باکی لە هیچ کەسێک نەبوو، کە لە ڕێگەی پلیکانەکاندا بیبینێت و بە تەواوی ئەو بابەتەی فەرامۆش کرد، بۆ ڕۆیشتن بۆ دوورگەی (ڤاسیلیڤسکی)[1] شەقامی "ڤ..."ی هەڵبژارد، دەتوت پەلەی بەئەنجامگەیاندنی کارێکی هەیە، ئاسایی لە کاتی ڕۆیشتندا، بەبێ ئەوەی ئاگاداری شەقامەکە بێت، لەژێر لێوەوە شتێکی دەوت، تەنانەت هەندێکجار بە دەنگی بەرز لەگەڵ خۆیدا دەدوا و ئەمەیش ڕێبوارەکانی سەرسام کردبوو، گەلێک لەو ڕێبوارانە بە سەرخۆشیان دەزانی.

٤

نامەکەی دایکی تەواو بێحەوسەڵەی کردبوو، بەڵام لەبارەی گرنگترین و سەرەکیترین مەسەلەوە، بۆ چرکەیەکیش، تەنانەت کە هێشتا لە خوێندنەوەی نامەکەیش نەبووبووەوە، بە دوودڵی بڕیارێکی زۆر قورس و بنبەستی لەسەر مەسەلەکە دا: "تا من مابم، ئەم شووکردن و ژنهێنانە سەرناگرێت، جەنابی لوژنییش قیر بە قەرەس!" بە تەوسەوە، لەگەڵ هەستکردن بە سەرکەوتنی بڕیارەکەی خۆشحاڵی و تووڕەییەکیشی تێگەڕا، لەبەر خۆیەوە کەوتە ورتەورت: "بەڵێ، مەسەلەکە زۆر ڕوونە.. نا، دایکە، نا، دونیا، ئێوە ناتوانن فریووم بدەن! تازەبەتازەیش داوای لێبوردن دەکەن، کە پرسیان بە من نەکردووە و خۆیان بڕیاریان داوە! بێگومان لەو باوەڕەیشدان، کە ئیتر ناکرێت ئەو پلانە هەڵوەشێتەوە، وەلێ دەبینن کە ئەوە دەکرێت یان نا! چ

---

[1] *Vasilievsky*

پاساوێکی گرنگیش دەهێننەوە! دەڵێن پیتەر پیتروڤیچ هێند دەربەست و ئەوەندە سەرقاڵە، کە تەنانەت دەبێت زەماوەندەکەی لە دەرفەتێکی زۆر کەم یان لە وێزگەی شەمەندەفەردا بکات. نەخێر، دونێچکا، چاک دەزانم دەتەوێت لەبارەی چ مەبەستێکەوە بە درێژی لەگەڵمدا بدوێیت، ئەوەیش دەزانم کە هەموو ئەو شەوە لە ژوورەکەدا پیاسەت کردووە، بیرت لە چی کردۆتەوە و بەرانبەر وێنەکەی مریەمی پاکیزە، کە دەستکردی مامۆستایانی "غازان"ە و لە ژووری خەوتنی دایکمدایە، بۆچی دووعا و نزات کردووە. سەرکەوتن بە چیای "جولجوتا"[1]دا سەختە: ئا.. کەواتە بڕیارەکە بە سەختی دراوە، تۆ ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا[2]، دەتەوێت ببیتە ژنی پیاوێکی کارا و ئاقڵ کە خاوەنی سەرمایەیە (دیارە لەبەر ئەوەی خاوەن سەرمایەیە، ئیتر ئەوە شتی سەرەکی و ڕەزایەتبەخشە) بە قسەی دایکم لە دوو جێگا کار دەکات و هاوبیری نەوەی نوێیە و بە لای دونیایشەوە گوایا پیاوێکی میهرەبانە. وشەی "گوایا" لە هەموو شت سەرنجڕاکێشترە! دونێچکایش هەر لەبەر خاتری ئەو "گوایە" شووی پێدەکات.. زۆر باشە! زۆر باشە! بەڵام دەبێت تۆ بە دوای ئەوەدا بگەڕێیت، کە چۆن دایکم دەربارەی "نەوەی نوێ" بۆی نووسیووم؟ تەنیا لەبەر ئەوەی تایبەتمەندیی ئەو پیاوە دیاری بکات یان لەبەر دووربینیی خۆی، تا خۆشەویستیی من بۆ جەنابی لۆژین بجوڵێنێت، ئای فێڵبازەکان!

---

[1] گولگوتا یان جولجوتا Golgotha چیایەکی نزیک بە ئۆرشەلیمە، لەوێ مەسیح لە خاچ دراوە.

[2] *Avdotia Romunovna*

پێویستە لایەنێکی تریش ڕوون بکرێتەوە: تا چەند ئەم دووژنە لەو ڕۆژە و لەو شەوە و تەنانەت دوای ئەوەیش لەگەڵ یەکتریدا ڕاستوڕەوان بوون؟ ئایا هەموو قسەکانی نێوان ئەو دووانە هاتۆتە سەر زمانیان یان خۆیان وایان داناوە لە دڵ و بیری هەردووکیاندا یەک شت هەیە و ئەو شتەیش پێویست ناکات بە وشە بوترێت، چونکە وتنەکەی بێهودە و زیادەیە، بێگومان، تا ڕادەیەک هەر ئەمەیان بووە.. لە نامەکەدا دیارە. بە لای دایکمەوە پیاوەکە کەمێک توندە و بە سادەیی خۆی ئەمەی بە دونیا وتووە. بێگومان ئەویش هەڵچووە و بە تووڕەیی وەڵامی داوەتەوە. هەڵبەتە! کێ تووڕە نابێت کاتێک مەبەستێکی لا تەواو ڕوون و ئاشکرا بێت، کەچی پرسیاری ساف و سادەی لێبکرێت، بە تایبەتی ئەگەر پێشتر بڕیاری تەواوی ئەوە درابێت و قابیلی چەندوچوون نەبێت! ئیتر ئەمە چییە کە بۆی نووسیوم: "رودیا، دونیات خۆش بوێت، ئەو لە خۆی زیاتر تۆی خۆش دەوێت" ئایا ئەمە پەشیمانییەک نییە، کە لە ناوەوەیدا ئازاری دەدات بەوەی قایل بووە کچەکەی ببێتە قوربانی بۆ کوڕەکەی؟ "تۆ ئومێدمانیت، تۆ هەموو شتێکمانیت!" ئای دایکە!

ڕقێکی ئەستوور لە دڵیا ئاگری دەسەند و ئەگەر لەو کاتەدا جەنابی لۆژینی بدیایە، دەیکوشت. ڕاسکۆلنیکۆڤ کەوتە دوای باهۆزەکانی نێو سەری و بەردەوام بوو لەسەر بیرکردنەوە: "ئا، ئەمە ڕاستە، بەڵێ، ڕاستە کە لەگەڵ مرۆڤدا دەبێت وردەوردە و بە پارێز نزیک بکەویتەوە بۆ ئەوەی بکرێت باشی بناسیت". بەڵام جەنابی لۆژین دیارە، شتی سەرەکی ئەوەیە کە ئەو "کەسێکی بەکار و گوایا میهرەبانە" بۆ گاڵتەیە، بار و سندووق لەسەر گیرفانی خۆی بار دەکات، جا چۆن میهرەبان نەبێت؟ لەگەڵ ئەمانەیشدا هەردووکیان،

واتا بووک و دایک، لەگەڵ کابرای دێهاتیا بڕیویانەتەوە بە گالیسکەکەی ئەو سەفەر بکەن کە حەسیری تیا داخراوە (ئاخر من خۆم سەفەری ئەو ناوەم کردووە) باشە، نەوەد فەرسەخە، دوای ئەویش هەزار فەرسەخی تر "بە چاکی و خۆشی بە شەمەندەفەری پلە سێ سەفەر دەکەین"، ماقووڵیشە چونکە دەبێت پێ بە قەدەر بەڕەکەت ڕابکێشیت، کەواتە تۆ، جەنابی لۆژین، چ کارەیت؟ ئاخر ئەمە بووکی تۆیە.. بۆ دەبێت نەزانیت کە دایکی کچەکە بۆ خەرجیی ڕێگە قەرزی کردووە؟ هەڵبەت، تۆ لەم ڕووەوە حسابێکی بازرگانییانە دەکەیت: مامەڵەکە یەکسان و لە سوودی هەردوولادایە، کەواتە دەبێت خەرجییەکەیشی نیوەبەنیوە بێت، تەواو وەک ئەو پەندەی دەڵێت: "برامان برایی و کیسەمان جیایی" وەلێ لێرەیشدا ئەم پیاوە کارامەیە دەشێت کڵاوی لەسەر نابن: ئاخر، کرێی بار لە کرێی خۆیان کەمترە، لەوانەیە هەر بە بەلاش بێت. ئایا ئەم دوو ژنە هەموو ئەم شتانەیان نەبینیووە، یان نەیانویستووە بیبینن؟ چەندە دڵخۆش و قایلن؟ جا ئەمە هێشتا گوڵەکانە و میوەکان لە دواوەن. بەڵام ئەوەی گرنگە، چروکی و ڕژدی نییە، بەڵکو ئەو شێوازەیە کە هەموو ئەمانەی تەگبیر کردووە، ئاخر، ئەمە قسەی دوای هاوسەریەتیی و بۆ ئێستا جۆرە پێشبینییەکی پەیامبەرانەیە! بەڵام دایە، تۆ بە چ بۆنەیەکەوە کەوتوویتە دوای ئەم بیرە؟ بە چی ڕێگەی پترۆزبورگ لەبەر دەگریت؟ بە سێ ڕۆبل یان وەک پیرێژنەکە دەڵێت، بە دوو "گەلای چرووک" هوم! ئەی لە پترۆزبورگدا چۆن دەژی؟ ئەو کە بە چەند بەڵگەیەک لەوە گەیشتووە تەنانەت لە سەرەتای کارەکەشدا ناتوانێت دوای زەماوەند لەگەڵ دونیادا بژی، گوایا پیاوە ئازیزەکە لەم بارەیەوە شتێکی لەدەم دەرپەڕیووە و وا خۆی نیشان داوە. هەرچەندە دایکم تەواو حاشا لەم

مەسەلەیە دەکات و دەڵێت "خۆم قبووڵی ناکەم" کەواتە بەتەمای کێیە؟ بە تەمای ئەو سەدوبیست ڕۆبڵەی کە دەبێت قەرزەکەی ئافاناس ئیڤانۆڤیچیش لەو بدرێتەوە؟ سەرپۆشی زستانە دەچنێت؟ دەستکێشی جوان دروست دەکات، چاوە کزەکانی لەکیس دەچێت، بەڵام سەرپۆشەکان لە ساڵێکدا بیست ڕۆبڵ دەخەنە سەر سەدوبیست ڕۆبڵەکە، من ئەمە دەزانم. دیارە هەموو ئومێدێکی ئەو بەزەیی جەنابی لۆژینی خانەدانە: "بێگومان خۆیشی پێشنیاز و جەختیش لە من دەکات" بەڵێ، هەروایە، چاوەڕێ بە! ئای لەو دڵە پاکە شیلەرئاسایانەی[1] بەردەوام ئاوا خۆشباوەڕن: تا دواچرکە یەکێک وەک پەڕی تاوس دەڕازێننەوە، تا کۆتایی بڕوایان بە چاکە هەیە نەک خراپە، ئەگەرچی هەست بە هەموو شتێک دەکەن، بەڵام بە هیچ جۆرێک پێشەکی قسەیەکی ڕاست ناکەن، تەنانەت بیریشی لێناکەنەوە و بە هەردوو دەستیان هەقیقەت دەدەنە دواوە، تا ئەو کاتەی کەسێکی لێزان بە دەستی خۆی کڵاویان دەکاتە سەر. بەڕاست: دەبێت ئەم جەنابی لۆژینە میداڵی شانازی هەبێت یان نا؟ گرەو دەکەم کە میداڵی "ئانای پاکیزە"ی هەیە و لە کاتی میوانداریکردنی لە لایەن کاربەدەست و بازرگانەکانەوە، دەیکات بە خۆیدا، ڕەنگە لە ڕۆژی زەماوەندەکەیشیدا هەروا بکات: ئاە.. خوا بکەم نینۆکی سەرخوراندنی نەبێت ".. باشە، ئەوە دایکم وایە، خوا تەمەنی درێژ بکات وا دروست بووە، ئەی دونیا تۆ بۆ؟ دونیچکای ئازیزم، من تۆ دەناسم، دوابینینی یەکتریمان تەمەنت بیست ساڵان بوو، من ڕەوشتی تۆم ناسیووە، تەنانەت کە دایە دەڵێت: "دونیا بەرانبەر زۆر شت خۆڕاگرە" من ئەمە

---

[1] Schiller شاعیری ڕۆمانتیکی ئەڵمانی، کە لە کۆتایی سەدەی هەژدەدا ژیاوە.

دەزانم، من دوو ساڵ و نیو پێش ئێستا ئەوەم زانیووە و لەو کاتەوە کە دوو ساڵ و نیو تێپەڕیووە، بیرم لەوە کردۆتەوە. بەڵێ، دەربارەی ئەوەی کە "دونیا دەتوانێت بەرگەی زۆر شت بگرێت". ئەگەر ئەو بتوانێت بەرگەی جەنابی سڤیدریگایلوف بە هەموو ناتەواویەکانییەوە بگرێت، ئەوە گومان لەوەدا نامێنێت کە بە ڕاستی دەتوانێت بەرگەی گەلێک ناخۆشیی تر بگرێت، ئێستا ئەو و دایە وا دەزانن دەتوانن لەگەڵ جەنابی لۆژیندا هەڵبکەن، ئەو کەسەی خاوەنی ئەو گریمانەیەیە، کە دەبێت ژن لە نێو هەژاران بێنێت بۆ ئەوەی ژن هەمیشە چاولەبەری چاکەی مێردیان بن. هەر ئەو کەسەی کە تا ڕادەیەک لە یەکەم پێکگەیشتنندا ئەم بیروباوەڕەی دەربڕیووە! باشە، با بڵێین ئەم قسەیەی لەدەم دەرچووە، هەرچەندە پیاوێکی بە ئاوەز و خاوەن لۆژیکە (زۆر لەوانەیشە کە ئەم مەبەستەی هەرگیز لەدەم دەرنەپەڕیبێت، بەڵکو بەتایبەتی ویستبێتی زووتر دەریببڕێت) بەڵام دونیا، دونیا بۆ؟ لای ئەو ئەم پیاوە ڕوون و ئاشکرایە و دەیەوێت ژیان لەگەڵ ئەودا بەسەر بەرێت! دونیا بە نان و ئاوی وشک قەناعەت دەکات، بەڵام ڕۆحی خۆی نافرۆشێت و ئازادیی خۆیشی هەرگیز بە ژیانی ڕابواردن ناگۆڕێتەوە، تەنانەت بە هەموو ناوچەی شلزویگ هولشتاینیشی [1] ناگۆڕێتەوە تا دەگاتە جەنابی لۆژین. نەخێر، ئەو دونیایەی من ناسیم، ئەمە نەبوو.. هەڵبەتە ئێستایش هەر نەگۆڕاوە!.. بێگومان وایە، نموونەی سڤیدریگایلوف دژوارن و هەڵکردن لەگەڵیاندا

---

[1] Schleswig- Holstein سالی ١٨٦٤ پروسیا و نەمسا لەسەر هەرێمی شلزویگ هولشتاین شەڕیان لەگەڵ دانیمارکدا کرد و پاشان بەو ناوەوە چووە سەر وڵاتی پروسیا.

زەحمەتە! دیارە ئەوەیش زەحمەتە کە هەموو تەمەنت بە شاراندا بگەڕێیت و بە دووسەد ڕۆبڵ لەساڵێکدا مامۆستایی بکەیت. لەگەڵ ئەمانەیشدا من ئەوە دەزانم کە خوشکەکەم ئەوەی پێ باشترە وەک زنجییەکان ببێتە کۆیلەی موڵکداران یان وەک لیتوانییەکان ببێتە بەندەی ئەڵمانەکان، نەک ڕۆح و هەستی خۆی بداتە یەکێک کە تاهەتاهەتایە حەزی لێنەکات و بە هیچ پێیەوە نەبەستریێت، بەڵکو تەنیا و تەنیا لەبەر سوودی شەخسی، سوودێکی سووک و ڕسوا.
گریمان جەنابی لۆژین زێڕێکی بێگەرد یان پارچە ئەڵماسیش بێت، هێشتا ئەو هەر بەوە قایل نییە ببێت بە ژنی شەرعیی جەنابی لۆژین. ئەی چۆن قایل بووە، نهێنیی ئەم کارە لە چیدایە؟ گرێکوێرەکە لە کوێدایە؟ مەبەستەکە ڕوونە: بۆ خۆی و ئاسوودەیی خۆی و تەنانەت بۆ ئەوەیش کە لە مەرگ ڕزگاری بێت، ئەو بە هیچ جۆرێک هەر خۆی نافرۆشێت، بەڵام دەیەوێت لەبەر خاتری یەکێکی تر ئەمە بکات، بۆ کەسێکی ئازیز و خۆشەویست خۆی دەفرۆشێت. هەموو مەبەستەکە لێرەدایە: لەبەر خاتری برا و دایک خۆی دەفرۆشێت. هەموو شتێک دەفرۆشێت! بەڵێ، چۆن پێویست بکات لەم لایەنەوە بیروباوەڕە ئاکارییەکانی خۆیشمان دەکوژین! ئازادی، ئاسودەیی، تەنانەت ویژدانیش، هەر هەمووی دەبەینە بازاڕ و مامەڵەیان پێدەکەین، چی دەبێت با ببێت، بەو مەرجەی ئەو کەسانەی خۆشمان دەوێن، بەختەوەر بن. بێ لەمانەیش، پاساوی تایبەت دادەهێنین، لە یەسوعییەکانەوە شت وەردەگرین و دەشێت بۆ ماوەیەک ئارامی بدەینە خۆمان و بڕوا بە خۆمان بهێنین، کە بۆ کاری چاکە، دەبێت ئەمە بکەین و هەر دەبێت بیشیکەین. بەڵێ، ئێمە واین و هەموو شتێکیش وەک ڕۆژی ڕوون وایە، ئەوە ئاشکرایە، کە هیچ کەس

بێجگە لە ڕادیون ڕومانوڤیچ[1] لەئارادا نییە، هەر ئەوە پلەی یەکەمی ئەو بڕیارەی بۆ دراوە، باشە، بێگومان دەبێت بەختەوەری بۆ ئەو دەستەبەر بکرێت، خەرجیی زانکۆی فەراهەم بهێنرێت، بکرێتە هاوبەشی نووسینگەکەی و هەموو ئاییندەی بۆ دابین بکرێت. دوور نییە ئەویش لە داهاتوودا دەوڵەمەند و بەڕێز بێت و ڕەنگە ناو و ناوبانگیشی لە کۆتایی تەمەنیدا بگاتە دواپلە. ئەی دایکە؟ چۆن کچەکەی دەکاتە قوربانی؟ بەڵام مەسەلەکە ڕودیایە، ڕودیای بێوێنە، ئازیز و ناوازە، ئاخر چۆن دەبێت بۆ کوڕێکی ئاوا بێوێنە تەنانەت کچێکی وایش نەکرێتە قوربانی؟ ئای لەو دڵە خۆشەویست و زاڵمە! وەلێ ئەمە هیچ نییە: هەر لەمەوە دەبێت ئێمە ئاگاداری چارەنووسی سۆنیایش بین، سۆنیا، سونێچکا مارمیلادۆڤ، سونێچکا کە تا دنیا بمێنێت، ئەویش نەمرە. ئایا ئێوە هەردووکتان بە تەواوی لە مەودای ئەم قوربانییە تێگەیشتوون و هەڵتان سەنگاندووە؟ دڵنیان؟ لە دەرەوەی تواناتاندا نییە؟ ئایا قوربانییەکی بەکەڵکە؟ ئاقڵانەیە؟ دونیا گیان، ئاخۆ دەزانیت کە چارەنووسی سۆنیای ئازیز لەوە خراپتر نییە کە ژیان لەگەڵ جەنابی لۆژیندا بەسەر بەریت؟ دایکم دەنووسێت: "چ خۆشەویستییەک لەئارادا نییە" جا چی مایەوە! ئەگەر خۆشەویستی تیا نەبێت و ڕێزیشی هەر تیا نەبێت، ئیتر چی هەیە؟ ئەی ئەگەر بە پێچەوانەوە نەفرەت و بێزاری و سووکایەتیی تیا بێت، ئەوسا چۆن؟ کەواتە ئەو کاتە وا دەردەچێت کە دەبێت بە ناچاری ئاگاداری "پاکیزەیی" بیت، وانییە؟ تێدەگەین؟ دەزانن مانای "پاکیزەیی" چییە؟ دەزانن "پاکیزەیی" لۆژین لەگەڵ "پاکیزەیی" سۆنیادا یەکێکە، تۆ بڵێ

[1] *Radion Romanovich*

ئەویان خراپتر و قێزەونتر و نەگریسترە؟ چونکە تۆ، دونیێچکا، لێرەدا تەنیا باس لە ئاسوودەیی و خۆش گوزەرانیی زیاتر دەکەیت، لە کاتێکدا لەوێ تەنیا و تەنیا ترسی لەبرسانامردن هەیە، دونیێچکا، ئەم "پاکیزەیی"یە بە نرخێکی گران، زۆرزۆر گران کۆتایی دێت.
چاکە، ئەی ئەگەر پاشان دەرکەوت کە توانای هەڵگرتنی ئەو بارە گرانەت نییە، تۆبە دەکەیت؟ چەند خەم و خەفەت دەچێژیت! نەفرەت دەکەیت. بەخوڕ فرمێسکی نهێنی دەڕێژیت، چونکە تۆ مارفا بتروڤنا نیت؟ ئەی ئەوسا لەگەڵ دایکماندا چۆن؟ ئەو لە ئێستاوە ئازار دەکێشێت و بێتاقەتە، ئەی ئەو کاتەی کە هەموو شتێکی بۆ ڕوون دەبێتەوە؟ ئەی من؟ بەڕاستِ هیچ بیرت لە من کردۆتەوە؟ من، دونیێچکا، قوربانیدانی تۆم ناوێت و پێویست ناکات، نا، دایکە، نامەوێت، مەحاڵە، تا من مابم، مەحاڵە بهێڵم ئەو کارە سەربگرێت. هەرگیز قبووڵی ناکەم".
لەناکاوێکدا ڕاسکۆلنیکۆڤ هاتەوە سەر خۆی و بێدەنگ بوو.
"مەحاڵە ئەو زەماوەندە سەربگرێت؟ باشە تۆ چی دەکەیت بۆ ئەوەی کە سەرنەگرێت؟ ناهێڵیت؟ بە چ هەقێک؟ دەتوانیت لای خۆتەوە بە چ بەڵێنێک قایلیان بکەیت تا ئەو هەقەت بدەنێ؟ کە خوێندنت تەواو کرد و چوویتە سەر کار، هەموو چارەنووس و ئایندەی خۆت بۆ ئەوان تەرخان دەکەیت؟ ئەم قسانەمان زۆر بیستووە، قسەی بێناوەرۆکن! ئێستا چۆن؟ دەبێت هەر ئێستا کارێک بکەیت، تێدەگەیت؟ بەڵام تۆ دەتوانیت چی بکەیت؟ تۆ باری بەسەریانەوە و گیرفانیان هەڵدەتەکێنیت. ئەوان ئەم پارەیە لەسەر سەد ڕۆبڵی خانەنشینییەکەیان وەردەگرن یان لە سفیدریگایلوفی قەرز دەکەن، تۆیش! ئەی ملیونێری ئایندە و ئەی ئەو خودایەی کە چارەنووسی ئەوانت لە نێو مشتدایە،

چۆن ئەمانە لە دەست سڤیدریگایلوڤەکان و ئافاناسی ئیڤانۆڤیچ فاخروشینەکان دەپارێزیت؟

دە ساڵی تر؟ تا دە ساڵی تر دایک لەدەست دەستماڵ دروستکردن و ڕەنگە ئەمەندەیش فرمێسک بڕێژێت، کوێر بێت.. یان بە هۆی نەخواردنەوە تووشی سیل بێت. ئەی خوشکت؟ چاک بیر بکەوە، تا دەساڵی دی یان هەر لەم دە ساڵەدا خوشکت چی لێدێت؟ ها تێگەیشتیت؟"

ڕاسکۆلنیکۆڤ بەم پرسیارانە ئازاری خۆی دەدا و وەک چێژیشی لێوەربگرێت وابوو، وەلێ هەموو ئەم پرسیارانە تازە و کتوپڕ نەبوون، بەڵکو کۆن و بێزارکەر و دێرینە بوون، ماوەیەک بوو ئەمانە ئازاریان دەدایە و بە تەواوی دڵیان دەپرواند، دەمێک بوو ئەو خەمانە لە دەروونیدا ڕیشەیان داکوتابوو، گەورە دەبوون، بەسەر یەکدا کەڵەکە دەبوون و لەم دواییەشدا ئیدی پێگەیشتبوون و خەست ببوونەوە، بە جۆرێکی ترسناک ببوونە پرسیارگەلێکی سەیر و دڵ و ئەقڵی ئەویان ئازار دەدا و سەرسەختانە داوای وەڵامیان دەکرد. وا ئێستایش نامەکەی دایکی وەک هەورەبروسکە بەسەریدا کێشا، ئەوە دەرکەوت کە ئێستا تەنیا خەم و خەفەت خواردن بێسوودە و دەردی بێدەرمانە و چەندوچوونی تەنیا دەربارەی پرسیارە بێوەڵامەکان ئیدی بەدەرد ناخوات، دەبێت کارێکی بۆ بکرێت. هەرچەندە زووتریش بکرێت، چاکترە. بە هەر نرخێک بووە، پێویستە بڕیارێک بدرێت، هەر جۆرە بڕیارێک بێت و یان.. لەپڕا بە تووڕەییەوە هاواری کرد:

- یان بەیەکجاری پشت لە ژیان دەکەم! وەک خۆی گوێڕایەڵی چارەنووس دەبم و بۆ هەمیشە قبووڵی دەکەم، هەموو جۆرە هەقێکی هەوڵدان و ژیان و خۆشەویستی لە خۆمدا دەکوژم.

لەپڕێکدا پرسیارەکەی مارمیلادۆڤی هاتەوە یاد:
.."تێدەگەیت، بەڕێز گیان. یانی چی ئەگەر نەتوانیت ڕوو لە شوێنێک بکەیت؟ چونکە پێویستە هەموو کەسێک بتوانێت، هیچ نەبێت ڕوو لە شوێنێک بکات.."
لەپڕێکدا ڕاسکۆلنیکۆڤ تەزوویەکی پیادا هات، بیرۆکەیەک، هەمان بیرۆکەی دوێنێ، دیسان لەسەری دایەوە، وەلێ بە لایەوە ئەوە سەیر نەبوو، چونکە دەیزانی، پێشتریش هەستی بەوە کردبوو کە ئەم بیرۆکەیە جارێکی تر سەری لێدەداتەوە، خۆیشی هەر چاوەڕێ بوو، بێجگە لەوە، بیرۆکەکە هیچ پەیوەندییەکی بە دوێنێوە نییە، وەلێ جیاوازییەکە ئەوەیە کە مانگێک پێشتر و تەنانەت تا دوێنێش بیرۆکەکە بێجگە لە ئارەزوویەک زیاتر هیچی تر نەبوو، کەچی ئێستا.. ئێستا وەک ئارەزوویەک دەرنەکەوت، بەڵکو بە شێوەیەکی تازە و ترسناک و تەواو نادیار خۆی نیشاندا، خۆیشی ئەمەی باش دەزانی.. لەپڕا شەپۆلی خوێن لەسەریدا جۆشی خوارد و بەرچاوی ڕەش بوو. بەپەلە ڕووی وەرگێڕا، بەدوای شتێکدا دەگەڕا، حەزی کرد دابنیشێت، بەدوای سەکۆیەکدا وێڵ بوو، لەو کاتەدا بە شەقامی (ک..)دا تێدەپەڕی، لە دووری سەد مەترێکەوە سەکۆیەکی بینی، تا توانیی، هەنگاوەکانی فراوانتر کرد، بەڵام لە ڕێگەکەیدا پێشهاتێکی بچووک بۆ چەند چرکەساتێک تێکڕای سەرنجی بۆ خۆی ڕاکێشا.
کە بەدوای سەکۆکەدا دەگەڕا، لە بەرانبەریدا، نزیکەی بیست هەنگاوێک لەوبەریەوە، ژنێکی ڕێبواری بینی، لە سەرەتادا هیچ سەرنجی ڕانەکێشا، هەروەک شتەکانی تری بەرانبەری کە دیار بوون و ئەم سەرنجی نەدەدان، زۆرجار ئەوەی بەسەر هاتبوو کە لە گەڕانەوەیدا بۆ ماڵەوە، هەرگیز ئەوەی لە یاد نەمابێت کە لە کام لاوە

هاتۆتەوە، لەسەر ئەم ڕەوشە ڕاهاتبوو، وەلێ لە ژنە ڕێبوارەکەدا شتێکی سەرسوڕهێن و تایبەت خۆی حەشاردابوو، کە لە یەکەم بینیندا بەرچاو دەکەوت و وردەوردە بە سەختی سەرنجی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا، لە پێشدا بێدەربەست و تەنانەت بێمەیلانە تەماشای کرد و پاشان زیاتر و زیاتر بەرەو لای کشا، لەپڕا ویستی بزانێت چی لەو ژنەدایە، کە هێندە سەرسووڕهێنە! وا دەردەکەوت کچێکی زۆر جوان بێت، لەم گەرمایەدا بە قژی پەخشانەوە بێچەتر و دەستکێش لە حاڵێکدا بە جۆرێکی پێکەنینهێنەر دەستی ڕادەتەکاند و بەڕێدا دەڕۆیشت، کراسێکی ئاوریشمینی ناسکی وای لەبەردابوو، کە ئەویش بۆ خۆی وەک شتێکی سەیر دەهاتە بەرچاو، دوگمەی کراسەکەی بە حاڵەحاڵ داخرابوون و لە پشتەوە، لە دەوری کەمەریدا، لەو جێگایەوە کە داوێن دەست پێدەکات، قڵیشێکی تیابوو، یەکێک لە دوگمەکان تەواو شل ببووەوە و تەکانی دەخوارد، دەسماڵێکی بچووکی بە گەردنە ڕووتەکەیەوە ئاڵاندبوو، کە بە لاروگەوێڕی بەستبووی، زیاد لە هەموو ئەمانە، کیژەکە هەنگاوی ناجۆری دەنا و پێی هەڵدەکەوت و سەرسمی دەدا، ئەم پێکگەیشتنە سەرئەنجام هەموو هەست و کونپشکنی ڕاسکۆلنیکۆڤی بزواند، ڕێک لە پاڵ سەکۆکەدا بە کچەکە گەیشت، وەلێ کچەکە هەر ئەوەندەی لە سەکۆکە نزیک کەوتەوە، بەبێ سێودوو خۆی دایە سەر لایەکیدا و سەری بە پشتەکەیەوە نا، گوایا لەبەر ئەوەی زۆر ماندوو بووە، چاوی نووقاند.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە بە جوانی لێی ڕاما، زوو زانیی تەواو مەستە، بینینی ئەم دیمەنە زۆر سەیروسەمەرە دەهاتە بەرچاو، تەنانەت ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری کردەوە نەوەک بە هەڵەدا چووبێت: لە بەرانبەریدا دەموچاوێکی سپی، قژ زەرد، ورد و قەشەنگ و بێنیهایەت جوان،

تەمەنی شانزە ساڵ، یان پانزە ساڵ دەینواند و کەمەکێک ڕووی خوێنتێزاو و تا ڕادەیەک ئاوساوی پێوە دیاربوو، وەک ئەوەی کچە ئاگای لە هیچ نەمابێت، قاچی نایە سەر قاچی و لەڕادەبەدەر ئەندامی لەشی دەرکەوتن، هەموو جووڵە و بزاوتێکی ئەوەیان دەردەخست، کە هیچ ئاگای لەوە نەماوە لەسەر شەقامێکدایە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ دانەنیشت، بەڵام خەیاڵی ڕۆشتنیشی نەبوو، بە سەرسووڕماوییەوە بەرانبەری وەستا، هەمیشە ئەم شەقامە لە دەشتێکی چۆڵ چووە، بە تایبەتی ئێستا، لەم سەعات دووی پاش نیوەڕۆگەرمەدا کەسی تیا نەبوو، لەگەڵ ئەمەیشدا کەمێک دوورتر لەمان بە پانزە هەنگاوێک، پیاوێک لە کەناری شەقامەکەدا وەستابوو، لە هەڵسوکەوتیدا بە چاکی هەست بەوە دەکرا، کە ئەویش دەیەوێت بۆ مەبەستێک لە کچەکە نزیک بێتەوە، زۆر لەوە دەچوو ئەویش کچەکەی لە دوورەوە دیبێت و کەوتبێتە دوای، وەلێ ڕاسکۆلنیکۆڤ لێی تێک دا، پیاوەکە بە تووڕەییەوە تەماشای ڕاسکۆلنیکۆڤی دەکرد، ئەگەرچی دەیویست ئەم پێی نەزانێت، کێچ کەوتبووە کەوڵی و هەر چاوەڕێی ئەوە بوو ئەم شڕەپۆشە بەڵایە دوور بکەوێتەوە و نۆرە بگاتە سەر ئەو، مەبەستەکە ڕوون و ئاشکرابوو، تەمەنی پیاوەکە لە دەوری سی ساڵاندا بوو، لەشپڕ، قەڵەو، سوروسپی بوو: تەواو وەک ئەوەی شیرت لەگەڵ خوێندا تێکەڵ کردبێت، لێوی سوور و سمێڵێکی باریک و بەرگیشی تا بڵێی شیک بوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕق بە تەواوی ئەوکی گرت و لەپڕێکدا ویستی هەر چۆنێک بووە، سووکایەتیەک بەم هەرزە چەورونەرمە بکات، کەمێک کچەکەی بەجێ هێشت و بەرەو پیاوەکە چوو، مستەکۆڵەی ئامادە و لە ڕقا دەمی کەفی کرد بوو، پێکەنی و هاواری لێکرد:

- ها سفیدریگایلوڤ لێرە چی دەکەیت؟
پیاوەکە ناوچاوی دا بەیەکدا و بەسەر سوورپماوییەکی لووتبەرزانە و دەنگێکی زبرەوە پرسی:
- یەعنی چی؟
- یەعنی بڕۆ و وێڵ بە.
- چەند لە خۆت ڕادەبینیت، سەگ..
ئەمەی وت و قامچیەکەی بەرز کردەوە، ڕاسکۆلنیکۆڤ بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کە پیاوەکە بە ئاسانی دەرەقەتی دوانی وەک ئەم دێت، دایە بەر مشتەکۆڵە و خۆی دا بەسەریدا، لەو کاتەدا یەکێک لە پشتەوە توند گرتی: پاسەوانێک کەوتە بەینیانەوە:
- بەسە بەڕێزان، لە شوێنی گشتیدا پێکدا هەڵمەپرژێن، چیتان دەوێت؟
کە لە بەرگە شڕەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤی ڕوانی، بە ئاوازێکی جیدی وتی:
- تۆ کێیت؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ باش لێی ڕاما، لە بەرانبەریدا ڕووی سەربازێکی ئازای بینی، کە سمێڵ و ڕیشی بە لای لاجانگیدا سپی بوون و ڕوانینێکی لێزانی هەبوو، زوو دەستی گرت و بە دەنگی بەرز وتی:
- من پێویستم بە تۆیە، من ڕاسکۆلنیکۆڤم، کۆنە خوێندکاری زانکۆم..
پاشان ڕووی تێکرد و وتی:
- دەبێت تۆیش بیزانیت، وەرە با شتێکت پیشان بدەم..
بەدەم قسەکانەوە دەستی پاسەوانەکەی گرت و بەرەو لای سەکۆکەی هێنا.
- وەرە، تەماشای بکە، تەواو سەرخۆشە، ئێستا بەم شەقامەدا تێدەپەڕی، کێ چووزانێت کێیە؟ بەڵام لەوە ناچێت کە ئەوە پیشەی بێت، زیاتر شیمانەی ئەوەی هەیە، کە سەرخۆشیان کردبێت و

فریوویان دابێت.. یەکەمجارە.. تێدەگەیت؟ هەر بەم حاڵەوە بەرەڵایان کردۆتە ناو کووچە و کۆڵان، بڕوانە، چۆن کراسەکەی دڕاوە، بڕوانە چۆنیان لەبەر کردووە: ئاخر خۆی لەبەری نەکردووە و ئەوان جلیان لەبەر کردووە، بێ لەوە دەستێکی نەشارەزا، دەستی پیاو لەبەری کردووە، ئەوە دیارە، ئێستا لەوێ بڕوانە، ئەو پیاوەی خۆی بە کەشخە دەزانێت و ویستم بیکوتم، من نایناسم و یەکەمجارە بیبینم، وەلێ ئەو کە ئەم کچە مەست و بێهۆشوگۆشەی لە ڕێگەدا بینی، حەزی لێکرد و زۆری ئارەزوو لێیە لێی نزیک بکەوێتەوە، چونکە لەو حاڵەیشدایە، بیفڕێنێ و بۆ لایەکی بەرێت.. بێگومان وایە، باوەڕ بکە من هەڵەنیم، من خۆم بینیم چۆن چاودێریی کچەکەی دەکرد و چاوی لێ کەلا نەدەخست، بەڵام من ڕێم لێگرت و ئێستا هەر چاوەڕێی ئەوەیە من بڕۆم، بڕوانە، کەمێک دوور کەوتەوە، وەک ئەوەی خۆی بە پێچانەوەی جگەرەیەکەوە سەرقاڵ بکات.. چی بکەین تا کچەکەی نەدەینێ؟ چۆن کچەکە ببەینەوە ماڵەکەی؟ بیری لێبکەرەوە!

پاسەوانەکە زوو لە هەموو شتەکان گەیشت، هەڵبەتە لە وەستانی کابرای قەڵەویش، ئەی کچەکە؟ پاسەوانەکە بەسەر کچەکەدا چەمایەوە و لە نزیکەوە لێی ڕوانی، سۆزێکی ڕاستگۆیانە لە ڕوویدا دەرکەوت و بەدەم سەرڕاوەشاندنەوە وتی:

- ئاخ، حەیف، هێشتا زۆر منداڵە، ڕاستە فریوویان داوە.

پاشان بانگی کچەکەی کرد:

-خانم، گوێ بگرە، ماڵتان لە کوێیە؟

کچەکە چاوە ماندوو مەستەکانی کردەوە و لەسەرخۆ لەوانەی ڕوانی، کە پرسیاریان لێدەکرد. بە دەست دەریکردن.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:

- گوێ بگرە، وەرە (لەو کاتەدا گیرفانی خۆی گەڕا و بیست کوپێکی دۆزیەوە و دەریهێنا) وەرە، بیگرە، سواری گالیسکەیەکی بکە و پێی بڵێ بیگەیەنێتە ماڵەوەیان، وەلێ دەبێت ناونیشانی ماڵەکە بزانین.
پاسەوانەکە پارەکەی وەرگرت و دیسان دەستی پێکردەوە:
- کچی باش، ها، کچی باش، هەر ئێستا گالیسکەیەکت بۆ دەگرم و خۆم دەتگەیەنم، بۆ کوێ دەفەرموویت؟ ها؟ ماڵتان لە کوێیە؟
کچە دیسان دەستی ڕاوەشاند و وتی:
- بڕۆ.. وازم لێ بێنە.
- ئای، ئای، ئەمە باش نییە! کچی باش، شەرمەزارییە، چ شەرمەزارییەک!
دیسان لە ڕووی سەرزەنشت و سۆزەوە بە تووڕەییەوە سەری ڕاوەشاند:
- بە ڕاستی کێشەیەکە بۆ خۆی!
لەگەڵ قسەکانیدا ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و خێرا بە سەرتاپای لەشیدا هەڵیڕوانی، زۆری بە لاوە سەیر بوو کە بەم جلە شڕوکۆنانەوە ئاوا پارە ببەخشێتەوە.
پاسەوانەکە پرسی:
- ئەم کچەت لە شوێنێکی لێرە دوورتر دیووە؟
- پێم وتیت، هەر لێرە، بە شەقامەکەدا تێدەپەڕی، لارەلارەی بوو، هەر کە گەیشتە سەکۆکە، بەسەریدا کەوت.
- چ بێشەرمییەک لەم ڕۆژانەدا ڕووی لە دنیا کردووە، خودایا! بەم منداڵییە و لەم کاتەدا و سەرخۆشی! هەڵیان خەڵەتاندووە، بێگومان وایە، جلەکانیشی دڕاوە.. ئای چ بێڕەوشتییەک بڵاو بۆتەوە.. پێدەچێت

خانەدانییش بێت و هەژار کەوتبن، لەم بابەتانە ئێستا زۆرن، دیارە خانومانە، وەک کچە خانەدانەکان.
دیسان بەسەریدا نوشتایەوە، ڕەنگە خۆیشی کچی هاوتەمەنی وای هەبێت کە وەک (کچە خانەدان و نازەنینەکان) بن و پەیڕەویی لە هەموو ئاداب و ڕەفتارێکی ڕەوشتباشەکان بکەن و لە ڕێوڕەسمی باو دەرنەچن.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە نیگەرانییەوە وتی:
- گرنگ ئەوەیە نەیدەین بە دەست ئەم بێڕەوشت و داوێنپیسەوە، بێگومان ڕسوای دەکات، دیارە دەیەوێت چی بکات! بێڕەوشتە نایشڕوات.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دەنگی بەرز دەدوا و بە دەستیشی ئاماژەی بۆ لای پیاوەکە دەکرد. ئەویش گوێی لە هەمووی بوو، لەوەدا بوو تووڕە بێت، بەڵام پەشیمان بووەوە و بە نیگایەکی نەفرەتلێکردنەوە وازی هێنا، ئینجا لەسەرخۆ، دە هەنگاو دوور کەوتەوە و دیسان وەستا.
پاسەوانەکە بەدەم بیرکردنەوەوە وتی:
- دەتوانین نەیدەینێ، بەڵام خۆزگا بمانزانیایە بۆ کوێی دەبەین! ئەگەر نا.. کچی باش، ئاها، کچی باش!
هەر بەدەم ئەم قسانەوە دیسان بەسەر کچەکەدا چەمایەوە.
کچەکە کتوپڕ بە تەواوی چاوی کردەوە و بە وردیی ڕوانی، وەک ئەوەی شتێکی دەستگیر بووبێت، لەسەر سەکۆکە هەستا و بەرەو ئەو شوێنە گەڕایەوە، کە لێی هاتبوو، بەدەم دەستڕاوەشاندنەوە وتی:
-ئاە.. بێشەرمەکان هێشتا دەستبەردارم نابن!
پاشان خێرا کەوتە ڕێ، بەڵام لەبەر ئەوەی لارەلارەی بوو، پیاوەکە لە ڕێگەیەکی ترەوە کەوتەوە دوای و چاوی لێنەدەتروکاند.

پاسەوانە سمێڵبابڕەکە بە جەختلێکردنەوە بە ڕاسکۆلنیکۆڤی وت:
- مەترسە، ناهێڵم.
کەوتە دوایان، پاشان هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە دەنگی بەرز وتییەوە:
- ئاە .. چ بێڕەوشتیەک بڵاو بۆتەوە!
لەو کاتەدا وەک شتێک بە ڕاسکۆلنیکۆڤدا چزابێت، بە تەواوی هەموو شتێکی لێ چەواشە بوو، لە دواوە هاواری لە پاسەوانەکە کرد:
- ئاها.. گوێ بگرە.
پاسەوانەکە ئاوڕی دایەوە. ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:
-وازی لێبهێنە، تۆ هەقت چییە؟ وێڵی بکە، لێی گەڕێ با ڕابوێرێت. (بە دەست ئاماژەی بۆ لای پیاوەکە کرد) ئاخر، تۆ چ هەقت بەسەرییەوە هەیە؟ پاسەوانەکە لە مەبەستی نەگەیشت، بە سەرسامییەوە چاوی لە لاوەکە بڕی، ڕاسکۆلنیکۆڤ پێکەنی، پاسەوان هەناسەی هەڵکێشا و کەوتە دوای پیاو و کچەکە، زۆر لەوە دڵنیا بوو کە ڕاسکۆلنیکۆڤ یان شێتە یان لە شێت خراپترە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ کە بە تەنیا مایەوە، بە تووڕەییەوە وتی: "بیست کۆپیکەکەی بردم، باشە، لەویش پارە وەردەگرێت و کچەکەی لە چنگ دەنێت و ئیدی کار لێرەدا بە کۆتایی دەگات.. باشە، ئەسڵەن من بۆ بیرم لە هاوکارییکردن کردەوە! ئاخر من بۆ یارمەتیی بدەم؟ ئایا من مافی ئەوەم هەیە یارمەتی خەڵکی بدەم؟ خوای دەکرد بە زیندوویی یەکیان دەخوارد، بە من چی؟ کەی من مافی ئەوەم پێدراوە بیست کوپیک ببەخشم، بۆ پارەی من بوو؟"
لەگەڵ ئەم قسە سەیرانەدا باری ڕاسکۆلنیکۆڤ نادروست بوو، لەسەر سەکۆ خاڵییەکە دانیشت، بیری ئاڵۆز بوو، تێکڕا هەموو

بیرکردنەوەیەکی ئەو چرکەساتەی دژوار دەهاتە بەرچاو، حەزی دەکرد بە تەواوی خۆی فەرامۆش بکات، هەموو شتێکی لەبیر بچێتەوە. پاشان بێتەوە سەر خۆی و لە نووکەوە دەست پێبکاتەوە، کە تەماشای گۆشە خاڵییەکەی سەکۆکەی کرد، وتی:

- کچی بێچارە، دێتەوە هۆشی خۆی، دەگری، پاشان دایکیشی دەزانێت.. لە پێشا لێی دەدات و پاشان بە قامچی دەکەوێتە وێژەی. ڕەنگە دوای ئەوە سووکایەتیی پێبکات و دەریبکات، ئەگەر دەرییشی نەکات، یەکێکی وەک داریا فرانتسوڤنا بۆن دەکات و ئەوسا کچە دەکەوێتە هاتوچۆی ئەملاوئەولا، دوای ئەوەیش نۆرەی خەستەخانەیە (هەمیشە ئەمە لەو کەسانە ڕوو دەدات، کە لەگەڵ دایکیاندا زۆر پاک دەژین و بە دزیی ئەوانەوە بێڕەوشتی دەکەن) دوای ئەوەیش.. دیسانەوە بۆ خەستەخانە، شەراب.. چایخانە و دیسان خەستەخانە.. دوای دوو سێ ساڵییش لە کار دەکەوێت، بەم جۆرە تێکڕا نۆزدە یان هەژدە ساڵ تەمەن بەسەر دەبات.. بۆ من لە مانەم نەبینیووە؟

ئەمانە چۆن بەم ڕۆژە گەیشتن؟ تەواو بەم شێوەیە.. ئاە. جا بە من چی؟ دەڵێن دەبێت وابێت، دەڵێن هەر ساڵەی ژمارەیەکی وا، یان ڕێژەیەکی سەدی هەیە کە وای لێبێت.. گۆڕبەگۆڕ چن، دیارە ئەمە بۆ ئەوەیە کە کەسانی تر ئاسوودە بژین و خەڵکی دی تەنگیان پێهەڵنەچنن، (ڕێژەی سەدی) بە ڕاستی ئەمانە وشەگەلێکی بەتامن، وشەی ئاسوودەبەخشن و زانستی! هەرکەوتیان لەسەدا چەند، دیارە ئیتر ترسی تیا نامێنێت، بەڵام ئەگەر وشەیەکی تری ئاسایی بێت، ئەوسا بێگومان جێی مەترسییە.. چونە ئەگەر دونیای ئازیزیش بکەوێتە ناو ئەو "لەسەدا چەند"ەوە! ئەگەر نەبوو بە یەکێک لەوانە، دەڕواتە نێو دەستەیەکی ترەوە.

لەپڕا ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری کردەوە: "بەڵام من بۆ کوێ دەچم؟ سەیرە! ئاخر من بە مەبەستێک کەوتمە ڕێ، هەر کە نامەکەم خوێندەوە، بەبێ وەستان کەوتمەڕێ.. بەرەو دوورگەی ڤاسیلیڤسکی بۆ لای ڕازومیخین[1]، ڕاستە.. ئێستا بیرم کەوتەوە، بەڵام بۆچی؟ بۆ بیری ڕۆیشتن بۆ لای ڕازومیخین ئێستا لە سەری داوم؟ سەیرە!
سەری لە خۆی سوورمابوو، ڕازومیخین هاوڕێیەکی کۆنی زانکۆی بوو، سەیرە ڕاسکۆلنیکۆڤ تا لە زانکۆ بوو، هاوڕێیەکی نەبوو، تێکەڵ بە کەس نەدەبوو، نەدەچووە لای کەس و ئەگەر یەکێک بهاتایە بۆ لای، بە زەحمەت پێشوازیی لێدەکرد، سەر ئەنجام زوو هەموو پشتیان تێکرد، نە لە دانیشتنی گشتیدا، نە لە گفتوگۆدا، نە لە ڕابواردندا و نە لە کاروباری تردا بەشداریی نەدەکردن. بە هەموو توانایەوە خەریکی خوێندن بوو، بیری لە خۆی نەدەکردەوە، بۆیە ڕێزیان لێدەگرت، بەڵام کەس خۆشی نەدەویست، زۆر هەژار و زۆریش لەخۆبایی بوو، گەلێک کەمدوو بوو، دەتوت نهێنییەکی لە خۆیدا حەشارداوە، هەندێک لە هاوڕێکانی وایاندەزانی وەک منداڵ تەماشای هەموویان دەکات، کە شایانی چاودێریکردن بن، وەک ئەوەی لە باری زیرەکی و زانست و بیروباوەڕەوە لە هەموویان لە پێشتر بێت و بە سووکی لە ڕا و ئارەزووەکانیان بڕوانێت.
بەڵام کەس نازانێت چۆن ئەوەندە لە ڕازومیخینەوە نزیکە! نەک تەنیا نزیکیی، بەڵکو لەگەڵ ئەودا ڕاستوڕەوان و هاودەمتریشە. هەرچەندە لەگەڵ ڕازومیخیندا هەر دەبوو وابێت.

[1] *Razoumikhine*

راز و میخین لاوێکی گەلێک چاک، ڕەند و میهرەبان بوو، میهرەبانییەکەی گەیشتبووە ڕادەی سادەیی، بەڵام لە پشت ئەو سادەییەوە، هەست بە قووڵی و ویقار دەکرا، هاوڕێ هەرە باشەکانی دەرکیان بەم ڕاستییە کردبوو، بۆیە هەموویان خۆشیان دەویست. بە هیچ جۆرێک گەمژە نەبوو، ئەگەرچی هەندێکجار زۆر سادە دەردەکەوت، دیمەنی سەرنجڕاکێش بوو، باڵابەرز، لاواز و مووڕەش و کەمتر ڕیشی دەتاشی، هەندێکجار دەکەوتە شەڕ و ئاژاوەنانەوە، بە پاڵەوان ناودەبرا، شەوێکی درەنگ لە ناو کۆمەڵێک بێئەدەبدا، لە زەلامێکی کەتەی درێژی سرەواند و بە زەویەکەوە خپی کرد، دەیتوانی بێسنوور بخواتەوە، دەیشیتوانی هەر نەخواتەوە، هەندێکجار شەیتانبازاڕێکی نارەوای ساز دەدا، بەڵام توانای ئەوەیشی هەبوو خۆیی لێ دەرباز بکات، شتێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی ڕازومیخین ئەوە بوو، کە هەرگیز شکست پەلوپۆی نەدەشکاند و هیچ پێشهاتێکی خراپ دەستەوستانی نەدەکرد. دەیتوانی لەسەر بەردی ڕەق بژی و بەرگەی برسیەتیی زۆر و سەرمای سەخت بگرێت، زۆر هەژار و بێکەس بوو، کاری هەمەچەشنەی دەکرد و خەرجیی خۆی بەدەست دەهێنا. گەلێک سەرچاوەی پێدەزانی، کە کاری تیا بکات و خۆی پێ بژێنێت. ساڵێکی ڕێک بە درێژایی زستانەکەی ژوورەکەی خۆی گەرم نەکرد و سوور بوو لەسەر ئەوەیش کە ئەمە باشتر و بەکەڵکترە، چونکە خەوتنی بەر سەرما خۆشترە. لەو کاتەدا، ئەویش ناچار بوو بۆ ماوەیەکی کەم واز لە زانکۆ بهێنێت، بەڵام بە هەموو توانای هەوڵی ئەوەی بوو دۆخەکە لەبارتر بێت، بۆ ئەوەی بتوانێت درێژە بە خوێندنەکەی بدات.

چوار مانگی تەواو بوو ڕاسکۆلنیکۆڤ سەردانی نەکردبوو، ڕازومیخینیش بە جێگای ئەوی هەر نەدەزانی، ڕۆژێک، دوو مانگ لەوەوپێش، جارێکیان نزیک بوو لە کۆلانێکدا بەیەکتر بگەن، بەلام ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕووی وەرگێڕا و بۆ ئەوەی ڕازومیخین نەیبینێت، بەرەو شەقامێکی تر چوو، ڕازومیخینیش لەگەڵ ئەوەیشدا کە هەستی پێکرد، چونکە نەیویست هاوڕێکەی دڵگیر بێت، ڕێی خۆی لەبەر گرت و ڕۆیشت.

٥

ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەر بیرکردنەوەکانی خۆی هەر بەردەوام بوو: "بە ڕاستی من بەم دواییە دەمویست داوای کارێک لە ڕازومیخین بکەم، وانەوتنەوە یان کارێکی دی.. وەلێ ئێستا ئەو دەتوانێت چ هاوکارییەکم بکات؟ با بڵێین وا توانیی چەند وانەیەکم بۆ پەیدا بکات، با بڵێین وا دوافلسی خۆی لەگەڵ مندا بەش کرد، هەڵبەتە ئەگەر پارەی هەبێت، بۆ ئەوەی پێڵاو و جلکێک بکڕم تا بتوانم وانەیان پێوە بڵێمەوە.. باشە.. ئەی دوای ئەوە؟ بەم پارەکەمانە دەتوانم چی بکەم؟ من ئێستا چ پێویستیم بەم شتانەیە؟ بە ڕاستی ئەم چوونەی من بۆ لای ڕازومیخین پێکەنینی گەرەکە.."

پرسیاری ئەوەی کە ئێستا بۆچی دەڕواتە لای ڕازومیخین، زیاد لە زانینی خۆی ئازاری دەدا، بە نیگەرانییەوە، بۆ ئەم کارەی کە زۆر ئاسایی دەهاتە پێشچاو، چاوەڕێی پێشهاتێکی شوومی لێدەکرا، بە سەرسوورمانەوە لە خۆی دەپرسی: "بەڕاست دەمویست تەنیا بە یارمەتیی ڕازومیخین هەموو کارەکانم بسازێنم، چارەی هەموو شتێکیشم لە ڕازومیخیندا بەرجەستە کردبوو؟"

بیری دەکردەوە و دەستی بە تەویڵیدا دەهێنا، لەپڕا هەر خۆبەخۆ، دوای بیرکردنەوەی زۆر، بیرۆکەیەکی سەیری بۆ هات، زۆر بە هێوری، وەک ئەوەی بڕیاری تەواو بنەبڕی خۆی دابێت، لەسەرخۆ وتی: "ئا.. دەڕۆم بۆ لای ڕازومیخین، دەڕۆم بۆ لای ڕازومیخین و ئەمە بڕیاری تەواومە.. بەڵام نەک ئێستا، بۆ لای ئەو.. ڕۆژێک دوای "ئەوە" دەڕۆم، ئەو کاتەی کە کارەکە کۆتایی هاتبێت و هەموو شتێک ڕوو لە تازەبوونەوە بێت" وەلێ زوو هاتەوە سەر خۆی و بەدەم هەستانی کتوپڕی سەر سەکۆکەوە بە دەنگی بەرز وتی:

- دوای "ئەوە" بۆ دەبێت "ئەوە" ڕوو بدات؟ ئایا بە ڕاستی ڕوو دەدات؟.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە سەکۆکە دوور کەوتەوە، تا ڕادەیەک کەوتە ڕاکردن، دەیویست بگەڕێتەوە ماڵەوە، کەچی لەپڕا گەڕانەوەی ماڵەوە بێزارییەکی تیا گێڕا. چونکە لەوێ، لە سووچێکیدا، لەو قەفەزە ترسناکەدا، مانگ زیاتر بوو "ئەوە" تاووتوێ دەکرا. بۆیە بەبێ ئەوەی بزانێت بۆ کوێ، بەرەو ڕوانگەکەی کەوتە ڕێ.

ڕکە خرۆشاوەکەی جۆرە تاوولەرزێکی تیا دروست کرد، تەنانەت هەستی بە سەرما کرد، لەو ئاووهەوا گەرمەدا ئەو سەرمای بوو. دەتوت بە زۆر و تا ڕادەیەک دوور لە ویستی خۆی، یان لەبەر پێویستییەکی دەروونی، هەر شتێکی لەسەر ڕێگەکەیدا دەبینی، لێی ڕادەما، وەک بە دوای شتێکدا بگەڕێت، کە حەسانەوەیەکی پێببەخشێت و نەیدۆزێتەوە، بۆیە بە ناچاری هەر لە بیرکردنەوەدا بوو، بەڵام هەر ئەوەندەی ساتمەیەکی بکردایە، سەری بەرز دەکردەوە و تەماشای ئەملاوئەولای دەکرد، یەکسەر بیری لە هەرچییەک کردبووەوە، فەرامۆشی دەکرد و تەنانەت نەیشیدەزانی بە کوێدا دەڕوات، بەم

جۆرە تەواوی دوورگەی "ڤاسیلڤسکی" بڕی، گەیشتە "نیڤای[1] بچووک" لە پردەکە تێپەڕی و کەوتە نێو دوورگەکانەوە، چاوی ماندووی، کە لەسەر تەپوتۆز و گەچ و خانووی زەبەلاحی نزیک بەیەک و هەوای خنکێنەر ڕاهاتبوو، بە سەوزی و فێنکایی ئەو ناوە حەسایەوە: لێرەدا نە بۆگەن و نە شوێنی ئارەقفرۆشی ئاسەواری نەبوو، کەچی لەپڕا ئەو هەستە خۆش و تازەیە گۆڕا بە هەستێکی ناخۆش و بێزارکەر، جارێک بەرانبەر ڤیلایەک دەوەستا، کە لە سەوزە زارێکدا بوو، لە دیوارەکانەوە تەماشای ناوەوەی دەکرد، هەر لە دوورەوە لەو ژنە جوانانە ڕادەما، کە لە هەیوان و باڵکۆنەکاندا بوون و ئەو منداڵانەی لە باخەکەدا یارییان دەکرد. بەتایبەتی گوڵەکان وایان سەرنج ڕاکێشابوو، کە زیاد لە هەر شتێکی دی لەوانی دەڕوانی. جارێکی تریش لەو گالیسکە قەشەنگ و ژن و پیاوە سواربووانەی دەڕوانی، کە بە لایدا تێدەپەڕین و چاوی کونپشکنی ئەم بە ڕێی دەکردن و پێش ئەوەی بکەونە نەدیوی، لەبیری دەچوونەوە، جارێک وەستا و پارەکانی ژمارد، زانیی سی کوپیکی پێیە، لە خۆوە کەوتە ژماردن: "بیست کوپیک بۆ پاسەوانەکە، سیان بۆ نامەهێنانەکەی ناستاسیا، بەم حسابە دۆێنشەو چل و حەوت یان پەنجا کۆپیکم داوەتە ماڵی مارمیلادوف" بەڵام خێرا تەنانەت ئەوەیشی لە یاد چوو کە بۆ پارەکەی لە گیرفانی دەرهێناوە.

کە بە بەردەم چێشتخانەکەدا تێپەڕی، کە زیاتر لە چایخانە دەچوو، دیسان کەوتەوە بیرکردنەوە، هەستی بە برسیەتی کرد، چووە ژووری، پێکێک ڤۆدکا و بابۆڵەیەک گۆشتی خوارد، بەڵام هەر بەدەم

---

[1] Neva ناوی ڕووبارێکە.

ڕۆیشتنەوە بابۆڵەکەی تەواو کرد، ماوەیەکی زۆر بوو ڤۆدکای نەخواردبووەوە، بۆیە هەرچەندە پێکێکی نۆشی بوو، کەچی زوو کاری لێکرد: هەنگاوی قورس و زۆری حەز بە خەو بوو، بەرەو ماڵەوە پێی هەڵگرت، وەلێ هەر ئەوەندەی گەیشتە دوورگەی "پتروڤسکی"[1] بە تەواویی ماندوو بوو و وەستا، لە ڕاستەڕێ لایدا و چووە ناو شەخەڵێکەوە، لەسەر سەوزە گیاکان کەوت و هەر لەوێدا زوو دایە پرخە.

لە کاتی نەخۆشیدا زوربەی خەونەکان بە ڕەونەق و بەرجەستە و ڕوونن و بێئەندازە لە واقیع دەچن. هەندێکجار دیمەنی هێند سەیر و سەرسووڕهێنەری تیا دەردەکەوێت، کە شوێن و ڕووداوەکانی ئەمەندە وردەکار و گونجاوو دڵگیر و بێوێنەن، تەنانەت ئەگەر خەونبینەکە هونەرمەندێکی شکۆمەندی وەک پوشکین و تورگنیڤیش بێت، ناتوانێت لە حاڵەتی بەئاگاییدا ئەو دیمەنانە دابهێنێت. خەون و خەوی بیماریی وا هەمیشە تا ماوەیەک لەبیر ناکرێن و ئاسەوارێکی قووڵ لە سروشتی مرۆڤی بێحاڵ و پەرێشاندا دروست دەکەن.

ڕاسکۆلنیکۆڤ خەونێکی سامناکی بینی: منداڵیی خۆی کاتێک کە هێشتا لە شارە چکۆڵەکەی خۆیاندا بوو، لە خەوندا بینی کە تەمەنی حەوت ساڵە و لە ڕۆژێکی پشوودا، لە کاتی خۆرئاوابووندا، لەگەڵ باوکیدا لە دەرەوەی شار دەگەڕێت، دنیا بەرەو تاریکی دەچێت و ناخۆشە، شوێنەکە هەر ئەوەیە کە لەبیری ماوە، ڕەنگە ئەو دیمەنەی لە یادی ماوە، لەوە کاڵتر بێت کە ئێستا لە خەونەکەیدا دەیبینێت، شارەکە وەک جاران بچووک، وەک لەسەر لەپی دەست دروست

---

[1] *petrovsky*

کرابێت، هەموو لایەکی دیارە، چەند بڕوانیت، درەختێک بەدی ناکەیت، گەلێک دوور، لە سووچێکی ئاسماندا خاڵێکی چکۆڵە هەیە، چەند هەنگاوێک لە دامێنی دوابێستانی شارەوە، چایخانەیەک بەرچاو دەکەوێت، چایخانەیەکی گەورەیە، پێشتریش، کە لەگەڵ باوکیدا بە لایدا تێدەپەڕین، بە بینینی ناخۆشی و ترسێکی تێدەگەڕا، هەمیشە خەڵکانێکی زۆری تیابوو، هاواریان دەکرد، قاقایان لێدەدا، جوێنیان دەدا، بە دەنگی ناخۆش و گیراویانەوە گۆرانییان دەوت و بەردەوام لەگەڵ یەکتردا لە شەڕدا بوون. لە دەوری ئەو چایخانەیەدا هەمیشە خەڵکانی سەرخۆش و تۆقێنەر دەگەڕان.. هەرکات ڕاسکۆلنیکۆڤ تووشیان بهاتایە، هەموو گیانی دەلەرزی و خۆی بە باوکییەوە دەنووساند، پاڵ چایخانەکە شەقام یان باریکە ڕێگەیەکە، هەمیشە بەتۆزوخۆڵە و بەردەوام ئەو ناوە زۆر لێڵ و تاریکە. ڕێگەکە هەر دەڕوا و دوای سێ سەد هەنگاوێک بە لای ڕاستا و بە دەوری گۆڕستانی شاردا پێچ دەخوات. لە ناوەڕاستی گۆڕستانەکەدا کڵێسەیەکی بەبەرددروستکراوی گومەز سەوزە، ساڵی یەک دووجار لەگەڵ باوک و دایکیدا دەچووە ئەوێ تا لە ڕێوڕەسمی درووودخوێندن بۆ گیانی نەنکی کە ماوەیەکی زۆر پێشتر مردبوو و ئەم هەرگیز نەیدیبوو، بەشداری بکات. هەمیشە لەگەڵ خۆیاندا دەفرێکی سپییان دەبرد، کە لە ناو دەستماڵێکی پێچراوەدا حەلْوای "کوتیا"ی تیابوو، کوتیا لە برنج و شەکر دروست دەکرا و هەندێک مێوژیان لە شێوەی خاچدا بەسەردا دەکرد. ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەم کڵێسە و وێنە کۆنانەی کە زۆربەی بەبێ چوارچێوە بوون و قەشە پیرەکەی کڵێسە کە هەمیشە سەری دەلەرزی، خۆشی دەویستن. لە پاڵ گۆڕی نەنکییەوە کە بە تەختەبەردێک داپۆشرابوو، گۆڕێکی بچووکی تر هەبوو، کە گۆڕی برا

بچووکەکەی بوو. براکەی بە شەش مانگی مردبوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ نەدیبووی و نە لەبیری مابوو، هەر ئەوەندەیان پێوتبوو برایەکی بچووکی هەبووە، کە دەچووە گۆڕستان، بە درودخوێندن و نیشانەی خاچەوە لەسەر گۆڕە چکۆلەکەی دەوەستا، سلاوی بۆ دادەخست و ماچی دەکرد، وا ئێستا لە خەودا دەیبینی کە لەگەڵ باوکیدا بە هەمان ڕێگەدا بۆ گۆڕستان دەچن و بە پاڵ چایخانەکەدا تێدەپەڕن، ئەو توند دەستی باوکی گرتووە، بە ترسەوە سەر بۆ لای چایخانەکە وەردەگێڕێ و لێی دەڕوانێت، شتێکی سەیر سەرنجی ڕادەکێشێت: دەڵێیت ئێستا ئەوێ سەیرانگایەکە و کۆمەڵێک ژنی ئوروستوکراتی جوان و ژنانی گوند لەگەڵ مێردیاندا و پیاوی تر کۆ بوونەتەوە، هەموو مەستن و تێکڕا گۆرانی دەڵێن. لە پێشی چایخانەکەدا گالیسکەیەکی سەیر وەستاوە، لەو گالیسکە گەورانەیە کە ئەسپیان لێدەبەستن و بار و چلیکانەی بادەیان پێدەبەن. بەردەوام حەزی لە تەماشاکردنی ئەو ئەسپە یالدرێژ و قاچئەستوورانە بوو، ئەوانە لەسەرخۆ دەڕۆن و هەنگاویان ڕەزمێکی تایبەتی هەیە، ئاسایی بە دوای خۆیاندا کێوبارێک کێش دەکەن و ماندوو نابن. وەک ئەوەی باریان پێ خۆشتر بێت لە حەسانەوە، وایە. وەلێ ئێستا شتەکە زۆر سەیرە! بە یەکێک لەو گالیسکانەوە ئەسپێکی چکۆلەی لاواز و بێهێزی گوندیان بەستبوو، لەو جۆرە ئەسپانەی کە هەندێکجار بە بارێکی باشی چلوچێو یان کاوە لەوانەیە گیانیان دەربچێت، بە تایبەتی ئەگەر گالیسکەکە لە لیتە و چالوچۆلییەک گیر بکات، ئەو هەمیشە لەو جۆرە دیمەنانەی بینیبوو، بە شێوەیەکی ئاسایی لەو ڕووداوانەدا جووتیار بە قامچی ئەمەندە بێبەزەییانە بەسەر و پۆتەلاکی ئەو ئاژەڵە هەژارەدا دەکێشێت، کە جاران لە بینینی ئەو دیمەنانەدا دڵی ڕاسکۆلنیکۆڤ

دەکەوتە ژان و هێندەی نەدەما دەست بە گریان بکات. بەڵام زۆرجار دایکی لە پاڵ پەنجەرەکەی دوور دەخستەوە. لەپڕا هەراوزەنایەک هەڵایسا، جووتیارە چەتەوڵە سەرخۆشەکان بە کراسی سوور و سەوزەوە، چاکەت بەشان و دەم بە هەرا و گۆرانیی و "بالالایکا"[1]وە لە چایخانەکەوە ڕژانە دەرێ، لاوێکی ملئەستووری دەموچاو گۆشتن کە ڕەنگی لە گێزەری سوور دەچوو، هاواری دەکرد:

- دابنیشن، هەمووتان دابنیشن، هەمووتان دەگەیەنم، دابنیشن، بەڵام لەپڕا دەنگی پێکەنین و هاوارێک بەرز دەبێتەوە: "یەعنی بەم بارگیرە هەموومان دەگەیەنیت!"

- ئاخرمیکولکا[2] تۆ عەقڵت هەیە؟ چۆن بارگیرێکی بێگیانی وات لەم گالیسکەیە بەستووە؟

- کوڕینە، بێگومان تەمەنی ئەم بارگیرە بیست ساڵ دەبێت.

میکولکا بەدەم خۆفڕێدانە ناو گالیسکەکەوە لغاوەکە دەگرێتە دەست و بە باڵای بەرزیەوە لە پێشەوە دەوەستێت و هاوار دەکات:

- سوار بن، هەمووتان دەگەیەنم، "ماتڤی"[3] ئەسپەکە حیلەکەی بردم و ئەم بارگیرە بێچارەیە دڵم دەردێنێت، ئەوەندەی نەماوە بیکوژم، جۆی بەلاش دەخوات. دەڵێم سوار بن، دەیهاژووم، دەیفڕێنم.

---

[1] Balalaika ناوی سازێکە.

[2] *Mikolka*

[3] *Matvey*

بەم قسانەوە قامچییەکە ڕادەوەشێنێت و بە تاسووقەوە خۆی ئامادەی لێدانی ئەسپە داماوەکە دەکات، خەڵکەکە پێدەکەنن و ئەو دووبارەی دەکاتەوە:

- سوار بن، ئەسپەکە فڕکە دەکات.

- بەڵام دە ساڵ دەبێت ئەم بارگیرە غاری نەکردووە.

- ئێستا دەیکات.

- کوڕینە دڵتان پێی نەسووتێت، هەریەکەتان قامچییەک بگرێتە دەست و ئامادە بێت.

- ڕاست دەکات، لێی بدەن. هەموویان بە قاقای پێکەنین و قسەی بێسەروپێ پەلاماری گالیسکەی میکولکا دەدەن، شەش کەس دەچنە ژووری و کەچی هێشتا جێگا هەیە. ژنێکی قەڵەوی سوور و سپیش لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن، ژنە بەرگی چیتی سووری لەبەردایە، فێستێکی پوولەکەڕێژیشی لەسەردایە، کە تایبەتە بە ژنی مێرددارەوە، پێڵاوەکەی پێی لە پێستە دروست کراوە و درێژە، فستق دەشکێنێ و پێدەکەنێت، هەموو ئەوانەی کە لە دەوریدان، پێدەکەنن، بە ڕاستیپش چۆن دەتوانیت پێنەکەنیت: ئاخر بارگیرێکی ئەوەندە بێهێز، دەتوانێت بارێکی هێندە گران هەڵبگرێت و غار بدات! دوو لاوی ناو گالیسکەکە هەریەکەیان زوو قامچییەکی لەدەست گرت بۆ ئەوەی یارمەتی میکولکا بدەن، دەنگی "هێی" بەرز بووەوە. بارگیرەکە بە هەموو توانایەوە گالیسکەکەی ڕادەکێشا، بەڵام نەک تەنیا نەیدەتوانی غار بدات بەڵکو بە زەحمەت هەنگاوی بۆ دەنرا و هەر ئەمپێ و ئەوپێی دەکرد. کەوتبووە هەناسەبڕکێ و لەژێر لێدانی سێ قامچیدا کە وەک تەرزە بەسەریا دادەبارین، دەنووشتایەوە، پێکەنینی هەردوولای نێو گالیسکە و ئەوانەی دەرەوە تا دەهات لە زیادبووندا بوو، میکولکایش

تا دەهات زیاتر ڕقی هەڵدەستا و بە تووڕەییەوە بارگیری هەژاری بە قامچی داگرتبوو، ئەو وایدەزانی بە لێدان بارگیرەکە دەکەوێتە غاردان.
لاوێکی ناو خەڵکەکە هاواری کرد:
- کوڕینە جێی ئێمەیش وەکەن.
میکولکا بە دەنگی بەرز وەڵامی دایەوە:
- سوار بن، هەمووتان سوار بن، هەمووتان هەڵدەگرێت، ئەگینا تا نەیکوژم دەستی لێهەڵناگرم.
ئەمەندە بێبەزەییانە قامچیی پیا کێشا، کە ئیدی نەیدەزانی بە چی و چۆن لێی بدات.
ڕاسکۆلنیکۆڤی منداڵ بە باوکی دەڵێت:
- باوکە گیان، باوکە گیان، ئەمانە چی دەکەن؟ باوکە گیان، ئەسپە بێچارەکە دەکوژن.
باوکی دەڵێت:
- با بڕۆین، با بڕۆین، گەوجن، مەستن و هەرزە، بڕۆ و تەماشایان مەکە.
دەیەوێت لەگەڵ خۆیدا بیبات، بەڵام لە دەست باوکی ڕادەکات و بەبێ ئەوەی لەبیری خۆیدا بێت بەرەو لای بارگیرەکە بەڕاکردن دەچێت، بارگیرە داماوەکە ئیتر هیچی پێنەماوە، هەناسەی دەبڕێ، دەوەستێ و دیسان دەیەوێت شتێک بکات و گالیسکەکە ڕابکێشێت، ئەوەندەی نەماوە بکەوێت.
میکولکا هاوار دەکات:
- ئەوەندەی بکوتن تا دەمرێت، مادام وایە تا نەمرێت وازی لێناهێنم.
پیرەمێردێک لە ناو خەڵکەکەوە هاوار دەکات.
- شەیتان، تۆ خاچت پێنییە و خودا ناناسیت؟

یەکێکی تر هەڵیدایە:
- ئایا دیوتانە بارگیرێکی ئاوا بارێکی وا قورس ببات؟
سێیەم کەس بە دەنگی بەرز وتی:
- دەیکوژیت؟
میکولکا هەڵیدایە:
-جا تۆ هەقت چییە؟ ماڵی خۆمە، چیم پێ خۆش بێت، دەیکەم، دەی سوار بنەوە، سوار بنەوە، هەمووتان سوار بن، هەر دەیخەمە غاردان.
لە پڕێکدا دەنگی قاقای پێکەنین بەرز دەبێتەوە و دەنگەکانی تر کپ دەبن. بارگیری نەگبەت توانای بەرگەگرتنی ئەو هەموو لێدانەی نەما و لەتاوا کەوتە جووتەوەشاندن. تەنانەت پیرەمێردەکەیش خۆی پێنەگیرا و زەردەخەنەیەکی بۆ کرد. بە ڕاستی بارگیرێک کە لە سەرەمەرگدا بێت، تازە چۆن جووتە دەهاوێت!
دوو کوڕی گەنجی ناو خەڵکەکە دوو قامچیان هێنا و بۆ لێدانی بەرەو لای بارگیرەکە کەوتنە ڕێ، هەریەکەیان لەلایەکەوە بە ڕاکردن هاتن.
میکولکا هاواری کرد:
- لە لمۆزی، لە چاوی بدەن، لە چاوی.
یەکێکی ناو گالیسکەکە دەنگی هەڵبڕی:
- کوڕینە گۆرانییەک.
هەموو ئەوانەی ناو گالیسکەکە بە دوایدا کەوتنە گۆرانی وتن. دەنگی گۆرانییەکی سەرخۆشانە بەرز بووەوە، دەنگی تەپڵ و هەندێکجارییش دەکەوتنە فیکەکێشان. ژنە لادێییەکەیش هەر خەریکی پێکەنین و فستقخواردنی خۆی بوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بەرەو لای بارگیرەکە ڕای کرد، ڕۆیشتە پێشێ و بینی چۆن بە چاوی ئاژەڵەکەدا، بە ناوچاویدا دەکێشن، کەوتە گریان، دڵی

تەنگ و فرمێسکی هاتە خوارێ، قامچی یەکێکیان بەر دەم و چاوی کەوت، وەلێ هەستی پێنەکرد، کەوتە هاوار، پەنای بەرەو پیرەمێردە سەرووڕیش سپییەکە برد، پیرەمێردەکە هەر بە سەرڕاوەشاندن بێزاری و نەفرەتی خۆی بەرانبەر بە ڕووداوەکە دەربڕی، یەکێک لە ژنە لادێییەکان دەستی ڕاسکۆلنیکۆڤ دەگرێت و دەیەوێت لەگەڵ خۆیدا بیبات. بەڵام لە دەستی هەڵدێت و دەگەڕێتەوە لای بارگیرەکە، ئاژەڵەکە دواتواناى خۆی بەکار دێنێت، بەڵام دیسان دەکەوێتەوە جووتەوەشاندن.

میکولکا بەوپەڕی تووڕەییەوە هاواری کرد:

- بەرەو دۆزەخ.

قامچییەکەی دانا، چەمایەوە و لە ناو گالیسکەکەدا دارێکی درێژ و ئەستووری دەرهێنا، بە هەردوو دەستی ئەمسەر و ئەوسەری گرت و ویستی بە هەموو تواناى بەسەر بارگیرە بێچارەکەیدا بکێشێت. هەموو خەڵکەکە هاواریان لێهەستا:

- ئەیهاڕێت

- ئەیکوژێت.

وەلێ میکولکا هاوار دەکات:

- ماڵی خۆمە.

بە هەموو توانایەوە دارە ئەستوورەکەی بەرز کردەوە و بەسەر بارگیرەکەیدا کێشا، دەنگی لێدانەکە ئەوەندە پتەو و کاریگەر بوو، هەموو ئەو ناوەی پڕ کرد.

هاوار لە زۆر لاوە بەرز بووەوە:

- لێیدە، لێیدە، بۆ وەستاویت؟

میکولکا جارێکی تر دارەکەی هەڵبڕی و بە هەموو هێزیەوە بە پشتی بارگیرە بێچارەکەیدا کێشایەوە، ئاژەڵە بەستەزمانەکە وەک بنەوێت وا بوو، بەڵام دیسان خۆی گرتەوە و چەند هێزی تیامابوو بۆ ڕاکێشانی گالیسکەکە بەکاری برد تا لە هەر لایەکەوە بێت، بەڕێی بخاتەوە، بەڵام شەش قامچی لە هەموو لایەکەوە دایانگرتەوە. بۆ جاری سێیەم و چوارەمیش دارەکە بە توندی و بەردەوام داهاتەوە. میکولکا داخی ئەوە شێتی کردبوو، کە بە یەکەم لێدان ئاژەڵەکەی لەپێ نەخستبوو.

لەملاوئەولاوە هەندێک هاواریان لێهەستایەوە:

- گیان بەدەستەوە نادات!

لە ناو خەڵکەکەوە یەکێک لە تەماشاکەرەکان بانگی کرد:

- کوڕینە، هەر ئێستا دەکەوێت، مەرگ لە سەروەختیدایە.

سێیەم کەسیش هاواری کرد:

- بۆ وەستاون! بە تەورێک یەکلایی بکەنەوە.

میکولکا دێوانەئاسا هاواری کرد:

- دەک بەڵات لێ، خۆتان لادەن.

دارەکەی فڕێ دا و جارێکی تر ژێر گالیسکەکە گەڕا، لوولە ئاسنێکی دۆزییەوە و دەریهێنا، بە دەنگی بەرز بە بارگیرەکەی وت:

- ئەمجارەیان وەرە پێشێ.

دیسانەوە بە هەموو توانای و زۆر بە توندی ئاسنەکەی بە ئاژەڵە بەستەزمانەکەدا کێشایەوە، لێدانەکە دەنگێکی توند و پتەوی لێهەستا، بارگیرە لاواز و داماوەکە تەکانێکی خوارد و پاشووی داکەوت، جارێکی دی ویستی هەستێتەوە، وەلێ دیسان لوولەئاسنەکە گەلێک توند و بەهێز درایەوە لە پشتی، ئەمجارەیان وا کەوتە سەر زەوییەکە، دەتوت هەر چوار پەلیت بڕیوەتەوە.

میکولکا هاواری لێهەستا:
- هەموو شتێک تەواو.
بە شێوەیەک لەسەر گالیسکەکەوە پەڕییە سەر زەوی، دەتوت ئاگای لە خۆی بڕاوە. چەند کوڕوکاڵێکی مەست هەرچییەکیان بەردەست کەوت لە قامچی و دار و تەختە، هێنایان و بەرەو بارگیرەکە کە لە گیانەڵادا بوو، خێرا بەڕێکەوتن.
میکولکا لە پاڵ ئاژەڵەکەدا وەستا و بە لوولەئاسنەکە کەوتە وێزەی، بارگیرەکە لمۆزی درێژ کرد، هەناسەیەکی قووڵی دا و مرد.
خەڵکەکە هاواریان کرد:
- گیانی دەرچوو.
- ئەی بۆ غاری نەدا!
میکولکا ئاسنەکەی هەر بە دەستەوە بوو، ئاگری ڕق لە چاوی دەبووەوە، بە دەنگی بەرز وتی:
-ماڵی خۆمە!
وا بە پێوە وەستابوو، وەک داخ لەوە بخوات کە ئیدی هیچ نەماوە لێی بدات.
لەو کاتەدا چەند دەنگێک لە نێو خەڵکەکەوە بەرز بووەوە:
- ڕاستە کە تۆ خاچت لە ملدا نییە!
منداڵە داماوەکە، ئیتر تەواو ئاگای لە خۆی بڕابوو، بەدەم هاوارەوە بەرەو لای بارگیرەکە دڕی بە خەڵکەکە دەدا، کە گەیشتە لای، لمۆزە خوێناوییەکەی لە نێو هەردوو دەستی نا و چاوو لچ و لێوی ماچ کرد، پاشان، لەپڕا بەرزەپێ ڕاست بووەوە و بەوپەڕی ڕق و تووڕەییەوە بە مشتە چکۆڵەکانی پەلاماری میکولکای دا، لەو کاتەدا باوکی کە

ماوەیەک بوو دوای کەوتبوو، گەیشتە لای، گرتی و لە ناو خەڵکەکەی دەرکرد و وتی:

- وەرە، وەرە بچینەوە ماڵێ.

ڕاسکۆلنیکۆڤی منداڵ بەدەم هەنسکی گریانەوە وتی:

- باوکە گیان، بۆ ئەمانە.. بارگیرە بێچارەکەیان کوشت؟

بەڵام هەناسەی گیرا و وشەکانی وەک هاوارێکی لەگەرووداتاساو هاتنە دەرێ.

باوکی وتی:

-سەرخۆشن، گەمژەن، بە ئێمە چی؟ دەی با بڕۆین.

منداڵەکە باوەش بە باوکیدا دەکات، بەڵام هەناسەی دەگیرێت، دەیەوێت هەناسەیەکی تازە بدات، هاوارێک بکات و لەو کاتەدا لە خەو بەئاگا دێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە خەو ڕاپەڕی و شەلاڵی ئارەقە بوو، هەناسەی بەگیر هاتبوو، بە ترسەوە خۆی ڕاست کردەوە، بەدەم خزانە ژێر درەختێکەوە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی: "سوپاس بۆ خودا کە ئەمە تەنیا خەو بوو، بەڵام یانی چی؟ تۆ بڵێی ئەمە سەرەتای پەرکەم نەبێت؟ چ خەوێکی ترسناک!" دەتوت هەموو گیانی ورد و کوتراوە و دڵی گیراو و وەڕزە، ئانیشکی دادایە سەر ئەژنۆی و سەری نایە نێوان هەردوو دەستییەوە، بە سەرسووڕمانەوە وتی: "خودایا، ئاخۆ دەبێت، دەبێت من بە ڕاستی تەورێک هەڵبگرم و ئەمەندە بەسەریدا بکێشم، تا کاژەلاکی وردوخاش بکەم.. لە خوێنە گەرم و لینجەکەیدا بگەوزێم، قفڵەکە بشکێنم، دزی بکەم، دزی بکەم و خۆم بشارمەوە.. لە خوێندا شەلاڵ.. بە تەور.. خودایا ئەمە دەکرێت؟"

که لەبەر خۆیەوە ئەم قسانەی دەکرد، وەک گەڵای درەخت دەلەرزی، پاشان جارێکی دی کەمێک جووڵا و وەک سەرسامییەکی قووڵ ئەوکی گرتبێت، لەگەڵ خۆیدا کەوتەوە دوان: "یانی چی؟ من دەمزانی بەرگەی شتی وا ناگرم، ئەی ئیتر بۆچی تا ئێستا خۆمی پێ ئازار دەدەم؟ ئاخر هەر دوێنێ، دوێنێ، کە ڕۆیشتم.. تاقیکردنەوەکە بکەم، هەر دوێنێ بە تەواویی لەوە گەیشتم کە بەرگەی ناگرم و ناتوانم بیکەم، کەواتە ئەی چی؟ بۆ تا ئێستا دوودڵم؟ ئاخر هەر دوێنێ کە لە پلیکانەکان دەهاتمە خوارێ، بە خۆم وت ئەمە کارێکی قێزەون و خراپ و دزێوە.. هەر ئەو بیرکردنەوە دڵی بەتێکەڵ هێنام و ترسم لێنیشت، نەخێر، من ناتوانم ئەوە بکەم، خۆم پێ ناگیرێت، گریمان بچووکترین گومان نەکرێت، گریمان هەموو ئەو شتانەی لەم مانگەدا بڕیاریان بۆ دراوە، وەک ڕۆژی ڕوناک و وەک بیرکاری ورد و بەجێ بن، خودایا! ئاخر من کە بەهەرحاڵ ناتوانم بڕیار لەسەر ئەو کارە بدەم، کە ناتوانم بیکەم. هەرگیز ناتوانم بیکەم.. کەواتە بۆ تا ئێستا.."
هەستایە سەر پێ و بە سەرسووڕماوییەوە لە چواردەوری خۆی ڕوانیی، وەک ئەوەی بە لایەوە سەیر بێت چۆن هاتۆتە ئێرە. ئەوسا بەرەو پردی "ت" بەڕێ کەوت، ڕەنگی پەڕیبوو، چاوی دەسووتایەوە، هەموو گیانی تێک شکابوو، کەچی لەپڕا هەناسەدانی ئاسان تربوو، هەستی کرد ئەو بارە قورسەی کە ماوەیەک بوو تەنگی پێهەڵچنیبوو، لەسەرشانی لاچوو، یەکسەر دڵی ئارام بووەوە و ئاسوودە بوو، لاڵایەوە و وتی: "خودایا، ڕێگەکەمم پیشان بدە و من لەم.. ئارەزووە نەفرەتلێکراوەی خۆم دەست هەڵدەگرم"
کە بەسەر پردەکەدا تێدەپەڕی، هێور و لەسەرخۆ تەماشای ڕووباری "نیڤا" و خۆرە پڕ لە درەوشاوەکەی ڕۆژئاوابوونی دەکرد، هەرچەندە

زۆر بێهێز بوو، بەڵام هەستی بە ماندووبوون نەدەکرد، لەوە دەچوو ئەو دوومەڵەی مانگێکی ڕێک بوو لەسەر دڵی هاتبوو، لەپڕا تەقی بێت، ئازادی، ئازادی. وا ئێستا لەو سیحر و ئەفسوون و خەیاڵاتە ئازاد ببوو.

دوای ئەوە، کە ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری لەو کاتە و لە گشت ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژانە دەکردەوە کە بەسەریدا هاتبوون، دەقیقە بە دەقیقە، خاڵ بە خاڵ و بەند بە بەندی دەهاتەوە یاد، شتێکی زۆر سەرنجڕاکێش سەرسامی دەکرد. شتێک کە لە ڕاستیدا بەو ئەندازەیەش سەیر نەبوو، وەلێ بۆ ئایندەی خۆی هەمیشە بە چارەنووسسازی دادەنا، بە هیچ جۆرێکیش نەیدەتوانی لەوە تێبگات، کە ئەو بەو هەموو شەکەتی و بێزارییەوە، کە دەبوو بە نزیکترین و کورتترین ڕێگەدا بگەڕایەتەوە ماڵەوە، کەچی لە مەیدانی "سننایا"[1]وە گەڕایەوە، گەڕانەوە لەوێوە هیچ پاساوێکی نەبوو، ئەو پێچەبەدەورەیە خۆی لە خۆیدا گەلێک زیاد بوو، هەرچەندە زۆریش دوور نەبوو، بەڵام شیاوی ئەوە بوو سەرنجت ڕابگرێت. هەڵبەتە دەیانجاری تر ئەوەی هاتبووە پێش کە بەبێ ئەوەی بزانێت ئەو شەقامانە کامانەن یان مەبەستی بووبێت بیانزانێت، پیایاندا گەڕابووەوە ماڵێ، وەلێ ئەمجارەیان بەردەوام لە خۆی دەپرسی کە ئەم ڕێکەوتە چی بوو ئەوی بە مەیدانی "سننایا"دا هێنا، کە هیچ پێویستی نەدەکرد و بۆ ئەویش ئەوەندە کاریگەر و گرنگ بوو، کە دەبوو هەر لە هەمان سەعات و دەقیقەدا، لە ژیانی ئەو و بەتایبەتی لەو بارە دەروونی و دۆخە ناهەموارەیدا ئەوە ڕووی بدایە تا بۆ ئایندە کاریگەرترین ئاسەوار لەسەر ژیان و چارەنووسی دابنێت؟ هەردەتوت ئەمە پلانێکە و بۆی چنراوە.

---

[1] *Sennaya*

کاتێک بە مەیدانی سنناپادا تێپەڕی، سەعات لە دەوروبەری نۆدا بوو، هەموو فرۆشیارەکان کە لەسەر سەکۆ و مێز، یان لە دووکان و کۆگاکاندا شتومەکیان دەفرۆشت، سەرقاڵی کۆکردنەوەی دووکان و شتومەکەکانیان بوون، بۆ ئەوەی وەک مشتەرییەکان بەرەو ماڵ بچنەوە، لە پاڵ چایخانە و چێشتخانەکانی لاکۆڵان و بنبانەکان، لە حەوشەی پۆخڵ و بۆگەنی ماڵەکانی مەیدانی "سننایا" و لە هەموو زیاتر لە پاڵ مەیخانەکاندا، خەڵکێکی زۆر لە فرۆشیار و هەژاران کۆ ببوونەوە. هەر کاتێک ڕاسکۆلنیکۆڤ بەبێ مەبەست ڕێی دەکەوێتە سەر ئەو شەقامە، لە بینینی ئەو دیمەنانە و بە تایبەتی بینینی هەموو لاکۆڵانەکانی ئەو ناوە خۆشیی تێدەگەڕێت. لەوێدا هیچ کەسێک بە چاوی سووکەوە لە جلکە دڕاوەکانی ئەم ناڕوانێت، لەوێدا هەموو کەسێک دەیتوانی بە ئاسانی چۆنی بوێت، بەڕێدا بڕوات بەبێ ئەوەی سووکایەتیی پێبکرێت یان هەستی بریندار بکرێت.

کە ڕاسکۆلنیکۆڤ گەیشتە سەرسووچی کۆڵانی "ک"، پیاوێکی لەگەڵ ژنەکەیدا بینی، وردەواڵەکانیان کە بریتی بوو لە دەزووشریت و ڕەفتە و بۆ فرۆشتن لەسەر دوو مێز دایاننابوون، ئەوانیش کەوتبوونە کۆکردنەوەی شتەکانیان تا بەرەو ماڵ بگەڕێنەوە، بەڵام ژنێکی ئاشنایان، کە لەو کاتەدا لێیان نزیک کەوتبووەوە، کەمێک لە ڕۆیشتن دوایخستن.

ئەم ژنە ئاشنایە لیزاڤیتا ئیڤانۆڤنا[1] یان وەک پێی دەڵێن "لیزاڤیتا"ی خوشکە چکۆلەی هەمان ئەلێنا ئیڤانۆڤنای پیر بوو، کە پارەی بە قازانج دەدایە خەڵکی و دوێنێ ڕاسکۆلنیکۆڤ بۆ بارمتە و

---

[1] *Lizaveta Ivanovna*

تاقیکردنەوەی کارەکەی سەعاتەکەی لا دانا. دەمێک بوو ڕاسکۆلنیکۆڤ زانیاریی زۆری لەبارەی ئەم لیزاڤێتایەوە بەدەست هێنابوو، تەنانەت ژنەکەیش کەمێک ئەوی دەناسی، لیزاڤێتا ژنێکی تەمەن سی و پێنج ساڵ بوو، باڵابەرز، بێنموود، شەرمن و لەسەرخۆ و تا ڕادەیەکیش گەلحۆ بوو، کۆیلەی تەواوی خوشکەکەی بوو، شەووڕۆژ کاری بۆ دەکرد و لە ڕوویا ترس دایدەگرت و دەلەرزی و تەنانەت تێهەڵدانیشی دەخوارد.

لیزاڤێتا بەرانبەر بە پیاوە فرۆشیار و ژنەکەی بە دوودڵی و بە بەستەکەیەوە وەستابوو، چاک گوێی بۆ گرتبوون، ئەوانیش زۆر بە گەرمی شتێکیان پێدەوت. کە ڕاسکۆلنیکۆڤ لە پڕێکدا ئەوی بینی، هەستێکی سەیر، لە شێوەی سەرسووڕمانێکی قووڵدا، هەموو گیانی داگرت، ئەگەرچی ئەو یەکدیبینینە لە خۆیدا هیچ جێگای سەرسووڕمان نەبوو.

پیاوە فرۆشیارەکە بە دەنگی بەرز دەیوت:

- لیزاڤێتا ئیڤانۆڤنا، واچاکە ئێوە خۆتان بڕیار بدەن، سبەینێ سەعات حەوت وەرە ئێرە، ئەوانیش دێن.

لیزاڤێتا بەدەم بیرکردنەوە و نووزەیەکەوە، وەک نەتوانێت بڕیار بدات، وتی:

- سبەینێ؟

ژنە فرۆشیارەکە کە زیتوزرنگ بوو، خێرا سەری قسەی لێگرت:

- ئەم ئەلێنا ئیڤانۆڤنایە عەجەب ترسێکی خستۆتە دڵتەوە، من کە تۆ دەبینم، وەک منداڵێکی چکۆڵەم دێیتە بەرچاو، خۆ ئەو خوشکی دایکی و باوکیشت نییە، زڕخوشکتە، بڕوانە چ دەستەڵاتێکی بەسەرتانەوە هەیە!

مێردەکەی قسەکەی پێبڕی:
- ئەمجارەیان هیچ بە ئەلیێنائیڤانۆڤنا مەڵێ، گوێ لە من بگرە، بەبێ ئەوەی پێی بڵێیت، وەرە لامان، کارێکی زۆر سوودبەخشە، هاوشیرەکەت پاشان خۆی لەوە تێدەگات و قایلیش دەبێت.
- کەواتە بێم؟
- نزیک سەعات حەوت، سبەینێ. لای ئەوانیشەوە دێن و ئەوسا خۆتان بڕیاری لەسەر بدەن.
ژنەکە قسەکەی تەواو کرد:
- سەماوەریش دەم دەکەین.
لیزاڤێتا کە هێشتا بیری دەکردەوە، وتی:
- باشە، دێم.
لەسەرخۆ هەستا و بەڕێ کەوت.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەوساتەدا بە لایاندا تێپەڕی و بێجگە لەوە گوێی لە هیچی تر نەبوو، لەسەرخۆ و بێدەنگ بە جۆرێک کەس گوێی لێی نەبێت، دەڕۆیشت و تێدەکۆشا وشەیەک لەوەی بیستبووی، لەبیری نەکات، وردەوردە سەرسووڕمانەکەی لێبوو بە ترس، پشتی لە سەرماندا تەزیبوو، تا لەپڕێکدا بە تەواوی لەوە گەیشت کە لیزاڤێتای خوشکی پیرێژنەکە و تاقە هاودەمی لە ماڵەکەدا، سبەینێ سەعات حەوتی سەر لە ئێوارە لە ماڵەوە نابێت، کەواتە پیرێژن سەعات حەوت بە تەنیا لە ماڵەوەیە.
چەند هەنگاوێکی مابوو بگاتە ماڵێ، ڕاسکۆلنیکۆڤ چون یەکێک فەرمانی مەرگی بەسەردا درابێت، چووە ژوورەکەی خۆیەوە، بیری لە هیچ نەکردەوە و نەیشیدەتوانی بیر بکاتەوە، بەڵام بە تەواوی بوونیەوە لەپڕا هەستی کرد کە ئیدی ئەو نە ئازادە لە بیرکردنەوەدا و

نە ئازادە لە کارکردندا، لە پڕێکدا هەموو شتێک بڕاوەتەوە و بڕیاری بنەبڕی لەسەر دراوە.
تەنانەت ئەگەر بۆ سەرگرتنی نەخشە و پلانەکەی، بەردەوام سالآنێک چاوەڕێی دەرفەتێکی تر بکات، هەرگیز ناتوانێت وەک ئەمەی کە ئێستا و لەناکاوێکدا بۆی هاتۆتە پێش، دڵنیا بێت لە سەرکەوتنی.
بەهەرحاڵ، ئەو بە بڕوای تەواوەوە لەوە تێگەیشت، کە بەبێ ئەوەی بکەوێتە پرسیار و سووسەکردنێک، کە ڕەنگە مەترسیی زۆری لە دواوە بێت، سبەینێ، لە فڵان سەعاتدا، ئەو پیرێژنەی کە ئەم دەیەوێت بیکوژێت، بە تاقوتەنیا لە ماڵەکەیدایە.

٦

لە دواییدا ڕاسکۆلنیکۆڤ لەو پێشهاتە تێگەیشت، کە بۆچی پیاوە فرۆشیارەکە و ژنەکەی لیزاڤێتایان بانگهێشتی لای خۆیان دەکرد، ئەمە مەسەلەیەکی زۆر ئاسایی و چ مەبەستێکی گرنگی لە دواوە نەبوو: خێزانێکی هەژاری تازەهاتوو، جلوبەرگ و شتی دیکەی ژنانەیان دەفرۆشت، لەبەر ئەوەی لە بازاڕدا هیچی وای بۆ نەدەکردن، بەدوای کڕیار و دەلآلێکدا دەگەڕان، لیزاڤێتایش سەری لەو کارانە دەخورا: هەقدەستێکی وەردەگرت و دەکەوتە دوای کارەکە، بازاڕی لیزاڤێتا گەرم بوو، چونکە زۆر سەرڕاست بوو، هەمیشە نرخی ڕاستەقینەی بە کڕیار دەوت و هەر نرخێک کە دایدەنا، بێنەوبەردەی لەسەر نەدەکرد، ئاسایی کەم قسەی دەکرد و وەک وتمان، گەلێک لەسەرخۆ و بەپارێز بوو.
بەڵام ڕاسکۆلنیکۆڤ لەم دواییەدا بڕوای بە خورافات هێنابوو، تا ماوەیەکی زۆریش ئاسەواری ئەو خورافاتەی لێنەدەبووەوە.

دەیویست هەمیشە ئەم ڕووداوانە ببەستێتەوە بە ڕێکەوتی سەیر و کاریگەرییە نهێنییە ئەفسوناوییەکانەوە.

پار زستان یەکێک لە خوێندکارەکانی هاوڕێی کە ناوی پوکوریف[1] و بە سەفەر دەچوو بۆ "خارکوف"، لە نێوان قسەکردندا ناونیشانی ئەلینا ئیڤانۆڤنای پیری دابوویە، بۆ ئەوەی ئەگەر ڕۆژێک پێویستی بە پارە بوو، بارمتەی لا دابنێت و بە قازانج پارەکەی لێ وەربگرێت. ڕاسکۆلنیکۆڤ تا ماوەیەک نەچووە لای پیرێژنەکە، چونکە وانەی دەوتەوە و هەرچۆنێک بوایە، کارەکانی خۆی ڕایی دەکرد، مانگ و نیوێک لەمەوبەر بیری ناونیشانەکەی کەوتەوە، دوو شتی هەبوو بۆ ئەوە دەشیان بە بارمتە دایانبنێت: سەعاتە زیوە کۆنەکەی باوکی و ئەو ئەنگوستیلە زێڕە چکۆڵەیەی کە سێ نقێمی سووری لەسەر بوو، کاتی خۆی خوشکی لە کاتی ماڵئاوایی لێکردنیدا بە یادگار دابوویە، ڕاسکۆلنیکۆڤ بڕیاری دا ئەنگوستیلەکەی بۆ بەرێت، کە پیرێژنەکەی دۆزییەوە، هەر لە یەکەم بینیندا، پێش ئەوەی هیچ شتێکی گرنگی لەبارەوە بزانێت، بەرانبەر بەو لە خۆیدا هەستی بە بێزارییەکی زۆر کرد، دوو گەڵاپارەی لێ وەرگرت و لەسەر ڕێگەکەیدا سەرێکی لە چایخانەیەکی گەنیلە دا، دانیشت و زۆری بیر کردەوە، بیرێکی سەیر، ڕاست وەک ئەو هێلکەیەی کە دەیەوێت ببێتە جووجەڵە، ئەم بیرە لە سەریدا تا دەهات، زیاتر پەرەی دەسەند و بە خۆیەوە سەرقاڵی دەکرد.

تا ڕادەیەک لە پاڵیدا، لە پشت مێزێکی ترەوە، خوێندکارێک کە هیچ نەیدەناسی و لە یادیشیدا نییە ناسیبێتی، لەگەڵ ئەفسەرێکی لاودا

---

[1] *Pokoref*

دانیشتبوو، دوای ئەوەی یاریی بلیاردیان کردبوو، دانیشتبوون بۆ چاخواردنەوە، لەپڕێکدا بەرگوێی کەوت کە خوێندکارەکە لەبارەی ئەلێنا ئیڤانۆڤنای سووخۆرەوە لەگەڵ ئەفسەرەکەدا دەدوێت و ناونیشانی دەداتێ، لە دیدی ڕاسکۆلنیکۆڤەوە ئەمە پێشهاتێکی سەیر بوو، چونکە ئەویش ئێستا لای ئەوەوە دەهاتەوە، وا لەوێشدا باس باسی ئەو ژنەیە! هەڵبەتە ئەمە تەنیا ڕێکەوتێک بوو، بەڵام ئەوێک کە بە هیچ جۆرێک ناتوانێت لەو کاریگەرییە سەیرە ڕزگاری بێت، وا ئێستا وەک یەکێک هەر بە دەستی ئانقەست ئەوە بکات، جارێکی دی هەمان بیری لا دروست دەکاتەوە، خوێندکارەکە کتوپڕ لەگەڵ هاوڕێکەیدا کەوتە باسی ئەلێنا ئیڤانۆڤنا:

- ژنێکی باشە، دەشێت هەمیشە پارەی لێ وەربگریت، لە جوولەکەی دەوڵەمەند دەچێت: دەتوانێت هەر لەوێدا پێنج هەزار ڕۆبڵت بداتێ، وەلێ بەسەر ڕۆبڵێکەوە ناچێت، لە بابەتی ئێمە زۆر کەس چوونەتە لای، وەلێ زۆر بەدڕەگەزە.

خوێندکارەکە کەوتە باسکردنی خراپی و شەڕئەنگێزیی پیرێژنەکە، وتی: ئەوەندە بەسە ڕۆژێک بەسەر بەڵێنەکەدا تێپەڕێت و بارمتەکەت تیا بچێت. چواریەکی قیمەتی بارمتەکەت دەداتێ، مانگی لەسەدا پێنج کە گەرمی قسە ببوو، زیاتر لەسەری ڕۆیشت، کە پیرێژنەکە خوشکێکی هەیە بە ناوی لیزاڤێتا، ئەگەرچی پیرێژن لاواز و بچووک دێتە بەرچاو، بەڵام لەو خوشکەی دەدات و وەک منداڵ بە تەواویی لەژێر چەپۆک و گوێڕایەڵیی ئەودایە، هەرچەندە باڵای لیزاڤێتا بە لایەنی کەمەوە مەترێک و شەست سانتیمە.

خوێندکارەکە بە دەنگی بەرز وتی:

- ئەمەیش دیاردەیەکە بۆ خۆی!
قاقایش دایە پێکەنین.
ئینجا هەردووکیان لەسەر لیزاڤێتا کەوتنە قسە، خوێندکارەکە بە تاموچێژێکی تایبەتییەوە باسی دەکرد و هەر پێدەکەنی. ئەفسەرەکەیش زۆری بایەخ بە گوێگرتنەکەی خۆی دابوو، داوای لە خوێندکارەکە کرد کە لیزاڤێتای بۆ پینەکردنی جلەکانی بۆ بنێرێت.
ڕاسکۆلنیکۆڤ یەک تاقە وشەیشی نەبوارد، یەکسەر لە هەموو شتێک گەیشت، لیزاڤێتا زڕخوشکی بچووکی پیرێژنەکە بوو، (دایکیان جیا بوو) تەمەنی سیوپێنج ساڵ بوو، شەووڕۆژ کاری بۆ خوشکەکەی دەکرد و چێشتکەر و جلشۆری بوو، بێ لەمانەیش شتی فرۆشتنی بۆ دەدوری، تەنانەت بەکرێ زەوی ماڵانیشی دەشت و هەموو دەستکەوتەکەی دەدایە خوشکی، نەیدەوێرا هیچ کار و بەڵێنێک بەبێ مۆڵەتی پیرێژن ئەنجام بدات، وەلێ پیرێژن وەسیەتی خۆی کردبوو، لیزاڤێتایش لەوە ئاگادار بوو، دەیزانی بێجگە لە شتومەکی وەک کورسی و کەرەسەی تر هیچ پارەیەکی پێنابرێت، هەموو سامانەکە بۆ گەیشتنە بەهەشتی گیانی پیرێژن کرابووە وەقفی یەکێک لە دێرەکانی ناوچەی "ن". لیزاڤێتا ژنی ماڵێ بوو، کارمەندی دەوڵەتی نەبوو، شووی نەکردبوو، لەشولاری گەلێک قەڵب و زۆریش درێژ بوو، پێی گەورە و چەماوە بوون و هەمیشە کەوشی کۆنەی لەپێ دەکرد، خۆی پاک ڕادەگرت، وەلێ ئەوەی خوێندکارەکە سەری لێ سوور دەما و پێکەنینی دەهێنایە، هەمیشە لیزاڤێتا سکی پڕ بوو.
ئەفسەرەکە وتی:
- تۆ نەتوت دزێوە؟

- بەڵێ، ڕەشپێستێکە، لە سەربازێکی دەمامککراو دەچێت، بەڵام دەزانیت، بە هیچ جۆرێک دزێو نییە، دەموچاوێکی زۆر میهرەبانی هەیە، بەتایبەتی دوو چاوی زۆر جوان، بۆیە بە لای زۆر کەسەوە مەقبووڵە، گەلێک هێور و شەرمنە، هەمیشە لەسەر هەموو شتێک لەگەڵتایە، تەنانەت زەردەخەنەکەیشی زۆر قەشەنگە.

ئەفسەرەکە بە پێکەنینەوە وتی:

- باشە، دیارە تۆیش حەزی پێدەکەیت؟

- لەبەر نامۆییەکەی.

پاشان زۆر بە گەرمییەوە وتی:

- با پێت بڵێم، ئامادەم ئەو پیرێژنە نەگریسە بکوژم و ماڵەکەی تالان بکەم، دڵنیات دەکەم کە تووشی هیچ ئازارێکی ویژدانی نابم.

ئەفسەرەکە کەوتەوە پێکەنین، ڕاسکۆلنیکۆڤ تەزوویەکی تێگەڕا، بە ڕاستی شتێکی سەیر بوو.

خوێندکارەکە دیسان بوێرانە وتی:

- بمبوورە، دەمەوێت پرسیارێکی جیدیت لێبکەم، هەڵبەتە من ئەوەم بە گاڵتەوە وت، بەڵام بڕوانە، لەلایەکەوە پیرێژنێکی گەمژەی هیچوپووچی بەد و نەخۆش کە کەڵکی بۆ کەس نییە، بەڵکو و زیان لە خەڵکی ئەدا و خۆیشی نازانێت بۆ دەژی، ڕەنگە هەر بەیانیش بمرێ.. تێدەگەیت؟ تێدەگەیت؟

ئەفسەرەکە لە قوتابییە هەڵچووەکە ڕاما و وەڵامی دایەوە.

- چاک، بەڵێ، چاک تێدەگەم.

- کەواتە گوێ لە پاشماوەکەی بگرە، لەلاکەی ترەوە، توانا گەنج و تازەکان بێهودە و بێپشتیوان لەناو دەچن، ئەوانە بە هەزارانن و دنیایان پڕ کردووە، سەد، بەڵکو هەزار پڕۆژە و کاری چاکە هەیە، کە

دەتوانرێت بەو پارەیەی ئەو پیرێژنە وەقفی دێری کردووە، ئەنجام بدرێت، سەدان، تۆ بڵێ هەزاران کەس هەیە بەو پارەیە دەخرێنە سەر ڕاستەڕێگە، دەیان خێزان لە هەژاری و بەدڕەوشتی و نەدارایی و نەخۆشیی زائەندامی ڕزگار دەبێت، هەموو ئەمانە بەو پارەیە دەکرێن. ئەو بکوژە، پارەکەی هەڵبگرە، بەڵام بەو مەرجەی دوایی بەو پارەیە خۆت تەرخان بکەیت بۆ کاری چاکە و خزمەتی مرۆڤایەتی.. دەڵێی چی، تاوانێکی ناچیزی بچووک هەزاران کاری باش نایشواتەوە؟ لەباتیی ژیانی تاقەکەسێک، هەزاران ژیانی تر لە بەدی و خراپی ڕزگار دەبێت، مەرگێک و لەباتیی ئەو سەدان گیان. ئاخر ئەم ژمارەیە تەواو ئاشکرا و ڕوونە، بێجگە لەوەی کە لە پێوانەی گشتیدا ژیانی پیرێژنێکی سیلاویی دەبەنگی خراپ چ ئاسەوارێکی هەیە، لە ژیانی ئەسپێیەک و جاڵجاڵوکەیەک زیاتر نییە! ئەسڵەن ئەو نرخەیشی نییە، چونکە پیرێژنەکە زیانبەخشە، گیانی کەسانی تر لەناو دەبات، بەدکردارە.. کەمێک لەمەوبەر لە ڕقا گازی لە پەنجەی لیزاڤێتا گرت و ئەوەندەی نەمابوو بیقرتێنێت.

ئەفسەرەکە وتی:

- بێگومان شایانی ئەوە نییە بژی، وەلێ ئەمە کاری سروشتە..

- هاوڕێ، سروشت چاک ئاڕاستە و ڕابەری دەکرێت. ئەگەر وا نەبووایە، ناچار نوقمی وەهم و کاری پڕوپووچ دەبووین. ئەگەر ئەمە نەکرایە، هەرگیز مرۆڤە مەزنەکان دروست نەدەبوون، دەڵێن: "ئەرک" و "ویژدان" من نامەوێت شتێک لەسەر "ئەرک" و "ویژدان" بڵێم، بەڵام ئاخر ئێمە چۆن لەم وشانە تێگەیشتووین؟ گوێ بگرە، پرسیارێکی ترت لێدەکەم، گوێ بگرە.

- باشە.

- تۆ ئێستا قسەوباس دەکەیت، بەڵام پێم بڵێ بزانم خۆت پیرێژنەکە دەکوژیت یان نا؟
- بێگومان نا، من باسی دادپەروەریم دەکرد.. مەسەلەکە من نیم.
- وەلێ بە بڕوای من، ئەگەر تۆ خۆت ناتوانیت بڕیار بدەیت، ئەم کارە هیچ پەیوەندییەکی بە دادپەروەریەوە نییە، وەرە، با دەستێکی تر یاری بکەین.
ڕاسکۆلنیکۆڤ زۆر شپرزە بوو، هەڵبەتە هەموو ئەم قسانە ئاساییترین قسەی گەنجانێک بوون کە جارەهای جار، بە شێوەی تر و لە بابەتگەلی تردا گوێبیستیان بووە، بەڵام بۆ بەتایبەتی ئێستا کە خۆیشی لە سەروبنی ئەو مەسەلەیەدا بوو، ئەمە ڕووی دا، دەبێت ڕووداوەکە وابێت کە ئەم ناچار بێت گوێبیستی ئەم جۆرە گفتوگۆ و بیرانە بێت؟ ئەی بۆ دەبێت هەر لەم کاتەدا کە بیرۆکەیەکی لەبارەی پیرێژنەکەوە لەژێر سەردایە، دەبێت گوێی لە قسەگەلێک بێت، کە پەیوەندیی بە پیرێژنەکەوە هەبێت؟ ئەم ڕێکەوتەی سەیر دەهاتە بەرچاو، گفتوگۆ بێنرخەکەی ئەو دوو کەسەی ناو چایخانەکەیش کاریگەرییەکی نائاسایی کردە سەر بیرکردنەوەی لەوەودوای، وەک ئەوەی بە ڕاستی جۆرە پێشهاتێکی سەیر بەڕێوە بێت.
کە ڕاسکۆلنیکۆڤ لە بازاڕی "سننایا"وە گەڕایەوە ماڵەوە، خۆی بەسەر قەنەفەکەدا دا و سەعاتێکی تەواو بەبێ جووڵە دانیشت، دنیا بەرەو تاریکی دەچوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ مۆمی نەبوو، هەر بیری لەوەیش نەکردبووەوە کە دەبێت مۆمێک دابگیرسێنێت، هەرگیز نەیتوانی ئەوە بێنێتەوە یادی خۆی، کە ئایا لەو ماوەیەدا بیری لە شتێک کردۆتەوە یان نا. پاشان هەستی بە لەرزوتاکە کردەوە و بە چاکی زانی لەسەر قەنەفەکە ڕاکشێت، چاوی لێک نا و زوو خەوێکی قورس ئەوکی گرت.

ماوەیەکی زۆر خەوت، بەبێ ئەوەی خەون ببینێت، تەنانەت ناستاسیاش کە سەعات دەی بەیانی هاتە ژوورەکەی، بە هەزار حاڵ لە خەو هەڵیساند. نانوچای بۆ هێنا، ئەو چایەی مابووەوە و جارێکی تر ناستاسیا کردبوویە قۆرییەکەی خۆیەوە، ناستاسیا بە توورەییەوە وتی:

- خەوێکی سەیرە! دەڵێی بۆ خەو دروست بووە!

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە بێزارییەوە کەمێک جووڵا، سەری دەیەشا، کە هەستایە سەر پێ، لە ژوورەکەیدا سووڕێکی خوارد و دیسان کەوتەوە سەر قەنەفەکە.

ناستاسیا هاواری کرد:

- دیسان خەو؟ باشە تۆ نەخۆشیت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی نەدایەوە.

- باشە، ئێستا چات دەوێت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە کاتێکدا چاوی دەنایەوە سەر یەک، ڕووی لە دیوارەکە کرد و بە زەحمەت وتی:

- جارێ.

ناستاسیا بەسەریەوە وەستا و وتی:

- ڕەنگە وابێت، نەخۆش بێت.

پاشان گەڕایەوە و ڕۆیشت.

سەعات دووی پاش نیوەڕۆ دیسان ناستاسیا بە شۆرباوە گەڕایەوە. ڕاسکۆلنیکۆڤ هەروا خەوتبوو، دەستی لە چایەکەش نەدابوو، تەنانەت ناستاسیا بە ڕکەوە ڕایتەکاند، لە کاتێکدا بە بێزارییەوە لێی دەڕوانی، هاواری لێکرد:

- تۆ چەند دەنوویت!

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستا و دانیشت، وەلێ هیچی نەوت و چاوی لە زەوییەکە بڕی.
ناستاسیا پرسی:
- نەخۆشیت یان نا؟
وەلێ جارێکی تریش وەڵامی نەبیست و دوای کەمێک بێدەنگی وتی:
- هەر هیچ نەبێت بچۆرە سەر شەقامەکە، بایەکی باڵت بدە، هیچ دەخۆیت یان نا؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە زەبوونییەوە وەڵامی دایەوە:
- دوایی، بڕۆ.
دەستیشی وا ڕاتەکاند، کە نیشانەی بێزاری بوو.
ناستاسیا ئیستێکی تری کردەوە، بە سۆزەوە لێی ڕوانی و چووە دەرێ. دوای چەند چرکەیەک ڕاسکۆلنیکۆڤ چاوی کردەوە و ماوەیەک لە شۆرباکە ڕاما، نانەکەی هەڵگرت، بە کەوچکەکەی دەستی کەوتە نانخواردن.
بە نابەدڵی چەند تیکەیەکی خوارد، تەنیا دووسێ کەوچک و ئەویش وەک بەزۆر بێت، وابوو، سەریشی ئیدی ئەوەندە نەدەیشا، کە لە خواردنەکە بووەوە، دیسان لەسەر قەنەفەکە ڕاکشایەوە، وەلێ ئیتر خەوی لێنەکەوت، بەڵکو بەبێ جووڵە، لە کاتێکدا کە دەموچاوی نوقمی سەرینەکە کردبوو، دەتوت بەردەوام خەون دەبینێت، خەونەکانی زۆر سەیروسەمەرە بوون، پێش هەر شتێک وای دەهاتە بەرچاو، کە لە شوێنێکی ئەفریقادایە، لە میسر یان لە مێرگێکی نادیاردا، کاروان دەحەسێتەوە و حوشترەکان بە هێوری نووستوون، لە دەورووبەریدا گەلێک دارخورما هەن، هەموو خەڵکەکە سەرگەرمی نانخواردنن، وەلێ ئەو هەر ئاو دەخواتەوە، ڕاست لە کانییەک کە لە پاڵیدایە و

خوڕەی دێت، هەوا فێنک و ئاوی شیرین و سارد.. ئاو بەسەر بەردی ڕەنگاوڕەنگ و لمی ئاڵتونیدا دەڕوات و دەدرەوشێتەوە. لەپڕا ئاشکرا گوێی لە دەنگی زەنگی سەعات بوو، ڕاپەڕی، هاتەوە سەر خۆی، سەری بەرز کردەوە، لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوەی کرد، کاتی لەبەرچاو گرت و زوو، لە کاتێکدا کە تەواو هاتبووەوە سەر خۆی، هەستا، وەک ئەوەی یەکێک بە زۆر لە قەنەفەکەی کردبێتەوە، وابوو. لەسەر نووکی پەنجەی لە دەرگاکە نزیک کەوتەوە، لەسەرخۆ کەمێکی ترازاند، گوێقوڵاغی بیستنی دەنگی خوار پلیکانەکان بوو، دڵی توند لێی دەدا، بەڵام هەموو شتێکی لای پلیکانەکان ئارام و هەموویش نوستبوون. زۆری بە لاوە سەیر بوو، کە توانیبووی لەو بێدەنگییەدا، لە دوێنێشەوەوە تا ئێستا بخەوێت و نە کارێکی ئەنجام دابێت و نە شتێکی ئامادە کردبێت.. سەعاتیش گەیشتبێتە شەش.. لەپڕا لەبری خەو و بێهۆشی، شپرزەیی و بیمارییەکی نائاسایی چۆکییان لەسەر دانا، پێشەکیی کارەکە هێند زۆر نەبوو، هەموو توانای خستە گەڕ تا بیر لە هەموو شتەکان بکاتەوە و هیچی لەبیر نەچێت، وەلێ دڵی وا لێی دەدا و دەنگی دەهات، کە بە زەحمەت هەناسەی بۆ دەدرا، دەبوو لە پێشدا بەرەزوانەیەک پەیدا بکات و بیدورێت بە پاڵتۆکەیدا، ئەمە کارێکی کەمخایەن بوو، دەستی وەردایە ژێر سەرینەکەی و لە نێو جلەکانیدا کە لەوێدا لەسەریەک نرابوون، کراسێکی کۆن و دڕاوی خۆی دەرهێنا، لە پارچەکانی تیلماسکێکی بڕی، کە پانی پێنج و درێژیی سیوپێنج سانتیمەتر بوو، تیلماسکەکەی دوولا کرد، پاشان پاڵتاوە هاوینییە هەراووتۆکمەکەی کە لە قوماشی ئەستوور دروست کرابوو (تاقە بەرگێکی بوو کە بەسەر جلەکانی تریدا لەبەری دەکرد) لەبەری خۆی داکەند و هەردوو سەری بەرەزوانەکەی لەژێرەوە بە

بنباڵی چەپییەوە بەست، لە کاتی دروونەکەدا دەستی دەلەرزی، بەڵام توانیی بەسەر خۆیدا زاڵ بێت و کارەکە بە باشی ئەنجام بدات، بە جۆرێک، کە پاڵتاوەکەی لەبەر کردەوە، لە دەرەوە هیچ نەدەبینرا، دەمێک بوو ڕاسکۆلنیکۆڤ دەرزی و دەزووی ئامادە کردبوو، لە پارچە کاغەزێکدا خستبوویە ناو مێزە چکۆڵەکەوە. وەلێ لەبارەی بەرەزوانەکەوە، دەبێت ئەوە بوترێت کە داهێنانێکی زۆر وردی خودی ئەو بوو، بەرەزوانەکە پەیوەندیی بە تەورەکەوە هەبوو: چونکە هەرگیز ناکرێت تەورێکت بەدەستەوە بێت و بە کۆڵاندا بڕۆیت، ئەگەر لەژێر پاڵتاوەکەیشیدا بیشاردایەتەوە، هێشتا هەر دەبوو بە دەستییەوە بوایە و ئەمەیش بێگومان سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشا. ئێستا بە هۆی بەرەزوانەکەوە تەنیا ئەوەندە بەس بوو دەمی تەورەکەی لێوە ڕەت بکات تا تەورەکە لەژێر بنباڵیدا، لە ناوەوە، بە درێژایی ڕێگەکە بە بەرەزوانەکەوە و لەسەرخۆ ئاوێزان بێت، ئێستا دەیتوانی دەستی بخاتە گیرفانی دەرەوەی پاڵتاوەکەی و لەوێوە دەسکی تەورەکە لە ناوەوە بگرێت بۆ ئەوەی ئەملاوئەولا نەکات. لەبەر ئەوەی پاڵتاوەکەی گەلێک هەراو بوو، هەر تەواو لە کیسەیەک دەچوو، بۆیە لە دەرەوە ئەوە دەرنەدەکەوت کە لە ناوەوەدا، لە ناو گیرفانەکەوە شتێک بەدەست گیرابێت. بیرۆکەی ئەم بەرەزوانەیەی لە پێش دوو هەفتەوە لە سەردا بوو.

کە ڕاسکۆلنیکۆڤ لە کارەکەی بووەوە، پەنجەی خستە ناو ئەو درزە بچووکەوە، کە کەوتبووە نێوان قەنەفەکە یان وەک پێی دەڵێن "دیوانی تورکی" و زەوییەکەوە، لە سووچی لای چەپییەوە کەمێک گەڕا و ئەو ئەمانەتەی کە دەمێک بوو لەوێدا شاردبوویەوە، هێنایە دەرەوە. دەبێت ئەو ڕاستییەش بڵێین کە ئەو ئەمانەتە بە هیچ جۆرێک ئەمانەتێکی

ڕاستەقینە نەبوو، بەڵکو پارچە تەختەیەکی ڕێک و سافکراو بوو، هەر بە قەدەر قوتوویەکی جگەرەی زیو دەبوو. ئەو هەروا بە ڕێکەوت، لە کاتی گەڕانێکیدا، لە حەوشەی ماڵێکدا کە کارگەیەکی دارتاشیی لە لایەکیدا بوو، ئەو قوتوەی دۆزیبووەوە، دوایی پارچەئاسنێکی باریک، کە بێگومان لە شتێکی تر ببووەوە و هەر ئەو ساتە لە شەقامێکدا دۆزیبوویەوە، خستبوویە سەر پارچەتەختەکە، دوای ئەوەی هەردوو پارچەکەی نابوونە سەر یەک (پارچە ئاسنەکە لە تەختەکە بچووکتر بوو) توند بە دەزوویەک پێکیەوەی بەستبوون و بە پارچەکاغەزێکی سپی و پاک پێچابوویەوە، ئەوەندەیش دەزووی تێئاڵاندبوو، کە بە ئاسانی نەدەکرایەوە. ئەم کارە بۆ ئەو مەبەستە ئەنجام درابوو، کە پیرێژنەکە بۆ ماوەیەکی باش سەرگەرمی کردنەوەی بێت و ڕاسکۆلنیکۆڤیش دەرفەتی چەند چرکەیەکی لێببێنێت. پارچەئاسنە چکۆڵەکە بۆ ئەوەبوو کە لە سەرەتاوە پیرێژن وا نەزانێت شتەکە تەنیا پارچەتەختەیەکە. هەموو ئەمانە ماوەیەک بوو لەژێر قەنەفەکەدا ئامادە کرابوون.

هەر ئەوەندەی ئەمانەتەکەی خۆی دۆزییەوە، لەپڕێکدا هاواری یەکێکی لە حەوشەکەوە کەوتە بەرگوێ:

– دەمێکە سەعات شەش لێی داوە.

– دەمێکە؟ خودایە!

ڕاسکۆلنیکۆڤ بەپەلە بەرەو دەرگاکە چوو، گوێی ڕاگرت، کڵاوەکەی هەڵگرت و لە سیانزە پلیکانەکەوە، زۆر لەسەرخۆ، بە بێدەنگی، وەک پشیلەیەک هاتە خوارێ، گرنگترین کاری ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەوەبوو تەورەکە لە موبەقەکە بدزێت، لەبەر ئەوەی کارەکەی بە تەور ئەنجام دەدرا، زۆر دەمێک بوو بڕیاری خۆی دابوو. هەرچەندە ئەو

چەقۆیەکی باخ هەڵپاچینی هەبوو، بەڵام نە بڕوای بە چەقۆ هەبوو نە بە توانای خۆی، بۆیە بڕیاری دابوو بە تەور کارەکەی ئەنجام بدات. دەبێت هەر لەم لایەنەوە باس لەوەیش بکرێت کە بۆ ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەم بڕیارەی دابوو! هەموو ئەم بڕیارانە بە جۆرێکی سەیر هاتنە کایە: واتا چەندە ئەم بڕیارانە توندتر بدرانایە، هەر بەو ئەندازەیە لە دیدی ڕاسکۆلنیکۆڤەوە بڕیارگەلێکی بێماناتر و شوومتر دەردەکەوتن. لەگەڵ هەموو ئەو کێشە دەروونییە ناخۆشانەی تووشی ڕاسکۆلنیکۆڤ هاتبوون، بەدرێژایی ئەو ماوەیە هەرگیز بۆ تاوێکیش نەیدەتوانی بڕوا بە سەرکەوتنی کارەکەی بهێنێت. ئەگەر ڕێکەوت وا بکەوتایەتەوە کە هەموو وردەکارییەکانی نەخشەکە تا دواهەنگاو جێبەجێ بکرانایە و دوابڕیاریان لەسەر بدرایە، بە شێوەیەک کە ئیتر جێگای دوودڵیی تیا نەبوایەتەوە، ئەوسا زۆر ئەگەری ئەوە هەبوو کە لە بڕیارەکەی، وەک کارێکی زۆر ترسناک و نابەجێ. بە تەواویی پەشیمان بێتەوە، بەڵێ هێشتا گومان و دڵەڕاوکێ و مەسەلەی ئاڵۆز زۆر لە زیادیدا بوو، وەلێ بەدەستهێنانی تەور مەسەلەیەکی زۆر بچووک بوو، کە هەرگیز ئەوی نارەحەت نەدەکرد، چونکە کارێکی لەوە ئاسانتر نەبوو. لەبەر ئەوەی ناستاسیا گەلێکجار، بەتایبەتی لە ئێوارانداا لە ماڵ دەچووە دەرێ، یان سەری لە دراوسێکان دەدا یان دەڕۆیشتە دوکان و هەمیشە دەرگاکەی بە کراوەیی جێ دەهێڵا. خاوەن ماڵەکە هەمیشە لەسەر ئەمە شەڕی لەگەڵدا دەکرد. لەم لایەنەوە ئەوەندە بەس بوو ڕاسکۆلنیکۆڤ لەو کاتەدا لەسەرخۆ بڕواتە چێشتخانەکە، تەورەکە هەڵبگرێت و دوای سەعاتێک کە هەموو شتێک کۆتایی پێدێت، بگەڕێتەوە چێشتخانەکە و تەورەکە لە جێی خۆی دابنێتەوە.

وەلێ هێشتا گومانگەلێک لەئارادا بوون: ئەگەر دوای سەعاتێک بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی تەورەکە بخاتەوە جێی خۆی و بەڕێکەوت ناستاسیایش هاتبێتەوە ئەوێ، لەم حاڵەتەدا دەبێت تێپەڕێت و چاوەڕێ بکات بۆ ئەوەی جارێکی تر بڕواتەوە دەرەوە. بەڵام ئەگەر هەر لەو کاتەدا ناستاسیا تەورەکەی بێتەوە بیر و بە دوایدا بگەڕێ و بیکاتە هەراوزەنا، ئەوسا بەدگومانییەک دروست دەبێت، یان هەر هیچ نەبێت، بوارێکی بۆ دەرەخسێنێت.

هەموو ئەمانە وردەکارییەک بوون هێشتا ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری لێنەکردبوونەوە یان دەرفەتی ئەوەی نەبوو بیریان لێبکاتەوە. بیری لە کارە سەرەکییەکە دەکردەوە و وردەکارییەکانی دەنایە لاوە. تا ئەو کاتەی کە بە تەواوی لە هەموو شتێک دڵنیا دەبێت، بەڵام هەمیشە دەگەیشتە ئەوەی کە هەرگیز کارەکە نایەتە دی، هیچ نەبێت بە لای خۆیەوە وا دەشکایەوە. بۆ نموونە بە هیچ جۆرێک نەیدەتوانی پێشبینیی ئەوە بکات کە ڕۆژێک دەستبەرداری بیرکردنەوە بێت، هەستێت و بەوپەڕی سادەییەوە بڕوات بۆ ئەوێ. تەنانەت دواسەردانی پیرێژنەکەیش (کە زیاتر بۆ پشکنینی شوێنەکە بوو) هەر ئاوا ڕەوتەنی ئەنجام درا، نەک بە شێوەیەکی سووربوون و جەخت لەسەرکردن. دەشێت بە خۆی وتبێت: "لێگەڕێ بڕۆم و تاقیی بکەمەوە، ئەوەندە لێکدانەوەی ناوێت" بەڵام یەکسەر تێک چوو، تفی لەسەر زەوی کرد، بێزی لە خۆی هاتەوە و هەڵات، لە کاتێکدا وا دەهاتە بەرچاو کە دەمێکە ئەو زۆر بە وردی لێکۆڵینەوەی پێویستی دەربارەی چارەسەرکردنی گرفتە ئەخلاقییەکەی ئەم مەسەلەیە کردووە. گریمانەکەی لە چەقۆی تیژ دەچوو، تەنانەت لە خۆیشیدا ئیدی هیچ پاساوێکی ماقووڵی نەدەدۆزیەوە. کەچی هێشتا هەر لە

خۆی دڵنیا نەبوو، سەرسەختانە خۆی کردبووە وابەستە و بە دوای بەڵگەیەکدا دەگەڕا، وەک ئەوەی یەکێک ناچاری کردبێت ئەم کارە بکات. وەلێ دوێنێ کە چاوەڕواننەکراو و هەموو شتێکی یەکلایی کردبووەوە، لە خۆیەوە کاریگەرییەکی زۆر قووڵی لێکردبوو: وەک کەسێک دەستی گرتبێت و بە توانایەکی سەیرەوە، هەردوو چاوی بەستبێتەوە و بەبێ هیچ بەرەنگارییەک بەدوای خۆیدا کێشی بکات، وابوو. دەتوت چمکێکی کراسەکەی لە تایەی ماشێنێک گیر بووە و، ماشێنەکە وردەوردە بەرەو لای خۆی کێشی دەکات.
لە سەرەتادا، کە بێگومان ماوەیەکی دوورودرێژ بوو، پرسیارێک لە چوارچێوەی پرسیارەکانی تردا زۆر بە خەستی ئەمی سەرقاڵ کردبوو: بە لایەوە سەیر بوو کە بۆچی تا ڕادەیەک هەموو تاوانەکان بە ئاسانی ئاشکرا دەبن، هەروەها بۆ تا ڕادەیەک شوێنپێی گشت تاوانکاران ئەوەندە ئاسان دەدۆزرێنەوە. وردەوردە گەیشتە ئەنجامی جۆراوجۆر و سەرنجڕاکێش، وای هاتە بەرچاو کە هۆی سەرەکیی شاردنەوەی تاوان ئەوەندە پەیوەندیی بە هۆکاری مادییەوە نییە، بەڵکو زیاتر بە خودی تاوانکارەوە بەستراوەتەوە، هەر تاوانکارێک، تا ڕادەیەک هەموو تاوانکارێک، لە کاتی ئەنجامدانی تاواندا تووشی جۆرێک لە بێئیرادەیی و بیری خراپ دەبنەوە. واتا لەو کاتەدا کە زیاد لە هەر کاتێکی دی پێویستی بە ئەقڵ و دانایی هەیە، کەچی ئیرادە و بیری ڕووناک جێگاکەی دەداتە جۆرێک لە منداڵبازاڕی. بە ڕای ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەم تاریکیی ئەقڵ و لاوازیی ئیرادەیە وەک نەخۆشی تووشی مرۆڤ دێت، لەسەرخۆ پێدەگات و کەمێک پێش ڕوودانی تاوانەکە، دەگاتە ئەوپەڕی گەشەسەندن، ئەم حاڵەتە کاتی ڕوودانی تاوان و ماوەیەکیش دوای ئەوە، بە کەسەکانەوە بەستراوەتەوە.

هەروەها وەک خۆی دەمێنێتەوە و پاشان وەک هەر نەخۆشییەکی دی لەناو دەچێت. لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە، کە ئایا نەخۆشی تاوان دروست دەکات، یان خودی تاوان بەپێی سروشتی خۆی، هەمیشە هاوڕێی حاڵەتێکە، کە لە نەخۆشی دەچێت؟ هێشتا ڕاسکۆلنیکۆڤ لە خۆی ڕانابینێت وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە.

دوای ئەوەی گەیشتە ئەم ئەنجامانە، هێشتا ڕاسکۆلنیکۆڤ باوەڕی تەواوی بەوە هەبوو کە ئەو دوورە لەو جۆرە نەخۆشییانە، ئەقڵ و ئیرادەیشی بەردەوام لە کاتی ئەنجامدانی بەرنامەیەکی وادا لەگەڵیدان، ئەم بڕوایەی تەنیا لەوەوە هاتبوو، کە ئەو نەخشەکەی خۆی بە "تاوان" ناداتە قەڵەم، ئێمە لە لێکدانەوەی تەواوی بەسەرهاتەکەدا کە ئەم بەرئەنجامەی لێکەوتەوە، چاو دەپۆشین. چونکە بەبێ ئەوەیش ئێمە هەنگاوێکمان بۆ پێشەوە ناوە، تەنیا ئەوەی لێ زیاد دەکەین، کە کێشەی مادیی ڕووت لای ئەو بە پلەی دووەم دێت. ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری دەکردەوە: "ئەوەندە بەسە دەسەڵاتت بەسەر ئەقڵ و ئیرادەتدا هەبێت تا بتوانیت لە کاتی خۆیدا، واتا کە تەواوی وردەکارییەکانت زانی، بەسەر کێشەکاندا زاڵ بیت" بەڵام هێشتا کارەکە دەستی پێنەکردبوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ کەمتر بڕوای بە دوابڕیارەکانی خۆی هەبوو، تەنانەت لە کاتی ئەنجامدانیشدا، هەموو شتێک بە جۆرێکی دی، واتا بەڕێکەوت و کتوپڕ ڕوویان دەدا.

شتێکی زۆر بچووک، پێش ئەوەی لە پلیکانەکان بێتە خوارێ، ئەوی وەستاند. کە گەیشتە چێشتخانەی خاوەن ماڵەکە، کە بەردەوام دەرگاکەی کرابووەوە، بە گومان و پارێزەوە لە ناوەوەی ڕوانی، بۆ ئەوەی بزانێت ئەگەر ناستاسیا لەوێ نەبێت/ خاوەن ماڵەکە لەوێیە یان نا، ئەگەر لەوێ نەبێت، ئەم دڵنیا بێت کە دەرگای ژوورەکەی باش

داخراوە، نەوەکا لەو ساتەدا کە دەڕواتە چێشتخانەکە بۆ ئەوەی تەورەکە بێنێت، خاوەنماڵەکە لە ژوورەکەیەوە سەربێنێتە دەرێ و چاوی بکات، کە بینی ناستاسیا ئەمجارەیان نەک هەر لە چێشتخانەکەدایە، بەڵکو سەرقاڵی کارێکیشە، یەعنی جلە شۆراوەکان لە سەبەتەیەک دەردێنێ و لەسەر تەناف هەڵیان دەخات، یەکجار سەری سووڕما. هەر کە ناستاسیا ڕاسکۆلنیکۆڤی بینی، وازی لە جلە شۆراوەکان هێنا، لێی ڕاما تا تێپەڕی و لەچاو ونبوو، بەڵام ڕاسکۆلنیکۆڤ تەماشای ئەوی نەکرد و وا تێپەڕی، وەک ئەوەی هیچی نەدیبێت، وەلێ کارەکەی سەری نەگرت. چونکە تەوری لێنەبوو: ڕاسکۆلنیکۆڤ کەوتە سەرسامییەکی قووڵەوە.

کاتێ بەرەو دەرگای دەرەوە دەچوو، لەگەڵ خۆیدا بیری کردەوە: "ئاخر چۆن و لەسەر چ بنەمایەک من وام بیر کردۆتەوە کە حەتمەن نابێت لەم ساتەدا ناستاسیا لە ماڵ بێت؟ چۆن، چۆن لەم بارەیەوە ئەوەندە دڵنیا بووم؟" ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستی بە داڕمان و تەنانەت زەلیلیی خۆی کرد. دەیویست لە داخا بە خۆی پێبکەنێت.. ڕقێکی خەستی ئاژەڵییانە لە ناوەوەیدا دەکوڵا.

لەبەر دەرگاکەدا کەوتەوە بیرکردنەوە. چوونە سەرشەقام بە بیانووی پیاسەکردنەوە کارێکی دزێو بوو، گەڕانەوەیش بۆ ماڵەوە لەو دزێوتر بوو. کاتێک لە بەردەم دەرگاکەدا و ڕێک بەرانبەر ژووری کراوەی پاسەوانەکە وەستا بوو، لەژێر لێوەوە بە خۆی وت: "چ دەرفەتێکی چاکم بۆ هەمیشە لەدەست دا" لەپڕا مووچرکێک بە هەموو لەشیدا گەڕا، لە ژوورە چکۆلەکەی پاسەواندا کە دوو هەنگاوێک لێیەوە دوور بوو، لەژێر کورسییەکی داردا، شتێکی بینی دەبریسکایەوە.. تەماشای ئەملاوئەولای کرد، کەس دیار نەبوو، بە سەری پەنجە لە ژوورەکە

نزیک کەوتەوە. بە دوو پلیکانەی بچووکدا چووە خوارێ، بە دەنگێکی نزم بانگی لە پاسەوانەکە کرد و وەڵام نەبوو، "دیارە کەوایە، لە ماڵ نییە، وەلێ دەبێت لەم دەوروبەرەدا، لە حەوشە بێت، چونکە دەرگای ژوورەکەی تەواو لەسەر پشتە" زۆر بەپەلە خۆی گەیاندە تەورەکە (ئەوەی دەبریسکایەوە، تەور بوو) لەژێر کورسییەکە، لە بەینی دوو برە داردا هێنایە دەرێ. هەر لەوێ، پێش ئەوەی لە ژوورەکە بێتە دەرەوە، بەو بەرەزوانەوە کە بۆی ئامادە کردبوو، توند بەستی. هەردوو دەستی خستە گیرفانی و لە ژووری پاسەوانەکە هاتە دەرێ. کەس نەیبینی، بەدەم بزەیەکی سەیرەوە کە کەوتبووە سەرلێوی، بیری کردەوە: "ئەمەیان بە یارمەتیی ئەقڵ نەبوو، هی شەیتان بوو" ئەم ڕێکەوتە بوێرییەکی زۆری پێبەخشی.

ڕێگەکەی لەسەرخۆ و بەویقارەوە دەبڕی، پەلەی نەدەکرد نەوەک گومانی لێبکرێت، کەمتر تەماشای ڕێبواری دەکرد، دەیویست هەر لێیان نەڕوانێت و چەندە بتوانێت سەرنجیان بۆ خۆی ڕانەکێشێت.

لەوێدا کڵاوەکەی هاتەوە بیر: "خودایا، سێ ڕۆژ لەمەوبەر پارەیشم هەبوو کەچی نەمتوانی کڵاوێک بکڕم" چەند وشەیەکی ناشیرینی بە دڵدا هات. کە چاوێکی بە ناو دوکانێکدا گێڕا، لە سەعاتی دیوارەکەیەوە زانی سەعات حەوت و دە دەقیقەیە. دەبێت پەلە بکات و بە دەوری ماڵەکەیشیدا بگەڕێت، پاشان لە لایەکی ترەوە بڕواتە ژوورێ.

جاران ئەگەر بە ڕێکەوت بیری لەم بەسەرهاتە بکردایەتەوە، بێگومان بوو کە ترسی لێدەنیشت، کەچی ئێستا زۆر نەدەترسا، تەنانەت بیری بۆ هەندێک شتی تر دەچوو، کە هیچ پەیوەندییەکی بەو باسەوە نییە. بەلام بۆ ماوەیەکی کەم، ئەو کاتەی بە پاڵ باخی "یوسوپف"دا تێدەپەڕی، بیری لەوە کردەوە، کە دەبێت لەوێدا فوارەی زۆر دروست

بکرێت، چونکە بە ئاسانی ئاووهەوای ئەو ناوە پاک و فێنک دەکات. کەم کەم بیری لەوە کردەوە، کە ئەگەر "باخە هاوینییەکان" هەموو "گۆڕەپانی مارس" بگرنەوە و تەنانەت ببەسترێنەوە بە "کۆشکی میخایلوسکی"یەوە، ئەوسا شار چەندە کەڵکی لێوەردەگرت و چەندیش ڕازاوەتر دەبوو. لە پڕێکدا بیرۆکەیەکی تری بەسەردا هات، کە بۆچی لە هەموو شارە گەورەکاندا مرۆڤ نەک بە زۆر، بەڵکو هەر بە خوایشت، حەزی بەوەیە لەو گەڕەکانەدا بژی، کە نە باخی تیایە و نە فوارە، لەو شوێنانەدا کە پڕن لە پیسی و بۆن و بەرامەی ناخۆش . لێرەدا بیری گەڕانەکانی خۆی کەوتەوە لە گۆڕەپانی "سننایا"دا، بۆ چرکەساتێک هاتەوە سەر خۆی و کەوتەوە بیرکردنەوە: "ئەم شتە هەلەقومەلەقانە چییە، نا، چاکتر وایە هەر بیری لێنەکەمەوە" پاشان بیرۆکەیەکی تری بەسەردا هات: "دیارە ئەو کەسانەیش کە بەرەو سێدارە دەبرێن، بیر لە هەموو ئەو شتانە دەکەنەوە، کە لەسەر ڕێگەیاندا دەیانبینن" وەلێ ئەم بیرۆکەیە بۆ چرکەساتێک وەک بروسکە هات و تێپەڕی و خۆیشی زۆر زوو لە خۆیدا کوژاندییەوە. ئیتر چ ڕێگەیەک نەمابوو، ئەمەماڵەکە، ئەمە دەرگا گەورەکەی دەرەوە. کتوپڕ لە شوێنێکی نادیارەوە سەعاتێک لێیدا "مانای چی، ناشێ سەعات حەوت و نیو بێت؟ نابێت، هەرگیز، بێگومان سەعاتەکە لە پێشە" بەختی یار بوو، لە بەردەم دەرگا گەورەکەی دەرەوەدا هەموو شتێک بەخێر گەڕا.

هەر لەو کاتەدا وەک بەتایبەتی بۆ ئەم ڕەخسابێت، لە بەردەمیدا، بارێک کای گەورە لە دەرگاکەوە چووە ژووری و ئەمی بە تەواوی شاردەوە، هەر ئەوەندەی بارەکایەکە گەیشتە حەوشەی ناوەوە، ڕاسکولنیکۆڤیش خێرا بە لای ڕاستا وەرگەڕا، لەوێدا، لەولای

عەرەبانەی کاکەوە گوێی لە دەنگوهەرای چەند کەسێک بوو، وەلێ کەس گوێی بەو نەدا و کەسیشی نەبینی. لەو کاتەدا زۆر لەو پەنجەرانەی کە بەسەر حەوشە گەورەکەدا دەیانڕوانی، کرابوونەوە. بەڵام ڕاسکۆلنیکۆڤ سەری هەڵنەبڕی، توانای سەرهەڵبڕینی نەبوو، ئەو پلیکانانەی بەرەو ژووری پیرێژنەکە دەچوون، هەر ڕاست لە دوای دەرگاکەوە و کەوتبوونە لای ڕاستەوە. ڕاسکۆلنیکۆڤ دوای چرکەساتێک خۆی لەوێدا بینییەوە، هەناسەی تازەی دا، دڵی کە توند کەوتبووە لێدان، دەستی نایە سەری و گوشی. تەورەکەی بەسەر کردەوە و دڵنیا بوو، لەسەرخۆ و بەپارێزەوە، لە کاتێکدا کە تەواو گوێی هەڵخستبوو، لە پلیکانەکان بەسەرکەوت. بەڕێکەوت لەو کاتەدا سەر پلیکانەکانیش چۆڵوهۆڵ بوون. هەموو دەرگاکان داخرابوون و ڕووبەڕووی کەس نەبووەوە، تەنیا لە قاتی دووەمدا، دەرگای ئاپارتمانێکی چۆڵ کرابووەوە و کۆمەڵێک بۆیەچی کاریان تیا دەکرد. تەنانەت ئەوانیش نەیانبینی.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەستا، بیرێکی کردەوە و کەوتەوە ڕێ، بە خۆی وت: "بێگومان زۆر چاکتر دەبوو ئەگەر ئەمانیش لێرە نەبوونایە، وەلێ.. هێشتا دووقاتی تری ماوە".

باشە، ئەمەیش قاتی چوارەم، ئەوە دەرگاکە، ئەوەیش ئاپارتمانەکەی بەرانبەر، ئەوەیش کەسی تیا نییە، قاتی سێیەمیش، زۆر لەوە دەچێت ئەو ئاپارتمانەی کەوتۆتە ژێر ئاپارتمانی پیرێژنەکەوە، چۆڵ بێت. ئەو کارتە تایبەتییانەی بە بزماری بچووک بە دەرگاکەوە داکوتراون، نەماون. کەواتە ماڵەکەیان چۆڵ کردووە.. ڕاسکۆلنیکۆڤ تەواو هەناسەی گیرا، لە چرکەساتێکدا بیرۆکەیەکی بەسەردا هات "چۆنە بگەڕێمەوە؟" بەڵام وەڵامی خۆی نەدایەوە و گوێی بەرەو لای ماڵی

پیرێژنەکە هەڵخستبوو. بێدەنگییەکی مەرگئاسا چۆکی بەسەر ژوورەکەدا دادابوو. پاشان، جارێکی تر گوێڕادێری لای پلیکانەکان بووەوە و ماوەیەک بە وردی گوێی هەڵخست. ئینجا، بۆ دواجار تەماشای ئەملاوئەولای خۆی کرد، خۆی کۆک و تەیار کرد و دیسان تەورەکەی بەسەر کردەوە، کە بە بەرەزوانەکەوە هەڵواسرابوو، بەخۆی وت: "ئایا ڕەنگم زۆر پەڕیووە؟ زۆر پەشۆکاوم؟ پیرێژنەکە بەدگومانە.. چۆنە کەمێکی تر چاوەڕێ بم.. بۆ ئەوەی دڵم بێتەوە سەر خۆی..؟"

بەڵام دڵی نەهاتەوە سەر خۆی، بە پێچەوانەوە، دەتوت بە دەستی ئانقەست توندتر و توندتر لێی دەدا، ڕاسکۆلنیکۆڤ خۆی نەگرت. لەسەرخۆ دەستی درێژ کرد و زەنگی لێدا، دوای نیو دەقیقە جارێکی دی لە زەنگەکەی دایەوە، ئەمجارەیان کەمێک توندتر، وەڵام نەبوو، بێهودە زەنگکوتان نە کەڵکی هەبوو نە بۆ ئەو دەشیا. بێگومان پیرێژنەکە لە ماڵ بوو، بەدگومان و تەنیا بوو، تا ڕادەیەک ڕاسکۆلنیکۆڤ شارەزای ڕەفتاری بوو.

جارێکی تر گوێی بە دەرگاکەوە قرساند، نەیزانی هەستی تا ئەو ڕادەیە شپرزەیە (کە ئەمەیش کێشەیەک بوو بۆ خۆی) یان بە ڕاستی دەنگەکە چاک دەبیسترا. بەڵام بەهەرحاڵ، کتوپڕ گوێی لە دەنگی هێوری دەستێک بوو بە دەستگیری دەرگاکەوە لەگەڵ خشەخشی کراسێکدا کە بەری دەکەوت. بێگومان یەکێک لەودیوەوە وەک ئەو لە پاڵ دەرگاکەدا وەستابوو، لە ناوەوە گوێی گرتبوو، ئەویش هەناسەی لەخۆ بڕیبوو، دەبوو وەک ئەمیش گوێی بە دەرگاکەوە قرساندبێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ئانقەست جووڵەیەکی کرد و کەمەکێک دەنگی هەڵبڕی تا پیرێژن گومانی ئەوە نەبات کە ئەم لە پارێزیدایە. ئینجا بۆ

سێیەمین جار زەنگەکەی لێدایەوە، بەڵام لەسەرخۆ، بەڕێز و بەبێ ئەوەی هیچ خۆی تێک بدات.
پاشان کە یادی ئەو چرکەساتەی دەکردەوە و بە ڕوونی دەیهێنایەوە بەرچاوی خۆی، هەستی دەکرد تا هەتاهەتایە شوێنەواری ئەو چرکەساتە لە بیریدا دەمێنێت. نەیدەزانی لەو ساتەدا ئەو هەموو فرۆفێڵەی لە کوێوە هێنابوو، بەتایبەتی ئەو کاتەی کە تاریکایی ئەوەندە هزری داگیر کردبوو، کە هەرگیز هەستی بە جەستەی خۆی نەدەکرد. دوای چرکەساتێک گوێی لە دەنگی کرانەوەی دەرگاکە بوو.

## ٧

دەرگاکە وەک جاری پێشتر درزێکی تێکەوت، دیسان دووچاوی تیژ لە نێو دڵی تاریکییەکەوە لێی ڕامان. لەو ساتەدا ڕاسکۆلنیکۆڤ تەواو پەشۆکا و لەوەدابوو هەڵەیەکی گەورە هەموو شتەکانی لێ تێک بدات.
لە ترسی ئەوەی نەکا پیرێژن لە تەنیاییەکەی خۆی بترسێت و، ئومێدی ئەوەیشی نەبوو دیمەنی ئەم دڵنیاییەک بەو ببەخشێت، ڕاسکۆلنیکۆڤ دەستی بە دەرگاکەوە گرت و بۆ ئەوەی پیرێژن بیر لە داخستنەوەی نەکاتەوە بەرەو لای خۆی ڕایکێشا، پیرێژنەکە کە ئەمەی بینی، دەرگاکەی بەرەو لای خۆی ڕانەکێشایەوە، بەڵام دەستگیرەکەی بەرەڵا نەکرد. بە جۆرێک، کە خەریک بوو ڕاسکۆلنیکۆڤ دەرگا و پیرێژنەکە بەرەو پلیکانەکان بەکێش بکات. کە بینی پیرێژن بەر دەرگاکەی گرتووە و ناهێڵێت بڕواتە ژووری، ڕاست بەرەو ڕووی ڕۆیشت، پیرێژن لە ترسا خۆی لادا، ویستی شتێک بڵێت. بەڵام پێدەچوو نەتوانێت و هەردوو چاوی تێبڕی.

ڕاسکۆلنیکۆڤ چەند توانی، بە ڕەهایی و لەسەرخۆ لەگەڵیدا کەوتە قسە:

- سڵاو ئەلێنا ئیڤانۆڤنا

بەڵام نەیتوانی کۆنترۆڵی دەنگی بکات، دەیبڕی و لەرزینی تێدەکەوت:

- من بۆ تۆ.. شتێکم هێناوە.. چاکترە بڕۆیتە ئەولاوە، لای ڕوناکییەکە..

بەبێ ئەوەی چاوەڕێی مۆڵەتی لێبکات، بە لایدا تێپەڕی و چووە ناو ژوورەکەوە.

پیرێژنەکە کەوتە دوای، زمانی کرایەوە و پێی وت:

- سەیرە، ئاخر چیت گەرەکە؟ کێیت؟ بۆ هاتوویت؟

- ئەلێنا ئیڤانۆڤنا، هەرئاوا! من ڕاسکۆلنیکۆڤم، دەمێکە ناسیاوتانم.. ئەمەیش ئەو بارمتانەیە کە جاری پێشوو بۆم باس کردی، بۆم هێناویت.

بەدەم قسەکردنەوە بارمتەکەی بۆ ڕاگرت، پیرێژن تەماشای بارمتەکەی کرد و دیسانەوە لە میوانە ناوەختەکە ڕامایەوە، ڕامانێکی قووڵ و تووڕە و بێباوەڕی. چرکەساتێکی خایاند، ڕاسکۆلنیکۆڤ وای بۆ چوو کە لە چاوی پیرێژندا نیمچە گاڵتەجاڕییەک هەیە، وەک ئەوەی لە هەموو شتێک گەیشتبێت، لاوەکە وای هەست دەکرد کە خۆی لەدەست داوە، ترس دایگرتووە، ترسەکە هێند زۆرە، ئەگەر پیرێژنەکە نیو دەقیقەی تر هەر ئاوا بێدەنگ لێی بڕوانیت، بێگومان لە بەردەمی هەڵدێت.

کەچی لەپڕا بە تووڕەییەوە وتی:

- تۆ بۆ وا لێم دەڕوانیت، دەڵێی نامناسیت؟ ئەگەر بارمتەکەت ناوێت، دەچمە لای خەڵکی تر، کاتی زۆرم نییە.

هەرگیز ڕاسکۆلنیکۆڤ خەیاڵی لای ڕستەیەکی وا نەبوو، بەڵام ڕستەکە لە خۆیەوە لە دەمی دەرپەڕی. پیرێژن هاتەوە سەر خۆی، بڕوای بە توانایی دەنگی میوانەکە کرد، بەدەم تەماشاکردنی بارمتەکەوە پرسی:

- کوڕی باش، ئاخر تۆ چیم بۆ دێنیت، ئەمە چییە؟

- قوتووی جگەرەیە و لە زیو دروست کراوە، من جاری پێشوو پێم وتیت. پیرێژن دەستی درێژ کرد.

- بۆ وا ڕەنگت پەڕیوە؟ دەستیشت دەلەرزێت، ترساویت، ها؟ ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دەنگێکی پچڕ پچڕەوە وەڵامی دایەوە:

- لەرزوتامە، بێگومان کاتێک کە مرۆڤ هیچی نەبێت بیخوات، ڕەنگی پێوە نامێنێت.

دوارستەی بە زەحمەت بۆ وترا، هێزی تیا نەمابوو، بەڵام پیرێژنەکە بڕوای بە وەڵامەکە کرد و بارمتەکەی لێ وەرگرت، لەگەڵ تێڕامانێکی تری ڕاسکۆلنیکۆڤدا بارمتەکەی لە ناو دەستیا هەڵسەنگاند و پرسی:

- چییە؟

- چییە؟ قوتووی جگەرەیە.. زیوە.. تەماشای بکە.

- نا، پێناچێت زیو بێت.. زۆرت پێوە پێچاوە.

پیرێژن بەدەم کردنەوەی دەزووەکانەوە ڕووی لە ڕووناکیی پەنجەرەکە کردبوو (لەگەڵ ئەوەیشدا کە گەرما ژوورەکەی تەواو خەفە کردبوو، هەموو پەنجەرەکان داخرابوون) بۆ چەند چرکەساتێک وازی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ هێنا و پشتی تێکرد، لاوەکە دوگمەی پاڵتاوەکەی کردەوە و تەورەکەی لە بەرزوانەکە ڕزگار کرد. بەڵام هەمووی دەرنەهێنا و تەنیا بە دەستی ڕاست لەژێر پاڵتاوەکەیەوە گرتی. دەستی زۆر لاواز بوو، خۆی هەستی پێدەکرد چۆن بەردەوام

دەستی زیاد لە جاران بێتوانایی تێدەگەڕا و سست دەبوو. لەوە ترسا تەورەکەی لە دەست بەر ببێتەوە.. لەپڕێکا - وەک ئەوەی سەری گێژ بخوات، وا بوو.

پیرێژن بە تووڕەییەوە هاواری لێکرد:

- ئاخر بۆ ئەم هەمووەت پێوە پێچاوە!

ویستی لەسەرخۆ بۆ لای بگەڕێتەوە.. ئیدی لەوەدا نەمابوو چرکەساتێک چییە بە فیڕۆی بدات. ڕاسکۆلنیکۆڤ تەورەکەی دەرهێنا، بە هەردوو دەستی بەرزی کردەوە و بەبێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێت، بەبێ هیچ زەحمەتێک، تا ڕادەیەک وەک لە خۆیەوە ڕوو بدات، تەورەکەی بۆ داهێنایەوە. لەو کاتەدا هەستی بە توانای خۆی کرد.

پیرێژن وەک هەمیشە سەری ڕووت بوو، قژی سپی، وەک هەمیشە بە ڕۆن چەور و وەک کلکی مشک هۆنرابووەوە، بە شانە دەرپەڕیووەکەیەوە کە لە پشتی سەریەوە دەبینرا، دیار بوو، لەبەر ئەوەی پیرێژنەکە کورتەباڵا بوو، ڕاست تەورەکە بەر تەوقی سەری کەوت: ژنە هاوارێکی کرد. وەلێ هاوارێکی لاواز و لە پڕێکدا کەوتە سەر زەوییەکە، تەنیا ئەوەندە فریا کەوت کە هەردوو دەستی بەرەو لای سەری بەرێت، هێشتا بارمتەکە لە ناو دەستێکیدا بوو. ئەوسا ڕاسکۆلنیکۆڤ بە هەموو هێزیەوە چەند جارێکی دی بە پشتی تەورەکە بەربووە تەوقی سەری، خوێن وەک دەفرێکی قلْپکراوە دەردەپەڕی، لاشەکە کەوتە سەر پشت. ڕاسکۆلنیکۆڤ چووە دواوە تا ڕێگە لە کەوتنەکە نەگرێت. پاشان زۆر خێرا بەسەر دەموچاویا چەمایەوە، پیرێژن مردبوو. دەتوت چاوی دەیەوێت لە گلێنەوە بێتە دەرێ، تەوێڵی و هەموو دەموچاوی هاتبوونەوە یەک و چرچولۆچ ببوون.

ڕاسکۆلنیکۆڤ تەورەکەی لە نزیک مردووەکەوە لەسەر زەوی دانا، لە کاتێکدا کە دەیویست خوێنەکە پیسی نەکات. ڕاست دەستی بە گیرفانی پیرێژندا کرد. هەمان گیرفانی لای ڕاست کە جاری پێشوو پیرێژن کلیلەکانی لێ دەرهێنابوو. ئەقڵی ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تەواویی لەسەر خۆی بوو، ئیتر نە هەستی بە ماندووبوون دەکرد و نە بە سەرگێژخواردن. وەلێ هێشتا دەستی دەلەرزی، لە ئاییندەدا ئەوەی لەبیر ناچێت کە لەو کارەدا زۆر ورد و بەئاگا بووە. هەر هەوڵی ئەوەیشی بوو کە خوێناوی نەبێت.. زوو کلیلەکانی دەرهێنا. هەموو کلیلەکان وەک جاری پێشوو لە ئەڵقەیەکی ئاسندا بوون، بە کلیلەکانەوە و بەپەلە بەرەو ژووری نووستن بەڕێ کەوت، ژوورەکە بچووک و دۆلابێکی پڕ لە پەیکەری چکۆلەی تیابوو، نزیک بە دیوارەکەی بەرانبەر، تەختەخەوێکی گەورەی تا ڕادەیەک پاک هەبوو، لەگەڵ لێفەیەکی لۆکەی ڕووئاوریشم، کە چەند پارچە قوماشێکی هەمەڕەنگی پێوە دوورابوو، لە پاڵ دیواری سێیەمدا دۆلابێکی جل هەبوو، شتێکی سەیر. هەر ئەوەندەی کلیلی لە دۆلابەکە نا و گوێی لە دەنگی بوو، ئیتر هەموو گیانی کەوتە لەرزین.. دیسانەوە لەپڕا ویستی هەموو شتەکان وەک خۆی واز لێبێنێت و بڕوات، بەڵام ئەم حاڵەتە چرکەیەک زیاتری نەبرد، تازە بۆ ڕۆیشتن درەنگ بوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ گاڵتەی بەخۆ هات، کاتێک لەپڕێکدا بیرێکی ناخۆشی تر وەک بروسکە بەسەریدا کێشا: لەناکاوێکدا وای بۆچوو کە ڕەنگە پیرێژنەکە هێشتا زیندووبێت، ڕەنگە بێتەوە هۆش خۆی. بۆیە کلیل و دۆلابی وەک خۆی بەجێ هێشت و بەرەو لای لاشەکە تێی تەقاند، تەورەکەی هەڵگرتەوە و بەرزی کردەوە، بەڵام داینەهێنایەوە، چونکە جێی گومان نەبوو، پیرێژن مردبوو، کە بەسەریدا نووشتایەوە و لە

نزیکەوە تێیڕوانی، بە چاکی بینی کاسەسەری پیرێژن وردوخاش بووە و کەمێکی کەوتبووە خوارێ، ویستی پەنجەی لێبدات، بەڵام دەستی کێشایەوە: بەبێ ئەوەیش هەموو شتێک بە چاکی دیار بوو، لەوانە خوێن بە ئەندازەی چاڵێک کۆ ببووەوە. لەپڕا ڕاسکۆلنیکۆڤ لە ملی پیرێژنەکەدا چاوی بە شریتێکی بچووک کەوت. ڕایکێشا. بەڵام شریتەکە قایم بوو نەپچڕا، بە تایبەتی کە خوێنەکە تەڕی کردبوو، هەوڵیدا هەرچۆنێک بووە، لەژێر باڵی پیرێژنەکەوە بیهێنێتە دەرەوە. بەڵام شتێک نەیدەهێشت و گیری کردبوو. ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەمەندە قەڵس ببوو، لەوەدابوو دیسان بەبێ سێودووکردن تەورەکە لە بەشی سەرەوەی لاشەکە و لە شریتەکە بدات، بەڵام نەیوێرا، بە زەحمەت و دوای دوو دەقیقە هێنانوبردن و بە دەست و تەوری خوێناوییەوە، توانیی بەبێ ئەوەی تەورەکە بوەشێنێت، شریتەکە ببڕێت و لێی بکاتەوە، بەهەڵەدا نەچووبوو، ئەوە کیسەی پارە بوو، دوو خاچ، یەکێکیان لە دار و ئەویتریان لە مس، مینایەکی بچووک و کەناری کیسەکە بە تیلماسکێک پێستەی پیس کە قفڵێکی ئاسنی لێدرابوو، بە شریتەکەوە بەسترابوو. پێدەچوو کیسەکە پڕ بێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بەبێ لێوردبوونەوە نایە گیرفانی. خاچەکانی فڕێدایە سەر سنگی پیرێژنەکە، دیسان بە تەورەکەوە خۆی گەیاندەوە ژووری نووستنەکە.

زۆر بەپەلە ڕستە کلیلەکەی لە دەست گرتەوە و کەوتەوە هێنانوبردنی. کارەکەی باش نەدەچەرخا، کلیلەکان قفڵەکانیان نەدەکردەوە. نەک لەبەر ئەوەی دەستی دەلەرزی، نا، بەڵکو بەردەوام هەڵەی تێدا دەکرد، بۆ نموونە دەیبینی کلیلەکە بۆ قفڵەکە دەست نادات و بۆی ناگونجێت، بەڵام وازی لێنەدەهێنا. لەپڕێکا ئەوەی وەبیر

هاتەوە و زانیی کە کلیلە گەورە ددانداره‌کە کە لە پاڵ کلیلە بچووکەکانی ترەوە بە شریتەکەوەیە، بێگومان هی دۆلابەکە نییە، (جاری پێشوویش هەر ئەمەی بە بیردا هاتبوو) بەڵکو کلیلی ئەو سندوقەیە، کە دەشێت هەموو شتەکان لەوێدا شارابنەوە، ڕاسکۆلنیکۆڤ وازی لە دۆلابەکە هێنا و زوو خزایە ژێر قەرەوێڵەکەوە. چونکە دەیزانی کە سندوقی پیرێژنان ئاسایی لەژێر قەرەوێڵە دادەنرێن. وایشبوو: سندووقەکە تا ڕادەیەک گەورە و بە درێژیی کەمتر لە مەترێک، بە دەرگایەکی دیارەوە کە بەردەمەکەی بە پێستەیەکی نەرمی سوور داپۆشرابوو، بزماری بچووکی پۆڵای پیادا کوترابوو، خرابووە ژێر تەختەی نووستنەکەوە. کلیلە ددانداره‌کە ڕێک بۆ سندووقەکە گونجا و دەرگاکەی کردەوە. هەر لەوێدا و لەژێر متیلێکی سپیدا پاڵتاوێک لە کەوڵی کەروێشک کە بە پارچەیەکی سوور داپۆشرابوو، بەرچاو دەکەوت، لەژێر کراسێکی ئاوریشمەوە، پاشان دەسماڵێک و دوای ئەوەیش تا بنی سندووقەکە هەر قوماش بوو. پێش هەر شتێک ڕاسکۆلنیکۆڤ ویستی دەستە خوێناوییەکانی بە پارچەیەک لەو قوماشە سوورانەی کە بە پاڵتاوەکەوە بوو، پاک بکاتەوە، بیری کردەوە: "سوورە و لەسەر ڕەنگی سوور خوێن کەمتر دەردەکەوێت" کەچی لەپڕێکا هاتەوە سەرخۆی و بە ترسەوە بیری کردەوە: "خودایا، ئەرێ شێت بووم؟" هەر ئەوەندەی ڕاسکۆلنیکۆڤ پارچە قوماشەکانی ڕاوەشاند، لەپڕا لەژێر پاڵتۆکەوە سەعاتێکی ئاڵتوون کەوتە خوارێ. ڕاسکۆلنیکۆڤ بەپەلە سەرقاڵی پشکنینی ناو سندووقەکە بوو، لە ڕاستیشدا لە نێو پارچەکاندا شتگەلێک هەبوون، لە زێڕ دروست کرابوون – بێگومان هەموو ئەمانە ئەو بارمتانە بوون، کە خاوەنەکانیان دایاننابوو و هێشتا وەریاننەگرتبووەوە – جۆرەها

بازنگ، زنجیر، گواره، دەرزی بۆینباخ و شتی تر دەکەوتنە بەرچاو. هەندێکیان لە پاکەتی خۆیاندا و هەیشیان بوو لە کاغەز و ڕۆژنامەوە پێچرابوون، بەڵام زۆر بە ڕێکوپێکی و پاکژی لە کاغەزەکانەوە پێچرابوون و بە شریت بەسرابوون. بەبێ ئەوەی دەقیقەیەک بەفیڕۆ بدات، بەبێ ئەوەی جیایان بکاتەوە یان لە پاکەتەکانیان دەربهێنێت، گیرفانی پانتۆڵ و پاڵتۆکەی لێ پڕ کردن. بەڵام نەیتوانی زۆر کۆ بکاتەوە.

لەناکاوێکدا لەو ژوورەی پیرێژنەکەی تیابوو، گوێی لە دەنگی پێی یەکێک بوو. زوو وەستا، وەک مردوو بێدەنگ بوو. وەلێ بێدەنگیی هەموو شوێنێکی گرتبووەوە، نەکا ئەمە تەنیا خەیاڵی خۆی بێت! وەلێ لەپڕێکا بە چاکی گوێی لەناڵەیەکی سووک بوو، وەک ئەوەی کەسێک بە هێوری و ناوبەناو بناڵێنێ و بێدەنگ بێت، پاشان جارێکی دی بۆ ماوەی یەک دوو دەقیقە بێدەنگیەکی مەرگئاسا هەموو ئەو ناوەی داگرتەوە، ڕاسکۆلنیکۆڤ لە پاڵ سندووقەکەدا کرووشکەی کردبوو و چاوەڕێی دەکرد. بە زەحمەت هەناسەی دەدا، لەپڕا هەستا، تەورەکەی هەڵگرت و لە ژووری خەوتنەکە بەدەرکەوت.

لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا لیزاڤێتا وەستابوو، بەستەیەکی گەورەی بەدەستەوە بوو، بەسەرسامییەوە لە خوشکە کوژراوەکەی خۆی دەڕوانی، ڕەنگی ببووە گەچی دیوار و پێدەچوو توانای هاوارکردنی نەبێت. ژنە هەر ئەوەندەی بەو جۆرە ڕاسکۆلنیکۆڤی بینی، وەک گەڵای درەخت لەرزی، تەزوویەک بە لەشیا گەڕا و دەموچاوی گۆڕا. دەستی بڵند و دەمی کردەوە. وەلێ هاواری نەکرد، لەسەرخۆ پشتاوپشت ڕۆیشت و خزایە سووچێکەوە، چاوی بڕیبووە ڕاسکۆلنیکۆڤ و زمانی هەر بەسرابوو، وەک هەناسەی هاوارکردنی

نەبێت. ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تەورەکەوە پەلاماری دا. لێوی ژنەکە وەک لێوی زارۆکان کاتێک لە شتێک بترسن و چاویان پێوەی ئەبڵەق بووبێت و بیانەوێت هاوار بکەن، لار ببووەوە، لیزاڤێتای نەگبەت هێند سادەو بێبەرگری و ترساو بوو، تەنانەت بۆ داپۆشینی دەموچاویشی دەستی بەرز نەکردەوە. لە کاتێکدا کە ئەم جووڵەیە بۆ ئەو چرکەساتە تاقەبزاوتێکی ئاساییە، کە ئەو بیکات. چونکە تەورەکە ڕاست بەرانبەر سەروچاوی ئەو ڕاگیرابوو. تەنیا دەستی چەپی کە هیچی پێ هەڵنەگرتبوو، کەمێک بڵند کرد – هێشتا زۆری مابوو بگاتە دەموچاوی – و بەرەو لای ڕاسکۆلنیکۆڤی درێژ کرد. وەک ئەوەی بیەوێت لە خۆی دوور بخاتەوە. ڕێک دەمی تەورەکەی بە کاژەڵاکی سەریدا کێشا و لە ناوچاوانییەوە تا پشتی سەری شەق کرد. ژنە لەسەر زەوییەکە تەخت بوو. خەریک بوو ڕاسکۆلنیکۆڤ تەواو خۆی لەدەست بدات، بەستەکەی هەڵگرت. دیسان فڕێی دایەوە سەرزەوی و بەرەو ڕاڕەوەکە دەرپەڕی.

تا دەهات ترسی لەسەر زیاتر و زیاتر دەبوو، بە تایبەتی دوای تاوانی کوشتنی دووەم، کە هەرگیز چاوەڕێی نەبوو. دەیویست زووتر لەوێ هەڵبێت. ئەگەر لەو کاتەدا توانای ڕوانینێکی ڕاست و بیرکردنەوەیەکی دروستی هەبووایە، ئەگەر توانای ئەوەی هەبووایە وێنای تەواوی قورسیی کارەکەی و هەموو نائومێدی و ناشیرینی و بێمانایی ئەو کارەی بکردایە، یان درکی ئەوەی هەبووایە، کە تووشی چ گاشە و دژواری و ڕەنگە زوڵم و گرفتێک دەبێتەوە، تا لێرە دەرباز بێت و بگاتەوەماڵەوە، زۆر ڕێی تێدەچوو ئەگەر ئەمانەی بزانیایە، هەموو شتێکی واز لێبهێنایە و ڕێکوڕەوان بڕۆیشتایە و خۆی بەدەستەوە بدایە. ئەمەی لەبەر ئەوە نەدەکرد، کە ترسی لە ئایندە بێت. بەڵکو

تەنیا لەبەر قێزەونی و ناخۆشیی ئەو کارەی کە ئەنجامی دابوو. هەستکردن بەو قێزەونییە بەردەوام تیایدا زیادی دەکرد.. بۆیە هەرگیز ئامادەی ئەوە نەبوو کە لەو کاتەدا بەرەو لای سندووقەکە یان بەرەو ژوورەکە هەنگاو هەڵبنێت.
بەڵام وردەوردە جۆرێک لە پەرتیی هەست، یان ڕەنگە بیر، دەستی بەسەردا دەکێشا. دەتوت هەندێکجار خۆی لەبیر دەکرد، یان با بڵێین ئەسڵی کارەکەی لەبیر دەکرد و دەکەوتە نێو وردەکارییەکانەوە. پاشان کە چووە چێشتخانەکەوە، لەسەر سەکۆکە سەتڵێکی پڕ لە ئاوی بینی، بیری لە شتنی تەور و دەستی خۆی کردەوە. دەستی هەڵکێشرابوو لە خوێن و پێشییەوە چەسپیبوو. ڕاست تەورەکەی بۆ ناو ئاوەکە ڕاهێشت، پارچەسابوونێک کە لەژێر پیاڵەیەکی شکاودا و لە پاڵ پەنجەرەکە دانرابوو، هەڵیگرت و کەوتە دەستشۆردن. دوای دەستشتن تەورەکەی دەرهێنا و ئاسنەکەی شت، بۆ ماوەی نزیک بە سێ دەقیقە، دەسکەدارینەکەیشی کە لە خوێن هەڵکشابوو، شوشت. تەنانەت سابوونیشی بۆ بەکار هێنا. دوای ئەوە بە پارچەپەڕۆیەک کە لە چێشتخانەکەدا بەسەر تەنافێکەوە بوو، هەمووی وشک کردەوە، ئەوسا لە پاڵ پەنجەرەکەدا بە وردی سەروبنی تەورەکەی کرد، هیچ ئاسەوارێکی خوێنی پێوە نەمابوو، بەڵام هێشتا دارەکەی تەڕ بوو، وردەکارانە تەورەکەی بە بەرزوانەی ژێر پاڵتاوەکەیدا کردەوە. پاشان، ئەوەندەی ڕووناکاییە کەمەکەی ناو چێشتخانەکە یارمەتی دەدا، پاڵتاو و پانتۆڵ و چەکمەکانی بەسەر کردەوە. لە چاوپیاخشاندنێکدا پێدەچوو هیچیان پێوە دیار نەبێت. بەڵام چەند پەڵەیەک بەسەر چەکمەکانییەوە مابوو. ڕاسکۆلنیکۆڤ پارچەپەڕۆیەکی تەڕ کرد و چەکمەکانی پێ پاک کردەوە. وای هەست دەکرد کە

بەسەرکردنەوەکانی چاک ئەنجام نەداوە و ڕەنگە هێشتا شتێکی دیار مابێت کە ئەو نایبینێت. لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستاو کەوتە بیرکردنەوە، بیرێکی بەئازار و تاریک تیایدا چەکەرەی دەکرد: بیری ڕەفتاری شێتانەی خۆی کە لەم چرکەساتەدا نەدەتوانێت بڕیارێک بدات و نە بەرگری لە خۆی بکات، ڕەنگە ئەوەی ئێستا کردوویەتی، هەرگیز نەدەبوو بیکردایە.. "خودایا، دەبێت بڕۆم و هەڵبێم" ئەم وشانەی لەبەر خۆیەوە لە ڕاڕەوەکەدا وت. وەلێ لەوێدا ترسێک چاوەڕێی دەکرد، کە هەرگیز لەوەوبەر هەستی پێنەکردبوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەستابوو، تەماشای دەکرد و ئەوەی دەیبینی، بڕوای پێنەدەکرد. دەرگاکە، دەرگای چوونە دەرەوە، واتا هەمان ئەو دەرگایەی کە لە دالآنەکەوە بەرەو پلیکانەکان دەچوو، ئەوەی ماوەیەکی کەم لەوەوبەر خۆی زەنگەکەی لێدابوو، بە تەواوی کرابووەوە، لە هەموو ئەو ماوەیەدا نە داخرابوو نە کلۆم کرابوو. ڕەنگە پیرێژنەکە هەر بۆ خۆپارێزی دەرگاکەی لە دوای خۆیەوە دانەخستبێت، بەڵام ئای خودایا! ئەو کە دوایی لیزاڤیتای دیبوو! چۆن نەیزانیبوو، ئاخر چۆن بیری لەوە نەکردبووەوە کە دەبێت ئەم ژنە لە شوێنێکەوە هاتبێتە ژوورێ، خۆ دیوارەکەی کون نەکردووە!

ڕاسکۆلنیکۆڤ بەپەلە بەرەو لای دەرگاکە ڕۆیشت و کلۆمی کرد.

– بەڵام نا، ئەم کارەیش گونجاو نییە! دەبێت بڕۆم، بڕۆم..

کلۆمی دەرگاکەی ڕەواندەوە و دەرگاکەی کردەوە، لەسەر پلیکانەکان وەستا و گوێی ڕادێرا و بۆ ماوەیەک هەر گوێقولاغ بوو. لە دوورەوە، لە خوارەوە و دەشێت لە نزیک دەرکی هاتنەوەژوورەوە بێت. دەنگی دوو پیاوی بەهەرا کە جوێنیان بەیەکتری دەدا، دەهاتە گوێ. "ئەمە چییە؟" لەبەر خۆیەوە ئەمەی وت، خۆی گرت و چاوەڕێ بوو. لە

پرێکدا یەکسەر هەموو هەراوزەناکە کپ بوو. لەوە دەچوو لێک جیا بوویبێتنەوە. هەر کە ویستی بڕواتە دەرەوە، کتوپڕ لە قاتی خوارەوەدا دەرگایەک بە ژاوەژاو بەرانبەر بە پلیکانەکان کرایەوە، یەکێک بەدەم ورینگەورینگی گۆرانییەوە لە پلیکانەکانەوە هاتە خوارێ، ڕاسکۆلنیکۆڤ لەگەڵ خۆیدا بیری کردەوە: "ئەمانە ئەم هەموو دەنگەدەنگەیان لەچییە!" دیسان دەرگاکەی داخست و کەوتەوە چاوەڕوانی. تا بێدەنگیی هەموو لایەکی گرتەوە، چ دەنگێک نەدەهاتە گوێ، وەلێ هەر ئەوەندەی هەنگاوێکی بەرەو پلیکانەکان نایەوە، هەنگاوی تازەی یەکێکی هاتەوە بەرگوێ.

دەنگی هەنگاوەکان لە دوورەوە دەهات، لە پلەبەراییەکانەوە، وەلێ ئەو لە دواییدا زۆر بە چاکی و ڕوونی ئەوەی بەبیری خۆی دەهێنایەوە، کە لەو کاتەدا، لە دەنگی بەرایی هەنگاوەکاندا بەبێ ئەوەی بزانێت چۆن، هەستی بەوە کرد کە بەرەو ئێرە، واتا بەرەو قاتی چوارەم بۆ لای پیرێژنەکە دێن. بۆ؟ ئایا دەنگەکە دەنگێکی تایبەتی بوو؟ هەنگاوەکان قورس و یەک ڕیتم و لەسەرخۆ بوون. ئەوەتا لە قاتی یەکەم تێپەڕی، ئێستا دێتە سەرەوە و دەنگی پێکەی بەرز و بەرزتر دەبێت. دەنگی هانکەهانکی هەناسەی دێتە گوێ. ئەمەیشیان قاتی سێیەم.. بۆ ئێرە دێت! لەپڕا ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستی کرد خەریکە لە شوێنی خۆیدا وشک بێت. تەواو وەک ئەو کەسەی کە خەون دەبینێت لە دواوە ڕاوی دەنێن و لێی نزیک کەوتوونەتەوە و دەیانەوێت بیکوژن. بەڵام ئەو وەک بزمار لە جێگاکەیدا چەقی بێت و تەنانەت توانای دەستجووڵاندنی نەبێت.

سەرئەنجام کاتێک میوانە ناوەختەکە بەتەمای هاتنە قاتی چوارەم بوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ کەوتە جووڵە، دەرفەتی هێنا، توند و خێرا لە

ڕارەوەکەوە خۆی خستەوە ناو ژوورەکە و لە دوای خۆیەوە دەرگاکەی پێوەدا، ئینجا لەسەرخۆ و بێدەنگ کلۆمی کرد. ئێستا تەنیا غەریزە بوو کۆمەکی لێدەکرد. دوای ئەنجامدانی ئەم کارانە، هەناسەی لە خۆی بڕی و گوێی بە دەرگاکەوە نا، میوانە نەناسەکەیش گەیشتبووە بەردەم دەرگاکە. ئێستا ئەم دووانە ڕووبەڕووی یەکدی وەستابوون. ڕاست وەک ئەو کاتەی کەمێک لەمەوپێش کە ئەو و پیرێژنەکە بەرانبەر یەکتری وەستابوون و تەنیا دەرگاکە لێکی جیا کردبوونەوە و ئەو گوێقولاغ بوو.

میوانەکە چەند جارێک هەناسەی قووڵی هەڵکێشا، ڕاسکۆلنیکۆڤ لە کاتێکدا کە توند تەورەکەی لەناو دەستیدا گوشیبوو، بەخۆی وت: "دیارە زەلامێکی کەتەیە" دەتوت هەموو ئەمانە لە خەوندا دەبینێت، میوان زەنگەکەی گرت و توند لێی دا.

کە زەنگە بچووکە کانزاییەکە لێی دا، لەناکاودا میوانەکە وای هەست کرد یەکێک لە ژوورەکەدا دەجووڵێت. بۆ چەند چرکەساتێک بە چاکی گوێی گرت. نەناسراوەکە جارێکی تر زەنگی لێدایەوە و دیسان چاوەڕێی کردەوە، پاشان خۆی نەگرت و کەوتە ڕاکێشانی دەسکی دەرگاکە. ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ترس و لەرزەوە تەماشای میلەی کلۆمەکەی دەکرد کە لە ئەڵقەکەدا دەهات و دەچوو، بە ترسێکی زۆرەوە چاوەڕێی ئەوەی دەکرد کە کلۆمەکە لە جێی خۆی هەڵبکەنرێت. لە ڕاستیشدا وا دەرگاکەی بە توندی ڕادەکێشا، کە دەشیا ئەوە ڕوو بدات. ویستی بە دەست کلۆمەکە بگرێت. بەڵام لەوە ترسا ئەوی تر هەستی پێبکات. ڕاسکۆلنیکۆڤ سەری لێشێوابوو، دەتوت سەرەگێژەی تووش بووەتەوە. بیری کردەوە: "هەر ئێستا دەکەوم" وەلێ نەناسەکە کەوتە قسە و ئەم هاتەوە سەرخۆی:

- چییە، نوستووون یان یەکێک خنکاندوونی؟ نەفرەتتان لێبێت. ئای ئەلێنا ئیڤانۆڤنا. جادووکەری پیر، لیزاڤتا ئیڤانۆڤنا، جوانی بێوێنە، دەرگاکە بکەنەوە، بە لەعنەت بن، یەعنی خەوتوون! پاشان زۆر بە تووڕەییەوە. دە جار لەسەر یەک بە هەموو هێزییەوە زەنگەکەی لێدا، زۆر باش ئەوە دیاربوو، کە کەسە نەناسەکە لەمماڵەدا دەسەڵاتی هەیە و دۆستییانە.

لەم کاتەدا کتوپڕ لە پلیکانە نزیکەکەوە دەنگی هەنگاوی کورت و خێرای یەکێک هاتە گوێ، یەکێکی دیش نزیک دەبووەوە، وەلێ ڕاسکۆلنیکۆڤ لە سەرەتاوە بە چاکیی گوێی پێنەدا.

تازەهاتووەکە بە دەنگێکی خۆشی پڕ لە ئاوازەوە ڕووی لە میوانی یەکەم کرد، کە هێشتا هەر زەنگی لێدەدا و پێی وت:

- بەڕاست کەسی لێنییە؟ سڵاو کوخ.

ڕاسکۆلنیکۆڤ زوو بە خۆی وت: "بە دەنگیا دیارە زۆر گەنجە"

کوخ وەڵامی دایەوە:

- هەر شەیتان دەزانێت، خەریکە قفڵەکە بشکێنم، ئەی تۆ چۆن من دەناسیت؟

- بەڕاستتە، سێ ڕۆژ لەمەوبەر لە "گامبرینوس" سێ جار لەسەر یەک بلیاردم لێ نەبردیتەوە؟

- ئا..

- کەواتە لێرە نین؟ سەیرە، زۆریش گەوجانەیە، پیرێژن دەبێت بۆ کوێ چووبێت؟ من کارم پێیەتی.

- هاوڕێ، منیش هەرکارم پێیەتی.

لاوەکە دەنگی هەڵبڕی:

- ئەی چی بکەین؟ ئای لەم بەدبەختیە! هاتبووم برێ پارەم دەست کەوێت.
- چارنییە دەبێت بگەڕێینەوە، بەڵام ئەی بۆ بەڵێن دەدات؟ ئەو سیحربازە خۆی ئێستای بۆ دیاری کردم. ئاخر ڕێم دوورە، بۆ کوێ ملی شکاندووە، تێناگەم، بە درێژایی ساڵ ئەم سیحربازە دانیشتووە و ماندووە و قاچی دێشێت، کەچی وا ئێستا، لەپڕا چووە بۆ گەڕان.
- بۆ لە دەرگاوانەکە نەپرسین؟
- چی لێ بپرسین؟
- بۆ کوێ ڕۆیشتووە و کەی دێتەوە؟
- های، نەفرەت لە شەیتان.. بپرسین.. ئاخر ئەو بۆ هیچ جێگایەک ناچێت..
بەدەم ئەم قسانەوە جارێکی دی دەسکی دەرگاکەی ڕاکێشا.
- نەفرەت لە شەیتان، هیچ چار نییە، دەبێت بگەڕێینەوە.
لەپڕێکدا لاوەکە هاواری کرد:
- ڕاوەستە، بڕوانە، کە دەرگاکە ڕادەوەشێنیت، درزێکی تێدەکەوێت.
- جا چییە؟
- چۆن، تێناگەیت؟ ئەمە مانای وایە یەکێکیان لەماڵە. ئەگەر هەموویان بڕۆیشتنایە، دەرگاکەیان لە دەرەوە بە کلیل دادەخست، نەک لە ناوەوە کڵۆمی بکەن. گوێت لێنییە کڵۆمەکە چۆن دەنگی دێت؟ لە کڵۆمکردنی دەرگایشدا دەبێت یەکێک لە ژوورەوە بێت، تێدەگەیت؟ کەواتە لە ژوورەوە دانیشتوون و دەرگاکە ناکەنەوە.
کوخ بە سەرسوورمانەوە دەنگی هەڵبڕی.
- ڕاستە، ڕاستە، کەواتە ئەم دووانە خەریکی چین؟ پاشان زۆر بە توورەییەوە دەستی کردەوە بە ڕاکێشانی دەرگاکە.

لاوەکە کەوتەوە هاوار:
- ڕاوەستە. ڕایمەکێشە. دیارە شتێک لەئارادایە، تۆ زەنگت لێداوە، دەرگاکەت ڕاکێشاوە. کەس نەیکردۆتەوە. کەواتە یان هەردووکیان بێهۆشن یان..
- چی؟
- دەزانیت چی، بڕۆین بۆ لای دەرگاوانەکە، با ئەو خۆی بیاندۆزێتەوە.
- ڕاستە.
هەردووکیان هاتنە خوارێ.
- ڕاوەستە. تۆ لێرەبە و من دەچم بۆ لای دەرگاوانەکە.
- بۆ من لێرە بمێنمەوە؟
- هەروا. بزانین چی ڕوو دەدات.
- باشە..
لاوەکە بە گەرمییەوە وتی:
- ئاخر من خۆم بۆ کاری دادوەریی لێکۆڵینەوە ئامادە دەکەم، لێرەدا ئەوە ئاشکرایە. بەڵێ، ئاشکرایە شتێک لەئارادایە.
بەدەم قسەکردنەوە لاوەکە بەپەلە بە پلیکانەکاندا هاتە خوارێ.
کوخ مایەوە، جارێکی تر بە هێوری لە زەنگەکەی دا، دەنگی زەنگەکە بەرز بووەوە. پاشان لەسەرخۆ، وەک جارێکی دی تاقیی بکاتەوە، دەسکی دەرگاکەی ڕاوەشاند، جارێک بەرەو لای خۆی و جارێک بەرەو خوار تا بە تەواویی لەوە دڵنیا بێت کە دەرگاکە تەنیا جووت کراوە. پاشان بەدەم هەناسەهەڵکێشانەوە خۆی چەماندەوە و لە کونی کلیلەکەوە کەوتە تەماشاکردن، بەڵام ئەودیوی دەرگاکە کلیلی تیابوو، بۆیە نەیتوانی هیچ ببینێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕاوەستا بوو، تەورەکەی هەر بەدەستەوە بوو، دەتوت لە حاڵەتی وڕێنەکردندایە، تەنانەت خۆی بۆ ئەوە ئامادە کردبوو هەر ئەوەندەی ئەوان بڕۆنە، ژوورەوە لەگەڵیاندا بەشەڕ بێت. لەو کاتەدا کە ئەو دوانە لە دەرگایان دەدا و تەگبیریان دەکرد، چەند جارێک ئەم بیرەی بە مێشکدا هات کە کارەکە ببڕێتەوە و لە پشت دەرگاکەوە هاواریان لێبکات.

هەندێکجار دەیویست پێش ئەوەی دەرگاکە بکەنەوە، سەر بنێتە سەریان، جوێنیان پێبدات و گاڵتەیان پێبکات. دوایی زۆر بە خێرایی ختوورەیەکی پێدا هات: "خۆزگا ئەم کارە زوو دەگەیشتە ئەنجام".

- بەڵام لەعنەت لە شەیتان.

کات تێپەڕی، دەقیقەیەک، دوو دەقیقە و کەس نەهات، کوخ کەوتە جووڵە و لەناکاوێکدا دەنگی هەڵبڕی:

- من هەقم بەسەرەوە چییە!

بە هەڵەداوان بەرەو خوار بووەوە، چەکمەکانی بە پلیکانەکاندا دەکێشا و لەپڕا دەنگی هەنگاوەکانی بڕا.

- خودایا، چی بکەم!

ڕاسکۆلنیکۆڤ کێلوونەکەی لادا، کەمێک دەرگاکەی کردەوە، دەنگی هیچ نەبوو، پاشان بەبێ ئەوەی بیری لێبکاتەوە، چووە دەرێ و چەند هێزی تیابوو، توند دەرگاکەی داخست و بەرەو خوار بووەوە.

سێ پلیکانەی بڕیبوو کتوپڕ لە خوارەوە بوو بە ژاوەژاو، ئەم بۆ کوێ بچێت! نەیزانی لە کوێدا خۆی وەشارێت. ئەوەندەی نەمابوو جارێکی دی بگەڕێتەوە هەمان ئاپارتمانی لای پیرێژنەکە.

- هێی، دێوودرنج، شەیتان، بیگرن.

یەکێک لە ئاپارتمانەکەی خوارەوە هاتبووە دەرێ و کەوتبووە ئەو دادوهاوارە. وەک بڵێی نەدەڕۆشت. بەڵکو لە پلیکانەکانەوە تلاوتل دەکەوتە خوارێ و هاواری دەکرد:

-متیکا، متیکا، متیکا[1]، لەعنەتی خوات لێبێت.

هاوارەکە بە نووزەیەک کۆتایی هات. دوا هەراوزەنا لە دەرەوە دەهاتە گوێ، پاشان هەموو شتێک کڕ بوو. بەڵام هەر لەو چرکەساتەدا چەند کەسێک کە بە دەنگی بەرز و بەپەلە قسەیان دەکرد، کردبوویانە هەرا و بە پلیکانەکاندا سەردەکەوتن، سێ یان چوار کەس بوون، ڕاسکۆلنیکۆڤ دەنگی زرنگاوەی لاوەکەی ناسییەوە، "خۆیانن!"

ڕاسکۆلنیکۆڤ زۆر بە نائومێدییەوە بەرەو ڕوویان چوو. "چی دەبێت با ببێت، ئەگەر ڕامگرن، کارێکی خراپ دەکەن، ئەگەر ڕێشم لێنەگرن، هەر کارێکی خراپ دەکەن. لە یادیاندا دەمێنێتەوە" لەوەدا بوو پێک بگەن، لە نێوانیاندا تەنیا پلیکانەی قاتێک مابوو کە لەپڕا ڕێی دەربازبوونی بۆ کرایەوە: لە دووری چەند پلیکانەیەک لەولای ڕاسکۆلنیکۆڤەوە، بە لای ڕاستا، ئاپارتمانێکی چۆڵی هاتە بەرچاو کە دەرگاکەی بە تەواویی کرابووەوە. هەمان ئاپارتمانی قاتی دوو بوو، کە کرێکاران تیایدا خەریکی بۆیەکردن بوون، دەتگوت لەو کاتەدا هەر بەدەستی ئانقەست لەوێ نەمابوون، دیارە هەر ئەوان بوون، کە بەو هەراوزەنایەوە پێشتر چوونە دەرەوە. زەمینەی ژوورەکە تازە بۆیە کرابوو، سەتڵێکی بچووک، قوتوویەکی بۆیە و فڵچەیەک لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بوو.

[1] "متیکا" بچووککراوەی دیمترییە.

لە چاوتروکانێکدا ڕاسکۆلنیکۆڤ لە دەرگا کراوەکەوە خۆی فڕێدایە ژووریێ و بێدەنگ لە پشت دیوارەکەوە وەستا، ئەم کارەی تەواو لە جێگای خۆیدا بوو، چونکە ئەوانیش گەیشتبوونە ئەو قاتە و بەرەو سەرەوە سووڕابوون، بەدەم قسەوە بە لایدا تێپەڕین و چوونە قاتی چوارەوە. ڕاسکۆلنیکۆڤ سێودووی لێنەکرد. لەسەر پەنجەی پێی هاتە دەریێ و لە پلیکانەکانەوە بەپەلە هاتە خواریێ، پلیکانەکان کەسی تیا نەبوو، هەروەها دەرگای هاتنەژوورەوەیش. بەپەلە دەرگایماڵەکەی بەجێ هێشت و لە شەقامەکەدا بە لای چەپدا سووڕایەوە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە چاکی دەیزانی. بەڵێ، زۆر بە چاکی دەیزانی کە لەم چرکەساتەدا ئەو چەند کەسە لە ئاپارتمانەکەدان و سەریان لەوە زۆر سووڕماوە کە دەرگاکە کراوەتەوە لە کاتێکدا کە تۆزێک پێش ئێستا داخرابوو. دەیزانی کە ئێستا ئەوان ئیدی سەرقاڵی تەماشاکردنی لاشەکانن و هەناسەیەک نابات، کە هەست دەکەن و باش پەی بەوە دەبەن کە پیاوکوژەکە تا ئێستا لەوێ بووە و دەرفەتی خۆشاردنەوەی هێناوە و بە بەردەمیاندا هەڵهاتووە و بۆی دەرچووە. ڕەنگە ڕملی ئەوەیش لێبدەن کە ئەو کاتەی ئەوان دەچوونە سەریێ، ئەو لە ئاپارتمانە چۆڵەکەدا دانیشتبێت. لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا ڕاسکۆلنیکۆڤ بە هیچ جۆرێک نەیدەوێرا هەنگاوی خێرا بنێت، هەرچەندە هێشتا سەد هەنگاوێکی مابوو بگاتە پێچی یەکەم، بە خۆی وت: "چۆنە لە پاڵ دەرگای ماڵێکدا خۆی وەشارێت یان لە پلیکانەی ماڵی نەناسێکدا ماوەیەک چاوەڕێ بێت؟ نا، ئەمە ترسناکە، ئەی چۆنە تەورەکەی فڕێ بداتە لایەکەوە؟ چۆنە عەرەبانەیەک بە کرێ بگرێت؟ نا، ترسناکە، ترسناکە!"

بۆچوونەکانی چەواشە بوون، بەڵام وا گەیشتە کۆڵانێکی باریک، نیوەگیان خۆی تێخزاند، تا ڕادەیەک ئیدی لەوێدا ڕزگار ببوو، خۆی ئەمەی دەزانی: دەشیا گومانی لەسەر کەمتر بێت، بێجگە لەوەی کە هاتوچۆی زۆری بەسەرەوە بوو، ئەو لە ناو خەڵکەکەدا دەبووە گەردیلەیەک، وەلێ نارەحەتی و ئازارەکانی ئەوەندە بێهێز و بێتوانایان کردبوو، لەوەدا بوو نەتوانێت بجووڵێت.

دڵۆپ دڵۆپ ئارەقەی لێدەتکا، سەروملی تەواو تەڕببوو، تەنانەت کە ڕاسکۆلنیکۆڤ گەیشتە لای ڕووبارێک، یەکێک لە هاتوچۆکەران هاواری لێهەستا و وتی: "چەند سەرخۆشە!"

ئیتر ڕاسکۆلنیکۆڤ ئاگای لە خۆی نەمابوو، چەند زیاتر بڕۆیشتایە، خراپتر دەبوو. لەگەڵ ئەمانەیشدا پاشان ئەوەی بیر هاتەوە کاتێ گەیشتە ڕووبارەکە، خەڵکەکە کەمتر بوون و وای هەست کرد ئەم بەرچاو دەکەوێت و ترسا. لەوەدا بوو دیسان بگەڕێتەوە ناو کۆڵانەکە و ئەوەندەیشی نەمابوو لەپێ بکەوێت، بەڵام سووڕێکی خوارد و لەلایەکی ترەوە ڕاست گەیشتەوە ماڵەکەی خۆی.

کە ڕاسکۆلنیکۆڤ لە دەرگای دەرەوەی ماڵەکەیەوە چووە ژوورێ، هێشتا نەهاتبووەوە سەر خۆی، تەنانەت کاتێک تەورەکەی بیر کەوتەوە کە گەیشتە سەر پلیکانەکان. کێشەیەکی گەورەی لەپێش بوو: واتا دەبوو بە جۆرێک تەورەکە لە جێگای خۆی دابنێتەوە چەند بڕەخسێت، کەس پێی نەزانێت. هەڵبەت ئیدی توانای بیرکردنەوەی ئەوەی نەبوو، کە ڕەنگە بۆ ئەم ئەوە زۆر چاکتر بووایە تەورەکەی نەهێنایەتەوە بۆ جێگای خۆی، بەڵکو هەر کەمێک دوای کارەکە فڕێی بدایەتە دەرەوەی ساختمانێکەوە.

بەڵام هەموو شتێکی بۆ بەخێر گەڕا، چونکە دەرگای دەرگاوانەکە پێوە درابوو بەبێ ئەوەی قفڵ کرابێت. بۆیە دەبوو دەرگاوانەکە لە ژوورەکەیدا بێت. بەڵام ڕاسکۆلنیکۆڤ ئیتر توانای ئەوەی نەمابوو بیر بکاتەوە، بۆیە ڕاست ڕووی لە ژووری دەرگاوانەکە کرد و دەرگاکەی کردەوە. ئەگەر دەرگاوانەکە لێی بپرسیایە: "چیت دەوێت؟" ڕەنگە یەکسەر تەورەکەی بدایەتە دەستی. وەلێ دەرگاوانەکە وەک جاری پێشوو لەوێ نەبوو، تەورەکەی لە جێگای خۆی، لەژێر کورسییەکەدا و وەک جاری پێشوو دانایەوە، تەنانەت دار و چەوێڵەکەیشی دایەوە بەسەریدا. دوایی تا ژوورەکەی خۆی کەسی نەبینی. دەرگای خاوەن ماڵەکە داخرابوو، کە گەیشتەوە ناو ژوورەکەی، بەبێ ئەوەی خۆی بگۆڕێت، خۆی فڕێ دایە سەر تەختی نووستنەکەی، خەوی لێنەکەوت، وەلێ وەک بێهۆش بێت وابوو، ئەگەر لەو کاتەدا یەکێک بهاتایەتە ژوورەکەیەوە، ڕاست لەسەر جێگاکەیەوە ڕادەپەڕی و هاواری دەکرد. بیری زۆر و سەیری بە مێشکدا دەهات و دەچوو، بەڵام بە هەموو توانایەکییەوە نەیدەتوانی لەسەر یەکێک لەو بیرانە بوەستێت و بڕیاری لەسەر بدات.

١

ڕاسکۆلنیکۆڤ تا ماوەیەکی دووورودرێژ هەر ئاوا لەسەر جێگاکەی کەوتبوو، پێدەچوو هەندێکجار بە ئاگا بێتەوە، لەو چرکەساتانەدا دەیزانی دەمێکە شەوی بەسەردا هاتووە. بەڵام بیری لە هەستان نەدەکردەوە، سەرئەنجام هەستی کرد دنیا تەواو ڕووناکە. لەسەر پشت کەوتووە و هێشتا بێهۆش و گێژە. لە شەقامەکەوە بە چاکی گوێی لە هەمان ئەو دەنگی گریانە زەلیلانەیە بوو، کە هەموو شەوێک لە دوای سەعات دووەوە لەژێر پەنجەرەکەیەوە دەهات. وا ئێستا هەمان ئەو دەنگانە لە خەوی دەکەن. بیری کردەوە: "ئەمەیش دەنگی ئەو سەرخۆشانەی کە لە مەیخانەکان دێنە دەرێ، دیارە سەعات لە دووی نیوە شەویش تێپەڕیووە".

لەپڕا وا لەسەر جێگاکەی ڕاپەڕی، دەتوت یەکێک دەستی داوەتە پەلی، "چۆن! سەعات لە دوویش لایداوە!" لەسەر کورسییەکە دانیشت و هەموو شتێکی هێنایەوە بیر خۆی. بەڵێ، لەناکاوێکدا و لە چرکەساتێکدا هەموو شتێکی بەیاد هێنایەوە.

له چرکەساتی یەکەمدا وای بیر کردەوە کە شێت دەبێت. زۆری سەرمابوو، بەڵام سەرماکە تا ڕادەیەک لە ئەنجامی ئەو لەرزوتایەوە بوو، کە لە خەودا لێی هاتبوو، ئێستایش کتوپڕ لەرزێکی وای تێگەڕا، کە چۆقەچۆقی دانی دەهات. هەموو گیانی کەوتبووە لەرزین. ڕاسکۆلنیکۆڤ دەرگاکەی کردەوە و گوێی هەڵخست: هەموو ماڵەکە لە خەوێکی قووڵدا بوو، بە سەرسامییەوە لە خۆی و ژوورەکەی دەڕوانی و نەیدەتوانی لەوە بگات، کە چۆن دوێنێشەو، دوای ئەوەی هاتۆتە ناو ژوورەکەیەوە، دەرگاکەی جووت نەکردووە و جلەکانیشی نەگۆڕیووە. بەڵکو هەر بە کڵاوەکەیشیەوە لەسەر تەختەکە ڕاکشاوە. کڵاوەکەیشی لەسەر زەوییەکە، لە پاڵ سەرینەکەیدا کەوتبوو "ئەگەر یەکێک بهاتایە، چی دەوت؟ ڕەنگە بە سەرخۆشی بزانیمایە، بەڵام.." خۆی گەیاندە پەنجەرەکە، دنیا ڕووناک بوو، بەپەلە جلوبەرگ و سەراپای خۆی بەسەر کردەوە تا بزانێت هیچ ئاسەوارێکی پێوەیە یان نا؟ بەڵام زانیی کە ئەوە بەس نییە، ڕاسکۆلنیکۆڤ کە لە سەرما هەڵدەلەرزی، جلەکانی داکەند و گشت لایەکی بەباشی تەماشا کرد، هەموو پارچەیەکی سەروبن کرد، لەبەر ئەوەی لە خۆی دڵنیا نەبوو، سێجار دووبارەی کردەوە، ئەوەی بەبەرچاوەوە بوو، بچووکترین ئاسەواریان پێوە دیار نەبوو، تەنیا داوێنی پانتۆڵەکەی، ئەو شوێنەی کە دڕاو و تاڵ تاڵ ببوو، خوێنێکی خەست و وشکی پێوە مابوو. ڕاسکۆلنیکۆڤ چەقۆیەکی دەستدایە و تاڵەکانی بڕی، ئیدی لەوە نەدەچوو شوێنەوارێک مابێتەوە. لەپڕێکا ئەوەی بیر کەوتەوە کە جانتای پارە و ئەو شتانەی لە دۆڵابی پیرێژنەکەی دەرهێنابوون، هێشتا لە گیرفانیدان، تا ئەو کاتە بیری لەوە نەکردبووەوە کە دەریانبێنێت و بیانشارێتەوە. تەنانەت کە لە سەروبنکردنی جلەکانی

بەریشیدا بوو، ئەوەی بە بیردا نەهات. یەعنی چی؟ لەپڕا، زۆر خێرا هەمووی لە گیرفانی دەرهێنا و لەسەر مێزەکەی بڵاوی کردنەوە، دوای ئەوەی هەموو شتێکی، تەنانەت هەستارِی گیرفانەکانیشی بە هەڵگێڕاوەیی دەرهێنا تا لەوە دڵنیا بێت کە هیچیان تیا نەماوە. ڕاسکۆلنیکۆڤ هەموو شتەکانی لە سووچێکدا دانا، لەوێدا، لە گۆشەیەکی داوێنی دیوارەکەدا. بەشێک لە پاشماوەی کاغەزی دڕاو و هەڵواسراوی سەر دیوار هەبوو. خێرا هەموو شتەکانی تەپاندە ناو چاڵێکی ژێر کاغەزەکانەوە. ئەوسا بە خۆشحاڵییەوە، بەدەم هەستانەوە لەو گۆشە و چاڵە ورد بووەوە، کە بە شتەکان قۆقز ببوون. بیری کردەوە: "هەموو شتێک لەچاو ونبوو، تەنانەت جانتای پارەکەیش". لەپڕا لە ترسا هەموو گیانی لەرزی و نائومێدانە کەوتە پرتەپرت: "خودایە، من چیم لێهاتووە؟ ئەمە چۆن شاردنەوەیەکە؟ بۆ شت وا دەشارێتەوە؟"

لە ڕاستیا ڕاسکۆلنیکۆڤ حسابی بۆ ئەو شتانە نەکردبوو، ئەو تەنیا بیری لای پارەکان بوو، بۆیە لای خۆیەوە جێگایەکی تەرخان نەکردبوو بۆ شاردنەوەیان. لەگەڵ خۆیدا کەوتەوە بیرکردنەوە: "بەڵام من ئێستا لە چی خۆشحاڵم؟ ئایا شت ئاوا دەشارنەوە؟ بە ڕاستی ئەقڵم لەدەست داوە!" بە لەشی داهێزراویەوە لەسەر قەنەفەکە دانیشت و لەپڕا لەرزە بێوێنەکەی تێگەڕایەوە. بەبێ بیرکردنەوە پاڵتاوە زستانییەکەی سەردەمی خوێندکاریەتی، کە گەرم و دڕاو و لە پەنای کورسییەکەدا فڕێ درابوو، ڕاکێشا و بەسەر خۆیدا دا، دیسانەوە خەو و ڕێنە دایگرتەوە، لە هۆش خۆی چوو.

پێنج دەقیقەی نەبرد کە جارێکی تر هەستایەوە و وەک شێت خۆی گەیاندە جلەکانی "چۆن توانیم بنوومەوە لە کاتێکدا هیچ کارێکم

ئەنجام نەداوە؟ وایە. بەڵێ، وایە، هێشتا بەرەزوانەکەی بنهەنگڵم لێنەکردۆتەوە! بیرم چوو، چۆن شتی وا لەبیر دەچێت! چ شایەتێکی گەورەیە!" بەرەزوانەکەی لێکردەوە و پارچەپارچەی کرد، پارچەکانی لەژێر سەرینەکە و لە تەنیشت شتەکانی ترەوە دانا، پاشان لە کاتێکدا کە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستابوو، زۆر بە وردی و ناخۆشییەوە لە هەموو لایەکی دەڕوانی تا بزانێت لەسەر زەوییەکە یان لە جێگایەکی تردا شتێکی لەبیر نەکردووە، بەردەوام لەبەر خۆیەوە دەیوت: "قوماشی تیتوڵ تیتولکراو بە هیچ جۆرێک گومان دروست ناکات.. من وا دەزانم وا بێت، بەڵێ، هەروایە". ئەو بڕوای وابوو کە هەموو شتێک، تەنانەت یادوەری و بیری سادەیش دەستبەرداری ئەو بوون، ئەمەیش وردەوردە زۆریان ئازار دەدا: "یەعنی چی، نەکا لە ئێستاوە دەستی پێکردبێت، ناشێ سزا گەیشتبێت؟ بەڵێ، بەڵێ. خۆیەتی، تۆڵەیە".

لە ڕاستیا تاڵە بڕاوەکان کە لە پانتۆڵەکەی کردبوونەوە، لەسەر زەوییەکە، لە ناو ژوورەکەدا بە هەموو لایەکدا پەرشوبڵاو بوو، تا یەکەم کەس کە دەڕواتە ناو ژوورەکەوە، بیبینێت! لەپڕێکدا وەک مایەپووچێک هاواری لێهەستا: "بەڕاست من چیمە؟"

لەو کاتەدا بیرێکی سەیری بەسەردا هات، کە تۆ بڵێی هەموو جلەکانی خوێناوی بێت! ڕەنگە گەلێک پەڵەی خوێنی پێوەبێت و ئەو نەیانبینێت، چونکە ئەقڵی لاوازە و لەدەستی داوە و.. ئەقڵی تێک چووە. لەناکاوێکدا ئەوەیشی بیر کەوتەوە کە ڕەنگە خوێن بە جانتای پارەکەوە بێت. "..

کەواتە دەبێت گیرفانیشم خوێناوی بێت، چونکە من جانتاکەم بە خوێنەوە خستە گیرفانم" لە چاوتروکانێکدا هەستاری گیرفانەکەی هێنایە دەرەوە و بە ڕاستیش وابوو: هەستاری گیرفانەکە ئاسەواری

خوێنی پێوه بوو، کەوتەوە بیرکردنەوە: "کەواتە ئەقڵم تەواو لەکار نەکەوتووە. هێشتا بیر و لێکدانەوەم لە کاردان، هەر خۆم ئێستا هەستم بەو شتانە کردو بیرم لێکردنەوە".

بە خۆشییەوە هەناسەیەکی قووڵی دا و بە خۆی وت: "ئەو لاوازییەی هەستم پێکرد، لە ئەنجامی لەرز و تاکەوەیە و هیچی تر" هەستارِی گیرفانی چەپی پانتۆڵەکەی بە تەواوی دەرهێنا. لەو کاتەدا تیرێژێکی خۆر لە پەنجەرەکەوە کەوتە سەر جزمەکەی پێی چەپی: بە گۆرەوییەکەیەوە کە لە جزمەکەی هاتبووە دەرێ، شتێک بەرچاو دەکەوت، جزمەکەی داکەند، هەمووی خوێن بوو، نووکی گۆرەوییەکەی تەواو خوێن بوو، دیارە لەو کاتەدا بەبێ پارێز، پێی نابووە ناو چاڵێک خوێنەوە.. "باشە، باشە ئێستا من دەتوانم چی بکەم؟ تاکێک گۆرەوی و ڕیشاڵی پانتۆڵ و هەستارِی گیرفان لە کوێ بشارمەوە؟"

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەموو ئەو شتانەی بەدەستەوە گرت و لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستا "بیانخەمە ناو زۆپاکەوە؟ بەڵام یەکەمجار ناو زۆپاکە دەگەڕێن، بیانسووتێنم؟ بەڵام بە چی بیانسووتێنم؟ تەنانەت شقارتەیەکیشم پێنییە، نا، چاکتر وایە بڕۆمە دەرێ و هەموویان فڕێ بدەمە شوێنێکەوە، وا چاکترە لە شوێنێکی دوور فڕێیان بدەم" بەدەم دانیشتنی سەر قەنەفەکەوە دووبارەی کردەوە: "خێرا، هەر ئێستا، بەبێ دواکەوتن" کەچی دیسان سەری کەوتەوە سەر سەرینەکە، دیسان لەرزێکی زۆر بەهێز لەگۆی خست و پاڵتاوەکەی بەسەر خۆیدا کێشایەوە، ماوەیەک، چەند سەعاتێک، بەرودوا، وای دەهاتە بەرچاو کە "چەند باش بوو ئەگەر هەر ئێستا، بەبێ دواکەوتن، بڕۆیشتایەتە شوێنێکی دوور و هەموو شتەکانی لەوێ فڕێ بدایە و لەم سەر

یشەیە ڕزگاری بووایە.. چەند زووتر.. چاکتر". چەند جارێک ویستی لەسەر تەختەکە هەستێت، وەلێ نەیتوانی، سەرئەنجام لە دەرگادانێکی توند بە تەواوی هێنایەوە سەر خۆی.
ناستاسیا بە مشتەکۆڵە لە دەرگاکەی دەدا و هاواری دەکرد:
- دە بیکەرەوە، ماویت یان مردووی، ئەم هەموو خەوە بوو بە چی! بە درێژایی ڕۆژ وەک سەگ دەخەوێت، بە ڕاستیش سەگە! دە بیکەرەوە. سەعات لە دەیش تێپەڕیووە..
گوێی لە دەنگی پیاوێک بوو دەیوت:
- ڕەنگە هەر لە ماڵەوە نەبێت.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی:
"ئای.. ئەوە دەنگی دەرگاوانەکەیە، چی دەوێت؟"
ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕاست بووەوە و لەسەر تەختەی نووستنەکە دانیشت، دڵی لە پەلەپەلیدا کەوتبووە ئازار، ناستاسیا بەرپەرچی دەرگاوانەکەی دایەوە و وتی:
- کەواتە کێ دەرگاکەی کێلون کردووە؟ بڕوانە، دەرگاکەیش لەسەر خۆی دادەخات، دەترسێت نەک بیدزن! بیکەرەوە، خەوخۆش، بیکەرەوە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی: "ئەمانە چییان دەوێت؟ بۆ دەرگاوان؟ هەموو شتێک ئاشکرا بووە، بەرگری بکەم یان دەرگاکە بکەمەوە؟ هەموو شتێک تەواو.."
کەمێک ڕاست بووەوە، بەسەر دەرگاکەدا چەمایەوە و کێڵۆنەکەی لادا، ژوورەکەی ئەوەندە تەنگەبەر بوو، کە دەیتوانی بەبێ ئەوەی هەستێت دەرگاکە بکاتەوە.

ڕاستی کردبوو. دەرگاوان و ناستاسیا ڕێک وەستابوون. ناستاسیا بە جۆرێکی زۆر تایبەتی لێی ڕاما، ڕاسکۆلنیکۆڤ بە شێوەیەکی نائومێدانە و بوێرییەوە لە دەرگاوانەکەی ڕوانی. دەرگاوانەکە بێدەنگ پەڕە کاغەزێکی ڕەنگ خۆڵەمێشی پێچراوەی بە مۆم مۆرکراوی بۆ ڕاگرت و وتی:

- ئاگادارییەکە لە بەڕێوەبەرایەتییەوە

- کام بەڕێوەبەرایەتی؟

- چەند بەڕێوەبەرایەتی هەیە؟ کێ نایزانێت! نووسینگەی پۆلیس.

- بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس، بۆ؟

- من چوزانم، ئاگادارکردنەوەیە و دەبێ بچیت.

دەرگاوانەکە زۆر بە وردی تەماشای لاوەکە و دەوروبەری خۆی کرد و گەڕایەوە کە بڕوات.

ناستاسیا کە چاوی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ نەدەتروکاند، وتی:

- لەوە دەچێت زۆر نەخۆش بیت؟

دەرگاوانەکە بۆ چرکەساتێک ئاوڕی دایەوە، ناستاسیا لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

- لە دوێنێوە تای لێهاتووە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی نەدەدایەوە و بەبێ ئەوەی نامەکە بکاتەوە، هێشتا هەر لە ناو دەستیا ڕایگرتبوو.

ناستاسیا دڵی پێی دەسووتا، کە بینی قاچی لە تەختەکەوە شۆڕ کردۆتەوە بۆ ئەوەی هەستێت، لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

- پێویست بە هەستان ناکات، نەخۆشیت، مەڕۆ، خۆ دنیا ناڕوخێت! ئەوە چییە بەدەستەوە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ تەماشای دەستی خۆی کرد، لە دەستی ڕاستیا تاڵە بڕاوەکانی ڕیشووی پانتۆڵ، تاکێک گۆرەوی و هەستاڕی گیرفانە تیتۆڵ تیتۆڵکراوەکەی بینی، هەر بەو شتانەوە نوستبوو، کە پاشان بیری ئەو ڕووداوەی دەکردەوە، ئەوەی بیر دەکەوتەوە کە تەنانەت لەو کاتەیشدا تای لێدەهات و نیوەخەوتوو بوو، هەموو ئەو شتانەی توند لە ناو دەستیا دەگوشی و هەر بەو جۆرە خەوی لێدەکەوتەوە.

- بڕوانە چۆن ئەم پڕوپیتاڵانەی کۆ کردۆتەوە و لەگەڵیاندا نووستووە، وەک گەنجی دۆزیبێتەوە وایە..

ناستاسیا بەدەم قسەکانییەوە قاقای پێکەنینێکی دەمارگیرانەی لێدەدا.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە چاوتروکانێکدا هەموو ئەو شتانەی نایە ژێر پاڵتاوەکەیەوە و چاوی لە ناستاسیا بڕی. هەرچەندە نەیدەتوانی لەو کاتەدا بە چاکی داوەرییەکی ئاقڵانە بکات. بەڵام زانی ئەگەر پۆلیس بیەوێت یەکێک بگرێت، بەو جۆرە مامەڵەی لەگەڵدا ناکات: "وەڵێ پۆلیس منی بۆ چییە؟"

- چا ناخۆیت، بۆت بێنم؟ ئامادەیە..

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستایە سەر پێ و لەژێر لێوەوە وتی:

- نا.. من دەڕۆم، هەر ئێستا دەڕۆم بۆ لای پۆلیس.

- بزانە دەتوانیت لە پلیکانەکان دابەزیت؟

- دەڕۆم..

- ئارەزوو، ئارەزووی خۆتە.

ناستاسیا کەوتە دوای دەرگاوانەکە، ڕاسکۆلنیکۆڤ خێرا بەرەو لای پاڵتاوەکەی ڕۆیشت بۆ ئەوەی چاو بە گۆرەوی و ڕیشاڵەکاندا بگێڕێت "پەڵەیان پێوەیە، بەڵام هەرگیز دیار نین، هەموو پیس و ڕەنگبوردوو و پتورکاون، ئەوەی نەزانێت، هیچی لێ تێناگات، کەواتە ناستاسیاش

ناتوانێت له دووره‌وه ببینێت، سوپاس بۆ خودا" پاشان به نیگه‌رانییه‌وه ئاگادارییه‌که‌ی کرده‌وه و که‌وته خوێندنه‌وه‌ی. ماوه‌یه‌کی زۆر خوێندیه‌وه تا تێگه‌یشت، ئاگاداریه‌کی ئاسایی گه‌ڕه‌ک بوو، که ده‌بوو سه‌عات دوو و نیوی ئه‌و ڕۆژه بڕواته نووسینگه‌ی پۆلیس.

ڕاسکۆلنیکۆڤ به سه‌رسامیه‌کی ناخۆشه‌وه بیری کرده‌وه.. "ئاخر چۆن ده‌بێت وابێت، من ئاسایی هیچ کارێکم به پۆلیس نییه، پاشان ئه‌ی بۆ ئه‌مڕۆ؟ خودایا، خۆزگا زوو ته‌واو بوایه".

وه‌خت بوو بکه‌وێته سه‌رئه‌ژنۆ و بلاڵێته‌وه، که‌چی له خۆوه پێکه‌نینی لێپژا، بێگومان نه‌ک به دوعا و لالانه‌وه‌که‌ی، به‌ڵکو به خودی خۆی. به‌په‌له به‌رگی له‌به‌ر کرد و له‌به‌ر خۆیه‌وه وتی: "ئه‌گه‌ر تیا چووم قیروسیا، فه‌رقی چییه!" له‌پڕا بیری کرده‌وه "وا چاکتره گۆره‌وی له پێبکه‌م، چونکه له تۆزوخۆڵا زیاتر ده‌گۆڕێت، په‌ڵه‌کانی له‌ناو ده‌چن" به‌ڵام هه‌رکه له‌پێی کرد، یه‌کسه‌ر به ترس و بێزارییه‌وه دایکه‌نده‌وه، وه‌لێ زوو ئه‌وه‌ی بیر که‌وته‌وه که گۆره‌ویی تری نییه، بۆیه به‌په‌له له‌پێی کرده‌وه و دیسان دایه‌وه پێکه‌نین، له‌و کاته‌دا که‌وته‌وه بیرکردنه‌وه: "هه‌موو ئه‌مانه ڕێژه‌یین، بابه‌تی ڕووکه‌شن و وابه‌سته‌ی هه‌لومه‌رجن" به‌ڵام هه‌ر ده‌له‌رزی "ئیتر، وا له‌پێم کرد، کار گه‌یشته له‌پێکردن!" پێکه‌نینه‌که‌ی ناخۆش گه‌ڕا و له‌به‌ر خۆیه‌وه وتی: "نا، له توانای مندا نییه.." لاقی ده‌له‌رزی، له‌ژێر لێوه‌وه ده‌یوت: "له ترسایه".

سه‌ری گێژ و له‌تاوا تا گرتی. که به‌ره‌و قاڵدرمه‌کان چوو، هه‌ر له‌به‌ر خۆیه‌وه ده‌یوت: "ساخته‌یه‌کی تیایه، مه‌به‌ستیانه به فرۆفێڵ له داوم نێن، له هه‌مووی خراوتر ئه‌وه‌یه که من وڕێنه‌مه، ڕه‌نگه قسه‌یه‌کی نابه‌جێ بکه‌م".

لە ڕێی پلیکانەکاندا ئەوەی یاد هاتەوە، کە هەموو شتەکانی خستۆتە کونی دیوارەکەوە و هەروا دایناون. ئەوەی بیر کەوتەوە و وەستا "ڕەنگە بیانەوێت کە ئەم لەوێ نەبێت ژوورەکەی بپشکنن" وەلێ لەپڕا نائومێدانە، یان با بڵێین بێدەربەست لە مەرگ و ئەوەی ڕوو دەدات، شانی هەڵتەکاند و ڕێگەی لەبەر گرتەوە: "گرنگ ئەوەیە زوو تەواو بێت".

مرۆڤ لە بەردەم گەرمای سەرشەقامەکەدا خۆی پێنەدەگیرا، خۆزیا لە هەموو ئەو ڕۆژانەدا هیچ نەبێت چەند دڵۆپێک باران بباریایە، دیسان تۆز و خۆڵ و خشت و گەچ.. دیسانەوە بۆگەنی دووکان و مەیفرۆشەکان، دیسانەوە هەر هەمان خەڵکی سەرخۆش و کۆڵهەڵگر و گالیسکە نابووتەکان، هەتاوەکە وا لە نێوچاوی دەدا، کە ڕوانینیش ئازاری پێدەگەیاند، تەواو سەری گێژ بوو، ئەم هەستە بۆ کەسێک لەرزوتای لێهاتبێت و لەپڕا لە ڕۆژێکی هەتاودا بێتە سەرشەقام، کارێکی زۆر ئاسایی بوو.

کە گەیشتە پێچی شەقامەکەی دوێنێ، ڕاسکۆلنیکۆڤ بە نیگەرانییەکی زۆرەوە تەماشای ئاپارتمانەکەی کردەوە و زۆر زوو چاوی لێ کەلاخست. کە لە نووسینگەکە نزیک کەوتەوە، بیری کردەوە: "ئەگەر پرسیارم لێبکەن، ڕەنگە پێیان بڵێم".

نووسینگەی پۆلیس نزیکەی دووسەد و پەنجا مەترێک لە ماڵەکەیەوە دوور بوو. تازە گواستبوویانەوە بۆ بارەگایەکی نوێ لە قاتی چوارەمی ئاپارتمانێکی تازەدروستکراودا. ڕاسکۆلنیکۆڤ جارێکی دی، بۆ ماوەی چەند دەقیقەیەک سەری لە بارەگا کۆنەکە دابوو. کە چووە ناو ئاپارتمانەکەوە، لەلای ڕاستەوە پلیکانەیەکی بینی، کە کابرایەکی لادێیی بە کۆنووسێکەوە کە بە دەستییەوە بوو دەهاتە خوارێ.

"بێگومان ئەمە دەرگاوانە، کەواتە نووسینگەکە لێرەدایە" هەر بەو هەستەوە بە پلیکانەکاندا سەرکەوت، نەیدەویست دەربارەی هیچ شتێک پرسیار لە کەس بکات.
کە گەیشتە قاتی چوارەم، لەگەڵ خۆیدا دوا: "دەڕۆمە ژووریَ، لەسەر ئەژنۆ دادەنیشم و هەموو شتێک دەدرکێنم".
ڕێی پلیکانەکان تەنگەبەرەو پڕە لە پاشماوە، هەموو چێشتخانەی ئاپارتمانەکانی هەر چوار قاتەکە بەسەر ئێرەدا دێن و بە درێژایی ڕۆژ هەر وا کراوەن، بۆیە هەواکەی تەواو تەنگەنەفەست دەکات.
دەرگاوانەکان بەو کۆنووسانەی لە بندەستیاندا بوو، ئەو ژن و پیاو و پۆلیسانەی کاریان هەبوو، بەردەوام لە سەرکەوتن و دابەزیندا بوون.
دەرگای نووسینگەکە هەمیشە کراوە بوو. ڕاسکۆلنیکۆڤ چووە ژووریَ و لە ڕاڕەوەکەدا وەستا، زیاتر گوندییەکان لەوێدا وەستابوون و چاوەڕێیان دەکرد، بێجگە لە تەنگەنەفەسییە زۆرەکەی ئەویَ، بۆیەی تازە کە لە ڕۆنێکی خراپ دروست کرابوو، تازە ژوورەکانیان پیَ بۆیە کردبوو و هێشتا وشک نەببووەوە، بۆنێکی وای لێدەهات، مرۆڤی دەخستە هێڵنجدان. کە ماوەیەک وەستا، بیری کردەوە کەمێک بڕواتە پێشەوە و بچێتە ژوورێکی ترەوە. هەموو ژوورەکان بچووک و نزم بوون، هێند ئۆقرەی لێبڕابوو، کە هەر بۆ پێشەوە ملی دەنا، کەس گوێی پێنەدەدا، لە ژووری دووەمدا کارمەندەکان بەرگیان لەم کەمێک چاکتر و سەرقاڵی نووسین بوون.
هەموویان سەیر دەهاتنە بەرچاو.
یەکێکیان ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و وتی:
- چیت دەوێت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ ئاگاداریی نووسینگەکەی پیشان دا، پیاوەکە تەماشای ئاگادارییەکەی کرد و پرسی:
- خوێندکاریت؟
- بەڵێ، کۆنە خوێندکارم.
کارمەندەکە تەماشایەکی سەرپێیی ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد، بەڕواڵەت کابرایەکی پەرێشان و شلوشاو بوو، کە هیچت لە بینینەکەیدا بۆ دەرنەدەکەوت. ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕاما: "هیچ لەمە تێناگەیت، چونکە هەموو شتێک لای ئەو وەک یەک وایە".
کارمەندەکە بە پەنجەی ئاماژەی بۆ دواژوور کرد و وتی:
- بڕۆ بۆ لای سکرتێر.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بەرەو ژووری چوارەم کە پیشانی درابوو، چوو، ژوورێکی تەنگ و ئاپوورە. بەرگی ئەوانەی کە لەوێ بوون، کەمێک لەوانەی ژوورەکانی تر پاکتربوو، لە نێو ئەوانەدا کە بۆ کار هاتبوونە ئەوێ، دوو ژن دەبینران، یەکێکیان جلوبەرگێکی پرسە و هەژارانەی لەبەرابوو، کە بەرانبەر کارمەندێک دانیشتبوو، بەپێی ڕێنمایی ئەو شتی دەنووسی، ژنەکەی تر زۆر قەڵەو و دەموچاو بەپەڵە و لە سووریدا شین دەینواند، ژنەکە سەرنجی ڕادەکێشا. بەرگێکی زۆر جوانی لەبەردا بوو، قاپێکی ئاڵتوونیی بە سنگەوە بوو. لە گۆشەیەکدا وەستابوو و چاوەڕێی شتێکی دەکرد. ڕاسکۆلنیکۆڤ ئاگادارییەکەی لە پێشی سکرتێرەکە دانا، ئەوییش تەماشایەکی کرد و وتی:
- چاوەڕێ بە.
سکرتێرەکە دەستی بە کاری ژنە پرسەدارەکە کردەوە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ هەناسەیەکی حەسانەوەی دا: "بێگومان مەسەلەکە شتێکی ترە" وردەوردە ورەی هاتەوە سەر خۆی و بە هەموو توانای

هەوڵی ئەوەی بوو لەسەرخۆ و ئارام بێت: "تاقە تێکەوتن و هەڵەیەکی زۆر بچووک بەسە بۆ ئەوەی تیا بچم، ئم.. بە داخەوە ئێرە هەوای کەمە" پاشان لەسەری ڕۆشت "خەفەخانە، لە جاران زیاتر سەرم گێژ دەخوات.. ئەقڵیشم هەروا".

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستی کرد پەشێوییەکی سەیر هەموو لەشی داگرتووە. ترسا کە خۆی بۆ دابین نەکرێت، هەوڵیدا خۆی سەرقاڵی مەبەستێک بکات و بیری لێبکاتەوە، مەبەستێک چ پەیوەندییەکی بەو کارەیەوە نەبێت، بەڵام بێسوود بوو. سکرتێرەکە زۆری سەرنج ڕاکێشابوو، دەیویست لە سیمایەوە شتێک بخوێنێتەوە. چۆن کەسێکە، زۆر گەنج بوو، تەمەنی بیست و دوو ساڵ دەبوو، گەنمڕەنگێکی بە بزاڤ، کە لەو تەمەنە بچووکتری پیشان دەدا. جلەکانی بەپێی مۆدە گەلێک ڕێکوپێک دەهاتنە پێشچاو، قژی بە لایەکدا شانە و ڕۆنێکی زۆری لێدابوو، پەنجەی سپی و پاک و خاوێن، چەند ئەنگوستیلەیەکی لە پەنجەدا بوو، هێلەکەکەی بە زنجیری ئاڵتوون ڕازابووەوە. لەگەڵ یەکێک لەو بێگانانەدا کە کاریان کەوتبووە، ئەوێ چەند ڕستەیەکی باشی بە زمانی فەڕەنسی قسە کرد. بە ژنە قەڵەوە ڕەنگسوورە شینباوەکە کە جلێکی قەشەنگی لەبەردابوو، لەگەڵ ئەوەیشدا کە کورسییەکی لە پاڵدا بوو، کەچی وەک ئەوەی نەوێرێت دابنیشێت و هەر بە پێوە وەستابوو. وتی:

- لێزاڤیتا ئیڤانۆڤنا[1]، فەرموو دابنیشە.

خانمەکە لەسەرخۆ بە زمانی ئەڵمانی وەڵامی دایەوە:

- سوپاست دەکەم.

---

[1] *Louiza Ivanovna*

ژنەکە دانیشت، خشەخشێک کە لە بەرگە ئاوریشمینەکەیەوە بەرز بووەوە، کراسە شینە کاڵەکەی کە بە تۆڕی سپی ڕازابووەوە، وەک گۆیەکی زۆر جوان بە دەوری کورسییەکەدا هاتە خوارێ و تا ڕادەیەک نیوەی ژوورەکەی داگیر کرد، بۆنی عەتر بڵاو بووەوە، خانم بەوەی نیوەی ژوورەکەی داگیر کردبوو، وا دەهاتە بەرچاو نارەحەت بێت، هەرچەندە زەردەخەنەیەکی بەسەر لێوەوە بوو، بەڵام زەردەخەنەکەی تێکەڵ بوو لە ترس و ڕووهەڵمراوی کە بە ئاشکرا تووشی نیگەرانییان دەکرد:

خانمە پرسەدارەکە سەرئەنجام کارەکەی ڕێک کەوت و لە جێگاکەی هەستا. لەپڕێکدا ئەفسەرێکی بەهەراوزەنا و بێباک، کە لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا شانی هەڵدەتەکاند، هاتە ژوورەوە، کڵاوە قوتە جوانەکەی نایە سەر مێزەکە و لەسەر کورسییەک دانیشت. خانمە ڕێکپۆشەکە کە ئەوی بینی، لە جێگاکەی کەمێک جووڵا و بە خۆشییەوە و بۆ ڕێزگرتنی ئەفسەرەکە خۆی نووشتاندەوە، بەڵام ئەفسەرەکە بە هیچ جۆرێک بەسەر خۆیدا نەهێنا و گوێی پێنەدا. ژنەکەیش ئیدی ئەوەندەی بوێری بە خەرج نەدا، کە لەسەر کورسییەکە ڕووبەڕووی ئەفسەرەکە دابنیشێتەوە. ئەم پیاوە لەعنەتییە لێکۆڵەرەوەی بەشەکە بوو، ڕەنگی سمێڵی خەنەیی و بە شێوەیەکی ئاسۆیی لە هەردوولای ڕوومەتیی تێپەڕی بوو، دەموچاوی لەگەڵ ئەوەیشدا کە زۆر ورد بوو، بێچاووڕوویی لێدەتکا.

ئەفسەرەکە هەر لەژێرەوە و تا ڕادەیەک تووڕە چاوی بە ڕاسکۆلنیکۆڤدا گێڕا، جلەکانی ڕاسکۆلنیکۆڤ شڕ بوون، بە هەموو شێواوی و ناتەواویەکیی ئەو لاوەوە هێشتا حاڵ و ڕەفتاری لەگەڵ جلەکانیدا نەدەگونجا. ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەربەستانە بۆ ماوەیەکی زۆر

چاوی لە چاوی ئەفسەرەکە بڕی، بە جۆرێک کە لەگەڵیا بەرخوردی کرد، لەوەیش سەری ماسا کە شرۆڵەیەکی وا نایەوێت چاو لە چاوە بروسکە ئاساکانی ئەو لابدات، بۆیە بەسەر ڕاسکۆلنیکۆڤدا نەڕاندی.
- تۆ، چیت دەوێت؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە پەشۆکاوییەوە وەڵامی دایەوە:
- لێرە داوایان کردووم.. ئاگاداریم بۆ هاتووە.
سکرتێرەکە سەری لەسەر کاغەزەکە لابرد و بەپەلە وتی:
- مەسەلەی پارەدانەکەیە، ئەمە خوێندکارەکەیە.
سکرتێرەکە بەدەم قسەکردنەوە دەفتەرێکی دایە ڕاسکۆلنیکۆڤ و ئاماژەی بە شوێنێکدا تیایدا و پێی وت:
- بیخوێنەرەوە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری کردەوە: "پارە؟ پارەی چی؟ کەواتە مەسەلەکە ئەوە نییە" لە خۆشیا تەزوویەکی تێگەڕا، لە پڕێکدا هەستی بە سوکەڵەییەکی نائاسایی کرد، دەتوت بارێکی گرانی لەسەرشان لاچووە.
ئەفسەرە لاوەکە کە نەتدەزانی زیاتر لە چی پەست دەبێت، هاواری کرد:
- پێیان وتوویت سەعات چەند بێیت؟ بۆیان نووسیویت سەعات نۆ و ئێستا لە سەعات یانزە لایداوە.
ڕاسکۆلنیکۆڤیش لە پڕێکدا ڕقی سەرکەوت کە خۆیشی چاوەڕێی نەدەکرد، بەڵام تا ڕادەیەک چێژی دەدایە، بە دەنگی بەرز و بەبێ ئەوەی سەری بە لایدا وەربگێڕێت، وەڵامی دایەوە:
- پێش چارەکێک ئاگادارییەکەیان بۆ هێناوم، ئەوەندەیش بەسە، کە من بە لەرزوتاوە هاتوومەتە ئێرە.

- هاوار مەکە
- من هاوار ناکەم، لەسەرخۆ دەدوێم، وەلێ تۆ بەسەر مندا هاوار دەکەیت، من خوێندکارم، ڕێگەت نادەمێ هاوارم بەسەردا بکەیت.
ئەفسەرە پۆلیسەکە ئەمەندە پەشۆکا، کە لە سەرەتاوە تەنانەت نەیتوانی قسەیەک بکات و تەنیا کەوتە کەفچڕاندن، پاشان لە جێگاکەی هەستا و هاواری لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد:
- بێدەنگ بە، لە دەزگایەکی دەوڵەتیدایت، جەناب، سەرکێشی نەکەیت.
ڕاسکۆلنیکۆڤیش دەنگی لێ بەرز کردەوە:
- تۆیش لە دەزگای دەوڵەتیدایت، بێجگە لەمە هاوار دەکەیت و جگەرەیش دەکێشێت، ئەمانە هەموو ڕێزنەگرتنە لە ئێمە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بەم قسانە هەستی بە چێژێکی سەیر دەکرد.
سکرتێرەکە بە زەردەخەنەوە لە هەردووکیانی ڕوانی، ئەفسەرە توورەکە دابوویە بیرکردنەوە، لە دواییدا بە دەنگێکی بەرز و نائاسایی وتی:
- پەیوەندی بە تۆوە نییە. چاکترە ئەو پارەیەی داوایان لێکردوویت، بیاندەیتێ، ئەلکساندەر ئیڤانۆڤیج[١] پیشانی بدە، شکاتیان لێکردوویت، پارەکە نادەیت! چ هەڵۆیەکە!!
بەڵام ڕاسکۆلنیکۆڤ ئیدی گوێی بۆ شل نەکرد، بە وردی کەوتە خوێندنەوەی کاغەزەکە تا زوو لە مەبەستەکە تێبگات. یەک دوو جار خوێندیەوە و هیچی لێ تێنەگەیشت، لە سکرتێرەکەی پرسی:
- ئەرێ ئەمە چییە؟

---
[١] *Alexander Ivanovich*

-ئەمە نامەیەکە داوای قەرزی خۆیانی لێکردوویت، دەبێت بیدەیت، هەموو ئەو خەرجی و پێبژاردنانەیش کە دێتە سەری، یان بە نووسین وەڵامیان بدەیتەوە و ئەو کاتە دیاری بکەیت کە دەتوانیت بیدەیتەوە، لەگەڵ ئەمانەیشدا دەبێت بچیتە ژێر ئەو بارەی کە تا قەرزەکە تەواو دەبێت، نابێت لە پایتەخت بڕۆیتە دەرەوە، ماڵ و سامانت نەفرۆشیت و نەیانشاریتەوە. بەڵام داواکار بۆی هەیە سامانت بفرۆشێت و بەپێی یاسا لەگەڵتاندا ڕەفتار بکات.

- ئاخر من.. قەرزاری کەس نیم.

- ئەوە پەیوەندی بە ئێمەوە نییە، ئێمە تەنیا نامەیەکی ڕەسمی و سەنەدێکمان بەدەست گەیشتووە، کە ماوەی قەرزدانەوەکە تێپەڕیووە، نۆ نۆ مانگ لەمەوبەر بەرانبەر بەسەدوپەنجا ڕۆبڵ کە داوتە بە خاتوو زارنیتسینا[١]، کە بێوەژنی کارمەندی وەزارەتێکە، ئەو خانمەیش سەنەدەکەی داوەتە چیبارۆف[٢] کە کارمەندێکی ئیداریی ترە، ئێستا بۆ وەڵامی ئەمە تۆمان بانگ کردووە.

- بەڵام ئەم خانمە خاوەن ماڵەکەمە.

- جا چییە ئەگەر خاوەن ماڵت بێت؟

سکرتێرەکە بە زەردەخەنەیەکی پڕ لە دڵسۆزی و لێبوردنەوە کە لە هەمان کاتیشدا مانای سەرکەوتنی خۆی دەگەیاند، تەماشای دەکرد، سەرکەوتن بەسەر لاوێکدا، کە لە هەموو لایەکەوە پەلامار بدرێت، وەک بیەوێ پێی بڵێت: "دەی، چۆنی، حاڵت چۆنە؟" بەڵام ڕاسکۆلنیکۆڤ ئیدی چ کارێکی بە سەنەدی قەرزەوە هەیە؟ ئایا ئەو

[١] *Zarnitsina*

[٢] *Chebarof*

مەسەلەیە ئیتر نرخی ئەوەی هەبوو کە نیگەرانی بکات یان هەر بایەخی بداتێ!
ڕاسکۆلنیکۆڤ هەر بە پێوە وەستابوو، دەیخوێندەوە، گوێی دەگرت، وەڵامی دەدایەوە و تەنانەت پرسیاریشی دەکرد، بەڵام هەموو ئەم کارانەی بەبێ ویستی خۆی بوو، هەستی ئەوەی کە گیانی پارێزراوە و لە مەترسییەکی هەنووکەیی ڕزگاری بووە، لەو چرکەساتەدا هەموو گیانی پڕ کردبوو لە خۆشی. بەبێ ئەوەی بیر لە ئاییندە و ڕاڤەکردن و گریمانە و گومان و شتی تر بکاتەوە.. ئەوە چرکەساتێکی پڕ لە خۆشیی ڕاستەقینە بوو بە هەموو مانایەکی گرانبەهاوە. بەڵام هەر لەو کاتەدا لە نووسینگەکە ڕووداوێکی وەک هەورەبروسکە ڕووی دا.
ئەفسەرە لاوەکە کە هێشتا بەرانبەر بەو سووکایەتییەی پێی کرابوو، دەلەرزی و ئاگری تووڕەییەکەی تا دەهات زیادی دەکرد و دەیویست بەرگری لەو تەشەرە بکات، کە لێی درابوو، بە هەموو توانایەوە هێرشی کردە سەر ئەو ژنە جوان و بەدبەختەی کە لە ڕاڕەوەکەی ئەوەوە بە بزە گەلۆرانەکەیەوە تەماشای ئەمی دەکرد، لەپڕا ئەفسەرەکە بە دەنگی بەرز بەسەر ژنەکەیدا نەڕاند:
- هەی وا و وا پێکراو، دیسانەوە دوێنێشەو لای تۆوە چی ڕووی دا؟ ها؟ دیسانەوە کۆڵانەکەت پڕ کردەوە لە بێئابڕۆیی و کاری ناشیرین؟ دیسانەوە هەراهەرا و سەرخۆشی؟ دیارە حەزت لە زیندانە، من پێم وتیت، دە جار ئاگادارم کردیت و یانزەهەمین جار ئیتر وازت لێناهێنم، کەچی دیسانەوە، دیسانەوە کاری خۆتت کرد. هەی وا.. وا پێکراو..
کاغەزەکەی دەستی ڕاسکۆلنیکۆڤ کەوت و بە سەرسووڕماویەوە سەیری خانمە جوانەکەی کرد، کە ئاوا بێپەردە ڕسوا دەکرا. بەڵام زۆر زوو لە مەسەلەکە گەیشت و چیرۆکەکەی خۆش هاتە بەرچاو،

هێند بە تاسەوە گوێی گرتبوو، کە حەزی دەکرد پێبکەنێت و قاقا لێبدات. تەواوی دەماری کەوتبووە جووڵە.
سکرتێرەکە بە سۆزێکی زۆرەوە وتی:
- ئیلیا پیتروڤیچ[1]، پاشان کەمێک وەستا و چاوەڕێی هەلێک بوو، چونکە ئەفسەرە لاوەکە ئەوەندە تووڕە بوو، بە هیچ جۆرێک ئارام نەدەبووەوە مەگەر دەستی بگیرایە، سکرتێرەکە ئەمەی لە ئەزموونی خۆیەوە دەزانی.
وەلێ خاتوونە جوانەکە لە سەرەتادا لەم هەورەبروسکەیە لەرزی لێهات، گەلێک سەیر بوو، چەندە جوێنەکان توند و بێئەژمار بوونایە، بەو ڕادەیە ژنەکە میهرەبانتر دەبوو، زەردەخەنەکەی بەرانبەر ئەفسەرە ڕقهەستاوەکە تا دەهات دەلالتر دەینواند، هەر لە شوێنەکەی خۆیدا بە هێوری قاچی بە زەویەکەدا دەکێشا و خۆی بۆ دەنووشتاندەوە، ئەویش پەرۆشی ئەوەبوو مۆڵەتی قسەیەکی بدرێتێ..
سەرئەنجام بە ئامانج گەیشت، هەر ئەوەندەی ئەفسەرەکە بێدەنگ بوو، ئیدی لە پڕێکدا بە دەنگێکی تەواو ئەڵمانی. بەڵام بە زمانی ڕووسییەکی شکستە وتی:
- بەزموڕەزم لەماڵەکەی مندا نەبووە جەنابی کاپیتان: هیچ شەڕێکیش ڕووی نەداوە، ئەوان بە سەرخۆشی هاتن، من هەمووی باس دەکەم، جەنابی کاپیتان، من تاوانم نییە و ماڵەکەم ئابڕوومەندە جەنابی کاپیتان، ئەو کارەیش کە لەوێدا دەکرێت، ئابڕوومەندانەیە، جەنابی کاپیتان، هەرگیز حەزم لە شەڕ نەکردووە.. وەلێ ئەوان تەواو سەرخۆش بوون و سێ قاپی تریشیان داوا کرد، یەکێکیان پێی

---
[1] Ilia petrovich

هەڵبڕی و پیانووی پێ لێدا، ئەم کارەیش بە هیچ جۆرێک لەماڵێکی بە حەیاوحورمەتدا باش نییە، پیانۆکە شکا، کە ئەمە ڕەفتارێکی خراپە. من ئەمەم بەو وت، ئینجا شووشەکەی هەڵگرت و گرتییە خەڵکەکە، ئیتر زوو هەستام و دەرگاوانەکەم بانگ کرد. کارل[1] هات و بە چاوی ئەویشیدا کێشا، لە هانریتیشی[2] دا. پێنج کەڕەتیش بە دەموچاوی منیدا کێشا، ئەمە ئەوپەڕی ناشیرینییە لە ماڵێکی شەرافەتمەندا، جەنابی کاپیتان، من کەوتمە هاوار، ئەو، ئەو پەنجەرەیەی کردەوە کە بەسەر ڕووبارەکەدا دەڕوانێت، لەوێدا وەستا وەک بەراز کەوتە بۆڕەبۆڕ. ئەمە حەیاچوونە. چۆن دەبێت لە پاڵ پەنجەرەیەکدا کە بەسەر کۆڵاندا دەڕوانێت، وەک بێچووەبەراز بوەستیت و هاوار بکەیت؟ ئاە.. کارڵیش لە پشتەوە فراکەکەی گرت و لە پەنجەرەکەی دوور خستەوە، لەو کاتەدا ڕاستە جەنابی کاپیتان، جلەکەی دڕا، پاشان کەوتە هاوارهاوار کە دەبێت من پانزە ڕۆبڵی لەباتیی ئەوە بدەمێ. من خۆم جەنابی کاپیتان، پێنج ڕۆبڵم پێدا، جەنابی کاپیتان، میوانێکی بێتەربیەتە، هەمیشە دەیکاتە هەراوهوریا، دەیوت لەسەر تۆ داشۆرینێکی درێژ بڵاو دەکەمەوە، چونکە دەتوانم لە هەموو ڕۆژنامەکاندا لەبارەی ئێوەوە شت بنووسم.

- وا دیارە نووسەریشە؟

- بەڵێ. جەنابی کاپیتان، چ میوانێکی نانەجیبیشە، جەنابی کاپیتان. کاتێک لە ماڵێکی بەحورمەتدا..

- باشە، بەسە، من پێم وتبوویت، جاری تریش پێم وتبوویت..

[1] Karl

[2] henriette

سکرتێرەکە جارێکی دی بە ویقارەوە وتی:
- ئیلیا پیتروڤیچ!
ئەفسەرەکە نیگایەکی پەلەی کرد و سکرتێرەکە لەسەرخۆ سەری جوولاند. ئەفسەرە لاوەکە کەوتەوە قسەکردن.
- بەڕێز لێزاڤیتا ئیڤانۆڤنا، بۆ دواجار پێت دەڵێم، ئەوەیش بزانە کە ئەمە دواجارە، ئەگەر جارێکی دی لە ماڵە ئابڕوومەندەکەی تۆدا شەڕوهەرا ڕوو بدات، بە ئەدەبەوە پێت دەڵێم، گوێت ڕادەکێشم، تێگەیشتی؟ وتت ئەدیب و نووسەر پێنج ڕۆبڵی زیوی لە "ماڵە ئابڕوومەندەکەتدا" لەبری بەرگە دڕاوەکەی وەرگرت؟ دە وەرە دەی! ئەمەیش نووسەر!
لەو کاتەدا تەماشایەکی سووکایەتیپێکردنی ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد.
- سێ ڕۆژ لەمەوبەریش لە چێشتخانەیەکی هەرزاندا چیرۆکێکی تری لەم بابەتە ڕووی داوە: یەکێک لەو جۆرە نووسەرانە نیوەڕۆژەی خواردووە و نەیویستوە پارەی خواردنەکە بدات، وتوویەتی "شتێک دەنووسم و داتاندەشۆم" یەکێکی تریش لە کەشتیدا، هەفتەی ڕابوردوو، خێزانی بەڕێزی کارمەندێکی ئیداری کە بریتی بوون لە ژن و کچەکەی، داوەتە بەر جوێن. هەر لەم ماوەیەدا نووسەرێکی تر لە پێشانگایەکی شیرینیفرۆشیدا بە تەکان کراوەتە دەرەوە. بەڵێ، ئەمانەن ئەدیب و نووسەر و خوێندکار و لەو بابەتانە.. تف! باشە، تۆ ئیدی بڕۆ، خۆم سەرت لێدەدەم.. بەڵام ئاگادار بە، گوێت لێمە؟
لێزاڤیتا ئیڤانۆڤنا بە میهرەبانی و ئەدەبەوە بە هەموو لایەکدا خۆی دەنوشتاندەوە تا هەر بە پشتاوپشت گەیشتە دەرگاکە. وەلێ لەبەر دەرگاکەدا لە پشتەوە بەر ئەفسەرێکی پایەدار کەوت، کە ڕوویەکی کراوەی گەش و سمێڵێکی پڕی زۆر جوان و ڕیشێکی زەردباوی

لەسەر ڕوومەتی هێشتبووەوە. ئەم ئەفسەرە نیکودیم فومیچ[1] بوو، سەرپەرشتی کاری بەشەکە. لیزاڤیتا ئیڤانۆڤنا بۆ ڕێزلێنانی ئەمەندە بەپەلە چەمایەوە، لەوەدابوو لەسەر زەویەکە دابنیشێت. بە هەنگاوی وردی، دەتوت خەریکە دەفڕێت، زوو لە نووسینگەکە چووە دەرەوە. نیکودیم فومیچ بە شێوازێکی لەوەندانە ڕووی لە ئیلیا پیتروڤیچ کرد و وتی:

- دیسانەوە هەراوزەنا، دیسانەوە هەورەبروسکە و تۆزوخۆڵ و گەرداو! جارێکی تریش پەستیان کردیت! من لە خوار پلیکانەکانەوە گوێم لە دەنگت بوو.

ئیلیا پیتروڤیچ کە چەند پەڕە کاغەزێکی بەدەستەوە بوو، بەرەو مێزێکی تر دەرۆیشت و لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا شانی دەجووڵاند، واتا هەنگاوی بۆ هەر لایەک بنایە، شانی بەرەو ئەوێ دەسووڕاند، بە بێدەربەستییەکی ئەشرافانەوە وتی:

- چی بکەم. فەرموو تەماشاکە، جەنابی نووسەر، یەعنی خوێندکار، یان چاکتری بڵێم کۆنە خوێندکار، قەرزەکەی ناداتەوە، سەنەدی مۆر کردووە، خانووەکە چۆڵ ناکات و بەردەوام سکاڵای زۆری لەدەست دەکرێت، کەچی هێشتا گلەیی ئەوە دەکات کە بۆ لە خزمەتیاندا جگەرە دەکێشم، خۆیان پ.. پ.. پەست دەکەن. ئەمانە. فەرموو لەمانە بڕوانە. بەم حاڵەوە، ئەمە باشترین نموونەیە.

- هەژاری تاوان نییە هاوڕێ، وێڵیکە، دیارە پوشو خۆی لەبەر ئاگرا ناگرێت، دیارە تۆیش هێند لێیان نیگەران بوویت، ئیتر نەتتوانی جڵەوی خۆت بگریت.

---

[1] *Nikodim Fomich*

پاشان نیکودیم فومیچ به میهرەبانییەوە ڕووی قسەکانی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و وتی:
- وەلێ بەڕێز ، تۆ لە خۆتەوە تووڕە بوویت، دەبێت پێت بڵێم کە پیاوێکی زۆر پیاوانەیە، بەڵام وەک باروت وایە، باروت! تووڕە دەبێت، دەجۆشێت، دەتەقێت و دوای ئەوە تەواو دەبێت و دەبێتە ئاشی ئاولێکەوتوو، بێدەنگ دەبێت، بەڵام دڵی زێڕە و هەروەک خۆی دەمێنێتەوە. تەنانەت لە فەوجەکەیدا نازناوی "ئەفسەری باروت"یان داوەتێ.
ئیلیا پیتروڤیچ کە ئەم وشانەی پێخۆشبوو، بەڵام هێشتا نارازی بوو، بە دەنگی بەرز وتی:
- چ فە.. فە.. فەوجێکیش!
لە پڕێکدا ڕاسکۆلنیکۆڤ حەزی بەوە بوو وتەیەکی زۆر خۆشیان پێبڵێت: بە شێوازێکی ڕەندانە ڕووی لە نیکودیم فومیچ کرد و وتی:
- ڕێگە هەیە، کاپتن خۆت لە جێگای من دابنێیت.. من تەنانەت ئامادەم داوای لێبووردنیان لێبکەم، ئەگەر هەڵەیەکم بەرانبەریان کردووە، من خوێندکارێکی هەژار و نەخۆشم و لە هەژاریدا ئازار دەچێژم (هەر بەو شێوەیە وتی: ئازار) من خوێندکار بووم، لەبەر ئەوەی ئێستا ناتوانم کاروباری ژیانم ئەنجام بدەم، بۆیە وازم لە زانکۆ هێناوە، بەڵام بەم زووانە بڕێک پارەم بەدەست دەگات، دایکم و خوشکم لە هەرێمی (س)ن و پارەم بۆ دەنێرن و دەتوانم قەرزەکانم بدەمەوە. خاوەن خانووەکەم ژنێکی دڵسۆزە. لەبەر ئەوەی دەرسی تایبەتی نالێمەوە و چوار مانگە پارەم نەداوەتێ، بە جۆرێک پەست بووە، کە تەنانەت ئێستا خواردنیشم بۆ نانێرێت.. لە ڕاستیا من هەر نازانم ئەم

سەنەدە چییە! کە ئێستا بە نامەی ڕەسمی داوای پارەکەیم لێدەکەن. ئێوە خۆتان وەکیل بن، لە کوێ دەتوانم پارەی بدەمێ!
سکرتێرەکە دیسانەوە وتیەوە:
- ئەوەیان پەیوەندیی بە ئێمەوە نییە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ جارێکی دی جڵەوی قسەی لەدەست گرتەوە و بەبێ ئەوەی ڕوو لە سکرتێر بکات، ڕووی دەمی کردە نیکودیم فومیچ و لەگەڵ ئەوەیشدا هەموو توانای خستە گەڕ کە ئیلیا پتروڤیچیش گوێی لێبێت، بەڵام ئەمیان خۆی بە پەڕە کاغەزەکانەوە سەرقاڵ کرد و بە بێزارییەوە پشتگوێی خست، ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:
- بوارم بدە. بوارم بدە. من تەواو لەگەڵ تۆدام. بەڵام لێگەڕێ منیش ڕووناکییەک بخەمە سەر مەسەلەکە و بڵێم کە من سێ ساڵە لە خانووی ئەودا دەژیم، واتا لەو کاتەوە کە لە دەرەوەی شارەوە هاتووم. تەنانەت پێش ئەوەیش، پێشتریش. وەلێ بۆ دان بەوەدا نەنێم کە من لە سەرەتاوە بەڵێنم دابوو کچەکەی بخوازم، ئەم قسەیە هەروا بەدەمی و دوور لە شتی ڕەسمی بوو.. ئەو کچ بوو.. بەهەرحاڵ، تەنانەت پێم خۆش بوو هەرچەندە عاشقیشی نەبووم.. بە کورتی ئەوەیش پەنی لاویەتیە، دەمەوێت بڵێم ئەوسا خاوەن ماڵەکەم گەلێک لەگەڵ مندا دڵۆڤان بوو، زۆر شتی لێک نەدەدایەوە و تا ڕادەیەک ژیان.. بەڵێ ژیانێکی بێدەربەستانەم هەبوو.
ئیلیا پتروڤیچ بە زمانێکی زبر کە هەستی سەرکەوتنی تیا دەبینرا، وتی:
- جەناب ئێمە لەبارەی ژیانی تایبەتی خۆتەوە هیچمان داوا لێنەکردویت و ماوەی گوێگرتنیشمان نییە.

وەلێ ڕاسکۆلنیکۆڤ، لەگەڵ ئەوەیشدا قسەکردنی لەپڕی لا دژوار بوو، زۆر زوو لە قسەی خست و وتی:
- ئاخر ڕێگەم بدە، ڕێگەم بدە منیش هەندێک ڕوونکردنەوەم هەیە، مەسەلەکە چۆن بوو، هەر لە سەرەتاوە.. هەرچەندە من لەگەڵتام کە باسکردنی زیادەیە.. بەڵام ساڵێک لەمەوبەر کچەکە تووشی نەخۆشی تیفوویید بوو و مرد، منیش وەک کرێگرتەیەک، وەک جاران، لەوێ مامەوە و کە خاوەن ماڵ گوێزرایەوە بۆ ئەم شوێنەی ئێستا، پێی وتم، بە دڵپاکییەوە پێی وتم، کە زۆر لە من پشتئەستور و دڵنیایە.. بەڵام هەر خراپ نییە سەنەدێکمان لە نێواندا بێت بە بڕی سەد و پەنجا ڕۆبڵ -ئەو بڕە پارەیەی کە لەسەر من بە قەرزی دەزانێت- کە بیدەمێ، گوێت لێمە.. بە تایبەتی وتی ئەگەر ئەو سەنەدەی بدەمێ، دوای ئەوە چەندم پارە پێویست بێت، بمداتێ و هەرگیز، بەڵێ هەرگیز -ئەمە قسەی خۆی بوو- ئەو سەنەدە بۆ قازانجی خۆی بەکار نەهێنێت، تا ئەو کاتەی من خۆم پارەکەی ئەدەمەوە.. وا ئێستایش کە دەرسەکانم لەدەست چوون و پارەی خۆراکیشم نییە، بە ڕەسمی داوای پارەم لێدەکات.. من چی بڵێم؟
ئیلیا پتروڤیچ بێشەرمانە قسەکەی پێبڕی و وتی:
- هەموو ئەم وردەکارییە سۆزبزوێنانە بایەخی لای ئێمە نییە، دەبێت تۆ وەڵام بدەیتەوە و خۆت بە بڕیارەکەوە ببەستیتەوە، ئیتر ئەوەی کە تۆ ڕۆژێک عاشق بوویت و لەم بابەتە ناخۆشانە.. ئەسڵەن پەیوەندیی بە ئێمەوە نییە.
نیکودیم فومیچ لە پشت مێزەکەوە دانیشت و کەوتە ئیمزاکردن، لەبەر خۆیەوە وتی:
- تۆیش.. زۆر دڵڕەقیت.

لەوە دەچوو شەرمەزار بێت.
سکرتێرەکە بە ڕاسکۆلنیکۆڤی وت:
- باشە، بتووسە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دەنگێکی تایبەتیەوە پرسی:
- چی بنووسم؟
- من ئێستا بۆت پڕدەکەمەوە.
لای ڕاسکۆلنیکۆڤ وا بوو کە دوای دانپیانانەکانی و سکرتێرەکە زیاتر بێشەرمی و گوێپێنەدانی بەخەرج دا، بەڵام سەیرەکە لەوەدا بوو کە کتوپڕ ڕاسکۆلنیکۆڤ تەواو لە ڕای خەڵکی، ڕای هەر کەسێک بێت، بە تەواویی بێدەربەست بوو، ئەم وەرچەرخانەیش لە ساتەوەختێکدا، لە چرکەیەکدا ڕووی دا. ئەگەر ئارەزووی بیرکردنەوەی ئەو مەسەلەیەی ببوایە، بە تەواوی سەری لەوە سووڕ دەما کە چۆن توانیویەتی چەند چرکەساتێک پێشتر لەگەڵ ئەوانەدا قسە بکات و بە باس و سکاڵاکانی سەریان بیەشێنێت؟ باشە ئەم هەستە لە کوێوە هات؟ ئێستا بە پێچەوانەوە ئەگەر ژوورەکە لەپڕێکدا، نەک لە پاسەوان، بەڵکو پڕبێت لە هاوڕێکانیشی، ئەو کاتەیش ڕەنگە وشەیەکی گەرمی دەست نەکەوێت کە بەدڵ بیڵێت. چونکە لە پڕێکدا دڵی پڕ بوو لە بۆشاییەکی گەورە، هەستێکی نامۆ و تاریک. تەنیاییەکی پڕ لە ئازار و بێدەربەستانەی سەیر کەوتە دڵییەوە. نە دانپیانانە تایبەتییە لاوازەکانی بەرانبەر بە ئیلیا پیتروڤیچ، نە سەرکەوتنە نابووتەکەی ئەفسەرە لاوەکە، هیچێک لەمانە نەبوونە هۆکاری ئەو ئاڵوگۆڕەی کتوپڕ بەسەر دڵیدا هات، نا، ئەو ئێستا چ پەکی بە زەبوونی و کزی خۆی و ئەم فیزوهەوا و ئەم ئەفسەر و ژنانی ئەڵمانی و داواکاری و نووسینگە و شتی ترەوە کەوتووە! ئەگەر ئەم لەم چرکەساتەدا فەرمانی

سووتاندنیان بەسەردا بدایە، کەمەکێک بۆی نەدەجوولا، تەنانەت بە وردی گوێدێری فەرمانەکەیش دەبوو. ئەم وەرچەرخانەی کە ئێستا لەودا پەیدا بوو، بۆ خۆیشی تەواو تازە و پێشبینینەکراو و کتوپڕ بوو. وا نەزانرێت کە ڕاسکۆلنیکۆڤ لە ڕێی ئەقڵەوە پەی بەمە بردبێت، بەڵکو بە تەواوی توانایەوە هەستی دەکرد کە نەک تەنیا لە باسکردنی ئەو شتە تایبەتی و هەستبزوێنانە بەڵکو بە هیچ جۆرێک، لەسەر هیچ مەسەلەیەک، ئیدی نابێت لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا، لە نووسینگەی پۆلیسدا قسە بکات. تەنانەت ئەگەر هەموو ئەوانە برا و خوشکی ڕاستەقینەی بن نەک ئەفسەری پۆلیس. بەتایبەتی باسکردنی بابەتێکی تایبەت بە ژیانەوە کە تەواو بێهودەیە. تا ئێستا هەستێکی ئەوەندە سەیری لە خۆیدا نەدیبوو، ئەوەی لە هەموو زیاتر ئازاری دەدایە، ئەو هەستە بوو، نەک تێگەیشتن و دەرکی مەبەست – هەستێکی هێند قووڵ، کە لە هەستەکانی پێشوتری زیاتر ئازاریان دەدا.
سکرتێرەکە خەریکی نووسینی مەبەستێک بوو، کە ئاسایی بۆ وەڵامدانەوە پێویستە، واتا وتنی ئەوەی: کە ناتوانم بیدەمەوە، بەڵێن دەدەم لە فڵانەوەختا (هەر وەختێک بێت) بیدەمەوە، لە شار ناچمە دەرەوە، کەلوپەلم نافرۆشم و نایبەخشم و لەم جۆرە شتانە.
سکرتێر لە ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕاما و بە سەرسامییەوە وتی:
- تۆ توانای نووسینت نییە، خەریکە قەڵەمەکە لە دەستت دەکەوێتە خوارێ. نەخۆشیت؟
- بەڵێ سەرم گێژ دەخوات. چی ماوە بیڵێ.
- تەواو، مۆری بکە.
سکرتێرەکە نامەکەی هەڵگرت و کەوتە ناو نامەکانی ترەوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ قەڵەمەکەی دایەوە، وەلێ لەباتیی ئەوەی هەستێت و بڕوات، هەردوو ئانیشکی نایە سەر مێزەکە و بە هەردوو دەستی کەوتە گوشینی سەری، دەتوت بزمار بە کاژەڵاکی سەریدا دادەکوتن. لەناکاوێکدا بیرێکی سەیری بەسەردا هات، وەک ئەوەی بڕواتە لای نیکودیم فومیچەوە و ئەوەی دوێنێشەو ڕووی داوە، بە هەموو وردەکارەکانییەوە، بۆی باس بکات، پاشان لەگەڵ هەموویاندا بڕواتەوە بۆ ماڵەکەی و ئەو شتانەی لە سووچەکەدا، لە کونەکەدا، دایناون، پیشانیان بدات.

ئەم بیرە هێند بەهێز بوو، کە بۆ ئەنجامدانی لە جێگاکەی هەستا، بەڵام زوو بیری کردەوە: "چاکتر نییە باشتر بیری لێبکەمەوە؟ نا، باشترە زیاتر لێی ڕانەمێنم و ئەم کۆڵە لەسەرشانم لابدەم" وەلێ لەپڕا وەک لە جێگاکەیدا وشک بووبێت وابوو: نیکودیم فومیچ بە گەرمی لەگەڵ ئیلیا پیتروڤیچ سەرگەرمی ئەم قسانەبوو:

- نابێت، هەردووکیان ئازاد دەکەن! یەکەم: دزیەتی لە هەموو شتەکاندا هەیە، تۆ خۆت بڕیار بدە، ئەگەر ئەوان ئەو کارەیان کردبێت. بۆ بانگی دەرگاوانیان کردووە؟ بۆ ئەوەی خۆیان تاوانبار بکەن؟ یان فڕوفێڵێک بەخەرج بدەن؟ نا، ئەمەیان زێدەڕۆییە لە فێڵبازیدا! بێ لەمانەیش پستریاکوفی[1] خوێندکاریان دیووە کاتێک کە ویستوویەتی بڕواتە ناو ساختمانەکەوە، هەردوو دەرگاوان و ژنێکیش دیویانە: ئەو لەگەڵ سێ هاوڕێیدا بووە و لە بەردەم دەرگای چوونەژوورەوەدا لێیان جیابۆتەوە، پێش جیابوونەوەیش، لەبارەی دانیشتوانی ساختمانەکەوە، لە بەردەم هاوڕێکانیدا، پرسیاری لە دەرگاوانەکان

---

[1] *pestriakof*

کردووه. باشه دەبێت یەکێک کە خەیاڵێکی وای لەژێر سەردا بێت، پرسیار لەسەر دانیشتوانی ساختمانەکە بکات؟ هەروەها "کوخ" پێش ئەوەی بچێتە لای پیرێژنەکە، نیوسەعات لە خوارەوە، لای زەرەنگەرەکە دانیشتووە و لە سەعات هەشت و چارەکی تەواودا لەوێوە ڕۆیشتۆتە سەرەوە بۆ لای پیرێژنەکە. فەرموو خۆت بیری لێ بخە گەڕ..

- مۆڵەتم بدە. ئاخر ئەم ئاڵۆزییە چۆن کەوتۆتە کارەکەیانەوە: خۆیان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە لە دەرگایان داوە و دەرگاکە داخراوە، دوای سێ دەقیقە، کە لەگەڵ دەرگاوانەکەدا گەڕاونەتەوە، سەیریان کردووە دەرگاکە کراوەتەوە. ئەم دژایەتییە چۆن لێک دەدەیتەوە؟

- قسەکە لێرەدایە، بێگومان بکوژەکە لە ژوورەوە دانیشتووە و دەرگاکەی لەسەر خۆی کلۆم کردووە، بێگومان هەر لەوێدا دەیانگرت، ئەگەر کوخ کەرایەتیی نەکردایە و نەچوایە بەدوای دەرگاوانەکەدا، بێگومان لەو ماوەیەدا بکوژەکە دەرفەتی دەست کەوتووە و لە پلیکانەکانەوە هاتۆتە خوارێ و هەر چۆنێک بووە، لەدەستیان هەڵاتووە. کوخ بە هەردوو دەستی خاچ بۆ خۆی دەکێشێت و سوێند دەخوات: "ئەگەر لەوێدا بمامایەتەوە، بکوژەکە بەدەردەکەوت و بە تەور دەیکوشتم" کوخ دەیەوێت لە کڵێسەدا بەپێی ڕێوڕەسمی ئاسایی دروودی بۆ بخوێنن، هە، هە، هە!

- کەواتە کەس بکوژەکەی نەبینیووە؟

سکرتێرەکە کە لە جێگای خۆی گوێقوڵاغ دانیشتبوو و وتی:

- چۆنی دەبینن؟ شوێنەکە لە کەشتیی نوح دەچێت.

نیکودیم فومیچ بە گەرمی کەوتەوە قسە:

- مەسەلەکە ئاشکرایە، هەر زۆر ئاشکرایە.

ئیلیا پیتروڤیچ بەرپەرچی دایەوە:
- نەخێر، بە هیچ جۆرێک ئاشکرا نییە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ کڵاوەکەی هەڵگرت و بەرەو لای دەرگاکە چوو. بەڵام نەگەیشتە دەرگاکە..
کە هاتەوە هۆش خۆی، بینی لەسەر کورسییەک دانیشتووە، لەلای ڕاستەوە یەکێک گرتوویەتی، لەلای چەپیشەوە یەکێکی دی وەستاوە و پەرداخێکی زەردی پێیە، کە پڕە لە ئاوێکی زەردباو. نیکودیم فومیچ بەرانبەری وەستاوە و چاوی تێبڕیووە، ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەر کورسییەکە هەستا.
نیکودیم فومیچ بە دەنگێکی زبرەوە پرسی:
- چیتە؟ نەخۆشیت؟
سکرتێرەکە کە لە شوێنەکەی خۆی دانیشتبوو، سەرگەرمی نامەکان بوو، وتی:
- ئەو کاتەی مۆری بڕیارەکەی دەکرد، بە زەحمەت قەڵەمەکەی گرتبوو.
ئیلیا پتروڤیچیش بەدەم ڕێکخستنی کاغەزەکانەوە لە جێگای خۆیەوە دەنگی هەڵبڕی:
- تۆ دەمێکە نەخۆشیت؟
ئیلیا پتروڤیچ نەخۆشەکەی لە کاتی بێهۆشکەوتنەکەیدا بینی، بەڵام کە هاتەوە هۆش خۆی، زوو لێی دوورکەوتەوە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەژێر لێوەوە وەڵامی دایەوە:
- لە دوێنێشەوەوە...
- ئایا دوێنێشەو لە ماڵ هاتبوویتە دەرەوە؟
- بەڵێ، لە دەرەوە بووم.

- به نەخۆشی؟
- به نەخۆشی.
- له سەعات چەندا؟
- دوای سەعات حەوتی شەو.
- ببووره لێت بپرسم، بۆ کوێ چوویت؟
- بۆ سەر شەقام
- وەڵامێکی کورت و ڕوون.

دەنگی ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕەق و ناوبەناو بوو، ڕەنگی ببووه کاغەزی سپی و چاوه سووردداگەڕاو و ڕەشەکانی بەرانبەر به ڕوانینی ئیلیا پتروڤیچ نەوی بوون.

نیکودیم فیومیچ وتی:

- لەسەر پێ خۆی ناگرێت و تۆیش..

بەڵام ئیلیا پیتروڤیچ به شێوازێکی تایبەتی وەڵامی دایەوه.

- قەیدی نییه.

نیکودیم فیومیچ ویستی شتێکی تر بڵێت، بەڵام که چاوی به سکرتێرەکه کەوت و بینی ئەویش لێی ڕاماوه، بێدەنگ بوو. لەپڕێکا هەموو بێدەنگ بوون، دۆخێکی سەیر بوو.

ئیلیا پیتروڤیچ سەرئەنجام وتی:

- زۆر چاکه، با دوا نەکەویت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ چووه دەرەوه و تەنیا ئەوەندەی گوێ لێبوو که له کاتی چوونەدەرەوەیدا باسەکه گەرم بوو. دەنگی پرسیارکردنی نیکودیم فومیچ له هەموویان دیارتر بوو.. ڕاسکۆلنیکۆڤ له شەقامەکەدا تەواو هاتەوه هۆش خۆی، له کاتێکدا که دەیویست بەپەله

بگاتەوە ماڵێ، لەگەڵ خۆیدا دەیوتەوە: "پشکنین، پشکنین، هەر ئێستا دەکەونە پشکنین، ئای ڕێگرانە! گومانیان لە منە!"
جارێکی دی ترس لە نووکی پێیەوە تا تەوقی سەری داگرت.

**٢**

"ئەی ئەگەر پشکنیبێتیان چۆن؟ چۆنە ئێستا لە ژوورەکەمدا بن؟"
باشە، ئەمەیش ژوورەکەی، نە هەواڵێک و نەکەسێک هاتۆتە ناوی، تەنانەت ناستاسیایش دەستی لە هیچ نەداوە، وەلێ خودایا، چۆن توانیبووی ئەم هەموو شتانە لەو کونەدا دابنێت؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ خۆی کوتایە سووچەکەوە، دەستی خستە ژێر کاغەزە دیوارییەکان و کەوتە دەرهێنانی شتەکان و پڕکردنی گیرفانەکانی، تێکڕا هەشت پارچە شت بوون: دوو قوتووی بچووک کە گوارەیان تیابوو یان شتێکی لەو بابەتە، کە چاک تەماشای نەکردن، چوار کیسەی بچووکی چەرمین، پاشان زنجیرێک کە بە کاغەزی ڕۆژنامەیەکەوە پێچرابوو. شتێکی تریش کە هەر بە کاغەزی ڕۆژنامەوە پێچرابوو و زیاتر لە میداڵ دەچوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ شتەکانی خستە گیرفانە جیاوازەکانییەوە: یەعنی گیرفانی پاڵتۆ و گیرفانی لای ڕاستی پانتۆڵەکەی، هەوڵیشیدا زۆر بەرچاو نەکەون، جانتا پارە بچووکەکەیشی لەگەڵ شتەکانی تردا هەڵگرت، ئینجا لە ژوورەکەی هاتە دەرێ و ئەمجارەیان بە تەواوی دەرگاکەی کردەوە.
هەنگاوی خێرا و پتەوی دەنا، هەرچەندە هەستی دەکرد تەواو ڕووخاوە. بەڵام بە چاکی دەیزانی چی دەکات، ئەو لەوە دەترسا لە دوایەوە بن، لەوە دەترسا دوای نیوسەعات یان چارەکێک فەرمانی

چاودێریکردنی دەربچێت، بۆیە دەبوو هەرچۆنێک بووە، پێش ئەو وادەیە ئاسەواری کارەکەی بە هیچ جۆرێک نەهێڵێت. دەبێت تا هێشتا هێز و توانای بیرکردنەوەی ماوە، کارەکانی ئەنجام بدات، بەڵام بۆ کوێ بچێت؟

کەمێک لەمەوبەر بڕیاری دابوو هەموو شتەکان فڕێ بداتە ڕووبارەکەوە بۆ ئەوەی نیشانەکانیان لە ئاودا نەمێنن و کارەکەی تەواو بێت. لە کاتی وڕێنەی شەو و لەو کاتانەدا کە چاک لەبیریەتی چەند جارێک دەیویست هەستێت و بکەوێتە ڕێ، ئەم بڕیارەی دابوو: کە "تا بکرێت، زووتر هەموو شتەکان لەناو ببرێن" بەڵام ڕزگاربوون لەو شتانە هەروا ئاسان نەبوو.

نزیکەی نیو سەعات یان ڕەنگە زیاتر بێت کە بە کەناری "یکاترینسکی"[1] دا دەڕۆیشت، کە دەگەیشتە ئەو پلیکانانەی کۆتایی ڕووبارەکەیان پێدەهات، بە چاکی هەڵیدەسەنگاند. وەلێ تەنانەت بیری ئەنجامدانی بڕیارەکە بە مەحاڵ دەهاتە بەرچاو، چونکە یان لەسەر تەختەی دارە پتەو و گەورەکان، کە نزیک بە پلیکانەکان بوون، ژنە جلشۆرەکان وەستابوون و جلیان دەشت، یان بەلەمەکان هەر لەو ناوەدا لەنگەریان خستبوو. بێجگە لەمانە خەڵکانێکی زۆر لە هەموو لاوە لە هاتوچۆدا بوون و دەشیا لە هەر لایەکی کەنارەکەوە ببینن و سەرنجیان بۆ خۆی ڕابکێشێت. بێگومان هەر کەسێک بەتایبەتی بەرەو داوێنی ڕووبارەکە بێت و بوەستێت و شتێک فڕێ بداتە ئاوەکەوە، گومانی لێدەکرێت. خۆ ئەگەر پێستە چەرمینەکان بکەونە سەرئاو و نقوم نەبن، ئیتر دەبێت چی ڕوو بدات؟ هەڵبەتە ئەمە وا دەردەچێت،

---

[1] *Ekatrinsky*

هەموو کەسێک دەیبینێت، ئێستا بێجگە لەوانەیش هەموو ئەوانەی بەوێدا تێدەپەڕن، کە بەم دەگەن، پیایدا هەڵدەڕوانن، وەک ئەوەی بێجگە لە چاودێریکردنی ئەم کاری تریان نەبێت، ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری دەکردەوە: "ئەمە بۆ وایە، ڕەنگە من لای خۆمەوە وام بێتە بەرچاو؟"
سەرئەنجام ئەوەی بە بیردا هات کە ڕەنگە وا چاکتر بێت بڕوات بۆ دەوروبەری ڕووباری نیڤا: ئەویٚ هەم خەڵکی کەمترە و هەم دوورترە لە بینین، بەهەرحاڵ، فڕێدانی شتەکان لەویٚ ئاسانتر و دڵنیاترە و لە هەموویش گرنگتر ئەوەیە لەم شوێنەوە دوورە، کە کارەساتەکە تیایدا ڕووی داوە.
لەپڕێکدا سەری لەوە سووڕما کە چۆنە وا نیوسەعاتی تەواوە بە دەرد و نیگەرانییەکی زۆرەوە لەم جێگا پڕ لە مەترسییەدا وێڵ و سەرگەردان دەسووڕێتەوە و ئەم بیرەی ئێستای بۆ نەهاتووە.
هەروەها چۆن لەبەر ئەوەی جارێک لە خەودا یان لە کاتی وڕێنەدا بڕیارێکی داوە، وا ئێستا نیوسەعاتی تەواوە بە بێهودەیی دێت و دەچێت. ڕاسکۆلنیکۆڤ لەم دواییەدا خەیاڵی پەرت و گەلێک زوو شتی لەبیر دەکرد، خۆی هەستی بەمە کردبوو، بۆیە دەبوو هەنووکە زۆر پەلە بکات.
لە شەقامە بەرفراوانەکەی (ف..)ەوە بەرەو ڕووباری نیڤا بەڕیٚ کەوت، وەلیٚ لە ڕێگەدا بیرێکی تری بۆ هات: "بۆ نیڤا؟ بۆ ناو ئاو؟ ئایا وا باشتر نییە بڕوات بۆ شوێنێکی زۆر دوور، بۆ نموونە بۆ دوورگەکان، لەویٚ لە شوێنێکی زۆر چەپەک، لە شەخەڵێکدا، لەژێر دەوەنێکدا، هەموو شتەکان بخاتە چاڵێکەوە و درەختێکیش بکات بە نیشانە؟" هەرچەندە وای هەست دەکرد، کە ناتوانێت لەو چرکەساتەدا

داوەرییەکی باش و ڕوون بکات، بەڵام ئەم بیرۆکەیەی لا بێخەوش بوو.
وەلێ نەیتوانی بگاتە دوورگەکانیش، پێشهاتێکی تری هاتە سەر ڕێ: هەر ئەوەندەی لە شەقامە فراوانەکەوە گەیشتە گۆڕەپانەکە، لەناکاو لەلای چەپی خۆیەوە ڕاڕەوی حەسارێکی بینی، کە دیوارەکانی بچووکترین کون و ڕۆچنەیان تیا نەبوو، لەناو حەسارەکەدا، هەر یەکسەر لە دوای دەرگای دەرەوە، بە لای ڕاستدا، دیوارێکی قایمی بێسپیکاریی ماڵێکی چوارقاتی دراوسێ، زۆر درێژ ببووەوە، لەلای چەپیشەوە هەر بە ڕیزی دیوارەکەدا و ڕاست لە دوای ڕاڕەوەکەوە، دیوارێکی لەتەختەدروستکراو بە درێژایی بیست پێ لە ناوەوەی حەسارەکەدا درێژ بۆتەوە و بە لای چەپدا دادەگەڕێت. ئەوە شوێنێکی تەریکی بێڕۆچنە بوو، کە وردکەوپرتکەی ساختمانەکەیان تێ فڕێ دابوو. تۆزێک لەولاترەوە، لە کۆتایی دیوارەکەدا، لە پشت دیوارە تەختەکەوە، سووچی کەپرۆکەیەکی لەبەرددروستکراوی نزم و دووکەڵاویت بەرچاو دەکەوت، کە لە بەشێکی وەرشە دەچوو، ڕەنگە ئێرە شوێنی تایە و دارتاشی و شتی لەو بابەتە بێت، هەموو شوێنەکە، تا ڕادەیەک هەر لەبەر دەرگاکەوە تۆز و گەردی ڕەشی خەڵووزی گرتبوو. لەپڕا ڕاسکۆلنیکۆڤ وای بە بیردا هات: "چاکە شتەکان فڕێ بدەم و بۆی دەربچم".
لەبەر ئەوەی ڕاسکۆلنیکۆڤ کەسی لە حەسارەکەدا نەبینی، لە دەرگا گەورەکەی دەرەوە هاتە ژوورێ، هەر لەوێدا، لە نزیک دەرگاکەوە، ئاوەڕۆکەی بینی کە تەکی دابووە دیوارە تەختەکەوە، لەم دەزگایانەدا کە ئاسایی کرێکار، عەرەبانچی و لەو بابەتانەی تیا زۆر بن، ئەم شتانە هەن. لە سەرووی ئاوەڕۆکەوە، بە دیوارە تەختەکەوە، وەک

کارێکی ئاسایی، بە نووسینێکی تۆخ کە زیاتر بۆ گاڵتە بوو، نووسرابوو: "لێرەدا وەستان قەدەغەیە". ئێرە بە لایەنی کەمەوە ئەوەی باشە جێگای گومان نییە کە بۆ یەکێک هاتۆتە ژووریٚ و وەستاوە، پاشان جارێکی دی بەخۆی وتەوە:

"وا چاکە هەمووی لێرەدا هەڵرێژم و برۆم!"

کە ڕاسکۆلنیکۆڤ جارێکی تر تەماشای ئەملاوئەولای خۆی کرد و دەستی بۆ گیرفانی برد، لەپڕێکدا لە پاڵ دیوارەکەی دەرەوەدا، لە نێوان دەرگا و ئاوەڕۆکەدا کە مەترێک زیاتر نەبوو، چاوی بە بەردێکی گەورەی بیرازنەکراو کەوت، کە ڕەنگە بیستوپێنج کیلۆ کێشی بێت و ڕێک پاڵی دابووە دیوارە بەردینەکەی شەقامەکەوە. پشتی ئەم دیوارە شەقام و شۆستە بوو، دەنگی ئەو هاتوچۆکەرانە کە هەرگیز لەو شوێنانەدا کەم نابنەوە، بە چاکی دەبیسترا، بەڵام لە پشت دەرگاکەوە کەس ئەوی نەدەبینی، تەنیا مەگەر لە شەقامەکەوە بێتە ژوورەوە، دەشیا ئەمەیش ڕوو بدات، بۆیە پێویستی بە پەلەکردن بوو. ڕاسکۆلنیکۆڤ بەسەر بەردەکەدا چەمایەوە، بە هەردوو دەستی توند بەشی سەرەوەی گرت و هەموو هێزی دایە خۆی تا لە جێگاکەی جووڵاندی. بۆشاییەک کەوتە ژێر تاشە بەردەکە کە لە چاڵێکی بچووک دەچوو، بەپەلە هەرچییەکی لە گیرفاندا بوو، دەریهێنان و خستنیە چاڵەکەوە، جانتای پارەکە کەوتبووە سەر هەموو شتەکانی ترەوە، هێشتا چاڵەکە شتی تری دەگرت. پاشان بە بەردەکەدا نووسایەوە و بە تەکانێک وەک جارانی خۆی لێکردەوە، بەردەکە ڕێک وەک پێشووی لێهاتەوە. تەنیا ئەوە نەبێت کە کەمێک، زۆر کەم، بەرزتر لە جاران دەینواند، وەلیٚ ڕاسکۆلنیکۆڤ هەندێک خۆڵی بە دەوری بەردەکەدا کرد و بەپیٚ باش کوتایەوە، ئیدی هیچ دیار نەما.

ڕاسکۆلنیکۆڤ دوای ئەمە هاتە دەرەوە و ڕووی لە گۆڕەپانەکە کرد، جارێکی تر بەختەوەرییەکی یەکجار زۆر، وەک ئەو خۆشحاڵییەی لە نووسینگەی پۆلیسدا هەستی پێکرد، بۆ چرکەساتێک هەموو گیانی داگرت "ئاسەواری تاوانەکە هەمووی کەوتە ژێر خاکەوە، کێ ئەوەی بە بیردا دێت ژێر ئەو بەردە بگەڕێ؟ ڕەنگە بەردەکە لەو کاتەوە لەوێ بێت، کە ئەو ماڵە کراوە و ئەوەندەی تریش هەر لەوێدا بمێنێتەوە، ئەگەر بیشیدۆزنەوە، کێ گومان لە من دەکات؟ هەموو شتێک تەواو، کەسیش شایەت نییە بەسەرمەوە!" و دایە پێکەنین، بەڵێ، پاشان لە ئاییندەدا بیری لەوە دەکردەوە کە چەندە پێکەنینێکی پڕ لە تووڕەیی و بچووک و بێدەنگ و درێژخایەن بوو، تا ماوەیەک هەر پێکەنی: واتا بە درێژایی ئەو کاتەی بە گۆڕەپانەکەدا تێدەپەڕی، هەر پێدەکەنی. بەڵام کە گەیشتە شەقامی "ک"، ئەو شوێنەی سێ ڕۆژ لەوەوبەر تووشی کچەکە هاتبوو، لەپڕا پێکەنینەکەی بڕا، بیرۆکەی تر خزانە ناو مێشکییەوە، وای هاتە بەرچاو کە تێپەڕین بە لای ئەو سەکۆیەدا کە لەو کاتەدا، دوای ڕۆیشتنی کچە گەنجەکە لەسەری دانیشت و بیری کردەوە، زۆر قێزەونە، هەروەها زۆر ناخۆش دەبێت ئەگەر جارێکی تر تووشی ئەو سمێڵبابڕە ببێتەوە، کە لەو کاتەدا بیست کۆپیکی دایە، لەبەر خۆیەوە وتی: "نەفرەت لە شەیتان".

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە کاتی بەرێگەڕۆیشتنندا تووڕە و بێدەربەستانە لەملاوئەولای دەڕوانی، ئێستا هەموو بیری بە دەوری مەبەستێکدا دەسووڕا، کە بە لایەوە "مەبەستێکی سەرەکی" بوو، ئێستا، بەتایبەتی هەر ئێستا، تاقوتەنیا ڕووبەڕووی ئەو مەبەستە سەرەکییە ڕاوەستا، تەنانەت وای هەست دەکرد کە لە ماوەی ئەو دوو مانگەدا ئەمە یەکەمجارە وای بەسەر هاتبێت، لەپڕا لە هێرشی تووڕەبونێکی تونددا

بیری کردەوە: "نەفرەت لە هەموو ئەمانە: چاکە، ئەوەی ڕووی دا ڕووی دا، نەفرەت لەم ژیانە تازەیە: خودایا چ ژیانێکی دەبەنگانەیە.. ئەمڕۆ من چەندە درۆودەلەسەم کرد، بە چ ڕسواییەکەوە بەرانبەر ئیلیا پتروڤیچ ئەمڕۆ قسەی بێماناو ڕیاییم بەخەرج دا، بچووک بوومەوە، بەڵام ئەمەیش بێهودەییەکە بۆ خۆی، تف لە هەموو ئەوانە و لە ڕسوایی و دووڕوویی منیش! ئەمەیش گرنگ نییە، هیچ گرنگ نییە..!"

ڕاسکۆلنیکۆڤ لەناکاوێکدا وەستا، پرسیارێکی تازە، چاوەڕواننەکراوو تا ئەوپەڕی سادە گێژوویژی کرد: "ئەگەر هەموو ئەم کارانە بە ڕاستی ئاقڵانە کراون نەک گەوجانە، ئەگەر تۆ ئامانجێکی دیاریکراو و داڕێژراوت لەم کارەدا هەبووە، ئەی چۆن تا ئەم چرکەساتە تەنانەت تەماشای ناو جانتاکەت نەکردووە و نازانیت چیت دەستکەوتووە، لەبەر چی ئەم هەموو ئازارەت قبووڵ کردووە و ئەم کارە پیس و ناقۆڵا و سووکەت بۆ ئەنجام داوە؟ تۆ، هەر ئێستا دەتەویست ئەو جانتایە، بە هەموو ئەو شتانەوە کە تیایەتی و هێشتا نەتدیوون، فڕێ بدەیتە ئاوەوە، ئەم کارە چ مانایەکی هەیە؟"

بەڵێ، ئەمە وایە، هەمووی ڕاستە، پێشتریش هەر ئەمەی دەزانی و بە هیچ جۆرێک ئەم مەسەلەیە بۆ ئەو تازە نەبوو، ئەو کاتەی لە نیوەی شەودا بڕیاری دا شتەکان فڕێ بداتە ڕووبارەکەوە، بڕیارێکی تریشی دا: کە ڕێگە بە بچووکترین دوودڵی و بەرهەڵستی نەدا بۆ پەشیمانبوونەوە، بەڵکو تەواو ئاسایی و سروشتی، وەک ئەوەی دەبێت هەر بیکات و بێجگە لەمە چ ڕێگەیەکی تری نەبێت.. بەڵێ. ئەمانەی دەزانی و لەبیری بوو، ڕەنگە ئەم بڕیارەی دوێنێ دابێت، هەر

لەو دەقیقەیەدا کە لە پاڵ سندووقەکەدا دانیشتبوو قوتووەکانی لێ دەردەهێنا، بە ڕاستی هەروایە.
سەرئەنجام ڕاسکۆلنیکۆڤ جەختی لەسەر ئەوە کرد کە: "لەبەر ئەمەیە کە زۆر نەخۆشم، من خۆم ئازار و ئەشکەنجە داوە و خۆیشم نازانم چی دەکەم.. دوێنێ، سێ ڕۆژ لەمەوبەر.. هەموو ئەم ماوەیە ئازاری خۆمم دا و.. کە چاک ببمەوە، ئیتر.. ئازاری خۆم نادەم.. بەڵام ئەی ئەگەر هەر چاک نەبووم، ئەوسا چۆن؟ خودایا، چەندە لەم شتانە بێتاقەتم!"..
ڕاسکۆلنیکۆڤ بەبێ وەستان هەر دەڕۆیشت، زۆری حەز بەوە بوو هەر چۆنێک بێت، واز لەم بیر و لێکدانەوانەی بهێنێت، وەلێ نەیدەزانی چی بکات و چ بڕیارێک بدات، هەستی نوێ و نادیار بەردەوام بەرکی دەگرت، ئەم هەستە نەفرەتییە بێکۆتاییە، نەفرەتێکی سەخت و ڕقاوی بوو بەرانبەر بەو شتانەی کە دەیبینی و لە دەوروبەریدا بوون. هەموو ئەو کەسانەی بە بەردەمیدا تێدەپەڕین، لەبەرچاویدا پیس و ناپاک بوون. تەنانەت شێوەی ڕێڕۆیشتن و هەڵسوکەوتیان ناپاکانە دەهاتنە بەرچاو، بە جۆرێک، کە ئەگەر یەکێک لەوانە سەری قسەی لەگەڵدا بکردایەتەوە، ئەو یان تفی لە دەموچاوی دەکرد یان گازی لێدەگرت..
کە گەیشتە کەناری "نیڤای بچووک" و پاڵ ئەو پردەی کە لە دوورگەی "فاسیلوسکی"دا بوو، لەپڕێکدا وەستا و بیری کردەوە: "لێرەدا دەژی، لەم ماڵەدا، یەعنی چی؟ پێدەچێت بەپێی خۆم هاتبێتم بۆ لای ڕازومیخین، دیسانەوە قەوانەکەی جارانە.. بەڵام دەبێت لەم لایەنەوە ئەوە بزانم کە من خۆم بە دەستی ئانقەست هاتوومەتە ئێرە، یان هەر بەدەم ڕێوە ڕێکەوت هێناومی؟ جیاوازیی نییە، سێ ڕۆژ پێشتر

وتبووم دوای تەواوکردنی کارەکە دەڕۆم بۆ لای.. باشە چ خەوشی نییە، ئێستا دەڕۆم، وەک ئەوەی من ئێستا توانای سەردانیم نەبێت.."

ڕاسکۆلنیکۆڤ سەرکەوتە قاتی پێنجەم بۆ لای ڕازومیخین، ڕازومیخین لە ژوورە چکۆلەکەیدا بوو، لەو کاتەدا سەرقاڵی کار و نووسین بوو، خۆی دەرگاکەی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کردەوە، ئەوان چوار مانگ بوو یەکتریان نەدیبوو، ڕازومیخین بە بیجامەیەکی کۆنەوە، بە پێڵاوێکی بێگۆرەوی و سەروقژێکی بژ و دەست و دەموچاوی نەشۆراوەوە، لە ژوورەکەیدا دانیشتبوو، کە تەماشای سەرتاپای هاوڕێ تازەگەیشتووەکەی کرد، سەری سووڕما و هاواری لێهەستا:

-چیتە؟

پاشان بێدەنگبوو، فیکەیەکی لێدا و بەدەم تەماشاکردنی جلەکانی ڕاسکۆلنیکۆڤەوە لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

- یەعنی حاڵ و بارت ئەوەندە خراپە؟ هاوڕێ، تۆ لە ئێمەیش دواکەوتووتری، دەی دابنیشە. بێگومان ماندوویت؟

کە ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەر قەنەفە لەمشەماگیراوەکە دانیشت، کە لە قەنەفەکەی خۆی خراپتربوو، لەناکاوا ڕازومیخین وتی:

- بەڕاستی تۆ نەخۆشیت، دەزانیت؟

بەدەم قسەکردنەوە نەبزی دەستی گرت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ دەستی بەردا و وتی:

- پێویست ناکات، من هاتووم.. دەزانیت، من وازم لەوانەوتنەوە هێناوە.. دەمویست.. بەڵام نا، من پێویستم بە وانەوتنەوە نییە.

ڕازومیخین کە لێی ڕامابوو، وتی:

- دەزانیت؟ تۆ وڕێنە دەکەیت!

- نەخێر، وڕێنە ناکەم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەر قەنەفەکە هەستا، ئەو کاتەی لە قالدرمەکان سەردەکەوت، هیچ لە بیری ئەوەدا نەبوو کە دەبێت ڕووبەڕووی هاوڕێکەی بێتەوە، ئێستا، لە چاوتروکانێکدا، بەپێی ئەزموون لەوە تێگەیشت کە لەم چرکەساتەدا، لە هەموو شت کەمتر حەزی لە ڕووبەڕووبوونەوەی کەسێکە. ڕقوکینەی سەرکەوت، هەر ئەو کاتەی هاتە ژوورەکەی ڕازومیخینەوە، خەریک بوو ئەو ڕقەی کە لە خۆی بووەوە/بیخنکێنێت، بەپەلە بەرەو لای دەرگاکە ڕۆیشت و وتی:

- خواحافیز.

- ڕاوەستە، مەڕۆ، تۆ کابرایەکی سەیریت!

ڕاسکۆلنیکۆڤ جارێکی دی دەستی دەرهێنا و وتی:

- نا، پێویست ناکات.

- باشە، ئەی بۆ هاتیت! تۆ شێت بوویت؟ ئاخر ئەمە لە سووکایەتیپێکردن دەچێت، من هەر ئاوا وازت لێناهێنم و ناهێڵم بڕۆیت.

- باشە، کەواتە گوێ بگرە، من هاتوومەتە لای تۆ، چونکە بێ لە تۆ کەسی تر ناناسم، کە بتوانێت.. هاوکاریم بکات.. چونکە تۆ لە هەموو ئەوانی دی میهرەبانتری، واتا ئاقڵتری و دەتوانیت داوەری بکەیت.. بەڵام ئێستا وا تێدەگەم پێویستم بە هیچ نەبێت، گوێت لێمە؟ هیچ شتێک.. هیچ دڵسۆزی و کۆمەکێک.. من خۆم.. بە تەنیا، کارەکانم.. چاکە، بەسە، لێم گەڕێ.

- یەک دەقیقە ڕاوەستە، ناپەسەند، تۆ تەواو شێت بوویت، من کارم بەوەوە نییە، وەلێ بڕوانە: من ئێستا وانەوتنەوەم نییە، قیروسیا کە نیمە، بەڵام لە بازاڕدا کتێبفرۆشێک هەیە بە ناوی خیروڤیموف[1] کە

---

[1] *Kherouvimof*

خۆی له خۆیدا جۆره وانەیەکی چاکە، من ئەوە نادەم بە پێنج وانەی ژووری بازرگانی، ئەو بڵاوکەرەوەیە، کتێبی بچووکی زانستە سروشتییەکان بڵاو دەکاتەوە، ئەو کتێبانە ئەوەندە دەفرۆشرێن، کە بەخەیاڵتا نایەت، تەنیا ناونیشانەکەیان دنیایەک نرخی هەیە. تۆ هەمیشە جەخت لەسەر ئەوە دەکەیت کە من کابرایەکی دەبەنگم، بەڵام هاوڕێ، بە خودا لە منیش دەبەنگتر هەیە، ئەو ئێستا کەوتۆتە دنیای ماقووڵ و مەسەلە کۆمەڵایەتییەکانیشەوە، خۆی هیچ نازانێت، بەڵام من هانی دەدەم لەسەر کارەکە بەردەوام بێت، بۆ نموونە ئەم دوو پەڕە و نیوە دەقێکی ئەڵمانییە، کە بە باوەڕی من تا بڵێی باسێکی بێنرخە، بە کورتی، باسەکە لەبارەی ئەوەوەیە کە ئایا ژن مرۆڤە یان نا؟ بێگومان زۆر چاک دەیسەلمێنێت کە ژن مرۆڤە. خێروڤیموف بە بۆنەی کێشەی ژنانەوە ئەمە ئامادە دەکات و من وەریدەگێڕم، ئەم دوو دەفتەر و نیوە درێژ دەکاتەوە بۆ شەش دەفتەر، ناونیشانێکی گەورەی بۆ دادەنێین کە نیولاپەڕە داگیر بکات، هەر بەرگێکی دەفرۆشین بە نیوڕۆبڵ، دەفرۆشرێت هەر دەفتەرێک شەش ڕۆبڵ مافی وەرگێڕان بە من دەدات واتا بە تەواوی پانزە ڕۆبڵم بەردەکەوێت، کە شەشیانم پێشەکی وەرگرتووە، کە ئەمەمان تەواو کرد، باسێک لەبارەی ئەسپی دەریاوە وەردەگێڕم، بێجگە لەمانە لە بەشی دووەمی "دانپیانان"دا هەندێک گفتوگۆ و قسەی بێتاموبۆ هەن، کە دەستنیشانمان کردووە و وەریاندەگێڕین، یەکێک بە خێروڤیموفی وتوە کە "ڕۆسۆ" لە هەندێک بۆچووندا "رادیشچیف"[1]ەکەی خۆمانە، منیش دیارە خۆم ناکەم بە خاوەنی و هیچی لەبارەوە ناڵێم، جیر بە

---

[1] Radishchef نووسەرێکی کۆتایی سەدەی هەژدەی ڕووسیایە.

جەهەنەم، باشە، دەتەوێت بەرگی دووەم کە بە ناوی "ئایا ژن مرۆڤە یان نا؟" وەربگێڕێت؟ ئەگەر دەتەوێت، هەر ئێستا دەقەکە و قەڵەم و کاغەزت لەبەردەستایە.. هەموو ئەمانە لەسەر ئەرکی ئەوە، سێ ڕۆبڵیش هەڵگرە، چونکە من هەموو پارەی وەرگێڕانەکەم بۆ بەرگی یەک و دوو، پێشەکی وەرگرتووە، بەم جۆرە تۆ سێ ڕۆبڵی تەواوت بەردەکەوێت، کە ئەم پەڕانەی تریشت تەواو کرد، سێ ڕۆبڵی ترت بەردەکەوێت. داوایەکی تریشم هەیە، تکایە ئەم کارەی من بۆ تۆی دەکەم، بە خزمەتی مەزانە، بە پێچەوانەوە، تۆ کە هاتیتە ژوورەوە، من یەکسەر ئەوەم بە خەیاڵدا هات کە چۆن بتوانم کەڵکت لێ وەربگرم، یەکەم، من لە ڕێنووسدا لاوازم، دووەم لە زمانی ئەڵمانیدا هەندێکجار تەواو وێرانم، تا ئەو ڕادەیەی کە خۆم شت دروست دەکەم و وای دادەنێم ئەوەی خۆم لە دەقەکە چاکترە. وەلێ لە ڕاستیا کێ ئەوە بە چاکتر دەزانێت، ڕەنگە خراپتر بێت.. باشە، دەڵێی چی، قبووڵتە یان نا؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەنگ دەقی وتارە ئەڵمانییەکەی هەڵگرت، بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت، سێ ڕۆبڵیشی هەڵگرت و دەرپەڕی. ڕازومیخین بە واقوڕماوییەوە لە دواوە تەماشای دەکرد. کە ڕاسکۆلنیکۆڤ گەیشتە قاتی یەکەم، کتوپڕ بۆ ژوورەکەی ڕازومیخین، گەڕایەوە، لە پلیکانەکان سەرکەوت، دەقە ئەڵمانییەکە و سێ ڕۆبڵەکەی خستەوە سەر مێزەکە، دیسانەوە، بەبێ ئەوەی چرکەی لێوە بێت، چووە دەرەوە، ڕازومیخین لە تووڕەییدا ئاگای لە خۆی بڕا و هاواری لێکرد:

- ئەرێ تۆ سەرخۆشی یان تا گرتووتی؟ کردووتەتە گاڵتەجاڕ! خەریکە منیش شێت دەکەیت.. باشە، بۆ هاتیتەوە، شەیتان؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە لەو کاتەدا بە پلیکانەکاندا دەچووە خوارێ، لەسەرخۆ وتی:

- پێویستم بە وەرگێڕان نییە.
ڕازومیخین لە سەرەوە هاواری لێهەستا:
-ئەی چ بەڵایەکت گەرەکە؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بەبێ وەڵامدانەوە هەر دەڕۆشت.
- گوێ بگرە، ماڵەکەت لە کوێدایە؟
وەڵامی نەدایەوە.
- کەواتە، چاوت دەردەهات.
ڕاسکۆلنیکۆڤ ئیدی کەوتبووە سەر شەقامەکە، لەسەر پردی "نیکۆلافسکی" بە هۆی ڕووداوێکی ناخۆشەوە، جارێکی تر هاتەوە سەرخۆی: گالیسکەوانێک قامچییەکی قایمی بە پشتیدا کێشا، لەبەر ئەوەی گالیسکەوانەکە چەند جارێک هاواری لێکردبوو، خەریک بوو ڕاسکۆلنیکۆڤ بکەوێتە ژێر پێی ئەسپەکانەوە. قامچییەکە ئەوەندە بەزەبر بوو، کە ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تووڕەییەوە بەرەو لای پلیکانەکان تێی کێشا (لە ڕاستیا نەتدەزانی بۆ ناوەڕاستی پردەکەی گرتبوو، واتا ئەو شوێنەی کە بۆ هاتوچۆی هۆییەکانی گواستنەوە دانرابوو نەک بۆ پیادەڕەوی) هەر بەو ڕقەوە ددانی بەجیڕ هێنا. بێگومان لەملاوئەولایشیەوە هەرا و پێکەنین بەرز بووەوە.
- دەستی خۆش بێت..
- دیارە گیرفانبڕە.
- بێگومان، خۆی کردووە بە سەرخۆش و بە تایبەتی خۆی فڕێ دەداتە ژێر دەست و پێی ئەسپەکان بۆ ئەوەی شتێکی دەست بکەوێت، دە وەرە و قسەی لەگەڵدا بکە!
- ئەمانە هەر کاریان ئەمەیە جەناب، بازرگانییەکە بۆ خۆی!

بەڵام لەو کاتەدا کە لە پاڵ پلیکانەکاندا وەستابوو، هێشتا لە دواوە نیگایەکی بێمانا و پڕ لە کینەی گالیسکەکەی دەکرد کە وردەوردە دوور دەکەوتەوە، دەستی بۆ پشتی خۆی برد، لەپڕێکدا هەستی کرد یەکێک پارە دەنێتە مشتیەوە. بینی ژنێکی بازرگانی بەتەمەنە بە کڵاو و پێڵاوی تایبەتیەوە، کچێکی کڵاوبەسەری گەنجی لەگەڵدا بوو، چەترێکی سەوزی بە دەستەوە بوو، لەوە دەچوو کچی خۆی بێت، ژنەکە وتی:

- هاوڕێی بەڕێز، بیکە بە خاتری مەسیح لێم وەربگرە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ پارەکەی لێ وەرگرت و دوانەکەیش بە پاڵیا تێپەڕین.

پارچە دراوێکی زیویی بیست کوپیکی بوو، بە سیما و جلەکانیدا هەقیان بوو بە هەژاری بزانن، هەژارێک کە لەسەر شەقامەکان سواڵ دەکات. بەڵام ڕاسکۆلنیکۆڤ زۆر باش لەوە گەیشت کە بیست کۆپیک لە تۆڵەی ئەو قامچییەدا بوو کە بەر پشتی کەوت و سۆزی ژنەکەی جووڵاند.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بیست کۆپیکەکەی لە ناو مشتیا توند گوشی. دە هەنگاوێک چووە پێشتر، پاشان ڕووی لە ڕووباری نیڤا و کۆشکی سەڵتەنەتی کرد. ئاسمان بەبێ گەواڵە هەور و ڕەنگی ئاوەکەیش تا ڕادەیەک شین بوو، ئەوەی بە دەگمەن لە ڕووباری نیڤا چاوەڕێ دەکرا، گومەزی کەنیسەکەش لە هیچ جێگایەکی ترەوە بەم جۆرەی ئێستای لای پردەکەوە بە باشی نەدەبینرا، واتا لەو جێگایەوە کە بیست هەنگاوێک لە پەرستگاکەوە بەرچاو دەکەوت و سەرنجڕاکێش بوو، هەروەها درەوشانەوەیەکی تایبەتی ئەوەندە بێگەردی هەبوو، کە بە چاکی جوانکارییەکانیت دەبینی. ئازاری قامچییەکە نەما و ڕاسکۆلنیکۆڤ لێدانەکەی فەرامۆش کرد. تەنیا بیرۆکەیەکی ناخۆش و

بزۆک سەری تێکردبوو. هەر بەو شێوە وەستانەوە ماوەیەک لە ئاسۆی دوور ڕاما: بە شوێنەکە ئاشنا بوو، ئەو کاتانەی دەچوو بۆ زانکۆ، ئەو کاتانەیش کە ئاسایی دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، ڕەنگە سەد جار ئەوەی پێش هاتبێت کە هەر لە هەمان جێگادا بە تایبەتی وەستابێت و تەماشای ئەو دیمەنە جوانەی کردبێت. هەموو جارێکیش هەستێکی نادیار هەژاندبێتی، هەمیشە کە لەو دیمەنە ڕامابێت، هەستی بە سۆزێکی نامۆ کردبێت، ئەم دیمەنە شکۆدارە بۆ ئەو وەک ڕۆحێکی مردوو وایە، کە نەدەبیستێ و نەدەژنەوێ. هەموو جارێکیش سەیری بەو هەستە غەمگین و بە نهێنییەی خۆی دەهات، لەبەر ئەوەیش کە لە خۆی دڵنیا نەبوو، وای دادەنا کە لە داهاتوویەکی دووردا دەرکی پێدەکات. ئێستا، لەپڕێکدا زۆر بە ڕوونی ئەو پرسیار و سەرسوورمانانەی ڕابووردووی خۆی هاتەوە یاد و زانیی بە یادهێنانەوەی ئەوانە ڕێکەوت نییە. هەر ئەو وەستانەی لە هەمان شوێنی پێشوودا، بۆ خۆی جێگای سەرسوورمان بوو، تۆ بڵێی وا بزانێت کە ئێستایش دەتوانێت بە هەمان شێوازی جاران بیر لەو مەسەلە و دیمەنانە بکاتەوە، کە ئەوسا سەرقاڵیان دەکرد و سەرنجیان ڕادەکێشا. لەوەدابوو پێبکەنێت، بەڵام بە شێوەیەکی زۆر ناخۆش دڵی گیرا. هەموو ڕابووردوو، واتا بیروبۆچوونی ڕابووردووی و ئەو کێشە و مەسەلانەی پێشووی و سۆز و هەستەکانی ئەو ڕۆژگارانە، هەموو ئەم دیمەنانە و تەنانەت خۆیشی، دەتوت هەر هەموو ئەمانە، هەنووکە لە بن چاڵێکی هەرە قووڵدا، لە خوارەوە، لەژێر پێیدا، بە زەحمەت دەردەکەوتن، وەک ئەوەی هەموو بەرەو ئاسمان باڵ بگرن و لەبەرچاوی ون بن.. کە لەناکاوێکدا و بەبێ مەبەست دەستی خۆی ڕاوەشاند، لە ناو مشتە نووقاوەکەیدا

هەستی بە بیست کوپیکیەک کرد، مشتی کردەوە و لە پارەکەی ڕوانی، پاشان دەستی بڵند کرد و پارەکەی فڕێ دایە ناو ئاوەکەوە، ئینجا گەڕایەوە و بەرەو ماڵەوە کەوتە ڕێ، لەو کاتەدا وای هاتە بەرچاو کە بە مقەست هەموو پەیوەندییەکی نێوان خۆی و خەڵک و گشت دنیای بڕیووە.

کە گەیشتەوە ماڵەوە، شەو داهاتبوو، واتا شەش سەعاتی ڕێک ڕێگەی بڕیووە، چۆن و لە کوێوە گەڕاوەتەوە، هیچی لەبیر نەمابوو، جلەکانی داکەند، لە حاڵێکدا کە وەک ئەسپێکی تواناڵەبەربڕاو دەلەرزی، لەسەر قەنەفەکە ڕاکشا، پاڵتۆکەی بە خۆیدا دا و زۆر زوو ئاگای لە دنیا بڕا..

دنیا تەواو تاریک بوو کە لە دەنگێکی ناخۆش بەئاگا هات. خودایا، ئەم هاوارە چی بوو! دەنگ و ناڵەیەکی ئەوەندە ناسروشتی، زایەڵە و پاڕانەوە و گریان و لێدان و جوێنی لەو بابەتە، هەرگیز لە ژیانیدا نەبیستبووی و نەبینیبووی. تەنانەت نەیدەتوانی دڕندایەتی و شێتێتییەکی لەو جۆرە بهێنێتە بەرچاوی خۆی.. زۆر ترسناک. هەر بەدەم ڕەنج و هەراسی دڵییەوە لەسەر جێگاکەی هەستا. بەڵام تا دەهات بگرەوبەردەو ناڵە و جمێنەکان دەیاندایە زیادی. لەپڕێکدا زۆر بە سەرسووڕماوییەوە دەنگی خاوەن ماڵەکەیانی ناسی، کە چۆن وەک ئاژەڵێک دەیقروسکاند و هاواری دەکرد و خێرا خێرا ڕستەگەلێکی دووبارە دەکردەوە کە هەرگیز لە وشەکانی نەدەگەیشتی.

تەنیا ئەوەندەت دەزانی کە دەپاڕایەوە بۆ ئەوەی دەست لە لێدانی هەڵگرن، چونکە زۆر بێبەزەییانە لای پلیکانەکانەوە لێی دەدرا. دەنگی ئەو کەسەی کە لێی دەدا، ئەوەندە تووڕە و ڕکاوی بوو، کە گڕوکرخ بوو. لەگەڵ ئەمانەیشدا ئەویش هەر بەپەلە و بەدەم هەناسەبڕکێوە

شتگەلێکی بێمانای دەوت. لەپڕێکدا ڕاسکۆلنیکۆڤیش وەک گەڵای دار لەرزی، چونکە دەنگەکەی ناسی. ئەمە دەنگی ئیلیا پتروڤیچ بوو، ئیلیا پتروڤیچ لێرەیە و لە ژنە خاوەنماڵەکە دەکوتێ، بە لەقە لێی دەدا و سەری بە پلیکانەکاندا دەکێشێت، ئەمە ئاشکرایە و لە دەنگی لێدان و گریانەوە هەموو شتێک دەردەکەوێت. یەعنی چی، بۆ دنیا سەروبن بووە؟

بە ئاسانی گوێت لێدەبوو کە لە هەموو نهۆمەکان و سەر پلیکانەکانەوە خەڵکی کۆ ببوونەوە، دەنگی جۆراوجۆر و سەیر دەکەوتە بەر گوێ، خەڵکەکە سەردەکەوتن، لە دەرکیان دەدا، دەرگاکانیان پێکدادەدا و خەڵکی تریان پێوە دەنیشت. ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تەواوی سەرسامییەوە دەیوتەوە: "ئاخر بۆ؟ چۆن دەبێت؟ شتی وا دەبێت؟" زۆر بە جیدی هاتبووە سەر ئەو ڕایەی کە بەتەواوی شێت بووە، بەڵام نا، زۆر بە ئاشکرا گوێی لێبوو.. بێگومان هەر دێنە سەر و سۆراغی ئەمیش "چونکە.. بێگومان هەموو ئەمانە بەڵگەن.. بۆ کارەساتەکەی دوێنێ.. خودایا!" ویستی دەرگاکە کلۆم بکات، بەڵام دەستی بەرز نەبووەوە.. ئەوەیش بێسوود بوو، ترس هەموو گیانی کردبووە سەهۆڵبەندان، ئازاری دەدا و سڕی کردبوو.. وەلێ وردەوردە هەراوزەناکە کە ماوەی دە دەقیقەی خایاند، هێور بووەوە. هێشتا خاوەن ماڵەکە دەلالایەوە، ئیلیا پیتروڤیچیش هەر هەڕەشەی دەکرد و جوێنی دەدا.. تا ئەویش کڕبوو، ئیدی گوێت لە دەنگی نەبوو "بەڕاست ڕۆشتووە! خودایا!" خاوەن ماڵەکەیش دوور کەوتۆتەوە، بەڵێ.. ئەگەرچی هێشتا دەگری و دەناڵێنێ.. ئا.. ئەوە دەرگای ژوورەکەیشی داخرا.. خەڵکەکە بە پلیکانەکاندا بەرەو ئاپارتمانەکانیان بڵاوەی لێدەکەن، ئاخ هەڵدەکێشن، لێک دەدەن، هاوار لە یەکتر دەکەن،

هەندێکجار دەنگیان دەبێتە هاوار و جاری دی دەکەونە ناڵەوزاری، پێدەچێت ژمارەیان زۆر بووبێت، ڕەنگە گشت دانیشتوانی ساختمانەکە بووبن، وەلێ خودایا، دەشێت شتی وا بێت! ئاخر لەبەرچی و ئەم کابرایە بۆ هاتۆتە ئێرە!"

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە بێزارییەوە خۆی دایەوە بەسەر قەنەفەکەدا، وەلێ ئێدی نەیتوانی چاوی لێک بنێت، نزیکەی نیوسەعاتی بە ئازار و هەستێکی ترسناکەوە، کە هەرگیز تا هەنووکە بە خۆیەوە نەدیبوو، بەسەر برد. لە پڕێکا پرشنگێک ژوورەکەی ڕووناک کردەوە: ناستاسیا بە مۆمێک و قاپێک شۆرباوە هاتە ژوورەوە، دوای ئەوەی بە وردی تەماشای ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد و زانی نەنوستووە، مۆمەکەی لەسەر مێزەکە دانا و دەستی کرد بە دانانی ئەو نان و خوێ و قاپ و کەوچکەی کە لەگەڵ خۆیدا هێنابوونی.

- بێگومان لە دوێنێوە هیچت نەخواردووە، تەواوی ڕۆژەکە لە هاتوچۆدا بوویت و تایش سووتاندوویتی.

- ناستاسیا.. بۆ لە خاوەن ماڵەکەیان دەدا؟

ژنەکە چاوی تێبڕی و وتی:

- کێ لە خاوەن ماڵەکەی دەدا؟

- ئێستا، نزیکەی نیو سەعات لەمەوبەر، ئیلیا پتروڤیچی یارمەتیدەری لێکۆڵەرەوە، لەسەر پلیکانەکان.. بۆ بەو جۆرە لە ژنە خاوەن ماڵەکەی دا و.. بۆ هاتبووە ئێرە؟

ناستاسیا بێدەنگ و بۆ ماوەیەک ناوچاوی دا بەیەکدا و هەروا لێی ڕاما، ڕاسکۆلنیکۆڤ لەم ڕوانینە کونپشکنییە زۆر بێتاقەت بوو، تەنانەت ترسا، پاشان بە دەنگێکی لاواز و لەسەرخۆ وتی:

- ناستاسیا بۆ بێدەنگ بووی؟

ناستاسیا لەسەرخۆ، وەک ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بدوێت، وەڵامی دایەوە:

- ئەمە خوێنە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕەنگی هەڵبزڕکا، خۆی بەرەو لای دیوارەکە بەکێش کرد و لەبەر خۆیەوە وتی:

- خوێن!.. خوێنی چی؟

ناستاسیا بێدەنگ، هەر تەماشای ئەوی دەکرد، تا دوایی دیسانەوە بە دەنگێکی توند و سەختەوە وتی:

- کەس لە خاوەن ماڵەکەی نەداوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ تەماشای دەکرد و بە زەحمەت هەناسەی دەدا، ئەوسا بە دەنگێکی لەسەرخۆتر لە پێشوو وتی:

- من خۆم گوێم لێبوو.. نەخەوتبووم، دانیشتبووم، ماوەیەک گوێم گرت.. یارمەتیدەری لێکۆڵەرەوەکە هاتبوو.. هەموو لەسەر پلیکانەکان کۆ ببوونەوە، لە هەموو ئاپارتمانەکانەوە..

- کەس نەهاتبوو، ئەوە خوێنی خۆتە هاوار دەکات، کاتێک خوێن ڕێی هاتنەدەرەوەی دەگیرێت و هێرش بۆ جگەر دەبات، ئەو کاتە دەداتە مێشک و خەون و خەیاڵاتی پێدەکات،.. چاکە، ئێستا دەخۆیت یان نا؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی نەدەدایەوە، ناستاسیا هەر بە سەریەوە وەستابوو، لێی ورد دەبووەوە و نەدەڕۆشت.

- ناستاسیا گیان.. ئاوم بدەرێ.

ناستاسیا چووە خوارێ و دوای دوو دەقیقە شەربەیەکی سپیی پڕ لە ئاوی هێنا و گەڕایەوە، وەلێ ڕاسکۆلنیکۆڤ ئیدی نەیزانی چی ڕووی دا، تەنیا ئەوەی لەبیر بوو کە قومێکی لە ئاوە ساردەکە نۆشی و

ئەوی تری ئاوی ناو شەربەکەی کرد بە سەر سنگی خۆیدا، پاشان بێهۆش کەوت.

## ٣

ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەوە نەبوو کە بە درێژایی نەخۆشییەکەی هۆشی لەدەست دابێت، نۆرەتایەکی توندی دەهاتێ لەگەڵ وڕێنە و نیمچەبێهۆشییەک. دوایی گەلێک لەو شتانەی بیر کەوتەوە، هەندێکجار وای دەهاتە پێشچاو کە خەڵکێکی زۆر دەوریان داوە و هەموو دەیانەوێت بیگرن و بۆ جێگایەکی بەرن، لە بارەیەوە لە گفتوگۆدان و مشتومڕیانە، جاری دی، لەپڕا تاقوتەنیا لە ژوورەکەدا دەمێنێتەوە، هەموویان دەڕۆنە دەرەوە، چونکە لێی دەترسن، جارجارە کەمێک دەرگاکە دەکەنەوە و لێی دەڕوانن، دەکەونە هەڕەشە لێی و لە نێوان خۆیاندا پلانی لێدەگێڕن، پێدەکەنن و گاڵتەی پێدەکەن.

ڕاسکۆلنیکۆڤ یاد لە ناستاسیا دەکات، کە زۆرجار لە پاڵ خۆیدا دەیبینێت، یەکێکی تریش هەروا، گوایا زۆر ئاشنای بووە، بەڵام ئەو کەسە کێیە؟ بە هیچ جۆرێک نەیدەتوانی ئەوە بزانێت، لەم لایەنەوە ئازاری دەچەشت و تەنانەت دەگریا، جار هەبوو وایدەزانی مانگێکی ڕێکە خەوتووە، جاری تر بە ڕۆژێکی دووروودرێژی ناودێر دەکرد. بەڵام "ڕووداوەکە"، ئەو ڕووداوەی بە تەواوی فەرامۆش کردبوو، هەمیشەیش لەبیری ئەوەدا بوو کە مەسەلەیەکی فەرامۆش کردووە، کە نابێت فەرامۆش بکرێت. بۆ بەیادهێنانەوەی ڕەنج و ئازاری دەکێشا، دەیناڵاند، تووشی ڕق و تووڕەیی و ترس و هەراسانی دەهات. لەو کاتانەدا دەیویست لە جێگاکەی هەستێت، دەیویست ڕابکات، وەلێ هەمیشە یەکێک بە زۆر ڕێی لێدەگرت و دووبارە

وەڕزی دایدەگرت و بێهۆش دەکەوتەوە، پاشان بە تەواوی دەهاتەوە هۆش خۆی.

سەعات دەی سەرلەبەیانییەک ئەمەی بەسەر هات، ئەو بەیانییە لە ڕۆژە بێگەردەکان بوو، بەردەوام هەتاوەکە بە شێوەی هێڵێکی پانودرێژ ڕاست دەکەوتە سەر دیوارەکە و سووچێکی لای دەرگاکەی ڕووناک دەکردەوە، ناستاسیا و یەکێکی تر، کە زۆر کونپشکنیانە لەمی دەڕوانی و کەسێکی نەناس بوو. لە پاڵ قەرەوێڵەکەیدا وەستابوون، ئەم کەسە لاوێکی چاکەتلەبەری ڕیش تەنک بوو، زیاتر لە کارگوزارێک دەچوو، لە دەرگا نیوەکراوەکەی خاوەن ماڵەکەوە تەماشای ناوەوەی دەکرد، ڕاسکۆلنیکۆڤ کەمێک جووڵا و بەدەم ئاماژەکردنەوە بۆ لاوەکە، پرسی:

- ناستاسیا، ئەوە کێیە؟

ناستاسیا وتی:

- ئاخری هاتەوە هۆش خۆی!

لاوە کارگوزارەکە قسەکەی پەسەند کرد:

- بەڵێ، هاتەوە هۆش خۆی.

خاوەن ماڵ کە لە درزی دەرگاکەوە دەیڕوانی، هەر ئەوەندەی کە زانی هاتۆتە هۆش خۆی، دەرگاکەی زوو داخست و ونبوو، هەمیشە کەمڕوو بوو، بە زەحمەت دەیتوانی گفتوگۆ یان شت ڕوون بکاتەوە، تەمەنی نزیکی چل ساڵ، قەڵەو، چاووبرۆ ڕەش و بە هۆی قەڵەوی و تەمبەڵییەوە، میهرەبان و تەنانەت زۆر ڕۆحسوک بوو، بەڵام تا ڕادەیەکی زۆر شەرمن بوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕووی لەلاوەکە کرد و پرسی:

- تۆ کێیت؟

وەلێ لەم کاتەدا جارێکی دی دەرگاکە بە تەواوی کرایەوە و ڕازومیخین کە کەمێک خۆی دانەواندبوو، لەبەر ئەوەی بالای زۆر بەرز بوو، هاتە ژوورەوە و بەدەنگی بەرز وتی:

- هەر دەڵێی ژووری ناو کەشتییە، هەمیشە بەرتەوێڵم دەکەوێت، ئاخر بەمەیش دەڵێن ئاپارتمان! دەی، هاوڕێ، هاتوویتەتەوە سەر خۆت؟

پاشنکا[١] ئێستا پێی وتم

ناستاسیا وتی:

- هەر ئێستا هاتەوە سەر خۆی.

کارگوزارە لاوەکە بە زەردەخەنەیەکەوە وتییەوە:

- بەڵێ، هەر ئێستا هاتۆتەوە سەر خۆی.

ڕازومیخین لەپڕا ڕووی لە کارگوزارەکە کرد و وتی:

- بەلام تۆ کێیت؟ من دەبینیت، من ناوم ڤراز و میخینە، نەک ڕازومیخین، کە هەمووتان بە هەڵە وام پێدەڵێن، بەڵێ ڤرازومیخین، خوێندکار و کوڕە خانەدانم و ئەویش هاوڕێمە، باشە، ئەی جەنابتان کێن؟

- من لە نووسینگەی خۆماندا کار دەکەم، لە لایەن شلوپایفی[٢] بازرگانەوە بۆ کارێک هاتوومەتە ئێرە.

- فەرموو لەسەر ئەو کورسییە دابنیشە.

---

[١] پاشنکا، یان (پاشا) ناوە چکۆلەی باراسکیفا، براسکوفیایە کە لەبەر ناز و خۆشەویستی پێی دەوترێت براسکوفیا. خاوەنی ئەوماڵەیە کە ڕاسکۆڵنیکۆفی تیا دەژی —و—

[٢] *shelopayef*

خودی ڕازومیخینیش لەسەر کورسییەکی ئەودیوی مێزەکەوە دانیشت، ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و لەسەر قسەکانی ڕۆشت:
- تۆیش هاوڕێ، چاکت کرد هاتیتەوە هۆش خۆت، ئەمە چوارەم ڕۆژە بە زەحمەت شتێک دەخۆی یان دەخۆیتەوە، باوەڕ بکە بە کەوچک چایان دەدایتێ، من دووجار زوسیموفم[1] هێناوەتە سەرت، لە بیرتە؟ زوسیموف زۆر بە وردی فەحسی کردیت و وتی هیچ نییە و ڕەنگە شتێک بەر سەرت کەوتبێت، بارێکی نالەباری دەمارگیرییە، تووشی بەدخۆراکی بوویت، دەڵێت بیرە و خەرتەلەیان کەم داویتێ، نەخۆشییەکەت هی ئەوەیە. وەلێ گرنگ نییە، زوو تێدەپەڕێت، ئافەرین زوسیموف، سەرەتایەکی باشی دەست پێکردووە بۆ چارەسەرکردن.
پاشان جارێکی تر تەماشای لاوەکەی کردەوە و وتی:
- نامەوێت لە کارەکەت دوا بکەویت، چیت هەیە بیڵێ.
ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و وتی:
- ڕودیا، ئەمە جاری دوەمە لە نووسینگەکەی ئەمانەوە دێن بۆ ئێرە، بەهەرحاڵ، جاری پێشوو، ئەم نەبوو، یەکێکی تر بوو، ئێمە قسەمان لەگەڵیدا کرد. ئەوەی پێش تۆ هاتبووە ئێرە کێ بوو؟
- بێگومان سێ ڕۆژ لەمەوبەر دەڵێیت، ڕاستە، ئەو ئەلکسی سیمونوڤیچ[2] بوو. ئەویش لە نووسینگەکەی ئێمەیە.
- وەلێ ئەو لە تۆ تێگەیشتوتر بوو، تۆ ئەڵێی چی؟
- وایە، بە ڕاستی ئەو بەهرەمەندترە.
- زۆر چاکە، بەردەوام بە.

---

[1] *Zosimof*

[2] *Alexey semyonovich*

لاوەکە ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و وتی:
- بە هۆی ئافاناسی ئیڤانۆڤیچ ڤاکروشینەوە[1]، وابزانم ناوتان زۆر ژنەوتوە، لەسەر داوای دایکت، حەواڵەیەک کە بۆ ئێوە هاتووە، گەیشتۆتە نووسینگەکەمان، ئەگەر تەواو هاتوویتەوە سەر خۆت، سیوپێنج ڕوبڵتان دەدەمێ، چونکە سیمیون سیمیونوڤیچ[2]، بە هۆی ئافاناسی ئیڤانۆڤیجەوە و لەسەر داوای دایکتە، وەک جاری پێشوو ڕاسپێری کراوە، ئاگاداریت؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری کردەوە و وتی:
- بەڵێ.. لە بیرمە.. فاخروشین..
ڕازومیخین دەنگی هەڵبڕی و وتی:
- گوێت لێیە؟ فاخروشینی بازرگان دەناسێت، کەواتە چۆن ئاگای لە خۆی نییە؟
منیش وا ئێستا تێدەگەم کە تۆیش کەسێکی تێگەیشتوویت، کەواتە گوێگرتن لە کەسانی بەئاوەز کارێکی چاکە.
- وایە، فاخروشین هەمان ئافاناسی ئیڤانۆڤیچە، لەسەر داوای دایکت، کە هەر ئەوان و بە هەمان ئەم شێوەیەی ئێستا، جارێکی دی پارەی بۆ حەواڵە کردبوویت، ئەمجارەیش داواکەی ڕەت نەکردەوە و چەند ڕۆژێک لەمەوبەر هەر لەم شوێنەوە هەواڵیان بە سیمون سیمینویڤچ دا کە سیوپێنج ڕوبڵت بدەنێ، بە تەمای دەرفەتێکی باشتر.

[1] *Afanaci Ivanovich Vakhroushin*

[2] *semyon semyonovich*

- بڕیاری "بە تەمای دەرفەتی باشتر"ت بە چاکی وت، بە نیسبەت "دایکیشتەوە" هەر خراپ نەبوو، ئێستا چۆنتان دێتە بەرچاو، ئایا بە تەواوی هاتۆتە هۆشی خۆی، یان نا؟

- بە لای منەوە خەوشی نییە، تەنیا ئەوەی من بمەوێت، پسووڵەی بەدەستگەیشتنیەتی.

- ئەو پسووڵەکەت بۆ دەنووسێت، ئەوە چییە پێت، دەفتەرە؟

- بەڵێ دەفتەری بەدەستگەیشتنە، فەرموو.

- بمدەرێ، دەی ڕودیا، هەستە و من دەتگرم، ناوی ڕاسکۆلنیکۆڤی بۆ بنووسە، قەڵەمەکەت بگرە، چونکە ئێستا هاوڕێ، زیاد لە هەر شتێک پێویستمان بە پارەیە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ قەڵەمەکەی دایە دواوە و وتی:

- پێویست ناکات.

- چی پێویست ناکات؟

- مۆری ناکەم.

- ئای! لەعنەت لە شەیتان، ئاخر چۆن مۆری ناکەیت؟

- پارە.. پێویستم پێی نییە..

- چۆن پارەت پێویست نییە! نا، هاوڕێ درۆ دەکەیت، من خۆم دەزانم.

ڕازومیخین ڕووی لە لاوەکە کرد و وتی:

- تۆ نیگەران مەبە، تکایە، هەر ئاوا.. دیسانەوە وڕێنە دەکات، هەرچەندە لە کاتی بێداریشدا هەر تووشی دێت.. تۆ پیاوێکی ئاقڵیت، ئێمە ڕێنمایی دەکەین، یەعنی بە کورتی و پوختی دەستی دەگرین و مۆرەکەی پێدەکەین، دەی وەرە.

- بەڵام من دەتوانم جارێکی تر بێمەوە.

- نا، نا، بۆ زەحمەت بكێشیت، تۆ پیاوێكی ئاقڵیت.. دەی.. ڕودیا، میوانەكە دوا مەخە.. نابینی چاوەڕێتە؟
ڕازومیخین تەواو لە دڵەوە خۆی بۆ ئەوە ئامادە كردبوو كە دەستی ڕاسكۆلنیكۆڤ بگرێت.
ڕاسكۆلنیكۆڤ وتی:
-لێم گەڕێ، خۆم دەتوانم..
قەڵەمەكەی هەڵگرت و ئیمزای دەفتەرەكەی كرد، لاوەكە پارەكەی دایە و ڕۆشت.
- دەستخۆش. دەی هاوڕێ، ناتەوێت شتێك بخۆیت؟
ڕاسكۆلنیكۆڤ وەڵامی دایەوە:
- با، دەخۆم.
ڕازومیخین پرسی:
- شۆرباتان هەیە؟
ناستاسیا كە بە درێژایی ئەو ماوەیە لەوێ وەستابوو، وەڵامی دایەوە:
- شۆربای دوێنێشەومان هەیە.
- بە پەتاتە یان وردە برنج؟
- بە پەتاتە و وردە برنجیش.
- زۆر باشە، شۆرباكە بهێنە، چایش..
- هەر ئێستا دەیانهێنم.
ڕاسكۆلنیكۆڤ بە سەرسووڕماوی و ترسێكی زۆر و بە بێدەنگی لە هەموو شتێكی دەڕوانی، بڕیاریدا بێدەنگ بێ و چاوەڕێ بكات، بۆ ئەوەی بزانێت كۆتاییەكەی بە چی دەگات، بە خۆی وت: "دەڵێیت من لە حاڵەتی وڕێنەكردندا نیم.. پێدەچێت هەموو ئەمانە ڕاستی بن.."

دوای دوو دەقیقە ناستاسیا شۆرباکەی هێنا و وتی چایەکەیش وا پێدەگات، بە شۆربا و دوو کەوچک و دەفرێک و تەواوی شتەکانی دی: خوێدان، بیبەردان. خەرتەلە بۆ گۆشتەکە و شتی تریش. دەمێک بوو خوانێکی وا نەڕازابووەوە، سفرەکەیش پاکژ بوو.
ڕازومیخین وتی:
- ناستاسیا گیان، خراپ نییە ئەگەر پراسکوفیا پاڤلۆڤنا[1] دوو قاپی بچووک بیرەمان بۆ بنێرێت، تا بیخۆینەوە.
- بۆ ئەمانە زۆر زرنگیت!
بەدەم قسەکردنەوە ناستاسیا ڕۆیشت بۆ جێبەجێکردنی داواکە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ زۆر بە نیگەرانییەکی سەیرەوە چاو و گوێی کردبووەوە. هەر لەو کاتەدا ڕازومیخین لەسەر قەنەفەکەی ئەو دانیشت، لەگەڵ ئەوەیشدا کە ڕاسکۆلنیکۆڤ خۆی توانای دانیشتنی هەبوو، کەچی ئەو وەک ورچێک، بەدەستی چەپی سەری لە باوەش گرت و بەدەستی ڕاست کەوچکی شۆرباکە کە چەند جارێک فووی لێکردبوو تا دەمی هاوڕێکەی نەسووتێت، لە دەمی نزیک کردەوە. بەڵام شۆرباکە خۆی گەرم نەبوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ئیشتیهاوە کەوچکێکی لە شۆرباکە خوارد. ئینجا کەوچکی دووەم و سێیەم، بەڵام دوای چەند کەوچکێک لەپڕێکدا ڕازومیخین وەستاو وتی دەبێت ئیدی پرس بە زوسیموف بکەین.
ناستاسیا بە دوو قاپ بیرەوە هاتە ژووری.
- چایت دەوێت؟
- بەڵێ.

---

[1] *Praskofia pavlovna*

- ناستاسیا، چایەکە زووتر بێنە، چونکە دەتوانین بەبێ گوێدانە وانەی کۆلێژی پزیشکیش چا بخۆینەوە، ئا.. ئەمەیش بیرە.
ڕازومیخین ئەمەی وت و لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشت، شۆربا و گۆشتەکەی لە خۆی نزیک خستەوە، ئەمەندە بە پەرۆشەوە دەستی بە خواردن کرد، دەتوت سێ ڕۆژە نانی نەخواردوە، پاشان ئەوەندەی کە تیکەکەی ناودەمی مۆڵەتی بدایە، وتی:
- هاورێ، ڕودیا، من ئێستا هەموو ڕۆژێک لای ئێوە بەم جۆرە نان دەخۆم، هەموو ئەم میواندارییە پاشانکا، خاتوونەکەی خاوەنماڵتان، خەرجیی دەکێشێت، لە ناخی دڵییەوە لە من تێدەگات، بێگومان منیش هیچ داوایەکم نییە، بەڵام هیچیش ڕەت ناکەمەوە، ئا، ئەوەیش ناستاسیا و چایەکەی، چەندە زرنگە! ناستاسیا گیان، بیرەت ناوێت؟
- برۆ، فێڵباز!
- ئەی چای؟
- چای؟ ئەوە قەیدی نییە.
- تێکە، وەلێ نا، من خۆم بۆت تێدەکەم، دابنیشە، لە پشت مێزەکەوە دابنیشە.
ڕازومیخین زۆر زوو کارەکەی ئەنجام دا، چای بۆ تێکرد، پاشان فنجانێکی تری پڕ کرد، دەستی لە خواردنەکەی کێشایەوە و لەسەر قەنەفەکە دانیشتەوە، وەک جاری پێشوو ورچئاسا بە دەستی چەپی سەری نەخۆشەکەی لە باوەش گرت، کەمێک هەڵیساند و بە کەوچکی چایەکە چای بە دەمیەوە دەکرد، بەردەوامییش زۆر بە بایەخەوە فووی لە کەوچکە چاکە دەکرد: وەک ئەوەی ئەو فوولێکردنە گرنگترین ئەنگێزەی ڕزگاربوونی نەخۆشەکە بێت. ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەنگ و هیچ بەرگرییەکی نەدەکرد، هەرچەندە لە خۆی ڕادەبینی، کە

هەستێت و لەسەر قەرەوێڵەکە دابنیشێت بەبێ ئەوەی کەس یارمەتیی بدات. نەک تەنیا توانای دەستبەکارهێنان، بەڵکو لەو باوەڕەدا بوو کە توانای بەڕێگەدارۆیشتنیشی هەیە. بەڵام بە جۆرە فێڵێکی سەیر، فێڵێک کە دەتوت غەریزەیە، لەپڕێکدا وای بە خەیاڵدا هات کە وا چاکە تا ماوەیەک هێز و تواناکەی بشارێتەوە. خۆ بکاتە نەخۆش و لە کاتی پێویستیشدا کەمێک خۆی بداتە گێلی، لە بۆسەدا بێ و گوێی بیستن و زانینی بە چاکی بخاتە گەڕ تا بزانێت لە دەوروبەریدا چی ڕوو دەدات. لەگەڵ ئەمانەیشدا نەیتوانی خۆی لەو هەستە نەفرەتییە ڕزگار بکات، کە تیایدا پەیدا ببوو. هەر ئەوەندەی پێنج کەوچکێکی خوارد، لەناکاوێکدا سەری خۆی ئازاد کرد و کەوچکەکەی وەک منداڵ دایە دواوە و کەوتەوە سەر سەرینەکە، ژێر سەرەکەی سەرینی پەڕ و بەرگەکەی پاکوخاوێن بوو. ئەمە سەرنجی ڕاسکۆلنیکۆڤی ڕاکێشا و لای سەیر بوو.

ڕازومیخین سەرلەنوێ هاتەوە جێگاکەی خۆی و کەوتەوە خواردنی شۆربا و بیرەکەی و وتی:

- پاشانکا دەبێت هەر ئەمڕۆ هەندێک مرەبای توومان بۆ بنێرێت، بۆ ئەوەی بۆ ڕودیا شەربەتی لێ دروست بکەین.

ناستاسیا کە ژێرپیاڵەی چاکەی لەسەر هەر پێنج پەنجە کراوەکەی خۆی دانا بوو و چای دەخواردەوە، پرسی:

- لە کوێ تووت بۆ پەیدا بکات؟

- ئازیزەکەم، توو لای بەقاڵ دەست دەکەوێت. دەزانیت ڕودیا، لێرە بەبێ ئەوەی تۆ بیزانیت چیرۆکێک ڕووی داوە، ئەو کاتەی کە تۆ فێڵبازانە لە پێشی من هەڵاتی و ناونیشانی ماڵەکەیشت بەجێ نەهێشت، لەپڕا لە سەری دام و بڕیارم دا بتدۆزمەوە و سزات بدەم؛

لەو ڕۆژەوە دەستبەکاربووم، هێند گەڕام و پرسیم مەپرسە، ئەم ماڵەی ئێستاتم لەبیر نەمابوو، هەرچەندە لە ڕاستیا هەرگیز ئێرەم هەر نەزانیووە، بەڵام ماڵەکەی پێشوتم دەزانی، کە نزیک بە "پێنجگۆشە" و لە ساختمانی "خارلاموف"[١] بوو. ئەمەندە بەدوای ئەو خانووەی خارلاموفدا گەڕام و گەڕام، تا لە دواییا دەرکەوت کە خانووەکە بەناوی خارمولاموفەوە نییە، بەڵکو بە ناوی "بوخا"وەیە، هەندێکجار مرۆڤ هەڵە لە ناودا دەکات. زۆرم ڕق هەستا، بە تووڕەییەوە بەرەو نووسینگەی تۆمارگەکە چووم. بڕوانە، بە دوو دەقیقە تۆیان بۆ دۆزیمەوە، ناوی تۆ لەوێ تۆمار کراوە.

- تۆمار کراوە!

- ئەی چۆن. بەڵام بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە لەوێ بووم، نەیانتوانی سەرتیپ "کوبلیف"[٢] بدۆزنەوە، دەی، زۆری دەوێت، بەهەرحاڵ، هەر کە هاتمە ئێرە، هەموو شتەکانتم زانی، هەموو شتێک هاوڕێ، هەموویانم زانی، هەموو شتێک دەزانم، نیکودیم فومیچم ناسی، ئیلیا پتروڤیچیشیان نیشان دام، دەرگاوان و جەنابی زامیوتۆف[٣] یەعنی ئەلکساندەر گریگوریڤیچ[٤] کە سکرتێری بەڕێوەبەریەتی نووسینگەکەیە. پاشان لەگەڵ پاشانکایشدا کە گوڵی سەرمێزی هەموان بوو، هەموو ئەمانە و ناستاسیایش دەزانێت..

---

[١] *Kharlamof*

[٢] *Kobelyof*

[٣] *Zamyotof*

[٤] *Alexandre Grigorievich*

ناستاسیا بە زەردەخەنەیەکی تەوساوییەوە وتی:
- زۆرت پیا هەڵدا!
- وا چاکترە چای شیرین بخۆیت، ناستاسیا نیکیفورڤنا[١].
ناستاسیا لەپڕا دایە پێکەنین و بە دەنگی بەرز وتی:
- توولە سەگ!
کە پێکەنینەکەی کۆتایی هات، لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو:
- وەلێ من ناستاسیا پتروڤام[٢]، نەک نیکیفورڤنا.
- باش بوو ئەمەم زانی.
پاشان ڕازومیخین ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و وتی:
- دەی، هاوڕێ، بۆ ئەوەی زۆر نەڵێم، دەبێت ئەوە بدرکێنم کە من دەمویست هەر لە سەرەتاوە لێرەوە تەزوویەکی بەهێزی کارەبا بخەمە کار، بۆ ئەوەی لە ڕەگەوە، هەموو وەهمەکانی ئەم ناوە بە یەکجاری ڕیشەکێش بکەم. وەلێ پاشانکا سەرکەوت، لە ڕاستیا هاوڕێ، من هەرگیز چاوەڕێم نەدەکرد کە ئەو تا ئەو ڕادەیە.. دەستودڵ کراوە بێت، وایە؟ تۆ دەڵێی چی؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەنگ بوو، هەرچەندە بۆ کەمێکیش نیگا پڕ لە دوودڵییەکەی خۆی لەسەر ئەو لانەدا و تا دەهات زیاتر لێی ڕادەما.
ڕازومیخین کە لە بێدەنگییەکە هیچ ناڕەحەت نەبووبوو، وەک ئەوەی وەڵامێکی دەست کەوتبێت، کە دەیویست پاڵپشتیی لێبکات، وتی:
- دەتوانم بڵێم، زۆر خانەدانانە و لە هەموو ڕوویەکیشەوە!

---

[١] nikiforovna

[٢] petrova

ناستاسیا کە پێدەچوو قسەکانی لەبەردڵ خۆشبێت و لەزەتی لێببینێت، بە دەنگی بەرز وتی:

- ئەی حەیوان!

- کێشەکە لێرەدایە هاوڕێ، تۆ هەر لە سەرەتاوە نەتتوانی تەگبیری کاری خۆت بکەیت، نەدەبوو لەگەڵیدا وابیت، ئاخر وەک دەڵێن، ئەو ڕەوشتێکی زۆر سەیری هەیە. چاکە دوایی باس لە ڕەوشت و خووی دەکەین.. بەڵام چۆن دەبێت کار بگاتە ڕادەیەک کە ئەو بتوانێت خواردنت لێببڕێت؟ یان بۆ نموونە ئەو پسووڵەیە، بە ڕاست تۆ شێت بوویت کە پسووڵە مۆر دەکەیت؟ یان ئەو پرۆژەی ژنهێنانە، ئەو کاتەی ناتالیا یگوروڤنا[1]ی کچی کە هێشتا نەمردبوو.. من هەموو شتێک دەزانم، بە ڕاستی دەزانم ئەمە نوختەیەکی گرنگە و منیش کەرم، بمبوورە، بەڵام دەربارەی دەبەنگی، تۆ چۆنی بیر لێدەکەیتەوە هاوڕێ، ئەم براسکوفیا پاڤلوڤنایە، لە یەکەم بینیندا وا نایەتە بەرچاو کە دەبەنگ بێت، وایە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە چاوی لەلایەکی تربوو، بەڵام دەیزانی وا چاکە گفتوگۆکە نەبڕێت، بە لالووتێکەوە وتی:

- وایە..

ڕازومیخین لەو وەڵامگیرییە خۆشیی هات و هاواری کرد:

- وایە؟ بەڵام ئاقڵیش نییە، بە تەواویی کەسایەتییەکی نائاسایی هەیە، بە ڕاستی برا گیان من چاک سەری لێدەرناکەم، باوەڕت هەبێت، بێگومان تەمەنی چل ساڵ دەبێت، خۆی دەڵێ سیوشەش ساڵم و هەقیشیەتی، سوێندت بۆ دەخۆم کە من دەربارەی ئەو زیاتر لە ڕووی

---

[1] natalia Egorovna

ئەقڵەوە داوەری دەکەم، لە باری سەرنجی میتافیزیکییەوە، نێوان ئێمە هاوڕێ، کۆمەڵە مەسەلەیەک هاتە گۆڕێ، کە زانستی جەبری تۆ هیچە! بە ڕاستی من هیچی لێتێناگەم. هەموو ئەمانە توڕەهاتن. وەلێ کاتێک ئەو تۆ دەبینێت، کە ئیتر خوێندکاری زانکۆ نیت و لە دەرس و جلوبەرگ بێبەش کراویت و کچەکەیشی مردووە، ئیتر هیچ پاساوێک نییە کە دەربەستیت بکات و ئاگای لێت بێت، لەپڕا ترسی لێنیشت. لەلایەکەوە تۆ خۆت گۆشەگیر کردووە و ناتەوێت پەیوەندییەکەی جارانت هەبێت، بۆیە ئەوییش بیری لەوە کردۆتەوە کە لێرە دەرت بکات، ماوەیەک بوو بیری لەمە دەکردەوە، بەڵام گرێبەستەکە ڕایگرتبوو، چونکە تۆ خۆت لەوە دڵنیات کردبوو کە دایکت پارەکە دەدات..

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دەنگی بەرز و ڕوون وتی:

- من لە ڕووی نابووتی خۆمەوە ئەوەم وت. ئەگینا دایکم لەوەدایە بکەوێتە دەرۆزەکردن.. من درۆم دەکرد تا لە ئاپارتمانەکەدا داڵدەم بدەن و خواردنم بدەنێ.

- وایە، ئەمە کارێکی ژیرانە بوو، وەلێ قسە لەوەیە کە لەم نێوانەدا جەنابی چبارف کە کەسایەتییەکی گرنگ و ڕاوێژکاری دادگایە، هاتە ناوەوە. ئەگینا پاشانکا بەبێ ئەو هەرگیز بیری لە کاری وا نەدەکردەوە. چونکە زۆر شەرمنە، بەڵام پیاوی دەوڵەمەند و ڕاوێژکار نازانێت شەرم چییە. بێگومان، پێش هەر شتێک پرسیاری ئەوەی کردووە کە ئایا سەنەدەکانی دەست دەکەوێت یان نا؟ دیارە وەڵامی بە ئەرێ دراوەتەوە. چونکە دایکێک لەئارادایە کە لە سەد و بیستوپێنج ڕوبڵی مووچەی خۆی، ئەگەر نانیش نەخوات، ڕودیا هەر ڕزگار دەکات. خوشکێکیشی هەیە لەبەر خاتری براکەی ئامادەی

کۆیلایەتیکردنە، ئەم پشتی بەوان بەستووە، تۆ بۆ ئەوەندە پەشۆکاویت؟ هاوڕێ، ئێستا من هەموو نهێنییەکانت دەزانم، بێهوودە نەبوو لەگەڵ پاشانکادا، ئەو کاتەی پەیوەندیتان خۆش بوو، دەردەدڵت بۆ دەکرد. وەلێ ئێستا من لە ڕووی هاوڕێیەتیەوە پێت دەڵێم و ڕاستیش دەکەم: مرۆڤی خانەدان و بەهەست ڕاستوڕەوان دەردی دڵی خۆی دەکات و مرۆڤی زرنگ گوێی بۆ دەگرێ و خۆراکەکەی دەخوات و پاشانیش کەسەکە قووت دەدات، هەر بەم جۆرە پاشانکا سەنەدەکەی داوەتە چبارف، وەک ئەوەی ئەو پارەکەی دابێتێ، ئەمیش داوای دانەوەی قەرزەکەی کرد و ئەم کارەی لا ئاسان بوو. کە ئەمانەم هەموو زانی، ویستم بە ویژدانێکی ئاسوودەوە تەزووە کارەباکەمی بۆ بنێرم، وەلێ لەم کاتەدا لە نێوان من و پاشانکادا گونجانێک دروست بوو، بۆیە دەستورم دا هەموو کارەکە ڕابگرن. واتا هەر لە سەرەتاوە من چوومە ژێر ئەوەی کە تۆ پارەکە دەدەیتەوە. من، هاوڕێ بووم بە زامنی تۆ. گوێت لێمە؟ چبارفمان بانگ کرد، دە ڕۆبڵمان لە مشتی ناو سەنەدەکەمان لێسەندەوە. ئێستا بە شانازییەوە دەیدەمەوە دەستت. ئێستا بڕوایان بە قسەت هەیە، فەرموو بیگرە، من وەک پێویست دەبوو هەندێکی لێبدڕێنم.

ڕازومیخین سەنەدەکەی خستە سەر مێزەکە، ڕاسکۆلنیکۆڤ سەیرێکی کرد و بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت، ڕووی لە دیوارەکە کرد، بە جۆرێک کە ڕازومیخین تەنگە گرتی و دوای دەقیقەیەک وتی:

- هاوڕێ، پێدەچێت من جارێکی دی گەوج بووبێتم، من دەمویست لە بیرت بەرمەوە، بەم چەنەبازییەم ئاسوودەت بکەم، کەچی لەوە دەچێت ئاگری تووڕەبوونتم خۆشتر کردبێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ دوای دەقیقەیەک بێدەنگی، بەبێ ئەوەی ڕووی تێبکات، وتی:
- تۆ ئەو کەسەی کە لە کاتی وڕێنەکردنەکەمدا نەمدەناسیت؟
- من بووم، تەنانەت بەهاتنی من تۆ ئاگات لە خۆت نەمایەوە، بەتایبەتی ئەو کاتەی کە زامیوتوفم لەگەڵدا بوو.
- زامیوتوف.. سکرتێرەکە؟ بۆ؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەپڕێکدا ڕووی وەرگێڕا و چاوی لە ڕازومیخین بڕی.
- چی بوو، بۆ ئەوەندە شپرزەبوویت؟ ئەو دەیویست بتناسێت، خۆی دەیویست، چونکە زۆرجار لەبارەی تۆوە قسەمان کردووە، ئاخر ئەگەر ئەمە نەبووایە، دەمتوانی لە کێوە ئەم هەموو شتە دەربارەی تۆ بزانم؟ لاوێکی چاکە هاوڕێ، زۆر چاکە.. هەڵبەتە لە بابەتی خۆی، ئێستا هاوڕێی یەکترین و تا ڕادەیەک هەموو ڕۆژێک یەکتر دەبینین، ئاخر من گوێزاومەتەوە بۆ ئێرە، نەتزانیووە؟
تازە گوێزاومەتەوە، لەگەڵ ئەودا یەک دوو جار لێزاڤیتامان بینی، لێزاڤیتات لە بیرە، لێزاڤیتا ئیڤانۆڤنا؟
- ئایا من وڕێنەم دەکرد؟
- ئەی چۆن، هەر ئاگات لە خۆت نەبوو.
- چیم دەوت؟
- چیت دەوت؟ مەعلوومە وڕێنەکەر چی دەڵێت.. دەی هاوڕێ، بۆ ئەوەی کاتمان بەفیڕۆ نەچێت، با دەستبەکار بین.
ڕازومیخین هەستاو کڵاوەکەی بەدەستەوە بوو.
- ئاخر، چیم دەوت؟
-واز ناهێنیت! ناشێ لە ئاشکراکردنی نهێنییەک بترسیت؟ مەترسە! لەبارەی کۆنتێسەوە هیچت نەوت، بەڵام لەبارەی سەگی پاس

"بولدوگ" و گواره و زنجیری ئاڵتون و دوورگەی "کریستوفسکی" و دەرگاوان و نیکودیم فومیچ و ئیلیا پیتروڤیچ و یارمەتیدەری لێکۆڵەرەوە، زۆرت وت. بێجگە لەمانە، زۆریش لەسەر گۆرەوییەکانت دوایت و بایەخت دانێ. دەپاڕایتەوە کە گۆرەوییەکانت بدەنەوە، تەنیا گۆرەوییەکانت بدەنەوە. زامیوتوف خۆی هەموو کونوکەلەبەرەکانی بە دوای گۆرەویەکانتا پشکنی، ئەم گۆرەوییە گەنیلانەیەی دۆزییەوە، بە دەستە بچووکەکانی خۆی کە بە گوڵاو شتبوونی و ئەنگوستیلەیان تیا بوو، پێشکەشی کردیت. ئەوسا لەسەرخۆ لێت وەرگرت و بیستوچوار سەعاتی تەواو ئەم گۆرەوییە پیسانەت لە ناو دەستی خۆتدا ڕاگرت. بە جۆرێک گرتبووت، کە کەس نەیدەتوانی لێتی بستێنێتەوە. بێگومان ئێستا لە سووچێکی ژێر لێفەکەتدایە. هەندێکجاریش ڕیشووی پانتۆڵەکەت دەویست، چۆنیش دەپاڕایتەوە! ئێمەیش دەمانویست لەوە تێبگەین کامە ڕیشووت دەویست؟ وەلێ هیچمان دەستگیر نەبوو. باشە، با ئێستا بچینە سەر کارەکە: ئەمە سیوپێنج ڕۆبڵە، دە ڕۆبڵی لێهەڵدەگرم و دوای دوو سەعاتی تر بۆت دەهێنمەوە، هەر لەم سەروبەندەیشدا هەواڵەکە بە زوسیموف دەگەیەنم، هەرچەند دەبوو ماوەیەک زۆر لەمەوپێشتر لێرە بووایە، چونکە لە سەعات یانزەیش لایداوە، تۆیش ناستاسیا گیان، کە من لێرە نەبم زیاتر سەر بدە، بەڵکو شتێک بخواتەوە بیدەیتێ، یان هەر شتێکی تر کە داوای بکات، باشنگایش، خۆم ئێستا هەموو شتێکی پێدەڵێم، بە ئومێدی دیدار.

ناستاسیا لە دوایەوە وتی:

- پێی دەڵێت باشنگا، ئای.. بێژوی فێڵباز!

ناستاسیا دەرگاکەی کردەوە و گوێقوڵاغ بوو. وەلێ خۆی نەگرت و چووە خوارێ، زۆری حەز لێبوو بزانێت ڕازومیخین چی بە ژنە

خاوەن ماڵەکە دەڵێت، چونکە دیار بوو کە ژنەکە تەواو شەیدای ڕازومیخین بووبوو.

کە دەرگاکەی لەسەر پێوەدا، نەخۆشەکە لێفەکەی لەسەر خۆی لادا و وەک شێت لە جێگاکە ڕاپەڕی. زۆر بە پەرۆش و بێئارامیەوە چاوەڕێی ڕۆیشتنی ئەو دووانە بوو تا یەکسەر دەست بداتە کارکردن، بەڵام بە چی، کام کار؟ وەک ئەوە وابوو کە بە دەستی ئانقەست کارەکەی لەبیر کردبێت.

"خودایا تەنیا شتێکم پێبڵێ، ئایا ئەمان ئاگاداری هەموو بەسەرهاتەکەن، یا نەکوو هێشتا نایزانن؟ خۆ ئەگەر هەموو دەیزانن و بەسەر خۆیاندا نایهێنن چۆن؟ ڕەنگە ئەو کاتەی دەخەوم سەر بکەنە سەرم و پاشان کتوپڕ هەموو بێنە قسە و بڵێن ئاگاداری هەموو شتێکین، بەڵام هەر بە ئارەزوو خۆمان لێ نەبان کردووە. باشە ئەو کاتە چی ڕوو دەدات؟ ئەی دەبێت ئێستا چی بکەم؟ لە بیرم چوو، پێدەچێ هەروا خۆم لەبیر خۆمم بردبێتەوە، لە پڕێکا فەرامۆشم کردبێت. کەچی کەمێک لەمەوبەر لە بیرم بوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا ڕاوەستا بوو، بە سەرسامییەکی ئازاراوییەوە لە دەوروبەری خۆی دەڕوانی، لە دەرگاکە نزیک کەوتەوە و کردییەوە، گوێی هەڵخست، بەڵام دوایی، ئەمە ئەو کارە نەبوو کە دەبوو بیکات، لەپڕێکدا، وەک ئەوەی بیری کەوتبێتەوە، خۆی گەیاندە ئەو گۆشەیەی ژوورەکە، کە کونی دیوارەکەی لێبوو، بە وردی کەوتە گەڕان، دەستی نایە ناو کونەکە و تیایدا گەڕا، بەڵام ئەمەیش کارە سەرەکییەکە نەبوو، بەرەو لای زۆپاکە چوو، دەرگاکەی کردەوە و بەناو خۆڵەمێشەکەی ناویدا کەوتە گەڕان، هەندێک لە ڕیشووی پانتۆڵەکەی و چەند لایەکی دڕاوی، وەک

چۆن لە پێشدا لەوێ دایناوبوو، هەر ئاوا مابوونەوە، کەواتە کەس نەیبینیون! ئەوسا کەوتە گەڕان بە دوای گۆرەوییەکانیدا کە پێشتر ڕازومیخین لە بارەیەوە دوا. ڕاستە لێرەدا، لەسەر قەنەفەکە، کەوتۆتە ژێر لێفەکەوە، بەڵام لەوساوە تا ئێستا ئەمەندە پیس و چڵکن بووە، کە زامیوتیف هیچ سەرنجی لێنەداوە.

"ئا، زامیوتوف! مەرکەزی پۆلیس! باشە بۆ دەبێت منیان بۆ مەرکەزی پۆلیس بانگ کردبێت! ئاگادارکردنەوەکەم کوا؟ ئا.. من هەموو شتێکم تێکەڵ کردووە، من پێشتر چووم بۆ مەرکەزەکە، ئەوسا لە گۆرەوییەکانم ڕادەمام، وەلێ ئێستا.. ئێستا من نەخۆشم، زامیوتوف بۆ هاتۆتە ئێرە؟ بۆ ڕازومیخین دەیهێنێتە ئێرە؟"

ڕاسکۆلنیکۆڤ دیسانەوە کەوتەوە ورتەورت و بە بێحاڵییەوە لەسەر قەنەفەکە دانیشتەوە، "ئەمەیان چییە؟ هەر وڕێنەکەی جارانە یان ڕاستییە؟ لەوە دەچێت ئەمەیان بە ڕاستی وا بێت.. ئا.. هاتەوە بیرم: هەڵاتن، دەبێت تا زووە هەڵێم، ڕاستە، ڕاستە، دەبێت هەڵێم، بەڵێ، بەڵام بۆ کوێ؟ جلەکانم کوان؟ چەکمەکانم نەماون، بردوویانە و شاردویانەتەوە، من دەزانم، ئەمە پاڵتاوەکەمە، گوێیان پێنەداوە، ئەمەیش پارەکە، لەسەر مێزەکەیە، سوپاس بۆ خودا، ئەمەیش سەنەدەکەیە.. پارەکە هەڵدەگرم و دەڕۆم، دەڕۆم خانوویەکی تر دەگرم، ئیتر نامدۆزنەوە، بەڵێ، بەڵام نووسینگەی ماڵ دۆزینەوە؟ ئەوان ئەمدۆزنەوە. ڕازومیخین بە گیردێنن، وا چاکترە ڕا بکەم.. بۆ شوێنێکی زۆر دوور، بۆ ئەمەریکا و بە گۆڕی باوکی هەموویانەوە! سەنەدەکەیش دەبەم، لەوێ بە دەردێکم دەخوات، چیتر هەڵبگرم؟ ئەوان وا دەزانن نەخۆشم، هەموو شتێک دەزانن! ئاخ بمتوانیایە بە پلیکانەکاندا بچوومایەتە خوارێ. ئەی ئەگەر پاسەوانانی پۆلیس لەوێ

بن چی بکەم؟ ئەی ئەمەیان چییە؟ پاشماوەی بیرەیە، نیوقاپە و ساردە". ڕاسکۆلنیکۆڤ قاپەکەی هەڵگرت کە هێشتا پەرداخێک بیرەی تیا مابوو، زۆر بە تاسووقەوە بە قومێک هەڵی دا، لەوەی دەکرد کە ئاگرەکەی سنگی پێبکوژێنێتەوە، وەلێ دەقیقەیەکی نەخایاند کە بیرەکە سەری گەرم کرد و تەزوویەکی سووکەڵە و خۆش بە پشتیا گەڕا، پاڵ کەوت و لێفەکەی بەسەر خۆیدا کێشا، بیرۆکە نەخۆش و شپرزەکەی، زیاتر لە جاران ئاڵۆزکاو، زۆری نەبرد کەوتە وەنەوزدان، زۆر بە خۆشییەوە، سەری خستە سەر سەرینەکە، توند لێفە نەرمە لۆکەییەکە، کە لەباتیی پاڵتاوە دڕاوەکەی جاران بەسەری خۆیدا دابوو، بە خۆیەوە پێچا، لەسەرخۆ هەناسەی دا و کەوتە خەونێکی قووڵ و ئارامەوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە دەنگی هاتنی یەکێک بۆ ژوورەکەی لە خەو هەستا. چاوی کردەوە و ڕازومیخینی بینی، کە بە تەواویی دەرگاکەی کردبووەوە و لەبەر دەرگاکە دوودڵ وەستابوو، کە ئایا بێتە ژوورەوە یان نا؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ خێرا لەسەر جێگاکەی هەستا، وا تەماشای ڕازومیخینی کرد دەتوت دەیەوێت شتێک بەبیر خۆی بێنێتەوە.

-ها.. نەنووستویت، باشە، منیش هاتمەوە.

ڕازومیخین ڕوو لە خوارەوە بانگی کرد:

- ناستاسیا، بوخچەکە بهێنە بۆ ئێرە.

ئینجا ڕووی لە هاوڕێکەی کرد و وتی:

- هەر ئێستا خەرجییەکەت بۆ یەکلایی دەکەمەوە..

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە نیگەرانییەوە سەیری ئەملاوئەولای خۆی کرد و پرسی:

- سەعات چەندە؟
- چاک خەوتیت هاوڕێ، لە دەرەوە شەوە، ڕەنگە سەعات شەش بێت، زیاد لە شەش سەعات نوستوویت..
- خودایا، چی دەکەم:
- دەی، ئیدی چی بووە؟ چاکت کرد، بۆ کوێت پەلەیە؟ بەڵێنی هیچ ژوانێکت هەیە؟ ئێستا هەموو کاتەکەمان بەدەستەوەیە، من سێ سەعاتە چاوەڕێی تۆم، دوو جار هاتم تۆ خەوتبوویت، دووجاریش چووم بۆ لای زوسیموف، لەوێ نەبوو، قەیدی نییە، هەر دێت، سەرەودەرەیەکی کارەکانی خۆیشم کرد، ئاخر ئەمڕۆ من ماڵم گوێزایەوە، بە تەواویی گوێزامەوە و ئێستا لەگەڵ مامەمدا دەژیم، بەڕاستمە، من ئێستا مامم هەیە.. لێگەڕێ، لەعنەت لە شەیتان، با بچینەوە سەر کار، ناستاسیا گیان، بوخچەکە بێنە، ئێستا دەیبینم.. دەی هاوڕێ، باری تەندروستیت چۆنە؟
- باشم، نەخۆش نیم.. ڕازومیخین، دەمێکە لێرەیت؟
- نەموت سێ سەعاتە چاوەڕێتم..
- نا، پێش ئەوە؟
- یەعنی چی پێش ئەوە؟
-لەکەیەوە هاتوچۆی ئێرە دەکەیت؟
- هەموویم بۆ باس کردوویت، لە بیرت چووە؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری پەرت بوو، وەک خەون ڕابووردووی هاتەوە بەرچاو، نەیدەتوانی بە تەنیا هیچ بێنێتەوە یادی خۆی، نیگایەکی بەپرسیاری لە ڕازومیخین گرت.
ڕازومیخینیش بە سەرسامییەوە وتی:

- ها، له بیرت چوەتەوە، من ئەوسایش دەمزانی که هێشتا تۆ لەسەر خۆت نیت.. بەڵام ئێستا دوای خەوەکەت چاکتریت.. بە ڕاستی وا دەرئەکەوێت که زۆر له جاران باشتر بیت، چاکتر، با بچینەوە سەر کارەکه، هەر ئێستا دێتەوە بیرت، ئازیزی بەڕێز، تەماشای ئێرە بکە.

بەدەم قسەکردنەوە بوخچەکەی کردەوە که پێدەچوو زۆری لا مەبەست بێت.

- باوەڕ بکه هاوڕێ، ئەم کارە دەڵێی بەردێکه بەسەر دڵمەوە، چونکه، دەبێت بۆ ئایینده ببیته پیاو، دەی با لێرەوە دەست پێبکەین. ئینجا له ناو بوخچەکەوە کڵاوێکی جوانی تا ڕادەیەک ئاسایی و هەرزانی دەرهێنا و وتی:

- ئەم کڵاوە دەبینیت؟ با تاقیی بکەینەوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ به ناخۆشیەوە دەستی دایه دواوە و وتی:

- دوایی، دوایی..

- نا، هاوڕێ، ڕودیا، ئینکاری مەکه، دوایی دوور دەکەوێتەوە، بێجگه لەوە ئەمشەو خەوم لێناکەوێت، چونکه من هەر به مەزەنه کڕیومه و نەمدەزانی ئەندازەت چەنده.

که کڵاوەکەی کردە سەری، دەنگی سەرکەوتنی لێهەستا.

- ئەها.. هەردەڵێی بۆ خۆت کراوە، کڵاو، هاوڕێ، یەکەمین پێویستییه له پۆشاکدا، هەر خۆی جۆرێکە له ناسنامە، تولستیاکوفی[1] هاوڕێم، که دەڕواتە شوێنێکی گشتییەوە، ناچارە کڵاوە کۆنەکەی دابگرێت، هەرچەنده هەموو ئەوانی دی کڵاویان لەسەردا بێت، خەڵکی وا دەزانن کڵاوداگرتنەکەی له ڕووی ڕێزەوەیه، بەڵام له ڕاستیدا ئەو شەرم

---

[1] *Tolstiakof*

دایدەگرێت، چونکە کڵاوەکەی لە هێلانەی باڵندە دەچێت، ئەو مرۆڤێکی شەرمنە، دەی، ناستاسیا گیان، ئەم دوو کڵاوە بگرە و بڵێ بزانم کامیان چاکترە: ئەم "پالمرستون"ە "لە گۆشەیەکدا کڵاوێکی خڕی ڕەنگ کاڵەوەبووی ڕاسکۆلنیکۆڤ، کە نەتدەزانی بۆ ناوی "پالمرستون"ی لێنراوە، دەرهێنا" یان ئەم دانە گەوهەرە؟ بڵێ بزانم ڕودیا، چەندم پێدابێت باشە؟

کە بینی ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەنگە، ڕووی لە ناستاسیا کرد و وتی:

- تۆ ئەڵێی چی، ناستاسیا گیان؟

ناستاسیا وەڵامی دایەوە:

- بیست کوپیک باشە.

راوزمیخین بە نابەدڵییەوە هاواری کرد:

- بیست کوپیک! گەوجە، ئەمڕۆ تۆیش بە بیست کوپیک لە کڕین نایەیت.. هەشتا کوپیک، بەڵێ، ئەویش لەبەر ئەوەی کە بەکار هاتووە و ڕاستت دەوێت، من بەو مەرجەیش کڕیم، ئەگەر کۆنت کرد، بۆساڵی ئایندە کڵاوێکی ترت بە خۆڕایی دەداتێ، بە خوا. دەی ئێستا، وەک لە قوتابخانە دەمانوت، با چینە سەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، یەعنی بچینەوە سەر ئەسڵی کارەکە، بەڵام پێشەکی با ئەوە بڵێم کە من شانازی بەو پانتۆڵەوە دەکەم کە کڕیومە (ئەمەی وت و پانتۆڵێکی ڕەنگ خۆڵەمێشی کە لە قوماشێکی ناسکی هاوینە دروست کرابوو، خستە بەردەمی ڕاسکۆلنیکۆڤ).

- نە کونێک، نە پەڵەیەک، ئەگەرچی بەکاریش هاتووە، بەڵام زۆر چاکە، هێلەکەکەیشی هەروایە و هاوڕەنگیە، تەواو مۆدەیەتی، بۆ بەکارهاتنەکەیشی، ڕاستت دەوێت وا چاکترە، چونکە نەرمتر و گونجاوتر بووە، بڕوانە ڕودیا، بۆ ئەوەی کارت بەرەو پێش بچێت، بە

لای منەوە ئەوەندە بەسە هەمیشە ئاگات لە وەرزەکان بێت: بۆ نموونە ئەگەر لە مانگی ڕێبەنداندا خۆراکی گیامارانەت نەوێت، ئەوا چەند ڕۆبڵێک لە جزدانەکەتدا دەمێنێتەوە، ئەمەیش هەروایە: ئێستا هاوینە و منیش شتی هاوینەم کڕی، چونکە لە پاییزدا دەبێت قوماشی ئەستوورتر بکڕیت، ئەوسایش ناچار دەبیت ئەوەی کڕیوتە تووڕی بدەیت.. بەتایبەتی تا ئەو کاتە ئەمانیش لەکەڵک دەکەون، ئیتر یان لەبەر زۆری و حەزکردن لە شتی تازە و جوان یان لەبەر گیرۆدەیی ناوەوە! دەی، تۆ چەندە نرخی بۆ دادەنێیت؟ دوو ڕۆبڵ و بیست و پێنج کوبیک: بڕوانە من ئەمەیشم هەر بە هەمان ئەو مەرجە کڕی، کە بۆ کڵاوەکەم دانابوو: واتا کە کۆن بوو، پوا ساڵی ئایندە بە بەلاش بۆت دەگۆڕێت، لە دوکانی "فادەیف"[1] هەر بەم شێوازە کڕین و فرۆشتن ئەنجام دەدرێت، جارێک پارە بدەیت بۆ هەموو تەمەنت بەسە، چونکە جاری تر سەر ناکەیتەوە بەوێدا، دەی، با بچینە سەر چەکمەکان، بەلاتەوە چۆنن؟ زۆر چاک دیارە کە بەکار هاتوون، بەڵام هێشتا کەڵکی دوومانگی تریان پێوە ماوە، چونکە بێگانە دروستی کردوون و جینسەکەیشی هەر هی ئەوانە. سکرتێری سەفارەتی ئینگلیز هەفتەیەک لەمەوبەر لە بازاڕ فرۆشتنی، بە هەموویەوە شەش ڕۆژ لەپێی کردن، وەلێ پێویستی بە پارە بوو، نرخی ئەم ڕۆبڵێک و پەنجا کوپیکە، نرخێکی گونجاوە.

ناستاسیا وتی:

- بەڵام ڕەنگە بۆ پێی نەبێت؟
- بۆ پێی نەبێت؟ ئەی ئەمە چییە.

---

[1] *Fadeyef*

بەدەم قسەکەیەوە ڕازومیخین تاکێک پێڵاوی کۆن، کون کون و چرچولۆچ و قوڕاوی ڕاسکۆلنیکۆڤی لە گیرفانی دەرهێناو وتی:
- من بە ئەندازەوە ڕۆیشتووم، لەبەر ئەم شتە سەیرەوە زانیومە ئەندازەی پێی چەندە، هەموو کارەکە بە وردەکارییەوە ئەنجام دراوە. بەڵام بۆ جلی ژێرەوە لەگەڵ ژنە خاوەن ماڵەکەدا ڕێک کەوتم. وەرە، ئەمە سێ کراسی دەزوو کە بەشی سەرەوەی بە تەواوی مۆدێلی ئێستایە.. بەم جۆرە: کڵاوەکە هەشتا کوپیک، دوو ڕۆبڵ و بیستوپێنج کوپیک باقی پۆشاکەکانی تر، هەمووی دەکاتە سێ ڕۆبڵ و پێنج کوپیک، ڕۆبڵێک و پێنج کوپیک پێڵاوەکە، لەبەر ئەوەی زۆر چاکن، هەمووی دەکاتە چوار ڕۆبڵ و پەنجا و پێنج کوپیک، پێنج ڕۆبڵیش جلەکانی ژێرەوە. بەم جۆرە هەمووی دەکاتە نۆ ڕۆبڵ و پەنجا کوپیک، چل کوپیکیشم هێناوەتەوە لەگەڵ پێنج کوپیکی مسیدا دەتدەمەوە، فەرموو وەریبگرە. بەم جۆرە ڕودیا، تۆ لەبارەی جلوبەرگەوە تەواو سازیت. چونکە بە لای منەوە پاڵتاوەکەت هێشتا باشە، بەڵکو زۆر ئابڕوومەندانەیە. هەموو ئەمانە لەبەر ئەوەی لە "شارمەر" کڕیومانە. گۆرەوی و شتەکانی دی خۆت هەڵیانبژێرە، بیستوپێنج ڕۆبڵمان بۆ ماوەتەوە، لەبارەی باشنکا و کرێی ژوورەکەتەوە نیگەران مەبە، من قسەم تێدا کردووە و تۆ ماوەی زۆرت لەبەردەستایە، دەی ئێستا هاوڕێ، مۆڵەتم پێبدە کراسەکەت بگۆڕم. چونکە گومانم لەوە نییە کە نەخۆشییەکەت تەنیا لە کراسەکەتەوە سەرچاوەی گرتووە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ کە بە بێزارییەوە گوێی لە هەواڵی کڕینی شتومەکەکانی ڕازومیخین گرتبوو، ئەوی دایە دواوە و وتی:
- لێم گەڕێ، نامەوێت.

ڕازومیخین پێی داگرت و وتی:
- ئەوە هەر نابێت هاوڕێ، ئەی من پێڵاوم بۆچی دڕاندووە! پاشان ڕووی لە ناستاسیا کرد و وتی:
- ناستاسیا گیان، شەرم مەکە، هاوکاریم بکە، ئا.. بەم جۆرە.
هەرچەندە ڕاسکۆلنیکۆڤ بەرگری کرد، بەڵام ڕازومیخین کراسەکەی گۆڕی. ڕاسکۆلنیکۆڤ خۆی دا بەسەر سەرینەکەدا و دوو دەقیقە هیچی نەوت، لەگەڵ خۆیدا بیری دەکردەوە: "ئەمە بەم زوانە دەست لەسەرم ناکاتەوە" پاشان چاوی لە دیوارەکە بڕی و وتی:
- بە کام پارە ئەم هەموو شتانەت کڕی؟
- کام پارە؟ سەیرە! بە پارەی خۆت، لە بیرتە کارمەندەکە لای فاخروشینەوە هاتبوو، دایکت ناردبووی، یان ئەمەیشت فەرامۆش کردووە؟
دوای ئەوەی ماوەیەک بیری کردەوە، بە ڕوویەکی ترشەوە ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:
- ئا.. ئێستا بیرم کەوتەوە..
ڕازومیخین بڕۆی هێنانەوە یەک و بە نیگەرانییەوە کەوتە سەیرکردنی.
دەرگا کرایەوە و پیاوێکی باڵابەرز و بەهەیکەل هاتە ژووری، پێدەچوو تا ڕادەیەک ڕاسکۆلنیکۆڤ بیناسێت.
ڕازومیخین بە خۆشییەوە هاواری لێهەستا:
- زوسیموف، ئاخری هاتی!

زوسیمۆف پیاوێکی کەڵەگەتی بەخۆوەبوو، دەموچاوی پڕ و ڕەنگی پەڕیوو، ڕیشی تاشراو بوو، قژی گەلێک زەرد و پاکژ ، چاویلکەیەکی لە چاودا و ئەموستیلەیەکی گەورەی زێڕ لە پەنجە ئەستوور و هەڵاوساوەکەیدا بوو، تەمەنی دابوویە بیست و حەوت ساڵ. پاڵتاوەکەی هەراو و جوان و پانتۆڵێکی هاوینەی کاڵی لەپێدا بوو، بەگشتی هەرچییەکی لەبەردا بوو، دەلال و ڕێک و قەشەنگ بوو. کراسی سپیی بێگەرد، زنجیرێکی سەعاتی زۆر گەورە، لە ڕێڕۆیشتنیشدا هێند لەسەرخۆ، کە واتدەزانی نەخۆشە، لە هەمان کاتدا وا خۆی پیشان دەدا کە زۆر لە خۆی ناکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا کە زۆر هەوڵی دەدا لە بەرگپۆشیندا ئەوە بشارێتەوە، کەچی بەردەوام و لە هەر چرکەساتێکدا ڕواڵەتبازییەکەی بە ئاشکرا پێوە دیار بوو. هەموو ئەو کەسانەی دەیانناسی، بە کابرایەکی سەرسەخت و بەگرفتیان دادەنا، بەڵام لەسەر ئەوەیش کۆک بوون کە پیاوێکە پیشەکەی خۆی زۆر باش دەزانێت.

ڕازومیخین هاواری کرد:

- هاوڕێ، دووجار هاتووم بۆ لات.. بڕوانە هاتۆتەوە سەر خۆی.

زوسیمۆف کە بە وردی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕامابوو، لەسەر قەنەفەکە، لە خوار ئەوەوە دانیشت، زوو پاڵی دایەوە، ڕوو بە ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:

- دەیبینم، دەیبینم، دەی ئێستا حاڵتان چۆنە؟ ها؟

ڕازومیخین وتی:

- هێشتا هەر خەمۆکە، ئێستا کراسەکەیمان گۆڕی، زۆری نەمابوو بگری.

- ئاساییە، دەتانتوانی کراسگۆڕینەکەتان بخستایەتە دوایی. نەبزی باش لێدەدات، هێشتا سەرت دێشێت، ها؟
- نا، باشم، زۆر باشم.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەر قسەکانی سوور و بە تووڕەییەوە دەیکردن. لەپڕێکدا کەمێک هەستا، چاوی بروسکەی دا، وەلێ زۆر زوو کەوتەوە سەر سەرینەکە و ڕووی لە دیوارەکە کردەوە. زوسیموف کە زۆر بە وردی چاودێریی دەکرد، بێدەربەستانە وتی:
- زۆر باشە، هەموو شتێک لە جێی خۆیدایە، هیچی خواردووە؟
هەموو شتێکیان بۆ باس کرد و لێیان پرسی کە چی بدەنێ.
- هەموو شتێکی بدەنێ. شۆربا، چا، وەلێ قارچک و خەیاری مەدەنێ، گۆشتی گایش چاک نییە و.. باشە ئیدی قسەی ناوێت.
لەگەڵ ڕازومیخیندا سەیرێکی یەکتریان کرد و وتی:
- پێویستی بە دەرمان نییە، هیچی مەدەنێ، سبەی خۆم دێمەوە، ڕەنگە ئەمڕۆیش.. دەتوانین..
ڕازومیخین وەک لای خۆیەوە بڕیاری دابێت، وتی:
- سبەی شەو دەیبەم بۆ گەڕان، بۆ باخی "یوسوپڤ" و لەوێوە سەر لە "کۆشکی بلورین"یش دەدەین.
- من بم بەیانی هەر ئاوا وازی لێدێنم، ڕەنگە کەمێک خراپ نەبێت، دەی دوایی بزانین چۆن دەبێت.
ڕازومیخین لەپڕێکدا ڕووی لە زوسیموف کرد و وتی:
- بە داخەوە، ئەمڕۆ من بە هۆی ماڵگواستنەوەوە میوانداریم هەیە، ماڵەکە هەرچەند هەنگاوێک لێرەوە دوورە، خۆزگا ئەویش بهاتایە، هیچ نەبێت هەر لەسەر قەرەوێڵەکە لە ناوماندا ڕابکشێت، تۆیش دەبێ بێیت، لە بیرت نەچێت، خۆت بەڵێنت داوە.

- زۆر باشە، وەلێ تۆزێ درەنگ دێم، چیت ئامادە کردووە؟
- هیچ، چاو ڤۆدکا و ماسیی وشک و جۆرێک نانی خۆماڵیی تایبەت، هەمووی خۆمانەیە.
- کێن ئەو کەسانە؟
- هەموو ئێرەیین، هاوڕێی تازەن، بێجگە لە پیرە مامێکم، کە ئەوییش هەر تازەیە، چونکە دوێنێ بۆ هەندێک کار هاتۆتە پترۆزبورگ، بە پێنج ساڵ جارێک یەکتر دەبینین.
- کێیە؟
- هەموو تەمەنی بە بەڕێوەبەری پۆستی ناوچەکە بەسەر بردووە.. مووچەی خانەنشینی وەردەگرێت، تەمەنی شەست و پێنج ساڵە، پێویست ناکات ئەوەندە قسەی لەسەر بکەم، بەڵام حەز دەکەم بڵێم کە خۆشم دەوێت، پۆرفیری سیمیونوڤیچ[1] لێکۆڵەری ناوچەیش دێت، مافناسە، تۆیش دەیناسیت.
- ئەویش خزمتە؟
- خزمێکی زۆر دوورمە، بۆ پێت ناخۆشە؟ چونکە جارێک شەڕتان بووە، ئێستا دەتەوێت نەیەیت؟
- من ئەوم لا مەبەست نییە.
- چاکتر، کەواتە هەندێک خوێندکار، مامۆستایەک، کارمەندێک، مۆسیقارێک، ئەفسەرێک کە زامیوتوفە..
- تکایە پێم بڵێ بزانم. نێوان تۆ یان با بڵێین ئەو (لێرەدا ئاماژەی بۆ ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و لەسەر قسەکەی ڕۆشت) لەگەڵ یەکێکی وەک زامیوتوفدا چی کۆی دەکاتەوە؟

[1] *porfiri semyonovitch*

- های لەو دوودڵییە! مەبەستت بیروباوەڕە! ئەو کەسانە بوونیان بەسەر سپرینگێکەوەیە، بەرنامەڕێژ کراوە و ناتوانێت بە ئارەزووی خۆی ئەملاوئەولا بکات، بە ڕای من ئەو پیاوێکی باشە. ئەمە خۆی لە خۆیدا گرنگترین بیروباوەڕە، ئیدی نایشمەوێت شتی تر بزانم، زامیوتوف مرۆڤێکی زۆر چاکە.

- بەهەرحاڵ، باش دەزانێت لەسەر دوو پەت یاری بکات، مرۆیەکی بەرژەوەندیخوازە.

ڕازومیخین بە تووڕەبوونێکی نائاساییەوە هاواری کرد:

- چی لێبکەم؟ بەرژەوەندیخوازە یان نا قیروسیا: جا چییە ئەگەر وابێت! بۆ من لەو لایەنەوە پیامدا هەڵداوە، کە لەسەر دووپەت یاری دەکات و بەرژەوەندیخوازە؟ من تەنیا ئەوەم وتووە کە وەک خۆی مرۆڤێکی باشە. ئەگەر بمانەوێت بە چاکی لە هەموو لایەکەوە خەڵکی هەڵبسەنگێنین، زۆر کەس هەن بە پاکی نامێننەوە، من بڕوای تەواوم هەیە ئەگەر من خۆم بەو شێوەیە تاووتوێ بکرێم، نرخی سەلکەپیازێک و پولێکی قەڵبم نامێنێت". تەنانەت ئەگەر تۆیشم بخەنە سەر!

- ئەمەی کە وتت کەمە، تۆ لای من نرخی دوو سەلک پیازت هەیە.

- بەڵام من تەنیا بە سەلکەپیازێک تۆ دەکرم، دەی، دانیشتنەکە خۆشتر بکە. زامیوتوف هێشتا مێردمناڵێکە، دەتوانم گوێی ڕابکێشم، دەبێت بە لای خۆمدا ڕاییبکێشم نەک لە خۆمی تەرە بکەم، تۆ ناتوانیت یەکێک بەوە چاک بکەیت، کە لە خۆتی دوور بخەیتەوە، بە تایبەتی مێردمنداڵێک، لەگەڵ تەمەنی وادا دەبێت دووقات هەوڵ بدەیت، وەڵێ ئێوەی گەوجە پێشڕەوەکان لە هیچ ناگەن، ڕێزی مرۆڤتان لانییە، ئەو کەسەیش ڕێزی مرۆڤ نەزانێت، خراپەکاری لەگەڵ خۆیدا دەکات.

ئەگەر وەک ئەنجام حەزدەکەی بزانیت بە ڕاستی پێت بڵێم کە من و ئەو کاری هاوبەشمان هەیە.

- بێگومان دەمەوێت بیزانم.

- کێشەی بۆیەچییەکە، واتا نەقاشەکە.. بێگومان هەر ڕزگاری دەکەین، ئەوەیش بزانە کە تا ئێستا هیچی لەسەر نییە، کارەکە زۆر ڕوون و ئاشکرایە، ئەوەی لەسەر ئێمەیە، زوو گەیاندنیەتی بە کۆتایی.

- کامە بۆیەچی؟

- چۆن، بۆم باس نەکردوویت؟ وەلێ نا، من هەر سەرەتایەکم لێ باس کرد.. بەڵێ، دەربارەی کوشتنی پیرێژنە سووخۆرەکە یان ژنە کارمەندەکە، ئێستا بۆیەچییەکەیشی تێوە گلاوە.

- لەبارەی ئەو کوشتنەوە پێشتر شتێکم لێ بیستیت، بە لایشمەوە زۆر گرنگە.. تا ڕادەیەکیش.. لە ڕۆژنامەکانیشدا هەر شتێکم لەبارەی کوشتنەکەوە خوێندەوە، بەڵام..

ناستاسیا کە بە درێژایی ئەو ماوەیە لە ژوورەکەدا وەستابوو، پاڵی دابووەوە دەرگاکەوە و گوێی هەڵخستبوو، لەپڕێکدا ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و وتی:

- لیزاڤێتایشیان کوشتووە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دەنگێکی زۆر نزمەوە کە بە زەحمەت دەبیسترا، وتی:

- لیزاڤێتا؟

- بەڵێ لیزاڤێتای دەلاڵ، نایناسیت؟ دەهاتە ئێرە، بۆ خوارەوە، تەنانەت کراسەکەی بۆ پینە کردیت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕووی لە دیوارەکە کردەوە، چاوی بڕییە ئەو پەڕەکاغەزە پیس و زەردانەی کە پڕ بوون لە نەخشی گوڵی سپی،

گوڵێکی سپیی هەڵبژارد، کە وێنەکەی ناشیرین و خەتی قاوەیی تیابوو، کەوتە لێرامانی کە چەندە پەڕەی تیایە و هەر پەڕەگوڵێکیش چەندە ددانە و هێڵی لەخۆ گرتووە، هەستی کرد دەستوپێی ئەوەندە سست بوون، وەک ئەوەی کە ئەو ئەندامانەی لێکرابووبنەوە وابوو، لەگەڵ ئەوەیشدا بەسەر خۆیدا نەهێنا و چاوی لەسەر گوڵە چکۆڵەکە لانەبرد.

- باشە، ئەی بۆیەچییەکە چۆن؟

ڕازومیخین بە گەرمییەوە لەسەری ڕۆشت:

- هیچ، ئەویشیان لە ڕیزی بکوژەکان داناوە.

- هیچ بەڵگەیەکی لەسەرە؟

- بەڵگە؟ هەرچەندە شتێکیان دەستگیر بووە! وەلێ دەبێت ئەوە بوترێت کە ئەو بەڵگانە بەڵگەی ڕاستی نین و دەبێت ئەمە بسەلمێنرێت. چیرۆکەکە ئەمەیە کە یەکەمجار گومانیان لە کوخ و پستریاکوف کرد و گرتیانن، ئای، چ کارێکی دەبەنگانە بوو! مرۆڤ لە کاری وا شەرم دەیگرێت، ڕەنگە ئەمڕۆ پستریاکوف سەرم لێبدات.. بەڕاست، ڕودیا، تۆ ئەم مەسەلەیە نازانیت، لە پێش نەخۆشیەکەتدا ڕووی دا، ڕێک لە شەوی ئەو ڕۆژەدا کە تۆ لە بەڕێوەبەریەتیی پۆلیس بێهۆش کەوتیت، یەعنی هەر ئەو کاتەی باسیان لەو کێشەیە دەکرد.

زوسیموف وردبینانە سەرنجی دایە ڕاسکۆلنیکۆڤ، بەڵام ئەو وەک نە بای دیبێ و نە باران وابوو. زوسیموف بە توانجەوە وتی:

- دەزانیت ڕازومیخین؟ چەندە لێت دەڕوانم، لەسەر ئەم مەسەلەیە تۆ گەلێک زۆربلێی دەکەیت.

ڕازومیخین مشتی بەسەر مێزەکەدا کێشا و وتی:

- وایە، وەلێ هەرچۆنێک بێت، هەر لەو بەڵایەی ڕزگار دەکەم، دەزانیت چ شتێک زۆر دڵی مرۆڤ دەهێنێتە جۆش؟ ئەوەی کە ئەوان درۆ دەکەن گرنگ نییە، چونکە دەکرێت هەمیشە لە هەڵە خۆش بیت، تەنانەت خودی هەڵە چاکەی ئەوەی هەیە، کە دەتگەیەنێتە ڕاستی، نا، من داخی ئەوەمە کە ئەوان هەڵە دەکەن و پاشان هەڵەکەیشیان بە گەورەیی دادەنێن. من ڕێزم بۆ پۆرفیری هەیە، بەڵام.. تۆ دەزانیت چی لە سەرەتاوە ئەمانەی بەهەڵەدا برد؟ ئەوەی کە دەرگاکە داخرابوو، کاتێکیش ئەو دووانە لەگەڵ دەرگاوانەکەدا گەڕانەوە، دەرگاکە کرابووەوە. لەوەوە گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە دەبێت کوخ و پستریاکوف بکوژەکە بن، ئاخر ئەمەیە لۆژیکی ئەوان!

- باشە، تۆیش ئەمەندە خۆت سەغڵەت مەکە، تەنیا گرتوویانن، ئاخر نابێت کە.. بەڕاست من ئەم کوخەم پێشتر دیووە، وا دیارە ئەو شتانەی لە پیرێژنەکە کڕیوەتەوە، کە ماوەی ڕەهنەکەیان بەسەر چووە. وایە؟

- بەڵێ، ساختەچییە، سەنەدەکانیش دەکڕێت، زۆڵ و دەستبڕێکە بۆ خۆی، بەڵام چاوی دەردەهات، دەزانیت من بۆ لە پێستی خۆم دەردەچم؟ لە ڕۆتینێکی کۆنی زۆر داڕزیوو کە کەڵکی نەماوە، لە کاتێکدا کە دەتوانرێت ڕێگەیەکی زۆر نوێ بۆ چارەسەرکردنی کارەکە لەبەر بگیرێت. تەنیا لە ڕێی نیشانەکانی دەروونزانییەوە دەتوانرێت بگەیتە ڕاستی، ئەوان دەڵێن ئێمە "بەڵگە و نیشانەمان" هەیە، ئاخر بەڵگە هەموو شتێک نییە، لایەنی کەم نیوەی کێشەکە لەوەدایە کە چۆن دەتوانن ئەو بەڵگانە لێک بدەنەوە.

- تۆ خۆت دەتوانیت بە چاکی لەو بەڵگانە کەڵک وەربگریت؟

- تۆیش سەیریت؟ ئاخر نابێت بێدەنگ بیت، کاتێک هەستت کرد کە..
بەڵێ، ئەو کاتە بە ڕاستی هەست دەکەیت کە توانای هاوکاریکردنت هەبێت، ئەگەر.. ئا.. ئایا تۆ باش ئاگاداری بەسەرهاتەکەیت؟
- باشی دەزانم، بەڵام چاوەڕێی ئەوەم بۆیەچییەکە خۆی بۆم بگێڕێتەوە.
- ڕاست دەکەیت، کەواتە گوێ لە چیرۆکەکە بگرە: هەر ڕۆژێک دوای کوشتنەکە، سەرلەبەیانی، کە ئەوان هێشتا سەرگەرمی کوخ و پستریاکوف بوون- ئەگەرچی ئەم دووانە چ هەنگاوێکیان نابێت وتوویانە و مەسەلەکە تەواو ڕوون و ئاشکرایە- لەناکاوێکدا شایەتێک هاتۆتە گۆڕێ، کە هەرگیز کەس چاوەڕێی ناکات. لادێییەک بەناوی دوشکین[1] - خاوەنی مەیفرۆشییەکە بەرانبەر ئەوماڵەی تاوانەکەی تیا کراوە- دەڕوات بۆ بەڕێوەبەریەتیی پۆلیس و پاکەتێک گەوهەر و گوارەی ئاڵتوون لەگەڵ خۆیدا دەبات، چیرۆکێکی درێژیان لەسەری بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت:
"سێ ڕۆژ لەوەوبەر، سەرلەئێوارە، کەمێک دوای سەعات هەشت "ئاگات لە ڕۆژ و سەعاتەکە هەیە؟"بۆیەچییەک کە پێشتریش هاتۆتە لام، ناوی نیکۆلایە، ئەم پاکەتە و گوارەی زێڕ و بەردە بەنرخەکانی بۆ هێنام، دەیویست ئەوانە بەرانبەر بە دوو ڕۆبڵ بە بارمتە لای من دابنێت، کە پێم وت ئەمانەت لە کوێ هێناوە؟ وتی لە ڕارەوەکەدا دۆزیویەتەوە، ئیتر منیش پرسیاری ترم لێنەکرد" ئەمە دوشکین دەیڵێت "منیش گەلایەکم دایە" مەبەستی ڕۆبڵێکە. "چونکە زانیم ئەگەر لای من داینەنێت، بە بارمتە لای یەکێکی تری دادەنێت، هەمووی

[1] Doushkin

یەکێکە، ئەو هەر دەیدات بە ئارەق، کەواتە وا چاکترە ئەم شتە لای من بمێنێتەوە، وەک دەڵێن: کارت باش بێ و ترست نەبێ. ئەگەر شتێکیش هاتە پێش و مقۆمقۆیەک پەیدا بوو، ئەوسا خۆم مەسەلەکە دەگەیەنمە لای پۆلیس" هەڵبەتە، قسەکانی بێسەرەوبەرەن، من دوشکین دەناسم کە وەک سەگ درۆ دەکات، ئەو خۆیشی پارە بە سوو دەدات، ماڵی دزی دەشارێتەوە، ئەو شتە سی ڕۆبڵەی بۆیە لە نیکۆلا وەرگرتووە، نەک لەبەر ئەوەی بێت و خەبەری لێبدات، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ترساوە، وەلێ باوابێت، قیروسیا، گوێ بگرە. پاشان دوشکین بەردەوام بوو:

- من ئەو جوتیارە، یەعنی نیکۆلا دیمنتیف[1] لە منداڵییەوە دەناسم خەڵکی ناوچەی "زارایسک" و شاری خۆمانە، چونکە ئێمەیش خەڵکی "رزان"ین، نیکۆلا هەرچەندە لە ئارەقخۆرە قورسەکان نییە، بەڵام هەندێکجار دەخواتەوە، ئێمە دەمانزانی کە ئەو لەگەڵ دیمیتریدا[2] لەم ماڵەدا کاری بۆیە دەکەن، ئەو و دیمیتری خەڵکی شوێنێکن، بە کورتی هەر ئەوەندەی ڕۆبڵەکەی وەرگرت، زوو وردی کردەوە، یەکسەر دوو پێکی چکۆڵەی خواردەوە و باقی پارەکەی وەرگرتەوە و بۆی دەرچوو. بەڵام لەو کاتەدا من دیمیتریم لەگەڵیا نەبینی، بۆ ڕۆژی دوایی بیستمان کە ئەلێنا ئیڤانۆڤنا و لیزاڤێتا ئیڤانۆڤنای خوشکیان بە تەور کوشتووە، ئێمە ئەوانیشمان دەناسی، من هەر لە گوارەکانەوە گومانم هەبوو، چونکە دەمزانی کە ئەو خوالێخۆشبووە لە بارمتەی شتا پارەی بە سوو دەدا، بۆیە چووم بۆ ماڵەکەیان و هێدی هێدی

[1] *Nekolay dementyef*

[2] *dimitri*

لەوێ کەوتمە پرسوجۆکردن، لەسەرخۆ لە هەموویانم پرسی: نیکۆلا لێرەیە؟ دیمیتری وتی نیکۆلا چووە بۆ بەزمورەزمی خۆی، بەیانی بە سەرخۆشی هاتبووەوە ماڵەوە، دە دەقیقەیەک مابووەوە و ڕۆشتبووەوە، دیمیتریش کە ئیتر ئەوی نەدیبوو، خۆی بە تەنیا کارەکەی ئەنجام دابوو، شوێنی کارەکەیان لە قاتی دووەم بوو، پلیکانەکانی ئەمان لەگەڵ پلیکانەکانی ماڵی ئەو داماوانەدا یەکێک بوو، کە هەموو ئەمانەم بیست، ئەوسا لای کەس هیچمان نەدرکاند "ئەمە دوشکین وا دەڵێت". بەڵام ئەوەی پەیوەندیی بە کوشتنەکەوە بێت، ئێمە چەند توانیمان تاووتوێمان کرد و گەڕاینەوە ماڵەوە، هەر لە گومان و سەرسووڕماندا بووین. ئەمڕۆ بەیانی سەعات هەشت..." یەعنی ڕۆژی سێیەم، تێدەگەیت؟ "بینیم نیکۆلا هاتە لام: هۆشیار نییە، بەڵام زۆریش سەرخۆش نییە، قسەی وەردەگرت. لەسەر سەکۆکە بێدەنگ دانیشت، لە مەیخانەکەدا بێجگە لەو تەنیا پیاوێکی غەریبە و ئاشنایەک کە لەسەر قەنەفەکە خەوتبوو، دوو منداڵی کارگوزاری خۆیشمان هەر لەوێ بوون، لێم پرسی: دیمیتریت دی؟ وتی "نا، نەمدی".

- نەیشهات بۆ ئێرە؟
- نا، لە سێ ڕۆژ لەمەوبەرەوە نەهاتووە.
- دوێنێشەو لە کوێ نووستیت؟
- لە شەقامی "پسکی[1] نزیک بە کالومنسک"[2].
- کەواتە ئەو ڕۆژە گوارەکانت لە کوێ هێنا؟

---

[1] peski

[2] kalomensk

- لەسەر شۆستەکەدا دۆزیمەوە.
ئەم قسەیەی بە شێوەیەک کرد، کە ڕووی لە من نەبوو.
- بیستووتە ئەو شەوە. لە فڵان سەعاتدا، لەسەر پلیکانەکان، ئەوەو ئەوە ڕووی داوە؟
- نا، نەمبیستووە.
گوێی تیژ کرد و چاوی کرانەوە، لەپڕێکدا ڕەنگی وەک گەچیی سپی لێهات. منیش هەر بەو جۆرە باسم بۆ دەکرد، ئەو کڵاوەکەی هەڵگرت بۆ ئەوەی بڕوات، ویستم ڕایگرم، پێم وت "نیکۆلا، ڕاوەستە، ناتەوێت شتێک بخۆیتەوە؟ خۆیشم ئاماژەیەکم بۆ بۆیەک کرد کە بەردەرگاکە بگرێت و خۆم لە پشتی سەکۆکەوە هاتمە دەرێ، لەو کاتەدا نیکۆلا هێند چالاکانە ڕاپەڕی و کەوتە سەرشەقامەکە و لە کۆڵانەکەوە هەڵات، کە تەنیا جێپێیم بەدی کرد. ئیتر من گومانم نەما کە ئەو تاوانەکەی کردووە".
زوسیموف وتی:
- بێگومان
ڕازومیخین وتی:
- ڕاوەستە، گوێ بۆ کۆتاییەکەی بگرە، بێگومان بۆ گرتنی نیکۆلا هەوڵێکی زۆریان دا: مەیخانەکەی دوشکینیان پشکنی و خۆیان گرت، هەروەها دیمیتری و دانیشتوانی کالومنسکیان ژێروبان کرد. نەیانتوانی بیگرن، تا سێ ڕۆژ لەمەوبەر کە لە پڕێکا نیکۆلایان هێنا، لە نزیک دەروازەی "س" لە کاروانسەرایەکدا گرتبوویان، وەک دەڵێن کە چووەتە ئەوێ، خاچە زیوینەکەی لە ملی کردۆتەوە و لەباتیی ئەوە داوای قاپێک ڤۆدکای کردووە، ئەوانیش داویانەتێ، دوای چەند دەقیقەیەک ژنێکی لادێیی دەڕوات بۆ گەوڕەکە و لە درزی دەرگاکەوە

نیکۆلا دەبینێت کە پشتێنەکەی بە دارێکەوە هەڵخستووە و ئەڵقەیەکی تێکردووە، چوەتە سەر تەختەدارێک و دەیەوێت ئەڵقەکە بکاتە ملی خۆی، ژنە لادێییەکە دەکەوێتە هاوار، خەڵکەکەی لێ کۆدەبنەوە و پێی دەڵێن:

- ها، ئەمە تۆی؟

نیکۆلا دەڵێت:

- بمبەن بۆ فلان شوێنی پۆلیس، دان بە هەموو شتێکدا دەنێم.

ئەوانیش بە ڕێزێکی زۆرەوە هێنایان بۆ ئێرە. ئێمەیش کەوتینە پرسینی کێیت، چۆنیت و بۆچی و تەمەنت چەند ساڵە؟ وەڵامی دایەوە: "تەمەنم بیستودوو ساڵە".

- کە لەگەڵ دیمتریدا کارت دەکرد لە فلان سەعاتدا، کەست لەسەر پلیکانەکان بینی؟

- بێگومان خەڵکم دیووە، ڕەنگە زۆریش بووبن، بەڵام گوێم پێنەداون.

- ئەی گوێت لە هیچ نەبووە، لە دەنگەدەنگ و هەرایەک؟

- هیچ شتێکی نائاسایم گوێ لێنەبووە.

- ئایا تۆ، نیکۆلا، لە هەمان ڕۆژدا دەتزانی کە فلانە پیرێژن لە فلان ڕۆژ و فلان سەعاتدا لەگەڵ خوشکەکەیدا کوژراون و هەرچییەکیان هەبووە براوە؟

- نە دەمزانی و نە ڕۆحم پێی وتووم، یەکەمجار، سێ ڕۆژ لەمەوبەر لە مەیخانەیەکدا، لە ئاڤاناسی پاولوڤیچم بیست.

- ئەی گوارەکانت لە کوێ هێنا؟

- لەسەر شۆستەکە دۆزیمەوە.

- بۆ ڕۆژی دوایی لەگەڵ دیمیتریدا نەهاتیتە سەر ئیش؟

- خەریکی ڕابواردن بووم.

- له کویٚ؟
- له فلان شوێن و فلان شوێن.
- بۆ لەدەست دوشکین ڕات کرد؟
- چونکه لەو کاتەدا زۆر ترسام.
- له چی ترسایت؟
- لەوەی تاوانبارم بکەن.
- که تۆ گومان له خۆت ناکەیت، ئەی بۆ دەترسیت؟
ڕازومیخین وتی:
- زوسیموف باوەڕ دەکەیت یان نا، ئەم پرسیارانەیان وەک خۆی چۆنه، لێیان کردووه، من چاک دەزانم، به ڕاستی پێم گەیشتووه باشه، چۆنه؟ ڕای تۆ چۆنه؟
- وەلیٚ نا، چونکه بەڵگه و دەلیل لەبەردەستایه.
- من ئێستا پەیوەندیم به بەڵگه و مەڵگەوه نییه، بەڵکو مەبەستم ئەو لێپرسینەوەیەیه، که لەگەڵیان کردووه، مەبەستم ئەوەیه که ئەمانه چۆن له ئەرک و پیشەی خۆیان تێگەیشتوون! باوابێت، نەحلەتیان لێبیٚ. ئەوەنده تاویان دایه و فشاریان بۆ هێنا، که لەدواییدا خۆی به دەستەوەدا و وتی: "گوارەکانم لەسەر شۆستەکه نەدۆزییەوه، بەڵکو لەو ئاپارتمانەدا دۆزیمەوه، که من و دیمیتری بۆیەمان دەکرد".
- ئاخر چۆن؟
- چۆن؟ بەم جۆره: به درێژایی ئەو ڕۆژه من و دیمیتری بۆیەمان دەکرد، نزیکی سەعات هەشت ویستمان بڕۆین، دیمیتری قەڵەمبۆیەکەی هەڵگرت و هێنای بەدەموچاوما، دەموچاومی بۆیه کرد و بۆی دەرچوو، منیش کەوتمه دوای، به دوایدا ڕام دەکرد و هاوارهاوارم بوو، هەر که ویستم له پلیکانەکەوه بڕۆمه داڵانەکەی

دەرەوە، بەر دەرگاوانەکە کەوتم، کە لەگەڵ چەند بەڕێزێکدا وەستابوو، نازانم ژمارەی ئەو بەڕێزانە چەند بوو، تەنیا ئەوەندە دەزانم کە دەرگاوانەکە کەوتە جوێنپێدانم، دەرگاوانێکی تری لێبوو ئەویش جوێنی پێدام، ژنی دەرگاوانەکەیش هاتە دەرێ و جوێنبارانی کردم، پیاوێکیش کە لەگەڵ خاتوونێکدا لە دەرگاکەوە دەهاتنە ژوورێ، ئەویش کەوتە جوێندان. چونکە من و دیمیتری بە جووتە لەبەر دەرگاکە کەوتبووین و ڕێگەمان لێگرتبوون، من قژی دیمیتریم گرتبوو و دابووم بە زەویدا، دابوومە بەر مستەکۆڵە، دیمیتریش لەژێرەوە قژی منی ڕادەکێشا و مستی پێدا دەکێشام. بەڵام ئێمە ئەم کارەمان بە ڕق و دوژمنایەتییەوە نەدەکرد، بەڵکو لە ڕووی خۆشەویستی و کاتبەسەربردنەوە بوو. پاشان دیمیتری خۆی ڕزگار کرد و بەرەو کۆڵانێک هەڵات، منیش بە ڕاکردن کەوتمە دوای و پێی نەگەیشتم، بە تەنیا گەڕامەوە ئاپارتمانەکە، چونکە دەبوو کەرەسەکان کۆ بکەمەوە، کۆم کردنەوە و چاوەڕێی دیمیتری بووم کە بگات، لەو کاتەدا، لە بەردەم دەرگاکە لە ڕاڕەوەکەدا لە سووچێکدا قاچم بەر بەستەیەک کەوت، کردمەوە و تەماشام کرد، بینیم لە کاغەزێکەوە پێچرابوو، کاغەزەکەم کردەوە، بینیم بەستەکە قولاپی بچووکی پێوەیە، قولاپەکانم کردەوە، ناو بەستەکە ئەم گوارانەی تیابوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لەپڕێکدا کاتێک بە نیگایەکی لێڵ و سامناکەوە لە ڕازومیخینی، دەڕوانی هاواری کرد:

- لە پشت دەرگاکەوە؟ لە پشت دەرگاکەوە کەوتبوون؟ پشت دەرگاکە؟

پاشان لەسەرخۆ هەستا و هەردوو دەستی گرت بە قەنەفەکەوە و دانیشت، ڕازومیخینیش لە جێگاکەی هەستا و وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ.. ئەی چۆن؟ تۆ چیتە؟ بۆ وا تێک چوویت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دەنگێکی زۆر نزمەوە کە بە زەحمەت دەبیسترا وەڵامی دایەوە:

- هیچ..

دیسانەوە لەسەرخۆ کەوتەوە بەسەر سەرینەکەیدا و ڕووی لە دیوارەکە کرد، هەموویان کەمێک بێدەنگ بوون.

ڕازومیخین بەدەم تەماشاکردنێکی سەیری زوسیموفەوە وتی:

- خەو دەیباتەوە، دیارە خەونەکەی بزرکاندووە.

زوسیموف لەسەرخۆ سەری بە نیشانەی نەرێ ڕاوەشاند و وتی:

- دەی تەواوی بکە، پاشان چی ڕووی دا؟

- حەزت دەکرد چی ڕوو بدات؟ هەر کە گوارەکانی بینی، ڕاست ئاپارتمان و دیمیتریی فەرامۆش کرد، کڵاوەکەی هەڵگرت و بەرەولای دوشکین بۆی دەرچوو، وەک دەزانین، ڕۆبڵێکی لێسەند و درۆیەکی بۆ ساز کرد، کە بەستەکەی لەسەر شۆستەکە دۆزیوەتەوە و ئیتر کەوتە شەوقوزەوقی خۆیەوە، لەبارەی کوشتنەکەیشەوە هەر هەمان قسەکانی پێشووی دووبارە دەکاتەوە.

- ئاگام لە هیچ نییە، هیچ نازانم و تەنیا لە سێیەم ڕۆژدا زانیومە.

- ئەی بۆ تا ئێستا نەهاتبوویت؟

- لە ترسا.

- ئەی بۆ دەتویست خۆت بخنکێنیت؟

- لەبیرکردنەوە و خەیاڵی زۆردا.

- کام بیروخەیاڵ؟

- نەک تۆمەتم بدەنە پاڵ.

ڕازومیخین لە سیموفی پرسی:

- باشە، ئەمە هەموو چیرۆکەکە، ئێستا تۆ وەک بزانیت لەمەوە چ ئەنجامێک بەدەست دێنن؟
- چی بزانم؟ هەرچۆنێک بێت، بەڵگە لە ئارادایە، هەرچەندە بەڵگەکان بچووکیش بن، بەڵام هێشتا ڕووداو و شایەتن، نابێت بۆیەچییەکە بەرەڵا بکرێت.
- بەڵام ئەوان بەبێ سێودووکردن بە پیاوکوژیان داناوە، ئەوان هیچ گومانێکیان لای خۆیان نەهێشتۆتەوە.
- تۆ لە خۆتەوە ئەمە دەڵێیت و جەختی لەسەر دەکەیت. باشە ئەی گوارەکان؟ تۆ دەبێت ئەوە بزانیت کە ئەگەر لە هەمان ڕۆژ و هەمان سەعاتدا گوارەکان لە سنووقەکەی پیرێژنەوە گەیشتبێتە دەستی نیکۆلا.. کەواتە دەبێت ئەوە قبووڵ بکەیت، کە دەبێت لە ڕێگەیەکەوە کەوتبێتە دەستی، ئەمەیش لە خۆیدا بۆ لێکۆڵینەوە گرنگە.
ڕازومیخین هاواری کرد:
- چۆن کەوتۆتە دەستی! چۆن کەوتۆتە دەستی؟ ئایا بە ڕاستی تۆ کە پزیشکیت و دەبێت پێش هەر شتێک مرۆڤ بناسیت و بۆت ئاسانە لە هەموو کەس زووتر لە سروشتی مرۆڤ بگەیت، ئایا بە ڕاستی بەپێی ئەم هەموو بەڵگانە نابینیت کە ئەم نیکۆلایە چ جۆرە مرۆڤێکە؟ ئایا تۆ هەر لە سەرەتاوە نابینیت کە لە کاتی لێکۆڵینەوەدا هەرچییەکی وتووە، ڕاستییەکی ڕووتە؟ خۆی چۆنی وتووە، وا گوارەکانی دۆزیوەتەوە، واتا پێی لە بەستەکە هەڵکەوتووە و هەڵیگرتووە.
- ڕاستییەکی ڕووت! بەڵام لەگەڵ ئەمانەیشدا خۆی دانی بەوەدا نا کە قسەکانی سەرەتای درۆ بوون؟
- گوێ بگرە، باش گوێ بگرە. دەرگاوانەکە، کوخ، پستریاکوف، دەرگاوانەکەی تر، ژنی یەکەم دەرگاوان، ژنەکەی دی کە لەو کاتەدا

لای ژنی دەرگاوانەکە بوو، کروکوفیش[1] کە لەو کاتەدا لە گالیسکە دابەزیبوو و قۆڵ لە قۆڵی خانمێکدا دەچووە ژوورەوە، هەموو ئەمانە، واتا هەشت نۆ شایەت، هەموویان دەڵێن نیکۆلا کەوتبوو بەسەر دیمیتریدا و دابووی بە زەویدا و بە مشت لێی دەدا، ئەویش قژی نیکۆلا گرتبوو و بەر مشتەکۆڵەی دابوو، لەبەر دەرگاکە کەوتبوون و ڕێیان لە ڕێبوار بەستبوو، لە هەموو لایەکەوە جوێنیان پێدەدان، وەلێ ئەوان وەک منداڵەوردکە (ڕێک ئەمە قسەی شایەتەکانە) بەسەر یەکدا کەوتبوون، هاواریان دەکرد، زۆرانیان دەگرت و پێدەکەنین. هەردووکیان وا پێدەکەنین خەریک بوو لێک ببنەوە. بە سەروسیمایەکی زۆرر پێکەنیناوییەوە کەوتبوونە دوای یەک، وەک منداڵ بە کۆڵانەکاندا فرکان فرکانیان بوو، گوێت لێبوو؟ ئێستا ئەوەیشت لەبیر نەچێت کاتێک لاشەکانیان لەسەرەوە دۆزیەوە، هێشتا گەرم بوون، گوێت لێمە؟ هێشتا گەرم بوون، جا ئەگەر ئەمانە کوژەرەکان بووبن، یان هەر نیکۆلا بە تەنیا کردبێتی و ئەمانە قفڵی سنووقیان شکاندبێت و شتەکانی ناویان تاڵان کردبێت، یان بەشداریی تاڵانییەکەیان کردبێت، ئەوسا ڕێگەم بدە تەنیا پرسیارێک لە تۆ بکەم: ئایا ئەو حاڵەتە ڕۆحییە، یانی ئەو هاوارهاوار و پێکەنینە، ئەو دەمەدەمە منداڵانەیەی بەر دەرگا، لەگەڵ تەور و خوێن و پیلانی زۆردارانە و تاڵانکردندا ڕێک دەکەوێت؟ ئایا دەبێت لەو هەلومەرجەدا، واتا هەر پێنج یان دە دەقیقە پێش ئەو ڕوداوەی کە باسمان کرد، ئەوان تاوانی کوشتنەکەیان ئەنجام دابێت، چونکە وەک دەڵێن، لاشەکان هێشتا گەرم بوون، ئەوسا لەپڕێکدا واز لە لاشە و ئاپارتمان

[1] *Krukof*

و دەرگای کراوە بهێنن و بیشزانن لەو کاتەدا خەڵکی لەوێدان، نێچیرەکەیان بەرەڵا بکەن؟ ئایا ڕێی تێدەچێت ئەوان تازە کوشتنەکەیان ئەنجام دابێت، پاشان لێیگەڕابن و لەسەر شەقامەکەدا وەک منداڵ کەوتبنە پێکدادان و قاقای پێکەنین و خەڵکیش تەماشایان بکات؟ ئەم ڕاستییە دە کەس بە یەک دەنگ دەیڵێت.

- بە ڕاستی شتێکی سەیرە، بێگومان هەر مەحاڵە، بەڵام، بەڵام.

- نا برادەر، "بەڵام"ی نەگەرەکە، ئەگەر ئەو گوارانەی لە هەمان ڕۆژ و سەعاتدا کەوتنە دەست نیکۆلا، بە ڕاستی بەڵگەیەکی گرنگ بن بەسەریەوە، کە خۆی ئەمەی وتووە و هەر ئەمەیش وا بکات کە زۆر بڕوا بە شایەتەکان نەکرێت، کەواتە دەبێت بەڵگە و شایەتی تر هەبن بۆ بێتاوانیی ئەو، بەتایبەتی کە ئەو بەڵگانە نکۆڵیان لێنەکرێت، بەڵام بۆ ئەو دۆخەی کە ئێستا دادگا و داوەریی ئێمەی تیایە، تۆ دەڵێی چی؟ ئایا ئەوان قایل دەبن، یان ئەو ئامادەگییەیان تیایە بەسەرهاتێک قبووڵ بکەن، کە گشت شایەت و بەڵگەکانی تەنیا و تەنیا لەسەر بنەمای سایکۆلۆژی یان لایەنێکی ڕۆحی تایبەت دامەزرابێت و چ شتێک نەتوانێت ڕەتی بکاتەوە و هەر بە خۆیشی توانای ئەوەی هەبێت هەموو بەڵگە مادییەکانی تر بداتە دواوە؟ نەخێر، دەزگا دادوەرییەکانی لای ئێمە ئەمە قبووڵ ناکەن و نایسەلمێنن، بە هیچ جۆرێک قبووڵی ناکەن، لەبەر ئەوەی دواجار بەستەیەکیان دۆزیوەتەوە، هەروەها ئەویش ویستوویەتی خۆی لەدار بدات "ئەگەر هەستی بە تاوانباری نەکردایە، دەستی بۆ کاری وا نەدەبرد" ئەمە کێشە سەرەکییەکەیە، ئەمەیە ئێمە تووشی هەڵچوون و خرۆشان دەکات، تێدەگەیت؟

- بەڵێ، دەبینم تۆ زۆر هەڵچوویت، ڕاوەستە، لە بیرم چوو پێت بڵێم چی دەیسەلمێنێت کە ئەو بەستەیەی گوارەکانی تیابووە، تەواو لە سندووقی پیرێژنەکە دەرهاتووە؟

ڕازومیخین برۆی ویک هێنان و بێدەربەستانە وەڵامی دایەوە:

- ئەمە سەلماوە، کوخ ناسیویەتەوە، خاوەن بارمتەکەیشی دەستنیشان کردووە، خاوەنی گوارەکەیش تەواو ئەوەی سەلماندووە کە ئەو شتانە هی ئەون.

- بە داخەوە، پرسیارێکی دی: ئایا کەس نیکۆلای لەوکاتەدا نەدیووە کە کوخ و پستریاکوف چوونەتە سەرەوە، ئایا ناتوانرێت بە هەر ڕێگەیەک بێت ئەمە بسەلمێنرێت؟

ڕازومیخین بە حەسرەتێکی ڕکاوییەوە وەڵامی دایەوە:

- نا، هەموو کێشەکە لەسەر ئەوە وەستاوە کە کەس ئەوی نەدیووە، هەر ئەمەیشە کارەکەی تێک داوە، تەنانەت کوخ و پستریاکوفیش کاتێک سەرکەوتوون، سەرنجی ئەوەیان نەداوە، ئەگەرچی شایەتییەکەیان ئێستا بایەخێکی نییە، ئەوان دەڵێن: "دەرگای ئاپارتمانەکەمان بە کراوەیی بینی، وامانزانی لە چاکسازیدایە، بەڵام کە تێپەڕیین، سەرنجی ئەوەمان نەدا، چاکیش لە بیرمان نییە کە لەو کاتەدا کرێکار کاری تیا کردووە یان نا؟"

- کەواتە بەڵگەی بێتاوانیی ئەوان تەنیا لەوەدایە، کە یەکتریان داوەتە بەر مشتەکۆڵە و پێکەنیوون، گریمان ئەمە بەڵگەیەکی بەهێز بێت، بەڵام.. باشە، تۆ یارمەتیم بدە: تۆ خۆت چۆن بەسەرهاتەکە لێک دەدەیتەوە؟ دۆزینەوەی گوارەکان بە چی دەزانیت؟ ئەگەر بە ڕاستی بەو شێوەیە دۆزرابێتەوە، کە ئەو باسی کردووە؟

- چۆنی لێک بدەمەوە؟ لێکدانەوەی ناوێت، مەسەلەکە زۆر ئاشکرایە. بە لایەنی کەمەوە ئەو ڕێگەیەی بۆ لێکۆڵینەوە لەبەر دەگیرێت، ڕێکوڕەوانە. واتا هەر ئەو بەستەیە خۆی سەلماندوویەتی بکوژی ڕاستەقینە گوارەکانی ون کردووە، ئەو کاتەی کوخ و پستریاکوف لە دەرگایان داوە بکوژەکە، لەسەرەوە و لە ناو ژوورەکەدا دەرگاکەی لەسەر خۆی کلۆم کردووە، کوخ کەریەتیی بەخەرج داوە و چووەتە خوارێ، لەو کاتەدا پیاوکوژەکەیش هاتۆتە دەرێ و بەرەو خوارەوە تێی کێشاوە، چونکە هیچ ڕێگەچارەیەکی تری نەبووە، لەسەر پلیکانەکان لە دەست کوخ و پستریاکوف و دەرگاوانی ئاپارتمانە خاڵییەکە ون بووە. واتا ڕێک لەو چرکەساتەدا کە دیمیتری و نیکۆلا لەوێوە دەردەکەوتن و دەرگاوان و دوو کەسەکەی دی دەڕۆشتنە سەرەوە، ئەو هەر لەوێ، لە پشت دەرگاکەوە وەستاوە و ئەمەندە ماوەتەوە، تا دەنگی پێنەماوە، پاشان لەسەرخۆ کەوتۆتە ڕێ و چووەتە خوارەوە. ئەوە هەر ئەو کاتەیشە، کە دیمیتری و نیکۆلا لەسەر شەقامەکە یەکتر ڕاو دەنێن و هەموو پەرەوازە بوون و ئیدی کەس لە دەوری دەرگای دەرەوە نەماوەتەوە. ڕەنگە بکوژەکەیان دیبێت، بەڵام سەرنجیان لێنەداوە، ڕێبوار زۆرە وەلێ، بەستەکە لەو کاتەدا کە ئەو لە پشت دەرگاکەوە وەستاوە، لە گیرفانی کەوتۆتە خوارێ و ئەو پێی نەزانیووە کە شتێکی لێکەوتووە، لەبەر ئەوەی سەرقاڵ بووە و نەیپەرژاوە. بوونی بەستەکە بە تەواوی ئەوە دەردەخات کە لەوێدا وەستاوە، ئەمە تەواوی چیرۆکەکەیە.

زوسیموف وتی:

- سەیرە! نا! هاوڕێ ئەمە زۆر شتێکی سەیرە، زۆریش.

- بەڵام بۆ؟ بۆ؟

- چونکە هەموو شتێک زۆر بە چاکی ڕێک خراوە.. تەواو چنراوە، وەک ئەوەی لە شانۆگەرییەکدا دەیبینین.
- ئاە!!
هەرکە ڕازومیخین ئەو هەناسەیەی هەڵکێشا، دەرگاکە کرایەوە و پیاوێکی نەناس کە کەس نەیدەزانی کێیە، خۆی بەژووردا کرد.

٥

ئەو بەڕێزەی هاتە ژوورەوە، پێدەچوو لە تەمەنی لاویی تێپەڕاندبێت، پیاوێک بوو لە خۆبایی و بەفیز، بەدەبدەبە و خۆپارێز. هەر کە گەیشتە بەردەرکی ژوورەکە، وەستا، تەماشایەکی سەیر و نالەباری ئەملاوئەولای کرد، لە ڕوانینەکەیدا وا دەردەکەوت کە مەبەستی نەبوو هیچ نهێنییەکی تیا وەشارێت، وەک بپرسێت: "ئەمە کوێیە وا منی تێکەوتووم؟" بە گومان و جۆرە ترسێک کە زیاتر لە سووکایەتیپێکردن دەچوو، تەماشای "کوختە"کەی ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد. هەر بەو سەرسامییەیشییەوە لە ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕاما، ڕاسکۆلنیکۆڤیش، کە هەر بە جلوبەرگی دەرەوە و بە ڕیشی نەتاشراو و سەروقژی ژاکاوەوە لەسەر قەنەفە نابووت و پۆخڵەکەی پاڵکەوتبوو، بەبێ ئەوەی بجوڵێت، ئەویش کەوتە تەماشای. تازەهاتووەکە بە هەمان لەسەرخۆییەوە کەوتە تەماشاکردنی ڕیشی نەتاشراو و سەری شانەنەکراوی ڕازومیخین، ئەویش لای خۆیەوە، بەبێ ئەوەی جووڵەی بۆ بکات، بە کونپشکنییەکی سووکایەتیپێکردنەوە چاوی لە ناوچاوی بڕی. بۆ ماوەی دەقیقەیەک بێدەنگییەکی سەخت ئەو ناوەی داگرت، لە ئەنجامدا وەک چاوەڕێ دەکرا، گۆڕانێکی چکۆڵە بەسەر دیمەنەکەدا هات، ڕەنگە گۆڕانەکە لەوەوە بووبێت کە جەنابی تازەهاتوو لە ڕێگەی

چەند ئاماژەیەکی دیارەوە هەستی بەوەکردبێت کە ئەم خۆبەقورسگرتنە زۆرەی ئەو لەم جێگایەدا، واتا لەو "کۆختە"دا بەرئەنجامێکی باشی بۆ ئەو نابێت، بۆیە هەندێک نەرمیی بەخەرج دا و بە ڕێزێکەوە کە خاڵی نەبوو لە جۆرە زبرییەک، ڕووی لە زوسیموف کرد، بە شێوەیەک کەوتە پرسیار، کە هەموو وشەیەکی دانار دانار لە جێگای خۆی دادەنا. پرسی:

- ڕادیون ڕومانوڤیچ ڕاسکۆلنیکۆڤ، خوێندکاری زانکۆی بەڕێز، یان کۆنە خوێندکار؟

زوسیموف لەسەرخۆ جووڵا، لەوەدا بوو کە وەڵام بداتەوە، کاتێک ڕازومیخین کە ڕووی پرسیاری لێنەکرابوو، هاتە دەست و وەڵامی دایەوە:

- ئەوەیە، ئەوەی لەسەر قەنەفەکە کەوتووە.. چیت دەوێت؟

دەستەواژەی "چیت دەوێت؟" کە ئاسایی و بێ پێچوپەنا ڕازومیخین کردی، خەریک بوو جەنابی کابرای بەلووتوپۆ لە پێستی خۆی دەربکات، تەنانەت خەریک بوو بەرەو لای ڕازومیخین وەرگەڕێت، بەڵام هەرچۆنێک بوو، توانی خۆی بگرێت و خێرا گەڕایەوە لای زوسیموف.

زوسیموف بێدەربەستانە و تەنیا بەسەر ئاماژەی بۆ لای نەخۆشەکە کرد و لەسەرخۆ وتی:

- ئەمە ڕاسکۆلنیکۆڤە.

زوسیموف باوێشکی دا، بە شێوەیەکی نائاسایی دەمی داپچڕی و هەروا هێشتییەوە، پاشان بە هێوریی دەستی بۆ گیرفانی هێلەکەکەی برد، سەعاتێکی زێڕی زۆر گەورەی داخراوی دەرهێنا، کردییەوە و لێیڕوانی، هەر بە هەمان هێوری و سستییەوە خستییەوە گیرفانی.

خودی ڕاسکۆلنیکۆڤ بە درێژایی ئەو ماوەیە بێدەنگ لەسەرپشت کەوتبوو، زۆر بە وردی لە تازەهاتووەکەی دەڕوانی بەبێ ئەوەی هیچ بیرێکی لێبکاتەوە، ڕووی کە ئیتر لەسەر ئەو گوڵە چکۆڵەیەی لادابوو کە بەسەر کاغەزی دیوارەکەوە بوو، ئەمەندە ڕەنگی هەڵبزرکابوو، کە پێدەچوو دەردوئازارێکی بەسوێی هەبێت، دەتوت هەر ئێستا نەشتەرگەرییەکی سەختی بۆ کراوە، یان لەژێر ئەشکەنجە و ئازاردا بووە. وەلێ جەنابی تازەهاتوو وردەوردە و زیاتر سەرنجی ئەوی ڕاکێشا، پاشان گومان و سەرسووڕمان، تەنانەت ترسێکیشی تیا دروست کرد، کە زوسیموف ئەوی پیشان دا و وتی: "ئەمە ڕاسکۆلنیکۆڤە" لەپڕێکدا خێرا ڕاپەڕی، لەسەر جێگاکەی دانیشت، بە دەنگێکی تا ڕادەیەک هەڕەشەئامێز، بەڵام سست و جارجار بڕاوەوە وتی:

- بەڵێ، من ڕاسکۆلنیکۆڤم، چیت دەوێت؟

میوانەکە بە وردی تەماشای کرد و بە دەنگێکی لەسەرخۆوە خۆی پێناساند:

- من پیتەر پتروڤیچ لۆژینم، هیوادارم ناوەکەمت لا نەناس نەبێت.

وەلێ ڕاسکۆلنیکۆڤ کە بە تەواوی چاوەڕێی شتێکی تر بوو، سست و لەسەرخۆ لێی ڕوانی و وەڵامی نەدایەوە، دەتوت بە ڕاستی ئەمە یەکەمین جارە ناوی پیتەر پیتروڤیچ دەبیستێت.

پیتەر پیتروڤیچ بە نارەحەتییەوە پرسی:

- چۆن؟ بۆ تۆ تا ئێستا هیچ هەواڵێکت پێنەگەیشتووە؟

لە وەڵامی ئەو قسانەدا ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەرخۆ شانی دادایە سەر سەرینەکە، هەردوو دەستی لە پشتسەرییەوە هەڵپێکا و کەوتە

تەماشاکردنی ژوورەکە، بەسەر دەموچاوی لۆژینەوە ئاسەواری دەردوخەمێک دەرکەوت.

زوسیموف و ڕازومیخین زیاتر کەوتنە سووسە و خۆتێهەڵقورتاندنی لۆژین، تا لە دواییدا هەستی نائارامیی تێگەڕا و بە ئەسپایی وتی:

- وامدەزانی، وامدەزانی ئەو نامەیەی کە دە ڕۆژ زیاترە، یان لە دوو هەفتە لەمەوبەرەوە پۆست کراوە..

لەپڕێکدا ڕازومیخین قسەکانی پێبڕی و وتی:

- گوێ بگرە، تۆ بۆ تا ئێستا لەبەر دەرگاکە وەستاویت؟ ئەگەر کارێکت هەیە، فەرموو دابنیشە، چونکە بۆ هەردووکتان تۆ و ناستاسیا، شوێنەکە تەنگە، ناستاسیا گیان، کەمێک ڕێگەی بۆ بکەرەوە با تێپەڕێت، فەرموو، ئەمەیش کورسییەکەت دەی تێپەڕە!

کورسییەکەی خۆی لە مێزەکە دوور خستەوە، مەودایەکی لە نێوان مێزەکە و ئەژنۆیدا هێشتەوە، بە دەمارێکی تا ڕادەیەک کرژەوە چاوەڕێی کرد بۆ ئەوەی میوانەکە لەو تۆزە بۆشاییەوە تێپەڕێت. ڕازومیخین وا ساتەکەی هەڵبژاردبوو، کە تازەهاتووەکە بواری ڕەتکردنەوەی نەما، بۆیە خێرا، هەرچەند بەردەوام پێی هەڵدەکەوت، بەڵام لەو بۆشاییە تەنگەوە ڕەت بوو، کە گەیشتە کورسییەکە، دانیشت و بە دوودڵیەوە لە ڕازومیخین ڕاما، ڕازومیخین وتی:

- تۆ نارەحەت مەبە، پێنج ڕۆژە ڕودیا نەخۆشە، چەند ڕۆژێک وڕێنەی دەکرد، وەلێ ئێستا هاتۆتەوە سەرخۆی و باش خواردن دەخوات. ئەمەی دانیشتووە، پزیشکییەتی، کەمێک لەمەوبەر سەیری کردەوە، منیش هاوڕێی ڕودیام و هەر وەک ئەویش پێشتر خوێندکاری زانکۆ بووم، هەنووکە وەک دەبینیت، پەرستاری ئەوم، لەبەر ئەمە، تۆ گوێ بە ئێمە مەدە و بێباک بە لێمان، چیت هەیە بیڵێ.

پیتەر پیترڤیچ ڕووی لە زوسیموف کرد و وتی:
- سوپاسگوزارم، وەلێ من بەهاتن و قسەکردنم نەخۆشەکە ناڕەحەت ناکەم؟
زوسیموف بە هێمنی وەڵامی دایەوە:
- نا، ڕەنگە بۆ ئەو کاتبەسەربردنێکیش بێت.
دیسانەوە باوێشکی دایەوە، ڕازومیخین وتی:
- ماوەیەکە هاتۆتەوە سەر خۆی، هەر لە بەیانی زووەوە.
ڕازومیخین ئەمەندە خۆمانە و سادە و بێ پێچوپەنا قسەکانی کرد، کە پیتەر پیتروڤیچ کەوتە بیرکردنەوە و بەخۆداچوونەوە. هەروەها زیاتر بوێریی تێگەڕا، ڕەنگە ئەم هەستە لەوەوە سەرچاوەی گرتبێت، کە ئەولاوە لەوچە و ڕووتوڕەجاڵە بواری بۆ ڕەخسا وەک قوتابییەک خۆی پێبناسێنێت.
لۆژین دەستی بە قسە کرد:
- دایکت..
ڕازومیخین بە دەنگی بەرز وتی:
- هوم!
لۆژین نیگایەکی پڕ لە پرسیاری لێکرد و ڕازومیخین بەردەوام بوو:
- مەبەستم هیچ نەبوو، قسەکانت مەبڕە..
لۆژین شانی هەڵتەکاند و وتی:
- .. دایکت، ئەو کاتەی هێشتا من لایان بووم، نامەیەکی بۆ نووسیت. کە گەیشتمە ئێرە بەتایبەتی چەند ڕۆژێک وەستام و نەهاتمە لات، بۆ ئەوەی تەواو لەوە دڵنیا بم کە تۆ لە هەموو شتێک ئاگاداریت، کەچی ئێستا زۆرم پێ سەیرە..
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەپڕێکدا بە تووڕەیی و نائارامییەوە وتی:

- دەڕانم، دەزانم، ئەمە تۆیت؟ زاوا؟ چاک دەزانم.. ئیتر بەسە.
پیتەر پتروڤیچ هەستی بە سووکایەتی کرد. بەڵام بێدەنگ بوو، دەیویست تا زووە لە مانای قسەکانی ڕاسکۆلنیکۆڤ بگات، بێدەنگیی ماوەیەکی خایاند.
هەر لەو کاتەدا کە ڕاسکۆلنیکۆڤ بۆ وەڵامدانەوەی ڕووی تێکردبوو، لەناکاودا دووبارە بە وردی کەوتەوە تەماشاکردنی، ئەمەندە سووسەکەرانە لێی ڕوانی، دەتوت کەمێک لەوەوبەر دەرفەتی ئەوەی نەبووبوو چاک سەروبەندی لێبگرێت و هەڵیسەنگێنێت، یان لەوانەیە شتێکی تازەی تیا دۆزیبێتەوە، بۆیە کەمێک سەری لەسەر سەرینەکە بەرز کردەوە، لە ڕاستییشدا لە تێکڕای سیمای پیتەر پتروڤیچدا شتێک بەتایبەتی سەرنجی ڕادەکێشا، هەر ئەم حاڵەتەیش بوو ئەو ڕاستییەی دەسەلماند کە بۆچی بەبێ سێودوو ڕاسکۆلنیکۆڤ بە "زاوا" ناودێری کرد. یەکەم ئەوە زۆر ئاشکرا بوو، تەنانەت لەڕادەبەدەر هەستی پێدەکرا کە پیتەر پتروڤیچ هەوڵی زۆری داوە سوود لەم چەند ڕۆژە کەمە وەربگرێت، کە لە پایەتەختە، بۆ ئەوەی بتوانێت لە ماوەی چاوەڕوانیکردنی دەزگیرانەکەیدا خۆی قۆز و ڕێکوپێکتر بکات، دیارە ئەمە کارێکی ڕەوایە و نیازپاکیی ئەو دەردەخات. بۆیە دەبوو، بە هۆی ئەو پێشهاتانەوە کە دروست بوون، لە هەستی خۆبەزلزانیە زۆرەکەی ببووردنایە. لەبەر ئەوەی کە ئەو هەر بە ڕاستی زاوا بوو، دەشیا هەموو جلەکانی کە تازە لای بەرگدروو هاتبوونەوە و گەلێک شیک بوون، بە جوانترین بەرگ بدرانایەتە قەڵەم، تەنیا ئەوە نەبێت کە گەلێک زراف بوون و بۆ مەبەستێک و بۆنەیەکی تایبەتیش لەبەرکرابوون، کڵاوە خڕ و نوێ و ڕێکپۆشەکەیشی ئەم ڕاستییەی دەسەلماند: پیتەر پیتروڤیچ زۆر بە ڕێزەوە ڕەفتاری لەگەڵ کڵاوەکەیدا

دەکرد، لەرادەبەدەر بە دەستییەوە دەگرت و ئاگاداری بوو. جووتە دەستکێشە گەلێک دەلال و وەنەوشەییەکەی کە لە پێشانگای "ژڤان" کڕیبووی‌ بەڵگەی ئەو ئامانج و مەبەستە بوو، لەبەر ئەوەی هێشتا دەستکێشەکە تەواو تازەبوو، چونکە لەباتیی ئەوەی لە دەستیان بکات، هەر بۆ نواندن بە دەستییەوە دەگرتن..

بەرگی لۆژین زیاتر ڕەنگی کراوە و قەشەنگ و بەباقوبریق بوون، ڕەنگی چاکەتەکەی قاوەییەکی کاڵ و پانتۆڵەکەی ناسک و هێلەکەکەیشی لە قوماشێکی هەمان جۆری پانتۆڵەکەی بوو، کراسێکی تازەی زۆر ناسک و بۆینباخەکەیشی لە قوماشێکی شیرین و خەتی گوڵینی تیابوو، لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو، کە گشت ئەمانە لەگەڵ دیمەن و سیمای پیتەر پتروڤیچدا بە تەواوی دەگونجان. دەموچاوی تەڕوتازە و تەنانەت دەلالیش بوو، بێ ئەمانەیش تەمەنی لە چلوپێنجساڵی کەمتر دەینواند، ڕیشێکی تەنک لە لاجانگییەوە لە شێوەی چوارچێوەیەکی ناسکدا تا سەر چەناگەی دەهات، چەناگەی تازەتاشراوی بریسکەی لێوە دەهات، لەوێدا ڕیشی پڕتر دەبوو، تەنانەت قژی کە کەمێک بە لای سپێتیدا دەینواند و لای سەرتاش بە باشی شانە و چاک کرابوو، نە جێگای پێکەنین و نە ڕوویەکی گەمژانەی پێدەبەخشی، چونکە ئاسایی لەو شێوازە قژچاککردنەدا ئاسەوارێکی وا جێ دەمێنێت و مرۆڤ بە ناچاری ئەو پیاوە ئەڵمانییەی دێتەوە بیر، کە خۆی دەگۆڕێ و بۆ خوازبێنی دەچێت، ئەگەر لەو ڕووە جوان و شکۆمەندەدا ئاسەوارێکی نابەجێ و ناپەسەند بەرچاو بکەوتایە، ئەوە هۆی تری هەبوو.

دوای ئەوەی ڕاسکۆلنیکۆف بێباکانە جەنابی لۆژینی هەڵسەنگاند، زەردەخەنەیەکی تەوساوی هاتە سەرلێو، دیسانەوە سەری لەسەر

سەرینەکە نایەوە و لە بنمیچەکەی ڕوانییەوە. وەلێ جەنابی لۆژین خۆی گرت، وەک ئەوەی بڕیاری دابێت ماوەیەک ئەو ڕەفتارە سەیرانە بەسەر خۆیدا نەهێنێت. پاشان بە ناچاری بێدەنگییەکەی شکاند و دەستی بە قسە کردەوە:

- زۆر بە داخەوەم کە تۆ بەم حاڵەوە دەبینم، ئەگەر بمزانیایە نەخۆشیت، زووتر دەهاتمە دیدەنیت، بەڵام دەزانیت چەند ئەرکم گرانە! بێجگە لەوەی کە وەک پارێزەرێک کار دەکەم، کاری تا ڕادەیەک گرنگی ئەنجومەنی پیرانیشم لەسەرشانە. ئەمە بێجگە لە سەرقاڵیی تر کە بێگومان خۆتان دەرکی دەکەن. هەر لە ئێستایشەوە چاوەڕێی دایک و خوشکتم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ جووڵا و ویستی قسەیەک بکات، لە دەموچاویا جۆرە هەڵچوونێک بەدی دەکرا، پیتەر پتروڤیچ بێدەنگ بوو، چاوەڕێی کرد، کە زانیی دەنگ نەبوو، کەوتەوە قسە:

- .. بەڵێ لە ئێستاوە چاوەڕێم، وەک سەرەتا خانوویەکیشم بۆ گرتوون.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دەنگی نزم وتی:

- لە کوێ؟

- تا ڕادەیەک نزیک بە ئێرەیە، لە ماڵی (باکالیڤ)[1].

ڕازومیخین قسەی پێبڕی:

- واتا لە "وازنسینسکی" تەلارەکە دوو نهۆمە بە هەموو کەرەسەکانی ناوماڵەوە "یوشین" بە کرێیان دەدات. من لەوێ بووم.

- بەڵێ بە هەموو کەرەسەکانەوە.

---

[1] *Bakaleyef*

ڕازومیخین وتی:
- شوێنێکی پیسوپۆخڵ، بۆگەن و ترسناکە، لەگەڵ ئەمانەیشدا گومانی لەسەرە، لەوێدا کارەساتی سەیر ڕووی داوە، خوا نەبێت کەس نازانێت کێ لەوێدا دەژی.. من خۆیشم بە بۆنەی بەسەرهاتێکی ئابڕووبەرەوە ڕێم لەوێ کەوتووە، بەڵام نرخەکەی هەرزانە.
پیەتر پتروڤیچ بە ئەدەبێکی دەستکردەوە وتی:
- هەڵبەت من نەمدەتوانی ئەم هەموو شتانەی لێوە بزانم، چونکە خۆیشم تازە بەوێم زانیووە، وەلێ دەبێت ئەوە بڵێم ئەو دوو ژوورەی کە لەوێ گرتوومە، زۆر پاک و خاوێنن، لەبەر ئەوەیش کە تا ڕادەیەک بۆ ماوەیەکی کورتە..
پاشان ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و بەردەوام بوو لە قسەکردن:
- من لە ئێستاوە ماڵی خۆمانم پەیدا کردووە، واتا ئەو شوێنەی کە دەبێتە ماڵی ڕاستەقینەمان وئێستا لە چاککردنیدام، تا ئەو کۆتایی دێت، ناچارم لە ژووری کرێدا بژیم، کە هەموو شتێکی تیا بێت. من خۆم لە ئێستادا دوو هەنگاوێک لێرەوە دوورم، لە ماڵی لیپێ ڤێخزێلا[1] لە ئاپارتمانی هاوڕێیەکی لاومدا ئاندری سیمونوڤیچ لێبزیاتینکۆف[2] دام، هەر ئەویش تەلارەکەی باکالیڤی پیشان دام.
ڕاسکۆلنیکۆڤ وەک شتێکی بیر کەوتبێتەوە، بە هێوری وتی:
- لای لێبزیاتینکۆف؟
- بەڵێ، ئاندریێ سیمونوڤیچ، کارمەندی وەزارەتێکە، دەیناسیت؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی دایەوە:

---

[1] *Lippevekhzel*

[2] *Andrei semyonovich Lepezyatnikof*

- نا.. نەخێر.
- ببوورە، وا لە پرسیارەکەت تێگەیشتم، سەردەمانێک من خاوەنداری بووم، لاوێکی زۆر چاک و دروستە و.. منیش لای خۆمەوە مامەڵەی گەنجان و تێکەڵیانم پێخۆشە، لەوانەوە پیاو دەتوانێت فێری شتگەلێکی تازە بێت.
پیەر پتروڤیچ تەماشای ئامادەبووانی کرد و بە تەمای ئافەرینکردنیان بوو.
ڕازومیخین پرسی:
- ئاخر لە چ بارەیەکەوە؟
پیەر پتروڤیچ خۆشیی لە پرسیارەکە هات و وتی:
- بە تەواوی ڕاستییەوە ئەمە دەڵێم، لە باری ناوکی مەبەستەکەوە، ئاخر دەزانیت من دە ساڵە نەهاتوومەتە پترزبورگ، هەڵبەت هەموو ئەم شتە تازانە، گشت گۆڕانە فیکرییەکان گەیشتونەتە ناوچەکانی ئێمە، بەڵام بۆ ئەوەی شتەکان زیاتر بە چاکی و ڕوونی ببینیت، دەبێت لە پتروزبورگدا بیت. بە بڕوای من باشترین ڕێگە بۆ تێگەیشتن سەرنجدانە لە بارودۆخی گەنجەکانی خۆمان و من دان بەمەدا دەنێم و خۆشحاڵیشم.
- لە چی خۆشحاڵیت؟
- پرسیارەکەتان فرەلایەنە، ڕەنگە هەڵە بم، بەڵام من وا دەزانم کە لە گەنجاندا، سەرنجی ورد و ڕوون، توانایەکی زۆری ڕەخنەگرتن، بیرکردنەوەیەکی فراوان هەیە.
زوسیموف بە لالووتێکەوە وتی:
- ئەمە ڕاستە.
ڕازومیخین هاتە ناوەوە و وتی:

- درۆ دەکەیت، چ بیرێک لە ئارادا نییە، بیری کۆک بە زەحمەت دێتە دەست و هەر لە خۆوە لە ئاسمانەوە داناکەوێت، ئێمە نزیکەی دوو سەد ساڵە دەستی کار و کردەوەمان لە بنی هەمانەکەوە دەرچووە.
ڕووی لە پیتەر پتروڤیچ کرد و وتی:
- دەشێت هزرێک لەئارادا بێت ئارەزووی چاکسازی هەبێت، هەرچەندە بە شێوەیەکی منداڵانەیش بێت، خانەدانی و جوامێریش لە نێو ئەم هەموو فێڵزان و تەڵەکەبازانەدا کە هێرشیان هێناوەتە ئێرە، بەرچاو دەکەوێت. وەلێ لەگەڵ ئەمانەیشدا کاروکردەوەی زۆر لەئارادا نییە. دەشێت چاوەڕێی کاری چاکە لە بازرگانێکی چەکمەڕەق بکرێت!
پیتەر پتروڤیچ بە هەستێکی ڕەزامەندانەوە وەڵامی ڕازومیخینی دایەوە:
- من لەگەڵ بۆچوونەکانی تۆدا نیم، بێگومان هەڵە و لەڕێدەرچوون هەیە، وەلێ دەبێت چاوپۆشیش هەبێت، لەڕێدەرچوون بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو کەسانە حەزیان بە کارە و ئێستا لە هەلومەرجێکدا دەژین، کە ئەو کارانەیان بۆ دەستەبەر ناکرێت. ئەگەر ئەوەی ئەنجام دراوە، کەمە، بەڵام کاتی تەواوییش لەبەردەستا نەبووە، هەروەها باس لە هۆکارەکانیش ناکەین، کە بەدی نەهاتوون. بە ڕای من گەر ڕاستت دەوێت، تەنانەت هەندێک کاریش هەر کراون، بۆ نموونە بیری نوێ و بەسوود بڵاو بوونەتەوە، هەروەها بەرهەمی تازەی بەکەڵک لە جێی بەرهەمی خەیاڵاوی و ڕۆمانسیی کۆن بڵاو بۆتەوە، ئەدەبیات ڕەنگی پوختەتر بووە، گەلێک لە وەهمە زیانبەخشەکان بوونەتە مایەی گاڵتەجاڕی و ڕیشەکێش کراون.. بە کورتی، ئێمە پەیوەندی خۆمانمان

به تەواوی لەگەڵ ڕابووردوودا بڕیووە، ئەمەیش بە ڕای من لە خۆیدا کاریکە..".

لەپڕێکدا ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:

- بەوەی لەبەری کردووە، خۆی دەنوێنێت.

پیتەر پتروڤیچ کە گوێی لە قسەکانی نەبوو، پرسی:

- چۆن؟

بەڵام وەڵامی نەبوو.

زوسیموف بەپەلە وتی:

- هەموو ئەمانە ڕاستن.

پیتەر پتروڤیچ بە خۆشییەوە تەماشای زوسیموفی کرد و وتی:

- وانییە؟

پاشان ڕووی لە ڕازومیخین کرد، وەک ئەوەی هەست بە سەرکەوتوویی و جۆرە گەورەییەک بکات، وتی:

- دەبێت بڕوا بەوە بکەیت..

لەوەدا بوو بڵێ "گەنجی بەڕێز"، بەڵام کەوتەوە سەر قسەکانی پێشوی:

- کە هەنگاو بەرەو پێشەوە نراوە. سەرکەوتن لە بواری زانستی و ئابووریدا بەدەست هاتووە..

- ئەمانە وتراون و دووبارە دەبنەوە.

پتروڤیچ زۆر بەپەلە هاتەوە سەر قسەکانی:

- نا، دووبارە نین، بۆ نموونە ئەگەر تا ئێستا منیان فێری ئەوە کردبێت کە خزمەکانم خۆش بوێت و منیش خۆشم ویستبن، ئەنجامی ئەمە چۆن شکاوەتەوە؟ ئەنجامەکەی ئەوە بووە کە من پاڵتۆکەم کردۆتە دوو پارچە و یەکێکیانم داوەتە خزمەکەم و هەردووکمان بە نیوەڕووتی ماوینەتەوە، بەپێی ئەو پەندە ڕوسییەی

کە دەڵێت: "ئەگەر لەیەک کاتدا بکەویتە دوای چەند کەروێشکێک، هیچیانت دەستگیر نابێت" وەلێ زانست دەڵێت: لە پێش هەر کەسێکەوە تەنیا خۆتت خۆش بوێت، لەبەر ئەوەی هەموو شتێک لە دنیادا لەسەر سوودی تایبەتی دامەزراوە، ئەگەر خۆتت خۆشویست، ئەوسا کارەکانت وەک خۆیان بەڕێوە دەچن و پاڵتاوەکەیشت هەر بە تازەیی دەمێنێتەوە. هەقیقەتی ئابووری ئاماژە بەوە دەکات، کە چەند لە کۆمەڵگادا ژیانی تایبەتی تاکەکان دەستەبەر کرابێت و پاڵتۆکان زورتر و چاکتر بن، هەر بەو ئەندازەیە کۆمەڵگا پتەوتر دەبێت و کاروبارە گشتییەکان و سوودە گشتییەکان بەرەوپێشتر و سەرکەوتوتر دەچن. بەم پێیە ئەگەر من بۆ خۆشیی ژیانی تایبەتی خۆم تێبکۆشم، وەک ئەوە وایە کە بۆ خۆشیی ژیانی هەموان تێکۆشابێتم و وەک ئەنجامیش هەوڵی ئەوەم دابێت کە یەکێکی تریش لە دەستکەوتنی زیاتر بەهرەمەند بووبێت، ئەمەیش لە بەخششی چەند کەسێکەوە نایەتە دی، بەڵکو دەبێت هەموو لەو بەخشش و خۆشگوزەرانییەدا هاوبەش بن. بیرۆکەکە سادەیە، بەڵام بەداخەوە بۆ بەدیهاتنی ماوەیەکی زۆری دەوێت، چونکە تا ئێستا پەردەیەکی بەوەهم و خەیاڵی پیادراوە و شاراوەتەوە، هەرچەندە کەمەهۆشیارییەکی دەویست بۆ ئەوەی بتوانیت پەی پێبەریت.

ڕازومیخین بە ڕەقی دەمکوتی کرد:

- ببوورە، منیش هۆشیار نیم و ئەمەندەیش بەسە. ئاخر، من لە قسەکانمدا ئامانجێکم هەبوو، ئەگینا ئەم هەموو چەنەبازی و دڵی خۆخۆشکردنە، ئەم هەموو دووبارە و سێبارەیە، سێ ساڵە نەفرەتیان لێدەکەم، بە خودا، نەک خۆم، تەنانەت کە خەڵکی تریش لەو بارەیەوە قسە دەکات، من سوور دادەگەڕێم. تۆ زۆر پەلەت کرد لە دەربڕین و

باسکردنی بیرو بۆچوونەکانتدا، دەشێت لەمە خۆش بیت و من سەرکۆنەت ناکەم لەسەری، وەلێ من تەنیا ئەمەوێت بزانم کە تۆ کێیت؟ چۆن لەم دواییەدا بازرگانە نابووت و بچووکەکان دەستیان داوەتە ئەو کارانە کە سوودی گشتییان تیایە؟ لە کاتێکدا کە ئەوان لە پێناوی بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیاندا، هەموو شتێکیان پۆخڵ کردووە! کەواتە ئیدی بەسە.

جەنابی لۆژین کە بە ویقارێکی یەکجار زۆرەوە خۆی تەیار کردبوو، دەستی بە قسان کرد:

- بەڕێز، ئایا بەم ڕاشکاوییەتان مەبەستتان لەوەیە کە منیش..

ڕازومیخین قسەی پێبڕی:

- ببوورە.. ببوورە. نازانم، وەلێ ئیتر بەسە.

ڕووی بەرەولای زوسیموف وەرگێرا و لەسەر قسەکانی پێشووی ڕۆشت.

پیتەر پتروڤیچ هێند ئاقڵ بوو کە وەڵام و ڕوونکردنەوەکان زوو بسەلمێنێت، بەڵام دوای دوو دەقیقە بڕیاری ڕۆیشتنی دا، بۆیە ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و وتی:

- هیوادارم ئەم دۆستایەتییەی کە ئەمڕۆ دەستمان پێکرد، دوای چاکبوونەوەتان و بەپێی ئەو هەلومەرجەی کە خۆت دەیزانی، توندوتۆڵتر بێت.. بەتایبەتی هیوای چاکبوونەوەت بۆ دەخوازم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ تەنانەت سەریشی وەرنەگێڕا، پیتەر پتروڤیچ جووڵا بۆ ئەوەی هەستێت، زوسیموف ڕوو بە ڕازومیخین وەک پاڵپشتیی لێبکات، وتی:

- حەتمەن یەکێک لەوانە کوشتوویەتی کە بارمتەی لاداناوە.

ڕازومیخینیش هەر بەو زمانە وتی:

- حەتمەن کاری ئەوانە، پۆرفیری بۆچوونی خۆی دەرناخات، بەڵام لە هەموو ئەو کەسانە دەکۆڵێتەوە، کە بارمتەیان لای ئەو ژنە داناوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دەنگی بەرز وتی:

- لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەوانەدا دەکات، کە بارمتەیان هەبووە؟

- بەڵێ، ئەی بۆ؟

- هیچ

زوسیموف پرسی:

- جا ئەوانە لە کوێ پەیدا دەکات؟

- هەندێکیان کوخ دەیزانێت، ناوی هەندێکی تریشیان لەسەر بەستەی بارمتەکانە، هەیشیانە هەر کە بیستیان، خۆیان هاتن..

- سەیرە! ئەوەی ئەو کارەی کردووە، زۆر زۆڵ و زرنگ و بەئەزموون بووە، چەند بوێر! چەند بە ورە!

ڕازومیخین قسەی پێبڕی:

- نا، کێشەکە لەمەدایە کەوا نییە، مەسەلەکە وانییە، کە ئێوە بۆی چوون. بە بڕوای من ئەو کەسە نە زرنگە و نە خاوەن ئەزموونە و ئەمەیش یەکەم کاری لەو جۆرەیە، کە کردوویەتی. ئەگەر وای دابنێیت کە ئەمە کاری کەسێکی زرنگ و کردەیە، کەواتە نەدەبوو وا بکرایە، بەڵام ئەگەر گریمانەکە وابێت کە کەسێکی بێئەزموون کردوویەتی، دەبینیت تەنیا ڕێکەوت لەو بەدبەختییە ڕزگاری کردووە. جا ڕێکەوت چی ناکات؟ ڕەنگە پێشبینیی ئەوەیشی نەکردبێت کە چی بەسەر دێت! ئەی کارەکەی چۆن ئەنجام داوە؟ بەم جۆرە: ئەو شتانەی هەڵگرتووە، کە قیمەتیان دە ڕۆبڵ یان بیست ڕۆبڵە و گیرفانی لێ پڕ کردوون. بە ناو بەستە و سنووقی پیرێژنەکەدا گەڕاوە. لە کاتێکدا کە لە چەکمەجەی سەرەوەی دۆلابەکەدا، بێجگە لە پارەی وردە، هەزار و

پێنجسەد ڕۆبڵی کاشی تیا بووە. تەنانەت دزییشی نەزانیووە، تەنیا شتێک کە توانیوویەتی بیکات، کوشتنەکە بووە، ئەمە یەکەمجاری بووە، پێت دەڵێم ئەمە یەکەمجاری بووە و ئیتر سەری لێشێواوە، ڕزگاربوونیشی بێنەخشە و بەڕێکەوت بووە.

پیەر پتروڤیچ کە هێشتا بە دەستکێش و کڵاوەکەی دەستییەوە ڕاوەســـتا بوو و دەیویست

پێش ئەوەی بڕوات قسەیەک لەو بارەیەوە بکات. ڕووی لە زوسیموف کرد و وتی:

- وا بزانم لەبارەی کوشتنی ئەو پیرێژنەوە قسە دەکەن، کە ژنی کارمەندێک بووە.

دیار بوو لۆژین زۆری لا خۆشبوو پێش ئەوەی بڕوات، ئاسەوارێکی باش لە دوای خۆیەوە بەجێ بهێڵێت. ئەمەیش بەشێک بوو لەو خۆدەرخستن و نەرجسیەتەی هزری تەنیبوو.

- بەڵێ، تۆیش بیستووتە؟

- ئەی چۆن! هەموو دراوسێکان..

- لە هەموو وردەکارییەکانی بەئاگایت؟

- بە تەواویی نا، بەڵام ئەوەی سەرنجڕاکێشە، شتی ترە، واتا مەسەلەیەکی فرەلایەنە، با لەوە گەڕێین کە لەم پێنج ساڵەی دواییدا، بە تایبەتی لە ناو چینەکانی خوارەوەدا تاوان زۆر بوە، با واز لە تاڵانکردن و ئاگربەربوونەوەی بەردەوامیش بهێنین، لە هەموو ئەمانە سەیرتر بە لای منەوە ئەوەیە، کە کێشەی تاوانکردن لە چینەکانی سەرەوەدا ڕوو لە زیادیە، هەر بە هەمان شێوەی کە لە چینەکانی خوارەوەدا هەیە. لەلایەکەوە دەبیستین کۆنە قوتابییەک لە شەقامێکی گشتیدا پەلاماری گالیسکەیەکی پۆست دەدات، لە شوێنێکی دی

دەبیستین کەسانێکی بەپلەوپایە دراوی ساختە دروست دەکەن، هەروەها دەبیستین لە موسکۆ، گروپێک بە تۆمەتی ئەوەی ساختەیان لە بلیتی بەخت کردووە، گیراون و پاشان دەردەکەوێت کە یەکێک لە سەرکردەکانی ئەو گروپە مامۆستایەکی مێژووی گشتییە. دواجاریش، یەکێک لە کارمەندەکانی سەفارەتمان لە دەرەوە، لەسەر پارە یان کارێکی نهێنی دەکوژرێت! جا ئەگەر ئێستا ئەم پیرێژنە سووخۆرە بە دەستی یەکێک لەوانە کوژرابێت، کە لە چینی سەرەوەن و هەروایشە، چونکە وەک من بزانم چینی هەژاران زێڕیان نییە بیکەنە بارمتە و لای ئەو دایبنێن. کەواتە ئەم بێسەرەوبەرەییەی کۆمەڵگای ئێمە کە کۆمەڵگایەکی شارستانییە، چۆن لێک دەدرێتەوە؟

زوسیموف وتی:

- وەرچەرخانە ئابوورییەکان دەوری سەرەکیان هەیە لە بوونی ئەم دیاردەیەدا.

ڕازومیخین وتی:

- چۆن لێکی بدەینەوە؟ ئاسانە، بەوەی کە گیانی کارکردنمان تیا مردووە و بیریشمان نەزۆکە.

- یەعنی چۆن؟

- یەعنی ئەو مامۆستای مێژووەی کە بلیتی ساختەی دروست دەکرد، کاتێک لێیان پرسی بۆ ئەوە دەکات، وتی: "خەڵکیی بۆ ئەوەی دەوڵەمەند بن، هەموو ڕێگەیەکی جیاواز لەبەر دەگرن، بۆیە منیش ویستم زوو دەوڵەمەندبم". وشەکانی ئەوم وەک خۆی لەبیر نییە، بەڵام پوختەی قسەکانی وا بووە، کە دەیەوێت زووتر و بەبێ ماندووبوون سامان بەدەست بهێنێت. ئێمە وا ڕاهاتووین هەموو شتێکمان بە ئاسانی بێتە دەست؟ بار بین بەسەر کەسانی ترەوە و

تیکەی جوراوی خەڵکی بخۆین، بەڵام لە کاتی خۆیشیدا هەموو کەسێک وەک هەقیقەتی خۆی دەردەکەوێت..
- ئەی ڕەوشت چۆن.. ئەی یاسا و بیروباوەڕ؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ خێرا هەڵیدایە:
- ئاخر، بۆ نیگەرانیت؟ ئەم ئەنجامە تەواو لەگەڵ تیزەکەی تۆدا ڕێک هاتوتەوە.
- چۆن ڕێکە لەگەڵ تیزی مندا؟
- ئەوەی کەمێک لەمەوبەر ڕاتدەگەیاند، ئەگەر بیگەیەنیتە کۆتایی، دەگەیتە ئەو ئەنجامەی کە مرۆڤکوشتن ڕەوایە.
لۆژین هاواری لێهەستا:
- تکایە!..
ڕوسیموف وتی:
- نەخێر، وا نییە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ڕەنگی پەڕیوویەوە هێشتا پاڵکەوتبوو، لێوی سەرەوەی دەلەرزی، هەناسەیشی سوار بوو.
لۆژین بەردەوام بوو لەسەر لووتبەرزی و خۆبەزلزانینەکەی:
- هەموو شتێک سنووری خۆی هەیە، بیرۆکەی ئابووری بانگەشەی کوشتن نییە، ئەگەر وایش تێبگەین..
دیسانەوە ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دەنگێکەوە کە ڕکەکەی دەیبڕی و هەستت دەکرد شادمانییەکی ناجۆری تیایە، قسەکانی پێبڕی و وتی:
- ڕاستە تۆ.. ڕاستە تۆ بە دەزگیرانەکەتت وتوە.. لەو ساتەدا کە ڕەزامەندیی خۆی دەرخستووە بۆ ئەوەی شووت پێبکات، کە زیاد لە هەموو شتێک تۆ بەوە دڵخۆشیت کە.. ئەو هەژار و نەدارایە، چونکە هەڵبژاردنی ژن لە ناو هەژاراندا سوودی زۆرە، لەبەر ئەوەی پیاو

دەتوانێت بەسەریدا زاڵ بێت و ئەوەی بەچاودا بدات، کە بەختەوەری ئەو بە هۆی مێردەکەیەوەیە؟
ڕقی لۆژین ئەوەندە هەڵچوو، دەتوت دەیەوێت لە پێستی خۆی بچێتە دەرێ، هاواری کرد:
- گەورە و بەڕێز، گەورە و بەڕێز، چۆن بیرۆکەکەیان شێواندووە! بمبوورە، وەلێ دەبێ پێت بڵێم ئەو قسەیەی بەرگوێت کەوتوە، یان داویانە بە گوێتا، هیچ بنەمایەکی ڕاستیی تیا نییە.. منیش.. هەست دەکەم کێ.. بە کورتی.. ئەم تیرە دایکت.. ئەو لەمەیش بترازێت، لەگەڵ هەموو ئاکار و سیفەتە مەزنەکانیدا، بە بڕوای خۆم خاوەنی بیری فانتازیا و گیانی ڕومانسیەتە.. لەگەڵ ئەمانەیشدا من ئەو هەستەم لانەبوو ئەو بەو شێوە شێوێنراوە بیر لە بۆچوونی من بکاتەوە، کە من هەزاران فرسەخ لەو بیرکردنەوەیە دوورم، ئیتر.. ئیتر..
ڕاسکۆلنیکۆڤ کەمێک هەستا و پاڵی بە سەرینەکەوە دا، بە نیگایەکی تیژ و درەوشاوەوە چاوی تێبڕی و دەنگی بەرز کردەوە:
- دەزانیت؟ دەزانیت.
لۆژین پرسی:
- چی بزانم؟
لۆژین بێدەنگ بوو، لە ڕوویدا وەستا و کەوتە چاوەڕوانی، بێدەنگییەکە چەند چرکەساتێکی خایاند.
ڕاسکۆلنیکۆڤ پێی وت:
- دەزانیت، ئەگەر تۆ جارێکی دی.. پرکێشی ئەوە بکەیت تەنانەت تاقەوشەیەک دەربارەی.. دایکم بڵێیت.. من لە قالدرمەکانەوە فڕێت دەدەمە خوارێ.
ڕازومیخین هاواری لێهەستا:

- ئەوە تۆ چیتە؟
- هەر ئەوەیە.
ڕەنگ بە ڕووی لۆژینەوە نەما، لێوی برد بەدەما و وتی:
- ئاوا..
پاشان بەزۆر بەری لە ڕقەکەی خۆی گرت، بەدەم هەناسەتوندییەکی زۆرەوە دەستی بە قسان کرد:
- گوێ بگرە جەناب، من هەر لە سەرەتاوە، کە هاتمە ئێرە، هەستم بە دوژمنایەتیی تۆ کرد، بۆیە زیاتریش مامەوە، تا زۆرتر تێبگەم، دەمتوانی زۆر شت بە نەخۆشێک و خزمێکی خۆم ببەخشم، وەلێ ئێستا.. بەرانبەر بە تۆ.. هەرگیز ناتبەخشم.
ڕاسکۆلنیکۆڤ هاواری کرد:
- من نەخۆش نیم.
- جا خراپتر..
- بڕۆ گوم بە لەبەرچاوم.
بەڵام لۆژین بەبێ ئەوەی کۆتایی بە قسەکانی خۆی بێنێت، لە چوونەدەرەوەدا بوو، دیسان بە نێوان کورسی و مێزەکەدا تێپەڕی، ئەمجارە ڕازومیخین هەستا تا ڕێگەی بکات. لۆژین بەبێ ئەوەی سەیری کەس بکات و تەنانەت سەرێک بۆ زوسیموف دانەوێنێت، کە ماوەیەک بوو ئاماژەی ئەوەی بۆ دەکرد دەست لەسەری نەخۆشەکە هەڵبگرێت و وازی لێبێنێت، لە ژوورەکە چووە دەرێ، کە خۆی دانەواند بۆ ئەوەی لە دەرگاکە ڕەت بێت، کڵاوەکەی هەر بۆ ئیحتیات تا ئاستی شانی بەرز کردەوە، تەنانەت لە دانەوینەکەیشیدا هەستت دەکرد باری سووکایەتیپێکردنێکی زۆری لەکۆڵ گرتووە و لەگەڵ خۆیدا دەیباتە دەرێ.

ڕازومیخین بەدەم ڕامان و سەر ڕاوەشاندنەوە بە ڕاسکۆلنیکۆڤی وت:
- ئایا ئەمە دەبێت، شتی وا دەشێت؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ ئاگری گرت و نەڕاندی:
- لێم گەڕێن، هەمووتان وازم لێبێنن، خوێنخۆرەکان، بۆ دەست لەسەرم بەرنادەن؟ من لێتان ناترسم، من ئیدی ناترسم، لە هیچ کەس ناترسم، بڕۆن، حەز ئەکەم تەنیا بم، تەنیا، تەنیا، تەنیا.
زوسیموف بەسەر ئاماژەی بۆ ڕازومیخین کرد و وتی:
- با بڕۆین.
- باشە، دەبێت هەر ئاوا بەجێی بهێڵین؟
- با بڕۆین.
زوسیموف چووە دەرێ، ڕازومیخین وەستا و پاشان دوای کەوت.
زوسیموف لەسەر پلیکانەکان وتی:
- ئەگەر بە قسەمان نەکردایە خراپتر دەبوو، با لەوە زیاتر هەڵنەچێت..
- ئەمە چییەتی؟
- خۆزگا تەزوویەکی شادیی تێدەگەڕا، ئێستا پێویستی بەمەیە، کەمێک پێشتر هێزێکی تێگەڕابوو.. دەزانیت بیرێکی لەژێر سەردایە، بیرێکی کۆک و سەنگین.. من لەو بیرە دەترسم و حەتمەن هەروایشە.
- ڕەنگە ئەم جەنابی پیتەر پتروڤیچە بێت، لە قسەکانیانەوە وا دەردەکەوت کە دەیەوێت لەگەڵ خوشکی ڕودیادا زەماوەند بکات، ڕودیایش پێش ئەوەی نەخۆش بکەوێت، نامەیەکی لەو بارەیەوە پێگەیشتووە.
- دیارە، دەڵێی شەیتان ئەمڕۆ ئەم زەلامەی هێنایە ئێرە، ڕەنگە هەموو شتەکان تێک بدات. بەڵام دەزانیت ڕاسکۆلنیکۆڤ بەرانبەر بە هەموو

شتێک بێباک و خوێنسارده، له هەموو شتێکدا بێدەنگە، تەنیا له شتێکدا نەبێت کە ئاگر دەگرێت، ئەویش مەسەلەی کوشتنە..
ڕازومیخین قسەکانی بەڕاست وەرگرت:
- وایە، وایە، بە ئاشکرا هەستم پێکرد، تاوانی کوشتن زوو ڕای دەکێشێت و دەترسێت.. دەزانیت بۆ؟ چونکە ئەو ڕۆژەی کە نەخۆش کەوت، ترساندیان، له بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس له هۆش خۆی چوو.
- تۆ ئەمشەو بە درێژی ئەمەم بۆ باس بکە، منیش دوایی شتی ترت پێدەڵێم. من زۆرم مەبەستە، نیو سەعاتی تر سەرێکی لێدەدەم، بەڵام مەترسیی ئەوەی نییە کە تووشی نەخۆشیی مێشک بووبێت.
- سوپاست دەکەم، منیش هەر لای باشنکا چاوەڕێ دەبم، ناستاسیاش دەکەمە چاودێری.
کە ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تەنیا مایەوە، ئۆقرەی لێبڕا، له ناستاسیای ڕوانی، ناستاسیا له ڕۆشتن خۆی دواخست، بە ڕودیای وت:
- دەی، ئێستا چا دەخۆیت؟
- دوایی، دەمەوێت بنووم، لێم گەڕێ.
ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەمەی وت و بە توورەیی و خێرا بەرەو لای دیوارەکە گەڕایەوە، ناستاسیا چووە دەرەوە.

## ٦

هەر کە ناستاسیا چووە دەرەوە، ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستا، دەرگاکەی جووت کرد، ئەو بەستە جلەی ڕازومیخین هێنابووی و خۆیشی گرێی دابوو، کردیەوە و کەوتەوە لەبەرکردنی جلەکان.
شتێکی سەیر بوو، وەک ئەوەی لەپڕێکدا بە تەواوی هێور بووبێتەوە، ئیدی نە ئەو وڕێنەیەی جارانی ما کە شێتئاسا دەیگرت، نە ئەو ترس

و سامەی کە لەم دواییەدا ئازاری پێدەگەیاند، ئەمە یەکەمین چرکەساتی هێمنبوونەوە لەناکاوەکەی بوو، هەڵسوکەوتە ورد و لەسەرخۆ و ڕوونەکەی بەڵگەی بڕوایەکی تۆکمە و سەقامگیری بوو. لەبەر خۆیەوە دەیوت: "هەر ئەمڕۆ، هەر ئەمڕۆ" لەگەڵ ئەمانەیشدا دەیزانی کە هێشتا لاواز و بێتوانایە، بەڵام باری دەروونی و ئەو هێزەی دەیگەیاندە سنووری ئارامی و پتەوی باوەڕی، توانا و هێزی بڕوابەخۆکردنیان پێدەبەخشی، لەلایەکی تریشەوە هیوای ئەوە بوو کە لە کۆڵانێکدا نەکەوێت.

کە جلە تازەکانی بە تەواوی پۆشی، تەماشای ئەو پارانەی کرد، لەسەر مێزەکە دانرابوون و خستنیە گیرفانی، بیستوپێنج ڕۆبڵ بوو، پاشان هەموو ئەو پێنج کوپیکانەی کە لە دەڕۆبڵییەکە باقی مابووەوە و ڕازومیخین دوای کڕینی جلەکان، بۆی هێنابووەوە، خستنیە گیرفانی، ئینجا لەسەرخۆ دەرگاکەی کردەوە، لە ژوورەکە وەدەرکەوت، بە پلیکانەکاندا هاتە خوارێ، تەماشای ناو چێشتخانەکەی کرد، کە دەرگاکەی بە تەواویی کرابووەوە، ناستاسیا پشتی لێی بوو، نووشتابووەوە و فووی لە سەماوەری خاوەن ماڵەکە دەکرد، گوێی لە هیچ نەبوو، بۆ کەس بیری بۆ ئەوە دەچوو کە ڕاسکۆلنیکۆڤ بڕواتە دەرەوە؟ دوای دەقیقەیەک گەیشتە سەر شەقامەکە.

سەعات هەشت بوو، خۆر ڕوو لە ئاوابوون بوو، وەک دوێنێ کەشوهەواکەی خەفەخان بوو، وەلێ ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دڵپڕۆکییەوە هەوا پیس و پڕ لە تۆز و خۆڵەکەی شاری هەڵدەمژی، خەریک بوو سەری گێژ بخوات، لەپڕا هێزێکی ترسناک لە چاوە سوورداگەڕاو و ڕووە زەرد و لاواز و ڕەنگە پەڕیووەکەیەوە دەرکەوت، نەیزانی، یان

هەر لە بیری ئەوەدا نەبوو بۆ کوێ بچێت، تەنیا یەک شتی دەزانی: "دەبێت هەر ئەمڕۆ هەموو کارەکان ئەنجام بدات، یەکژەمی و خێرا، تا نەیکات، ناگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، لەبەر ئەوەی ناتوانێت وا بژی" وەلێ چۆن کارەکە تەواو بکات و کۆتایی پێبهێنێت؟ لەم لایەنەوە هیچی نەدەزانی، هەر نەیشیدەویست بیری لێبکاتەوە، هەموو بیرکردنەوەیەکی لە خۆی دوور دەخستەوە، بیرکردنەوە ئازاری پێدەگەیاند، تەنیا هەستی بەوە دەکرد و دەیزانی کە هەر چۆنێک بووە دەبێت هەموو شتەکان بگۆڕێن، زۆر بە دڵنیایی و بڕوایەکی تۆکمەوە ئەمەی دەوتەوە: "هەر چۆنێک بووە".

وەک خووی پێوە گرتبوو، بە هەمان ئەو ڕێگەیەدا کە جاران پیاسەی پیا دەکرد، ڕاست بەرەو مەیدانی "سننایا" ڕێگەی لەبەر گرت، هێشتا نەگەیشتبووە مەیدانەکە، لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا و بەرانبەر دوکانی وردەفرۆشێک، تارژەنێکی لاوی مووڕەش وەستابوو، گۆرانییەکی زۆر بە سۆزی دەوت، تارژەنەکە کچۆڵەیەکی پانزە ساڵەی گۆرانیبێژی لەگەڵدا بوو، کیژۆڵەکە لەسەر شۆستەکە لە بەردەم کوڕەکەدا وەستابوو، وەک کچی گەنج تەنوورەیەک و پاڵتاوێکی ناسکی لەبەردا بوو، دەستکێش لەدەستا و کڵاوێکی حەسیری کە ڕەنگی پەڕەکانی ئاگرین بوون، لەسەردا بوو. هەموو ئەمانە کۆن و پەڕپووت دەیاننواند. کیژۆڵەکە بە دەنگی گۆرانیبێژە میللیەکان دەیخوێند، دەنگێکی بەچریکە و خۆش و بەئاواز، گۆرانیی دەوت و چاوەڕێی ئەوە بوو دووکاندارەکە دوو کوپیکی بداتێ. ڕاسکۆلنیکۆڤ لە پاڵ دوو سێ گوێگری تردا وەستا و کەمێک گوێی گرت، پاشان پێنج کوپیکییەکی لە گیرفانی دەرهێنا و خستییە نێو دەستی کچۆڵەکەوە، کچۆڵەکە لەناکاوێکدا، لە گرنگترین شوێن و

بەرزترین خاڵی گۆرانییەکەدا وەستا، وەک ئەوەی دەنگی بڕیبێت، بە تووڕەییەوە بە سازژەنەکەی وت: "بەسە". ئەوسا بە جووتە ڕوویان لە دووکانداری دوای ئەو کرد.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەپڕێکدا بە یەکێک لەو گوێگرە بەتەمەنانەی کە لە پاڵ تارژەنەکەدا وەستابوو، لەوەیش نەدەچوو مەبەستێکی هەبێت، پرسی:
- تۆ حەزت بە گۆرانیی سەرشەقامەکانە؟
پیاوەکە تەماشایەکی سەیری کرد. ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەر قسەکانی ڕۆشت، بەڵام بە جۆرێک کە دەتوت هەرگیز قسە لەسەر گۆرانیی سەر شەقامەکان ناکات و وتی:
- پێم خۆشە، لە شەوێکی سارد و تاریک و تەڕی پاییزدا، گوێم لە دەنگی ساز بێت، شەوێکی تەواو تەڕ، ئەو کاتەی دەموچاوی ڕێبوار ئەوەندە شین دادەگەڕێت، کە بە لای سەوزیدا دەڕوانێت، لەمانەیش چاکتر، ئەگەر بەفر، بەبێ با، کلوکلو بێتە خوارێ و لەو ناوەندەدا چرا گازییەکان بدرەوشێنەوە..
پیاوەکە، کە لە لایەک پرسیارەکە و لەلایەکی ترەوە دیمەنە سەیرەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ ترسیان تێگەڕاندبوو، لەبەر خۆیەوە وتی:
- نازانم، بمبوورە.
پیاوەکە بەرەو ئەوبەری شەقامەکە تێی کێشا.
ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕاست کوتای، تا گەیشتە سەر مەیدانی "سێنایا" ئەوە ئەو جێگایە بوو، کە چەند ڕۆژێک لەوەوبەر پیاو و ژنە دووکاندارەکە قسەیان لەگەڵ لیزاڤێتا دەکرد، وەلێ ئێستا لەوێ نەبوون.
ڕاسکۆلنیکۆڤ شوێنەکەی ناسییەوە، وەستا، تەماشای ئەملاوئەولای کرد، لە کوڕێکی گەنج، کە کراسێکی سووری لەبەردا بوو و لە پاڵ دەرگای دەرەوەی نانەوایەک باوێشکی دەدا، پرسی:

- لەم سەرسووچەدا، پیاو و ژنێک.. یان ژنەکەی کاسبیان دەکرد، ها؟
لاوەکە بە لووتبەرزیەوە تەماشای ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد و وتی:
- هەموو جۆرە فرۆشیارێک دێتە ئێرە و کاسبی دەکات.
- ناوی چییە؟
- هەر ناوێک کە لە کاتی تەعمیدا لێی نرابێت، هەر بەو ناوەیش بانگی دەکەن.
- ناشێ تۆ خەڵکی "زارایسک" بیت، لە کامە ناوچەیت؟
لاوەکە دیسان سەیرێکی ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد و وتی:
- گەورە و بەڕێز، ئێمە ناوچەمان نییە، هەرێممان هەیە، هەمیشە براکەم سەفەر دەکات و من لە ماڵەوە دەمێنمەوە، بۆیە هیچ نازانم، داوای لێبوردنت لێدەکەم، گەورە و بەڕێز.
- ئەو نهۆمەی سەرەوە چایخانەیە؟
- میوانخانەیە، بلیاردیشیان هەیە، شازادە خانمییشی تیایە بەە.. بەە..
ڕاسکۆلنیکۆڤ لە ناوەڕاستی مەیدانەکەوە تێپەڕی، لە سووچێکدا کۆمەڵێکی زۆری خەڵک، کە هەموو گوندنشین بوون، وەستابوون. ڕاسکۆلنیکۆڤ خۆی خزاندە ناویان و کەوتە سەیرکردنیان، نەتدەزانی بۆ حەز دەکات لەگەڵ هەریەکێکیاندا بکەوێتە گفتوگۆ، وەلێ جوتیارەکان گوێیان پێنەدا، هەموویان پێکدا دەهاتن و دەنگەدەنگیان بوو. ڕاسکۆلنیکۆڤ وەستا، بیری کردەوە و لە پیادەڕێکەوە بەرەو لای ڕاست و شەقامی "ف" چوو، کە لە گۆڕەپانەکە تێپەڕی، چووە کۆڵانەکەوە.. پێشتر زۆرجار لەم کۆڵانە کورتەوە، کە بە شێوەیەکی چەماوە لە گۆڕەپانەکەوە دەچووەوە سەر شەقامی "سادڤایا"[١]

[١] *Sadovaya*

تێپەڕیبوو. لەم دووایییەدا، کە لە هەموو شتێک وەرز ببوو، زۆر ئارەزووی دەکرد لەم جۆرە شوێنانەدا پیاسە بکات بۆ ئەوەی وەڕزتر بێت. بەڵام ئێستا بیر لە هیچ ناکاتەوە، لەم شوێنەدا ساختمانێکی گەورە هەبوو، هەموو بەشەکانی مەیخانە و چێشتخانە و مەیفرۆشی بوو، لە ناوەوەیدا هەموو چرکەساتێک ژنانێک بە بەرگی ماڵەوە، کە بەو جلانەوە تەنیا بۆ لای دراوسێ دەتوانیت بچیت، بە سەری ڕووت و کراسێکەوە، دەهاتنە دەرەوە، لە دوو سێ شوێنی سەر شۆستەکاندا، بە تایبەتی لە نزیک دەرگای چوونە ژوورەوەی ژێر زەمینەکاندا کە دوای بڕینی دوو پلە دەشیا بڕۆیتە شوێنە خۆشەکەوە، لە دەوری یەک کۆ دەبوونەوە، لە یەکێک لەو شوێنانەدا، لەم کاتەدا، ژاوەژاوێک هەڵایسابوو تەواوی کۆڵانەکەی پڕ کردبوو، گیتاریان لێدەدا، گۆرانییان دەوت و شادمانییەکی تەواو ئەو ناوەی لە ئامێز گرتبوو، کۆمەڵێکی زۆر لەو ژنانە لەبەر دەرگاکە کۆببوونەوە، هەندێکیان لەسەر پلیکانەکان و هەیشیان بوو لەسەر شۆستەکە دانیشتبوون. دەستەیەکیش هەر بە پێوە دەپەیڤین. هەر لەوێدا، لەناوەڕاستی شەقامەکەدا سەربازێکی مەست جگەرەی دەکێشا، بەبێ ئەوەی بزانێت بۆ کوێ دەچێت، دەڕۆیشت و بە دەنگی بەرز جوێنی دەدا، پێ دەچوو بیەوێت بڕواتە یەکێک لە دووکانەکان ، بەڵام خۆیشی نەیدەزانی کامیانە. شڕۆڵەیەک جوێنی بە شڕۆڵەیەکی تر دەدا، بەدمەستێک لە ناوەڕاستی شەقامەکە کەوتبوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ لای ئاپۆرەی ژنانەوە وەستا، ژنەکان بە دەنگی کرخەوە لە ژاوەژاوی خۆیاندا بوون، هەموویان کراسی چیت لەبەردا و کەوش لەپێ و سەریان قۆتی بوو، هەیانبوو تەمەنی لە چل ساڵ تێپەڕیبوو، تیایشیاندا هەبوو تەمەنی حەڤدە ساڵ بوو. زۆربەیان بەری چاویان

ئاوسابوو. ڕاسکۆلنیکۆڤ خۆیشی نەیدەزانی ئەو گۆرانی و هەراوزەنایەی لە ژێرزەمینەکەوە دێت، بۆ ئەمەندە سەرنجی ئەمی ڕاکێشاوە، لەوێدا، لە نێوان قاقای پێکەنین و هاوارهاوارەوە گوێت لە پیاوێک دەبوو کە بە دەنگێکی نەرم و ناسکەوە لەگەڵ گیتارلێداندا گۆرانیی دەوت، هەموو توانای دابووە سەما و بەپێی زەربی گیتارەکە پێی بە زەویدا دەکێشا، ڕاسکولینکۆف بە وردی، بە ڕوویەکی گرژ و بیرێکی ئالۆزەوە، لە بەردەم دەرگای چوونەژوورەوەدا خۆی لار کردبووەوە و گوێی گرتبوو، ماتیگرانە لە پیادەڕێکەوە چاوی بۆ ناو هۆڵەکە شۆڕ کردبووەوە، دەنگە ناسکەکە دەیوت: (تۆ ئەی پاسەوانە خۆشەویستەکەم بە ناهەق لێم مەدە).

ڕاسکۆلنیکۆڤ تامەزرۆی گوێلێگرتنی ئەو شیعرە بوو، وەک ئەوەی گشت مەبەستەکە لەوێدا کۆ بووبێتەوە، لە خۆی پرسی: (چۆن بچمە ژوورەوە؟ قاقا لێدەدەن، مەستن، چۆنە منیش سەرخۆش بم؟)

ژنێکیان بە دەنگێکەوە کە تا ڕادەیەک زرنگەی لێدەهات و هێشتا نەگیرابوو، وتی:

- گەورە و بەڕێز، نایەیتە ژووریّ ؟ ژنەکە گەنج بوو، تەنانەت لە نێو هەموو ئەوانی تردا تاقە ژنێک بوو کە لێی نەدەبێزرایت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕاست بووەوە و تەماشایەکی کرد و وتی:

- چ جوانی!

ژنە زەردەخەنەی هاتیّ، پیاوتنەکەی زۆر لا خۆش بوو، ئینجا وتی:

- تۆیش زۆر جوانیت.

ژنێکی دی بە دەنگێکی گڕەوە وتی:

- چەندە لاوازیت! دەڵێی تازە لە نەخۆشخانە هاتوویتە دەریّ؟

لەپڕێکدا جوتیارێک نزیک کەوتەوە، کەمێک مەست بوو، دوگمەی کراسەکەی کراوە و ڕوویەکی خۆش و زۆرزانانەی هەبوو، قسەکانی بەوان بڕی:

- لەوە دەچێت هەموو کچە سەرتیپ بن، لووتیان کورت و قوتە. بڕوانە لە بەزمیان!

ژنێکیان پێی وت:

- وەرە ژووری، تۆ هەر هاتوویت.

- دێم! گیانەکەم!

جووتیارەکە بە ڕاکردن خۆی بە ژووریدا کرد.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کەوتەوە ڕێ، ژنە گەنجەکە لە دواوە هاواری لێکرد:

- گوێ بگرە بەڕێز.

- چ دەڵێیت؟

ژنەکە پەشۆکا:

- من، گەورە و ئازیز، زۆر خۆشحاڵ دەبم چەند سەعاتێک لەگەڵتابم، بەڵام ئێستا، نازانم بۆ ناتوانم لە بەرانبەرتا هیچ بڵێم، کوڕی باش، شەش کوپیکم بدەرێ با شتێکی پێبخۆمەوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ چی بە دەستەوە هات، لە گیرفانی دەریهێنا، سێ پارچە پێنج کوپیکی بوو.

- ئاە.. چ گەورەیەکی میهرەبانیت!

- ناوت چییە؟

- لە "دوکلید"! بپرسە.

یەکێک لە ژنەکان کە بەسەر ئاماژەی بۆ لای "دوکلید" دەکرد و وتی:

- بەسە ئیتر، ئەمە چ مانایەکی هەیە، هیچ لەمە تێناگەم چۆن پارە وا پەیدا دەکرێت؟ من ئەوەندە هەست بە سووکایەتی و ئازاری ویژدانی خۆم دەکەم، خەریکە بە زەویدا ڕۆدەچم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە وردی بەو ژنەیدا هەڵڕوانی، کە قسەکەی کرد.

ژنێک بوو دەموچاو ئاوڵاوی، تەمەن سی ساڵ، ڕووی شین داگەڕاو و لێوی ئاوسابوو، ڕەخنە و ئاوازەکەی لەسەرخۆ و ئاغر بوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەر بەدەم ڕۆیشتنەوە لەگەڵ خۆیدا دەدوا: "لە کوێ. لە کوێدا خوێندومەتەوە کە یەکێک لەوانەی فەرمانی مەرگی بەسەرا دراوە، سەعاتێک پێش لە سێدارەدانی دەڵێت یان وا بیر دەکاتەوە کە ئەگەر ناچار بکرێت لەسەر لووتکەیەک، یان تاوێرێک بژی، ئەوەندە شوێنەکە تەسک بێت کە تەنیا جێی هەردوو پێی بێتەوە، هەموو چواردەوریشی هەڵدێر، ئۆقیانووس، تاریکستانێکی هەمیشەیی، تەنیاییەکی بەردەوام، زریانێکی هەتاهەتایی بێت و ناچارییش بێت هەموو تەمەنی، یان هەزار ساڵ، لەو شوێنەدا هەتاهەتایە بە پێوە بوەستێت، هێشتا هەر پێی خۆشە وا بژی نەک خێرا بمرێت. تەنیا ژیان، ژیان و ژیان، ئیتر هەر چۆنێک بێت، تەنیا مانەوە و ژیان، ئەمە هەقیقەتێکی سەیرە! خودایا چ هەقیقەتێکە! مرۆڤ چەندە هیچە!.." دوای کەمێکی تر وتی: "بەڵام ئەو کەسەیش کە لەبەر ئەو هۆیە بە مرۆڤ دەڵێ هیچ، خۆیشی هیچە".

ڕاسکۆلنیکۆڤ گەیشتە شەقامێکی دی "ها! کۆشکی بلوزین! ڕازومیخین کەمێک لەمەوبەر باسی کۆشکی بلورینی کرد، وەلێ من چیم دەویست؟ بەڵێ، دەمویست ڕۆژنامە بخوێنمەوە، ئاخر، زوسیموف دەیوت کە لە ڕۆژنامەدا ئەوەی خوێندۆتەوە".

پاشان، که ڕۆیشته ناو ڕیستورانتێکی تا ڕادەیەک گەورە و پاکژەوە، پرسی:
- ڕۆژنامەتان هەیە؟
ژوورەکانی ڕیستورانتەکە تا ئەندازەیەک خاڵی بوون، دوو سێ مشتەری چایان دەخواردەوە، لە ژوورێکی دوورەوە چوار کەس دانیشتبوون و شامپانیایان دەنۆشی، ڕاسکۆلنیکۆڤ وای بۆ چوو کە دەبێت زامیوتفیان تیابێت، بەڵام نەیدەتوانی لەو دوورەوە بیناسێتەوە، بە خۆی وت:
"جا چی تیایە، با لەوێ بێت؟"
بۆیە کە پرسی:
- ڤۆدکات دەوێت؟
- چا دەخۆم، ڕۆژنامە کۆنەکانی پێنج ڕۆژ لەمەوبەرم بۆ بێنە، پارەی ڤۆدکاکەت دەدەمێ.
- بەسەرچاو، ئەمە ڕۆژنامەکانی ئەمڕۆ، ڤۆدکایش دەفەرموویت؟
چا و ڕۆژنامە کۆنەکانیان هێنا، ڕاسکۆلنیکۆڤ دانیشت و کەوتە گەڕان: "ئیزلەر - ئیزلەر- ئانسکی - ئانسکی -ئیزلەر -بارتولا - ماسیمو - ئیزلەر - ئای. نەحلەت لە شەیتان؟ ئەمەیش هەواڵی جۆربەجۆر: ژنێک لەسەر پلیکانەکان کەوتە خوارەوە - پیاوێکی سەرخۆش سووتا- ئاگرکەوتنەوە لە پسکی - ئاگرکەوتنەوە لە شەقامی پتروزبورگ - دیسانەوە ئاگربەربوونەوە لە پتروزبورگ - ئاگرکەوتنەوەیەکی دی لە پتروزبورگ - ئیزلەر - ئیزلەر - ئیزلەر - ماسیمو - ئا، ئەمانەیش..."
سەرئەنجام دەستی بە خوێندنەوەی ئەوە کرد کە خۆی دەیویست، لەبەرچاویدا دێڕەکان هەڵبەزودابەزیان بوو. لەگەڵ ئەوەیشدا

هەواڵەکەی تا دووایی خوێندەوە و بە پەرۆشەوە کەوتە ناو ڕۆژنامەکانی ترەوە تا هەواڵی تازەتری تیا دەست بکەوێت. لە کاتی هەڵدانەوەی لاپەڕەکاندا لە بێتواناییدا دەستی دەلەرزی، لەپڕا یەکێک هاتە سەر مێزەکەی و لە پاڵیا دانیشت. تەماشای کرد، زامیوتف! هەر بە هەمان شێوەی جارانییەوە، بە ئەموستیلە و زنجیرییەوە، بەو جیاوازییەوە کە لە نێوان قژە لوول و ڕەش و ڕۆنلێدراوەکەی، لەگەڵ هێلەکە جوانەکەی و چاکەتە کەمێک پواوەکەی و کراسە تا ڕادەیەک پیسەکەیدا هەبوو، ئەو پێی شاد بوو، لایەنی کەم زەردەخەنەیەکی میهرەبان و ڕەندانەی بەسەر لێوەوە بوو، دەموچاوە گەنم ڕەنگەکەی لە نۆشینی شامپانیاوە سوور داگەڕابوو. بە سەرسووڕماوی و بە دەنگێکەوە کە دەتوت سەدەیەکە ڕاسکۆلنیکۆڤ دەناسێت، وتی:

- چۆنە! تۆ لێرەیت؟ دوێنێ ڕازومیخین پێی وتم کە هێشتا بێهۆشیت. زۆر سەیرە؟ دەزانیت، من هاتم بۆ لات..

ڕاسکۆلنیکۆڤ دەیزانی زامیوتوف دێتە لای، ڕۆژنامەکانی لادا و ڕووی تێکرد، زەردەخەنەیەکی تەوساوی بەسەر لێویەوە بوو، کە تووڕەیی و بێزاریی پێوە دیار بوو، بە هێوری وەڵامی دایەوە:

- دەزانم هاتبوویت بۆ لام، بیستم، بە دوای گۆڕەوییەکانمدا گەڕابووی، ئایا دەزانیت کە ڕازومیخین تۆی خۆش دەوێت و دەڵێت کە تۆ و ئەو چوونەتە لای لیزاڤیتا ئیڤانۆڤنا، ئەوە ئەو ژنەیە کە ئەو ڕۆژە لەسەرت دەکردەوە و لەبەرخاتری ئەو چاوت لە ستوان پوروخ[1] دادەگرت و ئەو نەیدەزانی مەسەلە چییە، لە بیرتە؟ چۆن دەبێت نەزانیت، خۆ مەسەلەکە ڕوون بوو، ها؟

---

[1] *porokh*

- چ بەڵایەکە؟

- کێ؟ پوروخ؟

- نا، ڕازومیخینی هاوڕێت..

- تۆ باش دەژیت جەنابی زامیوتوف، بەبێ پارەوپوول دەچیتە باشترین شوێن. کێ ئێستا لە شەمپانیا تێری کردیت؟

- ئەمە ئێمە.. دەماننۆشی.. ئەوەی تێری کردم؟

- هەقی خۆتە، کەڵک لە هەموو شتێک وەردەگریت!

پاشان دەستی دا بە پشتی زامیوتوفدا و وتی:

- گوێ مەدەرێ، تۆ کوڕێکی زۆر میهرەبانیت، چ خەوشێکی نییە، من ئەوەی کە وتم، بە خراپی نایڵێم، بەڵکو وەک دەڵێن "بەوپەڕی خۆشەویستی و گاڵتەوە" دەیڵێم، ئەمە ئەو قسەیەیە، کە کرێکارەکەی تۆ ئەو کاتەی میتکای بەر مستەکۆڵە دابوو دەیوت، لە بیرتە؟ لەبارەی کوژرانی پیرێژنەکەوە.

- تۆ چۆن دەزانیت؟

- ڕەنگە من لە تۆ زیاتری لێبزانم.

- کابرایەکی سەیریت.. دیارە هێشتا زۆر نەخۆشیت، نەدەبوو بێیتە دەرەوە.

- بە لای تۆوە شتێکی سەیرم؟

- بەڵێ، ڕۆژنامە دەخوێنیتەوە؟

- بەڵێ، ڕۆژنامە.

- ڕۆژنامەکان زیاتر لەبارەی ئاگرکەوتنەوەوە دەنووسن.

- نەخێر من لەبارەی ئاگرکەوتنەوەوە ناخوێنمەوە.

لەو کاتەدا نیگایەکی نهێنیئامێزی لە زامیوتوف گرت، زەردەخەنەیەکی گاڵتەجاڕانە جارێکی دی لێوی پێ لار کردەوە و لە حاڵێکدا کە چاوی لە زامیوتوف داگرت، لەسەر قسەکانی ڕۆشت.
- نەخێر من دەربارەی ئاگرکەوتنەوە ناخوێنمەوە، وەلێ لاوی ئازیز، دەزانم زۆرت پێخۆشە بزانیت چی دەخوێنمەوە، بیلێ، دانی پێدا بنێ.
- هەرگیز ئەوەم مەبەست نییە. هەروا پرسیم، بۆ نابێت بپرسیت؟ تۆ بۆ دەیگەینیتە..
- گوێ بگرە، تۆ پیاوێکی خوێندەوار و ڕوناکبیریت، وایە؟
زامیوتوف بە ویقارەوە وەڵامی دایەوە:
- من لە پۆلی شەشی پەیمانگام.
- پۆلی شەش! ئەی پاسارییە جوانەکەم، بەم سەروقژەوە، بەم ئەنگوستیلانەی دەستتەوە لە پیاوێکی دەوڵەمەند دەچیت! ئای چ کوڕێکی چاکیت!
لێرەدا ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕووبەڕووی زامیوتوف قاقای پێکەنینێکی بێزارکەرانەی لێدا، زامیوتوف سڵەمییەوە، نەڕەنجا، بەڵام سەیری پێهات، زۆر بە جیدی بە ڕاسکۆلنیکۆڤی وتەوە:
- ئای کە سەیریت! من وا دەزانم تۆ هێشتا وڕێنە دەکەیت.
- وڕێنە دەکەم؟ تۆ درۆ دەکەیت پاساری.. باش، من کابرایەکی سەیرم، بەلاتانەوە سەیرم، ها؟ شایانی ئەوەم کە سەیر بم، نا؟
- بەڵێ، وایت.
- کەواتە پێت بڵێم چیم دەخوێندەوە و بە دوای چیدا دەگەڕام؟ بڕوانە پێم وتن چەند ڕۆژنامەیەکم بۆ بێنن، هەقتە گومان بکەیت، وایە؟
- باشە، بیلێ.
- باش گوێت گرت؟

- بۆ گوێ بگرم؟

- دوایی پێت دەڵێم، وەلێ ئێستا، ئازیزەکەم، پێتی ڕادەگەیەنم، نا، چاکتر وایە بڵێم دانی پێدا دەنێم.. نا ئەمەیش ڕاست نییە، من دەیلێم و تۆ یاداشتی بکە، باشە! من دان بەوەدا دەنێم کە دەمخوێندەوە و بەدوای شتیشدا دەگەڕام، دەگەڕام و دەمکۆڵییەوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ چاوی کز کرد و لە قسە وەستا.

- دەمکۆڵییەوە و هەر لەبەر ئەمەیش هاتمە ئێرە.

پاشان زۆر دەموچاوی لە ڕووی زامیوتوف نزیک کردەوە. بە ئاهێکەوە وتی:

- بە دوای کوژرانی پیرێژنەکەدا دەگەڕام، ژنی کارمەندەکە.

زامیوتوف لێی ڕاما بوو، بەبێ ئەوەی بجووڵێت یان دەموچاوی خۆی لە ڕووی ئەو دوور بخاتەوە. ئەوەی لای زامیوتوف لە هەموو ئەم شتانە سەیرتر بوو، ئەوە بوو کە ئەم بێدەنگییە دەقیقەیەکی تەواوی خایاند، تەواوی یەک دەقیقە ئەم دووانە لە یەکتریان ڕوانیی.

لەپڕا زامیوتوف بە سەرسووڕماوی و بێئارامیەوە هاواری کرد:

- باشە، چیت دەخوێندەوە؟ بەڵام ئەمە چ پەیوەندییەکی بە منەوە هەیە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە هەمان لەسەرخۆیی و بەبێ ئەوەی بەرانبەر بە هاوارەکەی زامیوتوف بسڵەمێتەوە، وتی:

- ئەمە ئەو پیرێژنەیە، ئەوەی کاتێک تۆ لە بەڕێوەبەریەتیی پۆلیس سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بوویت لەسەری، لە بیرتە، من بێهۆش کەوتم، باشە، ئێستا تێگەیشتیت؟

زامیوتوف زۆر نائومێدانە وتی:

- لە چی بگەم، نازانم لە چی بگەم؟

ڕووی لەسەرخۆ و هێوری ڕاسکۆلنیکۆڤی لە چرکەساتێکدا گۆڕا و لە ناکاودا وەک پێشتر، بە هەمان قاقای دەمارگیرییەوە دەستی پێکردەوە، بە جۆرێک کە واتدەزانی توانای خۆگرتنی نییە، لە چرکەساتێکدا ئەو هەستەی بە ڕوونی هاتەوە یاد، کە زۆری بەسەردا تێنەپەڕیبوو، ئەو کاتەی هاتەوە یاد، کە بە تەورێکەوە لە پشت دەرگاکەوە وەستابوو، کێلوونەکە دەهات و دەچوو، دووانیش لە پشت دەرگاکەوە جوێنیان دەدا و پاڵیان بە دەرگاکەوە دەنا، ئەویش لەپڕێکدا ویستبووی هاواریان بەسەردا بکات و جوێنیان پێبدات، زمانیان لێدەربکێشێت و سەر بنێتە سەریان، پێبکەنێت، قاقا لێبدات و دیسان دووبارەی بکاتەوە.

زامیوتوف وتی:

- تۆ یان شێتیت یان...

قسەکەی بڕی، وەک کوتوپڕ بیرۆکەیەکی بۆ هاتبێت و سەرسامی کردبێت.

- یان؟ یان چی؟ دەی، دەی بیڵێ.

زامیوتوف بە تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە.

- هیچ، هەمووی قسەی قۆڕە.

هەردووکیان بێدەنگ بوون، لەپڕێکدا ڕاسکۆلنیکۆڤ دوای ئەو پێکەنینە بەلێشاو و پڕلەئازارانە کەوتە ناو دنیای بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە. بەسەر مێزەکەدا نووشتایەوە و سەری نایە ناو دەستی، بە جۆرێک واتدەزانی بە تەواویی بوونی زامیوتوفی لە بیر چووەتەوە، بێدەنگییەکە تا ڕادەیەک ماوەیەکی درێژی خایاند.

زامیوتوف وتی:

- تۆ بۆ چایەکەت ناخۆیت؟ سارد دەبێتەوە.

- چۆن؟ چیت وت؟ چا؟ بەڵێ؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ قومێکی لە چایەکە دا، تۆزێک نانی خستە دەمییەوە و نیگایەکی کتوپڕی لە زامیوتوف گرت، وەک ئەوەی هەموو شتێکی هێنابێتەوە بیر، هاتەوە سەر خۆی، جارێکی دی دەموچاوی شێوە گاڵتەجاڕییەکەی پێشوی لەخۆ گرتەوە و کەوتەوە چاخواردنەوە.
زامیوتوف وتی:
- ئەم دزی و کەڵەک و کڵۆکانە لەم ڕۆژانەدا زۆر بووە. ماوەیەک لەمەوبەر لە ڕۆژنامەی "هەواڵی مۆسکۆ"دا خوێندمەوە کە لە مۆسکۆدا تاقمێک ساختەچییان گرتووە لەوانەی پارەی قەڵب لێدەدەن و گرتوویانن. گروپێکی تەواون، پارەی قەڵب دروست دەکەن.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە هێمنی وتی:
- ئەمەی تۆ دەیڵێیت زۆر لەمەوپێش بوو، من مانگێ زیاترە ئەوەم خوێندۆتەوە.
پاشان بە زەردەخەنەیەکی تەوساوییەوە وتی:
- تۆ لەو باوەڕەدایت ئەوانە دز و ساختەچی بن؟
- ئەی چۆن نین؟
- ئەمانە ساختەچی بن؟ ئەمانە منداڵ و تازەکارن، نەک کەڵەکباز، پەنجا کەسی تەواو بۆ ئامانجێکی وا لە دەوری یەکدی کۆ دەگرن، باشە ئەمە دەبێت؟ بۆ کاری وا سێ کەسیش زۆرە، ئەمەیش بە مەرجێک کە هەر یەکێک لەوانە چەند لە خۆی دڵنیایە، ئەوەندەیش لەوی تر دڵنیا بێت، ئەوەندە بەسە یەکێکیان بە سەرخۆشی زمانی تەتەڵە بکات و شتێک بدرکێنێت، ئەوسا هەموو ڕیسەکەیان دەبێتەوە بە خوری، سادە و نەکردەن: ئەگەر نەزان نەبن، چۆن بڕوا بە کەسانێک دەکەن کە شیاوی ئەو کارە نین و هەر ئاوا بۆ بانکەکانیان

دەنێرن بۆ ئەوەی پارەکانیان بۆ ورد بکەنەوە! ئایا هەروا بەبێ سێودوو کاری وا دەکرێت؟ باشە، گریمان کارەکە لەگەڵ ئەو ناشییانەدا سەری گرت و سەرکەوت، با وایشی دابنێین کە هەریەکێک لەوانە ملیۆنێک ڕۆبڵی بۆ خۆی ورد کردەوە، باشە، دوای ئەوە چی؟ هەریەکێک لەوانە تا ماوە، ئەبەستریێتەوە بەوی ترەوە. بە ڕاستی مرۆڤ خۆی بکوژێت لەو حاڵەی چاکترە. خۆ ئەگەر ئەمانە هەر نەیانتوانی پارەکە ورد بکەنەوە، یەکێکیان ویستی لە نوسینگەیەک پارەکە ورد بکاتەوە. پێنج هەزار ڕۆبڵی وەرگرت و دەستی کەوتە لەرزین، چوار هەزاری ژمارد، بەڵام بەبێ ئەوەی پێنجەم بژمێرێت، هەر لەسەر بڕواپێبوون نەیژمارد و هەڵیگرت، تەنیا بۆ ئەوەی زووتر بیخاتە گیرفانی و بەپەلە بۆی دەربچێت، دیارە ئەمە گومان دروست دەکات، هەموو کارەکە بە هۆی نەزانی و دەبەنگییەوە دەشێوێنێت، ئاخر شتی وا دەبێت؟

زامیوتوف وتی:

- کە دەستیان بلەرزێت؟ بەڵێ، دەشێت.. من زۆر زۆر لەوە دڵنیام، چونکە هەندێکجار مرۆڤ ناتوانێت بەسەر خۆیدا زاڵ بێت.

- چۆن یەعنی؟

- بۆ نموونە تۆ دەتوانیت لە حاڵەتی وادا بەسەر خۆتدا زاڵ بیت؟ نا، من خۆم ناتوانم، بۆ سەد ڕۆبڵ دەستبردن بۆ شتێکی ئاوا پڕ لە مەترسی! بە پارەی قەڵبەوە بە ڕێگەدا ڕۆیشتن، ئەویش بۆ کوێ! بۆ بەڕێوبەرایەتیی بانک کە لەو مەسەلانەدا خوێنیان بووە بە ئاو، نا، نا، من لە حاڵی وادا ئارامم لێدەبڕێ، ئەی تۆ؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ دیسانەوە پڕ بە دڵ حەزی کرد زمانی دەربکێشێت و گاڵتەی پێبکات، هەندێکجار تەزوویەک بە پشتیا دەهات، پاشان وەک ئەوەی لە دوورەوە قسە بکات وتی:

- من وام نەدەکرد، بەم شێوەیە پارەکانم ورد دەکردەوە: هەزار ڕۆبڵی یەکەمم دەژمارد، ڕەنگە چوار جار بمژماردایە، لەسەر هەر یەکێکیشیان دەوەستام و لێی ڕادەمام، ئەوسا دەچوومە سەر هەزاری دووەم و دەستم بە ژماردنی دەکرد، لەبەر ئەوەی گەیشتبوومە ناوەڕاستی کارەکە، یەکێک لە پەنجا ڕۆبڵییەکانم دەردەهێنا، دەمدایە بەر ڕووناکاییەکە، پاشان هەڵمدەگێڕایەوە و دیسانەوە دەمدایەوە بەر ڕووناکییەکە نەکا قەڵب بێت، واتا دەترسم، دەموت "خزمێکم ماوەیەک لەمەوبەر بیست و پێنج ڕۆبڵی بەم جۆرە لەکیس چوو". پاشان حیکایەتێکم دەگێڕایەوە. ئەوسا هەر بەدەم ژماردنی هەزار ڕۆبڵی سێیەمەوە، دەموت "خێر، بمبوورە، وا ئەزانم لە دووەم هەزاردا حەوت سەد ڕۆبڵم بە هەڵە ژماردووە، گومانم هەیە"، ئەوسا هەزار ڕۆبڵی سێیەمم لا دەبرد و دەگەڕامەوە سەر دوو هەزارەکە، بەم جۆرە تا هەر پێنج هەزارەکەم تەواو دەکرد، کە تەواو دەبووم، لە سەفتەی پێنجەم و دووەم گەلایەکم دەردەهێنا و دووبارە دەمدانە بەر ڕووناکی و دیسان گومانم دەکرد و دەمگوت: "تکایە ئەمانەم بۆ بگۆڕەوە" تاوام لێدەکرد ئارەقە لەسەرییەوە بێت و لە بنی پێیەوە دەربچێت، بۆ ئەوەی نەزانێت چۆن زووتر لەدەستم ڕزگاری بێت. کاتێکیش کارەکە دەگەیەنمە ئەنجام، دەڕۆم، دەرگاکە دەکەمەوە، بەڵام نا، ببوورە، سەرلەنوێ دەگەڕێمەوە و پرسیارێکی لێدەکەم، یان داوای ڕوونکردنەوەیەکی لێدەکەم، بەڵی من بوومایە وام دەکرد.

زامیوتوف پێکەنی و وتی:

- تۆ چ شتێکی سەیر دەڵێیت! ئەمانە هەموو هەر قسەن، بەڵام ئەگەر ئەمە بە کردەوە بکەیت، بێگومان سەرەنگریێ دەبیت، با پێت بڵێم، لە کاری وادا بە بڕوای من نەک کەسانی وەک من و تۆ، بەڵکو خەڵکانی بەئەزموون و بێباکیش ناتوانن لە خۆیان دڵنیا بن و بەسەرخۆیاندا زاڵ بن. بۆ دوور بڕۆین. با نموونەیەکت بۆ باس بکەم: پیرێژنێکیان لە گەڕەکی ئێمە کوشت، لەوە دەچوو بکوژەکەی زۆر خوێنڕێژ و کردەبێت، بەبێ سڵکردنەوە و بە ڕۆژی نیوەڕۆ کارەکەی ئەنجام دا، هەروەکو موجیزەیش ڕزگاری بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا دەستی لەرزی، خۆی نەگرت و نەیتوانی دزییەکە بە تەواوی بکات، لە کارەکەیەوە دیارە..

ڕاسکۆلنیکۆڤ پێی ناخۆش بوو، بە دەنگی بەرز وەک ئەوەی بیەوێت زامیوتوف بێنێتە قسە، هاواری لێکرد:

- چۆن دیارە! باشە، ئەگەر ڕاست دەکەیت بۆ بەگرتی نادەیت!

- جا چییە، بێگومان بەگرتی دەدەن.

- کێ؟ تۆ؟ تۆ بەگرتی دەدەیت؟ گیانتتان دەردەچێت! ئاخر لای تۆ ئەوە گرنگە کە ئەو کەسە پارە خەرج دەکات یان نا؟ جاران پارەی نەبووە و ئێستا کتوپڕ کەوتۆتە پارەخەرجکردن، باشە، کەواتە هەر دەبێت ئەو بێت؟ کەواتە ئەگەر بیەوێت، منداڵێک دەتوانێت کڵاوت لەسەر بنێت.

زامیوتوف وەڵامی دایەوە:

- قسەکە لێرەدایە کە ئەوان هەموو هەروا دەکەن، ئاقڵانە دەکوژن، خۆیان دەخەنە مەترسییەوە، پاشان لەپڕێکدا لە قاوەخانەیەکدا بەگیر دەکەون، هەر لە کاتی ئەو پارەخەرجکردنەدا دەکەونە تەڵەکەوە،

هەموو ئەو کەسانە وەک تۆ قسەزان و دووربین نین، تۆ هەڵبەت نەدەچوویتە مەیخانە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ برۆی هێنایەوە یەک و چاوی لە زامیوتوف بڕی، پاشان بێمەیلانە وتی:

- تۆ لیک بە دەمتا دێتە خوارێ بۆ ئەوەی بزانیت ئەگەر من لە حاڵەتێکی وادابم چی دەکەم؟

زامیوتوف بە جیدی و دڵنیاییەوە وتی:

- وایە، حەز دەکەم بیزانم.

قسە و ڕوانینەکەیشی لەڕادەبەدەر زیاتر بوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لێی پرسی:

- زۆر حەز دەکەیت؟

- زۆر.

- زۆر باشە، من ئاوام دەکرد.

لەپڕا ڕاسکۆلنیکۆڤ دیسانەوە ڕووی لە ڕووی زامیوتوف نزیک کردەوە، لێی ڕاما، زۆر لەسەرخۆ، بە جۆرێک کە ئەمجارەیان زامیوتوف تەزوویەکی تێگەڕا، دەستی بە قسە کردەوە:

- ئەگەر من بکوژەکە بوومایە، ئاوام دەکرد: پارە و شتەکانم هەڵدەگرت، هەر کە لە ماڵەکە بهاتمایەتە دەرێ، یەکسەر بەبێ ئەوەی بچمە شوێنێکی تر، دەڕۆشتم بۆ جێگایەکی دوور، شوێنێکی تەواو تەریک کە کەس نەمبینێت، بۆ نموونە بۆ بێستانێک یان شتێکی لەو بابەتە، لەوێ، لەو بێستانە یان لەو حەسارەدا بە دوای بەردێک یان تاوێرە بەردێکدا کە کێشەکەی بیست یان بیست و پێنج کیلۆ بێت و دەشێت لە ساختمانێکەوە مابێتەوە، دەگەڕام، کەمێک بەرزم دەکردەوە، بێگومان ژێر بەردەکە چاڵۆکەیەکە، هەموو پارە و شتەکانم

دەخستە ئەو چاڵەوە و ڕێکم دەخست، بەردەکەم وەک جارانی خۆی دادەنایەوە. پێم دەنایە سەری و پاشان لێی دوور دەکەوتمەوە، ساڵێک یان دوان، تۆ بڵێ سێ ساڵیش هەر نەدەچووم بە لایدا، ئیدی با هەر بگەڕێن و سوور بخۆن و زوڕنا لێدەن.
زامیوتوف دیسان بەبێ ئەوەی بزانێت بۆ، تا ڕادەیەک زۆر بە هێوری وتی:
- تۆ شێتیت.
پاشان کتوپڕ خۆی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ دوور خستەوە. لەپڕێکدا چاوی ڕاسکۆلنیکۆڤ پریشکێکی تێکەوت، ڕەنگ بە ڕوویییەوە نەما و لێوی چەند جارێک لەرزی، پاشان چەند توانی، لە زامیوتوف نزیک کەوتەوە، بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت لچولێوی کەوتنە جووڵە، ئەمە نیو دەقیقەی خایاند، دەیزانی چی دەکات، بەڵام نەیدەتوانی بەسەر خۆیدا زاڵ بێت، وشەی ترسناک، وەک کلۆمی دەرگاکە، بەسەر لێویەوە دەهات و دەچوو، زۆری نەمابوو دەرپەڕێت، ئەوەندەی بەس بوو لێی بگەڕێت تا بکەوێتە سەر زمان.
- چۆنە ئەگەر من پیرێژنەکە و لیزاڤێتام کوشتبێت؟
لەگەڵ تەواوکردنی قسەکەدا ڕاسکۆلنیکۆڤ هاتەوە سەر خۆی.
زامیوتوف زۆر بە سەرسامییەوە لێی ڕوانی و ڕەنگی وەک گەچ سپی بوو، کە چەند زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و بە دەنگێکی تەواو نزمەوە کە بە زەحمەت دەبیسترا، وتی:
- جا شتی وا دەبێت؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ڕقەوە لێی ڕوانی و پاشان بە ساردی و گاڵتەپێکردنەوە وتی:
- دانی پێدا بنێ کە باوەڕت کرد، وایە؟ وایە؟

زامیوتوف بەپەلە وتی:
- هەرگیز باوەڕم نەکرد، ئێستایش لە هەر کاتێکی لەمەوبەر زیاتر باوەڕ ناکەم.
- بەڵام کەوتیتە تەڵەکەوە، چۆلەکەی ناو داو، کەواتە لەمەوبەر باوەڕت کردووە. ئەگەر وەک خۆت دەڵێیت: "ئێستا لە هەر کاتێکی لەمەوبەر زیاتر باوەڕ ناکەم؟"
زامیوتوف کە دیار بوو شڵەژابوو، وتی:
- نا.. هەرگیز وانییە، تۆیش بۆیە ئاوا ترساندمت، کە کار بگەیەنیتە ئەم ئەنجامە؟
- کەواتە باوەڕ ناکەیت؟ ئەی ئەو ڕۆژەی کە من لە ئیدارە هاتمە دەرەوە، لە دوای من تۆ چیت وت؟ ئەی بۆ کە هاتمەوە سەرخۆم، ستوان پورخ کەوتە لێکۆڵینەوە لەگەڵما؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ کڵاوەکەی بەدەستەوە گرت و هاواری لە پێش خزمەتەکە کرد:
- های، حسابەکەم بۆ بێنە؟
پێش خزمەت خێرا چوو بۆ لای و وەڵامی دایەوە:
- هەمووی دەکاتە سی کوپیک.
- ئەمەیش بیست کوپیکی تر بۆ ڤۆدکاکەت.
پاشان لە حاڵێکدا دەستی بە پارەکانەوە دەلەرزی، بۆ زامیوتوفی درێژکرد و وتی:
- بڕوانە ئەم هەموو پارەیە؟ سوور و شین. هەمووی بیست و پێنج ڕۆبڵە، ئەمە لە کوێوە هاتووە؟ ئەم جلو بەرگە نوێیەم لە کوێ هێناوە؟ تۆ خۆت دەزانیت کە من یەک کوپیکم نەبووە، بێگومان لەبارەی منەوە پرسیارت لە خاوەن ماڵەکەم کردووە.. دەی بەسە ئیدی.

بە زمانی فەڕەنسی قسەکانی تەواو کرد و وتی:
- زۆرم وت، بە ئومێدی دیدار.. هەر خۆش بێت!
ڕاسکۆلنیکۆڤ چووە دەرەوە، هەستێکی بێزراو و سەیری وا گیانی داگرتبوو، کە هەموو لەشی دەلەرزی، بەڵام هەستەکە چێژوتامێکی زۆر خۆشیشی تیابوو، هەرچەندە مڕومۆچ و تەواو ماندوو بوو، دەموچاوی وا تێک چووبوو دەتوت تازە هاتۆتەوە هۆش خۆی، ماندویەتییەکەی تا دەهات زیادی دەکرد، ئەو، توانای تێدەهاتەوە، لەگەڵ یەکەمین هەستی ئەو توانا تێهاتنەوەیەدا، لەپڕێکدا هەڵدەچوو دیسان بە هەمان خێراییەوە دەنیشتەوە.
زامیوتوف کە بە تەنیا مایەوە، بۆ ماوەیەک هەر لە جێگاکەی خۆیدا بیری دەکردەوە. ڕاسکۆلنیکۆڤ هەموو بیروبۆچوونەکانی لەبارەی مەسەلەیەکەوە ئاوەژوو کرد و بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێت، ڕایەکی سەقامگیری پێبەخشی، ڕایەک هەرگیز بەر هەڵبەزودابەزی پەشیمان بوونەوە ناکەوێت. دوای کەمێک زامیوتوف بە دەنگێکی تەواو بڕیاردەرانەوە وتی: "بە ڕاستیی ئیلیا پتروڤیچ دەبەنگە".
کە ڕاسکۆلنیکۆڤ دەرگای ڕیستورانتەکەی بە ڕووی شەقامەکەدا کردەوە، لەپڕێکدا لە بەردەم دەرگاکەدا تووشی ڕازومیخین بوو، هەردووکیان لە دووری هەنگاوێکەوە یەکتریان نەبینی، تەنانەت لەوەدا بوو کە سەریان بەریەکتر بکەوێت، ماوەیەک لەیەک ڕامان، ڕازومیخین تەواو سەری سووڕمابوو، وەلێ لەپڕێکدا تووڕە بوو، تووڕەبوونێکی ڕاستەقینە بە شێوەیەکی ترسناک لە چاوییەوە بریقەی دا و بە هەموو توانایەوە هاواری کرد:
- ئەوە تۆ لێرەی؟ لە ناو جێ هەڵاتویت! لەماڵەوە تەنانەت ژێر قەنەفەکەیشت بۆ گەڕام، چوومە سەربان، بە هۆی تۆوە نزیک بوو لە

ناستاسیایش بدەم.. کەچی وا جەنابت لێرەیت! ڕودیا، ئەم کارانە مانای چی؟ ڕاست بڵێ، دانی پێدا بنێ، گوێت لێمە؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەر خۆ وەڵامی دایەوە:
- ڕاستییەکەی ئەوەیە لە دەست ئێوە تەواو بەتەنگ هاتووم و لەوەدایە بمرم، دەمەوێت تەنیا بم.
- تەنیا؟ تۆ هێشتا توانای بەڕێگەدارۆیشتنت نییە و دەموچاوت زەرد و هەناسەبڕکێتە؟ کەرە.. تۆ لە "کۆشکی بلورین"دا چیت دەکرد؟ دەی بە ڕاستی بیڵێ.
- وازم لێبێنە.
ئەمەی وت و ویستی بە لای ڕازومیخیندا تێپەڕێ.
بەڵام ئەم هەڵوێستە ئەوەندە ڕازومیخینی تووڕە کرد، لەوەدابوو لە پێستی خۆی بێتە دەرێ، توند شانی ڕاسکۆلنیکۆڤی گرت و وتی:
- وازم لێبێنە؟ تۆ لەوەی کە کردووتە هێشتا ئەوەندە ڕووقایمی: دەڵێی "وازم لێبێنە؟" دەزانیت هەر ئێستا چیت لێدەکەم؟ باوەشت پیا دەکەم، وەک پریاسکە گرێت دەدەم، دەتخەمە بنهەنگڵم و دەتبەمەوە بۆ ماڵەوە، دەرگاکەیشت لەسەر دادەخەم!
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە نیمچەهێورییەکەوە وتی:
- گوێ بگرە ڕازومیخین، نابینیت کە من چاکەی تۆم ناوێت؟ چاکەکردن لەگەڵ کەسانێکدا کە پێی نەزانن بۆچییە؟ ئەوانەی بەرگەی چاکە ناگرن؟ باشە تۆ بۆ لە بەرایی نەخۆشییەکەمەوە بەدوامەوەیت و لێم ناگەڕێی؟ کێ ناڵێت من ئەو کاتە زۆر دڵخۆش دەبووم ئەگەر بمردمایە؟ باشە، ئایا ئەمڕۆ بە تەواوی ئەوەم تێنەگەیاندیت کە تۆ ئازارم دەدەیت، کە تۆ.. ئارامت لەبەر هەڵگرتووم! بەڕاست ئەم حەزی مرۆڤئازاردانە لە تۆدا چییە! من دڵنیات دەکەم هەموو ئەم شتانە دەبنە

هۆی ئەوەی کە من بە تەواوی چاک نەبمەوە، چونکە بەردەوام دەمهەژێنن و بێزار دەبم، ببینیت زوسیموفیش ئەو جارە ڕۆیشتە دەرەوە تا نارەحەت نەبم! توبی و خودا تۆیش لێمبگەڕێ و وازم لێبێنە، پاشان تۆ بە چ هەقێکەوە دەتەوێت بەزۆر ئاگاداریم بکەیت؟ بۆ نابینیت من کە ئێستا قسە لەگەڵ تۆدا دەکەم لەوپەڕی هۆشیاریدام؟ چۆن.. پێم بڵێ، چۆن دەتوانم تۆ بەوە قایل بکەم، کە پێمەوە نەنووسێیت و چاکەم لەگەڵدا نەکەیت؟ بهێڵن با من بێوەفا بم، بهێڵن با من پیاوێکی ڕسوا بم، تەنیا بە خودا سوێندتان دەدەم هەمووتان دەست لەسەرم هەڵبگرن، وازم لێبێنن، وازم لێبێنن.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە دەستی بە قسان کرد، لەسەرخۆ بوو، بەوەیش شادمان بوو کە وردەوردە ژەهرەکەی دەڕشت، بەڵام کە گەیشتە کۆتایی قسەکانی، زۆر هەڵچوو، هەناسەی گیرا، تەواو وەک ئەو کاتەی کە لەگەڵ لۆژیندا بەسەری هات.

ڕازومیخین وەستا، بیری کردەوە، دەستی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ بەردا و بە هێوری و تا ڕادەیەک بە لێڕامانەوە وتی:

- بڕۆ بۆ دۆزەخ.

بەڵام کە ڕاسکۆلنیکۆڤ ویستی هەنگاو بنێ، لەپڕێکدا هاواری لێکرد:

- ڕاوەستە! گوێ بگرە! من پێت ڕادەگەیەنم کە هەمووتان بەبێ هەڵاوێردکردن، چەقەچناو و درۆزنن، هەر ئەوەندەی هەست بە ناخۆشییەکی خۆتان بکەن، ئیتر وەک مریشکێک کە لە کاتی هێلکەکردندا گارەگار دەکات، ئێوەیش گوێمان بە خەمی خۆتان دەئاخنن! تەنانەت لەم مەسەلەیەدا دزی لە نووسەری بێگانەیش دەکەن. بە ئەندازەی گەردیلەیەک ژیانێکی ئازاد و ڕەسەنتان تیا نییە، لە ڕۆنی حووت دروست بوون و لەباتیی خوێن ئاو بە دەمارتاندا

دەگەڕێت، بڕوام بە هیچتان نییە، لەهەر بارودۆخێکدا بن، تاقە مەبەستتان ئەوەیە چی بکەن تا لە مرۆڤ نەچن!
کە ڕاسکۆلنیکۆڤی بینی دیسانەوە کەوتە ڕێ، بە ڕکێکی زۆرترەوە هاواری لێکرد:
- ڕاوەستە! تا دوایی گوێ بگرە، دەزانیت ئەمڕۆ بە هۆی گوێزانەوەمەوە بۆ خانوویەکی تر، هاوڕێکانم دێنە لام، ڕەنگیشە ئێستا هاتبن؟ من مامەم لەوێ داناوە، ئێستا هات بۆ لام، دامنا پێشوازیی لە میوانەکان بکات، باشە، ئەگەر تۆ دەبەنگ نەبوویتایە، دەبەنگێکی تەواو گەوج، گەوجێکی ڕاستودروست نەبوویتایە، کۆپییەکی خەڵکی بێگانە نەبوویتایە.. بڕوانە ڕودیا، من دانی پێدا دەنێم کە تۆ لاوێکی ئاقڵیت، بەڵام دەبەنگیت! جا ئەگەر تۆ دەبەنگ نەبوویتایە.. چاکتر وابوو کە ئەمڕۆ واتا هەر لە ئێوارەوە، سەرێک لەمن بدەیت و پێکەوە دابنیشین، ئەوە چاکتر بوو لەوەی بێهودە شەقامەکان بپێویت. بەڵام ئێستاکە هاتوویتەتە دەرەوە، ئیدی چارەیەک نەماوە! من کورسییەکی هەراو و نەرمت بۆ پەیدا دەکەم، خاوەن ماڵەکە هەیەتی، چای و کۆڕی هەموو برادەران.. ئەگەریش بتەوێت، دەشێ لەسەر قەرەوێڵەیەک بتخەوێنم، هەر لە بەینماندا ڕابکشێ.. زوسیموفیش لەوێیە، دێیت؟
- نەخێر.
ڕازومیخین بە پەرۆشەوە هاواری کرد:
- درۆ دەکەیت، تۆ چی دەزانیت؟ تۆ ناتوانیت وەڵامی ڕەفتاری خۆت بدەیتەوە، ئەسڵەن هیچ لە ژیان نازانیت.. من هەزار جار شەڕم لەگەڵ خەڵکیدا کردووە و پاشان گەڕاومەتەوە لایان، خەجاڵەت بووی، هەر

دەگەڕێیتەوە لای مرۆڤ! کەواتە ناونیشانەکەمت لە بیر نەچێت: خانووی پاچینکیف[1]، نهۆمی...

- بەم حسابە، تۆ جەنابی ڕازومیخین، ئامادەیت لەسەر چاکە تێهەڵدانیش بخۆیت.

- کێ، کێ لە من بدات؟ تەنانەت ئەگەر یەکێک بیریش لە لێدانی من بکاتەوە، لووتی دەشکێنم. ماڵی پاچینکوف ژمارە ٤٧، لە ئاپارتمانی پوشکین، کارمەندی دەوڵەت..

- نایەم، ڕازومیخین.

ئەوسا ڕاسکۆلنیکۆڤ سووڕا و پێی هەڵگرت.

ڕازومیخین لە دواوە هاواری لێکرد:

- گرەو دەکەم کە دێیت، ئەگینا تۆ.. ئیتر نامەوێت بتبینم، ئا بوەستە، زامیوتوف لە ژوورەوەیە؟

- لەوێیە.

- تۆ دیت؟

- دیم

- قسەتان کرد؟

- قسەمان کرد.

- دەربارەی چی؟ بەڵام برۆ و ون بە، نامەوێت بیڵێی. پاچینکوف ژمارە ٤٧، ناوی پوشکینیشت لەبیر نەچێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ گەیشتە شەقامی "سادوڤایا" و کەوتە نەدیوی، ڕازومیخین لە دواوە بۆی دەڕوانی و بیری دەکردەوە، لە دواییدا دەستێکی هەڵتەکاند و چووە ناو ساختمانەکەوە، بەڵام لە ناوەڕاستی

---

[1] *Pachinkof*

پلیکانەکاندا وەستا و تا ڕادەیەک بە دەنگی بەرز، لەسەر بیرکردنەوەکەی ڕۆشت:

"لەعنەت لە شەیتان، قسەکانی بەمانان، وەک ئەوەی.. منیش دەبەنگم! بەڵام بۆ شێتەکانیش قسەی بەمانا ناکەن؟ وەک بزانم زوسیموفیش لەم مەسەلەیە دەترسێت" پاشان بە ناوچاوی خۆیدا کێشا و بەردەوام بوو: "باشە، چی ئەبێت ئەگەر.. ئەگەر هەر ئاوا بە تەنیا وازی لێبێنم؟ بێگومان خۆی دەدات بەدەم ئاوەوە.. بەداخەوە من هەڵەم کرد، نابێت!" و بە تاو کەوتە دوای ڕاسکۆلنیکۆڤ، وەلێ ئیدی ئاسەواری دیار نەبوو، ڕازومیخین تفێکی هەڵدا و بە هەنگاوی فراوان بەرەو "کۆشکی بلورین" گەڕایەوە، بۆ ئەوەی تازووە زامیوتوف بخاتە ژێر گیروگازی پرسیارەوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕاست بەرەو پردی "س.." ڕۆشت، لە ناوەڕاستی پردەکەدا و لە کەنار تەیمانە ئاسنەکەدا وەستا، ئانیشکی نانە سەر و لە ئاسۆی دووری ڕوانی، دوای خواحافیزیکردن لە ڕازومیخین، هێند بێهێزی و ماندوویەتی دەستیان بەسەردا کێشا، کە زۆر بە زەحمەت خۆی بەوێ گەیاند، پێی خۆش بوو لەسەر شەقامەکە دابنیشێت یان ڕابکشێت. لە کاتێکدا کە بەرەو لای ئاوەکە چەمابووەوە، بەبێ ویستی خۆی، تەماشای دوازەردە گوڵڕەنگییەکەی خۆر و ئەو ڕیزە خانووەی کرد، کە لە تاریکاییە ئەنگوستەچاوەکەدا پەنجەرەکانیان شەوقی دەدایەوە.

یەکێک لە پەنجەرە دوورەکانی ژوورێکی خوارەوە، کە دەکەوتە کەناری چەپی ڕووبارەکەوە، لە دوازەردەی خۆر کە لەو چرکەساتەدا ڕاست لێی دەدا، وەک ئاگر دەدرەوشایەوە. ئاوە هەرە تاریکی ڕووبارەکەیش سەرنجی ڕاکێشابوو، وەک بڵێی زۆر بە قووڵی لێی

دەڕوانێت. سەرئەنجام بازنەی ڕەنگ سوور لەبەرچاوانیدا کەوتنە سوورڕخواردن، ماڵەکان کەوتنە جووڵە، ڕێبوارەکان، کەنار دەریا، گالیسکەکان و هەموو شتەکانی دی کەوتنە جووڵە و سەما، لەپڕێکدا مووچرکێکی پێدا هات، وەک ئەوەی بە هۆی دیمەنێکی ترسناک و سامناکەوە لە بێهۆشییەکەی خەلەست بێت. هەستی بە یەکێک کرد لە پاڵیا، لەلای ڕاستیەوە، وەستاوە، تەماشای کرد، ژنێکی باڵابەرزی بینی دەسماڵێکی بەسەریدا دابوو، ڕەنگی زەرد و لاواز و چاوە سووررداگەڕاوەکانی لە مەستیدا بە قووڵدا چووبوون، ژنەکە ڕێک لەمی دەڕوانی، وەلێ دیاربوو کە هیچ نابینێ و کەس ناناسێت. لەناکاودا ژنەکە بە دەستی ڕاستی ئاسنی تەیمانەکەی گرت، قاچی ڕاستی بەرز کردەوە و بەپەلە خستییە ئەو دیوی تەیمانەکەوە، پاشان بەپێی چەپی هەمان ئەو کارەی کرد و خۆی فڕێدایە ڕووبارەکەوە. ئاوە پیسەکە بە ئەندازەی خۆی جێگای بۆ کردەوە و لە چاوتروکانێکدا قووتیدا، بەڵام دوای کەمێک خنکاوەکە سەرئاو کەوت، شەپۆلانی ئاو دەیبرد و سەروقاچی نقوم کردبوو، تەنیا پشتی بە دەرەوە مابوو، کراسەکەی وەک سەرینێک پڕ لە هەوا و بەسەر ئاوەکەوە تۆپەڵ بووبوو.

دەیان هاوار بەرز بوونەوە کە:

- خۆی خنکاند، خۆی خنکاند.

خەڵکەکە گەیشتن و هەردوو کەنارەکە پڕ بوون لە تەماشاکەر، لەسەر پردەکە و بە دەوری ڕاسکۆلنیکۆڤدا کەسانێکی زۆر خڕ بوونەوە. پاڵیان بە ڕاسکۆلنیکۆڤەوە نا و بە تەیمانەکەیانەوە نووساند.

لە شوێنێکی کەمێک نزیکەوە، دەنگی گریانی ژنێک دەبیسترا، کە بانگی هەڵدابوو:

- هاوار، ئەوە ئەفروسینوشکای[1] خۆمانە، خەڵکینە فریای بکەون، باوکانی ئازیز، ڕزگاری بکەن.
خەڵکەکە هاواریان لێهەستا:
- بەلەم، بەلەم.
وەلێ ئیدی پێویستی بە بەلەم نەدەکرد، پاسەوانێک بە پلیکانەکانی پاڵ پردەکەدا خێرا بەرەو ڕووبارەکە داکەوت، پاڵتاو و پێڵاوەکانی داکەند و خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکەوە، زۆری نەویست تا بگاتە لای ژنەکە، چونکە ئاوەکە لە دووری دوو هەنگاوەوە ژنەکەی بەرەو لای پلیکانەکان دەبرد، پاسەوانەکە بە دەستی ڕاستی جلەکەی بەری گرت و بە دەستی چەپیشی ئەو دارەی گرت کە هاوڕێکەی بۆی درێژ کردبوو، ژنەکە زوو لە ئاوەکە دەرهێنرا. خستیانە سەر تەختەبەردەکانی پاڵ پردەکە، ژنەکە زوو هاتەوە سەرخۆی، کەمێک جووڵا، دانیشت و دایە پژمین و پرخەپرخ و بێهودە دەستی بەسەر جلە تەڕەکانیدا دەهێنا، هیچی نەدەوت.
هەمان دەنگی ژنەکەی پێشوو لە پاڵ ئەفروسینوشکادا کەوتە لاڵانەوە:
- خەڵکینە، دەزانن چەندە مەستە! مەست، ماوەیەک لەمەوبەر ویستی خۆی بخنکێنێت، بە هەڵواسراوی پەتمان لە ملی کردەوە، ئێستا چووم بۆ دووکان و بە کیژۆڵەکەم وت ئاگای لێبێت و وا ئەم کارەساتەی بەسەردا هات، دراوسێمانە، براکانم، دراوسێی خۆمان، ماڵمان لەم نزیکانەیە، ساختمانی دووەمی سەرسووچەکە، لەوێ..
خەڵکەکە بڵاوەیان لێکرد، بەڵام پاسەوانەکان هێشتا سەرقاڵی ژنەکە بوون، یەکێک لەبارەی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسەوە بە دەنگی بەرز

[1] *Afrocinoushka*

قسەی دەکرد.. ڕاسکۆلنیکۆڤ بە هەستێکی سەیرەوە، بێبایەخانە و بەبێ گوێپێدان لە هەموو ئەو شتانەی دەڕوانی، هەستی بە نەفرەت و بێزاری دەکرد، لەبەر خۆیەوە دەدوا "نا، نا، کارێکی دزێوە.. ئاو.. ئەوە ناهێنێت" هەر لەسەری ڕۆشت "هیچ ڕوو نادات، چاوەڕوانی چ کەڵکێکی هەیە؟ ئەمە بەشی پۆلیسە، کەوایە بۆ زامیوتوف لەوێ نییە؟ کەواتە لە سەعات نۆوە ئەم بەشە کراوەیە".
پاشان پشتی دایە تەیمانەکەوە و سەیری ئەملاوئەولای خۆی کرد.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە جەخت لەسەرکردنەوە وتی:
- بۆ نا؟ چی دەبێت با ببێت.
بەسەر پردەکەدا بەرەو ئەو شوێنە ملی نا، کە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی لێبوو، دڵی خاڵی و گیرابوو، ئارەزووی لە بیرکردنەوە نەدەکرد، تەنانەت جۆرێک لە غەم و بێتاقەتی هاتە سەرینی، ئەو گوڕوتینەی کە پێشتر هەیبوو، ئەو کاتەی لە ماڵەوە بۆ "ئەنجامدانی کارەکە" هاتە دەرەوە، ئیدی ئاسەواری نەمابوو، بێحاڵی جێی ئەوانەی گرتبووەوە.
ئەو کاتەی لەسەرخۆ و بە بێزارییەوە بە کەنار ڕووبارەکەدا دەڕۆشت، بیری دەکردەوە: "وایە، ئەمەیش ڕێگەچارەیەکە، لەگەڵ ئەمەشدا کارەکە تەواو دەکەم، چونکە دەمەوێت.. ئەی بە ڕاست ئەمە ڕێگەچارەیە؟ ئاە.. چ جیاوازییەکی هەیە، شوێنپێیەکە و تیا دەوەستم، ها! کۆتاییەکی سەیرە، ئای چ کۆتاییەکە! پێیان بڵێم؟ ئاە.. نەفرەت لە شەیتان، چاک ماندوو بووم، وا چاکە ڕابکشێم، یان تا زووە دابنیشم، لە هەمووی خەجاڵەتتر ئەوەیە کە ئەمە کارێکی زۆر گەلۆرانەیە: ئەمەیش قیروسیا، ئاە.. ئەو گەمژەییانە زۆرن، کە بە بیری مرۆڤدا دێن..

بۆ گەیشتن بە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس دەبوو هەر ڕاست بڕۆیت، پاشان لە پێچی دووەمدا بە لای چەپدا لابدەیت، هەردوو هەنگاو بەولاوە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس بوو، بەڵام کە گەیشتە پێچی یەکەم، وەستا، بیری کردەوە، بەبێ هیچ مەبەستێک، یان ڕەنگە تەنیا بۆ ئەوە بووبێت دەرفەتێکی کەمی دەست بکەوێت، لە دوو کۆڵانەکەی دی تێپەڕی، سوورێکی خوارد و چووە ناو کۆڵانەکەوە. هەر دەڕۆیشت و چاوی لە زەوییەکە هەڵنەدەبڕی، لە پڕێکدا، وەک یەکێک بە گوێیدا بچرپێنێت، سەری بەرز کردەوە، بینی بەرانبەر هەمان ماڵ و لە پاڵ دەرگای دەرەوەیدا وەستاوە، ئەو لەو "شەوەوە" نەهاتبووەوە ئێرە و تەنانەت بە لایشیدا تێنەپەڕیبوو، ئارەزوویەکی بێمانا کە لە وەسفکردن نایەت، بەرەو ناوەوەی دەکێشا، چووە خانووەکەوە، لە ڕاڕەوەکە تێپەڕی، پاشان لە یەکەم دەرگاوە ڕۆشت و بەو پلیکانانەدا کە ئاشنایەتیی لەگەڵیاندا هەبوو. بەرەو قاتی چوارەم سەرکەوت، پلیکانەکان تەنگەبەر و پڕ لە ساتمە و زۆر تاریک بوون، لە هەموو قاتێکدا دەوەستا و بە هەموو لایەکدا ملەقوتێی بوو، لە ڕاڕەوی قاتی یەکەمدا شووشەی پەنجەرەیەک بە تەواوی دەرهاتبوو، بیری کردەوە کە ئەوسا ئەمە وانەبوو، ئەمەیش ئاپارتمانی قاتی دوو، کە نیکۆلا و میتکا لەوێ کاریان دەکرد "داخراوە و دەرگاکەی ڕەنگ کراوەتەوە، مانای وایە دەدرێتەوە بە کرێ" ئەمەیش قاتی سێ.. و چوار.. ئا، ئێرەیە! تەواو واقی وڕما: دەرگای دەرەوەی ئەم ئاپارتمانە بە تەواویی کرابووەوە، خەڵکیی تیا بوو کە دەنگیان دەبیسترا، هەرگیز چاوەڕێی شتی وای نەدەکرد.

دوای کەمێک دوودڵی لە دواپلە سەرکەوت و چووە ئاپارتمانەکەوە، ئەم ئاپارتمانەیشیان چاک دەکردەوە و کرێکاری تیابوو، ئەمە سەری

بەسوورڕ هێنا، لە خەیاڵی ئەودا نەبوو هەموو شتەکان وەک پێشوو ببینێتەوە، وەک ئەوسا چۆن دیبوونی، وای لێهات چاوەڕێی ئەوە بکات کە تەنانەت هەردوو لاشەکەیش لە هەمان جێگای خۆیاندا ببینێتەوە. بەڵام وا ئێستا دیوارەکان ڕووتن، ئاسەواری شتومەک نییە، سەیرە! ڕاسکۆلنیکۆڤ بەرەو لای پەنجەرەکە ڕۆشت و لە کەناریا دانیشت.

دوو کرێکار لەوێ بوون، هەردووکیان گەنج و یەکێکیان زۆر لەوی دی گەورەتر بوو، سەرقاڵی چەسپاندنی کاغەزی نوێ بوون بەسەر دیوارەکاندا، لەبری کاغەزی زەرد و کۆنەی دڕاو، کاغەزی سپیان پیا دەگرت، کە گوڵی وەنەوشەیی پێوە بوو. ڕاسکۆلنیکۆڤ هەر لە خۆیەوە خۆشیی بەو کارە نەهات و نیگایەکی ڕکاوی لە کاغەزی دیوارەکان گرت. وەک ئەوەی داخ بەوە بخوات کە هەموو شتەکانیان بۆ بەو ڕادەیە گۆڕیووە.

پێدەچوو کرێکارەکان لە کاتی خۆیان تێپەڕاندبێت و بیانەوێت خێرا کاغەزەکان بە دیوارەکاندا بچەسپێنن و بەرەو ماڵەوەیان بگەڕێنەوە. دەرکەوتنی ڕاسکۆلنیکۆڤ هیچ سەرنجی ڕانەکێشان، ئەوان سەرگەرمی قسەی خۆیان بوون، ڕاسکۆلنیکۆڤ خاچئاسا دەستی لەسەر سنگی دانا و گوێی ڕادێرا.

کرێکارە بەتەمەنەکە بە بچووکترەکەی وت:

- ئەو ژنە ڕۆژێک پێشتر هاتە لای من، بەیانییەکی زوو بوو، تەواو خۆی ڕازاندبووەوە. پێم وت "بۆ بە لەنجە و نازەوە دێیتە لام؟ وتی: تیت ڤاسیلیچ[1]، دەمەوێت لەمەودوا بە تەواویی بۆ تۆ بم" ئاوا! ئەی

---

[1] *tit vassilich*

دەزانیت چ بەرگێکی لەبەر کردبوو، مۆدێل، مۆدێلێکی ڕاست و دروست!
کرێکارە منداڵکارەکە وتی:
- ئاپۆ گیان، مۆدێل چییە؟
دیار بوو کە دەیویست شت لە ئاپۆوە فێر بێت.
- مۆدێل، هاورێکەم، ئەو وێنە ڕەنگییانەن کە هەموو ڕۆژێکی شەموان بە پۆستا بۆ بەرگدرووەکانی ئێرە دەنێررێت، بە پۆستی دەرەوەدا، بۆ ئەوەی هەموو کەسێک بزانێت چی لەبەر دەکات و چۆنی لەبەر دەکات. چ ژن و چ پیاو، جیاوازیی نییە. کەواتە مودێل وێنەیە، بۆ پیاو زیاتر ڕدنکوتە، بەڵام بەرگی ژنانە، هاوڕێ، ئەوە هەر نەیکردبێت، ئەگەر هەموویانم بدەیتێ هێشتا هەر دەڵێم کوا!
لاوەکە وەک بەو قسانە مەست بووبێت، هاواری لێهەستا:
- جا چی لەم پتروزبورگەدا نییە! هەموو شتێکی تیا دەست دەکەوێت، بێجگە لە باوک و دایک!
ئەوی تریان وەک مامۆستایەک لەسەرخۆ وتی:
- ڕاستە، هاوڕێ، بێجگە لە داک و باب هەموو شتێکی تیایە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستا و چووە ئەو ژوورەوە، کە پێشتر سنووق و پێخەف و دۆڵابی تیابوو، ژوور هیچی تیا نەبوو، بۆیە تا بڵێی بچووک هاتە بەرچاوی، کاغەزی دیوارەکانی هەمان کاغەزی پێشوو بوو. لە سووچێکدا، بە چاکی جێگای مێزێک دەبینرا، کە لەژێر پەیکەرە چکۆلەکاندا بوو. تەماشایەکی کرد و دیسانەوە بۆ لای پەنجەرەکەی گەڕایەوە، کرێکارە گەورەکەیان لەژێرەوە خێسەی لێدەکرد، لەپڕا گەڕایەوە لای ڕاسکۆلنیکۆڤ و لێی پرسی:
- چیت دەوێت؟

لەباتیی ئەوەی وەڵامی بداتەوە، ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستا و چووە ڕاڕەوەکە، پەتی زەنگەکەی ڕاکێشا، هەمان زەنگ و هەمان دەنگ بوو، بۆ جاری دووەم و سێیەم ڕایکێشایەوە، گوێی لە دەنگەکە گرت و یادوەرییەکانی خۆی بەسەر کردەوە، هەستێکی ترسناک و ناخۆشی ڕابووردووی زیاتر وەبیر دەهاتەوە، لەگەڵ هەر لێدانێکی زەنگەکەدا ڕادەچڵەکی و زیاد لە جاران چێژی لێوەردەگرت.

کرێکارەکە کە لە ژوورەکەوە بەرەو لای دەهات، هاواری لێکرد:

- ئاخر پێم بڵێ چیت دەوێت؟ تۆ کێیت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ دیسانەوە لە دەرگاوە هاتەوە ژوورێ و وتی:

- دەمەوێت ئەمماڵە بە کرێ بگرم، بۆیە پێویستە بە چاکی تەماشای بکەم.

- بە شەو ماڵ بە کرێ نادرێت، بێ لەوە، تۆ دەبێت دەرگاوانەکە ببینیت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەر قسەکانی ڕۆشت.

- زەوییەکە شۆراوە، بۆیەی دەکەنەوە؟ خوێنی پێوە نەماوە؟

- خوێنی چی؟

- ئاخر پیرێژن و خوشکەکەیان تازە کوشتووە، لێرەدا جۆگەلەیەک خوێن دروست ببوو.

کرێکارەکە حەوسەڵەی لێبڕا و وتی:

- ئاخر تۆ کێیت؟

- من؟

- بەڵێ؟

- حەز ئەکەی بیزانیت؟ وەرە با بچینە لای پۆلیس، لەوێ پێت دەڵێم.

کرێکارەکان بە سەرسامییەوە لێیان ڕوانی.

کرێکارە گەورەکەیان بە بچووکەکەی وت:
- دەبێت ئێمە بڕۆین، زۆر درەنگ کەوتین، با بڕۆین ئالشکا، دەبێت دەرگاکە کلیل بکەین.
ڕاسکۆلنیکۆڤ خوێنساردانە وتی:
- باشە با بڕۆین.
کەوتە پێشیان، هێدی هێدی لە پلیکانەکان هاتە خوارێ، کە گەیشتە بەر دەرگای دەرەوە، هاواری کرد:
- ها! پاسەوان.
چەند کەسێک ڕێک لە بەردەم دەرگای دەرەوە وەستابوون و تەماشای ڕێبوارەکانیان دەکرد. دوو دەرگاوان، ژنێکی گوندی و پیاوێکی بازرگان بە جلی ماڵەوە و چەند کەسێکی دی بوون.
ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕاست بەرەو لایان چوو، دەرگاوانێکیان پرسی:
- چیت گەرەکە؟
- چوویت بۆ لای پۆلیس؟
- ئێستا چووم، چیت دەوێت؟
- هەموو لەوێن؟
- هەر لەوێن.
- ئەفسەری یارمەتیدەریش لەوێ بوو؟
- ئەویش بۆ ماوەیەک لەوێ بوو، ئەی تۆ چیت دەوێت؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی نەدایەوە، وڕبوو، لە پاڵیاندا وەستا.
کرێکارە گەورەکەیان نزیک کەوتەوە و وتی:
- هاتوە ئاپارتمانەکە ببینێت.
- کامە ئاپارتمان؟

- ئەوەی کاری تیا دەکەین، دەڵێت "بۆ خوێنەکەتان پاک کردۆتەوە؟ لێرەدا کوژرانێک ڕووی داوە و من هاتووم ئێرە بە کرێ بگرم" زەنگەکەیشی ڕاکێشا، خەریک بوو لەبن دەریبکێشێت، دواییش وتی "وەرە با بڕۆین بۆ لای پۆلیس تا هەموو شتێکت پیشان بدەم" وازیشی نەدەهێنا.

دەرگاوانەکە بەسەر سوورڕماوی و برۆی وێکهاتوویەوە کەوتە سەیرکردنی ڕاسکۆلنیکۆڤ، پاشان بە دەنگێکی جیدیتر هاواری کرد:

- ئاخر تۆ کێیت؟

- من ڕادیون ڕومانوڤیچ ڕاسکۆلنیکۆڤم، کۆنە خوێندکاری زانکۆم لە ماڵی شیل[1] لە کۆڵانێکی نزیک بە ئێرە، لە ئاپارتمانی ژمارە ١٤دام، لە دەرگاوانەکە بپرسە دەمناسێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەموو ئەم قسانەی لە حاڵەتێکی ڕاماندا، کە بە قووڵی لە شەقامە تاریکەکەی دەڕوانی، وت، تەنانەت بەبێ ئەوەی ئاوڕێک بداتەوە.

- باشە، بۆ هاتوویت بۆ ئەم ئاپارتمانە؟

- تا تەماشای بکەم.

- تەماشای چی بکەیت؟

بازرگانەکە لەپڕێکدا هاتە ناو قسەکانەوە و وتی:

- باشە، بیگرن و بیبەن بۆ پۆلیس.

لەپڕێکدا بێدەنگ بوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لاونیو تەماشایەکی کرد و ورد لێی ڕوانی، بە کاوەخۆ پێی وت.

---

[1] *shill*

- فەرموو با بڕۆین.
پیاوەکە غیرەتی بە خۆی دا و جەختی کردەوە:
- بیبەن! بۆ چووەتە ئەوێ، چی لەژێر سەردایە؟ ها؟
کرێکارەکە لەبەر خۆیەوە وتی:
- بڵێم سەرخۆشە، سەرخۆش نییە، خوا ئەزانێت چییە!
دەرگاوانەکە کە تەواو تووڕە ببوو، هاواری کرد:
- ئاخر چیت دەوێت؟ بۆ دەستمان لێهەڵناگریت؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە گاڵتەپێکردنەوە پێی وت:
- دەترسیت بچیتە لای پۆلیس؟
- لە چی دەترسم؟ بەڵام بۆ هاتوویت ئەمەندە بێزارمان بکەیت؟
ژنە گوندییەکە دەنگی هەڵبڕی:
- ئەی فێڵباز!
دەرگاوانەکەی تر کە گوندییەکی زۆر بەخۆوە و پاڵتاوێکی هەراوی لەبەردا و دەستەیەک کلیلی بە پشتێنەکەیدا کردبوو، بە دەنگی بەرز وتی:
- بۆ لە خۆتانەوە قسەی لەگەڵدا دەکەن؟ بڕۆ ون بە، ڕاستە فێڵێکی لەژێر سەردایە، دەی بڕۆ..
پاشان شانی ڕاسکۆلنیکۆڤی گرت و بەرەو شەقامەکە پەرتی کرد.
خەریک بوو ڕاسکۆلنیکۆڤ سەرسم بدات و بکەوێت، بەڵام خۆی گرتەوە و ڕێک ڕاوەستایەوە، بێدەنگ لە هەموویانی ڕوانی و دوور کەوتەوە.
کرێکارەکە وتی:
- زەلامێکی سەیرە!
ژنە لادێییەکە وتی:

- لەم ڕۆژانەدا زەلامی سەیرسەیر دەردەکەوێت!
پیاوە بازرگانەکە وتی:
- بەڵام خۆزگا دەمانبردە لای پۆلیس
دەرگاوانە گەورەکە وەک ئەوەی بیەوێت قسەکان کۆتاییان پێبێت، وتی:
- چیمان بەسەریەوە هەیە، دیارە کابرایەکی فێڵبازە، کە پێوەت نووسا، مەحاڵە لێت بێتەوە.. ئیدی ئەوە دیارە و دەیانناسین.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لە حاڵێکدا کە لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا و لە چوارڕێیانێکدا وەستابوو، لە دەوروبەری دەڕوانی و بیری دەکردەوە: "باشە، بڕۆم یان نا" وەک ئەوەی چاوەڕێی یەکێک بێت، کە دواوشەی پێبڵێت، بەڵام دەنگ لە کەسەوە نەدەهات.
هەموو شتێک کەڕ و مردوو بوو، وەک ئەو بەردانەی هەنگاوی بەسەردا دەنان، تەنیا بۆ ئەو مردبوو، تەنیا بۆ ئەو.. لەپڕێکدا لە دوورەوە لە دووسەد هەنگاوی کۆتایی شەقامەکەوە، لە تاریکاییەکی خەستا، هەستی بە کۆمەڵێک و قسە و هاوارکرد. لە ناوەڕاستی کۆمەڵەکەدا گالیسکەیەک وەستا بوو- ڕوناکییەک لە شەقامەکەدا دەردەکەوت "دەبێت چی بێت؟"
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە لای ڕاستا پێچی دا و بەرەو لای خەڵکەکە چوو، دەتوت پێویستیی بە هەموو شتێکە. کە هەستی بەمە کرد، پێکەنی، پێکەنینێکی سارد، چونکە لەبارەی پۆلیسەوە بڕیاری تەواوی دابوو، تەواو لەوە بێگومان بوو کە هەر ئێستاکە هەموو شتێک کۆتایی پێدێت.

٧

لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا گالیسکەیەکی دەلالی پیاوماقوڵێک، کە بە دوو ئەسپی سەرکێشی ڕەنگ خۆڵەمێشییەوە بەسترابووەوە، وەستابوو، گالیسکەکە کەسی تیا نەبوو، گالیسکەوانەکە لە شوێنەکەی هاتبووە خوارێ و لە پاڵ گالیسکەکەدا ڕاوەستابوو، لغاوی ئەسپەکانی بە دەستەوە بوو، خەڵکێکی زۆر لە چواردەوری کۆ ببوونەوە و پاسەوانەکانیش لە پێشیانەوە بوون، یەکێک لە پاسەوانەکان چرایەکی بچووکی بە دەستەوە بوو، لە ناوەڕاستی شەقامەکە و نزیک بە تایەی گالیسکەکە بە چراکە تەماشای شتێکی دەکرد، هەموو خەڵکەکە لە ملەقوتێدا بوون، هاوار و ژاوەژاوێکی سەیر و بەداخیان بوو، گالیسکەوانەکە شپرزە دەهاتە بەرچاو و جارناجارێک دەیوت:

- خودایە، چ گوناهێکە! چ گوناهێک!

ڕاسکۆلنیکۆڤ چەند توانی، خۆی ڕەپێش نا و سەرئەنجام هۆی هەراوزەنا و خۆتێهەڵقورتاندنی خەڵکەکەی بینی: لەسەر زەوییەکە پیاوێک بێهۆش کەوتبوو، ببوو بە ژێر گالیسکەکەوە، جلەکانی بەری بەڕواڵەت کۆن بوون، بەڵام بەرگی کەسانی خانەدان بوون و لە خوێن هەڵکشابوون. خوێن لە ڕووی دەتکا، دەمو چاوی بریندار و شێواو و تێکقوپاو بوو، دیاربوو گالیسکەکە چاک هاڕیبووی.

گالیسکەوانەکە هەر دووبارەی دەکردەوە: خودایا، چۆن دەبوو من ئاوا بێئاگابم! خۆ ئەگەر ئاژوبێتم، یان هاوارم نەکردبێت ئەوە قەیدی نییە، بەڵام هێور و لەسەرخۆ لێم دەخوڕی، هەموو ئەمانە دەزانن، ئەگەر خەڵکەکە درۆ بکات، وا منیش وەک ئەوان درۆزنم، بەڵام سەرخۆش ڕاست بە ڕێگەدا نارِوات، ئەمە ئاشکرایە.. بینیم دەیویست لە شەقامەکە بپەڕێتەوە، لارەلارەی بوو، لەوەدابوو بکەوێت، جارێک هاوارم لێکرد، دوو جار و سێ جار، ئەسپەکانم وەستاند، کەچی

ڕاست خۆی، خۆی خستە بەر پێیان، نازانم، هەر بە دەستی ئانقەست ئەمەی کرد یان تەواو مەست بوو، ئەسپەکانیش جوانوون و سرکن، کەوتنە پڕمەوسمکۆڵان، ئەو هاواری دەکرد و ئەوانیش زیاتر بەهەوادا دەچوون و.. ئیتر ئەم بەدبەختییەی لێکەوتەوە.

یەکێک لەناو خەڵکەکەوە شایەتیی بۆدا:

- هەرچییەکی وت ڕاست وابوو.

دەنگێکی تر بەرز بووەوە:

- ڕاست دەکات، سێ جار هاواری لێکرد.

سێیەم کەسیش هاواری کرد:

- ڕاستە، سێ جار، هەموو گوێمان لێبوو.

بەگشتی گالیسکەوانەکە نە زۆر دەترسا و نە زۆریش غەم دایگرتبوو. دیاربوو گالیسکەکە هی کەسێکی دەوڵەمەند و گرنگ بوو، ئەم لێرە چاوەڕێی هاتنی ئەوی دەکرد، پاسەوانەکانیش دەیانویست هەرچۆنێک بێت، کێشەکە چارەسەر بکەن، دەبوو پیاوە زەرەرمەندەکە ببەنە پۆلیس و نەخۆشخانە، وەلێ کەس ناوی نەدەزانی.

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەروا وردەوردە ڕێگەی بۆ خۆی کردەوە، چووە پێشێ و دانەویەوە، لەپڕێکدا چرا چکۆلەکە دەموچاوی کابرای نەگبەتی تەواو پیشاندا، ڕاسکۆلنیکۆڤ ناسی، هەربەدەم ڕێگەکردنەوە و چوونەپێشێی هاواری کرد:

- من دەیناسم، دەیناسم، کارمەندێکی خانەنشینە، ناوی مارمیلادۆڤە، ماڵیان لەم نزیکانەیە، لە خانووی کوزلدایە، دەبێت زوو بگاتە لای پزیشک، من پارەکەی بۆ دەدەم، وەرن.

هەندێ پارەی لە گیرفانی دەرهێنا و پیشانی پۆلیسێکی دا، ڕاسکۆلنیکۆڤ شپرزەییەکی سەیری تێکەڕابوو.

پۆلیس لە ناسینی کەسە زەرەرمەندەکە خۆشحاڵ بوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ ناونیشانی خۆی دانێ و بەهەموو توانایەوە، وەک ئەوەی ئەو پیاوە کەوتوە باوکی بێت، حەزی کرد مارمیلادۆڤی بێهۆش زووتر بگەیەنرێتە ماڵەوە یان زۆر بە جەختەوە دەیوت:

- ماڵەکەی لێرەدایە، دوای سێ ماڵ، لە خانووی کوزل، ئەڵمانییە دەوڵەمەندەکە.. بێگومان بە سەرخۆشی بەرەو ماڵ بۆتەوە، دەیناسم، هەمیشە مەستە...، خێزانەکەی لەوێدا دەژی، ژن و کوڕ و کچی هەیە، کەی دەگاتە خەستەخانە؟ هەر لە ماڵەکەی خۆیدا جەتمەن پزیشکێک بەدەست دێت. من پارەکەی دەدەم، خۆم دەیدەم، هەرچۆنێک بێت کەسوکارەکەی چاکتر ئاگاداری دەکەن، زوو بە فریای دەکەون، ئەگینا پێش ئەوەی بگاتە خەستەخانە دەمرێت..

ڕاسکۆلنیکۆڤ دەرفەتی هێنا و لەسەرخۆ پارەیەکی خستە چنگی پۆلیسێکەوە، وەلێ مەسەلەکە ڕوون و یاسایی بوو، بەهەرحاڵ، لە ماڵەکەی خۆیدا باشتر چارەسەر دەکرا و نزیکتریش بوو، کابرای برینداریان هەڵگرت و بردیان، خەڵکانێک هاوکاریان کرد، خانووی کوزل سێ هەنگاوێک دوور بوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ کەوتبووە دوایان و بە پارێزەوە سەری بریندارەکەی گرتبوو، ڕێگەکەی پیشاندەدان و لەسەرخۆ دەیوت:

- لێرەوە، لێرەوە، کە چووینە سەر پلیکانەکان دەبێت سەری بەرز بکەینەوە، بسووڕێن.. ئاوا.. من هەقەکەی دەدەم.. سوپاستان دەکەم.

کاترینا ئیڤانۆڤنا، وەک کاری هەمیشەی، هەر ئەوەندەی دەقیقەیەک دەرفەتی بهێنایە، خێرا لە ژوورە بچووکەکەیدا دەکەوتە پیاسەکردن، لە پەنجەرەکەوە بۆ لای زۆپاکە یان بە پێچەوانەوە، دەستی لەسەر سنگی دەکردە خاچ و لەگەڵ خۆیدا دەکەوتە قسەکردن و کۆکین.

لەم دواییانەدا زیاد لە جاران قسەی لەگەڵ کچە گەورەکەیدا دەکرد، یولیای تەمەن دەساڵ ئەگەرچی هێشتا گەلێک شت هەبوو کە نەیدەزانین، بەڵام زۆر چاک لەوە گەیشتبوو کە دایکیی پێویستی بەوە، بۆیە هەمیشە بە چاوە گەورە و زرنگەکانییەوە چاودێریی لێدەکرد و بە هەموو توانایەوە دەیویست ئەو چی لێ داوا بکات، ئەم بەجێی بهێنێت، ئەمجارەیان پولیچکا جلی برا بچووکەکەی دادەکەند تا بیخەوێنێت.

منداڵەکە بۆ گۆڕینی ئەو کراسەی کە دەبوو لە هەمان ئەو شەوەدا بیشۆن، هێور و ڕاست و بێدەنگ لەسەر کورسییەک دانیشتبوو، قاچە چکۆڵەکانی توند بە یەکترەوە نووساندبوو، بەرەو پێشەوە، بەرەو لای خەڵکەکە درێژی کردبوون. منداڵەکە گوێی لەو قسانە گرتبوو، کە دایکی و خوشکە گەورەکەی لەگەڵ یەکدیدا دەیان کرد، دەمولێوی هێنابووە پێشێ و بەبێ جووڵە لێیان ڕامابوو، ڕێک وەک ئەو کوڕە ئاقڵانەی کە دادەنیشن بۆ ئەوەی ڕووتیان بکەنەوە تا بڕۆن بنوون. کچێکی لەو منداڵتریان لە جلکێکی تەواو دڕاودا لە پاڵ دیوارەکەدا وەستابوو، چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد سەرەی بێت. دەرگای لای پلیکانەکان بە تەواوی کرابووەوە، بۆ ئەوەی هەرچۆنێکە لەو شەپۆلی دووکەڵی جگەرەیەی کە لە ژوورەکانی ترەوە دێتە ناوەوە و ژنە نەگبەتە سیلاوییەکە دەخاتە کۆکەکۆک و ئازاردان، کەم بکاتەوە. لەوە دەچوو کاترینا ئیڤانۆڤنا لەم هەفتەیەی دواییدا لەڕولاوازتر بووبێت، پەڵە سوورەکانی سەر ڕوومەتی زیاد لە جاران سوور ببوونەوە. بەدەم هاتوچۆی ناو ژوورەکەوە بە کچەکەی دەوت:

- پۆلیچکا، تۆ بڕوا ناکەیت، تەنانەت توانای وێناکردنی ئەوەیشت نییە کە بزانیت ئێمە لە ماڵی باوەگیاندا چەندە شاد و هەبوو دەژیاین، چۆن

ئەم کابرا سەرخۆشە منی پەک خست و هەموو ئێوەیش هەر وا لێدەکات! باوکم کارمەندێکی گەورەی دەوڵەت و پلەکەی نزیک لە پارێزگار بوو، تەنیا هەنگاوێکی مابوو بگاتە ئاستی پارێزگاری، تەنانەت هەموو ئەوانەی دەهاتنە لای، دەیانوت: "ئیڤان میخائیلوڤیچ، ئێمە تۆ بە پارێزگاری خۆمان دەزانین" کاتێک کە من.. ئاه.. کاتێک کە من ئح، ئح، ئح.. تفت لێبێ ژیان (بەدەم تفکردن لە ژیانەوە هەرچی پیسییەکی سنگی هەبوو، تفی کردەوە و دەستی بە سنگییەوە گرت و کەوتەوە قسە).

- ئەو کاتەی کە من.. نا، کاتێک لە کۆتایی شەوی ئاهەنگەکەدا، نوێنەری خانەدانەکان، شازادەخانم بیززملنایا[1]، واتا ئەو خانمەی پیرۆزبایی لێ کردم کاتێک بووم بە ژنی باوکت، کاتێک کە بینیمی، یەکسەر پرسی: "ئەمە ئەو کچە دلۆڤانە نییە کە لە ئاهەنگی دەرچوونی قوتابخانەیدا سەمای (شالی)ی کرد؟" دەبێت ئەم دڕاوییە پینە بکەین، خۆزگا دەرزی و دەزووت بهێنایە و هەر ئێستا وەک فێرم کردوویت بتدورایەتەوە، ئەگینا بەیانی.. ئاه، بەیانی ئح، ئح، ئح. دڕاوییەکەی زیاتر دەبێت.

ژنە داماوەکە وشەکانی کۆتایی زۆر بە زەحمەت و بەدەم کۆکەوە وت:

- لەو کاتەدا شازادە شچگلسکوی[2] کە ئەفسەرێکی لاو بوو و تازە هاتبووە پترۆزبورگ، سەمای مازورکای لەگەڵدا کردم و بۆ ڕۆژی دوایی ویستی بێتە خوازبێنیم، بەڵام من بە قسەی خۆش سوپاسم

[1] *bezzemelnaya*

[2] *shtche gelskoy*

کرد و پێم وت ماوەیەکە دڵم لای یەکێکی ترە. پولیچکا، ئەو کەسە باوکت بوو، باوکت زۆر توورە بوو. بەڕاست ئاوەکە ئامادەیە؟ باشە، کراسەکە بێنە، گۆرەوییەکان لە کوێن؟ پاشان ڕووی لە کچە بچووکترەکە کرد و وتی:
- لیدا، ئەمشەو تۆ بەبێ کراس بنوو، تەگبیری بکە، گۆرەوییەکانت لە پاڵ خۆتا دابنێ.. ئەویش دەشۆم، ئەم سەرخۆشە شڕەوپڕەلەبەرە بۆ نەهاتەوە؟ کراسەکەی هێند لەبەر کردووە بوەتە سەختیان، هەموویشی دڕاندووە.. خۆزگا هەموویانم بەیەکجاری بشوردایە و دوو جار ئازارم نەچەشتایە، خودایا، ئح، ئح، ئح، دیسانەوە!
کە چاوی بەو خەڵکە کەوت لە ڕاڕەوەکەدا کۆ ببوونەوە و شتێکیان بۆ ژوورەکەی ئەم دەهێنا، هاواری لێهەستا:
- ئەمە چییە؟ چی ڕووی داوە؟ چی دەهێنن؟ خودایا!
کە مارمیلادۆڤی خوێناوی و لەسەرخۆچوویان هێنایە ژوورەوە، پۆلیسەکە بەملاوئەولادا هەڵیڕوانی و پرسی:
- ئاخر، لە کوێی دابنێین؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ قەنەفەیەکی نیشان دا و وتی:
- سەرقەنەفەکە، ڕاست لەسەر قەنەفەکەی دابنێن، سەریشی بخەنە ئێرەوە.
یەکێک لە ڕاڕەوەکەدا هاواری کرد:
- بووە بە ژێر گالیسکەوە، سەرخۆش بوو.
کاترینا ئیڤانۆڤنا بە ڕەنگی پەڕیووەوە وەستابوو، بە زەحمەت هەناسەی دەدا، منداڵەکان ترسان، لیدای چکۆڵە هاواری کرد و خۆی هەڵدایە باوەشی پولیچکاوە، هەموو گیانی دەلەرزی.

دوای ئەوەی ڕاسکۆلنیکۆڤ مارمیلادۆڤی خەواند، بەپەلە بەرەو کاترینا چوو، پێی وت:

- توو خوا هێور بە، مەترسە، بە شەقامەکەدا تێدەپەڕی کە بوو بە ژێر گالیسکەیەکەوە، ناڕەحەت مەبە، دێتەوە هۆش خۆی، من پێم وتن بۆ ئێرەی بێنن.. من جاری تر هاتوومەتە ئێرە، لە بیرتە؟ دێتەوە هۆش خۆی، من خەرجییەکەی لە ئەستۆ دەگرم.

کاترینا ئیڤانۆڤنا نائومێدانە چووە لای مێردەکەی و هاواری کرد:

- بە نیازی خۆت گەیشتیت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ زوو تێگەیشت ئەم ژنە لەوانە نییە کە یەکسەر لە هۆش خۆی بچێت، خێرا سەرینی نایە ژێر سەری پیاوە داماوەکە: کەس بیری بۆ ئەوە نەچووبوو. کاترینا ئیڤانۆڤنا کەوتە داکەندنی جلەکانی و بەوردی تەماشاکردنی. خۆی لەبیر چووبووەوە و گازی لە لێوی دەگرت، ئەو هاوارونالآنەی دەیانویست لە سنگییەوە زوو بێنە دەرێ، خەفەی کردن.

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەر لەو سەروبەندەدا یەکێکی ڕاسپارد بڕوات و پزیشکێک بهێنێت. هەر خانوویەک لەولایانەوە پزیشکێک هەبوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ بە کاترینا ئیڤانۆڤنای وت:

- من ناردوومە بە دوای پزیشکا، بێتاقەت مەبە، پارەکەیش خۆم ئەیدەم، ئاوتان نییە؟ دەستەسڕێک یان خاولییەک یان هەر شتێکی ترم بدەنێ، هێشتا نازانین برینەکەی چۆنە، بەهەرحاڵ، زامدارە نەک کوژراو، دڵنیا بن.. با بزانین پزیشک چی دەڵێت!

کاترینا ئیڤانۆڤنا خۆی گەیاندە پەنجەرەکە، لەوێ لەسەر کورسییەکی قووڵ کە لە سووچێکدا دانرابوو، تەشتێکی گڵینی گەورەی پڕ لە ئاو دانرابوو. ئاوەکە بۆ ئەوە ئامادە کرابوو کە شەو کراسی مێردەکەی و

منداڵەکانی پێ بشوات. ئەم شەوانە جلشتنە لایەنی کەم هەفتەی دوو جار و هەندێکجار زیاتریش کاترینا بە دەستی خۆی دەیکرد، چونکە کار گەییشتبووە ئەوەی کە ئیتر لە قاتێک زیاتر جلی تریان نەبوو بیگۆڕن. هەر یەکێک لە ئەندامانی خێزانەکە تەنیا یەک دەست جلی هەبوو. کاترینا ئیڤانۆڤنایش بەرگەی پیسوپۆخڵی نەدەگرت، بەوە قایل بوو، ئەو شەوانە لە کاتی نووستندا، زیاد لە توانای خۆی ماندوو بکات، بەیانی بە پاکی جلەکانی کە بەسەر تەنافەوە بوون، وشکیان بکاتەوە و بیانداتێ، نەک ماڵەکەی بە پیسی ببینێت.

ویستی وەک ڕاسکۆلنیکۆڤ داوای لێکردبوو، تەشتەکە هەڵبگرێت، بەڵام زۆری نەمابوو بە تەشتەکەوە بکەوێت، ڕاسکۆلنیکۆڤیش خاولییەکی پەیدا کرد و بە ئاو تەڕی کرد و کەوتە پاککردنەوەی دەموچاوە خوێناوییەکەی مارمیلادۆڤ. کاترینا ئیڤانۆڤنا لە پاڵیا وەستا، دەستی بە سنگی خۆیەوە گرتبوو، بە زۆر هەناسەی هەڵدەکێشا، ئەو خۆی پێویستی بە کۆمەک و یارمەتیدان بوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ وردەوردە کەوتە بیری ئەوەی کە نەدەبوو جەخت لەسەر هێنانی زامدارەکە بکات بۆ ئێرە، پاسەوانەکەیش بە سەرسامییەوە هەروا وەستابوو.

کاترینا ئیڤانۆڤنا بانگی کچەکەی کرد:

- پولێچکا، خێرا بڕۆ بۆ لای سۆنیا، ئەگەر لە ماڵەوە نەتبینی، قەیدی نییە، بڵێ باوکی بووە بەژێر گالیسکەوە و هەر کە گەیشتەوە ماڵەوە، بێت بۆ ئێرە. زوو بە پولێچکا، وەرە، ئەم دەسماڵە بدە بەسەرتا.

منداڵە چکۆڵەکە کە لەسەر کورسییەکە دانیشتبوو، لەپڕێکدا بە زمانی پتەوە وتی:

- زوو، لاکە (ڕاکە).

ئەمەی وت و دیسانەوە بێدەنگ، ڕاست لەسەر کورسییەکە مایەوە، چاوی هەروا ڕاماو، قاچی توند بەیەکەوە نووساندبوو، پێی بەرەو پێشەوە و نووکی پەنجەی بە شاشی دەرکەوتبوون.
ژوورەکە لەو ماوەیەدا ئەوەندە سیخناخ بوو، دەرزیت هەڵدایە نەدەکەوتە سەر زەوی. هەموو پاسەوانەکان ڕۆیشتن، بێجگە لە یەکێکیان کە هێشتا مابووەوە و دەیویست ئەو خەڵکانەی لە پلیکانەکانەوە هاتبوونە ژوورەوە، دیسان بەرەو ئەوێیان بکاتەوە، زۆربەی کرێگرتەکانی خاتوو لیپی ڤێخزێلا هاتبوونە دەرەوە، یەکەمجار لەبەر دەرگاکانی خۆیاندا وەستان، بەڵام دوایی تێکڕا ڕژانە ناو ژوورەکەوە، کاترینا ئیڤانۆڤنا بە تووڕەییەوە هاواری لێکردن:
- خۆزگا لێگەڕانایە هیچ نەبێت مرۆڤ بە ڕەحەتی بمردایە، تەماشای چی دەکەن؟ بە فیشکەفیشکی جگەرەیشەوە! ئح، ئح، ئح، هەر ئەوە ماوە بە کڵاویشەوە بێنە ژووری!.. ئەمانە، یەکێکیان کڵاویشی لەسەردایە.. دەی بڕۆنە دەری، هیچ نەبێت ڕێزی مردوو بگرن!
کۆکە گەرووی گرت، بەڵام هەڕەشەکەیش کاریگەر بوو، دیار بوو قسەی کاترینایان بەهەند وەردەگرت، ئەوەتا، یەک بەدوای یەکدا لەو دەرگایەوە کە هاتبوونە ژووری، دیسانەوە چوونە دەرەوە، لە ناوەوەی خۆیاندا هەستیان بە جۆرە خۆشییەک کرد، ئەوە هەستی ڕاستەقینەی هاودەردییە، هەمیشە لە دڵی نزیکترین کەس بەیەکدی کە لێقەومان و داماوی ڕوزیان تێبکات، ئەو هەستە هەیە، ئەمە هەستی هەموو مرۆڤێکە و چ ئاوارتەیەکی تیا نییە.
لەو میانەدا و لە دەرەوە هەندێک قسە دەکەوتە بەرگوێ لەبارەی خەستەخانەوە، گوایا نابێت ئەم ناوە جەنجاڵ بکرێت و خەڵکی ناڕەحەت بن، کاترینا ئیڤانۆڤنا هاواری لێکردن:

- چۆن؟ یەعنی نابێت بمرێت!
ویستی دەرگاکە بکاتەوە تا وەک هەورەتریشقە بەسەریاندا بکێشێت. بەڵام لەبەر دەرگاکەدا تووشی خاتوو لیپی ڤێخزێلا بوو کە تازە هەواڵی کارەساتەکەی بیستبوو، هاتبوو چارەسەرێک بدۆزێتەوە. خاتوو لیپێ ڤێفزیل ژنێکی ئەڵمانی و تا بڵێی بێبیر و نارێکوپێک بوو، ئەو دەستی بەیەکدا دا و بە ڕووسییەکی شکست وتی:
- خودا هاوار! مێردەکەت بەسەر خۆشی بووە بە ژێر دەستوپێی ئەسپەوە، بیبەن بۆ خەستەخانە، من خاوەنی ئەم ماڵەم!
کاترینا ئیڤانۆڤنا بە فیز و دەعیەیەکی تایبەتیەوە وتی:
- ئامالیا لودڤیگوڤنا[1]، تکایە بزانە چی دەڵێیت!
هەمیشە لەگەڵ خاوەن ماڵدا هەر بەو لووتبەرزیەوە قسەی دەکرد. بۆ ئەوەی هەر کەسە و جێوڕێی خۆی بزانێت، ئێستایش، بەم حاڵەوە، ئەو وازی لەم نەریتە بەتامەی خۆی نەدەهێنا.
- ئامالیا لودڤیگوڤنا!
- من جارێک و بۆ هەمیشە ئەوەم پێ وتوویت کە تۆ هیچ کاتێک مافی ئەوەت نییە بە من بڵێی ئامالیا لودڤیگوڤنا، من ئامالیا ئیڤانۆڤنام.
- تۆ ئامالیا ئیڤانۆڤنا نیت، بەڵکو ئامالیا لودڤیگوڤنایت، لەبەر ئەوەی کە من لەو کەسە ڕیاباز و گرگنانەی لە بابەتی جەنابی لبزیاتنیکوف نیم، کە ئێستا لە پشت دەرگاکەوە پێدەکەنێت (لە ڕاستیا لە پشت دەرگاکەوە دەنگی قاقای پێکەنین دەهات کە دەیانوت: "وا دەستیان داوەتە قژی یەکتریی") بۆیە هەمیشە هەر پێت دەڵێم ئامالیا لودڤیگوڤنا، بەڵام من نازانم تۆ بۆ خۆشیت لەم ناوە نایەت، تۆ خۆت دیت چی

[1] *Amalia Ludvigovna*

بەسەر سمیون زاخارڤیچ هات. لە سەرەمەرگدایە، داوات لێدەکەم هەر ئێستا دەرگاکە دابخەیت و نەهێڵیت کەس بێتە ژوورەوە. هیچ نەبێت با بە ڕەحەتی بمرێت، ئەگینا بڕوا بکە کە هەر سبەینێ ئەم ڕەفتارەت دەگاتە گوێی پارێزگار. شازادە بە کچی منی ناسیووە، هەروەها خودی سمیون زاخارڤیچیش، کە زۆرجار بە سەری کردۆتەوە، بە چاکی دەیناسێت، هەموو کەس دەزانێت کە سمیون زاخارڤیچ دۆست و هاوڕێی زۆری هەیە، ئەو لەبەر ئەو لاوازییە هەرە ناخۆشەی لە خۆیدا هەستی پێدەکات و بە هۆی نەفسبەرزی و خانەدانیی خۆیەوە وازی لەو هەموو هاوڕێیانەی هێناوە، بەڵام ئێستا..
ئاماژەی بۆ ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد:
- لاوێکـــی گەورە و خانـــەدان یارمەتیمان دەدات کە لەلایەکەوە دەستی دەڕوا و لـــەلایەکی تریشەوە هاوڕێ و ئاشنای زۆرە. سیمون زاخارڤیچ لە منداڵییەوە دەیناسێت، بڕوات هەبێت، ئامالیا لودڤیگوڤنا..
هەموو ئەم قسانە بەپەلە کران و چەندە بۆ پێشەوە بچوایە، قسە خێراتر دەکرا. بەڵام لەپڕێکدا کۆکە کاترینای لە وتە خست. لەو کاتەدا ئەوەی لە گیانەڵادا بوو، هاتەوە هۆش خۆی و ناڵاندی، کاترینا ڕایکرد بۆ لای، چاوی کردەوە و بەبێ ئەوەی هێشتا کەس بناسێت، یان بیری لێبکاتەوە، لە ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕاما، کە لە پاڵیا وەستابوو، هەناسەی قورس و قووڵ و پچڕپچڕ بوو، خوێن بە لالێویا دەهاتە خوارێ و ئارەقە کەوتبوە نێو چاوی. کە ڕاسکۆلنیکۆڤی ناسی، بە زەحمەت چاوی گێڕدا، کاترینا ئیڤانۆڤنا بە نیگایەکی غەمگین بەڵام دڵگیرانە تەماشای کرد، فرمێسک بە چاویا هاتە خوارێ، پاشان بە دەنگێکی پڕ لە نائومێدییەوە وتی:

- خوا گیان، هەموو سنگی بووە بە گۆشتی کوتراو، خوێن، تەماشای خوێنەکە، دەبێت گشت جلەکانی دابکەنین.
پاشان ڕووی تێکرد و وتی:
- سمیون زاخارڤیچ، ئەگەر دەتوانیت کەمێک بسووڕێ.
مارمیلادۆڤ ژنەکەی خۆی ناسی و بە دەنگێکی گیراوەوە وتی:
- قەشە!
کاترینا ئیڤانۆڤنا بەرەو لای پەنجەرەکە چوو، تەوێڵی بە چوارچێوەکەیەوە نا و نائومێدانە هاواری کرد:
- ژیان نەفرەتت لێبێت.
ئەوەی لە گیانەلادا بوو دوای چرکەیەک بێدەنگی وتی:
- قەشە!
کاترینا بەسەریا قیژاندی:
- ناردوومانە بە دواییدا.
بریندارەکە گوێڕایەڵانە بێدەنگ بوو. دوایی بە نیگایەکی غەمگین و ترساوەوە بە دوای ژنەکەیدا گەڕا، کاترینا ئیڤانۆڤنا جارێکی تر گەڕایەوە سەری و وەستا، بریندارەکە تۆزێک ئارام بوو، بەڵام زۆری بڕ نەکرد، زوو چاوی بڕیە لیدای جوان و چکۆڵەی کە لە سووچێکدا وەک ئەوەی لە کاتی لەسەرخۆچووندا بێت دەلەرزی، بە ڕوانینە سەیر و نیگا منداڵانەکەیەوە لێی دەڕوانی، بە دوودڵی و بە ئاماژەوە بۆی، وتی:
- ئا.. ئا..
دەیویست شتێک بڵێت.
کاترینا ئیڤانۆڤنا هاواری لێکرد!
- ئیدی چیت دەوێت؟

زامدارەکە کە بە نیگایەکی شێتانەوە لە قاچە ڕووتەکانی کچۆڵەکەی خۆی دەڕوانی، بە زەحمەت لەبەر خۆیەوە وتی:

- پێی پەتییە، پێی پەتییە.

کاترینا ئیڤانۆڤنا بە تووڕەییەوە دەنگی لێ بەرز کردەوە:

- خۆت دەزانیت بۆ پێی پەتییە!

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دەماخێکەوە وتی:

- سوپاس بۆ خودا، پزیشکەکە هات.

پزیشکەکە کە پیرەمێردێکی ڕێکوپێکی ئەڵمانی بوو، لە کاتێکدا لە بێمتمانەییدا چاوی بەملاوئەولادا دەگێڕا، هاتە ژوورەوە، چووە نزیک نەخۆشەکەوە، نەبزی گرت، بە وردی تەماشای سەری کرد و بە یارمەتی کاترینا ئیڤانۆڤنا قۆپچەی کراسەکەی کە تەواو شەلاڵی خوێن بوو، کردەوە و سنگی ڕووت کرد، هەموو قەفەزەی سنگی کوتراو و پەرێشان و چەند پەراسوویەکی لای ڕاستی شکابوو، لای چەپی، ڕێک بەسەر دڵییەوە، پەڵەیەکی زەردی سامناکی گەورە کە شوێنپێی لێدانی توندی سمی ئەسپەکان بوو، دەبینرا، پزیشکەکە برۆی هێناوەیەک، پۆلیسەکە ئەوەی بۆ باس کردن کە چۆن بریندارەکە بە تایەی گالیسکەکەوە گیر بووە و کاتێک کە تایەکە سووڕاوەتەوە، چۆن نزیکەی سی هەنگاو بەسەر زەویی شەقامەکەدا ڕایکێشاوە.

پزیشکەکە لەسەرخۆ بە ڕاسکۆلنیکۆڤی وت:

- سەیرە چۆن وا هاتۆتەوە هۆش خۆی!

ڕاسکۆلنیکۆڤ پرسی:

- جا ئەڵێی چی؟

- هەر ئێستا دەمرێت.

- یەعنی هیچ ئومێدێک نییە؟

- هیچ، دواهەناسەکانی ژیانیەتی.. بێجگە لەوەی کە سەریشی زۆر بە سەختی بریندار بووە.. هەرچەندە دەشێت خوێنی لێبگرین.. بەڵام.. کەڵکی نییە.. دوای پێنج یان حەوت دەقیقەی دی حەتمەن دەمرێت.
- کەواتە با هیچ نەبێت خوێنی بگرین.
- باشە، بەڵام با پێت بڵێم کە ئەم کارەیش هەر بێسوودە.
لەو کاتەدا دیسانەوە دەنگی پێ هات، خەڵکەکە لە تارمەکەدا ڕێگەیان دەکردەوە، قەشەیەکی پیری سەرسپی، کە هەندێک شتی پێویستی پێبوو، دەرکەوت، پۆلیسێکی بە دواوە بوو، زوو پزیشکەکە جێگای خۆی دایە و تەماشایەکی بە مانای کرد. ڕاسکۆلنیکۆڤ پزیشکەکەی قایل کرد کە کەمێک بمێنێتەوە، ئەویش شانی هەڵتەکاند و مایەوە.
هەموویان چوونە دواوە، داننان بە گوناهەکاندا زۆری نەخایاند، بریندارەکە کە لە سەرەمەرگدابوو توانای قسەکردنی نەبوو، بێجگە لە دەنگێک کە دەبڕاو لێی تێنەدەگەیشتی، چ شتێکی تری بە زماندا نەدەهات.
کاترینا ئیڤانۆڤنا لیدای هەڵگرت و کوڕە منداڵەکەیشی لەسەر کورسییەکە هەستاند، بەرەو لای زۆپاکە کە لە سووچێکدا بوو، بردنی، لەسەر ئەژنۆ دانیشت و منداڵەکانیشی بەرانبەر بە خۆی هەر خستە سەر ئەژنۆ. کیژەکە هەر دەلەرزی، بەڵام کوڕە بچووکەکە کە لەسەر ئەژنۆ ڕووت و چکۆڵەکانی دانیشتبوو، بە هێوریی دەستە چکۆڵەکانی بەرز دەکردەوە و وێنەی خاچی دەکێشا، کرنووشی دەبرد تا ناوچاوی بەرزەوییەکە دەکەوت، دیار بوو هەستی بە چێژێکی تایبەتی دەکرد. کاترینا ئیڤانۆڤنا لێوی خۆی دەگەست و نەیدەتوانی ڕێ لە فرمێسکەکانی بگرێت، ئەویش هەر نزای دەکرد و بە دەگمەن کراسی منداڵەکەی چاک دەکرد. هەر لەو سەروبەندەدا دەرفەتی هێنا

و بەدەم نزاوە، بەبێ ئەوەی هەستێت، سەرپۆشەکەی لە دۆلابەکە دەرهێنا و دای بەسەر شانە ڕووتەکانی کچەکەدا. لەم کاتەدا دەرگای ژوورەکانی ناوەوە، بە هۆی چەند کەسێکی ماتیگر (فزولی)ەوە کرانەوە، لە تارمەکەدا، هەموو دانیشتووانی سەروخواری ئاپارتمانەکە، بەبێ ئەوەی پێ بنێنە ئەم دیوی دەرگای ژوورەکە، کەوتبوونە تەماشا، تا دەهات زیاتر پاڵەپەستۆیان دەکرد، تەنیا تاقە مۆمێکیش ئەو دیمەنەی ڕوناک کردبووەوە.

لەو کاتەدا، لە تارمەکەوە، لە ناو خەڵکە ئاپۆرەکەوە، پولیچکای بچووک کە چووبوو بە دوای خوشکەکەیدا، بەپەلە گەیشت. کە هاتە ژووری (بە هۆی ئەوەوە کە بە ڕاکردن گەڕابووەوە، هەناسەی گیرابوو) سەرپۆشەکەی لابرد، چاوی بۆ دایکی گێڕدا، لێی نزیک کەوتەوە و وتی:

- ئێستا دێت، لە شەقامەکە پێی گەیشتم.

دایکی ئەویشی لە پاڵ خۆیدا خستە سەر ئەژنۆ. لە ناو ئاپۆرەی تەماشاکەرانەوە کچێکی گەنج، لەسەرخۆ و بەپارێزەوە دەهات. قوتبوونەوەی ئەم کچە لەو ژوورەدا، لە نێو هەژاری، جلوبەرگی دڕاو، مەرگ و نائومێدیدا شتێکی سەیر بوو، جلەکانی بەری ئەو کچە هەرزان بەهابوو. بەڵام لەگەڵ زەوقی کۆڵان و شەقام و ئەو یاسا و ڕێسایەی لەگەڵ دنیا تایبەتیەکەی ئەودا دەگونجێ و ئەو ئامانجە ناپەسەندانەی دەستی بەسەر ئەو دنیایەدا گرتووە، تەواو دەگونجا. سۆنیا لە تارمەکەدا و ڕێک لە بەردەم دەرگای ژوورەکەدا وەستا، بەڵام هەنگاوی بۆ ژوورەوە نەنا، وەک یەکێک ون بووبێت، نیگای وێڵی دەگێڕا، بەبێ ئەوەی بزانێت چی هەیە و چی نییە. هەروەها ئاگای لەوەیش نەمابوو کە کراسە ڕەنگاوڕەنگە ئاوریشمینەکەی، بە

داوێنێکی هەراوی پێکەنینهێنەوە کە لە دەستی چوارەم کڕابوو، لەگەڵ ئەم شوێنەدا نەدەگونجا، هەروەها تەنوورە پان و پۆڕەکەی کە بە پانی و درێژیی دەرگاکەی داگرتبوو، لەگەڵ پێڵاوە بریقەدارو چەترە چکۆڵەکەی دەستی کە شەوانە پێویستیی پێی نەدەبوو، هەروەها کڵاوێکی حەسیری خڕی سەیری کردبووە سەری، کە پەڕێکی سووری پیا چەقاندبوو، لەژێر کڵاوە چکۆڵەکەوە، کە وەک منداڵان لار داینابوو، دەموچاوێکی وردی سارد و ڕەنگزەرد و لاواز، زارێکی داچەقاو و چاوانێکی پڕ لە ترس، دەبینرا، سۆنیا تەمەنی هەژدەساڵان بوو، کچێکی کورتەباڵا و لاواز، بەڵام قژی زەرد و جوان بوو، چاوی شین و گەلێک سەرنجڕاکێش بوو، چاوی بڕییە قەنەفە و قەشەکە، ئەوەندە خێرا هاتبوو، بە زەحمەت هەناسەی بۆ دەدرا، سەرئەنجام گوێی لە هەندێک قسە و چرپەچرپی ناو خەڵکەکە بوو، چاوی داخست، لە دەرگاکە چووە ژووری و بەڵام هەر لە سووچێکدا وەستا. دانپیانان و ڕێوڕەسمە ئاینییەکە کۆتاییان پێهات، کاترینا ئیڤانۆڤنا چووەوە پاڵ جێگای مێردەکەی، قەشەکە لاکەوت و ڕۆیشتە پشتەوە، پێش ئەوەی بڕوات، گەڕایەوە لای کاترینا ئیڤانۆڤنا، بۆ ئەوەی دڵی بداتەوە و ئامۆژگاریی بکات.

کاترینا ئیڤانۆڤنا بە ڕەقی و تووڕەییەوە قسەکانی پێبڕی، ئاماژەی بۆ لای منداڵەکانی کرد و پرسی:

- باشە ئەمانە تاوانیان چییە؟

قەشە وتی:

- خودا گەورەیە، لە بەزەیی خودا بێئومێد مەبە.

- هەی هەی! خوا میهرەبانە، بەڵام بۆ ئێمە نا.

قەشە بەدەم سەرڕاوەشاندنەوە پێی وت:

- خانمەکە، ئەمەی تۆ دەیڵێیت، گوناهە.
کاترینا ئیڤانۆڤنا ئاماژەی بۆ لای پیاوەکەی کرد کە لەگیانەڵادایە و هاواری کرد:
- ئەی ئەمە گوناه نییە؟
- بەڵکو ئەوانەی بەبێ ویستی خۆیان کارەساتەکەیان ناوەتەوە، هیچ نەبێت بەوە قایل بن کە لە بریداو بۆ دەستگیرویتان هەقتان بۆ بکەنەوە.
کاترینا ئیڤانۆڤنا بە تووڕەییەوە دەستی ڕاوەشاند و بە دەنگی بەرز وتی:
- تۆ لە من تێناگەیت؟ هەقی چیم بۆ بکەنەوە؟ ئاخر ئەو خۆی، بە سەرخۆشی چووەتە ژێر دەستوپێی ئەسپەکانەوە! ئیدی هەقی چی! لەوەوە هیچ هەقێکم بەدەست ناگات، بەڵکو هەمیشە مایەی سەرئێشە و ئازاری من بووە. ئاخر مەیخۆر بوو، هەرچییەکی دەست دەکەوت، دەیدا بە خواردنەوە، لە ئێمەی دەدزی و دەیبردە مەیخانە، ژیانی من و منداڵەکانی لە یانەکاندا نابووت کرد، سوپاس بۆ خودا کە مرد! زیانی کەمتر دەبێت.
- ئەمە کاتی بەخشین و لێبووردنە، ئەم ڕەفتارەتان گوناهە، خانم، ئەم هەستەتان گوناهێکی گەورەیە.
کاترینا ئیڤانۆڤنا لە پاڵ بریندارەکەدا هەر لە جووڵەدا بوو، ئاوی دەدایە، ئارەقە و خوێنی سەری پاک دەکردەوە، سەرینەکانی ڕاست دەکردەوە، لەگەڵ قەشەکەدا قسەی دەکرد و جارجارە هەر بەدەم کارکردنەوە ئاوڕی لێدەدایەوە، تا لەپڕێکدا تەواو گەیشتە تینی و شێتانە پەلاماری دا:

- باوکە! هەموو ئەمانەی تۆ دەیانڵێیت قسەی ڕووتن، بەخشین و لێبووردنی چی! ئەگەر ئەمشەو ئەمەی بەسەر نەهاتایە و هەر ئاوا بگەڕایەتەوە ماڵەوە.. ئەو تاقە کراسە پیس و دڕاوەی لەبەریدایە و هیچی تری نییە، پێوەی دەخەوت، ئەوسا من ناچار بووم تا بەیانی هەموو گیانم لەناو ئاودا بێت. خرتکەوپرتکەی ئەو و منداڵەکان بشۆم و لە پشت پەنجەرەکەوە وشکیان بکەمەوە، کە بەیانیش گزنگی دا، ئینجا دەست بکەم بە پینەوپەڕۆیان. ئەمەیە شەوی من!.. ئیتر قسەکردن لە بەخشین کارێکی بێهودەیە: تازە من هەر لێیشی خۆش بووم.

کۆکینێکی قووڵ و ترسناک قسەکانی پێبڕی. کاترینا ئیڤانۆڤنا بەڵغەمەکەی تف کردە دەستە سڕێکەوە، بۆ تەماشاکردنی بردییە پێشەوە بۆ بەرچاوی قەشەکە و دەستی توند بە سنگییەوە گرت. دەستەسڕەکە پڕ بوو لە خوێن..

قەشە سەری دانەواند و هیچی نەوت.

مارمیلادۆڤ تەواو لە سەرەمەرگدا بوو، بەڵام چاوی لەدەم و چاوی کاترینا ئیڤانۆڤنا هەڵنەدەگرت کە دیسان خۆی بەسەردا شۆڕ کردبۆوە. دەیویست شتێکی پێبڵێت، تەنانەت هەوڵیشی بۆ دا و بە زەحمەت زمانی جووڵاند و شتێکی وت کە کەس تێی نەگەیشت، وەلێ کاترینا ئیڤانۆڤنا کە زانی مێردەکەی دەیەوێت پۆزشی بۆ بهێنێتەوە، زوو فەرمانی دایە:

- بێدەنگ بە! پێویست ناکات! ئەزانم دەڵێی چی..

بریندارەکە بێدەنگ بوو، هەر لە هەمان کاتدا نیگا شلوێکەی بەر سۆنیا کەوت و بینی.. تا ئەوسا ئاگای لەو نەبوو، سۆنیا لە سووچێکی تاریکدا وەستابوو، لەپڕێکدا بریندارەکە بە دەنگێکی گیراو و هەناسەی

سوارەوە، بەوپەڕی نیگەرانییەوە، لە کاتێکدا کە بە چاوە گێژوویژەکانی لەو شوێنەی دەڕوانی، کە کچەکەی لێ وەستابوو، هەوڵیدا کەمێک هەستێت، وتی:

- ئەمە کێیە؟ ئەمە کێیە؟

کاترینا ئیڤانۆڤنا هاواری لێکرد:

- بنوو، بنوو.

بریندارەکە بە تەکانێکی زۆر نائاسایی توانی خۆی لەسەر دەست بگرێت، بە حاڵەتێکی ترسناک و بێجووڵە بۆ ماوەیەک سەیری کچەکەی خۆی کرد، وەک ئەوەی نەیناسێت، ئاخر، ئەو هەرگیز کچەکەی بەو جۆرە بەرگەوە نەبینیبوو، لەپڕێکدا ناسی، کچە داماو و زەلیل و غەمبارەکەی کە شەرمی بە جلەکانی خۆی دەهات و بە لارەملێ و سادەییەوە چاوەڕێی ئەوەی دەکرد سەرەی ئەوییش بێت تا دوامالئاوایی لە باوکی بکات. غەم و ئازارێکی لەڕادەبەدەر نیشتە سەر دەموچاوی پیاوە و لە کاتێکدا کە دەستی بۆ لای سۆنیا درێژ کردن هاواری لێ هەستا:

- سۆنیا، کچەکەم، بمبەخشە!

بەڵام لەبەر ئەوەی هاوسەنگیی نەما و دەستی ترازا، تەکانێکی خوارد و بەدەما لەسەر قەنەفەکەوە کەوتە خوارێ، هەڵیانساندەوە و پاڵیان خست، ئیدی لە دواهەناسەیدا بوو، سۆنیا بە دەنگی نزم هاواری کرد، چووە پێشێ و لە باوەشی گرت، هەر بەو حاڵەوە جووڵەی لێبڕا.

باوکی لە ئامێزی ئەودا گیانی دەرچوو.

کاترینا ئیڤانۆڤنا کە لاشەی بێگیانی مێردەکەی بینی، دەنگی هەڵبڕی:

- بە مرازی خۆی گەیشت، باشە. ئەی ئێستا چی بکەین؟ بە چی بەخاکی بسپێرم:

به چی ئەمانە، بەڵێ ئەمانە، سبەینێ بە چی نانیان دەرخوارد بدەم؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە کاترینا ئیڤانۆڤنا نزیک بووەوە و پێی وت:

- کاترینا ئیڤانۆڤنا، هەفتەی پێشوو مێردە کۆچکردووەکەت هەموو شتێکی لەبارەی ژیانی خۆیەوە بە درێژی بۆ باس کردم.. بڕوات هەبێت بەرانبەر بە تۆ بەوپەڕی ڕێز و پێزانینەوە قسەی کرد، لەوشەوەوە، کە زانیم تا چ ڕادەیەک وەفای بۆ هەمووتان و بەتایبەتی بۆ تۆ کاترینا ئیڤانۆڤنا هەیە، لەگەڵ ئەو نەگبەتییەی داوێنگیری ببوو، چەندە ڕێز و دڵسۆزی بۆ تۆ هەبوو، ئیتر لەو شەوەوە بووین بە هاوڕێ، ئێستا ڕێگەم پێبدە من یارمەتیتان بدەم و ئەرکی هاوڕێیەتیم لەگەڵ ئەو خوالێخۆشبووەدا بەجێ بێنم. ئەمە.. کە وابزانم بیست ڕۆبڵە. ئەگەر ئەم برە پارەیە کۆمەکێکتان پێبکات، من.. من، جارێکی دی دێمەوە لاتان.. ڕەنگە هەر بەیانی بێمەوە.. خواتان لەگەڵ.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بەپەلە لە ژوورەکە چووە دەرێ و خێرا لە ناو خەڵکەکەوە خۆی گەیاندە پلیکانەکان. بەڵام لەپڕێکدا تووشی بوو بە تووشی نیکۆدیم فومیچەوە، کە دوای بیستنی هەواڵی ئەم نەهامەتییە هاتبوو خۆی سەروکاری پێویستییەکان بکات. لەوساوە کە کارەساتی کوژرانەکە ڕووی دابوو، کاتێ لە پۆلیسخانە یەکیانبینی، ئیتر ئەم دووانە چاویان بە یەکتری نەکەوتبوو. نیکۆدیم فومیچ لە یەکەم نیگادا ڕاسکۆلنیکۆڤی ناسییەوە و پرسی:

ها! ئەمە تۆیت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی دایەوە:

- مرد، پزیشک هات، قەشە هات و هەموو شتێک ئامادە کرا، ژنە بێچارەکە زۆر نارەحەت مەکە، نەخۆشیی سیلیەتی، ئەگەر دەتوانیت دڵی بدەرەوە..

پاشان لە کاتێکدا کە ڕاست چاوی لەدووی چاوی ئەو نابوو، بە گەپپێکردنەوە وتی:
- تۆ پیاوێکی دلۆڤانیت، دەزانم..
نیکودیم فومیچ کە لەبەر ڕووناکیی چراکەدا چەند پەڵەخوێنێکی تازەی بە هێلەکەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤەوە بینی، وتی:
- ئای! تۆ خوێنت پێوەیە؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە شێوازێکی زۆر تایبەتی وتی:
- بەڵێ، هەموو لەشم بووە بە خوێن.
پاشان زەردەخەنەیەکی هاتێ، سەری ڕاوەشاند و بە پلیکانەکاندا چووە خوارێ. لەسەرخۆ و بەبێ پەلەکردن دەچووە خوارێ، هەموو گیانی لەرزوتا دایگرتبوو، وەلێ خۆی بەوەی نەدەزانی کە خۆشی هەستێکی تازەی ژیان لەپڕێکدا و زۆر بە سەختی لەودا دروست ببوو. ئەو هەستە لە هەستی کەسێکی دەکرد، کە فەرمانی مەرگی بەسەردا درابێت و لەناکاوێکدا و بەبێ ئەوەی بەتەما بووبێت هەواڵی بەخشینی پێبگات. لە ناوەڕاستی پلیکانەکاندا تووشی قەشەکە بوو، کە بۆ ماڵ دەگەڕایەوە، ڕاسکۆلنیکۆڤ بە هێوری ڕێی بۆ کردەوە و بەبێ قسە سڵاوی لێکرد. بەڵام کە گەیشتە دواپلە، لە دوایەوە گوێی لە دەنگی پێیەک بوو، کە بەپەلە لە دوای دەهات، ئەمە پولێچکای منداڵ بوو، کە کەوتبووە دوای و بانگی لێدەکرد:
- گوێ بگرە، گوێ بگرە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕووی تێکرد، کچەکە لە دواپلەکانی کۆتاییدا پلەیەک لە سەرووی ئەوەوە بەرانبەری وەستا، کەمە ڕووناکاییەک لە حەوشەوە هاتبووە ناوەوە. ڕاسکۆلنیکۆڤ دەموچاوە لاوازی، بەڵام جوانی کچەکەی ناسییەوە کە زەردەخەنەی لەسەر لێو و سەرنجێکی

منداڵانەی لەم دابوو، پەیامێکی پێبوو پێدەچوو زۆری پێخۆش بێت، بە هانکەهانکەوە وتی:
- گوێ بگرە، ناوت چییە؟.. ئەی ماڵتان لە کوێیە؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ دەستی خستە سەرشانی و بە خۆشییەکی تایبەتیەوە لێی ڕوانی، بەو تەماشاکردنەی زۆر دڵی خۆشبوو، هەرچەندە خۆیشی نەیدەزانی هۆیەکەی چییە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لێی پرسی:
- کێ تۆی ناردووە؟
کچۆڵەکە زۆر بە شادییەوە زەردەی هاتێ و وتی:
- خوشکەکەم، سۆنیا ناردومی.
- خۆیشم دەمزانی کە سۆنیای خوشکت ناردوویتی.
- دایکیشم هەروا، چونکە کە سۆنیای خوشکم ویستی بمنێرێت، دایکیشم هاتە لامەوە و وتی:
- پۆلیا گیان، زوو بە ڕاکردن.
- سۆنیای خوشکت خۆش دەوێت؟
پۆلیا زۆر بە باوەڕەوە وتی:
- ئەوم لە هەموو دنیا خۆشتر دەوێت.
لەپڕێکدا زەردەخەنەکەی قووڵتر بوو.
- ئەی منیشت خۆش دەوێت؟
کچۆڵەکە وەڵامی نەدایەوە، بەڵام دەموچاوە وردیلەکەی بینی کە لە ڕووی ئەم نزیک بووەوە، لێوە گۆشتن و ناسکەکانی، بەوپەڕی سادەییەوە، بۆ ماچکردنی ڕاسکۆلنیکۆڤ هێنانە پێشێ، لەپڕێکدا دەستە باریکەکانی کە لە دەنکەشقارتە دەچوون، لە ملی وەرهێنا و توند باوەشی پێدا کرد، سەری کچۆڵەکە کەوتە سەر شانی، لە کاتێکدا

که به تەواوی ڕووی بە ڕوویەوە نووساندبوو، کچۆڵەکە دەستی بە گریان کرد. دوای دەقیقەیەک سەری بڵند کرد و فرمێسکەکانی بە پشتی دەستی سڕی و وتی:

- دڵم بۆ باوکم دەسووتێت.

لەپڕێکدا بە ڕوویەکی لێهاتوانەوە کە منداڵ لە خۆی دەگرێت تا وەک "گەورە" قسان بکات، وتی:

- چ بەڵا و نەگبەتییەک بەڕێوەیە!

- باوکت خۆشی دەویستیت؟

بە هەمان سیمای جیدی و زەردەخەنەوە، تەواو وەک گەورە وتی:

- لیدا گیانی لە هەموومان زیاتر خۆش دەویست، لەبەر ئەوەی منداڵە، چونکە نەخۆشە. هەمیشە لە دەرەوە شتێکی بۆ دەهێنایەوە، بەڵام ئێمەی فێری خوێندن دەکرد.

هەر بە ویقارەوە لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

- منیشی فێری دەستووری زمان و شتی ئاینی دەکرد، دایە گیانیش هیچی نەدەوت، وەلێ ئێمە دەمانزانی کە دڵی بەم کارانە خۆش بوو، باوکیشم هەر دەیزانی.

دایکە گیان دەیەوێت فەڕەنسیم فێر بکات، چونکە ئێتر کاتی ئەوە هاتووە کە من باش فێر ببم..

- دەزانیت لە خوا بپاڕێیتەوە؟

- بەڵێ، بێگومان دەیزانم، ماوەیەکە، چونکە من گەورەم، خۆم بە تەنیا و بە دەنگی نزم دروود دەخوێنم، بەڵام کولیا و لیدا گیان بە دەنگی بەرز لەگەڵ دایکما لە پێشدا درووودی حەزرەتی مریەم دەخوێنن و دوایی دەست بە هیی تر دەکەن کە دەڵێت:

"خودایا. له خوشکه سۆنیامان ببووره و خۆشەویستیی خۆتی پێببەخشە" پاشان دەڵێن "خودایا، له باوکەکەی تریشمان خۆش بە و خۆشەویستیی خۆتی پێببەخشە" ئاخر باوکی یەکەممان مردووە و ئەمیان باوکی دوەممانە، ئێمە بۆ ئەمیش هەر درووود دەخوێنین.

- پۆلیا گیان، من ناوم ڕادوێنە، جارێکیش درووود بۆ من بخوێنن، بۆ ئەم "رادوێنه هەژار"ە.

کچۆڵەکە بە گەرمی وتی:

- هەتا مابم، هەمیشە دووعای چاکەت بۆ دەکەم.

دیسانەوە، لەناکاودا دایەوە پێکەنین و بازرەقەی بەست، جارێکی تر توند لە ئامێزی گرتەوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ناو و ناونیشانی خۆی دایە، بەڵێنیشی پێدا کە حەتمەن سبەی دەگەڕێتەوە لایان، کچۆڵەکە بە هەستێکی پڕ لە پێزانینەوە لێی جیا بووەوە.

کە ڕاسکۆلنیکۆڤ هاتە سەر شەقامەکە، سەعات لە دە تێپەڕی کردبوو، دوای پێنج دەقیقە لەسەر پردەکە وەستابوو، هەر لەو جێگایەدا کە چەند ڕۆژێک لەوەوبەر ژنێک خۆی فڕێ دابووە ڕووبارەکەوە، بە دەنگێکی پڕ لە بڕوا و سەرکەوتووانەوە وتی:

- بەسە، گوم بن، ئەی بیری پووچ و ترسی درۆ و تارماییە خەیاڵییەکان، ژیان هەر بەردەوامە، بۆ من ئێستا ناژیم؟ ژیانی من نەبەستراوەتەوە بە ژیانی ئەو پیرێژنەوە، خوا لێی خۆش بێت. بەسە، خانمەکە، ئیتر کاتی حەسانەوەت بوو، ئێستا سەردەمی دەسەڵاتی هزر و ڕوناکییە.. دەسەڵاتی.. ویست و هێزە.. با بزانین من و تۆ کاممان سەردەکەوین! ئێستا خۆم ئەمە تاقی دەکەمەوە!

به فیزێکی تایبەتییەوە، وەک بڵێی بانگی شەڕکردن لە هێزێکی تاریک بکات، لەگەڵ خۆیدا کەوتە قسە:
- پێم بڵێ چۆن قایل بووم لە شوێنێکی زۆر تەنگەبەردا بژیم! من ئێستا زۆر لاوازم، بەڵام.. لەوە دەکات نەخۆشییەکەم بە تەواویی چاک بووبێتەوە، کە لە ماڵ هاتمە دەرێ، دەمزانی چاک دەبمەوە، بەڕاست، ماڵی پاچینکوف تەنیا دوو هەنگاو لێرەوە دوورە، هەر دەبێت سەرێک لە ڕازومیخین بدەم، تەنانەت ئەگەر ئەمەندەیش نزیک نەبووایە.. با گرەوەکە بەرێتەوە، لێگەڕێ با ئەویش دڵخۆش بێت، گرفتێک نییە، با وابێت!.. هێز.. هێز پێویستە. بەبێ هێز هیچ کارێک ناڕواتە پێشێ، بەڵام هێز و دەسەڵاتیش بەزۆر دەست دەکەوێت، ئەمەیە ئەو شتەی کە ئەوان نایزانن.
کە ئەم قسانەی بە لووتبەرزی و تەواوی بڕواوە خستە سەر پەیڤەکانی تری، ڕێگەی لەبەر گرت و بە شەکەتی هەنگاوی نا تا لە پردەکە تێپەڕی، تا دەهات فیز و دڵنیاییەکەی لە زیادی بوو، هەر دەقیقەیەک کە تێدەپەڕی، ئەم لە دەقیقەی داهاتوودا کەسێکی تر بوو. بەڵام چ شتێکی گرنگ بوو بە هۆی ئەوەی کە ئەم گۆڕانەی بەسەردا بێت؟ خۆیشی نەیدەزانی، وەلێ وەک یەکێک کە لەوەدا بێت لە دەریایەکدا بخنکێت، چۆن دەست بۆ پوشێک دەبات، ئەمیش لەپڕا لەوە گەیشت کە دەتوانێت بژی، کە هێشتا ژیان بە بەریەوە ماوە و ژیانی ئەم لەگەڵ ژیانی پیرێژنەکەدا نەهاتۆتە کۆتایی، ڕەنگە بۆ ئەم ئەنجامگیرییە زۆری پەلە کردبێت، بەڵام گوێی پێنەدا.
لەپڕێکدا بە بیریدا هات: "لەگەڵ ئەمانەیشدا داوام کرد درووود بۆ ئەم ڕادیۆنە هەژارە بنێرن.. باشە، ئەمە تەنیا لە دووربینییەوە بوو" بەم

ڕستەیەی دوایی زوو پێکەنینی بە ساکارییە منداڵانەکەی خۆی هات. لە بارێکی زۆر خۆش و دڵگەرمیدا بوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ئاسانی ڕازومیخینی دۆزیەوە. لە خانووەکەی پاچینکوفدا کرێگرتە تازەکەیانی دەناسی و دەرگاوانەکە خێرا ڕێگەکەی پیشان دا، لە ناوەڕاستی پلیکانەکاندا گوێی لە ژاوەژاوی قسەی خەڵکێکی زۆر بوو، ئەو دەرگایەی بەسەر پلیکانەکاندا دەیڕوانی، لەسەر پشت بوو، هاوار و دەنگەدەنگ دەهات، ژوورەکەی ڕازومیخین تا ڕادەیەک گەورە بوو، دانیشتوانیش پانزە کەس بوون. ڕاسکۆلنیکۆڤ لە تارمەکەدا وەستا، لە پشتەوە، دوو کارەکەری خاوەن ماڵەکە، بە دەوری دوو سەماوەری گەورەدا و شووشە و دەوری و قاپی خواردن و مەزە، کە لە مووبەقی خاوەن ماڵەکە دەهاتنە دەرێ، سەر قاڵی کار بوون، ڕاسکۆلنیکۆڤ ناردی بە دوای ڕازومیخیندا، ئەویش زۆر بە خۆشی و تاسەوە هاتە لای، هەر لە یەکەم ڕوانیندا دیار بوو کە زۆری خواردۆتەوە، ئەگەرچی ڕازومیخین هەرگیز سەرخۆش نەدەبوو، بەڵام ئەمجارەیان پێوەی دیار بوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بەپەلە پێی وت:

- گوێ بگرە، هاتووم پێت بڵێم تۆ گرەوەکەت بردۆتەوە، لە ڕاستیدا کەسیش نازانێت لە ئاییندەدا چ پێشهاتێکی دی دێتە ڕێ، وەلێ من ناتوانم بێمە ژوورەوە، ئەوەندە بێهێزم خەریکە بکەوم، بۆیە سڵاو و خوات لەگەڵ! بەڵام سبەی وەرە بۆ لام..

- با پێت بڵێم، من دەتگەیەنمە ماڵەوە، تۆ کە خۆت دەڵێی هێند بێهێزی.. ئیتر..

- ئەی میوانەکان چی لێدەکەیت؟ ئەو قژلوولە کێیە کە ئێستا تەماشای کردین؟

- ئەمە؟ تەنیا خوا دەزانێت کێیە! دیارە هاوڕێی ماممە، یان دەشێت لە خۆیەوە هاتبێت.. ئەوان لای مامم جێ دەهێڵم. پیاوێکی زۆر بەڕێزە. بەداخەوە ناتوانیت ببیتە هاوڕێی، باشە، با هەموویان وێڵ بن، هەموویان، ئەوان ئێستا بیر لە من ناکەنەوە، دەبێت منیش هەناسەیەکی تازە وەربگرم، چونکە هاوڕێ، تۆ لە کاتی خۆیدا هاتی، ئەگەر دوو دەقیقە درەنگتر بگەیشتیتایەتە ئێرە، خوا ئاگادارە ئەکەوتینە گیانی یەکدی، درۆی وا دەکەن.. هەر ناتوانیت بیری لێبکەیتەوە، مرۆڤ تا کوێ دەتوانێت درۆ بکات! بەڵام چۆن دەتوانیت بیری لێنەکەیتەوە؟ بۆ خۆمان درۆ ناکەین؟ دەی، لێگەڕێ با درۆ بکەن، ڕۆژێک هەر دێت نەیانەوێت درۆ بکەن.. دەقیقەیەک دابنیشە تا زوسیموف بهێنم.

زوسیموفیش بە جۆرە پەرۆشییەکەوە پێشوازی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد، سووسەکردنێکی تایبەتی پێوە دیار بوو، زوو دەموچاوی گەشایەوە، بە ڕادەیەک کە دوای تەماشاکردنی فەرمانیدایە:

- هەر ئێستا دەبێت بنوویت، شەویش یەکێک لەمانە دەخۆیت، دەیخۆیت؟ ماوەیەکە بۆم ئامادە کردوویت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی دایەوە:

- دوانیش بێت دەیخۆم.

هەر لەوێدا دەرمانەکەی خوارد.

زوسیموف بە ڕازومیخینی وت:

- زۆر چاک دەکەیت کە خۆت دەبیبەیت، بزانین تا بەیانی چی ڕوو دەدات. ئەمڕۆ هیچ خراپ نییە، زۆر جیاوازی لەگەڵ ڕۆژانی پێشوودا هەیە، هەر ئەقڵە و لە خەسارێک..
کە گەیشتنە سەر شەقامەکە، ڕازومیخین بە ڕاسکۆلنیکۆڤی وت:
- دەزانیت، ئێستا زوسیموف کە هاتە دەرەوە، چی بە گوێمدا چرپاند؟ هاوڕێ. من هەموو شتەکان ڕێکوڕەوان بە تۆ دەڵێم، چونکە ئەمانە دەبەنگن، زوسیموف پێی وتم لە ڕێگە قسەت لەگەڵدا بکەم و بتدوێنم و دوایی هەمووی بۆ بگێڕمەوە. چونکە ئەو وا بیر دەکاتەوە.. تۆ.. یان شێتیت.. یان نزیکیت لە شێتبوون، ئینجا بزانە! یەکەم تۆ سێ ئەوەندە لەو ئاقڵتریت، دووەم ئەگەر شێت نەبیت، تۆ کەی دەربەستی ئەوەیت ئەو چی دەکات و چ کارێکی ناجۆری لە مێشکدایە. سێیەم ئەم پەڵخە گۆشتە کە پسپۆڕی نەشتەرگەرییە، ئێستا خووی داوەتە نەخۆشییە دەروونییەکان. وەلێ لەبارەی تۆوە، قسەکانی ئەمڕۆی تۆ لەگەڵ زامیوتوفدا تەواو ئەوی ئاوەژوو کرد.
- زامیوتوف هەموو شتێکی بۆ گێڕایەوە؟
- هەموو شتێک و کارێکی چاکیشی کرد، من ئێستا لە تەواوی شتەکان تێگەیشتم و زامیوتوفیش هەروا. بەڵێ، بە کورتی ڕودیا.. قسە لەسەر ئەوەیە.. من هەنووکە کەمێک مەستم، بەڵام قەیدی نییە، قسە لەسەر ئەوەیە کە ئەم بیرۆکەیە.. تێدەگەیت؟ ڕیشەی لەواندا داکوتاوە.. تێدەگەیت؟ واتا هیچ یەکێک لەوانە نەیدەوێرا بە ئاشکرا ئەوە بڵێت لەبەر ئەوەی زۆر هیچ و بێمانا بوو.. بە تایبەتی دوای ئەوەی بۆیەچییەکەیان گرت، ئیتر بۆ هەمیشە ئەو جۆرە بیرۆکانە نەمان و لەناو چوون، وەلێ ئەمانە بۆ گەمژە و دەبەنگن؟ من ئەوسایش کەمێک گوێی زامیوتوفم ڕاکێشا.. با لە بەینی خۆماندا بێت هاوڕێ،

تکات لێدەکەم ئەگەر شتێکیشی لێدەزانیت هەرگیز ئاماژەی پێنەکەیت. من لەم دواییەدا بەوەم زانیووە کە ئەو زۆر دڵی ناسکە، ئەوسا لای لێزاڤیتا بووین، بەڵام ئەمڕۆ هەموو شتێک دیار و ئاشکرایە، لە هەمووی گرنگتر و تاوانبارتر ئەم ئیلیا پتروڤیچەیە، ئەو بوورانەوەکەی تۆی لە پۆلیسخانە کردە پاساو، وەلێ خۆیشی لە دواییدا خەجاڵەت بوو. ئاخر، من هەموو شتێک دەزانم..

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە پەرۆشەوە گوێی گرتبوو، ڕازومیخین بە سەرخۆشی نهێنییەکانی دەدرکاند.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:

- من بۆیە ئەو کاتە بوورامەوە چونکە خەریک بوو دەخنکام، بۆنی بۆیە و ڕۆن هەموو ئەو ناوەی گرتبووەوە.

- سەیرە ئێستا پاساوی بۆ دەهێنیتەوە! مەسەلەکە هەر بۆنی بۆیە و ڕۆن نەبوو، سەرەتای نەخۆشییەکەت لە مانگێک لەوەوبەرەوە دەستی پێکرد، زوسیموف شایەتە، نازانیت چەندە زامیوتوف بێتاقەتە، هەر ناتوانیت بیری لێبکەیتەوە! ئەو دەڵێت "من ناکەمە پەنجەیەکی بچووکی ئەو پیاوە" واتا پەنجەیەکی بچووکی تۆ، هاوڕێ، هەندێکجار هەستێکی ناسک و بەسۆزی هەیە، وەلێ ئەو وانەیەی ئەمڕۆ لە "کۆشکی بلوورین" فێری بوو، هەرگیز تووشی نابێتەوە. ئاخر، تۆ لە سەرەتادا ترساندت و کەوتە لەرزین. تۆ تا ڕادەیەک ناچارت کرد کە دیسانەوە بڕوا بەو شتە هیچوپووچ و بێمانایە بێنێتەوە، کەچی لەناکاودا زمانی گاڵتەپێکردنت لێدەرهێنا! دەستخۆش، ئێستا هەر بە تەواوی تەپی، بە خودا تۆ مامۆستایت، لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا دەبێت وا ڕەفتار بکەیت، بەداخەوە کە لەوێ نەبووم، دەزانیت؟ ئێستایش زۆر چاوەڕێی کردیت، پۆرفیریش حەز لە ناسینت دەکات.

- بەڕاست.. ئەویش.. بەڵام بۆ بە شێتم دەزانن؟
- بەو مانایە نا کە بە شێتت بزانن، هاوڕێ، لەوە دەچێت زۆرم ڕێسا بێت. ئەوەی لەو کاتەدا ئەوی سەرسام کردبوو، تۆ لەڕادەبەدەر بایەخت تەنیا بەو شتە دابوو.. وەلێ ئیدی ئەوە ڕوونە کە تۆ بۆ ئەوەندە بە گرنگت گرتبوو، ئێستا لە بارودۆخەکە گەیشتوون.. دەزانن بۆ ئەو مەسەلەیە تۆی تەواو تێک داوە و چەندە پەیوەندیی بە نەخۆشییەکەتەوە هەیە.. من هاوڕێ، تۆزێک سەرخۆشم، بەڵام خودا خۆی دەیزانێت چی لەژێر سەردایە.. من حەز ئەکەم پێت بڵێم، ئەو هەموو توانای خۆی داوەتە بواری نەخۆشیی دەروونی، وەلێ تۆ گوێی پێمەدە..
بۆ ماوەی چرکەساتێک هەردووکیان بێدەنگ بوون، پاشان ڕاسکۆلنیکۆڤ کەوتەوە قسەکردن:
- گوێ بگرە ڕازومیخین، دەمەوێت بە ڕاستوڕەوانی پێت بڵێم، ئێستا من لە سەرینی مردوویەک بووم، کارمەندێک مرد.. هەرچی پارەیەکم پێبوو دامنا.. بێجگە لەوە، هەر ئێستا بوونەوەرێک ماچی کردم، ئەگەر کەسێکیشم بکوشتایە، ئەوسایش.. بە کورتی لەوێ من یەکێکی تریشم بینی.. پەڕێکی سوور بە کڵاوەکەیەوە بوو.. دیارە منیش خەریکم دەکەومە وڕێنەکردن، زۆر بێتینم، ئاگادارم بە.. پلیکانەکان لەوێندەرن..
ڕازومیخین بە نیگەرانییەوە پرسی:
- چیتە؟ چیتە؟
- سەرم کەمێک گێژ دەخوات، وەلێ گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە تا بڵێی من خەمبارم، زۆر خەمبارم، هەروەک ژنان، باوەڕ بکە، بڕوانە، ئەوە چییە؟ بڕوانە، بڕوانە!
- چی بووە؟

- بۆ نابینیت؟ ڕووناکی لە ژوورەکەمدا هەیە، لای درزەکەوە..
بە جووتە بەرانبەر دوا پلەی پلیکانەکان و بە پاڵ دەرگای خاوەن ماڵەکەوە وەستابوون، بە ڕاستی لەوێوە دەبینرا کە ژوورەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕووناکی تیایە.

ڕازومیخین وتی:

- سەیرە! ڕەنگە ناستاسیا بێت.

- ئەو هەرگیز لە کاتی وادا نایەتە لام. هەر دەمێکیشە نووستووە، وەلێ.. چی تیایە! خوات لەگەڵ.

- تۆ ئەڵێی چی؟ من دەتگەیەنم و پێکەوە دەڕۆینە ژوورەوە.

- دەزانم پێکەوە دەچینە ژوورێ، بەڵام من حەز دەکەم هەر لێرە دەستت بگوشم و ماڵئاواییت لێبکەم، دەی دەستت بێنە، خوات لەگەڵ.

- ڕودیا، چیتە؟

- هیچ، با بڕۆین، تۆ دەبیتە شایەت..

بە پلیکانەکاندا سەرکەوتن، ڕازومیخین وای بە بیردا هات کە ڕەنگە زوسیموف ڕاست بکات، لەبەر خۆیەوە وتی: "ئاه، بە زۆربڵێی خۆم دۆخەکەم لێ تێک دا" لەپڕێکدا هەر کە گەیشتنە بەر دەرگاکە، لەناو ژوورەکەوە گوێیان لە گفتوگۆ بوو.

ڕازومیخین هاواری کرد:

- کێ لەوێیە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ یەکەمجار دەسکی دەرگاکەی گرت و تەواو کردیەوە، لەبەر دەرگاکەوە سەرسام وەستا. دایک و خوشکی لەسەر قەنەفەکە دانیشتبوون و سەعات و نیوێک بوو چاوەڕێیان دەکرد. بۆ لە هەموو شتێکی دی کەمتر چاوەڕێی دەکردن و لە هەر شتێکی دی کەمتریش بیری لایان بوو! لەگەڵ ئەوەیشدا کە هەر ئەمڕۆ ئەوەی پێگەیشتبوو

که ئەوان بەڕێوەن و ڕەنگە بگەنە پترووزبورگ؟ بە درێژایی ئەو سەعات و نیوە، یەک بەدوای یەکدا، ئەو دوانە ناستاسیایان بە پرسیار داگرتبووەوە، ناستاسیا هێشتا هەر بەرانبەریان وەستابوو، چی هەیە و چی نییە بۆی باس کردبوون. هەردوو ژنەکە، کە زانییان ئەمڕۆ ڕاسکۆلنیکۆڤ نەخۆش بووە و بەدەم وڕێنەکردنەوە لە ماڵ هەڵاتووە بە تەواوی ترسان "خودایا چی بەسەر هاتبێت!" هەردووکیان دەگریان و هەردووکیان لە ماوەی ئەم سەعات و نیوەدا گەلێک خەم و ئازاریان چێشت.

کە ڕاسکۆلنیکۆڤ دەرکەوت، هەرایان لێهەستا، بە خۆشی و شادییەکی زۆرەوە پێشوازییان لێکرد و بەرەو ڕووی چوون، وەلێ ئەو مردوویەکی ڕاوەستاو بوو، بیرێکی کتوپڕ، کە مرۆڤ ناتوانێت خۆی لەبەردا بگرێت، وەک هەورەبروسکە بەسەریا داباری، تەنانەت بۆ لە ئامێزگرتنیان دەستیشی بەرز نەبووەوە، چونکە هێزیان تیا نەمابوو، دایک و خوشکی باوەشیان پیا کرد و بە سنگی خۆیانەوە نووساند، ماچیان دەکرد، پێدەکەنین و دەگریان.. ڕاسکۆلنیکۆڤ هەنگاوێکی نا، لەترێکی دا و لەسەر زەوییەکە بووڕایەوە.

نائومێدی و ترس، ناڵە و هاوار بەرپا بوو.. ڕازومیخین کە لە بەردەم دەرگاکەدا وەستابوو خۆی کوتایە ژوورێ، نەخۆشەکەی بە هەردوو دەستی بەهێزی گرت و لە چاوتروکانێکدا لەسەر قەنەفەکەی نا، بە دەنگی بەرز بە خوشک و دایکەی وت:

- هیچ نییە، هیچ نییە، لەهۆشخۆچوونێکی بێبەها و ناچیزە، هەر ئێستا پزیشک وتی باری تەندروستیی لە جاران چاکترە و تەواو ڕوو لە باشییە، ئاو، دەی، ئاو بێنن، وا دێتەوە هۆش خۆی، هەر ئێستا، وا هاتەوە..

## ١

ڕاسکۆلنیکۆڤ کەمێک ڕاست بووەوە و لەسەر قەنەفەکە دانیشت، لەسەرخۆ بە دەستی ئاماژەی بۆ ڕازومیخین کرد تا لافاوی هەستی پڕ و شەوقی ئاگرینی نەگونجانی خۆی بەرانبەر بە دایک و خوشکی بوەستێنێت، ئینجا دەستی هەردووکیانی گرت، نزیکەی دوو دەقیقە بە بێدەنگی، تەماشای هەر یەکێکیانی کرد. دایکی لە ڕوانینەکەی ترسا، لە نیگاکەیدا سۆزێکی گەورەی بەسوێ، لە هەمان کاتدا بێجوولە و شێتانە، دەبینرا، پولخێریا ئەلێکساندروڤنا کەوتە گریان، ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا ڕەنگی پەڕیبوو، دەستی لە ناو دەستی کاکیا دەلەرزی.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دەنگێکی ناسەقامگیرەوە و ئاماژە بە ڕازومیخین وتی:

- لە گەڵیا بڕۆنەوە بۆ ماڵێ.. تا بەیانی، بەیانی هەموو شتێک.. دەمێکە گەیشتوون؟

پولخێریا ئیڤانۆڤنا وەڵامی دایەوە:

- ئەم ئێوارەیە، ڕودیا، شەمەندەفەرەکە زۆر زۆر دواکەوت، بەڵام ڕودیا، من بە هیچ جۆرێک ئێستا تۆ بەجێ ناهێڵم، من ئەمشەو لای تۆ..

ڕاسکۆلنیکۆڤ دەستی ڕاوەشاند و بە تووڕەییەوە وتی:
- ئازارم مەدەن.
ڕازومیخین هاواری کرد:
- من لای دەمێنمەوە، دەقیقەیەک چییە بەجێی ناهێڵم، میوانەکان چاویان دەردەهات، خوای دەکرد سەریان بە دیواردا دەکێشا، مامەم مشوریان دەخوات.
پولخێریا ئیڤانۆڤنا توند دەستی ڕازومیخینی گوشی و وتی:
- نازانم چۆن سوپاست بکەم!
بەڵام ڕاسکۆلنیکۆڤ دیسان قسەی پێبڕی و بە تووڕەییەوە وتی:
- من ناتوانم، ناتوانم، ئازارم مەدەن، بەسە، بڕۆن. ناتوانم..
دونیا بە ترسەوە، بە هێوری و لەبەر خۆیەوە وتی:
- دایکە گیان با بڕۆین، هیچ نەبێت با دەقیقەیەک لە ژوورەکە بچینە دەرەوە، ئەگەر وانەکەین دیارە دەمانەوێت بیکوژین.
پولخێریا ئیڤانۆڤنا دەستی بە گریان کرد و وتی:
- یەعنی دوای سێ ساڵیش نابێت بیبینم؟
دیسانەوە ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەنگی کردن:
- ڕاوەستن، قسەم پێمەبڕن، پێدەچێت بیرم لای خۆم نەبێت.. ئایا لۆژینتان دیووە؟
- نا ڕودیا، بەڵام لە هاتنمان ئاگادارە.
بە کەمێک دوودڵییەوە پولخێریا ئیڤانۆڤنا لەسەری ڕۆشت:
- بیستمان پیتەر پتروڤیچ گەورەیی نواندووە و ئەمڕۆ سەری لێداویت.
- بەڵێ.. گەورەیی نواندووە! دونیا، بە لۆژینم وت ئەگەر ئەمجارە بێتەوە لە پلیکانەکانەوە دەیخەمە خوارێ، دەرمکرد.

- ڕودیا، تۆ چی دەڵێیت! دیارە.. تۆ ناتەوێت بڵێی کە...
وەلێ پولخێریا ئیڤانۆڤنا کە بە ترسەوە قسەی دەست پێکرد، تەماشای دونیای کرد و بێدەنگ بوو. ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا لە کاکی ڕاما و چاوەڕوانی قسەی تری بوو، هەردوو ژنەکە ئاگاداری شەڕەکە بوون، ناستاسیا تا ئەو جێگایەی خۆی تێی گەیشتبوو، هەموو ڕووداوەکەی بۆ گێڕابوونەوە، هەردووکیان سەرسامی و شپرزەیی بڕستی بڕیبوون.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە نارەحەتییەوە بەردەوام بوو:
- دونیا، من ئەم شووکردنەی تۆم ناوێت، بۆیە دەبێت لە بەیانی زووتر نییە بە لۆژین بڵێی کە تۆ ناتەوێت، بۆ کوێ دەچێت با بچێت..
پولخێریا ئیڤانۆڤنا هاواری کرد:
- ئای خودایا!
ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا بە توورەییەکەوە کە زوو جڵەوی گرت وتی:
- کاکە، تۆ بیر لەوە بکەرەوە کە دەیڵێیت.
دوایی لەسەرخۆ وتی:
- لەوە ناچێت تەندروستیت باش بێت، ڕەنگە نەخۆش بیت.
- وڕێنە دەکەم؟ وا نییە؟، نا.. تۆ لەبەر خاتری من دەبیتە ژنی لۆژین، وەلێ من قوربانیم ناوێت، بۆیە نامەیەک بۆ بەیانی ئامادە بکە، نامەی ڕەتکردنەوە، خۆیشم دەیخوێنمەوە، تەواو.
کچە دڵشکاوەکە هاواری لێهەستا:
- ناتوانم کاری وا بکەم! بە چ هەقێک..
دایکە بە ترسەوە ڕووی لە کچەکەی کرد و بەپەلە وتی:
- دونیا گیان، تۆیش تووڕەیت، بەسیەتی، سبەی.. ئەی تۆ نابینیت.. وایش چاکترە کە بڕۆین.

ڕازومیخین کە هێشتا سەرخۆش بوو، بە دەنگی بەرز وتی:
- وڕێنە دەکات! ئەگینا چۆن پڕکێشی دەکات!.. بەیانی هەموو ئەم گەوجایەتییانەی لەسەردا نامێنێت.. بەڵام ئەمڕۆ بە ڕاستی لۆژینی دەرکرد، ئەمە وایە، بەڵێ، ئەویش هەر تووڕە بوو، لێرەدا قسەی کرد، بە خۆیدا هەڵدەدا، پاشانیش کلکی نایە ناوگەڵی و بۆی دەرچوو.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا هاواری کرد:
- کەواتە ئەمە ڕاستە؟
دونیا بە سۆزێکەوە وتی:
- کاکە تا بەیانی، دەی دایە گیان.. خوات لەگەڵ ڕودیا.
بەڵام ڕاسکۆلنیکۆڤ بە هەموو توانایەوە دووبارەی کردەوە:
- گوێت لێمە خوشکێ؟ من وڕێنە ناکەم، ئەم زەماوەندە سووک و ڕسواییە، قەیدی نییە با من ڕسوا بم، بەڵام تۆ، نابێت.. یەکێکمان بەسە.. هەرچەندە من ڕسوام، بەڵام ئەو خوشکە بە خوشک نازانم، یا من، یا لۆژین، فەرموو بڕۆن..
ڕازومیخین قیژاندی:
- ئاخر، بۆ تۆ شێت بوویت، زاڵم!
ڕاسکۆلنیکۆڤ ئیتر وەڵامی نەداوە، ڕەنگە هەر توانای وەڵامدانەوەیشی نەبووبێت، لەسەر قەنەفەکە ڕاکشا، بەوپەڕی بێهێزیەوە ڕووی خۆی کردە دیوارەکە. ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا ماتیگرانە سەرنجێکی ڕازومیخینی دا. چاوە ڕەشەکانی بروسکەیەکیان دا، ڕازومیخین تەنانەت لەو نیگایە خەجڵی. پولخێریا ئەلێکساندروڤنایش وەک یەکێک بروسکەی بەرکەوتبێت، لە شوێنی خۆیدا وشک بوو، نائومێدانە زۆر بە ئەسپایی بە ڕاسکۆلنیکۆڤی وت:

- من به هیچ جۆرێک ناڕۆم، لێره بۆ خۆم له سووچێکدا.. دەمێنمەوە.. تۆ دونیا بگەیەنە.
ڕازومیخینیش هەر لەسەرخۆ، بەڵام زۆر بە تووڕەیی وتی:
- تۆیش هەموو شتەکان دەشێوێنیت! هیچ نەبێت با بڕۆینە تارمەی لای پلیکانەکان، ناستاسیا چرایەک دابگیرسێنە، سوێند دەخۆم..
که بەرەو لای پلیکانەکان دەچوون بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی:
- ... لەوەدابوو لە من و پزیشکەکە بدات، دەزانن؟ هەر خودی پزیشکەکە! تەنانەت ئەو زوو خۆی بە دەستەوەدا، بۆ ئەوەی ئەم زیاتر ڕک نەیگرێت، ڕۆیشت، من بۆ ئاگالێبوونی لە خوارەوە مامەوە، کەچی جلی لەبەرکرد و بۆی دەرچوو، ئێستایش ئەگەر تووڕەی بکەن، هەڵدێت، هەر ئەمشەو.. دەشێ بەڵایەک بەسەر خۆی بهێنێت..
- ئەی هاوار تۆ چی دەڵێیت!
- پاشان هەرگیز بۆ ئاڤدوتیا ناشێت لە ژوورێکی کرێگرتەدا بەبێ تۆ بە تەنیا بێت. بیر بکەرەوە لە چ شوێنێک گیرساونەتەوە، ئاخر ئەو پیەتەر پتروڤیچە بەدڕەگەزە نەیتوانی شوێنێکی چاکترتان بۆ بگرێت؟ بەڵام دەزانیت، من کەمێک سەرخۆشم، بۆیە جوێنم دا، گوێ مەدەرێ.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا جەختی کرد:
- دەچمە لای خاوەن ماڵەکەی ئێرە، لێی دەپاڕێمەوە بۆ ئەمشەو سووچێک بداتە من و دونیا، من ناتوانم بەم حاڵەوە بەجێی بهێڵم، ناتوانم.
بەدەم قسەکانەوە، لە یەکەمین قاڵدرمەدا، ڕاست ڕووبەڕووی دەرگای ژووری خاوەن ماڵەکە وەستا بوون، ناستاسیا لە قاڵدرمەی خوارتردا ڕێگەی بۆ ڕووناک دەکردنەوە. ڕازومیخین لەڕادەبەدەر هەڵچوو بوو. پێش نیو سەعات، ئەو کاتەی ڕاسکۆلنیکۆڤی بەرەو ماڵ دەهێنایەوە،

هەرچەندە گەلێک زۆربڵێی کرد و خۆیشی بەمەی دەزانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا کە زۆری خواردبووەوە، تەواو ئاگای لە خۆی بوو، کەچی ئێستا دڵی خۆش بوو، وا دەهاتە بەرچاو کە خواردنەوەکە دووقات کاری لێکردووە. لەگەڵ دوو خانمەکەدا وەستابوو، دەستی هەردووکیانی خستبووە ناو دەستی خۆیەوە و بە پاساوی زۆر قەناعەتپێکەرەوە ئامۆژگاری دەکردن، بۆ ئەوەیش کە زیاتر بڕوای پێبکەن، لە دوای هەر وشەیەکەوە دەستی هەردووکیانی لە ناو دەستی خۆیدا وا وەک مەنگەنە دەگوشی، کە ئازاری پێدەگەیاندن، بە هەردوو چاویشی خەریک بوو ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا هەڵلووشێت، هیچ شەرمیشی لەو کارەی نەدەکرد. ژنەکان لە تاو ئێشی دەستیان هەندێکجار دەستیان لە ناو دەستە گەورە و ڕەقەڵەکانی دەردەهێنا، بەڵام ئەو نەک تەنیا گوێی پێنەدەدا، بەڵکو تا دەهات زیاتر بۆ لای خۆی ڕایدەکێشان، ئەگەر ئەوان فەرمانیان پێبدایە کە لەبەر خاتری ئەوان خۆی لە پلیکانەکان بخاتە خوارێ، بەبێ سێودوو ملی بۆ دەدان.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا کە نوقمی بیرکردنەوە بوو لە ڕودیای ئازیزی و تەواو بێحەوسەڵە بوو. هەر چەندە هەستی دەکرد کە ئەم کوڕە گەنجە لەڕادەبەدەر دڵسۆزی بەخەرج دەدات و زیادەڕۆیی لەدەست گوشینیا دەکات، وەلێ لەبەر ئەوەی بۆ ئەو ڕزگارکەربوو، بۆیە نەیدەویست گوێ بەو شتانە بدات و وردەکاریی تیا بکات. بەڵام ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا، لەگەڵ بوونی هەمان ئەو نیگەرانییەدا کە لە دایکیا هەبوو، هەرچەندە نەدەترسا، بەڵام ڕوانینەکانی هاوڕێی براکەی کە ئاگریان لێدەبووەوە، سەرسامی و تا ڕادەیەک ترسی لێنیشاندبوو، تەنیا پشتی بەو قسانە قایم بوو، کە ناستاسیا دەربارەی ئەم پیاوە

ترسناکە کردبووی، هەر ئەوەیش ڕێگەی ئەوەی لێگرتبوو کە دەستی دایکی بگرێت و لەتاو ڕازومیخین هەڵبێت. هەروەها دەیشیزانی کە تازە هەڵاتن لە دەستی دادێک نادات، سەرئەنجام دوای دە دەقیقە کەمێک هێور بووەوە، چونکە لە تایبەتمەندییەتیی ڕازومیخین بەئاگا هات کە هەرچیەکی لە دڵدایە، ئیتر لە هەر حاڵێکدا بێت، هەمووی ئاشکرا دەکات، بۆیە هەرکەسێک سەروکاری لەگەڵدا بووایە، زۆر زوو دەیزانی کێیە و چی دەکات.

ڕازومیخین لە کاتێکدا کە دڵنیایی بە پولخێریا ئەلێکساندروڤنا دەبەخشی، هاواری کرد:

- هەرگیز نابێت لای خاوەن ماڵەکە بمێننەوە، ئەوە کاری کردە نییە، ئەگەرچی تۆ دایکیت، وەلێ ئەگەر بمێنیتەوە، بە تەواوی شێت دەبێت. ئەوسا خوا خۆی دەزانێت چی ڕوو دەدات. گوێ بگرە، بزانە چی دەکەم: ئێستا ناستاسیا لای دادەنیشێت و من ئێوە دەگەیەنمە ماڵەوە، چونکە ئێوە دوو ئافرەتن و ناتوانن بە تەنیا بە کۆڵاناندا برۆن، ئێمە لەم بارەیەوە لە پتروزبورگا.. بە کورتی، گرنگ نییە! کە ئێوەم گەیاند، بە ڕاکردن دەگەڕێمەوە ئێرە و دوای چارەکەسەعاتێک، بەڵێنی شەرەفتان دەدەمێ، دیسان دەگەڕێمەوە لاتان و لە چاکی و خراپیی ڕاسکۆلنیکۆڤ ئاگادارتان دەکەمەوە، پاشان، گوێ بگرن، لەلای ئێوەوە یەکسەر دەڕۆمەوە ماڵەکەی خۆم، میوانم هەیە، هەموویان سەرخۆشن، زوسیموف هەڵدەگرم، ئەو پزیشکەیە کە چارەی دەکات و ئێستا لە ماڵەکەی مندایە، ئەو سەرخۆش نییە، قەت ناخواتەوە، ئەیبەم بۆ لای ڕودیا و دوایی هەردووکمان دێینە لاتان، بەم جۆرە ئێوە لە ماوەی سەعاتێکدا دووجار هەواڵی دەزانن و لە خودی پزیشکەکەیشی دەبیستن، هەر ڕووبەڕوو لە خودی پزیشکەکە، نەک

ترسناکە کردبووی، هەر ئەوەیش ڕێگەی ئەوەی لێگرتبوو کە دەستی دایکی بگرێت و لەتاو ڕازومیخین هەڵبێت. هەروەها دەیشیزانی کە تازە هەڵاتن لە دەستی دادێک نادات، سەرئەنجام دوای دە دەقیقە کەمێک هێور بووەوە، چونکە لە تایبەتمەندییەتیی ڕازومیخین بەئاگا هات کە هەرچییەکی لە دڵدایە، ئیتر لە هەر حاڵێکدا بێت، هەمووی ئاشکرا دەکات، بۆیە هەرکەسێک سەروکاری لەگەڵدا بووایە، زۆر زوو دەیزانی کێیە و چی دەکات.

ڕازومیخین لە کاتێکدا کە دڵنیایی بە پولخێریا ئەلێکساندروڤنا دەبەخشی، هاواری کرد:

- هەرگیز نابێت لای خاوەن ماڵەکە بمێننەوە، ئەوە کاری کردە نییە، ئەگەرچی تۆ دایکیت، وەلێ ئەگەر بمێنیتەوە، بە تەواوی شێت دەبێت. ئەوسا خوا خۆی دەزانێت چی ڕوو دەدات. گوێ بگرە، بزانە چی دەکەم: ئێستا ناستاسیا لای دادەنیشێت و من ئێوە دەگەیەنمە ماڵەوە، چونکە ئێوە دوو ئافرەتن و ناتوانن بە تەنیا بە کۆڵاناندا بڕۆن، ئێمە لەم بارەیەوە لە پتروزبورگا.. بە کورتی، گرنگ نییە! کە ئێوەم گەیاند، بە ڕاکردن دەگەڕێمەوە ئێرە و دوای چارەکەسەعاتێک، بەڵێنی شەرەفتان دەدەمێ، دیسان دەگەڕێمەوە لاتان و لە چاکی و خراپیی ڕاسکۆلنیکۆڤ ئاگادارتان دەکەمەوە، پاشان، گوێ بگرن، لەلای ئێوەوە یەکسەر دەڕۆمەوە ماڵەکەی خۆم، میوانم هەیە، هەموویان سەرخۆشن، زوسیموف هەڵدەگرم، ئەو پزیشکەیە کە چارەی دەکات و ئێستا لە ماڵەکەی مندایە، ئەو سەرخۆش نییە، قەت ناخواتەوە، ئەیبەم بۆ لای ڕودیا و دوایی هەردووکمان دێینە لاتان، بەم جۆرە ئێوە لە ماوەی سەعاتێکدا دووجار هەواڵی دەزانن و لە خودی پزیشکەکەیشی دەبیستن، هەر ڕووبەڕوو لە خودی پزیشکەکە، نەک

لە من، خۆتان لێی بپرسن، ئەگەر باری تەندروستی خراپ بوو، سوێند دەخۆم خۆم دەتانهێنمە ئێرە و ئەگەر باشیش بوو، بۆ خۆتان بخەون، وەلێ من هەموو شەوەکە هەر لێرە دەمێنمەوە. لە تارمەکەدا، ئەو پێی نازانێت، بە زوسیموفیش دەڵێم لای خاوەن ماڵەکە بمێنێتەوە بۆ ئەوەی لەبەردەستا بێت، باشە، چی بۆ ئەو باشترە ئێوە یان پزیشک؟ بێگومان پزیشک بەکەڵکترە، باشە دەی، بڕۆن بۆ ماڵەوە، لای خاوەن ماڵ هەر نابێت، ڕەنگە بۆ من بهێڵێت، بەڵام بۆ تۆ نا، چونکە.. چونکە ژنێکی گەلۆرە، ئەو بەنیسبەت ئاڤدوتیا ڕومانوڤناوە، تەنانەت ئەگەر ڕاستت دەوێت، ئیرەیی بە تۆیش دەبات.. بێگومان ئاڤدوتیا ئەوە هەر نەیکردبێت، ژنێکی زۆر سەیرە، بەڵام منیش هەر گەمژەم.. ڤیروسیا! با بڕۆین، بڕوام پێدەکەن؟ ها! بڕوام پێدەکەن یان نا؟

ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا وتی:

- دایکە گیان، بێگومان ئەوەی کە دەیڵێت بەجێی دەهێنێت، ئەوە بەڵێنی خۆیەتی، تا ئێستا ئەو کاکمی ڕزگار کردووە، ئەگەر ڕاست بێت و پزیشکەکە بەوە قایل بێت، کە شەو لێرە بمێنێتەوە، ئیدی چی لەوە باشتر دەبێت؟

ڕازومیخین بەدەم دەستودەمخۆشییەوە هاواری لێهەستا:

- تۆ.. تۆ لێم تێدەگەیت، چونکە تۆ فریشتەیت، با بڕۆین، ناستاسیا هەر ئێستا بڕۆ سەرەوە و لای دابنیشە، چراکە دابگیرسێنە، چارەکێکی تر دەگەڕێمەوە..

هەرچەندە پولخێریا ئەلێکساندروڤنا قەناعەتی تەواوی نەکردبوو، بەڵام جەختیشی نەکرد، ڕازومیخین ژێربالی هەردووکیانی گرت و بە پلیکانەکاندا هێنانییە خوارێ، دەبێت ئەوەیش بڵێین کە پولخێریا

ئەلێکساندروڤنا تا ڕادەیەک لە ڕازومیخین هەر دڵنیا نەبوو، بە خۆی دەوت: "ئەگەرچی دڵسۆز و زیرەکە، بەڵام تۆ بڵێی بتوانێت بەڵێنەکەی بەجێ بێنێت؟ ئەمەیش بەم حاڵەتەوە کە تیایەتی!"

ڕازومیخین لەوە گەیشت کە پولخێریا ئەلێکساندروڤنا چی لە دڵدایە. بە هەنگاوە فراوانەکانی، بەبێ ئەوەی ئاگاداری ئەوە بێت کە خانمەکان بە زەحمەت دەیانتوانی پێی بگەن، کەوتە سەر شۆستەکە، بۆ ئەوەی بیرکردنەوەکانی پولخێریا ئەلێکساندروڤنایش لەکار بخات، وتی:

- بەڵێ، تێدەگەم، تۆ بیر لەوە دەکەیتەوە کە من لە چ حاڵێکدام! بێخود، یەعنی من سەرخۆشم، بەڵام کێشەکە لەمەدا نییە، من مەستی شەراب نیم، بەڵکو بینینی ئێوە سەرخۆشی کردووم، وەلێ گرنگ نییە، گوێم پێمەدەن، درۆ دەکەم، من شایستەی ئێوە نیم، بە هیچ جۆرێک شایستەی ئێوە نیم، هەر ئەوەندەی ئێوەم گەیاند، ڕاست دەچمە سەر جۆگاکە و دووجام ئاو بەسەرما دەکەم و هەموو شتێک تەواو دەبێت. ئەگەر دەزانن من هەردووکتانم چەند خۆش دەوێت! پێمەکەنن، تووڕە مەبن، لە هەموو کەس تووڕە بن، بەڵام لە من نا، من هاوڕێی ئەوم، کەواتە هاوڕێی ئێوەیشم، من وام دەوێت.. من دەمێکە ئەم هەستەم هەیە.. ساڵێک لەمەوبەر هەر لەم کاتەدا.. وەلێ نا، هەرگیز لەمەوپێش ئەو هەستەم نەبووە، چونکە ئێوە وەک لە ئاسمان کەوتبێتنە خوارەوە وایە، بە کورتی، من ئەمشەو هەرگیز نانووم.. زوسیموف لەوە دەترسا کە ڕودیا شێت بێت.. بۆیە نابێت بیوروژێنین..

دایک هاواری کرد:

- تۆ دەڵێی چی!

ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا زۆر ترسا، پرسی:

- بەڕاست پزیشک وای وت؟

- وتی، وەلێ ڕاست نییە، هیچ ڕاست نییە، تەنانەت دەرمانێکی دایە، تۆزێک بوو، خۆم بینیم، ئەو کاتە بوو کە ئێوە گەیشتن.. ئاە.. خۆزگا ئێوە سبەی بگەیشتنایە، باش بوو ئێمە ڕۆیشتین، سەعاتێکی تر خودی زوسیموف هەواڵی تەواوتان دەداتێ. هیچ سەرخۆش نییە، منیش مەست نابم.. بەڵام بۆ ئەوەندەم خواردۆتەوە، کە سەرخۆش بم؟ لەبەر ئەوەی ئەو نەحلەتییانە کێشامیانە ناو قسەوە، ئاخر، من بڕیارم دابوو ئیتر خۆم نەخەمە ناو بێنەوبەردەی گفتوگۆوە.. قسەی هێند بێمانا دەکەن! خەریک بوو دەست بدەمە یەخەیان. من مامەم وەک سەرۆک لەوێ دانا.. سەرۆکی دانیشتنەکە، باوەڕ بکەن، ئەوان دەخوازن مرۆڤ هیچ کەسایەتییەکی خۆی نەبێت، ئەمە بە پێشکەوتن دادەنێن، هەموو هەوڵێکیان بۆ ئەوەیە کە مرۆڤ لە خۆی نەچێت، لە هەموو شتێک کەمتر لە هەقیقەتی خۆی بچێت، ئەمەیش لای ئەوان گەورەترین پێشکەوتنە. خۆزگا هەر هیچ نەبووایە درۆکانیشیان بە شێوازێکی زۆر تایبەت دەربڕیایە، بەڵام.. پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە شەرمەوە قسەکانی پێبڕی و وتی:

- گوێ بگرە..

وەلێ قسەپێبڕینەکە ئەوەندەی تر ئاگری لە لاوەکە بەردا، ڕازومیخین بە دەنگی بەرزتر نەڕاندی:

- تۆ چۆنی بیر لێدەکەیتەوە؟ تۆ وادەزانیت من بۆیە ئەمانە دەڵێم، چونکە ئەوان درۆیان کردووە! نا، من ئەوانەم خۆش دەوێت، کە درۆ دەکەن، درۆ یەکەم تایبەتمەندیی مرۆڤە کە لە هەموو گیاندارەکانی تری جیا دەکاتەوە. بە درۆ دەگەیتە ڕاستی! من بۆیە مرۆڤم، چونکە درۆ دەکەم، هەرگیز کەس نەگەیشتۆتە ڕاستی ئەگەر چوارده جار یان

ڕەنگە سەدوچواردە جار درۆی نەکردبێت، ئەمەیش شایانی ڕێزلێگرتنە، بەڵام، ئێمە ناتوانین درۆکانیشمان بەپێی ئەقڵی خۆمان بکەین، درۆم لەگەڵدا بکە، بەڵام درۆی خۆت بکە و منیش ئەو کاتە ماچت دەکەم، درۆکردن بە شێوازی خۆت، لەو هەقیقەتە چاکترە کە لاساییکردنەوەی خەڵکی تر بێت. لە یەکەمیاندا تۆ مرۆڤی، لە دووەمدا تۆ تەنیا تووتییەکیت. ڕاستی هەرگیز لەناو ناچێت، بەڵام دەشێت ژیان لەناو بچێت. لەم بارەیەوە نموونە زۆرە، باشە، ئاخر ئێستا ئێمە چین؟ ئێمە هەموومان، هەموومان بەبێ ئاوارتەیەک، لەبارەی زانست، کولتوور، بیر و ئایدیۆلۆژی، ئارەزوو، قوتابخانەی ئازادیخوازی، ئەقڵ، ئەزموون و هەموو شتێک، هەموو شتێک، هەموو شتێک. ئێمە هێشتا لە پۆلە سەرەتاییەکانی خوێندنگادایـن. حەزمان بە ئەقڵی خەڵکانی ترە، پێی ڕاهاتووین، وا نییە! ڕاست دەکەم؟

هەر بەم جۆرە بەدەم هاوار و دەنگەدەنگەوە دەستی خانمەکانی لە ناو دەستی خۆیدا توند دەگوشی و دەیوتەوە:

- وا نییە؟

پولخێریا ئەلێکساندروڤنای داماو وتی:

- خودایا.. من نازانم.

ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا بە ویقارەوە وتی:

- وایە، وایە، هەرچەندە من لە گشت شتەکاندا لەگەڵتا نیم.

لە پڕێکدا، ڕازومیخین ئەمەندە توند دەستی گوشی، کە هاواری لێهەستا.

ڕازومیخین بە خۆشی و پێزانینەوە وتی:

- وایە؟ تۆ دەڵێی وایە؟ بەڵام تۆ.. تۆ سەرچاوەی چاکی، پاکی، هزر و.. کەماڵیت، بێنە دەستت، دەی.. تۆیش بێنە دەستت، دەمەوێت لە بەردەمتانا کڕنووش بەرم و هەر ئێستا دەستەکانیشتان ماچ بکەم.
هەر لەناوەڕاستی پیادەڕێکەدا کە خۆشبەختانە لەو کاتەدا تەواو چۆڵ بوو، بە چۆکدا هات.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا کە بێتاقەتییەکەی گەیشتبووە ئەوپەڕی، هاواری لێکرد:
- بەسە، تکایە، تۆ چی دەکەیت؟
دونیایش هەر بە نیگەرانی و پێکەنینەوە وتی:
- هەستە، هەستە!
- هەرگیز هەڵناستم، ئێوە دەستتانم بدەنێ. ئاوا، باشە، بەسە، هەستام، بڕۆین. من لێبوکێکی بێچارەم، من شایستەی ئێوە نیم، مەست و شەرمەزارم.. شایانی ئەوە نیم ئێوەم خۆش بوێت، بەڵام کڕنووش بۆ بردنتان ئەرکی هەموو کەسێکە، بە مەرجێک ئاژەڵ نەبێت، منیش کڕنووشم بۆ بردن.. باشە، ئەوەیش ژوورەکەتانە، هیچ نەبێت ڕادیون لەم لایەنەوە هەقیەتی کە پیتەر پتروڤیچی ئێوەی دەرکرد، چۆن لە ڕووی هاتووە لە ژوورێکی وادا داتانبنێت؟ ڕسواییە! دەزانن کێ دەهێننە ئێرە؟ ئاخر، تۆ دەزگیرانی ئەویت، نا؟ دەزگیرانی ئەویت. کەواتە با پێت بڵێم مێردەکەت تا بڵێی پیاوێکی قێزەونە.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا دەستی بە قسە کرد:
- گوێ بگرە، جەنابی ڕازومیخین، تۆ خۆت فەرامۆش کردووە.
ڕازومیخین هاتەوە سەر خۆی و وتی:
- بەڵێ، ڕاست دەکەیت، من خۆم فەرامۆش کردووە، شەرمەزارم، بەڵام، بەڵام نابێت لەسەر ئەو قسانەی کە پێتانی دەڵێم تووڕە بن،

چونکە بە ڕاستگۆییەوە دەیانڵێم، نا، چونکە.. هوم، ئەگەر وابووایە کارێکی قێزەون بوو، بە کورتی، نەک لەبەر ئەوەی من ئێوەم.. هوم.. باشە با وابێت، پێویست ناکات، نایلێم، بۆ ناوێرم! بەڵام ئێمە هەموومان کە ئەو هاتە ژوورەوە، هەستمان کرد ئەم کەسە لە ئێمە نییە، نەک لەبەر ئەوەی بە قژی لوولکراویەوە تازە لای سەرتاشەوە هاتبوو، نەک لەبەر ئەوەی پەلەی بوو ئەقڵی خۆیمان پێبفرۆشێت، بەڵکو لەبەر ئەوەی سیخوڕ و ڕژدە، وەک جوولەکە، فێڵبازە و ئەمەیش دیار و ئاشکرایە، ئایا ئێوە بە ئاقڵی دەزانن؟ نا، دەبەنگە، دەبەنگە، ئاخر، ئایا ئەوە مێردتە؟ ئەی خوا گیان!

لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا لە پلیکانەکانەوە بەرەو لای ژوورەکە سەردەکەوتن، وەستا و وتی:

- خانمەکان بڕوانن، هەرچەندە ئەوانەی ئێستا لە ماڵەکەمدان، هەموویان سەرخۆشن، بەڵام هەموویان نەجیبن، لەگەڵ ئەوەدا کە ئێمە درۆ دەکەین.. ئاخر منیش هەر درۆ دەکەم، بەڵام سەرئەنجام بە درۆکانی خۆمان دەگەینە ڕاستی، چونکە لەسەر ڕێگەی ڕاست وەستاوین، وەلێ پیتەر پتروڤیچ.. هەنگاو بەسەر ڕێگەی ڕاستا نانێت، هەرچەند ئێستا من جوێنم پێدان، بەڵام ڕێزم بۆ گشتیان هەیە، تەنانەت زامیوتوفیشم خۆش دەوێت، ئەگەرچی ڕێزی ناگرم. چونکە بێجگە لە تووتەڵەسەگێک چی تر نییە، تەنانەت زوسیموفی حەیوانیشم خۆش دەوێت چونکە خانەدانە و کاری خۆی دەزانێت. باشە، کەواتە ئیتر بەسە، هەموو شتێک وترا و داوای لێبوردن دەکەم، بمبوورن، وایە؟ باشە، با بڕۆین، من ئەم ڕاڕەوە دەزانم، لێرە بووم، لێرە، لەم ژووری ژمارە سێیەدا، کارەساتێک ڕووی دا.. دەی، ئێوە لە کوێن؟ کامە ژوور؟ هەشتەم؟ باشە، بەڵام شەو دەرگاکە دابخەن، نەهێڵن

کەس بێتە ژووریّ، چارەکەسەعاتێکی تر بە هەواڵەوە دێمەوە و پاشان دوای نیو سەعات لەگەڵ زوسیموفدا دێم، دەبینن، ماڵئاوا..
ڕۆیشتم.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە نیگەرانی و ترسەوە بە کچەکەی خۆی وت:
- ئای وای، دونیا گیان، دەبێت چی ڕوو بدات؟
دونیا لە کاتێکدا کە کڵاو و مانتۆکەی لابرد، وتی:
- دایکە گیان، هێور بە، خوا خۆی ئەم بەڕێزەی بۆ ئێمە ڕەخساندووە، هەرچەندە بە ڕاستی لە کۆڕی خواردنەوەوە هاتووە، بەڵام بڕوا بکە دەشێت پشتی پێببەسترێت، تا ئێستایش چەندە خزمەتی کاکمی کردووە!
- ئا، دونیا، خوا دەزانێت دێتەوە یان نا! بەڕاست نازانم من چۆن قایل بووم لای ڕودیا نەمێنمەوە! هیچ ئەوەم بە بیردا نەدەهات ئەو بەو حاڵەوە ببینم، چەند لەگەڵماندا دڵڕەق بوو! وەک ئەوەی بینینمانی پێ خۆش نەبێت..
فرمێسک لە چاویا قەتیس ما.
- نا دایکە گیان، وانییە، تۆ باش سەرنجت نەداوەتیّ، تۆ هەر دەگریایت، دیارە نەخۆشییەکەی سەختە و ئەوەیش وای لێکردووە.
- ئای لەو نەخۆشییە! چی دەبێت، چۆن قسەی لەگەڵدا کردیت، دونیا؟
لەگەڵ قسەکاندا دایکە بە دزییەوە لە چاوی کچەکەی ڕوانی بۆ ئەوەی چی لە بیریدایە بیخوێنێتەوە. بەوەی کە دونیا لایەنی ڕودیای گرت و ئەمەیش بەو مانایەیە، کە بەخشیویەتی، کەمێک ئاسوودە بوو، بۆ ئەوەیش کە تەواو دڵنیا بێت، وتی:
- من بێگومانم سبەینێ ڕاکانی خۆی دەگۆڕێت.

- بەڵام من تەواو لەوە دڵنیام کە سبەینێش هەر لەو بارەیەوە دەپەیڤێت.
ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا، بەمە کۆتایی بە قسەی دایکی هێنا و ئەمەیش خۆی مەسەلەیەکی دروست کرد، چونکە پولخێریا ئەلێکساندروڤنا لە گفتوگۆکردن لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە ئێستا زۆر دەترسا.
دونیا لە دایکی نزیک بووەوە و ماچی کرد، دایکیشی بە هێوریی توند لە ئامێزی گرت، پاشان بە نیگەرانییەوە دانیشت و کەوتە چاوەڕوانیکردنی ڕازومیخین، لە پەناوە تەماشای کچەکەی دەکرد، کە ئەویش هەر لە چاوەڕوانیکردندا بوو، دەستی لە پشتییەوە هەڵپێکابوو، بیری دەکردەوە و لە ناو ژوورەکەدا پیاسەی دەکرد. ئەم پیاسەکردنە لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر خوویەکی ئاسایی ئاڤدوتیا بوو، دایکیشی لەو جۆرە کاتانەدا زۆر لەوە دەترسا، کە بیرکردنەوەکەی شلوێ بکات.
بێگومان ڕازومیخین بەو عەشقە کتوپڕەیەوە کە لە حاڵەتی مەستیدا بۆ ئاڤدوتیا هەڵگیرسابوو، زۆر پێکەنینهێن بوو، بەڵام بە تەماشاکردنێکی ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا، بەتایبەتی لەم بارەی ئێستایدا کە دەستی لە پشتەوە هەڵپێکابوو، بە غەمباری و بیرکردنەوەوە هاتوچۆی بە ژوورەکەدا دەکرد، هەرکەس بەو جۆرە بیبینیایە، ڕازومیخینی دەبەخشی، بە تایبەتی ئەگەر لە کاتی ئاسایی خۆی و دوور لە سەرخۆشی بووایە. ئاڤدوتیا گەلێک جوان بوو، باڵای بەرز و زۆر گونجاو و پڕ بوو، لە هەڵسوکەوتیا دیار بوو کە زۆر بڕوای بە خۆیەتی. هەرچەندە ئەمە هیچ لە ناسکی و نەرمی و ڕێکپۆشییەکەی نەدەهێنایە خوارێ. دەموچاوی لە کاکی دەچوو، بەڵام ئەم نمونەیەک بوو لە جوانی، قژی زەردێکی تێر و کەمێک لە قژی کاکی کاڵتربوو، چاوانی تا ڕادەیەک ڕەش و درەوشاوە و لەخۆبایی و لە هەمان کاتدا

هەندێکجار تا ئەوپەڕی نەرمونیان بوون، ڕەنگی دەموچاوی پەڕیبوو، بەڵام نەک پەڕینی نەخۆشی، ڕووی لە تەندروستیا گەش و پرشەپرشی بوو، دەمی کەمێک بچووک و لێوی سوور و قووت بوو، کە وەک چەناگەی هاتبووە پێشێ و تاقە ئەندامێکی بەخەوشی دەموچاوە جوان و سەرنجڕاکێشەکەی بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو خەوشە سیمای کەسایەتییەکی ڕەسەن و هەندێک لووتبەرزیی پێدەبەخشی. ئەگەرچی ڕووی تا ڕادەیەکی زۆر مانای جیدی و ڕامانی پێوە دیار بوو تا خۆشحاڵی، بەڵام زەردەخەنەیەکی دڵگیر و شایستە و پێکەنینێکی دڵبزوێن و بێگەرد سیماکەی ڕازاندبووەوە. کەواتە ڕازومیخین ناهەقی نەبوو بەو مەستی و گەرمی و سادەیی و خانەدانییەوە، وەک پاڵەوانێکی بەهێز کە هەرگیز شتی وا جوانی نەدیبوو، هەر لە یەکەم نیگاوە ئەقڵی لەدەست بدات. بەتایبەتی دەڵێی ئەم ڕێکەوتی یەکەم بینینە، وای کرد کە دونیا لە حاڵەتی جوانی و خۆشەویستی و دڵخۆشییەوە، کە بینینی براکەی بۆی ڕەخساند، پاشان لە حاڵەتێکی تریشدا کە چۆن لێوە قوت و جوانەکەی بەرانبەر بە داواکارییە سەخت و نادروستەکانی کاکی خەجڵین. ئەم دوو دیمەنە بڕستیان لە ڕازومیخین بڕی و هێز و توانای بەرگریکردنی نەهێشت. ڕازومیخین کاتێک لەسەر پلیکانەکان بە سەرخۆشی باسی ئەوەی کرد گوایا خاوەن خانووەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ، واتا پراسکوفیا بافلوفنا نەک تەنیا ئیرەیی بە ئاڤدوتیا ڕومانوفنا، بەڵکو بە پولخێریا ئەلێکساندروڤنایش دەبات، قسەکەی ڕاست بوو، چونکە ئەگەرچی تەمەنی پولخێریا ئەلێکساندروڤنا چلوسێ ساڵ بوو، وەلێ هێشتا جوانییەکەی ڕابووردووی هەر مابووەوە و لەو تەمەنە گەنجتر دەینواند، ئەم مەبەستە بۆ هەموو ئەو ژنانە دەشێت، کە گیانی زیندوو

و هەستی نوێ و دڵێکی پڕ لە گەرمی و خۆشەویستییان تا پیری لەگەڵ خۆدا هێناوە، با ئەوەیش بڵێین کە پاراستنی هەموو ئەم خەسڵەتانە تاقە ڕێگەی مانەوەی جوانییە، تەنانەت لە تەمەنی پیریشدا.
ڕاستە قژی پولخێریا ئەلێکساندروڤنا تاڵی سپیی تێکەوتبوو، تەنک ببوو. لۆچی وردیلە کەوتبووە لاچاوی و خەموخەفەت چاڵی و سیسییان لەسەر گۆناکانی دانابوو، لەگەڵ ئەمانەیشدا دەموچاوێکی دڵگیر بوو، وێنەیەک بوو لە دونیای دوای بیست ساڵی تر. تەنیا ئەوە نەبێت کە ئەو وەک دونیا لێوی خوارەوەی قنج نەبوو.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا ژنێکی زۆر بەهەست بوو، بەڵام نەک زێدەڕۆ کە بگاتە سۆزایەتییەکی دەستکرد، شەرمن و سازشکار بوو، وەلێ تا ڕادەیەکی دیاریکراو، لە گەلێک مەسەلەدا خۆی دەدا بەدەستەوە. لە زۆر شتا، تەنانەت لەو شتانەیشدا کە پێچەوانەی بیروباوەڕی بوون، بەڵام هەمیشە سنوورێکی بۆ شەرەف و یاسا و بیروباوەڕی خۆی دانابوو، کە هیچ کات و هەلومەرجێک ئەو سنوورەی پێ نەدەبەزاند.
هەر دوای ڕۆیشتنی ڕازومیخین بە بیست دەقیقە، دووجار لەسەر یەک بەڵام لەسەرخۆ، لە دەرگاکە درا، ئەو گەڕابووەوە و هەر ئەوەندەی دەرگاکەی لێکرایەوە، یەکسەر وتی:
- نایەمە ژوورێ، کاتم نییە، لە خەوێکی خۆش و قووڵدا بوو، خەوێکی ڕەحەت و ئاسوودە، خوا بکەم دە سەعاتی تر هەڵنەستێت. ناستاسیای لایە، پێم وت تا نەگەڕێمەوە نەڕوات، ئێستا دەچم و زوسیموف دێنم، ئەو هەموو شتێکتان پێدەڵێت، ئێوەیش بنوون، دەزانم ماندوون..
بەدەم قسەکانەوە ڕێی دالانەکەی گرت و ڕۆیشت.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا کە لەڕادەبەدەر دڵخۆش بوو، وتی:

- چ لاوێکی زیرەک و دڵسۆز و بەوەفایە!
ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا هەر بەدەم پیاسەی ناو ژوورەکەوە، زۆر بە گەرمی وتی:
- پێدەچێت مرۆیەکی خۆش ڕەوشت بێت.
دوای نزیکەی سەعاتێک، لە ڕاڕەوەکەدا دەنگی پێ هات و پاشان لە دەرگاکە درا، هەردوو ئافرەتەکە ئەمجارە، تەواو بڕوایان بە بەڵێنەکەی ڕازومیخین کرد و چاوەڕێ بوون، وایش بوو، ڕازومیخین زوسیموفی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، زوسیموف زوو بەوە قایل ببوو کە واز لە میوانییەکە بهێنێت و بڕوات بۆ بینینی ڕاسکۆلنیکۆڤ، بەڵام بە دوودڵی و بێمەیلیەوە هاتبوو بۆ لای خانمەکان، چونکە بڕوای بە قسەکانی ڕازومیخین نەبوو، کە بە سەرخۆشی کردبوونی، وەلێ زوو هەستی خۆویستییەکەی ئاسوودەی کرد و بە خۆشییەوە قایل بوو، چونکە زانی ئەوان بە ڕاستی چاوەڕوانیی ئەویان کردووە، دە دەقیقەی ڕێک دانیشت، بە تەواویی پولخێریا ئەلێکساندروڤنای دڵنیا کرد. قسەکانی بەڵگەی ئەوە بوون کە زۆر بایەخ بە نەخۆشەکە دەدات، لە هەمان کاتیشدا زۆر بە لەسەرخۆیی و جیدیەوە دەریدەبڕین، تەواو وەک پزیشکێکی تەمەن بیستوحەوت ساڵە کە ڕاوێژێکی گرنگی پێبکرێت، بە هیچ جۆرێک لە بابەتەکە دوور نەکەوتەوە، هیچ حەزێکی وایشی دەرنەبڕی کە بۆنی ئەوەی لێبێت بیەوێت پەیوەندیی تایبەتی لەگەڵ خانمەکاندا ببەستێت. چونکە هەر کە هاتە ژووری و جوانییە سەرسووڕهێنەرەکەی ئاڤدوتیا ڕومانوڤنای بینی، ئیتر زوو هەوڵی دا سەرنجی نەداتێ، بە درێژایی ئەو ماوەی دیدەنییە تەنیا ڕووبەرووی پولخێریا ئەلێکساندروڤنا دەدوا، ئەمە ڕەزامەندییەکی دەروونیی گەلێک زۆری پێبەخشی. لەبارەی

نەخۆشەکەیشەوە دەریخست کە لە ئێستادا باری تەندروستییەکەی زۆر هیوابەخشە. بەپێی بۆچوونی ئەویش، هۆکاری نەخۆشییەکە، بێجگە لە خراپی باری دارایی ئەم مانگانەی دوایی نەخۆشەکە، لایەنی دەروونیشی تیایە. ئەمە بەرهەمی چەندان هۆکاری تری ئاڵۆزیی سایکۆلۆژی و دارایی و ترس و خەم و هەندێ بیروباوەڕ و شتی ترە. کە زوسیموف هەستی کرد ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا زۆر بە وردی گوێی لە قسەکانی گرتووە، زیاتر کەوتە لێکدانەوە و شرۆڤەکردن، کە پولخێریا ئەلێکساندروڤنایش بە ترس و دوودڵییەوە پرسیاری ئەوەی لێکرد کە بڵێی نەخۆشییەکە "نیشانەی شێتیەتی" پێوە بێت، زوسیموف بە گاڵتەیەکی لەسەرخۆ و ئاشکراوە وەڵامی دایەوە: کە زیدەڕۆییان لە قسەکانی ئەودا کردووە، بەڵام هەڵبەتە لای نەخۆشەکە هەست بە دڵەڕاوکێیەکی هەمیشەیی دەکرێت، کە بێگومان ئەوە سەرئەنجامی بیرکردنەوەیەکی بەردەوامە لە شتێک، چونکە خودی ئەو، واتا زوسیموف لە ئێستادا زۆر بە سەختی خەریکی لێکۆڵینەوەی ئەو بەشەی زانستی پزیشکییە. وەلێ دەبێت ئەوەیش لەبیر نەکرێت کە نەخۆشەکە تا نزیکەی ئەمڕۆیش هەر وڕێنەی کردووە.. بێگومان هاتنی خێزانەکەی هێز و توانای تازەی دەداتێ، دڵخۆشی دەکات و دەوری دەبێت لە چاکبوونەوەیدا. ئینجا زۆر بە بایەخەوە بەردەوام بوو لەسەر گفتوگۆکەی و وتی: "بە مەرجێک تووشی ڕاچڵەکین و شڵەژانی توندی ڕۆحی نەبێت".

پاشان زوسیموف هەستا، بە ویقار و ڕووی خۆشەوە ماڵئاوایی لێکردن، بە درود و سوپاسگوزارییەکی دڵسۆزانەوە بەڕێ کرا، تەنانەت دەستە چکۆلەکانی ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا، بەبێ ئەوەی خودی زوسیموف چ پێشدەستی و ئاماژەیەکی بۆی هەبێت، بۆ

ماڵئاواییلێکردن، هاتە پێشێ و تەوقەی لەگەڵدا کرد. زوسیموف بە تەواویی ڕازیبوونییەوە لەو دیدەنییە و لە ڕەفتاری خۆی، چووە دەرێ.

ڕازومیخین لە چوونە دەرەوەیدا لەگەڵ زوسیموف پێی وتن:

- بەیانی قسە دەکەین، ئێستا دەبێت بخەون، سبەینێ زوو دێمە لاتان و هەواڵتان بۆ دەهێنم.

کە ئەو دوو لاوە گەیشتنە سەرشەقامەکە، زوسیموف زۆر بە دڵگەرمییەوە وتی:

- ئەم ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنایە چ کچێکی دڵڕفێنە!

- دڵڕفێن؟ وتت دڵڕفێن؟

ڕازومیخین ئەم قسانەی بە دەنگی بەرز دووبارە کردەوە، لەپڕێکدا پەلاماری زوسیموفی دا و دەستی لە گەرووی نا:

- ئەگەر تۆ ڕۆژێک لە ڕۆژان پرکێشی بکەیت.. تێدەگەیت.. تێدەگەیت؟

هەر بەدەم یەخەڕاکێشان و نووساندنی بە دیوارێکەوە هاواری کرد:

- گوێت لێمە؟

زوسیموف کە هەوڵی ئەوەی بوو خۆی لە دەستی ڕزگار بکات، وتی:

- وازم لێبێنە، شەیتانی سەرخۆش.

هەر کە ڕازومیخین دەستی لێبەردا، ئەو تەواو لێی ڕاما و لەپڕا دایە قاقای پێکەنین، ڕازومیخین بەرانبەری وەستابوو، دەستی شۆڕ کردبووەوە، بە ڕوویەکی ترشوتاڵەوە لێی دەڕوانی، پاشان بە سیمایەکەوە کە لە هەوری تیرەوتار دەچوو، لەسەرخۆ وتی:

- هەڵبەتە.. من کەرم.. بەلام.. تۆیش.. تۆیش هەر وایت..

- نا هاوڕێ. من هەرگیز وانیم، من لە ناو خەیالاتی بۆشدا ناژیم.

هەردووکیان بە بێدەنگی کەوتنە ڕێ، تەنیا ئەو کاتە نەبێت کە گەیشتنە ماڵی ڕاسکۆلنیکۆڤ، ڕازومیخین کە لە بیرکردنەوەیەکی قووڵدا بوو، بێدەنگییەکەی شکاند و بە زوسیموفی وت:

- گوێ بگرە، تۆ کوڕێکی زۆر چاکیت، بەڵام تۆ بێجگە لە هەموو ئەو سیفەتە خراپانەی کە هەتە، ژنبازیشیت، من ئەمە دەزانم، لە کەسە ڕسواکانیشیت، تۆ پیاوێکی هیچوپووچیت، تۆ ڕادەبوێریت و قەڵەو دەبیت، کۆ لە هیچ شتێک ناکەیتەوە، من ئەمە بە پیس ناودێر دەکەم، چونکە ئەوە مرۆڤ بەرەو لای پۆخڵی دەبات، تۆ هێند زمانلووسیت کە دەبێت دانی پیدا بنێم، نازانم چۆن لەگەڵ ئەم هەموو شتانەدا تۆ دەتوانیت پزیشکێکی چاک و دڵسۆز بیت، جەنابی پزیشک لەسەر دۆشەکی پەڕ دەنوێت و شەوانە لەبەر نەخۆش لە جێگاکەی خۆی هەڵدەستێت.. سێساڵی دی ئیتر لەبەر نەخۆش لە شوێنەکەت هەڵناسیت.. بەڵام قیروسیا، مەسەلەکە ئەمەیان نییە. مەسەلەکە شتێکی ترە: تۆ ئەمشەو لە ماڵی خاوەن خانووەکە دەنوویت (بە هەزار حاڵ قایلم کردووە) منیش لە چێشتخانەکەیدا دەخەوم، ئەمەیش دەرفەتێکە بۆ ئەوەی چاکتر ئاشنای بیت.. بۆ ئەوەی بزانیت ئەوەی تۆ بیری لێدەکەیتەوە وا نییە. لەودا هاوڕێ، سێبەرۆکەیەکیش لەو شتانەی بەسەرەوە نییە.

- من هەرگیز وا بیرم نەکردۆتەوە.

- هاوڕێ لەودا، شەرم، بێدەنگی، ئابڕوو، خانەدانییەکی زۆر هەیە، لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا هەناسەی قووڵ و توانەوەی وەک مۆمیش هەیە، هەمیشە وەک مۆم دەتوێتەوە! سوێندت دەدەم بە هەموو شەیتانەکانی دنیا، من لە دەستی ڕزگار بکە، ئەو زۆر ڕووخۆشە، لە چاکەت دەرناچم، بە سەر خزمەتت دەکەم.

زوسیموف زیاد لە جاران دایە قاقای پێکەنین:
- تۆ زۆر سەیریت! باشە من دەتوانم چی لێبکەم؟
- دڵنیات دەکەم کە ماندووبوونی زۆری ناوێت، تەنیا قسەی بۆ بکە، چی ئەڵێی بیڵێ، هەر لە پاڵیا دابنیشە و بۆی بڵێ، بێجگە لەوە تۆ پزیشکیت، باسی دەرمانی نەخۆشییەکی بۆ بکە، سوێندت بۆ دەخۆم پەشیمان نابیتەوە، پیانۆیشی هەیە، تۆ خۆت دەیزانی کە من ورینگەورینگێک بە پیانۆ دەکەم، گۆرانییەکی ڕەسەنی ڕووسی دەزانم، گۆرانیی "فرمێسکە ئاگرینەکانم دەبارێنم" گۆرانییە ڕەسەنەکانی زۆر حەز لێیە، بەڵێ، باس لە ئاواز کرا. تۆیش پیانۆژەنێکی زرنگیت، مامۆستای خودی ڕوبنشتاینیت[1]، سوێندت بۆ دەخۆم پەشیمان نابیتەوە.
- باشە، تۆ هیچ بەڵێنێکت پێداوە؟ گرێبەستێکت لەگەڵدا مۆر کردووە؟ ڕەنگە بەڵێنت دابێتێ کە بیهێنیت..
- هەرگیز، هەرگیز، قەت شتی وا نەبووە، هەرگیز وانییە، چبارف دەیویست..
- کەواتە وێڵیکە.
- ئاخر، نابێت هەر ئاوا وێڵ بکرێت.
- بۆ نابێت؟
- چونکە هەروا بە سادە و ساکاری ناکرێت، مەسەلەکە پەیوەندیی تێکەوتووە.
- باشە بۆ فریووت داوە؟

---

[1] rupinstein

تەنگی شێوان و هەناسەی هێور و شوێنی گەرم و نەرمە، ڕێک وەک ئەوە وایە کە تۆ مردبێتیت، کەچی زیندوویشی و خۆشی لە هەردوو حاڵەتەکە وەردەگریت، باشە هاوڕێ، زۆرم چەنەدا، کاتی نووستنە، گوێ بگرە، من کە شەو بەئاگا هاتم، سەرێک لە ڕاسکۆلنیکۆڤ دەدەم، تا بزانم چۆنە، بەڵام گرنگ نییە، هەموو شتێک بە چاکی بەڕێوە دەچێت، تۆیش زۆر نیگەران مەبە، ئەگەر ویستت، تۆیش سەرێکی لێبدە، ئەگەر هەستت بە شتێک کرد، بۆ نموونە ورێنە یان تا، یان هەر شتێکی دی، یەکسەر هەڵمبستێنە، هەرچەندە ئەمە زەحمەتە.

## ٢

ڕۆژی دوایی ڕازومیخین بەدەم لێکدانەوە و مەراقەوە، لە نێوان سەعات حەوت و حەوتونیوی بەیانیدا لە خەو هەستا، بەو بەیانییە گەلێک کێشەی چاوەڕواننەکراو ڕوویان تێکردبوو، هەرگیز پێشتر وێنای ئەوەی نەکردبوو کە بشێ ڕۆژێک لە ڕۆژان بە حاڵێکی لەو جۆرەوە لە خەو ڕابێت، ڕووداوی شەوی پێشتری بە وردودرشتیەوە هاتەوە بیر، دەیزانی شتێکی نائاسایی بەسەر هاتووە و شتێک کاری تێکردووە، کە تا ئێستا دۆستایەتی لەگەڵیدا نەبووە و هیچ پەیوەندییشی بە کاریگەرییەکانی پێشتری ئەوەوە نییە، بۆ نموونە تەواو لەوە دڵنیا بوو، کە ئەو ئومێدەی لە دڵیا بڵێسەی سەندووە، مەحاڵە بێتە دی. بەڵکو ئەوەندەیش مەحاڵە کە تەنانەت هەر بە بیرلێکردنەوەیشی شەرمی لێهات و بەپەلە چووە سەر خەمگەلێکی دی، کە زیاتر لە ڕاستییەوە نزیک بوون و ئەو گرفتاریانەی کە لە "دوێشەوی نەحلەتیەوە" بۆی مابووەوە.

ناخۆشترین شت کە لە یادەوەریدا مابووبێتەوە، ئەوە بوو کە تا چ ڕادەیەک دوێشەو پیس و نامەردانە ڕەفتاری کردووە، هەڵبەت نەک لەبەر ئەوەی کە مەست بووە، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە ڕووبەڕووی کچێکی گەنج کە لەو بارە تایبەتییەدا بوو، بە هۆی ئیرەیی پێبردن و کەریەتییەکەی خۆیەوە و بەبێ ئەوەی ئاگای لە پەیوەندیی وردی کچەکە و دەزگیرانەکەی بێت، یان ئەو کەسە بە چاکی بناسێت، جوێنی پێداوە، باشە بە چ هەقێکەوە وا بەپەلە و خێرا کەوتە داوەریکردنی ئەو کوڕە؟ کێ ئەوی بە دادوەر داناوە؟ ئایا مرۆڤێکی وەک ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا بۆ پارە خۆی بە پیاوێکی نالایەق دەفرۆشێت؟ کەواتە گومان لەوەدا نییە کە ئەو پیاوە لایەنی چاکەی تیایە. بۆ مەسەلەی ژوورە فەرشکراو و ئامادەکانیش؟ بەڕاست ئەو لە کوێ بزانێت ئەم ژوورانە وان؟ ئاخر ئەو خەریکی ئامادەکردنی ماڵە.. ئاە.. ئەو شەوە چەند خوێڕیەتیی بەخەرج داوە! بەڵام دەتوانێت چ پاساوێکی هەبێت.. سەرخۆش بووە؟ ئەمە پاساوێکی گەوجانەیە، کە زیاتر ڕسوای دەکات. مەی ڕاستیی مرۆڤ دەردەخات، وا ڕاستییەکان بە تەواویی دەرکەوتن، واتا "ناپاکیی دڵی ڕەق و پڕ لە ئیرەییەکەی" دەرکەوت. پاشان ئارەزوویەکی لەم جۆرە، بۆ یەکێکی وەکو ڕازومیخین، هەرگیز بەدی دێت؟ بەرانبەر بە کچێکی وا جوان، ئەو چییە؟ بەدمەستێکی چەنەباز و فشەکەری دوێنێ!

ئایا دەشێت بەراوردێکی هێند قەشمەر و سەرسامهێن بکرێت؟

ڕازومیخین لەم بیرکردنەوەیەدا تەواو ڕەنگی سوور داگەڕا، لەپڕێکدا وەک ئێستا بێت، ئەوەی بیر هاتەوە کە چۆن ئەو کاتەی دوێنێ لەسەر پلیکانەکان وەستابوو، دەیوت کە خاوەن خانووەکە ئیرەیی بە ئاڤدوتیا ڕۆمانوفنا دەبات.. ئەمە بە یەکجاری بڕستی لێبڕی، ڕازومیخین بە

هەموو هێزی مشتەکۆڵەیەکی وای بە وەجاخی مووبەقەکەدا، کێشا کە دەستی بریندار بوو خشتێکیشی شکاند.
دوای کەمەکێک، هەستی بە ڕسواییەکی قووڵ کرد، وتی:
- هەڵبەت، هەڵبەت، شوێنەواری ئەم هەموو ڕسواییە هەرگیز لەناو ناچێت.. کەواتە بیرلێکردنەوەیشی بێهودەیە، بۆیە دەبێت بێدەنگ بڕۆم و.. ئەرکەکانم بە ئەنجام بگەیەنم.. بێدەنگ و بێ داوای لێبوردن کردن و هیچ وتن.. بێگومان ئیدی هەموو شتێک تازە لەکیس چووە.
لەگەڵ ئەمانەیشدا ڕازومیخین لە کاتی جللەبەرکردنیدا، زیاد لە ئاسایی بایەخی بە بەرگی دا، بێجگە لەم قاتە جلی تری نەبوو، ئەگەر هەیشی بووایە، ڕەنگە لەبەری نەکردایە "ڕێکپۆش نەبوو، بەڵام هەرچۆنێک بێت، نەدەبوو بە پیسوپۆخڵی و ناڕێکوپێکی، بڕواتە لایان و هەستی ئەوان بڕوشێنێت. بەتایبەتی کە ئەوان پێویستیان بەمە و دەیانەوێت لایانبێت". جلەکانی بە چاکی بە فلچە پاک کردەوە، کراسەکەی تا ڕادەیەک بەردەوام پاک بوو، لەم لایەنەوە ڕازومیخین زۆر ڕێکوپێک دەینواند.
ئەو بەیانییە ڕازومیخین زۆر بایەخی بە پاکوخاوێنی خۆی دا، ناستاسیا سابوونی هەبوو، سەروملو و بە تایبەتی دەستی زۆر باش شۆرد، کە هاتە سەر ئەوەی ئایا ڕیشی بتاشێت یان نا (پراسکوفیا بافلوفنا گوێزانی گەلێک چاکی هەبوو، کە دوای مردنی بەڕێز زارنیتسنی مێردی بۆی مابووەوە)، بێ ئەوەی بەزەیی بە خۆیدا بێتەوە بە نەرێ وەڵامی دایەوە: "با وەک خۆی بێت، ئەگینا وا دەزانن من لەبەر خاتری.. هەڵبەتە، بێگومان وا بیری لێدەکەنەوە، کەواتە من هەر نایتاشم". پاشان زیاتر لە خۆی نووسا و وتی: ".. بەتایبەتی کە من ئەوەندە پیس و نەگریسم، لە سەرسەریی ناو کۆڵان و شەقامەکان

دەچم.. باشە وا وتمان پیاوێکی شەریفم، باشە، بەشەرەفبوون شانازیی نەگەرەکە، هەموو کەسێک پێویستە لەسەری شەریف بێت، بەڵکو زیاتریش.. لەگەڵ ئەوەیشدا کە من خۆم دەزانم هەندێ کاری ناڕەوام کردووە. نەک کاری ناڕەوا، بەڵکو کارگەلێکی ئاوا.. هەندێکجاریش بیری وام بەسەردا دێت.. هوم.. چۆن ئەمانە لەگەڵ ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنادا بەراورد دەکرێت: لەعنەت لە شەیتان! باشە، با وابێت، من هەروا دەمێنمەوە، سوک و ڕسوا و سەرسەری، بە جەهەنەم، لەمەیش خراپتر دەبم..!"

زوسیموف کە شەو لە ماڵی پراسکوفیا پافلوفنا ڕۆژی کردبووەوە، ڕازومیخینی لەم قسەوباسەدا بینی، کە لەگەڵ خۆیدا دەیکرد، پێش ئەوەی بگەڕێتەوە ماڵەکەی، خێرا سەری لە نەخۆشەکە دا، ڕازومیخین پێی وتبوو نەخۆشەکە لە خەوێکی قووڵدایە، زوسیموف وتی لە خەو هەڵیمەستێنن، بهێڵن خۆی هەستێت و بەڵێنیشی دا سەعات دە سەری لێبداتەوە، ئینجا لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

- بێگومان ئەگەر لە ماڵەوە بێت، ئاه. پزیشک کە دەسەڵاتی بەسەر نەخۆشدا نەبێت، چەند گرانە چارەسەرکردنی! پێم بڵێ، ئەم دەچێت بۆ لایان یان ئەوان دێنە لای ئەم؟

ڕازومیخین کە لە مەبەستی سەرەکیی پرسیارەکە گەیشت، وەڵامی دایەوە:

- وا دەزانم ئەوان بێن بۆ ئێرە، بۆ ئەوەی لەبارەی کاروباری خێزانیی خۆیانەوە گفتوگۆ بکەن. بۆیە من دەڕۆم، تۆ لەبەر ئەوەی پزیشکیت، لە من زیاتر مافت هەیە.

- خۆ منیش قەشە نیم گوێ لە دانپیانانەکانی بگرم، دێم و دەڕۆم، منیش کاری زۆرم هەیە.

ڕازومیخین برۆی هێنانەوە یەک و وتی:
- من شتێک بێتاقەتم دەکات، دوێنێ بە سەرخۆشی، کە لەگەڵ ڕاسکۆلنیکۆڤ هاتمەوە، لە ڕێگە زۆرم چەقەچەق کرد، قسەی قۆڕ و هەڵەت و پەڵەت، هەر لەو میانەدا وتم کە تۆ دەترسیت نەکا ئەو.. نزیک بێت لە شێتبوونەوە.
- تۆ دوێنێ ئەمەت بە خانمەکانیش وت.
- دەزانم کەریەتیم کرد، حەز دەکەیت لێم بدە، بەڵام بە ڕاستی تۆ لەو باوەڕەدایت کە ڕەنگە شێت بێت؟
- قسەی هیچ دەکەیت، باوەڕی چی؟ تۆ خۆت ئەو کاتەی کە منت دەهێنا بۆ لای، وات دەزانی پەرکەمی لەگەڵدایە.. خۆیشمان دوێنێ زیاتر نەوتمان پێدا کرد، بەتایبەتی تۆ.. باسی چیرۆکی بۆیەچییەکەت لە بیرە؟ بابەتێکی سەیر بوو، ڕەنگە ئەو لەسەر ئەمە شێتگیر بووبێت، ئەگەر دەمزانی ئەو ڕۆژە لە مەڵبەندی پۆلیس چی بەسەر هاتووە، ئەو بێژوە بە بەدحاڵیبوونی خۆی چۆن سووکایەتیی پێکردووە! هوم، هەرگیز نەمدەهێشت ئەو باسەی دوێشەوکردمان بەسەر زمانتا بێت. ئەم جۆرە نەخۆشانە مشکێکت لێدەکەن بە چیایەک و ئەفسانە وەک واقیع دەبینن.. ئەوەی لە بیرم مابێت، لە گێڕانەوەکەی دوێنێشەوی زومیوتوفەوە لە نیوەی مەسەلەکە گەیشتم، ئەمە هیچ نییە، من ئاگام لە شتی سەیرترە، پیاوێکی تەمەن چل ساڵ کە تووشی نەخۆشی ماخولیا ببوو، هەموو ڕۆژێک کە لەسەر سفرە دادەنیشت، منداڵێکی تەمەن هەشت ساڵانە گاڵتەی پێدەکرد، ئەویش خۆی پێنەگیرا و منداڵەکەی کوشت. ئەمەی ئێمەیش بە جلی دڕاو و نەخۆشییەوە، لەگەڵ ئەو پۆلیسە بێشەرم و بەدحاڵییەدا! بەرانبەر بە کەسێک کە تووشی ماخولیا بووبێت، لەگەڵ ئەوەیشدا زۆر خۆی بە گەورە

بزانێت! ڕەنگە هۆی ڕاستەقینەی نەخۆشییەکەی ئەمە بێت، بەهەرحاڵ، بۆ دۆزەخ.. بەڵام بە ڕاستی ئەم زامیوتوفە کوڕی چاکە، وەلێ، هوم.. دوێنێ بە بەلاش ئەم چیرۆکەی گێڕایەوە، گەلێک چەنەبازە.

- بۆ بۆ کێی باس کردووە؟ تەنیا من و تۆ نەبووین؟

- بۆ پورفیریشی باس کردووە.

- جا چییە ئەگەر پۆرفیری بزانێت؟

- بەڕاست، تۆ هیچ کاریگەریت لەسەر دایک و خوشکی هەیە؟ دەبێت ئەمڕۆ زۆر بە وریاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن.

ڕازومیخین بە ساردییەوە وتی:

- پێک دێن.

- بۆ لەگەڵ لۆژیندا ئەو هەڵوێستەی نواند؟ لۆژین پیاوێکی دەوڵەمەندە و پێناچێت کچەکەیش ڕقی لێی بێت.. ئەوانیش خاوەنی سەلکەتورێک نین، ها؟

ڕازومیخین بە توورەییەوە شیڕاندی:

- ئاخر تۆ ئەم خۆتێهەڵقورتاندنەت لەچییە؟ من چوزانم سەلکێک تووریان هەیە یان نا، خۆت لێیان بپرسە بەڵکو لەوەیش بگەیت..

- تۆ هەندێکجار زۆر دەبەنگیت، سەرخۆشییەکەی دوێنێت هێشتا تیا ماوەتەوە.. خوات لەگەڵ، بە ناوی منەوە سوپاسی پراسکوفیا پاڤلۆڤنایش بکە بۆ میواندارییەکەی.. دەرگاکەی لەسەر خۆی پێوە دابوو کە ڕۆژباشم لێکرد و ئەو لەو دیوەوە چ وەڵامێکی نەدامەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا کە ئەو سەعات حەوت لە خەو هەستابوو، سەماوەریان بۆ هاوردبووە ڕاڕەوەکەوە.. تەنانەت من شانازیی بینینیشیم بەرنەکەوت.

لە سەعات نۆی تەواودا ڕازومیخین لەگەڵ باکالیڤدا لای ئەو ژوورانە بوون، کە بە کرێ گیرابوون، هەردوو خانمەکە زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕێی بوون، لە سەعات حەوتەوە، ڕەنگە زووتریش، هەردووکیان لە خەو هەستابوون. ڕازومیخین کە دەموچاوی وەک شەوەزەنگ بەیەکدا دابوو، بە بێزارییەوە سڵاوی لێکردن، لەپڕێکدا ڕقی لە خۆی هەستا. چونکە پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە شەوقەوە پێشوازی لێکرد و وا بەدەستیا نووسا، زۆری نەمابوو ماچیان بکات. ڕازومیخین نیگایەکی ترسئامێزی ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا کرد، وەلێ لەو دەموچاوە فیزاوییەوە ئێستا نیشانەی ڕێز و هاوڕێیەتی و سوپاسگوزاریەک، لەباتی ڕوانینی گاڵتەئامێز و نەفرەتلێکردن، کە خۆی چاوەڕوانی ئەمەیان بوو، دەخوێندرایەوە. کە ئەگەر بە جوێنپێدانەوە پێشوازییان لێبکردایە بۆ ئەم ئاسان و ئاسوودەتر دەبوو، چونکە لەم حاڵەتەی ئێستادا ئەو زۆر هەستی بە ناڕەحەتی دەکرد. بەڵام بۆ خۆشبەختی ئەو، دەرگای قسە کرایەوە و ئەویش زۆر زوو پێوەی نووسا.

کە پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بیستی ڕودیا "هێشتا لە خەو هەڵنەستاوە"، بەڵام "باری تەندروستیی زۆر باشە" زۆری پێ خۆش بوو، چونکە دەبوو پێشتر لەبارەی هەندێک کاروبارەوە ڕاوێژ بکات و ڕوونیان بکاتەوە. پاشان قسە هاتە سەر نان و چای بەیانی، بە ڕازومیخینیان وت دەبێت بەرچاییان لەگەڵدا بخوات، چونکە هێشتا ناشتایان نەکردبوو و لە چاوەڕوانی ڕازومیخیندا بوون. ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنا زەنگی لێدا، خزمەتکارێکی شڕەلەبەری پۆخڵ هات بەدەم زەنگەکەوە، داوای چایان لێکرد، سەرئەنجام چایان هێنا، وەلێ دیمەنەکە هێند پیس و دزێو بوو، کە خانمەکان بێزار بوون. خەریک بوو ڕازومیخین جوێنێکی خەست بە شوێنەکە بدات، بەڵام زوو

لۆژینی بیر کەوتەوە، بێدەنگ و بێزار بوو، وەلێ کە پرسیارەکانی پولخێریا ئەلێکساندروڤنای بەسەردا دارژا، گەلێک خۆشحاڵ بوو.
لە وەڵامی پرسیارەکاندا ڕازومیخین سێ چارەکەسەعات قسەی کرد، بە درێژایی ئەو ماوەیە بەردەوام قسەیان پێدەبڕی و پرسیاری تازەیان لێدەکرد، توانی ئەوەی کە دەیزانی لەبارەی بەسەرهاتەکانی دواساڵی ژیانی ڕادیون ڕومانوڤیچەوە، هەموویان بۆ باس بکات تا گەیشتە سەر نەخۆشییەکەیشی، لەگەڵ ئەمانەیشدا هەر گەلێک شتی نەدرکاند، وەک ڕووداوی لای پۆلیس و ئەو بەسەرهاتەی لێی کەوتەوە. خانمەکان زۆر بە پەرۆشەوە گوێیان لێگرتبوو، وەلێ کە زانی قسەی کۆتایی پێهاتووە و گوێگرەکانی قایلن، تازە هەستی بەوە کرد کە بە لای ئەوانەوە ئەم هێشتا دەستی بە قسە نەکردووە.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا زۆر بەپەلە وتی:
- پێم بڵێ. پێم بڵێ بیروڕای تۆ چۆنە.. ببوورە، من هێشتا نازانم ناوت چییە؟
- دیمیتری پروکفیچ[1]
- زۆر باشە، دیمیتری پروکفیچ، گەلێک حەز دەکەم بزانم.. بەگشتی ئەو چۆن لە شتەکان دەڕوانێت، یەعنی لە مەبەستەکەم تێبگە، چۆن چاکتری بڵێم! حەز لە چی دەکات و ڕقی لە چییە؟ ئایا هەمیشە وا تووڕە و تڕۆیە؟ مەیل و ئارەزووی - ئەگەر بتوانین وای بڵێین- لە چییە؟ ئێستا چی زۆر کاری لێدەکات؟ حەز ئەکەم ئەگەر..
دونیا وتی:
- دایکە گیان، چۆن دەبێت وەڵامی هەموو ئەمانە بەیەکجار بداتەوە!

---
[1] *Dimitri prokofich*

- خودا گیان، ئاخر دیمیتری پروکفیچ من هەرگیز چاوەڕێی ئەوە نەبووم بەم حاڵەوە بیبینم.
دیمیتری پروکفیچ وەڵامی دایەوە:
- هەڵبەتە ئەمە شتێکی ڕوون و ئاشکرایە، من دایکم نییە، بەڵام هەموو ساڵێک مامم دێتە ئێرە و هەموو جارێکیش تا ڕادەیەک نامناسێتەوە، تەنانەت سەروسیمایشم، لەگەڵ ئەوەدا کە پیاوێکی زۆر ئاقڵیشە. بێگومان بە درێژایی ئەم سێ ساڵ لەیەکدابڕانەی ئێوەوە، گەلێک ئاو لە ئاش گەڕاوە، نازانم چیتان پێبڵێم؟ ساڵونیوێکە من ڕادیون دەناسم، لەو کاتەوە ڕووگرژ، مڕومۆچ، بە خۆی دەنازێ و لووتبەرزە. لەم دواییەدا و ڕەنگە زۆر پێشتریش تووشی بەدگومانی و ماخۆلانیش بووە. جوامێر و میهرەبانە، پێی خۆش نییە هەستوسۆزی خۆی دەربڕێت، حەز دەکات دڵڕەقی بنوێنێت، نەک سکاڵای دڵی خۆی بکات، هەندێکجارییش ماخولیایی نییە، بەڵکو تەنیا سارده و تا ڕادەیەک هەستی ناجوڵێ و گیانی مرۆڤایەتیی تیا نامێنێ، بە ڕاستی وەک ئەوە وایە کە دوو خووی دژ بەیەک لەودا هەبن و جێ لە یەکتری بگرن. هەندێکجاریش تەواو بێدەنگ و بێقسەیە. ئەو خۆی وا دادەنێت کە هیچ دەرفەتی نییە، یان هەموو سەر دەکەنە سەری، کەچی بۆ خۆی درێژ لێی ڕادەکشێ و چ کارێک ناکات. هیچ قۆشمەبازیش نییە، بەڵام نەک لەبەر ئەوەی قسەی خۆشی پێنەبێت، نا، بەڵکو وەک بڵێی دەرفەتی ئەوەی نەبێت خۆی بەو کارە بێهودانەوە خەریک بکات. کە لەگەڵیدا دەدوێن، تا کۆتایی گوێ لە بەرانبەرەکەی ناگرێت، هەرگیز ئەو شتەی سەرنجی هەموان ڕادەکێشێ، لای ئەو گرنگ نییە. زۆر بە خۆی دەنازێ و هەڵبەتە هەقیشیەتی، باشە ئیتر

چی؟.. من وای بۆ دەچم هاتنی ئێوە کاریگەریی لەسەر چاکبوونەوەی دەبێت.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا کە لە بیروڕای ڕازومیخین دەربارەی ڕودیا بێتاقەت بوو، هاواری کرد:

- ئاخ، خوا بکەم وا بێت.

ڕازومیخین سەرئەنجام بوێرانەتر تەماشای ئاڤدوتیا ڕومانوڤنای کرد، لە کاتی قسەکردنەکەدا هەندێکجار سەیری کرد، بەڵام نیگاکانی زۆر کاتی و کتوپڕبوون و زوویش چاوی کەلا دەخست، ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا جارێک لە پاڵ مێزەکەدا دادەنیشت و بە وردی گوێی دەگرت، جاری تر سەرلەنوێ هەڵدەستا و وەک خووی پێوە گرتبوو، لەمسەرەوە بۆ ئەوسەری ژوورەکە پیاسەی دەکرد، دەستی وەک خاچ لێدەکرد و لێوی دەکرۆشت، هەر بەدەم ڕۆیشتنەوە هەندێکجار پرسیارێکی دەکرد و بیری دەکردەوە، ئەویش هەر ئەو خووەی هەبوو کە تا کۆتایی گوێ بۆ ئەوە نەگرێت کە دەیڵێن. کراسێکی ڕەنگ تێری ناسکی لەبەردا بوو، دەزماڵێکی سپی و تەنکی بە گەردنییەوە ئاڵاندبوو. ڕازومیخین بە گەلێک بەڵگە زوو لەوە تێگەیشت کە ئەو دوو ژنە زۆر هەژارن، وای لێکدایەوە ئەگەر ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا بەرگێکی شازادانەی لەبەردا بووایە، ئەوسا ئەم هیچ لێی نەدەترسا، بەڵام ئێستا ڕەنگە لەبەر ئەوەی کە جلەکانی ئەمەندە نابووت بوون و بارێکی هەژارانەی لە خۆی گرتبوو، ترسی خستبووە دڵی ئەمەوە و لە هەر وشە و ڕەفتارێکی خۆی دەترسا، بێگومان ئەمە بۆ کەسێکیش کە ئاسایی بڕوای تەواوی بە خۆی نەبێت، هۆی نارەحەتی بوو.

ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا بە زەردەخەنەوە وتی:

- تۆ زۆر شتی گرنگت لەبارەی ڕەوشت و خوی براکەمەوە پێوتین.. بێلایەنیش بوویت، وا چاکە، من وا دەزانم تۆ ستایشی دەکەیت.
دوای کەمێک بیرکردنەوە لەسەری ڕۆیشت:
- ڕەنگە بە ڕاستی ژنێکیش لە ژیانیدا هەبێت.
- من شتی وام نەوتووە، دەشێ لەم بارەیەوە تۆیش ڕاست بکەیت.. تەنیا..
- چی؟
ڕازومیخین بە جەختەوە وتی:
- ئاخر، ئەو کەسی خۆش ناوێت، ڕەنگە هەروایش بمێنێتەوە.
- یەعنی توانای خۆشویستنی نییە؟
- ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا، دەزانیت تۆیش زۆر سەیر لە براکەت دەچیت، لە هەموو شتێکدا!
ڕازومیخین ئەم قسانەی لەپڕێکدا کرد و بە شێوەیەکیش کردی، کە خۆی چاوەڕوانی نەبوو. بەڵام ئەوەی لەبارەی براکەی ئەو کچەوە وتبووی، کە خێرا وەبیر خۆی هێنایەوە، وەک چەنەوەر سوور داگەڕا و زۆریش پەشۆکا. ئاڤدوتیا ڕومانوفنا کە لێی دەڕوانی، نەیتوانی ڕێ لە پێکەنینەکەی خۆی بگرێت.
پولخێریا ئەلکساندروفنا کە تا ڕادەیەک دڵگران ببوو وتی:
- پێدەچێت دەربارەی ڕودیا هەردووکتان هەڵەبن، دونێچکا، مەبەستم باری ئێستای ئەو نییە، ئەوەی پیتەر پتروڤیچ لەم نامەیەدا نووسیویەتی و.. من و تۆیش واماندەزانی ڕەنگە ڕاست نەبن. وەلێ دیمیتری پروکفیچ تۆ دەتوانیت وێنای ئەوە بکەیت کە ئەو تا چ ڕادەیەک سەیر و چۆنی بڵێم، ڕاڕایە، من هەرگیز نەمتوانیووە پەی بە خووخدەی ئەوبەرم، تەنانەت ئەو کاتەیش کە تەمەنی پانزە ساڵان

بوو، من بڕوای تەواوم بەوە هەیە کە ئێستایش دەتوانێت لەپڕێکدا کارێکی وا بکات، کە هیچ مرۆڤێک هەرگیز ئەو کارەی بە خەیاڵدا نەیەت.. با زۆر دوور نەکەوینەوە، ساڵ و نیوێک لەمەوبەر، نازانیت چۆن ئێمەی سەراسیمە کرد و هێنایینییە ژاروژەنگ، تەنانەت زۆری نەمابوو دیقی ڕەش بکەم، کاتێ کە بیستم لەسەری داوە لەگەڵ ئەو کچەدا.. ناوی چییە؟ کچی خاوەن خانووەکە، خاتوو زارنیتسینادا زەماوەند بکات.

ئاڤدۆتیا ڕومانوڤنا لە ڕازومیخینی پرسی:

- ئایا تۆ هیچ وردەکارییەک لەبارەی ئەو چیرۆکەوە دەزانیت؟

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بەگەرمییەوە وتی:

- تۆ ئەوەت بە خەیاڵدا دێت کە فرمێسکەکانم، ئاواتەکانم، نەخۆشیم، تەنانەت مردنیشم لە ئەنجامی خەفەت و هەژاریمانەوە، بیانتوانیایە ئەو لەو کارە بگێڕنەوە؟ نەخێر، زۆر بە هێوری هەموو کۆسپەکانی دەبڕی، بەڵام ئایا ئەمە دەشێت؟ بەڕاست دەشێت ئێمەی خۆش نەوێت؟

ڕازومیخین بە پارێزەوە وەڵامی دایەوە:

- هەرگیز لەو بارەیەوە هیچی بە من نەوتووە، بەڵام من لە خودی خاتوو زارنیتسیناوە کە چیرۆکبێژێکی باشیش نییە، هەندێک شتم بیست، کە تا ڕادەیەک بەلامەوە سەیر بوون..

هەردوو ژنەکە پێکەوە پرسییان:

- چیت بیستووە؟

- هیچ شتێکی نائاساییم نەبیستووە، بەڵام ئەوەم زانی کە بڕیاری تەواو لەسەر زەماوەندەکە درابوو، وەلێ کچەکە مرد و کارەکەیش بە دڵی خاتوو زانیتسینا نەبوو. بێجگە لەمانە دەڵێن کچەکە جوان نەبووە،

تەنانەت ناشیرینیش بووە.. زۆریش لەشبەبارو.. ڕەفتار سەیریش بووە.. بەڵام دەڵێن ئاکاری چاکە و شایستەی تیا بووە، بێگومان شایستە و ئاکارچاک بووە ئەگینا هەر هیچ مانایەکی تیا نەدەما. هیچ جیازییەکیشی نەبووە، گوایا ڕودیا هەرگیز بیری لە جیازی نەکردۆتەوە.. بە ڕاستی داوەریکردن لە کێشەیەکی وادا کارێکی دژوارە.

ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا بە کورتی وتی:

- من بێگومانم کچێکی باش بووە.

- خوا لێم نەگرێت، وەلێ من بە مردنەکەی دڵخۆش بووم، هەرچەندە نازانم لەو دووانە کامیان ئەویتری بەدبەخت دەکرد. کوڕەکەم؟ یان ئەو؟

بەدەم قسەکانەوە پولخێریا ئەلێکساندروڤنا، بەپارێز و دزەنیگاوە بۆ دونیا، کە دەیزانی بۆ کچەکەی ناخۆش بوو، سەرلەنوێ دەربارەی دیمەنەکەی دوێنێی نێوان ڕودیا و لۆژین دەستی بە پرسیار کرد. بێگومان ڕووداوەکە زیاد لە هەر شتێکی تر، تا سنووری ترس و لەرز، ئەوی دوودڵ کردبوو. جارێکی دی ڕازومیخین، لە سەرەتاوە تەواوی بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە، وەلێ ئەمجارەیان بیروڕای خۆیشی خستە سەر. بەبێ پێچوپەنا ڕاسکۆلنیکۆڤی بەوە گوناهبار کرد، کە هەر بە دەستی ئانقەست سووکایەتیی بە پیتەر پیتروڤیچ کردووە، ئەمجارەیان ڕازومیخین نەخۆشیی ڕودیای نەکردە پاساو بۆ کارەکە، پاشان بەردەوام بوو:

- پێش نەخۆشکەوتنەکەیشی هەر ئەو خەیاڵەی لەژێر سەردابوو.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە بێحاڵییەوە وتی:

- منیش هەروای بۆ دەچم.

وەلێ سەری زۆر لەوە سوورما، کە چۆن ڕازومیخین ئەمجارە لەبارەی پیتەر پتروڤیچەوە لەسەرخۆ و تەنانەت بەڕێزەوە قسەی کرد. ئەمە ئاڤدوتیا ڕومانوفنایشی سەرسام کردبوو.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا خۆی پێنەگیرا و وتی:
- کەواتە ڕات بەرانبەر بە پیتەر پتروڤیچ وایە؟
ڕازومیخین بە گەرمی و جەختکردنەوە وەڵامی دایەوە:
- دەربارەی مێردی ئاییندەی کچەکەت ناتوانم ڕایەکی ترم هەبێت، ئەمەیش تەنیا لەبەر ئەدەبێکی ڕووکەش نالێم، بەڵکو.. لەبەر.. باشە، هیچ نەبێت لەبەر ئەوەی کە ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا بە مەیلی خۆیان ئەویان هەڵبژاردووە، کە دوێنێشەویش من قسەی خراپم لە بارەیانەوە کرد، چونکە سەرخۆش و ناتەواو بووم، هەروەها.. شێت بووم، بەڵێ شێت و بێمێشک بووم، بە تەواویی عەقڵم لەدەست دابوو.. لەو لایەنەوە من ئەمڕۆ خەجاڵەتم.
ڕازومیخین ئەمانەی وت و سوور داگەڕا و بێدەنگ بوو.
ئاڤدوتیا ڕومانوڤنایش سوور داگەڕا بەڵام بێدەنگییەکەی نەشکاند، لەو کاتەوەی قسە هاتە سەر لۆژین، وشەیەکی نەهاتە سەر زار.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنایش لەوەدا کە پشتیوانی لە کچەکەی نەکرد، دیاربوو کە دوودڵ بوو، لە دواییدا هەر بەو دوودڵی و نیگا یەک لە دوایەکەکانیەوە بۆ کچەکەی، دانی بەوەدا نا کە تا ئێستا لە مەسەلەکە زۆر دەترسێت، وتی:
- بڕوانە دیمیتری پروکفیچ.. دونێچکا، من لەگەڵ دیمیتری پروکفیچدا تەواو بە ڕاشکاوی دەدوێم.
ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا بە دەنگێکی پڕ لە قەناعەتەوە وەڵامی دایەوە:
- بێگومان، دایکە گیان.

دایکە بەو مۆڵەتەی کە بۆ باسکردنی خەم و ئازارەکانی خۆی وەریگرتبوو، دەتوت کێوێک لەسەرشانی لاچووە، خێرا کەوتەوە قسە:
- مەسەلەکە ئاوایە، ئەمڕۆ سەرلەبەیانی زوو، نامەیەکمان لە پیتەر پتروڤیچەوە پێگەیشت کە وەڵامی هەواڵی گەیشتنەکەمان بوو بۆ ئێرە. دەزانیت، دوێنێ بڕیار بوو، وەک خۆی لە پێشدا بەڵێنی دابوو، کە بۆ پێشوازیمان بێتە وێزگە. کەچی نۆکەرێکی ناردبووە پێشوازیمان، کە ناونیشانی ئەم ژوورانەی پێبوو، بۆ ئەوەی ڕێگەمان پیشان بدات، پیتەر پتروڤیچ ڕایسپاردبوو پێمان بڵێت کە ئەم بەیانییە خۆی دێتە لامان، وەلێ لەباتیی خۆی دیسان ئەم بەیانییە ئەم نامەیەی گەیشت.. وا چاکترە خۆت بیخوێنیتەوە، لێرەدا شتێک هەیە منی زۆر نیگەران کردووە.. ئێستا خۆت تێدەگەیت ئەو شتە چییە.. بەڵام دیمیتری پروکفیچ، دەبێت ڕای خۆتم بە ڕاستی پێبڵێیت، تۆ لە هەموو کەسێک باشتر ڕەوشتی ڕودیا دەناسیت، لە هەموو کەسێک باشتریش دەتوانیت ڕێنمایی بکەیت، با هەر لە پێشیشەوە پێت بڵێم کە دونێچکا هەر لە سەرەتاوە لە مەسەلەکە گەیشتووە و بڕیاری خۆی داوە، بەڵام من هێشتا نازانم چی بکەم و تا ئێستا هەر چاوەڕێی تۆم.
ڕازومیخین نامەکەی کردەوە، کە مێژووی دوێنێی پێوە بوو، دەستی بە خوێندنەوەی کرد:
"خاتوو پولخێریا ئەلێکساندروڤنای ئازیز، بەوپەڕی ڕێزەوە پێت ڕادەگەیەنم کە بە هۆی کۆمەڵێک کێشەی چاوەڕواننەکراوەوە نەمتوانی بۆ پێشوازیتان بێم بۆ وێزگەی ڕێگەی ئاسن، لەبەر ئەوە یەکێکم نارد تا ڕادەیەک شارەزا و زرنگە، هەروەها بە هۆی هەندێک کاری زۆر پەلەوە کە لە ئەنجومەنی پیران بۆم پێش هاتووە، بۆ ئەوەیش دیداری تۆ لەگەڵ کوڕەکەتاندا و ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا لەگەڵ کاکیدا بە باشی بەڕێوە بچێت، سبەی بەیانیش شانازیی بینینی ئێوەم نییە، شەرەفی بینینتان و پێشکەشکردنی سڵاو و ڕێزم لەلای

خۆتان، لە پێش سبەینێ و لە سەعات هەشتی تەواویی دوای نیوەڕۆدا بۆ نارەخسێت. لەو ڕووەوە، زۆر بە ڕاشکاوی دەخوازم و جەخت لەسەر ئەوە دەکەم، کە کاتی هاتنم بۆ لاتان با ڕادیون ڕومانوڤیچ لەوێ نەبێت، چونکە دوێنێشەو لە ماڵەکەی خۆیدا چووم بۆ سەردانی، زۆر بێئەدەبانە و خراپ شکاندمی، بێجگە لەمانە، بەتایبەتی خۆم لەگەڵ ئێوەدا لەبارەی شتێکەوە قسەوباسێکی زۆرم هەیە، دەمەوێت لە بیروباوەڕی ئێوەیش ئاگادار بم، حەز دەکەم بەوپەڕی ڕێزیشەوە پێشەکی ئەوەتان پێڕابگەیەنم، کە لەگەڵ ئەم داواکارییەمدا، ئەگەر ڕووبەڕووی ڕادیون ڕومانوڤیچ ببمەوە، بەبێ سێودووکردن دەگەڕێمەوە دواوە، ئەوسایش هەرچی ڕوو بدات، گوناهەکەی لە ئەستۆی ئێوەیە. بۆیە ئەمەتان بۆ دەنووسم، چونکە ڕادیون ڕومانوڤیچ لە دیدەنیکردنەکەی مندا بۆ لای نەخۆش دیار بوو، کەچی دوای دوو سەعات لەپڕێکدا چاک بووەوە. بۆیە دەڵێم لەوانەیە هەر لە ماڵەکەی خۆی بێتە دەرێ، بێتە لای ئێوە. من بڕوای تەواوم بەمە هەیە، چونکە بە چاوی خۆم ئەوم لە ماڵی یەکێکدا بینی، کە بە سەرخۆشی کەوتبووە ژێر گالیسکەوە و هەموو گیانی شکاو و پاشان مردبوو. دوێنێشەو بە بیانووی ناشتنی تەرمی ئەو پیاوەوە بیست و پێنج ڕۆبڵی دایە کچەکەی، کچەکەی ناوبانگی خراپە و هەموو کەس دەیناسێت. لە کاتێکدا کە من دەزانم ئێوە بە چ دەردەسەرییەک ئەو پارەیەتان بۆ پەیدا کردووە. ئەو ڕەفتارەی زۆر سەرسامی کردم. ڕێزی تایبەتیم بۆ ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا هەیە، هیوادارم هەستی وەفاداری و ڕێز و دڵسۆزیی نۆکەری خۆتان قبووڵ بکەیت.

"لۆژین"

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا چاوی پڕ بوو لە گریان و وتی:

- دیمیتری پروکفیچ، ئێستا من چی بکەم؟ ئاخر، چۆن دەتوانم بە ڕودیا بڵێم نەیەت بۆ ئێرە؟ ئەو دوێنێ لەسەر ئەوە سوور بوو کە دەبێت پیتەر پتروڤیچ دەربکەم، ئێستا ئەمی تر دەخوازێت کە نابێت

ئەو ببینم. ئاخر ئەو کە بەمە بزانێت، هەر بەتایبەتی دێت و.. ئەوسا چی دەقەومێت؟
ڕازومیخین خێرا و لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە:
- ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا چ بڕیارێک دەدات، بە قسەی بکە.
- ئای خودا گیان! ئاڤدوتیا دەڵێت.. خوا خۆی دەزانێت چی دەڵێت و مەبەستەکەیشی ڕوون ناکاتەوە. دەڵێ وا چاکترە، واتا نەک وا چاکە، بەڵام لەبەر هۆیەک، حەتمەن پێویستە ڕودیا بەتایبەتی ئەمشەو سەعات هەشت بێت و دەبێت ئەو دووانە یەکتری ببینن.. وەلێ من دەمویست تەنانەت نامەکەیشی پیشان نەدەم، بەڵکو بە فڕوفێڵێک، یان بە هۆی تۆوە کارێکی وا بکەم، کە نەیەت.. لەبەر ئەوەی زۆر تووڕەیە.. بێ لەمانە من لەوە ناگەم کێ سەرخۆش بووە و مردووە و کچێکی هەبووە، چۆن ڕودیا دوافلسی خۆی داوەتە ئەو کچە.. ئەو پارەیەی..
ئاڤدوتیا ڕومانوفنا لەسەری ڕۆشت:
- ئەو پارەیەی بەو حاڵە دەستت کەوت، دایە گیان...
ڕازومیخین بە بیری پەرتەوە وتی:
- دوێنێ حاڵی باش نەبوو، ئەگەر دەزانن دوێنێ لە چایخانەدا چی کردووە، هەرچەندە شتێکی ئاقڵانە بوو.. هوم! لەبارەی ئەو کەسەی مردووە و کچەکەی لە ڕاستیا دوێنێ کە دەگەڕاینەوە ماڵێ، شتێکی بە من وت، بەڵام من هیچ لە قسەکانی تێنەگەیشتم.. هەڵبەت، من خۆیشم دوێنێ..
- دایە گیان لە هەمووی چاکتر ئەوەیە ئێمە خۆمان بچین بۆ لای، لەوێ بڕوات هەبێت، یەکسەر دەزانین دەبێت چی بکەین، هەرچەند درەنگیشە، خودایا! سەعات لە دە تێپەڕیووە!

ئەم ڕستەیەی دوایی دونیا لە کاتێکدا وت، کە تەماشای سەعاتە ئاڵتونییە زۆر قەشەنگەکەی کرد کە بە مینا ڕازابووەوە، سەعاتەکە بە زنجیرێکی ناسک و جوان کە کاری ڤینیسیا بوو، ئاوێزانی گەردنی بوو، بە هیچ جۆرێک لەگەڵ خشڵەکانی تریدا هاوسەنگ نەبوو.
ڕازومیخین لەگەڵ خۆیدا دوا: "دیاریی دەزگیرانەکەیەتی".
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە نیگەرانی و شپرزەییەوە وتی:
- ئاخ، بەڵێ کاتی ڕۆیشتنە، دونیا گیان، کاتی ڕۆیشتنە، ئەگینا وا هەست دەکات کە لە دوێشەوەوە ڕقمان هەستاوە، بۆیە نەچووین بۆ لای، ئای وای، خودایا!
بەدەم ئەم قسانەوە، بەپەلە کۆڵوانەکەی دا بە شانیا و کڵاوە بچووکەکەی لەسەر نا، دونیایش جلی لەبەر کرد، ڕازومیخین سەرنجی دا کە دەستکێشەکانی دونیا نەک هەر کۆنە، بەڵکو دڕاویشە، لەگەڵ ئەوەدا کە بە ئاشکرا جلەکانیان کۆن دیار بوو، وەلێ سیمایەکی بە ویقاری پێدابوون، ئەمە بۆ هەموو ئەوانە ڕاستە، کە دەزانن چۆن بەرگی هەژارانە بپۆشن. ڕازومیخین بە ڕێزێکی گەلێک زۆرەوە تەماشای دونیای دەکرد، شانازی بەوەوە دەکرد کە لەگەڵیا دەڕوات و بە خۆی دەوت: "ئەو شاژنەی[1] کە لە بەندیخانەدا گۆرەوییەکانی خۆی دەدوورییەوە، بێگومان لەو چرکەساتەدا شکۆمەندتر و لە شاژن مەزنتر دەینواند وەک جاران کە لە جەژن و ئاهەنگەکاندا دەبینرا".
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە دەنگی بەرز و پڕ لە سەرسامییەوە هاواری کرد:

---

[1] لێرەدا نووسەر مەبەستی لە ماری ئەنتوانێتە لە پەیکەرەکەدا.

- خودایا. ئایا هەرگیز ئەوەم بە بیردا دەهات کە لە بینینی کوڕەکەم، ڕودیای زۆر ئازیزم، ئاوا تووشی ترس و دڵەڕاوکێ بم!
پاشان تەماشایەکی پڕ لە سەرنجی ڕازومیخینی کرد و وتی:
- دیمیتری پروگفیچ، من دەترسم!
دونیا ماچی کرد و وتی:
- دایە گیان مەترسە، وا چاکترە بڕوات پێی هەبێت، من بڕوام پێیەتی.
ژنەی بێچارە هاواری کرد!
- خودایا، منیش بڕوام هەیە، بەڵام من بە درێژایی دوێنێشەو نەنوستووم.
هەرسێکیان گەیشتنە سەرشەقامەکە.
- دەزانیت دونێچکا، هەر ئەوەندەی سەر لە بەیانی کەمێک خەو بردمییەوە. لەپڕێکدا مارفا بتروڤنای خوالێخۆشبوو هاتە خەوم.. سەرتاپا سپیپۆش بوو.. لێم نزیک کەوتەوە، دەستی گرتم و سەری لێڕاوەشاندم، ئەوەندە بە جیدی ئەم کارەی کرد، دەتوت سەرزەنشتم دەکات.. ئایا خێرە؟ ئاخ، دیمیتری پروکفیچ، تۆ هێشتا نایزانیت، مارفا پتروڤنا مردووە.
- نەخێر، نایزانم، کام مارفا پتروڤنا؟
- لەپڕێکدا مرد، جا بزانە..
دونیا هاتە ناو قسەکانەوە و وتی:
- دوایی دایکە گیان، ئاخر ئەم هێشتا نازانێت مارفا پتروڤنا کێیە؟
- چۆن نازانێت؟ من وامدەزانی هەموو شتێک دەزانێت، بمبوورە دیمیتری پروکفیچ، ئەم ڕۆژانە من کەمێک ئەقڵم لەدەست داوە، بە ڕاستی من تۆم بە پەیامبەرێکی لای خوا دەزانی، بۆیە بە تەواوی بڕوام بەوە بوو کە تۆ هەموو شتێک دەزانیت، من تۆ بە یەکێک لە

خۆمان دادەنێم.. پێتان ناخۆش نەبێت کەوا دەڵێم، ئای ئای! ئەوە دەستی ڕاستت چییەتی، بریندار بووە؟

ڕازومیخین زۆر بە خۆشحاڵییەوە وتی:

- بەڵێ، برینداره.

- من هەندێکجار زۆر بە سۆزەوە قسە دەکەم، بە جۆرێک کە دونیا ئاگادارم دەکاتەوە.. وەلێ، ئەی خودایا، ئەو ژوورە بێکەڵکە چییە کە ئەو تیایدا دەژی! بڵێی ئێستا بەئاگا هاتبێت؟ ئەو ژنە، مەبەستم خاوەن خانووەکەیەتی، ئایا ئەوە بە ژوور دادەنێت؟ گوێ بگرە، تۆ دەڵێی ئەو حەز ناکات قسەی دڵی خۆی بە کەس بڵێت، ئەی باشە ئەوە دەبێت کە من بە.. سۆز و لاوازیی خۆمەوە بێتاقەتی بکەم؟ ئایا ڕێنماییەکم دەکەیت، دیمیتری پروکفیچ؟.. چۆنم لەگەڵیا؟ دەزانیت، من بە تەواویی ئەقڵم لەسەردا نەماوە.

- زۆر پرسیاری لێمەکە، بەتایبەتی کاتێک کە ڕوو گرژ دەکات، لەبارەی تەندروستیشییەوە زۆری لەسەر مەڕۆ، پێی خۆش نییە.

- ئاخ دیمیتری پروکفیچ، دایکایەتی چ بەڵایەکە! سەیری ئەو پلیکانانەیش بکە.. چ پلیکانەیەک!

دونیا کەوتە دڵدانەوەی دایکی و وتی:

- دایکە گیان، تۆ ڕەنگیشت پەڕیووە، هێور بە ئازیزم، بێگومان بە بینینی ئێمە دڵخۆش دەبێت.

پاشان بریقەیەک کەوتە ناوچاوی و لەسەری ڕۆشت:

- ئیتر تۆ بۆ ئەوەندە ئازاری خۆت دەدەیت!

- ڕاوەستە، با لە پێشا من تەماشایەک بکەم، بزانم لە خەو هەستاوە یان نا؟

خانمەکان هێدی هێدی کەوتنە دوای ڕازومیخین کە بە پلیکانەکاندا سەردەکەوت، کە لە قاتی چوارەمدا گەیشتنە بەرانبەر ماڵی خاوەن خانووەکە، بینیان دەرگای ماڵەکە درزێکی بچووکی تێکەوتووە، لە تاریکییەکەدا دوو چاوی ڕەش و زۆر تیژ تەماشایان دەکات، کە نیگاکان بەریەکتری کەوتن، دەرگاکە لەپڕا داخرا، دەنگێکی وای لێوە هات، لەوەدا بوو پولخێریا ئەلێکساندروڤنا لە ترسا بقیژێنێت.

## ٣

زوسیموف بە خۆشییەوە پێشوازیی لێکردن و بە دەنگی بەرز وتی:
- تەندروستیی باشە، باشە.
دە دەقیقەیەک دەبوو هاتبووە ئەوێ و لە سووچەکەی دوێنێشەودا، لەسەر قەنەفەکە دانیشتبوو، ڕاسکۆلنیکۆڤیش لە سووچێکی بەرانبەریدا دانیشتبوو، بە پێچەوانەی جارانەوە جلەکانی هەموو لەبەردا بوو، تەنانەت دەست و دەموچاوی باش شۆراو و قژی داهێنابوو. ژوورەکە لەپڕێکدا پڕ بوو، ناستاسیا هەرچۆنێک بوو بە دوای میوانەکاندا هاتە ژوورێ و گوێقوڵاغ بوو.
لە ڕاستیدا لەوە دەچوو باری تەندروستیی ڕاسکۆلنیکۆڤ باش بێت. بە تایبەتی لە چاو دوێنێشەودا، بەڵام زۆر ڕەنگی پەڕیوو خەیاڵبردە و ڕووتاڵ بوو. لە کەسێکی بریندار یان لە یەکێک دەچوو، کە ئازارێکی زۆر لە لەشیدا بێت، برۆی هاتبوونەوەیەک، لێوی لێکنراو و ڕوانینی بڵێسەداربوو، کەم و بەبێ مەیلی قسەی دەکرد، وەک بڵێی ئەرکێکی لەسەرە و دەبێت بەجێی بێنێت، جارجارە ئاسەواری دوودڵییەک لە ڕەفتاریدا دەردەکەوت، تەنیا پێویستی بەوە بوو کە دەستی یان

پەنجەی بە لەفاف بپێچێت، تا تەواو لەو کەسە بکات، کە یان پەنجەی مووی لێهاتووە یان دەستی زەبری بەرکەوتبێت یان ژانی تێگەڕابێت. لەگەڵ ئەمانە هەموویدا، تەنانەت ئەو ڕەنگپەڕیوویی و ڕوومۆنییەی، کاتێ کە دایک و خوشکی چوونە ژوورێ، دەتوت تیشکێک ڕوناکی کردەوە، وەلێ ئەمە بێجگە لە خەم و پەرێشانییەکەی حاڵەتی ڕەنج و ئازارێکی زۆری لێ زیاد کرد. ڕووناکییەکە زوو کوژایەوە، بەڵام ئازارەکە مایەوە، زوسیموفیش کە چاودێریی نەخۆشەکەی دەکرد و بە گەرمیی پزیشکێکی تازە کارەوە لە حاڵی دەڕوانی، بە سەرسوڕماوییەوە بینی کاتێک کەسوکاری نەخۆشەکەی هاتنە ژوورێ، لەباتیی خۆشی و شادیکردن، لە دەموچاوی نەخۆشەکەدا جۆرە سووربوونێکی نهێنی لەسەر بەرگەگرتنی ئازارێکی بێچارەسەر دەبینی، پاشان بینی تا ڕادەیەک هەر وشەیەکی گفتوگۆکە وەک تیرێک وابوو بەر یەکێک لە زامەکانی نەخۆشەکە بکەوێت و لە جاران زیاتر پەرێشانی بکات. هەروەها زوسیموف لەوەیش سەری سوورما، کە چۆن نەخۆشەکە خۆی دەگرێت و دەتوانێت هەستی ماخولیاکەی دوێنێی بشارێتەوە، کە بە بچووکترین وشە لە پێستی خۆی دەردەچوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ڕووخۆشیەوە دایک و خوشکی ماچ کرد و وتی:

- بەڵێ، خۆیشم هەست بەوە دەکەم کە چاکترم.

دەموچاوی پولخێریا ئەلێکساندروڤنا لە خۆشیا گەشایەوە، ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕووی لە ڕازومیخین کرد و بە خۆشییەوە دەستی گوشی، کەوتەوە قسەکردن:

- ئەوەی کە دوێنێ وتوومە، ئەمڕۆ نایڵێمەوە.

زوسیموف کە لە ماوەی دە دەقیقەی دانیشتنیدا لەگەڵ نەخۆشەکە، قسەی پێنەمابوو، لە هاتنی دیدەنیکەران زۆر دڵخۆش بوو، کەوتەوە وتن:

- من لە حاڵی ئێستای سەرسامم، سێ چوار ڕۆژی تر، ئەگەر هەر ئاوا بەرەو پێش بڕوات، بە تەواوەتی دەگەڕێتەوە سەر باری جارانی، واتا وەک مانگێک یان دوو مانگ یان ڕەنگە.. سێ مانگ لەمەوبەری لێدێتەوە، ئاخر، ئەم حاڵەتە لە ماوەیەکی زۆر لەمەوبەرەوە زەمینەی بۆ ڕەخساوە، ها؟

پاشان زوسیموف زەردەخەنەیەکی کرد، بە دوودڵیەوە وەک لەوە بترسێت نەوەکا نەخۆشەکە ناڕەحەت بکات، وتی:

- ئێستا دان بەوەدا دەنێیت کە ڕەنگە گوناهی خۆتی تیا بێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ساردییەوە وتی:

- زۆر ڕێی تێدەچێت.

زوسیموف کە قسەی لە دەمدا خۆش ببوو، لەسەری ڕۆشت:

- من لەو لایەنەوە ئەمە دەڵێم، کە چاکبوونی ئێستای تۆ لە پێش هەموو شتێکدا پەیوەندیی بە خۆتەوە هەیە، ئێستا کە دەتوانم لەگەڵتا بدوێم، حەز دەکەم قەناعەت بەوە بکەیت کە بۆ ئەوەی بە تەواویی چاک ببیتەوە، دەبێت ئەو هۆکارە سەرەتایی و سەرەکییانە ڕیشەکێش بکەین، کە بوون بە هۆی نەخۆشییەکەت، ئەگینا لەوانەیە حاڵتان بەرەو خراپتر بچێت، من ئەو هۆکارە سەرەتاییانە نازانم چین، وەلێ تۆ دەبێت بیانزانیت، تۆ پیاوێکی بەئاوەزیت و بێگومان ئاگاداری حاڵی خۆت بوویت. بەپێی بۆچوونی من سەرەتای تێکچوونی تۆ تا ڕادەیەک لەو کاتەوەیە، کە وازت لە زانکۆ هێنا. تۆ توانای بێکاریت نییە، بۆیە

هەم کار و هەم ئامانجێکی پتەوی سەقامگیر، بە ڕای من، یارمەتییەکی چاکت دەکەن.

- بەڵێ، بەڵێ، تۆ بە تەواویی لەسەر هەقیت.. من هەرچی زووتر دەگەڕێمەوە زانکۆ و ئەوسا هەموو شتێک.. بە شێوەی سروشتی خۆی بەڕێوە دەچێت.

زوسیموف کە مەبەستی لەو پەندە ئاقڵانانەی خۆی زیاتر سەرنجڕاکێشانی خانمەکان بوو، ئێستا کە وتەکەی گەیشتە کۆتایی، کەمێک شڵەژا و شپرزە بوو، کە تەماشای ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد، لە ڕوویدا حاڵەتێکی گاڵتەجاڕیی خوێندەوە، بیری کردەوە، بەڵام ئەوە زۆری نەخایاند، چونکە پولخێریا ئەلێکساندروڤنا خێرا سوپاسی زوسیموفی کرد، کە دوێنێشەو دیدەنیی لێکردوون.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە نیگەرانییەوە وتی:

- چۆن؟ دوێنێشەو هاتە لاتان؟ کەواتە ئێوەیش ماندووبوونی ڕێگە نەیهێشتوە دوێنێشەو بە چاکی بخەون؟

- ڕوودیا، هەموو ئەم کارانە تا سەعات دوو درێژەیان کێشا، من و دونیا لەماڵیشەوە لە پێش سەعات دوودا نانوین.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە لەپڕێکدا لۆچ کەوتە تەوێڵی و چاوی لە زەوی بڕی، وتی:

- بە ڕاستی نازانم چۆن سوپاسی بکەم، پارەیش وەرناگرێت.

پاشان ڕووی لە زوسیموف کرد و وتی:

- ببوورە ئەم باسەم کردەوە، من هیچ لەوە ناگەم چۆن و لەبەرچی منت بە شایانی ئەم هەموو چاکە و بایەخپێدانەی خۆت زانی، هیچ تێناگەم و.. تەنانەت بۆ من ناخۆشە، من بە ڕاشکاوی لەگەڵتا دەدوێم.

زوسیموف بەزۆر پێکەنینی لە خۆی هێنا و وتی:

- پێت ناخۆش نەبێت. وای دابنێ تۆ یەکەمین نەخۆشی منیت، ئێمەمانان کە تازە دەست بە چارەسەری نەخۆش دەکەین، یەکەم نەخۆشمان وەک منداڵی خۆمان خۆش دەوێت، هەندێکیان تا ڕادەیەک شەیدایان دەبن منیش تا ئێستا زۆر نەخۆشم نییە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ ئاماژەی بۆ ڕازومیخین کرد و وتی:
- دەربارەی ئەو هیچ ناڵێم، ئەویش بێجگە لە ڕەنج و ئازار هیچی تری لە من دەست نەکەوتوە.
ڕازومیخین دەنگی هەڵبڕی:
- درۆ دەکات! دیارە ئەمڕۆ گەلێک سۆزی جووڵاوە؟
ئەگەر ڕازومیخین کەمێک وردتر بووایە، دەیزانی مەسەلەکە هیچ جۆرە سۆزدارییەکی تیا نییە، بەڵکو لای نەخۆشەکە کارەکە تەواو بە پێچەوانەوە بوو، ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا هەستی بەمە کرد، زۆر بە وردی و دوودڵییەوە لە کاکی دەڕوانی.
ڕاسکۆلنیکۆڤ وەک ئەوەی لە بەیانییەوە وانەیەکی لەبەر کردبێت و بیەوێت بیڵێت، کەوتەوە دوای پەیڤەکانی خۆی:
- دەربارەی تۆ دایکە گیان، من ناوێرم بدوێم، ئەمڕۆ هەر بیرم لەوە کردەوە، کە دوێنێ تا چەند لێرە ئازارت لە چاوەڕوانکردنی مندا کێشاوە.
بەدەم ئەم قسانەوە ڕاسکۆلنیکۆڤ بە زەردەخەنەوە بێدەنگ دەستی بەرەو لای خوشکی درێژ کرد، وەلێ ئەمجارەیان زەردەخەنەکەی زۆر ڕاستگۆیانە بوو، دونیا ئەو دەستەی بۆی درێژ کرابوو، گرتی و بە گەرمی ڕایوەشاند، ئەمە یەکەمجار بوو کە ڕاسکۆلنیکۆڤ دوای گفتوگۆکەی دوێنێ ڕووی لە خوشکی کردبێت. دەموچاوی دایکیان، لە

بینینی ئەم ئاشتبوونەوە کۆکەی نێوان خوشک و برا، لە خۆشیاندا گەشایەوە.

ڕازومیخین کە هەموو شتێکی گەورە دەکرد، لەسەر کورسییەکە بە هێوری وەرچەرخا و وتی:

- من لەبەر ئەم جۆرە کارانە خۆشم دەوێت، دەستپێشخەرییە تایبەتییەکان بە خۆی.

دایکیشی لەگەڵ خۆیدا وتی: "چەندە کارەکانی جوانن! چ ڕەفتارێکی نەجیبانەی هەیە! چەند بە ئاسانی و دڵناسکییەوە هەموو بەدحاڵیبوونەکەی دوێنێشەوی لەگەڵ خوشکیدا نەهێشت.. تەنیا بە دەستدرێژکردنێک و لە چرکەساتێکدا و بە نیگایەکی خۆشەویستییەوە.. چاوەکانیشی چ جوانن، ئەسڵەن ڕووی هەموو جوانە.. تەنانەت لە دونیایش جوانترە.. بەڵام خودا گیان، ئەم چاکەت و پانتۆڵە چییە و چەندە خراپ لەبەری کردووە! لە دوکانی ئاڤاناسی ئیڤانۆڤیچ، ڤاسیای[1] خزمەتکار، لەم باشتر جل لەبەر دەکات.. ئاخ.. ئەگەر بمتوانیایە لە باوەشی بگرم و ماچی بکەم و.. بگریم، بەڵام دەترسم، دەترسم.. خودا گیان. بۆ وایە! هەرچەندە بە خۆشەویستییەوە دەدوێت، وەلێ من هەر دەترسم، ئاخر، لە چی دەترسم؟"

پاشان، لە پڕێکدا، وەک ئەوەی پەلەی وەڵامدانەوەی ئەوی بێت، وتی:

- ئاخ ڕودیا، تۆ باوەڕ ناکەیت چەندە من و دونیا دوێنێشەو.. چارەڕەش بووین! وا ئێستا هەموو شتێک کۆتایی هات و ئێمەیش چەندە بەختەوەرین، تۆ خۆت بیری لێبکەرەوە. نزیکەی لەو کاتەوە لە

---

[1] *vassia*

شەمەندەفەر دابەزین، تا ئێرە بە ڕاکردن هاتین بۆ ئەوەی لە ئامێزت بگرین، کەچی ئەو ژنە، ئەوە ئێستا لێرەیە! سلاو ناستاسیا، بەڵێ، کتوپڕ پێی وتین کە تۆ نەخۆشیت و تایەکی توندت لێهاتووە، کەچی بە دزیەوە، بەدەم وڕێنەکردنەوە لەدەست پزیشک هەڵاتوویت و کەوتویتەتە کۆلانان، ئەوانیش کەوتوونەتە دوات، تۆ باوەڕ ناکەیت ئێمە چیمان بەسەر هات! یەکسەر بیری مردنی کتوپڕی پوتانچیکوفی[1] ناسیاوی ئێمە و هاوڕێی باوکتم کەوتەوە. تۆ ئەوت لەبیر نییە، ڕودیا، ئەویش تای لێهاتبوو، هەر ئاوا لە ماڵ هەڵات و کەوتە بیرێکی حەوشەوە و ڕۆژی دوایی دەریانهێنایەوە. ئێمەیش لای خۆمانەوە شتەکەمان زۆر گەورە گرت و ویستمان بڕۆینە لای پیتەر پتروڤیچ بەڵکو کۆمەکێکمان پێبکات.. چونکە ئێمە کەسمان نەبوو، بە تەواوی بێکەس! دواڕستەکانی ئاوازی خەم و نالەنالیان لێدەتکا، بە تەواوی ئاگای لە خۆی نەمابوو، چونکە بیری کەوتەوە کە باسکردنی پیتەر پتروڤیچ هەرچەندە وای لێکدایەوە کە هەموو پێیان خۆش بێت، بەلام لەوە دەچوو هێشتا مەترسیدار بێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لەبەر خۆیەوە وەلامی دایەوە:

- بەڵێ، بەڵێ، هەڵبەتە هەموو ئەم ڕووداوانە، جێگای داخن..

بەلام سیمای هێند پەرێشان و مانای کەمبایەخیی دەگەیاند، کە دونیا بە سەرسامیەوە لێی ڕوانی.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەک بە وردی شتێکی بیر کەوتبێتەوە، بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی:

---

[1] *Potanchikof*

- دەمویست چی بڵێم، ها؟ بەڵێ، دایکە گیان، دونیا تۆیش، وا نەزانن ئەمڕۆ من نەمویستبێت یەکەمجار خۆم بێم بۆ لاتان و چاوەڕێی هاتنی ئێوە بووبم، کە یەکەمینجار بێن بۆ دیدەنیم.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە سەرسامییەوە وتی:

- ئەم قسانە چییە، ڕودیا؟

دونیا بیری کردەوە: "یەعنی چی، بڵێی وەک بەجێهێنانی ئەرکێک وەڵاممان بداتەوە؟ ئاشتکردنەوەکەی و پۆزشهێنانەکەی، وەک ئەوە وایە بێگارێکی کردبێت یان وانەیەک لەبەر بکات".

- منیش ئێستا لە خەو هەستام ویستم بێم بۆ لاتان، وەلێ جلەکانم دوایان خستم، دوێنێشەو لە بیرم نەبوو، بە ناستاسیا بڵێم، ئەم خوێنە بشوات. ئێستا، تازە دەرفەتم دەست کەوت کە جلەکانم لەبەر بکەم.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا نیگەران بوو.

- خوێن، کامە خوێن؟

- هیچ نییە.. نیگەران مەبە، دایە گیان، ئەم خوێنە لەوەوەیە، کە دوێنێشەو بەدەم وڕێنەکردنەوە پیاسەم دەکرد، پێم بەر پیاوێکی بریندار کەوت.. کارمەندێک بوو.

ڕازومیخین قسەکەی پێبڕی و وتی:

- بەدەم وڕێنەکردنەوە؟ بەڵام تۆ هەموو شتێکت لە بیرە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دڵنیاییەوە وتی:

- ڕاستە، وردودرشتی هەموو شتەکانم لە بیرە، وەلێ ئەگەر لێم بپرسیت بۆ وامکردو بۆ چووم بۆ ئەوێ و چیم وت، ئیتر ناتوانم هیچ ڕوون بکەمەوە.

زوسیموف هاتە ناو گفتوگۆکەوە:

- حاڵەتێکی زۆر ئاسایی و دیارە، هەندێکجار ئەو کارەی دەکرێت، زۆر وەستایانە و تەنانەت داهێنەرانەیە، بەڵام بنەما و هۆکارەکەی دەشێت پاک نەبێت و کاریگەری چەند نەخۆشییەکی جۆراوجۆری لەسەر بێت، وەک خەون.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری کردەوە: "ڕەنگە خراپ نەبێت ئەگەر تا ڕادەیەک بە شێتم بزانێت".
دونیا کە بە دوودڵییەوە لە زوسیموفی دەڕوانی، وتی:
- دەشێت کەسانی لەشساغیش ئەمانەی لێ ڕوو بدات؟
زوسیموف وەڵامی دایەوە:
- سەرنجێکی زۆر وردە. لەم لایەنەوە بە ڕاستی هەموو ئێمەیش زۆرجار لە شێت دەچین، تەنیا جیاوازییەک هەیە، کە "نەخۆشەکان" کەمێک لە ئێمە شێتترن. لەبەر ئەوە دیاریکردنی ئەو سنوورە کارێکی پێویستە، وەلێ مرۆڤی تەواو ساغڵەم و تەندروست، تا ڕادەیەک هەر بوونی نییە، لە هەر دە هەزار یان سەد هەزار کەس ڕەنگە تووشی یەکێکی وا ببین. ئەمەیش گریمانەیەکی تا بڵێی لاوازە..
لەگەڵ وشەی "شێت"دا کە زوسیموف بێترس و لێکدانەوە لە باسی بابەتێکدا کە خۆی عاشقیەتی و کتوپڕ بەسەر زمانیدا هات، هەموو دانیشتوان ناوچاویان بەیەکدا دا، ڕاسکۆلنیکۆڤ وەک ئەوەی دەربەست نەبێت، لە بیرکردنەوەیەکدا کە زەردەخەنەیەک بەسەر لێوە بێڕەنگەکانیەوە نەخشی بەستبوو، بێباکانە هەر بۆ خۆی دانیشتبوو.
ڕازومیخین بەپەلە لێی پرسی:
- باشە، ئەی بریندارەکە چی بەسەر هات؟ قسەکەم پێبڕیت.
ڕاسکۆلنیکۆڤ وەک ئەوەی بەئاگا هاتبێتەوە، وتی:

- چۆن؟ بەڵێ، کە ویستم یارمەتی بدەم و بیبەمەوە ماڵەکەیان، خوێناوی بووم.. بە ڕاستی دایکە گیان، دوێنێ کارێکم کردووە، لێخۆشبوونی نییە، لە ڕاستیا بێئەقڵ بووم. دوێنێشەو چی پارەت بۆ ناردبووم، هەموویم دایە ژنی ئەو پیاوە، بۆ ناشتنی تەرمەکەی.. بێوەژنێکی هەژاری سیلاوی، سێ منداڵی بچووکی هەیە، هەموویان برسین.. هیچ لە ماڵەکەیاندا نییە، دانی پێدا دەنێم کە هەق نەبوو ئەوە بکەم، بە تایبەتی کە خۆم دەزانم ئەو پارەیەتان چۆن دەست کەوتووە، ئاخر، بۆ ئەوەی یارمەتیی خەڵکی بدەیت، پێویستە سەرەتا هەقی ئەوەت هەبێت، ئەگینا..

بە فەڕەنسی وتی:

- ئەگینا، سەگینە، ئەگەر ڕازی نین، بۆ خۆتان بمرن.

کەوتە پێکەنین و بە ڕووسی وتی:

- دونیا، وا نییە؟

دونیا بە جەختەوە وتی:

- نەخێر، وا نییە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە نیگایەکی نەفرەتی و زەردەخەنەیەکی پڕ لە گاڵتەپێکردنەوە لەبەر خۆیەوە وتی:

- حەو! تۆیش کە.. مەبەستێکت هەیە، دەبوو بمزانیایە.. باشە، شایانی پیاهەڵگوتنە.. ڕەنگە ئەمیان باشتر بێت.. وەک ئەنجام، ئەگەر گەیشتیتە ئەو سنوورەی کە نەدەبوو بیبەزێنیت، بەدبەخت دەبیت، خۆ ئەگەر هەنگاوێک بەرەو ئەولاتر بنێیت، دەشێ بەدبەختتر بیت.. وەلێ تێکڕا هەموو ئەم شتانە قسەی بێجێن.

ڕاسکۆلنیکۆڤ دواڕستەی لەبەر ئەوەی گەرمی قسە ببوو، بە تووڕەیی وت، پاشان بە توندی و دەنگی پچڕپچڕەوە وتی:

- دایکە گیان، دەمویست بڵێم، داوای لێبوردنت لێدەکەم.
دایکی بە خۆشحاڵییەوە وتی:
- بەسە ڕودیا، من بڕوام وایە هەر کارێ تۆ بیکەیت، زۆر باشە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە زەردەخەنەیەکی خۆ کردەوە وتی:
- وایش نا، ئەمەندە خۆشباوەڕ مەبە.
بێدەنگیی هەموو لایەکی گرتەوە، لەم گفتوگۆ و بێدەنگی و ئاشتی و داوای لێبوردنەدا حاڵەتێکی دەستکرد هەبوو، کە هەموویان هەستیان پێدەکرد.
ڕاسکۆلنیکۆڤ کە لەژێرەوە سەیری خوشک و دایکی دەکرد، بە خۆی وت: "لەوە دەچێت لێم بترسن".
لە ڕاستیا پولخێریا ئەلێکساندروڤنا چەندە بێدەنگتر بووایە، ترسی زۆرتر دەبوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ دیسانەوە لای خۆیەوە کەوتەوە بیرکردنەوە: "وا ئەزانم کە لێرە نەبوون، بە ڕاستی خۆشم دەویستن".
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا لەپڕێکدا وتی:
- ڕودیا دەزانیت، مارفا پتروڤنا مرد!
- مارفا پتروڤنا کێیە؟
- هەی هەی! هەمان مارفا پتروڤنا سڤیدریگایلوڤ، لە بیرمە لەبارەی ئەوەوە زۆر شتم بۆ نووسیویت.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەپڕا داچڵەکی، وەک ئەوەی لە خەو خەبەری بووبێتەوە، وتی:
- ئا، بەڵێ، لە بیرمە.. کەواتە مرد؟ بەڕاست مرد؟ بۆ مرد؟
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا ئەم تاقیباتکردنەی پێ خۆش بوو، خێرا وەڵامی دایەوە:

- بیری لێبکەرەوە، زۆر کتوپڕ مرد، هەر لەو کاتەدا کە ئەم نامەیەم بۆ نووسیت، تەنانەت هەر هەمان ڕۆژیش. بیری لێبکەرەوە کە چۆن ئەو پیاوە ترسناکە بوو بە هۆی مردنی، دەڵێن زۆر خراپ لەو ژنە کڵۆڵەی داوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕووی لە خوشکی کرد و وتی:

- بۆ ژیانیان بەو جۆرە بوو؟

- نا، تەواو بە پێچەوانەوە، ئەو هەمیشە لەگەڵ ژنەکەیدا هێور و تەنانەت بە ئەدەبیش بوو. بۆ ماوەی حەوت ساڵ، لەڕادەبەدەر، لە هەندێک ڕەوشت و خووی ئەو بەرانبەر بە کۆمەڵێک شت چاوپۆشی دەکرد. کەچی لەپڕێکدا ئیتر خۆی پێنەگیرا.

- جا ئەگەر توانیبێتی حەوت ساڵی تەواو دان بە خۆیدا بگرێت، ئیتر ترسناکییەکەی لە چیدایە؟ تۆ دونیا گیان، پێدەچێت پاکانەی بۆ بکەیت؟

- نا، نا، پیاوێکی ترسناکە، لەو ترسناکتر چ پیاوێکی ترم بە خەیاڵدا نایەت.

دونیا تا ڕادەیەک ئەمەی بە گرژییەکەوە وت، پاشان برۆی هاوردەوە یەک و کەوتەوە بیرکردنەوە.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا خێرا بە دوای قسەکانی خۆی کەوتەوە:

- بەسەرهاتەکەیان سەرلەبەیانییەک ڕووی دا، دوای ئەوە مارفا پتروڤنا فەرمانی دا زوو گالیسکەکە ئامادە بکەن، بۆ ئەوەی یەکسەر دوای نانی بەیانی بڕوات بۆ شار، هەمیشە لە ڕووداوی وادا دەچوو بۆ شار، دەڵێن زۆر بە دڵی خۆی نانی بەیانیانی خواردوە.

- بەو لێدانەوە کە خواردبووی؟

- با ئەوەیش بڵێم کە هەمیشە.. ئەو عادەتەی هەبوو، هەر کەنانی بەیانیی دەخوارد، بۆ ئەوەی درەنگ نەکەوێت، ڕاست دەچوو بۆ حەمام.. دەزانیت، گوایا بەو حەمامە دەرمانی خۆی دەکرد، ئەوان لەوێ کانییەکیان هەیە ئاوەکەی ساردە، ئەو بەردەوام هەموو ڕۆژێک لەوێ خۆی دەشت.. هەر ئەوەندەی چووە کانییەکەوە، دڵی وەستا.

زوسیموف وتی:

- بێگومان وایە.

- مێردەکەی زۆر خراپ لێی دابوو؟

دونیا وەڵامی دایەوە:

- ئەمەیان مەسەلەیەک نییە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە پڕێکدا و بە تووڕەییەکی بێ زۆرلەخۆکردنەوە وتی:

- هم، وەلێ دایکە گیان، چۆن تاقەتت هەیە ئەم شتە تورەهاتانە دەگێڕیتەوە!

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا زوو وەڵامی دایەوە:

- ئەی چی بکەم کوڕم! نەمدەزانی لەبارەی چییەوە بدوێم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە زەردەخەنەیەکی خۆکردەوە وتی:

- بۆ ئێوە هەمووتان لێم دەترسن؟

دونیا بەبێ پەردە، لە کاتێکدا کە نیگایەکی خەستی لە کاکی کرد، وتی:

- ئەمە ڕاستە، دایکم کە پێی نایە سەر پلیکانەکان، لە ترسا وێنەی خاچی کێشا.

دەموچاوی ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ڕادەیەک گرژبوو، دەتوت دەماری بەگیر وەستاوە.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە شەرمەوە وتی:

- تۆ چی دەڵێیت دونیا! ڕودیا، تکات لێدەکەم بێتاقەت نەبیت.. دونیا بۆ وا دەڵێیت؟ ڕاستە ئەو کاتەی بۆ ئێرە دەهاتم، بە درێژایی ڕێگە و لە ناو شەمەنەفەردا، هەر خەیاڵم لەو خۆشییە دەکردەوە کاتێک کە یەکتر دەبینین، چۆن هەموو هەواڵەکان بۆ یەکدی دەگێڕینەوە.. ئەوەندەیش خۆشحاڵ بووم ئاگام لە ڕێگە نەمابوو، وەلێ ئەمە چییە کە دەیڵێم، ئێستایش هەر خۆشحاڵم.. دونیا، تۆ لە خۆتەوە قسە دەکەیت، ڕودیا تەنیا بینینی تۆ، بەسە بۆ ئەوەی من بەختەوەر بم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بەبێ ئەوەی تەماشای بکات، دەستی گوشی و بە ناخۆشییەوە لەسەرخۆ وتی: واز بێنە دایکە، دەرفەتی قسەکردنمان زۆر دەبێت.

دوای ئەم قسانە لەپڕا ڕاسکۆلنیکۆڤ تێک چوو، ڕەنگی پەڕی.. دیسانەوە هەستە ترسناکەکەی جاران، وەک سەرمای مەرگ بە گیانیا تێپەڕی.. دیسانەوە زۆری لا ڕوون و ئاشکرا بوو کە هەر ئێستا درۆیەکی زلی کرد، کە نەک تەنیا ئێستا، بەڵکو و ئیتر هەرگیز دەرفەتی ئەو گفتوگۆ درێژەیان نابێت، ئیدی هەرگیز، لەگەڵ هیچ کەسێکدا، لەبارەی هیچ شتێکەوە ناتوانێت قسە بکات، کاریگەریی ئەم بیرۆکە پڕ لە ئازارە هێندە بەهێز بوو، کە بۆ چرکەساتێک خۆی لە یاد کرد. لە جێگاکەی هەستاو بەبێ ئەوەی سەیری کەس بکات، بەرەو لای دەرگاکە چوو.

ڕازومیخین دەستی گرت و هاواری کرد:

- چی بووە، چیتە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ دووبارە دانیشتەوە و هێدی هێدی کەوتە تەماشاکردن، هەموو بە سەرسامییەوە لێیان ڕوانی، لەناکاوێکدا بە دەنگی بەرز وتی:

- نازانم، ئێوە هەمووتان بۆ ئەوەندە بێزارکەرن، شتێک بڵێن، ئاخر بۆ، هەر ئاوا دانیشتوون، باشە، بڵێن، قسە بکەن.. لە دەوری یەک کۆبووینەتەوە و هیچ ناڵێین، دەی شتێک بڵێن.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا خاچی کێشا و وتی:
- سوپاس بۆ خودا، وامزانی وەک دوێشەوی لێهاتۆتەوە.
ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا بێدەربەستانە وتی:
- ڕودیا، چیتە؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی دایەوە:
- هیچ نییە، یادی شتێکم کەوتەوە.
لەناکاودا دایە قاقای پێکەنین.
زوسیموف لەسەر قەنەفەکە هەستا و لەسەرخۆ وتی:
- باشە، ئەگەر شتێکت بیر کەوتۆتەوە خراپ نییە، ئەگینا من خۆیشم لەوەدا بووم.. ئیتر دەبێت من بڕۆم، ڕەنگە بێمەوە.. ئەگەر بینیم تۆ..
پاشان سڵاوی کرد و چووە دەرەوە، پولخێریا ئەلێکساندروڤنا وتی:
- چ مرۆڤێکی جوامێرە!
ڕاسکۆلنیکۆڤ لە پڕێکدا و بەپەلە و هێند بە گەرمی کە لەوەوبەر لێی ڕوو نەدابوو، وتی:
- بەڵێ، مرۆڤێکی جوامێر و مەزن و ئاقڵ و ڕوناکبیرە، لە بیرم نییە پێش نەخۆشکەوتنەکەم لە کوێ دیومە.. وەلێ وا دەزانم دیبێتم..
پاشان سەری بۆ لای ڕازومیخین وەرگێڕا و وتی:
- ئەمیش پیاوی چاکە.
دوایی یەکسەر بە خوشکی وت:
- دونیا، تۆ پێت باشە؟
هەر لە خۆیشیەوە دایە پێکەنین

دونیا وەڵامی دایەوە:
- زۆریش.
ڕازومیخین شڵەژا و دەموچاوی سوور داگەڕا، لەسەر کورسییەکەی هەستا و وتی:
- ئای کە زەلامێکی زۆربلێیت!
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا زەردەیەکی هاتێ، بەڵام ڕاسکۆلنیکۆڤ قاقای لێدا و وتی:
- ئەی تۆ بۆ کوێ دەچیت؟
- منیش دەڕۆم.. کارم هەیە.
- تۆ نابێت بڕۆیت، ڕاوەستە، زوسیموف ڕۆیشت، ئەبێ تۆیش بڕۆیت، مەڕۆ.. سەعات چەندە؟ دوانزە؟ دونیا سەعاتەکەت چەند جوانە! بۆ دیسانەوە بێدەنگ بوون؟ خۆ هەر من قسە دەکەم.
دونیا وەڵامی دایەوە:
- ئەمە دیاریی مارفا پتروڤنایە.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بۆی تەواو کرد:
- گەلێکیش گرانبەهایە.
- زۆریش گەورەیە، لە سەعاتی ژنان ناچێت.
دونیا وتی:
- من وام حەز لێیە.
ڕازومیخین لەگەڵ خۆیدا بیری کردەوە: "کەواتە دیاریی زاوا نییە" نەیشتدەزانی بۆ ئەمەندەی پێ خۆش بوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:
- من وامدەزانی دیاریی لۆژینە.
- نا، ئەو هێشتا هیچی بە دونێچکا نەداوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کتوپڕ بە دایکی وت:
- ئا.. بەڕاست دایکە لەبیرتە، کە عاشق بووم و ویستم ژن بێنم؟
دایک لە گۆڕینی قسە و ڕەوتی گفتوگۆی کوڕەکەی تەواو سەرسام بوو:
- ئاخ، بەڵێ لە بیرمە کوڕم.
لەگەڵ دونیا و ڕازومیخیندا نیگایەکی یەکیان کرد.
- ئای، چیتان بۆ باس بکەم؟ تەنانەت لە بیریشم ماوە، کچێکی دەردەدار بوو. بەدەم قسەکردنەوە کەوتە بیرکردنەوە و چاوی لە زەوی بڕی.
- کچێکی زۆر دەردەدار بوو، حەزی بە یارمەتیی سواڵکەر دەکرد و هەمیشە ئارەزووی لە چوونەدێر بوو، جارێکیش کە باسی ئەوێی بۆ کردم، فرمێسکی ڕشت، بەڵێ، بەڵێ، لە بیرمە، زۆر چاکم لە بیرە.. ناشیرینیش بوو.. بە ڕاستی نازانم بۆ ئەوەندە دڵم دابوویە.. ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێت، کە هەمیشە نەخۆش بوو.. خۆ ئەگەر شەل یان کۆم بووایە، بێگومان زیاتر خۆشم دەویست.. (زەردەخەنەیەکی ترسناک کەوتە سەر لێوی) بەڵێ.. ئەوە جۆرێک بوو لە هەرزەکاری.
دونیا بە پەرۆشەوە وتی:
- نا، ئەوە هەر هەرزەکاری نەبوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە مەبەستەوە چاوی لە خوشکی بڕی، وەلێ یان گوێی لە قسەکانی نەبوو یان تێی نەگەیشت. پاشان لە کاتێکدا کە خەیاڵی ڕۆیشتبوو، هەستا، لە دایکی نزیک کەوتەوە، ماچی کرد و گەڕایەوە شوێنەکەی و دانیشت.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا کە حاڵەتەکە کاری لێکردبوو، وتی:
- تۆ ئێستایش هەر خۆشت دەوێت؟

- ئەو؟ ئێستا؟ ها.. بەڵێ، تۆ باسی ئەو کچە دەکەیت! نا، هەموو ئەو شتانە لە دنیایەکی تردان.. سەردەمانێکی زۆر دوور.. نەک هەر ئەوە.. بەڵکو هەرچییەکیش کە لەم دەوروبەرەمدا ڕوو دەدات، دەڵێی هی سەردەمێکی ترە و پەیوەندیی بە ئێستاوە نییە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە وردی لێی ڕوانین:
- بە ئێوەیشەوە.. دەڵێی من لە دووری هەزار فرسەخەوە تەماشاتان دەکەم.. خوا خۆیشی دەزانێت کە بۆ ئەم باسەمان کردۆتەوە.
پاشان بە تووڕەییەوە وتی:
- ئەی سوودی پرسیارکردنتان چییە؟
ئینجا بێدەنگ بوو، دەستی بە کرۆشتنی نینۆکی کرد و دیسانەوە خەیاڵ بردییەوە.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا لەپڕا بێدەنگیە قورسەکەی شکاند و وتی:
- چ جێگایەکی خراپت هەیە ڕودیا، دەڵێی گۆڕە، من لەوە بێگومانم کە نیوەی خەمۆکییەکەت خەتای ئەمماڵەتە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە هەستێکی پەرتەوە وەڵامی دایەوە:
- ماڵ؟.. بەڵێ، ماڵ کاریگەریی زۆرە.. خۆیشم بیرم لێکردۆتەوە.. بەڵام ئەگەر دەزانیت ئێستا چ بیرۆکەیەکی سەیرت دەربڕی، دایە گیان..
بە دوا قسەکەی خۆی پێکەنینێکی نهێنیئامێزی کەوتە سەر لێو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستی کرد کە ئەم کۆبوونەوە و ئەم دایک و خوشکەی کە دوای سێ ساڵ یەکتریان دیوەتەوە، ئەم قسە خۆمانەییانەی کە چ بابەتێکی هاوبەشیان تیا نەبوو، بۆ ئەو بێزارکەرە و خۆی پێناگیرێت. وەلێ مەسەلەیەکی گەورە لە پێش بوو، کە دەبوو هیچ دوا نەکەوێت و هەر ئەمڕۆ بە لایەکدا بخرێت. ئەمە بڕیارێک بوو

پێشتر، ئەو کاتەی لە خەو بەئاگا هاتبووەوە، دابووی، ئێستا لە بوونی ئەم مەسەلەیە دڵخۆشە، وەک ڕێگەچارەیەکی دۆزیبێتەوە، ئینجا بە دەنگێکی وشک و جیدی دەستی پێکرد:

- گوێ بگرە دونیا، هەڵبەتە لەوەی دوێنێشەو ڕووی دا، من داوای لێبوردنت لێدەکەم، وەلێ بە ئەرکی خۆمی دەزانم جارێکی دی بیرت بهێنمەوە، کە من واز لە مەبەستە سەرەکییەکە ناهێنم. یان من یان لۆژین، لێگەڕێ با من بەدڕەگەز بم، بەڵام تۆ نا، یەکێکمان بەسە، ئەگەر تۆ مێرد بە لۆژین بکەیت، من ئیدی بە خوشکی خۆمت نازانم.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە توندی هاواری لێکرد:

- ڕودیا، ڕودیا، دیسانەوە گەڕایتەوە سەر قەوانەکەی دوێنێشەو، تۆ بۆ هەمیشە خۆت بە بەدڕەگەز دادەنێیت، من ئەمە قبووڵ ناکەم. دوێنێیش هەروا..

دونیا بە شێوازێکی وشک و یەکلایکەرەوە وەڵامی دایەوە:

- کاکە، دیارە هەڵەیەک لای تۆوە هەیە، من بە درێژایی شەوی ڕابردوو بیرم کردەوە و هەڵەکەتم دۆزیەوە، هەموو کێشەکە لەوەدایە کە گوایا تۆ وا دەزانیت من لەبەر خاتری کەسێک خۆم دەکەمە قوربانی. هەرگیز شتی وا نییە، من بۆ خۆم شوو دەکەم، چونکە ژیانم نالەبارە، بێگومان بەوەیش خۆشحاڵ دەبم ئەگەر بتوانم سوودێک بە کەسوکاریشم بگەیەنم، بەڵام ئەمەیان گرنگترین هۆکاری بڕیارەکەی من نییە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە لە ڕقا بەربووە کرۆشتنی نینۆکەکانی، بە خۆی دەوت:

"درۆ دەکات، لووتبەرزە، نایەوێت دان بە ڕاستیدا بنێت، کە حەزی بە چاکەکردنە، ئای لەم خووە پۆخڵە! خۆشەویستیشیان لە نەفرەت دەچێت.. ئاخ، من چەندە بێزم لە هەموویان دێتەوە!"
دونیا لەسەری ڕۆشت:
- بە کورتی: من بۆیە شوو بە پیتەر پتروڤیچ دەکەم، تا لە دوو شەڕ ئاسانترینیان هەڵبژێرم، بڕیارم داوە ئابڕومەندانە ئەو هەرچیم داوا لێبکات، ئەنجامی بدەم و درۆی لەگەڵدا نەکەم.. بەڵام تۆ ئەو زەردەخەنە تەوساوییە چی بوو کردت؟
دونیا پەشۆکا و تووڕەیی لە ناوچاویا دەرکەوت.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە توانجەوە پێی وت:
- هەموو ئەوانەی بۆ ئەنجام دەدەیت؟
- ئەوەندەی بتوانم، من لە شێواز و هاتنەپێشەوەی پیتەر پتروڤیچدا زوو لەوە گەیشتم کە ئەو چی لە من دەوێت، هەڵبەتە، ئەو لە خۆی ڕازییە، ڕەنگە زۆریش خۆی بە گەورە بزانێت، وەلێ هیوادارم ڕێزی منیش بگرێت.. بۆ دیسان پێدەکەنیت؟
- ئەی تۆ بۆ دیسان سوور داگەڕایت؟ خوشکێ، تۆ درۆ دەکەیت و بە ئارەزوویش درۆ دەکەیت، تەنیا لەبەر سەرسەختی ژنانەیی خۆت، هەر لەبەر ئەوەی قسەکەی من سەرنەگرێت.. تۆ هەرگیز نابێت ڕێز لە لۆژین بگریت، من ئەوم بینی و قسەم لەگەڵدا کرد، کەواتە تۆ بۆ پارە خۆت دەفرۆشیت، بۆیە کارێکی زۆر ڕسواییە، زۆریش بەوە خۆشحاڵم کە تۆ لایەنی کەم لە شەرماندا سوور دادەگەڕێیت.
دونیا کە ئیدی خۆی پێنەگیرا، هاواری کرد:
- نا، وا نییە، درۆیش ناکەم، ئەگەر بە تەواویی بڕوام بەوە نەبێت کە دەربەستمە و ڕێزم لێدەگرێت، هەرگیز نابم بە ژنی.. خۆ ئەگەر

لەوەیش دڵنیا نەبم کە دەتوانم ڕێزی لێبگرم، هەر نابم بە ژنی، خۆشبەختانە دەتوانم هەر ئێستا بڕیاری تەواو بنەبڕی خۆم لەسەر ئەم شووکردنە بدەم، وەک تۆیش دەیڵێیت، کارێکی ڕسوایی نییە، باشە، با بڵێین من بڕیارێکی بێئابڕومەندانەم داوە و تۆ ڕاست دەکەیت، ئەی ئەمە ناهەقی نییە، کە تۆ بەم جۆرە لەگەڵمدا دەدوێیت؟ تۆ بۆ داوای ئازایەتییەک لە من دەکەیت، کە دەشێت لە خۆیشتا نەبێت؟ ئەمە زوڵم و ستەمە، ئەگەر من یەکێک بەدبەخت بکەم، ئەو کەسە تەنیا خۆمم، من هێشتا کەسم نەکوشتووە! بۆ لێم مۆڕ دەبیتەوە؟ بۆ وا ڕەنگت پەڕیووە؟ ڕودیا، چیتە؟ ڕودیا، ئازیزەکەم.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا هاواری کرد:

- خودا گیان، وات لێکرد لە هۆش خۆی بچێت.

- نا، نا.. هیچ نییە، تۆزێ سەرم گێژی خوارد، لەسەرخۆچوون نییە.. تۆیش واز لەم لەسەرخۆچوونە ناهێنیت! هوم! بەڵێ، دەمویست بڵێم چی؟ بەڵێ، کەواتە تۆ لە ئێستاوە، لە ئەمڕۆوە، بڕیاری تەواوت بەوە هەیە، کە دەتوانیت ڕێزی بگریت یان نا.. یان ئەو قەدرزانی لە تۆ بکات یان نا.. وات وت، نا؟ من وا تێگەیشتم کە تۆ وتت هەر ئەمڕۆ؟ یان من خراپ تێگەیشتم؟

دونیا وتی:

- دایکە گیان، نامەکەی پیتەر پتروڤیچ پیشانی کاکم بدە.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بەدەستلەرزینەوە نامەکەی بۆ ڕاگرت، ڕاسکۆلنیکۆڤ بە بایەخێکی زۆرەوە لێی وەرگرت، بەڵام پێش ئەوەی بیکاتەوە، زۆر بە سەرسامییەوە لە دونیای ڕوانی، وەک لەپڕێکدا بیرۆکەیەکی تازەی بۆ هاتبێت. لەسەرخۆ وتی:

- سەیرە، ئاخر من چیم لەم سەرئێشەیەداوە؟ ئەم هەراوزەنایە لە پای چی؟ کێت پێ چاکە شووی پێبکە.
بە ڕواڵەت لەگەڵ خۆیدا دەدوا، بەڵام وشەکانی بە دەنگی بەرز وتن و ماوەیەکیش لە خوشکی ڕاما، وەک بیەوێت چارەسەری کێشەیەک بکات. پاشان هەر بەو باری سەرسامییەوە نامەکەی کردەوە، هێدی هێدی و بە وردی کەوتە خوێندنەوەی، دووجار خوێندیەوە. پولخێریا ئەلێکساندروڤنا زۆر دوودڵ بوو، وەک ئەوەی هەموو لە چاوەڕوانیی شتێکی تازەدا بن.
دوای ماوەیەک ڕامان، ڕاسکۆلنیکۆڤ بەبێ ئەوەی ڕوو لە کەس بکات، نامەکەی دایەوە دایکی و وتی:
- پێم سەیرە، ئاخر ئەو بە دوای کاری گرنگەوەیە، پارێزەرە و تەنانەت شێوازی قسەکردنیشی بە لافوگەزافە، کەچی وەک نەخوێندەوار شت دەنووسێت.
هەموو داچڵەکین، هیچ چاوەڕێی شتی وانەبوون.
ڕازومیخین زوو هەڵیدایە:
- ئەوان هەموویان هەر ئاوا دەنووسن.
- بۆ تۆ خوێندوتەتەوە؟
- بەڵێ.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە شڵەژاوییەوە!
- ئێمە پیشانمان دا، ڕودیا، ئێمە پێشتر ڕاوێژمان پێکرد.
ڕازومیخین قسەکانی بە پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بڕی و وتی:
- ئەمە شێوازی مافناسانە، لە دادگاکاندا وا دەنووسرێت.

- نووسینی مافناسان! ڕاستە، ئەمە بە ڕاستی شێوازی نووسینی دادگا و ئیدارەیە. نە ئەوەندە نەخوێندەوارانە و نە ئەوەندەیش زۆر ئەدەبی بێت، هەمان شێوازی ئیداری.

ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا وەک کەمێک لە قسەکەی کاکی زویر بووبێت، وتی:

- پیتەر پیتروڤیچ ئەوە ناشارێتەوە کە لە کاتی خوێندنیدا بێپارەوپوول بووە، تەنانەت شانازی بەوەوە دەکات کە خۆی خۆی پێگەیاندووە.

- باشە، هەقیەتی شانازی بە خۆیەوە بکات، من لێی ناگرم، خوشکێ تۆ لەوە زویر بوویت کە من لە هەموو نامەکەدا ڕەخنەم لە شێوازی نووسینەکە گرت، وا تێدەگەیت من بۆیە بەتایبەتی لەبارەی ئەو شتە سووکانەوە قسە دەکەم، کە بەرانبەر بە تۆ ڕقی خۆم خاڵی بکەمەوە. نا، بە پێچەوانەوە، لەبارەی شێوازەوە شتێکم بیر کەوتەوە، کە وتنی لێرەدا بێجێ نییە، لەم نامەیەدا زاراوەیەک هەیە: ".. هەرچی ڕوو بدات گوناهەکەی لە ئەستۆی ئێوەدایە" ئەمە زۆر ئاشکرایە و هەڕەشەیشە بەوەی کە ئەگەر من بێم بۆ لاتان و ئەو بڕواتە دەرەوە، ئەم هەڕەشەی ڕۆیشتنە، ڕاست وەک ئەوە وایە کە ئێوە، ئەگەر مل نەدەن، ئەو وازتان لێدێنێت ئەگەرچی هەر خۆیشی هێناونی بۆ پتروزبورگ، کەواتە تۆ ڕات چییە؟ ئایا ئەم وشانەی لۆژین هەر بەو ڕادەیە زویریان دەکردیت، ئەگەر بۆ نموونە ئەو (ئاماژە بۆ ڕازومیخین دەکات) یان زوسیموف یان یەکێک لە ئێمە بماننووسیایە؟

دونیا بە خاترجەمی وتی:

- نا، من لەوە گەیشتم کە ئەم شێوازە زۆر منداڵانەیە و دەشێت ئەو لە نووسیندا وریا نەبێت.. تۆ لەمەیاندا ڕاست دەکەیت، کاکە، تەنانەت من چاوەڕێی ئەوە نەبووم..

- بەڵێ ئەمە شێوازی دادگایە، بەو شێوازەیش ناتوانیت بە جۆرێکی تری بنووسیت، بۆیە دەشێت لەوە زبرتر بێت، کە ئەو خۆی ویستویەتی، وەلێ من دەمەوێت کەمێک تۆ غەمگین بکەم: لەم نامەیەدا دەربڕینێکی تر هەیە کە بوختانە بە هەقی من و کەمێک سووکە. من دوێنێ پارەم بەخشییە بێوەژنێکی دەردەداری کۆستکەوتوو، نەک بە بیانووی ناشتنی تەرمەکە، بەڵکو بە ڕاستی بۆ ناشتنی تەرمەکە بوو، نەیشمدا بە کچەکەیان یان بە قسەی ئەو، کچە ناوبانگ خراپەکەیان (کە لە هەموو تەمەنیدا دوێنێشەو بۆ یەکەمجار دیویەتی) بەڵکو دامە دەست خودی بێوەژنەکە. لە هەموو ئەم قسانەدا ئەو زۆر ئارەزووی ئەوەی هەیە من سووک بکات و نێوانمان تێک بدات. هەر بەو شێوازی دادگاییە، واتا بە شێوەیەک کە ئامانجەکەی بە چاکی دیارە.. پەلەیەکی منداڵانەی پێوەیە، کە ساکاریی ئەو دەردەخات. لۆژین پیاوێکی ئاقڵە، بەڵام بۆ ئەوەی کاری ئاقڵانە بکەیت، تەنیا ئەوە بەس نییە کە ئاقڵ بیت، هەموو ئەم شتانە ڕووی ڕاستەقینەی مرۆ دەردەخەن.. بڕوا ناکەم زۆر قەدرزانی لە تۆ بکات، من ئەمە تەنیا وەک ئامۆژگاری بە تۆ دەڵێم، ئەگینا لە ناخی دڵمەوە هیوای بەختەوەریت بۆ دەخوازم..

دونیا وەڵامی نەداوە، ئەو زوو بڕیاری خۆی دابوو، تەنیا چاوەڕێی شەو بوو.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا کە تۆنی دەنگی کوڕەکەی زۆر دوودڵی کردبوو، پرسی:

- کەواتە تۆ چ بڕیارێک دەدەیت ڕودیا؟

- یەعنی چی، چ بڕیارێک دەدەم؟

- باشە، دەربارەی ئەوەی کە پیتەر پیتروڤیچ نووسیویەتی کە شەو نابێت لای ئێمە بیت ئەگینا ئەو دەڕوات.. ئەگەر تۆ بێیت، کەواتە تۆ.. دێیت؟

- بێگومان ئەو بڕیارە بە دەست من نییە، بەڵکو بە پلەی یەکەم لای ئێوەیە، ئەگەر داواکەی پیتەر پیتروڤیچ ئێوە ناڕەنجێنێ، دووەمیش بڕیارەکە لای دونیایە، ئەگەر ئەویش زویر نابێت.

بە ئاوازێکی وشکەوە لەسەری ڕۆشت:

- منیش کارێک دەکەم کە بە لای ئێوەوە باش بێت.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا خێرا وتی:

- دونێچکا بڕیاری خۆی داوە و منیش تەواو لەگەڵێدام.

دونیا وتی:

- من بڕیارم داوە ڕودیا، داوات لێدەکەم، زۆریش ئەم داوایە دەکەم، کە دەبێت لەو دانیشتنەدا ئامادە بیت، دێیت؟

- دێم.

پاشان دونیا ڕوی لە ڕازومیخین کرد و وتی:

- داوا لە تۆیش دەکەم کە سەعات هەشت لە ماڵی ئێمە بیت، دایکە گیان ئەمیش داوەت دەکەم.

- زۆر چاکە، دونیا گیان، باشە، هەر بڕیارێکت داوە، باوا بێت، بۆ منیش خۆشترە، من لە خۆنواندن و درۆ خۆشیم نایەت، وا چاکترە هەموو هەقیقەتەکان بڵێین، ئیتر پیتەر پیتروڤیچ زویر دەبێت یان نابێت، ئارەزووی خۆیەتی.

## ٤

لەم کاتەدا دەرگاکە لەسەرخۆ کرایەوە، کچێک کە بە ترس و دوودڵییەوە تەماشای ئەملاوئەولای دەکرد، هاتە ژوورێ، هەموویان بە سەرسامی و ڕامانەوە کەوتنە تەماشاکردنی، کچەکە سۆنیا سمیۆنۆڤنا مارمیلادۆڤا بوو، دوێنێشەو ڕاسکۆلنیکۆڤ بۆ یەکەمجار دیبووی، بەڵام شێوازی جلوبەرگ و ئەو حاڵەتە تایبەتییەی کە لەو کاتەدا هەیبوو، ببووە هۆی ئەوەی کە وێنەیەکی تری جیا لەمەی ئێستا لە یادەوەریی ڕاسکۆلنیکۆڤدا نەخش ببەستێت. ئێستا کچێکی ئاغر، جلێکی هەژارانە لەبەردا و هەر لە کیژۆڵەیەکی دەکرد. ڕەفتاری نەجیبانە و شایستە، دەموچاوێکی ڕووناک و کەمێک ترساو دەینواند، بەرگێکی زۆر سادە لەوانەی کە هەموو ڕۆژێک لەبەر دەکرێن، کڵاوێکی چکۆلانەی شێوازی کۆنی لەسەردا بوو، بەڵام وەک دوێنێ چەتری بەدەستەوە بوو، هەر ئەوەندەی بە پێچەوانەی ئەوەوە کە چاوەڕێی دەکرد، ژوورە ئاپۆرەکەی بینی، نەک تەنیا شڵەژا، بەڵکو هەر خۆی لەدەست دا. وەک منالێکی ترساو ویستی بگەڕێتەوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە سەرسامییەکی زۆرەوە وتی:

– ئاە.. ئەمە تۆیت؟

لەپڕا خۆیشی تەریق بووەوە. یەکسەر زانی کە دایک و خوشکی لە نامەکەی لۆژینەوە کە باسی کچێکی کردبوو لە حاڵەتێکی تایبەتی و بێئابڕوویدا، ئەمان ئەو کچە باش دەناسن. هەروەها ئەم هەر ئێستا لە دژی بوختانەکەی لۆژین نارەزایی دەربڕیووە و وتوویەتی کە ئەو کچەی تەنیا ئەو جارە بینیووە و کەچی وا ئێستا لەپڕا خۆی بە ژووردا دەکات. هەروەها ئەوەی بە بیر خۆی هێنایەوە، کە بە هیچ شێوەیەک بەرانبەر بە نووسینەکەی لۆژین کە وتبووی: "کچەکە

ناوبانگی بە خراپ دەرچووە" ئەم نارەزایی دەرنەبڕیبوو، هەموو ئەمانە لەپڕێکدا و بە شێوەیەکی ئاڵۆز بە مێشکیدا گوزەریان کرد، وەلێ کە چاکتر لێی ورد بووەوە، بینی ئەو کچە هێند کلۆڵ و داماوە و ئەوەندە زەبوونە، کە زۆر دڵی پێی سووتا، کە کچەکە ویستی هەڵێت، دڵی ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تەواویی قوڵپی دا، بۆیە بەپەلە و بە نیگایەک کە کچەکەی ڕاگرت، وتی:

- من هیچ چاوەڕێی تۆ نەبووم، فەرموو دابنیشە، بێگومان تۆ لای کاترینا ئیڤانۆڤناوە هاتوویت، ببوورە، لەوێ نا، لێرە، لێرەدا دابنیشە.

لە کاتی هاتنە ژوورەوەی سۆنیادا، ڕازومیخین کە لەسەر یەکێک لە کورسییەکانی ڕاسکۆلنیکۆڤ لەبەر دەرگاکە دانیشتبوو، بۆ ئەوەی ڕێگە لە کچەکە نەگرێت هەستا، لە پێشا ڕاسکۆلنیکۆڤ ویستی گۆشەیەکی قەنەفەکە، یەعنی جێگاکەی زوسیموفی پیشان بدات، بەڵام کە بیری کەوتەوە ئەم قەنەفەیە جێگایەکی زۆر خۆمانە و لە شوێنی خەفگەیشیەتی، خێرا ئاماژەی بۆ کورسییەکەی ڕازومیخین کرد، هەر لەسەر هەمان قەنەفە کە زوسیموفی لەسەر دانیشتبوو، ئاماژەی دایە ڕازومیخین و وتی:

- تۆیش لێرە دابنیشە.

سۆنیا کە تا ڕادەیەک لە ترسا دەلەرزی، دانیشت و بە شەرمەوە تەماشای هەردوو خانمەکەی کرد، دیار بوو کە خۆیشی لەوە نەدەگەیشت چۆن دەبێت لە پاڵ ئەواندا دابنیشێت، کە ئەمەی بە بیردا هات، ئەوەندە ترسا لەپڕێکدا هەستا و بە نارەحەتییەکی زۆر و زمانی گیرەوە ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و وتی:

- من.. من تەنیا بۆ دەقیقەیەک هاتووم، داوای لێبووردنت لێدەکەم کە زەحمەتم دایت، من لەلای کاترینا ئیڤانۆڤناوە هاتووم، چونکە کەسی

تری نەبوو بینێریتە لاتان.. کاترینا ئیڤانۆڤنا فەرمووی، تکاتان لێبکەم کە سبەی بەیانی، بۆ ڕێوڕەسمی ناشتنی باوکم، کاتی نوێژ بێن بۆ گۆڕستانی "میتروفانوسکی" دوای ئەوەیش بۆ ماڵی خۆمان، واتا بۆ نانی نیوەڕۆ لە ماڵی ئەو بیت و ئەو شەرەفەی پێ ڕەوا ببینیت، فەرمووی تکاتان لێبکەم..

سۆنیا زمانی گرتی و بێدەنگ بوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤیش کەمێک هەستا و ئەویش بە زمانی گیر و ڕستەی ناتەواوەوە وتی:

- حەتمەن هەوڵ دەدەم بێم.. حەتمەن.

لەپڕێکدا وتی:

- فەرموو دابنیشە، دەبێت من لەگەڵتا قسە بکەم، تکایە، ڕەنگە تۆ پەلەت بێت، تکایە دوو دەقیقەم لە کاتی خۆت بدەرێ.

بەدەم وتەکانییەوە کورسییەکەی لێ نزیک خستەوە و فەرمووی لێکرد، سۆنیا دیسان دانیشتەوە، سەرلەنوێ بە شپرزەیی و خەجاڵەتییەوە تەماشای دوو خانمەکەی کردەوە، لەپڕێکدا هەردوو چاوی لە زەوییەکە بڕییەوە.

دەموچاوە ڕەنگ پەڕیووەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ سوور داگەڕا، وەک ئەوەی تەواوی بوونی سەروبن بووبێت، چاوانی بوونە پشکۆ، پاشان بە دەنگێکی کۆک و پتەوەوە وتی:

- دایکە گیان، ئەمە خاتوو سۆنیا سمیۆنۆڤنا مارمیلادۆڤایە، کچی هەمان مارمیلادۆڤای بەدبەخت، کە دوێنێشەو هەر لە بەردەمی مندا ئەسپەکان وردوخاشیان کرد، من لە بارەیەوە قسەم بۆ کردوون..

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا نیگایەکی سۆنیای کرد و کەمێک چاوی تروکاند، لەگەڵ هەموو ناخۆشییەکانی خۆیدا بەرانبەر بە نیگا سەخت

و سەرکەشەکانی ڕودیای کوڕی، بە هیچ جۆرێک نەیتوانی دەستبەرداری ئەو تاموچێژە ببێت. دونیایش زۆر بە وردی لە دەموچاوی کچە داماوەکە ڕاما، بە سەرسامییەوە پیایدا هەڵیڕوانی. سۆنیا کە گوێی لە پێناسەکەی خۆی بوو، بەرانبەریان چاوی هەڵبڕی، بەڵام زیاتر شپرزە بوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بەپەلە پێی وت:

- من ویستم لێت بپرسم، کاری ئەمڕۆتان چۆن تێپەڕاند؟ ئایا نارەحەتیان نەکردن، با بڵێین لە لایەن پۆلیسەوە؟

- نەخێر، هەموو شتێک ئاسان تێپەڕی، ئاخر، ئیتر ئەوە دیارە کە هۆی مردنەکە چی بووە، نارەحەتیان نەکردین، وەلێ کرێگرتەکان تووڕەن.

- لە چی؟

- لەسەر ئەوەی تەرمەکە زۆر ماوەتەوە، ئاخر، ئێستا گەرمە و بۆنیش.. بۆیە ئەمڕۆ لە نوێژی ئێوارەدا دەیبەن بۆ گۆڕستان و سبەینێ بۆ کەنیسەیەکی بچووک. کاترینا ئیڤانۆڤنا لە پێشا قایل نەبوو، بەڵام ئێستا خۆیشی دەزانێت کە ئەوە نابێت.

- کەواتە ئەمڕۆ؟

- ئەو تکای کرد کە گەورەمان بکەیت و سبەینێ کاتی نوێژ بێیت بۆ کەنیسە، لەوێوە بۆ ئەنجامدانی داوەت و ڕێوڕەسمی یادکردنەوەکە تەشریف بهێنیتەماڵەوە.

- بۆ ئەوان داوەت بۆ یادکردنەوەکە دەکەن؟

- بەڵێ، هەر ئاوا خواردنێکی سادە، ئەو فەرمووی کە زۆر سوپاس لە تۆ بکەم بۆ ئەو کۆمەکەی دوێنێ.. بەبێ تۆ نەماندەتوانی تەرمەکە بە خاک بسپێرین.

لەپڕێکدا هەر بەدەم قسەکردنەوە لێو و چەناگەی کەوتە لەرزین، وەلێ هێزی دایە خۆی و بەسەر خۆیدا زاڵ بوو، پاشان دیسانەوە چاوی لە زەوییەکە بڕیەوە.

لە کاتی گفتوگۆکەدا ڕاسکۆلنیکۆڤ بە وردی لێی ڕامابوو، دەموچاوی لاواز، زۆر لاواز، بچووک و ڕەنگ هەڵبزڕکاو، خەتی دەموچاوی نارێک و لووت و چەناگەی باریک و تیژ بوون، نەدەبوو ناوی جوانی لێبنێت. بەڵام بەرانبەر بەوە چاوە شینەکانی ئەمەندە ڕوون و بێگەرد بوون، کە شەیدایان دەکردیت، ڕوویەکی هێند میهرەبان و سادە، کە بە دەست خۆت نەبوو ڕایاندەکێشایت. لە سیما و تەواوی پەیکەرەکەیدا تایبەتمەندییەکی تریش هەبوو، لەگەڵ ئەوەدا کە تەمەنی هەژدە ساڵ بوو، بەڵام زیاتر لە کچۆڵەیەکی دەکرد، زۆر لە تەمەنی خۆی بچووکتر و تا ڕادەیەک لە منداڵ دەچوو. ئەمە هەندێکجار لە جووڵە و بزاوتەکانیدا دەردەکەوت و مرۆڤی دەهێنایە پێکەنین.

ڕاسکۆلنیکۆڤ جەختی لەسەر قسەکان کرد و پرسی:

- چۆن دەبێت کاترینا ئیڤانۆڤنا بەو برە پارە کەمە کارەکانی تەواو کردبێت و بیری لە خواردنیش کردبێتەوە؟

- ئاخر، تابووتەکە سادەیە.. هەموو شتەکانی تریش هەر سادەن، بۆیە شتی گرانی تێنەکەوت.. ئێمە لەگەڵ کاترینا ئیڤانۆڤنا حسابی هەموو شتێکمان کرد، بە جۆرێک کە کەمێکیش بۆ داوەتییەکە مایەوە.. کاترینا ئیڤانۆڤنا زۆری مەبەستە ئەو داوەتە بکرێت.. ئاخر نابێت.. ئەو حەزی لێدەکات، ئەو.. خۆتان دەیزانن.

- تێدەگەم، تێدەگەم.. هەڵبەتە.. تۆ بۆ ژوورەکەم سەروبن دەکەیت؟ دایکیشم دەڵێت ئەم ژوورە لە تابووت دەچێت.

سۆنیا بە دەنگێکی تۆکمە و هێورەوە وەڵامی دایەوە:

- تۆ دوێنێشەو هەرچی پارەت پێبوو، دات بە ئێمە.
ئەمەی وت و زوو چاوی لە زەوییەکە بڕی، لێو و چەناگەی دیسانەوە کەوتنەوە لەرزین، ماوەیەک بوو لەو باری هەژارییەی ڕاسکۆلنیکۆڤ سەری سووڕمابوو، وا ئێستا ئەم قسانە لە خۆیانەوە لە دەمی دەرپەڕین.
بێدەنگی هەموو لایەکی گرتەوە، چاوی دونیا ڕووناکتر و پولخێریا ئەلێکساندرۆڤنایش بە خۆشەویستییەوە لە سۆنیای ڕوانی، پاشان لە کاتی هەستانیا وتی:
- ڕودیا، هەڵبەتە ئێمە پێکەوە نانی نیوەڕۆ دەخۆین، دونیا گیان، وەرە با بڕۆین، تۆیش ڕودیا، خۆزگا دەچویتە دەرێ و کەمێک دەگەڕایت و دەحەسایتەوە، دەنووستیت و ئەوسا زوو دەهاتی.. ئێمە تۆمان ماندوو کرد، دەترسم..
ڕاسکۆلنیکۆڤ بەدەم هەستانەوە خێرا وتی:
- بەڵێ، بەڵێ، دێم، بەڵام بە ڕاستی، من کارێکم هەیە.
ڕازومیخین تەماشای ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد و هاواری لێکرد:
- یەعنی ئێوە نانی نیوەڕۆ پێکەوە ناخۆن؟ تۆ چیتە؟
- بەڵێ، بەڵێ، دێم، هەڵبەتە، هەڵبەتە.. وەلێ تۆ دەقیقەیەک ڕاوەستە و مەڕۆ. ئێوە ئێستا لەگەڵ ئەودا کارتان نییە، دایە گیان، ڕەنگە من لە بینینی ئەوتان مەحرووم بکەم.
- نا، نا، بەڵام تۆ دیمیتری پروکفیچ بۆ نانی نیوەڕۆ دەفەرموویت لەگەڵماندا؟
دونیا جەختی کرد:
- تکات لێدەکەم وەرە.

ڕازومیخین سەری ڕێزی دانەواند و دەموچاوی تەواو گەشایەوە، بۆ چرکەساتێک لە ناکاودا و بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر هەموو بێزار بوون.

- خوا حافیز ڕودیا، واتا بە ئومێدی دیدار، من خۆشم لە وتەی خوات لەگەڵ نایەت، خوات لەگەڵ ناستاسیا.. ئاە.. دیسانەوە وتم خوات لەگەڵ..

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا ویستی سەری ڕێز بۆ سۆنیا دانەوێنێت، وەلێ نەیتوانی و بەپەلە لە ژوورەکە چووە دەرێ.

بەڵام ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا بە نۆرەی خۆی کە لە دوای دایکییەوە دەڕۆیشت و گەیشتە ئاستی سۆنیا، تەواو سەری بۆ دانەواند و سڵاوی لێکرد، سۆنیا شڵەژا، بەپەلە و ترسەوە بە هەمان شێوە سڵاوەکەی سەندەوە و لە دەموچاویدا شتێکی وەک نەخۆشی ڕەنگی دایەوە، وەک ئەوەی ئەدەب و سەرنجی ئاڤدوتیا ڕومانوڤنای بە لاوە قورس و ناخۆش بووبێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە لە ڕاڕەوەکەدا بوو، هاواری کرد:

- دونیا خواحافیز، بێنە دەستت.

دونیا لە کاتێکدا کە بە شپرزەیی بۆ لای دەچوو، بە خۆشییەوە وتی:

- بەڵام ئێمە تەوقەمان کرد، لە بیرت چوو؟

- باشە، چ عەیبێکی نییە، با جارێکی تریش بیکەینەوە.

قامکە چکۆڵەکانی دونیای توند گوشی، دونیا زەردەخەنەیەکی بۆ کرد، سوور داگەڕا، خێرا دەستی ئازاد کرد و کەوتە دوای دایکی، نەتدەزانی ئەو بۆ بەختەوەر دەهاتە پێشچاو!

کە ڕاسکۆلنیکۆڤ گەڕایەوە ژوورەکەی، نیگایەکی ڕوونی لە سۆنیا کرد و وتی:

- زۆر چاکە، خوا لە مردووەکان خۆش بێت و تەمەنی زیندووەکان درێژ بکات، وا نییە، وایە، نا؟

سۆنیا تەماشایەکی سەیری دەموچاوی کرد، کە لەپڕێکدا کرابووەوە، ڕاسکۆلنیکۆڤ چەند چـــــرکەساتێک لێی ڕاما، هەموو ئەو چیرۆکەی کە باوکی کۆچکردووی لەبارەی کچەکەیەوە گێڕابوویەوە، لە پڕێکدا، لە چرکەساتێکدا، بیری لاوەکە کەوتەوە..

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا هەر کە هەنگاوی نایە سەر شەقامەکە، وتی:

- خودایا، دونێچکا، ئێستا هەست بە خۆشحاڵی دەکەم کە هاتینە دەرەوە، لەوە دەچێت ئەمەیان چاکتر بێت. ئاخۆ دوێنێشەو، لە فارگۆنی شەمەندەفەرەکەدا، دەمتوانی وا بیر بکەمەوە، کە تەنانەت لەم بینینە کورتەی کوڕەکەم شادمان دەبم!

- دایکە گیان، من جارێکی تریش پێت دەڵێمەوە ئەو هێشتا زۆر نەخۆشە، بۆ نایبینیت؟ دەشێت لەبەر ئەوەی ئازار بۆ ئێمە دەکێشێت وای بەسەر هاتبێت. دەبێت لێبوردن هەبێت، زۆریش، دەشێت لە زۆر شت ببووریت.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە گەرمی و ئیرەییبردنێکی سووکەڵەوە زوو کەوتە دوای قسەی کچەکەی و وتی:

- وەلێ تۆ لێبوردنت نەبوو، دەزانیت دونیا، من تەماشای هەردووکتانم دەکرد، تۆ وێنەیەکیت لەو، نەک تەنیا بە ڕووکەش، بەڵکو بە ڕۆح و ئاکاریش. هەردووکتان غەمگینن، هەردووکتان گرژ و تووڕەن، هەردووکتان لووتبەرز و جوامێرن.. ئاخر ناشێ ئەو خۆپەرست بێت، دونێچکا، وا نییە؟ وەلێ بە ڕاستی، کە بیر لەوە دەکەمەوە ئەمشەو لە ماڵەکەماندا چی ڕوو دەدات، خەریکە دڵم دەوەستێت.

- گوێ مەدەیە دایکە گیان، چی دەبێت با ببێت.
- دونیا گیان، ئاخر تۆ بیر لەوە بکەرەوە ئێمە ئێستا لە چ بارێکداین!
هەروەها پولخێریا ئەلێکساندروڤنای بێچارە لە پڕاو بەبێ پارێز وتی:
- باشە چی ڕوو دەدات ئەگەر پیتەر پتروڤیچ لە وادەکەی پەشیمان بووەوە؟
دونیا بە زمانێکی ڕەق و سووکایەتییەوە وتی:
- ئەگەر ئەوەی کرد، ئیتر ئەو چ قیمەتێکی دەبێت!
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا خێرا قسەی بە کچەکەی بڕی و وتی:
- چاکمان کرد ئێستا هاتین، ڕاسکۆلنیکۆڤ پەلەی ئەنجامدانی کارێکی هەبوو، لێگەڕێ پیاسەیەک بکات، هیچ نەبێت هەناسەیەک وەربگرێت، ژوورەکەی زۆر خەفەیە.. هێند هەوای تیا نییە مرۆڤ هەناسەی تیا بدات، لێرە، لەم شەقامانەیشدا هەر دەڵێیت لە ژوورێکی بێهەوادایت، خودایا، چ شارێکە!.. ڕاوەستە.. بڕۆ.. پێت پیا دەنێن! ئاخر، ئەوە پیانۆیەک بوو بردیان.. چەند خۆ بەیەکتردا دەکێشن.. من لەو کچەیش زۆر دەترسم.
- کامە کچ، دایە گیان؟
- ئەو سۆنیا سمیۆنۆڤنایەی کە ئێستا لەوێ بوو.
- چۆن؟
- دڵم وا دەڵێت، دونیا، باوەڕ دەکەیت یان نا، هەر کە هاتە ژوورەوە، یەکسەر بۆ ئەوە چووم کە ئەسڵی مەسەلەکە لێرەدایە..
دونیا بە تووڕەییەوە وتی:
- هیچ لێرەدا نییە، بە ڕاستی دایکە گیان، خۆ تۆ هەستەکانت زۆر سەیرن! ئەو تازە دوێنێ ئەم کچەی ناسیووە و ئەمڕۆیش کە هاتە ژوورێ، نەیناسی.

- باشه، دەیبینیت! چۆن نیگەرانمان دەکات، دەیبینیت، دەیبینیت، زۆریش ترسام، هەر لێی دەڕوانیم و دەیڕوانی، چاوانێکی هەبوو، من بە زەحمەت لەسەر کورسییەکە ئارامم گرتبوو.. لە بیرتە ئەو کاتەی ڕودیا دەستی بە ناساندنی کرد؟ زۆر سەیرە، پیتەر پیتروڤیچ لەبارەی ئەو کچەوە وا دەنووسێت و کەچی ڕودیا وا بە ئێمەی دەناسێنێت، بە تایبەتی بە تۆ، دیارە لای ئازیزە.

- خەڵک زۆر شت دەنووسێت، لەبارەی خۆیشمانەوە زۆریان وت و زۆریان نووسی، بۆ لە بیرت چوو؟ من بڕوام وایە کە کچێکی باشە و هەموو ئەم قسانە هەڵبەستراون..

- یاخوا وابێت.

لەپڕێکدا دونیا قسەکانی دایکی بڕی و وتی:

- بەڵام پیتەر پیتروڤیچ بوختانکەرێکی نامەردە.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بێدەنگ بوو، قسەکان بە ناتەواویی مانەوە.

* *

ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕازومیخینی بەرەو پەنجەرە چکۆڵەکە برد و وتی:

- گوێ بگرە، دەزانی چ کارێکم پێتە؟

سۆنیا کە بە مەبەستی ڕۆیشتن سەری ڕێزی دانەواند، بەپەلە وتی:

- کەواتە بە کاترینا ئیڤانۆڤنا دەڵێم کە دێیت بۆ ئەوێ..

- هەر ئێستا، سۆنیا سمیۆنۆڤنا، ئێمە نهێنیمان نییە و تۆیش ڕێگەت لێنەگرتووین. حەزم دەکرد دوو قسەی ترت لەگەڵدا بکەم..

لەپڕێکدا وەک ڕستەکەی خۆی بڕیبێت، بە ناتەواوی هێشتییەوە و ڕووی لە ڕازومیخین کرد و وتی:

- بەڵێ، تۆ ئەم.. ناوی چییە؟ پۆرفیری پتروڤیچە دەناسیت؟

ڕازومیخین وەک تاقیبکەرێکی تەواو وتی:

- ئەی چۆن، خزمی خۆمە، ئەی ئەم پرسیارەت لە چییە؟
- ئاخر، ئەم کارە.. دەی باشە، ئەوەی پەیوەندیی بە کوشتنەکەوە هەیە.. خۆت دوێنێشەو وتت کە لەژێر دەستی ئەودایە.
- وایە، ئێ؟
ڕازومیخین وا چاوی کردبوونەوە نزیک بوو بێنە دەرێ.
- ئەو لەوانەی پرسیوەتەوە کە بارمتەیان لای ژنەکە هەبووە، منیش بارمتەم هەیە، شتی چکۆڵە، بەهەرحاڵ، یەکێکیان ئەنگوستیلەیەکی بچووکە کە خوشکم بۆ یادگاری لە کاتی هاتنمدا بۆ پترۆزبورگ پێی بەخشیبووم. سەعاتێکی زیوینی باوکیشم. نرخی هەموویان پێنج شەش ڕۆبڵە، بەڵام یادگارییەکی ئازیزن لام، ئێستا دەبێ چی بکەم؟ نامەوێت ئەو شتانە سەریان تیا بچێت. بە تایبەتی سەعاتەکە، کاتێ کە باسی سەعاتەکەی دونیا هاتە ناوەوە، لەتاو ئەوەی نەک دایکم بیەوێت تەماشای ئەو سەعاتە بکات، گیانم هاتبووە لەرزین. ئەوە تەنیا شتێک بوو کە لە دوای باوکم مابووەوە، ئەگەر ون بێت، دایکم نەخۆش دەکەوێت، ئەمەیش ژن! بڵێ، پێم بڵێ چی بکەم؟ دەزانم وا چاکترە بە بەشی پۆلیسی بڵێم، دەشێت ئەوە باشتر بێت کە بە خودی پۆرفیری بڵێم؟ ها؟ ئەڵێی چی؟ دەمەوێت زوو ئەو کارە بە لایەکدا بخەم، دەبینیت کە پێش نانی نیوەڕۆ دایکم لێی دەپرسێتەوە.
ڕازومیخین بە هەڵچوونێکی زۆرەوە هاواری کرد:
- هیچ پەیوەندیی بە پۆلیسەوە نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە پۆرفیریەوەیە، سەیرە، خۆشحاڵم! ئەمە هیچی ناوێت، با هەر ئێستا بڕۆین، لێرەوە دوو هەنگاوە و بێگومانم لەوێیە.
- باشە.. بابڕۆین.

- ئەو زۆر زۆری پێخۆشە، پێی خۆشە بتناسێت، من لەبارەی تۆوە زۆر قسەم لەگەڵدا کردووە، لە گەلێک لایەنەوە، تەنانەت دوێنێش، با بڕۆین. کەواتە تۆ پیرێژنەکەت دەناسی؟ باشە، پێشهاتێکی چاک بوو.. ئا.. ڕاستی سۆنیا ئیڤانۆڤنا..

ڕاسکۆلنیکۆڤ بۆی ڕاست کردەوە و وتی:

- سۆنیا سمیۆنۆڤنا.

پاشان هەر بەوی وت:

- سۆنیا سمیۆنۆڤنا، ئەمە ڕازومیخینی هاوڕێمە، کوڕێکی زۆر باشە.

- ئەگەر دەتانەوێت ئێستا بڕۆن..

سۆنیا سمیۆنۆڤنا بەبێ ئەوەی تەماشای ڕازومیخین بکات، ئەو قسانەی کرد و لەم ڕەفتارەی خۆیشی زۆر شڵەژا.

ڕاسکۆلنیکۆڤ یەکلایی کردەوە و وتی:

- باشە، بڕۆین، سۆنیا سمیۆنۆڤنا، من هەر ئەمڕۆ سەرێکتان لێدەدەم، پێم بڵێ بزانم تۆ لە کوێ دەژیت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بەبێ دوودڵی ئەمەی وت، وەلێ لە نیگای کچەکە خۆی دزییەوە، سۆنیا ناونیشانی خۆی دایە و سوور داگەڕا، هەموویان پێکەوە چوونە دەرەوە.

ڕازومیخین کە لە دوایانەوە لە نەردەوانەکان دەهاتە خوارێ، پرسی:

- دەرگاکە داناخەیت؟

- هیچ کاتێک دایناخەم.

پاشان ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەربەستانە وتی:

- دوو ساڵی تەواوە دەمەوێت قفڵ بکڕم.

ئینجا بە پێکەنینەوە ڕووی لە سۆنیا کرد و وتی:

- ئەو کەسانەی هیچیان نییە شیاوی قفڵلێدان بێت، بەختەوەرن، وانییە؟

لەبەر دەرکی دەرگای دەرەوە کە دەچووە سەر شەقامەکە، وەستان.

- سۆنیا سمیۆنۆڤنا تۆ بە لای ڕاستا دەڕۆیت؟ بەڕاست تۆ چۆن ماڵەکەی منت دۆزییەوە؟

بە ئاوازێکەوە ئەم پرسیارەی کرد، وەک بڵێی بیەوێت پرسیاری تری بە دوادا بکات، حەزی دەکرد چاو لە چاوە هێمن و بێگەردەکانی کچەکە ببڕێت، بەڵام بۆی نەڕەخسا.

- تۆ خۆت دوێنێ ناونیشانی ماڵەکەت دابوو بە پولێچکا.

- پولێچکا؟ ئا.. بەڵێ.. پولێچکا! کیژۆڵەکە.. خوشکتە؟ ئا ناونیشانم پێدا؟

- بۆ لە بیرت چۆتەوە؟

- نا.. لە بیرمە.

- من پێشتر لەبارەی تۆوە لە باوکی کۆچکردوومەوە شتێکم بیستبوو.. ئەوسا هێشتا ناوی خانەوادەی تۆم نەدەزانی، ناوی خۆیشت، باوکیشم هەر ناوی نەدەزانیت.. ئێستا هاتم.. لەبەر ئەوەی دوێنێشەو ناوتانم زانی، ئەمڕۆ یەکسەر پرسیم: جەنابی ڕاسکۆلنیکۆڤ لەم ناوە لە کوێدایە؟ نەیشمدەزانی کە تۆیش ژووری ئامادەکراوت گرتووە، خوات لەگەڵ.. من بە کاترینا ئیڤانۆڤنا دەڵێم..

سۆنیا زۆری پێ خۆش بوو کە سەرئەنجام لێیان جیا بووەوە، سەری داخستوو ڕێگەی لەبەر گرت، پەلەی بوو کە هەر چۆنێک بووە، زوو لێیان ون بێت، تا هەر چۆنێکە، ئەو بیست هەنگاوەی دەیگەیەنێتە پێچی کۆڵانەکە، زووتر بیبڕێت و تەنیا بمێنێتەوە. ئەوسا، لەو کاتەدا کە هەر بەپەلە دەڕوات، دەتوانێت تەماشای کەس نەکات و لە هیچ

شتێک ڕانەمێنێت، بەڵکو تەنیا هەر بیر بکاتەوە، ڕابووردوو بێنێتەوە یاد و هەڵیسەنگێنێت. هەرگیزاوهەرگیز، پێشتر ئەم جۆرە هەستەی نەبووە، دنیایەکی تازە، نادیار و ئاڵۆز کەوتبووە دڵییەوە. لەپڕێکدا ئەوەی هاتەوە بیر، کە خودی ڕاسکۆلنیکۆڤ خوازیاری ئەوەبوو ئەمڕۆ، ڕەنگە بەیانییەکەی یان هەر ئێستا بهاتایە بۆ لای.

ترپەی دڵی زیادی کرد، وەک منداڵێکی ترساو کە لە یەکێک بپاڕێتەوە، لەبەر خۆیەوە وتی:

- هەر ئەمڕۆ نا، تکات لێدەکەم، ئەمڕۆنا، خوا گیان! بۆ لای من.. لەم ژوورەدا.. دەبینێت.. ئای خودایا!

بێگومان لەو کاتەدا بە هیچ جۆرێک ئاگای لەو پیاوە نەناسە نەبوو، کە کەوتبوە دوای و هەنگاو بە هەنگاو چاودێریی دەکرد، هەر لەو دەقیقەوە کە لە ماڵی ڕاسکۆلنیکۆڤ هاتبووە دەرێ، کەوتبووە دوای، لەو چرکەساتەوە کە هەرسێکیان، واتا ڕازومیخین، ڕاسکۆلنیکۆڤ و ئەو بۆ قسەکردن لە ڕاڕەوەکەدا وەستابوون، ئەم ڕێبوارە لە کاتێکدا بە پاڵیاندا تێپەڕیبوو. هەر بە گوێلێبوونی قسەکانی سۆنیا کە دەیوت: "پرسیم جەنابی ڕاسکۆلنیکۆڤ لە کوێ دەژی؟" لەناکاودا موچرکی پیا هات، خێرا، بەڵام زۆر بە وردی تەماشای هەرسێکیانی کرد، بە تایبەتی ڕاسکۆلنیکۆڤ کە کچەکە ڕووی دەمی لەو بوو، پاشان سەیرێکی ماڵەکەی کرد و لە یادی خۆیدا هێشتییەوە. گشت ئەم کارانە لە چرکەساتێکی سەر ڕێگەدا ڕوویان دا، ڕێبوارەکە کە دەیویست کەس نەیبینێت، کەمێک دوور کەوتەوە و بەدەم چاوەڕێکردنەوە، هەنگاوی خاو بوونەوە، چاوەڕێی سۆنیا بوو، بینی کە ئەوان خواحافیزیان لە یەکتر کرد، زانی ئێستا سۆنیا بەرەو شوێنەکەی خۆی دەڕواتەوە.

پیاوەکە لەو کاتەدا کە وێنەی سۆنیای دەهێنایە بەرچاوی، بیری کردەوە: "ئاخر ماڵەکەی لە کوێدایە؟ من ئەم دەموچاوەم لە جێگایەکدا بینیوە، دەبێت بزانم.." کە گەیشتە پێچەکە، بەرەو شەقامەکەی تر چوو، ئاوڕی دایەوە و سۆنیای بینی کە هەر بە هەمان ڕێگەدا بە دوای ئەمدا دێت و ئاگای لە هیچ نەماوە، کە سۆنیا گەیشتە سەری کۆڵانەکە، بەرەو هەمان شەقام وەرگەڕا، پیاوەکە بەبێ ئەوەی چاو لەو و لە شەقامەکەی ئەوبەر هەڵبگرێت، کەوتە دوای، دوای پەنجا هەنگاوێک، پیاوەکە دیسان بەرەو شەقامەکەی ئەوبەر، واتا بەرەو لای سۆنیا چوو، پێی گەیشت، لە دوایەوە، بە دووری پێنج هەنگاوێک، دەڕۆیشت.

پیاوێکی تەمەن پەنجا ساڵ بوو، باڵای لە باڵای ئاسایی بەرزتر و شانە پانەکانی دیمەنێکی کۆمیان دەدایە. جلەکانی هەراو و جوان و وەک خانەدانێک دەهاتە بەرچاو، گۆچانێکی قەشەنگی بەدەستەوە بوو، کە لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا بە پیادەڕێکەیدا دەکێشا، دەستکێشێکی تازەیشی لە دەستا بوو، دەموچاوی پان و تا ڕادەیەک پەسەند و ڕەنگ و ڕوویشی نوێ و لە پوتروزبورگی نەدەچوو، قژی زۆر پڕ و زەرد و کەمێک سپی دەینواند، ڕیشی پان و پڕ و وا دەهاتە بەرچاو کە لە قژی سەری زەردتر بێت، چاوی شین و ڕوانینی هێور و ورد و بەڕامان بوو، لێوی سوور بوو، بەگشتی زۆر باش مابووەوە و وا دەردەکەوت کە لەو تەمەنەی کردوویەتی، لاوتر بێت.

کە سۆنیا گەیشتە ڕووبارەکە، هەردووکیان لەسەر پیادەڕێکە بەیەکدی گەیشتن، پیاوەکە کە لێی دەڕوانی، هەستی بەوە کرد حاڵەتی کچەکە شپرزە و سەرسامە، کە سۆنیا گەیشتە ساختمانەکەی خۆیان، لە دەرگای دەرەوە چووە ژوورێ، پیاوەکەیش هەروای کرد و دەتوت

کەمەکێک سام گرتوویەتی، کە سۆنیا گەیشتە حەوشەکە، بە لای ڕاستا بەرەو ئەو شوێنەی پلیکانەی ماڵەکەی بوو، تێی کێشا، پیاوە نەناسەکە لەژێر لێوەوە وتی:

- بەه!

بە دوای سۆنیادا بە نەردەوانەکەدا سەرکەوت، لەوێدا تازە سۆنیا هەستی پێکرد. کە گەیشتە نهۆمی سێ، لە داڵانەکەدا سوڕا و زەنگی ژووری نۆی لێدا، لەسەر دەرگاکەی بە دەباشیر نووسرابوو: کاپەرناومۆڤی خەیات[١]. دیسانەوە کابرای نەناس دووبارەی کردەوە: (بەه!)

لەم پێشهاتە سەیرەیش سەری سووڕما و زەنگی ژووری ژمارە هەشتی لێدا، بەینی نێوان هەردوو دەرگاکە تەنیا شەش هەنگاو دەبوو.

پیاوەکە کە سەیری سۆنیای دەکرد و پێدەکەنی، وتی:

- تۆ لای کاپەرناومۆڤ نیشتەجێیت؟ دوێنێ ئەو هێلەکەکەمی چاک کرد، من دراوسێتم، لای خاتو ڕسلیخ[٢] گورتودا کارلوڤنا[٣]، چ ڕێکەوتێکە!

سۆنیا بە وردی لێی ڕاما.

پیاوەکە بە خۆشییەوە لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

- دراوسێین، ئاخر، من سێ ڕۆژە هاتوومەتە شارەوە، پێم خۆشە جاری تر یەکدی ببینین. خوات لەگەڵ.

---

[١] *Kapper naounmof*

[٢] *Reslikh*

[٣] *Guertouda Karlovna*

سۆنیا وەڵامی نەدایەوە، دەرگایان کردەوە، سۆنیا لەسەرخۆ چووە ژوورەکەی خۆی، بەبێ هیچ هەستی بە شەرمەزارییەک کرد، لەوە دەچوو ترسا بێت.

* * * * *

ڕازومیخین لە ڕێگەدا کە بەرەو ماڵی پۆرفیری دەچوو، گەلێک شپرزە بوو، چەند جارێک بە ڕاسکۆلنیکۆڤی وت:

- برادەر، ئەمە زۆر چاکە، من خۆشحاڵم، خۆشحاڵ.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لای خۆیەوە بیری دەکردەوە: "ئاخر، لە چی خۆشحاڵیت؟"

- ئاخر، من نەمدەزانی تۆیش لای پیرێژنەکە بارمتەت هەیە، ئەمە.. ئەمە دەمێکە؟ مەبەستم ئەوەیە تۆ دەمێکە چوویتەتە لای ژنەکە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی: "چ کەرێکە؟"

- کەی؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەستا و بیری کردەوە:

- وا ئەزانم سێ ڕۆژ لە پێش مردنیدا.

بەپەلە و بە تایبەتی وەک ئەوەی زۆر لە شتەکانی بترسێت، وتی:

- بەڵام من ئێستا بۆ ئەوە ناڕۆم شتە بارمتەکانم وەربگرمەوە، ئاخر، من تەنیا یەک ڕۆبڵی زیوم هەیە.. ئەمەیش لە پای ئەو وڕێنە نەفرەتییانەی دوێنێشەوەوە.

وشەی وڕێنەی بە ئاوازێکی زۆر کاریگەرانە وت.

ڕازومیخین بەپەلە و نەیشدەزانرا بۆ، بڕوای بە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و وتی:

- وایە، بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ، ئەی کەواتە بۆ.. تۆ وات دەوت.. دەزانیت.. تۆ لە کاتی وڕێنەکەتدا بەردەوام باسی ئەموستیلە و زنجیرت دەکرد، باشە. بەڵێ، بەڵێ. ڕوونە، ئێستا هەموو شتێک ڕوون و ئاشکرایە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە دڵی خۆیدا کەوتە ڕاوێژ:

"کەواتە، سەیر ئەم بیرۆکەیە لە سەریاندا ڕیشەی داکوتاوە، ئاخر، ئەم پیاوە ئامادەیە لەباتیی من لە خاچ بدرێت و زۆریشی پێخۆشە و مەسەلەکەیش ڕوون و ئاشکرایە، چونکە من لە کاتی وڕێنەکاندا ناوی ئەموستیلەم هێناوە، سەیرە! هەموو بڕوایان بەمە هەیە".. بە دەنگی بەرز پرسی:

- تۆ لەو باوەڕەدایت ئێستا لە ماڵ بێت؟

ڕازومیخین بەپەلە وەڵامی دایەوە:

- لە ماڵە، لە ماڵە، هاوڕێ، ئەو گەنجێکی باشە، دەیبینیت، وەلێ کەمێک بەدە، یەعنی بێگومان پیاوی ناو کۆمەڵە، بەڵام لە لایەنێکی ترەوە بەدە، لاوێکی بەئاوەزە، بەڵێ بە ئاوەزە، هیچ بێئەقڵ نییە، بەڵام شێوازی بیرکردنەوەی زۆر تایبەتییە.. بێمتمانە، بەدبین و دڵڕەقە، حەزی لێیە فێڵ لە مرۆ بکات، نەک بەو مانایەی لە ڕێگە لایدات، بەڵکو سەر بنێتە سەرت، شێوازی کارکردنی کۆن و مادییە.. بەڵام لە کارەکەیدا شارەزایە، زۆری لێدەزانێت،ساڵی پار کێشەیەک کە پەیوەندیی بە کوشتنەوە هەبوو، هەرچەندە تا ڕادەیەک هیچ شوێنەواری نەمابوو، کەچی دۆزییەوە، زۆر زۆری پێخۆشە تۆ بناسێت.

- جا بۆ ئەوەندە زۆر؟

- نەک لەبەر ئەوەی.. دەزانیت، لەم دواییەدا، واتا لەو کاتەوە کە تۆ نەخۆش کەوتیت، من گەلێک جار ڕێک دەکەوت لەبارەی تۆوە زۆر بە

درێژی قسەم بۆ دەکرد، ئەویش گوێی دەگرت، کە زانی تۆ بە هۆی ئەو بارە نالەبارەتەوە ناتوانیت خوێندنی یاسا تەواو بکەیت، وتی: "بەداخەوە!" لەوەوە تێگەیشتم.. واتا لە هەموو ئەم شتانەوە.. نەک لەبەر هۆیەک.. دوێنێ زامیوف.. بڕوانە ڕودیا، من دوێنێ بە سەرخۆشی کە دەڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوە، چەند قسەیەکم کرد، دەزانیت هاوڕێ، دەترسم نەک مەسەلەکە گەورە بکەیت..

- چی، ئەوەی کە من بە شێت دەزانن؟ جا کێ ناڵێ ڕاستە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە زۆر پێکەنینی لە خۆی هێنا.

- بەڵێ، بەڵێ.. یەعنی.. ئاه.. نا.. دەی، دەربارەی هەموو ئەو شتانەی وتم و دەربارەی مەسەلەکەی تریش هەمووی قسەی قوڕ و ئەنجامی مەستی بوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ خۆی تووڕە کرد و هاواری کرد:

- ئاخر بۆ داوای پۆزش دەکەیت؟ بۆ نازانیت لە هەموو ئەم شتانە چەند بێتاقەت و بێزارم!

- دەزانم، دەزانم، تێدەگەم، بڕوات بێ تێدەگەم، تەنانەت وتنیشی هەر شەرمەزارییە.

- ئەگەر شەرمەزارییە بۆ دەیڵێیت.

هەردووکیان بێدەنگ بوون، ڕازومیخین لەڕادەبەدەر ڕازی بوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ بە بێزارییەوە هەستی پێدەکرد، بێجگە لەوە، هەرچییەکیش کە ڕازومیخین لەبارەی پۆرفیریەوە وتبووی، ئەوی نیگەران کردبوو. ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ڕەنگی پەڕیوو و دڵەکوتێوە بیری کردەوە: "بۆ ئەم کابرایەش دەبێت بکەومە پاڕانەوە و لاڵانەوە و ڕەفتارم سروشتی بێت، وەلێ لە هەمووی سروشتیتر ئەوەیە کە هەرگیز نەپاڕێمەوە، نە بە دەستی ئەنقەست و نە بە جەخت

لەسەرکردنی، نا، دیسانەوە ئەویش نابێت بە سروشتی.. باشە، با بزانین چی ڕوو دەدات.. بزانین.. ئێستا.. بڕۆم یان نەڕۆم باشترە؟ پەروانە خۆی بەرەو ئاگری مۆم دەچێت! دڵم لێدەدات، ئەمە خراپە.
ڕازومیخین وتی:
- لەو باڵاخانە ڕەنگ خۆڵەمێشییەدا دەژی.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی:
"لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە ئایا پۆرفیری ئاگای لەوەیە من دوێنێ چوومەتە ماڵی ئەو پیرێژنە.. یان کە من لەبارەی خوێنەوە پرسیارم کردووە؟ دەبێت هەر ئێستا ئەوە بزانم، هەر کە چوومە ژوورەوە، دەبێت لە دەموچاوییەوە ئەوە تێبگەم، ئەگینا.. تەنانەت ئەگەر بیشفەوتێم، دەبێت ئەوە بزانم".
لەپڕێکدا بە زەردەخەنەیەکی ساختەوە ڕووی لە ڕازومیخین کرد و وتی:
- دەزانیت؟ هاوڕێ، من لە بەیانییەوە هەستم پێکردوویت تۆ لە بارێکی شپرزە و ناخۆشدایت؟ ڕاستە؟
ڕازومیخین بە تووڕەییەوە وتی:
- ناخۆش؟ بە هیچ جۆرێک ناخۆشیم نییە.
- نا، هاوڕێ، ئەوە دیارە، لەسەر کورسییەکە وا دانیشتبوویت، کە هیچ کاتێک وا دانانیشیت، لە کەناری کورسییەکە دانیشتبوویت و بەردەوام مووچڕک بە لەشتا دەهات، لە خۆتەوە هەڵدەستایت، جارێک تووڕە دەبوویت و لەپڕێکدا دەهاتیتەوە سەر خۆت، تەنانەت سوور دەبوویتەوە. بە تایبەتی کە داوەتی نانخواردنی نیوەڕۆیان کردیت، زۆر سوور بوویتەوە.
- نا، هیچم نەبوو، درۆ دەکەیت، تۆ دەتەوێت بڵێی چی؟

- بۆ وەک مندالّە قوتابی ڕاوەڕێوی دەکەیت! نەفرەت لە شەیتان، دیسان سوور داگەڕایت.
- بەلام، تۆ چ بەرازێکیت!
- ئاخر، بۆ دەپەشۆکێیت؟ هەی ڕۆمیۆ[1]، ئارام بە، من ئەمڕۆ لە هەندێک جێگا باسی ئەمانە دەکەم هە، هە، هە، دایکم دەهێنمە پێکەنین.. هەروەها هەندێک کەسی تریش..
- گوێ بگرە، گوێ بگرە، ئاخر، ئەمە قسەی دلّە، ئەمە.. ئاخر، ئەمە چ مانایەکی هەیە؟ نەفرەت لە شەیتان.
لەشی ڕازومیخین لە ترسا وەک شەختەی لێهاتبوو، بە تەواوی کەوتە تورتەتورت.
- چییان پێدەلّێیت؟ من هاوڕێ.. ئای چ بەرازێکیت!
- ڕێک وەک گولّی بەهار! ئەگەر بزانیت ئەم حالّەتەت چەند لێدێت! ئەی ڕۆمیۆی نیو مەتری، ئەمڕۆ چاک خۆت شتووە، نینۆکیشت پاک کردۆتەوە! ها.. تۆکەی وا بوویت؟ بەخوا ڕۆنیشت لەسەرت داوە! ئادەی سەرت دانەوێنە با بیبینم.
- هەی بەراز.
ڕاسکۆلنیکۆڤ وا پێدەکەنی، هەستت دەکرد خۆی بە پێوە ناگرێت، هەر بەو پێکەنینەیشەوە چووە مالّی پۆرفیری پتروڤیچ، ڕاسکۆلنیکۆڤیش وای دەویست. لە ناو ژوورەکانەوە گوێت لە دەنگی پێکەنینیان بوو، کە هێشتا ئەوان لە ڕاڕەوەکەدا بوون.

---

[1] Romeo ناوی یەکێکە لە پالّەوانە ناودارەکانی شکسپیر، کە لە خۆشویستن و دلّداریدا بەسەر زمانی هەموو کەسێکی ڕۆژئاواوە بوو. لێرەدا بە درکە و گالّتەوە بەکار هاتووە.

ڕازومیخین لە کاتێکدا کە بە شانی ڕاسکۆلنیکۆڤەوە نووسا بوو، بە تووڕەییەوە وتی:
- لێرە تاقە وشەیەک لەم بارەیەوە نەڵێیت، ئەگینا دەمت دەشکێنم.

٥

لەو کاتەدا کە ڕازومیخین هەڕەشەی دەکرد، ڕاسکۆلنیکۆڤ هەنگاوی نایە ناو ژوورەکەوە. وایش چووە ژووری، دەتوت هەموو توانای خۆی لەوەدا کۆکردۆتەوە کە پێکەنینەکەی بگرێت، لە دوایەوە ڕازومیخین بە ڕوویەکی تورەوترۆ، سوور وەک گوڵەباخ، بە باڵایەکی بەرز و شپرزەوە، بە شەرمەوە چووە ژووری. سەروسیمای لەو چرکەساتەدا ئەوەندە پێکەنین هێنەر بوو، کە پاکانەی بۆ پێکەنینەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ دەکرد. ڕاسکۆلنیکۆڤ کە هێشتا بە خاوەن ماڵەکە نەناسێنرابوو، سەری دانەواند و سڵاوی لە خاوەن ماڵەکە کرد کە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستابوو و بە نیگایەکی پرسئامێزەوە لێی دەڕوانین. ڕاسکۆلنیکۆڤ دەستی درێژ کرد و دەستی خاوەن ماڵی گوشی.

وا دەهاتە بەرچاو کە هێشتا ڕاسکۆلنیکۆڤ نەیدەتوانی بە تەواوی ڕێگە لە شادمانییەکەی بگرێت و دوو سێ وشە بڵێت و خۆی پێبناسێنێت. بەڵام هەر ئەوەندەی کە وێنەیەکی جیدی لەخۆ گرت و لەبەر خۆیەوە شتێکی وت، لەناکاودا لە خۆیەوە، دیسان تەماشایەکی ڕازومیخینی کرد و ئیدی توانای خۆگرتنی نەما، دایە پرمەی پێکەنینێک، کە تا ئەو کاتە بە هەزار حاڵ خۆی پێ گیرابوو، وا ئێستا بەبێ ویستی خۆی قوڵپی دا. ئەو ڕقوتووڕەییە نائاساییەی کە

ڕازومیخین بەرانبەر بەو پێکەنینە "ڕاستگۆیانە" بۆی پێش هات، وێنەیەکی زۆر سروشتی و خۆشی دایە دیمەنەکە.
ڕازومیخین وەک بەدەستی ئانقەست کۆمەک بەو دیمەن و حاڵەتە بکات کە هاتبووە دی، هاواری کرد:
- ئەی شەیتان!
دەستیشی وا ڕاوەشاند، کە بەبێ ویستی خۆی بەرمێزە خڕە چکۆڵەکە کەوت کە پیاڵە چای خاڵیی لەسەر بوو، هەموو ئەو شتانە ئاوەژوو بوون و کەوتنە سەر زەوی و هەراوزەنایان نایەوە.
پۆرفیری پتروڤیچ بە خۆشییەوە و بە دەنگی بەرز وتی:
- بەڕێزان، ئاخر بۆ کورسی دەشکێنن؟ بۆ زیان بە سامانی دەوڵەت دەگەیەنن!
شانۆکە ئەم دیمەنەی هەبوو. ڕاسکۆلنیکۆڤ هەر پێدەکەنی و ئەوەی لە بیر کردبوو، کە دەستی لە نێو دەستی خاوەن ماڵەکەدایە، بەڵام لەبەر ئەوەی ڕادەکەی دەزانی، چاوەڕێی دەرفەتێک بوو کە بە شێوەیەکی زۆر سروشتی دەستی دەربێنێت و کۆتایی بە دیمەنەکە بهێنێت. ڕازومیخین کە لە کەوتنی مێزە چکۆڵەکە و شکانی پیاڵەکان بە تەواوی پەشۆکابوو، نیگایەکی غەمگینانەی کردە وردە شووشەکان، تفی ڕۆکردە سەر زەوییەکە و بەپەلە بۆ لای پەنجەرەکە سووڕا، بە ڕوویەکی زۆر گرژ و مۆنەوە پشتی لەوان کرد و بەبێ ئەوەی هیچ ببینێت، لە پەنجەرەکەوە بۆ دەرەوە هەڵیڕوانی.
پۆرفیری پتروڤیچ پێدەکەنی و حەزی پێکەنینی بەردەوام بوو، وەلێ دیار بوو کە چاوەڕێی ڕوونکردنەوەی دەکرد، لە گۆشەیەکدا لەسەر کورسییەک زامیوتوف دانیشتبوو، بە هاتنی میوانەکان هەستا، هەر بە پێوە چاوەڕێی کرد و زەردەخەنە لەسەر لێوی نەدەبڕا، سەری

سوورڕمابوو، تەنانەت بە بەدحاڵیبوونێکەوە لە دیمەنەکە و بە تایبەتی لە ڕاسکۆلنیکۆڤی دەڕوانی. ئامادەبوونی زامیوتوف کە چاوەڕێ نەدەکرا، ڕاسکۆلنیکۆڤی بە شێوەیەکی ناخۆش سەراسیمە کرد، لەگەڵ خۆیدا کەوتە دوان: "دەبێت بیر لەمەیشیان بکرێتەوە"، پاشان بە شەرمێکەوە وتی:

- داوای لێبوردن دەکەم، بەندە.. ناوم ڕاسکۆلنیکۆڤە.

- ببوورە، زۆرم پێخۆشە کە بەم جۆرە هاتیتە ژوورەوە.

پاشان پۆرفیری ئاماژەی بەرەو لای ڕازومیخین کرد و وتی:

- بەڵام ئەو بۆ نایەوێت تەنانەت سڵاویش بکات؟

- بە خوا نازانم بۆ ئەوەندە ڕقی لە من هەستاوە. من هەر ئەوەندە لە ڕێ پێموت کە لە ڕۆمیۆ دەچێت و.. ئەوەیشم سەلماند و هیچ شتێکی دی لەئارادا نەبوو.

ڕازومیخین بەبێ ئەوەی ڕووی وەربگێڕێت، وتی:

- بەراز.

پۆرفیری بە پێکەنینەوە وتی:

- دیارە گەلێک بەڵگەی گرنگ هەیە، بۆیە ئەو بە تاقە وشەیەک وا ڕقی هەستاوە.

ڕازومیخین لە ناوەڕاستی قسەکانی پۆرفیریەوە تێهەڵچوو، وتی:

- ئیدی چی، لێکۆڵەرەوە!.. کورە نەفرەت لە هەمووتان.

پاشان بە ڕوویەکی کراوە و شادەوە، وەک هیچ ڕووی نەدابێت، دەستی بە پێکەنین کرد و لە پۆرفیری پتروڤیچ نزیک بووەوە و وتی:

- بەسە، لە ڕاستیدا ئێمە هەموومان کەرین، با بچینەوە سەر باسەکە، ئەمە ڕادیون ڕومانوڤیچ ڕاسکۆلنیکۆڤی هاوڕێمە، یەکەم ناوی تۆی بیستووە و دەیەوێت بتناسێت، دووەم کارێکی بچووکی لەگەڵتا هەیە.

دەی.. زامیوتوف! ئەی تۆ لێرە چی دەکەیت؟ ئێوە یەکتری دەناسن؟ لەکەیەوە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە نیگەرانییەوە لەگەڵ خۆیدا دوا: "ئەی ئەمەیان چییە!" زامیوتوف بە ڕووکەش پەشۆکا، بەڵام زۆری نەبرد بێدەربەستانە وتی:

- دوێنێ لە ماڵەکەی خۆتدا یەکترمان ناسی.

- کەواتە خوا نەیویست زەرەرێکی بە دواوە بێت: هەفتەی ڕابوردوو زۆری پێداگرت کە هەر چۆنێک بووە لەگەڵ تۆ و پۆرفیری یەکتر بناسن، وەلێ ئێوە بەبێ منیش یەکدی دەناسن، تووتنەکەت لە کوێدایە؟

پۆرفیری پتروڤیچ جلی ماڵەوەی لەبەردا بوو: کراسێکی سپیی خاوێن و دەمپێییەکی کۆنی لەپێدا بوو. تەمەنی سیوپێنج ساڵ و باڵای لە باڵای ئاسایی کورتتر بوو، تا ڕادەیەک ورگن و قەڵەو و بەخۆوە بوو. دەموچاوی تاشراو و نە ڕیش و نە سمێڵی نەبوو، قژی لە پشت سەرە گەورەکەیەوە کە بە شێوەیەکی تایبەتی لە پشتملیەوە دەردەکەوت، کورت کرابووەوە. دەموچاوە خڕ و قەڵەوەکەی، لەگەڵ لووتە پانەکەیدا، بە ڕەنگێکی زەردەوە هەروەک نەخۆش دەردەکەوت، تا ڕادەیەکیش مایەی گاڵتەپێکردن بوو. ئەگەر لەبەرچاوی نەبووایە، چاوانێک کە درەوشانەوەیەکی نمناکیان تیا بوو، مژۆڵەکانیشی کە تا ڕادەیەک سپی بوون و دەتوت هەمیشە لە چاوبڕکێدان، سیمای میهرەبان دەینواند، نیگای چاوەکان، لەگەڵ پەیکەرەکەیدا، کە تا ڕادەیەک دەچووەوە سەر پەیکەری ژنێکی لادێی، لەگەڵ یەکتردا نەدەگونجان، ئەمیان ویقارێکی دابوویە، کە لە یەکەم نیگادا بە هیچ جۆرێک چاوەڕوانی نەبوویت.

پۆرفیری پتروڤیچ که بیستی میوانەکه کارێکی بچووکی لەگەڵیدا هەیه، خێرا تکای لێکرد لەسەر قەنەفەکه دابنیشێت، خۆیشی له لاکەی تریەوه دانیشت و له میوانەکه ڕاما تا زووتر گوێی له ڕوونکردنەوەی مەسەلەکان بێت، بایەخپێدانەکەی هێند دڵگەرمانه بوو، که له یەکەم بەرخوردا تووشی پەشۆکان و دوودڵی دەکردیت، به تایبەتی به لای یەکێکەوه که نەناس بێت و ئەوەی که دەیڵێیت، شایانی ئەو هەموو بایەخپێدانه زۆره نەبێت. لەگەڵ ئەمانەیشدا ڕاسکۆلنیکۆڤ به کورتی و پوختی باسی له کارەکەی خۆی کرد و به وردی ڕوونکردنەوەکانی بۆ دەربڕی، بۆیه زۆر به لەخۆڕازیبوونەوه هەستی کرد که ئیتر دەتوانێت زۆر به چاکی تەماشای پۆرفیری بکات. پۆرفیری پتروڤیچیش له هەموو ئەو ماوەیەدا چاوی لێ کەلا نەخست. ڕازومیخین که لەسەر هەمان مێز و بەرانبەر ئەوان دانیشتبوو، زۆر به تاسه و پەرۆشەوه گوێی له کێشەکه گرتبوو، بەردەوام چاوی له یەکێکیانەوه بۆ ئەوی تر دەگوێزایەوه، به جۆرێک که لەڕادەبەدەر بوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ له دڵی خۆیدا جوێنی دا:

- چ کەرێکه!

پۆرفیری به شێوازێکی زۆر دڵگەرمانه وتی:

- دەبێت به پۆلیسی ڕابگەیەنیت که دوای زانینی ڕووداوەکه، واتا کوشتنی ژنەکه، تۆ لای خۆتەوه داواکاریت ئەوەیه به دادوەری لێکۆڵینەوه ڕابگەیەنن که فڵانه شت هی تۆیه و تۆیش دەتەوێت شتەکه له بارمتەیی دەربهێنیت.. یان.. بەهەرحاڵ.. بۆت دەنووسن.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەوەندەی له توانایدا بوو، خۆی شپرزه نیشان دا و وتی:

- قسه لەوەیە کە من لە ئێستادا ئەوەندە پارەم نییە و.. تەنانەت نایشتوانم ئەو شتە چکۆلانەیش.. دەزانیت، من ئێستا تەنیا دەمەوێت ئەوە ڕابگەیەنم کە ئەو شتانە هی منن و هەر کاتێک پارەم هاتە دەست، ئەوسا..

پۆرفیری پترۆڤیچ لە کاتێکدا بە ساردییەوە ئەو شتانەی وەرگرت، کە پەیوەندیان بە مەسەلە ئابوورییەکەوە هەبوو، وەڵامی دایەوە:

- هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت، تۆ ئەگەر بتەوێت، دەتوانیت هەر ڕاستەوخۆ بۆ منی بنووسیت، بەو جۆرەی کە وتم، واتا: "کاتێک لەبارەی فلان شتەوە هەواڵم زانی، وا ڕایدەگەیەنم کە فلان شت هی منە و داواکارم کە.."

ڕاسکۆلنیکۆڤ بەپەلە قسەکانی پێبڕی و زیاتر بایەخی بە لایەنە مادیەکە دا و وتی:

- دەتوانم نامەکە لەسەر کاغەزی سپیی سادە بنووسم؟

- بەڵێ، لەسەر سادەترین کاغەز!

لەپڕێکدا پۆرفیری وەک چاو دابگرێت، چاوی نانە سەر یەک، وای تەماشا کرد کە بە ئاشکرا گاڵتەپێکردنی پێوە دیار بوو، یان ڕەنگە ئەمە تەنیا لای ڕاسکۆلنیکۆڤەوە وا کەوتبێتەوە، چونکە حاڵەتەکە چرکەساتێکی نەبرد، بە کورتی، شتێک بوو لەو بابەتە. ڕاسکۆلنیکۆڤ ئامادە بوو سوێند بخوات کە پۆرفیری هەر بەو مەبەستەوە چاوی لەو داگرتووە، بۆیە وەک بروسکە ئەوە بەسەری ڕاسکۆلنیکۆڤدا گوزەری کرد کە "ئەو دەیزانێت".

پاشان بە کەمێک پەرێشانییەوە لەسەری ڕۆشت:

- ببوورە کە بەم شتە بچووکانە سەرت دێشێنم، شتەکانی من کە لای پیرێژن بە بارمتە دامنابوون، نرخیان دەگاتە پێنج ڕۆبڵ، بەڵام لەبەر

ئەوەی یادگارین و لە کەسانی ترەوە پێم دراون، بەلامەوە زۆر بە نرخن، بۆیە کە لە بەسەرهاتەکە ئاگادار بووم، دانی پێدا دەنێم زۆر ترسام..
ڕازومیخین هەر بە دەستی ئانقەست وتی:
- کەواتە بڵێ لەبەر ئەمە بوو کاتێک دوێنێ بە زوسیموفم وت پۆرفیری لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەوانەدا دەکات کە بە بارمتە شتیان لای پیرێژنەکە داناوە، تۆ ڕاپەڕیت!
لێرەدا جامەکە پڕ بوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ نەیتوانی خۆی بگرێت و بەو چاوانەوە کە لە ڕقا ئاگریان لێدەبووەوە، تەماشایەکی ئەوی کرد، بەڵام زوو هاتەوە سەر خۆی و بە تووڕەییەکی دەستکرد بەڵام زیرەکانە وتی:
- هاوڕێ، پێدەچێت تۆ قەشمەریم پێبکەیت؟ من دان بەوەدا دەنێم، دەشێت بۆ ئەو شتانەی کە ڕەنگە لای تۆ هیچ نەبن، من لەڕادەبەدەر نیگەران بم، بەڵام نابێت لەبەر ئەوە من بە خۆپەسەند و ڕژد دابنێیت. ڕەنگە لە دیدی مندا ئەو دوو شتە بچووک و بێنرخە بە هیچ شێوەیەک وەک ڕوانینی تۆ نەبێت بۆیان. من هەر ئێستا پێموتیت کە ئەو سەعاتە زیوەی ڕەنگە پولێک نەهێنێت. تاقە شتێکە کە لە باوکمەوە بۆم ماوەتەوە، پێم پێبکەنە، وەلێ دایکم هاتوە بۆ لام..
بەدەم وتنی ئەم قسانەوە ڕووی لە پۆرفیری کرد، بەڵام زۆر زوو دیسانەوە گەڕایەوە لای ڕازومیخین و بە تۆنی دەنگێکەوە کە خۆی مەبەستی بوو بلەرزێ، وتی:
- خۆ ئەگەر بزانێت سەعاتەکە فەوتاوە، سوێند دەخۆم زۆر بە سەختی نارەحەت دەبێت، ئاخر ئەم ژنانەیش!
ڕازومیخین بە خەمێکەوە وتی؟

- بە هیچ جۆرێک وا نییە، من هەرگیز مەبەستم ئەوە نەبووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە!

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە نائارامییەکەوە کەوتە بیرکردنەوە: "باش بوو؟ سروشتی بوو؟ زێدەڕۆیم نەکرد؟ بۆ وتم: ئەم ژنانە!"

پۆرفیری لە خۆوە پرسی:

- کەواتە دایکت هاتووە بۆ لات؟

- بەڵێ.

- کەی؟

- دوێنێشەو.

پۆرفیری وەک بیر بکاتەوە، بێدەنگ بوو، پاشان لەسەرخۆ و بە ساردییەوە وتی:

- هەرگیز شتەکانت لەناو ناچن، ئاخر، ماوەیەکە من چاوەڕێی تۆم.

وەک هیچ ڕووی نەدابێت، ڕووی لە ڕازومیخین کرد و تەپڵەکی جگەرەکەی لێ نزیک خستەوە، چونکە بێبەزەییانە بە سووتووی جگەرەکەی فەرشەکەی پیس دەکرد. ڕاسکۆلنیکۆڤ بە قسەکانی پۆرفیری داچڵەکی، بەڵام ئەو خۆی بە جگەرەکەی ڕازومیخینەوە خەریک کرد و وای نیشان دا کە سەیری ناکات.

ڕازومیخین هاواری کرد:

- چۆن؟ چاوەڕێی بوویت؟ بۆ دەتزانی کە ئەو لەوێ شتی بە بارمتە داناوە؟

پۆرفیری پتروڤیچ ڕاست ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و پێی وت:

- شتەکانت، ئەموستیلە و سەعاتەکەی لای ئەو بە کاغەزێکەوە پێچرابوو، ناوی تۆیشی بە ڕوونی لەسەر نووسراوە، هەروەها مێژووی ئەو ڕۆژەی کە شتەکانی لێ وەرگرتوویت..

- چۆنە ئاوا وردەکاریت؟
لەگەڵ ئەم وشانەدا ڕاسکۆلنیکۆڤ زەردەخەنەیەکی سووک و ناڕەحەتی کرد و ویستی بە تایبەتی ڕاستەوخۆ لە چاوی پۆرفیری بڕوانێت. بەڵام خۆی نەگرت و لەپڕێکدا لەسەری ڕۆشت:
- من بۆیە ئێستا ئەو باری سەرنجەی خۆمم خستە ڕوو، چونکە بێگومانم کە ئەوانەی شتیان بە بارمتە لای پیرێژنەکە داناوە، زۆرن.. زەحمەتە ناوی هەموو ئەوانە لە بیردا بمێنن.. بەڵام تۆ بە پێچەوانەوە بە چاکی ناوی هەموویان دەزانیت و..
پاشان لەگەڵ خۆیدا کەوتە بیرکردنەوە: "دەبەنگییە، لاوازییە! بۆ ئەم ڕستەیەم وت!"
پۆرفیری بە زەردەخەنەیەکەوە کە بۆنی گاڵتەپێکردنی لێدەهات، وتی:
- ئاخر، تا ڕادەیەک هەموو خاوەن بارمتەکان دەناسم و تۆ تەنیا کەسێکیت کە تا ئێستا نەهاتوویتەتە ئێرە.
- من نەخۆش بووم.
- ئەمەیشم بیستووە، تەنانەت ئەوەیشم بیستووە کە لەسەر مەسەلەیەک زۆر پەرێشان بوویت..
ئێستایش لەوە دەچێت ڕەنگت هەر پەڕیبێت؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەپڕا دەنگی گۆڕی و بە ڕەقی و بەربەرەکانیکردنەوە قسەکانی پێبڕی.
- هەرگیز ڕەنگم نەپەڕیووە.. بە پێچەوانەوە تەندروستیم زۆر باشە.
تووڕەییەکەی ئەمەندە جۆشی سەندبوو، توانای دامرکاندنەوەی نەبوو، بە خۆی وت: "دەترسم لەم ڕق هەستانەدا ئەوەی کە نابێت بیڵێم، بیڵێم! بە ڕاست ئەمانە بۆ هێندەم ئازار دەدەن!".
ڕازومیخین کەوتە قسە:

- تەندروستیت زۆر باشە! چ قسەیەکی بێمانا! تا ئەندازەیەک هەتا دوێنێشەو لە بێهۆشی و وڕێنەکردندا بوو.. پۆرفیری باوەڕ دەکەیت، بە زۆر لەسەر پێ دەوەستا، وەلێ هەر ئەوەندەی ئێمە، یەعنی من و زوسیموف، دوێنێ ئاوڕمان دایەوە، جلی لەبەر کرد و لەسەرخۆ تێی تەقاند، کەس نەیزانی تا نیوەشەو لە کوێ گەڕاوە. دیسان دەیڵێمەوە کە بە تەواویی لە حاڵەتی وڕێنەکردندا بوو، ئاخر، تۆ دەتوانیت بیهێنیتە بەرچاوت، ڕێکەوتێکی زۆر سەرنجڕاکێش!

پۆرفیری ڕێک وەک ژنەلادێیی سەری ڕاوەشاند و بە ئاوازێکی تایبەتەوە وتی:

- بەڕاست، بە تەواوی لە حاڵەتی وڕێنەکردندا بوویت؟ تۆ تەماشا!

- ئاە، قسەکانی هیچ و بێمانان، باوەڕی پێمەکە، تۆ خۆیشت بەبێ ئەوەی من بیڵێم باوەڕ ناکەیت.

ئەم وشانە بە ڕقێکی ئەستوورەوە لە دەمی ڕاسکۆلنیکۆڤ هاتنە دەرێ، بەڵام پۆرفیری پترۆڤیچ خۆی نەکرد بە خاوەنی.

ڕازومیخین لەپڕێکدا بە تووڕەییەوە وتی:

- ئاخر، ئەگەر لە وڕێنەکردندا نەبوویتایە، چۆن دەبوو بچیتە دەرەوە؟ بۆ چوویتە دەرەوە؟ لەبەر چی؟.. بەتایبەتیش، بۆ بە دزییەوە ڕۆیشتی؟ ئاخر، ئایا تۆ لەو کاتەدا ئەقڵت هەبوو؟ ئێستا کە ئیدی هەموو مەترسییەک تێپەڕیووە، بۆیە وا بەبێ پەردە دەدوێم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کتوپڕ پێکەنینێکی بوێرانەی کرد و بە پۆرفیری وت:

- دوێنێ بە تەواویی بێحەوسەڵەیان کردبووم، منیش لە تاوا هەڵاتم، بۆ ئەوەیماڵێک بە کرێ بگرم و ئیتر نەمدۆزنەوە، پارەیەکی باشیشم لەگەڵ خۆمدا برد، ئەم جەنابی زامیوتوفە پارەکانی بینی، باشە،

جەنابی زامیوتوف دوێنێ من ئەقڵم تەواو بوو یان وڕێنەم دەکرد، تۆ دادوەر بە.
لەو کاتەدا ئامادە بوو زامیوتوف بخنکێنێت، تەماشاکردن و بێدەنگییەکەی زامیوتوف ئازاری دەدا و لەڕادەبەدەریش تووڕەی کردبوو.
زامیوتوف بە وشکی وەڵامی دایەوە و وتی:
- بە ڕای من تۆ تەواو ئاقڵانە و تەنانەت زۆریش زرنگانە قسەت دەکرد، بەڵام گەلێک تووڕە بوویت.
پۆرفیری بۆی زیاد کرد:
- ئەمڕۆیش نیکودیم فومیچ پێی وتم کە دوێنێشەو، لە درەنگوەختا، لە ماڵی ئەو کارمەندەدا کە ببوو بە ژێر گالیسکەوە، تۆی بینیبوو..
ڕازومیخین بە دوایدا چوو:
- باشە، تەنانەت ئەو کارمەندە: ئایا ئەو کاتەی لە ماڵی ئەو کارمەندە بوویت، هەڵسوکەوتی تۆ شێتانە نەبوو؟ دوافلست دایە بێوەژنەکە بۆ ناشتنی تەرمەکەی! باشە، هەر دەتویست کۆمەکی بکەیت، پانزە ڕۆبڵت پێبدایە، بیست ڕۆبڵت پێبدایە، هیچ نەبێت سێ ڕۆبڵت بۆ خۆت بهێشتایەتەوە،

کەچی تۆ ڕێک بیست و پێنج ڕۆبڵەکەت کردە دەستییەوە.
- کێ دەڵێت من خەزینەیەکی پارەم نەدۆزیوەتەوە و تۆ نایزانیت؟ لەبەر ئەوە من دوێنێ دەستکراوە بووم.. وەرە، جەنابی زامیوتوف ئەوە دەزانێت کە من گەنجینەیەکی پارەم دۆزیوەتەوە!..
پاشان ڕووی لە پۆرفیری کرد و بە لێوەلەرزەوە وتی:

- داوای لێبوردنت لێدەکەم کە نیو سەعاتە بەم قسە بێمانا و پووچانەوە سەرمان ئێشاندویت، بێتاقەت بوویت، نا؟
- ببوورە، بە پێچەوانەوە، بە پێچەوانەوە! ئەگەر دەزانیت من چەند پێم خۆشە و تۆم مەبەستە، هەم بینینی خۆت و هەم گوێگرتن لە قسەکانت.. من زۆر بەوە دڵخۆشم کە دواجار تەشریفت هێنایە ئێرە.
ڕازومیخین دەنگی هەڵبڕی و بە پۆرفیری وت:
- هیچ نەبێت چایەکمان بدەرێ، گەرووومان وشک بوو.
- بیرێکی هەرە چاکە، ڕەنگە بۆ کارەکەیشمان زۆر باش بێت، بەڕاست، لە پێش چایەکەدا شتێکی ترت ناوێت کە پەیوەندییەکە کۆکتر بکات؟
- بڕۆ لاچۆ!
پۆرفیری پتروڤیچ ڕۆیشتە دەرەوە تا فەرمانی چایان بۆ بدات. لێکدانەوە وەک گێژەڵووکە لەسەری ڕاسکۆلنیکۆڤدا هەڵیکردبوو، زۆر خرۆشابوو، بە خۆی وت: "لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە نە شت دەشاردنەوە و نە ڕوودەربەستییان هەیە! ئاخر، ئەگەر تۆ هیچ من ناناسیت، ئەی بۆ لە بارەمەوە لەگەڵ نیکودیم فومیچدا قسە دەکەیت؟ دیارە ئیتر نایانەوێت ئەوە لە من بشارنەوە کە چۆن وەک ڕەوەسەگێک بەدوامەوەن! ئەمانە بە کورتی و پوختی تف لە ناوچاوم دەکەن.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لە ڕکا دەلەرزی:
(باشە، بە ئاشکرا پەلامارم بدەن، بۆ یاریی مشک و پشیلەم لەگەڵدا دەکەن؟ ئەمەیان بێئەدەبییە، ئاخر پۆرفیری پتروڤیچ، ڕەنگە ئیتر من چاوپۆشی نەکەم! هەڵدەستمە سەر پێ و هەموو ڕاستییەکان بە ناوچاوتاندا دەکێشم، ئەوسا دەزانن چەندم ڕق لێتانە!)

بە زەحمەت هەناسەیەکی دا.
ئەی ئەگەر هەموو ئەمانە خەیاڵی ڕووت بن چۆن؟ ئەگەر لە تراویلکەیەک زیاتر هیچ نەبن و من لە هەموویاندا هەڵە بم، چی؟ ئەگەر توورە و ترۆییەکەم لە بێئەزموونی و نواندنی ئەو دەورە خراپە بێت، کە دەمەوێت بیبینم، چۆن؟ دەشێت گشت ئەم شتانەی کە دەیڵێن، چ مەبەستێکیان لە دواوە نەبێت و قسەکانیان ئاسایی بێت؟ بەڵام لەگەڵ ئەمانەیشدا شتێکیان هەر تیایە.. دەشێت ئەم قسانە هەمیشە بکرێن، وەلێ شتێک هەر هەیە! بۆچی ئەو ڕێکورەوان وتی: "لای ژنەکە؟" ئەی بۆ زامیوتوف لەسەری ڕۆیشت و وتی من " زرنگانە" دەدوێم؟ بۆ ئەمانە بەو ڕیتمەوە قسەیان لەگەڵدا کردم؟ بەڵێ.. بەو ڕیتمە.. خۆ ڕازومیخینیش لێرە دانیشتووە، ئەی بۆ هیچ گومانێک ناکات؟ بۆ ئەم مرۆڤە سادە و ساکارە هیچی بە خەیاڵدا نایەت؟ دیسان تا دایگرتمەوە! ئایا پۆرفیری چاوی لێداگرتمەوە یان نا؟ بێگومان ئەمە خەیاڵێکی ڕووتە، بۆ چاوم لێدابگرێت؟ دەیانەوێت دەمارم بەگیر بێنن و سەربنێنە سەرم؟ یان هەموو خەیاڵێکی ڕووتە و هیچی تر.. یان هەموو شتێک دەزانن! تەنانەت زامیوتوفیش بێئابڕووە.. بەڕاست زامیوتوف بێئابڕووە؟ زامیوتوف شەو بیری گۆڕی، من هەستم دەکرد کە بیری دەگۆڕێت، لێرە وەک ماڵی خۆی ڕەفتار دەکات، لە کاتێکدا کە ئەمە یەکەمین جارە بێتە ئێرە. پۆرفیری وەک میوان لێی ناڕوانێت، پشتی تێکردووە و دانیشتووە. بوونەتە هاوڕێی یەکتری! حەتمەن بە هۆی منەوە بوونەتە هاوڕێ! بێگومان پێش هاتنی ئێمە لەبارەی منەوە قسەیان کردووە.. ئایا لەبارەی خانووەکەوە هیچ دەزانن، خۆزگا زووتر بمزانیایە.. کە وتم دوێنێشەو هەڵاتووم تا بڕۆم خانوویەک بە کرێ بگرم، خۆی لێ نەبان کرد و هیچی نەوت. وەلێ

من ئەو مەسەلەیەم زیرەکانە هێنایە پێشێ، بۆ ئایینده کەڵکی لێدەبینم، واتا لە کاتی وڕێنەکردندا بووم.. هە هە، هە! ئەو لەبارەی شەوی پێشووەوە هەموو شتێک دەزانێت! ئاگای لە هاتنی دایکم نییە!.. بەڵام ئەو پیرێژنە سیحربازە تەنانەت مێژووی ڕۆژەکەیشی بە قەڵەم نووسیووە! درۆ دەکات، بڕوای پێناکەم! ئاخر هەموو ئەم شتانە هێشتا بەڵگەی تەواو نین، هەر خەیاڵ و وێناکردنن! نا، ئێوە ئەگەر ڕاست دەکەن بەڵگەی دڵنیاکەر بێنن، تەنانەت خانووەکەیش چ بەڵگەیەکی لەسەر نییە، هەر وڕێنەیە. من دەزانم چییان پێدەڵێم.. ئایا لەبارەی خانووەکەوە هیچ دەزانن؟ تا تێنەگەم ناڕۆم، بەڕاست من بۆ هاتووم؟ بەڵام هەر ئەم تووڕەییەی ئێستای من، بەڵگەیەکی چاکە، ئاه چەندە تووڕەم! ڕەنگە چاکیش بێت، نیشانەی نەخۆشییە.. ئەو دەیەوێت تاقیم بکاتەوە، دەیەوێت هەستم پەرت بکات، بۆ هاتوومەتە ئێرە؟"

هەموو ئەمانە وەک بروسکە بەسەریدا تێپەڕین، پۆرفیری پتروڤیچ دوای چرکەساتێک گەڕایەوە و خۆشحاڵ هاتە پێشچاو، بە ئاوازێکی تەواو جیاواز، بەدەم پێکەنینەوە بە ڕازومیخینی وت:

- دەزانیت هاوڕێ، من لە دوێنێشەوەوە سەرم، تۆ بڵێ هەموو لەشم تێک چووە.

- شەوێکی خۆش بوو، وانییە؟ ئاخر، من دوێنێشەو ئێوەم لە کاتێکی زۆر خۆشدا بەجێ هێشت، کێ سەرکەوت؟

- دیارە، کەس سەرنەکەوت، دەستکرا بە باسی نەمری و کەوتینە فڕین بە ئاسمانەکاندا.

- ڕودیا بیهێنە بەرچاوت، باسیان لەسەر چی کردووە: ئایا تاوان بوونی هەیە یان نا؟ قسەی قۆڕ.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ئاسایی وتی:
- جا ئەوە چییە؟ مەسەلەیەکی ئاسایی کۆمەڵایەتییە.
پۆرفیری وتی:
- پرسیارەکە وا نەکرابوو.
ڕازومیخین خێرا و وەک هەمیشە بە گەرمی و پەرۆشەوە وتی:
- ڕاستە، پرسیارەکە هەرگیز وانەبوو، بڕوانە ڕودیا، گوێ بگرە و دوایی ڕای خۆت دەرببڕە، من ئەمەم دەوێت، من دوێنێ لەگەڵ ئەمانەدا شێت ببووم و بە تەمای هاتنی تۆ بووم، پێم وتبوون کە تۆ دێیت، چیرۆکەکە لە باری سەرنجی سۆشیالیستەکانەوە دەستی پێکرد، دیارە بۆچوونی ئەوان ئاشکرا و ڕوونە: تاوان، ناڕەزایی دەربڕینە دژی خراپیی ڕژێمی کۆمەڵایەتی، هەر ئەمەندە و هیچی تر، هۆکاری تر بۆ تاوانکردن نییە و هەر ئەوەیە.
پۆرفیری پتروڤیچ دەنگی هەڵبڕی:
- بینیت چۆن درۆت کرد!
دیار بوو کە پۆرفیری زۆر شادمان بوو، بە بینینی ڕازومیخین پێکەنینی دەهات و زیاتر دەیجووڵاند.
ڕازومیخین بە گەرمی قسەی پێبڕی و وتی:
- هیچ هۆکارێکی تر بە ڕاست نازانن، درۆ ناکەم! من کتێبی سۆشیالستەکانت پیشان دەدەم. بە باوەڕی ئەوان هەموو شتێک بەرئەنجامی "ستەمی کۆمەڵایەتییە" و هیچی تر نییە، ئەم ڕستەیەیان زۆر خۆش دەوێت، هەر لەبەر ئەوەیە کە ڕاستەوخۆ ئەنجامگیریی ئەوە دەکەن، کە ئەگەر کۆمەڵگا بارێکی سروشتیی هەبێت، هەرچی تاوان هەیە لەناو دەچێت و نامێنێت، چونکە ئیدی هۆکارێک نامێنێتەوە بۆ دەربڕینی ناڕەزایی و هەموویش بە زووترین کات چاک دەبن.

سۆشیالستەکان گوێ بە سروشت نادەن، سروشت هەر دەخەنە لاوە، بە لای ئەوانەوە مرۆڤێک کە گۆڕانی سروشتی و مێژوویی خۆی هێنابێتە کۆتایی، ناتوانێت کۆمەڵگایەکی سروشتی و گونجاو بهێنێتە دی. بەڵکو بە پێچەوانەوە، "ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی" کە لە مێشکی زانایەکی ماتماتیکزانەوە سەرچاوەی گرتبێت، یەکسەر بە تەواوی باری مرۆڤەکە دروست دەکات و بێتاوان و چاک دەیڕەخسێنێت. ئەم کارە گەلێک خێراتر و زووتر لە هەر ڕووداوێکی سروشتی و ژیانیی دی ئەنجام دەگرێت، هەر لەبەر ئەمەیە کە سۆشیالیستەکان لە ناخی خۆیاندا ڕقیان لە مێژووە، دەڵێن لە مێژوودا "تەنیا ناشیرینی و گەمژەیی" هەیە. هەموو شتێکیش تەنیا لە ڕوانگەی "گەمژەییەوە" ڕاڤە دەکەن، بۆیە ڕقیان لە ڕەوتی سروشتیی ژیانە، بە لای ئەوانەوە ڕۆحی زیندوو پێویست نییە، ئاخر، ڕۆحی زیندوو ژیانی گەرەکە، ڕۆحی زیندوو سەر بۆ میکانیکیەت دانانەوێنێت، ڕۆحی زیندوو گومانکارە، ڕۆحی زیندوو لەگەڵ ڕابوردوودا پەیوەندیی هەیە و دەربەستە پێوەی. بەڵام ئەو کەسەی کە بۆنی مردووی لێدێت، دەتوانیت لە کایوچویش دروستی بکەیت، بەڵام ئیتر ئەوە زیندوو نییە، ویستی نییە، بەندەیەکە و سەرپێچی ناکات، ئەنجام وا دەکەوێتەوە کە هەموو شتێک پابەندە بە ئەندازەی قاڵبی خشت و ڕاڕەو و ژوورە تایبەتییەکانی سۆشیالیستەکانەوە. با گریمانەی ئەوە بکەین کە ژووری سۆشیالیستەکان ئامادەیە، بەڵام ئەی دوایی، سروشتی ئێوە هێشتا بۆ کەڵکوەرگرتن لەو جۆرە ژوورانە ئامادەگیی نییە، سروشتی ئێوە ژیانی دەوێت، هێشتا ڕێگەی ژیانی نەبڕیووە و زووە بۆ چوونە گۆڕستان! تەنیا بە لۆژیک ناتوانین بەسەر سروشتی مرۆڤایەتیدا باز بدەین و خۆمانی لێ گێل بکەین، دەشێ لۆژیک پێشبینیی سێ حاڵەت

بکات، لە کاتێکدا کە ژمارەی حاڵەت لە ملیۆنان تێدەپەڕێت. دەکرێت چاو لەو ملیۆنانە بپۆشین و هەموو مەسەلەکان تەنیا ببەستینەوە بە خۆشگوزەرانییەوە. ئەمە ئاسانترین ڕێگەچارەی کێشەکانە! مەسەلەکە بە شێوەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش ڕوونە و پێویستی بە بیرکردنەوە نییە، بەڵێ، لە هەموو گرنگتر ئەوەیە کە پێویست بە بیرکردنەوە ناکات. بەم شێوەیە هەموو نهێنیەکانی ژیان لە دوو پەڕەی چاپکراودا جێی دەبێتەوە.

پۆرفیری پێکەنی و وتی:

- تەماشا چۆن هەڵچووە، دەبێت دەستوپێی ببەسترێتەوە!

پاشان ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و وتی:

- دوێنێشەویش هەر ئەم بەزمە بوو، لە ژوورێکدا شەش دەنگی جیاواز لە یەک کاتدا بەرزدەبووەوە، بێ لەوەیش لە پێشدا سەرخۆشی کردین، دەتوانیت وێنای بکەیت؟ نا، هاوڕێ، تۆ هەڵەیت، "ژینگە" دەوری گرنگی هەیە لە تاواندا، من لەگەڵ ئەم ڕایەدام.

- خۆیشم دەزانم دەوری گرنگی هەیە، بەڵام تۆ پێم بڵێ ئەگەر پیاوێکی تەمەن چل ساڵان ئابڕووی کچێکی تەمەن دە ساڵانی برد، ئایا ژینگە وای لێکردووە کە ئەو تاوانە بکات؟

پۆرفیری بە ویقارێکی سەرنجڕاکێشەوە وتی:

- ئەی بۆ! ئەگەر بە قووڵی لێی بڕوانین، دەشێت ئەوە ناچاری کردبێت. ئەو تاوانەی دەرهەق بەو کچە کراوە، بە چاکی و بەڵکو و زۆر بە چاکی دەتوانیت بیبەستیتەوە بە چۆنیەتیی ژینگەوە.

ڕازومیخین خەریک بوو شێت بێت، هاواری کرد:

- دەتەوێت هەر ئێستا پێت بسەلمێنم کە تۆ پێڵووت سپییە، هەر لەبەر ئەوەیش سپییە، کە بەرزایی زەنگی کڵێسای قەشە یوحەنا

حەفتاوحەوت مەتر دەبێت، ئەتوانم زۆر باش ئەمە بسەلمێنم، زۆر بە وردی و بەپێی ڕەوشی ڕوناکبیران و تەنانەت بە شێوازی لیبرالیستەکان. قەولت دەدەمێ کە دەتوانم، باشە، دەتەوێت گرەو بکەین؟

- باشە، دەیکەم، وا گوێ دەگرین بزانین چۆن ئەمە دەسەلمێنیت!

ڕازومیخین لە جێگاکەی هەستا، دەستی ڕاوەشاند و دەنگی هەڵدا:

- ئاخر، ئەم شەیتانە بە تەواویی خۆی لێ نەبان کردووە، لەگەڵ تۆدا پێویست بە قسەکردن ناکات، ئاخر هەموو ئەمانە بە دەستی ئانقەست.. ڕادیون، تۆ هێشتا نایناسیت، دوێنێشەویش هەر لایەنی ئەوانی گرت تا پێیان ڕابوێرێت، جا دوێنێشەو نازانی چی دەوت، خودایا! ئەوانیش دڵیان پێی خۆش بوو.. ڕەنگە تا دوو هەفتە لەسەر ئەم باوەڕە بمێنیت. پار نەماندەزانی بۆ ئێمەی لەوە دڵنیا دەکرد، کە دەیەوێت تەرکی دنیا بکات، دوو مانگی تەواو جەختی لەسەر ئەمە کرد، ماوەیەک لەمەوبەرییش لە بیری ئەوەدا بوو دڵنیامان بکات کە دەیەوێت ژن بهێنێت و هەموو شتێکی بۆ مارەبڕین ئامادە کردووە، تەنانەت بەرگی تازەی دابووە کردن و ئێمەیش پیرۆزباییمان لێکرد، بەڵام نە ژن لەئارادا بوو، نە هیچ شتێکی دی، هەر هەمووی درۆ بوو.

- تۆ درۆ دەکەیت، من پێشتر بەرگم بەکرد دابوو، هەر لەبەر خاتری بەرگی تازەیش بوو کە هات بەسەرما و بە هەمووتانم ڕابوارد.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەرخۆ وتی:

- بەڕاست تۆ دەتوانیت ئاوا بە چاکی دەور ببینیت؟

- تۆ وات دەزانی نا؟ ڕاوەستە، تۆیش فریوو دەدەم هە، هە، هە! نا، گوێ بگرە، ڕاستییەکەت بە تەواوی پێدەڵێم، بەم بۆنەیەوە هەموو ئەم مەسەلانەی لەبارەی تاوان و ژینگە و کچۆڵەکانەوە کە لێی دواین،

وتارێکی کورتی تۆیان بیر هێنامەوە، وتارێک وابزانم ناونیشانەکەی "دەربارەی تاوان" یان شتێکی لەو بابەتە بوو، باش لە بیرم نەماوە، بەڵام هەمیشە سەرنجی ڕادەکێشام، دوو مانگ لەمەوبەر دەرفەتی خوێندنەوەییم لە گۆڤاری "گوتەی مانگانە"دا دەست کەوت و چێژم لێوەرگرت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە سەرسامییەوە وتی:

- وتاری من؟ لە گۆڤاری "گوتەی مانگانە"دا؟ ڕاستە، شەش مانگ لەمەوبەر، ئەو کاتەی وازم لە زانکۆ هێنا، وتارێکم دەربارەی کتێبێک نووسی، بەڵام من وتارەکەم دا بە "گوتەی هەفتانە" کە گۆڤارێکی هەفتانەیە، نەک "گوتەی مانگانە" کە گۆڤارێکی مانگانەیە.

- وتارەکە بوو بە نسیبی "گوتەی مانگانە".

- بەڵێ، چونکە گۆڤاری "گوتەی هەفتانە" ئیتر دەرنەچوو، بۆیە وتارەکەیان ئەو کاتە چاپ نەکرد..

- ڕاستە، لەبەر ئەوەیش کە "گوتاری هەفتانە" ئیتر چاپ نەکرا، لەگەڵ "گوتەی مانگانە"دا دایان لەیەک، بۆیە وتارەکەت دە مانگ لەمەوپێش لە "گوتەی مانگانە"دا بڵاوکرایەوە، تۆ نەتزانیووە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ڕاستی ئاگای لێنەبوو.

- گوێ بگرە، دەتوانیت لە پاداشتی وتارەکەتدا پارەیان لێوەربگریت، بەڵام کەی تاقەتی ئەوەت هەیە! وا خۆت لە ژیان تەریک کردووە تەنانەت لەو شتانەیش بێئاگایت، کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە خۆتانەوە هەیە، ئیتر ئەمەیان هەقیقەتە.

ڕازومیخین بە دەنگی بەرز وتی:

- ئافەرین ڕودیا، منیش ئەمەم نەزانیووە، هەر ئەمڕۆ دەچمە کتێبخانە و ئەو ژمارەیە وەردەگرم، مانگێک لەمەوبەر؟ ڕۆژەکەی کەیە؟ کێشە

نییە، پەیدای دەکەم، سەیرە! وتار بڵاو دەکەیتەوە و بە کەسیش ناڵێیت؟

- بەڵام تۆ چۆن زانیت ئەوە وتاری منە؟ من تەنیا بە پیتێک مۆرم کردووە.

- تەواو بە ڕێکەوت، ئەوەیش چەند ڕۆژێک لەمەوبەر زانیم، بەڕێوەبەری گۆڤارەکە پێی وتم، ئاشنایەتیمان هەیە.. زۆرم بەدڵ بوو.

- وەک لە یادم بێت، باسی باری دەروونیی بکوژێکم کردووە بە درێژایی ماوەی تاوانەکەی.

- وایە، پێ لەسەر ئەوەیش دادەگریت، کە بڵێیت ئەنجامی تاوان هەمیشە نەخۆشیی لەگەڵدایە، بیرۆکەیەکی زۆر تازەیە، وەلێ ڕاستییەکەی بۆ من ئەو بەشەی وتارەکە زۆر بایەخی نەبوو، بەڵکو بیرۆکەیەک کە لە کۆتایی وتارەکەدا دەردەکەوت و بەداخەوە تۆ ئاماژەیەکی شاراوەت پێداوە، گرنگ بوو.. بە کورتی ئەگەر لە یادت مابێت، ئاماژەیەکی وای تێدا بوو، کە کەسانێک لە دنیادا هەن دەتوانن.. واتا نەک دەتوانن، بەڵکو بە ڕاستی مافی ئەوەیان هەیە، دەست بۆ هەر تاوان و کارێکی ناشیرین ڕابکێشن و بیکەن، وەک ئەوەی چ یاسایەک بۆ ئەوان نەنووسرابێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە گۆڕین و شێواندنی زۆر و دەست ئەنقەستی بیرۆکەکەی زەردەخەنەیەکی هاتێ.

ڕازومیخین بە سەرسامییەکی زۆررەوە پرسی:

- چۆن؟ چی بوو؟ هەقدان بە تاوانکردن؟ ئەمە هەرگیز نابێت نەک لەبەر ئەوەیش کە دەوروبەر؟

پۆرفیری وەڵامی دایەوە:

- نا، نا، نا نەک تەنیا لەبەر ئەوە، قسە لەوەیە کە وتارەکەی خەڵکی دەکات بە دوو بەشەوە، بەشێکی "ئاسایی" و بەشێکی "نائاسایی" خەڵکیی ئاسایی دەبێت ملکەچ بن و پەیڕەوی لە یاسا بکەن و نەیبەزێنن، لەبەر ئەوەی کە ئەوان "ئاساییین"، وەلێ خەڵکی نائاسایی مافی ئەوەی هەیە تاوان بکات و یاسایش ببەزێنێت، تەنیا لەبەر ئەوەی کە "نائاساییین". ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم، وا دەزانم تۆ وات نوسیبوو؟

ڕازومیخین بە سەرسامییەوە لەبەر خۆیەوە وتی:

- ئاخر ئەمە چۆن دەبێت؟ شتی وا مەحاڵە.

دیسانەوە ڕاسکۆلنیکۆڤ زەردەخەنەیەکی کرد، یەکسەر زانی مەسەلەکە چییە و دەیانەوێت بەرەو کوێی بەکێش بکەن، وتارەکەی خۆی لە بیر بوو، بڕیاری دا بڕواتە ناو شەڕەکەوە، زۆر خاکییانە و بە سادەیی وتی:

- من هەرگیز لە نووسینەکەمدا ئەمەم مەبەست نەبووە، وەلێ دان بەوەدا دەنێم کە تۆ تا ڕادەیەکی باش بیرۆکەکەی منت دەربڕی. تەنانەت ئەگەر ڕاستت دەوێت زۆر بە چاکی و دەستپاکییەوە.. "پێدەچوو ئەو دانپیانانەی پێ خۆش بێت" تاقە جیاوازییەک کە هەبێت، ئەوەیە من هەرگیز جەخت لەسەر ئەوە ناکەم کە خەڵکیی نائاسایی، وەک تۆ دەڵێیت، بۆیان هەبێت هەموو تاوان و سەرپێچییەک بکەن. من بێگومانم کە وتاری لەو بابەتە تەنانەت مۆڵەتی چاپکردنیشی نادرێت. من تەنیا و تەنیا ئاماژەکەم وا کردووە کە کەسی "نائاسایی" مافی ئەوەی هەیە.. واتا نەک ئەوەی کە مافی یاسایی هەبێت، بەڵکو دەتوانێت ڕێگە بە ویژدانی خۆی بدات هەنگاو بەسەر هەندێک بەربەستا بنێت. ئەمەیش تەنیا لە یەک حاڵەتدا دەبێت، ئەویش ئەوەیە

کە ئەنجامدانی بیرۆکەکەی (کە دەشێت ببێتە هۆی ڕزگارکردنی ڕەگەزی مرۆڤایەتی) پێویستی بە هەنگاونانێکی وا هەبێت. تۆ دەفەرموویت وتارەکەم ڕوون نییە، من ئامادەم تا ئەو جێگایەی بخوازێت، ڕوونی بکەمەوە.. ڕەنگە هەڵە نەبم ئەگەر بڵێم کە تۆیش ئەمەیانت دەوێت، کەواتە فەرموو: بە ڕای من ئەگەر دۆزینەوەکانی لە بابەتی کپلەر و نیوتن بە هۆی کۆمەڵێک پێشهاتەوە نەهاتنایەتە دی و خەڵک نەیزانیایە ئەگەر ژیانی یەکێک یان دە، یان سەد و زیاتریش نەکرانایەتە قوربانی، ئەوسا نیوتن مافی ئەوەی هەبوو، یان هەر ئەرکی سەرشانی بوو.. کە ئەو دە یان سەد کەسە لەناو بەرێت بۆ ئەوەی دۆزینەوەکەی پێشکەش بە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بکات. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە نیوتن مافی ئەوەی هەبێت بە ئارەزووی خۆی کێی بوێ بیکوژێت، یان هەموو ڕۆژێک لە بازاڕدا دزی بکات. من لە بیرمە لە وتارەکەمدا ئەوەم ڕوون کردۆتەوە کە هەموو یاسادانەر و بنیاتنەرانی بناغەی مرۆڤایەتی، لە کۆنەوە بیگرە تا تازەیان، لە لیکورک و سۆلۆن و محەمەد و ناپلیۆن و هی ترەوە، هەموو ئەمانە بەبێ هەڵاوێردکردن تاوانبارن، هەر هیچ نەبێت لەبەر ئەوەی بەهێنانی یاسای نوێ، یاسا کۆنەکە کە لەلای خەڵکی پیرۆز و لە باوک و باپیریانەوە بۆیان مابووەوە، لەناویان برد، بێگومان لە خوێنڕشتنیش دەستیان نەپاراستووە، ئەگەر بە ڕاستی ئەو خوێنە (کە هەندێکجار زۆر بێتاوانانە و تەنیا بۆ پاراستنی یاسا کۆنەکانیان دەیانڕشت) کارئاسانیی بۆ ئەنجامدانی پەیامەکەیان کردبێت. مایەی سەرنجدانە کە زۆربەی ئەو کەسانەی کاری چاکیان کردووە و بنەمای مرۆڤایەتییان داڕشتووە، کەسانێکی گەلێک خوێنڕێژ بوون. بە کورتی، ئەنجامگیرییەکەی من وایە، کە نەک تەنیا کەسانی مەزن،

بەڵکو تەنانەت ئەو کەسانەیش کە کەمێک لە دەرەوەی چوارچێوەی ئاسایین، یەعنی تەنانەت ئەوانەی هەندێک توانای دەربڕینیان هەیە و قسەی تازەیان پێیە، دەبێت بە ناچاری و بەپێی سروشتەکەیان کەمتازۆر یاخی و سەرکێش بن. بێگومان ئەمەیش مەسەلەیەکی ڕێژەییە، ئەگەر وانەبن هەرگیز ناتوانن لەو چوار دیوارە بێنە دەرێ، مانەوەیش لە ناو ئەو چوارچێوەیەدا هەر بەپێی سروشتەکەیان قایلیان ناکات، بە ڕای من خۆیشیان نابێت قایل بن. بە کورتی و پوختی، تا هەنووکە ئەوەی دەیبینن، هیچ مەبەستێکی تازە و نوێ لەئارادا نییە، ئەمە تا ئێستا هەزار جار چاپ کراوە و خوێندراوەتەوە، بەڵام لەبارەی ئەو پۆلبەندیەی لە خەڵکیم کردووە و بە دوو بەشی "ئاسایی" و "نائاسایی" دابەشم کردوون، دانی پێدا دەنێم کە کەمێک سەرەڕۆییم کردووە، وەلێ من جەخت لەسەر ژمارە ناکەم، تەنیا بڕوام بە گەوهەری بیری خۆم هەیە، ئەمەیش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کە خەڵکیی بەپێی یاسای سروشت بەگشتی دەکرێنە دوو بەشەوە: خەڵکیی ئاسایی واتا ئەوانەی کە تەنیا بە کەڵکی زاووزێ دێن، خەڵکانی ڕاستەقینەیش، واتا ئەوانەی کە دەتوانن یان لە خۆیان ڕادەبینن لە دەوروبەری خۆیاندا قسەی نوێ بکەن، هەڵبەتە دەتوانین پۆلبەندیەکی زۆروزەبەندەی لاوەکیش بکەین. وەلێ ئاکاری هەرە تایبەتیی ئەم دوو چینە بە تەواوی دیار و ئاشکرایە، دەستەی یەکەم واتا مادە، بەگشتی ئەو کەسانەن، هەر بە سروشت کۆنەپارێز و بەویقارن، قایل و گوێڕایەڵ دەژین، ڕای من وایە دەبێت ئەوانە هەر بە گوێڕایەڵی بژین، چونکە ئەرکیان ئەوەیە و بە هیچ جۆرێکیش ئەوە بچووکیان ناکاتەوە، دەستەی دووەم هەموو یاسا دەبەزێنن و تا ڕادەیەکیش وێرانکەرن، یان ئارەزووی وێرانکردنیان تیایە.

یاسابەزاندن و تاوانکردنی ئەم جۆرە کەسانە هەڵبەتە ڕێژەیی و گەلێک جیاوازە، ئەمانە لە زۆر ڕووەوە بە دەربڕینی جیاواز خوازیاری ئەوەن بە ناوی ئاییندەوە ئێستا وێران بکەن، خۆ ئەگەر پێویست بکات یەکێک لەوانە بۆ سەرکەوتنی بیروباوەڕەکەی هەنگاو بەسەر لاشەدا بنێت، یان خوێنێک بڕێژێت، بە ڕای من ئەو کەسە دەتوانێت بە پەنامەکی و ویژدانێکی ئاسوودەوە ڕێگە بە خۆی بدات هەنگاو بەسەر لاشەدا بنێت و خوێن بڕێژێت. ئاشکرایە کە ئەم کارە پەیوەندیی بە ناوەڕۆک و گرنگیی بیرەکەیەوە هەیە. ئینجا تۆ سەرنجی ئەوە بدە کە من لە وتارەکەمدا تەنیا بەم مانایە باسم لە مافی بەزاندنی یاسا و تاوانباری کردووە. لە بیرت نەچێت کە باسەکەمان لە مەسەلەی مافەوە دەستی پێکرد. بەهەرحاڵ، ئەمە ترسی زۆری نەگەرەکە، چونکە هەرگیز کۆمەڵانی خەڵک ئەم مافەیان پێنابەخشێت، بە پێچەوانەوە، کەمتازۆر دەیانکوژێت یان لە سێدارەیان دەدات، بەم کارەیش بەویژدانەوە ئەرکی کۆنەپارێزیی خۆی ئەنجام دەدات. نەوەکانی ئاییندەی هەمان ئەو خەڵکانەیش کەمتازۆر گەلێک ستایشی ئەو چەوساوە و کوژراوانە دەکەن و پەیکەریان بۆ دروست دەکەن، هەمیشە دەستەی یەکەم گەورەکانی ئێستان و دەستەی دووەم گەورەی ئاییندەن. یەکەمەکان پارێزگاری لە دنیا و ژیان دەکەن و ژمارەی ئەندامەکانی زیاد دەبن، بەڵام دووەمەکان ژیان دەخەنە جووڵە و بەرەو مەبەست و ئامانجی دەبەن. هەردوولایشیان بە شێوەیەکی یەکسان مافی بوونیان هەیە. بە کورتی، لە دیدی منەوە

هەموویان بە یەکسانی مافیان هەیە! بژی شەڕی هەمیشەیی. تا دەرکەوتنی حەزرەت[1].
- کەواتە تۆ بڕوات بە دەرکەوتنی حەزرەت هەیە؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دڵنیاییەوە وەڵامی دایەوە:
- بڕوام پێیەتی.
لەگەڵ وەڵامەکەی و بە درێژایی قسەکردنە دووروودرێژەکەی چاوی بڕیبووە نوختەیەکی فەرشەکە و سەری دانەواندبوو.
- ئەی.. ئەی بڕوات بە خوایش هەیە؟ بمبوورە کە ئاوا خۆم لە شت هەڵدەقورتێنم.
ڕاسکۆلنیکۆڤ چاوی بەرەو لای پۆرفیری بڵند کرد و وتی:
- بڕوام پێیەتی.
- بڕوات بە زیندوبوونەوەی ئەلازەریش[2] هەیە؟
- بڕوام پێیەتی، تۆ چ کارت بەمانە هەیە؟
- بە تەواویی بڕوات پێیان هەیە؟
- بە تەواویی بڕوام پێیان هەیە.
- باشە.. نا، ببوورە لەم کونپشکنینانەم، وەلێ ڕێگەم دەدەیت بگەمەوە سەر مەبەستی پێشوو: من وای دەبینم کە خەڵکیی هەمیشە ئەمانە ناکوژن، بە پێچەوانەوە هەندێکیان..

---

[1] لە وەرگێڕانە عەرەبییەکەی (سامی الدروبی)دا دەربڕینەکە بەم جۆرەیە: "تا ئۆرشەلیمی نوێ دێتەوە کایە، بێگومان".

[2] Lazare ناوی یەکێکە لە قەدیسەکانی مەسیح گوایا دوای مردنی مەسیح زیندووی کردۆتەوە.

- لەسەردەمی ژیانی خۆیاندا سەردەکەون؟ هەڵبەتە، هەندێکیان هەر لە سەردەمی ژیانی خۆیاندا بە ئامانج دەگەن و ئەوسا..
- خۆیان دەست بە کوشتنی کەسانی دی دەکەن؟
- ئەگەر پێویست بکات، دەزانیت، زۆرجار هەروا دەشکێتەوە، تێکڕا سەرنجەکانت هۆشیارانەیە.
- سوپاست دەکەم، بەڵام دەتوانیت پێم بڵێیت چۆن بتوانین مرۆڤە ئاساییەکان لە نائاساییەکان جیا بکەینەوە؟ ئایا کە لەدایک دەبن، هیچ نیشانەیەکیان پێوەیە؟ من لەم بارەیەوە دەڵێم ئەم مەسەلەیە وردەکاریی زیاتری دەوێت، واتا بەرجەستەکردنی زێدەتری پێویستە، ببوورە لەوەی کە من هەر بە سروشت مرۆڤێکی عەمەلی و خۆشباوەڕم، وەلێ ناتوانین جلوبەرگێکی تایبەتیان لەبەر بکەین، یان پۆشاکێکی وەک یەک تەنانەت داخێک و شتێکی لەو بابەتانە؟ چونکە، بڕوا بکە ئەگەر جیاکردنەوە نەبێت، ڕەنگە یەکێک لە دەستەیەکیان خۆی بە دەستەکەی تر بداتە قەڵەم و وەک خۆت دەڵێیت، هەموو بەربەستەکان تێکوپێک بدات و ئەوسا..
- ڕاستە، ئەمە زۆر ڕوو دەدات، ئەم بۆچوونەی تۆیش لەوەی پێشوو هۆشیارانەترە..
- سوپاسگوزارم..
- شایانی نییە، بەڵام ئەوە بزانە کە ئەم هەڵەیە تەنیا لە لایەن دەستەی یەکەمەوە دەکرێت. واتا لە لایەن کەسە ئاساییەکانەوە (ڕەنگە ئەم ناوە نەگونجاو بێت کە لێم ناون) گەلێک لەو مرۆڤە نائاساییانە، ئەگەرچی هەر بە خۆڕسک گوێڕایەڵن، بە هۆی هەندێک گەمەی سروشتەوە کە تەنانەت گا لێی بێبەش نییە، حەز لەوە دەکەن خۆیان وا بنوێنن کە پێشڕەو و یاخین و قسەی تازەیان پێیە. بە تەواوی

بڕوایشەوە ئەم کارە دەکەن. لە کاتێکدا ئەمانە بە زۆریی گوێ بەوانە نادەن، کە وتەی نوێیان پێیە، تەنانەت ئەوەندە لێیان بێزارن، کە بە دواکەوتوویان لە قەڵەم دەدەن. وەلێ بە بڕوای من ئەمانە مەترسیی گەورە دروست ناکەن و نابێت تۆیش لەوە بترسیت، چونکە ئەو جۆرە کەسانە هەرگیز ناتوانن ڕێگەی دوور ببڕن. بە هۆی ئەم ئارەزووەیانەوە بێگومان دەبێت هەندێکجار سزا بدرێن و بکەونە بەر قامچیلێدان، بۆ ئەوەی جێگای خۆیان بزانن، وەلێ لەمە زیاتر پێویست بە سزای دی ناکات و تەنانەت کەسیشی ناوێت ئەم کارەی پێبسپێررێت، چونکە هەر خۆیان خۆیان دەدەنە بەر قامچی، لەبەر ئەوەی کەسانێکی ڕاست و دروستن. هەندێک لەمانە خۆیان سزای خۆیان دەدەن، هەیشیانە بە خەڵکانی تری دەسپێرن.. بۆ نموونە، لەبەرچاوی خەڵکی تۆبەی جۆربەجۆر دەکەن و ئەمەیش لە خۆیدا کارێکی جوانە و وانەیەکی نموونەییە بۆ کەسانی دی.. بە کورتی: بۆ ئەوەی نیگەران نەبیت.. یاسایەک لەئارادا هەیە.

- ڕاستە، هیچ نەبێت لەم لایەنەوە تۆ کەمێک ئاسوودەت کردم، وەلێ، ئاخر تەماشای کلۆڵییەکی تر بکە: تکایە پێم بڵێ، ئایا ئەو جۆرە کەسانەی کە مافی کوشتنی خەڵکی تریان هەیە، واتا کەسە نائاساییەکان. زۆرن؟ هەڵبەتە من ئامادەی گوێڕایەڵیم، وەلێ تۆ دەبێت بڕوات بەوە هەبێت، کە ئەگەر ژمارەی ئەو جۆە کەسانە زۆر بێت، مەترسی هەیە. وانییە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە هەمان ئاوازەوە وتی:

- ئاخ، لەوەیش مەترسە، بەگشتی ئەو کەسانەی بیری تازەیان هەیە، تەنانەت ئەوانەیش کە دەتوانن کەمەکێک شتی نوێ دەرببڕن، زۆر کەم دێنە دنیاوە، واتا ئەوەندە کەمن، کە سەرت سووڕدەمێنێت. بەڵام

تەنیا شتێک هەیە، کە ڕوون و ئاشکرایە: ڕێژەی ئەوانەی لەدایک دەبن، ئیتر لە هەر دەستەیەک بن لەو دووانە، یاسای سروشت زۆر بە ڕاستی و وردی ئەو ڕێژەیە دیاری دەکات. بێگومان تا ئێستا ئەو یاسایە نەدۆزراوەتەوە، وەلێ من بڕوام بە بوونی هەیە و ئەمەیش لە ئاییندەدا دەردەکەوێت. زۆربەی زۆری خەڵکی، واتا "مادە"کە، تەنیا لەبەر ئەوە بوونیان هەیە تا لە ئەنجامدا بە هۆی هەوڵ و بنەمایەکەوە کە هێشتا نهێنییە، لە ڕێگەی تێکەڵبوونی ڕەگەز و نەژادەکانەوە مرۆڤێکی ئازاد و سەربەخۆ دروست بکەن، تەنانەت ئەگەر لە هەزار کەس یەکێکی تیا هەڵبکەوێت. وەلێ ئەوانەی کە کەسایەتین و لەبیرکردنەوەدا ئازاد و ئاسۆیەکی فراوانیان هەیە، ڕەنگە لە دەهەزار کەس (ئەمە تا ڕادەیەک بە بەڵگەوە دەڵێم) یەک کەس هەبێت. خۆ ئەگەر کەسانی تر بگریت کە پلەی سەربەخۆییان بالاترە، لە سەدهەزار کەس یەکێکی بەردەکەوێت. کەسانی بلیمەت لە ملیۆنەها و بلیمەتە هەرە مەزنەکانیش کە لە لووتکەی مرۆڤایەتیدان، ڕەنگە لە نێو چەندان هەزار ملیۆنی ئەم سەرزەمینەدا یەکێکی تیا بێت. بە کورتی، من بە ناو ئەو دەزگایەدا نەگەڕاوم، کە ئەمانە بەرهەم دێنێت، وەلێ گومانم لەوە نییە کە یاسایەکی دیاریکراو هەیە و دەبێت ببێت. لەم لایەنەوە ڕێکەوت لەئارادا نییە.

ڕازومیخین سەرئەنجام هاواری لێهەستا:

- بەڕاست، ئێوە گاڵتە دەکەن؟ یەکتری دەخەڵەتێنن؟ دانیشتوون و هەریەکەتان بەوی دی ڕادەبوێرێت! ڕودیا، تۆ بە جیدی قسە دەکەیت؟ ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەنگ، دەموچاوە ڕەنگپەڕیوو و غەمبارەکەی بۆ لای بەرز کردەوە و هیچی نەوت، بەرانبەر بەم ڕووە هێدی و غەمبارە، بە

تەوسەوە پێکەنین و قسەی تووڕە و بێئەدەبانەی پۆرفیری بە لای ڕازومیخینەوە زۆر سەیر هاتە بەرچاو.
- باشە هاوڕێ، ئەگەر ئەمە بە ڕاستی جیدیە، کەواتە.. تۆ بۆت هەیە بڵێیت ئەم قسانە هیچی تازەیان تیا نییە و دووبارەکردنەوەی ئەو شتانەیە، کە ئێمە هەزار جار خوێندومانەتەوە و گوێمان لێبووە، بەڵام ئەوەی کە لە هەموو ئەمانەدا تازەیە و بە ڕاستی تایبەتمەندیی بە تۆوە هەیە، زۆر بە سەرسامییەوە دەبێت بڵێم، ئەوەیە کە تۆ لە ڕووی ویژدانەوە پاساو بۆ مەسەلەی خوێنڕێژی دەکەیت و.. بمبوورە.. ئەوەیش، بەم دەمارگیرییەوە.. و گوایا گرنگترین بابەتی وتارەکەی تۆیش ئەمەیە، باشە، بە ڕای من.. ئەگەر خوێنڕشتن تەنیا لە ڕێگەی ویژدانەوە چاوپۆشیی لێبکرێت.. لای من لەوە خراپترە کە یاسا ڕێگە بەو خوێنڕشتنە بدات.
پۆرفیری پاڵپشتی لێکرد و وتی:
- ئەمە قسەیەکی زۆر بەویژدانانەیە، ئەویان زۆر مەترسیدارترە.
- نا، تۆ، زۆر دوور کەوتوویتەتەوە و زیاد ڕۆیشتوویت، هەڵەیەک هەیە، من وتارەکە دەخوێنمەوە.. تۆ زیادەڕۆیی دەکەیت، تۆ ناتوانیت وا بیر بکەیتەوە.. خۆم وتارەکە دەخوێنمەوە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:
- لە وتارەکەدا هەموو ئەم شتانە نییە، لەوێدا تەنیا چەند ئاماژەیەک کراوە.
پۆرفیری کە لە جێگاکەیدا ئۆقرەی نەدەگرت، وتی:
- وایە، وایە، تا ڕادەیەک ئێستا ئەوەم لێ ڕوونە کە تۆ چۆن لە تاوان دەڕوانیت، وەلێ لەم جەختکردنەم ببوورە، زۆر ناڕەحەتت دەکەم و خەجاڵەتم... بڕوانە، تۆ کەمێک لەمەوبەر دەربارەی هەڵەی تێکەڵبوونی

ئەو دوو گروپە کەمێک دڵنیات کردم.. بەڵام پێشهاتە سەیر و سەمەرەکانیش نیگەرانم دەکەن. بۆ نموونە، چی ڕوو دەدات ئەگەر پیاوێک یان لاوێک خۆی بە لیکورک یان محەمەدی ئایندە بزانێت و بیەوێت هەموو بەربەستەکان لابەرێت.. بەو بیانووەی کە شەڕ و لەشکرکێشییەکی دوورودرێژ لە پێشدایە و ئەمەیش پارەی زۆری گەرەکە.. ئەوسا بۆ شەڕەکەی خۆی خەریکی ئامادەکردنی پێویستییەکانی بێت؟

زامیوتوف لە ناکاوێکدا لە سووچەکەیەوە پێکەنینێکی تەوساوی کرد، ڕاسکۆلنیکۆڤ تەنانەت سەری بۆ بەرز نەکردەوە و لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە:

- منیش ئەوەم قبووڵە کە دەشێت پێشهاتی لەو جۆرە ڕوو بدات، کەسانی کەمبیر و ناوبانگویست بەتایبەتی لە داوی وا دەکەون.. بەتایبەتیش لاوەکان.

- باشە، بڕوانە، کەواتە ئەوسا چی ڕوو دەدات؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ زەردەیەکی هاتێ و وتی:

- بەڵێ، ئیتر وا وایە! ئەمەیان خەتای منی تیا نییە، وا هاتووە و هەر وایش دەبێت، ئەوییش (ڕاسکۆلنیکۆڤ سەری بۆ لای ڕازومیخین تەکان دا) ئێستا دەیوت کە من ڕێگە بە خوێنڕشتن دەدەم، باشە، ئیتر چی؟ کۆمەڵگا تا بتەوێت ئاوەدانە بە تاراوگە، بە زیندان و لێکۆڵەرەوە و کاری قورسەوە، کەواتە ترسی بۆ چییە؟ دوای دزەکە بکەون..

- ئەی ئەگەر گرتمان؟

- بە سزای خۆی دەگات.

- تۆ زۆر لۆژیکیت، ئەی لەبارەی ویژدانی ئەوەوە دەڵێی چی؟

- باشە ئێوە چ پەیوەندیتان بە ویژدانی ئەوەوە هەیە؟

- هیچ، بەڵام هەر لە باری مرۆڤدۆستییەوە.
- کەسی خاوەن ویژدان کە هەستی بە هەڵەکەی خۆی کرد، ئازار دەچێژێت، ئەمە زیاد لە کارە قورسەکە سزادانە.
ڕازومیخین برۆی هێناوە یەک و وتی:
- باشە ئەی ئەو کەسانەی کە بە ڕاستی بلیمەتن، واتا ئەوانەی مافی کوشتنیان پێدراوە، دەبێت ئازار نەچێژن، تەنانەت بۆ ئەو خوێنەی کە ڕشتوویانە؟
- وشەی "دەبێت" بۆچییە؟ لەم کێشەیەدا نە ئەرێ هەیە و نە نەرێ. ئەگەر ئەو کەسە دڵی بە حاڵی قوربانی دەسووتێت، لێی بگەڕێ با ئازار بچێژێت.. ئەو کەسەی هەستی قووڵ و ویژدانی هەراوی هەیە، دەرد و ئازار دەچێژێت.
پاشان لەناکاوێکدا ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری پەرت بوو، بە جۆرێک کە تەنانەت ئاهەنگی قسەکانی گۆڕان، وتی:
- بە ڕای من ئەو کەسەی کە بە ڕاستی مەزنە، دەبێت لە دنیادا هەڵگری خەمی مەزن بێت.
ڕاسکۆلنیکۆڤ چاوی هەڵبڕی و لە هەموویان ڕاما، زەردەخەنەیەکی کرد و کڵاوەکەی هەڵگرت.. ئێستای لەچاو ئەو کاتەدا کە هاتە ژوورەکە، زۆر هێورتر بوو، خۆیشی هەستی بەمە کرد، هەموویان هەستان.
پۆرفیری دیسان وتی:
- باشە، دەتەوێت جوێنم پێبدەیت یان نا، لێم تووڕە بیت یان نا، بەڵام من خۆم پێناگیرێت، دەبێت ڕێگەم بدەیتێ پرسیارێکی تری بچکۆلەت لێبکەم (بە ڕاستی زۆرم ماندوو کردوویت) بیرۆکەیەکی بچووکە و دەمەوێت بیڵێم، تەنیا بۆ ئەوەی لە بیرم نەچێت..

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە جیدی و ڕەنگی پەڕیووەوە، ڕاوەستا و چاوەڕێی کرد، پێی وت:
- فەرموو، بیڵێ.
- ئاخر.. بە ڕاستی نازانم چۆن بە چاکی دەربیبڕم.. بیرۆکەیەکی شەیتانانەیە.. بیرۆکەیەکی سایکۆلۆژییە، بڕوانە، ئەو کاتەی تۆ وتارەکەتت دەنووسی، مەحاڵ بوو.. هە، هە، هە، کە خۆت هیچ نەبێت تۆزێک، هەر بە زاراوەکەی خۆت، خۆت بە کەسێکی "نائاسایی" و خاوەنی قسەی نوێ نەزانیبێت.. وا نییە؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە بێزارییەوە وەڵامی دایەوە:
- دەشێت، زۆریش.
ڕازومیخین جووڵەیەکی کرد:
- جا ئەگەر وایە، ئایا دەکرێت خۆتان بڕیارتان دابێت، بۆ نموونە لەبەر سەرنەکەوتن لە ژیاندا یان لەبەر هەژاری.. یان بۆ جۆرە کۆمەککردنێک بە دنیای مرۆڤایەتی، بەربەستەکان بخەیتە ژێر پێتەوە؟ واتا، بۆ نموونە خەڵک بکوژیت یان دزی بکەیت؟
پۆرفیری دیسانەوە چاوی چەپی لێداگرت و پێکەنینێکی بێدەنگی کرد. ڕاست وەک جارەکەی پێشوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بوێرانە و بە فیزەوە وەڵامی دایەوە:
- ئەگەر من ئەو بەربەستانەم ببەزاندایە، هەرگیز بە ئێوەم نەدەوت.
- نا، من تەنیا بۆ کونپشکنی، بۆ تێگەیشتن لە وتارەکەت و لە ڕووی تیۆرییەوە ئەو پرسیارەم کرد...
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە بێزارییەوە بیری کردەوە: "ئاها! چ داوێکی زۆڵانەیە!"
پاشان بە ساردییەکەوە وتی:

- حەز دەکەم ئەوە بزانیت کە من نە خۆم بە محەمەد دەزانم نە بە ناپلیۆن و نە کەسێکی تری لەو بابەتانە، وەک ئەنجامیش، لەبەر ئەوەی لە جێی ئەواندا نیم، ناتوانم بە تەواوی ئەوەتان بۆ ڕوون بکەمەوە کە ئەگەر وا بوومایە چیم دەکرد.

لەپڕێکدا پۆرفیری بە شێوازێکی زۆر خۆمانە وتی:

- واز لەوە بێنە، کێ ئێستا لە ڕووسیادا هەیە خۆی بە ناپلیۆن نەزانێت؟

ئەمجارەیان تەنانەت لە دەنگیا زۆر بە ئاشکرا ڕازێک دیار بوو.

لەپڕێکدا زامیوتوف لە سووچەکەیەوە پلارێکی هاویشت:

- ناشێ هەفتەی ڕابووردوو ناپلیۆنێکی ئایینده ئالیانا ئیڤانۆڤناکەمانی بە تەور کوشتبێت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەنگ بوو، زۆر بە وردی و سەختی لە پۆرفیری ڕامابوو، ڕازومیخین دەموچاوی دا بەیەکدا، پێشتریش لەوە دەچوو هەستی بە شتێک کردبێت، بە تووڕەییەوە لە هەموو لایەکی ڕوانی، بێدەنگییە بێزارکەرەکە دەقیقەیەکی خایاند، ڕاسکۆلنیکۆڤ سووڕا کە بڕوات.

پۆرفیری بەدەم دەستدرێژکردنەوە، بە دەنگێکی میهرەبان و زۆر خۆشەوە وتی:

- ئیتر تۆ دەڕۆیت، زۆر زۆر بە ناسینتان شادمانم، لەبارەی داواکەیشتەوە تەواو دڵنیا بە، بەو شێوەیەی کە پێم وتی، وای بنووسە، لە هەمووی باشتر ئەوەیە کە خۆت هەر لێرە سەرێکم لێبدەیت.. لەم ڕۆژانەدا، با بڵێین بەیانی، من بێگومان سەعات یانزە لێرە دەبم، هەموو شتێک لێرە ئەنجام دەدەین.. بۆ خۆیشمان قسە دەکەین.

هەروەها بە میهرەبانییەوە وتی:

- وەک ئاخر کەسیش کە لەوێ بوویت، ڕەنگە بتوانیت شتێکمان پێبڵێیت..

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ڕەقی پرسی:

- دەتەوێت بە شێوەیەکی ڕەسمی و لە جێگایەکی ڕەسمیدا لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا بکەیت؟

- ئاخر، بۆ؟ ئەم کارە بۆ ئێستا هیچ پێویست نییە، تۆ باش تێنەگەیشتیت، من، دەزانیت، هیچ دەرفەتێک لەکیس خۆم نادەم و.. لەگەڵ هەموو ئەوانەدا کە بارمتەیان داناوە، قسەم کردووە.. ناونیشانم لە هەندێکیان وەرگرتووە.. تۆیش وەک ئاخر کەس..

پۆرفیری لەپڕێکدا وەک لە شتێک خۆشحاڵ بێت، هاواری کرد:

- وەلێ بە ڕاستی.. باش بوو بیرم کەوتەوە.. نازانم بڵێم چی؟

رووی لە ڕازومیخین کرد و وتی:

- لەبارەی نیکۆلاوە، تۆ ئەوسا سەرودڵت گرتم.. تەواو بۆم دەرکەوت.. دەزانم کە..

دیسانەوە ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کردەوە:

- نیکۆلا لاوێکی پاکە، وەلێ دەتوانم چی بکەم، تەنانەت ناچار بووین میتیایش زەحمەت بدەین.. قسە لەسەر ئەمەیە، واتا مەبەستی سەرەکی ئەوەیە کە: ئەو کاتەی بە پلیکانەکاندا سەرکەوتیت.. بەڵام ڕێم بدە، تۆ لە دوای سەعات حەوتەوە لەوێ نەبوویت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ دوای سەعات حەوت.

لەپڕێکدا بە ناخۆشییەوە هەستی کرد کە دەیتوانی هەرگیز ئەوە نەڵێت.

- باشە، ئەی ئەو کاتەی کە بەوێدا تێپەڕیت، تۆ هیچ نەبێت دوو کرێکار، یان کرێکارێکت لە نهۆمی دوودا نەبینی، لەو ژوورەدا کە دەرگاکەی کرابووەوە، لە بیرتە؟ چونکە ئەوان لەوێدا بۆیاخیان دەکرد، ئەم شتە زۆر زۆر بۆ ئەوان گرنگە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەرخۆ و وەک ئەوەی بیر لەو شتانە بکاتەوە، وەڵامی دایەوە:
- بۆیاخچی؟ نا، نەمبینی.
لە کاتێکدا کە بە هەموو توانایەوە دەیویست بەسەر خۆیدا زاڵ بێت و هەموو گیانی لە ئازارا بوو تا زووتر هەست بەوە بکات کە چ داوێکی بۆ دانراوە و نەکا شتێک بکات کە تێی بکەوێت، لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو:
- نا، نەمبینین، تەنانەت ئاگاداری ئەوەیش نیم کە دەرگای ژوورێک کرابێتەوە، بەڵام لە قاتی چوارەمدا (لێرەدا بە تەواوی داوەکەی دۆزیەوە و سەریش کەوت) لە بیرمە کارمەندێک لە ماڵێکی بەرانبەر بە ئەلینا ئیڤانۆڤنا شتوومەکی دەگوێزایەوە.. لە بیرمە، ئەمەم چاک لە بیرە.. سەربازەکان قەنەفەیەکیان دەهێنایە دەرەوە و منیشیان بە دیوارەکەوە نووساند، بەڵام بۆیاخچییەکان.. نا، لە بیرم نییە ئەوان لەوێدا بووبن.. لەوەیش ناچێت دەرگای هیچ ژوورێک کرابێتەوە، بەڵێ، شتی وا نەبوو.
ڕازومیخین وەک لەپڕا هاتبێتەوە سەرخۆی و هەستی بەئاگا هاتبێت، دەنگی هەڵبڕی و بە پۆرفیری وت:
- تۆ دەڵێی چی! ئاخر، بۆیەچییەکان لە ڕۆژی کوشتنەکەدا کاریان دەکرد، بەڵام ئەم سێ ڕۆژ لەوەوپێش لەوێ بووە، ئەمە چ پرسیارێکە تۆ دەیکەیت؟

- ئاه، هەموویم تێکەڵ کرد!
لەگەڵ قسەکانیدا پۆرفیری مستێکی بە ناوچاوانی خۆیدا کێشا، پاشان وەک بیەوێت پۆزش بهێنێتەوە، ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و وتی:
- لەعنەت لە شەیتان، ئەم کارە بە تەواوی ئەقڵی لەسەردا نەهێشتووم، ئاخر، من ئەوەم بە لاوە گرنگە کە بزانم لە نێوان سەعات حەوت و هەشتا کەسێک لەو ماڵەدا بووە یان نا، من وامزانی تۆ دەتوانیت وەڵامم بدەیتەوە، من بە تەواوی هەموویم تێکەڵوپێکەڵ کرد.
ڕازومیخین دەموچاوی پێکدا دا و وتی:
- کەواتە تۆ دەبێت وردتر بیت.
ئەم قسانەی دوایی لە تارمەکەدا کرا، پۆرفیری پترۆڤیچ زۆر بە ڕوویەکی خۆشەوە ئەوانی تا بەردەرگاکە ڕەوانە کرد، هەردووکیان بە پەستی و ڕوویەکی ترشاوەوە گەیشتنە کۆڵانەکە و تا چەند هەنگاوێکیش هیچیان لەگەڵ یەکتردا نەوت. ڕاسکۆلنیکۆڤ هەناسەیەکی قووڵ و تازەی دا..

٦

ڕازومیخین کە کەوتبووە ناو دنیای بیرکردنەوەوە، تەواوی توانای خستبووە گەڕ تا بەڵگەکانی ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕەت بکاتەوە، دیسانەوە کەوتەوە دووبارەکردنەوەی قسەکانی:
- باوەڕ ناکەم، ناتوانم بڕوا بکەم.
ئەو دووانە تا دەهات لە ژوورەکانی باکالیێڤ نزیک دەبوونەوە، کە ماوەیەکی زۆر بوو پولخێریا ئەلێکساندروڤنا و دونیا لەوێ چاوەڕێیان دەکردن. ڕازومیخین لە ڕێگەدا و لە گەرمەی قسەکردندا

دەوەستا، لەو لایەنەوە کە ئەمە یەکەمینجار بوو ئاوا بە ڕاشکاوی لەو بابەتە بدوێن، شپرزە و ناڕەحەت بوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە زەردەخەنەیەکی سارد و وشکەوە وەڵامی دایەوە:
- باوەڕ مەکە، تۆ وەک نەریتی خۆت سەرنجی هیچت نەدا، وەلێ من هەموو وشەیەکم هەڵدەسەنگاند.
- تۆ بەدگومانیت، بۆیە هەڵتدەسەنگاند.. هوم.. من بە ڕاستی لەگەڵ تۆدام، کە قسەکانی پۆرفیری تا ڕادەیەک سەرسووڕهێن بوون، بەتایبەتیش ئەو زامیوتوفە بەدڕەوشتە، تۆ ڕاست دەکەیت، جۆرێک بوو. بەڵام بۆ؟ بۆ وای دەکرد؟
- بە درێژایی شەو بیری گۆڕیووە.
- نا، بە پێچەوانەوە، ئەگەر ئەوان بڕوایان بەو شتە بێمانایە هەبووایە، هەموو توانایان بەکاردێنا بۆ ئەوەی بیشارنەوە، هەر لە نهێنیدا دەیانهێشتەوە تا لەپڕێکدا دەیانخستیتە تەپکەکەوە.. وەلێ ئێستا، ئەم بزاوتە سەرکێشەیان لە ڕووی نەزانینەوەیە.
- ئەگەر ئەمانە بەڵگەیان لەبەردەستا بووایە، واتا بەڵگەی ڕاستەقینە یان هەر هیچ نەبێت گومانێکی پتەو، ئەوسا وەک قوماربازەکان هەوڵیان دەدا بە هیوای بردنەوەی یارییەکە زیاتر بیشارنەوە، بێگومانیشم لێکۆڵینەوەکەیان پێشتر دەخست، وەلێ ئەمانە چ بەڵگە و شایەتێکیان نییە، هەموو ئەو شتانەی دەیلێن، بە خەیاڵ دروستی دەکەن. هەموو بۆچوونی بەتاڵ و بێسەرەوبەرەیە، بۆیە دەیانەوێت چاوقاییمانە مرۆڤ هەڵدێرن، دەشێت خۆیشی لەوە نیگەران و تووڕە بێت کە بەڵگەیەکی نییە، هەر لە کاتی ئەو تووڕەییەشدا بوو کە قسەیەکی لە دەم دەرچوو، ڕەنگە مەبەستیشی بووبێت.. گوایە مرۆڤێکی ئاقڵە.. ڕەنگە ویستبێتی من بەوە بترسێنێت کە شتی پێیە،

لێرەدا هاوڕێ، سایکۆلۆژیەتێکی تایبەت پێویستە.. بەڵام بەگشتی ئەم هەموو بێنەوبەردەیە زۆر ناخۆش بوو، وێڵی بکە..

- سووکایەتیپێکردنیشە، زۆریش سوکایەتیپێکردنە، من لە مەبەستی تۆ دەگەم، بەڵام.. لەبەر ئەوەی بە ڕاشکاوی قسەمان لەگەڵ یەکدا کرد، (ئەمەیش زۆر باشە کە گەیشتینە ئەوەی بە ڕاشکاوی لەگەڵ یەکتردا قسە بکەین، من ئەمەم زۆر پێ خۆشە) بۆیە بەبێ پێچوپەنا ئەوەت لا دەدرکێنم کە ماوەیەک بوو من ئەمەم لەواندا هەست پێکردبوو، مەبەستم بیرۆکەکەی ئەوانە، لە هەموو ئەم ماوەیەدا.. بێگومان بە تەواوی شتەکەیان لا بەرجەستە نەبووبوو، بەڵام بۆ دەبێت تەنانەت ئەگەر بەرجەستەیش نەبووبێت، بیرێکی ئاوا لەواندا دروست بووبێت! چۆن دەوێرن؟ ڕەگی ئەم بیرۆکانەیان لە کوێدا حەشار داوە؟ ئەگەر تۆ سەرنجت دابێت، من زۆر ڕقم هەستابوو، قوتابییەکی بێچارە کە دەردی هەژاری و ماخولیا هەڵیتەکاندووە، نەخۆشییەکی قورس و وڕێنە سەری تێکردووە.. چاکە، تۆ بڕوانە، لاوێکی هەمیشە بەگومان و لووتبەرز کە ڕێزی خۆی دەزانێت، کەسێک شەش مانگی ڕێک لە سووچێکدا گۆشەگیرە و کەسی نەدیووە، بە بەرگی کۆنە و دڕاو و پێڵاوی بێبنەوە، دەشێت لاوێکی وا لە بەردەم کەسانێکی هیچوپووچی پۆلیسدا ڕابگیرێ و جوێنی پێبدرێ، لەگەڵ ئەمانەیشدا شتێکی بۆ بدۆزنەوە، کە قەرزاری کارمەندێکی گرنگی وەک چبارۆفە و بەپێی سەنەدێکی ساختە دەبێت بیداتەوە. پاش ئەوانەیش، بۆنی ناخۆشی بۆیاخ هەڵمژێ و خۆی لەبەر گەرمای سی پلە و لە ژوورێکی پڕ لە خەڵکدا کە توانای هەناسەدانی نەمێنێت، ببینێتەوە، ئینجا گوێ لە چیرۆکی ژنێک بگرێ، کە شەوێک لەوەوبەر کوژراوە و ئەم لای بووە. هەموو ئەمانە بە سکی

برسییەوە، ئاخر، ئەم کەسە چۆن لە هۆش خۆی ناچێت! چۆن گریمانەی بێمانا لەسەر لەهۆشخۆچوونەکەی دروست دەکرێت! نەعلەت لە شەیتان! من دەزانم ئەمە پیاو تووڕە و بێزار دەکات، بەڵام، ڕودیا، ئەگەر من لەباتیی تۆ بوومایە، لەبەرچاویاندا قاقا دەمدایە پێکەنین، یان تفم لە سەروچاوی هەموویان دەکرد، تفێکی خەست. بە شێوەیەک ڕاست و چەپ بەر زللەم دەدان کە شایانی بن، هەر بەو جۆرە کۆتاییم بە باسەکە دەهێنا، بە هیچیان بزانە، مەترسە، با خەجاڵەت بن.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی: "باشی دەڵێیت!"

پاشان بە کەسەرەوە بە ڕازومیخینی وت:

- چۆن بە هیچیان بزانم؟ بەیانی جارێکی تر لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا دەکەن، بەڕاست دەبێت بکەومە لێکدانەوە و شرۆڤە بۆیان؟ لە کاتێکدا من لە ئێستاوە لەوە پەشیمانم، کە دوێنێ لە میوانخانەکە خۆم خستە ڕیزی زامیوتوفەوە و قسەم لەگەڵدا کرد..

- لەعلەت لە شەیتان! خۆم دەچم بۆ لای پۆرفیری و وەک یەکێکی هەرە نزیک قسەی لەگەڵدا دەکەم، بڕوا بکە، دەبێت چی پێیە بیڵێت، بەڵام زامیوتوف..

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە خۆی وت: "ئاخری تێگەیشت".

لەپڕا ڕازومیخین شانی گرت و هاواری کرد:

- ڕاوەستە، ڕاوەستە، تۆ هەڵەیت، ئێستا تێگەیشتم، تۆ هەڵەیت، ئاخر، یانی چی ئەم کاسەیە بێ ژێر کاسە نییە؟ تۆ دەڵێیت ئەمە تەڵەیەکە و بۆت دانراوە، ئەم باسی کرێکارانە داوە و دەیانەوێت پێتەوە بکەن! باشە، بیری لێبکەرەوە، ئاخر ئەگەر تۆ ئەو کارەت بکردایە، هەرگیز ئەوەت بە دەمدا دەهات کە بڵێی بۆیاخکردنی ژوورەکەت بینیووە..

کرێکارەکانیشت دیووە؟ بە پێچەوانەوە دەتوت هیچم نەبینیووە تەنانەت ئەگەر دیبێتیشت، کێ لە دژی خۆی شایەتی دەدات؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە بێزارییەکی زۆرەوە وەڵامی دایەوە:
- ئەگەر من ئەو کارەم بکردایە، حەتمەن دەموت کرێکارەکانیشم دیووە و ژوورەکانیش.
- باشە، چۆن پیاو دژی خۆی شایەتی دەدات؟
- چونکە تەنیا گوندییەکان یان تازەکار و بێئەزموونەکان لە کاتی لێکۆڵینەوەدا هەموو شتێک ڕەت دەکەنەوە و لەسەر هیچ ناوەستن. بەڵام کەسی بەئاوەز و ئەزموون، چەند بتوانێت هەوڵ دەدات دان بە هەموو ئەو شتانەدا بنێت، کە دیارن و ناتوانرێت نکوڵیان لێبکرێت. پاشان بە دوای بەڵگەی تردا بگەڕێت، ڕەنگێکی تایبەتی و چاوەڕواننەکراوی وای پێببەخشێت کە بە تەواوی ماناکانیان بگۆڕێت و ڕووناکاییەکی تریان بخاتە سەر. ڕەنگە پۆرفیری لای خۆیەوە وای دانابێت کە من حەتمەن وای وەڵام دەدەمەوە، واتا بۆ ئەوەی ڕواڵەتی مەسەلەکە بپارێزم، بڵێم بەڵێ دیومە و پاساوێکیشی بۆ دروست بکەم..
- ئاخر، ئەگەر وات بوتایە، ئەو یەکسەر پێی دەوتیت کە دوو ڕۆژ پێشتر کرێکارەکان لەوێ نەبوون، کەواتە دەبێت تۆ لە هەمان ڕۆژی کوشتنەکەدا، سەعات حەوت و هەشت لەوێ بووبێتی، ئەوسا لەسەر هیچ تووشی دەبوویت.
- ڕاستە، ئەو حسابی ئەوەی کردبوو دەرفەتی بیرکردنەوەم نەداتێ، بۆ دەرخستنی هەقیقەتەکە بەپەلە وەڵام بدەمەوە و ئەوەم لە بیر نەبێت، کە دوو ڕۆژ پێش ڕووداوەکە کرێکارەکان لەوێ نەبوون.
- بەڵام چۆن ئەوە لە بیر دەکرێت؟

- زۆر بە ئاسانی، لەم شتە بچووکانەدا کەسانی زرنگ زووتر تێدەکەون، مرۆڤ چەند زیرەکتر بێت، هەر بەو ڕادەیە کەمتر بیر لەوە دەکاتەوە کە لەسەر شتێکی بچووک بکەوێتە داوەوە، پۆرفیری بە هیچ جۆرێک ئەوەندە گەوج نییە کە تۆ وێنای دەکەیت..
- کەواتە بۆیە ئەوەندە زۆڵە!
ڕاسکۆلنیکۆڤ نەیتوانی بەر لە پێکەنینەکەی بگرێت، وەلێ هەر لە هەمان کاتدا ئەو مەیل و گەرمییەی کە لەم ڕوونکردنەوانەدا پیشانی دا. بەرانبەر بەو حاڵەتی کرژی و بێزارییەی کە پێشتر وەک بارێکی گران وابوو بەسەریەوە، بە لایەوە سەرسووڕهێنەر بوو، بە خۆی وت: "کەم کەم لە هەندێک شتی ئەم مەسەلەیەدا چێژ وەردەگرم".
وەلێ لەپڕێکدا، هەر لەو چرکەساتەدا کەوتە دڵەڕاوکێیەکی تایبەتییەوە، وەک ئەوەی بیرۆکەیەکی چاوەڕواننەکراو و سامناک بەرکی گرتبێت وابوو، تا دەهات دوودڵییەکەی دەیدایە زیادی. تازە ئەوان گەیشتبوونە بەردەرگای ژوورە بەکرێگیراوەکانی باکالیڤ. لە ناکاودا ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:
- تۆ خۆت بڕۆ ژووری و من ئێستا دەگەڕێمەوە بۆ لات.
- بۆ کوێ؟ تازە ئێمە گەیشتووین!
- ناچارم، ناچارم، کارێکم هەیە.. نیو سەعاتی تر دێم.. بەوانیش بڵێ.
- ئارەزووتە، بەڵام منیش لەگەڵتا دێم!
- تۆیش حەز بە ئازاردانم دەکەیت!
هاوارى ڕاسکۆلنیکۆڤ هاودەم بوو لەگەڵ تووڕەبوونێکی سەخت و تاڵدا، ڕوانینەکەیشی هێند نائومێدانە بوو، کە ڕازومیخین بە شپرزەیی و پەشۆکانەوە لە جێگای خۆیدا وشک بوو، ماوەیەک لە بەردەم ماڵەکەدا وەستا، ڕووی بەیەکدا دا و لە هاوڕێکەی ڕوانی، کە چۆن

هەنگاوی خێرا بەرەو کۆڵانەکەی خۆی دەنێت. پاشان لە کاتێکدا کە دانەجیرەی بوو، مشتی گرمۆڵە کرد، هەر لەوێدا سوێندی خوارد کە هەر ئەمڕۆ پۆرفیری وەک لیمۆ بگوشێت، ئینجا چووە سەرێ تا پولخێریا ئەلێکساندروڤنا کە لە دواکەوتنە زۆرەکەیان ترسی لێنیشتبوو، دڵنیا بکاتەوە.

کە ڕاسکۆلنیکۆڤ گەیشتەوەماڵەکەی خۆی، ئارەقە لاجانگەکانی تەڕ کردبوو، هەناسەبڕکێی بوو، بەپەلە لە نەردەوانەکان سەرکەوت، چووە ناو ژوورەکەیەوە، کە دەرگاکەی کرابووەوە و زوو دەرگاکەی پێوەدا، پاشان بە ترسێکی شێتانە خۆی فڕێ دایە سووچێکەوە، یەعنی بۆ لای هەمان کونی دیوارەکە، کە شتەکانی تیا شاردبووەوە. دەستی بە کونەکەدا کرد و تا ماوەیەک بە وردی تیایدا گێڕای، کاغەزە دیوارییەکانی بەسەر کردەوە، کە هیچی نەدۆزیەوە، هەستا و هەناسەیەکی قووڵی دا. هەر لەو کاتەدا کە لە خانووەکەی باکالیڤ نزیک کەوتبووەوە، لەپڕێکدا خەیاڵی بۆ ئەوە چوو کە یەکێک لە شتەکان، بۆ نموونە زنجیر، دوگمەی سەردەست، یان تەنانەت ئەو کاغەزەی شتەکانی پێوە پێچابوو، نووسینێکی بە خەتی پیرێژنەکە لەسەر بوو، ڕەنگە بە هەر جۆرێک بووبێت، نەیدیبێت و لە یەکێک لەو کونانەدا مابێتەوە، بۆ ئەوەی لە پڕێکدا، وەک شایەتێکی چاوەڕواننەکراو کە نەتوانیت نکۆڵیی لێبکەیت، لە بەردەمیدا قوت بێتەوە. وەک ئەوەی لە بیرکردنەوەدا بێت وەستابوو، زەردەخەنەیەکی سەیر و تەوساوی و تا ڕادەیەکیش بێمانا کەوتبووە سەر لێوی، بیری ئاڵۆز بوو، پاشان کڵاوەکەی هەڵگرت و بە بێدەنگیی بەرەو دەرگای دەرەوە چوو.

لەپڕێکدا دەنگێک بەرز بووەوە:

- ئەمە خۆیەتی.
ڕاسکۆلنیکۆڤ سەری بڵند کرد.
دەرگاوانەکە لە پاڵ ژوورەکەی خۆیدا وەستابوو، ڕاسکۆلنیکۆڤی پیشانی پیاوێکی تا ڕادەیەک کورتەباڵا دەدا، کە لەوە دەچوو وردەبۆرژوا بێت، شتێکی وەک هێلەک و کراسێک کە لە هیماڵەوە دەچوو، لەبەریدا بوو. لە دوورەوە لە ژنێکی لادێی دەچوو، کڵاوێکی چەور و پیسی لەسەردا و سەریشی بەرەو لای سنگی داکەوتبوو، لەشی ناقۆڵا و دەموچاوە چرچ و ماندووەکەی ئەوەی نیشان دەدا کە تەمەنی لە پەنجا زیاترە، چاوی بچووک و بەقووڵاچوو، نیگایەکی مۆنی دڵڕەقانە و ناقایلی هەبوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ پرسیاری لە دەرگاوانەکە کرد کە لێی دەهاتە پێشێ، وتی:
- چییە؟
پیاوەکە لەسەرخۆ و لە ژێرەوە چاوی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ بڕیبوو، زۆر بە وردی و تایبەتی پیایدا هەڵیدەڕوانی، پاشان لەسەرخۆ سوڕا و بەبێ ئەوەی وشەیەک بەسەر زمانیدا بێت، لە دەرگا گەورەکەوە چووە سەر شەقامەکە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ دەنگی هەڵبڕی:
- ئاخر مەسەلەکە چییە؟
- هیچ، ئەم زەلامە نەناسە دەیپرسی کە خوێندکارێک.. ناوی تۆیشی هێنا، لێرە دەژی یان ناو کرێگرتەی کێیە، تۆیش لەو کاتەدا هاتیتە خوارێ، منیش تۆم پیشان دا و ئیتر ئەو ڕۆشت، سەیرە!
دەرگاوانەکەیش سەری سوورما بوو، بەڵام سەرسوورمانەکەی زۆری نەخایاند، دوای کەمێک ڕامان وەرچەرخا و دووبارە خزایەوە

ژووره چکۆڵەکەی. ڕاسکۆلنیکۆڤ بە هەڵەداوان کەوتە دوای کابراکە، خێرا زانی لەوبەری شەقامەکەوە، هەنگاوی لەسەرخۆ و هاوسەنگ دەنێت، چاوی بڕیوەتە زەوی و خەیاڵی ڕۆیشتووە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ زوو پێی گەیشت، ماوەیەک لە دوایەوە ڕۆیشت، پاشان گەیشتە پاڵی و لەلاوە تەماشای سەروچاوی کرد، پیاوەکە زوو هەستی پێکرد، خێرا چاوی بە سەرتاپایدا گێڕا، وەلێ دیسانەوە چاوی داخستەوە، هەر بەو جۆرە، دەقیقەیەک بە پاڵ یەکدا ڕۆیشتن بەبێ ئەوەی قسەیەک لەگەڵ یەکتریدا بکەن.
لە دواییدا ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دەنگێکی تا ڕادەیەک لەسەرخۆ پرسی:
- تۆ هەواڵی منت... لە دەرگاوانەکە پرسی بوو؟
پیاوەکە وەڵامی نەدایەوە و سەیریشی نەکرد، دووبارە هەردووکیان بێدەنگ بوون.
- تۆ چیتە.. دێیت، دەپرسیت و بێدەنگ دەبیت، باشە، ئەمە چ مانایەکی هەیە؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ دەنگی کەوتبوو، دەتوت وشەکان نەیاندەویست بە ڕوونی بێنە دەرێ.
کابراکە ئەمجارەیان چاوی هەڵبڕی، بە مڕومۆچییەوە خێسەیەکی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد، لەپڕێکدا بە دەنگێکی لەسەرخۆ، بەڵام ڕوون و ئاشکرا وتی:
- پیاوکوژ!
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە پاڵیدا دەڕۆیشت، لەپڕێکدا قاچی بە تەواوی سست بوو، پشتی سارد و بۆ چرکەساتێکیش دەتوت دڵی وەستا، تەواو وەک ئەوەی هەرەسی هێنابێت وابوو. هەر بەو جۆرە سەد هەنگاوێک پێکەوە ڕۆیشتن، هەر بێدەنگیش بوون. پیاوەکە تەماشای نەدەکرد.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دەنگێکی زۆر نزم لەبەر خۆیەوە وتی:
- دەڵێی چی.. چی.. کێ پیاوکوژە؟
کابرا ڕوونتر و بە دڵنیایی و بە زەردەخەنەیەکەوە کە مانای سەرکەوتنێکی ناهەمواری دەبەخشی، وتی:
- تۆ پیاوکوژیت!
دیسانەوە ڕاستەوخۆ تەماشای دەموچاوە ڕەنگپەڕیووەکەی و چاوە مردووەکانی ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد. ئەوە ئەو کاتە بوو کە هەردووکیان گەیشتبوونە سەر پێچی شەقامەکە. کابرا بە لای چەپی شەقامەکەدا دایکێشا و بەبێ ئەوەی تەماشای دواوە بکات ڕۆیشت. ڕاسکۆلنیکۆڤ لە جێگای خۆیدا وەستا و تا ماوەیەک لە کابرای دەڕوانی. سەرنجی دا دوای پەنجا هەنگاو، کابرا ئاوڕی دایەوە، تەماشای ئەمی کرد کە هێشتا بێجووڵە لە جێگاکەیدا چەقی بوو. بەرجەستەکردنی ڕاستەقینەی هەڵوێستی کابرا نەدەزانرا، وەلێ بە لای ڕاسکۆلنیکۆڤەوە وابوو کە ئەمجارەیشیان کابرا زەردەخەنەیەکی سارد و ناجۆر و سەرکەوتووانەی بۆ کردووە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە هەنگاوی سست و هێور و بە ئەژنۆی لەرزیووەوە کە دەتوت سەرما کەسیرەی کردووە، گەڕایەوە و بەرەو ژوورەکەی خۆی سەرکەوت، کڵاوەکەی داگرت و خستییە سەر مێزەکە، دە دەقیقە بێجووڵە لە پاڵیا وەستا، پاشان بەبێ ئەوەی هێزی تیا مابێت، کەوتە سەر قەنەفەکە، وەک نەخۆش سووکەناڵینێکی کرد و پاڵکەوت. چاوی داخستبوو، نیو سەعات بەو جۆرە تێپەڕی. بیری لە هیچ نەدەکردەوە. تەنیا بیرۆکەیەک، یان ختوورەیەک، یان دیمەنێک نەبێت کە بە بەرچاویدا تێدەپەڕین، ئەوەیش بە نارێکی و بەبێ ئەوەی پەیوەندییان بە یەکترەوە هەبێت، بۆ نموونە دەموچاوی ئەو کەسانەی

کە بە منداڵی دیبوونی، یان ئەوانەی تەنیا جارێک چاوی پێیان کەوتبوو و ئیتر هەرگیز بیری لێنەکردبوونەوە، زەنگی کڵێسەیەک و.. مێزی بلیاردی کابارێیەک و ئەفسەرێک کە لە پاڵیا وەستابوو، بۆنی جگەرەیەک لە جگەرەفرۆشییەکی ژێرزەمینیدا، مەیفرۆشێک، نەردەوانێکی زۆر تاریک کە ئاوی پیس و توێکڵەهێلکە داپۆشیبێت، لەگەڵ ئەوەیشدا دەنگی زەنگی کڵێسای یەکشەموانی تیا ببیستێت.. هەموو ئەم شتە جۆراوجۆرانە یەک بەدوای یەکدا وەک ڕەشەبا هێنابێتنی، دەهاتن و دەچوون. تەنانەت هەندێکیان ئەوەندە چێژیان هەبوو، کە بۆ ماوەیەک ڕاسکۆلنیکۆڤیان سەرگەرم دەکرد، بەڵام ئەوانە زوو ون دەبوون. بەهەرحاڵ، ئەو لە ناوەوەی خۆیدا هەستی دەکرد شتێکی قورسی لەسەرە، بەڵام زۆر ئازاری نادات، تەنانەت هەندێکجار ئەو قورساییەی لا خۆش بوو.. تەزوویەکی سووکی تێدەگەڕا و تا ڕادەیەک خۆشییەکی دەهاتێ.

ڕاسکۆلنیکۆڤ گوێی لە هەنگاوی خێرا و دەنگی ڕازومیخین بوو، چاوی لێکنا و خۆی کردە خەوتوو. ڕازومیخین دەرگای کردەوە و ماوەیەک لەبەر دەرگاکەدا بە دوودڵییەوە وەستا، ئینجا لەسەرخۆ هەنگاوی نایە ناو ژوورەکەوە و بە هێوری لە قەنەفەکە نزیک کەوتەوە. گوێی لە ورتەورتی ناستاسیا بوو کە دەیگوت:

- وازی لێبێنە، با چاک بخەوێت، دوایی نان دەخوات.

ڕازومیخین وەڵامی دایەوە:

- باشە، ڕاست دەکەیت.

هەردووکیان بە هێمنی چوونە دەرێ و دەرگایان داخست، نزیکەی نیوسەعاتی خایاند، ڕاسکۆلنیکۆڤ چاوی کردەوە، لەسەر پشت ڕاکشا و دەستی نایە پشت سەری.

"ئەم کابرایە کێیە؟ ئەمەی دەڵێی لەژێر زەوییەوە هەڵتۆقیووە، کێیە؟ لە کوێ بووە و چی دیووە؟ بێگومان هەموو شتێکی بینیووە، باشە، لەو کاتەدا لە کوێ وەستاوە و لە کوێوە تەماشای کردووە؟ بۆ وا تازە لەژێر زەوییەوە هاتۆتە دەرێ؟ چۆنی دیووە، دەبوو ببیبینێت؟ .. هوم..."
ڕاسکۆلنیکۆڤ تەزوویەکی سارد هەموو گیانی هێنابووە لەرزین، لەسەر بیرکردنەوەکەی بەردەوام بوو: "ئەی ئەو قوتووەی کە نیکۆلا لە پشت دەرگاکەوە دۆزییەوە؟ ئایا دەبوو ئەوە ڕوو بدات؟ ئەمانە بەڵگەن؟ بەڵگەی تەواون؟ ئەگەر لە نێوان هەزاران شتدا شتێکی هەرە بچووکت لە یاد کرد، دەبێتە بەڵگەیەک بە گەورەیی ئەهرامەکانی میسر. مێشێک فڕی و شتێکی دی! بۆ ناشێت؟"
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە بێزارییەکی زۆرەوە هەستی بەبێ توانایی خۆی کرد، بێتوانایی جەستەی، زەردەخەنەیەکی تاڵی هاتێ و کەوتەوە بیرکردنەوە: "دەبوو ئەمەم بزانیبا، چۆن وێرام، کە من خۆم باش دەناسم و لە توانا و باری خۆم ئاگادارم، تەورم هەڵگرت و خۆم شەلاڵی خوێن کرد؟ دەبوو ئەمەم پێشتر بزانیبا.." بە نائومێدییەوە لەبەر خۆیەوە وتی:
- بەڵێ، من پێشتر ئەمەم دەزانی.
هەندێکجار لە پێشی بیرۆکەیەکدا ڕا دەوەستا: "نا، ئەو جۆرە کەسانە وەک من دروست نەبوون، ئەوەی بە ڕاستی ئەو دەسەڵاتەی هەیە، کەسێکە دەتوانێت هەموو کارێک ئەنجام بدات. تۆڵۆن ژێرەوژوور بکات، قەتڵوعامی پاریس بکات، لە میسردا لەشکرەکەی فەرامۆش بکات، ملیۆنان کەسی ناو سوپاکەی لە پەلاماردانی موسکۆدا لەناو بەرێت و پاشان لە "ڤلنا" پاکانەی خۆی بکات و دوای مردنیشی

پەیکەری بۆ دروست بکەن[1]. وا دیارە هەموو شتێک بۆ ئەو کەسانە ڕەوایە، حەتمەن لەشی ئەوان لە ئاسن دروست کراوە نەک لە گۆشت و خوێن!"

بیرۆکەیەکی کتوپڕ و تا ڕادەیەک تازە ڕاسکۆلنیکۆڤی خستە پێکەنین: "ناپلیۆن، ئەهرام، واتەرلو، ئینجا پیرێژنێکی دزێو، پیرێژنێکی سووخۆر بە سندوقێکی سوورەوە لەژێر تەختەکەیدا، چۆن ئەم دوانە بەراورد بەیەکدی دەکرێن! تەنانەت پۆرفیری پتروڤیچ چۆن ئەمەی بۆ قووت دەدرێت!.. بۆ قووتدانی ئەم شتە کاری ئەمانە! جوانناسی ئەو کارە دەداتە دواوە: "بۆ دەبێت ناپلیۆن بخزێتە ژێر تەختە خەوی پیرێژنێکی دزێوەوە!" ئاهـ. چ قێزەونە!"..

هەندێکجار وای هەست دەکرد کە وڕێنە دەکات. دەکەوتە لەرزوتایەکی خۆشەوە، جاری تر زۆر بە پەرۆشەوە بیری دەکردەوە: پیرێژنەکە بێجگە لە شتێکی بێمانا چی تر نییە، ڕەنگە هەر دروستکردنەکەی هەڵە بێت، مەبەست ئەو نییە، پیرێژن تەنیا نەخۆشێک بوو، من دەمویست لە سنوور زیاتر تێپەڕم.. من مرۆڤم نەکوشتووە، بەڵکو باوەڕێکم کوشتووە، باوەڕێکم لەناو بردووە، وەلێ نەمتوانی سنوورەکە ببەزێنم و هەر لەم دیوەوە مامەوە.. ئەوەی توانیم بیکەم، کوشتن بوو، بەڵام وا دیارە نەمزانیووە ئەوەیشم چۆن کرد! باوەڕ؟ بۆ لەو کاتەدا ڕازومیخینی گەوج جوێنی بە سۆشیالیستەکان دەدا؟ مرۆڤی چەوساوە و کارگەرن، "بۆ خۆشی و بەختەوەری گشتی " تێدەکۆشن.. نا، نا، ژیان جارێک بۆ من ڕەخسا و

---

[1] مەبەستی لەو کەسە "ناپلیۆن"ە کە هەموو ئەو کارانەی لە کاتی فەرمانڕەواییەکەیدا کردووە. ـو ـ

ئیتر هەرگیز بۆ من وجودێکی نییە، من ناتوانم چاوەڕوانی "بەختەوەریی گشتی" ببم، دەمەوێت خۆیشم بژیم، ئەگینا وا چاکترە هەر نەمێنم باشە، ئەی دوای ئەوە؟ من نەمدەویست بە پاڵ دایکە برسییەکەمدا تێپەڕم و ڕۆبڵێک لە گیرفانمدا توند بگرم و چاوەڕوانی بەختەوەریی گشتی بم و بڵێم: "منیش خشتێکم بۆ بەختەوەریی گشتی داناوە، لە دڵدا هەست بە ئاسوودەیی دەکەم!.." هە، هە، باشە بۆ ڕێگەتان پێدام؟ منێک کە تاقە جارێک دەژیم، منیش دەمەوێت..
پاشان وەک شێت پێکەنینێکی کتوپڕی کرد و لەسەر قسەکانی ڕۆشت:
- ئاه، لە دیدی جوانناسییەوە بە ڕاستی من لە ئەسپێیەک زیاتر نیم، هەر ئەوە و هیچی تر.
دوایی بە زەردەخەنەیەکی تەوساوییەوە بەم بیرۆکەیەوە چەسپی، لە کاتێکدا کە هەوڵی گەڕان و شرۆڤەکردنی مەسەلەکە سەرگەرمی کردبوو، دیسانەوە کەوتەوە دوای قسەکانی: "بەڵێ، لە ڕاستیدا من هەر ئەسپێیەکم، هیچ نەبێت لەبەر ئەوەی کە یەکەم: من هەر ئێستایش بیر لەوە دەکەمەوە کە من ئەسپێم، دووەم: لەبەر ئەوەی مانگێکی تەواو، یەزدانی میهرەبانم بێزار کرد و کردم بە شایەت، کە من ئەم کارە نە بۆ خودی خۆم دەکەم و نە بۆ ئارەزووەکانم. بەڵکو لەپێناوی مەبەستێکی ڕەوا و گەلێک جواندا دەیکەم.. هە، هە، سێیەم: لەبەر ئەوەی کە بۆ ئەنجامدانی کارەکە من زۆر بە ویژدانەوە کردوومە، ڕەچاوی کێش و ئەندازە و حسابم کردووە، لە نێو ئەسپێکانیشدا بێکەڵکترینیانم هەڵبژاردووە، دوای کوشتنیشی بڕیارم دا لە ماڵ و سامانەکەی، تەنیا ئەوەندە هەڵبگرم، کە بۆ هەنگاوەکانی بەراییم پێویست بوون، نە زیاد و نە کەم (ئەوەی کە مایەوە، بەپێی ڕاسپاردەی خۆیشی درایە دێر، هە، هە، هە!)".

هێند توورە بوو، کەوتبووە دانەکیرە و لەگەڵ خۆیشیدا هەر دەدوا: "لەبەر ئەوە چ گومان لەوەدا نییە کە من ئەسپێم و ڕەنگە خودی من لەو ئەسپێ کوژراوە خراپتریش بم، پێشتریش دەمزانی کە دوای کوشتنەکە ئەم قسانە هەر بە خۆم دەڵێم! ئایا شتێک هەیە لەگەڵ ئەم سووکی و دزێوییەدا بەراورد بکرێت! چ سووکییەک! چ ترسنۆکییەک! ئێستا زۆر باش لەوە تێدەگەم کە ئەو پێغەمبەرە شمشێربەدەستە ئەسپسوارە کە دەڵێت: "خودا دەفەرموێت گوێڕایەڵ بە، ئەی بەندەی لەرزیوو"، ئەو پێغەمبەرە ڕاست دەکات و لەسەر هەقە ئەگەر بە درێژایی ڕێگە، بە لەشکرێکی زۆرەوە، ڕێگە بگرێت و تاوانبار و بێتاوان لەناو بەرێت و بەوەیش قایل نەبێت هیچ ڕوونکردنەوە و پاساوێکیان بۆ بهێنێتەوە. ئەی بەندەی لەرزیوو. ملکەچ بە و ئارەزوو مەکە، چونکە داخوازی کاری تۆ نییە. ئای، هەرگیز لەو پیرێژنە خۆش نابم، بە هیچ جۆرێک".

قژی شەلاڵی ئارەقە بوو، لێوە لەرزیووەکانی وشک و داخ بوون. بێجووڵە نیگایشی لەبن میچەکە بڕیبوو. دایک و خوشکمم چەند خۆش دەویست! ئێستا بۆ چاوم پیایاندا هەڵنایەت؟ بەڵێ لێیان بێزارم، بە جەستە بێزارم و ناتوانم لای خۆمەوە لە گەڵیاندا دەربەرم، لە بیرمە.. کەمێک لەمەوبەر لە دایکم نزیک بوومەوە و ماچم کرد. کاتی لە ئامێزگرتنی بیرم لەوە کردەوە ئەگەر ئەو بزانێت چی ڕوو دەدات.. ئەی چۆنە پێی بڵێم؟ لەدەستیشم دێت.. هوم! دەبێت ئەویش وەک من وابێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە کاتێکدا کە لە بیرکردنەوەیەکی قووڵدا بوو، دەتوت دەیەوێت لەگەڵ وڕێنەکەیدا چنگاوش بێت، لەسەر قسەکانی ڕۆشت: "ئای چەندە ئێستا لەو پیرێژنە بێزارم! ئەگەر زیندوبووایەتەوە،

سەرلەنوێ دەمکوشتەوە. داماو لیزاڤێتا، بۆ لەو چرکەساتەدا گەیشت!..
وەلێ سەیرە، من تا ڕادەیەک بیر لەو هەر ناکەمەوە. وەک ئەوەی من ئەوم نەکوشتبێت!.. لێزاڤیتا، سۆنیا، داماوە بێدەنگوسەنگەکان، بە چاوی پڕ لە خۆشەویستی و بێوەییانەوە، ئەمانە بۆ ناگرین؟ بۆ نانالێنن؟.. ئەمانە هەموو شتێک دەبەخشن.. ڕوانینیان هێور و میهرەبانە، سۆنیا، سۆنیای بێدەنگ و دلۆڤان".

ڕاسکۆلنیکۆڤ بێهۆش کەوت.

زۆری بە لاوە سەیر بوو کە لە بیری چوبووەوە چۆن هاتۆتە سەر شەقامەکە، شەو درەنگبوو، دنیا تا دەهات تاریکتر دەبوو. مانگە پڕەکە تا دەهات زیاتر و زیاتر دەدرەوشایەوە، وەلێ هەواکە خەفە بوو. خەڵکەکە دەستەدەستە بە شەقامەکەدا دەهاتن و دەچوون، هەندێکیان بە شەکەتی دەگەڕانەوە ماڵەوە و هەیشبوو بۆ خۆیان دەگەڕان، بۆنی قسڵ و تۆز و خۆڵ و بۆگەناو دەهات. ڕاسکۆلنیکۆڤ غەمگین و نیگەران هەنگاوی دەنا، چاکی لە بیرە کە لە ماڵەوە بە ئامانجێکی تایبەتییەوە هاتبووە دەرێ، دەبوو کارێک ئەنجام بدات و پەلەی لێبکات. بەڵام کارەکە چی بوو. ئەوەی لە بیر نەمابوو. لەپڕێکدا وەستا، لەوبەری شەقامەکەوە کەسێکی بینی لەسەر شۆستەکە وەستاوە و دەست بۆ ئەم ڕادەوەشێنێت. لە شەقامەکە پەڕییەوە و چوو بۆ لای. بەڵام زەلامەکە زوو پشتی تێکرد، وەک هەر نەیدیبێت، بەبێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە و بەسەر خۆیدا بهێنێت، سەری داخست و ڕۆیشت "ئەمە چییە؟ خۆی بانگی نەکردبووم؟" لەگەڵ ئەوەیشدا پێی هەڵگرت تا پێی بگات، دە هەنگاوی مابوو بگاتە لای، لەپڕا ناسی و ترسا. ئەو کەسە هەمان وردەبۆرژوای کەمێک لەمەوبەر بوو، هەمان بەرگی لەبەردا و دەموچاویشی مۆن بوو. ڕاسکۆلنیکۆڤ دووربەدوور دوای کەوت،

دڵی لێی دەدا، هەردووکیان پێچرانە کۆڵانێکەوە، کابرا هەر ئاوڕی نەدەدایەوە. ڕاسکۆلنیکۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی: "ئایا دەزانێت من بە دوایەوەم؟" کابرا گەیشتە ڕاڕەوی ساختمانێکی گەورەوە. ڕاسکۆلنیکۆڤ خێرا گەیشتە دەرگاکە و کەوتە تەماشا، بۆ ئەوەی کابرا ئاوڕ بداتەوە و بانگی ئەم بکات. بە ڕاستییش دوای ئەوەی گەیشتە حەوشەکە، کابرا لەپڕێکدا گەڕایەوە، دیسانەوە بە دەستی ئاماژەی کردەوە. ڕاسکۆلنیکۆڤ زوو خۆی گەیاندە ڕاڕەوەکە، وەلێ کابرا ئیتر دیار نەما، بێگومان گەیشتبووە پلەکانی یەکەم، ڕاسکۆلنیکۆڤ هەر بە دوایەوە بوو، لە ڕاستیدا لە نەردەوانی دووەمدا گوێت لە دەنگی لەسەرخۆی پێی یەکێک دەبوو. سەیر بوو، پلیکانەکان بە لای ڕاسکۆلنیکۆڤەوە نامۆ نەبوون، ئەوەیش پەنجەرەی نهۆمی یەک، تریفەی مانگ بە شێوەیەکی غەمگین و نهێنیئامێز لە شووشەکەی دەدا. ئەمەیش نهۆمی دووەم، ئا! ئەمەیش ئەو شوێنەیە کە کرێکارەکان بۆیەیان تیا دەکرد.. چۆن ئەم زوو نەیناسیەوە؟ دەنگی پێی کابرا کە لە پێشیەوە دەڕۆیشت، نەما "بێگومان وەستاوە یان لە جێگایەکدا خۆی حەشار داوە". ئەمەیش قاتی سێیەم، ئایا هەر بڕوات؟ چ بێدەنگییەک فەرمانڕەوای ئەو ناوەیە، تەنانەت سامناکیشە! وەلێ ڕاسکۆلنیکۆڤ هەر ڕۆیشت، لە دەنگی پێی خۆی دەترسا و شپرزە بوو. خودایا، چەند تاریکە! بێگومان ئەو کابرایە لێرەدا، لە سووچێکدا خۆی مەڵاس داوە، ئاه! دەرگای باڵکۆنەکە بە تەواوی کراوەتەوە، ڕاما و چووە ژوورێ، داڵانەکە زۆر تاریک و چۆڵ بوو. کەس بەرچاو نەدەکەوت، وەک ئەوەی هەموو شتەکان برابێتنە دەرەوە، هێدی هێدی، لەسەر نووکی پەنجە، چووە میوانخانەکەوە، هەموو ژوورەکە پڕ بوو لە تریفە درەوشاوەکەی مانگ. لەوێدا هەموو

شتەکان ڕەنگ و ڕووی پێشوویان هەبوو، تەنانەت کورسییەکان، ئاوێنەکە، قەنەفە زەرد و وێنە لە چوارچێوە گیراوەکان، مانگە مەزنەکەیش، تەواو پڕ، ڕەنگ سوورێکی مسین، ڕێک لە پەنجەرەکەوە سەیری ناوەوەی دەکرد. ڕاسکۆلنیکۆڤ بە خۆی وت: "ئەم بێدەنگییە لە مانگەوەیە، گومان لەوەدا نییە کە سەرقاڵی کارێکە، دەرخستنی نهێنییەک، هەڵهێنانی مەتەڵۆکەیەک". ڕاسکۆلنیکۆڤ وەستا و چاوەڕێی کرد، ماوەیەک هەر وا بە بێدەنگی مایەوە، چەندە مانگەکە هێورتر بووایە، ئەوەندە دڵی ئەو توندتر لێی دەدا، بە ڕادەیەک هەستی بە ئازار دەکرد، کڕی و هێورییەکە بەردەوام بوون، لەپڕێکدا گوێی لە دەنگێکی تیژ و ناخۆش بوو، لە شکانی لقەدارێکی باریک دەچوو، دیسانەوە هەموو شتێک بێدەنگ بووەوە، مێشێک هەستا و لەپڕێکدا لە کاتی فڕیندا بەر شووشەیەک کەوت، گیزەیەکی لێوەهات لە سکاڵا و دەردەدڵ دەچوو. هەر لەو کاتەدا، چاوی بە جلێکیماڵەوە کەوت، کە لە سووچێکدا، لە نێوان باوەڵێکی بچووک و پەنجەرەکەدا هەڵواسرابوو، بە خۆی وت: "جلی ماڵەوە لێرەچی دەکات؟ پێشتر ئەمەی لێنەبوو". لەسەرخۆ لێی نزیک کەوتەوە، زانی دەبێت لە پشتییەوە یەکێک خۆی شاردبێتەوە، جلەکەی لادا و کورسییەکی بینی، لەسەر کورسییەکە، لە سووچێکدا، پیرێژنێک دانیشتبوو، بە جۆرێک خۆی پێچابووەوە و سەری دانەواندبوو، کە بە هیچ جۆرێک ڕووی نەدەبینرا، ماوەیەک بەرانبەری وەستا، بێگومان خودی "ئەو" بوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری کردەوە: "دەترسێت!" پاشان لەسەرخۆ تەورەکەی لە ئەڵقەکە کردەوە و یەک دووجار بەسەری پیرێژنەکەیدا کێشا، سەیر بوو پیرێژن هیچ بە خۆی نەزانی، هەر دەتوت لە دار دروست کراوە، ڕاسکۆلنیکۆڤ ترسا و زیاتر لێی نزیک کەوتەوە، چەمایەوە و

تەماشای کرد. پیرێژنەکەیش زیاتر سەری دانەواند، ئەوسا ڕاسکۆلنیکۆڤ تەواو خۆی دانەواندە سەر زەوییەکە، لەژێرەوە لە دەموچاوی ڕوانی، لێی ڕاما و سەری سوورما: پیرێژنەکە دانیشتبوو و پێدەکەنی، پێکەنینێکی بەکوڵ و بێدەنگ، پێکەنینێک کە نەدەبیسترا و تەواو زۆری لە خۆی کردبوو کە ڕاسکۆلنیکۆڤ گوێی لە دەنگی نەبێت. لەپڕێکدا هەستی کرد کە دەرگای ژووری نووستن کەمێک کرایەوە، لەوێیش دەنگی پێکەنین و چرپەچرپ دەهات. ئەم تووڕە بوو، بە هەموو هێزییەوە کەوتە پێداکێشانی سەری پیرێژن، وەلێ لەگەڵ هەر لێدانێکدا پێکەنین و چرپەچرپ زیاتر بەرز دەبووەوە، خودی پیرێژنە کە لە پێکەنیندا گرمۆڵە بووبوو. ڕاسکۆلنیکۆڤ ویستی هەڵبێت. وەلێ تارمەکە ئاپۆرەی خەڵک بوو. ئەو دەرگایەی ڕووی لە نەردەوانەکە بوو، تەواو کرابووەوە، داڵان و پلیکانە و خوارەوە هەمووی خەڵکی بوو، سەریان لە یەکدی نزیک و گشتیان تەماشایان دەکرد، هەموویان هەناسەیان لە خۆ بڕیبوو، بێدەنگ وەستابوون، ڕاسکۆلنیکۆڤ دڵی گوشرا.. توانای هەنگاونانی نەما و دەتوت بە زەوییەکەوە چەقیووە. ویستی بقیژێنێت و بەئاگا هات. زۆر بە زەحمەت هەناسەیەکی دا، بەڵام سەیر بوو، دەتوت هێشتا مۆتەکەکەی لێنەبووەتەوە، دەرگای ژوورەکەی لەسەر پشت و لەبەر دەرگاکەشدا پیاوە نەناسەکە وەستابوو، زۆر بە وردی لەمی دەڕوانی.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە هێشتا فریای ئەوە نەکەوتبوو بە تەواوی چاوی بکاتەوە، خێرا چاوی داخستەوە، بێجووڵە لەسەر پشت کەوتبوو، بە خۆی وت: "ئەمە خەونە کە هێشتا بەردەوامە یان نا؟" پاشان پێڵووەکانی کردنەوە و تەماشای کرد: پیاوە نەناسەکە لە هەمان شوێن وەستابوو و چاوی لەو بڕیبوو. لە ناکاوێکدا کابرا لەسەرخۆ

بەردەرگای جێ هێڵا و لە دوای خۆیەوە توند دەرگاکەی داخست. لە مێزەکە نزیک کەوتەوە و چرکەساتێک وەستا، لە هەموو ئەو ماوەیەدا چاوی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ نەدەتروکاند، لەسەرخۆ، بێدەنگ نزیک لە تەختەی نووستنەکە، لەسەر کورسییەکە دانیشت، کڵاوەکەی لە پاڵ خۆیدا خستە سەر زەوی، هەردوو دەستی نایە سەر گۆچانەکەی و چەناگەی خستە سەر، دیار بوو ئامادەیە ماوەیەک چاوەڕوان بێت، ئەوەندەی بکرێت، لە ڕێی مژۆڵە نیمچەداخراوەکانییەوە، ڕاسکۆلنیکۆڤ بینی کە کابرا تەمەنی لاویی بڕیووە، کەمێک بەخۆوە و ڕیشێکی پڕی کەمڕەنگ و تا ڕادەیەک سپی هەبوو..

دە دەقیقە تێپەڕی، هێشتا دنیا ڕووناک بوو، وردەوردە خۆر لە ئاوابوونی دەدا، بێدەنگییەکی تەواو ژوورەکەی داگرتبوو، تەنانەت لای پلیکانەکانیشەوە دەنگ نەدەهات. تەنیا مێشێکی زل گیزەگیزی دەکرد، بەملاوبەولادا دەفڕی و بەبێ ویستی خۆی خۆی بە شووشەکەدا دەکێشا، سەرئەنجام ڕاسکۆلنیکۆڤ خۆی پێنەگیرا، لەپڕێکدا هەستا و لەسەر قەنەفەکە دانیشت.

– فەرموو، بزانم چیت دەوێت؟

کابرای نەناسراو بە هێوری و پێکەنینەوە، بە دەنگێکی تایبەتەوە وتی:

– من دەمزانی تۆ نەنووستوویت و خۆت کردووە بە خەوتوو، ڕێگەم بدە خۆمت پێبناسێنم: من ئارکادی ئیڤانۆڤیچ[1] سڤیدریگایلوفم..

---

[1] *Arkadi Ivanovich*

١

دیسانەوە ڕاسکۆلنیکۆڤ لەگەڵ خۆیدا کەوتەوە قسە: "نەکا ئەمەیش هەر بەشێک بێت لە خەونەکە؟" بەپارێز و دوودڵییەوە چاوی لە میوانە چاوەڕواننەکراوەکە بڕی، پاشان بە دەنگێکی بەرزی هاژەوە وتی:

- سڤیدریگایلوف؟ چۆن! هەرگیز نابێت!

وەک بڵێی میوانەکە هیچ سەیری بەم قسانە نەهاتبێت.

- بە دوو ئەنگیزە هاتوومەتە لات، یەکەم، حەزم کرد ڕووبەڕوو لەگەڵت ئاشنا بم، چونکە ماوەیەکی زۆرە گەلێک شت لەبارەی تۆوە دەبیستم، کە زۆر سەرنجڕاکێشن و لە قازانجی تۆن. دووەم، هیوادارم یارمەتیی مەسەلەیەکم بدەیت، کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە خوشکت، ئاڤدوتیا ڕومانوڤناوە هەیە. لە ئەنجامی بەدحاڵیبوونێکدا، دەشێت ئەگەر ڕاسپاردەیەک نەبێت، تەنانەت نەهێڵێت بچمە ماڵەکەیانەوە، وەلێ بە هاوکاریی تۆ، هیوای پێچەوانە دەخوازم..

ڕاسکۆلنیکۆڤ قسەکەی پێبڕی:

- هیوایەکی بێهودەیە.

- تکایە بمبوورە ئەم پرسیارەت لێدەکەم، ئەوان دوێنێ گەیشتنە ئێرە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی نەدایەوە.

- دەزانم دوێنێ گەیشتوون، منیش خۆم سێ ڕۆژ لەمەوبەر گەیشتووم، باشە، ڕودیون ڕومانوڤیچ، دەمەوێت لەم بارەیەوە پێت بڵێم کە پاکانەکردن بۆ خۆم بە کارێکی بێهودە دەزانم، وەلێ مۆڵەتم بدەیە با منیش بپرسم: بەڕاست لە سەرانسەری ئەم چیرۆکەدا من چ گوناهێکی گەورەم پێدەبڕێت؟ ئەگەر ئێمە بە ڕاستی بمانەوێت دوور لە هەر مەبەستێک، داوەرییەکی بیرمەندانە بکەین.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بەدەم بێدەنگییەکەیەوە هەر تەماشای دەکرد.

- تاوانی من ئەوەیە کە لە ماڵی خۆمدا، کەوتبوومە دوای کچێکی بێپشتوپەنا و "بە پێشنیازی هیچوپووچی خۆم سووکایەتیم پێکرد" وایە؟ (بڕوانە خۆم دەستپێشخەری دەکەم) ئاخر ئەوەندە بەسە کە جەنابت بزانیت منیش مرۆڤم -بە لاتینی وتی- هیچ شتێکی مرۆڤایەتیم پێ نامۆ نییە[١]. بە کورتی، دەشێت منیش عاشق بم و خۆشەویستی بکەم، (بێگومان ئەمە بەبێ ویستی خۆمان ڕوو دەدەن) ئەگەر تۆ بڕوات بەمە هەبێت، ئەوسا مەسەلەکە زۆر ئاسایی و سادە و ڕوون دەبێت. هەموو پرسیارەکە لەوەدا کۆ دەبێتەوە کە ئایا من دڕندەیەکی کێویم یان خۆم قوربانیم؟ باشە ئەگەر قوربانی بم، ئەوسا چۆن؟ ئاخر ئەو کاتەی کە پێشنیازی ئەوەم بۆ کرد لەگەڵمدا بۆ ئەمریکا یان بۆ سویسرا هەڵبێت، ڕەنگە هەستێکی پڕ لە ڕێزم لە دڵدا بووبێت و خوازیاری ئەوە بووبێتم کە بەختەوەریی هەردوو لامان دەستەبەر بکەم. ئاخر ئەقڵ لە خزمەتی هەستەکاندایە؟ بۆیە دەشێت من زیاتر ستەمم لە خۆم کردبێت نەک لەو..

---

[١] Nihil humanum ڕستەیەکی بەناوبانگی تیرانسە: "من مرۆڤم، هیچ شتێکی مرۆڤایەتیم پێ نامۆ نییە". -و-

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە بێزارییەوە قسەی پێبڕی:
- ئەسڵەن قسە لەسەر ئەوە نییە، بە کورتی و پوختی پێت بڵێم تۆ کابرایەکی ناخۆشەویستیت، ئیتر لەسەر هەق بیت یان نا، کەسمان حەزمان بە ناسینی تۆ نییە، تۆمان ناوێت، فەرموو برۆ دەرەوە.
لەپڕا سڤیدریگایلوف دایە قاقای پێکەنین، بەدەم پێکەنینە قووڵەکەیەوە وتی:
- بەڵام تۆ.. تۆ تێناکەویت و دانامێنیت.. ویستم زرنگیی بەخەرج بدەم، وەلێ نەکرا، تۆ پەنجەت نایە سەر مەبەستە سەرەکییەکە.
- تۆ هێشتا بەردەوامی لەسەر فریوودان و زرنگییەکەت.
سڤیدریگایلوف کە هێشتا لە قاقای پێکەنینەکەی نەکەوتبوو، وتی:
- چ قەیدی هەیە؟ چ قەیدی هەیە؟ ئاخر وەک دەڵێن شەڕ شەڕە و هەر فێڵ و زرنگییەکی بۆ بەکار بێنیت ڕەوایە؟.. لەگەڵ ئەوەیشدا تۆ قسەت پێبڕیم، هەر چۆنێکە، من دیسان دووبارەی دەکەمەوە کە ئەگەر ئەو پێشهاتە لە باخەکەدا ڕووی نەدایە، هیچ ناخۆشییەک پێش نەدەهات، مارفا بتروڤنا..
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ڕەقی قسەکەی پێبڕی:
- دەڵێن هەر تۆیش گیانی مارفا پتروڤنات کێشاوە؟
- کەواتە تۆ ئەمانەیشت بیستووە؟ ئەگەرچی هەردەبوو بیبیستیت.. باشە، لەبارەی ئەم پرسیارەتانەوە بە ڕاستی نازانم بڵێم چی، هەرچەندە لەم ڕووەوە ویژدانم تەواو ئاسوودەیە، واتا تۆ وا مەزانە کە من شتێک هەبێت لێی بترسم. هەموو ئەم بەسەرهاتە زۆر بە وردی ئەنجام درا، لێکۆڵینەوەی پزیشک ئەوەی دەرخست کە دڵوەستانەکە لە ئەنجامی ئەو خۆشۆردنە خێرایەوە بووە، کە دوای خواردنێکی قورس و نۆشینی نزیکەی قاپێک شەرابەوە بووە، هەڵبەتە

لێکۆڵینەوەکە هیچ شتێکی تری نەوتبوو، نا، دەزانیت من ماوەیەک و بە تایبەتی لە ڕێگەدا، ئەو کاتەی سواری شەمەندەفەر بووبووم، بیرم لە چی دەکردەوە: تۆ بڵێی من هۆیەک نەبووبێتم.. بۆ ڕوودانی ئەو کارەساتە، بۆ نموونە جۆرێک لە تووڕەیی دەروونی یان شتێکی لەو بابەتە؟ بەڵام بە تەواوی برواوە گەیشتمە ئەو ڕاستییەی کە تەنانەت ئەوەیش مەحاڵە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ پێکەنی:

– بەرگەی ئەم هەموو ناخۆشییە دەگریت.

– تۆ بە چی پێدەکەنیت؟ باش بیر بکەرەوە: من تەنیا دووجار بە قامچییەکی بچووک سووک لێم داوە، تەنانەت شوێنی لێدانەکەیشی دیار نەماوە.. تکات لێدەکەم من بە لاسار و بەدگومان نەزانیت، چونکە من دەزانم کاری ناشیرینم کردووە و هتد.. وەلێ ئەوەیش زۆر باش دەزانم کە مارفا پتروڤنا لەو "سەرگەرمی"یەی من تا ڕادەیەک خۆشحاڵ بوو. چیرۆکی خوشکەکەت لە هەوەڵەوە تا کۆتایی بە هەموو کەسێک وترابوو، مارفا پتروڤنا دوای سێ ڕۆژ ناچار بوو لە ماڵ نەڕواتە دەرێ، بۆ چوونە ناوشار ئیدی هیچی لە گیرفاندا نەبوو، بێجگە لەوە سەری هەمووانی بە خوێندنەوەی ئەو نامەیە بردبوو (بێگومان لەبارەی خوێندنەوەی ئەو نامەیەوە شتێکت بیستووە). ئیتر دوای ئەوە و لەپڕێکدا ئەو دوو زەبرە قامچییە لە ئاسمانەوە بۆی هاتە خوارێ. یەکەم کاری مارفا پتروڤنا ئەوە بوو کە فەرمانی دا گالیسکەکەی بۆ ببەستن.. من کارم بەوەوە نییە کە هەندێکجار وا ڕوو دەدات ژنان بە پێچەوانەی هەموو ئەو ڕق و تووڕەییەی کە بە ڕووکەش هەیانە، زۆر حەز بەوە دەکەن سووکایەتییان پێبکرێت. ئەم جۆرە پێشهاتە لە هەموو کەسێک ڕوو دەدات، مرۆڤ زۆر زۆر

حەزی بەوەیە سووکایەتیی پێبکرێت. ئایا تۆ سەرنجی ئەمەت داوە؟ وەلێ ئەم مەسەلەیە بە تایبەتی بۆ ژنان ڕاستە، تەنانەت دەتوانین بڵێین ئەمە تاقە شتێکە کە دڵیان خۆش دەکات.

ڕاسکۆلنیکۆڤ چرکەساتێک بیری لەوە کردەوە، کە هەستێ و بڕوا و دانیشتنەکە لەوێدا کۆتایی پێبێنێت. بەڵام جۆرێک لە کونپشکنی و حساباتێک لەو کارەی کرد، بە هەستێکی پەرتەوە پرسی:

- تۆ حەز لە لێدان دەکەیت؟

سڤیدریگایلوف بە هێوری وەڵامی دایەوە:

- نا، زۆر نا، لەگەڵ مارفا پتروڤنایشدا دەتوانم بڵێم هەرگیز شەڕمان نەبووە، هەمیشە لە ژیانماندا ڕێک بووین و ئەو لێم ڕازی بووە، بە درێژایی ژیانی حەوت ساڵیمان من تەنیا دوو جار قامچیم بەکار هێناوە (هەڵبەتە ئەگەر جاری سێیەم حساب نەکەین کە تا ڕادەیەک گومانهەڵگرە) یەکەمجار دوای دوو مانگی زەماوەندمان بوو، واتا هەر یەکسەر دوای ئەوەی چووینە لادێ. جاری دووەم، ئەم ڕووداوەی دوایی بوو. تۆ هەرگیز بیرت بۆ ئەوە چووە کە من کابرایەکی ستەمکار و کۆنەپەرست و بێبەزەیی بم؟ هە، هە.. وەلێ بە ڕاستی ڕودیون ڕومانوڤیچ، ئایا لە بیرت نەماوە چەند ساڵێک لەمەوبەر، تەپڵی بەدناویان بۆ تەمێکردنی خەڵکانی دی، بۆ گەنجێک لێدا و ئابڕوویان برد، هەم لە بەردەمی خەڵک و هەم لە چاپەمەنییەکاندا. ناوی خێزانەکەیم لە بیر چۆتەوە، ئەوەی لە شەمەندەفەردا لە ژنێکی ئەڵمانیی دابوو، لە بیرتە؟ هەر ئەو ساڵەیش بوو کە گۆڤاری "سەردەم" باسی ئابڕووچوونەکەی کرد (بێگومان وتاربێژییەکەت لە بیرە لەسەر "شەوانی میسر" لە یادت ماوە؟ ئاە، ئەو چاوە ڕەشانە! ڕۆژە زێڕینەکانی گەنجیمان لە کوێیت؟ لە کوێیت؟) چاکە، با من ڕای

خۆمت پێبڵێم: هەرگیز دڵم بەو کابرایە ناسوتێت، کە ژنە ئەڵمانییەکەی دابووە بەر قامچی، چونکە بە ڕاستی شیاوی دەستخۆشیلێکردن نییە، لەگەڵ ئەمەیشدا دەبێت بڵێم، هەندێکجار تووشمان دەبێت بە تووشی ئەو جۆرە ژنە "ئەڵمانییە" ئاژاوەگێڕانەوە، کە بڕوا ناکەم هیچ ڕوناکبیرێک هەبێت بتوانێت خۆی بگرێت و بەسەر خۆیدا زاڵ بێت و حەوسەڵەی لەدەست نەدات. کەس لەم ڕوانگەیەوە مەسەلەکەی تاووتوێ نەکردووە، لە کاتێکدا کە ئەم شێوازە نیشانەی دۆستایەتی و چارەسەرییەکی بەویژدانانەی کێشەکەیە.

سڤیدریگایلوف دوای ئەم قسانە دیسانەوە کەوتەوە پێکەنین. ڕاسکۆلنیکۆڤ زانی بەرانبەرەکەی کەسێکە ئامانجێکی تایبەتی هەیە و بە تەواوی لەسەر خۆیەتی. پرسی:

- دیارە تۆ چەند ڕۆژێکە لەگەڵ کەسدا قسەت نەکردووە؟

- تا ڕادەیەک، ڕاستە، مەبەستت چییە؟ ڕەنگە بە لاتەوە سەیر بێت مرۆڤێکی سروشت نەرمم و دەتوانم بگونجێم؟

- نا، من بەوە سەرسامم تۆ لەڕادەبەدەر نەرمیت و قابیلی گۆڕانیت..

- بەو بەڵگەیەی بە پرسیارە ڕەقەکانت نەڕەنجام؟ وایە؟.. بۆ بڕەنجێم؟

ئەوسا بە سادەییەکی سەرسووڕمێنەوە وتی:

- تۆ چۆن پرسیارت کرد، منیش هەروا وەڵامم دایتەوە.

پاشان بیرمەندانە لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

- من پەیوەندیم بە هیچ شتێکی تایبەتییەوە نییە، بە خودا سوێند دەخۆم، بەتایبەتی کە ئێستا هیچ شتێک نییە من سەرقاڵی خۆی بکات. وەلێ تۆ هەقتە وێنای ئەوە بکەیت کە من دەمەوێت هەرچۆنێک بووە، خۆشەویستیی تۆ بەدەست بێنم، بەتایبەتی کە من شتێکم لەگەڵ خوشکتا هەیە. ئەوەیش خۆم ڕامگەیاندووە و پێم وتوویت، وەلێ بە

ڕاشکاوی پێت دەڵێم کە زۆر دڵتەنگ و خەفەتبارم، بەتایبەتی لەم سێ ڕۆژەدا، هەر لەبەر ئەوەیە کە بە بینینت خۆشحاڵ بووم.. ڕودیون ڕومانوڤیچ پێت ناخۆش نەبێت کەوا بە ئاشکرا لەگەڵتا دوام. وەلێ خۆت نازانم بۆ، لەبەر دیدەی مندا گەلێک سەیر دێیتە بەرچاو، هەرچی دەڵێی بیلێ، بەڵام لە تۆدا شتێک هەیە.. بە تایبەتی لە ئێستادا، واتا نەک لەم چرکەساتەدا، بەڵکو ئێستا بە شێوەی گشتی.. زۆر باشە، من ئیدی بێدەنگ دەبم، ڕووت گرژ مەکە: ئاخر منیش ئەو ساویلکەیە نیم، کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕووی تێکرد و وتی:

- ڕەنگە تۆ هەرگیز ساویلکە نەبیت، تەنانەت وا دەزانم لە ژینگەیەکی باشەوە هاتبیت، یان لایەنی کەم لە کاتی پێویستدا دەشێت جێگای بڕواپێکردن و دڵنیایی بیت.

سڤیدریگایلوف بە زمانێکی زبر و تەنانەت بە لووتبەرزییەوە وەڵامی دایەوە.

- من گوێ بە قسەی کەس نادەم، بۆیە بیر لەوە دەکەمەوە بۆ دەبێت هەندێکجار مرۆڤ بەدکار نەبێت، بە تایبەتی کە ئەوە بەرگێکە لەم بارودۆخەی ئێمەدا گەلێک سانا و شایستەیە.

هەر بەدەم پێکەنینەکەیەوە وتی:

- بەتایبەتی ئەگەر مرۆڤ هەر بە سروشت حەزی لێبێت.

- بیستوومە لێرە ناسیاوی زۆرت هەن. وەک دەڵێن تۆ "هاوڕێی دەستڕۆیشتوو"ت هەیە، لەم لایەنەوە من بۆ تۆ چ کەڵکێکم هەیە، مەگەر مەبەستێکت هەبێت؟

سڤیدریگایلوف بەبێ ئەوەی وەڵامی ئەسڵی پرسیارەکە بداتەوە، وتی:

- ڕاست دەکەیت ناسیاوم زۆرە، من ئەوانم دیووە، ئاخر ئەمە سێیەم ڕۆژە کە من لەم شارەدا دێم و دەچم، هەم خۆم دەیانناسم، هەم ئەوانیش بەسەرم دەکەنەوە. دەی، هەڵبەتە من بەرگی چاک لەبەر دەکەم و هەژار نیم. دەزانیت یاسای چاککردنی کشتوکاڵ ئێمەی نەگرتەوە: دارستان و لەوەڕگاکانم دەستکەوتی چاکیان هەیە، وەلێ من بۆ ئەوێ ناچم، پێشتریش هەر حەزم پێنەدەکرد. سێیەم ڕۆژمە کە هاتوومەتە ئێرە و نەچوومەتە لای کەس.. ئینجا ئێرە شارە؟ تۆ سەرنجی ئەوەیش بدە کە ئەمە چۆن شارێکە؟ بۆم باس بکە، شاری مووچەخۆران، شاری جۆرەها قوتابیی ئاینی، بە ڕاستی من پێشتر گەلێک شتی ترم لێرە نەدەبینی، واتا هەشت ساڵ لەمەوبەر، کاتێک کە لێرە بێهودە دەسووڕامەوە.. ئێستا تاقە هیوام زانستی توێکارییە و بەس، خوا دەزانێت کە وایە!

- چ جۆرە زانستی توێکارییەک؟

سڤیدریگایلوف دیسانەوە بەبێ ئەوەی گوێ بە پرسیارەکە بدا، لەسەری ڕۆشت:

- وەلێ ئەم یانە و چێشتخانانەی پێی دەوترێت ڕستورانی دوسو[1]، ئەو سەما و پێشکەوتنانەی ئێوە بانگەشەی بۆ دەکەن! باشە، با کاریان بەسەر ئێمەوە نەبێت. ئەی دەبێت مرۆڤ ساختەچیش بێت؟

- بۆ تۆیش ساختەچیەتیت کردووە؟

- بۆ نەمکردووە؟ ئێمە پێش هەشت ساڵ لەمەوبەر کۆمەڵێکی زۆر شایستە و بەڕێز بووین، پێکەوە کاتمان بەسەر دەبرد، دەزانیت

---

[1] Dussaud ئوتێل و چێشتخانەیەکی فەڕەنسی کە لەو سەردەمەدا زۆر بەناوبانگ بووە. ماوەیەک دۆستویفسکی لەوێدا ژیاوە -وەرگێڕ-

هەموومان. کەسانێکی زۆر بەڕەوشت، یان شاعیر یان سەرمایەدار بووین. ئاسایی لە کۆمەڵگای ڕووسیدا بەڕەوشتترین کەس نائومێدەکانن. تۆ سەرنجی ئەمەت داوە؟ ئێستاکە دەمبینیت لە گوندێکدا بۆ خۆم کەنار خستووە. زۆری نەمابوو کابرایەکی یونانی خەڵکی نیژینسک، لەسەر ئەوەی قەرزاری بووم، بمخاتە بەندیخانەوە. لەو ساتەدا بوو کە مارفا پتروڤنا دەرکەوت، دانوستانی لەگەڵ کابرادا کرد و بە سی هەزار ڕۆبڵ منی کڕیەوە (کۆی هەموو ئەو قەرزەی لەسەرم بوو، حەفتا هەزار ڕۆبڵ بوو) ئیتر لەگەڵ مارفادا بەپێی یاسا بووین بە ژن و مێرد و وەک خەزێنەیەکی دەست کەوتبێت، زوو لەگەڵ خۆیدا بردمی بۆ گوند. ئاخر ئەو پێنج ساڵ لە من گەورەتر بوو، زۆری خۆش دەویستم، حەوت ساڵ لەو گوندە نەچوومە دەرەوە. تۆ بڕوانە، ئەو ژنە لە هەموو تەمەنیدا سەنەدی ئەو سی هەزار ڕۆبڵەی کە منی پێ کڕیبووەوە و لای یەکێکی تر دانابوو، لە دژی من بەکاری نەهێنا، لە کاتێکدا ئەگەر خەیاڵی سەرپێچیکردنم هەبووایە، دەیتوانی وا دەستگیرم بکات، کە وێران بم، بێگومان دەیتوانی بیکات، ئاخر، ئەم هەموو شتە جیاوازانە لە ژندا هەیە.

- ئەی ئەگەر ئەو سەنەدە نەبووایە ڕات دەکرد؟

- نازانم، ناتوانم هیچ بڵێم، بەڵام ئەو سەنەدە هیچ منی بێتاقەت نەکردبوو، حەزم لە هیچ شوێنێکی تر نەبوو، خودی مارفا پتروڤنایش کە هەستی بە بێتاقەتیم کرد، دووجار پێشنیازی بۆ کردم کە بە سەفەر بڕۆمە دەرەوەی وڵات. بەڵام سەفەر بۆ؟ پێشتر چووبوومە دەرەوە، هەمیشە لەوێ دڵم ناخۆش بوو. نەک هەر ئەوە، بەڵکو لە سووریی شەبەق، لە کەنداوی ناپۆلی و تەماشاکردنی دەریا غەم دایدەگرتم. لە هەمووی خراپتر ئەوە بوو، کە بە ڕاستی هەستم بە

دڵتەنگی دەکرد. نا، نیشتمان چاکترە، هیچ نەبێت لێرە دەتوانیت کەمتەرخەمی لە هەموو شتەکاندا بخەیتە ئەستۆی کەسانی تر و خۆتی لێ دەرباز بکەیت. ڕەنگە ئێستا من حەزم لە سەفەر بێت بۆ قوتبی باکوور، چونکە شەرابەکەم خراپ بووە و تاقەتی خواردنەوەیم نییە، بەڵام بێجگە لە شەرابییش هیچی ترم بۆ نەماوەتەوە. خۆم ئەمەم تاقی کردۆتەوە. بەڕاست دەڵێن "بیرگ"[1] ڕۆژی یەکشەممە لە باخی یوسوپفەوە بە باڵۆنێکی یەجگار گەورە دەفڕێت و بە پارەیش خەڵکی تر لەگەڵ خۆیدا دەبات. بڵێی ئەمە ڕاست بێت؟

- چۆن، ئامادەیت بفڕیت؟

سڤیدریگایلوف وەک ئەوەی بە ڕاستی بیری لەوە کردبێتەوە، لەسەرخۆ وتی:

- من؟ نا.. هەر ئاوا..

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی: "تۆ بڵێی ڕاست بکات؟"

سڤیدریگایلوف بیری کردەوە و وتی:

- نا، سەنەدەکە ناڕەحەتی نەدەکردم، من خۆم حەزم لێنەبوو لە گوندەکە دەربچم، بێجگە لەوە، ساڵێکیش دەبێت کە مارفا پتروڤنا لە ڕۆژی جەژنی لەدایکبوونمدا سەنەدەکەی بۆ گێڕاومەتەوە، هەروەها بڕێک پارەی چاکیشی پێبەخشیووم، ئاخر ئەو سەرمایەیەکی هەبوو، پێی وتم: "ئارکادی ئیڤانۆڤیچ، بڕوانە من چەند متمانەم بە تۆیە". بڕوات هەبێت ئەمە دەقی وتەکەیەتی. بێگومان تۆ بڕوا ناکەیت وای وتبێت؟ بەڵام دەزانیت، من لە گوندەکەدا ببوومە موڵکدارێکی بەڕێز،

---

[1] Berg ئەڵمانییەک بوو وانەی بالیەی دەوتەوە و بە باڵۆن گەشتی ئاسمانی بە خەڵکی دەکرد —و—

هەموو کەسێکی ئەو ناوە دەیانناسیم، کتێبیشم پەیدا کرد، لە سەرەتادا مارفا پتروڤنا هانی دەدام، بەڵام دوایی لەوە ترسا خوێندنەوە ماندووم بکات.

- گوایا تۆ زۆر دڵت بۆ مارفا پتروڤنا تەنگ بووە؟

- من؟ ڕەنگە، بە ڕاستی دەشێ وا بێت، بەڕاست تۆ بڕوات بە تارمایی و خەونەکان هەیە؟

- چ تارمایی و خەونێک؟

- تارمایی و خەونە ئاساییەکان، ئەی تۆ چیت مەبەستە؟

- ئەی تۆ، بڕوات پێ هەیە؟

- بەڵێ و نەخێر، بە فەڕەنسی لەسەر قسەکەی ڕۆشت:

- لەبەر خاتری تۆ نەخێر.. واتا، نەخێرەکە زیاترە..

- ئایا تارمایی دەبینیت؟

سفیدریگایلوف بە سەرسامییەوە تەماشای کرد، پاشان زەردەخەنەیەکی تەوساوی خستە سەر لێوی و وتی:

- هەندێکجار مارفا پتروڤنا سەردانم دەکات.

- یەعنی چۆن سەردانت دەکات؟

- تا ئێستا سێ جار هاتووە، یەکەمجار هەر لەو ڕۆژەدا کە تەرمەکەیمان ناشت. واتا سەعاتێک دوای گەڕانەوەمان لە گۆڕستان، ڕێک پێش ئەوەی بێم بۆ ئێرە، جاری دووەم، سێ ڕۆژ لەمەوبەر، لە کاتی سەفەرەکەمدا، سەرلەبەیانی، لە وێستگەی "ڤیشیری بچووک". سێیەم جارییش دوو سەعات لەمەوبەر لەو ئاپارتمانەدا، کە تیا دەژیم، لە ژوورەکەدا، بە تەنیا بووم.

- بەئاگا بوویت؟

- تەواو بەئاگا بووم، هەر سێ جارەکە بەئاگا بووم، دێتە لام، دەقیقەیەک قسەم لەگەڵدا دەکات و پاشان لە دەرگاکەوە دەڕواتە دەرێ، هەمیشە لە دەرگاوە دەڕواتە دەرەوە، تەنانەت وا دەزانم کە گوێم لە دەنگی هەنگاوەکانیەتی.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لەپڕێکدا وتی:

- بۆ، من بە ڕاستی وام بیر دەکردەوە، کە دەبووایە تۆ شتی وات لێ ڕوو بدات!

یەکسەر لەوە سەرسام بوو کە بۆ ئەو قسەیەی کردووە، زۆر پەشۆکا.

سفیدریگایلوڤ بە سەرسامییەوە پرسی:

- بەڕاست؟ تۆ وات بیر کردەوە؟ بە ڕاستی وایە؟ چاکە، ئەی من پێم نەوتیت لە نێوان من و تۆ هاوشێوەییەک هەیە، ها؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە زبری و توندییەوە پێی وت:

- تۆ هەرگیز شتی وات نەوتوە!

- نەموتووە؟

- نا.

- وامزانی وتوومە، کە هاتمە ژوورەوە و بە چاوی نووقاوەوە تۆم بینی کە پاڵ کەوتبوویت و خۆت کردبوو بە نوستوو.. یەکسەر بە خۆم وت: "ئەمە خۆیەتی!"

ڕاسکۆلنیکۆڤ هاواری لێهەستا

- یەعنی چی، مەبەستت لە "خۆی" چییە؟

سفیدریگایلوڤ بە گنەگنێکی ڕاستگۆییانەوە وتی:

- مەبەستم؟ بە ڕاستی نازانم مەبەستم چییە..

بۆ چرکەساتێک بێدەنگ بوون و هەردووکیان چاویان لە یەکدی بڕیبوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تووڕەییەوە وتی:

- هەموو ئەمانە قسەی هیچوپووچن، باشە کە دێتە لات چیت پێ دەڵێت؟

- ئای؟ بیری لێبکەرەوە، قسە لەسەر شتی زۆر پووچ دەکات، بە جۆرێک مرۆڤ سەیری پێدێت و ڕقم هەڵدەستێنێت. یەکەمجار کە هات، دەزانیت، من شەکەت بووم، دوای ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردن و سرود و درووود و نانخواردن، لە دواییا، لە ژوورەکەی خۆمدا بە تەنیا مامەوە، دەستم کرد بە جگەرەکێشان و بیرکردنەوە. لە دەرگاکەوە هاتە ژوورێ و وتی: "ئارکادی ئیڤانۆڤیچ، ئەمڕۆ بە هۆی ئەم بەردەسەرییەوە لە بیرت چوو سەعاتی ژووری نانخواردن قورمیش بکەیت". لە ڕاستیشدا، ئەو سەعاتە، بە درێژایی حەوت ساڵ، هەموو هەفتەیەک خۆم قورمیشم دەکرد، ئەگەر لە بیریشم بچوایە، ئەو بیری دەخستمەوە، ڕۆژی دووەم کە بەرەو ئێرە دەهاتم و لە سپێدەدا گەیشتمە وێستگەکە، شەو ئەمەندەم وەنەوز دابوو، شەکەت ببووم، خەواڵوو بووم، قاوەیەکم داوا کرد. لەپڕێکدا مارفا پتروفنام بینی لە پاڵما دانیشتووە، دەستەیەک کاغەزی قوماری پێیە، پێی وتم: "دەتەوێت بۆ سەفەرەکەت نیازێک لە دڵی خۆتا بگریت؟" ئاخر لە فاڵگرتنەوەدا پسپۆڕ بوو. بە ڕاستی هەرگیز لە خۆم خۆش نابم کە نیازم نەگرت، ترسام و هەڵاتم، بە ڕێکەوت شووتی شەمەنەفەرەکەیش لێی دا. ئەمڕۆیش کە دوای خواردنێکی زۆر بێکەڵک لە میوانخانەکە دانیشتبووم، گەدەم قورس و جگەرەم دەکێشا، لەناکاودا دیسان مارفا پتروڤنا هاتە ژوورەوە، خۆی لە تەل دابوو، بە

بەرگێکی ئاوریشمینی سەوزەوە کە داوێنێکی زۆر درێژی هەبوو، پێی وتم: "سڵاو، ئارکادی ئیڤانۆڤیچ، ئەم جلانەی لەبەرمدان، بە لای تۆوە چۆنە؟ ئانیسیا ناتوانێت وای بدورێت". ئانیسیا بەرگدرووویەکی گوندییە و پێشتر کۆیلە بووە، بۆ فێربوون چووەتە مۆسکۆ و کچێکی زۆر جوانە". هەروا وەستا و لە بەردەممدا خۆی سووڕاند، منیش تەماشام کرد و پاشان لە دەموچاویم ڕوانی، وتم: "پێویست ناکات، مارفا پتروڤنا، بەم شتە هیچوپووچانەوە بێیتە لای من و خۆت بێتاقەت بکەیت". پێی وتم: "ئەی هاوار! وای لێهاتووە کە نەتوانم سەر بنێمە سەرت!" بۆ ئەوەی تووڕەی بکەم، وتم: "مارفا پتروڤنا، دەمەوێت ژن بێنم".

- "لێت دەوەشێتەوە، ئارکادی ئیڤانۆڤیچ، بەڵام هونەرێکی گەورە نانوێنیت، کە هێشتا ژنەکەت بە خاک نەسپاردووە، یەکسەر بە تەمای ژنهێنان بیت. خۆزگا یەکێکی چاکیشت هەڵبژاردبێت، بەڵام من دەزانم، ئەمە نە بە قازانجی تۆیە و نە بە قازانجی ئەو، تەنیا ئەوەندە هەیە کە دەبن بە گاڵتەجاڕی خەڵکی شەریف".

پاشان ڕۆیشت و داوێنی کراسەکەی خشەخشی خستە ئەو ناوە، بە ڕاستی کارێکی هیچوپووچ بوو، وانییە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە وەڵامدا وتی:

- ڕەنگە هەموو ئەم شتانەی کە وتت، درۆ بن؟

لەوە دەچوو سڤیدریگایلوف ئاگای لە ڕەقیی پرسیارەکە نەبووبێت، بیری کردەوە و وتی:

- من کەمتر درۆ دەکەم.

- پێشتر، یەعنی پێش ئەم شتانە، هەرگیز خەونت نەدەبینی؟

- ن.. نا، تەنیا جارێک نەبێت، شەش ساڵ لەمەوبەر، نۆکەرێکم هەبوو ناوی ڤدکابوو، تازە ناشتبوویان، کە بێئاگا هاوارم کرد:
- ڤدکا، نێرگەلەکە!

هاتە ژووری، ڕاست بەرەو لای ئەو دۆڵابە چوو، کە نێرگەلەکەی منی لێبوو، دانیشتبووم، بیرم دەکردەوە "بێگومان بە تەمای تۆڵە کردنەوەیە"، چونکە پێش ئەوەی بمرێت شەڕێکی سەختمان لەگەڵ یەکتریدا کردبوو، هاوارم کرد: "چۆن وێراوتە بە ئانیشکی دڕاوەوە بێیتە لام؟ بڕۆ دەرەوە گەمژە". ئەویش پشتی تێکردم، چووە دەرێ و ئیتر نەگەڕایەوە.
لەم بارەیەوە یەک وشەم بە مارفا پتروڤنا نەوت. ویستم لە کاتێکی تردا کۆنوێژێک بۆ گیانی بسازێنم، بەڵام لام ستەم بوو.
- بڕۆرە لای پزیشک.
- بەبێ تۆیش من بە خۆم زانیووە کە نەخۆشم. هەرچەندە بە ڕاستی نازانم چیمە، بە لای خۆمەوە پێنج قات لە تۆ تەندروستیم باشترە. وەلێ لێم نەپرسیت کە تۆ بڕوات بە هاتنەوەی ڕۆح هەیە یان نا؟ بەڵکو ئەوەم لێپرسیت کە تۆ بڕوات بە بوونی خەون و تارمایی هەیە؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تووڕەییەوە دەنگی هەڵبڕی:
- بە هیچ جۆرێک بڕوام پێی نییە.
سڤیدریگایلوف بەدەم کەمەکێک سەرلارکردنەوەوە وەک لەگەڵ خۆیدا بدوێت، وتی:
- باشە ئاسایی چیت پێدەڵێن؟ پێت دەڵێن: "تۆ نەخۆشیت، بۆیە ئەوەی کە دەیبینیت، بوونی ڕاستەقینەی نییە و تەنیا خەونە" وەلێ ئەمەیش بە تەواویی لۆژیک نییە. من ئەوە دەسەلمێنم کە خەونەکان تەنیا لە نەخۆشدا دەردەکەون. بەڵام ئەمە تەنیا ئەوە دەسەلمێنێت کە بێجگە لە

نەخۆش کەسی تر خەون نایبینێت، نەک بەو مانایەی کە خەون هەر بوونی نییە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تووڕەییەوە جەختی کرد:
- بێگومان هەر بوونی نییە.
سفیدریگایلوڤ تەماشای کرد و لەسەرخۆ وتی:
- بوونی نییە، نا؟ تۆ وا بیر دەکەیتەوە؟ باشە، چۆنە ئێمە وا بیر بکەینەوە -تۆیش هاوکاریم بکە- کە خەون بریتییە لەو پارچە و کەرتانەی هی دنیایەکی ترن.. سەرەتای ئەو دنیایە. بێگومان مرۆڤی تەندروست پێویستی بە بینینی نییە، چونکە مرۆڤی تەندروست کەسێکە بەم ژیانەوە بەستراوەتەوە، بۆیە هەوڵی ئەوە دەدات کە سیستمێکی ڕێکوپێک بەرکەماڵ بێت، بەڵام هەر ئەوەندەی کەمێک نەخۆش بکەوێت و سیستمە سروشتییە خاکییەکەی تۆزێک لاسەنگ بێت، ڕاست وای بۆ دەچێت کە دنیایەکی تر هەیە و چەندە لێرە زیاتر نەخۆش بێت، پەیوەندیی لەگەڵ دنیاکەی دیدا کۆکتر دەبێت، بە شێوەیەک کاتێ مرۆڤ دەمرێت، ڕاست دەڕواتە دنیاکەی ترەوە، ئەگەر بڕوات بە ژیانێکی تر هەیە، دەبێت بڕوات بەم چەندوچوونەیش هەبێت.
ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:
- من بڕوام بە ژیانی دوای مەرگ نییە.
سڤیدریگایلوف کە بیری پەرت ببوو، لەپڕێکدا وتی:
- بەڕاست؟ ئەی ئەگەر لەو دنیا تەنها جاڵجاڵۆکە و شتی لەو بابەتە هەبن، چۆن؟
- ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری کردەوە "شێتە".

- به ڕای من نەمریی بەردەوام چەمکێکی نادیاری هەیە، کە مەوداکەی زۆر فراوانە! ئاخر بۆ دەبێت فراوان بێت؟ ئێستا تۆ وای بیر لێبکەرەوە کە لەباتیی هەموو ئەم خەیاڵانە، نەمریی بریتی بێت لە ژوورێک، وەک گەرماوی لادێ دووکەڵاوی بێت و گۆشە و کەناری بە جاڵجاڵۆکە تەنرابێت و هەموو نەمریی بریتی بێت لەمە، دەزانیت من هەندێکجار وای دەبینم.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە بێزارییەوە هاواری کرد:
- بەڕاست تۆ هیچ وێنایەکی ئاسوودەبەخشتر و دادوەرانە ترت لا نییە بێجگە لەم کارەساتانە!
سڤیدریگایلوف بە زەردەخەنەیەکی کاڵەوە وتی:
- دادوەرانەتر؟ کێ چووزانێت! ڕەنگە ئەمە زۆر دادپەروەریی تێدابێت. دەزانیت. ئەگەر بە دەستی من بووایە، حەتمەن وام لێدەکرد.
لەم وەڵامە درێژەوە لەپڕێکدا سەرمایەکی نادیار کەوتە جەستەی ڕاسکۆلنیکۆڤەوە. سڤیدریگایلوف سەری بەرز کردەوە. زۆر بە وردی لێی ڕاما. لەناکاوێکدا دایە قاقای پێکەنین و هاواری کرد:
- نا، تۆ بزانە، نیوسەعات لەمەوبەر، هێشتا یەکترمان نەدیبوو، خۆمان بە دوژمنی یەکتر دەزانی، هێشتا کارێک لە نێوانماندا یەکلایی نەکرابووەوە، کەچی وازمان لێهێنا و کەوتینە دنیایەکی ترەوە. باشە، کەواتە من هەڵە نەبووم، کە وتم ئێمە هەردووکمان میوەی باخێکین؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تووڕەییەوە وتی:
- کەواتە تکایە، مەبەستەکەتم زوو پێبڵێ، هۆی ئەوەیش کە تەشریفتان هێناوەتە لام.. و.. و.. من پەلەمە، دەمەوێت بڕۆم.
- ببوورە، حەز ئەکەم پێم بڵێیت ئایا ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنای خوشکت، دەبێت بە ژنی جەنابی لۆژین پتروڤیچ؟

- دەشێت ئەو پرسیارانەی پەیوەندییان بە خوشکمەوە هەیە، وازیان لێبهێنیت و ناوی خوشکم نەهێنیت؟ من تێناگەم تۆ چۆن دەوێریت لە بەردەمی مندا ناوی ئەو ببەیت، ئەگەر تۆ بە ڕاستی سڤیدریگایلوفیت؟

- ئاخر من تەنیا بۆ ئەوە هاتووم لەبارەی ئەوەوە قسە بکەم، چۆن دەتوانم ناوی نەهێنم؟

- زۆر باشە، فەرموو، بەڵام زۆر زوو.

- من دڵنیام، دەربارەی ئەو لۆژینە بەڕێزە، کە لە ژنەکەمەوە خزمایەتیمان هەیە، ئەگەر تا ئێستا دەیبینیت یان هەندێ شتی وردت لەبارەیەوە بیستبێت، تۆ ڕا و سەرنجی خۆت گەڵاڵە کردووە، ئەو شیاوی ئەوە نییە ببێتە مێردی ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنا، دەزانم ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنا لەم مەسەلەیەدا جوامێرانە خۆی دەکاتە قوربانی.. خێزانەکەی، وەک ئەنجام ئەو شتانەی کە لە لایەنی تۆوە بیستوومە، پێم وایە تۆیش لای خۆتەوە پێت خۆش نییە ئەو هاوسەرێتییە سەربگرێت، بەبێ ئەوەی زیانێکی لێبکەوێتەوە، ئێستا کە بە تایبەتی و لە نزیکەوە تۆم ناسی، بە تەواوی بڕوام بەمە هەیە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:

- هەموو ئەم باسە بەڵگەی سادەیی تۆیە.. ببوورە.. ویستم بڵێم بەڵگەی بێشەرمیی تۆیە.

- واتا مەبەستت ئەوەیە بڵێیت کە من بۆ بەرژەوەندیی خۆم ئەمە دەکەم؟ مەترسە ڕادیون ڕومانوڤیچ، ئەگەر بۆ بەرژەوەندیی خۆم ئەمەم بکردایە، ئەمەندە بە ڕاشکاوی قسەم نەدەکرد، وا مەزانە، من ئەوەندە گەوج نیم، با شتێکی سایکۆلۆژی سەیرت لەم لایەنەوە بۆ ڕوون بکەمەوە. هەروا ماوەیەک لەمەوبەر، ئەو کاتەی دەمویست پاکانە بۆ ئەو خۆشەویستییە بکەم کە بۆ ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا هەمبوو،

به خۆمم وت منیش قوربانیم. باشه، ئێستا ئەوە بزانە کە من هیچ هەستێکی خۆشەویستیم بۆی نەماوە، هیچ جۆرە خۆشەویستییەک، تەنانەت سەرم لە خۆم سوور دەمێنێت، ئاخر من جاران ئەو هەستەم هەبوو..

ڕاسکۆلنیکۆڤ قسەکەی پێبڕی و وتی:

- هۆیەکەی تەمەڵی و گەندەڵیی خۆت بوو.

- ڕاست دەکەیت، من مرۆڤێکی تەمەڵ و گەندەڵم، بەڵام خوشکت، ئەمەندە ئاکاری جوانی هەبوو، کە تەنانەت من نەمدەتوانی نەکەومە ژێر کاریگەرییەوە. وەلێ هەموو ئەمانە، وەک خۆم هەستم پێکرد، بێجگە لە هەرزەگۆیی هیچی تر نەبوو.

- دەمێکە لەمە گەیشتوویت؟

- ماوەیەکی کەمە هەستم پێکردووە، بەڵام لە سێ ڕۆژ لەمەوبەرەوە یەعنی تا ڕادەیەک لەو ڕۆژەوە کە هاتوومەتە پتروزبورگ، بە تەواویی دڵنیا بووم. دەبێت ئەوەیش بڵێم کە لە مۆسکۆ هێشتا لەسەر ئەو ڕایە بووم کە سەفەرکردنەکەم بۆ ئێرە تەنیا بۆ خوازبێنیکردنی ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا و ڕکەبەرایەتیکردنی جەنابی لۆژینە.

- ببوورە قسەکەت پێدەبڕم، تکایە ئەگەر دەتوانیت، وتەکەت کورت بکەرەوە و بچۆرە ناو کرۆکی ئەو مەسەلەیەوە، کە بۆی هاتوویتەتە ئێرە. من پەلەمە و دەبێت لە ماڵ بڕۆمە دەرێ..

- بە خۆشحاڵییەوە، هەر کە گەیشتمە ئێرە و بڕیارم دا.. سەفەرێکی کورت بکەم، ویستم پێشەکی چەند شتێکی پێویست بە ئەنجام بگەیەنم، مناڵەکانی خۆمم نارد بۆ لای پووریان، ئەوان دەوڵەمەندن و پێویستیان بە من نییە، بێجگە لەوە من چ باوکێکم بۆ ئەوان؟ بۆ خۆم تەنیا هەندێک شتم هەڵگرت کە پار مارفا پتروڤنا پێی بەخشیبووم، من

ئەوەم بەسە، بمبوورە ئێستا دێمە سەر مەسەلەکە، پێش سەفەرەکەم کە دەشێت هەر ڕوو بدات، دەمەوێت کارەکەم لەگەڵ جەنابی لۆژینیشدا تەواو بکەم، وا مەزانە من ڕقم لێیەتی و حەز بە بینینی ناکەم، بەڵام ئەو هۆکاری شەڕی نێوان من و مارفا پتروڤنا بوو، واتا کاتێک کە زانیم ئەو بە تەمای ئەم زەماوەندەیە، ئێستا دەمەوێت چاوم بە ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا بکەوێت، بە یارمەتی تۆ و ڕەنگە بە ئامادەبوونی جەنابیشتان، بۆ ئەوەی تێی بگەیەنم کە یەکەم هیچ سودێک لە جەنابی لۆژین نابینێت و بێگومانم زیانی زۆری پێدەگات، دووەم داوای لێبووردنی لێبکەم بەرامبەر بەو پێشهاتە ناخۆشانەی کە من هۆکاریان بووم و ڕێگەم بداتێ دەهەزار ڕۆبڵیان پێشکەش بکەم، بۆ ئەوەی بتوانێت بە ئاسانی پەیوەندی خۆی لە جەنابی لۆژین ببڕێت. لەو باوەڕەیشدام ئەگەر ئەو دەرفەتە فەراهەم بێنێت، خۆیشی حەز بەو پەیوەندیبڕینە بکات.

ڕاسکۆلنیکۆڤ زیاتر بە سەرسامی نەک بە ڕقەوە دەنگی هەڵبڕی:

– بە ڕاستی تۆ شێتیت! چۆن دەوێریت ئەم قسانە بکەیت!

– من دەمزانی تۆ دەکەویتە هاوار هاوار. یەکەم، هەرچەندە من دەوڵەمەند نیم، بەڵام ئەم دەهەزار ڕۆبڵە ئەو کاریگەرییەی لەسەر خەرجیی من نییە، یەعنی هیچ پێویستییەکم پێی نییە. خۆ ئەگەر ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا لێم وەرنەگرێت بێگومانم ئەو پارەیە لە شتی بێبایەخ و گەوجانەی تردا خەرج دەکەم. ئەمە یەک. دووەم ویژدانم گەلێک ئاسوودەیە. من بەبێ هیچ حسابێک ئەم پێشنیازە دەکەم، ئیتر باوەڕ دەکەیت یان ناکەیت، کەیفی خۆتە، دوایی تۆیش و ئاڤدوتیا ڕومانوڤنایش پەی بەم ڕاستییە دەبەن. هەموو مەسەلەکە لەوەدایە کە من بە ڕاستی بووم بە هۆی ناخۆشی و دەردەسەری خوشکی

بەڕێزت، لەبەر ئەوە بە ڕاستی هەست بە پەشیمانی دەکەم، لە ناخی دڵمەوە دەخوازم نەک لە تۆڵەی گوناهەکەم یان لە بری ئەو دەردەسەرییانە، بەڵکو تەنیا و تەنیا بۆ ئەوەی کارێکی بە کەڵکیان بۆ ئەنجام بدەم. چونکە من لە خۆمدا مرۆڤێکی بەد و شەڕخواز نیم. ئەگەر لە پێشنیازەکەمدا تەنانەت لە ملیونێکدا یەک حساب هەبووایە، ئەو کاتە پێشنیازی دەهەزار ڕۆبڵم نەدەکرد. لە کاتێکدا کە هەر پێنج هەفتە لە مەوبەر پێشنیازی پارەی لەوە زیاترم بۆ کردبوو. ئەمەیش بەرجا، لەوانەیە بەم زووانە لەگەڵ کچێکدا زەماوەند بکەم، بۆیە دەبێت هیچ جۆرە بەدگومانییەک لەبارەی نیەتخراپی من بەرانبەر ئاڤدوتیا ڕۆمانوفنا لەئارادا نەمێنێت. لە کۆتاییدا دەبێت بڵێم کە ئەگەر ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنا شوو بە جەنابی لۆژین بکات، ئەو برە پارەیەی هەر پێدەدرێت، بەڵام لە یەکێکی ترەوە.. تووڕە مەبە ڕادیون ڕومانوڤیچ، بە هێوری و لەسەرخۆییەوە داوەری بکە.

خودی سڤیدریگایلوف زۆر لەسەرخۆ و بەوپەڕی ئارامییەوە ئەم قسانەی کرد.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:

- تکات لێدەکەم کۆتایی پێبێنە، چونکە بەهەرحاڵ وتەکانت هێند بێئابڕووانەیە، جێگای پۆزشی تیا نابێتەوە.

- هەرگیز، بەپێی قسەی تۆ لەم دنیایەدا مرۆڤ بەرانبەر بە مرۆڤی دی تەنیا توانای ستەمکردنی هەیە، واتا بەپێی ئەوەی باوە، مرۆڤ هەقی ئەوەی نییە کەمەکێک چاکە لەگەڵ کەسی تردا بکات، بەڵام ئەمە گەوجایەتییە، ئاخر، ئەگەر بۆ نموونە من بمردمایە و ڕاسپێریی ئەوەیشم بکردایە کە ئەو پارەیە بە خوشکت بدەن، ئەو کاتەیش هەر نکۆڵیی لە وەرگرتنی دەکرد؟

- زۆر ڕێی تێدەچێت.
- نەخێر، ئەمە ڕاست نییە، هەر چەندە دەبێت ئەوەیش بڵێم کە دەهەزار ڕۆبڵ دەشێت لە شوێنی خۆیدا برە پارەیەکی زۆر باش بێت. بەهەرحاڵ، تکات لێدەکەم ئەو قسانەی کردمان، بە ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنای بگەیەنیت.
- نا، پێی ناڵێم.
- لەم حاڵەتەدا، ڕادیون ڕومانوڤیچ، ناچارم خۆم چاوم پێی بکەوێت، ئەگەرچی پێی ناخۆشە.
- ئەگەر من قسەکانتی پێبگەیەنم، تۆ ئیدی هەوڵی بینینی نادەیت؟
- بە ڕاستی نازانم چیت پێبڵێم، زۆر حەز ئەکەم هیچ نەبێت تەنیا جارێک بیبینم.
- بەتەما مەبە.
- بەداخەوە، بەڵام تۆ من ناناسیت، ڕەنگە بۆ لەمەودوا زیاتر پەیوەندی بگرین.
- تۆ لەو بڕوایەدای کە ئێمە زیاتر لە یەکدی نزیک ببینەوە؟
سڤیدریگایلوف زەردەخەنەیەکی هاتێ، هەستا و کڵاوەکەی هەڵگرت، وتی:
- بۆ نا؟ بەڕاست وا نەزانیت کە زۆر حەزم لە بێزارکردنت بووبێت، بەڵکو ئەو کاتەی بۆ ئێرە دەهاتم، هەر زۆر گەشبین نەبووم، هەرچەندە سیمای ئەم بەیانییەی تۆ منی سەرسام کردبوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە بێزارییەوە وتی:
- ئەم بەیانییە تۆ منت لە کوێ دیوە؟
- هەر بە ڕێکەوت.. من وای بۆ دەچم لە تۆدا شتێک هەیە، کە لە منەوە زۆر نزیکە.. گوێ مەدەرێ، لەوانە نیم بێتاقەتتان بکەم. من

لەگەڵ فڕوفیڵاوییەکاندا هەڵم کردووە. شازادە سڤیربار[١]م بێزار نەکردووە، کە خزمێکی دوورمە و یەکێکە لە خانەدانەکان. لەبارەی حەزرەتی مریەمەوە کە بەرهەمێکی ڕافائیلە، توانیم لە ئەلبوومەکەی خاتوو پریلیکوف[٢]دا شتێک بنووسم. حەوت ساڵی تەواو، بەبێ ئەوەی بڕۆم بۆ شوێنێکی تر، لەگەڵ مارفا پتروڤنادا ژیام، لە ماڵی شازادە ڤیازمسکی[٣] کە دەکەوێتە گۆڕەپانی کۆنی "سننایا"وە، شەوانم بردە سەر، ڕەنگە لەگەڵ "بیرگ"یشدا بە باڵۆنەکەی بفڕم.

- زۆر چاکە، مۆڵەت هەیە پرسیارێکت لێبکەم: ئایا بەم زوانە سەفەر دەکەیت؟

- سەفەری چی؟

- ئەو سەفەرە کورتەی کە خۆت باست کرد.

- سەفەری کورت؟ ئا، بەڵێ، بەڕاست من وتم سەفەرێکی کورت دەکەم.. باشە، ئەمە مەسەلەیەکی دووردرێژە.. وەلێ ئەگەر بتزانیایە چ پرسیارێکم لێدەکەیت!

سڤیدریگایلوف دواڕستەی بە دەنگی بەرز وت و کورتەکەنینێکی بۆ کرد:

- ڕەنگە من لەباتیی ئەو سەفەرە کورتە ژن بێنم، سەرقاڵی خوازبێنیکردنن بۆم.

- لێرە؟

---

[١] *Svirber*

[٢] *Prilukov*

[٣] *Viazemsky*

- بەڵێ.
- کەی ئەو دەرفەتەت دەست خست؟
- وەڵێ زۆر حەز دەکەم جارێک ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا ببینم، بە ڕاستی داوات لێدەکەم، دەی، بە هیوای دیدار.. ئاخ، بەڕاست، خەریک بوو لە بیرم بچێت، بە خوشکت بڵێ لە وەسیەتنامەکەی مارفا پتروڤنادا سێ هەزار ڕۆبڵ بە ناوی ئەوەوە دانراوە، ئەمە تەواو ڕاستە، مارفا پتروڤنا هەفتەیەک لە پێش مردنیا و بە ئامادەیی خۆم ئەم کارەی کرد. دوای دوو، یان سێ هەفتە، ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا دەتوانێت پارەکە وەربگرێت.
- بەڕاستتە؟
- بەڕاستمە، پێی بڵێ، دەی، نۆکەرتم، ئاخرماڵەکەم لێرەوە زۆر دوور نییە.
که سڤیدریگایلوف لە چوونەدەرەوەدا بوو، لەبەردەرگاکەدا تووشی ڕازومیخین هات.

٢

سەعات لە دەوری هەشتا بوو، کە هەردووکیان بەرەو تەلاری باکالایف بەپەلە دەڕۆیشتن بۆ ئەوەی پێش لوژین بگەنە ئەوێ.
هەر ئەوەندەی گەیشتنە شەقامەکە، ڕازومیخین پرسی:
- دەی، ئەوە کێ بوو؟
- ئەوە سڤیدریگایلوف بوو، ئەو مولکدارەی لە ماڵەکەیدا سووکایەتیی بە خوشکم کرابوو کاتێک وەک پەرستارێک لای کاری دەکرد. خوشکم کە زانیبووی ئارەزووی لە دەوروخولدانیەتی، لای نەما. مارفا پتروڤنای ژنی خوشکمی لە ماڵەکەی دەرکرد. ئەو ژنەی لە

دواییدا پۆزشی بۆ دونیا هێنایەوە و لە پڕێکیشدا پێش ماوەیەکی کورت مرد. قسەکانمان لەبارەی ئەوەوە بوو. نازانم بۆ من لەم زەلامە دەترسم، هەر دوای بەخاکسپاردنی ژنەکەی بەپەلە گەیشتۆتە ئێرە. پیاوێکی یەکجار سەیرە و نیازێکی هەیە، لەوە دەچێت شتێکی لەژێر سەردا بێت.. دەبێت ئاگامان لە دونیا بێت.. دەمویست ئەمەت پێبڵێم، گوێت لێمە؟

- ئاگامان لێی بێت! بۆ دەتوانێ چی بەرانبەر ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا بکات؟ بەڵام، ڕودیا من سوپاست لێدەکەم کە تۆ بەم شێوازە قسە لەگەڵ مندا دەکەیت.. حەتمەن، حەتمەن ئاگاداری دەبین.. لە کوێ دادەنیشێت؟

- نازانم.

- بۆ لێت نەپرسی؟ حەیف، وەلێ خۆم دەیدۆزمەوە.

دوای کەمێک بێدەنگی ڕاسکۆلنیکۆڤ پرسی:

- تۆ ئەوت بینی؟

- بەڵێ، بینیم، باش سەرنجیم دا.

ڕاسکۆلنیکۆڤ جەختی کرد:

- بەڕاستی بینیت، باش بینیت؟

- چاک، بەڵێ، چاکم لە بیر ماوە، لە بەینی هەزار کەسیشدا بێت دەیناسمەوە. لە ناسینەوەی خەڵکا زەینم زۆر باشە.

دیسانەوە بێدەنگ بوونەوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ورتەورتێکی کردەوە:

- هوم.. سەیرە.. دەزانیت.. وای بۆ دەچم.. هەموویم لەبەرچاوە.. ڕەنگە ئەمە لە خەیاڵێک زیاتر هیچی تر نەبێت.

- تۆ دەڵێی چی؟ من بە باشی لە مەبەستەکەت تێناگەم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ دەمی بە زەردەخەنەیەک لار کردەوە و بەردەوام بوو:

- ئێوە هەمووتان من بە شێت دەزانن، منیش لە کەمەکێک لەمەوبەرەوە هەستم بەوە کردووە، کە بە ڕاستی شێتم، چونکە ئەوەی بینیم تەنیا تارماییەک بوو.
- دەڵێی چی؟
- کێ چوزانێت! بە ڕاستی دەشێت من شێت بم، هەرچی ئەم شتانەی لەم ڕۆژانەدا ڕوویان دا، ڕەنگە هەر خەیاڵ بووبن..
- ئاە.. ڕودیا، دیسانەوە نارەحەتیان کردیتەوە؟ ... ئاخر، چی دەگوت، بۆچی هاتبوو؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی نەدایەوە، ڕازومیخین کەمەکێک بیری کردەوە و وتی:
- باشە، کە وایە گوێ لە ڕاپۆرتەکەم بگرە. هاتم بۆ لات، نووستبوویت، پاشان نانی نیوەڕۆم خوارد و چووم بۆ لای پۆرفیری، هێشتا زامیوتوف لەوێ بوو. ویستم دەست پێبکەم، بەڵام نەکرا. هیچ، نەمدەتوانی باش بدوێم. ئەوان هێند حاڵی نین و تێناگەن. بەڵام بەسەر خۆیاندا نەدەهێنا. ئەوسا پۆرفیریم بردە پاڵ پەنجەرەکەوە، کەچی نازانم بۆ وەک پێویست دەرنەچوو: تەماشای سووچێکی دەکرد، منیش بۆ گۆشەیەکی ترم دەڕوانی. سەرئەنجام مشتێکم لە قەپۆزی نزیک خستەوە و پێم وت وەک خزمێک لە هەقی دێم، ئینجا تفێکم ڕۆ کرد و چوومە دەرێ. کارێکی گەلۆرانە بوو. قسەیەکم لەگەڵ زامیوتوفدا نەکرد، دەزانیت، وام دەزانی کارەکەم تێک داوە، وەلێ ئەو کاتەی لە پلیکانەکان دەهاتمە خوارێ، بیرۆکەیەکم تێگەڕا: من و تۆ بۆ سەری خۆمان دێشێنین؟ ئەگەر مەترسییەک یان شتێکی لەو بابەتە ڕووبەڕووی تۆ ببووایەتەوە، هەڵبەت قسەیەکی تر بوو، بەڵام ئێستا بە تۆچی! ئاخر تۆ چ دەستێکت لە مەسەلەکەدا نییە، کەواتە با بڕۆن

ملیان بشکێت، دوایی چاک بە ڕیشیان پێدەکەنین. خۆ ئەگەر من لەباتیی تۆ بوومایە، وێڵم دەکردن. بە ڕاستی چەندە خەجاڵەتن! وێڵیان بکە. تەنانەت لەوانەیە لێیشیان بدەین، وەلێ ئێستا با پێبکەنین.
ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی دایەوە:
- ڕاست دەکەیت.
لەگەڵ خۆیشیدا کەوتە بیرکردنەوە "بابزانم بەیانی چی دەڵێیت؟"
سەیر لەوەدا بوو کە تا ئەو کاتە ڕاسکۆلنیکۆڤ تەنانەت تەنیا جارێکیش بیری لەوە نەکردبووەوە کە "کاتێک کە ڕازومیخین تێبگات، چۆن بیر دەکاتەوە؟" هەر بەدەم ئەم لێکدانەوەیەوە، چاوی لە هاوڕێکەی بڕی. هەواڵەکەی لەبارەی دیداری پۆرفیرییەوە هێند سەرنجی ڕانەکێشا: لەوساوە تا ئێستا گەلێک شتی تر سەریانهەڵدابوو.
لە ڕاڕەوەکەدا تووشیان بوو بە تووشی لۆژینەوە: ئەو لە سەعات هەشتی ڕێکدا گەیشتبوو، بە دوای ژوورەکەدا دەگەڕا، وا ئێستا هەرسێکیان پێکەوە هاتنە ژووری، بەبێ ئەوەی تەماشا یان سڵاو لە یەکتر بکەن. هەردوو لاوەکە پێشکەوتن، وەلێ پیتەر پتروڤیچ کەمێک خۆی دواخست و لە پێش دەرکێوە پاڵتاوەکەی لەبەری داکەند، پولخێریا ئەلێکساندروڤنا خێرا بەرەو پیری لە ژوورەکە هاتە دەرێ، دونیا لە پێشوازیی براکەیدا بوو.
پیتەر پیتروڤیچ چووە ژووری و بە میهرەبانییەکی پڕ لە لووتبەرزییەوە سڵاوی لە هەردوو خانمەکە کرد، پێدەچوو کەمێک شپرزە بێت و هێشتا نەهاتبێتەوە سەر خۆی. پولخێریا ئەلێکساندروڤناش وەک ئەوەی شڵەژابێت، بەپەلە هەموویانی لە دەوری مێزێک کۆ کردەوە کە سەماوەری لەسەر دەکوڵا. دونیا و

لۆژین بەرانبەر بە یەکتری لەمسەر و ئەوسەری مێزەکەوە دانیشتن. ڕازومیخین لە پاڵ لۆژین و ڕاسکۆلنیکۆڤ لە پاڵ خوشکیا دانیشت. بۆ چرکەساتێک بێدەنگی بەرقەرار بوو. پیتەر پیترۆڤیچ خێرا دەستەسڕێکی لە گیرفانی دەرهێنا کە بۆنی عەتری لێدەهات و لووتی سڕی، لەو دەمەدا سیمای چاک دەینواند، وەلێ لە کەسێک دەچوو کەرامەتی ڕوشابێت و داوای ڕوونکردنەوە بکات. تەنانەت لە پێش هاتنەژوورەوەیدا وای بە خەیاڵدا هات کە پاڵتاوەکەی لەبەری دانەکەنێت و بگەڕێتەوە و بڕوات. بەم کارە درشتەی هەردوو ژنەکە تەمێ بکات تا بەیەکجاری مەسەلەکەیان تێبگەیەنێت. بەڵام بڕیاری یەکجاریی لەسەر ئەو کارە نەدابوو، ئەو کەسێک بوو دەیویست بە تەواویی بگاتە ڕاستی و حەزی لە پێچوپەنا نەبوو: ئەگەر ژنەکان ئاوا بە ئاشکرا سەرپێچییان لە فەرمانی ئەو کردبێت، دیارە ئەوە هۆکارێکی خۆی هەیە. کەواتە تا زووتر لە کێشەکە بگات، چاکترە. بۆ تەمێکردنیش هەمیشە کاتی دەبێت، چونکە دەتوانێت بیکات. بۆیە زۆر بە ڕەسمی ڕووی لە پولخێریا ئەلێکساندرۆڤنا کرد و پێی وت:

- هیوادارم سەفەرەکەتان چاک بووبێت.

- لە سایەی خواوە، پیتەر پیترۆڤیچ.

- زۆرم پێخۆشە، ئاڤدوتیا ڕومانوڤنایش ماندوو نەبووە؟

دونیا وەڵامی دایەوە:

- من گەنجم و بە توانام، ماندوو نابم، بەڵام بۆ دایکم زۆر ناخۆش بوو.

- چی بکەین؟ ڕێگەکانی وڵاتەکەمان زۆر دووروودرێژە، وەک دەڵێن "ڕووسیای دایکمان" گەلێک بەربڵاوە. وەلێ من بەو هەموو پەرۆشییەوە کە هەمبوو، نەمتوانی دوێنێشەو بۆ پێشوازیتان بێم.

لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا هیوادارم هەموو شتێک بەبێ سەرئێشە مەیسەر بووبێت.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە دەنگێکی تایبەتەوە وتی:

- نا، پیتەر پیتروڤیچ، ئێمە زۆر نائومێد ببووین، ئەگەر دوێنێشەو خوا خۆی دیمیتری پرۆکفیچی بۆ نەناردینایە، بێگومان تیا دەچووین. ئەمە خۆیەتی دیمیتری پرۆکفیچ ڕازومیخین.

بەدەم قسەکانەوە لاوەکەی بە لۆژین ناساند.

لۆژین مۆڕەیەکی لە ڕازومیخین کرد و لەبەر خۆیەوە وتی:

- بەڵێ، دوێنێشەو، بە شانازیەوە.. ناسیم.

پاشان برۆی هێناوە یەک و بێدەنگ بوو.

دەتوانین بەگشتی بڵێین کە پیتەر پیتروڤیچ لەو جۆرە کەسانەی ناو کۆمەڵ بوو، کە بە ڕواڵەت زۆر میهرەبان و بەئەدەبن، یان با بڵێین میهرەبانانە خۆ دەنوێنن. بەڵام هەر ئەوەندەی شتێکیان بەدڵ نەبێت یان پێچەوانەی ئارەزووی ئەوان بێت، ئیتر یەکسەر هەموو توانای خۆ لەدەست دەدەن، لەباتیی مرۆڤی ئازاد و خۆش، کە گیان و چالاکی بە خەڵکی دەبەخشن، دەبن بە کیسەیەک ئارد.

هەموویان دووبارە بێدەنگ بوونەوە، ڕاسکۆلنیکۆڤ تەواو بێدەنگ بوو. ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا تا ماوەیەک نەیدەویست بێدەنگییەکە بشکێنێت، ڕازومیخین هیچی نەبوو بیڵێت. بۆیە پولخێریا ئەلێکساندروڤنا دیسانەوە هەوڵیدا بەپێی ڕەوشتی تایبەتیی خۆی دەست بە قسە بکاتەوە.

- ئایا بیستوتانە کە مارفا پتروڤنا کۆچی دوایی کردووە؟

- هەڵبەتە بیستوومە، هەر زوو زانیم و ئێستایش بۆ ئەوە هاتووم ئاگادارتان بکەم کە ئارکادی ئیڤانۆڤیچ سڤیدریگایلۆڤ هەر لە دوای

بەخاکسپاردنی ژنەکەیەوە بەپەلە بەرەو پترۆزبورگ کەوتۆتە ڕێ، بەهەرحاڵ، ئەم شتەم زۆر بە وردی پێگەیشتووە.
دونیا بە دوودڵییەوە لەگەڵ دایکیا نیگایەکی خێرایان گۆڕییەوە و پرسی:
- بۆ پترۆزبورگ؟ بۆ ئێرە؟
- بەڵێ هەروایە، دیارە لەو پەلەی هاتنەی و بەگشتی ئەو شتانەی لەوەوبەر ڕوویان داوە، مەبەستێکی هەیە.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا هاواری کرد:
- خودایا! تۆ بڵێی لێرەیش دەست لە یەخەی دونێچکا بەرنەدات؟
- بە ڕای من پێویست ناکات نە تۆ و نە ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا ئەوەندە بترسن. هەڵبەتە ئەگەر خۆتان ئەوەتان مەبەست نەبێت کە پەیوەندیی لەگەڵدا بکەن. وەلێ ئەوەندەی کە پەیوەندیی بە منەوە هەبێت، ئاگادارم و ئێستایش لە سەروبەندی دۆزینەوەی شوێنەکەیدام.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا لەسەری ڕۆشت:
- وای پیتەر پتروڤیچ، نازانیت چەند ترساندمت؟ من تەنیا دووجار ئەوم بینیووە، زۆر ترسناک هاتۆتە بەرچاوم، من بێگومانم کە ئەو بوو بە هۆی مردنی خوالێخۆشبوو مارفا پتروڤنا.
- ناتوانین لەم بارەیەوە تەواو دڵنیا بین. من زانیاریی وردترم هەیە، باسی ناکەم. ڕەنگە ڕەوتی خێرای ڕووداوەکان ئەمەی بەدی هێنابێت. واتا لە ڕێی کاریگەریی دەروونی و سووکایەتیپێکردنەوە. بەڵام لەبارەی گوشار و بەگشتی ڕەوشت و ئاکاری ئەو کەسەوە، من لەگەڵ ڕایەکەی تۆدام. من نازانم ئێستا هەیەتی یان نا، ئایا بە ڕاستی مارفا پتروڤنا چی بۆ بەجێ هێشتووە، ئەمەیش بە زوویی دەزانم، وەلێ، هەڵبەتە لێرە، لە پترۆزبورگ، بە کەمێک توانای مادییەوە،

یەکسەر دەچێتەوە سەر ڕەوشتە کۆنەکەی. لە نێو هەموو خەڵکیدا ئەو گەندەڵترین و گومڕاترین کەسە. من بەڵگەیەکی گرنگم بۆ ئەم بۆچوونەی خۆم هەیە، مارفا پتروڤنا کە بەدبەختانە بەو ڕادەیە ئەوی خۆشویست و لە دەست قەرز ڕزگاری کرد، هەشت ساڵیش خزمەتی تری پێکرد: هەر بە هۆی هەوڵ و کۆششی ئەو ژنەوە بوو، بەسەرهاتی تاوانێکی گەورە، کە بریتی بوو لە کوشتنێکی دڕندانەی ئەفسانەئامێز، هەرزوو دیزەبەدەرخۆنە کرا، ئەو کارەساتێک بوو کە زۆر بە ئاسانی ئەوی بەرەو سیبریا دەبرد، بەڵێ، ئەمە هەقیقەتی ئەو پیاوەیە، کە دەتەوێت بیناسیت.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا دەنگی هەڵبڕی:

- ئاە، خودایا.

ڕاسکۆلنیکۆڤ جوان گوێی گرتبوو، دونیا بە جیدی و سووربونەوە پرسی:

- بەڕاستتە کە لەم بارەیەوە زانیاریی وردت هەیە!

- من تەنیا ئەو شتە دەڵێم کە بە گوێی خۆم لە خوالێخۆشبوو مارفا پتروڤنام بیستووە. دەبێت ئاگامان لەوە بێت کە لەبارەی یاساییەوە ئەم کارە گەلێک ئاڵۆزە. لێرە، لە ماوەیەکی زۆر لەمەوبەرەوە، ژنێک بە ناوی ڕسخیلەوە دەژیا، ڕەنگە ئێستایش هەر مابێت، ژنێکی بێگانەیە، پارە بە سوو دەدات و کاری تریش دەکات. جەنابی سڤیدریگایلوف لەگەڵ ئەم ڕسخیلەدا، کۆنتر پەیوەندییەکی نزیک و نهێنیئامێزیان هەبووە، لە ماڵی ئەم ژنەدا خزمێکی، گوایا خوشکەزای بووە، کچێکی تەمەن پانزە یان چواردەساڵی کەڕولاڵ ژیاوە. ئەم ڕسخیلە یەکجار ڕقی لەم کچە بووە، لەسەر تیکەیەک نان سەرکۆنەی کردووە و زۆر دڕندانەیش لێی داوە. ڕۆژێک کچە بە خنکاوی

لەسەربان دەدۆزنەوە، وتیان خۆی خۆی کوشتووە. دوای هێنان و بردنی ئاسایی، کۆتایی بە مەسەلەکە هێنرا، بەڵام دوایی زانرا کە کچە لە لایەن سڤیدریگایلوفەوە زۆر دڕندانە دەستدرێژی کراوەتە سەر. لە ڕاستیا هەموو ئەمانە لە نهێنیدا مانەوە، هەواڵەکە لە ژنێکی تری ئەڵمانییەوە بوو، ژنێکی ناپاک کە باوەڕی پێنەدەکرا، لە ڕاستیا هیچ داوایەکیش لەئارادا نەبوو، بە هۆی کۆشش و پارەی مارفا پترۆڤناوە کارەکە لە سنووری واتەوات زیاتر دەرنەچوو. بەڵام واتەواتەکە جێی سەرنجڕاکێشان بوو. تۆ، ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا، هەڵبەتە ئەو کاتەی لێیانەوە نزیک بوویت، چیرۆکی فیلیپا ناوێکی نۆکەرت بیستووە، کە شەش ساڵ لەمەوبەر، واتا هێشتا یاسای کۆیلایەتی باو بوو، بە هۆی ئازاردانی زۆرییەوە گیانی لەدەست دا.

- بە پێچەوانەوە بیستوومە کە ئەو فیلیپە خۆی خۆی خنکاندووە.

- تەواو ڕاستە، بەڵام هۆکار و تەنانەت ناچارکردنی لەسەر خۆکوژی، دەرکردنی بەردەوامی لە ماڵ و بێزارکردنی بوو لە لایەن سڤیدریگایلوفەوە.

دونیا وەڵامێکی وشکی دایەوە و وتی:

- من ئاگام لەم مەسەلەیە نییە، بەڵام چیرۆکێکی زۆر سەیرم بیستووە کە ئەم فیلیپە کەسێکی مالیخولیایی و جۆرە فەیلەسوفێک بوو، کە خۆی لە ماڵ خزاندبوو، خەڵکی دەیانوت "ئەمەندەی خوێندۆتەوە، ئەقڵی لەدەست داوە" وایش باو بوو کە لەبەر ئەوە خۆی کوشتووە، چونکە خەڵکی گاڵتەیان پێکردووە نەک لەبەر لێدانی جەنابی سڤیدریگایلوف. سڤیدریگایلوف لەبەرچاوی مندا بە چاکی لەگەڵ خەڵکیدا هەڵسوکەوتی دەکرد، تەنانەت خۆشیان دەویست، هەرچەندە بە ڕاستی ئەوەیان دەزانی دەستی لە کوشتنی فیلیپدا هەیە.

لۆژین کە بەدەم زەردەخەنەیەکی مانادارەوە لێوی بەدەمدا برد، وتی:
- دەبینم ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا کە تۆ، لەپڕێکدا حەز بە پاکانە بۆ کردنی دەکەیت کە بێتاوان دەربچێت، لە ڕاستیدا ئەو پیاوێکی فێڵبازە و دەتوانێت سەرنجی ژنان ڕابکێشێت. باشترین بەڵگە مردنە ناخۆشەکەی مارفا پتروڤنایە. من تەنیا خوازیاری ئەوە بووم یارمەتی تۆ و دایکت بدەم بەرانبەر بەو هەنگاوە تازانەی کە ئەو دەیان نێت و تا ئەوەندەی بتوانم ڕێنماییتان بکەم، چونکە بێگومانم کە ئەو پیاوە جارێکی دی دەکەوێتەوە قەرزوقوڵە و بەندیخانە دەبێتەوە بە جێگای. مارفا پتروڤنا هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە پارەوماڵی بە میراتی بۆ بەجێ بێڵێت، چونکە ئەو هەر بیری لای مناڵەکانی بوو. خۆ ئەگەر شتێکی بۆ بەجێ هێشتبێت، بێگومان زۆر کەم بووە، بۆ کەسێک کە ڕەوشت و خویەکی تایبەتی هەبێت، بەشی ساڵێکیش ناکات.
دونیا وتی:
- پیتەر پتروڤیچ تکات لێدەکەم قسە لەبارەی جەنابی سڤیدریگایلوفەوە بخەرە لاوە، ئەو مەسەلەیە من بێزار دەکات.
لەپڕێکدا بۆ یەکەمین جار ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەنگییەکەی شکاند و وتی:
- سڤیدریگایلوف ئێستا لای من بوو.
لە هەموو لایەکەوە دەنگی سەرسووڕمان بەرز بووەوە و هەموو گەڕانەوە لای ڕاسکۆلنیکۆڤ، تەنانەت پیتەر پتروڤیچیش تووشی نیگەرانی بوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەری ڕۆشت:
- سەعاتونیوێک لەمەوبەر، کاتێک نووستبووم، هاتە ژوورێ، لە خەوی هەڵساندم و خۆی پێناساندم. زۆر کراوە و دڵخۆش و تەواو بە هیوای ئەوە بوو کە پەیوەندیی لەگەڵدا بگرم. دونیا، لەو بارەیەوە

زۆری مەبەست بوو کە تۆ ببینێت و داوای لێکردم منیش لەو دیدارەدا بەشدار بم. پێشنیازێکی بۆت هەیە و لەو بارەیەوە شتێکی بە من وت. بێجگە لەوە زۆر جەختی لەسەر ئەوە کرد کە پێت بڵێم مارفا پتروڤنا هەفتەیەک پێش مردنی، سێ هەزار ڕۆبڵی بۆ تۆ وەسیەت کردووە، دەبێت تۆ، دونیا، زۆر زوو ئەو پارەیە وەربگریت.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا خاچێکی بە ڕووی خۆیدا کێشا و بە دەنگی بەرز وتی:

- سوپاس خودایا، دونیا دوعای بۆ بکە، دوعا.

لۆژین بێئیرادە وتی:

- ئەمە ڕاستە.

دونیا خێرا پرسی:

- باشە، پاشان چی؟

- پاشان، وتی ئەو خۆی نیەتی و هەموو سامانەکە لای منداڵەکانیەتی، کە ئەوانیش لای پوریانن. ئەوەیشی وت کە ماڵەکەی نزیک بە ماڵەکەی منە. بەڵام لە کوێیە؟ نازانم، لێم نەپرسی:

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە سەرسامییەوە وتی:

- بەڵام دەیەوێت چ پێشنیازێک بۆ دونیا بکات. ئایا بە تۆی وت؟

- بەڵێ، وتی.

- چی وت؟

- دوایی دەیڵێم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەنگ بوو و کەوتە چاخواردنەوە:

پیتەر پتروڤیچ سەعاتەکەی دەرهێنا، تەماشای کرد و وەک ئەوەی تا ڕادەیەک بێزار بێت، لەسەر کورسییەکە هەستا و وتی:

- دەبێت بڕۆم بە لای کاری خۆمەوە، با لە ئێوەیشی تێک نەدەم.

دونیا وتی:

- پیتەر پتروڤیچ مەڕۆ، تۆ دەتویست هەموو عەسر لێرە بیت، بێجگە لەوە تۆ خۆت نوسیبووت کە دەتەوێت لەگەڵ دایکە گیاندا باسێک بکەیتەوە.

پیتەر پتروڤیچ لە کاتێکدا کە دیسانەوە لەسەر کورسییەکە دانیشتەوە، کڵاوەکەی هەر بە دەستەوە بوو، بە شێوەیەکی جیدی وتی:

- ڕاستە دایە، ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا، من دەمویست بە ڕاستی مەسەلەیەک لەگەڵ تۆ و دایکی بەڕێزتاندا باس بکەم، مەسەلەیەک کە شتی گرنگی تیایە. بەڵام هەر بەو شێوەیەی کە کاکت نایەوێت لە بەردەمی مندا باس لە پێشنیازەکانی جەنابی سڤیدریگایلوف بکات، منیش نامەوێت و ناتوانم لە بەردەم خەڵکی تردا.. و دەربارەی هەندێک شتی تا ڕادەیەک گرنگ هیچ بڵێم. هەروەها کەس گوێی لە داوای گرنگ و پڕبایەخی من نەگرتووە.

لۆژین ڕووی ترش کرد و بە تەواوی ویقارەوە بێدەنگ بوو.

دونیا وتی:

- داواکاری تۆ لەو لایەنەوە کە کاکم لە کاتی دانیشتنی من و تۆدا ئامادە نەبێت، من خۆم نەمویستووە. تۆ نوسیبووت کە کاکم سووکایەتی پێکردوویت، من وا دەزانم کە دەبێت زوو ئەوە ڕوون بکرێتەوە و ئێوەیش ئاشت ببنەوە. خۆ ئەگەر ڕودیا بە ڕاستی سووکایەتیی بە تۆ کردووە، دەبێت ئەو داوای لێبووردنت لێبکات و دەیشیکات.

پیتەر پتروڤیچ زوو کەوتە خۆی:

- ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا، هەندێک سوکایەتیپێکردن هەیە کە ئەگەر بە نیازی خراپیش نەکرابێت، بەڵام هەرگیز لە بیر ناچێتەوە. هەر شتێک

سنووری خۆی هەیە و هەر ئاوا تێپەڕین بەسەریدا کارێکی پڕ لە مەترسییە، چونکە کە هەنگاوێکت بەسەریدا نا، هەرگیز ناتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ دواوە.
دونیا بە کەمێک بێئارامیەوە قسەکەی پێبڕی:
- پیتەر پتروڤیچ، لە ڕاستیا من مەبەستێکی ترم هەبوو، باش لێی ورد بەرەوە، ئاییندەی ئێمە ئێستا بەوەوە بەستراوەتەوە، کە هەموو ئەم قسانە زووتر ڕوون بکرێنەوە و نیەتپاکی بەرقەرار بێت. من ڕێکوڕاست و بەبێ ئەملاوئەولا، هەر لەم سەرەتای کارەوە، دەڵێم کە بێجگە لەمە هیچی تر ناکرێت و ئەگەر تۆ کەمێکیش بە دەربەستی منەوە بیت، هەرچەندە دژواریش بێت، بەڵام دەبێت هەر ئەمڕۆ ئەو کێشەیە کۆتایی پێبێت. دیسانەوە دەیڵێمەوە ئەگەر کاکم هەڵەیەکی کردبێت، پۆزشت بۆ دێنێتەوە.
لۆژین کە تا دەهات زیاتر تووڕە دەبوو، وتی:
- ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا، بە لامەوە سەیرە تۆ وا باسی مەسەلەکە دەکەیت، لەگەڵ ئەوەدا کە من زۆر ڕێزت لێدەگرم و وەک دەڵێن دەتپەرستم، بەڵام لە هەمان کاتدا زۆر ڕێی تێدەچێت خۆشیم لە یەکێک لە نزیکەکانی تۆ نەیەت. لەگەڵ ئەوەیشدا کە خۆم بە بەختەوەر دەزانم ئەگەر زەماوەندت لەگەڵدا بکەم، وەلێ لە هەمان کاتدا ناتوانم ئەو ئەرکانە لەئەستۆ بگرم کە نەگونجاوبن و..
دونیا بە گەرمییەوە قسەکەی پێبڕی و وتی:
- وای پیتەر پتروڤیچ، ئەم هەموو زوو ڕەنجانە بخەرە لاوە و هەر ئەو مرۆڤە ئاقڵ و خانەدانە بە، کە هەمیشە دەمناسی و حەزم بە ناسینیەتی. من بەڵێنی گەورەم بە تۆ داوە. من دەزگیرانتم، لەم کارەدا متمانەم پێبکە و بڕوای تەواوت هەبێت کە دەتوانم بێلایەنانە داوەریی

بکەم. ئەم داوەرییەی من نە بە لای کاکمەوە سەیر بێت و نە بە لای تۆوە. کاتێک کە ئەمڕۆ، دوای گەیشتنی نامەکەت داوام لە کاکم کرد کە ئەویش دەبێت لەم دانیشتنەدا ئامادە بێت، من هیچ شتێکم لەبارەی بڕیاری خۆمەوە پێنەوتووە. ئاخر، تۆ بیر لەوە بکەرەوە کە ئەگەر ئێوە ئاشت نەبنەوە، من ناچار دەبم لە بەینی هەردووکتاندا یەکێکتان هەڵبژێرم، یان تۆ یان ئەو. ئەمەیش کێشەیەکە، کە لە هەردووکتانەوە سەرچاوەی گرتووە. بۆ من ناکرێت و ناشێت لە هەڵبژاردنەکەمدا هەڵە بکەم، لەبەر تۆ دەبێت واز لە براکەم بێنم یان لەبەر ئەو واز لە تۆ بێنم. من ئێستا دەمەوێت و ڕاستودروست ئەوە بزانم کە ئایا ئەو بە ڕاستی برامە یان نا؟ لەبارەی تۆیشەوە دەبێت بزانم کە ئایا تۆ منت خۆش دەوێت، نرخێکت بۆ داناوم و ئایا بە ڕاستی تۆ مێردمیت؟

لۆژین بە بێزارییەوە وتی:

- ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا، قسەی تۆ لای من زۆر بایەخی هەیە، بە ڕاستیش دەیڵێم. بە نیسبەت ئەو جێگایەوە کە بە شانازییەوە من لای تۆ هەمە، وشەکانت هەندێک ڕەق بوون. بێ لەوە، تەنیا بەراوردکردنە سەیرەکەی تۆ، واتا بەراوردکردنی من بەم.. لاوە لووتبەرزە کەمێک سووکایەتییە:

قسەکانیشت لەوە دەکەن کە لەو بەڵێنەی پێتداوم، پەشیمان بوویبیتەوە. تۆ دەڵێی: "یا تۆ یان ئەو" بەم قسانە ئەوە دەردەخەیت کە من چ نرخێکی کەمم لای تۆ هەیە.. لەگەڵ ئەو پەیوەندی و تێکەڵییەدا کە لە نێوان من و تۆدا هەیە، من ناتوانم ئەم شتانە بە ڕاست بزانم.

دونیا سوور داگەڕا:

- چۆن! من بەرژەوەندیی تۆم بەرانبەر هەموو ئەو شتانە داناوە، کە لە ڕاستیدا تا ئێستا بەنرخترین شتی ژیانی منن، کەچی لەپڕا تۆ دەڕەنجێیت و وای دادەنێیت من نرخێکی کەمیشم بۆ دانەناویت.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەنگ، زەردەخەنەیەکی تەوساوی کرد، ڕازومیخین جوولەیەکی هاتێ، وەلێ پیتەر پتروڤیچ پۆزشەکەی قبوولْ نەکرد، بەڵکو بە پێچەوانەوە لەگەڵ هەر وشەیەکدا ڕق و تووڕەییەکەی زیاتر دەبوو. دەتوت چێژ لەو ئەنجامە وەردەگرێت.
بە فیزێکەوە وتی:
- خۆشویستنی هاوڕێی ئاییندەی ژیان، یەعنی مێرد، دەبێت لە خۆشویستنی برا زیاتر بێت، بەهەرحاڵ، من ناتوانم لە یەک ڕیزدا لەگەڵ.. هەرچۆنێک بێت، هەرچەندە تا ئێستا لەسەر ئەوە سوور بووم کە لە بەردەم براکەتدا نامەوێت و ناتوانم هەموو کێشەکان ڕوون بکەمەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا حەز دەکەم بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستێکی زۆر گرنگ کە بۆ من تا ڕادەیەک سووکایەتیپێکردنە، ڕووی دەمم لە دایکی بەڕێزتان بکەم.
پاشان ڕووی لە پولخێریا ئەلێکساندروڤنا کرد و وتی:
- کوڕەکەت، دوێنێ لە بەردەم بەڕێز ڕازبودکین (زۆر ڕێز و ئەدەبی بۆ ڕازومیخین نواند: ڕەنگە ناوەکەم باش نەوتبێت؟ ببوورە ناوی خانەوادەکەتانم فەرامۆش کردووە) بە هەڵگێڕانەوەی بیرۆکەکەم منی ئازاردا، ئەو بیرۆکەیەی ماوەیەک لەمەوبەر لە گفتوگۆیەکی تایبەتیدا، کاتێک قاوەمان دەخواردەوە، دەرمبڕیبوو. وتم زەماوەندکردن لەگەڵ کچێکی هەژاردا کە سەختی ژیانی چەشتبێت، بە لای منەوە چاکترە تا کچێک کە لە ناو نازونیعمەتدا گەورە بووبێت، چونکە لە لایەنی ئاکارییەوە بەکەڵک ترە، کوڕەکەت هەر بە ئانقەست، قسەکانی منی بە

شێوەیەکی گاڵتەجاڕانە گەورە کرد. منیشی بە کابرایەکی زۆردار تاوانبار کرد، من وا دەزانم کە سەرچاوەی ئەم مەسەلەیە پەیوەندیی بە نامەی تایبەتی نێوانتانەوە هەیە. زۆر بەختەوەر دەبم ئەگەر تۆ، پولخێریا ئەلێکساندروڤنا، بتوانیت پێچەوانەی ئەمەم پێبسەلمێنیت و ئاسوودەم بکەیت. پێم بڵێیت تۆ بە چ واژەیەک لە نامەکانتا قسەی منت بۆ ڕادیون ڕومانوڤیچ گوێزاوەتەوە؟

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا وەک گێژ بووبێت، وتی:

- لە بیرم نییە، خۆم چۆنی لێتێگەیشتبێتم وا. نازانم ڕودیا چۆنی پێوتوون.. لەوانەیشە بە ڕاستی شتێکی لێ زیاد کردبێت.

- ئەگەر تۆ پێت نەوتبێت، ئەو نەیدەتوانی شتی بخاتە سەر.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا زۆر بە ویقارەوە وتی:

- پیتەر پتروڤیچ، بەڵگە بۆ ئەوەی کە من و دونیا قسەی تۆمان خراپ لێک نەداوەتەوە، ئەوەیە کە ئێستا ئێمە لێرەین.

دونیا پاڵپشتیی کرد و وتی:

- ڕاستە، دایکە گیان.

لۆژین بە بێزارییەوە وتی:

- ئەگەر وابێت، کەواتە من لەمەیشدا بە هەڵەدا چووم!

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بوێرانەتر لەسەری ڕۆشت:

- پیتەر پتروڤیچ، تۆ بەردەوام ڕادیون بە هەڵە دادەنێیت، کەچی هەر خۆت دوێنێ لە نامەکەتدا شتی ناڕاستت لەسەری نووسیبوو.

- لە یادم نییە شتی ناڕاستم نووسیبێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بەبێ ئەوەی ڕووبکاتە لۆژین، بە زبرییەوە وتی:

- تۆ نووسیبووت من دوێنێ لەباتیی ئەوەی پارە بە ژنی کوژراوەکە بدەم ــلە ڕاستیا دابوویشم – پارەکەم داوە بە کچەکەی، کچێک کە تا

دوێنێشەو هەرگیز ئەوم نەدیووە. تۆ بۆیە ئەوەت نوسیبوو، تا بەینی من و کەسوکارم تێک بدەیت، هەروەها شتی زۆر ناشیرینت لەبارەی ڕەفتاری کچێکەوە نووسیووە، کە خۆیشت نایناسیت، هەموو ئەو قسانە بوختان و سووکایەتین.

لۆژین کە لە ڕقاندا گیانی کەوتبووە لەرزین، وتی:

- ببوورە جەناب، من لە نامەکەمدا تەنیا لەبەر ئەوە بە درێژی باسی کار و ڕەوشتی تۆم کردووە، چونکە ئەمە داوای خوشک و دایکت بوو، بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکەم کە من تۆم چۆن دیووە و چ کاریگەرییەکتان لەسەر من داناوە، وەلێ ئەوەی پەیوەندیی بە خودی نامەکەوە هەیە، ئەگەر ڕاست دەکەیت، یەک دێڕم بۆ بدۆزەرەوە دوور لە ویژدان نووسرابێت و درۆ بێت. ئایا تۆ پارەت نەداوەتێ، یان ناشێ لە ناو ئەو خێزانەدا کە ڕەنگە بەدبەخت و نەگبەتیش بن، یەکێکی سووک هەبێت؟

- بە ڕای من، تۆ بە هەموو ڕەوشتی خۆتەوە، بە ئەندازەی پەنجەچکۆڵەی ئەو کچە نەگبەتە کە تۆ بەردی تێدەگریت، نرخت نییە.

- کەواتە، بۆ تۆ ئاساییە کە ئەو کچە لە ڕیزی خوشک و دایکتا دابنێیت.

- ئەگەر زۆر حەز ئەکەی بیزانیت، من ئەم کارەم کردووە. من ئەمڕۆ ئەوم لە تەنیشت دایکم و خوشکمدا دانیشاند.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا هاواری لێهەستا:

- ڕودیا!

دونیا سوور داگەڕا، ڕازومیخین برۆی هێنانەوە یەک و لۆژین بە گاڵتەپێکردنەوە زەردەخەنەی هاتێ و وتی:

- ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا، خۆت دەبینیت کە ئایا لە حاڵەتێکی وادا دەکرێت لێکحاڵیبوون هەبێت یان نا؟ هیوادارم ئێستا ئەم مەسەلەیە بەیەکجاری چارەسەر بکرێت و هەموو شتێک ڕوون ببێتەوە. وەلێ ئێستا من دەڕۆم بۆ ئەوەی کۆبوونەوەی خۆشی خێزانیتان لێ تێک نەدەم و نهێنییەکانتان نەبەمە دەرەوە. (لۆژین لە جێگاکەی هەستا و کڵاوەکەی بە دەستەوە گرت) بەڵام پێش ڕۆیشتنم دەمەوێت ئەوەتان وەبیر بێنمەوە، کە لەمەودوا من لەم جۆرە کۆبوونەوە و ئاڵتموساڵتمە ببەخشن. لە تۆیش، پولخێریا ئەلێکساندروڤنای بەڕێز، بەتایبەتی ئەم داوایەم هەیە، بە تایبەتیش کە من نامەکەم تەنیا بۆ تۆ نوسیبوو نەک بۆ کەسێکی دی.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە بێزارییەوە وتی:

- لەوە دەچێت، پیتەر پتروڤیچ، تۆ بتەوێت ئێمە بە تەواوی بخەیتە ژێر دەسەڵاتی خۆتەوە. دونیا بۆی باس کردیت کە بۆ داواکەتمان بەجێ نەهێنا، ئەو لەو بارەیەوە بۆچوونی باش بوو. بێجگە لەمە، تۆ لە نامەکانتا کە بۆ منی دەنووسیت، تێم دەخوڕیت. ئایا بە ڕاستی دەبێت ئێمە هەرچی تۆ حەزی لێبکەیت و بیڵێیت، ئیتر بەجێی بهێنین؟ لە کاتێکدا کە بە پێچەوانەوە من دەمەوێت پێت بڵێم، کە بۆ لەمەودوا دەبێت ڕەفتارت لێبووردن و هێوری لەخۆ بگرێت، چونکە ئێمە وازمان لە هەموو شتێک هێناوە و بە پشتی تۆ هاتووینەتە ئێرە، کەواتە بە ڕاستی بەبێ هەموو ئەم قسانەیش تا ڕادەیەک ئێمە لەژێر دەسەڵاتی تۆداین.

لۆژین بە گاڵتەپێکردنەوە وتی:

- ئەمە فەرمانێکی دادپەروەرانە نییە، پولخێریا ئەلێکساندروڤنا، بەتایبەتی لەو ساتەوەی هەواڵی وەسیەتنامەی مارفا پتروڤنات

لەبارەی سێ هەزار ڕۆبڵەکەوە پێگەیشتووە و لە کاتی گونجاودا هاتووە، ئەمەیش لەو زمانە تازەیەتانەوە دەردەکەوێت، کە لەگەڵ مندا قسەی پێدەکەن.
دونیا بە تووڕەییەوە وتی:
- کەواتە بەپێی قسەکەی خۆت، دەشێت تۆ گەلێک ئومێدت لەسەر هەژاری و نەدارایی ئێمە بنیات نابێت.
- بەهەرحاڵ، ئیتر بەتەمای ئەو ئومێدە نیم، بەتایبەتیش ناتوانم ڕێگر بم لە بەردەم ئەو پێشنیازە نهێنییانەی کە ئارکادی ئیڤانۆڤیچ سڤیدریگایلۆڤ بۆی کردوون. ئەو پێشنیازانەی کە کاکت ئاگاداریەتی و وەک من بزانم گەلێک بۆ تۆ گرنگە و دەشێت زۆر خۆشیش بێت.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا هاواری کرد:
- ئای، خودایا!
ڕازومیخین لەسەر کورسییەکە ئۆقرەی لێبڕابوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ پرسی:
- ئەرێ خوشکێ، تۆ تەریق نابیتەوە؟
- بۆ نا، ڕودیا، من خەجاڵەتم!
پاشان ڕومانوڤنا لە حاڵێکدا کە لە داخا ڕەنگ لە ڕووی پەڕیبوو، ڕووی کردە لۆژین ووتی:
- پیتەر پتروڤیچ، بچۆرە دەرێ.
لەوە دەچوو کە پیتەر پتروڤیچ بە هیچ جۆرێک چاوەڕێی کۆتاییەکی وای نەکردبێت، ئەو لەڕادەبەدەر بە خۆی و توانای خۆی دەنازی و گەلێک ئومێدی بە لاوازیی نێچیرەکەی بوو. تا ئێستایش هەر بڕوای نەدەکرد، ڕەنگی هەڵبزڕکا و لێوی کەوتبووە لەرزین.

- ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا، تۆ کە بەم وشانە ڕەوانەم دەکەیت، ئەگەر من ئێستا لەم دەرگایە بچمە دەرێ، باش بیری لێبکەرەوە، ئیدی هەرگیز ناگەڕێمەوە، باش بیری لێبکەرەوە، قسەی من یەکێکە.
دونیا بەپەلە لە جێگاکەی ڕاپەڕی، بەسەریا هاواری کرد:
- چ بێشەرمی و بێچاوڕوویەک! من هەرگیز نامەوێت تۆ جارێکی تر بگەڕێیتەوە ئێرە.
لۆژین کە تا ئەو چرکەساتە باوەڕی بەم کۆتاییە نەدەکرد و بۆیە تەواو شڵەژابوو، هاواری کرد:
- بەڕاست! ئاوا.. بەڵام تۆ دەزانیت ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا کە من دەتوانم ناڕازی بم و ڕێت لێبگرم.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە گەرمی کەوتە بەرگریکردن لە دونیا:
- بە چ هەقێکەوە تۆ قسەی وا دەکەیت؟ چ ناڕازیبوون و چ ڕێگرتنێک؟ یان تۆ چ هەقێکت بە خۆت داوە؟ ئایا دەشێت من دونیای کچم بە کەسێکی وەک تۆ بدەم؟ بڕۆ و بەیەکجاری وازمان لێبێنە. ئێمە هەڵە بووین کە خۆمان خستە نێو بێویژدانییەکی واوە، هەڵەی منیش لە هەموو کەس زیاترە..
لۆژین ئاگری ڕقی هەڵایسابوو، هاواری کرد:
- بەڵام، پولخێریا ئەلێکساندروڤنا، تۆ بەو بەڵێنەی کە بە منت دابوو و ئێستا لێی پەشیمانیت دەستوبالّمت بەستبووەوە.. منیش لە دواییدا دەبێت ئەوە هەر بڵێم کە من بۆ ئەوە پارەم خەرج کردووە..
ئەم داوایەی دوایی پیتەر پتروڤیچ ئەمەندە لەگەڵ ڕەوشت و خوی ئەودا دەگونجا، ڕاسکۆلنیکۆڤ کە لە ڕک و تووڕەییدا ڕەنگ لە ڕووی پەڕیبوو و دەیویست هەرچۆنێکە خۆی بگرێت، لەپڕێکدا خۆی پێنەگیرا

و دایە قاقای پێکەنین. وەلێ پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بێئاگا لە خۆی هاواری کرد:
- کام خەرجی؟ خەرجیی چی؟ ڕەنگە باسی جانتاکە بکەیت؟ ئاخر، ئەوە کارمەندی شەمەندەفەرەکە بە بەلاش هەڵی گرت. خودایا، ئێمە تۆمان بەستۆتەوە! پیتەر پتروڤیچ وەرەوە سەرخۆت، ئەوە تۆیت کە دەستوپێی ئێمەت بەستۆتەوە و سەرتاپات شەتەک داوین، نەک ئێمە.
ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا جەختی کردەوە:
- دایکە گیان، بەسە، تکات لێدەکەم بەسە، پیتەر پتروڤیچ تکایە بڕۆ دەرەوە.
لۆژین کە تا ڕادەیەک خۆی لەدەست دابوو، وتی:
- دەڕۆم، بەڵام دەمەوێت قسەیەکی تریش بکەم، لەوە دەچێت دایکت هیچی لەبیر نەمابێت: من کاتێک بڕیاری هێنانی تۆم دا، کە لە ناو خەڵکیدا واتەواتێکی زۆر خراپت بە دواوە بوو، من بە پێچەوانەی ڕای خەڵکی جووڵامەوە بۆ گێڕانەوەی ئابڕووی تۆ. بێگومان من دەمتوانی بە ئومێدی پاداشت بم و هیچ نەبێت تۆ سوپاسم بکەیت.. وەلێ وا تازە چاوم کرایەوە. من وای دەبینم کە بە ڕاستی زۆر زۆر کارێکی ناڕەوام کرد کە گوێم لە واتەواتی خەڵکی نەگرت.
ڕازومیخین کەلەسەر کورسییەکە ڕاپەڕی و ئامادەی شەڕ بوو، هاواری کرد:
- دەڵێی سەری بە لەشییەوە زیادە.
دونیا وتی:
- تۆ پیاوێکی سووک و ڕسوایت.
ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕازومیخینی خستە لاوە و پێی وت:
- لەسەرخۆ، هیچ ناکەیت.

پاشان کە زۆر لە لۆژین نزیک کەوتبووەوە، لەسەرخۆ و بە دەنگێکی گڕەوە وتی:
- تکایە بڕۆ و ونبە، یەک وشەی تر نەڵێیت، ئەگینا..
پیتەر پتروڤیچ چەند چرکەساتێک بە ڕەنگی پەڕیووەوە کە ڕق دەموچاوی شێواندبوو تەماشای کرد. پاشان وەرگەڕا و چووە دەرێ.
کەم کەس دەیتوانی هەست بەو ڕقە بکات کە لۆژین بەرانبەر بە ڕاسکۆلنیکۆڤ هەڵیگرتبوو، لۆژین تەنیا هەر ئەوی لە هەموو ئەو کارەدا بە تاوانبار دەزانی. سەیر ئەوە بوو، تەنانەت ئەو کاتەی کە لە پلیکانەکانەوە بەرەو خوار دەبووەوە، هێشتا وای دەزانی کە ڕەنگە کارەکە بە تەواوی کۆتایی نەهاتبێت و ئەوەی پەیوەندی بە هەردوو خانمەکەوە هەبێت، "زۆر گریمانەی" ئەوە هەیە کە چار بکرێت.

٣

گرنگترین شت ئەوە بوو کە لۆژین تا دوادەقیقەش بە هیچ شێوەیەک چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد کارەکە بەو جۆرە بشکێتەوە و کۆتایی پێبێت، ئەو هەوڵی زۆری بە گەڕ خستبوو، تەنانەت بیری لەوە نەکردبووەوە دوو ژنی هەژار و بێدەستەڵات ئا بەو جۆرە لێی یاخی بن. لە هەموو شتێک زیاتر فیز و بەخۆنازینی زۆری گەیشتبووە ڕادەی خۆپەسەندی و باوەڕو متمانەیان پێ پەیدا کردبوو: پیتەر پتروڤیچ کە خۆی لە چینێکی خوارەوەوە هەڵگڕابوو، وەک نەخۆشییەکی دەروونی هەبێت، هەموو کارەکانی خۆی گەلێک بە شایستە و باش دەزانی. لە هزر و توانای خۆی زۆر ڕازی بوو، تەنانەت ئەگەر بە تەنیا بووایە، ئاسایی لە بەردەم ئاوێنەدا دەوەستا و چێژی لە تەماشاکردنی خۆی دەبینی. بەڵام لە هەموو شتێک زیاتر

دەربەستی پارەوپووڵ بوو، کە بە زەحمەت و ڕێگەی جۆراوجۆر بە دەستی هێنابوو.

کەمێک لەوەوبەر، کاتێک ئەو بیرەوەرییە تاڵەی وەبیر دونیا هێنایەوە، کە هەرچەندە ناوبانگی دونیا خراپ بووە و ئەم هەر ویستوویەتی بیخوازێت، لۆژین قسەکانی زۆر بە قەناعەتەوە دەکرد و تەنانەت وتەی ناهەقی قبووڵ نەدەکرد و پێی جاڕز دەبوو، ئەو کاتەیش کە دونیای خواست، ئەو پڕوپاگەندە و قسە و قسەلۆکانەی بەبێ بنەما دایە قەڵەم، کە خودی مارفا پتروڤنا بە ئاشکرا بە درۆی خستبووەوە و لۆژین دانی بەمەدا دەنا. دانیشتوانی شارۆچکەکەیش زۆر دەمێک بوو ئەو تۆمەتەی درابووە پاڵ دونیا، بە تەواوی ڕەتیان کردبووەوە و هەموو شتێکی ئەو لایەنەیان فەرامۆش کردبوو. لۆژین هەرگیز نکۆڵیی لەوە نەدەکرد کە پێشتر هەموو ئەو شتانەی زانیووە. کەچی لەبارەی بڕیارەکەیەوە کە دەیویست دونیا بهێنێت و بیخاتە ئاستی خۆی، بڕیارەکەی زۆر بە هەنگاوێکی گرنگ و تەنانەت بە هەڵوێستێکی زۆر مەزنی دەدایە قەڵەم، ئێستا کە ئەمەی وەبیر دونیا دەهێنایەوە، ئەو نهێنییە و ئەو خۆشەویستییەی کە جارەهای جار تەنیا چێژی لە بیرلێکردنەوەی دەبینی، دەیخستنە ڕوو و ئاشکرای دەکردن. لەوەیش سەری سوورمابوو کە ئەوانی دی بۆ بەرانبەر بەو هەنگاوەی خوێنساردن، کاتێک کە سەردانی ڕاسکۆلنیکۆڤیشی کرد، وەک یەکێک چووە ژوورەکەی، کە کاری چاکی کردووە و شایانی سوپاس و ستایشە. هەڵبەتە هەنووکە کە لە نەردەوانەکانەوە دەهاتە خوارێ، هەستی بەوە دەکرد کە گەلێک دڵی شکاوە و بایەخیشی نەدراوەتێ، بەڵام دونیا هەند بۆ ئەو پێویست بوو، کە هەرگیز نەیدەتوانی دەستبەرداری ببێت. ئەو ماوەیەکی زۆر، بەڵکو ساڵانێک

بوو خەونی بە ژنهێنانەوە دەبینی، بەردەوام و بێپسان پارەی بۆ کۆ دەکردەوە، لە ناوەوەیدا سەرمەستانە خەونی بە کچێکەوە دەبینی، کە ڕەسەن و هەژار بێت (بەڵێ حەتمەن هەژار بێت) زۆر دەلال و جوان و خانەدان، ڕەوشتبەرز، شەرمن و ساردوگەرمیی ڕۆژگاری چەشتبێت، هەروەها دەبێت سەری ڕێز بۆ ئەم دابنەوێنێت، کچێک بێت تا ماوە ئەم بە فریادڕەسی خۆی بزانێت، ملکەچی بێت و کارەکانی (بە تەنیا کارەکانی ئەم) بە چاک و دەگمەن بداتە قەڵەم. لۆژین لە کاتی تەنیایی و حەسانەوەیدا چ دیمەن و وێنایەکی چێژبەخش و شیرین و فریوودەرانەی لە خەیاڵی خۆیدا بەرجەستە کردبوو، وا خەریکیش بوو خەونەکانی بێنە دی، جوانی و ڕەوشتی ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنا ئەوی سەرسام کردبوو، نەبوونییش ئەوپەڕی ئازایەتی و بوێریی پێبەخشیبوو. ئەوەی لۆژین بەرانبەر بە خۆی دەیبینی، زیاتر بوو لە خەونەکەی، ئەو کچێکی دەست کەوتبوو: لووتبەرز، خاوەن کەسایەتی، چالاک و بەتوانا، لە باری بیر و زانستیشەوە لە خۆی باڵاتربوو (لۆژین هەستی بەمە دەکرد) کەواتە مرۆڤێکی لەم بابەتە بۆ هەموو ژیانی سوپاسگوزاری هەنگاوەکەی دەبێت و ئامادەی گشت فیداکارییەک دەبێت بۆی، ئەویش بۆی هەیە بە تەواوی مانا فەرمانی بداتێ. بەتایبەتیش تۆزێک پێش ئەم ڕووداوە، دوای بیرکردنەوە و وەستانێکی زۆر سەرئەنجام بڕیاری ئەوەی دابوو کە کارەکەی بگۆڕێت و بڕواتە نێو چالاکیی فراوانترەوە تا بتوانێت وردەوردە جێپێی خۆی لە نێو شوێنی چاکتری کۆمەڵگادا بکاتەوە، ئەو کۆمەڵگایەی کە ماوەیەکی زۆر بوو بە تاموچێژێکی فراوانەوە خەیاڵی لێدەکردەوە. بە کورتی بڕیاری دابوو بەختی خۆی لە پترزبورگدا تاقی بکاتەوە. ئەو دەیزانی دەتوانێت لە ڕێی ژنەوە سەرکەوتنی زۆر

بەدەست بێنێت. ئەو سەرنجڕاکێشانەی لەو ژنە جوان و جوامێر و ڕووناکبیرەدا هەبوو، دەیتوانی جوانییەکی زۆریش بە ژیانی ئەم ببەخشێت، خۆشەویستی خەڵکی بە لای خۆیدا ڕابکێشێت، شەبەنگێک لە دەوروبەریدا دروست بکات: وەلێ هەنووکە تەواوی ئەو ئومێدانە بەبا چووبوون، ئەم دابڕانە ناکاو و بێمانایەی ئێستا وەک بروسکە لێی دا. گشت ئەم بەسەرهاتە، بریتیبوو لە بەدحاڵیبوون و گاڵتەجاڕییەک، ئەو تەنیا کەمێک جەسارەتی نیشان داوە و تەنانەت فریای ئەوە نەکەوتووە بە تەواوی باری سەرنجی خۆی بڵێت. تەنیا گاڵتەی کردووە و لەم کارەیدا کەمێک گەرموگوڕیی پێوە دیار بووە، وەلێ دووچاری چ کۆتاییەکی جیدی و ترسناک بۆتەوە! ئیتر تەنانەت دونیای بە شێوازی خۆی خۆش دەویست. لە خەونەکانیدا فەرمانی بەسەردا دەدا و کەچی لەناکاودا!.. نا، سبەی، هەر سبەی، پێویستە هەموو پەیوەندییەکانی پێشوو وەک خۆیان لێبێتەوە، دەردەکان دەرمان بکرێن و کارەکان چاک بکرێنەوە، لە هەموویش گرنگتر ئەوەیە کە ئەو هەرزەکارەی هێشتا بۆنی شیری خاو لە دەمی دێت و ئەم هەموو کێشەیەی دروست کردووە، دەبێت لەناو ببرێت.

بە هەستێکی دەردناک و بێئیرادەی خۆی ڕازومیخینی بیر کەوتەوە.. وەلێ لەو لایەنەوە زوو دڵنیا بوو، بە خۆی وت: "هەر ئەوە مابوو ئەویش بخەنە ئاستی منەوە" بەڵام ئەو کەسەی کە بە ڕاستی لێی دەترسا، سڤیدریگایلوڤ بوو.. بە کورتی چاوەڕوانی دەردەسەرییەکی زۆری دەکرد.

دونیا دایکی لە ئامێز گرتبوو، ماچی دەکرد و دەیوت:

– نا، من، من لە هەمووتان تاوانبارترم، من بە پارەکانی هەڵخەڵەتام، وەلێ سوێند دەخۆم، کاکە، هەرگیز وامنەدەزانی مرۆڤێکی هێند نامەرد

بێت، ئەگەر پێشتر چاک بمناسیبایە هەرگیز دەسخەڕۆی هیچ شتێک نەدەبووم. کاکە، سەرکۆنەم مەکە.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا کەوتە ورتەورت:
- خودا ڕزگاری کردین، خودا خۆی ڕزگاری کردین.
ئەم قسانەی بەبێ بیرکردنەوە دەوت و پێدەچوو هێشتا بە چاکی درکی بەوە نەکردبێت کە ڕووی دابوو.
هەموویان خۆشحاڵ بوون و تەنانەت دوای پێنج دەقیقە کەوتنە پێکەنین، تەنیا دونیا نەبێت کاتێک ئەو پێشهاتەی بیر دەکەوتەوە، ڕەنگی سپی دەبوو و برۆکانی دەهاتنەوە یەک. پولخێریا ئەلێکساندروڤنا پێشتر هەرگیز بە بیریدا نەدەهات، کە ئەویش شادمان دەبێت. پەیوەندیبڕینی لەگەڵ لۆژیندا و لەو بەیانییەدا بە بەدبەختییەکی گەورە دەزانی. ڕازومیخین زۆر بەختەوەر بوو. هێشتا نەیدەوێرا بە تەواوی بەختەوەرییەکەی خۆی دەربخات. وەلێ چۆن یەکێک تای لێهاتبێت، هەموو گیانی دەلەرزی، وەک ئەوە وابوو کە بارێکی گران لەسەر دڵی لاچووبێت. ئێستا دەیتوانی هەموو ژیانی ببەخشێتە ئەو دوو کەسە و خزمەتیان بکات.. بۆ کەم ڕوو دەدات کە پێشهاتی وا بێتە دی. بەڵام بە ترسەوە بیرەکانی ئاییندەی لە خۆی دەتەراند و لە وێنا و خەیاڵەکانی خۆی دەترسا، تەنیا ڕاسکۆلنیکۆڤ بوو کە هەر لە شوێنەکەی خۆیدا دانیشتبوو، تا ڕادەیەک ڕوو گرژ و بێتاقەت دەردەکەوت. ئەو کە لە هەموویان زیاتر سوور بوو لەسەر ئەوەی لۆژین بکرێتە دەرەوە، ئێستا وەک ئەوە وابوو لەوان کەمتر بایەخ بە ڕووداوەکە بدات، دونیا لە خۆیەوە بیری لەوە دەکردەوە، کە هێشتا براکەی لێی تووڕەیە، پولخێریا ئەلێکساندروڤنایش بە ترسەوە تەماشای کوڕەکەی خۆی دەکرد.

دونیا لە ڕاسکۆلنیکۆڤ نزیک بووەوە و وتی:
- باشە، سڤیدریگالوف چی پێ وتیت؟
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە دەنگی بەرز وتی:
- ئاخ، بەڵێ، بەڵێ.. چی بوو..
ڕاسکۆلنیکۆڤ سەری بڵند کرد:
- بێگومان دەیەوێت دەهەزار ڕۆبڵ بدات بە تۆ و پێشی خۆشە بە ئامادەبوونی من جارێک تۆ ببینێت.
پولخێریا ئەلێکساندروڤنا هاواری لێهەستا:
- بڕوانە! هەرگیز ئەوە ناکرێت، چۆن دەوێرێت پارە بە دونیا بدات!
ڕاسکۆلنیکۆڤ دەستی کرد بە گێڕانەوەی ئەو قسانەی لەگەڵ سڤیدریگایلوفدا کردبووی. (ئەم کارەی پێ خۆش نەبوو) بەڵام ئەوەی نەگێڕایەوە، کە مارفا پتروڤنا لە دوای مردنی جارێکی دی دەرکەوتۆتەوە. ئەمەیش لەبەر ئەوەی لە مەبەستە سەرەکییەکە دوور نەکەوێتەوە و شتی زیادە نەڵێت کە خۆی لە وتنی بێزارە.
دونیا پرسی:
- ئەی تۆ چۆن وەڵامیت دایەوە؟
- لە پێشا وتم کە هیچ شتێکی ئەو بە تۆ ناڵێم، وەلێ وتی ئەگەر وا بێت هەموو توانای بۆ بینینی تۆ بەکار دەهێنێت. جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە ئەو سۆز و عەشقەی بەرانبەر بە تۆ هەیبوو، لە تراویلکە زیاتر هیچی دی نەبووە و لە ئێستادا هیچ هەستێکی لەو بابەتەی بۆ تۆ نییە.. بەڵام حەزی نەدەکرد تۆ ببیتە ژنی لۆژین.. تێکڕا قسەکانی فریوودەرانە بوون.
- ڕودیا، تۆ ڕات بەرانبەری چۆنە، چۆنی دەبینیت؟

- تێی ناگەم، دان بەوەدا دەنێم کە باش سەری لێ دەرناکەم. دەهەزار ڕۆبڵ پێشکەش دەکات و خۆیشی بە دەوڵەمەند دانانێت. دەڵێت نیازی سەفەری هەیە و دوای دە دەقیقە قسەکەی لە بیر دەچێتەوە، لەپڕێکدا دەڵێت نیازی وایە ژن بێنێت و خەریکن خوازبێنی بۆ دەکەن.. هەڵبەتە چەند ئامانجێکی هەیە و بێگومان ئامانجەکانی دزێون، لەوەیش ناچێت کە ئەو نیازی لەگەڵ تۆدا خراپ بووبێت یان بیەوێت گەوجایەتییەکی وا بکات.. بە ئاشکرا من لەباتیی تۆ پارەکەم بەیەکجاری و بەبێ سێودوو ڕەت کردووە. بەهەرحاڵ، بە کابرایەکی سەیر هاتە بەرچاوم.. نیشانەی شێتیم تیا بینی، ڕەنگە من هەڵە بم، یان لەوانەیە ئەمە خۆی لە خۆیدا جۆرە فریوویک بێت، پێدەچێت مەرگی مارفا پتروڤنا کاری تێکردبێت.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا وتی:

- خوا لەو ژنە خۆش بێت، تا بمێنم دوعای خێری بۆ دەکەم، دونیا بیر لەوە بکەرەوە ئەگەر ئەو سێ هەزار ڕۆبڵە نەبووایە ئێمە ئێستا چیمان بەسەر دەهات! خودایا، دەڵێی لە ئاسمانەوە داکەوتووە ئاخ ڕودیا، بەیانی تەنیا سێ ڕۆبڵمان پێمابوو، من و دونیا تاقە ئومێدمان ئەوە بوو کە سەعاتەکەی دونیا بە بارمتە دابنێین تا ناچار نەبین دەست لەو کابرایە پان بکەینەوە و پاشان خۆیمان بەسەردا بسەپێنێت.

پێشنیازەکەی سڤیدریگایلوف لەڕادەبەدەر دونیای سەرسام کرد، هەر ڕاوەستابوو بیری دەکردەوە، دوایی ورتەورتێکی کرد و گیانی کەوتە لەرزین، بە خۆی وت: "بیرێکی ترسناکی لەژێر سەردایە".

ڕاسکۆلنیکۆڤ لەو ساکاوییەی دونیا تێگەیشت و پێی وت:

- پێدەچێت بە ناچاری چەند جارێکی تر بیبینمەوە.

ڕازومیخین بە گەرمییەوە وتی:
- چاودێریی دەکەم، شوێنپێی هەڵدەگرم! بۆ هەر کوێ بچێت، چاوی لێناتروکێنم، ڕودیا ڕێگەی پێداوم، کەمێک لەمەوبەر خۆی پێی وتم: "ئاگات لە خوشکم بێت" ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا تۆ ئەڵێی چی؟ ڕێگەی ئەم کارەم پێدەدەیت؟
دونیا زەردەخەنەیەکی کرد و دەستی بۆ درێژ کرد، بەڵام ترس لە دەموچاویدا کەم نەدەبووەوە. پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە ترسێکی شاراوەوە تەماشای کچەکەی خۆی کرد، بەهەرحاڵ، سێ هەزار ڕۆبڵ بە ئاشکرا دڵی دەدایەوە و ئاسوودەی دەکرد.
دوای چارەکە سەعاتێک هەموو لە گەرمەی باسوخواسدا بوون، تەنانەت ڕاسکۆلنیکۆڤ هەرچەندە قسەی نەدەکرد، بەڵام بە وردی گوێی گرتبوو. ڕازومیخین دابوویە دەمی و بە پەرۆشییەوە قسەی بۆ دەکردن:
- بۆچی، بۆچی دەتانەوێت بڕۆن! ئاخر لەو شارۆچکەیەدا چی دەکەن؟ لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە لێرە هەمووتان پێکەوەن و بەتەنگ یەکترەوە دێن، نازانن چەند بۆ یەکدی پێویستن! باوەڕ بکەن، دەی، هیچ نەبێت بۆ ماوەیەکی کەم بمێننەوە، منیش بە هاوڕێی خۆتان بزانن و هاوبەشی هەموو شتێکتان. بەڵێنتان پێدەدەم کە کاری باش ڕایی بکەین. گوێ بگرن، من ئەمانەتان بە وردی بۆ باس دەکەم، گشت پلانەکە. هەر ئەم بەیانییە، پێش هەموو ئەم شتانەی کە ڕوویان دا، وام بە بیردا هات کە.. مەبەستم ئەوەیە من مامێکم هەیە (پێکتان دەناسێنم، پیرەمێردێکی زۆر بەڕێز و ڕێکوپێکە) هەزار ڕۆبڵ سەرمایەیەتی، وەلێ ژیانی بە مووچەی خانەنشینی بەسەر دەبات و پێویستی بە پارەی تر نییە. ئەوە دوو ساڵە وازم لێناهێنێت و سوورە

لەسەر ئەوەی کە هەزار ڕۆبڵەکەی لێوەربگرم و لەسەدا شەش قازانجی بدەمێ. من تێی دەگەم: ئەو تەنیا ئەوەی مەبەستە کە یارمەتیم بدات. ساڵی پار پێویستم پێی نەبوو، بەڵام ئەمساڵ چاوەڕێی هاتنی بووم و بڕیارم داوە پارەکەی لێوەربگرم، کەواتە ئێوەیش هەزار ڕۆبڵ بدەن. لەوسێ هەزار ڕۆبڵەی کە هەتانە، ئەمەیش وەک سەرەتایەک چاکە، بەم جۆرە دەبینە شەریک، بەڵام ئینجا چی بکەین؟

ڕازومیخین زیاتر کەوتە ڕوونکردنەوەی مەبەستەکەی، باسی ئەوەی کرد کە تا ڕادەیەک خاوەن کتێبخانە و بڵاوکەرەوەکانی ئێمە کەمتر ئاگاداری چۆنایەتین، بۆیە زۆربەیان بڵاوکەرەوەیەکی خراپن. ئەمە لە کاتێکدایە کە بڵاوکراوەی باش بەهەرحاڵ زیانی نییە و هەندێکجار کەڵکێکی باشیشی هەیە.

ڕازومیخین حەزی لە بڵاوکردنەوەی کتێب بوو، دوو ساڵی ڕێک بوو ئەو کارەی بۆ خەڵکی تر دەکرد. لە کاتێکدا کە سێ زمانی بێگانەی تا ڕادەیەکی باش دەزانی. هەرچەندە شەش ڕۆژ لەوەوبەر بە ڕاسکۆلنیکۆڤی وتبوو کە زمانە ئەڵمانییەکەی چاک نییە. بەڵام بەو مەبەستە ئەوەی پێ وتبوو، کە ڕاسکۆلنیکۆڤ قایل بکات نیوەی کاری وەرگێڕانەکەی بخاتە ئەستۆی خۆی و لەباتیی ئەوە سێ ڕۆبڵ وەربگرێت. بەڵام لەو بارەیەوە درۆی دەکرد و ڕاسکۆلنیکۆڤیش دەیزانی درۆ دەکات.

ڕازومیخین بە گەرمییەکی لەوەوبەر زیاترەوە وتی:

- بۆچی، بۆچی لەم دەرفەتەی هاتۆتە بەردەستمان سوود نەبینین. لە حاڵێکدا کە یەکێک لە گرنگترین کەرەسەکانی ئەو کارە، کە پارەیە، لەبەردەستماندایە؟ هەڵبەتە دەبێت هەوڵی زۆری بۆ بدەین، ئێمەیش ئەو زەحمەتەی بۆ دەکێشین. یەعنی ئێوە، ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنا، من و

ڕودیا.. گەلێک بڵاوکراوەکانی ئێستا دەرامەتێکی باشیان هەیە، گرنگ ئەوەیە بزانین کامە وەرگێڕان پێویستە، پێکەوە، هەم وەرگێڕان، هەم بڵاوکردنەوە و خوێندنیش دەکەین. هەنووکە من دەتوانم بەکەڵک و کاریگەر بم، چونکە ئەزموونم هەیە. نزیکەی دوو ساڵە لەگەڵ بڵاوکەرەوەکاندا هاتوچۆمان هەیە و لە هەموو بێنەوبەردەیەکیان شارەزام، باوەڕ بکەن کە ئەوانە موجیزە ناکەن! ئاخر، بۆ شتێک بۆ خۆمان نەپچڕین، نابێت هەروا دەرفەت لەدەست بدەین، خۆم دوو سێ کتێب دەزانم کە بە کەسم نەوتووە، لە هەر یەکێکیان، هەر تەنیا بە ناوهێنانیان بۆ مەبەستی وەرگێڕان و بڵاوکردنەوە ڕەنگە سەد ڕۆبڵم دەست بکەوێت. بەرهەمی تر هەیە تەنانەت بۆ پێنج سەد ڕۆبڵیش ناوی ناهێنم. دەڵێن چی؟ تازە ئەگەر بە هەندێک کەس بڵێم، لەوانەیە گومان بکەن. خەڵکێکی ئەمەندە گەوجن! هەموو دەردەسەرییەک کە پەیوەندیی بە چاپخانە و کاغەز و فرۆشتنەوە هەیە، ڕووبەڕووی منی بکەنەوە. هەموو کونوکەلەبەرەکانی دەزانم. لە بچووکەوە دەست پێبکەین بە گەورە دەگەین. هەر هیچ نەبێت خەرجیی ڕۆژانەمانی تیا دەبێت و بێگومانم کە زەرەر ناکەین.

چاوی دونیا دەدرەوشانەوە:

- دیمیتری پرۆکفیچ، هەموو ئەو شتانەی کە تۆ وتت، من زۆر پێم باشن.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا وتی:

- هەڵبەتە من هیچ لەم مەسەلەیە نازانم، دەشێت باش بێت، وەلێ بەهەرحاڵ، خوا خۆی دەیزانێت چۆنە. کارێکی تازەیە و ڕوو لە نادیارە، دیارە ئێمە ناچارین لێرە بمێنینەوە.. هیچ نەبێت بۆ ماوەیەکی کەم.

تەماشایەکی ڕودیایشی کرد.
دونیا پرسی:
- کاکە، تۆ دەڵێی چی؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی دایەوە:
- من وای بۆ دەچم بیرێکی زۆر باشی کردۆتەوە، هەڵبەتە ئێستا جارێ پێویست ناکات بیر لە دروستکردنی بنکەیەکی بڵاوکردنەوە بکەینەوە. وەلێ دەتوانین زۆر سەرکەوتوانە پێنج شەش کتێب بڵاو بکەینەوە، خۆیشم بە بەرهەمێک دەزانم، کە بێگومانم فرۆشی زۆر دەبێت.. لە لایەنی ڕازومیخینیشەوە دڵنیا بن، خۆی دەزانێت چی دەکات. بەهەرحاڵ، دەرفەتی زیاترمان هەیە بۆ قسەلەسەرکردنی..
ڕازومیخین بە دەنگی بەرز وتی:
- بژیت. کەواتە گوێ بگرن، لێرەدا. هەر لەم تەلارەدا ئاپارتمانێک هەیە هی خاوەنی ئەم شوێنەیە، ئاپارتمانێکی تایبەتی و جیاوازە و ڕێگەی نایەتەوە سەر ئەم ژوورانە، هەموو شتێکی تێدایە، نرخەکەیشی گونجاوە و سێ ژووری تیایە. باشە، بۆ دەستپێکردنی کارەکە بڕۆنە ناوی، هەر بەیانی سەعاتەکەت دەخەمە بارمتە و پارەکە دێنم و ئیدی هەموو شتێک دروست دەبێت. گرنگ ئەوەیە کە دەتوانن پێکەوە تیایدا بژین و ڕودیایشتان لەگەڵدا بێت.. ها! ڕودیا بۆ کوێ دەچیت؟
پولخێریا ئەلێکساندرۆڤنا بە سەرسامییەوە پرسی:
- چییە، ڕودیا، دەتەوێت بڕۆیت؟
ڕازومیخین بە بێزارییەوە دەنگی لێهەڵبڕی:
- لەم کاتەیشدا؟

دونیا بە ساکاوییەکی تێکەڵ بە بڕواپێنەکردنەوە تەماشای کاکی کرد. ڕودیا کڵاوەکەی بە دەستەوە و ئامادەی چوونە دەرەوە بوو، بە دەنگێکی سەیرەوە وتی:

- پێدەچێت بتانەوێت لە گۆڕم نێن، یان بۆ هەمیشە ماڵئاواییم لەگەڵدا بکەن.

پاشان زەردەخەنەیەکی کرد کە لە ڕاستیدا زەردەخەنەیش نەبوو، بێئیرادە وتی:

- کێ چووزانێت؟ ڕەنگە ئەمە دواجار بێت کە یەکدی ببینین.

ئەو دەیویست ئەمە تەنیا بۆ خۆی بڵێت، کەچی بیرۆکەکە هەر لە خۆیەوە بە دەنگی بەرز وترا.

دایکی هاواری لێکرد:

- تۆ چیتە؟

دونیا بە دەنگێکی تایبەتییەوە پرسی:

- ڕودیا، بۆ کوێ دەڕۆیت؟

- هیچ، دەبێت بڕۆم.

وەڵامەکەی هیچی بە دەستەوە نەدا و وایش وتی، دەتوت خۆیشی بەگومان بێت لە وتنی، بەڵام لە دەموچاویدا وا دەردەکەوت کە بڕیاری تەواوی دابێت.

- کاتێک کە بۆ ئێرە دەهاتم.. دەمویست بڵێم.. بە ئێوە و بە تۆ، دونیا، دەمویست بڵێم کە بۆ ئێمە وا باشترە تا ماوەیەک لە یەکتری دوور بین، من حاڵم باش نییە، نارەحەتم.. پاشان دێم، خۆم دێم. هەر کاتێک بتوانم، لە بیرمن و خۆشم دەوێن، لێم بگەڕێن، با بە تەنیا بژیم، من ئەم بڕیارەم پێشتر دابوو.. ئەمە بڕیارێکە پاشگەزبوونەوەی تیا نییە، هەرچیەکم بەسەر دێت، لەناو بچم یان نا، حەز دەکەم تەنیا بم، بە

تەواویی لە بیر خۆتانم بەرنەوە، ئەمەیان باشترە. بەدوامدا مەگەڕێن، هەر کاتێک کە پێویست بوو خۆم دێم یان.. ئاگادارتان دەکەمەوە، بەڵکو هەموو شتێک لە نوێ ببووژێتەوە.. بەڵام لە ئێستادا، ئەگەر خۆشتان دەوێم، لێم ببوورن.. ئەگینا نەفرەتتان لێدەکەم، من وا هەست دەکەم.. خواتان لەگەڵ.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا هاواری کرد:

- خودا گیان!

پێکەوە دایک و خوشک سەرسام ببوون، ڕازومیخینیش هەروا.

دایکی بێچارە پاڕایەوە:

- ڕودیا، ڕودیا، با ئاشت ببینەوە، وەرە با وەک جاران وابین، بەڵام ئەو لەسەرخۆ بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت و لە ژوورەکە چووە دەرێ، دونیا کەوتە دوای و بە نیگایەک کە تووڕەیی تیا دەبریسکایەوە، وتی:

- کاکە، ئەی ئێمە چی بکەین؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ کەمێک لێی ڕاما و بە دەنگێک، کە لە ڕاستیدا دەتوت خۆیشی نازانێت چی دەڵێت، وتی:

- هیچ نییە، دێم بۆ لاتان، سەرتان لێدەدەم

دونیا قیژاندی:

- بێهەستی خۆپەرست، دڕندە.

ڕازومیخین توند دەستی دونیای گوشی و بە گوێیدا چرپاند:

- شێتە، شێت، نەک بێهەست، ئەقڵی لەدەست داوە، بەڕاست هەستی پێناکەیت؟ تۆیش هەستت نییە ئەگەر بەمە نەزانیت.

پاشان ڕازومیخین ڕووی لە پولخێریا ئەلێکساندروڤنا کرد، کە دەتوت لە جێگاکەی خۆیدا بەستوویەتی و پێی وت:

- هەر ئێستا دەگەڕێمەوە!

له ژوورەکە چووە دەرێ، ڕاسکۆلنیکۆڤ لە کۆتایی ڕاڕەوەکەدا چاوەڕێی بوو و پێی وت:

- زانیم بەدوامدا ڕادەکەیتە دەرەوە، بگەڕێرەوە لایان و لەگەڵیاندا بە.. سبەینێش هەر لایان بە.. هەر لایان بە، من.. ڕەنگە بێم.. ئەگەر بتوانم، خوات لەگەڵ.

بێ ئەوەیش کە دەستی بۆ درێژ بکات ڕۆیشت. ڕازومیخین کە بە تەواوی شڵەژابوو، کەوتبووە بۆڵەبۆڵ:

- ئاخر بۆ کوێ دەچیت؟ چیتە؟ چی دەکەیت؟ باشە وا دەبێت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ دیسانەوە وەستایەوە و وتی:

- بۆ یەکجاری پێت دەڵێم، هەرگیز لەبارەی هیچ شتێکەوە لێم مەپرسە، چونکە من وەڵامی تۆم لانییە.. مەیەرە لام، ڕەنگە خۆم بێم بۆ ئێرە.. واز لە من بهێنە، بەڵام واز لەوان مەهێنە، تێم دەگەیت؟

ڕاڕەوەکە تاریک بوو، ئەوان لە نزیک چراکەوە وەستابوون، بۆ چرکەساتێک لەیەکتریان ڕوانی. ڕازومیخین بە درێژایی تەمەنی ئەو چرکەساتەی لە یاد ناچێت. ڕوانینە ئاگرین و تیژەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ دەتوت تادێت توند و بەهێزتر دەبێت و دەچێتە ناو قوڵایی گیان و دەروونی ڕازومیخینەوە. لەپڕێکدا ڕازومیخین موچرکێکی پێدا هات. وەک ئەوەی شتێکی سەیر کەوتبێتە نێوانیانەوە.. وەک بیرۆکەیەکی بەئاماژە بێت لە نێوانیاندا، شتێکی دزێو و ترسناک، کە هەردووکیان پێی بزانن.. ڕازومیخین ڕەنگی مردووی لێ نیشت.

لەپڕێکدا ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ڕوویەکی گیراوی نەخۆش ئاساوە وتی:

- ئێستا تێگەیشتیت؟ دە بگەڕێرەوە بۆ لای ئەوان...

ئەمەی وت و خێرا پشتی تێکرد و لە ماڵەکە چووە دەرێ.

ئیتر من باس لەوە ناکەم کە دوای ئەوە چی لە ماڵی پولخێریا ئەلێکساندروڤنا ڕووی دا، چۆن ڕازومیخین گەڕایەوە لای ژنەکان و دڵی دانەوە، سوێند و دڵنیاکردنیان لەسەر حەسانەوەی ڕاسکۆلنیکۆڤ، ڕازومیخین لەوە دڵنیای کردن کە ڕودیا هەموو ڕۆژێک سەردانیان دەکات و دەیوت ئەو زۆر زۆر نەخۆشە و نابێت تووڕە بکرێت. بەڵێنی ئەوەیشی دا کە خۆی ئاگاداریی لێبکات و پزیشکێکی چاکی بەرێتە سەر، باشترین پزیشک، هەروەها لیژنەیەکی پزیشکی بۆ ساز بکات.. بە کورتی ئەو شەوە ڕازومیخین بۆ ئەوان بوو بە کوڕ و برا.

٤

ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕاست بەرەو ماڵی سۆنیا تێی کێشا، کە لە پاڵ ڕووبارێکدا بوو. خانوویەکی سێ قات، کۆن و ڕەنگ سەوز، هەر چۆنێک بوو، پاسەوانەکەی دۆزیەوە و ناونیشانێکی سەرپێی ماڵی کاپێرناومۆڤی خەیاتی بەدەست هێنا. دوای ئەوەی لە گۆشەیەکی حەوشەکەدا، ڕێگەی نەردەوانە تەنگ و تاریکەکەی دۆزیەوە، چووە سەرەوە، گەیشتە نهۆمی دووەم و چووە هەیوانێکەوە، کە بەسەر حەوشەکەدا دەیڕوانی. کاتێک لە تاریکییەکەدا سەرگەردان و نەیدەزانی چۆن ماڵەکەی کاپێرناومۆڤ پەیدا بکات، لە ناکاودا سێ هەنگاو لەولایەوە دەرگایەک کرایەوە، ڕاسکۆلنیکۆڤ زوو بە دەرگاکەوە نووسا.

دەنگی ژنێکی ترساو هات و پرسی:

- ئەوە کێیە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی دایەوە:

- منم.. هاتووم بۆ لای تۆ.
چوە ڕاڕەوە چکۆڵەکەوە، لەوێ لەسەر کورسییەکی شکاو، مۆمێک لە مۆمدانێکی مسی قوپاودا دەسووتا.
سۆنیا لە جێگاکەیدا چەقی، هاوارێکی کپی لێوەهات!
- ئەمە تۆیت؟ ئای خودایە!
- کامەیە ژوورەکەت؟ لێرەوەیە؟
بەبێ ئەوەی تەماشای سۆنیا بکات، ڕاسکۆلنیکۆڤ هەوڵی دا زووتر بڕواتە ژوورەکەوە.
دوای دەقیقەیەک سۆنیایش بە مۆمێکەوە چووە ژوورەوە، مۆمەکەی لە شوێنێکدا دانا و خۆی بەرانبەر بە ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕاوەستا، تەواو شپرزە بوو، لەم دیدەنییە ناوەختە ترسێکی وای لێنیشت، کە ناتوانرێت باس بکرێت، لەپڕێکدا دەموچاوە هەڵبزرکاوەکەی سوور داگەڕا و فرمێسک لە چاویدا قەتیس ما.. لە یەک کاتدا هەستی بە شەرم و هەڵچون و شادمانی دەکرد.. ڕاسکۆلنیکۆڤ خێرا ڕووی لێوەرگێڕا، لەسەر کورسییەکی بەردەم مێزێک دانیشت، بە نیگایەکی خێرا هەموو ژوورەکەی پشکنی.
ژوورەکە گەورە و بنمیچێکی زۆر نزمی هەبوو، ئەمە تاقە ژوورێک بوو، کە لە خانووەکەی کاپێرناومۆڤ جیا ببووەوە، دەرگای هاوبەش و هەمیشە قفڵلێدراویان کەوتبووە دیواری لای چەپەوە، لە بەرانبەردا، لە دیواری لای ڕاستەوە، دەرگایەکی تر هەبوو کە بەردەوام ئەویش بە قفڵ داخرابوو. لەولای خانووەکەوە، دراوسێیەکی تریان هەبوو ژمارەکەیان جیاواز بوو، ژوورەکەی سۆنیا زیاتر لە ئەمباری دەکرد.. شێوەی چوارگۆشەیەکی نارێکی هەبوو، بۆیە دیمەنەکەی ناجۆر دەینواند، دیوارێکی کەلوکۆم کە بەسێ پەنجەرەوە بەسەر

ڕووبارەکەدا دەیڕوانی، لەم سەرەوە بۆ ئەوسەری ژوورەکە کشابوو، سووچێکی ژوورەکە بە گۆشەیەکی تیژ کۆتایی دەهات و بە تەواویی نەدەزانرا تا کوێ دەڕوات. لەبەر ڕوناکایی کەمی مۆمەکەدا، نەتدەتوانی شتەکان لە یەکدی جیا بکەیتەوە. بەڵام گۆشەکەی تر، بە پێچەوانەی ئەوەوە، زیاد لە پێویست فراوان بوو، لە هەموو ئەو ژوورە گەورەیەدا تا ڕادەیەک هیچ کەرەسەیەکی ماڵی تیا نەبوو. لە سووچێکی لای ڕاستەوە، تەختە خەوێک و لە پاڵیا و نزیک بە دەرگاکە کورسییەک دانرابوو، لە پاڵ هەمان ئەو دیوارەدا کە تەختە خەوەکەی لاوە بوو، هەر نزیک بەو دەرگایەی کە دەڕۆیشتە ماڵە دراوسێکەوە، مێزێکی سادەی دار سفرەیەکی شینی لەسەر داخرابوو. لە پاڵ مێزەکەدا دوو کورسی پووش، لە پاڵ دیوارەکەی بەرانبەر و نزیک بە گۆشە تیژەکە دۆلابێکی بچووک کە لە داری سادە دروست کرابوو و لەو ناوە خاڵییەدا چ جێگایەکی نەدەگرت، دانرابوو. ئەمە هەموو کەرەسە و مۆبیلیاتی ناو ژوورەکە بوو، لە سووچێکی ژوورەکەدا، کاغەزی زەردی دیواری کۆن و بەکارهاتوو، لە ڕەشیدا دەبریسکایەوە. گومان لەوەدا نییە کە ئەم ژوورە لە زستاندا شێدار و نیشانەی هەژاریی پێوە دیار بوو: تەنانەت بە دەوری جێخەوتنەکەدا پەردەیەک نەکێشرابوو.

سۆنیا بێدەنگ بە میوانەکەیدا هەڵیدەڕوانی کە بە وردی و بەبێ ئەوەی شەرمی لێبێت، تەماشای ژوورەکەی دەکرد، وای لێدەڕوانی سەرئەنجام لە ترسا، وەک لە بەردەم دادوەر و فەرمانڕەوایەکدا چاوەڕێی چارەنووسی خۆی بکات، کەوتە لەرزین.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە هێشتا سەری هەڵنەبڕیبوو تەماشای ئەو بکات، پرسی:

- درەنگ هاتووم، بووە بە سەعات یانزە؟
سۆنیا لەبەر خۆیەوە وتی:
- بەڵێ.
پاشان وەک ئەوەی تەواوی ڕێگەچارەکەی لەمەدا بێت، بەپەلە وتی:
- ئاە، بەڵێ، سەعات یانزەیە، هەر ئێستا سەعاتی دراوسێکەمان لێی دا.. خۆم گوێم لێبوو، بەڵێ سەعات یانزەیە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ڕوویەکی گرژەوە وتی:
- ئەمە دواجارە دێم بۆ لات (لەڕاستیدا ئەمە یەکەمجار بوو بچێتە ئەوێ) ڕەنگە ئیتر نەتبینمەوە.
- سەفەر دەکەیت؟
- نازانم.. سبەی دەردەکەوێت.
سۆنیا بە دەنگێکی لەرزۆکەوە پرسی:
- کەواتە تۆ بەیانی نایەیت بۆ لای کاترینا ئیڤانۆڤنا؟
- نازانم، هەموو شتێک بەیانی دەردەکەوێت.. بەڵام قسەکە لەمەدایە، هاتووم شتێکت پێبڵێم..
ڕاسکۆلنیکۆڤ نیگایەکی خەیاڵاوییانەی کرد و لەپڕێکدا لەوە بە ئاگا هاتەوە کە خۆی دانیشتووە و سۆنیا هەر بەرانبەری بە پێوە وەستاوە. بۆیە کتوپڕ دەنگی گۆڕا، بە هێوری و میهرەبانییەوە وتی:
- بۆ وەستاوی؟ دابنیشە.
سۆنیا دانیشت، ڕاسکۆلنیکۆڤ بۆ چرکەیەک ڕووخۆش و تا ڕادەیەک بە سۆزەوە لێی ڕوانی.
- تۆ چەند لاوازیت! تەماشای دەستت بکە! زۆر شەفافن.. پەنجەکانت لە پەنجەی مردوو دەچێت.

دەستی سۆنیای خستە ناو دەستی، سۆنیا زەردەخەنەیەکی ناتەواوی کرد و وتی:
- من هەمیشە وابووم.
- لەو کاتانەیشدا کە لە ماڵی کەسوکارت بوویت؟
- بەڵێ.
- کەواتە، هەڵبەتە!
دیسانەوە کتوپڕ دەموچاو و دەنگی گۆڕا، جارێکی تر بە ژوورەکەدا هەڵیڕوانییەوە.
- تۆ ئێرەت لە کاپەرناومۆڤ بە کرێ گرتووە؟
- بەڵێ.
- ئەوان لەولاوە، لە پشت دەرگاکەوەن؟
- بەڵێ، ژوورەکەی ئەوانیش هەر ئاوایە.
- هەموویان لە ژوورێکدان؟
- بەڵێ هەموویان لە ژوورێکدان.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ڕوویەکی گرژەوە وتی:
- ئەگەر لە شوێنی تۆبام، شەوانە لێرەدا دەترسام.
سۆنیا کە پێدەچوو هێشتا نەهاتبێتەوە سەر خۆی و نەیدەزانی مەسەلەکە چییە، وەڵامی دایەوە:
- خاوەن ماڵەکە گەلێک باش و میهرەبانە.. هەموو ئەم شتانەیش هی ئەون، خێزانەکە هەموو دڵسۆزن و زۆرجار مناڵەکانیان دێنە لام..
- ئەوانەن کە زمانیان دەیگرێت؟
- بەڵێ.. مێردەکە زمانی دەیگرێت و کەمێکیش دەشەلێت، ژنەکەیشی هەروایە، نەک هەر زمانی بیگرێت.. بەڵکو لەوە دەچێت نەتوانێت بە تەواوی پیتەکانیش بڵێت. زۆر دڵسۆزە. مێردەکەی لە نۆکەرە

کۆنەکانە. حەوت منالّیان هەیە.. تەنیا کوڕە گەورەکەیان زمانی دەیگرێت.. ئەوانی تر نەخۆشن، بەڵام زمانیان نایگرێت.. دوایی بە کەمێک سەرسووڕمانەوە پرسی:

- تۆ چۆن لەبارەی ئەمانەوە ئەو شتانە دەزانیت؟

- باوکت هەموو ئەم شتانەی بۆ باس کردووم، هەموو شتێکی لەبارەی ئێوەوە پێوتووم. باسی ئەوەی بۆ کردووم کە چۆن تۆ سەعات شەش چوویتەتە دەرەوە و سەعات هەشت گەڕاویتەوە، ئەوەیشی بۆ باس کردووم چۆن کاترینا ئیڤانۆڤنا لە بەردەم جێخەوەکەتدا کەوتۆتە سەر ئەژنۆ.

سۆنیا کەمێک بێتاقەت بوو، بە گومانەوە لەبەر خۆیەوە وتی:

- وادەزانم ئەمڕۆ دیومە.

- کێ؟

- باوکم، بەسەر شەقامەکەدا دەڕۆیشتم، لەوێ، لە پێچەکەدا، دوای سەعات نۆ، وەک لە پێشمەوە بێت وابوو، هەر بە تەواوی خۆی بوو، من دەمویست بڕۆم بۆ لای کاترینا ئیڤانۆڤنا..

- پیاسەت دەکرد؟

سۆنیا خێرا وتی:

- بەڵێ.

پاشان دیسانەوە شلەژا و چاوی داخست.

- ئەوسا کە لەگەڵ باوکتا دەژیایت، کاترینا ئیڤانۆڤنا لێی دەدایت؟

- وای، نا، تۆ ئەڵێی چی، ئەڵێی چی، نا!

تەنانەت بە کەمە ترسێکەوە لە ڕاسکۆلنیکۆڤی ڕوانی.

- کەواتە خۆشت دەوێت؟

سۆنیا کتوپڕ وەک دەستی ئازاری هەبێت/ گرمۆڵەی کردن و بەدەنگێک کە بۆنی سکاڵای لێدەهات وتی:
- ئەو؟ باشە، هەڵبەتە! ئاە، تۆ ئەو.. ئەگەر تۆ بتناسیایە، ئاخر هەر تەواو لە منداڵ دەچێت.. بە تەواوی ئەقڵی تێک چووە... لە بەدبەختی، لە کاتێکدا کە چەند ئاقڵ بوو.. چەند زرنگ بوو، چەند دڵسۆز بوو! تۆ هیچ، هیچ نازانیت.. ئاە.
سۆنیا ئەم وشانەی زۆر بە نائومێدییەوە وت، غەمبار و پەشۆکاو دەهاتە بەرچاو، لە ناڕەحەتیدا دەستی هەڵدەگلۆفت. ڕوومەتە ڕەنگپەڕیووەکەی دیسانەوە سوور داگەڕانەوە، لە چاویدا نیشانەی خەمێکی زۆر دەردەکەوت. دیار بوو سۆزەکان تەواو دەروونیان هێنابووە جۆش، حەزی دەکرد شتێک بڵێت، داخی دەروونی بڕێژێت و پشتیوانیی لە کاترینا ئیڤانۆڤنا بکات. لەپڕێکدا کڵپەی سۆزێکی زۆر گەرم کە لە کوژانەوە نەیەت بەسەر دەموچاویەوە دەرکەوت.
- لێی دەدام؟ تۆ ئەڵێی چی؟ خودایا، لێی دەدام؟ با بڵێین باشە لێی داوم، ئینجا چییە! دەی، چییە؟ تۆ هیچ، هیچ نازانیت.. ئەو ئەوەندە بەدبەختە، ئای کە بەدبەختە! نەخۆشیشە.. ئەو وێڵی دوای دادپەروەرییە.. پاکە، بڕوای وایە دەبێت لە هەموو شتێکدا دادپەروەری هەبێت، ئەو دادپەروەریی گەرەکە.. تەنانەت ئەگەر ئازاریشی پێبگەیەنیت، نادادپەروەری ناکات. ئەو وای نابینێت کە مرۆڤ نەتوانێت هەمیشە دادپەروەر بێت، لەم لایەنەوە تووڕە دەبێت.. تەواو وەک منداڵ، وەک منداڵ! دادپەروەرە، دادپەروەر.
- باشە، تۆ چیت بەسەر دێت؟
سۆنیا تەماشایەکی پرسیارئامێزی لێکرد:
ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:

- ئاخر، ئاخر، ئەوان بە تەنیا تۆیان هەیە، ڕاستە کە پێشتریش هەموو بارەکەی ئەوان بە کۆڵی تۆوە بووە. تەنانەت ئەو خوالێخۆشبووە بۆ خومارشکێنی هاتۆتە لای تۆ، باشە، ئەی ئێستا چۆن؟
سۆنیا بە خەمبارییەوە وتی:
- نازانم.
- ئەوان هەر لێرە دەمێننەوە؟
- نازانم، ئەوان قەرزاری خاوەن خانووەکەیانن، ئەمڕۆ گوێم لێبوو خاوەن ماڵەکەیان بە دەنگی بەرز دەیوت دەبێت بڕۆنە دەرەوە، کاترینا ئیڤانۆڤنایش دەڵێت لەوێ نامێنێتەوە.
- چۆن دەوێرێت ئەو قسەیە بکات؟ پشتی بە تۆ قایمە؟
لەپڕێکدا سۆنیا وەک کەنارییەک یان وەک باڵندەیەکی بچووک کە بێزار بووبێت، دیسانەوە نیگەران و تەنانەت ڕک گرتییەوە و وتی:
- ئاخ نا، قسەی وا مەکە.. ئێمە یەکێکین، ژیانێکی هاوبەشمان هەیە، لە ڕاستیشدا دەتوانێت چی بکات؟ دەتوانێت چی بکات؟ چی؟
سۆنیا هەر بەو گەرمی و تووڕەییەوە بەردەوام بوو لە پرسیارکردنەکە:
- ئەگەر بتزانیایە ئەمڕۆ چەند گریاوە! ئاوەزی تێک چووبوو. تۆ بەوەت نەزانیووە؟ بە ڕاستی تێک چووە، هەندێکجار وەک منداڵ نیگەرانی دایدەگرێت تا سبەینێ هەموو شتێک بە شێوەیەکی شایستە لە جێگای خۆیدا بێت، خۆراک تەواو بەش بکات و خوانەکان پڕ بن. جاری وایش هەیە دەستی هەڵدەگلۆفێت، خوێن هەڵدەهێنێتەوە، دەگری و لەپڕێکدا لەتاو نائومێدی سەری خۆی بە دیواردا دەکێشێت، پاشان جارێکی دی هێور دەبێتەوە، هومێدی بە تۆیە، دەڵێت ئێستا تۆ کۆمەکی دەکەیت. بۆ ئەوەی هەرچۆنێک بێت، لە شوێنێک هەندێ پارە

قەرز بکات و بڕواتەوە شارەکەی خۆی، ئێمەیش لەگەڵ خۆیدا ببات و لەوێ بۆ کچانی خێزانە خانەدانەکان قوتابخانە بکاتەوە و منیش بکاتە سەرپەرشتیاریان، ئەوسا ژیانێکی تازە و قەشەنگ دەست پێبکاتەوە. ماچم دەکات و لە ئامێزیم دەگرێ و دڵم دەداتەوە. لە ڕاستیشدا بڕوای بە هەموو ئەمانە هەیە. نازانیت چەندە بڕوای بە خەونەکانی خۆی هەیە! بۆ دەکرێت چەندوچوونی لەگەڵدا بکەیت؟ هەرگیز. بە درێژایی ڕۆژەکە خۆی سەرقاڵی پاکوخاوێنی و چاککردنی تابووتەکە بوو، تەنانەت بەو بێهێزییەی خۆیەوە تابووتەکەی ڕاکێشایە ژوورەوە و ئیتر خۆی کەوت. ئەمڕۆیش هەردووکمان چووین بۆ بازاڕ، تا پێڵاو بۆ پولیچکا و لینا بکڕین، چونکە پێڵاویان بە پێوە نەماوە، بەڵام پارەمان کەم پێبوو، زۆر کورتی هێنا.. ئەو پێڵاوی زۆر جوانی بۆ هەڵبژاردبوون، لەبەر ئەوەی، وەک خۆت دەزانیت، ئەو خاوەن سەلیقە و زەوقە. بۆیە هەر لەوێدا، لە دووکانەکەدا دایە پرمەی گریان، هەر لە بەردەم دوکاندارەکاندا، چونکە پارەی کەم پێبوو.. ئاخ، نازانیت دیمەنەکەی چەند کاریگەر بوو!

ڕاسکۆلنیکۆڤ زەردەخەنەیەکی تەوساویی هاتێ و وتی:

- چاکە، کەواتە ئاشکرایە تۆ مەبەستتە وا بژیت..

سۆنیا دیسانەوە هاواری لێهەستا:

- تۆ دڵت پێی ناسوتێت؟ بەزەییت پیا نایەتەوە؟ ئاخر تۆ، من دەزانم، دوافلسی خۆتت دایە، بەبێ ئەوەی هێشتا شتێک لەبارەیەوە بزانیت، خۆ ئەگەر هەموو شتێکت دەبینی و دەتزانی، ئەوسا، ئای خودایا! ئەگەر دەتزانی چەند جار من ئەوم کردۆتە گریان! هەر هەفتەی پێشوو، وای لە خۆم! تەنیا یەک هەفتە پێش ئەوەی باوکم بمرێت، من

چ کارێکی زاڵمانەم کرد! تا ئێستا چەند جارێک ئەو کارەم کردووە، کە ئێستا بیر لەو ڕۆژانە دەکەمەوە، خەم و ئازارێکی زۆرم تێدەگەڕێت.. سۆنیا لەتاو ئازاری ئەو یادەوەرییانە، وا پەنجەی هەڵدەگلۆفت دەتوت بەتەمای شکاندنیانە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:

- کەواتە تۆ دڵڕەقیت؟

سۆنیا بەدەم گریانەوە وتی:

- بەڵێ، من، من، من ئەو ڕۆژە هاتبووم بۆ سەردانیان، خوالێخۆشبوو پێی وتم: "سۆنیا، بۆم بخوێنەوە، نازانم بۆ سەرم دێشێت، بۆم بخوێنەوە.. وەرە، ئەمەیش کتێبەکە". نەمزانی کتێبەکە چی بوو، لە ئاندرێ سمیونوڤیچی وەرگرتبوو، واتا لە لیبێزیاتینکۆڤ، ئەو لێرە دەژی و کتێبی سەیر دێنێت. وتم: "دەبێت بڕۆم". نەمویست بیخوێنمەوە. من بۆیە سەرم دابوون تا یەخەکان پیشانی کاترینا ئیڤانۆڤنا بدەم. لیزاڤیتای دەلاڵ یەخە و سەردەستی جوان و تازەی هێنابوو، کە نەخشونیگاریان لەسەر بوو. کاترینا ئیڤانۆڤنا زۆر خۆشی لێیان هات. کردنی بە جلەکانییەوە و لە ئاوێنەدا تەماشای خۆی کرد و گەلێک پەسەندی بوو، وتی: "سۆنیا تکات لێدەکەم بیاندە بە من، پێمی ببەخشە". زۆری دڵ پێوە بوون، وەلێ بۆ ئێستا چی لێدەکردن؟ تەنیا ئەوەی هەبوو، کە یادی ڕۆژانی ڕابووردووی پێدەکردنەوە. لە ئاوێنەدا تەماشای خۆی دەکرد و سەری لە خۆی سووڕدەما، وەلێ ئەو کە هیچ بەرگێکی شیاوی نەبوو، چەند ساڵێکیشە هیچی نییە، هەرگیز داوای هیچی لە کەس نەکردووە. لووتبەرزە. ئەو زیاتر ئەوەی پێخۆشە کە شتی خۆی بە خەڵکی بدات. کەچی لەپڕێکدا داوای کرد، چونکە زۆری لا جوان بوون. منیش حەیفم لێهات ئەوانەی

بدەمێ و وتم: "تۆ تازە بۆ چیتە، کاترینا ئیڤانۆڤنا؟" بەڵێ وام پێوت: "تۆ تازە بۆ چیتە؟" نەدەبووایە ئەم قسەیەم بکردایە، لە تەماشاکردنەکەیدا دیار بوو وەڵامەکەم چەندە سەخت بووە. نازانیت ڕوانینەکەی چ خەم و کەسەرێکی تیابوو.. ئەو دڵی بۆ یەخەکان نەدەسووتا، ئەوەی لا ناخۆش بوو کە من بەو جۆرە وەڵامیم دابووەوە. من ئەمەم بە ئاشکرا بینی. ئاخ! خۆزگا توانیبام هەموو شتێکم بگێڕایەتە دواوە، هەموو ئەو شتەی کە ڕووی دابوون، دەمگۆڕین.. واتا ئەو قسانەی کە کردبووم.. هاوار لە خۆم.. بەڵام چی؟.. لای تۆ گشتی وەک یەکە و هیچ مەبەستت نییە!

ڕاسکۆلنیکۆڤ پرسی:

- تۆ لیزاڤێتای دەڵاڵت دەناسی؟

سۆنیا بە کەمێک سەرسووڕمانەوە وتی:

- بەڵێ.. ئەی تۆ نەتدەناسی؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ دوای کەمێک بێدەنگی بەبێ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەی بداتەوە، وتی:

- کاترینا ئیڤانۆڤنا نەخۆشیی سیلەکەی زۆر سەختە و بەم زوانە دەمرێت.

- ئاخ، نا،نا.

سۆنیا بێئاگا لە خۆی پەلاماری هەردوو دەستی ئەوی دا، وەک ئەوەی داوای لێبکات کە نابێت ئەوە ڕوو بدات.

- ئاخر ئەوە چاکترە کە بمرێت.

سۆنیا بە ترسێکی زۆرەوە و بەبێ ئەوەی بزانێت چی دەڵێت، دیسانەوە وتی:

- نا چاکتر نییە، بە هیچ جۆرێک چاکتر نییە.

- ئەی منالّەکان چۆن؟ ئەگەر نەیانهێنیتە لای خۆت، ئەی بۆ کوێیان دەبەیت؟
سۆنیا سەری خۆی نابووە نێوان هەردوو دەستیەوە و زۆر بە نائومێدیەوە هاواری کرد:
- ئاخ، نازانم!
دیار بوو ئەو بیرۆکەیەی تا ئێستا چەند جارێک بە بیردا هاتبوو، وەلێ ڕاسکۆلنیکۆڤ وا سەرلەنوێ تازەی کردەوە.
لاوەکە بێبەزەییانە جەختی دەکرد:
- باشە، ئەی ئەگەر تۆ پێش مردنی کاترینا ئیڤانۆڤنا نەخۆش بکەویت و بتبەن بۆ نەخۆشخانە، ئەوسا چی ڕوو دەدات؟
- ئاخ، تۆ چی دەڵێیت، چی دەڵێیت؟ ئەمەیان هەرنابێت.
لە تاوا دەموچاوی سۆنیا بە تەواوی تێک چوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ زەردەیەکی تەوساوی و بێبەزەییانەی هاتێ و لەسەری ڕۆشت:
- بۆ نابێت؟ بۆ بە ڕاستی تۆ گرنتیی ئەوەت داوە کە نەخۆش نەکەویت؟ ئەگەر ڕووی دا، ئەوان چییان بەسەر دێت؟ هەموویان دەکەونە ناو کۆڵانەکان، کاترینا ئیڤانۆڤنا دەکۆکێ و دەکەوێتە دەرۆزەکردن، وەک ئەمڕۆ سەری بە دیواردا دەکێشێت و منداڵەکانیش دەگرین.. پاشان دەکەوێت، دەیبەنە پۆلیسخانە و ئینجا بۆ نەخۆشخانە و لە دواییشدا دەمرێت، منداڵەکانیش..
- ئاخ نا، نا، خوا ئەوە ناکات.
ئەم وشانە لە سنگی گیراوی سۆنیاوە بە زەحمەت دەردەچوون.
زەبوونانە گوێی گرتبوو، وەک بلاڵێتەوە، دەستی نابوونە سەر یەک و

وا له ڕاسکۆلنیکۆڤی دەڕوانی، دەتوت هەموو شتێک بەوەوە بەستراوەتەوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستا و له ژوورەکەدا کەوتە هاتوچۆکردن، چرکەساتێک تێپەڕی، سۆنیا هەر وەستابوو، بە خەمێکی گەلێک زۆرەوە هەردوو دەستی بەردابووەوە و سەری داخستبوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە ناکاوێکدا بەرانبەر بە سۆنیا وەستا و پرسی:

- ناتوانیت پاشەکەوت بکەیت؟ بۆ ڕۆژانی ڕەش، نەوەکا؟!

سۆنیا لەبەر خۆیەوە وتی:

- نا.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تەوسەوە وتی:

- هەڵبەتە نا! بەڵام هەوڵت دا؟

- بەڵێ هەوڵم دا.

- نەگەیشتە ئەنجام! بێگومان وایە، هیچ پێویست بە پرسیار ناکات.

دیسانەوە لە ژوورەکەدا کەوتەوە هاتوچۆ، دەقیقەیەکی تر تێپەڕی.

- دیارە هەموو ڕۆژێک دەستکەوتت نییە؟

سۆنیا بە تەواوی شڵەژا و خوێن پەڕییە دەموچاوی، زۆری لە خۆی کرد و وتی:

- نا.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کتوپڕ وتی:

- بێگومان ئاییندەی پولیچکایش هەروا دەبێت.

- نا، نا، هەرگیز ئەوە نابێت.

دەنگی سۆنیا ئەوەندە بەرز و نائومێدانە بوو، دەتوت یەکێک بە چەقۆ بریندار کردووە:

- یەزدان.. یەزدان ڕێگە بەم جۆرە بەدبەختییە نادات.

- ڕێگە بە کەسانی تر دەدات.
سۆنیا هەر لەبەر خۆیەوە دووبارەی دەکردەوە:
- نا، نا، خودا پشتیوانی لەو دەکات، خودای گەورە!
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە جۆرە ڕەقییەکەوە وتی:
- ڕەنگە خوا هەر لەئارادا نەبێت.
پاشان پێکەنی و چاوی تێبڕی.
لەپڕێکدا دەموچاوی سۆنیا بە تەواوی گۆڕا، ڕوومەتی کەوتە پلدان. ئینجا بە سەرکۆنەکردنێکی بێسنوورەوە تەماشای ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد. دەیویست بدوێت، وەلێ نەیتوانی وشەیەک چییە بدرکێنێت. تەنیا ئەوە نەبێت کە لەپڕا دایە پڕمەی گریان و دەموچاوی لە نێو هەردوو دەستیدا شاردەوە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ دوای کەمێک بێدەنگی وتی:
- تۆ دەڵێیت کاترینا ئیڤانۆڤنا ئەقڵی لەدەست داوە، خۆیشت هەروات بەسەر هاتووە.
پێنج دەقیقە تێپەڕی، ڕاسکۆلنیکۆڤ بەبێ ئەوەی تەماشای سۆنیا بکات، هەر لە ناو ژوورەکەدا هاتوچۆی بوو، لە دواییدا لێی نزیک بووەوە، چاوی ڕاسکۆلنیکۆڤ لە درەوشانەوە نەدەکەوت، بە هەردوو دەستی شانی گرت و ڕێک لە دەموچاوە گریاناوییەکەی ڕاما، ڕوانینەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ وشک و ئاگراوی و تیژ بوو، لێویشی توند دەلەرزین.. لەناکاودا زۆر خێرا چەمایەوە، چۆکی دادایە سەر زەوییەکە و قاچی سۆنیای ماچ کرد. سۆنیا زۆر پەشۆکا، وەک لە شتێک دوور بکەوێتەوە، خۆی لێ لادا، لە ڕاستیشدا ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تەواوی وەک شێت دەهاتە بەرچاو، کچە بە ڕەنگی پەڕیووەوە، لە کاتێکدا کە دڵی تەواو گوشرا بوو، کەوتە ورتەورت:

- تۆ چیتە؟ چی دەکەیت؟ بەرانبەر بە من!..
ڕاسکۆلنیکۆڤ زوو لەسەر زەوییەکە ڕاست بووەوە. بەرەو لای پەنجەرەکە ڕۆیشت و بە ئاوازێکی تایبەتیەوە وتی:
- من کڕنووشم بۆ تۆ نەبردووە، بەڵکو و کڕنووشم بۆ تەواوی ئازارەکانی مرۆڤایەتی بردووە.
پاشان گەڕایەوە لای و لەسەر قسەکانی ڕۆشت:
- گوێ بگرە، کەمێک لەمەوبەر، بە کەسێکم گوت کە سووکایەتی پێکردبووم، گوتم ئەو قیمەتی پەنجەچکۆڵەی تۆی نییە.. ئەمڕۆ، کاتێک کە خوشکمم لە پاڵ تۆدا دانا، شانازییەکی گەورەبوو بۆ ئەو.
سۆنیا بە ترسەوە هاواری کرد:
- ئاخ، ئەوە تۆ چیت وت؟ ئەمەت لە بەردەم خوشکتا وت؟ دانیشتن لە پاڵ مندا شانازیە! ئاخر من.. بێئابڕووم.. ئاخ، چیت وت!
لاوەکە بە دەنگێکی تا ڕادەیەک شیاوەوە وتی:
- من لەبەر بێئابڕوویی و گوناهت ئەوەم نەوتووە، بەڵکو لەبەر ئەو ئازار و ڕەنجە زۆرەیە کە دەیکێشیت، گومان لەوەدا نییە کە تۆ گوناهبارێکی گەورەیت، ئەمەیش بەتایبەتی لەوەوە هاتووە، کە تۆ بێهودە خۆت کردە قوربانی و ناپاکیت لەگەڵ خۆتا کرد، هەڵبەتە ئەمە حاڵەتێکی ترسناکە، جا چۆن ترسناک نەبێت کاتێک تۆ لە زەلکاوێکدا دەژیت، کە خۆت نەفرەتی لێدەکەیت، لە کاتێکدا دەزانیت (تەنیا بە چاوکردنەوەیەک) کە بەم کارەت یارمەتی کەس نادەیت و کەسیش لە هیچ ڕزگار ناکەیت! ئاخر، پێم بڵێ..
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە هەڵچوونەوە وتی:
- چۆن ئەم بێئابڕوویی و لە ڕێدەرچوونە لەگەڵ پیرۆزترین هەستوسۆزی تۆدا کە پێچەوانەیەتی، لە وجودی تۆدا کۆ بوونەتەوە؟

ئاخر زۆر دادپەروەرانەتر دەبێت، هەزار جار چاکتر و ئاقڵانەتر دەبێت ئەگەر بەسەردا خۆت فڕێ بدەیتە ئاوێکەوە و بۆ هەتا هەتایە کۆتایی بە هەموو شتێک بهێنیت!
سۆنیا لە کاتێکدا کە بە قەهرەوە لێی دەڕوانی و دەتوت هیچ سەیری بە پێشنیازەکەی ئەو نەهاتووە، بە دەنگێکی نزم پرسی:
- باشە ئەگەر ئەمە بکەم، ئەوان چییان بەسەر دێت؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ تەماشایەکی سەیری کرد و بە ڕوانینێک لە هەموو شتێک تێگەیشت: گومان لەوەدا نەبوو کە ئەو بیرۆکەیە بە ڕاستی بە مێشکی ئەویشدا تێپەڕیووە، ڕەنگە دڵکارانە و چەند جارێک لە کاتی نائومێدیدا کەوتبێتە دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەک بۆ ئەوەی بەیەکجاری کۆتایی بەو کارە بێنێت، هەر لەبەر ئەوەیش بوو کە پێشنیازەکەی ئێستای ڕاسکۆلنیکۆڤ زۆر سەرسامی نەکردبوو، تەنانەت گوێی بە قسە ڕەقەکانیشی نەدا، (سەرکۆنەکردن و دیدی تایبەتی ڕاسکۆلنیکۆڤ دەربارەی بێئابڕوویی ئەو هێشتا بێمانا مابووەوە و تێی نەدەگەیشت، ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەمەی دەزانی) بەڵام ڕاسکۆلنیکۆڤ دەرکی تەواوی ئەوەی کردبوو کە دەمێک بوو سۆنیا هەستی بێئابڕوویی و بێشەرەفی ببووە ئازارێکی سەخت و بە ڕیشەیدا ڕۆ چووبوو. لەگەڵ خۆیدا دوا:
"باشە چ شتێک، چی ڕێگەی ئەوەی لێگرتووە کە بڕیار بدات و بە تەواوی خۆی ڕزگار بکات؟" لەو چرکەساتەدا ئەوەی زانی کە ئەو منداڵە هەژار و هەتیووە سەروپێچکانە و خودی کاترینا ئیڤانۆڤنا، ئەو ژنە نیوەشێت و سیلاوییەی سەری خۆی بە دیواردا دەکێشا، تا چ ڕادەیەک جێی بایەخ و نرخپێدانی سۆنیان.

لەگەڵ ئەمانەیشدا ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەوەی لا ڕوون بوو، کە سۆنیا بەو خوو و ڕەوشت و کەمەزانینەوە کە هەیەتی، بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی لەم حاڵەی ئێستایدا بمێنێتەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەو پرسیارێکی هەر لا مابووەوە کە ئەگەر سۆنیا ئەوەندە بوێر و ئازا نەبووە خۆی فڕێ بداتە ناو ئاوێکەوە تا بخنکێ، ئەی چۆن توانیویەتی لە هەموو ئەم ماوەیەدا هەر ئاوا بمێنێتەوە و شێت نەبێت؟ بێگومان ئەوە دەزانێت کە حاڵەتەکەی سۆنیا دیاردەیەکی ڕێکەوتی ناو کۆمەڵگایە، بەڵام بەداخەوە بە هیچ جۆرێک نە ئاوارتەیە و نە دەگمەن. وەلێ ئەو ڕێکەوتە و ئەو پەروەردە کەمەی کە سۆنیا هەیبوو، لەگەڵ گشت ژیانی ڕابووردوویدا، ئەوەیان دەسەلماند کە لەگەڵ یەکەم هەنگاوی ئەو ڕێگە ڕسوا و نەفرەتلێکراوەدا، دەبوو سۆنیا لەناو بچێت و نەمێنێت. کەواتە چ شتێک لەسەر ئەو ڕێگەیە هێشتوویەتەوە؟ ئەو خۆی بێئابڕوو نەبوو، ئاشکرا بوو کە هەموو ئەو ڕسواییە تەنیا بە ڕووکەش داوێنگیری بووە، ئەگینا سووکی و ڕسوایی تەواو و ڕاستیی هێشتا بە ئەندازەی گەردیلەیەک نەگەیشتبووە ناو دڵی. ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەمەی بە چاکی دەبینی. کچە بەبێ هیچ پەردەیەک، وەک خۆی لە بەرانبەریدا وەستابوو. ڕاسکۆلنیکۆڤیش بیری دەکردەوە: "ئەو سێ ڕێگەی لەبەرە: یان خۆی لە ئاودا بخنکێنێت، یان شێت بێت و بکەوێتە شێتخانە، یان.. یان بە تەواویی خۆی بۆ ئەو ڕسواییە تەرخان بکات. ڕسواییەک ئەقڵ دەکاتە تاریکستان و دڵیش بە بەرد". ئەمەی دوایی لای ڕاسکۆلنیکۆڤ لە دوانەکەی دی بەد و ناقۆڵاتر بوو، وەلێ بەدگومانیش بوو. لەبەر ئەوەی ڕاسکۆلنیکۆڤ گەنج و لە زۆر شت دابڕاو و دڵڕەق بوو. بۆیە نەیتوانی بڕوا بەوە

نەکات کە ڕێگەی سێیەم، واتا مانەوە لەسەر بێئابڕوویی لە هەموو ئەوانی دی زیاتر چاوەڕێ دەکرا.
لە دڵی خۆیدا ناڵاندی: "ئایا لەواقیعدا ئەمانە ڕاستن؟ ئایا ئەم بوونەوەرە کە تاکو ئێستا پاکیزەیی ڕۆحی خۆی پاراستووە، بەوەی زانیووە یان هەستی پێکردووە چۆن کێشراوەتە ناو زەلکاوێکی ئاوا پۆخڵ و بۆگەنەوە! ئایا ئەو چوونە ناو زەلکاوەوە بە ڕاستی ڕووی داوە؟ ئایا توانیویەتی لە ناو ئەو زەلکاوە پیسەدا بمێنێتەوە و ڕسواییەکەی بەهەند وەرنەگرێت؟"
هەر بەو جۆرەی کە کەمێک لەمەوبەر سۆنیا هەڵوێستی نواند، ڕاسکۆلنیکۆڤیش وای بە بیردا هات: "نا، نا، هەرگیز ئەوە نابێت، نا، تا ئێستا بۆیە سۆنیا خۆی نەکوشتووە یان خۆی نەداوەتە دەم ئاوەوە، چونکە کارەکە بە تاوان دەزانێت و لەبەر خاتری ئەوانیش.. کە تا ئێستایش شێت نەبووە.. بەڵام کێ دەڵێت شێت نەبووە؟ بۆ ئەو دەتوانێت داوەری ڕاستودروست بکات؟ بۆ دەکرێت وەک ئەوەی ئەو دەیڵێت، کەسی تر هەبێت وای بڵێت؟ تەنانەت ئەوانەیش کە ئەقڵیان تەواوە، دەتوانن وەک ئەو داوەری بکەن؟ ئایا دەبێت ئەو لە پەنا هەڵدێرێکدا کە مەرگی لە دوایە، یان لەسەر زەلکاوێکی بۆگەندا کە دەیەوێت وردەوردە لە خۆیدا نقومی بکات، دابنیشێ، کە ئاگاداری مەترسییەکەی بکەن دەستی ڕاوەشێنێت و گوێی خۆی بگرێت؟ بە ڕاستی دەکرێت چاوەڕێی موجیزەیەک بێت؟ بێگومان هەروایە، بەڵام ئایا هەموو ئەمانە نیشانەی شێتی نین؟"
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەر ئەم بیرۆکەیە وەستا و جەختی لێکرد. بە لایەوە ئەم ئەنجامە لە هەموو ئەوانی دی ڕاستترە. زۆر بە وردی لە سۆنیا ڕامایەوە و پرسی:

- سۆنیا، تۆ زۆر لە خودا دەپاڕێیتەوە؟
سۆنیا بێدەنگ بوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ لە پاڵیا وەستا و چاوەڕێی وەڵام بوو.
لەپڕێکدا سۆنیا چاوە درەوشاوەکانی تێبڕی، دەستی ڕاسکۆلنیکۆڤی لە ناو دەستی خۆیدا گوشی و بە توانایەکی تایبەتییەوە کەوتە ورتەورت:
- ئاخر، بەبێ خوداوەند من چی بووم؟
لاوەکە بە خۆی وت: "هەر ئەوەیە کە من بیرم لێدەکردەوە".
پاشان بۆ زانیاریی زۆرتر لێی پرسی:
- خوا لە پاداشتی ئەوەدا چیت بۆ دەکات؟
سۆنیا ماوەیەک وەستا، وەک بڵێی توانای وەڵامدانەوەی نەبێت، سنگە لەڕولاوازەکەی لەتاوا هاتبووە لەرزین، پاشان بە نیگایەکی تووڕەوە لە لاوەکەی ڕوانی و بە دەنگی بەرز پێی وت:
- بێدەنگ بە، ئیدی هیچم لێمەپرسە، تۆ شایانی ئەوەنیت..
ڕاسکۆلنیکۆڤ سوور بوو لەسەر ئەوەی کە: "هەر ئەوەیە، هەر ئەوەیە کە خۆم وتم".
سۆنیا دیسانەوە چاوی داخست و لەبەر خۆیەوە وتی:
- خوا دەتوانێت هەموو شتێک بکات.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە گەرمییەکی زۆرەوە کەوتە تەماشاکردنی و گەیشتە ئەو بڕیارە: "ئەمەیە ئەنجام و هۆکارەکانی".
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە هەستێکی تازە و سۆزێکی تا ڕادەیەک بیمارانەوە، لە دەموچاوە لاواز و باریک و شێواوەکەی سۆنیا ورد بووەوە. بەو چاوە شین و شەرمەندانەوە کە دەیانتوانی بەو بڵێسە و هەستە دڵگیر و توانایەوە بدرەوشێنەوە، لەو جەستە بچووکەی ڕوانی، کە هێشتا لە

داخ و تووڕەییدا دەلەرزی. تەماشای ئەمانەی دەکرد و لە دیدی خۆیدا وای دەبینی کە هەموو ئەم حاڵەتە سەیر و سەرسووڕهێنەرانە تا ڕادەیەک بەدیهاتنیان مەحاڵە، بۆیە هەر لە دڵی خۆیدا دەیوت: "ئەم کچە تێک چوە، شێتە!"
کتێبێک لەسەر مێزەکە بوو، کە ڕاسکۆلنیکۆڤ لە ژوورەکەدا دەگەڕا، هەموو جارێک کتێبەکەی دەبینی. وەلێ ئەمجارەیان هەڵی گرت و تەماشای کرد. کتێبەکە "ئینجیل" بوو بە زمانی ڕووسی. کتێبێکی کۆن و دڕاوی بەرگتێگیراو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەو جێگایەوە کە وەستابوو بەرەو ئەو لایەی تری ژوورەکە کە سۆنیای لێبوو، بە دەنگی بەرز پرسیاری لێکرد:
- ئەم کتێبە لە کوێوە هاتووە؟
سۆنیا هەر لە شوێنەکەی خۆیەوە، سێ هەنگاو لەولای مێزەکەوە وەستابوو، بەبێ ئەوەی تەماشای لاوەکە بکات، بە دەنگێکەوە کە وات دەزانێ بەبێ ئارەزووی خۆی دەیڵێت. وەڵامی دایەوە:
- بۆیان هێناوم.
- کێ بۆی هێناویت؟
- لیزاڤێتا بۆی هێنام، داوام لێکردبوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری کردەوە: "لیزاڤێتا! زۆر سەیرە!" هەموو شتەکانی لای سۆنیا تا دەهات سەیر و سەمەرەتر دەهاتنە بەرچاو. لاوەکە کتێبەکەی لە مۆمەکە نزیک خستەوە، پەڕەکانی هەڵدایەوە و لەپڕا پرسی:
- باسی ئیلیازر لە کوێدایە؟
سۆنیا سەخت لە زەوییەکەی دەڕوانی و وەڵامی نەبوو، نزیک بە مێزەکە وەستابوو.

- ڕاستبوونەوەی ئیلیازر لە کوێدایە؟ سۆنیا، دەی پیشانم بدە.
کچەکە دزە چاوێکی تێگرت و بەبێ ئەوەی بچێتە لایەوە، بە دەنگێکی سارد و دڵکارانەوە وتی:
- لێرەدا نییە.. لە بەشی چوارەمی ئینجیلدایە.
- بۆم بگەڕێ و بۆمی بخوێنەوە.
لەگەڵ ئەو وتەیەیدا ڕاسکۆلنیکۆڤ دانیشت و پاڵی بە مێزەکەوە دا، سەری نایە سەر دەستی، چاوی تووڕەی لە سووچێک بڕی و ئامادەی گوێگرتن بوو. پاشان لەگەڵ خۆیدا دوا: "سێ هەفتەی تر لە شێتخانەم، ئەگەر لە جێگایەکی خراپتر نەبم".
سۆنیا کە ئاگای لە بێباوەڕیی ڕاسکۆلنیکۆڤ و ئەم داوا تازەیەی بوو، بە دوودڵییەوە لە مێزەکە نزیک کەوتەوە و کتێبەکەی بە دەستەوە گرت.
پاشان لەوبەری مێزەکەوە لەژێرەوە تەماشایەکی لاوەکەی کرد و وتی:
- بۆ تۆ نەتخوێندۆتەوە؟
وردەوردە دەنگی سەخت و سەختتر دەبوو.
- دەمێکە خوێندومەتەوە.. لەکاتی قوتابییەتیمدا، دەی بۆم بخوێنەرەوە.
- لە کڵێسایشدا گوێت لێنەبووە؟
- بۆ ئەوێ نەدەچووم، ئەی تۆ، زۆر دەڕۆیتە کڵێسا؟
سۆنیا لەبەر خۆیەوە:
- نـ. نا.
ڕاسکۆلنیکۆڤ زەردەیەکی هاتێ:
- تێدەگەم.. کەواتە وا پێدەچێت.. بەیانی نەڕۆیت بۆ بەخاکسپاردنی باوکت؟

- دەڕۆم، هەفتەیەک لەمەوبەرییش هەرلەوێ بووم.. ڕێوڕەسمم بەجێهێنا و دوعام کرد.
- بۆ کێ؟
- بۆ لیزاڤێتا، ئەویان بە تەور کوشتبوو.
تا دەهات دەماری ڕاسکۆلنیکۆڤ گرژتر دەبوو، کەم کەم کەوتە سەرەگێژە.
- تۆ هاوڕێی لیزاڤێتا بوویت؟
- بەڵێ.. ژنێکی ڕاست بوو.. دەهاتە ئێرە.. زۆر کەم.. نەیدەپەرژا.. پێکەوە شتمان دەخوێندەوە و.. قسەمان دەکرد، خودا بە چاوی خۆی دەبینێت[1].
ئەم وشانەی ناو کتێب سەری ڕاسکۆلنیکۆڤیان بەسووڕ هێنا. مەسەلەیەکی تریش، دیدارە نهێنییەکانی سۆنیا لەگەڵ لیزاڤێتادا.. هەردووکیان دێوانە و دەمارگیر.. بیری کردەوە "مرۆڤ لێرەدا شێت دەبێت، پەتایە". بە تووڕەیی و پێداگرتنەوە هاواری لێهەستا:
- بخوێنە.
سۆنیا هەر دوودڵ بوو، دڵی توند لێی دەدا، پێدەچوو نەوێرێت بۆی بخوێنێتەوە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ تا ڕادەیەک هاودەردیی دەکرد، لێی دەڕوانی و بە خۆی دەوت: "ئای شێتی بەدبەخت".
سۆنیا لەسەرخۆ وەک دەنگی گیرا بێت، لێی پرسی:
- تۆ چیت دەوێت؟ تۆ بێباوەڕیت؟

---

[1] خودا دەبینێت" ئاماژەیە بۆ ئایەتێکی ئینجیلی مەتتا کە دەڵێت: "خۆزگە بە پاکیزەکان، چونکە ئەوان خودا دەبینن" (ئیسحاحی پێنج).

ڕاسکۆلنیکۆڤ پێی بە زەویدا کێشا:
- بخوێنە، من پێم خۆشە، ئەی بۆ لیزاڤێتات نەدەخوێندەوە؟
سۆنیا کتێبەکەی کردەوە و ئەو شوێنەی دۆزیەوە، دەستی دەلەرزی، دەنگی نزم بوو، دووجار ویستی بخوێنێتەوە، وەلێ یەکەم وشەی بۆ نەوترا، سەرئەنجام دوای هەوڵێکی زۆر دەستی پێکرد: "... یەکێک بە ناوی ئیلیازرەوە نەخۆش بوو.." لەپڕێکدا لە وشەی سێیەمدا دەنگی زایەڵەیەکی تایبەتی تێکەوت و بڕا. وەک تەلێک زۆر ڕاکێشرابێت. هەناسەی لێبڕا و سنگی کرخ بوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ تا ڕادەیەک دەیزانی بۆ سۆنیا ناوێرێت بۆی بخوێنێتەوە، هەرچەندە ئەمەی زۆر چاک دەزانی کەچی زیاتر و زیاتریش بە ڕک و تووڕەییەوە جەختی خوێندنەوەی لە سۆنیا دەکرد. زۆرباش دەیزانی بۆ سۆنیا ئەوەندەی لا زەحمەت و دژوارە کە لایەنی دەروونی خۆی دەربخات. زانی کە ئەم دیاردەیە، چ لە ئێستا و چ لە ڕابووردوودا، بەشێک لە ژیانی ئەوی پێک هێناوە، ڕەنگە هەر لە کچۆڵایەتییەوە، واتا لەو کاتەوەی کە سۆنیا لە ناو خێزانەکەیدا و لە پاڵ باوکە نەگبەتەکەی و باوەژنە غەمگین و دێوانەکەی دەستی ڕۆژگار لە نێو منداڵی برسی و هەراوزەنا و سەرکۆنەی دزێودا دەژیا، ڕەگی تیا داکوتابێت. بەڵام لە هەمان کاتدا لەوە گەیشت و تەواو دڵنیا بوو، کە هەرچەندە لە کاتی خوێندنەوەدا، سۆنیا ئازاری دەچەشت و دەتوت ترسی شتێکی هەیە، کەچی لەگەڵ ئەمانەیشدا و لەگەڵ ئەو هەموو غەم و خەفەتەدا کە هەیبوو، سۆنیا بە ئارەزوویەکی پڕ و دەردناکەوە دەیویست ئینجیلەکە بخوێنێتەوە و بەتایبەتیش بۆ ئەوی بخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی گوێی لێبێت. بێگومان هەر ئێستایش، "ئیتر چی دەبێت با ببێت".

ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەمانەی لە چاوی سۆنیا و لە پەشۆکانەکەیدا دەخوێندەوە..
سۆنیا بەسەر خۆیدا زاڵ بوو، گیرانی گەرووی لە کاتی یەکەم خوێندنەوەی ئایەتەکاندا وەلا نا و کەوتە خوێندنەوەی فەسڵی یانزەهەمی ئینجیلی یوحەنا، تا گەیشتە ئایەتی نۆزدەهەمین:
.."گەلێک لە جوولەکەکان هاتبوونە لای مرتا و مریەم بۆ ئەوەی پرسە و سەرەخۆشیی مەرگی براکەیانی لێبکەن، کە مرتا بیستی مەسیح دێت، بۆ پێشوازیلێکردنی ڕۆیشت و مریەم لە ماڵدا مایەوە، مرتا بە مەسیحی وت: بەڕێز. ئەگەر تۆ لێرە بوویتایە، براکەم نەدەمرد، بەڵام ئێستایش هەر ئەوە دەزانم کە تۆ چی لە خودا بخوازیت، خودا پێتی دەبەخشێت".
لێرەدا، سۆنیا وەستا، چونکە هەم شەرم دایگرتبوو، هەم دەنگی دەلەرزی و دەیبڕی، پاشان دەستی پێکردەوە:
.."عیسا وتی: براکەت هەڵدەستێتەوە. مرتا وتی: دەزانم، لە قیامەتدا، لە ڕۆژی دواییدا هەڵدەستێتەوە. عیسا وتی: من خۆم ڕۆژی دوایی و ژیانم، هەر کەس بڕوا بە من بێنێت، ئەگەر مردوویش بێت، زیندوو دەبێتەوە، هەر کەسێکیش زیندوو بێت و بڕوا بە من بێنێت، هەرگیز نامرێت. ئایا تۆ بڕوات بەمە هەیە؟" ژنە وتی: (لێرەدا سۆنیا بە زەحمەت و ناخۆشییەوە هەناسەی تازە کردەوە، هەر وشەیەکی بە توانا و بە ڕوونی وەک لە ناو خەڵکیدا دان بە گوناهی خۆیدا بنێت، دەستی کردەوە بە خوێندنەوە). "مرتا وتی، بەڵێ گەورەم، من بڕوادارم، تۆ مەسیحی کوڕی خودایت کە ڕەوانەی دنیا کراویت".
سۆنیا چرکەیەک وەستا و ویستی سەیری ڕاسکۆلنیکۆڤ بکات. وەلێ خێرا خۆی گرتەوە و کەوتەوە خوێندنەوە. ڕاسکۆلنیکۆڤ بێجووڵە

دانیشتبوو، بەبێ ئەوەی ڕوو وەربگێڕێت، لە کاتێکدا کە پاڵی بە مێزەکەوە دابوو، لە سووچێکی دەڕوانی و گوێی تەکاندبوو، تا گەیشتە ئایەتی سیودوو.

"مریەم کە گەیشتە ئەو شوێنەی عیسای لێبوو، بەسەر قاچیدا کەوت و پێی وت: "گەورەم، ئەگەر لێرە بوویتایە، براکەم نەدەمرد". عیسا کە بەو گریانەوە ئەوی بینی و جوولەکەکانیش کە لەگەڵیدا هاتبوون، گیانی هاتە جۆشوخرۆش و وتی: لە کوێ داتانناوە؟ وتیان: بەڕێز، وەرە و تەماشای بکە. عیسا گریا، جوولەکەکان وتیان، بڕوانن چەندی خۆش ویستووە. هەندێکیشیان وتیان: ئەمەی کە کوێری چاک دەکردەوە، نەیتوانی فەرمانی نەمردنی ئەم پیاوە بدات؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ گەڕایەوە لای سۆنیا و بە شپرزەیی لێی ڕوانی: بەڵێ، هەر وایە! بە ڕاستییش سۆنیا هەموو لەشی کەوتبووە لەرزین و موچرکی پێدا دەهات. ڕاسکۆلنیکۆڤ چاوەڕێی ئەمە بوو، سۆنیا لە خوێندنەوەکەیدا لەو چیرۆکە نزیک دەکەوتەوە، کە مانای موجیزەیەکی گەورە و بێوێنەی لەخۆ گرتبوو. هەستی سەرکەوتنێکی مەزن دایگرتبوو. لەرینەوەی دەنگی لە زرنگانەوەی کانزایەک دەچوو، خۆشی و سەرووەرییەکی لێهەڵدەستا کە توانایەکی تایبەتی پێدەبەخشی. دەتوت دێڕەکانی پێشچاوی تێک دەچرژێن، چونکە بەرچاوی ڕەش دەبوو، وەلێ ئەوەی دەیخوێندەوە، لەبەری بوو، لە دوائایەتدا: "ئەو کەسەی توانی چاوی کوێر چاک بکاتەوە.." سۆنیا دەنگی نزم کرد، زۆر بە گەرمی بەرجەستەی گومان و سەرزەنشتی ئەو کەسە بێبڕوا و ئەو جوولەکە کوێرانەی کرد، کە هەر ئێستا، واتا لە دوای ئەو چرکەساتەوە، وەک ئەوانەی هەورە تریشقە لێیان دەدات، دەکەونە سەر زەوی، دەگرین و ئیمان دەهێنن. سۆنیا حەزی دەکرد

که "ئەو، ئەوی نابینا و بیبڕوا، ئێستا گوێی لێبێت.. و بڕوا بێنێت، بەڵێ، بەڵێ، هەر ئێستا، هەر ئێستا وای لێبێت.. سۆنیا لە خۆشی ئەم چاوەڕوانییەدا هەموو گیانی دەلەرزی. "عیسایش کە لە خۆیدا گەلێک بێزرابوو، هاتە نزیک گۆڕەکەوە. گۆڕەکە ئەشکەوتێکی چکۆڵە بوو بەردێکی نرا بووە سەر، عیسا وتی: بەردەکە لادەن، مرتای خوشکی مردووەکە وتی: گەورەم، ئێستا ئەو بۆنی کردووە، چونکە چوار ڕۆژە نێژراوە".
سۆنیا زیاتر دانی بە وشەی چوارەکەدا نا و کەوتەوە خوێندنەوە: "عیسایش وتی: بۆ پێم نەوتیت، ئەگەر بڕوا بێنیت، شکۆمەندی خوداوەند دەبینیت؟ پاشان بەردەکەیان لەسەر کونەکە لابرد، عیسا چاوی لە ئاسمان بڕی و وتی: باوکە لێ، سوپاست دەکەم کە گوێت لێگرتم، دەمزانی تۆ هەمیشە گوێ لە قسەم دەگریت، بەڵام لەبەر خاتری ئەمانەی لێرەن ئەمەم وت بۆ ئەوەی بڕوا بهێنن کە من ڕەوانەکراوی لای تۆم. کە عیسا ئەمەی وت، بە دەنگی بەرز هاواری کرد: ئیلیازر، وەرە دەرەوە. ڕاست مردووەکە هاتە دەرێ.."
(سۆنیا لە کاتێکدا کە گیانی دەلەرزی و موچرکی پێدا دەهات، بە خۆشی و سەرکەوتنەوە وشەکانی خوێندەوە، دەتوت ئەوەی کە دەیخوێنێتەوە، بە چاویش دەیبینێت).
..."دەستوپێی لە کفنەوە پێچرابوون و دەموچاویشی بە دەسماڵێک. عیسا پێی وتن: بیکەنەوە تا بڕوات".
"گەلێک لەو جوولەکانەی لەگەڵ مریەمدا هاتبوون، کە کارەکەی عیسایان بینی، باوەڕیان پێهێنا".

سۆنیا لەوە زیاتر چی تری نەخوێندەوە و نەیشیدەتوانی بیخوێنێتەوە، ئینجیلەکەی داخست و خێرا لەسەر کورسییەکە هەستا. بە چەند وشەیەکی دابڕدابڕ و دڵکارانە کەوتە ورتەورت:

- هەستانەوەی ئیلیازر تەواو بوو.

سۆنیا بێجووڵە، ڕووی وەرگێڕابوو، وەستا، وەک ئەوەی نەوێرێت، یان شەرم لە ڕوانینی ڕاسکۆلنیکۆڤ بکات، وابوو، هێشتا هەر دەلەرزی، مۆمی ناو مۆمدانەکە لە کۆتاییدا بوو، لەو ژوورە هەژارانەیەدا، هێشتا ڕووناکی دەدایە سەر بکوژێک و سۆزانییەک کە بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش و سەیر لە دەوری کتێبی نەمر کۆببوونەوە. پێنج دەقیقە یان زیاتر تێپەڕی. لەپڕا ڕاسکۆلنیکۆڤ ناوچاوی پێکدا دا و لە سۆنیا نزیک کەوتەوە، بە دەنگی بەرز وتی:

- من هاتووم لەبارەی کارێکەوە لەگەڵتا بدوێم.

کچە بێدەنگ چاوی تێبڕی، ڕوانینەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ گەلێک وشک و هیچ مانایەکی تیا نەدەبینرا، وتی:

- ئەمڕۆ من وازم لە کەسوکارم هێنا، دایکم و خوشکم، من ئیدی ناگەڕێمەوە بۆ لایان، بە تەواویی پەیوەندیم لەگەڵیاندا بڕی.

سۆنیا بە سەرسامییەوە پرسی:

- بۆ؟

ئەو دیمانەیەی کەمێک لەوەوبەر لەگەڵ دایک و خوشکی ڕاسکۆلنیکۆڤدا کردبووی، کاریگەرییەکی هێند لەڕادەبەدەری لەسەر دانابوو، کە خۆیشی نەیدەتوانی دیاریی بکات. بۆیە هەواڵی ئەو پەیوەندیبڕینەی زۆر بە لاوە سەیر بوو.

لاوەکە لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

- ئێستا من هەر تۆم هەیە.. وەرە با پێکەوە بڕۆین، من هاتوومەتە لات، ئێمە هەردووکمان نەفرەتلێکراوین، وەرە با پێکەوە بڕۆین.
چاوی ڕاسکۆلنیکۆڤ دەبریسکایەوە و سۆنیا لەگەڵ خۆیدا کەوتە قسە: "بەڕاست هەر لە شێت دەچێت!" پاشان هەنگاوێکی بۆ دواوە نا و بە ترسەوە وتی:
- بۆ کوێ بچین؟
- من چوزانم؟ تەنیا ئەوەندە دەزانم کە من و تۆ یەک ڕێگەمان هەیە، لەمە تەواو دڵنیام و هیچی دی، هاوئامانجیشین.
سۆنیا لێی دەڕوانی و لە هیچ تێنەدەگەیشت، تەنیا ئەوەی دەزانی کە ڕاسکۆلنیکۆڤ گەلێک داماوە و ئەوپەڕی بەدبەختە.
لاوەکە بەردەوام بوو:
- هیچ کامێک لەوانە ناتوانێت لە تۆ تێبگات، تەنانەت ئەگەر زۆر هەوڵی تێگەیاندنیشیان بدەیت. بەڵام من لێت گەیشتووم، پێویستم پێتە و هەر لەبەر ئەمەیش هاتوومەتە لات.
سۆنیا لەبەر خۆیەوە وتی:
- تێناگەم..
- دوایی تێدەگەیت، بۆ تۆیش وەک منت نەکردووە؟ تۆیش لە یاسا دەرچوویت و.. توانیشیت پێشێلی بکەیت، تۆ خۆت کوشتووە، ژیانی خۆتت داوە بە ئاودا، ژیانی خۆت.. وەلێ جیاوازیی نییە.. تۆ دەتتوانی بە ئەقڵ و ڕۆحت بژیت، وەلێ ئەنجامت بەرەو مەیدانی سەننایە، بەڵام تۆ بەرگە ناگریت، ئەگەر بە تەنیایش بمێنیتەوە شێت دەبیت.. منیش هەروا، تۆ ئێستا لەوە دەچیت ئەقڵت لەدەست دابێت، کەواتە بۆ بڕیار نەدەین، دەبێت پێکەوە بە ڕێگەیەکدا بڕۆین. با بڕۆین.

سۆنیا کە لە قسەکانی ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تەواویی سەراسیمە ببوو و وتی:

- بۆ، تۆ بۆ وا دەڵێیت؟

- بۆ؟ لەبەر ئەوەی نابێت هەر ئاوا بمێنێتەوە، لەبەر ئەمە، ئاخر دەبێت دڵکارانە و بە دیدێکی کراوەوە بڕیار بدەیت و چارەیەک بدۆزیتەوە، نەک وەک منداڵ بگریت و هاوار بکەیت کە خودا ناهێڵێت، باشە، ئەگەر بەیانی تۆیان برد بۆ خەستەخانە، چی دەبێت؟ ئەوی تر کە ئاوەزی ناجۆرە و نەخۆشی سیلی لەگەڵدایە و بەم زووانە دەمرێت، ئەی منداڵەکان چۆن؟ بۆ پۆلیچکایش نامرێت؟ بۆ تۆ هەر لێرە، لە گۆشە و کەناری شەقامەکاندا منداڵانێکت نەدیووە کە دایکیان بۆ دەرۆزەکردنی ناردبن؟ من دەزانم ئەو دایکانە لە کوێ و چۆن دەژین، لەم ژینگەیەدا منداڵ ناتوانێت وەک منداڵ بژی، لێرە منداڵی حەوت ساڵان بەرەڵا و دز دەردەچن، ئەگەرچی منداڵ وێنەیەکی مەسیحە: 'فریشتەی خوایان لەگەڵدایە'. عیسا فەرموویەتی ڕێزیان لێبگرن و خۆشتان بوێن، چونکە ئەوان ئایندەی مرۆڤایەتین..

سۆنیا کە خۆبەخۆ دەگریا و بە توندی دەستی هەڵدەگلۆفتن، دووبارەی کردەوە:

- باشە چی بکەین؟ چی؟

- چی بکەین؟ ئەوەی کە دەبێت بشکێت، پێویستە یەکجار و بۆ هەتا هەتایە بشکێنرێت، ئەمە دەکەین و ئازارەکەی دەچێژین، چۆن؟ تێناگەیت؟ دوایی تێدەگەیت.. ئازادی و دەسەڵات، دەسەڵات گرنگە، بەسەر هەموو بوونەوەرە لاوازەکاندا، بەسەر ئەم لانەیەی مێروولەکاندا!.. ئەمە ئامانجە، لە بیرت نەچێت! ئەمە دواوشەیە کە پێتی دەڵێم، ئەگەر سبەی نەهاتم، خۆت هەموو شتێک دەبیستێت و ئەوسا

قسەکانمت بیر بکەوێتەوە، پاشانیش ڕۆژێک، دوای ساڵانێک، بە درێژایی تەمەن لەوە دەگەیت کە مەبەستم چی بووە، ئەگەریش بەیانی هاتم، پێت دەڵێم، کێ لیزاڤێتای کوشتووە، خوات لەگەڵ:
سۆنیا لە ترسا لەرزی و لە حاڵێکدا کە موچرک بە لەشیدا دەگەڕا، تەماشای ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد و وتی:
- بەڕاست تۆ دەزانیت کێ کوشتویەتی؟
- دەیزانم و دەیشیڵێم.. بە تۆ، تەنیا بە تۆ، من تۆم دەستنیشان کردووە، بۆ ئەوە نەهاتوومەتە لات داوای لێبوردنت لێبکەم، بەڵکو و تەنیا بۆ درکاندنی مەبەستەکە، ماوەیەکە تۆم بۆ ئەوە دەستنیشان کردووە، کە ئەو شتەت پێبڵێم، هەر لەو کاتەوە کە باوکت لەبارەی تۆوە قسەی لەگەڵدا دەکردم و هێشتا لیزاڤێتا زیندوو بوو، من بیرم لەمە کردبووەوە، خوات لەگەڵ، تەوقەم لەگەڵدا مەکە، تا بەیانی!
ڕاسکۆلنیکۆڤ چووە دەرەوە، سۆنیا وای تەماشا دەکرد دەتوت لە شێتێک دەڕوانێت، وەلێ خۆیشی لە شێتی دەکرد و هەستیشی پێدەکرد، سەری گێژی دەخوارد "خودایا! ئەو چۆن دەزانێت کێ لیزاڤێتای کوشتووە؟ ئەم قسانەی ئەو چ مانایەکیان هەیە؟ سەیرە، زۆر سەیرە!" بەهەرحاڵ، بە ئەقڵیدا نەچوو، نا، بە هیچ جۆرێک، ئاخ، دیارە ئەو زۆر بەدبەختە.. وازی لە دایک و خوشکی هێناوە، بۆ؟ چی ڕوو یداوە؟ چ بڕیارێکی داوە؟ بەڕاست ڕاسکۆلنیکۆڤ چی پێوت؟ پێی ماچ کرد و وتی.. بەڵێ، ئەوەی بە ئاشکرا وت کە ئەو ناتوانێت بەبێ من بژی.. ئاخ خودایا!..
بە درێژایی ئەو شەوە سۆنیا لەرزوتا دایگرتبوو، هەندێکجار لە خەو ڕاست دەبووەوە، دەگریا، دەستی هەڵدەگلۆفت و جاری تریش سەرلەنوێ دەکەوتەوە نێو خەوێکی بیمارانەوە و پولێچکا و کاترینا

ئیڤانۆڤنا و لیزاڤێتا و خوێندنەوەی ئینجیل و ئەو.. ئەوی بە ڕەنگی پەڕیوو و چاوی ئاگرینەوە لە خەونیدا دەبینی.. کە پێی ماچ دەکات و دەڵێت.. ئاخ.. خودایا!

لە پشتِ دەرگاکەوە، لای ڕاست، لە دوای هەمان ئەو دەرگایەوە کە ماڵەکەی سۆنیای لە ماڵی خاتوو گرتود ڕسیلخ جیا دەکردەوە، ژوورێک هەبوو، ماوەیەک بوو چۆڵ و بەشێک بوو لە خانووەکەی خاتوو ڕسیلخ کە بە کرێی دەدا. بۆ ئەو مەبەستە ئاگاداری و پۆستەری بە دەرگای هاتنە ژوورەوە و شووشەی ئەو پەنجەرانەوە نابوو، کە بەسەر ڕووبارەکەدا دەیانڕوانی. سۆنیا دەمێک بوو کە ئەو ژوورە بە خاڵی و بێکرێگرتە بزانێت، وەلێ بە درێژایی ئەو قسانەی لەگەڵ ڕاسکۆلنیکۆڤدا کردبوویان، لە پشت دەرگای ژوورە چۆڵەکەوە، جەنابی سفیدریگایلوڤ وەستابوو و گوێی گرتبوو. کە ڕاسکۆلنیکۆڤ چووە دەرێ، سفیدریگایلوڤ وەستا و بیری کردەوەو لەسەر نووکی پەنجە گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی، کورسییەکی هێنا و بێدەنگ لەبەر ئەو دەرگایە داینا، کە دەچووەوە سەر ژوورەکەی سۆنیا. گفتوگۆکەی زۆر خۆش و سەرنجڕاکێش هاتە پێشچاو، ئەمەندەی لا خۆش بوو، کورسییەکەی بۆ ئەوە هێنا کە دوایی، با بڵێین بەیانی، جارێکی تر تووشی ناڕەحەتی نەبێت و سەعاتێک بەپێوە بوەستێت. بەڵکو بارێکی ئاسانتر بۆ خۆی فەراهەم بێنێت و چێژ و خۆشییەکە فراوان و کامڵتر بێت.

## ٥

کە بەیانی ڕۆژی دوایی، لە سەعات یانزەی ڕێکدا، ڕاسکۆلنیکۆڤ گەیشتە بەشی پۆلیس و لە نووسینگەی لێکۆڵینەوەدا داوای کرد هاتنەکەی بە پۆرفیری پتروڤیچ ڕابگەیەنن، زۆر سەیری پێهات، کە تا ماوەیەک کەس پێشوازیی لێنەکرد. نزیکەی دە دەقیقە تێپەڕی تا بانگ کرا، ئەو وا بەتەما بوو زۆر زوو بەدەنگییەوە بێن. لە ژووری چاوەڕوانییەکەدا وەستابوو، خەڵکی بە بەردەمیدا دەهاتن و دەچوون و پێنەدەچوو مەبەستیان بێت. لە ژوورێکی تردا کە لە ژووری نووسینگەکەی دەکرد، چەند نووسەرێک دانیشتبوون و شتیان دەنووسی. دیار بوو هیچ یەکێک لەوانە نەیدەزانی ڕاسکۆلنیکۆڤ کێیە و چییە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە دوودڵی و گومانەوە چاوی بە دەوری خۆیدا دەگێڕا بۆ ئەوەی بزانێت هەواڵگرێک یان سیخوڕێک لەو ناوەدا نییە کە چاودێریی ئەم بکات نەوەکا هەڵبێت؟ وەلێ هیچی لەو بابەتەی نەدی. تەنیا کارمەندی بچووکی دەبینی، کە سەرگەرمی کاری خۆیانن و هەندێک کەسی تر. وەلێ کەس گەنترین کاری بەو نەبوو. بە جۆرێک، کە دەیتوانی بە ئارەزووی خۆی بۆ هەر جێگایەک بیەوێت بڕوات.

تا دەهات بیرێک زیاتر و زیاتر لە سەریدا ڕەگی دادەکوتا، بیری ئەوەی ئەو پیاوە بەنهێنییەی دوێنێ کە دەتوت تارماییە و لەژێر زەوییەوە هەڵتۆقیوە، بە ڕاستی هەموو شتێکی دیبوو، هەموو شتێکی دەزانی. خۆ ئەگەر وابووایە، دەیانهێشت ئەو، واتا ڕاسکۆلنیکۆڤ، ئاوا لێرانەدا ئاسوودە بوەستێت و چاوەڕوان بێت؟ ئایا لێدەگەڕان تا سەعات یانزە چاوەڕێی بکەن تا هەر کاتێک دڵی ویستی بە ئارەزووی خۆی بێت بۆ لایان؟ ڕەنگە ئەو کەسە تا ئێستا هەواڵەکەی

نەگەیاندبێت... یان هەر لە بنەڕەتەوە شتێک نازانێت و بە چاوی خۆی هیچی نەدیووە (جا چۆن دەبوو بیبینێت؟) کەواتە دەشێت ڕووداوەکەی دوێنێشەو، کە بەسەریدا، یەعنی بەسەر ڕاسکۆلنیکۆڤدا هات، بێجگە لە تارمایی و خەونێک چی تر نەبووبێت، تەنیا خەیاڵی نەخۆش و دەمارگیرییەکەی ئەم ئاوا گەورە و گرنگی کردبێت، ئەم هەستە لە دوێنێشەوەوە خۆی بەسەر بیری ڕاسکۆلنیکۆڤدا سەپاندبوو، لەو کاتەوە کە ترس و نائومێدییەکی زۆری تێگەڕابوو.
کە ئێستا هەموو ئەو شتانەی لە بیری خۆیدا شەنوکەو دەکرد و خۆی بۆ جەنگێکی تازە ئامادە دەکرد، لەناکاوێکدا هەستی کرد دەلەرزێت، ئەم لەرزینە تەواو خرۆشاندی، چونکە وای لێکدایەوە لە ترسی ڕووبەڕووبونەوەیەتی لەگەڵ پۆرفیری پتروڤیچی نەفرەتیدا. لە هەمووی ناخۆشتر بۆی ئەوەبوو جارێکی دی لەگەڵ ئەو زەلامەدا ڕووبەڕوو ببێتەوە. هەستی دەکرد ڕقێکی بێئەندازەی لێیەتی و ترسی ئەوەی بوو ئەو ڕقە زۆرە ببێتە هۆی ئەوەی کە خۆی تێوە بگلێنێت. خەستیی ڕقەکەی لەرزینەکەی نەهێشت. ڕاسکۆلنیکۆڤ خۆی ئامادە کرد تا بە قیافەیەکی سارد و جەسورانەوە بڕواتە ژوورەکە، بڕیاریشی دا تا بتوانێت بێدەنگ و هێور بێت و هەرچۆنێک بووە، ئەم جارە بەسەر ئارەزووە نەخۆش و دەمارگیرییەکەی خۆیدا زاڵ بێت، ڕێک لەو چرکەساتەدا بۆ لای پۆرفیری پتروڤیچیان بانگ کرد.
لەو کاتەدا پۆرفیری پتروڤیچ بە تەنیا، لە ژووری نووسینگەکەیدا بوو، ژوورەکەی نە بچووک بوو نە گەورە، لە بەرانبەر قەنەفەیەکدا کە بە مشەمایەک بان درابوو، مێزێکی گەورەی نووسین بەرچاو دەکەوت. لە سووچێکیشدا دۆلابێک و چەند کورسییەک دیاربوون. هەموو ئەمانە موڵکی دەوڵەت و لە دارێکی زەردی وارنیشکراو دروست

کرابوو. له سووچێکی تردا له دیواری دواوه، یان باشتره بڵێین لەو تیغەیەی لە کۆتایی ژوورەکەدایە، دەرگایەکی داخراو هەیە. لەولاترەوە، لە پشت تیغەکەوە، دەبوو ژووری تر هەبێت. هەر کە ڕاسکۆلنیکۆڤ چووە ناوەوە، پۆرفیری پترۆڤیچ یەکسەر ئەو دەرگایەی داخست، کە لێوەی چووبووە ژووری و هەردووکیان بە تەنیا مانەوە. پۆرفیری بە ڕووی خۆش و پێشوازییەکی گەرمەوە خۆی بۆ میوانەکەی دەرخست، بەڵام هەر دوای چەند دەقیقەیەک ڕاسکۆلنیکۆڤ بەپێی هەندێک نیشانە و بەڵگە لەوە تێگەیشت، کە پۆرفیری پەشۆکاوە! وەک ئەوەی لەپڕێکدا لە بیرکردنەوەیان کردبێت یان بەسەر کارێکی تایبەتی و نهێنیەوە بووبێت. پۆرفیری دەستی بەرەو لای میوانەکەی درێژ کرد و وتی:

- بەە.. بەە.. گەورە و بەڕێز، ئاخری تۆیش.. لەم ناوەوە هاتیت، باشە بەڕێز، فەرموو دابنیشە، ڕەنگە پێت خۆش نەبێت بە ناوی قوربان و گەورە و بەڕێزەوە بانگت بکەم. داوای لێبووردنت لێدەکەم، ئەمە بەبێ ئەدەبی و زۆرخۆییانە مەزانە.. فەرموو لەسەر قەنەفەکە دابنیشە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بێ ئەوەی چاوی لەسەر هەڵبگرێت، دانیشت.

واژەکانی "لەم ناوەوە هاتن" و داوای لێبوردنکردن لە بەکارهێنانی زمانی خۆییانە و یەک دوو وشەی فەڕەنسی و شتانی تریش هەموو نیشانەیەکی ئاشکرا بوون. لەپڕێکیشدا بە دوودڵییەوە بیری کەوتەوە: "ئەو هەردوو دەستی بۆ لام درێژ کرد، بەڵام هیچیانی نەدامێ و کێشانییەوە".

هەردووکیان لە چاودێریکردنی یەکا بوون، بەڵام کە نیگایان بەر یەکدی دەکەوت، هەردووکیان بە خێرایی بروسکە بۆ لایەکی تر دەیانگوێزایەوە..

ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:
- من لەبارەی سەعاتەکەوە نامەیەکم بۆ هێناویت.. فەرموو بیبینە.. بزانە باش نووسراوە یان دەبێت جارێکی تر بینووسمەوە؟
پۆرفیری پتروڤیچ وەک ئەوەی پەلەی ڕۆیشتنی بێت: وتی:
- چی؟ نامە؟ بەڵێ، بەڵێ.. نیگەران مەبە.. هەروایە..
دوای ئەم قسانە نامەکەی لێوەرگرت و خوێندییەوە، لەگەڵ خستنە سەرمێزی نامەکەدا، بە هەمان پەلەپەلی پێشووەوە وتی:
- باشە، هەر ئەمەیە و هیچی تری ناوێت.
ئەوسا دوای چرکەساتێک، لە کاتێکا کە دەربارەی کارێکی دی دەدوا، دووبارە نامەکەی لەسەر مێزەکە هەڵگرت و خستییە سەر مێزی نووسینەکە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ کەوتەوە قسەکردن:
- وا بزانم دوێنێ تۆ دەتویست لە من.. بە ڕەسمی.. لەبارەی ناسیاویم لەگەڵ.. ژنە کوژراوەکەدا پرسیار بکەیت؟
لەو کاتەدا کتوپڕ وەک بروسکە ئەوەی بە بیردا هات کە بۆ هەر لە خۆمەوە وشەی "وابزانم"م بەکار هێنا. بەڵام هەر زوویش وەک بروسکە بیرێکی تری بەسەردا هات: "باشە، جا بۆ ئەوەندە لە وشەی وابزانم بترسم؟"
لەپڕێکدا هەستی کرد پەیوەندیکردنی بە پۆرفیرییەوە و ئەم چەند قسە و یەک دوو نیگایە، لە یەک کاتدا، هەموو ئەم دڵەڕاوکێ و ترسەی لێکەوتۆتەوە.. "بارێکی گەلێک ترسناکە، دەمارم دەهاڕێ و نیگەرانیم ڕوو لە زیادیە، چ بەدبەختییەکە! ئیدی هەر ناتوانم زمان هەڵبێنمەوە و ڕاستییەکە نەڵێم".

پۆرفیری پترۆڤیچ، بەبێ هیچ ئامانجێکی گچکە بە بەردەم مێزی نووسینەکەیدا دەهات و دەچوو، جارێک بەرەو پەنجەرەکە و جارێکی تر بەرەو خانەی کتێبەکان و دیسانەوە بەرەو مێزی نووسینەکەی دەڕۆیشت. هەندێکجاریش لە نیگای ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕای دەکرد یان دەوەستا و بە وردی لێی ڕادەما. پاشان کەوتە ورتەورت:
- بەڵێ، بەڵێ، نیگەران مەبە، پەلەمان نییە، دەرفەتمان لەبەردەستایە.
لەو کاتەدا لەشی چکۆڵە و قەڵەو و خڕی کە وەک تۆپ بە هەموو لایەکدا دەسووڕاوە و لە هەر سووچ و قوژبنێکی ژوور و دیوارەکاندا خولی دەخوارد، دیمەنێکی زۆر سەیری دابوویە. جگەرەیەکی بۆ میوانەکەی دەرهێنا و وتی:
- دەرفەتمان زۆرە، دەرفەتمان زۆرە.. تۆ جگەرە دەکێشیت؟ خۆت هەتە؟ دەزانیت، من لێرەدا پێشوازی لە تۆ دەکەم لەگەڵ ئەوەدا کەماڵەکەم لەوێندەر، لە پشت ئەو دیوارەوەیە. ماڵێکی دەوڵەتییە، وەلێ جارێ لە شوێنێکی ترم، دەبێت ئێرە چاک بکرێتەوە، گۆڕانی تێدا بکرێت. تا ڕادەیەک ئێستا لە تەواوبووندایە.. دەزانیت، لە ڕاستیدا خانووی دەوڵەتی شتێکی باشە، وایە؟ تۆ دەڵێی چی؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تەوسەوە لێی ڕوانی و وتی:
- بەڵێ، شتێکی باشە.
ئەم دووبارەکردنەوە گەوجانەیەی ئەو وشە بێمانایانە، کە گوایا خانووی دەوڵەتی شتێکی باشە، لەگەڵ ئەو ڕوانینە پڕ لە ڕاز و جیدی و ڕامانانەی بۆ میوانەکەی دەکرد، گەلێک لە یەکدی جیاواز بوون. هەر ئەمە ڕقی ڕاسکۆلنیکۆڤی زیاد لە جاران هەڵساند، بە جۆرێک کە ئیدی نەیتوانی لەو خۆهەڵنان و گاڵتەجاڕییە چاو بپۆشێت، بۆیە لەپڕێکدا بە ڕوانینێکی بێئەدەبانە، کە پێدەچوو چێژی لێببینێت، پرسی:

- دەزانیت، گوایا یاسایەکی دادوەری هەیە، واتا شێوازێکی دادوەری، بۆ هەموو لێکۆڵەرەوەکان، کە یەکەم جار لە دوورەوە، واتا لە مەبەستی بێهودەوە دەست بە پرسیار دەکەن، تەنانەت لە مەبەستی گرنگ بەڵام تەواو نامۆ و سەیر، بۆ ئەوەی ئەو کەسەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکەن دڵنیا بێت. یان باشتری بڵێین بێئاگای بکەن و پاشان کتوپڕ و بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو پرسیارێکی مەترسیداری لێبکەن و بیپێکن، وانییە؟ لەم لایەنەوە دەڵێیت لە هەموو یاسا و دەستوورەکاندا جەخت لەسەر ئەمە دەکرێت و پەیڕەویی لێ دەکرێت.
- بەڵێ، بەڵێ.. تۆ چۆنی لێک دەدەیتەوە.. کە من قسەم لەسەر موڵکی دەوڵەت دەکرد.. بەڵێ؟

بەدەم ئەم قسانەوە پۆرفیری پتروڤیچ پێڵووی لێک نزیک خستنەوە و چاوی داگرت، حاڵەتێکی خۆش و فریوودەرانە بە ڕوویەوە دەرکەوت و چینەکانی تەوێڵی ڕێک بوونەوە، چاوی جوان و هەموو دەموچاوی کرایەوە، لە کاتێکدا کە ڕاستەوخۆ چاوی لە چاوی ڕاسکۆلنیکۆڤ بڕی، قاقایەکی تووڕەی دووروودرێژی کرد.

ڕاسکۆلنیکۆڤیش سەرەتا هەوڵی کەمێک پێکەنینی دا، وەلێ کە پۆرفیری زانی دەیەوێت پێبکەنێت قاقایەکی هێند بەرزی لێدا، کە ڕەنگی سوور بووەوە. لەپڕێکدا بێزاریی ڕاسکۆلنیکۆڤیش ئەوەندە پەرەیسەند، کە هەر جۆرە خۆپارێزییەکی لەدەست دا، وازی لە پێکەنین هێنا، برۆی هاتنەوە یەک و بۆ ماوەیەک بە ڕقەوە لە پۆرفیریی ڕوانی، بە درێژایی قاقای پێکەنینەکەی کە دەتوت هەر بە دەستی ئانقەست نایبڕێتەوە، ڕوانینەکەی بەردەوام بوو. دیار بوو هەردووکیان بێدەربەستن، وا دەردەکەوت پۆرفیری پتروڤیچ بە ئاشکرا گاڵتە بە میوانەکەی خۆی دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەیبینی

میوانەکە نەفرەتی لە پێکەنینەکەی دێ، کەچی ئەو بەمە بێتاقەت نەدەبوو. شتێکی دی کە بۆ ڕاسکۆلنیکۆڤ مایەی سەرنجدان بوو: ئەو دەیزانی پۆرفیری پتروڤیچ کەمێک لەمەوبەر نە شلەژاوە و نە بێتاقەت بووە، بەڵکو خۆی، واتا ڕاسکۆلنیکۆڤ، لە داوەکە کەوتووە. زانی لەو لایەنەوە بێگومان شتێک، واتا مەبەستێک هەیە کە ئەم پێی نازانێت.. ڕەنگە هەموو شتێک ئامادە کرابێت و هەنووکە و هەر لە چرکەساتێکدا ئاشکرا ببێت و بەسەری ئەمدا بشکێت..

ڕاسکۆلنیکۆڤ زوو لە مەبەستەکە گەیشت، لە جێگاکەی هەستا، کڵاوەکەی گرتە دەست و بە دەنگێکی تەواو تووڕە و یەکلاییکەرەوە دەستی پێکرد:

- پۆرفیری پتروڤیچ، تۆ دوێنێ بە حەزەوە داوات کرد بۆ لێپرسینەوە بێم بۆ لات، (جەختی لەسەر وشەی لێپرسینەوەکە کرد). وا من هاتووم و ئەگەر پرسیارێکت هەیە بیکە، ئەگینا ڕێگەم بدە بڕۆم. کاتم نییە و کارم هەیە.. دەبێت بچم بۆ ناشتنی ئەو کارمەندەی کەوتبووە ژێر پێی ئەسپەکانەوە.. تۆیش دەیناسیت.

لە زیادکردنی دوارستەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕقی هەستا و بە تووڕەیی زیاترەوە وتی:

- من لە گشت ئەم شتانە بێزار بووم، تێدەگەیت؟ ماوەیەکیشە وام لێهاتووە.. تا ڕادەیەک نەخۆشییەکەیشم هەر پەیوەندیی بەوەوە هەیە.. بە کورتی..

هەستی کرد ئەو ڕستەیەی پەیوەندیی بە نەخۆشییەوە هەیە، تەواو لە جێی خۆیدا نییە. دەنگی لێهەڵبڕی:

- بە کورتی، داوات لێدەکەم پرسیارەکانت بکەیت یان ڕێگەی ڕۆیشتنم پێبدە.. خۆ ئەگەر دەتەوێت پرسیاریش بکەیت، بە هیچ

جۆرێک نابێت پێچەوانەی یاسا و ڕێسا بێت، ئەگینا وەڵام نادەمەوە. بۆیە دەڵێم خوات لەگەڵ، چونکە من و تۆ ناتوانین هیچ کارێک بکەین.
پۆرفیری پتروڤیچ لەپڕا کەوتە پەلەقاژە و زوو زمانی گۆڕی و بەبێ ئەوەی ئیتر پێبکەنێت، وتی:
- خودایا، ئەوە تۆ چیتە؟ ئاخر، چیت لێبپرسم، تکات لێدەکەم نارەحەت نەبیت.
بەدەم قسەکانەوە لەناو ژوورەکەدا هەر ئەملاوئەولای دەکرد و هەندێکجاریش لە ڕاسکۆلنیکۆڤ دەپاڕایەوە کە دابنیشێت:
- هێشتا زووە، کاتمان لەبەردەستایە، هەموو ئەمانەیش بێهودەن، بە پێچەوانەوە: بەم سەردانەت گەلێک خۆشحاڵم.. من وەک میوانێکی خۆم پێشوازیت لێدەکەم، ئەو پێکەنینە نەفرەتییەیش، بەڕێز، ڕادیون ڕومانوڤیچ، داوای لێبوردنت لێدەکەم، ڕادیون ڕومانوڤیچ؟ ناوەکەتم بە ڕاستی وتووە؟ من کابرایەکی تووڕەم، تۆ بە سەرنجە وردەکەت منت هێنایە پێکەنین، هەندێکجار بە ڕاستی وەک داری بی دەلەرزم و لەرزینەکەم زیاد لە نیوسەعات دەخایەنێت.. زوو پێکەنین دەمگرێت، بەم لەشولارەیشمەوە دەترسم ڕۆژێک لەپڕێکدا دڵم بوەستێت، ئاخر، بۆ دانانیشیت؟.. بەڕێز تکات لێدەکەم دابنیشیت، ئەگینا بە زویرت تێدەگەم.
ڕاسکۆلنیکۆڤ کە هێشتا ڕقەکەی نەڕەوییبووەوە و برۆی هێنابوونەوە یەک، بێدەنگ گوێی گرتبوو و کونپشکنی دەکرد، دانیشت، بەڵام کڵاوەکەی هەر بە دەستەوە بوو.
پۆرفیری پتروڤیچ کە هێشتا ئەمسەروئەوسەری ژوورەکەی دەکرد و وەک پێشتر نەیدەویست ڕوانینەکەی بەر ڕوانینی میوانەکەی بکەوێت، کەوتەوە ئاخاوتن:

- ڕادیون ڕومانوڤیچی ئازیز، دەمەوێت لەبارەی ڕەوشت و خوی خۆمەوە شتێکت پێبڵێم، دەزانیت، من تا ئێستا ژنم نەهێناوە و کەسێکم نە تێکەڵی خەڵک دەبم و نە ناسراوم، بێجگە لەمانە مرۆیەکی تەواو کامڵم، مرۆیەکی چەقبەستووی لاکەوتە.. و.. ئایا تۆ سەرنجی ئەوەت داوە، ڕادیون ڕومانوڤیچ، کە لێرە، واتا لە ڕووسیای ئێمەدا، لە هەموویش زیاتر لە ئەنجومەنەکانی پتروزبورگماندا، ئەگەر دوو مرۆڤی بەئاوەز کە هێشتا بە چاکی نەبوونەتە هاوڕێی یەکتری، بەڵام با بڵێین ڕێز لە یەکدی دەگرن، وەک من و تۆ، ئەگەر پێک بگەن، بۆ ماوەی نیوسەعاتی تەواو ناتوانن بابەتێک بدۆزنەوە قسەی لەسەر بکەن. بەرانبەر بە یەکدی دەمیان دەبێت بە تەڵەی تەقیوو، دادەنیشن و هەردووکیان بێتاقەت دەبن: هەموو کەس بۆ خۆی باسێکی هەیە بیکات: بۆ نموونە خانمەکان.. کەسانی تری ناو کۆمەڵگا، وەک ئەوانەی لە چینی سەرەوەدان هەمیشە بابەتی باسیان هەیە. وەلێ ئەوانەی لە چینی ناوەندن، وەک ئێمە، هەموو شەرمن و کەمدوون.. مەبەستم کەسانی بیرمەندە. گیانە هۆی ئەمە چییە؟ نازانم کێشەی کۆمەڵایەتی هاوبەشمان نییە یان زۆر شەریفین و نامانەوێت یەکتر فریوو بدەین؟ نازانم، بەڵێ، ئەی تۆ دەڵێی چی؟ دەیسا کڵاوەکەت لابەرە، دەڵێی دەتەوێت هەر ئێستا بڕۆیت، بێگومان دیاردەیەکی ناخۆشە.. بەڵام من بە پێچەوانەوە دڵخۆشم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کڵاوەکەی نایە لاوە، وەلێ بە ڕووە گرژەکەیەوە بێدەنگ و بە وردی گوێی لە قسە بێسەرەوبەرەکانی پۆرفیری گرتبوو. "ئاخر، مەبەستی چییە؟ ئایا بە ڕاستی دەیەوێت بەم زۆربڵێیە گەمژانەیەی خۆی هەستوبیرم پەرت بکات؟"

پۆرفیری کە هێور دەیڕوانی، لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

- قاوەت پێشکەش ناکەم چونکە ئێرە جێگای نییە، بەڵام بۆ نابێت پێنج دەقیقە لەگەڵ هاوڕێیەکتا دابنیشیت و خەمێک بە بادەن.. وەک دەزانیت هەموو ئەمانە ئەرکی کارن.. گیانەکەم، لەوە زویر نەبیت کە من بەردەوام بە ژوورەکەدا دێم و دەچم. بمبەخشە گیانە، بە ڕاستی پێت بڵێم زۆر لەوە دەترسم دڵت بڕەنجێنم، بەڵام ئەم جووڵانە بۆ من پێویستن، بەردەوام دانیشتووم و زۆر بەوە خۆشحاڵ دەبم، کە دەرفەت لە پێنج دەقیقە دەهێنم و دێم و دەچم.. مایەسیریمە.. دەمەوێت بە وەرزش چاری بکەم، دەڵێن ڕاوێژکەرانی دەوڵەت و کارمەندان و تەنانەت ڕاوێژکارە بەپایەوپلە گرنگەکان هەموو ڕۆژێک زۆر بە ئارەزووەوە تەنافبازی دەکەن، بەڵێ.. زانستی ئەم سەردەمە داوای دەکات. بەڵێ.. وەلێ لەبارەی ئەرکی ئێرەمەوە، لێکۆڵینەوە و هەموو ئەم ڕەسمیاتانە.. کە جەنابی خۆت ئێستا دەربارەی لێکۆڵینەوە باست کرد.. بەڵام حەز دەکەم بزانیت، ڕادیون ڕومانوڤیچ گیان، ئەم لێکۆڵینەوانە جاری وا هەیە خودی لێکۆڵەرەوە زیاد لەو کەسەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکات، تووشی سەرەگێژە دەبێت. لەم لایەنەوە تۆ زۆر بە ویژدان و هۆشیارانەوە ئاماژەت پێکرد. (ڕاسکۆلنیکۆڤ شتی وای نەوتبوو) مرۆڤ گێژ دەبێت، بە ڕاستی گێژ دەبێت، بەردەوام قەوانێکە و دووبارە دەبێتەوە، تەواو وەک دەنگی تەپڵ هەر دەیلێ و دەیلێتەوە. وەلێ گۆڕانێک بەدەستەوەیە، هەرچەندە ناووناونیشانمان دەگۆڕێت، هە، هە، هە! بەڵام لە کاری داوەریماندا، وەک خۆت زرنگانە ئاماژەت پێدا، من تەواو لەگەڵتا هاوڕام، بەڕاست حەز دەکەم پێم بڵێیت کام تاوانبار، تەنانەت ئەگەر نەزانترین جوتیار بێت، ئەوە نازانێت کە سەرەتا بە پرسیاری بێمانا گێژی دەکەن و پاشان لەناکاوێکدا یەک لە دوای یەک دەیدەنە بەر پرسیار و بە تەپڵی

سەریدا دەکێشن، هە، هە، هە! هەر بە تەپڵی سەریدا وەک جەنابتان فەرمووتان، هە، هە، هە! تۆ بە ڕاستی وات لێکدایەوە کاتێک من لەبارەی شوێن و خانووی دەوڵەتەوە دوام، واتزانی.. هە، هە، هە! تۆ کەسێکی سەیریت، زۆر چاکە، بەڵام من نایکەم! ئاخ، بەڕاست، قسە قسە ڕادەکێشێ و بیرێک بیرێکی دیی لێدەکەوێتەوە: تۆ هەر ئێستا لەبارەی یاساوڕێساوە شتێکت وت، لە بیرتە، لەبارەی لێکۆڵینەوەوە.. باشە ڕێسا چییە؟ دەزانیت لە زۆر شوێندا ڕێسا بێمانایە. هەندێکجار گفتوگۆیەکی دۆستانە بەکەڵکترە، ڕێم بدە لەم بارەیەوە دڵنیات بکەم کە ڕێسا هەمیشە لە شوێنی خۆیدایە و بە تەواویی لەناو ناچێت. دەمەوێت لێت بپرسم بەڕاست ڕێسا یانی چی؟ نابێت ڕێسا بەردەوام ڕێ لە لێکۆڵەرەوە بگرێت. کاری دادوەری لێکۆڵینەوە، ئەگەر بتوانین ناوی بنێین "هونەری ئازادە" یان شتێکی لەو بابەتە. هە، هە، هە!

پۆرفیری پتروڤیچ هەناسەیەکی دا، هەروا، بەبێ ماندوبوون هەندێکجار ڕستەی پووچ و بێمانای دەوت و جاری تریش وشەی وای دەوت، کە لە مەتەڵ دەچوو، لەپڕێکدا دیسانەوە دەکەوتەوە قسەی هیچوپووچ، ئیتر تا ڕادەیەک بە ناو ژوورەکەدا کەوتبووە ڕاکردن، هەنگاوە کورتەکانی تا دەهات تیژتر دەکرد، بەردەوامیش چاوی بڕیبووە زەوی، دەستی ڕاستی خستبووە پشتی و دەستی چەپی بەردەوام ڕادەوەشاند و وای دەجووڵاند کە بە شێوەیەکی سەیر لەگەڵ وتەکانیدا ڕێ نەدەکەوت. ڕاسکۆلنیکۆڤ لەپڕا سەرنجی دا لەو کاتەدا کە زۆر خێرا دەهات و دەچوو، پۆرفیری یەک دووجار نزیک بە دەرگاکە وەستا و بۆ چرکەساتێک گوێقوڵاغ بوو. لە دڵی خۆیدا وتی: "تۆ بڵێی چاوەڕێی یەکێک بێت؟" پۆرفیری کە زۆر بە سادەییەوە لە ڕاسکۆلنیکۆڤی دەڕوانی و ئەوەیش لاوەکەی خستبووە

گومان و دوودڵییەوە و خۆی ئامادە دەکرد، دیسانەوە بە گەرمی کەوتەوە قسەکردن:

- بە ڕاستی تۆ لەسەر هەقیت کە بڕیارە یاساییەکان بە گاڵتە دەزانیت و قەشمەریان پێدەکەیت، هە، هە، هە! ئەم شێوازە سایکۆلۆژییە زۆر قووڵانە - بێگومان هەندێکیان نەک هەموویان - گەلێک گاڵتەجاڕن و ڕەنگە زۆریش بێکەڵک بن ئەگەر خۆمان بە پیت بە پیتی بڕیارەکانییەوە ببەستینەوە.. بەڵێ، با بێینەوە سەر ڕێسا: چاکە، ئەگەر من لە لێکۆڵینەوەی خۆمدا دەستنیشانی یەکێکم کرد، جا هەر کەسێک بێت، کە تاوانبارە، بەڕاست، ڕادیون ڕومانوڤیچ تۆ بۆ کاری مافناسی خۆت ئامادە دەکەیت؟

- بەڵێ، من یاسام دەخوێند..

- باشە، کەواتە ئەمە نموونەیەکە و بۆ ئاییندەت بەکەڵکە، وا تێنەگەیت من لە خۆم ڕاببینم تۆ فێری شت بکەم، ئاخر، تۆ لەبارەی تاوانەوە وتاری سەرنجڕاکێش دەنووسیت! نا، من تەنیا ئەوەم دەوێت لەبارەی کارەساتێکەوە کە ڕووی داوە، نموونە بهێنمەوە، باشە، با بڵێین ئەگەر من فلان یان فیسارم بە تاوانباردایە قەڵەم، بە ڕاستی لە تۆ دەپرسم، بە چ بەڵگەیەک پێشوەخت ئەو کەسە ناڕەحەت بکەم، تەنانەت ئەگەر چەند بەڵگەیەکیشم لەسەری هەبێت؟ ڕاستە من ناچارم هەندێک کەس زوو بگرم، بەڵام کەسانی تر هەن دەشێت لەو جۆرە نەبن، بە ڕاستی ئەمە وایە، کەواتە وازی لێدەهێنم بۆ خۆی بە شاردا بگەڕێت، هە، هە، هە! نا، من وا هەست دەکەم تۆ بە تەواوی لە مەبەستەکەم نەگەیت، با ڕوونتر بۆتی بڵێم: بۆ نموونە ئەگەر لە پێش وەختی پێویستا بیگرم، ڕەنگە بەو کارە -ئەگەر بشێ ناوی لێبنێین- پەناگایەکی ئاکاری و دەروونی بۆ دروست بکەم هە، هە، هە! تۆ پێدەکەنیت؟ (ڕاسکۆلنیکۆڤ

بە هیچ جۆرێک خەیاڵی پێکەنینی نەبوو، لێوی توند دەکرۆشت و نیگا ئاگرینەکانی خۆی لە چاوی پۆرفیری کەلا نەدەخست و بە هێوری لە شوێنەکەیدا دانیشتبوو) ئەمە ڕاستییەکە و لەبارەی هەندێک کەسەوە بەتایبەتی وایە. چونکە خەڵکی جۆراوجۆرن، بەڵام شێوازی کار لەگەڵ هەموویاندا هەر یەکێکە. تۆیش ئێستا فەرمووت "بەڵگاندن"، گریمان بەڵگە هەیە، بەڵام برا گیان بەڵگە زۆرجار دوو سەری هەیە، ئاخر من دادوەری لێکۆڵینەوەم، کەواتە لایەنی لاوازم هەیە، من دان بەمەدا دەنێم: باشە ئەگەر پیشەی لێکۆڵەرەوە تەواو ڕوون و کۆک بێت. دەبێت بەڵگەیەکی وا لەبەردەستا بێت وەک دوو لەگەڵ دوودا دەکاتە چوار. بەڵگەیەکی هێند ڕوناک بێت کە نکوڵیی لێنەکرێت. وەلێ ئەگەر من بۆ ماوەیەک ئەوم گرت، هەرچەندە تەواو لەوەیش دڵنیا بم کە تاوانباری ڕاستەقینەیە، ئەوسا من خۆم لەو بەڵگانە بێبەش دەکەم، کە تاوانەکە دەسەلمێنن. بۆچی؟ لەبەر ئەوەی من – ئەگەر دەربڕینەکە تەواو بێت – دەستنیشانی بارێکی تایبەتیم بۆ ئەو کردووە، واتا لە باری سایکۆلۆژییەوە دڵنیا بووە، ئەوسا دەچێتەوە ناو قاوغەکەی خۆی و لەبەرچاوی من گوم دەبێت و پاشان دەرک دەکات کە ئەو لە گیراوەکانە و بڕاوەتەوە. دەڵێن لەم سیڤاستوپولە یەکسەر دوای ڕووداوەکەی "ئالما" خەڵکی زانا و هزرمەند زۆر لەوە دەترسان کە دوژمن بە ئاشکرا پەلاماریان بدات و سیڤاستوپوڵ داگیر بکات. بەڵام هەر ئەوەندەی بینییان دوژمن هەر مەبەستی گەمارۆدانە، دەڵێن نازانن خەڵکی تێگەیشتوو چەندە بەختەوەر و دڵشاد بوون، چونکە دیارە هیچ نەبێت کارەکە دوو مانگی پێدەچێت، لە کوێ دوژمن بە ڕێگەی گەمارۆدان سەردەکەوێت! دیسانەوە پێدەکەنیت، دیسان بڕوا ناکەیت؟ هەڵبەتە تۆیش هەقتە، بەڵێ هەقتە. من لەگەڵ تۆدا هاوڕام کە

هەموو ئەم شتانە پێشهاتی تایبەتین، بە ڕاستی تایبەتین. وەلێ لەگەڵ ئەوەیشدا ڕادیون ڕومانوڤیچی ئازیز، دەبێت لەم نێوەندەدا ئاگامان لەوە بێت حاڵەتی گشتی کە هەموو ڕێساویاساکانی بۆ بگونجێت و لە کتێبەکاندا تۆمار کرابێت، بوونی نییە. بۆیە هەر کارێک، یان هەر تاوانکارییەک کە بە ڕاستی ڕووی دابێت، ڕاست دەگۆڕێت بە حاڵەتێکی تەواو تایبەتی، هەندێکجار بۆ حاڵەتێکی ئەوەندە تایبەتی، کە هەرگیز لە هیچ شتێکی پێشتری خۆی ناکات. لەم لایەنەوە جاری وا هەیە پێشهاتی زۆر گاڵتەجاڕ ڕوو دەدات. بۆ نموونە ئەگەر من کەسێک وەک خۆی واز لێبێنم، هەرگیز نە بیگرم و نە سەر بکەمە سەری، بەو مەرجەی ئەوە بزانێت کە من لە هەر سات و هەر دەقیقەیەکدا.. یان لایەنی کەم هەست بکات کە من هەموو شتێک دەزانم و شەووڕۆژ بە دوایەوەم و چاودێریی دەکەم و بزانێت کە بەردەوام شوێنی گومانە و بترسێت، سوێند دەخۆم گێژ دەبێت و خۆی دێتە پێشێ و دەشێت کاری وایش بکات، کە تەواو وەک ئەوە وابێت کە بڵێیت دوو لەگەڵ دوودا دەکاتە چوار و ڕێک بێتە پێشێ.. باشە، ئەمەیش لە خۆیدا تاموچێژێکی خۆشی هەیە.

ڕەنگە ئەم تێکەوتنە لە جوتیارێکی سادە و ساکار ڕوو بدات، یان کەسانێکی زرنگ و هۆشیاری ئەم سەردەمە کە بەتایبەتی لە زۆر ڕووەوە چاووگوێ کراوە بن. هەر لەبەر ئەمەیە ئازیز، زۆر گرنگە ئەوە بزانرێت کە مرۆڤ، واتا ڕەهەند، بە چ ڕەهەندێک چاووگوێی کراوەیە. ئەوسا دەمار، تۆ دەمارت بە تەواوی لە بیر کردووە؟ ئاخر هەموو ئەمانە نەخۆش و لاواز و شپرزەن!.. بێجگە لەوەی هەموو کەسەکان ڕقاوین، ئەمەیش لە خۆیدا، با پێت بڵێم، لە هەندێک لایەنەوە کۆمەکێکی باشمان پێدەکات. ئیتر بۆ لەوە دڵگران بم کە کەسێکی وا

نەگیراوە و بۆ خۆی لە شاردا دێت و دەچێت. لێی گەڕێ، لێی گەڕێ با بۆ خۆی پیاسە بکات. چونکە من باش دەزانم کە بەو حاڵەیشەوە هەر نێچیری منە و ناتوانێت بۆ هیچ جێگایەک لە دەستم هەڵبێت، باشە بۆ کوێ بچێت؟ هە، هە، هە، بۆ دەرەوەی وڵات؟ ڕەنگە کابرایەکی پۆڵەندی بتوانێت بۆ دەرەوە ڕا بکات، نەک ئەو، بەتایبەتی کە من لە کەمیندام بۆی و چی پێویست بێت کردوومە. ئەی بۆ شوێنێکی زۆر دووری ناو وڵات هەڵدێت؟ ئاخر، لەوێ جووتیار هەن، جووتیاری ڕاستەقینەی ڕووسی، بۆیە ئەمێکی ڕوناکبیری ئەم سەردەمە، پێی باشترە لە زینداندا بێت و کاری زۆر قورسیشی پێبکرێت بەڵام لەگەڵ ئەو جۆرە جوتیارە نامۆیانەماندا نەژی. هە، هە! وەلێ هەموو ئەم قسانە زۆربلێی و ڕووکەشن. هەڵهاتن یانی چی؟ ئەمە لایەنە ڕووکەشەکەیە. مەبەستی سەرەکی شتێکی ترە. لەبەر ئەوە لە دەستی من ڕا ناکات چونکە نازانێت بۆ کوێ بچێت. بەڵکو لەبەر لایەنی دەروونی ناڕوات. هە، هە، هە! چ دەربڕینێکی سەرکەوتووە! ئەو لەبەر یاسای سروشت لە من ڕا ناکات. تەنانەت ئەگەر جێگایەکی هەبێت کە خۆی تیا حەشار بدات. پەروانەت بینیووە بە دەوری شەمدا؟ باشە، ئەویش ئاوا بە دەوری مندا دەسووڕێت. حەزی لە ئازادی نییە، هەمیشە لە بیرکردنەوەدایە، وەک داو خۆی لە نێو تەونێک دەنێت و ترس تا سەر سنووری مەرگ هەراسانی دەکات.. بێجگە لەمە خۆی مەسەلەیەکی لە بابەتی ٢+٢=٤ دەخاتە پێشم.. بێگومان بەو مەرجەی دەرفەتی زیاتری بدەمێ.. هەر بەو جۆرە بە دەورمدا دەسوڕێت و دەسوڕێت تا وردەوردە بازنەکە تەسکتر دەبێتەوە، ئینجا دەکەوێتە ناو دەممەوە! منیش بە ئارەزووی خۆم قووتی دەدەم و ئەوەیش زۆر بە لەزەتە. هە، هە، هە! باوەڕ ناکەیت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی نەبوو. بە ڕەنگی پەڕیوویەوە بێجووڵە دانیشتبوو. بە وردی لە دەموچاوی پۆرفیریی دەڕوانی. بۆ خۆی بیری دەکردەوە: "وانەیەکی چاکە، وەک ئەوەی دوێنێشەو نییە، لە یاریی مشک و پشیلە ناچێت و بێهودە نییە، توانای خۆیم پیشان دەدات.. دەڵێی.. پێم دەڵێ.. زۆر لەوە ئاقڵترە ئەوە بکات.. ئامانجێکی تری هەیە، بەڵام چ ئامانجێک؟ نا، هاوڕێ یاغنیشیت، دەمترسێنیت و داوم بۆ دەچنیت. چ بەڵگەیەکت پێنییە و زەلامەکەی دوێنێش لێرە نییە! تۆ هەر دەتەوێت لە ڕێگەم دەربکەیت. دەخوازیت زوو ڕقم هەستێنیت و ئەوسا لە داوم نێیت، وەلێ خراپ بۆی چوویت و هەڵەیت. هەڵە! باشە ئەی بۆ تا ئەم ڕادەیە ئاماژەم بۆ دەکات؟ ئایا دەماری نەخۆشم بەهەند وەرناگرێت! نا، هاوڕێ کوێرانە لێی دەڕوانیت، تۆ هەڵەیت، هەرچەندە هەر چاڵێکت هەڵکەندووە.. باشە، پاشان دەبینین چ خەوێکت پێوە دیوم!"

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەموو هێز و توانای کۆ کردەوە و بەرانبەر بە بەسەرهاتێکی نادیار و ترسناک خۆی ئامادە کرد، هەندێکجار دەیویست پەلامار بدات و پۆرفیری لە شوێنی خۆیدا بخنکێنێت. ئەو لەو کاتەوەی هاتبووە ژوورێ، ترسی ئەوەی لێنیشتبوو تووشی تووڕەبوونەکی وا ببێت. هەستی کرد لێوی وشک بووە، دڵی تەپەتەپیەتی و کەف لالێوی گرتووە. لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا بڕیاری دا بۆ ماوەیەک بێدەنگ بێت و قسە بە زاریدا نەیەت، دەیزانی کە بۆ ئەم بارەی ئێستا ئەوە باشترین سیاسەتە، چونکە نەک تەنیا بە بێهودە قسە ناکات بەڵکو بە پێچەوانەوە بە بێدەنگییەکەی خۆی دوژمنەکەی تووڕە دەکات، ڕەنگە ببێتە هۆی ئەوەی بەرانبەرەکەی بە قسەکانی

تێبکەوێت، لایەنی کەم ئەمەیش هیوایەک بوو ڕاسکۆلنیکۆڤ ئومێدی پێبەستبوو.
پۆرفیری کە زۆر سەرحاڵ و بەردەوام لە خۆشیدا پێدەکەنی و بە ژوورەکەدا هاتوچۆی بوو، کەوتەوە قسەکردن:
- نا، من وا دەزانم تۆ بڕوام پێناکەیت، وا تێدەگەیت من سووکە گاڵتەیەکت لەگەڵدا دەکەم، باشە، هەڵبەت تۆیش هەقی خۆتە، خوداوەندیش هەیکەلی منی وا دروست کردووە کە خەڵکیی هەر پێکەنینیان پێی بێت، ڕێک وەکو لیبووک، بەڵام دەمەوێت پێت بڵێم و دووبارەیشی دەکەمەوە. کە تۆ، گیانەکەم، ڕادیون ڕومانوڤیچ، لە منی پیرەمێرد ببووریت، تۆ گەنجیت، واتا لە سەرەتای گەنجیدایت و بۆیە وەک هەر لاوێکی دی، هزر و زرنگیی مرۆڤ لە هەموو شتێکی دی زیاتر دەنرخێنیت. توانای هزری پڕ لە تەنز و ئەنجامگیرییە ڕووتەکان سەرسامت دەکەن، لەمەدا لە ڕاوێژکارە سوپاییەکانی نەمسا دەچیت، واتا تا ئەو جێگایەی دەتوانم لەبارەی ڕووداوە سەربازییەکانەوە داوەری بکەم: ئەو بەڕێزانە لەسەر پەڕەی کاغەز، ناپلیونیان شکست دا و بەدیلیان گرت، لە نووسینگەکەشیاندا، کە نازانم چی پێدەڵێن، هەموو مەسەلەکانیان بە وردی شەنوکەو کرد، ڕێکیان خست و دەیانزانی ئەنجامەکەی چۆنە، بەڵام بڕوانە چۆن سەرلەشکرەکەیان "ماکس" لەگەڵ هەموو سوپاکەیدا خۆی بەدەستەوە دا. هە، هە، هە! باشە، دەبینم، ڕادیون ڕومانوڤیچی ئازیز، پێم پێدەکەنیت، لەبەر ئەوەی من کەسێکی مەدەنیم و کەچی نموونەکانم لە مێژووی سەربازییەوە سەرچاوە دەگرێت. بەڵێ، ئەی چی بکەم. ئەمەیە لاوازیی من، حەزم لە کاری سەربازییە و نازانیت چەند لە خوێندنەوەی کاروباری سەربازی چێژ وەردەگرم.. لە ڕاستیدا من لە هەڵبژاردنی

پیشەدا هەڵەم کردووە. دەبوو من ژیانی سەربازیم هەبێت و لە سوپادا بم. ڕەنگە نەبوومایە بە ناپلیون، بەڵام حەتمەن دەبووم بە کۆلۆنێل، هە، هە، هە!
باشە ئازیزم، ئێستا هەموو وردەکاری و ڕاستییەکانی مەسەلەکە، واتا مەسەلە تایبەتییەکەت بۆ ڕاڤە دەکەم: ڕاستی و سروشت، بەڕێزم، شتێکی زۆر گرنگن، زۆرجار ئەم دووانە پلانە هەرە وردەکان بەتاڵ دەکەنەوە. گوێ لەم پیرەمێردە بگرە. دڵگیرانە ئەمە دەڵێم، ڕادیون ڕومانوڤیچ (پۆرفیری پتروڤیچ کە ئەم قسانەی دەکرد، تەمەنیشی لە دەوروبەری سیوپێنجساڵیدا بوو، تەواو وەک پیرەمێردێک دەهاتە بەرچاو، تەنانەت دەنگی گۆڕابوو و پشتیشی کۆمابووەوە) پاشان من پیاوێکی قسەلەڕووم.. بەڕاست من قسەلەڕووم یان نا؟ دەڵێی چی؟ من قسەلەڕووم، من ئەمە هەروا بێبەرانبەر بە تۆ دەڵێم و هیچم لە تۆ ناوێت، هە، هە، هە! باشە، کەواتە قسەکەم تەواو دەکەم: هۆشیاری بە لای منەوە گەلێک گەورەیە، وەک دەڵێن، جوانیی سروشت و دڵخۆشیی ژیانە، لە ڕاستیشدا هۆشیاریی دەتوانێت شتی زۆر نهێنی دروست بکات، کەواتە لێکۆڵەرەوەیەکی بێچارەی ئاسایی کە خۆیشی گیرۆدەی خەیاڵە –چونکە ئەویش مرۆڤێکە وەک مرۆڤەکانی تر– چۆن دەتوانێت ئەو کێشانە چارەسەر بکات، وەلێ نەگبەتی لەوەدایە کە سروشت فریای ئەو لێکۆڵەرەوە بێچارەیە دەکەوێت و ڕزگاری دەکات. کەچی ئەو لاوانەی شەیدای هۆشیارین کە –بە زاراوەی دوێنێشەوی زرنگانە و فیلزانانەی تۆ– "بەسەر هەموو گیروگرفتێکدا زاڵ دەبن" تەنانەت بیر لەمە ناکەنەوە. لاوی هۆشیار، لەو لایەنە تایبەتیەوە، دەشێت درۆ بکات و درۆکەیشی زۆر لێزانانە و فێڵبازانە بکات و وایش بزانێت کە سەرکەوتووە و لە بەرهەمی هۆشیارانەی

خۆی چێژ وەربگرێت، وەلێ ناتوانێت و دەکەوێت، لەپڕێکدا لە جێگایەکی زۆر گرنگ و حەساسدا لە هۆش خۆی دەچێت. ڕەنگە نەخۆشیش بێت، هەندێکجار هەوای ژوورێک پیس و خەفەکەرە، بەڵام هەر گومانێک دروست دەکات! درۆکەی زۆر باش کرد، بەڵام حسابی بۆ سروشتی خۆی نەکرد و کەوتە داوەکەوە. هەندێکجاریش کە بە یاریی هۆشیارییەکەی مەست دەبێت، سەر دەکاتە سەر یەکێک، کە گومانی لێی هەیە، کەچی لەپڕێکدا یارییەکەی خۆ دەکێشێتە ئەوەی کە ڕەنگی خۆی هەڵبزرکێنێت، وەلێ ڕەنگی زۆر سروشتییانە دەپەڕێت و حاڵوباری گەلێک باش و سروشتییە، ئەمەیش بەدگومانییەکی تری بۆ دروست دەکات.

هەرچەندە جاری یەکەم فێڵەکە سەردەگرێت و لێکۆڵەرەوەکە دەخەڵەتێ، بەڵام ئەو لێکۆڵەرەوە خەڵەتاوە بە درێژایی شەو دێتەوە سەر خۆی و ئاوەزەکەی. بێگومان ئەگەر خۆیشی مرۆڤێکی هۆشیار بێت. ئاخر، لەم بابەتانە زۆرن، بۆ نموونە، خۆی پێش دەستی هەندێک کاروبار دەکات کە کەس لێی نەپرسیووە، هەمیشە خۆی لە شتگەلێک هەڵدەقورتێنێت، کە لە ڕاستیدا دەبێت لێی بێدەنگ بێت. قسە دەکات و دەدرکێنێت و ئاماژە دەکات. هە، هە! خۆی دێت و پرسیار دەکات کە بۆچی ئەم ماوە زۆرە منتان نەگرتووە؟ هە، هە، هە! دەشێت ئەمە لە زرنگترین کەس، یان زانایەکی دەروونی و ئەدیبێکیش ڕوو بدات. سروشت ئاوێنەیەکی زۆر شەفافە، تەماشای بکە و برۆ. بەڵام، ڕادیون ڕومانوڤیچ بۆ وا ڕەنگت هەڵبزرکاوە، هەناسەت تەنگ بووە، پەنجەرەکەت بۆ بکەمەوە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ هاواری کرد:

- نا، تکایە زەحمەت مەکێشە.

لەپڕێکدا دایە قاقای پێکەنین.
- تکایە زەحمەت مەکێشە!
پۆرفیری بەرانبەری وەستا، کەمێک چاوەڕێی کرد و لەپڕێکدا ئەویش لە دوایەوە دایە قاقای پێکەنین.
ڕاسکۆلنیکۆڤ زوو پێکەنینە هیستریاییەکەی خۆی وەستاند، لەسەر قەنەفەکە هەستا، ئەگەرچی نەیدەتوانی بە پێوە بوەستێت، بەڵام بە دەنگێکی پڕ لە تواناوە وتی:
- پۆرفیری پتروڤیچ، من سەرئەنجام بە ئاشکرا دەبینم تۆ لە کوشتنی ئەو پیرێژنە و لیزاڤێتای خوشکی تەواو لە من بەدگومانیت، من لای خۆمەوە ڕایدەگەیەنم کە ئەو بەسەرهاتە ماوەیەکە منی تەواو بێتاقەت کردووە، ئەگەر دەزانیت لەسەر هەقیت، بە شێوەیەکی یاسایی چاودێریم بکە، ئەگەر دەیشزانیت پێویستە بمگریت، بمگرە. بەڵام من ڕێگەت پێنادەم گاڵتەم پێبکەیت و ئازارم بدەیت.
لەناکاودا لێوی لەرزی، چاوی ڕقی تێزا و دەنگی کە تا ئەو کاتە لە کۆنترۆڵی خۆیدا بوو، بەرزبووەوە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەپڕێکدا بە هەموو توانای مشتی بەسەر مێزەکەدا کێشا و هاواری کرد:
- بەڵێ ڕێگەت پێنادەم، گوێت لێمە پۆرفیری پتروڤیچ؟ هەرگیز ڕێگەت پێنادەم.
پۆرفیری پتروڤیچ کە پێدەچوو ڕووبەڕووی مەترسییەک بووبێتەوە، دەنگی هەڵبڕی:
- ئای خودایا، دیسانەوە چی ڕووی داوە، گیانەکەم، ڕادیون ڕومانوڤیچ، ئازیزم، باوکم، ئاخر تۆ چیتە؟
دیسانەوە ڕاسکۆلنیکۆڤ هاواری لێ بەرز بووەوە:

- ڕێگەت پێنادەم.
پۆرفیری پتروڤیچ ڕووی لە ڕووی ڕاسکۆلنیکۆڤ نزیک خستەوە، بە ترسەوە و لەبەر خۆیەوە وتی:
- ئازیزم، لەسەرخۆ بە، چونکە گەر گوێیان لێبێت، دێنە ژووری، چاکە، ئەوسا ئێمە چییان پێبڵێین. بیری لێبکەرەوە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ زوو وتیەوە:
- ڕێگەت پێنادەم، ڕێگەت پێنادەم.
بەڵام ئەمجارەیان قسەکانی لەبەر خۆیەوە وت.
پۆرفیری خێرا ڕووی وەرگێڕا و بەرەو لای پەنجەرەکە چوو تا بیکاتەوە، وتی:
- چاکە هەوای تازە بێتە ژووری، وا چاکە تۆزێک ئاو بخۆیتەوە، ئازیزم ئەمە کاتی بەڵاکەیە.
بەدەم قسەکانەوە بەرەو لای دەرگاکە چوو تا داوای ئاو بکات، بەڵام خۆشبەختانە هەر لە ژوورەکەدا، لە گۆشەیەکیدا گۆزەیەک ئاوی دۆزیەوە، پەرداخێکی هێنا بۆ ڕاسکۆلنیکۆڤ و لەبەر خۆیەوە وتی:
- باوکە گیان، فەرموو، بەڵکو تۆزێک چاک بیت.
ترس و دڵسۆزیی پۆرفیری پتروڤیچ هێند سروشتی بوو، کە ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەنگ بوو، زۆر بە وردی کەوتە تەماشای، وەلێ ئاوەکەی لێوەرنەگرت.
- ڕادیون ڕومانوڤیچ، ئازیزم، ئاخر تۆ بەم حاڵەوە حەز بە شێتبوون دەکەیت، باوەڕم پێبکە، کەمێک ئاو بخۆرەوە، ئاخر هەر هیچ نەبێت تۆزێک.
ڕاسکۆلنیکۆڤی ناچار کرد پەرداخە ئاوەکەی لێوەربگرێت. ڕاسکۆلنیکۆڤ بەبێ بیرکردنەوە خێرا ویستی پەرداخەکە بخاتە سەر

لێوی، بەڵام زوو هاتەوە سەر خۆی و بە بێزارییەوە لەسەر مێزەکە دایینا.
پۆرفیری پتروڤیچ بە زمانێکی خۆش، بەڵام بە سیمایەکی پڕ لە ترس و دڵەڕاوکێوە کەوتە دڵدانەوەی:
- بەڵێ، ئەمە بەڵاکە بوو، ئازیزم، نەخۆشییە کۆنەکە سەری لێداویتەوە، خودایا! ئاخر بۆ ئاگاداریی خۆت ناکەیت؟ دیمیتری پرۆکفیچیش دوێنێشەو هاتە لام، لەگەڵ ئەوەدام، من لەگەڵ ئەوەدام کە خوویەکی توندوتیژم هەیە، خوویەکی خراپ، بەڵام ئەو چ بەرئەنجامێکی لەم مەسەلەیە گرت. خودایا! دوێنێشەو دوای تۆ هات، پێکەوە نانمان خوارد، هەر قسەی کرد و من سەراسیمە بووم و لای خۆمەوە بیرم کردەوە: "عەجەب!.. ئایا تۆ ناردووتە؟" ئاخر دانیشە، ئازیزم، توو سەری مەسیح دابنیشە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی دایەوە:
- نا، لای منەوە نەهاتووە! وەلێ دەمزانی دێتە لات و بۆچیش دێت.
- دەتزانی؟
- دەمزانی، جا ئەوە چییە؟
- ڕادیون ڕومانوڤیچی ئازیز، من نەک هەر ئاگام لەو کارەت بێت، بەڵکو ئاگاداری هەموو شتێکتم، هەموو شتێک. دەزانم چۆن چووبوویت بۆ بەکرێگرتنی ئاپارتمانەکە. ڕێک لە خۆراوابووندا، کاتێک دنیا تاریک داهاتبوو، زەنگەکەت لێدا و لەبارەی خوێنەوە چەند پرسیارێکت کرد، کرێکار و دارتاشەکانت تەواو وڕ کرد، لەو ساتەدا بە چاکی دەرکی باری دەروونیتان دەکەم.. لەگەڵ ئەمانەیشدا، سوێند دەخۆم کە تۆ وا بکەیت، شێت دەبیت. لە دەروونی تۆدا ڕق لەڕادەبەدەر هاتۆتە جۆش، بێگومان ڕقێکی پیرۆزە. ئەنجامی ئەو

ئازارانەیە کە دەیچێژیت، لە سەرەتادا لە چارەنووس و پاشان لە پۆلیس، هەر لەبەر ئەوەیە تۆ ئەملاوئەولا دەکەیت تا وەک دەڵێن، زوو خەڵکی بهێنیتە قسە و کارەکە یەکلایی بێتەوە. چونکە ئەم قسە بێمانا و بەدگومانییە تەواو بێتاقەتیان کردوویت، وایە؟ باش لە لایەنی دەروونیت گەیشتووم، نا؟.. وەلێ تۆ لەمەدا نەک هەر خۆت، بەڵکو ڕازومیخینیش تێک دەدەیت. ئاخر، ئەو لەم کێشانەدا گەلێک میهرەبانە، تۆ خۆت دەزانیت، تۆ نەخۆشیت و ئەو سادە و پاکە و لە ئەنجامدا ئەویش تووشی نەخۆشییەکەی تۆ دەبێت.. من، ئازیزم، کاتێک دێیتەوە سەر خۆت، بۆت ڕوون دەکەمەوە.. ئاخر گیانەکەم گوێ بگرە، بۆ خاتری مەسیح دابنیشە، تکات لێدەکەم بحەسێرەوە، ڕەنگ بە ڕووتەوە نەماوە، ئاخر، ئیدی دابنیشە..

ڕاسکۆلنیکۆڤ دانیشت، لەرزەکەی هاتبووە کۆتایی، بەڵام تا هەموو لەشی داغ کردبوو، بە وردی و سەرسامییەوە گوێی لە قسە دۆستانەکەی پۆرفیری گرتبوو، وەلێ بڕوای بە تاقە وشەیەکی نەدەکرد، هەرچەندە هەستی وابوو کە ئارەزوویەکی سەیری تیایە بۆ ئەوەی بڕوا بە قسەکانی بکات. وتە کتوپڕەکەی پۆرفیری لەبارەی بەکرێگرتنی ئاپارتمانەکەوە بەجارێ سەرسامی کردبوو، بیری کردەوە: "چۆن لەبارەی بەکرێگرتنی ئاپارتمانەکەوە شت دەزانێت و خۆیشی بۆم باس دەکات؟"

پۆرفیری بەپەلە لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

- بەڵێ، پێشتریش، لە ئەزموونی دادگاییماندا، ڕووداوی لەم جۆرە نەخۆشییە سایکۆلۆژییە بەرەو ڕوومان بۆتەوە، یەکێک هەر بەم شێوەیە خۆی بە تاوانی کوشتن دایە قەڵەم، چۆن ئەنجامدانێکیش! کەوتە وڕێنەیەکی بەردەوام و بەڵگەهێنانەوە، بە وردی ڕووداوەکەی

گێڕایەوە، سەری هەمووی بەگێژ هێنا و ڕێی لێ هەڵە کردن. لە کاتێکدا کە بەبێ بیرکردنەوە و ویستی خۆی تا ڕادەیەک ببووە هۆی کوشتنەکە، بەڵێ تا ڕادەیەک، چونکە کە زانی بووە بە هۆکارێک کە بکوژەکان ئەو تاوانە بکەن، تاسا، تێک چوو، کەوتە نێو خەیاڵ و وەهمێکەوە تەواو سەری لێشێوا و خۆی دڵنیا کرد کە ئەو بکوژی ڕاستەقینەیە. بەڵام ئەنجومەنی دادگای باڵا سەرئەنجام گرێکەی کردەوە و ئەو نەگبەتەی بەرەڵا کرد و خستییە ژێر چاودێرییەوە، سوپاس بۆ دادگای باڵا، ئەی داد و بێداد، ئاخر، ئاخر ئازیزەکەم وا نابێت، نابێت ئاوا خۆت دووچاری ماخولیا بکەیت، ئەمە دەمارت دەهاڕێ و ڕەنگە شەوانە بگەڕێیت و لە زەنگی ماڵان بدەیت و پرسیاری خوێن بکەیت. من ئەم باری دەروونییە بە تاقیکردنەوە باش فێری بووم. مرۆڤ هەندێکجار پێی خۆشە لە پەنجەرەوە یان لە قەڵایەکی بەرزەوە خۆی هەڵبداتە خوارێ، ئەم هەستە لەو حاڵەتەدا خۆش دێتە بەرچاو، هەروەها لەزەنگدانیش.. نەخۆشییە ڕادیون ڕومانوڤیچ، نەخۆشی. تۆ زۆر گوێ بە نەخۆشییەکەت نادەیت. دەبێت سەر لە پزیشکێکی شارەزا بدەیت. ئاخر ئەو هاوڕێ قەڵەوەت بە کەڵکی چی دێت! تۆ دووچاری نەخۆشیی وڕێنەیت. هەموو ئەم شتانەیش لە کاتی وڕێنەکردندا ڕوو دەدەن!

بۆ چرکەساتێک هەموو ژوورەکە لەبەرچاوی ڕاسکۆلنیکۆڤدا سووڕا، بە خۆی دەوت: "تۆ بڵێی تا ئێستا هەر درۆ بکات؟ مەحاڵە، مەحاڵە!" دەیویست ئەو بیرە لە سەری خۆی دوور بخاتەوە، لەبەر ئەوەی تا دەهات، زیاتر هەستی بەوە دەکرد کە تا چەند دەشێ ئەم بیرە تووڕەوتەوسنی بکات و لەوانەیشە هەر ئەم تووڕەییە بیگەیەنێتە

شێتی. پاشان بۆ درکپێکردنی یارییەکەی پۆرفیری، بە تەواوی توانای هزری خۆی کۆ کردەوە و دەنگی لێهەڵبڕی.

- ئەوەی تۆ باسی دەکەیت لە کاتی وڕێنەکردندا نەبوو، بەڵکو من گەلێک هۆشیار بووم، لە هۆشیاریدا بوو دەبیستیت، لە هۆشیاریدا؟

- بەڵێ تێدەگەم و دەبیستم، تۆ دوێنێش هەر دەتوت لە کاتی وڕێنەکردندا نەبووە. بەتایبەتیش پێت لەسەر ئەوە دادەگرت کە لە کاتی وڕێنەکردندا نەبووە! هەرچی تۆ دەیڵێیت من تێی دەگەم! ئەی داد.. ئاخر تۆ گوێ بگرە، ڕادیون ڕۆمانوڤیچ، گەورەم، با بڵێین وایە.. ئاخر، ئەگەر تۆ بە ڕاستی.. ئەم کارەت ئەنجام دابێت، یان بە هەر شێوەیەک بەشداریت لە کارێکی وا قێزەوندا کردبێت، ئەوسا دەکرا، ئاخر تۆ خوات بێت، دەکرا جەخت لەسەر ئەوە بکەیت کە هەموو ئەو کارانەت لە کاتی وڕێنەدا نەکردووە و بە پێچەوانەوە بە تەواوی هۆشیارییەوە ئەنجامت داوە؟ ئەمە دەبێت ئاوا جەخت بکەیت و پێ لەسەر سەرسەختیی خۆت دابگریت؟ ئاخر، دەبوو، تۆ خوات بێت، ئەوە دەبوو؟ بە ڕای من تەواو بە پێچەوانەوە دەشکایەوە. ئەگەر تۆ هەستت بە تاوانباری بکردایە، ئەوسا دەبوو جەخت بکەیت کە حەتمەن لە حاڵەتی وڕێنەکردندا بوویت. وانییە؟ وایە، نا؟

پرسیارەکە سەگایەتییەکی تیابوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ لە نزیک پۆرفیرییەوە کە بەسەریدا نووشتابووەوە، پاڵیدا بە پشتی قەنەفەکەوە و بێدەنگ، بە سەرسامییەوە کەوتە لێڕامانی.

پۆرفیری کەوتەوە قسەکردن:

- یان لەبارەی جەنابی ڕازومیخینەوە، کە دوێنێشەو لە خۆیەوە یان لای تووە هاتبوو. وا بۆ تۆ چاکە بڵێیت ئەو لە خۆیەوە هاتووە و نکوڵیی لەوە بکەیت کە تۆ ناردبێتت، بەڵام کە تۆ نکوڵی لە هاتنی

ناکەیت، کەواتە سووریت لەسەر ئەوەی بڵێیت ئەو بە دنەدانی تۆ هاتۆتە ئێرە!

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەرگیز جەختی لەسەر ئەوە نەکردبوو، سەرما خزیبووە پشتی و لەسەرخۆ و بە زەردەخەنەیەکی کەچی لالێویەوە وتی:

- ئەوەی کە وتت هەمووی درۆیە، تۆ تازە دەتەوێت وا لە من بگەیەنیت کە لە گەمەی من ئاگاداریت، پێشتر هەموو وەڵامەکانم دەزانیت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستی کرد کە قسەکانی ئەم وەک پێویست وەرناگرێت:

- دەتەوێت بمترسێنیت.. ڕێکوڕەوان تۆ گاڵتەم پێدەکەیت..

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە ئەم قسانەی دەکرد، زۆریش لێی ڕامابوو، لەپڕا ڕقێکی خەست لە چاویەوە بروسکەی دا و هاواری کرد.

- هەموو قسەکانت درۆن، تۆ خۆت زۆر باش دەزانیت چاکترین ڕێگە بۆ خۆدزینەوەی تاوانبار ئەوەیە تا ئەو جێگایەی کە بشێت بیڵێت، نکۆڵیی لێنەکات و نەیشارێتەوە. من بڕوام بە تۆ نییە.

پۆرفیری بە تەوسەوە وتی:

- چ کابرایەکی جەربەزەیت! لەگەڵ تۆدا چنگاوشبوون زەحمەتە. بیرۆکەیەک لە ناختا ڕەگی داکوتاوە، کەواتە بڕوات بە من نییە؟ وەلێ حەز دەکەم پێت بڵێم تا ڕادەیەک بڕوات پێکردووم، هەر بە ئەندازەی موویەک بڕوات بە قسەکانم هەیە و من هەوڵی ئەوەمە تەواو ببمە جێی بڕوات، چونکە بە ڕاستی من تۆم خۆش دەوێت و لە ناخەوە حەز بە چاکەت دەکەم.

لێوی ڕاسکۆلنیکۆڤ هاتبووە لەرزین.

پۆرفیری کە بە هێوری و دۆستانە دەستی بە سەر باسکی ڕاسکۆلنیکۆڤدا هێنا، کەوتەوە قسەکردن:
- بەڵێ، لە ناخەوە حەز دەکەم.. بڕوام پێبکە، وەک هاوڕێیەک پێت دەڵێم و بەبێ هیچ پێچوپەنایەک کە دەبێت ئاگات لە تەندروستیی خۆت بێت. بە تایبەتی کە ئێستا خێزانەکەت هاتوون بۆ لات، هیچ نەبێت ئاگاداریان بە، تۆ دەبێت دڵیان خۆش بکەیت و نازیان هەڵگریت، کەچی دەیانترسێنیت..
- ئەوە چ پەیوەندیی بە تۆوە هەیە؟ لە کوێ دەزانیت؟ بۆ ئەوەندە خۆت لە کاری خەڵکی هەڵدەقورتێنیت؟ دیارە تۆ هەر بە دوای منەوەیت و مەبەستیشتە من ئەوە بزانم؟
- ئای خودایا! ئاخر من هەموو ئەمانەم لە خۆت بیستووە، تۆ هەر ئاگات لەوە نییە کە حاڵت خراپ دەبێت هەموو شتێک یەک بەدوای یەکدا بە من و کەسانی تریش دەڵێیت. دوێنێشەو، لە ڕازومیخینی بەڕێز، واتا دیمیتری پرۆکفیچ ڕازومیخین، زۆر شتی سەرنجڕاکێشم بیست، نا، تۆ قسەکەت پێبڕیم، دەخوازم پێت بڵێم کە بە هۆی ئەو بەدگومانییەتەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا کە زۆر وریایت، دەربارەی گەلێک کاروباری جیاواز بیری خۆت لەدەست داوە، بڕوانە، با بگەڕێینەوە سەر مەبەستەکەی پێشوو، مەسەلەی زەنگەکە، کە بە ڕاستی بەڵگە و ڕووداوێکی گرنگە، گومان هەڵناگرێت. من کە لێکۆڵەرم، پاک و پوخت خۆم خستمە بەردەستت، تۆ هیچ لەمەدا نابینیت؟ ئاخر، ئەگەر من کەمێک لە تۆ بەدگومان بوومایە، ئەوەم دەکرد؟ بە پێچەوانەوە ئەگەر وا بووایە و من گومانم لێبکردیتایە، ئەوسا دەبوو بەدگومانییەکەت بخەوێنم و بە ڕوومدا نەهێنم کە من ئاگاداری ئەوەم و دەیزانم، تۆیش بە لایەکی تردا بەرم و ئەوسا لە ناکاوێکدا، بە تەور (وەک

خۆت دەڵێیت) بکێشم بە تەوقی سەرتا و وردوخاشت بکەم، بۆ نمونە لێت بپرسم: "ئەرێ بەڕێز، تۆ سەعات دە یان یانزەی شەو لەماڵی کوژراوەکە چیت دەکرد؟ بۆ پەتی زەنگەکەت ڕاکێشا؟ بۆ لەبارەی خوێنەوە پرسیارت کرد؟ بۆ سەرت لە دەرگاوانەکان شێواندبوو و دەتویست بیانکێشیتە لای سەرۆکی بەشی پۆلیس؟" بەڵێ، دەبوو من ئەوە بکەم، تەنانەت ئەگەر یەک تۆزیش گومانم لە تۆ بکردایە، دەبوو بە هەموو ڕێوڕەسمێکەوە لێکۆڵینەوەت لەگەڵدا بکەم، ماڵەکەت بپشکنم و لەوانە بوو بیشتگرم.. کەواتە، دیارە من لە تۆ بەدگومان نیم و بە پێچەوانەوە ڕەفتارم لەگەڵ تۆدا کردووە. بەڵام تۆ تەندروستیی خۆتت لەدەست داوە، دووبارەیشی دەکەمەوە، کە تۆ هیچ شتێک بە چاکی نابینیت!

بە جۆرێک هەموو لەشی ڕاسکۆلنیکۆڤ کەوتە لەرزین، کە پۆرفیری پتروڤیچ بە چاکی هەستی پێکرد.

ڕاسکۆلنیکۆڤ دەنگی هەڵبڕی:

- هەرچییەک دەڵێیت درۆیە. من لە مەبەستت تێناگەم، وەلێ دەزانم درۆ دەکەیت.. پێشتر قسەکانت بۆنی ئەمەی لێنەدەهات و من هەرگیز بە هەڵەدا ناچم.. تۆ درۆ دەکەیت!

پۆرفیری کە خرۆشانی پێوە دیار بوو، بەڵام خۆی دەگرت و نەیدەویست خۆشحاڵییە زۆر و گاڵتەجارییەکەی لەدەست بدات، بەوەی کە بەرانبەر بە ڕاوبۆچوونەکانی ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەر خۆی هیچ نیگەران نییە. بەردەوامیش بوو لەسەر قسەکانی:

- من درۆ دەکەم؟ درۆ دەکەم؟.. باشە، جاری پێشوو ڕەفتارم لەگەڵتا چۆن بوو؟ من کە دادوەری لێکۆڵەرم، خۆم هاوکاریم کردیت، هەموو کەرەسەیەکی بەرگریکردنم خستە بەردەستت و خۆم مەسەلە

سایکۆلۆژییەکانم پێوتیت: "نەخۆشی، وڕێنەکردن، خەمۆکی، ڕەنجی زۆر، مالیخولیا و پۆلیسەکان" و شتی تریشم بیر خستیتەوە، وایە؟ هە، هە، هە! ئەگەرچی دەبێت ئەوەیش بڵێم کە هەموو ئەم کەرەسەی بەرگری لەخۆکردنانە، تەواوی ئەم پاساو و هەوڵانە تەنیا ڕووکەشن و دوو سەریان هەیە: "نەخۆشی، وڕێنە، خەون و فەرامۆشی" هەموویان ڕاستن، بەڵام بەڕێز، بۆ لە کاتی نەخۆشی و وڕێنەکردندا تۆ هەر ئەم جۆرە خەونانە بە بیرتا دێت نەک شتی تر، ئاخر نەدەبوو خەونی تریش ببینیت؟ وا نیە؟ هە، هە، هە!

ڕاسکۆلنیکۆڤ بەدەم لەجێگاهەستانەوە پۆرفیریی کەمێک دایە دواوە، بە فیز و بێزارییەوە لێی ڕوانی و بە دەنگی بەرز پێی وت:

- بە کورتی دەمەوێت بزانم، ئایا تۆ هیچ جۆرە بەدگومانییەکت بەرانبەر بە من هەیە یان نا؟ دەی پۆرفیری پتروڤیچ، بە ڕوونی و خێرا ئەمەم پێبڵێ، دەبێت هەر ئێستا پێم بڵێیت!

پۆرفیری بە ڕوویەکی شاد و فێڵاوی و بەبێ ئەوەی هیچ دوودڵییەکی پێوە دیار بێت، بە سەریدا خوڕی:

- چ داوایەکی سەیرە! بە ڕاستی پەیوەندییەستن لەگەڵ تۆدا کارێکی ئاسان نییە! ئاخر، تۆ دەتەوێت چی بزانیت، دەتەوێت چی بکەیت تا هەموو شتێک بزانیت! تا ئێستا کەس تەنگی پێ هەڵچنیویت! تۆ هەر لە منداڵ دەکەیت: داخوازیت هەیە، دەتەوێت ئاگر بە دەستەوە بگریت. ئاخر، تۆ بۆ ئەوەندە خۆت ئازار دەدەیت؟ بۆ هێندە سووریت کە پەیوەندی لەگەڵ ئێمەدا ببەستیت، هۆیەکەی چییە؟ بۆ؟ هە، هە، هە!

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تووڕەییەکی زۆر نائاساییەوە شیڕاندی:

- پێت دەڵێم کە ئیتر من لە حەوسەڵەمدا نەماوە..

پۆرفیری قسەکانی پێبڕی:

- بێحەوسەڵەیی لە چی؟ بێباوەڕیی؟
دیسانەوە ڕاسکۆلنیکۆڤ مشتی بەسەر مێزەکەدا کێشا و هاواری کرد:
- سەرمەنێرە سەرم، نامەوێت.. پێموتیت نامەوێت، ناتوانم و نامەوێت! تێدەگەیت!
- لەسەرخۆتر، لەسەرخۆتر. ئاخر، گوێیان لە دەنگمان دەبێت، بە ڕاستی پێت دەڵێم: ئاگات لە خۆت بێت. گاڵتە ناکەم!
پۆرفیری ئەم قسانەی تا ڕادەیەک بە هێوری وت، ئەمجارە وەک پێشتر لە دەموچاویدا ئەو حاڵەتی ڕاستگۆیی و سەرسامییەی ژنێکی گوندیی نەبوو. بە پێچەوانەوە ئەمجارە ڕاستوڕەوان فەرمانی دەدا، ڕووی گرژ و برۆی هێنابوونەوە یەک، وەک ئەوەی بیەوێت هەموو نهێنی و ئاماژە گوماناوییەکان بخاتە لاوە. بەڵام ئەمە تەنیا چرکەساتێکی خایاند، ڕاسکۆلنیکۆڤ کە بارەکەی هەر ئاوا بەبێ یەکلاییکردنەوە بینی، خەریک بوو تەواو لە پێستی خۆی دەربچێت، بەڵام سەیر ئەوە بوو گوێڕایەڵیی فەرمانەکەی کرد، هەرچەندە ڕق و تووڕەیی تەواو بەرکیان گرتبوو، کەچی ئەو دەنگی نزم کرد و لەسەرخۆ کەوتە قسە کردن:
- ڕێگەی ئازاردانی خۆمت پێنادەم.
لەگەڵ ئەو ئازار و بێزارییەی هەستی پێدەکرد، هەستی کرد ناتوانێت فەرمانی بەرانبەرەکەی بەجێ نەهێنێت. بۆیە لە جاری پێشوو زیاتر ڕق گرتی و وتی:
- بمگرە،ماڵەکەم بپشکنە، بەڵام تکایە بەپێی یاساوڕێسا مامەڵەم لەگەڵدا بکە و یاریم لەگەڵدا مەکە! هەقی ئەوەت نییە..

پۆرفیری وەک پێشوو زەردەخەنەیەکی پڕ لە تەفرەی بۆ کرد، دەتوت لە تەماشاکردنی ڕاسکۆلنیکۆڤ چێژ وەردەگرێت، قسەی پێبڕی و وتی:

- هێند نائومێد مەبە، من تۆم بە تایبەتی و خۆمانە میوانداری کردووە، وەک هاوڕێی ڕاستەقینە.

- من هاوڕێیەتی تۆم مەبەست نییە و تفی لێدەکەم، گوێت لێمە؟ ئێستایش کڵاوەکەم هەڵدەگرم و دەڕۆم، دەی، دەڵێی چی، ئەگەر دەتەوێت بمگریت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ لەگەڵ قسەکانیدا کڵاوەکەی هەڵگرت و بەرەو لای دەرگاکە چوو، دیسانەوە پۆرفیری پێکەنی و جارێکی تریش بازووی گرت و لەبەر دەرگاکە وەستاندی:

- حەز دەکەیت شتێکی سەیر و سەرنجڕاکێش ببینیت؟

دیار بوو پۆرفیری لەڕادەبەدەر دڵخۆش و هێور بوو، ئەمە ڕاسکۆلنیکۆڤی دەهری کردبوو. لەپڕێکدا وەستا و بە نیگەرانییەکەوە کە لە پۆرفیری دەڕوانی، لێی پرسی:

- چ شتێکی سەیر و سەرنجڕاکێش؟ چی بووە؟

- شتێکی سەیری چاوەڕواننەکراو، لێرەدا، لە پشت دەرگای ژوورەکەمدا دانیشتووە، هە، هە، هە!

بەدەم قسەکانییەوە بە پەنجەی ئاماژەی بۆ لای دەرگایەکی داخراو کرد لە دیوارێکی باریکدا، کە دەچووەوە سەر باڵکۆنە دەوڵەتییەکەی:

- تەنانەت دەرگاکەیشم لەسەر داخستووە نەک ڕا بکات.

- چییە مەسەلە؟ لە کوێ! چی؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە دەرگاکە نزیک کەوتەوە و ویستی بیکاتەوە، وەلێ دەرگاکە داخرابوو.

- داخراوە و ئەمەیش کلیلەکەیەتی.
بەڕاستیش پۆرفیری کلیلێکی لە گیرفانی خۆی دەرهێنا و پیشانی دا.
ڕاسکۆلنیکۆڤ کە ئیتر خۆی پێنەگیرا، بەسەریدا نەڕاندی:
- هەرچی دەڵێیت درۆیە، درۆیە، لێبووکی نەفرەتی!
خۆیشی بەرەو لای پۆرفیری ڕادا، کە ئەویش بەبێ ترس بەرەو لای دەرگاکە پاشەکشەی کرد. لێی نزیک کەوتەوە و بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی:
- من هەموو شتێک تێدەگەم، هەموو شتێک! تۆ درۆ دەکەیت، سەردەخەیتە سەرم تا تەواو بمهاڕیت و شت لەسەر خۆم بڵێم..
- ئاخر، بەڕێز ڕادیون ڕومانوڤیچ، لەمە زیاتر کە تۆ دەیکەیت، چی تر هەیە بۆ ڕاستی لەسەرخۆ وتن، تۆ هیچ ئاگات لە خۆت نەماوە! هاواریش مەکە ئەگینا ناچار دەبم پیاوەکانم بانگ بکەم.
- درۆ دەکەیت، هیچ نییە، بانگیان بکە، تۆ دەتزانی من نەخۆشم و دەتویست مێشکم بهێنیتە ژاروژەنگ و تووڕەم بکەیت بۆ ئەوەی ڕاستی لەسەرخۆم بڵێم. ئەمەیە ئامانجی تۆ! نا، بەڵگەت بەدەستەوەیە، بیسەلمێنە. من لە هەمووی تێگەیشتووم! تۆ بەڵگەیەکت نییە، تۆ تەنها گریمانەیەکی سووک و ڕسوات بەدەستەوەیە، کە لە زامیوفەوە پێت گەیشتووە.. تۆ خووی من دەزانیت، دەتویست، لە پێستی خۆمم دەربکەیت و پاشان قەشە و پارێزەرم[1] بێنیتە سەر.. تۆ چاوەڕێی ئەم شتانەیت؟ وایە چاوەڕێی ئەوەیت؟ ئەی کوان؟ بۆ نایانهێنیت!

---

[1] (قەشە و پارێزەر) لە سیستمی قەزایی ئەوسادا ئەوە باو بووە کە لە سەرەتای لێکۆڵینەوەدا قەشەیەک ئامادە کراوە بۆ سوێنددانی تاوانبارکراو و پارێزەرەکەیش بۆ ناسینی شوناسنامەکەی. -و-

- پارێزەری چی، بەڕێز! بەڕاست مرۆڤ چی بەسەر دێت! بەم حاڵەی ئێستاوە ناکرێت وەک تۆ دەڵێیت ڕەچاوی یاساوڕێسا بکرێت، هاوڕێ، تۆ تەواو نیت، نازانیت.. ئێمە لە یاسا و ڕێسا دەرناچین، دەیبینیت!..
لەگەڵ ئەم ورتەورتەدا پۆرفیری گوێی لای دەرگاکە بوو، بە ڕاستیش هەر لەو کاتەدا لە پشت دەرگاکەوە، لە ژوورەکەی تردا، دەنگەدەنگ دەبیسترا.
ڕاسکۆلنیکۆڤ هاواری لێهەستا:
- ها، هاتن، تۆ بە دووتا ناردوون!.. تۆ چاوەڕێت دەکردن! تۆ حسابت بۆ کردوون.. باشە، پێیان بڵێ با هەموویان بێن بۆ ئێرە، پارێزەر و شایەت و هەرچییەک دەتەوێت.. زووبە، من ئامادەم، ئامادەم.
وەلێ لەم کاتەدا ڕووداوێکی سەیر هاتە پێش: ڕووداوێک بە نیسبەت سەرجەمی بەسەرهاتەکەوە هێند چاوەڕواننەکراو بوو، کە نە ڕاسکۆلنیکۆڤ و نە پۆرفیری پتروڤیچ هیچیان چاوەڕوانی کۆتاییەکی وایان نەدەکرد.

٦

لە دواییدا، کە ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەو دەقیقەیەی دەهاتەوە یاد، وای دەهاتە بەرچاو کە دەنگەدەنگی پشت دەرگاکە لەپڕێکدا زۆر بە خێرایی زیادی کرد و کەمەکێک دەرگاکە کرایەوە.
پۆرفیری پتروڤیچ بە ناقایلی هاواری لێ بەرز بووەوە:
- چی ڕووی داوە؟ ئاخر، من ئاگادارم کردبوون..
بۆ چرکەساتێک وەڵام نەبوو، وەلێ دیاربوو چەند کەسێک لە پشت دەرگاکەوە یەکێکیان بەرەو دواوە ڕادەکێشا.
پۆرفیری پتروڤیچ بە نیگەرانییەوە دووبارەی کردەوە:

- ئاخر، چی بووە؟
دەنگێک هاتە گوێ کە:
- زیندانییەکمان هێناوە، نیکۆلا.
پۆرفیری بەپەلە ڕووی لە دەرگاکە کرد و هاواری لێهەستا:
- پێویست ناکات: دوور بکەونەوە، ڕاوەستن.. بۆ هاتۆتە ئێرە! چ بێسەرەوبەرەییەکە!
دەنگەکەی پێشوو وتییەوە:
- ئاخر، ئەو..
وەلێ لەپڕا دەنگەکە بڕا، دوای دوو سێ چرکەسات، نەک زیاتر، هەراوزەنایەک کەوتە ڕێ، پاشان وەک لەناکاوێکدا یەکێک دڕی بە یەکێکی تر دابێت، کەسێکی ڕەنگ هەڵبزرکاو ڕاستەوخۆ هاتە ژوورەکەی پۆرفیرییەوە.
دیمەنی کەسەکە لە یەکەم بینینیدا گەلێک سەرسامکەر بوو، ڕاست چاوی لە بەرانبەری خۆی بڕیبوو، بەڵام لەوە نەدەچوو کەسی دیبێت. لە چاویا ویستێک دەدرەوشایەوە، کەچی دەموچاوی ڕەنگی مردووی لێنیشتبوو، دەتوت بەرەو لای سێدارەی دەبەن، لێوی سپی هەڵگەڕابوو کەمێکیش دەلەرزی.
کوڕەکە لە هەڕەتی لاویدا بوو، جلەکانی ئاسایی بوون، باڵای مامناوەند و لەشی لاواز، قژی لە شێوەی چەترا چاک کرابوو، سیمای دەموچاوی جوان و مەنگ بوو، ئەو کەسەی کە بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو ئەم لە دەستی دەرباز ببوو، پێش ئەوانی دی لە دوایەوە هاتە ژوورێ و شانی لاوەکەی گرت، ئەمە پاسەوان بوو، وەلێ نیکۆلا خۆی ڕاپسکاند و جارێکی تر خۆی لە دەستی ڕزگار کرد. چەند کەسێکی کونپشکن لەبەر دەرگاکەدا کۆ ببوونەوە،

هەندێکیان دەیانەویست بچنە ژووری، هەموو ئەم ڕووداوە تەنیا چرکەیەکی خایاند. پۆرفیری پتروڤیچ کە پێدەچوو ئاگای لە خۆی نەمابێت، بە بێزارییەکی زۆرەوە لەسەرخۆ وتی:

- بڕۆ، هێشتا زووە، ڕاوەستە تا بانگت دەکەم.. بۆ پێشوەخت هێناوتانە؟

لە ناکاوێکدا نیکۆلا لە بەردەمیدا کەوتە سەر چۆک.

پۆرفیری بە سەرسامییەوە هاواری کرد:

- چی بووە؟

نیکۆلا وەک تووشی تەنگەنەفەسی هاتبێت، لەپڕێکدا بە دەنگی بەرز وتی:

- تاوانبارم، من تاوانەکەم کردووە، من پیاوکوژەکەم.

ماوەی دە چرکە بێدەنگی باڵی بەسەر ئەو ناوەدا کێشا، دەتگوت هەموو شتەکان لە جێگای خۆیاندا وشک بوون، تەنانەت پاسەوانەکەیش سڵەمییەوە و ئیتر نزیکی نیکۆلا نەکەوتەوە، بەڵکو لای دەرگاکە پاشەکشەی کرد و بەبێ چرکە لەوێدا وەستا.

پۆرفیری پتروڤیچ لە حاڵەتی ساکاوییەکەی دەرهات و هاواری کرد:

- چی بووە؟

نیکۆلا کەمێک وەستا و دووبارەی کردەوە:

- من.. پیاوکوژەکەم.

- چۆن.. تۆ! چۆن.. کێت کوشتووە؟

دیاربوو پۆرفیری پتروڤیچ تەواو پەشۆکابوو، دیسانەوە نیکۆلا دوای کەمێک بێدەنگی لەپڕێکدا لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

- ئەلێنا ئیڤانۆڤنا و لیزاڤێتا ئیڤانۆڤنای خوشکی من.. کوشتوومن.. بە تەور، هۆشم لەسەردا نەمابوو..!

دیسانەوە بێدەنگ بووەوە، هێشتا هەر لەسەر زەوییەکە بە چۆکدا هاتبوو.

پۆرفیری پتروڤیچ چەند چرکەساتێک لە جێگای خۆیدا مایەوە، وەک لە بیرکردنەوەدا بێت، پاشان لەپڕێکدا کەوتەوە جووڵە و بە دەستی ئاماژەی چوونەدەرەوەی لە ئامادەبووەکان کرد، ئەوانیش لە چاو تروکانێکدا ونبوون و دەرگاکە داخرایەوە. ئینجا تەماشایەکی ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد کە لە سووچێکدا وەستابوو و بە سەرسامییەوە لە نیکۆلا دەڕوانی، خەریک بوو بڕوات بۆ لای و لەپڕێکدا وەستا، دیسانەوە تەماشای کردەوە و لە ناکاوێکدا ڕوانینەکەی گواستەوە بۆ لای نیکۆلا و لە نیکۆلاوە بۆ ئەو و دیسانەوە لەوەوە بۆ لای نیکۆلا و ئینجا پەلاماری دایە نیکۆلا و بە تووڕەییەوە هاواری لێکرد:

- تۆ بۆچی پێشوەخت بەم بیرە ئاڵۆزەتەوە سەرم لێ تێک دەدەیت؟ من هێشتا پرسیارم لێنەکردوویت کە ئایا ئەقڵت لەسەردا ماوە یان نا.. ئایا تۆ کوشتووتە یان نا؟

نیکۆلا وتی:

- من کوشتوومن.. بەڵگەم هەیە.

- سەیرە! بەچی کوشتونت؟

- بە تەور، لە پێشا ئامادەم کردبوو.

- چەندی پەلەیە! بە تەنیا بوویت؟

نیکۆلا لە پرسیارەکە تێنەگەیشت.

- بە تەنیا کوشتنت؟

- بە تەنیا، میتکا هیچی لەسەر نییە و بەشداری هیچی نەکردووە.

- باشە، لەبارەی میتکاوە پەلە مەکە! ئاە.. ئاخر، چۆن تۆ.. چۆن لە نەردەوانەکەوە هاتیتە خوارێ؟ ئاخر، دەرگاوانەکان هەردووکتانیان پێکەوە دیبوو؟

نیکۆلا بەپەلە، وەک پێشتر وەڵامەکەی ئامادە کردبێت، وتی:

- ئەم کارە من.. ئەوسا.. بۆ ڕێونی لەگەڵ میتکادا هاتمە خوارێ.

پۆرفیری بە توورەییەوە هاواری کرد:

- باشە، ڕاستە.

پاشان وەک لەگەڵ خۆیدا لەسەرخۆ بڵێت: ئەمانە قسەی ئەونین. لەپڕێکدا دیسانەوە چاوی بە ڕاسکۆلنیکۆڤ کەوتەوە. دیار بوو هێند بە نیکۆلاوە خۆی سەرگەرم کردبوو، کە بۆ ماوەیەک ڕاسکۆلنیکۆڤی بە تەواوی لە بیر نەمابوو، وا ئێستا لەپڕێکدا هاتەوە سەر خۆی و تەنانەت کەمەکێکیش شڵەژا. بۆیە ڕووی تێکرد و وتی:

- ڕادیون ڕومانوڤیچ، برا گیان، ببوورە، وا نابێت.. فەرموو برۆ.. تۆ کارت لێرە نییە.. من خۆیشم.. دەبینیت چ ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو دێتە پێشێ.. تۆ فەرموو.

پاشان دەستی گرت و بەرەو لای دەرگاکە ئاماژەی بۆ کرد.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە بێگومان هێشتا بە تەواویی لە مەسەلەکە نەگەیشتبوو، بەڵام دەرفەتی بڕوابەخۆبوونی جارێکی تر ڕەخساندەوە و وتی:

- دەڵێی تۆ چاوەڕێی شتێکی وانەبوویت؟

- تۆیش، بەڕێزم، چاوەڕێی شتی وا نەبوویت، بڕوانە دەستت چۆن دەلەرزێت! هە، هە، هە!

- تۆیش دەلەرزیت پۆرفیری پتروڤیچ.

- بەڵێ منیش دەلەرزم، چاوەڕێی شتی وانەبووم!

ئیدی ئەوان لەبەر دەرگاکە وەستابوون، پۆرفیری ئارامی لێبڕابوو، چاوەڕێی ڕۆیشتنی ڕاسکۆلنیکۆڤی دەکرد.
لەپڕێکدا ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:
- ئەی شتە چاوەڕواننەکراوەکەم پیشان نادەیت؟
- ئەمە دەڵێیت، بەڵام لە ترسا دانەچۆقەی پێکەوتبوو. هە، هە، بە ڕاستی گاڵتەجاڕیت، دەی، بە ئومێدی دیدار.
- بڵێ خوات لەگەڵ.
پۆرفیری بە زەردەخەنەیەکەوە کە لێوی شۆڕکردبووەوە وتی:
- هەرچی خوا نەیکات نابێت، هەرچی خوا نەیکات نابێت.
ئەو کاتەی ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ژووری نووسینگەکەدا تێدەپەڕی، سەرنجیدا کۆمەڵێک لێی دەڕوانن، لە ژووری چاوەڕوانیدا، لە ناوەڕاستی خەڵکەکەدا، توانی دوو دەرگاوانی "ئەو" ئاپارتمانە ببینێت، کە لەو شەوەدا پێشنیازی بۆ کردن بیبەن بۆ لای پۆلیس، ئەو دووانە وەستابوون و چاوەڕێی شتێکیان دەکرد. بەڵام هەر ئەوەندەی پێی نایە سەر نەردەوانەکان، سەرلەنوێ لە دوای خۆیەوە دەنگی پۆرفیری پترۆڤیچی گوێ لێبووەوە. کە گەڕایەوە، بینی لە دوایەوە ڕادەکات و هانکەهانکیەتی.
- تەنیا وشەیەک، ڕادیون ڕومانوڤیچ، لەبارەی هەموو ئەم ڕووداوانەوە.. بێگومان هەرچی خوانەیکات نابێت. وەلێ بەهەرحاڵ، بەپێی یاسا، ناچارم هەندێک شتت لێپرسم.. کەواتە پاشان یەکدی دەبینین، وانییە؟
بەدەم قسەکانیەوە بەرانبەر بە ڕاسکۆلنیکۆڤ وەستابوو و زەردەخەنەی دەکرد، دیسان دووبارەی کردەوە: وانییە؟
پێدەچوو بیەوێت شتێک بڵێت، وەلێ نەیدەتوانی.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە تەواو ورەی هاتبووەوە بەر و زۆر ئارەزووی بەخۆنازینی دەکرد، وتی:
- تۆیش پۆرفیری پتروڤیچ، دەربارەی ئەوەی کە ڕۆشت، بمبەخشە.. من تەواو ڕقم هەستابوو.
پۆرفیری تا ڕادەیەک بە خۆشحاڵییەوە دوای قسەکانی ئەو کەوت و وتی:
- گرنگ نییە، گرنگ نییە، خۆیشم، تۆزێ ڕەقم، بەداخەوە، باشە، کەواتە من و تۆ یەکتر دەبینینەوە، ئەگەر خوا بیکات زیاتر یەکدی دەبینین.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بۆی تەواو کرد:
- یەکتریش باشتر دەناسین؟
- یەکتریش باشتر دەناسین.
لەگەڵ ئەم قسانەدا پۆرفیری پتروڤیچ چاوی کەمێک کز کرد و دڵگیرانە چاوی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ بڕی و وتی:
- ئێستا دەچیت بۆ ئاهەنگی لەدایکبوون؟
- دەچم بۆ بەخاکسپاردنی مردوو.
- وایە، بۆ بەخاکسپاردن! ئاگات لە تەندروستیی خۆت بێت، تەندروستی..
ڕاسکۆلنیکۆڤ کە بە پلیکانەکاندا بەرەوخوار دەبووەوە، وتی:
- بەڵام من نازانم لای خۆمەوە چ دوعایەکت بۆ بکەم!
دیسانەوە ڕووی لە پۆرفیری کردەوە و لەسەر قسەکانی ڕۆشت:
- پێم خۆش بوو کارەکەت بەرەو پێش بڕوات، بەڵام وا خۆت دەبینیت کارەکەت چەند ڕسوایە!

پۆرفیری کە بۆ ڕۆیشتن ڕووی وەرگێڕابوو، زوو گوێقولاغ بوو و پرسی:

- بۆ ڕسوایە؟

- ئیتر، تۆ ئەم نیکۆلا قوڕبەسەرەت وا ئازار داوە -بێگومان بە شێوازی خۆت- تا کەوتۆتە دانپیانان. بێگومان شەووڕۆژ پێت وتوە: "تۆ پیاوکوژیت، تۆ پیاوکوژیت.." ئێستایش کە دانی پێداناوە، تۆ جارێکی تر باوکی لە گۆڕ دەردێنیت و پێی دەڵێی: "درۆ دەکەیت، تۆ پیاوکوژ نیت! مەحاڵە تۆ پیاوکوژ بیت! ئەمانە قسەی تۆ نین و فێریان کردوویت!" باشە، دوای ئەم هەموو شتانە چۆن کارەکەت ڕسوایی نییە؟- هە، هە، هە! کەواتە ئاگادار بوویت کە ئێستا بە نیکۆلام وت کە ئەو "قسەی خەڵکی تر دەڵێتەوە؟"

- چۆن ئاگادار نەبم؟

- هە، هە، هۆشیاریت، هۆشیاریت، سەرنجی هەموو شتێک دەدەیت! بە ڕاستی بیرت تیژ و گاڵتەئامێزە، سەرنجی پێکەنیناویترین شت دەدەیت.. هە، هە! دەڵێن لە نێو نووسەراندا گۆگۆل بەهرەدارترین نووسەری لەم بابەتە بووە.

- بەڵێ گۆگۆل[1].

- بەڵێ، گۆگۆل.. باشە، بە ئومێدی دیدار..

ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕاست چووەوە بۆ ماڵەوە. ئەمەندە شەکەت بوو، هەر کە گەیشتە ژوورەکەی، لەسەر قەنەفەکەی کەوت. نیوسەعات مایەوە تا بحەسێتەوە و بیر و ئەندێشەکانی کۆ بکاتەوە. نەیویست لەبارەی

---

[1] گۆگۆل (١٨٠٩-١٨٥٢) گەورە نووسەر و شانۆکاری ڕووسی لە بەرهەمە گرنگەکانی: پشکنەر، پاڵتۆ، تاراس بولبا، گیانە مردووەکان. -و-

نیکۆلاوە هیچ خۆی خەریک بکات. هەستی بە شپرزەییەکی سەخت کرد، لە دانپیانانی نیکۆلادا نهێنییەکی سەرسوورهێنەر هەیە، کە بە هیچ جۆرێک ئێستا تێی ناگات.

بەڵام دانپیانانی نیکۆلا شتێکی ڕاست بوو، ئەنجامەکەی زۆر بە ڕوونی لەبەرچاوی خۆیدا بەرجەستە کرد: نەدەبوو ئەو درۆیە تا سەر هەر بە شاراوەیی بمێنێتەوە، ئەوسا جارێکی تر دێنەوە وێزەی ئەم، بەڵام هیچ نەبێت تا ئەو کاتە ئازادە و دەبێت شتێک بۆ حاڵی خۆی بکات، چونکە مەترسییەکە هەر لەئارادایە.

وەلێ ئەمە تاکەی؟ بارودۆخەکە وردەوردە ڕووناکتر دەبووەوە، چونکە زۆر بە خێرایی، کەوتەوە بەسەرکردنەوەی ئەو قسانەی لەگەڵ پۆرفیریدا کردبووی. دیسانەوە ترس و لەرزی لێهێنایەوە، بێگومان هێشتا لە هەموو ئامانجەکانی پۆرفیری تێنەگەیشتبوو، بۆیە نەیدەتوانی گشت حسابەکانی ئەو بپێکێت، وەلێ بەشێکی یارییەکانی کەوتبوونە ڕوو، دیارە کەسیش لەم چاکتر نەیدەتوانی لەوە بگات کە شێوازی پۆرفیری لەم یارییەدا تا چ ڕادەیەک بۆ شەخسی ئەم پڕ لە مەترسییە. ئەگەر هەندێکی تری پێبچوایە، لەوانەبوو ئەمیش بە تەواوی بێتە سەر چۆک و چی هەیە بیڵێت. پۆرفیری هەر لە یەکەم بینینەوە بە تەواوی چوو بووە ناو ڕۆحی ڕاسکۆلنیکۆڤەوە و شارەزای ئەوە ببوو، کە ڕاسکۆلنیکۆڤ چەندە نەخۆش و شپرزەیە، هەرچەندە زۆر هەنگاوی نەدەنا، بەڵام لەسەرخۆ و بەدڵنیاییەوە جێپێی خۆی خۆش دەکرد. ڕاستە ڕاسکۆلنیکۆڤ لەو ماوەیەدا بەرانبەر پۆرفیری لە هەندێک قسەدا تێکەوتبوو، وەلێ هێشتا بەڵگەیەکی سەلمێنەری نەدابوو بە دەستەوە، ئەوەی هەبوو، تەنیا گریمانە و گومان بوو. وەلێ ئایا ئەوەی ئێستا بە خەیاڵیدا دێت،

ڕاستە؟ ئایا هەڵە نییە؟ پۆرفیری ئەمڕۆ دەیویست بگاتە چ ئەنجامێک؟ ئایا لە ڕاستیدا شتێکی ئامادە کردبوو؟ ئەی ئەو شتە چی بوو؟ ئایا چاوەڕێی شتێکی دەکرد یان نا؟ ئەگەر ئەو بەسەرهاتەی نیکۆلا پێش نەهاتایە، چۆن ئەمڕۆ لە یەکتری جیا دەبوونەوە؟

تا ڕادەیەک پۆرفیری هەموو شێوازی کارەکەی خۆی ئاشکرا کردبوو، هەڵبەتە پەلەی تیا بوو، وەلێ بەهەرحاڵ، شێوازەکەی خۆی خستبووە ڕوو، لای ڕاسکۆلنیکۆڤ وا کەوتبووەوە ئەگەر پۆرفیری زانیاری زیاتری لابووایە، هیچ گومانی تیا نەبوو کە دەیوت. ئەی "ئەو شتە چاوەڕواننەکراوە" چی بوو کە ئاماژەی بۆ کرد؟ گاڵتە بوو؟ بڵێی بەڵگەیەکی سەلمێنەر نەبێت؟ یان شتێکی شاراوە؟ ئەی پیاوەکەی دوێنێ؟ ئەو چی لێهات؟ ئەمڕۆ لە کوێ بوو؟ باشە ئەگەر پۆرفیری بەڵگەیەکی سەلمێنەری هەبووایە، بێگومان دەبوو پەیوەندییەکی تەواوی بە کابرای دوێنێوە هەبێت..

ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەر قەنەفەکە دانیشتبوو، سەری دانەواندبوو، ئانیشکی نابووە سەر ئەژنۆی و دەموچاوی خستبووە ناو لەپییەوە. مووچرکێکی توورەیی بە هەموو لەشیدا دەگەڕا، لە دواییدا هەستا، کڵاوەکەی هەڵگرت، بیری کردەوە و بەرەو لای دەرکەکە چوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستی ئەوەی تێگەڕابوو کە لایەنی کەم دەتوانێت ئەمڕۆ بەبێ سەرئێشە بێت. لەپڕا لەناو دڵیدا هەستی بە خۆشی کرد، حەزی دەکرد زووتر بگاتە لای کاترینا ئیڤانۆڤنا. بێگومان بۆ لە گۆڕنانی تەرمەکە درەنگ کەوتبوو، بەڵام بۆ ڕێوڕەسمی داوەتیی پرسەکە هێشتا دەرفەت مابوو، بێگومان لەوێ سۆنیایش دەبینێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەستا، بیرێکی کردەوە و زەردەخەنەیەکی بیمارانەی کەوتە سەرلێو، دیسانەوە لەگەڵ خۆیدا کەوتەوە قسە:

- ئەمڕۆ! ئەمڕۆ! بەڵێ، هەر ئەمڕۆ، دەبێت بەم جۆرە..

کە ویستی دەرگاکە بکاتەوە، دەرگاکە لە خۆیەوە درزێکی تێکەوت، ڕاسکۆلنیکۆڤ موچرکێکی پێداهات و گەڕایەوە دواوە، دەرگاکە لەسەرخۆ و بێدەنگ دەکرایەوە و لەپڕێکدا دەموچاوێکی لێدەرکەوت. دەموچاوی ئەو زەلامەی دوێنێ لەژێر زەوییەوە هەڵقولابوو، کابرا لەبەر دەرگاکەدا وەستا، نیگایەکی بێدەنگیی ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد و هەنگاوی نایە ناو ژوورەکەوە، هەروەک دوێنێ وابوو، بە هەمان داروبار و جلوبەرگەوە، وەلێ لە دەموچاو و ڕوانینیدا گۆڕانێکی گرنگ دیاربوو، ئەمڕۆ غەمگینتر دەهاتە بەرچاو. دوای کەمێک وەستان، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، تەنیا ئەوەندەی مابوو کە ڕوومەتی بگرێتە ناولەپی دەستی و سەری بخات بە لایەکدا بۆ ئەوەی تەواو لە پیرێژنێک بکات.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە لە شوێنی خۆیدا وشک ببوو لێی پرسی:

- چیت دەوێت؟

پیاوە کە دەنگی لێوە نەهات، دوای کەمێک بەڕێزەوە خۆی تا نزیک زەوییەکە چەماندەوە، تا ئەو ڕادەیەی پەنجەی دەستی ڕاستی بەر زەوییەکە کەوت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ هاواری کرد:

- تۆ چی دەکەیت؟

- پیاوەکە لەسەرخۆ وتی:

- من تاوانبارم.

- تاوانباری چیت؟

- تاوانباری ئەو بیروباوەڕە شەڕئەنگێز و زاڵمانەیەی کە هەمە.

هەردووکیان لەیەکدیان ڕوانی.

- ناڕەحەت بووم، ئەو کاتەی کە هاتیت و وابزانم کەمێکیش سەرخۆش بوویت، داوات لە دەرگاوانەکان کرد بتبەن بۆ لای پۆلیس و چەند پرسیارێکت دەربارەی خوێن کرد، ناڕەحەت بووم کە گوێیان نەدایتێ و بە سەرخۆشیان زانیت، هێند ناڕەحەت بووم خەوم لێنەکەوت، لەبەر ئەوەی شوێنەکەتم دەزانی، دوێنێ هاتم و هەواڵم پرسیت..

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە یەکسەر شتەکانی وەبیر هاتەوە، قسەکانی پێبڕی و پرسی:

- کێ هات؟

- من، چونکە سووکایەتیم پێکردبوویت.

- کەواتە تۆ لەو ئاپارتمانەدایت؟

- بەڵێ، من لەوێدا، لە هەمان کاتدا لەناو دەرگاکەدا لەگەڵیاندا وەستابووم، ئەڵێی لە بیرت نەماوە؟ من لەوێ لە کۆنەوە کاری کەوڵدوورین دەکەم، ئێمە هەر لە ماڵەکەماندا ئەو کارە دەکەین.. بە ڕاستی لە هەموویان زیاتر من ناڕەحەت بووم..

لەپڕێکدا ڕاسکۆلنیکۆڤ هەموو بەسەرهاتەکەی سێ ڕۆژ لەمەوبەر کە لەبەر دەرگاکە ڕووی دابوو، هاتەوە بیر، بیری کەوتەوە کە بێجگە لە دەرگاوانەکان، لەو جێگایەدا چەند کەسێکی تریش وەستابوون و ژنیشیان تیابوو. بیری کەوتەوە کە دەنگێک پێشنیازی کرد ڕاستەوخۆ ئەم ببەن بۆ بەڕێوەبەرێتیی پۆلیس، نەیدەتوانی دەموچاوی ئەو کەسەی قسەکەی کردبوو، بهێنێتە بەرچاوی، ئێستایش هەر نەیدەناسی، وەلێ دەیزانی کە وەڵامێکی ئەو زەلامەی داوەتەوە و ڕووی بۆ لای وەرگێڕاوە..

کەواتە، ئەمە هەموو بەسەرهاتە تراژیدییەکەی دوێنێ بوو! لە هەمووی خراپتر ئەوەبوو کە نزیک بوو تیا بچێت، خەریک بوو بە هۆی مەسەلەیەکی نابووت و بێنرخەوە خۆی لەناو بەرێت. دیارە ئەم زەلامە بێجگە لە کێشەی خانوو بەکرێگرتن و قسەکردن لەبارەی خوێنەوە هیچی تری پێنییە، بێگومان پۆرفیرییش هیچ لە هەمانەکەیدا نییە، بێجگە لە مەسەلەی هوڕاوەکردنەکە نەبێت، چ بەڵگەیەکی ڕاستی، جگە لە لایەنی "سایکۆلۆژی" کە ئەویش دوو سەری هەیە، شتێکی تری دروستی پێنییە. ئەگەر شتی تری دەست نەکەوێت، (نایشبێت دەستی بکەوێت، نابێت و نابێت).

ئەی ئیتر دەتوانن چی لەگەڵ ئەمدا بکەن؟ چۆن دەتوانن تاوانەکەی بەسەردا ساغ بکەنەوە، تەنانەت ئەگەر بیشیگرن؟ پێدەچێت پۆرفیرییش تازە شتێکی لەبارەی چوونی ئەم بۆ ئاپارتمانەکە زانیبێت و تا ئێستا ئاگای لە هیچ نەبووبێت، ڕاسکۆلنیکۆڤ کە لەپڕێکدا ئەم بیرۆکەیە بەسەریدا تێپەڕی، هاواری کرد:

- کەواتە تۆ بوویت ئەمڕۆ بە پۆرفیریت وت کە.. کە من هاتبووم؟

- کامە پۆرفیری؟

- دادوەری لێکۆڵەرەوە.

- من پێم گوت، ئەوسا دەرگاوانەکان نەچوون، بەڵام من چووم.

- ئەمڕۆ؟

- لە پێش تۆدا، دەقیقەیەک لە پێش تۆوە لەوێ بووم و هەموو شتێکم بیست. بینیم چۆن ئازاریان دەدایت.

- لەکوێ؟ چی؟ کێ؟

- لەوێ، لە پشت دیوارەکەوە، هەموو وەختەکە لەوێ دانیشتبووم.

- سەیرە؟ کەواتە "شتە چاوەڕواننەکراوەکە" تۆ بوویت؟ ئاخر چۆن شتی وا دەبێت؟

کابرا وتی:

- کە بینیم دەرگاوانەکان گوێ لە قسەم ناگرن و دەیانوت درەنگە و ڕەنگە تازە کاتی دادوەر ناجۆر بێت کە بۆ زوو نەچووینەتە لای، ناڕەحەت بووم، تەنانەت خەوم لە خۆم حەرام کرد و کەوتمە تاقیبات. کە دوێنێ شتێکم لەم ناوە دەست کەوت، ئەمڕۆ چووم، یەکەمجار کە چووم، لەوێ نەبوو، دوای سەعاتێک ڕۆشتمەوە، گوێیان پێنەدام، جاری سێیەم، ڕێگەیاندام، ئەوسا هەرچی هەبوو نەبوو بۆم باس کرد، ئەو لە ژوورەکەیدا کەوتە پیاسە، مشتی بە سنگیا دەکێشا و دەیوت: "چ بەڵایەکم بەسەردێنن ڕێگرینە؟! ئەگەر ئەمەم بزانیایە پۆلیسم دەنارد و دەمگرت" پاشان لە ژوورەکە دەرپەڕی، یەکێکی بانگ کرد و لە سووچێکدا کەوتنە قسە، دوایی هاتەوە لام و کەوتە تاقیبات و جوێندان، گەلێک سەرزەنشتی کردم، من هەموو شتێکم پێوت، باسی ئەوەیش کە تۆ نەتوێرا وەڵامی پرسیارەکانم بدەیتەوە و هەر نەیشتناسیم، دیسانەوە بە ناو ژوورەکەدا کەوتەوە ڕاکەڕاکە و بە سنگدا کێشان، تووڕەوتڕۆ ئەمسەروئەوسەری دەکرد و کە هەواڵی هاتنی تۆیان دایە، وتی: "بڕۆ پشت تیغە دیوارەکەوە، لەوێ دابنیشە و هەرچیت بیست، نابێت بجوڵێیت" خۆیشی کورسیی بۆ هێنام و دەرگاکەی لەسەر بەستم، وتی: "ڕەنگە تۆیش بانگ بکەم" بەڵام کە نیکۆلایان هێنا، دوای ڕۆیشتنی تۆ منی هێنایە دەرەوە و وتی: "جارێکی تر دەتهێنمەوە ئێرە و دیسانەوە هەندێک پرسیاری ترت لێدەکەمەوە".

- کە تۆ لەوێ بوویت، هیچیان لە نیکۆلا پرسی؟

- کە تۆی ڕەوانە کرد، منیشی ڕەوانە کرد و کەوتە لێکۆڵینەوە لەگەڵ نیکۆلا.
کابرا وەستا و لەپڕا دیسانەوە دانەویەوە تا پەنجەی بەر زەوی کەوت.
- لێم ببوورە تۆمەتبارم کردیت، ڕقم هەستابوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی دایەوە:
- خوا لێت ببوورێت.
کە ئەمەی وت، کابرا دیسانەوە دانەویەوە، بەڵام نەک وەک جاری پێشوو، بەڵکو تا ناوقەدی. لەسەرخۆ گەڕایەوە و چووە دەرێ.
ڕاسکۆلنیکۆڤ کە لەبەر خۆیەوە دەیوتەوە "هەمووی دوو سەری هەیە، ئێستا هەموو شتێک دوو سەری هەیە" لە جاران چالاکتر لە ژوورەکە چووە دەرەوە و پاشان لەو کاتەدا کە لە پلیکانەکانەوە دەچووە خوارێ بە زەردەخەنەیەکی ڕکاوییەوە وتی: "ئێمە دیسانەوە لەململانێداین!" بەڵام ڕکەکەی بەرەوڕووی خۆی بوو، چونکە بە بێزاری و شەرمەوە بیری لەو و بیری لەو (ترسنۆکییەی) خۆی دەکردەوە کە لەمەوبەر باڵی بەسەریدا کێشابوو.

## ١

سەرلەبەیانی ڕۆژی دوایی کە بەسەر گفتوگۆ شوومەکەی نێوان پیتەر پتروڤیچ لەگەڵ دونیا و پولخێریا ئەلێکساندروڤنادا تێپەڕیبوو، پیتەر پتروڤیچ لە خەو هەستا و بیری ڕووناکتر بوو، بە تەواوی نارەحەتییەوە ناچار بوو دان بەوەدا بنێت کە ئەوەی دوێنێشەو ڕووی دا و بەلایەوە زۆر سەرسامکەر و مەحاڵ بوو، بە هەقیقەت ڕاستە و نکۆڵیی لێناکرێت و قابیلی گۆڕان نییە، خۆپەسەندییە زامدارکراوەکەی وەک ڕەشمار بە درێژایی ئەو شەوە دڵی دەخوارد. هەر کە لە خەو هەستا، یەکسەر تەماشای ئاوێنەی کرد: لەوە دەترسا لەو شەوە درێژەدا سەفرا دەرروونی پیس کردبێت، بەڵام لەو لایەنەوە هەموو شتێک ئاسایی و دڵنیابەخش بوو. کە تەماشای دەموچاوە سپی و نەجیبانەکەی خۆی کرد، کە لەم دواییەدا کەمێک قەڵەو بووە، بۆ چرکەساتێک ئاسودەیی تێگەڕا و بڕوای تەواوی بەوە هێنا کە دەتوانێت لە شوێنێکی دی بووکێکی گونجاو و تەنانەت پاکیزەتر بۆ خۆی پەیدا بکات، بەڵام یەکسەر هاتەوە سەر خۆی و بە تووڕەییەوە تفێکی ڕۆ کردە پەنایەکەوە. ئەم کارە زەردەخەنەیەکی تەوساوی و گاڵتەجاڕانەی خستە سەر لێوی ئەندرە سمیونوڤیچ لێبێزیاتینکۆفی هاوڕێی، کە لەگەڵیدا لە ژوورەکەدا دەژیا. پیتەر پتروڤیچ سەرنجی لە

زەردەخەنەکەی دا و ئەمەی کردە ماڵ بەسەر هاوڕێکەیەوە، لەم دواییانەدا گەلێک شت لە نێوان ئەم دوانەدا ڕووی دابوو، لەپڕێکدا لەوە بەئاگا هاتەوە کە نەدەبوو ئاندرێ سمینوڤیچ لە بەسەرهاتی دوێنێی خۆی ئاگادار بکات، بۆیە ڕقەکەی دووقات زیادی کرد، ئەمە دووەمین هەڵەی دوێنێ بوو، کە لە ئەنجامی پەلەکردن و تووڕەبوونەوە بەدی هاتبوو، پاشان بە درێژایی ئەو بەیانییە، وەک دەستی ئانقەستی تیا بێت، یەک بەدوای یەکدا شکست و ناڕەحەتی ڕوویان لێدەکرد. تەنانەت لە دیوانی باڵای داددا، لە ئەنجامدانی کارێکدا کە ماوەیەک بوو دوای کەوتبوو، سەرنەکەوت. لە سەروو هەموویشەوە ئەو خانووەی بۆ زەماوەندەکەی بە کرێی گرتبوو، هەر لەسەر گیرفانی خۆیشی پارەی تیا خەرج کردبوو، خاوەن ماڵەکەی چووبووە سەردار و ئەمی هێنابوە ژاروژەنگ. ئەمە کابرایەکی کارمەندی بە ڕەگەز ئەڵمانی و تازەپیاکەوتوو بوو. بە هیچ جۆرێک قایل نەبوو ئەو گرێبەستەی تازە لە نێوانیاندا مۆر کرابوو، هەڵی بوەشێنێتەوە. دەبوو بەپێی گرێبەستەکە، لە کاتی هەڵوەشاندنەوەیدا، هەرچییەکی بەردەکەوێت بیدرێتی و لەم هەقە خۆش نەدەبوو. ئەگەرچی پیتەر پتروڤیچ تەواو دەستی بە خانووەکەدا هێنابوو، هەروەها لە پیشانگای مۆبیلفرۆشیدا یەک تاکە ڕۆبڵیان لەو پارەیە بۆ نەدەگێڕایەوە، کە لە بارمتەی مۆبیلەکاندا دانابوو، ئەگەرچی هێشتا بۆ ناو خانووەکەی نەگوێزابوونەوە. پیتەر پتروڤیچ لەسەرخۆ کەوتبووە دانەجیرە و بە خۆی دەوت: "لەبەر خاتری مۆبیلیات ژن ناهێنم!" هەر لەو میانەیەدا نائومێدییەک کەوتە دڵییەوە: "ئایا تەواو مەسەلەکە لەدەست چووە و کۆتایی پێهاتووە؟ ئایا ناکرێت هەوڵێکی تری بۆ بدرێت؟" کە بیری لە دونیای شۆخ و شەنگ کردەوە، جارێکی دی

خوێن لە دڵی چۆڕاو بۆ چرکەساتێک ئازارێکی زۆری چەشت، ئەگەر لەو کاتەدا تەنیا ئارەزووی کوشتنی ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەری بدایە، پیەتر پتروڤیچ، بێ هیچ ئەملاوئەولایەک ئارەزووەکەی دەبردە سەر.
پیەتر پتروڤیچ کە بە دڵشکاوی و نائومێدییەوە بەرەو ژوورەکەی لیبێزیاتینکۆف دەگەڕایەوە، بە خۆی وت: "بێجگە لەمانە هەڵەیەکی ترم ئەوە بوو کە پارەم پێنەدابوون. شەیتان بە لەعنەت بێت، بەڕاست چۆن من ئەوەندە جوولەکەئاسا بووم؟ لەم لایەنەوە هیچ حسابێکیش لەئارادا نەبوو، تەنیا ئەوە هەبوو کە من لە حاڵەتی هەژاری و نەبوونیدا بیانهێڵمەوە و کارێکی وا بکەم بە فریادڕەسی خۆیانم بزانن، وەلێ ئەوان.. ئاە.. نا، ئەگەر من لەو ماوەیەدا هەزار و پێنجسەد ڕۆبڵم بۆ جیازی و دیاری و جانتا و جلوبەرگ و خرتکەوپرتکە پێبدانایە، تا لە پێشانگای "کنوپ" و پیشانگای ئینگلیزی بیانکڕیایە، بێگومان ئێستا کارەکە پوخت و لەبارتر دەبوو. ئاوا بە ئاسانیش نەیاندەتوانی کارەکە هەڵوەشێننەوە، ئەمانە لەو کەسانەن لە کاتی پەشیمانبوونەوەدا خۆیان بە بەرپرسیار دەزانن، کە هەرچی دیاری و پارەیان دراوەتێ، بیدەنەوە، دانەوەیشی بۆ ئەوان کارێکی گران و ناخۆشبوو! هەروەها تووشی ئازاری ویژدانیش دەبوون بەرانبەر بە کەسێک ئەمەندە دەست و دڵفراوان بووە و کەچی لەپڕێکدا ئەوان دەستیان بەڕوویەوە ناوە. هم، هەڵەم کرد!" دوای ئەوەی دیسانەوە پێی بە جەرگی خۆیدا نایەوە، خێرا خۆی بە گەوج دایە قەڵەم، هەرچەندە ئەم ڕستەیەی بەدەم نەوت، کە بەم ئەنجامە گەیشت، گەڕایەوە ماڵەوە، بەڵام ڕکوتووڕەییەکەی لەو کاتە زیاتر بوو، کە لە ماڵ وەدەر کەوتبوو.
ڕێوڕەسمی پرسەی کۆچکردوو، کە لە ژوورەکەی کاترینا ئیڤانۆڤنادا بەجێ دەهێنرا سەرنجی ڕاسکۆلنیکۆڤی ڕاکێشابوو، دوێنێش هەندێک

شتی لەبارەی ئەم پرسەیەوە بیستبوو، تەنانەت پێدەچوو ئەوەیشی بیر کەوتبێتەوە کە ئەویش بۆ ئەو خوانە بانگهێشت کرابێت، وەلێ بە هۆی گرفتارییە تایبەتییەکانییەوە هەموو شتێکی لە بیر چووبوو. ئێستا کە خاتوو لیپیەخزل لە جێی کاترینا ئیڤانۆڤنا (ئەم چووبوو بۆ گۆڕستان) لە پاڵ مێزە ئامادەکراوەکەدا سەرگەرمی کاربوو، دەرفەتی دەست کەوت و چەند پرسیارێکی لێکرد، زانی کە دانیشتنەکە شکۆمەندانە بەڕێوە دەچێت. هەموو کرێگرتەکان تەنانەت ئەوانەیش کە کۆچکردوویان نەدەناسی، وەک ئاندرێ سمیونوڤیچ لیبێزیاتینکۆف کە پێشتر لەگەڵ کاتریناد بەشەڕ هاتبوو، بانگهێشت کرابوون، پیتەر پتروڤیچیش نەک تەنیا بانگ کرابوو، بەڵکو بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی دەکەن، چونکە لە نێو هەموو کرێگرتەکاندا دیارترین میوان بوو، خودی ئامالیا ئیڤانۆڤنا هەرچەندە پێشتر لەگەڵ کاتریناد دەمەدەمیان بوو، زۆر بەڕێزەوە بانگ کرابوو، بۆیە ئێستا خۆی لێرەدا بە خاوەن ماڵ دەزانی و هەڵدەسوڕا و تا ڕادەیەک چێژی لە کارکردنەکەی دەبینی. لە سەرووی ئەمانەیشەوە خۆی زۆر ڕازاندبووەوە، هەرچەندە جلی تازیەباری لەبەردا بوو، بەڵام سەرتاپای تازە و ئاوریشمین و زەرقی و بەرقی لەبەردا بوو، بە فیزەوە شانازیی بە خۆیەوە دەکرد. هەموو ئەم بەڵگە و زانیارییانە پیتەر پتروڤیچیان خستە سەر بیرکردنەوەیەکی تازە، کە چووە ژوورەکەیەوە، واتا ژووری ئاندرێ سمیونوڤیچ لیبێزیاتینکۆفەوە، هەر سەرقاڵی ئەو بیرە بوو، تێگەیشت کە دەبێت ڕاسکۆلنیکۆڤیش داوەت کرابێت.

ئاندرێ سمیونوڤیچ لەبەر هەر هۆیەک بێت، تەواوی ئەو بەیانییە لە ژوورەکەیدا مابووەوە. لە نێوان پیتەر پتروڤیچ و ئەم بەڕێزەدا پەیوەندییەکی سەیر، بەڵام تا ڕادەیەک سروشتی، دروست ببوو: پیتەر

پترۆڤیچ تا ڕادەیەک هەر لەو ڕۆژەوە کە خانووی لێگرتبوو، بەرانبەری هەستی بە نەفرەت و بێزاری دەکرد، لەگەڵ ئەوەیشدا سڵی لێدەکردەوە. پیتەر پترۆڤیچ کە گەیشتە پترۆزبورگ، هاتە لای ئەم، ئەمەیش لەبەر ئەوەنا کە ئەم پیاوێکی ڕژد و سووکە، هەرچەندە ئەمە گرنگترین هۆی ئەو مەسەلەیەیە، بەڵام هۆیەکی تری هەیە: ئەو کاتەی هێشتا لە ناوچەکەی خۆی دەژیا، لەبارەی ئاندریێوە کە خۆی بەخێوی کردووە. بیستبووی کە لاوێکی پێشکەوتنخواز و هەڵکەوتووە، تەنانەت لە نێو هەندێک لایەنی سەرنجڕاکێش و ئەفسانەییدا ڕۆڵی گرنگی هەیە. ئەمە هۆیەک بوو بۆ ئەوەی پیتەر پترۆڤیچ بەو لاوە سەرسام بێت، ئەو تاقم و لایەنە بە توانایانەیش کە ئاگاداری هەموو جێگایەک و لە هەموو کەسێکیش بێزار بوون و نهێنیی خەڵکیان دەردەخست، ماوەیەکی زۆر بوو پیتەر پترۆڤیچیان دووچاری سەرسامییەکی تایبەتی کردبوو کە بە هیچ جۆرێک نەدەزانرا هۆیەکەی چییە. بێگومان خۆی بە تەنیا، بە تایبەتی لە ناوچەیەکی دوورەدەستا، بە هیچ جۆر نەیدەتوانی وێنایەکی ڕاستودروست لەو تاقم و لایەنانە بکات. ئەویش وەک خەڵکانی دی بیستبووی، بەتایبەتی لە پترۆزبۆرگدا کەسانێک هەن پێیان دەڵێن پێشکەوتوو و نیهلیستی و چاکەخواز و.. هتد.. وەلێ ئەویش وەک گەلێ کەسی تر مانا و چەمکی ئەم واژانەی بە شێوەیەکی سەیر زل دەکرد، چەند ساڵێک بوو زیاد لە هەر شتێکی دی لە ئابڕووچوون دەترسا، ئەمەیش گرنگترین هۆی نیگەرانی هەمیشەیی و لەڕادەبەدەری ئەو بوو. بەتایبەتی ئەو کاتەی بیری لەوە کردەوە کە کارەکەی بگوێزێتەوە بۆ پترۆزبۆرگ. لەم لایەنەوە وەک دەڵێن "تۆقیبوو"، تەواو وەک ئەو منداڵانەی هەندێکجار لە شتێک دەتۆقن.

چەند ساڵێک لەوەوبەر کە لە ناوچەکانی دەرەوەی شار دادەنیشت و سەرقاڵی بەڕێخستنی کارەکانی بوو، دووجار ئەو ئابڕووچوونەی بە کەسانی خاوەن پلە و دەسەڵاتەوە دیبوو. ئەوانە کەسانێک بوون ئەم پارێزگارییی لێدەکردن، کە پێشتر ئەوان یارمەتییان دابوو. یەکێک لەو کێشانە خەریک بوو خاوەنەکەی بەرەو چورتم و هەڵدێرێکی گەورە بەرێت، دووهەمیش سەرئێشە و دوودڵیی نایەوە، بۆیە پیتەر پتروڤیچ بڕیاری دا هەر کە هاتە پترۆزبۆرگ، یەکسەر بە دیدێکی ڕوونەوە لە مەسەلەکان بڕوانێت، زانیاریی زۆر بەدەست بێنێت، لە کاتی پێویستیشدا دەستپێشخەر بێت، خۆشەویستی "نەوەی نوێیش" بەدەست بێنێت، لەم ڕووەوە ئومێدی بە ئاندرێ سمیونوڤیچ بوو، بەو جۆرە ئەو کاتەی ڕاسکۆلنیکۆڤی بینی، توانی هەندێک لە مەبەستەکانی لەو ڕستانەدا دابڕێژێت، کە گەنجانە بوون.

بێگومان ماوەیەکی زۆری نەبرد کە پیتەر پتروڤیچ لە ئاندرێ سمیونوڤیچدا بێجگە لە کەسایەتییەکی خوێڕی و سادە چیتری نەبینی. بەڵام ئەمە بە هیچ جۆرێک ڕای پیتەر پتروڤیچی نەگۆڕی و پرکێشی هیچی نەکرد، تەنانەت ئەگەر بڕوای تەواوی بەوە هەبووایە کە ئەو کەسە پێشکەوتووانە تا ئەو ڕادەیە سادە و ساکارن، هێشتا هەر بە دوودڵی دەمایەوە. بەهەرحاڵ، هەموو ئەو بیروباوەڕ و یاساوڕێسایانەی ئاندرێ سمیونوڤیچ بە گوێیدا دەدا و مێشکی پێ پڕ دەکرد، لای ئەو گرنگ نەبوو، ئەو مەبەستێکی تایبەتی خۆی هەبوو، تەنیا خوازیاری ئەوە بوو تا بتوانێت زووتر لەوە بگات کە ئایا ئەو کەسانە توانایەکیان هەیە یان نا؟ ئایا دەبێت لێیان بترسێت یان نا؟ ئایا ئەگەر ئەم دەست بۆ کارێک بەرێت -هەر کارێک بێت- ئەوان سووک و ڕسوای دەکەن؟ ئەگەریش ڕسوای بکەن، لە چ لایەنێکەوە

دەیکەن؟ ئەوەی باوە ئێستا خەڵکی لە چ بوارێکدا دەست بۆ ڕسواکردن دەبەن؟ بێجگە لەمانە، ئایا دەشێت هەرچۆنێک بووە خۆت بخزێنیتە ناویانەوە، خۆ ئەگەر بە ڕاستی خاوەن هێز و دەسەڵات بن هەرچۆنێک بێت کڵاو بکەیتە سەریان؟ ئایا ئەم کارە پێویستە بکرێت یان نا؟ ئایا ناکرێت، بۆ نموونە بۆ کار و پیشەکەی خۆی، بە هەر جۆرێک بێت، سوودیان لێوەربگرێت؟ بە کورتی، سەدان پرسیاری لە بەردەمدا قوت ببووەوە.

ئەم ئاندریێ سمیونوڤیچە لاوێکی لاواز و نەخۆش و کورتەباڵا بوو، کارمەندی شوێنێک و موویەکی زەردی سەرنجڕاکێشی هەبوو، ڕیشی بە هەردوولای ڕومەتیا هاتبووە خوارێ و گەلێک شانازیی پێوە دەکرد، بێ لەمانە هەمیشە چاوی دێشا، دڵی ناسک بەڵام لە قسەدا زۆر بڕوای بە خۆی و هەندێکجاریش بەفیز و هەوا بوو. ئەم حاڵەتە لەگەڵ دیمەن و ڕواڵەتیدا ئەمەندە جیاواز بوون، کە ببوونە مایەی پێکەنین، بەمانەیشەوە، لە ڕوانگەی ئامالیا ئیڤانۆڤناوە ئاندریێ کرێگرتەیەکی تا ڕادەیەک بەڕێز بوو، چونکە مەست نەدەبوو، کرێی ژوورەکەیشی بە ڕێکوپێکی دەدا. لەگەڵ هەموو ئەم ئاکارانەدا، ئاندریێ سمیونوڤیچ بە ڕاستی کابرایەکی تۆزێک گەوج بوو. پەیوەندیی ئەو بە "پێشکەوتن" و بە "نەوەی نوێ"مانەوە تەنیا لە ڕووی سۆزەوە بوو. یەکێک بوو لەو گروپە بێئەژمارانەی کە گەمژە و نابوود و لاواز بوون، هیچ کارێکی باش فێر نەبووبوون، لە هەوڵی ئەوەدا بوون زوو خۆیان بە بیرێکی باوی بەڕەواجەوە هەڵواسن، ئەوانە هەرچییەکیان بکردایە، سووکیان دەکرد، تەنانەت ئەگەر بە ڕاستگۆییش بیانکردایە.

لەگەڵ ئەمانەیشدا لیبێزیاتینکۆف، هەرچەندە گەلێک میهرەبان بوو، وەلێ وردەوردە لە هاوژووری لەگەڵ پیتەر پترۆڤیچدا کە پێشتر

ئەمی بەخێو کردبوو، بەتەنگ دەهات. بە ڕێکەوت هەردووکیان ئەم هەستەیان بەرانبەر بە یەکدی هەبوو. هەرچەندە ئاندرێ سمیونوڤیچ پیاوێکی سادە بوو، بەڵام وردەوردە لەوە دەگەیشت کە پیتەر پتروڤیچ فریووی داوەو لە ناخیدا لێی بێزارە و ئەو مرۆڤە نییە کە ئەم تێی گەیشتبوو.

لیبێزیاتینکۆف دەیویست یاسای "فوریە"[1] و تیوری "داروین"ی بۆ باس بکات، بەڵام پیتەر پتروڤیچ کە بەتایبەتی لەم دواییانەدا بە گاڵتەجاڕییەکی زۆرەوە گوێی لە قسەکانی دەگرت، لەم ڕۆژانەدا تەنانەت کەوتبووە سوکایەتیپێکردنیشی، لەبەر ئەوەی لۆژین هەر لە خۆوە تێگەیشتبوو کە لیبێزیاتینکۆف نەک تەنیا کابرایەکی گەوج و لەجەڕە، بەڵکو درۆزنیشە، لە ناو ئەوانەیشدا کە کاریان لەگەڵدا دەکات، چ پەیوەندییەکی بە کەسە گرنگەکانییەوە نییە. ئەوەی دەیزانێت، لە خەڵکی تری دەبیستێت. لە هەموویش گەنتر ئەوەیە کە توانای ڕاگەیاندنی بە باشی نییە، هەندێکجار زیاتر لەوە دەڵێت، کە پێویستە بوترێت، یان لەبەر پەرتی و دوودڵی ناتوانێت هیچ بڵێت، ئیتر بەم حاڵەوە چۆن دەتوانێت پێشکەووتنخواز و چاکە خوازبێت؟

دەبێت ئەوەیشمان لە بیر نەچێت کە پیتەر پیتروڤیچ لەم دە ڕۆژەدا، بەتایبەتی لە سەرەتایدا، گەلێک بە پەرۆشەوە ئەو ڕاوتەگبیرە سەیرانەی قبووڵ دەکرد، کە لە ئاندرێ سمیونوڤیچەوە سەرچاوەیان دەگرت، با بڵێین ئەو کاتەی کە ئاندرێ سمیونوڤیچ فەرمانی دەدایە

---

[1] شارل فوریە (١٧٧٢-١٨٣٧) فەیلەسوف و زانای سایکۆلۆژی فەرەنسی، لەدایکبووی بیزانسون: سەرۆکی قوتابخانەی فالانستیریانییە "یەکێتی سۆشیالیستی" و.

ئامادەی دروستکردنی "کومون"[1]ی تازە بێت لە شوێنێکی شەقامی "مشچانسکایا"[2] (شەقامی بورجوازییەکان)دا، یان پێی دەوت هەرگیز ڕێ لە دونیا نەگرێت، تەنانەت ئەگەر لە یەکەم مانگی زەماوەندیشیاندا بێت، ئەگەر ویستی دۆستێکی تر بۆ خۆی بگرێت، یان مەبەستی نییە منداڵەکانی ئاییندەی خۆی تەعمید بکات و.. شتی تریش.. لەم مەسەلانەدا پیتەر پیتروڤیچ یان بەرپەرچی نەدەدایەوە یان هەر بێدەنگ دەبوو. پیتەر پیتروڤیچ لەسەر شێوازی ئاسایی خۆی لەوە بێتاقەت نەدەبوو باس لە ئاکار و ڕەوشتی تایبەتی ئەو بکرێت. تەنانەت ڕێیشی بە ستایشی خۆی دەدا، چونکە هەموو جۆرە ستایش و پیاهەڵدانێکی خۆی گەلێک پێ خۆش بوو.

پیتەر پیتروڤیچ کە لەبەر چەند هۆیەک ئەو بەیانییە چەند پێنج ڕۆبڵییەکی ورد کردبووەوە، لە پشت مێزەکەیەوە دانیشتبوو، سەرقاڵی ژماردنی سەفتەی چەکەکانی بوو. ئاندرێ سمیونوڤیچیش کە بەردەوام پارەی لە گیرفاندا نەبوو، لە ژوورەکەدا پیاسەی دەکرد، خۆیشی لەو دارەتە نەدەدا کە سەفتە پارەکان سەرنجی ڕابکێشن یان مەبەستی بن. پیتەر پتروڤیچ هەرگیز بڕوای بەوە نەدەکرد ئاندرێ سمیونوڤیچ بە ڕاستی ئەو پارانەی لا بێنرخ بێت و بێبایەخانە لێیان بڕوانێت، ئاندرێ سمیونوڤیچیش لای خۆیەوە خەیاڵێکی تاڵی تێگەڕابوو، کە ڕەنگە پیتەر پتروڤیچ لەبارەی ئەوەوە بەو شێوەیە بیر

---

[1] Commane جۆرە سۆشیالستییەکە کە گەلێک لە ڕووناکبیرانی ڕووسیا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا بۆ بەدیهێنانی شێوازێکی سۆشیالیستی لە سەروبەندی دروستکردنیدا بوون.

[2] *Meshchanskaya*

بکاتەوە، بەوە دڵخۆش بێت لە دەرفەتێکدا بەو سەفتە پارانە ڕقی هاوڕێ لاوەکەی هەستێنێت، ئازاری بدات، گاڵتەی پێبکات و بە هیچی دابنێت، ئەوەی تێبگەیەنێت کە ئەم دوانە چەندە جیاوازن و چ بۆشاییەکی گەورە لە نێوانیاندا هەیە!

لێبێزیاتینکۆف لەگەڵ ئەوەیشدا کە سەرگەرمی ڕوونکردنەوەی بابەتە دڵگیرەکەی خۆی بوو لەبارەی دروستکردنی "کومون"ەیەکی تازە و تایبەتەوە، وەلێ پیتەر پیتروڤیچی دەبینی زۆر تووڕە و کەمبایەخە، وەڵام و سەرنجە کورتەکانی کە بەدەم ژماردنی سەفتەکانەوە لە دەمی دەردەچوو، پلارێکی گاڵتەئامێز و سوکایەتپێکردنی ئەم بوو. بەڵام ئاندرێ سمیونوڤیچی "مرۆڤدۆست" ئەم بارەی پیتەر پیتروڤیچی بەوە دانا بەرئەنجامی ئەو ناڕەحەتییەی دوێنێیە، کە لە دوای پەیوەندیبڕینی لەگەڵ دونیادا بەدی هاتووە و بەردەوام پەرۆشی ئەوەیە قسەی لەسەر بکرێت. دەیویست بەم بۆنەیەوە هەندێک پەیامی پێشکەووتوانە دەرببڕێت، تا لە لایەکەوە ئاسوودەییەک بە هاوڕێ بەڕێزەکەی ببەخشێت و لەلایەکی ترەوە "بێگومان" کار لە بەرەوپێشبردنی بیروباوەڕی بکات.

پیتەر پیتروڤیچ قسەکانی ئاندرێ سمیونوڤیچی لە شوێنێکی گرنگا بڕی و لەپڕێکدا پرسی:

- ئەم داوەتیە چییە کە ئەم ژنە.. بێوەژنە سازی دەکات؟

- دەڵێی ئاگات لێ نییە! من دوێنێ لەو ڕووەوە قسەم بۆ کردیت و دەربارەی ئەو دابونەریتە بیروباوەڕی خۆمم پێوتیت.. ئاخر، وەک بیستوومە، تۆیش بانگ کراویت، تۆ خۆت دوێنێ لەگەڵیا قسەت کردووە..

- من هەرگیز چاوەڕێی ئەوە نەبووم ئەو ژنە گەوجە تەواو نەدارایەی پارەی لەو گەوجەی ترەوە کە ناوی ڕاسکۆلنیکۆڤە وەرگرتووە، بیکات بە داوەت و پرسەدانان، ئێستایش کە بەوێدا تێپەڕیم، لەو هەموو سازدان و تەدارەکە سەرم سووڕما! دیارە خەڵکێکی زۆری بانگهێشت کردووە. تەنانەت لەسەر خوانەکە مەیم بینی.

پیتەر پیتروڤیچ کە دیار بوو مەبەستی تایبەتی هەیە، لەسەر باس و پرسیارەکانی ڕۆیشت، لەپڕێکدا سەری بەرز کردەوە و وتی:

- چی؟ وتت منیشی بانگ کردووە؟ کەی داوەت کراوم؟ لە بیرم نییە، ناچم، من لەوێ چ کارەم؟ دوێنێ کە تووشی بووم، تەنیا ئەوەم وت لەوانەیە بتوانێت وەک ژنی کارمەندێکی هەژار، ساڵانە یارمەتییەک وەربگرێت، ناشێ بۆ ئەوە منیشی بانگ کردبێت. هە، هە، هە!

لێبێزیاتینکۆف وتی:

- منیش پێم خۆش نییە بڕۆم.

- بێگومان تۆ بە دەستی خۆت لێت داوە، ئەوە ئاشکرایە، شەرم دەکەیت. هە، هە، هە!

لەپڕێکدا لێبێزیاتینکۆف سوور داگەڕا و وتی:

- کێ لێی داوە، لە کێ دراوە؟

- سەیرە! تۆ لە کاترینا ئیڤانۆڤنات داوە، مانگێک لەمەوبەر، دوێنێ ئەم هەواڵەم بیست.. ئەمەیش خاوەن بیروباوەڕەکان.. ئاوا کێشەی ژن چارە دەکەن! هە، هە، هە!

پیتەر پیتروڤیچ کە دیار بوو کەمێک ئاسوودەیی تێگەڕابوو، سەرلەنوێ کەوتەوە ژماردنی سەفتە پارەکان.

لیبزیاتینکۆف کە بەردەوام لە بەیادهێنانەوەی ئەم ڕووداوە بێزار دەبوو، بە تووڕەیی وتی:

- هەموو ئەمانە قسەی بێسەرەوبەرە و بوختانن، هەرگیز وا نەبووە، مەسەلەکە جۆرێکی تر بوو.. تۆ باشت نەبیستووە، قسە دروستکردنە! من لەو شوێنەدا بەرگریم لە خۆم کرد، یەکەمجار ئەو پەلاماری دام و چنگی بۆ درێژ کردم.. ڕیشی لە بنا هەڵکەندم... هەموو کەسێک، هەقی خۆیەتی بەرگری لە خۆی بکات، بێ لەمە، من ڕێگە بە کەس نادەم توندوتیژیم لەگەڵدا بکات.. بیروباوەڕم ڕێگەم پێنادات، چونکە ئەم کارە دەچێتە خانەی زۆرداریییەوە، پاشان دەبوو چیم بکردایە، هەر ئاوا بوەستم و بەرگری نەکەم؟ من تەنیا لە کۆڵ خۆمم کردەوە.

لۆژین لەسەر گاڵتەپێکردنە بەدەکەی بەردەوام بوو.

- هە، هە، هە!

- تۆ بۆیە ئازارم دەدەیت چونکە خۆت ڕکاوی و تووڕەیت.. ئەگینا ئەم قسە بێمانایانە چ پەیوەندییەکیان بە کێشەی ژنەوە هەیە! تۆ باش تێنەگەیشتیت. من بیرم لەوەیش کردۆتەوە ئەگەر ژن و پیاو لە هەموو شتێکدا یەکسان بن. تەنانەت لە لایەنی هێز و توانایشەوە (ئێستا نکۆڵی لەمە ناکرێت) کەواتە دەبێت لەم لایەنەیشەوە هەر یەکسان بن. هەڵبەتە پاشان لەوە گەیشتم کە نەدەبوو مەسەلەکە بەو شێوەیە بخرێتە بەرچاو، چونکە هەر نەدەبوو شەڕ و ئاژاوە پێش بێت، ئەم جۆرە پێشهات و گیروگرفتانە لە کۆمەڵگای ئاییندەدا شیاوی ئەوە نین بیریان لێبکرێتەوە.. بێگومان بەدەستهێنانی یەکسانی بە ڕێگەی شەڕ و ئاژاوە کارێکی سەیروسەمەرەیە!. من ئەوەندەیش گەمژە نیم.. ئەگەرچی شەڕوئاژاوە هێشتا بوونی هەیە، واتە.. بۆ لەمەودوا نابێت بمێنێت، بەڵام ئێستا هەیە.. ئاه.. شەیتان بە لەعنەت بیت! گفتوگۆ لەگەڵ تۆدا مایەی سەرئێشەیە... من لەبەر ئەو پێشهاتە ناخۆشە نییە کە نایەم بۆ ئەو دانیشتنی سەرخۆشییە، تەنیا لەبەر ئەوە ناچم چونکە

ناتوانم له بیروباوەڕی خۆم لابدەم، نامەوێت له نەریتێکی دواکەوتووی کۆمەڵایەتیدا بەشداری بکەم.. بەڵێ.. هەر لەبەر ئەوەیە. ئەگەرچی دەشێت بڕۆم، بەڵام تەنیا بۆ ڕابواردن و گاڵتەپێکردن.. بەداخەوە قەشەیەکی لێنییە. ئەگینا دەچووم.

– مەبەستت ئەوەیە نان و نمەکی خەڵکی بکەیت و لەسەر خوانیان دابنیشیت و پاشان تف له ڕوویان بکەیت؟ وایە؟

– نا، مەبەستم ئەوە نییە تف له ڕوویان بکەم، بەڵکو و تەنیا ڕەخنەلێگرتنیانە، ئامانجەکەی من بەسوودە. من دەتوانم ناڕاستەوخۆ بۆ پێشخستن و گەیاندنی بیروباوەڕ کەڵک له واقیع ببینم، هەموو مرۆڤێک لەسەریەتی بیروباوەڕی خۆی بڵاو بکاتەوە، چەندە لێبڕاوانە بیکات، چاکترە. من دەتوانم بیروباوەڕەکەم وەک دەنکەتۆوێک بچێنم.. لەو تۆوە هەقیقەت سەوز بێت. ئەمە چ کێشەیەک بۆ خەڵکی دروست دەکات! ڕەنگە له سەرەتادا پێیان ناخۆش بێت، بەڵام دوایی خۆیان دەبینن چەندە کەڵکیان لێوەرگرتووم، پێشتر لێرەدا خاتوو تربیف[1] که ئێستا بەشداری "کومون"ەکەمانە، بەوە تاوانباریان دەکرد که وازی له ماڵی باوکی هێناوە و کەوتۆتە دوای پیاوێک، نامەیەکیشی بۆ باوک و دایکی نووسیووە که ناتوانێت له ناو بیروباوەڕی پووچدا بژی، بۆیە شوویەکی ئازادی دوور له ڕێوڕەسمی ئاینی دەکات. ئەوسا خەڵکی پێیان دەوت ئەمە کارێکی نادروستە و توندوتیژییە بەرانبەر بە خێزان و کەسوکار، وا باشتر بوو هەستی ئەوان نەڕوشێنێت و نامەکەی کەمێک گونجاوتر بێت. بە ڕای من هەموو ئەم قسانە هەلەقومەلەقن و چ پێویستی بەوە نییە نامەی گونجاو و ناسکیان بۆ بنووسێت، بەڵکو

[1] *Terebyev*

بە پێچەوانەوە، لەمەسەلەی وادا دەبێت دەست دابگریت. لێرەدا خاتوو ڤارنتس[1] دەکەمە نموونە کە حەوت ساڵ لەگەڵ مێردەکەیدا ژیا، پاشان هەردوو منداڵەکەی بەرەڵا کرد و بە نامەیەکی بێپێشەکییەوە وازی لە مێردەکەی هێنا. بۆی نووسی: "هەستم دەکرد ناتوانم لەگەڵ تۆدا بژیم و خۆشبەخت بم، هەرگیز لێت نابوورم، کە تۆ فریووت دام و هەڵتخەڵەتاندم، ئەوەت لە من شاردەوە کە ڕێکخراوێکی تری کۆمەڵایەتی هەیە بە ناوی کۆمەڵەی سۆشیالیستی، بە هۆی پیاوێکی گەورەوە تازە هەموو ئەم شتانەم زانی و خۆم بەدەستیەوە دا و هەر لەگەڵ ئەودا کەوتمە کار بۆ بەدیهێنانی ئەو کۆمەڵە سۆشیالیستییە، ئەمانەت ڕاستوڕەوان پێدەڵێم، چونکە ئەگەر درۆت لەگەڵدا بکەم واتا درۆم لەگەڵ باوەڕ و شەرەفی خۆمدا کردووە. بۆ خۆت چۆن دەژیت بژی، دەست لە گەڕانەوەی من بشۆ، چونکە تازە کات درەنگە، هیوای بەختەوەریت بۆ دەخوازم" بەڵێ، دەبێت بەو شێوازە نامە بنووسرێت.

– ئەمە هەر ئەو خاتوو تربیڤەیە کە دەتوت سێهەم جاریەتی شووی ئازاد دەکات؟

– لە ڕاستیا ئەمە جاری دووەمیەتی، ئیتر جاری چوارەم بێت یان پانزەهەم.. چی تیایە! هەرگیز بە ئەندازەی ئێستا خەم لە مردنی دایک و باوکم ناخۆم، چەندان جار لەگەڵ خۆمدا بیرم کردۆتەوە کە ئەگەر تا ئێستا زیندوو بوونایە، چۆن ناڕەزاییم لە ڕوویاندا دەردەبڕی! بەتایبەتی بە جۆرێک ڕێکم دەخست کە.. بەڕاست لە چ خورافاتێکی دواکەوتوودا، تف! بیروڕای خۆمم پێدەوتن، وام دەکرد سەریان سووڕ بمێنێت! زۆر بەداخەوە کە هیچیان نەماون!

---

[1] *Varents*

پیتەر پتروڤیچ قسەکەی پێبڕی:
- تەنیا بۆ ئەوەی سەریان بەسوور بهێنیت؟ هە، هە، چاکە، لەم لایەنەوە مەیل مەیلی جەنابتە، وەلێ پێم بڵێ بزانم، تۆ کە کچی ئەو کۆچ کردووە دەناسیت، کچە لاواز و باریکەکە، ئەوەی لەبارەیەوە دەیڵێن ڕاستە؟نا؟

- جا چییە؟ لە ڕوانگەی منەوە، واتا بە بیروباوەڕی شەخسیی خۆم، ئەوە بۆ ژن زۆر سروشتییە، بۆ وا نەبێت؟ ئەگەر داوەرییەکی ڕاستەقینە بکەین، هەڵبەتە لەم کۆمەڵگایەی ئێستادا ئەو حاڵەتە زۆر سروشتی نییە. چونکە بەزۆر سەپێنراوە و ئازادی و ئارەزووی مرۆڤەکەی تیا نییە. بەڵام لە کۆمەڵگای ئاییندەدا بە تەواوی دەبێتە حاڵەتێکی سروشتی، چونکە کۆمەڵگاکە ئازادە. تەنانەت ئێستایش ئەو لەسەر هەقە، با چۆن ئەژی بژی، ئەو ئازار دەچێژێ و ماندوو دەبێت و ئەمەیش تاقە سەرمایەیەتی، واتا سەرمایەیەکە کە ئازادە لە بەکارهێنانیدا، بێگومان لە کۆمەڵگای ئاییندەدا پێویست بەو سەرمایەیە ناکات، چونکە هۆکاری مانەوەی نامێنێت، خۆفرۆشتنی ئافرەت لە ڕوویەکی ترەوە دیاری دەکرێت کە هاوسەنگە لەگەڵ سستمی گشتی و هۆشیاریدا. بە نیسبەت خودی سۆنیا سمیۆنۆڤناوە، لەم بارەی ئێستادا، من کارەکەی بە نارەزاییدەربڕینێکی توند دادەنێم بەرانبەر بە سستمی کۆمەڵایەتی، بۆیە من زۆر ڕێزی لێدەگرم، تەنانەت کە ئەو کچە دەبینم، دڵم دەکرێتەوە.
- وەلێ من وام بیستووە کە تۆ خۆت لەم خانووە دەرتکردووە!
لێبێزیاتینکۆف ڕقی هەستا و نەڕاندی:
- ئەمەیش بوختانێکی ترە! بە هیچ جۆرێک، بە هیچ جۆرێک مەسەلەکە وانەبووە. هەرگیز مەبەستێکی وا لەئارادا نییە، ئەم قسەوباسانە

دەستهەڵبەستی کاترینا ئیڤانۆڤنان، لەبەر ئەوەی لە هیچ تێنەگەیشت! هەرگیز من مەبەستم نەبووە لە سۆنیا سمیۆنۆڤنا نزیک ببمەوە. من تەنیا و تەنیا چاووگوێم دەکردەوە، بێ هیچ بەرانبەرێک، تێدەکۆشام هەستی ناڕەزایەتیی تیا دروست بکەم.. من تەنیا ئەوەم مەبەست بوو، کە ئەو ناڕازی بێت. خودی سۆنیا سمیۆنۆڤنایش ئیدی نەیدەویست لەمماڵەدا بمێنێتەوە!

- بۆ ئەویش بەشدارە لە کۆمەڵەی سۆشیالیستیدا؟

- وا دیارە گاڵتەت پێدێت، حەز ئەکەم پێت بڵێم تۆ لەم هەڵوێستەدا سەرکەوتوو نابیت، چونکە هیچ لە کومونە تێناگەیت! لە کۆمەڵەی سۆشیالیستیدا نەخشەی لەو بابەتە نییە.. کۆمەڵەی سۆشیالیستی بۆیە دروست دەبێت، کە ڕۆڵی وا بوونی نەمێنێت. لەو کۆمەڵگایەدا ئەم ڕۆڵە بە تەواویی مانا و مەبەستی دەگۆڕێت، ئەوەی لەم کۆمەڵگای ئێستادا گەوجانەیە، لەوێ هۆشمەندانە دەبێت، ئەوەی لەم هەلومەرجەی ئێستای ئێمەدا ناسروشتیە، لەوێ تەواو دەبێتە سروشتی. هەموو شتێک بەوەوە بەستراوەتەوە کە مرۆڤ لە کوێدا و لە چ هەلومەرجێکدا دەژی. هەموو شتێک بە ژینگەوە بەستراوەتەوە، مرۆڤ بە تەنیا خۆی هیچ نییە، بەڵام من تا ئێستا پەیوەندیم لەگەڵ سۆنیا سمیۆنۆڤنادا باشە، ڕەنگە ئەمە لەو سۆنگەیەوە هاتبێت، کە ئەو هەرگیز منی بە دوژمن یا نەیاری خۆی نەزانیووە، بەڵێ، من دەمەوێت ئەو دیدێکی سۆشیالیستانەی هەبێت، بەڵام لەبارەی شتی ترەوە! بۆ پێدەکەنیت؟ ئێمە خوازیاری کۆمەڵگایەکی سۆشیالیستیی تازەین، کە تایبەت بێت بە خۆمان و لەسەر پایەیەکی بەرفراوانتر دامەزرابێت، ئەم بیروباوەڕەیشمان لە پێشکەوتندایە. ئێمە زیاتر بێزاری

دەردەبڕین! ئەگەر دوبرولیوبف[1] لە ناو گۆڕدا زیندوو بێتەوە، من چەندوچوونی لەگەڵدا دەکەم، ئەگەر بلینسکیش[2] زیندوو بێتەوە، دەچمە گیانی. بەڵام ئێستا بە ڕاستی سەرگەرمی پێگەیاندنی سۆنیا سمیۆنۆڤنام. ئەو سروشتێکی زۆر زۆر بەرزی هەیە.

- چاکە، تۆیش سوود لەو سروشتە بەرزە وەردەگریت، وایە؟ هە، هە، هە!

- نا، نا، نەخێر، بە پێچەوانەوە.

- یانی چۆن بە پێچەوانەوە! هە، هە، هە! قسەیەکی سەیرە!

- باوەڕ بکە. ئاخر بزانم پێم بڵێ، لەبەر چ هۆیەک بمەوێت شت لە تۆ بشارمەوە؟ بە پێچەوانەوە، تەنانەت بۆ خۆیشم هەر سەیرە! کە لەگەڵما بێت، بێئەندازە شەرم و خەجاڵەتی دایدەگرێت.

- بێگومان تۆیش چاووگوێی دەکەیتەوە.. هە، هە! پێیشی دەسەلمێنیت کە هەموو ئەم شەرم و حەیایە بێمانایە!

- نەخێر، نەخێر! تۆ چەندە دڵڕەقانە تەنانەت گەوجانەیش -بمبوورە- لە مانای چاووگوێکردنەوە تێگەیشتوویت.. تۆ تێناگەیت! ئەی خودایا، تۆ چەندە هێشتا.. فرت بەم سەردەمەوە نییە. ئێمە دەمانەوێت ژن ئازاد بێت، وەلێ تۆ تەنیا بیر لە شتێک دەکەیتەوە.. هەر چەندە مەسەلەی شەرم و حەیا لە خۆیدا بێهودە و هیچە، بەڵام من بە تەواوی شەرمی ئەوم قبووڵە، چونکە ویستی خۆیەتی و بە هەقی خۆی دەزانێت. بە ڕاستی ئەگەر ئەو بە منی بوتایە "دەمەوێت لەگەڵتا بم" من خۆم زۆر بە سەرکەوتوو دەزانی، چونکە ئەو کچەم خۆش

---

[1] Doprolubov

[2] Belinsky

دەوێت، وەلێ ئێستا، بە لایەنی کەمەوە ئێستا، کەس وەک من بە ڕێز و ئەدەبەوە مامەڵەی لەگەڵدا نەکردووە.. لە منیش زیاتر ڕێزی بۆ کەسایەتیی ئەو دانەناوە. من چاوەڕێم و هیوادارم.. و هەر ئەمە.

- وا چاکە دیارییەکی پێشکەش بکەیت، گرەو دەکەم تۆ بیرت لەمە نەکردۆتەوە.

- من پێم وتیت تۆ لە هیچ ناگەیت، هەڵبەتە ئەو لەو حاڵەدایە، وەلێ لەم لایەنەوە مەسەلەیەکی تریش هەیە، مەسەلەیەکی تەواو جیاواز، تۆ بە سووک لەو دەڕوانیت، چونکە هەڵەیەکت لێدیوە، کە پەیوەندی بە شەرەفەوە هەیە، بۆیە بە چاوی سووک تەماشای دەکەیت، تۆ ناتەوێت حوکمێکی دادپەروەرانە و مرۆڤایەتییانە بەسەر ئەو کچەدا بدەیت. تۆ ئاگاداری سروشتی ئەو کچە نیت. من زۆر بە داخم لەم دواییەدا بە تەواوی وازی لە خوێندنەوە هێناوە و تەنانەت داخوازی کتێبم لێناکات، پێشتر کتێبی لێ داوا دەکردم. هەروەها جێی داخە لەگەڵ ئەو هەموو توانا و ئیرادەیەدا کە هەیەتی و سەلماندوویەتی، هێشتا تەواو سەربەخۆ نییە، واتا ئازادی و توانای ڕەتکردنەوەی گەلێک لە وەهمە کۆمەڵایەتییەکان.. و دیاردە بێماناکان. لەگەڵ ئەوەیشدا هەندێک لەو مەسەلانە بە چاکی دەزانێت و دەرکیان دەکات. بۆ نموونە، باش لە مەسەلەی دەستماچکردن دەزانێت. واتا لەوە بە ئاگایە کە ماچکردنی دەستی ژن لە لایەن پیاوەوە، سووکایەتیکردنە بە ژن، چونکە پیاوەکە خۆی لە پلەی یەکەمدا دادەنێت و ئەو لە پلەی دووەمدا. ئەم کێشەیە لای ئێمەوە باس کراوە و منیش لەگەڵ ئەودا قسەم لەسەر کردووە، لەبارەی سەندیکای کرێکارانی فەڕەنسایشەوە کە باسم بۆ دەکرد، بە قووڵی گوێی لێدەگرتم. ئێستایش باسی ئەوەی

بۆ دەکەم چۆن یەکێک بە ئازادی بڕواتە ژووری یەکێکی ترەوە، ئەمە لە کۆبوونەوەی ئاییندەماندا جێی مشتومڕە.
- ئەمەیان چییە؟
- لەم دواییەدا ئەمە بووە جێی باسوخواس کە ئایا یەکێک کە ئەندام بێت لە کۆمەڵەی سۆشیالیستیدا مافی ئەوەی هەیە هەر کاتێک بیەوێت، بچێتە ژووری ئەندامێکی تری هەمان کۆمەڵەوە ئیتر ژن بێت یان پیاو؟ بڕیار وادرا کە بەڵێ دەتوانێت.
- ئەی باشە ئەگەر لەو کاتەدا ئەو ئەندامە، ژنە یان پیاو، سەرقاڵی پێویستییەکی تایبەتی خۆی بوو؟ هە، هە، هە!
ئاندرێ سمیونوڤیچ داگیرسا و بە تووڕەییەوە وتی:
- جەنابتان هەر بیرتان لای ئەو "پێویستییە" نەفرەتلێکراوەیە! ئاه، نازانیت چەند پەشیمان و بێزارم لەوەی کاتی ئەم قسەوباسانە، پێش وادەی خۆی، لەبارەی ئەو پێویستییە مەلعوونەوە قسەم بۆ کردیت! نەفرەت لە شەیتان! لە ڕاستیا ئەمە کێشەی گرنگی هەموو ئەو کەسانەیە کە وەک تۆ وان، پێش ئەوەی لە مەسەلەکە تێبگەن، کێشەکە دەخەنە بەردەمی تۆ! وەک ئەوەی بە هەقی خۆیانی بزانن، یان شانازی بە شتێکەوە بکەن. ئاه! من چەندان جار وتوومە نابێت ئەو مەسەلەیە بەو کەسانە بوترێت، کە لە سەرەتادان تا ئەو کاتەی دەگەنە قۆناغی کۆتایی واتا ئەو کاتەی چاووگوێیان کراوەتەوە و کەوتوونەتە سەر ڕێ و پێگەیشتوون. بە جۆرێکی تر: تەنیا ئەوانە بۆیان هەیە لەم مەسەلانە بدوێن، کە ڕووناکبیری تەواون و بە قووڵی تێی دەگەن. باشە، پێم بڵێ.. تۆ چ ڕسوایی و بێشەرمیەک لە ئاودەستخانەدا دەبینیت؟ من یەکەمین کەسم کە.. من ئامادەم هەموو جۆرە ئاودەستێک پاک بکەمەوە. لەمەدا هیچ جۆرە فیداکارییەک نییە!

ئەمە تەنیا کارێکی بەکەڵک و ئابڕوومەندانەیە بۆ کۆمەڵگا، کە لە هیچ کارێکی دی کەمتر نییە، بێگومان زۆر مەزنترە لە کارەکانی وەک ڕوفائیل و پوشکین، چونکە قازانجی زیاترە.
- بەڵکو شەریفتریشە، شەریفتر، هە، هە، هە!
- شەریف یانی چی؟ لەبارەی دیاریکردنی جۆری کاری مرۆڤەوە من بەم زاراوانە قایل نیم. "شەریفترا" "جوامێرترا" هەموو ئەم زاراوانە پووچ و ڕسوا و بێمانا و کۆنن، لای من نرخێکیان نییە. هەر شتێک قازانجی بۆ مرۆڤایەتی هەبێت، شەریفە، من تەنیا شتێک دەزانم: قازانج! پێبکەنە، چەندت لا خۆشە پێبکەنە، وەلێ ئەمە هەقیقەتەکەیە.
پیتەر پتروڤیچ زۆر پێکەنی، ئیتر لە ژماردنی پارەکانی بووبووەوە و سەفتەکانی لادابوو، بەڵام بۆ هەر هۆیەک بێت، هەندێکیانی لەسەر مێزەکە هێشتبووەوە. مەسەلەی "ئاودەستەکان"یش هەرچەندە باسێکی بێنرخ بوو، بەڵام تا ئێستا چەندجارێک ببوو بە هۆی جیاوازی و پچڕانی پەیوەندیی نێوان پیتەر پتروڤیچ و لاوە هاوڕێکەی، هەموو کەرایەتییەکەیش لەوەدا بوو کە ئاندرێ سمیونوڤیچ بە ڕاستی تووڕە دەبوو، لە کاتێکدا کە لۆژین کاتی بەسەر دەبرد و ڕای دەبوارد، ئێستایش، زۆری حەز لێبوو کە لیبزیاتینکۆف تووڕە بکات.
لیبزیاتینکۆف لەگەڵ هەموو ئەو "سەربەخۆیی" و "ناڕازی"بوونەیدا هێشتا نەیدەوێرا ململانێی پیتەر پتروڤیچ بکات و بەگشتی وەک ڕاهاتنی چەندساڵێک لەوەوبەری ڕێزی لێدەگرت، خۆی نەگرت و هاواری کرد:
- تۆ بۆیە ڕکن و تووڕەیت چونکە دوێنێ لە کارەکەتدا سەرنەکەوتیت.
پیتەر پتروڤیچ بە هەوا و ناڕەحەتییەوە قسەکانی پێبڕی و وتی:

- حەز دەکەم پێم بڵێیت، ئایا دەتوانیت.. با باشتری بڵێم، ئایا تۆ لەگەڵ ئەو کچەدا ئەوەندە دۆستایەتیت هەیە، کە داوای لێبکەیت هەر ئێستا، بەپەلە بێتە ئێرە، بۆ ئەم ژوورە؟ وا ئەزانم ئێستا ئەوان لە گۆڕستان گەڕاونەتەوە.. گوێم لە دەنگی هاتوچۆیە.. دەبێت من ئەو ئافرەتە ببینم.

لێبێزیاتینکۆف بە سەرسامییەوە پرسی:

- چیت لێدەوێت؟

- هیچ، پێویستە بیبینم، من ئەمڕۆ یان بەیانی لێرە نامێنم، بۆیە حەزم دەکرد شتێکی پێبڵێم.. ڕەنگە وا چاکتر بێت تۆیش لێرە بیت و لە باسەکە ئاگادار بیت، زۆر باشترە، ئەگینا خوا خۆی دەزانێت چیت بە خەیاڵدا دێت!

- من خەیاڵم بۆ هیچ ناچێت، هەروا پرسیارەکەم کرد، وەلێ ئەگەر کارت پێیەتی، هێنانی بۆ ئێرە زەحمەت نییە، هەر ئێستا دەچم، هەقیشم بەسەرتانەوە نییە، بڕوات هەبێت.

هەروایش دەرچوو، دوای پێنج دەقیقە لیبزیاتینکۆف لەگەڵ سۆنیادا گەیشتن، سۆنیا زۆر بە سەرسووڕماوییەوە چووە ژووری. ئەو هەر بە سروشتی خۆی سام دایدەگرت، هەمیشە لە بارودۆخی وادا ترسی لێدەنیشت و لە دەموچاوی تازە و ناسیاوی نوێ هەراسان دەبوو. جارانیش هەر دەترسا، لە منداڵییەوە دەترسا و ئێستا ئەمە زیادی کردبوو.. پیتەر پتروڤیچ بە "ئەدەب و ڕێز"ەوە پێشوازیی لێکرد، پێشوازییەکی کەمێک بێپەردە و خۆمانەیی بە تایبەتمەندییەکەوە کە بۆ شان و شکۆ و ڕێزی یەکێکی وەک پیتەر پتروڤیچ بەرانبەر بە کچۆڵەیەکی سەرنجڕاکێشی وەک سۆنیا، تەواو شایستەیە. لۆژین ویستی زوو "دڵنیا"ی بکات، بۆیە لەسەر مێزەکەی بەرانبەر بە خۆی داینا، سۆنیا دانیشت، تەماشای ئەملاوئەولا و لێبێزیاتینکۆف و پارەی

سەر مێزەکەی کرد، لەناکاوێکدا دووبارە لە پیتەر پتروڤیچی ڕوانییەوە و چاوی لێهەڵنەگرت، وەک ئەوەی سەرنجی ئەمی ڕاکێشابێت. لێبێزیاتینکۆف ویستی بەرەو دەرگاکە بچێت، پیتەر پتروڤیچ هەستا، ئاماژەی بۆ سۆنیا کرد، کە هەڵنەستێ و لە نزیک دەرگاکەوە لیبزیاتینکۆفی وەستاند، لەسەرخۆ لێی پرسی:

- ئەو ڕاسکۆلنیکۆڤە لەوێیە، هاتووە؟

- ڕاسکۆلنیکۆڤ؟ لەوێیە، ئەی چۆن؟ بەڵێ، لەوێیە.. ئێستا هاتەوە. بینیم، ئەی چۆن؟

- کەوایە داوات لێدەکەم هەر لێرە بە، لەگەڵماندا، من بە تەنیا لەگەڵ ئەم کچەدا بەجێ مەهێڵە، هەرچەندە هیچ نییە، بەڵام دەشێ.. خوا دەزانێ چی پێوە دەنێن. حەز ناکەم ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەم مەسەلەیە بباتە دەرەوە و بیگێڕێتەوە. دەزانیت مەبەستم چییە؟

لێبێزیاتینکۆف لەپڕێکدا هەستی کرد و وتی:

- ئا، دەزانم، دەزانم، بەڵێ، هەقتە.. بە ڕای من تۆ شت زۆر گەورە دەکەیت.. وەلێ.. لەگەڵ ئەوەیشدا هەقی خۆتە، زۆر باشە، ناڕۆم، هەر لە پاڵ ئەم پەنجەرەیەدا دەوەستم و لێتان تێک نادەم.. دەزانم هەقی خۆتە..

پیتەر پتروڤیچ گەڕایەوە سەرکورسییەکەی و بەرانبەر بە سۆنیا دانیشت، بە وردی پیایدا هەڵیڕوانی و زۆر بە ویقار و لەڕادەبەدەر خۆی سەنگین ڕاگرت. وەک ئەوەی بیەوێت بڵێت: "تۆیش خانمەکە، خەیاڵی خراپ نەکەیت" سۆنیا زۆر ناڕەحەت بوو.

- سۆنیا سمیۆنۆڤنا، یەکەم خوازیارم لای دایکی بەڕێزت داوای لێبووردنم بۆ بکەیت، هەروایشە، کاترینا ئیڤانۆڤنا لە جێگای دایکتە؟

پیتەر پتروڤیچ قسەکانی بە هێوری و ناسکییەکی زۆرەوە دەست پێکرد و وا دەردەکەوت مەبەستێکی گەلێک پاکی هەیە.
سۆنیا خێرا و بە ترسەوە وتی:
- بەڵێ، وایە، لە جێگای دایکمە.
- چاکە، کەواتە لە دەمی منەوە داوای لێبوردنی لێبکە، لەبەر چەند هۆیەک کە لە دەرەوەی مندان، ناچارم داوای پۆزش بکەم، کە ناتوانم بە دەنگ داوەتە ڕەندانەکەی دایکتەوە بێم و لە دانیشتنی نانخواردنەکەدا بەشداری بکەم. مەبەستم ئەوەیە لە دانیشتنی یادکردنەوەی خوالێخۆشبوودا ناتوانم ئامادە بم.
سۆنیا بەپەلە لەسەر کورسییەکەی هەستا و وتی:
- بەسەرچاو، پێی دەڵێم، هەر ئێستا..
- نا هێشتا قسەم تەواو نەبووە.
بەم قسانە پیتەر پتروڤیچ سۆنیای ڕاگرت و بە سادەیی و نەزانینی ڕێوڕەسمی یەکترناسییەوە زەردەخەنەیەکی گاڵتەئامێزی بۆ کرد و وتی:
- تۆ زۆر کەم من دەناسیت، سۆنیا سمیۆنۆڤنای ئازیز، تۆ وا دەزانیت تەنیا بۆ شتێکی ئاوا بێنرخ کە پەیوەندی بە منەوە هەبێت، ڕێگە بە خۆم بدەم کەسێکی وەک تۆ سەرقاڵ بکەم و بانگی بکەمە لای خۆم؟ من مەبەستێکی ترم هەیە.
سۆنیا خێرا دانیشتەوە، دیسانەوە دراوە ڕەنگ خۆڵەمێشییە دڵگیرەکان، کە لەسەر مێزەکە بڵاو کرابوونەوە، کەوتە بەرچاوی، بەڵام زۆر بەپەلە ڕووی لێوەرگێڕان و تەماشای پیتەر پتروڤیچی کرد. چونکە زوو ئەو هەستەی تێگەڕا، کە سەیرکردنی پارەی خەڵکی کارێکی خراپە. سۆنیا چاوی لە چوارچێوەی ئاڵتوونیی چاویلکە

شووشەییەکەی پیتەر پتروڤیچ بڕی، کە بە دەستی چەپی ئاگاداریی لێدەکرد. هەروەها لە ئەنگوستیلە گەورە و هەرەجوانەکەی پەنجەی ناوەڕاستی هەمان دەستی چەپی ڕوانی، کە نقێمێکی زەردی لەسەر بوو. کەچی لەپڕێکدا چاوی لەسەر ئەویش لابرد، ئیدی نەیدەزانی لە کوێ بڕوانێت. بە ناچاری جارێکی تر کەوتەوە تەماشاکردنی چاوی پیتەر پتروڤیچ.

لۆژین دوای بێدەنگییەک کە لە جاری پێشوو ماقووڵتر دەردەکەوت، وتی:

- وا ڕێکەوت، دوێنێ هەر بەسەر پێوە دوو سێ قسەم لەگەڵ کاترینا ئیڤانۆڤنای بەدبەختا کرد، دوو وشە بەس بوو لەوە تێبگەم لە چ حاڵێکدایە.. ئەگەر بشێت بڵێم.. لە حاڵەتێکی ناسروشتیدایە.

سۆنیا بەپەلە پاڵپشتی قسەکەی کرد و وتی:

- وایە، حاڵەتێکی ناسروشتیی هەیە..

- یان ئەگەر ڕوونتر و سادەتری بڵێم، حاڵەتێکی نەخۆشی.

- بەڵێ، سادەتر و ڕوونترە.. بەڵێ، نەخۆشە.

- بەڵێ، لەم ڕووەوە و بە هەستێکی مرۆڤدۆستییەوە.. وەک دڵسۆزییەک پێم خۆشە لە لایەنێکەوە، بە پێشبینیکردنی چارەنووسی ناخۆش و نائومێدی ئەوەوە، بەتایبەتی یارمەتی بدەم. دیارە هەموو ئەو خێزانە هەژارە ئێستا گیانیان بە تۆیە.

سۆنیا لەپڕێکدا هەستا و وتی:

- ڕێگەم بدەرێ بپرسم.. تۆ لەبارەی مووچەی خانەنشینییەوە چیت پێوتووە. چونکە دوێشەو پێی وتم تۆ چوویتەتە ژێر ئەوەی مووچەیەکی بۆ پەیدا بکەیت؟ ئەمە ڕاستە؟

- بە هیچ جۆرێک وانییە و تا ڕادەیەک هەڵەی تێگەیشتنە. من تەنیا ئاماژەیەکم کرد کە ڕەنگە یارمەتیی بێوەژنی کارمەندێک بکرێت، کە لە کاتی کارکردندا لەناو چووە، بێگومان ئەمەیش کاتێک دەبێت، کە پشتیوانیی لێبکرێت. وەلێ باوکی خوالێخۆشبووت نەک تەنیا خزمەتی تەواو نەکردووە، بەڵکو لەم دواییەدا هەر نەچووەتە سەر کار. بە کورتی، ئەگەر کەمەئومێدێک لەئارادا بووبێت، ئێستا ئەوەیش زۆر کەم بۆتەوە. چونکە بە ڕاستی لە بارێکی بەم جۆرەدا یارمەتی نادرێت.. بەڵکو بە پێچەوانەوە.. چۆن ئەوان ئێستا لە خەیاڵی مووچەیەکی وادان؟ هە، هە، هە! خانمێکی زرنگە!

- بەڵێ، خانەنشینی.. چونکە خۆی خۆشباوەڕ و میهرەبانە، هەر لەبەر ئەو میهرەبانییەیەتی کە بڕوا بە هەموو شتێک دەکات و.. و.. بیریشی هەروایە.. بەڵێ، ببوورە.

لەگەڵ وتنی قسەکانیدا سۆنیا هەستا بڕوات.

پیتەر پتروڤیچ وتی:

- ببوورە، تۆ هێشتا گوێت لە هەموو قسەکانم نەبووە.

سۆنیا لەبەر خۆیەوە وتی:

- وایە، گوێم لێ نەبووە.

- باشە، کەواتە دابنیشە.

سۆنیا بە بێزارییەوە بۆ سێیەمین جار دانیشتەوە.

- کە بەو حاڵەوە و لەگەڵ ئەو منداڵە بەدبەختانەدا دایکتم بینی، وەک لە پێشدا وتم، ویستم هەر چۆنێک بێت، چەند بتوانم، یارمەتییەکی بدەم، یەعنی هەر بەو جۆرەی کەوتم، چەند بتوانم، نەک زیاتر، بۆ نموونە دەشێت بە ناوی ئەوەوە پیتاک بکرێت، یان یانسیبێکی بۆ ڕێک بخرێت و.. یان شتێکی لەم بابەتانە. ئەم جۆرە کارانە ئاسایی لە لایەن

کەسانێکی نزیک بەو کەسەوە، یان تەنانەت کەسانێکی بێگانەیش کە حەزی یارمەتیدانیان تیا بێت، ساز دەکرێت. هەر ئەمە بوو ویستم پێتانی بڵێم، دەشێت ئەم کارە بکرێت.

سۆنیا بەدەم ڕامانەوە لە پیتەر پتروڤیچ لەبەر خۆیەوە وتی:

- بەڵێ، زۆر چاکە، خوا لێتان..

- ئەم کارە دەکرێت.. وەلێ ئەمە بۆ لەمەودوا.. یەعنی دەکرێت هەر لەمڕۆوە دەست پێبکرێت. شەو یەکتر دەبینین، پێکەوە قسە دەکەین و بەرنامەی بۆ دادەنێین، لە دەوری سەعات حەوتا هەر لێرە سەرێکم لێبدە. هیوادارم ئاندرێ سمیونوڤیچیش بەشداری کارەکەمان بکات.. بەڵام.. لێرەدا شتێک هەیە، کە دەبێت لە پێشەوە بیزانین، هەر بۆ ئەوەیشە، سۆنیا سمیۆنۆڤنا، زەحمەتم داویتێ و بانگم کردویتەتە ئێرە. مەسەلەکە ئەوەیە، بە بڕوای من، ناشێت و ڕەنگە ترسناکیش بێت پارە بکرێتە دەستی کاترینا ئیڤانۆڤناوە، بەڵگەیش ئەم دانیشتنی یادکردنەوەیەی ئەمڕۆیە. واتا بێ ئەوەی تیکەیەک نانی هەبێت بۆ بەیانی، یان، بێ ئەوەی پێڵاوێکی لەپێدا بێت و شتی تریش، ئەمڕۆ شەرابی "رم"ی تایبەتی و تەنانەت دەڵێن شەربەتی "مادیراو" و قاوەیش کڕاوە. خۆم لە هاتنەکەمدا بینیم، سبەی دیسانەوە هەموو شتەکان بەسەر تۆدا دەشکێتەوە، تەنانەت داوای تیکەنانێکیشت لێدەکەن.. دەی، بە ڕاستی ئەمە بێمانایە. بۆیە بە لای منەوە دەبێت کۆکردنەوەی پارەکە بە شێوەیەک ئەنجام بدرێت، کە ئەو بێوەژنە نەگبەتە شتێکی لە بارەوە نەزانێت و تەنیا تۆ لێی بەئاگا بێت. قسەکەم ڕاستە؟

- نازانم.. ئەو هەر ئەمڕۆ ئەمەی کردووە.. ئەمەیش تەنیا جارێک ڕوو دەدات.. زۆری پێ خۆش بوو یادکردنەوەیەکی بۆ بکات، ڕێزی

لێبگرێت.. بۆ یادی.. وەلێ ژنێکی گەلێک ئاقڵە.. باشە، بێگومان ئارەزووی خۆتە، منیش زۆر زۆر، زۆر سوپاسگوزاری تۆم.. هەموو ئەوانیش.. خوا ئێوە.. هەروەها هەتیووەکانیش..

سۆنیا قسەکانی تەواو نەکردبوو دایە پڕمەی گریان.

– زۆر باشە، کەواتە ئەمانە لە بیر مەکە، ئێستایش وەک بەشداریکردنی من لەو پیتاکەی کە بۆ دایکت دەکرێت، تکایە ئەم پارانەم لێوەربگرە. حەزیش دەکەم، زۆریش حەز دەکەم لە هیچ شوێنێک ناوی من نەبرێت. فەرموو.. چونکە خۆیشم کێشەی دەرامەتم زۆرە و ناتوانم لەوە زیاتر...

پیتەر پتروڤیچ کە کاژە دە ڕۆبڵیەکانی باش لە یەکدی جیا کردبووەوە، بۆ سۆنیای ڕاگرت. سۆنیا وەریگرت. سوور داگەڕا. لە جێگاکەی هەستا، ورتەورتێکی کرد و بەپەلە کەوتە خواحافیزی. پیتەر پتروڤیچ بە ڕێزێکی زۆرەوە تا بەردەم دەرگاکە ڕەوانەی کرد. پاشان سۆنیا، کە سەرتاپا نیگەران و ماندوو دەهاتە بەرچاو، لە ژوورەکە هاتە دەرێ و بە شپرزەییەکی زۆرەوە گەڕایەوە لای کاترینا ئیڤانۆڤنا.

لە هەموو ئەو ماوەیەدا ئاندرێ سمیونوڤیچ کە نەیدەویست قسەیان پێببڕێت، جارێک لە پاڵ پەنجەرەکەدا دەوەستا و تاوێک لە ناو ژوورەکەدا دەکەوتە پیاسەکردن. بەڵام کە سۆنیا ڕۆشت، لەپڕێکدا لە پیتەر پتروڤیچ نزیک کەوتەوە و بە هەستێکی پڕەوە دەستی بۆ درێژ کرد و وتی:

– هەموو شتێکم دی و ژنەوت..

زۆر بە تایبەتی دانی بە دواوشەدا نا:

– ئەمە کارێکی شەرافەتمەندانە بوو، مەبەستم ئەوەیە بڵێم ئینسانییانە بوو. تۆ نەتویست سوپاسیشت بکەن. بینیم! هەرچەندە دان بەوەدا

دەنێم. لەسەر بنەمای ئەو بیروباوەڕەی هەمە ناتوانم دەستخۆشی لە خێرپێکردنەکەت بکەم. چونکە خێرپێکردن نەک ناتوانێت شەڕ ڕیشە کێش بکات، بەڵکو بەهێزتری دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ناشێت دان بەوەدا نەنێم کە حەزم لە کارەکەتان کرد، بەڵێ، بەڵێ، زۆرم لا خۆش بوو.

پیتەر پتروڤیچ کە بە دوودڵییەوە لە لیبزیاتینکۆفی دەڕوانی. لەبەر خۆوە وتی:

- نا، ئەمانە گرنگ نین!

- نا، گرنگە، کەسێک سووکایەتیی پێکرابێت -وەک ئەوەی دوێنێ بە تۆ کرا- لەگەڵ ئەوەیشدا بتوانێت بیر لە چارەڕەشیی خەڵکی تر بکاتەوە. کەسێکی وا.. هەرچەندە کارەکەی خەوشێکی کۆمەڵایەتیشی پێوە بێت. لەگەڵ ئەمانەیشدا.. شایانی ستایشە! من چاوەڕێی شتی لەم بابەتەم لە تۆ نەدەکرد پیتەر پتروڤیچ، بە تایبەتی کە بیروڕاکانت.. تۆ ئەو بیروڕایانەت زۆر قورس گرتووە! بۆ نموونە ئەو تێکشکانەی دوێنێ چەند تۆی نیگەران کردووە.

ئاندرێ سمیونوڤیچ کە سەرلەنوێ بە دڵخۆشییەوە خۆشەویستی خۆی بۆ پیتەر پتروڤیچ دەربڕی، لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

- باشە پێم ناڵێیت ئەم هاوسەریەتییەی تۆ دەتەوێت کەڵکی چییە، کەڵکی چییە؟ ژن و مێردایەتی لە ڕێگەی شەرعەوە چ سوودێکی بۆ تۆ هەیە، جەنابی پیتەر پتروڤیچی زۆر شەریف؟ ئەم بەشەرعی و یاساییکردنی هاوسەریەتییە بۆ تۆ چ کەڵکێکی هەیە؟ باشە، ئەگەر پێت خۆشە، دەتوانیت دارکاریم بکەیت، بەڵام زۆرم پێ خۆش بوو زەماوەندەکەت سەری نەگرت، ئازادیت و هێشتا بۆ سوودگەیاندن بە

مرۆڤایەتی دەژیت.. بەڵێ، خۆشحاڵم.. بڕوانە، هەرچییەکم لە دڵدا بوو، پێم وتیت.

- ئەزانیت بۆچی باشە، چونکە نامەوێت لە ڕێی ناشەرعی و مارەنەبڕینەوە کڵاوی تەرەسیم بکرێتە سەر و منداڵی خەڵک بەخێو بکەم، بۆیە مارەبڕین بە کاری پێویست دەزانم.

لۆژین هەر تەنیا بۆ وەڵامدانەوەی ئەو ئەو قسانەی کرد، ئەگینا ئەو زۆر بە سەختی بیری لە جێگایەکی تر و مەبەستێکی دی بوو.

ئاندرێ سمیونوڤیچ وەک ئەسپی شەڕ کە گوێی لە دەنگی شەیپووری جەنگ بووبێت، داچڵەکی و وتی:

- منداڵ؟ تۆ باس لە منداڵ دەکەیت؟ منداڵ باسێکی کۆمەڵایەتییە و بایەخێکی زۆر گرنگی هەیە. من لەگەڵتام، بەڵام کێشەی منداڵ بە جۆرێکی دی چارەسەر دەکرێت. هەندێک هەن منداڵ وەک بەشێک لە خێزان بە تەواوی ڕەت دەکەنەوە، لەبارەی منداڵەوە دواتر قسە دەکەین. با ئێستا بگەڕێینەوە سەر ئەو "تەرەسییە"ی کە ناوت هێنا، دان بەوەدا دەنێم ئەمە خاڵی لاوازی منە، ئەم زاراوە قێزەون و پۆخڵەی لە پوشکینەوە وەرگیراوە، لە فەرهەنگی ئاییندەدا جێی نابێتەوە، ئاخر "کڵاوی تەرەسی" یانی چی؟ ئەمە چ تێنەگەیشتنێکە! کامە کڵاو؟ کڵاو بۆچی؟ چ قسەیەکی بێمانایە! بە پێچەوانەوە لە هاوسەریەتیی ناشەرعیدا شتی وا هەر ڕوو نادات! کڵاوی تەرەسیەتی بەرئەنجامێکی سروشتی هەموو ژن و مێردایەتییەکی ڕەسمی و شەرعییە. واتا هاوسەریەتیی ئازاد بۆ چاککردن و نارەزاییدەربڕینە بەرانبەر بەو شێوە هاوسەریەتییە و چ ڕسواییەکی لە دواوە نییە.. خۆ ئەگەر گریمان ڕۆژێک لە ڕۆژان ناچاری ژنهێنانی بەو شێوە ڕەسمی و شەرعییە بکرێم. گەلێک بەو "کڵاوە" نەفرەتییە شادمان دەبم، ئەگەر

شتێکی وا ڕووی دا، بە ژنەکەم دەڵێم: "هاوڕێ، من تا ئێستا هەر خۆشم دەویستیت، وەلێ لەمەودوا بێجگە لە خۆشەویستی ڕێزیشت لێدەگرم، چونکە تواناى ئەوەت هەبوو نارەزایەتی دەرببڕیت!" پێدەکەنیت؟ دەزانیت بۆ، چونکە تۆ ئەو توانایەت نییە لە بیروباوەڕی پووچ خۆت ڕزگار بکەیت. نەفرەت لە شەیتان. ئاخر من ئەوە دەزانم ئەگەر یەکێک ژنێکی شەرعی بهێنێت و پاشان ژنەکە ناپاکیی لەگەڵدا بکات، ئەو پیاوە تووشی چ گاشەیەک دەبێت. چونکە هەموو کارێکی ناپەسەند ئەنجامی ناپەسەندی لێدەکەوێتەوە، لە حاڵی وادا ژن و مێردەکەیش تووشی کێشە و ڕسوایی دێن. بەڵام ئەگەر کڵاوەکە ڕێک و ڕەوان لەسەر بکەن و هاوسەریەتییەکی ئازاد و ناشەرعی پێک بهێنن، ئەوسا هەرگیز "کڵاوی تەرەسی" بوونی نامێنێت، هەر بە خەیاڵی کەسدا نایەت، تەنانەت ناوەکەیشی لە بیر دەچێتەوە. بە پێچەوانەوە، دەتوانم بڵێم ژنەکەت بۆت دەسەلمێنێت کە ڕێزت لێدەگرێت، چونکە تۆ ئامادە نیت ڕێ لە خۆشی و بەختەوەریی ئەو بگریت، هێندەیش سنگفراوان و پێشکەوتوویت، تۆڵە لە مێردە تازەکەی ناکەیتەوە. نەفرەت لە شەیتان! من هەندێکجار وام بە خەیاڵدا دێت ئەگەر ژن بێنم (ئیتر ژنهێنانی ئازاد بێت یان لە ڕێگەی شەرعەوە، هەردووکیان بەبێ جیاوازی) دەشێت خۆم دۆستێکی پیاو بۆ ژنەکەم پەیدا بکەم، ئەگەر ئەو خۆی بیری لە دۆستگرتن نەکردبووەوە، پێیشی دەڵێم: "هاوڕێ، من تۆم خۆش دەوێت، بەڵام بێجگە لەمە حەز دەکەم ڕێزم بگریت". بەڕاستمە، بەڵێ وایە، ئایا من ڕاست دەکەم یان نا؟

پیتەر پتروڤیچ بە تەوسەوە زەردەیەکی هاتێ، بەڵام قسەکانی زۆر بە لاوە گرنگ نەبوو. تەنانەت باش گوێیشی بۆ نەتەکاند. لە ڕاستیا بە قووڵی بیری لە جێگایەکی تر دەکردەوە. لە دواییدا لیبزیاتینکۆفیش

درکی بەوە کرد. پێدەچوو پیتەر پتروڤیچ دڵەڕاوکێی بێت، هەر دەستی هەڵدەگلۆفت و بیری دەکردەوە، هەموو ئەمانە، لە دواییدا کە ئاندرێ سمیونوڤیچ بیری کردەوە، هاتنەوە یادی.

٢

زۆر کارێکی گران بوو بتوانیت بە وردی ئەو هۆکارانە دیاری بکەیت، کە سەرە شێپرزەکەی کاترینا ئیڤانۆڤنا بۆ ئەم دانیشتنی یادکردنەوەیەی بە پێویست دەزانی. لە ڕاستیشدا، لەو بیست ڕۆبڵەی کە ڕاسکۆلنیکۆڤ بۆ خەرجیی کفنودفنکردن پێی دابوون، دە ڕۆبڵیان کردبووە قەبەڵی ئەم دانیشتنە، دەشێت کاترینا ئیڤانۆڤنا بە ئەرکێکی سەرشانی خۆی زانیبێت کە کۆچکردوو بە ڕێزەوە ناو ببرێت و بە "شێوەیەکی شایستە" یادی بکرێتەوە. بۆ ئەوەی گشت کرێنشینەکانی تر و ئامالیا ئیڤانۆڤنا بە تایبەتی لەوە بگەن، کە کۆچکردوو "نەک تەنیا لە هەموو ئەوان خراپتر نەبووە، بەڵکو بە چەند پلەیەکیش لەوان چاکترە". هیچ یەکێکیش لەوانە مافی ئەوەی نییە بەرانبەر بەو "بە خۆی بنازێت". ڕەنگە لەم لایەنەوە، لە پێش هەر شتێکی تردا، ئەو لووتبەرزییە کاریگەریی هەبووبێت کە تایبەتە بە هەژارانەوە، ئەو لووتبەرزییەی لە بەڕێخستنی هەندێک ڕێوڕەسمی کۆمەڵایەتیی لەم جۆرەدا کە لە ژیانماندا زۆر ڕوو دەدەن، گەلێک لە هەژار و داماوەکان هەرچییەکیان پێبکرێت بەکاری دێنن و دواپوولی خۆیانی تیا خەرج دەکەن، ئەمە تەنیا بۆ ئەوەی "لە خوار خەڵکەوە" نەبن و "خەڵکی دی" عەیبەیان نەڵێن. هەروەها زۆر پێدەچێت کاترینا ئیڤانۆڤنا لەم پێشهاتەدا، بەتایبەتی لەم چرکەساتەدا کە دەڵێی لە دنیادا بە تاقی تەنیا ماوەتەوە، ویستبێتی بە هەموو ئەو "کرێنشینە ئاوارە و

نەگبەتانە" بڵێت، ئەو نەک "دەزانێت چۆن بژی و میوانداری بکات" بەڵکو ئەو هەر لە بنەڕەتدا بۆ ئەم چارەنووسە دروست نەبووە کە بووە بە تووشیەوە. ئەو "لەماڵی خانەدان و دەوڵەمەند و کۆڵۆنێل"دا گەورە بووە، هەرگیز بۆ ئەوە پەروەردە نەکراوە خۆی زەوی گسک بدات و شەوانە شڕەوپڕەی منداڵ بشوات. ئەم هەوای لووتبەرزی و خۆبەزلزانینە هەندێکجار تووشی نەداراترین و بێکەسترین کەس دێت، هەندێکجاریش دەگۆڕێت بۆ نەبوونییەکی شێلگیرانەی سەخت، وەلێ بەهەرحاڵ، کاترینا ئیڤانۆڤنا لەو جۆرە ژنانە نەبوو، کە زوو خۆ بە دەستەوە دەدەن. دەشیا هەندێک پێشهات بە تەواوی کاری لێبکردایە، بەڵام هەرگیز نەیدەتوانی هەرەس بە ورەی بێنێت، واتا ترساندن و کۆنترۆڵکردنی ئیرادەی، مەحاڵ بوو. هەرچەندە سۆنیا زۆر ڕاستی دەکرد کە دەیگوت مێشکی خەریکە تێک دەچێت. وەلێ هێشتا ئەمە بە تەواویی یەکلایی نەببووەوە. بەڵام لەم دواییەدا، واتا لەم ساڵەی دواییدا، مێشکی ئەو داماوە، لەوە زیاتر هێدمەی بەرکەوتبوو، کە بەرگەی دەگرت. بە وتەی پزیشکیش، نەخۆشی سیل وردەوردە توانای ئەقڵ لەناو دەبات.

جۆر و ئەندازەی ئەو شەرابانەی کە بۆ ئەو دانیشتنە ئامادە کرابوون، لە نێوانیاندا شەرابی "مادیر"یش، زۆر نەبوو، زۆری خرابووە سەر، وەلێ خواردنەوە هەبوو، لەوانە ڤۆدگا، ڕۆم و شەرابی لیسبن، هەمووشیان خراپترین جۆری خواردنەوە بوون. لە خۆراکیشدا بێجگە لە "کوتیا"[1]، سێ چوار خواردنی جیاجیا، لەوانە "بلینی"[2] کرابوون و لە

---

Koutia [1] خۆراکێکی تایبەتییە، لەگەنم دروست دەکرێت.

Bliny [2] خۆراکێکە لە هەویر دروست دەکرێت.

چێشتخانەکەی ئامالیا ئیڤانۆڤنادا ئامادە کرابوون. هەروەها دوو سەماوەریان بۆ چاو "پونش"[1]ی دوای نانخواردن دەم کردبوو. کاترینا ئیڤانۆڤنا کڕینی شتەکانی خستبووە ئەستۆی خۆی. بۆ ئەم مەبەستەیش پیاوێکی نەگبەتی پۆڵۆنی کە ئەویش لە ساختمانەکەدا کرێچی بوو، خوایش دەیزانی بە چ مەبەستێکەوە لای لیپڤخزڵ کاری دەکرد، یارمەتیی دەدا. ئەو کابرایە زوو فریای کاترینا ئیڤانۆڤنا کەوت، هەموو دوێنێ و سەرلەبەیانی ئەمڕۆ، لە کاتێکدا کە ئاگالەخۆبڕاو و هانکەهانکی بوو، بەدوای کاتریناندا ڕاکەڕاکە و دیار بوو زۆریش هەوڵی دەدا سەرنجی خەڵکی بە لای خۆیدا ڕابکێشێت، بۆ بچووکترین شت پرسی بە کاترینا ئیڤانۆڤنا دەکرد، تەنانەت بۆ دۆزینەوەی تا ناو حەسارەکەیش دەچوو. بەردەوام بە زمانی پۆڵۆنی بە "خانمی بەڕێزی کۆڵۆنێل " ناوی دەهێنا، تا ئەوەی کاترینا ئیڤانۆڤنا، کە لە پێشدا لای وابوو بەبێ ئەم مرۆڤە "خزمەتگوزار و مەزنە" کاروبارەکانی بە تەواوی پەکیان دەکەوێت، سەرئەنجام ڕقی هەستا و لێی بەتەنگ هات، یەکێک لە سروشتەکانی کاترینا ئیڤانۆڤنا ئەوە بوو کە ڕێکەوتی هەر کەسێکی بکردایە، جوانترین سیفەتی دەدایە پاڵی و ئەوەندەی تاریف لێدەکرد، کە خودی کەسەکە شەرمی پێدەهات، لەو ئاکارانە دەدوا کە ئەسڵەن لەو کەسەدا نەبوو، لە ناخی دڵەوە ئەمەی دەکرد و خۆیشی بە تەواوی بڕوای پێی بوو. بەڵام لە ناکاوێکدا هەستی دەکرد فریوو دراوە، ئەو کەسەی پێش چەند سەعاتێک تاریفی لێدەکرد، پەیوەندیی لە گەڵیا دەبڕی، قسەی ناشیرینی پێدەوت و دەری دەکرد. خوویەکی سەیر و خۆشی لێبوردووانەی هەبوو. بەڵام تێکشکان و بەدبەختییە

---

[1] شەربەتێکی تێکەڵە لە شەراب و ئاوی میوە و شەکر.

یەک لە دوایەکەکانی، زۆر بە سەختی داوای ئەوەیان لێدەکرد هەموو کەس لە خۆشی و شادیدا بژین، کەسیش بێجگە لەو ژیانە چی تری قبووڵ نەبێت. ئەگەر ڕێکەوتی بچووکترین نایەکسانی و کەمترین شکستی بکردایە، لە پێستی خۆی دەردەچوو، بە جۆرێک کە دوای ئەوەی خۆی لەگەڵ ڕەنگاڵەترین هیوا و جوانترین ئاوات و درەوشاوەترین خەیاڵ و خەوندا ڕاهێنابوو، لە چرکەساتێکدا، دەکەوتە جوێندان بە چارەنووس و نەفرەتکردن لە زەمانە، هەرچییەکی بەردەست بکەوتایە، دەیدڕاند یان پەرتی دەکرد و سەری خۆیشی بە دیواردا دەکێشا.

کەسیش نەیدەزانی، چۆن ئاوا لە پڕێکدا، ئەم ئامالیا ئیڤانۆڤنایە، بوو بە جێی ڕێز و شانازی کاترینا ئیڤانۆڤنا، ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێت کە لەم پرسەدانان و میوانداریکردنەدا ئامالیا ئیڤانۆڤنا بەشداری کردووە و تەواو ماندوو بووە. مێزڕازاندنەوە و خوان و خاولی و پێویستیی تر و ئامادەکردنی خواردن لە چێشتخانەکەی ئەودا هەموو بەر ئەو کەوتبوو. کاترینا ئیڤانۆڤنا هەموو ئەوانەی بەرەوڕووی ئەو کردەوە و خۆی چوو بۆ گۆڕستان. لە ڕاستیشدا هەموو شتەکان باش بەڕێ کرابوون: مێز زۆر بە ڕێکوپێکی ڕازابووەوە. دەفر و چنگاڵ و چەقۆ و پەرداخ و پیاڵەی چا و شتی تریش. هەرچەندە ئەو شتانە لە ڕووی شێوە و ڕەنگ و نرخەوە گەلێک جیاواز و نەگونجاو بوون، چونکە لە کرێگرتەکان کۆ کرابوونەوە و بە ئەمانەت هێنرابوون. وەلێ لە کات و شوێنی دیاریکراوی خۆیدا ئامادە کرابوون. ئامالیا ئیڤانۆڤنا کە زانی کارەکانی زۆر چاک ئەنجام داوە، بە جلی ڕەش و کڵاوی بە قردیلەی ڕەشی جوان ڕازاوەوە، چووە پێشوازیلێکردنی ئەوانەی لەسەر قەبران دەگەڕانەوە، بەڵام هەستێکی شانازیکردن و لووتبەرزیی پێوە دیار

بوو. هەرچەندە ئەو هەستە لە جێی خۆیدا بوو، بەڵام لای کاترینا ئیڤانۆڤنا باش نەشکایەوە: بۆ ئەگەر ئامالیا ئیڤانۆڤنا نەبووایە، کەسی تر نەیدەتوانی مێز بڕازێنێتەوە! کڵاو و قردێلە تازەکانیش لای کاترینا پەسەند نەبوون، بە خۆی دەوت: "ناشێ ئەم ژنە ئەڵمانییە گەوجە شانازی بەوەوە بکات کە خاوەن ماڵە و بەزەیی پیاماندا هاتۆتەوە بۆیەش ئامادە بووە خێر بە کرێگرتەکان بکات؟ بەزەیی پێداهاتنەوە! بەداخەوە! لەماڵی باوکی کاترینا ئیڤانۆڤنادا کە کۆلۆنێل بووە و تا ڕادەیەکیش نیمچەپارێزگار بووە، جاری وا هەبووە خواردنی چل کەس لەسەر سفرە ئامادە کراوە. نموونەی ئامالیا ئیڤانۆڤنا، یان ڕاستتر ئامالیا لودڤیگوڤنا لەو شوێنەدا تەنانەت ڕێگەی ئەوەیشیان پێنەدەدا لە چێشتخانەدا کار بکات".

وەلێ کاترینا ئیڤانۆڤنا بڕیاری دا تا کاتی خۆی نەگات، ئەو هەستانە دەرنەبڕێت، هەرچەندە لە ناوەوەی خۆیدا بڕیاری دا کە ئامالیا ئیڤانۆڤنا لە جێی خۆیدا بوەستێنێت، بۆ ئەوەی لە خۆی بایی نەبێت و خوانەکردە خەیاڵی هەڵە بەسەریدا گوزەر نەکات. بۆیە سەرەتا بە ڕواڵەت لەگەڵیدا کەمێک ساردیی نواند. تا ڕادەیەک خەمێکی تریش کاترینا ئیڤانۆڤنای بێحەوسەڵە کردبوو: لە ناشتنی مردووەکەدا، لە هەموو ئەو کرێگرتانەی بانگ کرابوون، بێجگە لە کابرای پۆڵەندی کە لەگەڵ هەموو گیروگرفتەکانی خۆیدا دەرفەتی سەردانی بۆ ڕەخسابوو، تا ڕادەیەک کەسی دی ئامادە نەبوو. لە میوانداریییەکەیشدا، واتا بۆ نانخواردنیش، نابوودترین و هەژارترین میوان هاتبوون، ئەوانیش بە شڕوپڕترین جلوبەرگەوە، ئەوانەی بەتەمەن یان خاوەن ویقار بوون، وەک تەگبیریان پێکەوە کردبێت، کەسیان ئامادە نەبوون.

بۆ نموونە پیتەر پتروڤیچ لوژین، کە دەتوانیت لە هەموو کرێگرتەکانی دی زیاتر بە ویقار و خاوەن پلەوپایەی دابنێیت، ئەویش نەهاتبوو، ئەمە لە کاتێکدا کە دوێنێشەو بە هەموویانی وتبوو، واتا بە ئامالیا ئیڤانۆڤنا، پولیوتشکا، سۆنیا و کابرای پۆڵەندی، کە لوژین خانەدانترین و میهرەبانترین کەسە، دەوڵەمەندە و هاوڕێی گەورە گەورەی هەیە، پێشتر هاوڕێی یەکەم مێردی بووە و هاتوچۆی ماڵی باوکیشی کردووە و بەڵێنیشی داوەتێ چەند توانای هەبێت، یارمەتیی بدات کە مووچەیەکی خانەنشینی باشی بۆ ببڕێتەوە. لێرەدا دەبێت ئەوە لە یاد نەکەین کە خۆهەڵکێشانی کاترینا ئیڤانۆڤنا بە سامان و دۆست و هاوڕێوە، لە پای هیچ سوود و بەرژەوەندییەکی تایبەتی خۆیەوە نەبووە، بەڵکو تەنیا لەبەر دڵپاکیی خۆی و چێژبینین لە پیاهەڵدانی ئەو کەسە و بایەخ و نرخپێدانی بوو. لە دوای لوژینەوە و بە پەیڕەویلێکردنی ئەو لێبێزیاتینکۆفە "بێژی"یەش نەهاتبوو. باشە ئەو بە چی خۆی دەنازێت؟ ئێمە بەزەییمان پیا هاتبووەوە کە بانگهێشتمان کردبوو، لەبەر ئەوەی هاوڕێی پیتەر پتروڤیچە و لە ژوورێکدا لەگەڵی دەژی، وتمان ناکرێت ئەویش بانگ نەکەین.

هەروەها خانمێک و "کچە قەیرەکەی" نەهاتبوون، ئەوان هەرچەندە دوو هەفتەیەک بوو لە خانووەکەی ئامالیا ئیڤانۆڤنادا ژووریان گرتبوو. بەڵام تا ئێستا چەند جارێک لەو دەنگە دەنگوهەرایەی لە ژوورەکەی مارمیلادۆڤەوە دەچوە دەرێ، بە تایبەتی ئەو کاتانەی خوالێخۆشبوو بە سەرخۆشی دەگەڕایەوە ماڵەوە، هاواریان لێهەڵدەستا. کاترینا ئیڤانۆڤنا خۆی ئەمەی لە ئامالیا ئیڤانۆڤنا بیستبوو، ئەمەیش لەو کاتانەدا کە جوێنی دەدا و هەڕەشەی لە کاترینا ئیڤانۆڤنا دەکرد، کە لە ماڵەکە دەریان دەکات، چونکە شەڕوشۆڕەکەیان ببووە

هۆی بێزاریی "ئەو کرێگرتە خانەدانانەی کە هیچ یەک لە خێزانەکەی کاترینا نرخی پەنجەیەکی ئەوانیان نییە" کاترینا ئیڤانۆڤنا بە تایبەتی بڕیاری ئەوەی دابوو بانگی ئەو خانمە و کچەکەی بکات کە "ئەمان نرخی پەنجەیەکی ئەوانیان نییە!" بەتایبەتی کە تا ئێستا چەند جارێک ڕووی دابوو کاتێک تووشی ببوو بە تووشی ئەو ژنەوە، زۆر بە سووکایەتییەوە ڕووی لە کاترینا وەرگێڕابوو. بۆیە دەبوو ئێستا لەوە بگات کەسانێکی لەو نەجیبتر لێرەدا هەن کە بیر دەکەنەوە و هەستیارترن، ڕق هەڵناگرن و بەرانبەرەکەیان پشتگوێ ناخەن، دەبوو ئەو دوو خانمە لەوەیش تێبگەن کە کاترینا ئیڤانۆڤنا شایانی ئەم چارەنووسە نییە و لەگەڵیدا ڕانەهاتووە. بڕیاری دابوو لە کاتی نانخواردندا سەری ئەم باسەیان بۆ بکاتەوە، هەروەها ئەوەیشیان پێبڵێت کە باوکی پارێزگار بووە و ناڕاستەوخۆیش ئەوەیان تێبگەیەنێت کە ڕووەوەرگێڕان لە کاتی بەیەکترگەیشتندا کارێکی گەوجانەیە.

هەروەها یەکێکی تر لەوانەی کە نەهاتبوو، عەقیدێکی قەڵەو بوو (لە ڕاستیدا مولازمێکی خانەنشین بوو) وەلێ زانیبوویان کە ئەو لە دوێنێبەیانییەوە نەخۆشە و لە ناو جێگادا کەوتووە.

بە کورتی ئەوانەی بۆ میواندارییەکە هاتبوون، بریتی بوون لە کابرای پۆڵۆنی، کارمەندێکی نەگبەتی نووسینگە، کە جلێکی شڕوپڕی لەبەردا و دەموچاوی زیپکاوی و بۆنێکی ناخۆشی لێدەهات، پیرەمێردێکی کەڕی نیوەکوێر، کە کۆن لە بەڕێوەبەریەتێکی پۆستەدا کاری کردووە و نەتدەزانی کێ و لەبەر چی دەمێک بوو لە ماڵی ئامالیا ئیڤانۆڤنا داڵدەی درابوو، بێجگە لەمانە ئەفسەرێکی هەمیشە مەستی خانەنشین، کە لە ڕاستیدا لێپرسراوی کڕینی خواردەمەنیی سوپا بوو، قاقای

پێکەنینێکی زۆر ناشرینی لێدەدا، ئەمەیش هاتبوو، بەڵام تەنانەت ئەمەندە بێئەدەبانە هاتبوو، کە چاکەتی لەبەر نەکردبوو.
پاشان پیاوێکی تر بەبێ ئەوەی سڵاو لە کاترینا ئیڤانۆڤنا بکات هات، لەسەر مێزەکە دانیشت. سەرئەنجام یەکێک بە جلی ماڵەوەوە دەرکەوت، لەبەر ئەوەی کە جلکی تری نەبوو. هاتنی ئەو کابرایە بەو حاڵەوە ئەمەندە بێئابڕوانە بوو، کە ئامالیا ئیڤانۆڤنا و کابرای پۆڵۆنی توانییان لە ژوورەکە دەری بکەن. هەروەها کابرای پۆڵۆنی، دوو کەسی پۆڵۆنیی تر کە هەرگیز ڕێیان نەکەوتبووە ماڵی ئامالیا ئیڤانۆڤنا و کەس لەو ناوە نەیدیبوون. لەگەڵ خۆیدا هێنابوونی. گشت ئەم شتانە تەواو ڕقی کاترینا ئیڤانۆڤنایان هەڵساندبوو، بە خۆی دەوت: "باشە، ئەم هەموو خۆئامادەکردنە بۆ ئەمانە؟" تەنانەت لەبەر بێجێگایی منداڵەکانیان، لەسەر مێزێک کە هەموو ژوورەکەی داگیر کردبوو، بۆ نانخواردن دانەنا، بەڵکو لە پشتەوە لەسەر سنووقێک کە لە سووچێکدا دانرابوو، سفرەیان بۆ داخستن، بەو جۆرە دوو منداڵە بچووکەکەیان لەسەر کورسییەک دانا، پولێچکا کە لەوان گەورەتر بوو و سەرپەرشتیی دەکردن، تا خواردنیان بداتێ و لووتیان "وەک ڕێوڕەسمی خێزانە خانەدانەکان" پاک بکاتەوە. بە کورتی، دەبوو کاترینا ئیڤانۆڤنا، بە ناچاری. بە ڕێزێکی زۆرەوە، پێشوازییان لێبکات. بەڵام هەندێک لەوانەی بە چاوی ڕەخنە و بێبایەخانە تەماشا کرد و بە فیزەوە داوەتی سەر مێزی کردن، لەبەر ئەوە لای خۆیەوە بڕیاری دا هۆی نەهاتنی ئەو کەسانە بخاتە ئەستۆی ئامالیا ئیڤانۆڤناوە. بۆیە لەپڕێکدا بە تەواویی پشتگوێی خست و ئامالیا ئیڤانۆڤنایش لە مەسەلەکە گەیشت و زۆری لا ناخۆش بوو. ئەمە مزگێنیی

ئایندەیەکی باشی نەدەدا، بەھەرحاڵ، سەرئەنجام ھەموویان لە دەوری مێزەکە کۆبوونەوە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ تا ڕادەیەک ئەو کاتە گەیشت، کە ئەوانی تر لە گۆڕستانەوە گەڕابوونەوە. کاترینا ئیڤانۆڤنا بە ھاتنی گەلێک خۆشحاڵ بوو: یەکەم لەبەر ئەوەی ڕاسکۆلنیکۆڤ "تاقە میوانێکی ڕووناکبیر"ی نێو ئەوانە بوو، کە "بەپێی زانیارییەکی بڕواپێکراو، خۆی ئامادە کردبوو تا دوو ساڵی تر لە زانکۆی پترۆزبورگدا کورسیی مامۆستایەتی بەدەست بێنێت"، دووەم لەبەر ئەوەی ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ڕێزەوە و ھەر کە گەیشت داوای لێبوردنی لێکرد و وتی ھەرچەندە زۆری پێ خۆش بوو لەگەڵیاندا بچێتە سەر گۆڕستان، بەڵام بەداخەوە نەیتوانی بەشدارییان بکات.
کاترینا ئیڤانۆڤنا خێرا لای چەپی خۆیەوە داینا. (لە لای ڕاستییەوە ئامالیا ئیڤانۆڤنا دانیشتبوو) لەگەڵ ئەوەدا کە ھەمیشە لە ھەوڵی ئەوەدابوو خواردن بە ھەموو کەسێک بگات و لەگەڵ ئەو کۆکینە پڕ لە ئازارەی کە بەردەوام قسەی پێدەبڕی و نزیک بوو بخنکێت و لەو ساتەیشدا زۆر سەختتر ببوو، ھەمیشە ڕووی قسەی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ دەکرد، دەیویست ھەر بە چرپە باس لە ھەست و توورەبوونە ڕەواکەی خۆی بکات لەبارەی میوانداریيەکەوە کە بەپێی مەیل و ویستی ئەو ساز نەکراوە و بە دڵی نییە. دەبێت لەم ڕووەوە ئەوە بوترێت کە توورەییەکەی گەلێکجار لە شێوەی پێکەنینێکی شادمانانەدا دەردەکەوت، ئەمەیش گاڵتەپێکردن بوو بە میوانەکان و بەتایبەتی خاوەن ماڵەکە.
- خەتای ھەموو ئەم شتانە لە ئەستۆی ئەو کوندەپەپووەیە، دەزانیت کێ دەڵێم. ئەوە، ئەوە.

بەدەم قسەکانەوە کاترینا ئیڤانۆڤنا ئاماژەی بۆ لای خاوەن خانووەکەی دەکرد:

- تەماشای بکە، خەریکە گلێنەکانی چاوی دەردەپەڕن، خۆیشی دەزانێت باسی ئەو دەکەین. وەلێ چونکە لێی تێناگات، مۆڕەمان لێدەکات، ئاە، کوندەپەپوو، هە، هە، هە! بەم کڵاوە قردێلاویەیەوە دەیەوێت چیمان پیشان بدات! هە، هە، هە! بەڵام سەرنجت داوە هەمیشە هەوڵی ئەوەیەتی وا خۆی لای میوانەکان پیشان بدات، کە ئامادەبوونی لەم دانیشتنەدا و بەرانبەر بە من لە گەورەیی ئەوەوەیە، من بە مرۆڤێکی شایستەم دانا بۆیە داوام لێکرد کەسانی بەڕێز، بە تایبەتی هاوڕێکانی خوالێخۆشبوو بانگهێشتی ئەم میواندارییە بکات. وەلێ بڕوانە کێی داوەت کردووە، هەر لە لێبووک دەچن! خوا بیانبڕێت! تەماشای ئەو پیاوە بکە چ دەموچاوێکی پۆخڵی هەیە! ئاژەڵێکی دووپێیە! یان ئەو زەلامە پۆڵۆنییە.. هە، هە، هە! هیچ کەس، هیچ کەس، هەرگیز ئەمانەی لێرە نەدیووە و خۆیشم چ ڕۆژێک ئەمانەم نەبینیووە! باشە، من لە تۆ دەپرسم ئەمانە بۆ هاتوونەتە ئێرە؟ چەند جوانیش لە پاڵ یەکدا دانیشتوون!

لەپڕێکدا بە زمانی پۆڵۆنی ڕووی لە یەکێکیان کرد و وتی: بەڕێز، بە دڵسۆزییەوە لەسەر قسەکەی ڕۆشت:

- کولێرەت لایە؟ دەی فەرموو هی تر، بیرە بخۆرەوە، بیرە! حەز لە ڤۆدکا ناکەیت؟ سەیری بکە: لە جێگاکەی هەستاوە و سڵاو دەکات. تەماشا، تەماشا، بێگومان زۆر برسییانە. نەگبەتینە! باشە، با بخۆن، هەر باشە دەنگەدەنگ ناکەن، تەنیا.. بە ڕاستی خەمی کەوچکە زیوەکانی خاوەن خانووەکەمە...

لەپڕا بە دەنگی بەرز ڕووی لە خاوەن خانووەکە کرد و وتی:

- ئاماليا ئیڤانۆڤنا! ئەگەر بە ڕاستی کەوچکەکانی تۆیان دزی، پێشەکی پێت دەڵێم من هەقم بەسەرەوە نییە، هە، هە، هە!
دیسانەوە دایە قاقای پێکەنین و ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد، ئاماژەی بۆ لای خاوەنماڵەکە کرد و خۆشیی لە کارەکەی خۆی هات، وتی:
- تێنەگەیشت، دیسانەوە تێنەگەیشت! دانیشتووە و دەمی کردۆتەوە، لێی بڕوانە، کوندەپەپوو، کوندەپەپوو، هەر تەواو کوندەپەپوویەکی ڕاستەقینەیە، بەڵام بەو قردێلە تازانەوە، هە، هە، هە!
لێرەدا پێکەنینەکەی دیسانەوە بووەوە بە کوکینێکی زۆر سەخت کە ماوەی پێنج دەقیقەی خایاند. کەمێک خوێن کەوتە سەر دەستەسڕەکەی و ئارەقەیش کەوتە سەر ناوچاوانی. بە هێوری خوێنەکەی پیشانی ڕاسکۆلنیکۆڤ دا، هەناسەیەکی تازەی دایەوە، زۆر شپرزە و بەو پەڵە سوورانەوە کە کەوتبوونە سەر گۆنای، بە گوێی ڕاسکۆلنیکۆڤدا چرپاندی:
- تۆ بڕوانە، من کارێکی زۆر چاکم خستبووە ئەستۆی، داوام لێکردبوو ئەو خانمە و کچەکەی بانگ بکات. بێگومان دەزانیت باسی کێ دەکەم؟ بۆیە دەبووایە زۆر لەسەرخۆ و دلۆڤانانە ڕەفتاری بکردایە و گەلێک لێزانیش بووایە، بەڵام وایکرد ئەم ژنە گەلحۆ و تازەهاتووە، ئەم ئاژەڵە لەخۆباییە، ئەم لادێییە نابووتە، هەر تەنیا لەبەر ئەوەی ژنی ئەفسەرێک بووە، هاتۆتە ئێرە بۆ ئەوەی مووچەی خانەنشینی بۆ ببڕنەوە، بۆ ئەو مەبەستەیش پێڵاوی بەپێوە نەماوە ئەوەندە هاتوچۆی لێپرسراو و ژووری چاوەڕوانیی کردووە، بە تەمەنی پەنجا و پێنجساڵیەوە هێشتا سووراو و سپیاو دەکات (بە سەروچاویا دیارە).. کەچی لەگەڵ هەموو ئەمانەیشیدا ئەم جانەوەرە

نەک تەنیا بیری لە هاتن نەکردەوە، بەڵکو تەنانەت کە زانیشی ناتوانێت بێت، یەکێکی نەنارد وەک نەریتێکی ئەدەبییانەی باو پۆزش بهێنێتەوە! نازانم بۆ پیتەر پتروڤیچ نەهاتووە؟ بە ڕاست سۆنیا لە کوێیە؟ ئاها، ئەمیش ئەو، ئاخری هات باشە، سۆنیا، لە کوێ بوویت؟ بە لامەوە سەیرە تەنانەت لە پرسەی باوکیشتا ئاگات لە وادە و بەڵێن نەبێت! ڕادیون ڕومانوڤیچ، بفەرموو با لای تۆوە دابنیشێت، سۆنیا گیان، تۆ جێگەت ئێرەیە.. حەز لە چی دەکەیت دەستی بۆ درێژ بکە.. لەم خواردنە هەڵبگرە، ئەمە باشترە، هەر ئێستا کولێرەیش دێنن، نانت بە منداڵەکان دا؟ پولێچکا گیان، تۆ لەوێ هەموو شتێکت هەیە؟ هە، هە، هە! چاکە، لینا گیان، ئاقڵ بە، تۆیش کۆلیا، بەو جۆرە قاچت ڕامەژێنە، وا دابنیشە وەک چۆن منداڵی خێزانێکی شەریف و خانەدان دادەنیشێت. سۆنیا ئەی تۆ دەڵێی چی؟

سۆنیا کۆشا یەکسەر پۆزشەکەی پیتەر پتروڤیچ ڕابگەیەنێت، ویستی بە دەنگی بەرز قسە بکات بۆ ئەوەی دانیشتووان گوێیان لێبێت، ئەو ڕستە و دەستەواژە هەرە جوان و بە ئەدەبانەیش بەکار بهێنێت کە خودی پیتەر پتروڤیچ ڕازاندبوونییەوە، هەروەها ئەوەیشی لێ زیاد کرد کە پیتەر پتروڤیچ بەڵێنی داوە لە یەکەم دەرفەتدا سەریان لێدەدات. بۆ ئەوەی دەربارەی کارەکان پێکەوە قسە بکەن و چی پێویست بێت هەنگاوی بۆ بنێن.

سۆنیا دەیزانی ئەم باسە حەوسەڵەیەک بە کاترینا ئیڤانۆڤنا دەبەخشێت، ئارامی و ئاسوودەییەکی تێدەگەڕێنێت، لە هەموویش گرنگتر ئەوەیە گیانی خۆبەزلزانینەکەی دادەمرکێنێت.

پاشان سڵاوێکی خێرای لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد، لە پاڵیا دانیشت و بە وردی پیایدا هەڵیڕوانی، بەڵام بە درێژایی ئەو ماوەیە، لە قسەکردن

لەگەڵیدا و تا ڕادەیەک لە تەماشاکردنیشی خۆی گرت. سۆنیا تەنانەت حەوسەڵەیشی تەواو لەسەر خۆی نەبوو، هەرچەندە چاوی لە کاترینا ئیڤانۆڤنا نەدەتروکاند تا لێی دڵگران نەبێت. نە خۆی و نە کاترینا ئیڤانۆڤنا جلی تازییەباریان لەبەردا نەبوو، چونکە جلی ڕەشیان نەبوو، جلەکانی سۆنیا قاوەییەکی تێر و تاقە جلەکەی بەری کاترینایش قوماشێکی تۆخی ڕێڕێ بوو، هەواڵ و باسەکەی پیتەر پتروڤیچ بە باشی تێپەڕی. کاترینا ئیڤانۆڤنا دوای ئەوەی بە گرنگییەکی زۆرەوە گوێی لە قسەکانی سۆنیا گرت، زۆر بە ویقارەوە هەواڵی تەندروستی و ژیانی پیتەر پتروڤیچی پرسی، پاشان خێرا و بە دەنگێکی تا ڕادەیەک بەرز بە ڕاسکۆلنیکۆڤی وت: لە ڕاستیا بۆ کەسێکی بەڕێز و جوامێری وەک پیتەر پتروڤیچ، لەگەڵ ئەو دۆستایەتییە پتەوەی لەگەڵ خێزانەکەیدا هەیەتی و ئەو هاوڕێیەتییەی کە ئەو لەگەڵ باوکی ئەمدا هەیبووە، زۆر شتێکی سەیر دەردەچوو ئەگەر بکەوتایەتە ناو ئەم "سەگ و گورگەوە!"

ئینجا بە دەنگی بەرز وتی:

- لەبەر ئەمە، ڕادیون ڕومانوڤیچ، من زۆر سوپاسگوزاری تۆم کە بەم حاڵەیشەوە لە نانونمەک چەشتنی مندا بەشداریت کردین و هاتیت، هەرچەندە بڕوام وایە هاوڕێیەتیت لەگەڵ مێردی کۆچ کردوومدا تاقە هۆیەک بووە بۆ ئەوەی بەڵێنەکەت بەجێ بێنێت.

ئینجا، جارێکی دی بە ویقار و شانازییەوە هەموو میوانەکانی بەسەر کردەوە، لەپڕێکدا بە تایبەتی و بە دەنگی بەرز لە پیرەمێردە کەڕەکە کە لەوبەری مێزەکەوە دانیشتبوو، پرسی کە ئایا گۆشتی سوورەوەکراوی ناوێت، ئایا شەرابی سووری لیسبینیان داوەتێ؟ پیرەمێرد وەڵامی نەدایەوە و تا ماوەیەکیش هەر تێنەگەیشت پرسیاری

چی لێدەکات، هەرچەندە ئەوانەی لە پاڵیا دانیشتبوون، بە پێکەنینەوە دەیانویست تێی بگەیەنن.
وەلێ پیرەمێردەکە بە زاری کراوەوە تەماشای ئەملاوئەولای خۆی دەکرد و ئەمەیش ببووە هۆی ئەوەی دانیشتووەکان زیاتر پێبکەنن.
کاترینا ئیڤانۆڤنا ڕوو بە ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەر قسەکانی ڕۆشت:
- تەماشای ئەم گەمژەیە! بڕوانە، بڕوانە. ئاخر ئەمەیان بۆ هێناوە؟ بەڵام دەربارەی پیتەر پتروڤیچ دەبێت بڵێم هەمیشە بڕوام پێکردووە و هەڵبەتە، ئەو هەرگیز لەمانە..
پاشان بە توندی و بەدەنگی بەرز و ڕوویەکی گەلێک جیدی و گرانەوە بە جۆرێک کە ئامالیا ئیڤانۆڤنا لە بینینی سڵەمییەوە، پێی وت:
- هەرگیز لەو ژنە دەعەجانی و بێسەرەوبەرانەی تۆ ناچێت کە لە ماڵی باوکمدا بە کارەکەری موبەقیش ڕایان نەدەگرتن، مێردی خوالێخۆشبوویشم تەنیا لە ڕووی دڵسۆزیی و مەزنیی خۆیەوە ڕووی پێدەدان.
لەپڕێکدا ئەفسەرە خانەنشینەکەی ئازووقەی سوپا، کە لە نۆشکردنی دوانزەهەمین پێکی ڤۆدکادا بوو، هاواری لێهەستا:
- بەڵێ، حەزی لەمەی بوو، بە ڕاستی حەزی لێدەکرد و زۆریشی دەخواردەوە.
کاترینا ئیڤانۆڤنا زوو لێی ڕاپەڕی و وتی:
- مێردی کۆچکردووم بە ڕاستی لەو لایەنەوە خۆی پێنەدەگیرا و لاواز بوو، هەموویش ئەمە دەزانن، وەلێ پیاوێکی دڵسۆز و شەریف بوو، ماڵ و خێزانەکەی خۆی خۆش دەویست و ڕێزی لێدەگرتن. تاقە خەوشێکی هەبوو، کە لە ڕووی دڵسۆزییەکی تایبەت بە خۆیەوە زیاد لە پێویست بڕوای بە کەسانی بێکەڵک و گەندەڵ دەکرد. خوا دەزانێت

لەگەڵ کیدا دانیشتووە و خواردویەتییەوە، لەگەڵ کەسانێکدا کە نرخی پاژنەی پێڵاوەکانی ئەویان نەبووە، بڕوانە، ڕادیون ڕومانوڤیچ، لە گیرفانیا کەڵەشێرێکی بچووکیان دۆزییەوە، کە لە حەڵوا دروست کرابوو، زۆر سەرخۆش بوو، بەڵام منداڵەکانی لە بیر بوو.

ئەفسەری ئازووقەی هاواری لێهەستا:

- کەڵە... شێر.. وتت کەڵەشێر؟

کاترینا ئیڤانۆڤنا ئاقڵانە وەڵامی نەدایەوە، بەڵکو بیری کردەوە و هەناسەی هەڵکێشا، دوایی ڕوو بە ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:

- دیارە تۆیش وەک کەسانی دی وا بیر دەکەیتەوە کە من لەگەڵ کۆچکردوودا دڵڕەق بووبم، بەڵام وانییە، ڕێزی لێدەگرتم و زۆریش ڕێزی دەگرتم. مرۆڤێکی میهرەبان و پاک بوو، هەندێکجار زۆر دڵم پێی دەسووتا! هەندێکجار لە پەنایەکدا دادەنیشت و چاوی تێدەبڕیم، زۆر دڵم پێی دەسووتا، حەزم دەکرد بیلاوێنم، بەڵام کە بیرم دەکردەوە ئەگەر بیلاوێنم دەست دەداتەوە سەرخۆشی. تەنیا بە قسە و ڕەفتاری ڕەق دەتتوانی ڕێگەی لێبگریت.

ئەفسەری ئازووقە کە پێکێکی تری تازەی ڤۆدگای بۆ خۆی تێکرد، هاواری کرد:

- بەڵێ، قژڕاکێشانیشی تێدەکەوت، زۆریشی تێدەکەوت.

کاترینا ئیڤانۆڤنا قسەکانی پێبڕی و وتی:

- نەک تەنیا قژڕاکێشان، هەندێکجار پیاوی ئەوەندە گەوج هەیە، شایانی ئەوەن بە گسک لێیان بدەیت، هەڵبەتە ئێستا من مەبەستم لە خوالێخۆشبوو نییە..

پەڵە سوورەکانی سەر گۆنای زیاد لە جاران سوور داگەڕان و سنگی جۆشی خواردبوو، کەمێکی مابوو بێتەوە سەر خۆی و دیسان

تێهەڵچێتەوە، زۆر لە میوانەکان بە تەوسەوە پێدەکەنین و بابەتەکەیان لا خۆش بوو. ئەفسەری ئازووقەیان دنە دەدا و بە گوێیدا دەیاتچرپاند. دیار بوو دەیانویست ئەو دووانە بەربنە گیانی یەکتری.

ئەفسەری ئازووقە کەوتەوە قسە:

- ڕێگەم دەدەیت بپرسم، تۆ لەبارەی چییەوە.. مەبەستم ئەوەیە لەبارەی کێوە.. ئێستا.. بەڵام نا، پێویست ناکات! بێهودەیە: بێوەژنە، بێوەژن! دەیبەخشم و خۆ بەدەستەوە دەدەم.

جارێکی تر کەمێک ڤۆدگای بۆ خۆی تێکردەوە. ڕاسکۆلنیکۆڤ دانیشتبوو، لەسەرخۆ و بە بێزارییەوە گوێی گرتبوو، ئەو خواردنەی بەردەوام کاترینا ئیڤانۆڤنا دەیکردە قاپەکەیەوە، تەنیا بۆ ڕێز و نەڕەنجاندنی ئەو لێی دەچێشت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە وردی لە سۆنیای دەڕوانی، وەلێ سۆنیا تا دەهات شپرزەتر دەبوو، هەستی دەکرد ئەم دانیشتنە بە سەلامەتی کۆتایی نایەت، زۆر بە ترسەوە لە تووڕەییە سەختەکەی کاترینا ئیڤانۆڤنای دەڕوانی. ئەو دەیزانی گرنگترین هۆی نەهاتنی ئەو دوو ژنە کرێگرتە تازەیە بۆ میوانداریییەکە، خودی سۆنیایە. ئەو خۆی لە ئامالیا ئیڤانۆڤنای بیستبوو کە دایکی کچەکە، تەنانەت داوەتییەکەی پێ ناخۆش بووە و پرسیویەتی: "چۆن دەبێت کچەکەم لە تەنیشت ئەو کچەتیوەوە دابنیشێت؟" سۆنیا دەیزانی کاترینا ئیڤانۆڤنا هەر چۆنێک بووە، ئەم قسەیەی پێ گەیشتوەتەوە، سووکایەتیکردنیش بە سۆنیا، بە لای کاترینا ئیڤانۆڤناوە، قورستر بوو لە سووکایەتیپێکردنی خودی کاترینا و منداڵەکانی و تەنانەت بە باوکیشیان. بە کورتی ئەم سووکایەتیپێکردنە، مەرگەساتێک بوو بۆ خۆی، سۆنیا دەیزانی کاترینا ئیڤانۆڤنا ئیتر ئارام ناگرێت تا "بەو دوو ژنە خوێڕییە نەسەلمێنێت کە

ئەوان هەردووکیان..." و هتد. ڕێکەوتیش وابوو، وەک بە دەستی ئانقەست کرابێت، یەکێک لەوسەری مێزەکەوە دەفرێکی بۆ سۆنیا نارد، دەفرەکە بە ناوەکولێرە وێنەی دوودڵی تیرلێدراوی تیا کرابوو. کاترینا ئیڤانۆڤنا گڕی گرت، بەبێ وەستان و بە دەنگی بەرز کە دەگەیشتە ئەوسەری مێزەکە وتی ئەو کەسەی دەورییەکەی ناردووە بێجگە لە "چوار پێیەکی سەرخۆش" هیچی تر نییە.
ئامالیا ئیڤانۆڤنایش کە دڵی لێی دابوو پێشهاتی ناخۆش بەڕێوەیە، لە هەمان کاتدا پڕبەدڵ لە هەڵوێستی کاترینا ئیڤانۆڤنا ڕەنجا بوو، بۆ ئەوەی ئەو هەستە خراپەی لای میوانەکان دروست ببوو، بیرەوێنێتەوە، هەروەها لەبەرچاوی ئەواندا پلەوپایەیەک بۆ خۆی زیاد بکات، لە خۆیەوە و کتوپڕ کەوتە گێڕانەوەی چیرۆکێک بە زمانێکی ڕووسیی شکستە و وتی یەکێک لە هاوڕێکانی بە ناوی "کارل"[1] کە کارمەندی دەرمانخانە بوو، شەوێکی درەنگ سواری گالیسکەیەک دەبێت و دەڕوات، گالیسکەوانەکە ویستی بیکوژێ، ئەو زۆر پاڕایەوە نەیکوژێت، گریا و دەستی هەڵپێکا و ترسا، لە ترسانا دڵی تەقی" کاترینا ئیڤانۆڤنا هەرچەندە زەردەیەکی بۆ کرد، بەڵام یەکسەر یادی کەوتەوە کە نەدەبوو ئامالیا ئیڤانۆڤنا بە زمانی ڕووسی قسە بکات. ئامالیا ئیڤانۆڤنایش لە جاران زیاتر بێزرا و بە زمانە شکستە ڕووسییەکە قسەکانی ڕەت کردەوە و وتی: باوکی لە بەرلین کەسایەتییەکی زۆر زۆر ناودار بووە و هەمیشە لە ڕێڕۆیشتندا دەستی دەکەوتە گیرفانەوە". کاترینا ئیڤانۆڤنا خۆی نەگرت و بە شۆخییەوە دایە قاقای پێکەنین، بە جۆرێک کە ئامالیا ئیڤانۆڤنا خەریک بوو لە داخا بتەقێت و بە زۆر خۆی گرت.

---

[1] *karl*

کاترینا ئیڤانۆڤنا کە تازە هاتبووەوە سەر خۆی، لە ژێرەوە بە ڕاسکۆلنیکۆڤی وت:

- چەند گەمژەیە! دەیویست بڵێت باوکی دەستی دەخستە گیرفانییەوە بەڵام ئەو بە شێوازێک وتی وا دەزانیت دەستی بە گیرفانی خەڵکی تردا کردووە. هە، هە، هە! ئاگات لێنەبوو! ڕادیون ڕومانوڤیچ، هەموو ئەم بێگانانەی لە پتروزبورگ دەژین، بەتایبەتی ئەڵمانییەکان، کە کەس نازانێت لە کوێوە هاتوون، هەموویان لە ئێمە گەوجترن. باشە، بڕوا بکە، ئایا ئەمە چ مانایەکی هەیە کە "کارڵ، کارمەندی دەرمانخانە، لە ترسا دڵی تەقیووە" بە ڕاستی، بۆ ئەمە هێند گەلۆر بووە کە لەباتیی ئەوەی پەلاماری گالیسکەوانەکە بدات و دەستوپێی ببەستێت "دەستی هەڵپێکاو گریا و پاڕایەوە" کەرە! وا دەزانێت چیرۆکەکەی زۆر کاریگەر بووە و تەنانەت هەست بە خۆی ناکات چ چیرۆکێکی گەوجانەیە! بە لای منەوە ئەو ئەفسەری ئازووقەیە گەلێک لەو بە ئاوەزترە. هیچ نەبێت دیارە سەرلێشێواوە و هەموو ئەقڵی لە ناو پێکەکەیایەتی. بەڵام ئەمانە، باشە خۆ هەموو ڕێکوپێک و جیدین.. تەماشای بکە، دانیشتووە و چاوی زەق کردۆتەوە، تووڕەیە، تووڕە! هە، هە، هە! هە، هە، هە.

کاترینا ئیڤانۆڤنا کە هاتبووەوە سەر خۆی و کرابووەوە، ڕاست کەوتە باسکردنی هەندێک وردەکاری، کە چۆن لەگەڵ بەدەستهێنانی مووچەی خانەنشینیدا، لە شاری "ت.." کە شوێنی لە دایکبوونیەتی، قوتابخانەیەکی ناوخۆیی بۆ کچە خانەدانەکان دەکاتەوە.

هێشتا کاترینا ئیڤانۆڤنا باسی ئەم پرۆژەیەی لای ڕاسکۆلنیکۆڤ نەکردبوو، بۆیە ئێستا خێرا کەوتە ڕوونکردنەوەی وردەکارییەکانی و ئەو ژیانە خۆشەی لەوێ بەسەری دەبات. کەس نەیدەزانی چۆن ئاوا

کتوپڕ ئەو "بڕوانامەی ڕێزلێنانە"ی کە مارمیلادۆڤای کۆچکردوو لە مەیخانەکەدا بۆ ڕاسکۆلنیکۆڤی باس کردبوو، کاتێک کە کاترینا ئیڤانۆڤنا لە ڕۆژی دەرچوونی پەیمانگایدا سەمای لە بەردەم پارێزگادا کردووە، وا ئێستا گەیشتبووە دەستی کاترینا ئیڤانۆڤنا. ئەو بڕوانامەی ڕێزلێنانە بەڵگەیەکی سەلمێنەرە کە ڕێگەی کردنەوەی ئەو بەشە ناوخۆییەی بۆ بکاتەوە. وەلێ لەمە گرنگتر، هێنانی ئەو بڕوانامەیە بە مەبەستی ئەوە بوو کە ئەو "دوو ژنە دەعەجانی و هەرچیوپەرچییانە" ئەگەر بێنە دانیشتنەکەوە، بە تەواوی تەریق ببنەوە، چونکە بۆیان دەسەلمێت کە کاترینا ئیڤانۆڤنا لە بنەماڵەیەکی زۆر نەجیبە و تەنانەت دەتوانین بڵێین لە "خانەوادەیەکی خانەدان"ە و کچی ئەفسەرێکی پایەبڵندە. بەهەرحاڵ، لەو ژنانە چاکترە کە سەرپێچی دەکەن و لەم دواییەدا ژمارەیان زۆر زیادی کردووە، بڕوانامەی ڕێزلێنانەکە هەر زوو لە نێوان سەرخۆشەکاندا دەستاودەستی کرد و کاترینا ئیڤانۆڤنایش ڕێگەی لێنەگرت.. چونکە بڕوانامەکە بە ڕوونی نووسرابوو ئەو کچی پیاوێکی پلەدارە کە نزیکە لە پلەی عەقیدییەوە. لەبەر ئەوەیش کە کاترینا ئیڤانۆڤنا کەوتبووە هەوای خۆیەوە، لەسەر ئەو ژیانە خۆشە دەدوا، کە لە ئاییندەدا لە شاری "ت.." بەسەری دەبات. باسی ئەو مامۆستایانەی کرد کە داوایان لێدەکات لە قوتابخانەکەدا وانە بڵێنەوە. دەربارەی مانگۆیش[1]، ئەو پیرەمێردە فەڕەنسییەی لە پەیمانگا وانەی فەڕەنسی بە خۆی وتۆتەوە و ئێستایش هەر لە شاری "ت.." دەژی، قسەی کرد، لەوەدوا ئەو پیاوە تا ئێستایش بە کەمترین مووچە بە دەنگییەوە دێت. پاشان هاتە سەر

---

[1] *mango*

باسی سۆنیا و وتی: سۆنیایش لەگەڵیا دەڕوات بۆ شاری "ت.." و لە هەڵسوڕاندنی کارەکانیدا هاوکاریی زۆری دەکات. کە ئەم قسەیەی کرد، یەکێک لە بەری ئەوبەری مێزەکەوە دایە پڕمەی پێکەنین، کاترینا ئیڤانۆڤنا خۆی نەکرد بە خاوەنی و وای نیشان دا گوێی لە پێکەنینەکە نەبووە، بەڵام زوو زیاتر دەنگی هەڵبڕی و کەوتە باسی ئاکارە جوانەکانی سۆنیا وەک: "پاکی و دڵسۆزی، لەسەرخۆیی و لێبوردەیی، بەڕێزی و ڕەوشتجوانی" پاشان پەنجەی نازی بەسەر ڕوومەتی سۆنیادا هێنا، لە جێگاکەی هەستا و دوو جار ماچی کرد.

سۆنیا تەواو سوور داگەڕا و لەپڕێکدا کاترینا ئیڤانۆڤنا کەوتە گریان و لە ناوەوەی خۆیدا وتی: "گەوجییە بەم دەمارە ماندووەوە.. کە تەواو نارەحەتە، ئیتر کاتی ئەوە هاتووە میوانداریییەکە کۆتایی پێبێت، نانخواردن تەواو بووە و کاتی چاخواردنەوەیە".

ئامالیا ئیڤانۆڤنا لەوە زۆر بەتەنگ هاتبوو کە نە بەشداری گفتوگۆکانی کردبوو نە کەسیش گوێی لە قسەکانی گرتبوو، بۆیە لەو کاتەدا دوا دەرفەتی هێنا، خۆی ئامادە کرد و هەرچەندە دوودڵی و هەستێکی شاراوە هەر ترسێکی تیا دەجووڵاند، بەڵام ڕووی لە کاترینا ئیڤانۆڤنا کرد و سەرنجێکی زۆر ورد و قووڵی دایە، پێی وت: دەبێت لەو قوتابخانە نێوخۆییەدا زۆر ئاگای لە بەرگی ژێرەوەی کچەکان بێت (پێویستە جلشۆرێکی ژنی باشی هەبێت کە بەردەوام ئاگای لەو جلانە بێت، هەروەها پێویستە چاودێریی کچەکان بکرێت کە شەوانە بەدزییەوە هیچ جۆرە ڕۆمانێک نەخوێننەوە). کاترینا ئیڤانۆڤنا کە بە تەواوی شەکەت و بێتاقەت بوو، میوانداریییەکەیش حەوسەڵەی پێنەهێشتبوو، ڕاست قسەی بە ئامالیا ئیڤانۆڤنا بڕی و پێی وت قسەکانی هیچوپووچن و ئەو لێیان تێناگات. چاودێریکردنی جلوبەرگ

کاری لێپرسراوی گەنجینەیە، نەک سەرۆکی بەڕێزی پەیمانگا. لەبارەی خوێندنەوەی ڕۆمانیشەوە، ئەمە داوایەکی گەلێک ناشایستەیە و هیواداره ئامالیا ئیڤانۆڤنا قرِوقەپی لێبکات.

ئامالیا ئیڤانۆڤنا لە داخا دەموچاوی سوور داگەڕا، بە تووڕەیی و ڕووسییەکی شکستەوە وتی کە ئەو "لە نیەتپاکییەوە، تەنیا لە نیەتپاکییەوە، ئەمەی پێدەڵێت و چاکەی ئەوی گەرەکە، هەرچەندە دەمێکە کرێی خانوویشی لێوەرنەگرتووە". کاترینا ئیڤانۆڤنا خێرا بەرپەرچی دایەوەو وتی ئەو درۆ دەکات و چاکەی ئەمی ناوێت، چونکە هەر دوێنێ بوو، کاتێک کە هێشتا کۆچکردوو لە ناو جێگادا گیانی دەدا، ئامالیا ئیڤانۆڤنا خەریک بوو بۆ کرێ خانووەکە گیانی دەربهێنێت. لە وەڵامی ئەم قسانەدا ئامالیا ئیڤانۆڤنا وتی: "ئەو بۆ میوانییەکە ئەو دوو خانمەی بانگ کردبوو، وەلێ ئەوان نەهاتن، چونکە خانەدانن و ناتوانن بێنە داوەتی خانمێکی نانەجیبەوە".

کاترینا ئیڤانۆڤنا زوو هاتە دەست و پێی وت: لەبەر ئەوەی کە ئەو خۆی هیچ نییە و متمانەی پێناکرێت، بۆیە ناشێت لەبارەی خانەدانی و ناخانەدانیی کەسەوە بڕیار بدات. ئامالیا ئیڤانۆڤنا خۆی پێنەگیرا و زوو کەوتە باسی خۆی: "باوکی لە بەرلین پیاوێکی زۆر گرنگ بووە و کاتێک بە ڕێدا ڕۆیشتووە هەردوو دەستی ناوەتە گیرفانی و بەردەوام پف، پفی، بوە!" بۆ ئەوەی باوکی خۆی زیاتر بەرجەستە بکات، ئامالیا ئیڤانۆڤنا لەسەر کورسییەکە هەستا، هەردوو دەستی خستە گیرفانییەوە، فووی لە گوپی کرد و دەنگێکی بێمانای لە دەمی دەرهێنا، کە زیاتر لە پف، پف، دەچوو. هەموو کرێگرتەکان دایانە قاقای پێکەنین، هەستیان دەکرد شەڕێک بەڕێوەیە و پێیان خۆش بوو، بۆیە زیاتر دنەی خاوەنماڵیان دەدا. بەڵام ئیدی لەوەدا نەمابوو کاترینا

ئیڤانۆڤنا خۆی بگرێت. بە دەنگێکی بەرز کە هەموویان بیبیستن، وتی: ڕەنگە ئامالیا ئیڤانۆڤنا هەر بێباوک بێت، ژنێکی مەیخۆری ئاوارەی پتروزبورگ، بێگومان پێشتر یان چێشتلێنەر یان ڕەنگە لەو کارە خراپتری کردبێت.
ڕەنگی ئامالیا ئیڤانۆڤنا وەک قرژاڵێک خرابێتە ناو ئاوی داخەوە، تەواو سوور بووەوە. هاواری کرد کە "دەشێت کاترینا ئیڤانۆڤنا بێباوک بێت، ئەگینا باوکی ئەم خەڵکی بەرلینە، ڕینکۆتێکی درێژی لەبەر دەکرد و هەمیشە هەر پف، پفی بوو".
کاترینا ئیڤانۆڤنا بە تەوسەوە وتی: هەموو کەس بە چاکی بنەچەی ئەم دەناسێت، هەر ئەو بڕوانامەی ڕێزلێگرتنەی بە ڕوونی ئەوەی تیا نووسراوە کە باوکی عەقیدە، بەڵام باوکی ئامالیا ئیڤانۆڤنا، ئەگەر لە سووچێکدا باوکێکی هەبووبێت، حەتمەن لە دەرەوەی پتروزبورگەوە هاتووە و شیری فرۆشتووە. وەلێ زیاتر شیمانەی ئەوە هەیە کە هەر باوکی نەبووبێت، چونکە تا ئێستایش نازانیت ناوی ئامالیا ئیڤانۆڤنایە یان ئامالیا لودڤیگونا؟
لەو بڕگەیەدا ئامالیا ئیڤانۆڤنا کە تووڕەییەکەی گەیشتبووە لووتی، مستێکی بە مێزەکەدا کێشا، دەنگی هەڵبڕی کە ئەو ناوی ئامالیا ئیڤانۆڤنایە، نەک لودڤیگونا، باوکی ناوی ئیڤان و گەورە پیاوی شار بووە، لە کاتێکدا باوکی کاترینا ئیڤانۆڤنا هەرگیز پلەی وای بە خۆیەوە نەدیووە.
کاترینا ئیڤانۆڤنا لەسەر کورسییەکە هەستا، بە دەنگێکی دڵکارانە کە بە ڕووکەش هێور بەرگوێ دەکەوت (هەر چەندە ڕەنگی سپی و سنگی تەواو کرخ ببوو) وتی: "ئەگەر ئامالیا ئیڤانۆڤنا جارێکی دی پڕکێشی

بکات، باوکە نابوودەکەی لەگەڵ باوکی ئەمدا بەراورد بکات، کڵاوە قردێلاوییەکەی لەسەر دەکاتەوە و لەژێر پێی دەنێت".
هەر کە ئامالیا ئیڤانۆڤنا گوێی لەو وشانە بوو، بە ناو ژوورەکەدا کەوتە ڕاکەڕاکە و بە هەموو هێزی هاواری دەکرد کە ئەو خاوەن ماڵە و دەبێت کاترینا ئیڤانۆڤنا "هەر ئێستا لە خانووەکە بڕواتە دەرەوە". ئینجا بەپەلە کەوتە کۆکردنەوەی کەوچکە زیوینەکانی سەر مێزەکە. پاشان بوو بە ژاوەژاو، منداڵەکان دەستیان بە گریان کرد، سۆنیا بۆ هێورکردنەوەی کاترینا ئیڤانۆڤنا هەڵمەتی دایە، بەڵام کە ئامالیا ئیڤانۆڤنا لەناکاوێکدا ئاماژەی بۆ کارتە زەردەکە کرد، کاترینا ئیڤانۆڤنا سۆنیای دایە دواوە و پەلاماری ئامالیا ئیڤانۆڤنای دا، بۆ ئەوەی بەڵێنەکەی بباتە سەر و کڵاوەکەی لەسەر بکاتەوە. لەو چرکەساتەدا دەرگاکە کرایەوە، لەپڕێکدا پیتەر پتروڤیچ لۆژین لەبەر دەرگاکەدا دەرکەوت، وەستا و زۆر بە وردی بە هەموویاندا هەڵیڕوانی. کاترینا ئیڤانۆڤنا هاشاوڵی بۆ برد و هاواری لێکرد:

٣

- پیتەر پتروڤیچ! هیچ نەبێت تۆ بەرگریم لێبکە! بەم بوونەوەرە گەوجە بڵێ بۆی نییە خۆی هەڵنێ و لەگەڵ خانمێکی خانەداندا کە نەگبەتی ڕووی لێناوە، وا ڕەفتار بکات.. بۆ کاری لەم جۆرە دادگا هەیە.. من دەچمە لای خودی دادوەر.. ئەوسا ئەم دەبێت وەڵامی هەبێت.. بە یادی ئەو پێشوازییانەی باوکم لێی دەکردیت، بەرگری لە هەتیووەکانم بکە.
پیتەر پتروڤیچ کە بە هۆی دەستڕاوەشاندنەوە دەیویست کاترینا ئیڤانۆڤنا لێی نزیک نەبێتەوە، وتی:

- داوای لێبوردنت لێدەکەم خانمەکەم.. ببوورە، داوای لێبوردنت لێدەکەم، تۆ خۆت دەزانی من هەرگیز بە خزمەتی باوکی بەڕێزتان نەگەشتووم، ببوورە، خانم (یەکێک دایە قاقای پێکەنین) نایشمەوێت بکەومە ناو شەڕی بەردەوامی تۆ و ئامالیا ئیڤانۆڤناوە.. من بۆ کارێکی تایبەتی خۆم هاتووم، دەمەوێت زۆر بەپەلە لەگەڵ سۆنیای زڕکچتاندا.. ئیڤانۆڤنا.. وا بزانم ناوەکەی وایە؟ گفتوگۆیەکم هەیە.. ڕێگەم بدە بچم بۆ لای..

پیتەر پتروڤیچ ڕاست بە لای کاترینا ئیڤانۆڤنادا تێپەڕی و بەرەو لای سۆنیا چوو، کە لە سووچێکی بەرانبەردا وەستابوو.

کاترینا ئیڤانۆڤنا چۆن وەستا بوو، هەر وا مایەوە، وەک هەورەتریشقە لە شوێنی خۆیدا وشکی کردبێت وابوو، بڕوای نەدەکرد چۆن پیتەر پتروڤیچ دانی بە نانونمەکی باوکیدا نەنا، ئەو "نانونمەکەی" لە خەیاڵی خۆیدا دروستی کردبوو، خۆیشی وەک ڕاستییەک بڕوای تەواوی پێهێنابوو. ئاوازە وشک و تا ڕادەیەک هەڕەشەئامێزەکەی پیتەر پتروڤیچیش، سەری کاس کرد، بەگشتی لەگەڵ دەرکەوتنی ئەو پیاوەدا هەموویان وردەوردە ئارام بوونەوە، بێجگە لەوە پەیدابوونی یەکێکی وا "جیدی و پیاوی کار" لە ناو ئەو کۆمەڵەیەدا هەرگیز نەدەگونجا، ئاشکرا دیار بوو کە ئەو بۆ کارێکی گرنگ هاتووە و هۆکارێکی گەلێک نائاسایی ئەوی گەیاندۆتە ئەو شوێنە، بۆیە لەوانەیە ڕووداوێک پێش بێت و کارەساتێک بقەومێت. ڕاسکۆلنیکۆڤ کە لە نزیک سۆنیاوە وەستابوو، خۆی لادا تا پیتەر پتروڤیچ تێپەڕ بێت، وەلێ پیتەر هیچ خۆی تێنەگەیاند. دوای چرکەساتێک لیبزیاتینکۆفیش لەبەر دەرگاکەوە دەرکەوت. نەهاتە ژوورەوە، بەڵکو هەر لەوێدا، بە

سەرسامییەوە، کەوتە کونپشکنی. لەوە دەچوو بە هیچ جۆرێک نەزانێت چی لەئارادایە.
پیتەر پتروڤیچ ڕوو لە هەمووان وتی:
- بمبەخشن دانیشتنەکەم لێ تێک دان، بەڵام مەسەلەکە زۆر گرنگە، پێیشم خۆشە کە ئێوە بیزانن، ئامالیا ئیڤانۆڤنا خوازیارم تۆیش وەک خاوەنی خانووەکە، گوێ لەو قسانە بگریت، کە لەگەڵ سۆنیا ئیڤانۆڤنا دا دەیکەم.
پاشان ڕووی لە کچە کرد کە ترس و شپرزەییەکەی گەیشتبووە ئەوپەڕی. وتی:
- سۆنیا ئیڤانۆڤنا، لەسەر مێزەکەم، لە ژوورەکەی هاوڕێی بەڕێزم ئاندرێ سمیونوڤیچ لیبێزیاتینکۆف، هەر یەکسەر دوای ڕۆیشتنی تۆ، گەڵایەکی سەدڕۆبڵی من دیار نەما، ئەگەر تۆ بەهەر جۆرێک بێت بزانیت ئەو پارەیە لە کوێیە، بەڵێنی شەرەفت پێدەدەم، هەموو ئەمانەیش بەشایەت دەگرم کە ڕووداوەکە لێرەدا کۆتایی پێبێت. ئەگەر وانەبێت ناچار دەبم هەنگاوی جیدیتر بنێم و ئەوسا.. گوناهەکە لەسەر خۆتە.
بێدەنگییەکی کڕ تەواوی ژوورەکەی داگرت، تەنانەت ئەو منداڵانەیش کە دەگریان، بێدەنگ بوون. سۆنیا ڕەنگی مردووی لێنیشتبوو، وەستابوو لە لۆژینی دەڕوانی و نەیدەتوانی وەڵام بداتەوە، دەتوت هێشتا لە مەسەلەکە نەگەیشتووە، چەند چرکەیەک تێپەڕی.
لۆژین لێی ڕاما و پرسی:
- ها، دەڵێی چی؟
سۆنیا لە دواییدا نووزەیەکی لێوەهات و وتی:
- من نازانم.. من هیچ شتێک نازانم..

- نا؟ نایزانیت؟
دوای ئەو قسانە دیسانەوە لۆژین بۆ ماوەی چەند چرکەیەک بێدەنگ بوو، پاشان بە دەنگێکی دڵگیرانە کە هێشتا شتێک دۆستایەتیی هەر تیا مابوو، وتی:
- خاتوون، بڕوانە و بیری لێبکەرەوە، من ئێستاش دەرفەتی بیرکردنەوەت دەدەمێ. بڕوانە، ئەگەر من دڵنیا نەبوومایە، دیارە لەو ئەزموونانەوە کە هەمە، هەرگیز پڕکێشیم نەدەکرد ئاوا ڕاستەوخۆ لە ئەستۆی تۆی بنێم، چونکە تۆمەتدانەپاڵ، بەم ڕاستەوخۆییە و لەبەرچاوی خەڵکیدا ئەگەر درۆ یان تەنانەت بە هەڵەیش بوترێت، من خۆم بە بەرپرسیار دادەنێم، من ئەمە دەزانم، ئەم بەیانییە بۆ پێویستی تایبەتی خۆم چەند چەکێکم بە بڕی سێ هەزار ڕۆبڵ ورد کردەوە، بڕی پارەکانم لە دەفتەری یاداشتەکانمدا نووسراوە. کە گەڕامەوەماڵەوە، بە ئاگاداری ئاندرێ سمیونوڤیچ لێبێزیاتینکۆف، پارەکانم ژمارد، دوای ئەوەی دوو هەزار و سێ سەد ڕۆبڵم ژمارد، خستمە ناو کیفی پارەکە و کیفەکەیشم نایە گیرفانی ناوەوەی چاکەتەکەمەوە. ئەوەی لەسەر مێزەکە مایەوە نزیکەی پێنج سەد ڕۆبڵی کاش بوو، کە سیانیان سەد ڕۆبڵی بوون، لەو کاتەدا بوو کە تۆ هاتیتە ژوورەوە، بێگومان لەسەر داوای خۆم هاتیت، ماوەیەک مایتەوە، پاشان بە بێزارییەکی زۆرەوە کە تەنانەت سێ جار لە کاتی قسەکردندا هەستایت بۆ ئەوەی بڕۆیت. ئێمە هێشتا لە گەرمەی گفتوگۆدا بووین. ئاندرێ سمیونوڤیچ دەتوانێت لەم بارەیەوە شایەتی بدات. بێگومان تۆ خۆت، خاتوون، لەمە دڵنیایت، دانیش بەوەدا دەنێیت کە من بە هۆی ئاندرێ سمیونوڤیچەوە ویستم تۆ لەوێ ئامادە بیت. تەنیا بۆ ئەوەی دەربارەی منداڵە هەتیووەکان و ئەو بارە خەفەتبارەی کە کاترینا

ئیڤانۆڤنای خزمتی تێکەوتووە، (کە نەمتوانیبوو لە دانیشتنی پرسەکەیدا ئامادە بم) قسە بکەین، بۆ ئەوەی بتوانین لە ڕێی کۆکردنەوەی ئیمزا و پیتاک و شتێکی لەو بابەتەوە هاوکاریان بکەین. تۆ سوپاست کردم و تەنانەت فرمێسک لە چاوتا قەتیس ما، من هەموو شتێک وەک خۆی دەگێڕمەوە، بۆ ئەوەی یەکەم بیرت بهێنمەوە، دووەم تا بزانیت کە بچووکترین مەسەلە بەسەر مندا تێناپەڕێت و لە یادمدا دەمێنێت. دوایی من لەسەر مێزەکە دە ڕۆبڵیەکم هەڵگرت و لای خۆمەوە وەک پێشەکییەک بۆ هاوکاریکردنی کەسوکارەکەت دامیتێ. هەموو ئەمانە ئاندرێ سمیونوڤیچ دیویەتی. ئینجا تا بەردەم دەرگاکە ڕەوانەم کردیت، تۆ هەر بێتاقەت بوویت. کە لەگەڵ ئاندرێ سمیونوڤیچدا بە تەنیا مامەوە، نزیکەی دە دەقیقە پێکەوە قسەمان کرد. ئاندرێ سمیونوڤیچ چووە دەرێ و من گەڕامەوە سەر مێزەکە کە پارەکانی لەسەر بوو، بۆ ئەوەی دوای ژماردنیان، وەک بیرم لێکردبووەوە، بە جیا بیانخەمە جێگایەکەوە. زۆر سەیرم لێهات کە بینیم یەکێک لە سەد ڕۆبڵییەکان دیار نەماوە. ئێستا خۆت سەرپشک بە و بڕیار بدە. جارێ لەبارەی ئاندرێ سمیونوڤیچەوە من بە هیچ جۆرێک گومانم لێی نییە، تەنانەت شەرمم پێدێت ئەگەر خەیاڵێکی وایش بکەمەوە. گومانم لە ژماردنی پارەکانیش نییە، چونکە پێش هاتنی تۆ بە چرکەساتێک، دوای بەسەرکردنەوەی پارەکە، هیچ کەموکورییەکی تیا نەبوو. باوەڕ بکە، من ئەوەم لەبەرچاوە کە تۆ زۆر نارەحەت و پەلەی ڕۆیشتنت بوو، بۆ ماوەیەکیش هەر دەستت بەسەر مێزەکەدا دەهێنا، من ئاگام لە باری کۆمەڵایەتیی تۆ هەیە و ئەو حاڵەتەیش کە لەوەوە کەوتۆتەوە و ئەوپەڕی پێم ناخۆشە، بە پێچەوانەی ویستی خۆمەوە ناچار بەو بەدگومانیە بووم کە بێگومان بۆ خۆی بەدبەختییەکە، بەڵام ڕەوایشە

و له جێی خۆیدایه، دەبێت ئەوەیش دووباره بکەمەوە من به تەواوی بڕواوە، لەوە گەیشتووم لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا ئەم تۆمەتە بۆ من لێپرسراوی و مەترسییەک دێنێتە گۆڕێ. وەلێ وەک دەبینیت، من مەسەلەکەم پشتگوێ نەخست و دەبوو بەرانبەری بوەستم، ئێستا پێت دەڵێم کە بۆچی نەدەبوو بێدەنگ بم و هەڵنەدەمێ: تەنیا لەبەر شتێک، بەڵێ، تەنیا لەبەر ئەوەی کە تۆ لەڕادەبەدەر سپڵە و پێنەزان بوویت. خاتوون، بۆ؟ ئاخر، من بۆ ئەوە تۆم بانگ کردە لای خۆم کە یارمەتیت بدەم، کێشەی کەسوکارە هەژارەکەت چارەسەر بکەم، هەر بۆیە وەک سەرەتا دە ڕۆبڵم دایتێ، کەچی تۆ هەر لەوێدا و بەو گەرماوگەرمییە بەو جۆرە پاداشتی منت دایەوە! نا، چی بەمە دەڵێیت! چ پەندێک لەمە وەردەگریت! باش بیری لێبکەرەوە. پاشان من وەک هاوڕێیەکی دڵسۆز داوات لێدەکەم –چونکە لەم چرکەساتەدا مەحاڵە هاوڕێی لە من دڵسۆزترت هەبێت– وەرەوە سەر خۆت، ئەگینا چاوپۆشیت لێناکەم! دەی، دەڵێی چی؟

سۆنیا تاسابوو، لەبەر خۆیەوە وتی:

- من لەسەر مێزەکەی تۆ هیچم هەڵنەگرتووە. تۆ خۆت دە ڕۆبڵت داومەتێ، ئەوەتا، فەرموو ئەویشم ناوێت.

سۆنیا خێرا دەستەسڕەکەی لە گیرفانی دەرهێنا، گرێکەی دۆزییەوە و کردیەوە، گەڵا دە ڕۆبڵییەکەی دەرهێنا و بەرەو لای لۆژین درێژی کرد.

لۆژین بێ ئەوەی پارەکە وەربگرێت، بە جەخت و سەرکۆنەکردنەوە وتی:

- کەواتە دان بە سەد ڕۆبڵیەکەدا نانێیت؟

سۆنیا تەماشای ئەملاوئەولای خۆی کرد. هەموویان چاوی توورەیی و ڕق و گاڵتەپێکردنیان تێبڕیبوو. تەماشای ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد.
ڕاسکۆلنیکۆڤ دەستی کردبووە خاچ و لەسەر سنگی دانیا بوو، لە پاڵ دیوارەکەدا وەستابوو. چاوی گڕی لێدەبووەوە و تەماشای کچەکەی دەکرد.
سۆنیا کڕوزایەوە:
- خودایا!
لۆژین لەسەرخۆ و تەنانەت بە میهرەبانییەوە وتی:
- ئامالیا ئیڤانۆڤنا، دەبێت پۆلیس ئاگادار بکرێت، لەبەر ئەوە تکات لێدەکەم بنێرە بەدوای دەرگاوانەکەدا.
ئامالیا ئیڤانۆڤنا دەستی بەدەستا دا و بە ئەڵمانی و ڕووسییەکی شەقوشڕەوە وتی:
- خودای مەزن. من دەمزانی دزە.
لۆژین بە دوای قسەکانیدا وتی:
- تۆ دەتزانی؟ کەواتە بەڵگەیەک هەیە تۆی گەیاندبێتە ئەم ئەنجامە. ئامالیا ئیڤانۆڤنای بەڕێز، تکایە ئەم قسانەی لە بەردەمی ئەم کەسانەدا کردت لە بیریان نەکەیت.
لەپڕێکدا لە هەموو سووچ و کەنارێکەوە بوو بە دەنگەدەنگ و جووڵەجووڵ.
کاترینا ئیڤانۆڤنا کە تازە هاتبووەوە سەر خۆی، هاواری کرد:
- چۆن؟
ڕاست بەرەو لای لۆژین خۆی ڕادا و وتی:
- چۆن؟ بە دز تاوانباری دەکەیت؟ بە دز؟ سۆنیا؟ ئاه.. هەی خوێڕییانە! خوێڕییانە!

خۆی گەیاندە سۆنیا و بە دەستە لاواز و وشکەڵاتوەکانییەوە لە ئامێزی گرت، وەک مەنگەنە بە خۆیەوە نوساند و وتی:
- سۆنیا! چۆن وێرات دە ڕۆبڵ لەم کابرایە وەربگریت، هەی بێئەقڵ! دەی بیدەرێ، دە ڕۆبڵەکەی بدەرەوە، بیهێنە.
کە کاترینا ئیڤانۆڤنا گەڵا دە ڕۆبڵییەکەی لە سۆنیا سەند، لە ناو لەپیدا گرمۆڵەی کرد و ڕاست گرتییە دەموچاوی لۆژین، گلۆڵە کاغەزەکە دای لە چاوی و کەوتە سەر زەوی. ئامالیا ئیڤانۆڤنا ڕای کرد بۆ ئەوەی گەڵاکە هەڵبگرێت، پیتەر پتروڤیچ ڕقی هەستا و هاواری کرد:
- ئەم شێتە بگرن.
لەم کاتەدا لەبەر دەرگاکەوە لیبیزیاتینکۆف و چەند کەسێکی تر دەرکەوتن، لە نێوانیاندا ئەو دوو ژنە هەبوو، کە بانگ کرابوون و تازە هاتبوونە ئەوێ.
کاترینا ئیڤانۆڤنا هاواری لێهەستا:
- چۆن؟ شێت؟ من شێتم؟ گەوجە! تۆ خۆت گەوجیت! ئەی پیاوی یاسایی دڵڕەق. خوێڕی، سۆنیا، سۆنیا پارەی ئەو بدزێت؟ سۆنیا دز بێت؟ ئەو دەتوانێت تەنانەت پارەیشت بداتێ، هەی گەمژە!
کاترینا ئیڤانۆڤنا پێکەنینێکی هستیریانەی کرد:
- هەرگیز پیاوی وا گەمژەتان بینیووە؟
لەگەڵ قسەکانیدا بەرەو هەموو لایەک دەچوو، ئاماژەی بۆ لای لۆژین دەکرد و لەپڕێکدا خاوەن خانووەکەیانی بینی:
- چۆن؟ تۆیش پێی دەڵێیت دز؟ تۆیش لایەنی ئەو دەگریت؟ سۆنیا دزە؟ هەی مریشکەپیسکەی پروسی! بێویژدانانە! ئاخر ئەو لەم ژوورە نەچووەتە دەرێ، هەر کە لای تۆی بێشەرەفەوە گەڕایەوە، لێرەدا لە پاڵ ڕادیون ڕومانوڤیچدا دانیشت!.. وەرە بیگەڕێ، خۆ ئەو لەم ژوورە

نەڕۆشتۆتە دەرەوە، کەواتە دەبێت پارەکەی پێبێت، وەرە بیگەڕێ، بگەڕێ، دەی بگەڕێ. بەڵام ئەگەر هیچت نەدۆزییەوە، ئەوسا دەبێت جەناب ببووریت، دەبێت بێیتە وەڵام: لە بەردەم ئیمپراتۆردا، لە بەردەمی تزاردا، هەر دەچم بۆ لای خودی تزار و دەکەوم بەسەر پێیدا، هەر ئەمڕۆ، هەر ئەمڕۆ. من بێکەسم، من هەتیووم! ڕێگەم پێدەدەن، وا دەزانیت ڕێم پێنادەن! تۆ هەڵەیت، دەڕۆم، دەڕۆم، تۆ لای خۆتەوە وات داناوە کە ئەو شەرمن و خەجاڵەتە؟ تۆ بە هیوای ئەوە بوویت؟ وەلێ برادەر من، زرنگم و شەرم ناکەم، تۆ خراپ تێگەیشتوویت، وەرە بگەڕێ، بگەڕێ، بگەڕێ، دەی بگەڕێ.
کاترینا ئیڤانۆڤنا بەدەم قسەکانییەوە ڕق بەرچاوی گرتبوو، بەرەو لای سۆنیا دەستی لۆژینی ڕادەکێشا.
لۆژین وتی:
- من ئامادەم و وەڵامی ڕەفتاری خۆمم پێیە.. بەڵام ڕاوەستە، خانم، ڕاوەستە، من زۆر باش ئەوە دەزانم تۆ زرنگیت..
پاشان لەبەر خۆوە وتی:
- ئەمە.. ئەمە.. چۆن دەبێت؟.. ئەمە کاری پۆلیسە و دەبێت ئەو ئەنجامی بدات.. هەر چەندە، لێرەیش شایەت هەیە.. زیاد لە پێویست شایەت هەیە.. من ئامادەم.. بەڵام بەهەرحاڵ ئەمە بۆ پیاو کێشەیە.. چونکە دوو ڕەگەزی جیاوازن.. مەگەر بە یارمەتی ئامالیا ئیڤانۆڤنا.. هەرچەندە.. کارەکە وا ناکرێت.. ئاخر.. ئەی چۆن؟
کاترینا ئیڤانۆڤنا هاواری کرد:
- خۆت کێت دەوێت! خۆت دایبنێ با بێت و بیگەڕێت! سۆنیا، گیرفانەکانت هەڵبگێڕەوە، ئاوا! بڕوانە، حەیوان، هەموویان خاڵین، ئەم گیرفانەیان تەنیا دەستەسڕی تیایە و هیچی تر. دەبینیت! ئەمەیشیان

گیرفانەکەی تر، وەرە، وەرە، دەیبینیت، دەیبینیت! کاترینا ئیڤانۆڤنا نەک هەر تەنیا گیرفانەکانی هەڵگێڕایەوە، بەڵکو هەر بە تەواوی دەریهێنانە دەرەوە. بەڵام لە ناکاوێکدا، لە گیرفانی دووەمی لای ڕاستا، کاغەزێک دەرپەڕی، دوای ئەوەی لە حەوادا چەرخێکی خوارد، لە نزیک پێی لۆژینەوە کەوتە سەر زەوی. هەموویان ئەمەیان بینی: زۆریان بە سەرسامییەوە هاواریان لێهەستا، پیتەر پتروڤیچ دانەوییەوە، بە دوو پەنجە کاغەزەکەی هەڵگرت، بەرانبەر بە هەموویان ڕایگرت و کردییەوە. گەڵایەکی سەد ڕۆبڵی بوو، کە هەشت جار نووشتابووەوە. پیتەر پتروڤیچ دەستی بە گشت لایەکدا گێڕا بۆ ئەوەی هەموویان بە چاکی بیبینن.

ئامالیا ئیڤانۆڤنا بە ڕووسییە شەقوشڕەکەی هاواری کرد:

- دزە! لێرە مەمێنە! پۆلیس، پۆلیس، پێویستە ئەمانە بنێرن بۆ سیبریا.

لە هەموو لایەکەوە هاوار بەرز بووەوە. ڕاسکۆلنیکۆڤ هەر بێدەنگ بوو، چاوی لە سۆنیا کەلا نەدەخست و هەندێکجاریش نیگایەکی خێرای لۆژینی دەکرد. سۆنیا لە جێگاکەیدا وەستابوو، دەتوت کاس و وڕ بووە، تەنانەت سەیری پێنەدەهات. کەچی لەپڕێکدا تێکڕای دەموچاوی وەک خوێنی لێهات، قیژاندی و بە هەردوو دەستی دەموچاوی شاردەوە، دیسان هاوارێکی تری کردەوە، کە پڕ بوو لە ناڵە و لاڵانەوە:

- نا، من ئەم کارەم نەکردووە، من پارەم هەڵنەگرتووە. ئاگام لێی نییە.

خۆی هاویشتە لای سۆنیا ئیڤانۆڤناوە، ژنی نەخۆش ئەمەندە توند بە سنگی خۆیەوە نووساند، دەتوت پێی خۆشە سنگی بکاتە سپێر و لە هەموو شتێک بیپارێزێت. لە کاتێکدا کە وەک منداڵێک لە ئامێزیدا

دەیلاواند و ماچی دەکرد، هەندێکجاریش لێوی بەسەر دەستیدا دەهێنا، بەبێ باوەڕکردن بەو بەڵگەیەیش، هاواری دەکرد:

- سۆنیا، سۆنیا، من باوەڕ ناکەم.. باوەڕ ناکەم تۆ هەڵتگرتبێت، بەڕاست ئەمانە چ کەسانێکی دەبەنگن ئەگەر بڕوا بکەن! خودایا.

پاشان ڕووی لە خەڵکەکە کرد و وتی:

- دەبەنگینە! ئێوە هێشتا نازانن، نازانن چ دڵێکی پێوەیە، چۆن کچێکە! ئەو دزی بکات؟ ئەو! ئەو ئامادەیە دواکراسی لەبەر خۆی دابکەنێت، بیفرۆشێت، بە ڕووتی بسووڕێتەوە، ئەگەر هەموو ئێوە پێویستتان بەو کراسە بێت، بتانداتێ. بەڵێ، ئەمە لەو کەسانەیە. بۆیە کارتیشی وەرگرت، چونکە خەریک بوو منداڵەکانم لە برسانا دەمردن، لەشی خۆی بۆ ئێمە فرۆشت. ئاە.. خوالێخۆشبوو، مێردی خوالێخۆشبووم، ئەی بێچارە! دەبینیت؟ دەبینیت؟ ئەمەیش پرسەکەت! بۆ داکۆکیی لێناکەن؟ ئێوەیش بڕواتان کرد، هیچ یەکێکتان نرخی پەنجەچکۆڵەی ئەوتان نییە، هیچ کامتان، هیچ کامتان! خودایا، ئاخر بۆ داکۆکیی لێناکەن؟

هەنسکی کاترین ئیڤانۆڤنای هاوسەر مردوو، سیلاوی و بێچارە و بێکەس، کاری زۆری لە هەموویان کردبوو. لە دەموچاوە خەمبارەکەیدا کە نەخۆشیی سیل پووکاندبوویەوە، لە لێوی وشک و پەرماوی و دەنگی گڕ و گیراوی، لەو شین و شەپۆرەیدا کە لە گریانی منداڵ دەچوو، لەو پاڕانەوە پڕ لە نائومێدییەیدا، کە بۆ پشتیوانیلێکردنی سۆنیا دەیکرد، ئەمەندە بەزەیی و ئازاریان تیا دەردەکەوت، پێدەچوو هەموو دڵیان بەو ژنە بەدبەختە بسووتێت، تەنانەت پیتەر پتروڤیچیش زوو ئەو هەستی بەزەییپێداهاتنەوەیەی دەرخست و بە دەنگێکی کاریگەرەوە وتی:

- خانم، خانم! ئەم کێشەیە پەیوەندی بە تۆوە نییە، کەس ناتوانێت دەستی تۆمەتبارکردن بۆ لای تۆ ڕابکێشێت. بە تایبەتی کە تۆ خۆت، لە هەڵگێڕانەوەی گیرفانەکانیدا پارەکەت دۆزییەوە. بەوەدا دیارە کە تۆ هەر ئاگات لێنەبووە. زۆر زۆر بەداخم کە هەژاری وای لە سۆنیا سمیۆنۆڤنا کردووە دەست بۆ ئەو کارە بکێشێت. بەڵام ئاخر خاتوون، بۆ نەتویست دانی پێدا بنێیت؟ لە ڕسوایی دەترسایت؟ یەکەمجارت بوو؟ ڕەنگە ئاگات لە خۆت نەبووبێت؟ بە تەواوی دیارە. بەڵام بۆ کارەکەت بەم مەرەیە گەیاند!

پاشان ڕووی لە هەمووان کرد و وتی:

- بەڕێزان، بەڕێزان! لەبەر ئەوەی گەلێک کاری لێکردووم و بەزەییم پیایدا دێتەوە. هەرچەندە سووکایەتیشم پێکراوە، بەڵام ئامادەم لێی خۆش بم.

ئینجا ڕووی لە سۆنیا کرد و وتی:

- خاتوون، هیوادارم ئەم تەریقبوونەوەیە پەندێک بێت بۆ ئاییندەت و دەرسی لێوەربگریت، ئیتر من دوای کارەکە ناکەوم و بە ناچاری وازی لێدەهێنم. با لێرەدا کۆتایی پێبێت.

پیتەر پتروڤیچ لەژێرەوە تەماشای ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد، نیگای هەردووکیان بەر یەکدی کەوتن، نیگا ئاگرینەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ لەوەدا بوو ئەو بکات بە خۆڵەمێش. وەلێ کاترینا ئیڤانۆڤنا، لەوە دەچوو گوێی لە هیچ نەبووبێت. وەک شێت سۆنیای گرتبووە ئامێزی و ماچی دەکرد. منداڵەکانیش لە هەموو لایەکەوە و بە دەستە بچووکەکانییەوە بە سۆنیاوە نووسابوون. پولیچکایش کە تەنانەت بە تەواوی نەیدەزانی مەسەلەکە چییە، گیانی دەلەرزی، دەگریا و هەموو

سەروچاوی ببوو بە فرمێسک. ڕووە خنجیلانەکەی کە گریان ئاوساندبووی، نابووە سەر شانی سۆنیا و شاردبوویەوە..

لەپڕێکدا دەنگێکی زاڵ لەبەر دەرگاکەوە بەرز بووەوە:

- ئای کە پیاوێکی خوێڕییە!

پیتەر پتروڤیچ بەپەلە ئاوڕی دایەوە. لیبزیاتینکۆف کە چاوی بڕیبووە نێو چاوی و مۆڕەی لێدەکرد، جارێکی دی وتییەوە:

- ئای کە کارێکی نامەردانەیە!

پیتەر پتروڤیچ مووچرکێکی پێدا هات، هەموویان پێیان زانی (هەڵبەتە لە دواییدا ئەمەیان بیر دەکەوتەوە) لیبزیاتینکۆف هەنگاوی نایە ناو ژوورەکەوە، کە بەرەو لای پیتەر پتروڤیچ دەڕۆیشت وتی:

- چۆن وێرات من بکەیت بە شایەت؟

لۆژین کەوتە ورتەورت:

- یانی چی، ئاندرێ سمیونوڤیچ! لەبارەی چییەوە قسە دەکەیت؟

لیبزیاتینکۆف کە چاوی کوێرانە نابوونە سەر یەک و زۆر بە سەختی لێی دەڕوانی، بە توندی تێی خوڕی:

- دەزانیت یانی چی، یانی تۆ درۆ دەکەیت، مەبەستم ئەوەیە وا بڵێم.

لیبزیاتینکۆف ڕکێکی سامناک دایگرتبوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ چاوی تێبڕی، وەک ئەوەی بیەوێت هەموو وشەیەکی هەڵبسەنگێنێت و تێی بگات. دیسانەوە بێدەنگی هەموو لایەکی گرتەوە، پیتەر پتروڤیچ تا ڕادەیەک خۆی لەدەست دا، بە تایبەتی لە سەرەتادا، دوایی کەوتە پتەپت:

- تۆ کە ئەم قسانە بە من دەڵێیت.. ئاخر تۆ چیتە؟ ئایا هۆشت لەسەردا ماوە؟

- هۆشم لە جێی خۆیدایە، وەلێ تۆ.. تۆ نامەردیت! کارەکەت نامەردانەیە. من گوێم لە هەموو شتێک بوو، زۆر وەستام تا باش

تێبگەم، چونکە دەبێت دان بەوەدا بنێم کە من تا ئێستایش مەسەلەکەم زۆر بە ناماقووڵ دەهاتە بەرچاو.. ئاخر ئەم کارەت بۆ کرد، تێناگەم!
- بۆ من چیم کردووە! ئایا دەست لەم قسە هیچ و بەپێچوپەنایانە هەڵناگریت؟ ڕەنگە خواردبێتتەوە و سەرخۆش بیت؟
- تۆ پیاوێکی نامەردیت، ڕەنگە تۆ سەرخۆش بیت نەک من! من تەنانەت ڤۆدگایش ناخۆمەوە، چونکە ئەو کارە لەگەڵ بیروباوەڕی مندا ناگونجێت. بیری لێبکەنەوە ئەو، خۆی، هەر بە دەستی خۆی ئەو گەڵا سەد ڕۆبڵییەی دایە سۆنیا سمیۆنۆڤنا، من بینیم، شایەتم، ئامادەم سوێند بخۆم، ئەو، ئەو خۆی!
لیبزیاتینکۆف ڕووی قسەکانی دەکردە هەموویان و هەر یەکێکیشیان.
لۆژین هاواری کرد:
- کوڕە تۆ شێت بوویت؟ سۆنیا سمیونۆڤنا خۆی لێرەیە و بەرانبەرتانە، خۆی، هەر ئێستا، بەرانبەر بە هەمووان دانی پێدا نا کە بێجگە لە دە ڕۆبڵ پارەی تری لە من وەرنەگرتووە. ئیتر من چۆن توانیوومە دوایی ئەو پارەیەی بدەمێ!
لیبزیاتینکۆف بە دەنگی بەرز جەختی کردەوە:
- من خۆم تۆم بینی، تۆم بینی کە چیت کرد. هەرچەندە ئەمە بە پێچەوانەی بیروباوەڕمەوەیە، بەڵام ئامادەم لە دادگادا سوێند بخۆم، چونکە چاوم لێبوو چۆن تۆ بە دزییەوە پارەکەت خستە گیرفانی! بەڵام من دەبەنگ بووم کە وامزانی تۆ ئەم کارە لە ڕووی چاکە و بەزەییەوە دەکەیت. لەبەر دەرگاکە، ئەو کاتەی ڕەوانەت دەکرد و ئەو پشتی لە تۆ بوو، لە ئاوڕدانەوەدا تۆ بە دەستی ڕاست تەوقەت لەگەڵ کرد و بە دەستی چەپیشت لەسەرخۆ گەڵا سەد ڕۆبڵیەکەت خستە گیرفانییەوە. من خۆم بینیم، خۆم بینیم!

ڕەنگی لۆژین پەڕی و چوختییانە وتی:
- بۆ درۆ دەکەیت! باشە ئاخر چۆن توانیت تۆ کە لە پاڵ پەنجەرەکەدا وەستابوویت، ئەو سەد ڕۆبڵییە ببینیت؟ خەونت دیووە.. بەو چاوە کوێرانەتەوە.. وڕێنە دەکەیت!
- نا، خەونم نەدیووە، هەرچەندە دووریش وەستابووم، وەلێ هەموو شتێکم بینی، هەرچەندە لە ڕاستیا جیاکردنەوە و دیاریکردنی گەڵاکە لە پاڵ پەنجەرەکەوە کارێکی ئاسان نییە، لەم لایەنەوە ڕاست دەکەیت، بەڵام من لە ڕێی بەڵگەیەکی زۆر تایبەتییەوە تەواو لەوە دڵنیا بووم کە ئەو گەڵایە سەد ڕۆبڵییە. چونکە ئەو کاتەی تۆ دە ڕۆبڵیەکەت بە سۆنیا سمیونۆڤنا دا، کە خۆم ئەوەم بینی، هەر لەو کاتەدا گەڵا سەد ڕۆبڵییەکەیشت لەسەر مێزەکە هەڵگرت، (ئەمە خۆم بینیم، چونکە لەو کاتەدا کە من لە نزیک تۆ و مێزەکەوە وەستابووم، کتوپڕ بیرۆکەیەک لەسەری دام، لەبەر ئەوە لە بیرمدا مایەوە کە لە ناو دەستی تۆدا سەد ڕۆبڵییەک هەیە) تۆ قەدت کرد و هێشتتەوە، بە درێژایی ئەو ماوەیە هەر لە ناو دەستتا دەتگوشی، من لەوەدا بوو لە بیرم بچێتەوە، بەڵام کە هەستایت، لە دەستی ڕاستەوە ناتە دەستی چەپت و زۆریشی نەمابوو لێت بکەوێت. بۆیە ئەمجارەیان سەرلەنوێ بیرم کەوتەوە، چونکە دووبارە بیرۆکەکە لەسەری دامەوە. واتا زانیم تۆ دەتەوێت بە نهێنیی منەوە یارمەتیی بدەیت. ئێستا دەتوانیت بزانیت چۆن من چاودێریم کردوویت. چۆن ئەوەیشم بینی کە تۆ توانیت پارەکە بخەیتە گیرفانییەوە، من ئەمەم بینی، بینیم و ئامادەم سوێند بخۆم.
لیبزیاتینکۆف خەریک بوو دەخنکا، لە هەموو لایەکەوە بوو بە دەنگەدەنگ کە زیاتر بەڵگەی سەرسووڕمانی دەگەیاند. بەڵام

هەندێکجاریش لە دەنگەکاندا هاواری هەڕەشە دەبیسترا. هەموو دەوری پیتەر پتروڤیچیان گرتبوو، کاترینا ئیڤانۆڤنا خۆی ڕادایە لای لیبزیاتینکۆفەوە.

- ئاندرێ سمیونوڤیچ! من لەبارەی تۆوە هەڵە بووم! داکۆکیی لێبکە! تەنیا تۆ دەیناسیت! هەتیووە. خوا تۆی بۆ ناردووە! ئاندرێ سمیونوڤیچ، ئازیز و جوامێر!

کاترینا ئیڤانۆڤنا کە تا ڕادەیەک نەیدەزانی چی دەکات، لە بەردەمیدا بە چۆکدا هات.

لۆژین کە ڕکی گەیشتبووە ئەوپەڕ و تەواو تووڕە بوو، زریکاندی:

- بێمانایە، قسەی بێسەرەوبەرەن. جەناب! یانی چی "لە بیرم کرد، بیرم کەوتەوە، لە بیرم کرد" بەم قسانەی تۆ بێت، من بە تایبەتی و بە مەبەستەوە ناومەتە گیرفانی؟ بۆ؟ لەبەر چی؟ چی من و ئەمە کۆ دەکاتەوە..

- بۆچی؟ خۆیشم لەمە تێناگەم، بەڵام هیچ گومان لەوەدا نییە، ئەوەی من وتم، تەواو ڕاستە، من بڕوام پێیەتی، ئەی نامەردی تاوانبار. لە بیرمە لەو کاتەدا چەند زوو پرسیارێکم بە خەیاڵدا هات، ڕاست لەو کاتەدا کە سوپاسم کردیت و دەستم گوشیت، بەخۆم وت: بۆ بە دزییەوە پارەکەی خستە گیرفانییەوە؟ مەبەستم ئەوەیە لەبەر چی کارەکەت بە دزییەوە کرد؟ ئایا لەبەر ئەوە لە منت شاردەوە، چونکە دەتزانی بیروباوەڕی من دژی ئەو کارەیە و من کۆمەکی تایبەتی و خێر بە چارەسەری کێشەکە نازانم و ڕەتی دەکەمەوە؟ باشە، من بیرم لەوەیش کردەوە کە ڕەنگە تۆ پێت خۆش نەبووبێت لە بەردەمی مندا ئەو پارە زۆرەی بدەیتێ، هەروەها بۆ ئەوەیش چووم کە دەشێت بخوازیت ئەو سەرسام و شادمان بێت کاتێک لەپڕێکدا دەست بە

گیرفانیدا دەکات و سەد ڕۆبڵییەک بە دەستییەوە دێت (چونکە کەسانێکی خێرخواز هەن حەزیان لەوەیە کارە چاکەکانیان بەم شێوازە ئەنجام بدەن، من ئەمە دەزانم) پاشان بیری ئەوەم کردەوە تۆ دەتەوێت ئەو کچە تاقی بکەیتەوە، بۆ ئەوەی بزانیت ئایا دوای ئەوەی ئەو بە پارەکە دەزانێت دێتەوە لات و سوپاست دەکات یان نا! ئینجا وتم ڕەنگە لە سوپاس و سوپاسگوزاری بێزار بێت و پەیڕەوی لەو باوەڕە بکات، کە دەڵێت: دەستی ڕاستت نەزانێت دەستی چەپت چی دەکات، بە کورتی و پوختی گەلێک لەم ڕاوبۆچوونانە.. بەڵێ، بیرم بۆ زۆر شت چوو، بڕیاریشم دا لە دواییدا و بە هێوری هەموویان شەنوکەو بکەم، بەهەرحاڵ، بە لامەوە وا چاک بوو بەسەر خۆمیدا نەهێنم کە من ئاگاداری نهێنییەکانتم. وەلێ هەر لە هەمان کاتدا پرسیارێکی دی خێرا ئەوکی گرتم، کە دەشێت پێش ئەوەی سۆنیا سمیۆنۆڤنا پێی بزانێت، پارەکە ون بکات. بۆیە بڕیارم دا بێم بۆ ئێرە، بانگی بکەم و پێی بڵێم تۆ سەد ڕۆبڵییەکت خستۆتە گیرفانییەوە. بەڵام لە ڕێگەدا سەرم لە ماڵی خانمان کابیلیاتنیکوف[1] دا، بۆ ئەوەی کتێبی "پیاچوونەوەی گشتی میتۆدی بنچینەیی"[2]یان بدەمێ و ڕاسپێریان بکەم کە وتارەکانی پیدریت و ڤاگنەر بخوێننەوە. پاشان هاتم بۆ ئێرە و بەسەر ئەم شەڕەدا کەوتم. باشە، دەکرێت هەموو ئەم

[1] *Kabyliatnikov*

[2] ئەم کتێبە ساڵی ١٨٦٦ لە پترۆزبورگ چاپک راوە، وەرگێڕانی کۆمەڵێک وتاری زانستی ڕەهەند دیالەکتیکییە، لە لایەن کۆمەڵێک بیرمەندەوە نووسراون وەک: فیرشون، کلودبەناو، مولیشوت، تیودور پیدریت، ئادۆلف ڤاگنەر. -و-

بیروبۆچوونانەم لە خۆمەوە دروست کردبێت، بەبێ ئەوەی بە ڕاستی خۆم نەمدیبێت تۆ چۆن پارەکەت خستۆتە گیرفانییەوە؟

کە ئاندرێ سمیونوڤیچ وتەکانی خۆی بە بەڵگەی تەواو و ئەنجامگیرییەکی لۆژیکییانەوە تەواو کرد، زۆر ماندوو ببوو، بە جۆرێک کە ئارەقە بە ناوچاویدا دەهاتە خوارێ. بەداخەوە تەنانەت نەیتوانی بە زمانی ڕووسی و بە شێوەیەکی شایستە مەبەستەکانی دەرببڕێت (هەرچەندە زمانی تریشی نەدەزانی) بۆیە دوای ئەو داوەرییە ئەوەندە بە سەختی شەکەت بوو، دەتوت لەپڕێکدا تووشی چروسانەوە هاتووە. وەلێ لەگەڵ ئەوەیشدا کاریگەریی قسەکانی لەڕادەبەدەر بوو، چونکە هێند بە بڕوا و بوێرانە دەدوا، هەموویان باوەڕیان بە قسەکانی کردبوو. پیتەر پتروڤیچ هەستی کرد کاری بەرەو خراپی سەردەکێشێت.

بۆیە هاواری لێهەستا:

- ئەو پرسیارە گەوجانەیەی بە زەینی تۆدا هاتوون، چ پەیوەندییەکیان بە منەوە هەیە، ئەمانە کەی بەڵگەن! دەشێت هەموو ئەمانەت لە خەوندا بینیبێت! من پێت دەڵێم تۆ درۆ دەکەیت، درۆ دەکەیت و لەبەر هەر هۆیەک بێت بوختانم بۆ هەڵدەبەستیت، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی من بڕوام بە بیروباوەڕ و بۆچوونە کۆمەڵایەتییەکانی تۆ نییە، ئەو بیروڕا سۆشیالیستیە کافرانەیەی پڕە لە بێبەندوباری. تەنیا ئەمەیە و هیچی تر.

بەڵام ئەم فێڵەی پیتەر پتروڤیچ سوودی نەبوو، بە پێچەوانەوە لە هەموو لایەکەوە بوو بە ژاوەژاو، لیبزیاتینکۆف هاواری کرد:

- ئا.. تۆ لە مەبەستەکە دوور مەکەوەرەوە! درۆ دەکەیت! پۆلیس بێنە و من سوێند دەخۆم! من تەنیا شتێک هەیە کە تێی ناگەم، بۆ دەستی بۆ ئەم کارە ناپیاواتەیە برد! هەی نامەردی بەدبەخت!

سەر ئەنجام ڕاسکۆلنیکۆڤ هاتە پێشێ و بە دەنگێکی پتەوەوە وتی:

- من دەتوانم ئەوە ڕوون بکەمەوە کە بۆچی دەستی دایە ئەم کارە، ئەگەر پێویستیش بکات ئامادەم سوێند بخۆم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ هێور و پێداگر دیار بوو، لە یەکەم نیگاوە هەموویان بۆیان دەرکەوت بە ڕاستی ئەو لە وردەکاریی مەسەلەکە دەزانێت و ئیدی گرێکە دەکرێتەوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە ڕاستەوخۆ ڕووی لە لیبزیاتینکۆف کردبوو، وتی:

- من ئێستا هەموو شتێکم لا ڕوون بۆتەوە، لە سەرەتای حیکایەتەکەوە هەستم دەکرد پیلانێکی نامەردانە لەئارادایە، ئەم هەستەم لە ئەنجامی کۆمەڵێک هۆکارەوەیە، کە تەنیا من دەیزانم و ئێستا بۆ هەمووتانی باس دەکەم، چونکە هەموو قسەکان لەوێدا کۆ دەبنەوە، تۆیش، ئاندرێ سمیونوڤیچ، بە شایەتییە زۆر بەنرخەکانی خۆت، هەموو شتێکت بۆ من یەکلایی کردەوە و بەرچاوڕوونیت پێبەخشیم. هیوادارم هەمووتان، هەمووتان گوێم لێبگرن: ئەم بەڕێزە (ئاماژەی بۆ لۆژین کرد) ماوەیەک لەمەوبەر خوازبێنی کچێکی کرد. کچێک، ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنا ڕاسکۆلنیکۆڤی خوشکم، وەلێ دوای ئەوەی هات بۆ پترورزبورگ، سێ ڕۆژ لەمەوپێش، لە یەکەم دیدارماندا لەگەڵمدا بەشەڕ هات و منیش لە ماڵەکەم دەرم کرد، دوو شایەت لەسەر ئەو ڕووداوە هەن. ئەم کابرایە زۆر شەڕانییە، سێ ڕۆژ لەمەوبەر، من ئەوسا نەمدەزانی ئەو لەم ساختمانەی نزیک بە ئێوەدا ژووری گرتووە، لە ئەنجامدا ڕۆژی شەڕەکەمان، واتا سێ ڕۆژ

لەمەوپێش، ئەو ئاگای لێبوو کە من وەک هاوڕێیەکی کۆچکردووی بەڕێز مارمیلادۆڤ، هەندێ پارەم بۆ پرسەکەی دا بە کاترینا ئیڤانۆڤنای ژنی. ئەم بەڕێزە یەکسەر نامەیەکی بۆ دایکم نووسی و ئاگاداری کرد کە من هەرچی پارەم هەبوە، داومە بە سۆنیا سمیۆنۆڤنا، نەک بە کاترینا ئیڤانۆڤنا، هەروەها لە نامەکەیدا وشەی زۆر قێزەونی لەبارەی کاری.. سۆنیا سمیۆنۆڤناوە کردبوو، واتا زۆر بە ناشیرینی باسی پەیوەندیی نێوان من و سۆنیا سمیۆنۆڤنای کردبوو، هەموو ئەم کارەیشی، لە بیرتان نەچێت، بۆ ئەوە بوو کە پەیوەندیی نێوان من و دایکم و خوشکم تێک بدات. تا بۆیان بسەلمێنێت کە من ئامانجێکی ناشەریفانەم هەیە، بۆیە دواپوولی خۆم، کە ئەوان لە دەمی خۆیانی دەگرنەوە و وەک یارمەتیدانم بۆم دەنێرن، ئاوا بە خۆڕایی بە فیڕۆی ئەدەم، دوێنێشەو، بە ئامادەبوونی دایکم و خوشکم و خۆیشی، ئەم ڕاستییەم ئاشکرا کرد، سەلماندیشم من پارەکەم داوە بە کاترینا ئیڤانۆڤنا بۆ خەرجیی پرسەکە نەک بە سۆنیا سمیونۆڤنا، هەروەها ئەوەیشم وت کە من تا سێ ڕۆژ لەمەوبەر تەنانەت سۆنیام نەناسیووە و نەبینیووە، هەر لەو ئاقارەدا بە پیتەر پترۆڤیچم وت کە ئەو بەهەموو بەهرە و توانایەوە، بە ئەندازەی پەنجەچکۆڵەی سۆنیا سمیونۆڤنا نرخی نییە کە ئەو وا بە خراپی باسی دەکات، ئەو پرسیاری لێکردم کە ئایا ئامادەم سۆنیا سمیۆنۆڤنا لە پاڵ خوشکمدا دابنیشێنم؟ وەڵامم دایەوە کە من ئەو کارەم هەر لە یەکەم ڕۆژەوە کردووە. ئەو لەوە زۆر تووڕەیە کە دایکم و خوشکم نایانەوێت بە هۆی بوختان و دەستهەڵبەستەکانیەوە پەیوەندیم لەگەڵدا ببڕن. بۆیە بەردەوام قسەی ناجۆر و تڕۆی وای لەگەڵدا دەکردن، کە

شیاوی بەخشین نەبوو. لە ئەنجامدا پەتی پەیوەندییان لەگەڵدا بڕی و لە ماڵەکە دەریان کرد.
هەموو ئەم بەسەرهاتە دوێنێشەو ڕوویدا، ئێستا داواکارم بە تایبەتی ئاگادار بن: ئەوە بزانن، ئەگەر ئەو ئەمڕۆ لەوەدا سەربکەوتایە کە بیسەلمێنێت سۆنیا سمیۆنۆڤنا دزە. یەکەم بۆ خوشک و دایکمی دەردەخست کە تا ڕادەیەک بەدگومانییەکەی لە شوێنی خۆیدا بووە. دووەم لەسەر ئەوەی کە من خوشکم لەگەڵ سۆنیا سمیۆنۆڤنادا هاوسەنگ کردووە، هەقی ئەوەی هەیە تووڕە بێت و سەرئەنجام هێرشبردنی بۆ سەر من بەرگریکردن بووە لە شەرەفی خوشکی من، کە دەبێت بە دەزگیرانی ئەو. بە کورتی بە هۆی ئەم بەسەرهاتانەوە دەیتوانی هەر چۆنێکە، دووبارە سەربکەوێت و نێوان من و کەسوکارم تێک بدات، بێگومان ئەو کاتە ئومێدێکی پەیدا دەکردەوە، کە ئەوان بیگرنەوە خۆیان. بێجگە لەمەیش، دەیویست بەم کارەی ئێستای تۆڵە لە من بکاتەوە، چونکە لای خۆیەوە هەستی بەوە کردووە کە ئابڕوو و بەختەوەری سۆنیا سمیونۆڤنا لای من گەلێک بەنرخە. ئەمە هەموو ئەو شتانەیە کە لەژێر سەریدا بووە، من هەر ئەوەندە لەم چیرۆکە تێگەیشتووم، هۆکارەکان ئەمانەن و هیچی تریان لە پشتەوە نییە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بەم ڕستانە کۆتایی بە وتەکانی هێنا، گەلێکجار هاوار و دەنگی سەرسامیی ئامادەبووان قسەکانیان پێدەبڕی، ئەوانەی بە بایەخێکی زۆرەوە گوێیان بۆ ڕادێرابوو، بەڵام ڕاسکۆلنیکۆڤ لەگەڵ ئەو قسەبڕینانەیشدا، بە شێوازێکی هێندە هێمن، بە وردی و ڕوونی دوا، کە جێگای بۆ هیچ گومانلێکردنێک نەهێشتەوە، دەنگی زاڵ و

شێوازی قەناعەتپێکردن و دەموچاوە دڵگیرەکەی، کارێکی زۆر سەیر و سەرنجڕاکێشی لە ئامادەبووان کردبوو.
لیبزیاتینکۆف بە خۆشییەوە پەسەندی کرد و وتی:
- وایە، وایە، هەر وایە، هەر دەبێت وایش بێت، چونکە کاتێک سۆنیا سمیۆنۆڤنا هاتە ژوورەکەمانەوە، لە منی پرسی ئایا تۆ لەوێیت؟ ئایا تۆم لە نێو میوانەکانی کاترینا ئیڤانۆڤنادا دیووە؟ هەر بۆ ئەو مەبەستە بانگی کردمە پاڵ پەنجەرەکەوە و لەسەرخۆ ئەو پرسیارەی لێکردم. دیار بوو دەیویست بەتایبەتی تۆ لەوێ بێت. مەسەلەکە ئەمەیە.
لۆژین بێدەنگ بوو، هەرچەندە ڕەنگ بە ڕوویەوە نەمابوو، کەچی زەردەخەنەیەکی نەفرەتی خستبووە سەر لێوی. وەک بیر لەوە بکاتەوە بە چ جۆرێک خۆی لەم کێشەیە ڕزگار بکات. ڕەنگە زۆری پێ خۆش بووبێت هەر ئاوا بڕوات و دانیشتوانەکان بەجێ بهێڵێت، بەڵام بۆ ئەم حاڵەتەی ئێستا کارێکی نەشیاو بوو، چونکە ئەو هەڵوێستە بە مانای قبووڵکردنی تۆمەتەکان و دانپێدانانی ئەو بوختانە ناهەقانەبوو، کە دەربارەی سۆنیا سمیونوڤیچ کردبووی. بێجگە لەمانە، میوانەکان بە هۆی زۆر خواردنەوەی مەیەوە تەواو هەڵچووبوون. لێپرسراوی ئازووقە، هەرچەندە ئاگای لە تەواوی شتەکان نەبوو، بەڵام لەوانی دی زیاتر کردبووی بە هەرا، پێشنیازی زۆر ناخۆشی لە دژی لۆژین دەکرد. بەڵام لە نێوانیاندا کەسانێکیش دیار بوون، کە مەست نین، خەڵکەکە لە هەموو ژوورەکانەوە هاتبوون. سێ پیاوە پۆڵەندییەکە وروژابوون، بەرانبەر بە لۆژین هاواریان دەکرد، بە زمانی پۆڵۆنی هەڕەشەیان لێدەکرد و قسەیان پێدەوت. سۆنیایش بە وردی گوێی گرتبوو، بەڵام پێدەچوو ئەویش زۆر ئاگاداری هەموو شتەکان نەبێت. وەک ئەوەی بێهۆش بووبێت و تازە هاتبێتەوە

سەرخۆی. بەڵام چاوی لەسەر ڕاسکۆلنیکۆڤ لانەدەبرد، چونکە وای هەست دەکرد کە ئەو تەنیا کەسێکە بەرگریی لێبکات. کاترینا ئیڤانۆڤنا زۆر بە زەحمەت هەناسەی دەدا، خیزەخیزێک لە سنگییەوە دەهات و گەلێک شەکەت و ماندوو دیار بوو. لە هەموو گەمژانەتر باری ئامالیا ئیڤانۆڤنا بوو: دەمی کرابووەوە و هیچ نەیدەزانی مەسەلەکە چییە. تەنیا ئەوەی دەبینی، کە پیتەر پتروڤیچ گیری خواردووە. ڕاسکۆلنیکۆڤ ویستی بکەوێتەوە قسەکردن. بەڵام دەرفەتیان نەدا. هەموویان لۆژینیان دابووە بەر هاوار و هەڕەشە و جوێن. وەلێ پیتەر پتروڤیچ کۆڵی نەدا، کە بینی لە تۆمەتبارکردنی سۆنیادا شکستی خوارد، ڕاستوڕەوان دایە بێناموسی، بە ناو خەڵکەکەدا کەوتە ڕێکردنەوە بۆ خۆی و وتی:

- ببوورن بەڕێزان، ببوورن. هێند تەنگم پێ هەڵمەچنن، ڕێگەم بدەن بڕۆم، تکایە هەڕەشەیشم لێمەکەن. من دڵنیاتان دەکەم کە هیچ ڕوو نادات. من لەو ترسنۆکانەیش نیم.. بە پێچەوانەوە.. بەڕێزان ئێوە بەرپرسیارن کە دەتانەوێت بە زۆر تاوانێک داپۆشن، دزەکە دەستی کەوتۆتە ڕوو، من واز ناهێنم و دەیاندەمە دادگا، دادگا نە ئەوەندە کوێرە.. نە ئەوەندەیش سەرخۆشە، دادگا بڕوا بە دوو کەسی خوانەناس و پیلانگێڕ و گومڕا ناکات کە بیانەوێت تۆڵە لە من بکەنەوە و خۆیشیان لەبەر گەوجییان دانیان بەمەدا نابێت. بەڵێ، ڕێگەم بدەن.

ئاندرێ سمیونوڤیچ وتی:

- ئیدی ناهێڵم پێ بخەیتە ژوورەکەمەوە، تکایە هەر لە ئێستاوە بگوێزەرەوە بۆ جێگایەکی تر، هیچ لە بەینی من و تۆدا نەماوە، کە بیر لەوە دەکەمەوە چۆن بۆ ماوەی دوو هەفتە من خۆم شەکەت و ماندوو کردبوو بۆ ئەوەی باسی..

- ئاندریێ سمیونوڤیچ، من ئەو کاتەی خۆم سوور بووم لەسەر ئەوەی بڕۆم، تۆ جەختی مانەوەت لێدەکردم، ئێستا تەنیا ئەوە دەڵێم کە تۆ پیاوێکی گەلۆریت. هیوادارم بتوانیت ئەقڵ و چاوی کوێرت چار بکەیت، بەڕێزان داوای لێبوردن دەکەم.
لۆژین ڕێگەی بۆ خۆی کردەوە. بەڵام لێپرسراوی ئازووقەکڕین نەیدەویست هەر ئاوا بە ئاسانی تەنیا بە جوێن وازی لێبهێنێت. بۆیە پەرداخێکی لەسەر مێزەکە هەڵگرت و زۆر بە خێرایی گرتییە پیتەر پترۆڤیچ، بەڵام پەرداخەکە بەر ئامالیا ئیڤانۆڤنا کەوت، ژنەکە هاواری لێهەستا، لێپرسراوی ئازووقە لەبەر ئەوەی کە زۆر بە خێرایی پەرداخەکەی فڕێدا بوو، هاوسەنگییەکەی خۆی لەدەست دا، بۆیە بە هەموو قورساییەکەیەوە خۆی کردبوو بەژێر مێزەکەدا.
پیتەر پترۆڤیچ گەڕایەوە ژوورەکەی و دوای نیو سەعات لەوێ باری کرد. سۆنیا بە شەرمنییەکەی خۆیەوە، پێشتریش دەیزانی کە هاڕین و لەناوبردنی ئەو لە هاڕینی هەر کەسێکی دی ئاسانترە، هەموو کەسێکیش دەتوانێت بە ئاسانی سووکایەتیی پێبکات. لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەو تا ئەو کاتە وای بیر دەکردەوە کە دەتوانێت بەهەر ڕێگەیەک بێت، خۆی لەو بوختان و دەستهەڵبەستە گەورانە بپارێزێت، بە مەرجێک ئەگەر بتوانێت لەسەر بنەمای سۆز و خۆشەویستی و هێوری و خاکیەتی خۆی مامەڵە لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا بکات. بەڵام لەم لایەنەوە تووشی نائومێدی و ڕەشبینییەکی زۆر بوو، ئەمەیش زۆر گران لەسەری کەوت، بێگومان ئەو بەوپەڕی هێمنی و بەبێ نارەزاییدەربڕین دەیتوانی خۆی بگرێت. تەنانەت لەم کارەساتەیشدا، لە سەرەتادا، بەرگەگرتنی زۆر بە زەحمەت دەزانی، لەگەڵ ئەوەیشدا کە بێگوناهییەکەی بە تەواوی دەرکەوت و ترس و شپرزەییەکەی

بەسەر چوون و لە هەموو شتێک تێگەیشت، کەچی هەستی بێتوانایی و ڕەنج و ئازار دڵیان گوشی، تووشی حاڵەتێکی هیستیری بوو. سەرئەنجام خۆی نەگرت، لە ژوورەکە دەرپەڕی و بە هەڵەداوان بەرەو ماڵەکەی خۆی بەڕێ کەوت. ئەمە دوای ڕۆیشتنی لۆژین ڕووی دا. ئامالیا ئیڤانۆڤنایش کە دوای ئەوەی پەرداخەی بەرکەوت، نەیتوانی لە بەردەم پێکەنینی ئامادەبواندا خۆی بگرێت، کاسەی سەبری لێی ڕژا، وەک شێت هاوارێکی ناقۆڵای کرد و پەلاماری کاترینا ئیڤانۆڤنای دا، چونکە ئەوی بە هۆی هەموو گرفتەکان دەزانی. بە زمانێکی ناتەواوی ڕووسی وتی:

- نابێت لەم خانووەدا بمێنیت، دەبێت هەر ئێستا بڕۆیتە دەرەوە.

بەدەم قسەکانییەوە هەرچی شتومەکی کاترینا ئیڤانۆڤنا بوو، کە توانای هەڵگرتنیانی هەبوو، گرتی و فڕێی دانە سەر زەوی. کاترینا ئیڤانۆڤنا کە بێ ئەمەیش هێز و توانای لێبڕابوو، تا ڕادەیەک لەوەدا بوو ببوورێتەوە، لەسەر تەختەکەی بەو حاڵە ناخۆشەوە کەوتبوو، ڕاپەڕی و پەلاماری ئامالیا ئیڤانۆڤنای دا، وەلێ هێزی ئەو دوانە هاوکێشی یەکتر نەبوون، خاوەن خانووەکە بە جۆرێک ئەو ژنە نەخۆشەی ڕاوەشاند، کە وەک پەڕی باڵندەیەک فڕێی دایە لایەکەوە.

کاترین ئیڤانۆڤنای نەگبەت و بێچارە کەوتە گریان و هاوار.

- چۆن! بێجگە لەوەی کە بێبەزەییانە بوختانی بە سۆنیادا کرد، وەک حەیوان پەلاماری منیشی دا، لە ڕۆژی بەخاکسپاردنی مێردەکەمدا، فڕێم دەدەنە سەر شەقام، دوای ئەوەی کە نانونمەکیان کردم، لەگەڵ هەتیووەکانمدا، باشە بۆ کوێ بچم! خودایا!

پاشان چاوی بڵێسەی دا و ناڵاندی:

- خودایا، بەڕاست دەبێت هیچ دادپەروەرییەک نەبێت؟ تۆ ئەگەر بەرگری لە هەتیوو نەکەیت ئەی لە کێی دەکەیت؟ باشە، دەبینین، حەتمەن لە دنیادا هەقیقەت و دادپەروەرییەک هەیە، من دەیدۆزمەوە، هەر ئێستا ئەو دادگایانە دەدۆزمەوە. ڕاوەستە، حەیوانی خوانەناس، پولێچکا گیان، تۆ لەگەڵ منداڵەکاندا بمێنەرەوە، من هەر ئێستا دەگەڕێمەوە. چاوەڕێم بکەن. ئەگەریش دەتوانن لە کۆڵانەکەدا بوەستن، با بزانین لەم دنیایەدا هەقیقەتێک بوونی هەیە یان نا؟

ئەو قوماشە ئاوریشمینە سەوزەی مارمیلادۆڤ لە چیرۆکەکەدا باسی کردبوو، دای بەسەریدا. کاترینا ئیڤانۆڤنا لە ناو خەڵکی ئاپۆرە و مەستی کرێگرتەوە کە هێشتا لە ژوورەکەدا کۆ بوون، ڕێگەی بۆ خۆی کردەوە، بە هاوار و ناڵە و فرمێسکەوە پەڕییە سەر شەقامەکە، ئامانجێکی دیاری نەبوو، بەڵام هەر دەیویست لە هەر شوێنێکدا بووە دادپەروەری بدۆزێتەوە و دەست بە داوێنییەوە بگرێت.

پۆلیا لەگەڵ منداڵەکاندا بە ترسەوە چووە سەر سندوقێک، کە لە سووچێکی ژوورەکەدا بوو، دوو منداڵەکەی لە ئامێز گرت، بە ترسولەرزەوە چاوەڕێی گەڕانەوەی دایکی بوو.

ئامالیا ئیڤانۆڤنا بە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو هاواری دەکرد و دەیگرماند. هەرچییەکی بەردەست بکەوتایە، فڕێی دەدایە سەر زەوی و لە هەراوهاوار نەدەکەوت. کرێگرتەکانیش هەریەکە و لای خۆیەوە کەوتبووە زریکە و هاوار. هەندێکیان لەبارەی ڕووداوەکەوە چی بە ئەقڵیاندا بهاتایە، دەیانوت. هەندێکی تریان شەڕیان دەکرد و جوێنیان دەدا، هەیشیانبوو پێدەکەنی.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لەگەڵ خۆیدا بیری کردەوە: "کاتی ڕۆیشتنی منیش نزیک بۆتەوە، با بزانین سۆنیا سمیۆنۆڤنا چی دەڵێت!"

بەم خەیاڵەوە ڕووی لە ماڵی سۆنیا کرد.

ئەگەرچی ڕاسکۆلنیکۆڤ ترس و پەژارەیەکی زۆر تایبەتی خۆی لە دڵدا بوو، وەلێ بەرگرییەکی پارێزەرانەی بەتینوتاوی لە بەرانبەر لۆژیندا لە سۆنیا کرد. لەگەڵ ئەو هەموو ئازارەی بەیانیدا دەتوت دەرفەتێکی بۆ پێش هاتووە، کە باری گرانی ئەو هەست و لێکدانەوانەی توانای بەرگەگرتنیانی نەمابوو، بیانگۆڕێت بە شادمانییەکی ڕاستەقینە، بەتایبەتی دوای ئەو پشتیوانی و بەرگریکردنە دڵسۆزانەیەی لە سۆنیای کردبوو. بێجگە لەمە، ئەو بڕیارەی بۆ بینینی سۆنیا دابووی، هەندێکجار زۆر بە سەختی دوودڵی دەکرد، چونکە دەبوو لەو بینینەدا بە سۆنیا بڵێت کێ لیزاڤێتای کوشتووە. ئەمە ئازارێکی سەختی پێدەگەیاند، لەبەر ئەوە دەستی دەنا بە ڕووی ئەو بیرۆکەیەوە و لە خۆی دوور دەخستەوە. بۆیە ئەو کاتەی کە لای کاترینا ئیڤانۆڤناوە هاتە دەرێ و وتی: "باشە، ئێستا چی دەڵێیت سۆنیا سمیۆنۆڤنا؟" دیار بوو شەوق و دەماخی سەرکەوتنەکەی بەسەر لۆژیندا هێشتا کاریگەریی بەسەرییەوە مابوو. بەڵام لەپڕێکدا و بە شێوەیەکی زۆر سەیر گۆڕا: کە گەیشتەماڵی کابرناوموف، هەستی کرد لەناکاوێکدا هێزو توانای لێبڕا، ترسی لێنیشت و تەواو شڵەژا.

بەرانبەر بە دەرگاکە وەستا، بیری کردەوە و پرسیارێکی بە خەیاڵدا هات: "ئایا پێویست دەکات بگوترێت کێ لیزاڤێتای کوشتووە؟" پرسیارێکی سەیر بوو. چونکە لەپڕێکدا و هەر لەو چرکەساتەدا، هەستی کرد نەک ناکرێت ئەوە نەگوترێت و بە نهێنی بمێنێتەوە، بەڵکو دواخستنی تا ماوەیەکی لەوە زیاتر مەحاڵە. ئەو نەیدەزانی بۆ ئەوە مەحاڵە، تەنیا هەستی پێدەکرد و ئەو هەستی نەتوانینەیش هێند

بەئازار و گران بوو، کە تا ڕادەیەک هەرەسی پێدەهێنا. بۆ ئەوەی لەوە زیاتر لەگەڵ خۆیدا بێنەوبەرە نەکات و ئازار نەچێژێت، ڕاسکۆلنیکۆڤ بەپەلە دەرگاکەی کردەوە و لەبەر دەرگاوە تەماشای سۆنیای کرد. سۆنیا کە لەو کاتەدا پاڵی دابوو بە مێزەکەوە و دانیشتبوو، دەموچاویشی لە نێو هەردوو دەستیدا شاردبووەوە، هەر کە ڕاسکۆلنیکۆڤی بینی، خێرا هەستا و پێشوازیی لێکرد. دەتوت پێشتر لە چاوەڕوانی ئەودا بووە. کە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا گەیشتە لاوەکە، بەپەلە وتی:

- ئەگەر تۆ نەبوویتایە چیم بەسەر دەهات؟

دیار بوو دەیویست هەرچی زووترە ئەوە بە لاوەکە بڵێت، هەر لەبەر ئەوەیش بوو چاوەڕێی دەکرد.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بەرەو لای مێزەکە ڕۆشت و لەسەر هەمان ئەو کورسییە دانیشت، کە تازە سۆنیا لەسەری هەستابوو. کچەکە وەک دوێنێ دوو هەنگاو لەولاوە بەپێوە وەستا.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی: ئێ، سۆنیا؟

لەپڕا هەستی کرد لەرزینێک کەوتە دەنگییەوە، بەڵام بەردەوام بوو:

- ئاخر تەواوی کێشەکە لە "باری کۆمەڵایەتیی تۆ و ئەو داب و نەریتەدایە، کە لێی دەکەوێتەوە" تۆ لە مەسەلەکە دەگەیت؟

خەفەتێکی زۆر نیشتە سەر دەموچاوی سۆنیا، قسەی بە لاوەکە بڕی و وتی:

- دیسانەوە وەک دوێنێ قسەم لەگەڵدا مەکە! تکات لێدەکەم مەیکەرەوە، من خۆم کەم دەرد و ئازارم نییە..

پاشان لە ترسی ئەوەی نەکا ڕاسکۆلنیکۆڤ سەرکۆنەکردنەکەی ئەوی پێ ناخۆش بووبێت، بەپەلە زەردەخەنەیەکی کرد و وتی:

- بێئەقڵیم کرد ئەوێم بەجێ هێشت. دەبێت لەوێ چی ڕووی دابێت؟ ویستم ئێستا بگەڕێمەوە بەڵام هەر لە بیری ئەوەدابووم کە ئێستا.. تۆ دێیت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بۆی ڕوون کردەوە کە ئامالیا ئێڤانۆڤنا سەرقاڵی دەرکردنیان بوو لە خانووەکەی و کاترینا ئێڤانۆڤنایش بە دوای "دادپەروەری و هەقیقەت"دا وێڵ بوو.

سۆنیا ناڵەیەکی لێوە هات:

- ئەی هاوار، خودایا! با زوو بڕۆین.

بەدەم قسەکانەوە مانتۆ سووکەڵەکەی خۆی بەپەلە هەڵگرت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تووڕەییەوە هاواری کرد:

- بەردەوام وایت! هەمیشە لە بیری ئەواندایت! کەمێک لەگەڵما بمێنەوە.

- ئەی کاترینا ئێڤانۆڤنا چۆن؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە بێزارییەوە وتی:

- کاترینا ئێڤانۆڤنا بەبێ تۆ کاری ناڕوات، ئێستا کە لە ماڵ چووەتە دەرەوە، خۆی دەگەڕێتەوە لات، ئەگەر لێرە نەبێت، بە کەمتەرخەمت دادەنێت..

سۆنیا بە دوودڵی و پەژارەوە لەسەر کورسییەکە دانیشت، ڕاسکۆلنیکۆڤ چاوی لە زەوییەکە بڕیبوو، بیری دەکردەوە و هیچی نەدەوت.

پاشان بەبێ ئەوەی تەماشای سۆنیا بکات، دەستی پێکرد:

- با بڵێین لۆژین نەیویست، وەلێ ئەگەر بیویستایە و بۆیشی دەچووە سەر، ئەگەر بە ڕێکەوت من و لێبزیاتینکۆفیش لەوێ نەبووینایە، تۆی لە زیندان دەنا، وانییە؟

سۆنیا بە نزمی وەڵامی دایەوە:
- وایە.
بە نیگەرانی و حەواسپەرتییەوە دووبارەی کردەوە:
- وایە!
- بەڵام بە ڕاستی دەشیا من لەوێ نەبم! لیبیزیاتینکۆفیش هەر بە ڕێکەوت هاتبووە ئەوێ.
سۆنیا هەر بێدەنگ بوو.
- باشە، ئەگەر تۆی بخستایەتە زیندانەوە، ئەوسا چی ڕووی دەدا؟ لە بیرتە دوێنێ چیم پێ گوتیت؟
سۆنیا دووبارە وەڵامی نەدایەوە، لاوەکە دوای کەمێک تێڕامان بە پێکەنینێکی کەمێک دەستکردەوە وتی:
- من وێنای ئەوەم دەکرد تۆ دیسانەوە هاوار بکەیت و بڵێیت: "ئاخ، قسە مەکە، واز بێنە!"
دیسانەوە سۆنیا وەڵامی نەدایەوە، دوای چرکەیەک ڕاسکۆلنیکۆڤ لێی پرسی:
- دیسانەوە بێدەنگی؟ ئاخر دەبێت قسەیەک بکەین، وایە؟ من حەز دەکەم بزانم تۆ چۆن، وەک لیبیزیاتنیکوف دەڵێت، دەتتوانی ئەم کێشەیە چارەسەر بکەیت؟ (ڕاسکۆلنیکۆڤ لەوەدا بوو بشڵەژێت) نا، من بە ڕاستی قسە دەکەم، سۆنیا، بیر لەوە بکەرەوە کە تۆ لە پێشەوە هەموو نەخشەکانی لۆژینت بزانیایە، واتا بڕوای تەواوت هەبووایە کە کاترینا ئیڤانۆڤنا و منداڵەکانی لەناو دەچن و تۆیش سووک و ڕسوا دەبیت. (هەرچەندە هیچ بایەخ بەمە نادەیت) هەروەها پولێچکایش.. چونکە ئەمە ڕێگەی ئەویشە، باشە، ئەگەر لە ناکاوێکدا هەموو ئەمانە بخرانایەتە بەردەم بڕیار و داوەریی تۆ: کە ئایا لۆژین بە هەموو

نامەردیی ئەنجامدانی کارە دزێوەکانییەوە بژی یان کاترینا ئیڤانۆڤنا؟
تۆ چ بڕیارێکت دەدا؟ کامیان بمرن؟ من ئەم پرسیارە لە تۆ دەکەم؟
سۆنیا بە هێمنی لێی ڕوانی، هەستی کرد لە دوای ئەم قسە بەپارێزانەوە مەبەستێکی شاراوە هەیە، کە شتێک بیری ئەم دەخاتەوە.
پاشان بە وردی لە ڕاسکۆلنیکۆڤی ڕوانی و وتی:
- من وا هەست دەکەم تۆ بتەوێت پرسیارێک بکەیت.
- زۆر چاکە، با وابێت، بەڵام لەو حاڵەتەدا تۆ چ بڕیارێکت دەدا؟
سۆنیا بە بێزارییەوە وتی:
- بۆ پرسیار لە شتێک دەکەیت کە هاتنەدیی مەحاڵە؟
- کەواتە وا چاکترە لۆژین بە زیندوویی بمێنێت و کاری نامەردی خۆی بکات! تۆ ناوێریت ئەم بڕیارە بدەیت؟
- ئاخر، من ناتوانم بزانم خوا چی دەوێت.. بۆ پرسیارێک دەکەیت کە شیاوی کردن نییە؟ ئەم پرسیارە بێمانایانە بە چ کارێک دەخۆن؟ چۆن دەبێت ئەم مەسەلەیە بەسترابێتەوە بە بڕیاری منەوە؟ ئەی کێ منی کردۆتە دادوەر تا بڵێم کێ بژی و کێ بمرێ؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ خێسەی لێکرد و وتی:
- هەڵبەت ئەگەر "خواستی خوا" بێتە ئاراوە، هیچمان بۆ ناکرێت.
سۆنیا ناڵەیەکی سوێدارانەی کرد و وتی:
- بێپەردە بیڵێ، چیت دەوێت؟ دیسان تۆ دەتەوێت شتێک بڵێیت. ئایا هەر بۆ ئەوە هاتوویت ئازارم بدەیت؟
لەوە زیاتر خۆی نەگرت و دایە پڕمەی گریان.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە خەمێکی زۆرەوە تەماشای کرد، پێنج دەقیقە تێپەڕی، پاشان لەسەرخۆ وتی:
- دەزانیت سۆنیا تۆ ڕاست دەکەیت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لەپڕێکدا گۆڕا، شێوازە زبر و ناخۆشەکەی نەما، تەنانەت دەنگیشی تەواو کز بوو.

- من دوێنێ خۆم پێم وتیت کە ئەگەر بێم بۆ لات، لەبەر ئەوە نییە داوای لێبووردنت لێبکەم، وەلێ ئێستا تا ڕادەیەک وام دەست پێکردووە هەر دەڵێی داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم، من کە باسی لۆژین و خواستی خودام کرد، باسی خۆم کرد.. لە ڕاستیدا داوای لێخۆشبوونم کرد. سۆنیا.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ویستی زەردەخەنەیەک بخاتە سەر لێوی، بەڵام زەردەخەنەکە بێڕەونەق و لاواز خۆی نواند. سەری داخست و دەموچاوی نایە ناو هەردوو دەستییەوە.

لەپڕێکدا هەستێکی نائارامی و ڕقێکی چاوەڕواننەکراوی بەرانبەر بە سۆنیا تێگەڕا. پێدەچوو خۆیشی سەیری لەو هەستە سامناکە هاتبێت. خێرا سەری بەرز کردەوە و لە سۆنیا ڕاما، بەڵام نیگاکەی بەرانبەری نیگایەکی نیگەران و پڕ لە میهرەبانی بوو، نیگایەک هەستی خۆشەویستیت تیا بەدی دەکرد. ڕقەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ وەک خەونێک توایەوە. لەوانەیە ئەو هەستەی هەر نەبووبێت و بە هەڵە لەگەڵ هەستێکی تردا لێی تێک چووبێت، ئەمەیش مانای ئەوەیە وەختی چرکەساتەکە گەیشتبێت.

دیسانەوە ڕاسکۆلنیکۆڤ سەری داختستەوە و دەموچاوی لە ناو هەردوو دەستیدا شاردەوە. لەپڕێکدا ڕەنگی هەڵبزڕکا، لەسەر کورسییەکە هەستا، سەیری سۆنیای کرد و بێ ئەوەی هیچ بڵێت، خۆنەکردانە لەسەر قەرەوێڵەکەی دانیشت.

ئەو چرکەساتە لە هەستی ڕاسکۆلنیکۆڤدا بە تەواوی لەو چرکەساتەی دەکرد، کە تەورەکەی لە بەرەزوانەکە کردەوە، لە پشت سەری

پیریێژنەکەوە وەستا و هەستی کرد کە "ئیتر نابێت چرکەیەک بە فیرۆ بدات"
سۆنیا کە زۆر ترسا بوو، لێی پرسی:
- چیتە؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ توانای وەڵامدانەوەی نەبوو، هەرگیز ئەوەی بە بیردا نەدەهات مەبەستەکە بەم جۆرە "ئاشکرا" بکات، خۆیشی نەیدەزانی ئێستا چی بەسەر دێت.
سۆنیا بەهێوری لێی نزیک کەوتەوە، لەسەر قەرەوێڵەکە لە پاڵیا دانیشت، بێ ئەوەی چاوی لێبتروکێنێت چاوەڕوانیی کرد، دڵی بە جۆرێک لێی دەدا، لەوەدا بوو بتەقێت، بەرگەگرتنی ئەو حاڵەتە مەحاڵ بوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕووە هەڵبزرکاو و مردووئاساکەی، کە ڕەنگی مردووی لێنیشتبوو کردە سۆنیا. لێوی بەبێ خۆکرد لار دەکەوت و دەیویست شتێک بڵێت، ترس تەواو دەستی بەسەر سۆنیادا کێشا، لەسەرخۆ لێی تەکییەوە و وتییەوە:
- تۆ چیتە؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ وەک یەکێک وڕێنە بکات و ئاگای لە خۆی نەبێت، کەوتە منەمن:
- هیچ، سۆنیا، مەترسە.. هیچ نییە! بە ڕاستی هەروا ئەبێت ئەگەر دادوەرییەکی ڕاستەقینە بکەین..
لەپڕێکدا چاوی لە سۆنیا بڕی و وتی:
- باشە بۆ من تەنیا بۆ ئەوە هاتووم ئازاری تۆ بدەم؟ بەڕاست بۆ؟ من بەردەوام ئەم پرسیارە لە خۆم دەکەم، سۆنیا..

ڕەنگە پێش چارەکەسەعاتێک ئەو پرسیارەی لە خۆی کردبێت، بەڵام ئێستا ئەم قسانە لەوپەڕی بێتوانایی و بێئاگاییدا دەکات. لەرزێکی بەردەوامییش تەواوی جەستەی داگرتبوو.

سۆنیا هاودەردیی کرد و لێی ڕوانی، پێی وت:

- ئەم ئازارە چییە تۆ دەیچێژیت!

- هەمووی بێمانایە!.. دەزانیت سۆنیا (لە ناکاوێکدا زەردەی هاتێ، زەردەخەنەیەکی کاڵ و بێتین کە یەک دوو چرکەساتی خایاند) لە بیرتە دوێنێشەو دەمویست چیت پێبڵێم؟

سۆنیا بە نیگەرانییەوە چاوەڕێ ما.

- ئەو کاتەی دەڕۆیشتم، وتم ڕەنگە ماڵئاواییەکی هەتاهەتاییت لێبکەم. وەلێ ئەگەر بێم بۆ ئێرە. پێت دەڵێم.. کێ لیزاڤیتای کوشتووە.

سۆنیا لەپڕا هەموو لەشی کەوتە لەرزین.

- باشە، وا ئێستا هاتووم ئەوەت پێبڵێم.

سۆنیا بەبێ ئارامی لەبەر خۆوە وتی:

- کەواتە تۆ دوێنێشەو بە ڕاستی..

بەڵام وەک لەپڕا هاتبێتەوە سەرخۆی، بەپەلە پرسی:

- تۆ لە کوێ دەزانیت؟

هەناسەی بە زەحمەت دەدا و ڕەنگی تادەهات زیاتر هەڵدەبزڕکا،

- دەزانم.

سۆنیا دەقیقەیەک بێدەنگ بوو، پاشان بە ترسەوە پرسی:

- بۆ ئەو کەسەیان گرتووە؟

- نا، نەیانگرتووە.

دیسانەوە سۆنیا بە دەنگێکی زۆر کزەوە، دوای کەمێک پرسی:

- ئەی کەواتە تۆ چۆن دەیزانیت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ ئاوڕی لێدایەوە و جوان لێی ڕاما، بە زەردەخەنە لاواز و کەچەکەی پێشوویەوە وتی:

- هەڵیبێنە.

مووچرکێک بە جەستەی سۆنیادا گەڕا، پاشان زەردەیەکی منداڵانەی هاتێ و وتی:

- ئاخر تۆ بۆ.. تۆ بۆ ئەوەندە من دەترسێنیت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە هەر تەماشای دەموچاوی سۆنیای دەکرد و دەتوت ناتوانێت چاوی لێبتروکێنێت، لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:

- دیارە من و "ئەو کەسە" زۆر هاوڕێین.. ئەوەی من بیزانم، ئەو نەیدەویست لیزاڤێتا بکوژێت.. بە ڕێکەوت لیزاڤێتای کوشت، ئەو دەیویست تەنیا پیرێژنەکە بکوژێت.. ئەو کاتەی کە بە تەنیایە.. بەڵام لەپڕێکدا لیزاڤێتا گەیشت و.. ئەویشی کوشت.

دەقیقەیەکی زۆر ترسناک تێپەڕی، هەردووکیان لە یەکدی ڕامابوون، ڕاسکۆلنیکۆڤ پرسیارێکی لێکرد وەک لە قەڵایەکەوە خۆی فڕێ دابێتە خوارێ، وابوو:

- ناتوانیت هەڵیبێنیت ئەو کەسە کێیە؟

سۆنیا بە دەنگێکی زۆر نزم لەبەر خۆوە وتی:

- ن.. نا.

- باشە، بڕوانە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ دوای قسەکان، سەرلەنوێ هەستە کۆنینەکەی ئاشنای لەپڕێکدا ڕۆحی تەزاند. لە سۆنیای دەڕوانی، وەلێ لەپڕێکدا لە دەموچاوی سۆنیادا سیمای لیزاڤێتای بینییەوە. ئەو چرکەساتەی دەموچاوی لیزاڤێتا بە چاکی هاتەوە بیر، کە بە تەورەکەیەوە لێی نزیک کەوتەوە، ئەو لە ترسا خۆی پەنادایە لای دیوارەکە و هەردوو

دەستی بۆ پێشەوە درێژ کرد، زۆر چاکی لە بیرە، لە دەموچاوی لیزاڤێتادا ترسێکی منداڵانەی بینی، وەک سیمای دەموچاوی ئەو منداڵانەی لەپڕێکدا لە شتێک بترسن، بە ناڕەحەتییەوە لەو شتە ترسناکە بڕوانن و خۆیان بخەنە لاوە، دەستە بچووکەکانیان بۆ پێشەوە درێژ بکەن و لەوەدا بێت بگرین. تا ڕادەیەک ئێستا سۆنیا لە هەمان ئەو حاڵەتەدا بوو. بە هەمان بێتوانایی و ترسولەرزەوە، ماوەیەک لە ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕاما، لەپڕا دەستی چەپی بۆ پێشەوە درێژ کرد، کەمێک پەنجەی بەسەر سنگی ڕاسکۆلنیکۆڤدا هێنا، بە هێوری لەسەر تەختەکە هەستا، وردەوردە لێی دوور کەوتەوە و چاوی بە تیژی تێبڕی. لەپڕێکدا ترسەکەی سۆنیا لە ڕاسکۆلنیکۆڤیش نیشت، هەر هەمان ئەو ترسەی ئەو، ڕاسکۆلنیکۆڤیش لای خۆیەوە لە سۆنیا ڕاما، تا ڕادەیەک هەمان زەردەخەنە منداڵانەکە بە دەموچاوی ئەویشەوە دەرکەوت، سەرئەنجام لەژێر لێوەوە وتی:

- هەڵت هێنا؟

- خودایا!

ئەم وشەیە بە ئاهێکی ترسناکەوە لە سنگی سۆنیا هاتە دەری، کچەکە توانای لێبڕا، کەوتە سەر قەرەوێڵەکە و ڕووی لە سەرینەکەدا ون بوو. بەڵام دوای چرکەیەک بەپەلە هەستا و خێرا لە ڕاسکۆلنیکۆڤ نزیک بووەوە، هەردوو دەستی گرت، بە قامکە باریکەکانی وا کەوتە گوشینیان، دەتوت لە مەنگەنەدان، دیسانەوە بێجووڵە، وەک لە جێگاکەیدا بزمارکوت کرابێت. لە دەموچاوی ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕامایەوە. بەو ڕامانە پڕ لە نائومێدییەوە دەیویست لە ئاواتێکی خۆی بگەڕێت و بیدۆزێتەوە. بەڵام هیچ ئاواتێکی بەدی نەکرد. هیچ گومانێک نەما. هەر ئەوە بوو کە بۆی چووبوو. تەنانەت لە دواییدا، کاتێک کە سۆنیا ئەو

چرکەساتەی بیر دەکەوتەوە، حاڵەتێکی سەیر و سەرسووڕهێنی تووش دەهات: چۆن یەکسەر لەوە گەیشتبوو کە ئیدی گومانی تیا نەماوە؟ ئەوێک نەیدەتوانی بڵێ لەوەوبەر هەستێکی لەو بابەتەی تێگەڕاوە، کەچی کە ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەوەی پێوت، لەپڕێکدا وای هاتەبەر چاو کە پێشتر ئەوە بەدڵیدا ختوورەی کردووە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ وەک بلاڵێتەوە وتی:
- بەسە سۆنیا، بەسە! ئازارم مەدە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ هەرگیز بەو نیازە نەبوو کە ئاوا دان بە مەسەلەکە دابنێت، هەرگیز، بەڵام وا کەوتەوە.
سۆنیا کە دەتوت ئاگای لە خۆی نەماوە، لە جێگاکەی هەستا، بەدەم هەڵگڵۆفتنی توندی دەستییەوە گەیشتە ناوەڕاستی ژوورەکە، بەڵام بەپەلە گەڕایەوە و لە پاڵیا دانیشت، بە جۆرێک لەوەدا بوو شانی بە شانییەوە بنووسێت. لەپڕا وەک یەکێکی ئەنگێوراو لەرزی، قیژاندی و بەبێ ئەوەی هۆیەکەی بزانێت، لە بەردەم ڕاسکۆلنیکۆڤدا کڕنووشی برد. وتی:
- چیت کردووە، چیت بە خۆت کردووە؟
پاشان ڕاست هەستایە سەر پێ و ئاوێزانی گەردنی بوو، لە ئامێزی گرت و توند ب ەخۆیەوە نووساند.
ڕاسکۆلنیکۆڤ سڵەمییەوە و چووە دواوە، تەماشای کرد و زەردەخەنەیەکی خەمگینانەی هاتە سەر لێو.
- تۆ زۆر سەیریت، سۆنیا! لە ئامێزم دەگریت و ماچم دەکەیت، هەر تەواو لەو کاتەیشدا کە من باسی "ئەو شتەم" بۆ کردیت. تۆ هەرگیز نازانیت چی دەکەیت!
- نا، نا، لەم دنیایەدا کەس ئێستا لە تۆ داماوتر نییە!

بێ ئەوەی گوێی لە سەرنجەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ بێت، لە کاتی تەواو هەڵچوونیدا ئەو ڕستەیەی وت، وەک ئەوەی هیچ ئاگای لە خۆی نەمابێت و یەکسەر بە کوڵ کەوتە گریان. هەستێک کە ماوەیەکی زۆر بوو ڕاسکۆلنیکۆڤ ئاشنایەتیی لەگەڵیدا نەمابوو، وەک شەپۆلێکی بەتاو پەلاماری دڵی دا و زوو نەرمی کرد. ڕاسکۆلنیکۆڤ بەرگەی ئەو هەستەی نەگرت و دوو دڵۆپ فرمێسک بە برژۆڵییەوە قەتیس ما. پاشان بە ئومێدەوە تەماشای سۆنیای کرد و وتی:

- کەواتە سۆنیا دەستبەردارم نابیت؟

سۆنیا هاواری کرد:

- نا، نا، نا، هەرگیز، لە هەر شوێنێک بیت دەکەومە دوات. هەر شوێنێک! خودایا! وای لە منی بەدبەخت! ئاخر، بۆ پێشتر من تۆم نەناسی! بۆ زووتر نەهاتیتە ئێرە؟ ئای خودایا!

- وا ئێستا هاتووم.

دەتوت سۆنیا ئەقڵی لەدەست داوە، دیسانەوە دەستی لە مل کردەوە:

- ئێستا! ئێستا چی بکەین!.. پێکەوە، لەگەڵ تۆدا دێم بۆ زیندان.

وەک لە ناکاودا دەماری ڕاسکۆلنیکۆڤت ڕاکێشابێت. زەردەخەنەیەکی بێزاری پڕ لە لەخۆباییبوونی جارانی کەوتەوە سەر لێو، وتی:

- سۆنیا، ڕەنگە من هێشتا حەزم لە چوونەزیندان نەبێت.

سۆنیا تەماشایەکی خێرای کرد.

دوای ئەوەی لە ناکاوێکدا سۆنیا هاوسۆزی خەم و ئازاری ئەو مرۆ بەدبەختەی کرد، وا جارێکی دی بیری ترسناکی کوشتن لە پەڕەی دڵی دایەوە. لە گۆڕانی تۆنی دەنگی ڕاسکۆلنیکۆڤدا لەپڕا دەنگی پیاوکوژێکی بیست و بە سەرسامییەوە لێی ڕاما. ئەو تا ئێستا نەیدەزانی چۆن و لەبەرچی ئەو کارەی کردووە. وا ئێستا تێکڕای

هەموو ئەو پرسیارانە پێکەوە لە هەستیدا هەڵگیرسان، دیسان باوەڕی نەکرد کە "ئەو، دەکرێت ئەو پیاوکوژبێت! باشە ئاخر شتی وا دەبێت؟" سۆنیا کە پێدەچوو هێشتا نەهاتبێتەوە سەرخۆی، بەوپەڕی سەرسامییەوە وتی:

- یانی چی؟ من لە کوێم! باشە چۆن تۆ.. توانیت ئەم بڕیارە بدەیت؟.. یانی بۆ!

ڕاسکۆلنیکۆڤ دەنگی شەکەتیی لێدەچۆڕا و تا ڕادەیەکیش بە بێزارییەوە وتی:

- دیارە، بۆ دزین! لێمگەڕێ، سۆنیا!

سۆنیا بەوپەڕی سەرسامییەوە لە شوێنەکەیدا چەقی بوو، بەڵام لەپڕا هاواری کرد:

- برسیت بوو! تۆ.. بۆ ئەوەی یارمەتی دایکتی پێبدەیت؟ ها؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ سەری داخست و بۆ لایەکی تر ڕووی وەرگێڕا و بە هێوری وتی:

- نا، سۆنیا، نا! من ئەوەندە برسیم نەبوو.. من، لە ڕاستیا دەمویست یارمەتی دایکم بدەم. بەڵام.. ئەمەیش تەواو ڕاست نییە.. سۆنیا، ئازارم مەدە.

سۆنیا دەستی ڕاوەشاند و وتی:

- باشە دەبێت هەموو ئەمانە ڕاست بن! خودایا، ئەمە چ جۆرە ڕاستیەکە! کێ دەتوانێت بڕوا بەمە بکات؟.. تۆ کە هەموو شتێکی خۆت بە خەڵکی دەبەخشیت، چۆن بۆ دزی خەڵک دەکوژیت؟

پاشان هاواری کرد:

- ئایی! کەواتە ئەو پارەیەی بە کاترینا ئیڤانۆڤنات دا.. ئەو پارەیە.. خودایا.. ئەو پارەیەیش..

ڕاسکۆلنیکۆڤ بەپەلە قسەکانی پێبڕی:
- نا، سۆنیا، لێرەدا بوەستە، ئەم پارەیە لەو پارانە نەبوو، ئەم پارەیە دایکم بە هۆی بازرگانێکەوە بۆی ناردبووم، ئەو کاتە نەخۆش بووم، هەر ئەو ڕۆژەی کە پارەکەم پێگەیشت، دامێ، ڕازومیخین شایەتە.. ئەو پارەیە هی من بوو، هی خۆم، بەهەق هی خۆم بوو.
سۆنیا بە سەرسامییەوە گوێی لێگرتبوو، بە هەموو توانایەوە هەوڵی دەدا لە شتێک تێبگات.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەرخۆ و لە حاڵەتی بیرکردنەوەدا وتی:
- وەلێ پارەکەی تر.. من تەنانەت نازانم پارەی لێبوو یان نا، من لەو کاتەدا کیفی پارەکەم لە ملی کردەوە.. کیفێکی پێستە بوو، پڕ بوو.. زۆری تێئاخنرابوو. بەڵام من تەماشای ناوەوەیم نەکرد، دیارە پەلەم بووە، وەلێ شتەکان دوگمە و سەردەست و زنجیر بوو. هەموو ئەوانەم لەگەڵ کیفی پارەکەدا، لە حەوشەیەکدا کە نایناسمەوە، لە شەقامی "و..." خستمە ناو چاڵێکەوە، لەژێر بەردێکدایە، ئێستایش هەموو شتەکان هەر لەوێدان.
سۆنیا زۆر بە وردی گوێی گرتبوو، پاشان خێرا، وەک بیەوێت دوائومێدی لەدەست نەچێت، پرسی:
- باشە بۆ.. ئەی چۆن دەڵێی بە مەبەستی دزی کوشتووتە، لە کاتێکدا کە خۆت هیچت لێهەڵنەگرتووە؟
- نازانم.. هێشتا بڕیاری ئەوەم نەداوە ئەو پارانە هەڵبگرم یان نا!
ڕاسکۆلنیکۆڤ وشەکانی بە جۆرێک دەوت، وەک ئەوەی لە بیرکردنەوەیەکی سەختا بێت، پاشان هاتەوە سەر خۆی، زوو زەردەخەنەیەکی کرد و لەسەر قسەکانی ڕۆشت:
- ئەمە چ گەوجایەتییەک بوو من ئێستا کردم، ها؟

بیرێک بەسەری سۆنیادا تێپەڕی: "تۆ بڵێی شێت نەبێت؟" بەڵام زوو لە سەری خۆی دەرکرد. نا، مەسەلەکە شتێکی ترە، شتێک کە هیچ کەس تێی ناگات.

لەپڕێکدا ڕاسکۆلنیکۆڤ زۆر بە گەرمی وتی:

- دەزانیت سۆنیا، دەزانیت دەمەوێت چیت پێبڵێم: ئەگەر تەنیا لەبەر ئەوە کوشتبێتم کە برسیم بووە (ڕاسکۆلنیکۆڤ جەختی لەسەر هەر وشەیەک دەکرد، نیگایەکی پڕ لە ڕاز بەڵام ڕاستگۆیانەی لە سۆنیا دەگرت) ئێستا.. بەختەوەر بووم. ئەمە بزانە.

دوای کەمێک ناڵەیەکی نائومێدانەی کرد و وتی:

- بەڵام بە تۆ چی، ئەم مەسەلەیە چ سوودێکی بۆ تۆ هەیە. ئاخر بە کەڵکی چی تۆ دێت تەنانەت ئەگەر دان بەوەدا بنێم کە کارێکی خراپم کردووە؟ باشە، ئەم سەرکەوتنە گەمژانەیەی تۆ بەسەر مندا چی بۆ تۆ دەکات؟ ئاخ سۆنیا، بۆچی من بۆ ئەم شتانە هاتوومەتە لای تۆ؟

سۆنیا ویستی شتێک بڵێت و بێدەنگ بوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:

- بۆیە دوێنێشەو داوای هاتنم لێکردیت، چونکە ئیدی بێجگە لە تۆ کەسم نەماوە.

- بۆ کوێ بێم؟

- مەشڵەژێ، بۆ دزی و کوشتن نا، من و تۆ دوو کەسی جیاوازین.. دەزانیت سۆنیا، من ئێستا، هەر ئێستا لەوە گەیشتم کە دوێنێشەو بۆ کوێم بانگ دەکردیت. دوێنێشەو نەمدەزانی بۆ کوێت بانگ دەکەم. تەنیا لەبەرشتێک داوام لێدەکردیت و هەر بۆ ئەوەیش هاتبووم: سۆنیا، بە تەنیا جێم مەهێڵە. جێم دێڵیت؟

سۆنیا دەستی ڕاسکولنیکۆڤی گوشی.

دوای دەقیقەیەک ڕاسکۆلنیکۆڤ بەوپەڕی خەم و نائومێدیەوە، لە کاتێکدا کە بە قووڵی لە سۆنیا ورد دەبووەوە، هاواری کرد:

- باشە بۆ، بۆچی پێموت، بۆ کارەساتەکەم بۆ گێڕایەوە! تۆ، سۆنیا چاوەڕێی پاساوی منی، دانیشتویت و چاوەڕێ دەکەیت، من ئەمە دەبینم، بەڵام چیت پێبڵێم؟ ئاخر، تۆ شتێک لەو کێشەیە تێناگەیت، تەنیا ئەوەیە کە ئازار دەچێژیت.. ئەویش لەبەر من. باشە، بڕوانە، تۆ دەگریت و پاشان لە ئامێزی خۆتم دەگریت، بۆ لە ئامێزم دەگریت؟ چونکە نەمتوانی خۆم بە تەنیا بەرگەی ئەو نەهامەتییە بگرم و هاتووم بارە قورسەکە لە ئەستۆی یەکێکی تر بنێم. "تۆیش ئازار بچێژە، من ئاسوودەتر دەبم" ئایا تۆ دەتوانیت بەدکارێکی ئاوات خۆش بوێت؟

سۆنیا هاواری کرد:

- بۆ تۆ خۆیشت ئازار ناچێژیت؟

دیسانەوە هەمان هەستوسۆز وەک شەپۆلێک بەسەر دڵی ڕاسکۆلنیکۆڤدا هات و بۆ چرکەساتێک دڵی نەرم بوو.

- سۆنیا، من دڵێکی خراپم هەیە، ئەمە بزانە، گەلێک شت هەن لەمەوە ڕووناکییان دەچێتە سەر، هەر لەبەر ئەو خراپییەی خۆیشمە کە هاتوومەتە لات و تووڕەم، بێگومان کەسانێک هەن لە حاڵێکی وادا هەرگیز ناچنە لای کەسی تر. بەڵام من ترسنۆک و.. بەدم! بەهەرحاڵ، ئەمانە گرنگ نین.. دەبێت ئێستا قسەی خۆم بکەم، بەڵام نازانم لە کوێوە دەست پێبکەم..

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەستاو کەوتە ناو دنیای بیرکردنەوەوە، پاشان سەرلەنوێ هاواری کردەوە:

- بەداخەوە من و تۆ دوو کەسی جیاوازین، هەرگیز لە یەکدی ناگەین، بە ڕاستی نازانم بۆ، بۆ هاتم بۆ ئێرە! هەرگیز لە خۆم خۆش نابم، سۆنیا وتی:
- نا، نا، چاکت کرد هاتیت، باشترە من بیزانم! زۆر باشترە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە مەراقەوە لێی ڕوانی، لەوە دەچوو بیری لە شتێک کردبێتەوە، وتی:
- ڕەنگە شتەکە وابووبێت، هەر بە ڕاستی وابوو، دەزانیت، من ویستم ببم بە ناپلیۆن، بۆیە کوشتم.. باشە، ئێستا تێدەگەیت؟
سۆنیا لە ڕووی سادەیی خۆی و بە شەرمەوە کەوتە ورتەورت:
- نـ.. نا، بەڵام تۆ قسەکەت بکە..
جەختی لەسەر وتەکانی کرد:
- .. بیلێ! تێی دەگەم، لە ناخەوە تێی دەگەم.
- تێدەگەیت؟ زۆر باشە، با بزانین.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەنگ بوو، ماوەیەک دالْغەی لێدا و ئەوسا وتی:
- ئەوەی مایەی پێکەنینە، ئەوەیە من جارێکیان پرسیارێکم لە خۆم کرد کە: ئەگەر بۆ نموونە ناپلیۆن لە شوێنی من بووایە، لە سەرەتای ژیانیدا و بۆ بەدەستهێنانی شکۆ و گەورەیی نە ڕێگەی تولۆن و میسر، نە تێپەڕین بە چیای موبلانی لەبەر بگرتایە، بەڵکو لەباتیی هەموو ئەو شتە جوان و مەزنانە تەنیا و تەنیا پیرێژنێکی بکوشتایە، ژنێکی قێزەونی سەلەمخۆری هیچوپووچ هەر بۆ ئەوەی دەست بەسەر پارەی ناو سندووقەکەیدا بگرێت -ئەمەیش بۆ ئەوەی کە دەرگا لەسەر ژیانی ئاییندەی خۆی بکاتەوە، تێدەگەیت؟ ئایا ئەوسا ئەو کارەی دەکرد، ئەگەر هیچ دەروویەکی تری نەدیبایە؟ ئایا هەستی بە تەریقی و بێئابڕوویی نەدەکرد چونکە ئەو ڕێگەچارەیە گەلێک

ڕسواییە و دوورە لە جوامێریی و.. تاوانیشە؟ باشە، دەبێت پێت بڵێم کە لەسەر ئەو "پرسیارە" ماوەیەکی زۆر ئازارم چەشت، بە جۆرێک گەلێک شەرمەزار بووم کاتێک لەپڕێکدا گەیشتمە ئەوەی – ئەمەیش زۆر کتوپڕ بوو– کە ناپلیون نەک تەنیا خەجاڵەت نەدەبوو، بەڵکو هەرگیز ئەوەی بە بیردا نەدەهات کە ئەمە کارێکی بەنرخ نەبێت.. تەنانەت سەریشی لەوە دەرنەدەکرد کە بۆ دەبێت ئەم کارە سووک و ڕسوایی بەدوا بێت؟

بێگومان ئەگەر ڕێگەچارەی تری لەبەردەستا نەبووایە، ئەویش ئەو پیرێژنەی دەکوشت. باشە، منیش لەو دوودڵییە هاتمە دەرێ و کوشتم.. وەک پەیڕەویکردن لە خاوەن دەسەڵاتێک، ئیتر بەسەرهاتەکە وابوو، پێکەنینت پێدێت؟ بەڵێ، سۆنیا، ڕەنگە لێرەدا لە هەموو سەیرتر ئەوە بێت کە بەسەرهاتەکە بەم شێوەیە ڕووی داوە..

بەڵام سۆنیا بە هیچ جۆرێک پێکەنینی نەدەهات، بە دەنگێکی زۆر نزم و شەرمنتر لە پێشوو، وتی:

– وا چاکە کورت و پوخت مەسەلەکەم بۆ باس بکەیت، ئیتر پێویست بە نموونەهێنانەوە و ئەمسەروئەوسەر ناکات.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ئاوڕی لێدایەوە، نیگایەکی خەمبارانەی کرد و دەستی گرت.

– لەمەیشدا تۆ ڕاست دەکەیت سۆنیا، ئەمانە هەموو قسەی بێمانا و تا ڕادەیەک وڕێنەی ڕووتن! بڕوانە، تۆ دەزانیت کە ئیدی تا ڕادەیەک دایکم هیچی نییە، خوشکم ڕێکەوت ڕووناکبیری کردووە و بە ناچاری لە ناو خێزانەکاندا دادەیی دەکات. تاقە ئومێدێکی ئەوان من بووم. من دەمخوێند، وەلێ نەمدەتوانی خەرجیی زانکۆ پەیدا بکەم، بۆیە ناچار بووم بۆ ماوەیەک واز لە خوێندن بهێنم. ئەگەر کارەکە ئاسایی

برۆیشتایە، دوای دە، یان دوانزە ساڵ –ئەگەر هەموو شتێک بە باشی بەڕێوە بچوایە– لە دواییدا دەبوومە مامۆستا یان کارمەندێک و مانگانە هەزار ڕۆبڵ مووچەم وەردەگرت.. –دەتوت ڕاسکۆلنیکۆڤ پێشتر قسەکانی لەبەر کردووە– بەڵام تا ئەو کاتە دایکم لە داخ و خەفەتا دەمرد، منیش بە هیچ جۆرێک نەمدەتوانی ئاسوودەی بکەم. وەلێ خوشکم، ڕەنگە ئەو لە دایکم خراپتری بەسەر بهاتایە!.. باشە ئەمە پێی دەڵێن چی مرۆڤ هەموو تەمەنی نەبوونی بێت و بە لای هەر شتێکدا بڕوات، ڕووی لێوەربگێڕێت، دایکی فەرامۆش بکات، سووکایەتییەک کە بە خوشکی دەکرێت، بەوپەڕی ڕێزەوە قبووڵی بکات؟ ئەمە بۆ؟ ئایا بۆ ئەوەی دوای بەخاکسپاردنی ئەوان، کەسانێکی تری وەک ژن و منداڵ پێک بهێنێت و پاشان ئەوانیش بە هەژاری و بەبێ تیکەیەک نان بەجێ بهێڵێت؟ باشە.. باشە.. منیش بڕیارم دا، دوای ئەوەی پارەی پیرێژنەکەم دەست دەکەوێت، لە ساڵەکانی بەرایی خوێندنمدا خەرجی بکەم، بەبێ ئەوەی ئەرکی خوێندنی زانکۆم بخەمە ئەستۆی دایکم، هەروەها هەندێکی تری ئەو پارەیە لە یەکەم هەنگاوی ژیانی دوای زانکۆدا، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و بنەمایەکی فراوان بەکار بهێنم. واتا کار و کردەوەی ئاییندەم بە جۆرێک ڕێک بخەم، کە بتوانم ژیانێکی ئازاد و تازە بۆ خۆم بڕەخسێنم. باشە، ئەمە هەموو شتێکە.. دەی، بەو جۆرە پیرێژنەکەم کوشت، ئەمە کارێکی خراپ بوو من کردم.. بەڵام.. ئەمەندە بەسە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە شەکەتی کۆتایی بە چیرۆکەکە هێنا، پاشان سەری داخست.

سۆنیا بە خەمگینییەوە هاواری کرد:

- ئاخ. ئەمە ڕاست نییە، ڕاست نییە، باشە، دەبێت شتی وا بکرێت.. نا، وانییە، وانییە.

- دەبینیت کە خۆت دەڵێیت وانییە! بەڵام من ڕاستوڕەوان پێم وتیت، هەقیقەتەکە چۆنە، وا.

- ئاخر ئەمە چ جۆرە هەقیقەتێکە! ئاخ خودایا!

- سۆنیا، من تەنیا ئەسپێیەکم کوشتووە، ئەسپێیەکی پیس و زیانبەخش.

- بۆ مرۆڤ ئەسپێیە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ تەماشایەکی سەیری کرد و وەڵامی دایەوە.

- خۆیشم دەزانم ئەو ئەسپێ نەبوو.

پاشان لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

- من درۆ دەکەم، سۆنیا، ماوەیەکە درۆ دەکەم.. مەسەلەکە ئەمە نییە، تۆ ڕاست دەکەیت، سۆنیا. کارەکە ئەنگیزەی زۆر تری لە دواوەیە، سۆنیا، من ماوەیەکی زۆرە لەگەڵ کەسدا نەدواوم.. ئێستا سەرم زۆر دێشێت.

چاوی ڕاسکۆلنیکۆڤ لە ئاگری تادا داگیرسابوو، تا ڕادەیەک کەوتبووە وڕێنەکردن، زەردەخەنەیەکی نیگەرانی بەسەر لێویدا دەهات و دەچوو. لەو حاڵەتە دەروونییە شپرزەیەدا، شەکەتییەکی سەختی پێوە دەبینرا.

سۆنیا دەیزانی سنووری ئازارکێشانەکەی چەندە زۆرە. سەری ئەویش گێژی دەخوارد. ڕاسکۆلنیکۆڤ بە شێوەیەکی زۆر سەیر قسەی دەکرد! وەک ئەوەی وردەوردە مەسەلەکان بکەونە ڕوو.

"بەڵام.. چۆن دەبێت، چۆن! ئای خودایا!" سۆنیا لە داخ و نائومێدیدا بە جۆرێک دەستی هەڵدەگلۆفت، وەک بیەوێت بیانشکێنێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەک بە گۆڕانی بیروباوەڕی خۆی سەرسامی دایگرتبێت، لەپڕێکدا سەری بڵند کرد و کەوتەوە قسە:
- نا، سۆنیا، وانییە، کارەکە بەو جۆرە نییە، وا چاکە.. تۆ گریمانەکە وا بکە -بەڵێ ئەمەیان چاکترە- تۆ وای دابنێ من کابرایەکی لەخۆباییم، ئیرەیی دەبەم، تووڕەم، نامەردم، ڕکاویم و تۆڵەکارم و.. تەنانەت شتێک لە شێتیەتیم تێدایە- لێگەڕێ با هەموو شتێکت یەکژەمی پێبڵێم، لەبارەی شیمانەی شێتیەتیی منەوە، پێشتریش هەندێک شتیان دەوت و من پێم دەزانی.. - ئێستایش پێم وتیت من خەرجیی زانکۆم بۆ دابین نەدەکرا. بەڵام دەزانیت، ڕەنگە بمتوانیایە خوێندنەکەم تەواو بکەم؟ ڕەنگە دایکم بیتوانیایە پێویستییەکانی زانکۆی بۆ بناردمایە و خۆیشم خەرجیی خواردن و جلوبەرگم پەیدا بکردایە. بێگومان دەمتوانی! وانەم دەوتەوە و بۆ هەر وانەیەک نیو ڕۆبڵم وەردەگرت. ڕازومیخینیش وای دەکرد. بەڵام من سواری سەری خۆم بووم و نەمکرد، بە ڕاستی "سواری سەری خۆم بووم" پڕ بە پێستی خۆیەتی. ئیتر وەک جاڵجاڵۆکە خزامە سووچەکەی خۆمەوە. تۆ هێلانەکەمت دیبوو، هاتوویت. تۆ دەیزانیت، سۆنیا، بنمیچی نزم و ژووری تەنگ چەندە ڕۆح و ئەقڵی مرۆڤ بە تەنگ دێنێت! ئای چەندە لەو ژوورە بێزار بووم! لەگەڵ ئەوەیشدا نەمدەویست لێی بڕۆمە دەرێ. هەر بە تایبەتی نەمدەویست بچمە دەرێ، بە درێژایی ڕۆژ دەرنەدەچووم و کاریشم نەدەکرد. تەنانەت حەزی خواردنیشم نەمابوو، هەر بۆ خۆم ڕادەکشام، ئەگەر ناستاسیا شتێکی بهێنایە دەمخوارد، ئەگەر نەیشیهێنایە هەر بە برسیەتی ڕۆژەکەم بەسەر دەبرد، هەر لە داخا داوام نەدەکرد! شەوانە بە تاریکی دادەنیشتم، چونکە پارەی مۆمێکم پەیدا نەدەکرد، کە ژوورەکە ڕووناک بکاتەوە. دەبوو وانەکانم ئامادە

بکەم، بەڵام کتێبەکانم فرۆشتبوو، لەسەر مێزەکەم، یاداشتەکانم، دەفتەرەکانم تا ئێستایش لە تەپوتۆزدان و قامکێک خۆڵیان لەسەرە. من زیاتر ئەوەم پێ خۆش بوو ڕابکشێم و بیر بکەمەوە، بەردەوام بیرم دەکردەوە.. بەردەوام خەونم دەبینی، خەونی سەیروسەمەرە، ناهێنێت باسیان بکەم! بەڵام ئەوسایش، وام دەهاتە بەرچاو کە.. نا، بەم جۆرەنا، ناتوانم بە چاکی لێی بدوێم، بڕوانە، من هەمیشە، لەو کاتەدا لە خۆم دەپرسی بۆ ئەمەندە گەلحۆم، ئەگەر کەسانی تر نەزان بن و منیش ئەو ڕاستییە بزانم کە نەزانن، ئەی بۆ خۆم ئاقڵتر نەبم؟ دوایی، سۆنیا، زانیم ئەگەر چاوەڕێ بم تا هەموو خەڵکیی ئاقڵ دەبن، ئەوە کاتی زۆری دەوێت.. پاشان لەوەیش گەیشتم کە شتی وا هەرگیز بەدی نایەت، خەڵکی گۆڕانیان بەسەردا نایەت، کەسیش نییە بیانگۆڕێت و ئەوەیش ناهێنێت مرۆڤ هەوڵی بێهودە بدات! بەڵێ، ئەمە وایە، ئەمە یاسای ئەوانە.. یاسایە. سۆنیا! ئەمە وایە، من ئێستا ئەوە دەزانم سۆنیا، ئەو کەسەی ئەقڵ و ڕۆحێکی توندوتۆڵی هەبێت. ئەو کەسە دەبێتە سەروەریان. ئەو کەسەی جەسارەتی زۆری هەبێت، ئەو کەسە لای ئەمان هەق بەدەستە و بۆی هەیە هەموو شتێک بکات. ئەو کەسەی مەسەلە گرنگەکان پشتگوێ بخات، تفی لێبکات، ئەو کەسە دەبێتە یاسادانەری ئەمانە، کەسێک لە هەموو ئەوانی دی بوێرتر بێت، هەر ئەو لەوانی دی زیاتر مافی هەیە. تا ئێستا ئەمە وا ڕۆیشتووە و لە ئاییندەیشدا هەروا دەبێت. تەنیا کوێرەکانن ئەم هەقیقەتانە نابینن.

هەرچەندە لە کاتی قسەکردندا ڕاسکۆلنیکۆڤ بەردەوام لە سۆنیای دەڕوانی، بەڵام ئیتر نیگەرانی ئەوە نەبوو بزانێت سۆنیا لە قسەکانی دەگات یان نا. تا بە تەواوی لەشی داگرتبوو، لە هەڵچوونێکی

ترسناکدا دەژیا (لە ڕاستیا دەمێک بوو لەگەڵ کەسدا نەدوابوو) سۆنیا زانی، ئەم ڕەشبینییە بووەتە بنەمای بیروباوەڕی ئەو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ هەر بەو حاڵەتی هەڵچوونەوە بەردەوام بوو:
- سۆنیا، من ئەوسا هەستم کرد دەسەڵات تەنیا بۆ ئەو کەسانەیە، کە دەوێرن بنووشتێنەوە و بە چاکی بیگرن. لێرەدا تەنیا شتێک گرنگە: تەنیا شتێک، دەبێت بوێر بیت. ئەوسا، بۆ یەکەمجار لە هەموو تەمەنمدا بیرۆکەیەکم تێگەڕا، بیرۆکەیەک هیچ کەسێک لە پێش مندا بە خەیاڵیدا نەگەڕابوو، هیچ کەسێک. لەپڕێکدا پرسیارێک وەک خۆرەتاو لە پێشمدا قوت بووەوە، ئەویش ئەوەبوو کە بۆچی تاکو ئێستا یەکێک نەیوێراوە، کاتێک بە لای ئەم هەموو گەندەڵییانەدا تێپەڕیووە، کلکیان بگرێت و ڕەوانەی دۆزەخیان بکات، بەڵام من.. من ویستم بوێر بم و کوشتم.. من تەنیا ویستم بوێری بەخەرج بدەم، سۆنیا ئەمە هۆکارە ڕاستەقینەکەیە.
سۆنیا دەستی پێکدا دا و هاواری کرد:
- بەسە، بەسە! تۆ لە یەزدان دوور کەوتوویتەوە و یەزدانیش تۆی داوەتە دەست شەیتان..
- بەڕاست، سۆنیا، ئەو کاتەی لە تاریکیدا ڕادەکشام و بیری سەیر سەیرم دەکردەوە، تۆ بڵێی ئەهریمەن ختوورەی خراپی خستبێتە دڵمەوە؟ ها؟ پێم بڵێ.
- وس بە، گاڵتە مەکە، کافر، تۆ لە هیچ تێناگەیت، لە هیچ، ئای خودایا، ئەو لە هیچ، لە هیچ، ناگات!
- بێدەنگ بە، سۆنیا، من گاڵتە ناکەم، بە هیچ جۆرێک. من خۆیشم دەزانم ئەهریمەن ڕێنمایی کردووم. بێدەنگ بە سۆنیا، بێدەنگ بە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەم وتانەی بە بێزارییەوە دەوت و بەردەوامیش بوو لەسەری:

- من هەموو شتێک دەزانم، ئەو کاتانەی لە ژووره تاریکەکەدا ڕاکشابووم، بیرم لە هەموو ئەمانە کردەوە و لەگەڵ خۆمدا هێنامن و بردمن.. زۆر بە وردی سەروبنم کردن. من هەموو شتێک دەزانم، هەمووی! نازانیت ئەم هەموو بێنەوبەردە و چەنەبازییە لەو شوێنەدا تا چ ڕادەیەک منیان بێئومێد و نارەحەت کرد! من دەمویست هەموو شتەکان فەرامۆش بکەم، لە نووکەوە ژیان بگرمە بەر سۆنیا، دەمویست دەست لە چەنەبازی هەڵگرم. ئایا تۆ بە ڕاستی وا بیر دەکەیتەوە کە من وەک گەمژەیەکی چاوبەستراو دوای ئەم کارە کەوتبم؟ نا، من وەک هۆشیارێکی زرنگ کەوتمە دوای ئەم کارە و هەر ئەوەیش سەری تیا بردم. ئایا بە ڕاستی تۆ وا بیر دەکەیتەوە کە ئەگەر من بۆ نموونە ئەم پرسیارەم لە خۆم بکردایە: "ئایا من مافی دەستەڵاتداریم هەیە یان نا"، نەمدەزانی کە نەخێر مافم نییە؟ یان ئەگەر لە خۆم بپرسم: "ئایا مرۆڤ ئەسپێیە یان نا؟" بێگومان لای من مرۆڤ ئەسپێ نییە. ئەوەی لای ئەو کەسە ئەسپێیە، کە هەرگیز ئەم پرسیارە لە خۆی ناکات، بەڵکو هەر لە خۆیەوە بۆ پێشەوە لێدەخوڕێت و دەڕوات.. کاتێک من ئەو هەموو ڕۆژانە ئازارم دەچێژا بۆ ئەوەی تێبگەم کە ئایا ناپلیۆن ئەو پیرێژنەی دەکوشت یان نا، تەواو ڕوون و ئاشکرایە من هەستی ئەوەم هەبووە کە ناپلیۆن نیم.. ئازاری ئەو هەموو چەنەبازییەم چەشت سۆنیا، حەزم دەکرد بەیەکجاری لە کۆڵ خۆمی بکەمەوە، سۆنیا، ویستم بەبێ هیچ چەندوچوونێکی لۆژیکییانە، بیکوژم، لەبەر خۆم بیکوژم، تەنیا لەبەر خۆم، لەم لایەنەوە تەنانەت نەمویست درۆ لەگەڵ خۆمدا بکەم. ئەو

تاوانەم بۆ ئەوە نەکردووە یارمەتیی دایکم بدەم، نا، ئەمە درۆیە! بۆ ئەوەیش نەبووە کە دوای بەدەستهێنانی ئەو کەرەسانە کاری مرۆڤایەتی بکەم و یارمەتیی خەڵکی بدەم. نا، ئەمە درۆیە. من تەنیا لەبەر خۆم کوشتوومە، لەو چرکەساتەیشدا هیچ لام مەبەست نەبوو ئەوە بزانم کە پاشان دەبم بە کەسێکی چاکەخواز، یان هەموو تەمەنم وەک جاڵجاڵۆکە هەوڵ دەدەم خەڵکی بخەمە ناو تانوپۆکەمەوە و شیلەی ژیانیان بمژم.. مەسەلەی پارەیش هەر لە بیری مندا نەبووە، سۆنیا، کاتێک تووشم بوو بە تووشی ئەو کوشتنەوە، شتێکی ترم لە خەیاڵدا بوو.. من ئێستا بەو شتانە دەزانم.. سۆنیا هەوڵ بدە تێمبگەیت، ئەگەر ئەو ڕێگەیەم بێتەوە بەر، ڕەنگە هەرگیز کەس نەکوژم. من دەمویست لە شتێکی تر تێبگەم، شتێکی تر هانی دەدام ئەو کارە بکەم: دەبوو لەو کاتەدا من لەوە تێبگەم ئایا منیش وەک خەڵکانی دی ئەسپێم یان مرۆڤم؟ ئایا من دەتوانم سنوور ببەزێنم یان ناتوانم؟ ئایا ئازایەتی ئەوەم تیایە دانەومەوە و چیم پێویستە هەڵیبگرم، یان ناتوانم؟ ئایا بوونەوەرێکی ترسنۆک و لەرزۆکم یان خاوەن هەقم..

دیسانەوە سۆنیا دەستی بەدەستا دا و هاواری کرد:

- هەقی کوشتن؟ هەقی ئەوەت هەبێت خەڵکی بکوژیت یان نا؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تووڕەییەوە هاواری کرد:

- ئاە.. سۆنیا!

ویستی بەرپەرچی بداتەوە، بەڵام بە سووکایەتیپێکردنەوە بێدەنگی هەڵبژارد، پاشان کەوتەوە قسە:

- قسەم پێمەبڕە، سۆنیا، من تەنیا دەمویست شتێک بۆ تۆ بسەلمێنم: ئەویش ئەوەیە کە لەو کاتەدا شەیتان منی بۆ ئەوێ کێش کرد، پاشان

تێی گەیاندم کە نەدەبوو بۆ ئەوێ بڕۆم، چونکە منیش وەک هەموو کەسانی دی بێجگە لە ئەسپێیەک هیچی تر نیم: کردمی بە مەسخەرە و گاڵتەجاڕی خۆی، لەبەر ئەمەیە ئێستا هاتوومەتە لای تۆ، میواندارییم بکە، سۆنیا، ئەگەر ئەسپێ نەبوومایە، هەرگیز دەهاتمە لای تۆ؟ گوێ بگرە: لەو ساتەدا کە بۆ لای پیرێژنەکە دەچووم، تاقە مەبەستم "تاقیکردنەوە" بوو، لەمە تێبگە.

- ئەوسا کوشتت! کوشتت!

- باشە، بزانە چۆنم کوشتووە؟ ئایا کەس بەم جۆرە دەکوژرێت، ئایا من چیم کردووە خەڵکی تریش وا دەکات؟ ڕۆژێک ئەوەت بۆ باس دەکەم کە چۆن ڕۆیشتووم بۆ ئەوێ، بۆ من پیرێژنەکەم کوشتووە؟ نا، من خۆم کوشتووە، نەک پیرێژنەکە! بۆ هەتاهەتایە ژیانی خۆم دا بەدەم ئاوەوە.. بەڵام پیرێژنەکە شەیتان کوشتوویەتی، نەک من.. باشە، ئیتر بەسە، سۆنیا، بەسە.

لەپڕێکدا دەنگی هەڵبڕی و بە خەفەتێکی بێئەندازەوە وتی:

- وازم لێبێنە. لێم گەڕێ.

پاشان ئانیشکی دادایە سەر ئەژنۆی، سەری خستە نێو هەردوو دەستی و وەک مەنگەنە گوشی.

ناڵەیەک لە گەرووی سۆنیاوە هات و وتی:

- ئای چ ئازارێکە!

ڕاسکۆلنیکۆڤ سەری بڵند کرد، نیگەرانی و نائومێدی تەواو دەموچاویان گۆڕیبوو، تەماشای سۆنیای کرد، لەپڕا وتی:

- باشە، چار چییە؟ چی بکەین؟ بیڵێ.

سۆنیا ڕاست لە جێگاکەی هەستا، بە چاوە پڕ لە فرمێسکەکانی کە دەدرەوشانەوە هاواری کرد:

- چار چییە! هەستە..

.. شانی گرت، ڕاسکۆلنیکۆڤ کەمێک هەستا، بە سەرسامییەوە لێی ڕوانی.

- .. هەر ئێستا، یەکسەر بڕۆ لەسەر چوارڕێگەکە ڕاوەستە، کڕنووش بەرە، لە پێشا زەوییەکە ماچ بکە، ئەو زەوییەی پیست کردووە، پاشان سەر بۆ هەموو لایەک دابنەوێنە، بۆ هەر چوارلا، ئینجا بە دەنگی بەرز بە خەڵکەکە بڵێ: "من کوشتوومە!" ئەوسا یەزدان ژیانێکی تازەت پێدەبەخشێت. دەرۆیت؟ دەڕۆیت؟

لە کاتی ئەم پرسیارانەدا هەموو لەشی سۆنیا کەوتبووە لەرزین و لەوەدا بوو لە هۆش خۆی بچێت. توند هەردوو دەستی لاوەکەی خستبووە نێو دەستی خۆیەوە، بە نیگایەکی ئاگرینەوە لێی دەڕوانی.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەم هەڵچوونە کتوپڕەی سۆنیای زۆر سەیر هاتە بەرچاو و بە دەنگێکی گیراوەوە لێی پرسی:

- مەبەستت ئەوەیە بڕۆمە زیندان، سۆنیا؟ ئایا دەکرێت من ڕاستی لەسەر خۆم بڵێم.

- پێویستە خۆت لەبەر دەرد و ئازاردا بگریت بۆ ئەوەی لە گوناهەکانت پاک ببیتەوە.

- نا، من ناچمە لایان، سۆنیا.

- کەواتە ژیانی چی، چۆن دەتوانیت بژیت؟ ئایا ئەمە دەشێت؟ باشە، چۆن دەتوانیت لەگەڵ دایکتا قسە بکەیت؟ ئاە، ئەوان چییان بەسەر دێت؟ بەڵام من چی دەڵێم؟ تۆ دایک و خوشکت بەرەڵا کردووە، بەرەڵات کردوون و تەواو، وانییە؟ ئای خودایا: ئەو خۆی هەموو شتەکان دەزانێت. باشە، مرۆڤ چۆن دەتوانێت بێکەس بژی! ئێستا تۆ چیت بەسەر دێت!

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە هێوری وتی:
- منداڵ مەبە، سۆنیا، من چ ناهەقییەکم بەرانبەریان کردووە؟ بۆ بڕۆم بۆ لایان؟ چییان پێبڵێم؟ ئەمانە هەمووی خەیاڵی ڕووتن.. خۆیان ملیونان کەس دەکوژن و بە کاری چاکیشی دادەنێن. سۆنیا، ئەوانە درۆزن و حەرامزادەن!.. ناڕۆم، باشە چییان پێبڵێم؟
پاشان بە تەوسەوە وتی:
- پێیان بڵێم من کوشتوومە و نەموێراوە پارەکە هەڵبگرم و لەژێر بەردا شاردوومەتەوە؟ ئاخر ئەوان پێم پێدەکەنن و دەڵێن.. "کەربووی هەڵتنەگرت، گەوج و ترسنۆک بوویت". ئەوان هیچ، هەر لە هیچ ناگەن، ئەوان سۆنیا، شایانی ئەوە نین کە تێبگەن. بۆ بچم؟ ناچم، منداڵ مەبە سۆنیا.
سۆنیا دەستی پاڕانەوەی بۆ درێژ کرد و وتییەوە:
- ژیانی ئاییندەت بێجگە لە ئازارێکی بەردەوام هیچی تر نابێت.
ڕاسکۆلنیکۆڤ خێسەیەکی لێکرد، بە خەیاڵی پەرتەوە وتی:
- ڕەنگە زۆر بوختانم بە خۆمدا کردبێت، دەشێت هێشتا من مرۆڤ بم نەک ئەسپێ.. لە بڕیارەکانیشدا پەلەم کردبێت.. دەمەوێت هێشتا هەر بەرگری لە خۆم بکەم.
زەردەخەنەیەکی پڕ لە لەخۆباییبوونی کەوتە سەرلێو.
سۆنیا وتی:
- دەتوانیت بارێکی ئەوەندە گران هەڵبگریت؟ تەمەنێک، بە درێژایی تەمەنێک!
- ڕادێم، گوێ بگرە، گریان تەواو. ئێستا کاتی ئەوەیە بیر لە کار بکەینەوە، هاتووم پێت بڵێم ئێستا بە دوامدا دەگەڕێن، داویان بۆ داناوم.. دەمگرن.

سۆنیا بە ترسەوە هاواری کرد:

- وای!

- باشە بۆ هاوار دەکەیت؟ تۆ خۆت ناتەوێت بخرێمە زیندان؟ کەچی ئێستا دەترسیت؟ وەلێ ئەوە بزانە: من خۆمیان بەدەستەوە نادەم، بەرەنگاریان دەبمەوە، ناتوانن هیچ بکەن، هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نییە. دوێنێ تووشی مەترسییەکی گەورە هاتم و وامزانی ئیدی تەواو بووم. بەڵام ئەمڕۆ کاروبار چاکترە. هەموو بەڵگەکانیان دوو ڕووی هەیە. بەو مانایەی کە من دەتوانم تۆمەتەکانیان بە قازانجی خۆم هەڵبگێڕمەوە، تێدەگەیت؟ هەڵیشیدەگێڕمەوە، چونکە شارەزایان بووم.. بەڵام گومان لەوەدا نییە کە دەمخەنە زیندانەوە. ئەگەر پێشهاتێک ڕووی نەدایە، ڕەنگە هەر ئەمڕۆ زیندانی بکرامایە. ڕەنگە ئێستایش ئەو کارە بکەن. هەرچەندە ئیتر گرنگ نییە، سۆنیا، ماوەیەک دەمێنمەوە و پاشان ئازادم دەکەن. لەبەر ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی تەواویان بەدەستەوە نییە، بەدەستیشیانەوە نابێت، دڵنیات دەکەم، ئەوەی تا ئێستا بەدەستیانەوەیە، بەشی ئەوە ناکات تاوانبارم بکەن. بەڵام ئیتر بەسە.. ئەمەم بۆیە پێ وتی، تەنیا بۆ ئەوەی بیزانیت.. هەوڵیش دەدەم کە دایکم و خوشکم دڵنیا بکەم و ترسیان لێنەنیشێت.. لەوە ناچێت خوشکم لە ئێستادا پێویستی بە هیچ بێت.. دایکیشم هەروا.. هەموو شتەکە ئەمەیە. بەڵام تۆ ئاگات لە خۆت بێت.. لە بەندیخانەدا سەرم لێدەدەیت، کە زیندانی کرام؟

- ئاخ، بێگومان، بێگومان!

هەردووکیان شەکەت و داماو، وەک دوو کەسی نقوم بوو کە دوای زریان بە تەنیا کەوتبێتنە کەنارێکی چۆڵ و تەریکەوە، لە پاڵ یەکدا دانیشتبوون. ڕاسکۆلنیکۆڤ تەماشای سۆنیای دەکرد، هەستی بە

خۆشەویستییەکی زۆری سۆنیا دەکرد بەرانبەر بە خۆی، هەروەها لەناکاوێکدا هەستی بە ناڕەحەتی و ناخۆشییەک کرد کاتێک بینی کەسێک تا ئەو ڕادەیە ئەوی خۆشدەوێت. هەستێکی سەیر و ترسناک بوو. کە بۆ لای سۆنیا هات، وای بیر دەکردەوە هەموو هیوا و ئاواتی لەودا دەبینێتەوە. وای بۆ دەچوو کە هیچ نەبێت هەندێک لە ئازاری کەم دەبێتەوە، وەلێ ئێستا کە دڵی سۆنیا بە تەواوی لای ئەو بوو، لەپڕا زانی و هەستی کرد کە لە جاران زیاتر بەدبەختترە. بۆیە ڕووی لە سۆنیا کرد و پێی وت:

- سۆنیا، کاتێک دەکەومە زیندانەوە، وا چاکە سەرم لێنەدەیت.

سۆنیا وەڵامی نەدایەوە، دەگریا، چەند دەقیقەیەک تێپەڕی، پاشان وەک تازە بیری کەوتبێتەوە، لەپڕێکدا پرسی:

- خاچت هەیە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە سەرەتادا لە پرسیارەکەی تێنەگەیشت.

- نیتە، وایە؟ وەرە، ئەم خاچەدارینە بگرە، من خاچێکی ترم هەیە لە مس دروست کراوە و هی لیزاڤێتابوو. من و لیزاڤێتا خاچەکانمان گۆڕییەوە، ئەو خاچەکەی خۆی بە من دا و منیش میداڵە بچووکەکە. من ئێستا خاچەکەی ئەو لە گەردنم دەکەم و ئەمەی تر بۆ تۆ، فەرموو وەری بگرە.

بە جەختەوە وتییەوە:

- ئاخر.. ئەوەیانماڵی منە. هی خۆمە، ئاخر من و تۆ پێکەوە بەرەو هەڵگرتنی ئازار دەچین، هەر لەگەڵ یەکیشدا خاچەکانمان دەبەین!

ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:

- بمدەرێ.

حەزی لە زویرکردنی سۆنیا نەدەکرد، بەڵام لەناکاودا، ئەو دەستەی بۆ خاچەکەی درێژ کردبوو، گێڕایەوە دواوە، بۆ ئەوەیش دڵنیای بکات، لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

- ئێستا نا، سۆنیا.. دوایی، وا چاکترە.

سۆنیا بە تاسەوە پاڵپشتیی لێکرد:

- بەڵێ، بەڵێ، وا چاکترە، ئەو کاتەی دەتەوێت دان بە تاوانەکەتدا بنێیت. ئەوسا دەیکەیتە گەردنت، دێیت بۆ لام و من دەیکەمە گەردنت، پێکەوە درود دەخوێنین و پێکیشەوە دەڕۆین.

لەو کاتەدا یەکێک سێ جار لە دەرگاکەی دا، دەنگێکی زۆر ئاشنا و بەئەدەب هاتە بەرگوێ:

- سۆنیا سمیونۆڤنا، دەکرێت بێم بۆ لات؟

سۆنیا ترسا و خۆی بەرەو لای دەرگاکە ڕادا، لەبەر دەرگاکەوە دەموچاوی جەنابی لێبیزیاتنیکۆڤ دەرکەوت.

## ٥

لێبێزیاتینکۆف بە سەرو سیمایەکی شپرزەوە هات و ڕووی لە سۆنیا کرد:

- هاتم سەرت لێبدەم، سۆنیا سمیونۆڤنا، داوای لێبووردنت لێدەکەم.

لەپڕا ڕووی دەمی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد و وتی:

- لە خۆمەوە وام دانابوو کە تۆ لێرە بیت، بە نیازی خراپ نا، وەک ئەوەی کەسانی تر بیری لێدەکەنەوە، بەڵام وام دانابوو کە..

ئینجا وازی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ هێنا و لەگەڵ سۆنیادا کەوتە قسە:

- لەوێ کاترینا ئیڤانۆڤنا شێت بووە.

سۆنیا هاواری لێهەستا، لێبێزیاتینکۆف بەردەوام بوو:

- مەبەستم ئەوەیە لەوە دەچێت، بە کورتی.. نازانم چی بکەین، دەمویست ئەمە بڵێم! گەڕاوەتەوە، گوایا لەو شوێنەی کە بۆی چووە، دەریان کردووە، لەوانەیە لێیشیان دابێت.. ئیتر وا پێدەچێت، چووە بۆ لای سیمیون زاخاروڤیچی سەرۆک کاری مێردەکەی. بەڵام لە ماڵەوە نەبووە. چونکە میوانی نیوەڕۆی سەرتیپێکی تر بووە.. ئینجا تەماشا بکەن، چووە بۆ ئەو ماڵەیش، بۆ شوێنی نانخواردنەکە.. بیهێننە بەرچاوی خۆتان، چووە بۆ ماڵی سەرتیپەکەی تر و ئەمەندەی جەخت کردووە تا سەرۆک سیمیون زاخاروڤیچیان بۆ هێناوەتە دەرەوە. دەڵێن لەو کاتەدا لەسەر مێزی نانخواردن بوون. ئینجا بیری لێبکەنەوە کە دەبێت چی ڕووی دابێت! بێگومان کاترینا ئیڤانۆڤنایان دەرکردووە، وەک خۆیشی دەڵێت ئەم جوێنی بە سەرتیپەکە داوە و شتێکی تێگرتووە، دیارە زۆر جێی باوەڕە.. بەڵام چۆن نەیانگرتووە، من لەمە تێناگەم! ئێستا خۆی ئەم شتانە بۆ هەموو کەسێک دەگێڕێتەوە، تەنانەت بۆ ئامالیا ئیڤانۆڤنایش. وەلێ ئێستا هێند هاوار دەکات و بە خۆیدا دەکێشێت، ناتوانیت باش لە قسەکانی بگەیت.. ئاخ، دەڵێ و دەقیژێنێت.. هاواری ئەوەیەتی کە چۆن هەموو لێی تەکیونەتەوە و بەرەڵایان کردووە، بۆیە منداڵەکانی هەڵدەگرێت و دەیانباتە سەر شەقام و سازیان بۆ لێدەدات، گۆرانیان پێدەڵێت و سەمایان پێدەکات، خۆیشی گۆرانی و سەما دەکات، پارە لە خەڵکی کۆ دەکەنەوە، هەموو ڕۆژێکیش دەچنە ژێر پەنجەرەی ژووری ماڵی سەرتیپەکە، بەو جۆرە، وەک خۆی دەڵێت: "با سەرتیپ و خەڵکانی تریش ببینن چۆن منالی کارمەندێکی بەڕێز وەک سواڵکەر بە شەقامەکاندا دەگەڕێن". لە منداڵەکان دەدات و ئەوانیش دەگرین. لینا فێری گۆرانیی "گوندە چکۆڵەکە" دەکات، هەروەها کوڕە هەرە

بچووکەکەیان و پۆلینا میخایلوڤنا فێری سەما دەکات. جلەکانیان دەدرێنێت، کڵاوی تایبەتی، وەک کڵاوی لێبوکیان بۆ دەدورێت. دەیەوێت لەباتیی ئامێری مۆسیقا تەشتێک بە دەستەوە بگرێت و لێی بدات.. گوێ لە هیچ ناگرێت.. باشە، لای خۆتانەوە وێنای بکەن چی ڕوو دەدات؟ دەبێت هەر ئاوا دەستبەرداری بین!

لێبێزیاتینکۆف دەیویست هەر لەسەر گێڕانەوەی چیرۆکەکەی بڕوات، بەڵام سۆنیا کە بێدەنگ گوێی لێگرتبوو، لە پڕ مانتۆ و کڵاوەکەی خۆی هەڵگرت، لە ژوورەکە هاتە دەرێ و هەر بەدەم ڕێگەوە لەبەری کردن. ڕاسکۆلنیکۆڤ لە دوایەوە بەدەر کەوت و لێبزیاتینکۆفیش بە دوای ئەودا هاتە دەرێ، کە گەیشتنە کۆڵانەکە، بە ڕاسکۆلنیکۆڤی وت:

- حەتمەن شێت بووە، من نەمویست سۆنیا سمیۆنۆڤنا بترسێنم و وتم "گوایا" بەڵام گومانی تیا نییە کە شێت بووە. دەڵێن نەخۆشی سیل دوومەڵ لە مێشکا دروست دەکات. بە داخەوە من لە پزیشکی نازانم، ویستم کاترینا ئیڤانۆڤنا قەناعەت پێبکەم، بەڵام ئەو گوێ لە کەس ناگرێت.

- لە بارەی دوومەڵەکانەوە هیچت پێوت؟

- بە تەواوی نا، خۆ ئەگەر پێشم بوتایە، هەر لێم نەدەگەیشت، وەلێ دەمەوێت بڵێم ئەگەر بتەوێت بە لۆژیک قەناعەت بە یەکێک بکەیت، کە گریان باش نییە، واز لە گریان دەهێنێت، ئەمە ئاشکرایە، بەڵام تۆ لەو بڕوایەدایت کە ئەو دەست هەڵبگرێت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەڵامی دایەوە:

- ئاخر، ئەگەر وابووایە، ژیان زۆر ئاسان دەبوو.

- تکایە، تکایە، بێگومان زۆر زەحمەتە کاترینا ئیڤانۆڤنا لەمە بگات. وەلێ تۆ ئاگات لەوەیە لە پاریس، چەند تاقیکردنەوەیەکی تازە

لەبارەی ئەوەوە کراوە، کە دەکرێت شێت، لە ڕێی قەناعەتپێکردنێکی لۆژیکییانەوە چارەسەر بکرێت؟ یەکێک لە پسپۆڕەکان کە زانایەکی گەورە بووە و بەم زووانە مردووە، وای داناوە دەشێت لەو ڕێگەیەوە ئەو چارەسەرە بکرێت. پوختەی بیری لەوەدایە کە شێتەکان کێشەی ئۆرگانیکیان نییە، بەڵکو شێتیەتی جۆرە هەڵەیەکی لۆژیکییە. واتا هەڵەی داوەریکردن و بیروڕادەربڕین لەسەر شت. ئەو زانایە لەگەڵ نەخۆشەکەدا دەدوا و وردەوردە بەڵگەکانی ڕەت دەکردەوە، بیری لێبکەرەوە، دەڵێن ئەنجامی باشی بەدەست هێناوە. بەڵام پێدەچێت ئەنجامی چارەسەرییەکە تەواو دڵنیاکەر نەبووبێت، چونکە پزیشکەکە لەگەڵ ئەو شێوازەدا، شێوازی بەکارهێنانی دوشی ئاویشی بەکار هێناوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ماوەیەک بوو ئیدی گوێی بۆ قسەکانی هەڵنەخستبوو، کە گەیشتە بەر ماڵەکەی خۆی، بەسەر خواحافیزی لە لێبێزیاتینکۆف کرد و چووە ژوورێ، لێبزیاتینکۆف سەری سووڕما، تەماشای ئەملاوئەولای کرد و خێرا کەوتەوە ڕێ. ڕاسکۆلنیکۆڤ چووە ژوورە گەنیلەکەیەوە و لە ناوەڕاستیا وەستا "بۆ گەڕاوەتەوە بۆ ئێرە؟" سەیری کاغەزی دڕاو و زەردهەڵگەڕاوی سەر دیوارەکانی کرد، هەروەها تۆز و خۆڵ و تەختی نووستنەکەی.. لە دەرەوە، دەنگی لێدانێکی بەردەوام و ناخۆش دەبیسترا، وەک یەکێک بزمار دابکوتێت وابوو. چووە لای پەنجەرەکەوە، لەسەر پەنجەی پێی وەستا و خۆی هەڵبڕی. ماوەیەک زۆر بە وردی تەماشای دەرەوەی کرد. بەڵام دەرەوە چۆڵ و ئەوانەی شتیان دادەکوتی، دیار نەبوون. لەلای چەپەوە، هەندێک لە پەنجەرەی ئاپارتمانەکە کرابوونەوە. لە بەردەم پەنجەرەکاندا ئینجانەی گوڵ هەبوو، لە پشت پەنجەرەکانەوە جل

هەڵخرابوو.. ڕاسکۆلنیکۆڤ پێشتر هەموو ئەمانەی دەزانی. ئاوڕی دایەوە و لەسەر قەرەوێڵەکەی دانیشت، هەرگیزاوهەرگیز، ئەمەندەی ئێستا، هەستی بە تەنیایی نەکردبوو.
بەڵێ، جارێکی دی هەستی کردەوە کە ڕەنگە بە ڕاستی ڕقی لە سۆنیا بێتەوە. بەتایبەتی چونکە ئەو وای لێکردبوو کە ئێستای لە جاران داماو و بەدبەختتر بێت "بۆ چووبوو بۆ لای سۆنیا، بۆ ئەوەی سواڵی فرمێسکی لێبکات؟ بۆ دەبوو ژیانی سۆنیایش ژەهراوی بکات؟ ئای، چ نامەردییەکە!" لەپڕێکدا بە دەنگێک کە مانای پێداگرتنی دەگەیاند، وتی:
- من بە تەنیا دەمێنمەوە، نابێت بێتە سەردانی بەندیخانەم.
دوای پێنج دەقیقە دیسانەوە ڕاسکۆلنیکۆڤ سەری بەرز کردەوە و زەردەخەنەیەکی سەیری کرد. بیرێکی چاوەڕواننەکراوی بەسەردا هات: "کێ ناڵێ لە زیندانەدا حاڵم باشتر نابێت؟"
ڕاسکۆلنیکۆڤ لە بیری نەما لە ژوورەکەیدا لەگەڵ ئەو بیروبۆچوونە ئاڵۆزو سەیرانەدا کە پەلاماری سەریان دابوو، چ ماوەیەکی دوورودرێژی بەسەر بردووە! لەناکاوێکدا دەرگا کرایەوە و ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا هاتە ژوورێ، لە پێشا لە بەردەم دەرگاکەدا وەستا و تەماشای براکەی کرد. تەواو بەو شێوەیەی کە کەمێک لەوەوبەر ڕاسکۆلنیکۆڤ تەماشای سۆنیای کردبوو. پاشان چووە ژوورێ، بەرانبەر براکەی، لەسەر هەمان کورسییەکەی دوێنێی دانیشت. ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەنگ و بەبێ هیچ بیرکردنەوەیەک لێی ڕاما.
دونیا وتی:
- کاکە بێزار مەبە، من تەنیا بۆ دەقیقەیەک هاتوومەتە ئێرە.

دەموچاوی دونیا هێور و ڕەندانە و دوور لە توندوتیژی بوو، نیگای بێگەرد و ئارام بوو. ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستی کرد کە ئەویش لە خۆشەویستیا هاتووەتە لای.

- کاکە، من ئێستا هەموو شتێک دەزانم، هەموو شتێک، دیمیتری پرۆکفیچ هەموو شتێکی بۆ باس کردووم و لێکی داوەتەوە. بە هۆی بەدگومانییەکی گەوجانە و دزێوەوە تۆیان خستۆتە ژێر چاودێرییەوە و ئازارت دەدەن.. دیمیتری پرۆکفیچ پێی وتم هیچ مەترسییەک لەئارادا نییە و تۆ بە هەوانتە ئەو ترسەت لە خۆت گەورە کردووە. وەلێ من لەگەڵ ڕاکەی ئەودا نیم، من باش لەوە گەیشتووم کە چۆن هەستت وروژاوە و ڕەنگە ئەم حاڵەتی وروژانەیش بۆ هەمیشە کاریگەریی لەسەرت هەبێت. من لەمە دەترسم، من هەقم بەوەوە نییە کە بۆ وازت لە ئێمە هێناوە و ڕەخنەیشت لێناگرم. لە سەرکۆنەکردنیش داوای لێبووردنت لێدەکەم. وا هەست دەکەم ئەگەر منیش تووشی غەمێکی ئەمەندە قورس بهاتمایە، هەروەکو تۆ لە هەموو خەڵکی دوور دەکەوتمەوە و تەنیاییم هەڵدەبژارد. لەم بابەتەوە لەگەڵ دایکمدا هیچ ناڵێم، وەلێ دەربارەی تۆ بەردەوام قسەی لەگەڵدا دەکەم و بەدەم تووە پێی دەڵێم کە لە زووترین کاتدا دەگەڕێیتەوە لامان، لەبارەی دایکمەوە دڵت هیچ نەکات، من دڵنیا و ئاسوودەی دەکەم. بەڵام تۆ ئازاری مەدە و هیچ نەبێت جارێک وەرە بۆ لای. لە بیرت نەچێت کە ئەو دایکە، ئێستا تەنیا بۆ ئەوە هاتووم کە پێت بڵێم -دونیا لە جێگاکەی هەستا- ئەگەر لە هەر ڕوویەکەوە پێویستیت بە من بێت، تەنانەت بە ژیانیشم.. پێم بڵێ و من ئامادەم، خوات لەگەڵ.

دونیا سووری خوارد و بەرەو لای دەرگاکە چوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستا و لێی نزیک کەوتەوە، وەستاندی و وتی:

- دونیا! ئەم ڕازومیخینە، واتا دیمیتری پرۆکفیچ، کوڕێکی زۆر نایابە.
دونیا کەمێک سوور داگەڕا و دوای تۆزێک بێدەنگی پرسی:
- چی تر؟
- گەنجێکی چالاک، ئیشکەر و نەجیبە، توانای خۆشەویستییەکی قووڵی هەیە.. ماڵئاوا دونیا.
دونیا وەک تەواو هەڵایسابێت وابوو، پاشان لەپڕێکدا بە دوودڵییەوە وتی:
- چییە کاکە، پێدەچێت بۆ یەکجاری لە یەکدی جیا ببینەوە، ئەم ڕاسپێرییانە چییە بە منی دەڵێیت؟
- گرنگ نییە.. ماڵئاوا.
ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕووی لێ وەرگێڕا و بەرەو پەنجەرەکە چوو، دونیا کەمێک وەستا، بە دوودڵییەوە لێی ڕوانی و بە شپرزەیی چووە دەرێ.
نا، ئەو بەرانبەر بە خوشکەکەی سارد نەبوو، تەنانەت لە چرکەساتێکدا –دوا چرکەسات- زۆر بەتاسەوە حەزی دەکرد دونیا لە ئامێز بگرێت، ماڵئاوایی لەگەڵدا بکات و تەنانەت هەموو شتێکی پێبڵێت. بەڵام بە ڕاستی پڕکێشی نەکرد تەوقەیشی لەگەڵدا بکات، لەگەڵ خۆیدا بیری کردەوە: "لە ئاییندەدا، ئەگەر بیر بکاتەوە من چۆن ئێستا لە ئامێزم گرتووە، لەوانەیە مووچرکی پێدا بێت، ڕەنگە بڵێت من ماچیم لێدزیووە!" دوای چەند دەقیقەیەک بە خۆی وت: "تۆ بڵێی خۆی لە بەردەم ئەم جۆرە دانپێدانانەدا بگرێت؟ نا، خۆی ناگرێت، لەو ژنانەیە کە بەرگەی شتی وا ناگرن".
بیری لە سۆنیا کردەوە، شەماڵێکی تازە لە پەنجەرەکەوە هاتە ژوورێ، لە دەرەوەیش هەتاوەکە ڕووناکی پێشووی نەمابوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ لەپڕا کڵاوەکەی هەڵگرت و چووە دەرێ.

هەڵبەتە نە دەیتوانی و نە خوازیاری ئەوەبوو بیر لە نەخۆشییەکەی خۆی بکاتەوە، وەلێ نیگەرانیی بەردەوام و باری ناخۆشی دەروونی، هەرگیز نەدەبوو بەبێ کاریگەری بمێننەوە، ئەگەر تا ئێستا تا و وڕێنەو بوورانەوە نەهاتبوونەوە سەرینی، بێگومان تەنیا لەبەر ئەوەبوو کە ئەو نیگەرانییە دەروونییە بەردەوامە، هێشتا ئەوی لە حاڵەتی مانەوە و هۆشمەندیدا هێشتبووەوە. هەرچەندە حاڵەتێکی دەستکرد و ساتەوەختی بوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بەبێ ئامانج دەسووڕایەوە، خۆرئاوا بوو، لەم دواییەدا هەستی بە غەمێکی زۆر تایبەتی لە خۆیدا دەکرد، غەمێکی زۆر توندوتیژ نەبوو، بەڵام هەستی ئەوە دەکرا کە بەردەوام و بۆ هەمیشە بمێنێتەوە. دەتوت ئەم غەمە سارد و مەرگاوییە بە درێژایی ساڵانێکی بێکۆتا هەروا دەمێنێتەوە، وەک ئەوەی هەموو دەوروبەری داگیر کردبێت وابوو. لە خۆرئاوابووندا ئاسایی ئەو هەستە لە کاتی دی زیاتر ئازاری دەدا. لە دواییدا بە بێزارییەوە کەوتە ورتەورت:

- بە جەستەیەکی وا زەبوونی گەمژانەوە کە بۆ نموونە وابەستەی خۆرئاوابوونێکە، چۆن دەتوانم خۆم لە کاری بێهودە بدزمەوە، نەک تەنیا بۆ سۆنیا، بەڵکو پەنا بۆ دونیایش نەبەم!

یەکێک بانگی کرد، کە ئاوڕی دایەوە، لیبێزیاتینکۆف خۆی گەیاندێ و وتی:

- بیری لێبکەرەوە، من لەلای ماڵەکەی تۆوە دێم، بە دواتا دەگەڕام، بیهێنە بەرچاوت کە ئەو ژنە قسەکانی کردووە بە کردەوە. منداڵەکانی بردووە، من و سۆنیا سمیۆنۆڤنا بە هەزار شەڕەشەق دۆزیومانن‌نەتەوە. خۆی تاوەیەکی بە دەستەوە گرتبوو لێی دەدا، منداڵەکانی ناچار کردبوو سەما بکەن، منداڵەکان دەگریان، لەسەر هەر

کوچە و دووکانێکدا دەوەستان، خەڵکی گەوج و نەزانیش دوایان کەوتبوون، دەفەرموو با بڕۆین.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە دوای لێبێزیاتینکۆف کەوتبوو، بە گومانەوە پرسی:

- ئەی سۆنیا؟

- بە تەواوی شێت بووە، مەبەستم سۆنیا سمیونۆڤنا نییە، بەڵکو کاترینا ئیڤانۆڤنایە. بەڵام تا ئەندازەیەک سۆنیا سمیونۆڤنایش شێت بووە. کاترینا ئیڤانۆڤنا ئەوە هەر بە تەواوی شێت بووە. پێت دەڵێم تەواو بووە. دەیانبەن بۆ پۆلیسخانە، ئینجا وێنای بکە ئەمە چ کاریگەرییەک بەجێ دێڵێت.. ئێستا ئەوان لە نزیک ڕووبار و پردەکەوەن.. لە ماڵی سۆنیا سمیۆنۆڤناوە دوور نییە، بەڵکو زۆریش نزیکە.

لە پاڵ ڕووبارەکەدا، ئەو شوێنەی زۆر لە پردەکەوە دوور نەبوو، دوو ساختمان لەو لای ئەو خانووەوە کە سۆنیای تیا دەژیا. کۆمەڵێک کەس کۆ ببوونەوە. بەتایبەتی منداڵەوردکە گەمارۆی ئەوێیان دابوو، دەنگی گیراو و ناڵەی کاترینا ئیڤانۆڤنا لەسەر پردەکەوە دەهات. بە ڕاستی دیمەنێکی سەیر بوو، دەنگەکە دەیتوانی دانیشتوانی کۆڵان و بازاڕەکە بەرەو لای خۆی کێش بکات. کاترینا ئیڤانۆڤنا بە بەرگە کۆنەکەی و کەوڵەکەی بەری و کڵاوە پووشییە چکۆڵەکەی کە تەپیبووە لایەکی سەرییەوە، لە شێتێکی تەواو دەچوو. شەکەت و هانکەهانکی بوو.

دەموچاوی کە نەخۆشیی سیل زەرد و لاوازی هەڵگێڕابوو، زیاد لە هەر کاتێکی دی دەرد و ئازار خۆی تیا دەنواند –دەبێت ئەوە بزانین ئەوانەی نەخۆشی سیلیان لەگەڵدایە، لەسەر شەقام و لەبەر هەتاودا هەمیشە نەخۆشتر دێنە بەرچاو وەک ئەوەی لە ماڵی خۆیاندا

دەردەکەون– بەڵام ئەو بە جۆرێک جۆشی سەندبوو، دانەدەمرکایەوە. تا دەهات زۆرتر ڕکی زیادی دەکرد، بەردەوام خۆی ڕادەدایە لای منداڵەکانی و بەسەریاندا دەیقیژاند، پێی لێ دادەگرتن و لە بەردەم خەڵکەکەدا فێری دەکردن چۆن سەما بکەن و چی بڵێن و زۆری لەسەر دەڕۆیشت. کە دەیزانی لێی تێناگەن، نائومێدانە تووڕەیی بەرکی دەگرت و لە منداڵەکانی دەسرەواند.. پاشان لە ناوەڕاستی کارەکەدا خۆی دەگەیاندە لای خەڵکەکە، ئەگەر بینەرێکی پۆشتە و پەرداخی بدیایە، ڕێک دەکەوتە سکاڵا کە: "بڕوانە، ئەمانە منداڵی خێزانێکی خانەدانن و تەنانەت خێزانێکی بووە و ئێستا بەم حاڵە گەیشتوون". ئەگەر لە نێو خەڵکەکەدا گوێی لە پێکەنین یان وشەیەکی گاڵتەجاڕی ببووایە، ڕاست پەلاماری زەلامەکەی دەدا و جوێنبارانی دەکرد. لە ڕاستیا هەندێک پێدەکەنین، هەیشبوو سەری بادەدا، بەڵام بەگشتی هەموویان بە چاوی کونجکۆڵی و فزووڵەوە تەماشای ژنەی شێت و منداڵە کلۆڵەکانیان دەکرد. ئەو تاوەیەی لێبێزیاتینکۆف باسی لێوە کردبوو، لەئارادا نەبوو، یان لایەنی کەم ڕاسکۆلنیکۆڤ نەیبینی. بەڵام لەباتیی تاوەلێدان، کاترینا ئێڤانۆڤنا کە دەیویست پۆلیا گۆرانی بڵێت و لینا و کۆلیا سەما بکەن، دەستە ڕەق و تەقەکانی پێکدا دەدا، زەربەکەی ڕێک دەخست و خۆیشی لەگەڵیاندا دەیوت. بەڵام کە کۆکە دەیگرت و گۆرانییەکەی بۆ نەدەوترا، نائومێدانە ڕکی هەڵدەستا، جوێنی بە نەخۆشییەکەی دەدا و دەستی بە گریان دەکرد. گریان و ترسی کۆلیا و لینا زۆر بە سەختی تووڕەیان دەکرد. لە ڕاستیا هەوڵی دابوو جلی منداڵەکان لە شێوەی گۆرانیبێژە گەڕۆکەکاندا بێت. مێزەرێکی سووروسپی بەسەری کوڕە بچووکەکەیەوە بەستبوو لەوانەی تورکەکان دەیبەستن. بەڵام لەبەر ئەوەی کە لینا قوماشی بەر

نەکەوتبوو، کاترینا ئیڤانۆڤنا کڵاوێکی قووچی خوریی سووری کردبووە سەری -باشترە لەباتیی کڵاو بڵێین شەوکڵاو- ئەم کڵاوە هی خوالێخۆشبوو سمیون زاخارۆڤیچ بوو، پەڕی وشترمرێکی پێوە بوو، لە پاشماوەکانی نەنکی کاترینا ئیڤانۆڤنا و تا ئەو کاتە لە سندووقێکدا هەڵگیرابوو، کە هەموو شتەکانی ناوی بریتی بوون لە ئاسەواری بنەماڵەکە، پۆلیا بەرگی ئاسایی خۆی لەبەردا بوو. بەڵام بە نیگایەکی شەرمنانە و ترسەوە تەماشای دایکی دەکرد و بستێک لێی دوور نەدەکەوتەوە، فرمێسکەکانی دەشاردنەوە و لەبەر ئەوەی هەستی بە شێتبوونی دایکی کردبوو، بە دوودڵییەوە لەملاوئەولای دەڕوانی. گەلێک لە شەقام و خەڵکەکە دەترسا، سۆنیا بەردەوام لە دوای کاترینا ئیڤانۆڤناوە دەڕۆشت، دەگریا و لێی دەپاڕایەوە بگەڕێتەوە بۆ ماڵێ. بەڵام هیچ داوا و پاڕانەوەیەک کاری لە کاترینا ئیڤانۆڤنا نەدەکرد، ئەو بەدەم هەناسەبڕکێ و کۆکینەوە خێرا خێرا پێی دەوت:

- وازم لێبێنە سۆنیا، وازم لێبێنە. تۆ خۆت نازانیت چیت دەوێت. لە منداڵ دەکەیت! پێم وتیت ئیدی ناگەڕێمەوە لای ئەو ژنە ئەڵمانییە سەرخۆشە، لێگەڕێ هەموو، هەموو پترۆزبورگ بزانن، منداڵی پیاوێکی نەجیب، کە تەواوی تەمەنی بە ڕاستیودروستی ژیاوە و دەتوانین بڵێین هەر لە کاتی بەجێهێنانی کارەکەیدا مردووە، چۆن وا ئێستا درۆزە دەکەن (کاترینا ئیڤانۆڤنا ئەم چیرۆکەی لە خۆیەوە دروست کردبوو، کوێرانەیش بڕوای پێ هێنابوو) وازبێنە. وازبێنە با ئەو سەرتیپە کەودەنە ئەمانە ببینێت. بە ڕاستی سۆنیا تۆ بێئەقڵیت. باشە ئێستا چی بخۆین، تۆ بیڵێ؟ لەڕادەبەدەر ئازاری تۆمان داوە، ئیتر نامەوێت.

کە ڕاسکۆلنیکۆڤی بینی، زوو گەیشتە لای و هاواری کرد:
- ئاخ، ڕادیون ڕومانوڤیچ، ئەمە تۆیت! تکات لێدەکەم ئەم کچە گەمژەیە تێبگەیەنە کە لەمەی ئێمە کاری باشتر ناکرێت! تەنانەت سازلێدەرە گەڕۆکە ئاساییەکانیش خەرجیی خۆیان دەست دەکەوێت. ئێمەیش بە زوویی هەموو دەماننناسن، دەزانن، کە خێزانێکی هەژار و خانەدان و هەتیووبارین. ئەوەیش دەبینیت کە ئەو سەرتیپە ناچیزە جێگاکەی لەدەست دەدات. دەبینیت! ئێمە هەموو ڕۆژێک دەڕۆینە ژێر پەنجەرەی ژووری خانووەکەی، هەر کاتێک جەنابی ئیمپراتۆر بەلاماندا تێپەڕێت، هەموومان دەکەوینە سەر چۆک، وا دەکەم منداڵەکان بەرانبەر بە ئیمپراتۆر بووەستن و منیش پێی دەڵێم: "باوکە، فریامان بکەوە" ئیمپراتۆر باوکی هەتیووە، دڵسۆزە، دەبینیت پشتیوانیمان لێدەکات و ئەو سەرتیپە هیچوپووچە..
پاشان بە فەڕەنسی وتی:
- لینا، ڕێک بوەستە. تۆیش کۆلیا دەبێت دیسانەوە سەما بکەیت. چییە بۆ هەنسک هەڵدەدەیت! دەی، کەرە لە چی دەترسیت! خودایا، ڕادیون ڕومانوڤیچ، چی لەمانە بکەم! ئەگەر دەزانیت چەندە کەودەنن! ئاخر، چی لەگەڵ ئەمانەدا بکەم..
کاترینا ئیڤانۆڤنا لە حاڵێکدا کە نیمچە گریانێک دەگریا، کەچی هێشتا دابوویە دەمی و لە قسە نەدەکەوت، ئاماژەی بۆ منداڵە گریاوەکانی دەکرد. ڕاسکۆلنیکۆڤ هەوڵی دا بیگێڕێتەوە دواوە، بۆ ئەوەیش کە ڕێز لە غرورەکەی بگرێت، پێی وت بۆ ئەم جوان نییە بە کۆڵاناندا بگەڕێت، لەبەر ئەوەی کە ئەو خۆی داناوە ببێتە بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناوخۆیی کچانی خانەدان..
- ناوخۆیی هە، هە، هە! دەنگی دەهۆڵ لە دوور خۆشە.

پێکەنینەکەی کاترینا ئیڤانۆڤنا گۆڕا بە کۆکە و پاشان کەوتەوە قسە:
- نا، ڕادیون ڕومانوڤیچ، ئەو خەونە بووە نەخشی سەر ئاو! هەموو دەستیان لە ئێمە بەردا.. ئەو سەرتیپە هیچوپووچەیش.. دەزانیت، ڕادیون ڕومانوڤیچ، من مەرەکەبدانێکم تێگرت، مەرەکەبدانەکە لە ژوورێکدا لەسەر مێزێک دانرابوو، لە پاڵ پەڕەکاغەزێکدا کە ئەوانەی دەچوونە ئەوێ ئیمزایان لەسەر دەکرد. منیش ئیمزام کرد، پاشان مەرەکەبدانەکەم تێگرت و ڕام کرد. هەی نامەرد و بچووکینە! تفیان لێبێت. ئێستا. خۆم خواردنیان بۆ پەیدا دەکەم و منەتی کەس هەڵناگرم.
ئاماژەی بۆ سۆنیا کرد و وتی:
- لەڕادەبەدەر ئازارمان داوە! پۆلیچکا، چەندمان کۆ کردۆتەوە. پیشانم بدە، چۆن؟ تەنیا دوو کوپیک؟ هەی هیچوپووچانە، کەس پارە نادات، تەنیا کەوتوونەتە دوامان و زمان دەردێنن، باشە، ئاماژەی بە یەکێکی ناو خەڵکەکە کرد –نازانم ئەم گەوجە بە چی پێدەکەنێت. هەموو ئەم گاڵتەپێکردنانە لە ئەنجامی گەمژەیی کولیاوەیە. سزایەکی سەیرە! پۆلێچکا، چیت دەوێت؟ بە فەڕەنسی قسەم لەگەڵدا بکە، فێرم کردبوویت، چەند ڕستەیەک دەزانیت.. ئەگینا چۆن دەردەکەوێت کە ئێوە منداڵی خێزانێکی نەجیب و شەریفن و هیچ پەیوەندییەکتان بە سازلێدەرە گەڕۆکەکانەوە نییە. ئێمە نامانەوێت لە کۆڵانەکاندا چاولێکەریی "پتروشکا"[1] بکەین. بەڵکو ئێمە گۆرانیی ڕەسەن دەڵێین.. ئاخ بەڕاست! ئێستا چ گۆرانیەک بڵێین؟ تۆ زۆر قسەم پێدەبڕیت، بەڵام.. دەزانیت ڕادیون ڕومانوڤیچ، بۆیە لێرەدا وەستاوین تا بڕیار

[1] کەسایەتییەکی میللی کۆمیدییە.

لەسەر گۆرانییەک بدەین، پێویستە گۆرانییەک بێت کە کۆلیا بتوانێت سەمای لەگەڵدا بکات.. چونکە هەموو ئەم کارانە، چەند دەتوانیت لای خۆتەوە وێنای بکە، بێ پرۆڤەکردنە، دەبێت خۆمان بۆ ئەوە ئامادە بکەین کە لە مەودوا لە پێشا پرۆڤە بکەین، پاشان بەرەو شەقامی "نوسکی" دەچین. لەوێ خەڵکانی بەپلەوپایە زۆرە، کە زۆر زوو سەرنجمان دەدەنێ. لینا تەنیا گۆرانیی "گوندە بچووکەکە" دەزانێت، هەر بە تەنیا ئەو گۆرانییە و ئەوەیش نابێت، هەموو خەڵکی ئەو گۆرانییە دەزانن، ئێمە دەبێت گۆرانییەکی زۆر ناوازەتر بڵێین.. باشە، پولێچکا، تۆ بیرت لەچی کردۆتەوە؟ خۆزگا هیچ نەبووایە تۆ بتتوانیایە هاوکاریی دایکت بکەیت! یادوەرییم، یادوەرییم، خراپ بووە و شتم بیر ناکەوێتەوە، ئەگینا شتەکان باش بەڕێوە دەچوون. ئاخر، بە ڕاستی ناکرێت گۆرانی "ئەو ئەفسەرەی پاڵی داوەتە شمشێرکەیەوە"[١] بڵێین. وەرن با شیعرە فەرەنسییەکە "پێنج فلس" بڵێین، من فێرم کردبوون، ئەو شیعرەم فێر کردبوون ئیدی. بە تایبەتی چونکە شیعرێکی فەرەنسییە، یەکسەر لەوە تێدەگەن کە ئێوە منداڵی خانەدانن و کارتان زۆر کاریگەر دەبێت.. دەشێت تەنانەت گۆرانیی "مالبرو دەچێت بۆ شەڕ" بڵێین، چونکە گۆرانییەکە تایبەتە بە منداڵانەوە، لە ناو هەموو ماڵە دەوڵەمەندەکاندا کە بیانەوێت منداڵەکانیان بخەوێنن، ئەو گۆرانییەیان بۆ دەڵێن.

کاترینا ئیڤانۆڤنا دەستی بە وتنی گۆرانییە فەرەنسییەکە کرد:

---

[١] سەرەتای شیعرێکی شاعیری ڕۆمانسی باتیوشکوفە، ساڵی ١٨١٤ ئاوازی بۆ دانراوە و ڕەواجێکی زۆری هەبووە –و–.

مالبرو دەڕوات بۆ شەڕ – نازانێت کەی دەگەڕێتەوە. بەڵام دوای وتنی دوو دێڕەکە وتی:
– نا، وا چاکترە گۆرانی "پێنج فلس" بڵێین! باشە، کولیا، دەست بخەرە کەمەرت و ئامادە بە، تۆیش لینا، بە پێچەوانەوە بسووڕێ، من و پۆلیایش چەپڵە لێدەدەین و گۆرانی دەڵێین. ئەوسا بە فەرەنسی دەستی پێکرد:
"پێنج فلس، پێنج فلس بۆ بەرێخستنی ژیانمان.
– هە، هە، هە!..
کاترینا ئیڤانۆڤنا کەوتە کۆکین، پاشان هەر بەدەم کۆکینەوە وتی:
– پۆلیا، جلەکانت رێک بخە، سەر شانەکانت هاتوونەتە خوارێ. دەبێت هەمووتان ئاگاداری هەڵسوکەوتی خۆتان بن، بۆ ئەوەی هەموو بزانن کە منداڵی خێزانێکی نەجیبزادەن. من ئەوسا پێم وتیت با کراسەکە درێژتر و رێکتر بێت، بەڵام بە ئامۆژگارییەکانی تۆ، سۆنیا کە هەر دەتوت "کورتتر و کورتتر" لێت تێک دان و منداڵەکەی بێنموود کرد. چۆن! دیسان دەستان بە گریان کردەوە؟ باشە بۆ، بێگوێیانە؟ دەی، کولیا، تۆ زووتر دەست پێبکە، دەی، زوو، ئاخ.. چ منداڵێکی ئارامهەڵگریت.
"پێنج فلس، پێنج فلس"
– چی؟ دیسانەوە سەرباز! فەرموو، چیت دەوێت؟
هەروایش بوو، سەربازێک لە ناوەڕاستی خەڵکەکەوە رێی دەکردەوە. هەر لەو کاتەیشدا، پیاوێکی بە هەیبەت و هەڵکەوتوو دەرکەوت، بەرگێکی رەسمی و پاڵتاوێکی لەبەردا بوو، پیاوێکی بە ویقاری تەمەن پەنجا ساڵ بە گەردنبەندێکەوە (ئەمە بە تایبەتی بۆ کاترین ئیڤانۆڤنا خۆش و بۆ پاسەوانەکە کاریگەر بوو) نزیک کەوتەوە، بێدەنگ

گەڵایەکی سەوزی —سێ ڕۆبڵ—ی دایە کاترین ئیڤانۆڤنا. لە دەموچاوی پیاوەکەدا سۆزێکی ڕاستگۆیانە هەست پێدەکرا. کاترینا ئیڤانۆڤنا بەئەدەبەوە پارەکەی قبووڵ کرد و بە شێوازێکی تایبەتی بۆی چەمایەوە، بە غرورێکەوە وتی:

- گەورەم سوپاست دەکەم. ئەو هۆکارانەی ئێمەیان ناچار کردووە بۆ.. پولێچکا پارەکەی لێوەربگرە. دەبینیت کە کەسانێکی خانەدان و مەزن هەن لە کاتی بەدبەختیدا یەکسەر ئامادەن یارمەتی ژنێکی نەجیبزادە بدەن. جەنابی گەورە و میهرەبان، تۆ لە بەرانبەری خۆتدا، کۆمەڵێک منداڵی خانەدان دەبینیت، کە دەتوانیت بڵێیت ڕەگی نەجیبزادەییان تێدایە.. بەڵام ئەو سەرتیپە بێحورمەتە لەسەر خوان دانیشتبوو و گۆشتی کەوی دەخوارد.. پێشی بە زەویدا دەکێشا کە بۆچی لێم تێک داوە. پێموت: گەورە و بەڕێز، داوات لێدەکەم پشتیوانی لەم هەتیوانەم بکەیت، لە هەتیوەکانی سمیون زاخاروڤیچ، هەروەها لە کچەکەی کە خوێڕیترین کەس لە ڕۆژی مەرگی خوالێخۆشبوودا تانەی لێداوە.. ها، دیسانەوە سەربازەکەیە؟

ڕووی لە کارمەندە گەورەکە کردەوە و هاواری کرد:

- .. یارمەتیمان بدە، بۆ ئەم سەربازە وازم لێناهێنێت؟ لە شەقامی "مشچانسکایا"ش لە دەست سەربازێکی تر هەڵاتین، باشە، گەوجە تۆ چیت گەرەکە؟

- ئاخر.. ئەم کارانەی ئێوە لە شەقام و کۆڵاناندا قەدەغەیە، تکایە کاری نابەجێ مەکەن..

- تۆ کاری نابەجێ دەکەیت، من بە سازەوە دەگەڕێم، ئەمە چ پەیوەندییەکی بە تۆوە هەیە؟

- ئەوەی ساز لێبدات، دەبێت مۆڵەتی وەرگرتبێت، بەڵام تۆ بەم کارە خەڵکی بێزار دەکەیت، تۆ ماڵت لە کوێیە؟
کاترینا ئیڤانۆڤنا شیڕاندی:
- چۆن؟ مۆڵەت؟ من ئەمڕۆ مێردەکەم مردووە، مۆڵەتی چی!
پیاوە کارمەندەکە وتی:
- خانمەکەم، خانمەکەم، لەسەرخۆ بە، وەرە با بڕۆین، من دەتانگەیەنمە ماڵەوە، لە ناو ئەم خەڵکەدا بۆ تۆ جوان نییە ئەم کارە بکەیت.. تۆ نەخۆشیت..
کاترینا ئیڤانۆڤنا هاواری کرد:
- گەورە و بەڕێز، گەورە و بەڕێز، تۆ هیچ نازانیت، ئێمە دەچین بۆ شەقامی نڤسکی، سۆنیا سۆنیا! باشە بۆ کوێ چووە؟ ئەویش دەگری! باشە، ئێوە هەموو چیتان بەسەر هاتووە!
لەپڕێکدا هاواری کرد:
- کولیا، لینا، بۆ کوێ دەچن؟ ئاە چ منداڵێکی گەمژەن! کولیا، لینا، بۆ کوێ دەچن؟
وەلێ کولیا و لینا کە لە ئاپۆرەی سەر شەقامەکە و ڕەفتاری شێتانەی دایکیان تەواو ترسابوون، هەر ئەوەندەی چاویان بەو سەربازە کەوت کە دەیویست بیانگرێت و بیانبات، بە جووتە دەستی یەکتریان گرت و ڕایان کرد. کاترینا ئیڤانۆڤنای کلۆڵ بەدەم ناڵە و گریانەوە کەوتە دوایان، دیمەنێکی بە ڕاستی غەمگین و دڵتەزێن بوو کاتێک دەتبینی ئەو ژنە چۆن بە هەناسەبڕکێ و گریانەوە بە دوایاندا ڕای دەکرد.
سۆنیا و پولێچکایش هەر بە ڕاکردن کەوتنە دوای ئەو.
- سۆنیا، بیانگێڕەوە دواوە.. هەی منالی گەمژە و سەرەڕۆ!. پولێچکا بیانگرە!.. من ئەم کارە لەبەر ئێوە..

کاترین لە کاتی ڕاکردندا پێی خزا و کەوت.
سۆنیا کە بەسەریدا چەمابووەوە هاواری لێهەستا:
- خۆی کوشت، ئای.. خودایا.. شەلاڵی خوێنە!
هەموو بە دەوریدا کۆ بوونەوە. ڕاسکۆلنیکۆڤ و لیبزیاتینکۆف لەوانە بوون کە پێش ئەوانی تر گەیشتنە سەری. کارمەندەکە گەیشتە لایان و پاسەوانەکەیش لە دوای ئەوەوە بە بێزارییەوە وتی: "ئەی هاوار!" لەبەر ئەوەیش کە هەستی بە مەترسی کرد، دەستی ڕاوەشاند و کەوتە دوورخستنەوەی خەڵکەکە و وتی:
- لاچن! لاچن!
یەکێک هاواری کرد:
- خەریکە دەمرێت!
یەکێکی تر وتی:
- شێت بووە.
ژنێک کە نیشانەی خاچی بۆ خۆی دەکێشا، وتی:
- خودایا بگەرە فریای! کچ و کوڕەکەیان گیراوەتەوە؟ وا هێنایانن. کچە گەورەکەیان گرتوونیەتەوە.. چ سەرەڕۆیەکن!
بەڵام کە بە وردی لە کاترین ئیڤانۆڤنایان ڕوانی، زانییان بە پێچەوانەی بۆچوونەکەی سۆنیاوە، لەبەر ئەوە زامدار نەبووە کە قاچی بەر بەرد کەوتووە. بەڵکو ئەو خوێنەی سەر زەوی شەقامەکەی سوور کردووە، لە سنگی ئەو ژنە داماوەوە هەڵقوڵیوە و لە گەروویەوە هاتۆتە خوارێ.
پیاوە کارمەندەکە ڕووی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ و لیبێزیاتینکۆف کرد و لەبەر خۆیەوە وتی:

- دەزانم، دەزانم، ئەمە نەخۆشی سیلە، خوێن لە گەرووپەوە دێت و دەیخنکێنێت. ژنێکی خزمم وای بەسەر هات، بەم نزیکانە خۆم بە دیارییەوە بووم، هەر بەم جۆرە و بە ئەندازەی دوو پەرداخێک.. هەر لە پڕێکدا.. بەڵام چی بکەین، هەر ئێستا دەمرێت!
سۆنیا خۆی پێنەدەگیرا، دەپاڕایەوە و ڕووی لە هەر یەکێک لەوان دەکرد.

- بۆ ئێرە، ئێرە، بۆ لای من، من لێرە دەژیم.. دووەم خانوو، زووتر، زووتر بیگەیەننە ماڵەکەی من! بنێرن بە دوای پزیشکدا، ئای خودایا!
بە هەوڵی کارمەندەکە کارەکە ئەنجام درا، تەنانەت پاسەوانەکەیش لە هەڵگرتنی کاترین ئیڤانۆڤنادا هاوکاری کرد، بە نیوەمردوویی گەیاندیانە ژوورەکەی سۆنیا و لەسەر قەرەوێڵەکە پاڵیان خست، هێشتا هەر خوێنی لێدەهات. وەلێ لەوە دەچوو وردەوردە کاترینا ئیڤانۆڤنا بێتەوە سەر خۆی. لەگەڵ سۆنیادا، ڕاسکۆلنیکۆڤ و لیبزیاتینکۆف و پیاوە کارمەندەکە و پاسەوانەکە چوونە ژوورێ، پاسەوانەکە ئەو کونپشکن و سووسەکەرانەی دەرکرد، کە دەیانویست بڕۆنە ژوورەوە.
پولێچکا دەستی کولیا و لینای گرتبوو، ئەوان دەلەرزین و دەگریان و بەو حاڵەوە چوونە ژوورێ. خێزانی کاپەرناومۆڤیش گەیشتن، کاپەرناومۆڤ سیمایەکی سەیروسەمەرەی هەبوو، شەل و کوێر، قژی سەر و ڕیشی زۆر و بژ بوو، ژنەکەیش بە دەموچاوی هەمیشە ترس لێ پژاوەوە، منداڵەکانی کە ڕوویان لە ترساندا وشک و دەمیان داچەقاند بوو، لەبەر دەرگادا دەرکەوتن.

لەبەینی ئەم هەمووەدا، سڤیدریگایلوفیش دەرکەوت، ڕاسکۆلنیکۆڤ بە سەرسامییەوە تەماشای کرد، لەبەر ئەوەی لە بیری نەبوو ئەوی لە ناو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا دیبێت، نەیدەزانی لە کوێوە هاتووە.
باسی پزیشک و قەشە کرا، هەرچەندە پیاوە کارمەندەکە بە چرپە بە ڕاسکۆلنیکۆڤی وت کە پێویست بە پزیشک ناکات. بەڵام فەرمانی دا بچن بە دوای پزیشکدا. خودی کاپەرناومۆڤ بۆ ئەنجامدانی خێرا دەستبەکار بوو.
هەر لەو سەروبەندەدا، کاترینا ئیڤانۆڤنا هەناسەی هاتەوە سەر خۆی و خوێنەکەی تا ڕادەیەک وەستا. کاترینا ئیڤانۆڤنا نیگایەکی ئازاراوی، بەڵام ورد و کاریگەری لە سۆنیا کرد کە بە ڕەنگی هەڵبزرکاو و دەستی لەرزۆکەوە بە دەستەسڕەکەی دڵۆپە ئارەقەکانی ناو چاوی کاترینای پاک دەکردەوە. پاشان داوای کرد هەڵیبستێنن، هەر لەسەر قەرەوێڵەکە دایاننیشاند و لە هەردوولاوە ڕایان گرت.
کاترینا ئیڤانۆڤنا بە نزمی پرسی:
- منداڵەکان لە کوێن؟ سۆنیا تۆ هێناتنەوە؟ ئای گەوچینە.. باشە، ئاخر بۆ ڕاتان کرد؟.. ئاخ.
هێشتا لێوە وشکەکانی خوێن دایانپۆشیبوو، ژنە بە وردی چاوی بە دەوری خۆیدا گێڕا و وتی:
- تۆ لێرە ئاوا دەژیت سۆنیا! من تەنیا جارێکیش نەهاتوومەتە لات.. وا ئێستا بە ڕێکەوت..
بە غەمگینییەوە لێی ڕوانی:
- سۆنیا.. ئێمە توانامان تیا نەهێشتیت. پولێچکا، لینا، کولیا، وەرنە ئێرەوە.. چاکە، ئەمە منداڵەکان، هەموویان بۆ تۆ.. دەیاندەمە دەستت..

ئیتر من بەسە!.. شەڕەکە کۆتایی هات، ئاه.. لێم بگەڕێن، لێم بگەڕێن هیچ نەبێت با بە ئاسوودەیی بمرم..

دیسانەوە سەریان نایەوە سەر سەرینەکە.

- چی؟ قەشە؟ پێویست ناکات.. ئایا پارەی زیادەتان پێیە؟ من گوناهێکم نەکردووە، خوا بێ قەشەیش لێم خۆش دەبێت.. خۆی دەزانێت چەندم ئازار چەشتووە! ئەگەر نەیشمبەخشێت گرنگ نییە!..

وڕێنەیەکی ناڕەحەتکەر تا دەهات زیاتر دەستی بەسەردا دەگرت. جارێک مووچرکی پیا دەهات، چاوی بەملاوبەولادا دەگێڕا و بۆ چرکەساتێک هەموویانی دەناسییەوە، کەچی لەپڕێکدا هۆشیارییەکەی دەبوو بە وڕێنە، زۆر بە سەختی و زەحمەت هەناسەی دەدا، وەک ئەوەی شتێک لە گەروویدا قرخەقرخی پێبخات وابوو تا ئەو ڕادەیەی لە دوای هەر وشەیەکەوە هەناسەیەکی تازە بدات، هاواری دەکرد:

- من پێی دەڵێم "خاوەن شکۆ" ئەمە ئامالیا لودڤیگویە.. ئاخ، لینا، کۆڵیا، دەستان بخەنە کەمەرتان، توندتر، توندتر، گلیسە[١]، گلیسە، پێ بە زەویدا بکێشن.. منداڵێکی ڕەند بە!

بە ئەڵمانی وتی:

- "تۆ خاوەنی ئەڵماس و مرواریت" باشە، دوای ئەوە چی؟ خۆزگا ئەم گۆرانییەمان بوتایە:

تۆ جوانترین چاوت هەیە

ئیدی چیت دەوێت؟ کچەکە؟

باشە، دیارە "ئیدی چیت دەوێت؟" گەمژە هەروا بیر دەکاتەوە.. ئاخ.. ئەمەیش شیعرێکی تری ڕووسی:

---

*Glissez* [١] بە فەڕەنسی واتا بجوڵێ -و-

- "لە قرچەقرچی گەرمای نیوەڕۆدا.. لە دەشتەکانی داغستاندا.. "
ئای چەندە حەزم لەم گۆرانییە بوو.. هەر دەمپەرست، پولێچکا.. دەزانیت.. لەو کاتەدا کە لەگەڵ باوکت دەزگیرانی یەکتری بووین، باوکت ئەم گۆرانییەی دەوت.. چ ڕۆژانێک بوو! خۆزگا، خۆزگا بمانتوانیایە ئەو گۆرانییە بڵێین! بەڵام ئەوی تری، ئەوی تریم لە بیر چۆتەوە.. دەی ئێوە بیڵێن.. چی بوو؟ چی؟
کاترینا ئیڤانۆڤنا لەڕادەبەدەر شپرزە و پەرێشان بوو، دەیویست هەستێت، لە دواییدا بە دەنگی گیراو و ترسناکییەوە کە بە زەحمەت لە گەرووییەوە دەهاتە دەرێ، لە حاڵێکدا کە هەر وشەیەکی لەگەڵ هاوار و بە ڕوویەکی زۆر ترساوەوە دەوت، دەستی بە گۆرانییەکە کرد! "لە قرچە قرچی گەرمای نیوەڕۆدا.. لە دەشتەکانی داغستاندا.. فیشەکێک بە سنگەوە.".
لەپڕێکدا دایە پرمەی گریان، ناڵەیەکی پڕ لە حەسرەتی هەڵکێشا و هاواری کرد:
- ئاگات لەم هەتیوانە بێت! گەورە و بەڕێز، لەبەر خاتری ئەوەی نانونمەکی سمیون زاخاروڤیچت کردووە.. دەتوانین ناوی نەجیبزادەی لێبنێین..
لەپڕێکدا ڕاپەڕی و هاتەوە هۆش خۆی، بە سەرسامییەوە هەموویانی بەسەر کردەوە و لێیان ڕاما، لەناکاوێکدا سۆنیای ناسی. بە شەرم و ئەوینەوە، وەک ئەوەی بینینی سۆنیا لەوێدا سەرسامی کردبێت، وتی:
- سۆنیا، سۆنیا، سۆنیای ئازیز، تۆیش لێرەیت؟
دیسان سەریان بەرز کردەوە.
- بەسمە!.. تەواو! ماڵئاوا نەگبەت، ئیدی دواتوانای بارگیرەکە کۆتایی هات، لە گیانەڵادایە.

به نائومێدی و بێزارییەوە ئەمانەی وت و سەری کەوتەوە سەر سەرینەکە.
دیسانەوە بوورایەوە، بەڵام زۆری نەخایاند، دەموچاوە زەردهەڵگەڕاو و وشکهەڵاتووەکەی بەرەو دوا کەوت، دەمی کرایەوە، قاچی لەرزی و درێژ بوو، هەناسەیەکی زۆر قووڵی هەڵکێشا و مرد.
سۆنیا بەسەر لاشەکەیدا کەوت و لە ئامێزی گرت، سەری نا بە سنگی لاوازی ژنەکەوە و پێوەی نووسا، پولێچکا قاچی دایکی لە باوەش گرت، ماچی دەکرد و بەکوڵ دەگریا. کولیا و لینا کە واقیان وڕمابوو، هەستیان بە کارەساتێکی ترسناک دەکرد، پاڵیان دابووە یەکەوە و چاویان بڕیبووە یەکدی، لەپڕێکدا پێکەوە زاریان داپچڕا و کەوتنە هاوارهاوار. هێشتا هەر بەرگی لێبوکییەکەیان لەبەردا بوو. یەکێکیان مێزەر و ئەوی تر کڵاوێکی لەسەردا بوو کە بە پەڕی وشترمر ڕازابووەوە.
نەیانزانی لە کوێوە "بڕوانامەی ڕێزلێنانەکە" لەپڕێکدا لەسەر پێخەفەکە و لە پاڵ کاترینا ئیڤانۆڤنادا دانرا، پەڕەکە لە نزیکی سەرینەکەیەوە کەوتبوو. ڕاسکۆلنیکۆڤ بینی و چووە نزیک پەنجەرەکەوە. لێبێزیاتنیکوف چووە پاڵی و پێی وت:
- مرد!
سڤیدریگایلوڤیش لێی نزیک کەوتەوە و وتی:
- ڕادیون ڕومانوڤیچ دەمەوێت دوو قسەت لەگەڵدا بکەم، زۆر بە پەلە.
لێبێزیاتینکۆف زوو جێگاکەی خۆی بۆ چۆڵ کرد و بەئەدەبەوە دوور کەوتەوە. سڤیدریگایلوف ڕاسکۆلنیکۆڤی سەراسیمەی بردە سووچێکەوە و پێی وت:

- هەموو شتەکان لەسەر من، واتا کفنودفن و شتی تر، دەبێت بۆ ڕاپەڕاندنی ئەمە پارەت لە دەستا بێت و منیش پێم وتبوویت پارەم زۆرە. ئەم دوو کۆترە بێگوناهە و پۆلیا لە دەزگا خێرخوازییەکان دادەنێم، لەوێ زۆر باش ئاگاداریان دەبن. بە ناوی هەر یەکێکیانەوە هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵ دادەنێم تا دەگەنە تەمەنی باڵق بوون. بۆ ئەوەی سۆنیا سمیۆنۆڤنا تەواو دڵنیا و ئاسوودە بێت، ئەویش لەو زەلکاوە ڕزگار دەکەم، لەبەر ئەوەی کچێکی شایستەیە، وایە؟ باشە، تۆیش بە ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنا بڵێ بە چ شێوەیەک دەهەزار ڕۆبڵەکەی ئەوم خەرج کردووە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ پرسی:

- تۆ بە چ مەبەستێک ئەم چاکە گەورەیە دەکەیت؟

سڤیدریگایلوف پێکەنی.

- هەی.. هەی! چ بەدگومانێکیت! ئاخر، من پێم وتیت پارەم زۆرە. باشە، ناکرێت تەنیا لەبەر خاتری مرۆڤایەتی کارێکی وا بکرێت؟ ئاخر، ئەو (بە پەنجە ئاماژەی بۆ ئەو شوێنە کرد کە ژنە کۆچکردووەکەی لێبوو) وەک ژنە سووخۆرەکە -ئەسپێ- نەبوو. دەی پێم بڵێ: "کامیان باشترە لۆژین بەو نامەردی و خوێڕیەتەوە بژی یان ئەم ژنە بمرێت؟" خۆ ئەگەر من یارمەتییان نەدەم "پولێچکایش بۆ نموونە، ناچارە هەر هەمان ڕێگەی خوشکەکەی لەبەر بگرێت".

سڤیدریگایلوڤ وەک بە تەوس و گاڵتەپێکردنەوە قسەکان بکات وابوو، بەڵام چاویشی لە ڕاسکۆلنیکۆڤ هەڵنەدەبڕی.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە بیستنی ئەو قسانەی خۆی بە سۆنیای وتبوون، ڕەنگی پەڕی و سارد بووەوە. زوو خۆی بەرەو دواوە کێشا و

سەراسیمە لە سڤیدریگایلوڤ ڕاما. لە کاتێکدا هەناسەی تەنگ ببوو، منەمنێکی کرد:

- جا تۆ.. لە کوێ ئەمە دەزانیت؟

- ئاخر، منیش هەر لێرە، لە پشت ئەم دیوارەوە، لای خاتوو ڕسڵیخ دەژیم، لێرە کاپێرناومۆڤ و لەوێ خاتوو ڕسڵیخ کە هاوڕێیەکی کۆن و زۆر بەوەفامە، نیشتەجێن، من دراوسێی هەردووکیانم.

- تۆ؟

سڤیدریگایلۆڤ کە لە پێکەنیندا گیانی کەوتبووە جووڵە، وتی:

- بەڵێ، من دەتوانم سوێندی شەرەفت بۆ بخۆم، ڕادیون ڕومانوڤیچی زۆر ئازیز، کە تۆ بێئەندازە سەرنجی منت ڕاکێشاوە، ئاخر کە پێم وتیت من و تۆ پێک دێین، بۆ ئەوە پێشبینی نەبوو؟ باشە، وا پێک گەیشتین، دەیشبینیت من چ مرۆڤێکی شیاوم. دەبینیت دەشێ لەگەڵ مندا بگونجێیت و ژیان بەسەر بەریت.

## ١

ڕۆژانێکی سەیر بۆ ڕاسکۆلنیکۆڤ هاتبوونە پێشێ، وەک ئەوەی تەمێکی خەست پێچابێتیە خۆی و تەنیاییەکی دژواریش بەرکی ڕزگارنەبوونی گرتبێت. لە ڕۆژانی دواییدا، واتا دوای ماوەیەکی زۆر کە ئەو ڕۆژانەی دەکەوتەوە یاد، دەیزانی لەو قۆناغەدا توانای درککردنی لێڵ بووە. ماوەیەک، تا کۆتایی کارەساتەکە، ئەم حاڵەتەی هەر لەگەڵدا بوو، بێجگە لە هەندێک ناوکێشی کورت کورت نەبێت. بڕوای بەوە هێنا لەو کاتانەدا لە گەلێک مەسەلەدا هەڵەی کردووە. بۆ نموونە لە مێژووی هەندێک بەسەرهاتدا، لایەنی کەم، دوای گەڕانەوەی بۆ لای یاداشتەکانی خۆی، یان ئەو هەوڵانەی بۆ ڕووناککردنەوەی یادەوەرییەکانی بە هاوکاریی ئەو زانیارییانەی لە کەسانی ترەوە بە دەستی هێنان، گەلێک شتی لەبارەی خۆیەوە دۆزییەوە. بۆ نموونە بۆی دەرکەوت ڕوداوێکی لەگەڵ ڕوداوێکی تردا تێکەڵ کردووە، یان وای دەزانی بەسەرهاتێک پەیوەندیی بە بەسەرهاتێکی ترەوە هەیە کە لە ڕاستیدا ڕووی نەداوە و تەنیا لە خەیاڵی خۆیدا بووە. هەندێکجار تووشی ترس و شڵەژانێکی هێند ئازاراوی دەبوو، کە زۆری نەدەبرد دەبوە ترس و تۆقانێکی سامناک.

هەروەها لە بیرییەتی کە دەقیقە و سەعات و بەڵکو ڕۆژانێکیش، لە حاڵەتێکی دەروونیی وادا دەژیا بە پێچەوانەی ترسەکانی جارانییەوە بووە... ژیانی بە جۆرێک سڕ ببوو وەک هەندێک لەوانەی لە سەرەمەرگدان هەستی بە هیچ نەدەکرد. بەگشتی، لە دوارۆژانی ئەو قۆناغەدا دەتوت نایەوێت لە حاڵوباری خودی خۆی تێبگات. هەندێک لە مەسەلە گرنگەکان کە دەبوون زۆر زوو دەربخرێن و ڕووناکییان بخرێتە سەر، کەچی هەر بەتایبەتی بۆ ئەو دەبوو بە بارێکی گران. وای هەست دەکرد ئەگەر لە دەست هەندێک چەرمەسەری ڕزگاری بێت و لێیان هەڵبێت، ئەوە ئەوپەڕی بەختەوەریەتی. لە کاتێکدا کە ئەو لەبیرخۆبردنەوەیە لەوانە بوو ببێتە هۆی لەناوچونێکی ناچاری.

بەتایبەتی سڤیدریگایلوڤ نیگەرانی دەکرد، تەنانەت دەشێ بڵێین ڕاسکۆلنیکۆڤ تەواوی زەینی خۆی خستبووە سەر ئەو، لەوساوە کە سڤیدریگاڵوڤ لە ژوورەکەی سۆنیا، لەو ڕۆژەدا کە کاترینا ئیڤانۆڤنای تیا مرد، قسە هەڕەشەئامێزەکانی زۆر بە ڕاشکاوی پێوت، ئیتر ڕەوتی ئاسایی بیرکردنەوەی ڕاسکۆلنیکۆڤ وەک بڵێی تێک چوو. هەرچەندە ئەو مەسەلەیە بێسنوور نیگەرانی دەکرد، بەڵام ڕاسکۆلنیکۆڤی پەلەی چارەسەرکردنی نەبوو. هەندێکجار لەپڕێکدا، لە چایخانەیەکی هەژارانەی سووچێکی دوور و تەریکی شاردا، بە تاقوتەنیا خۆی دەبینییەوە، کە لەسەر مێزێک دانیشتووە و بیر دەکاتەوە، خۆیشی بە زەحمەت دەیزانی چۆن ڕێی کەوتۆتە ئەوێ. لەپڕێکدا دیسان سڤیدریگایلوفی وەبیر دەهاتەوە. زۆر ڕوون و ئاشکرا و بە دوودڵییەوە ئەوەی بۆ دەردەکەوت کە تا زووە لەگەڵ ئەو پیاوەدا قسە بکات و ئەگەر بکرێت چی هەیە پێی بڵێت، تەنانەت جارێک، لە پشت دیوارێکەوە، خەیاڵی وای لێدا، کە لەوێ چاوەڕێی

سڤیدریگایلۆڤە و ئەو شوێنە جێژوانیانە. جارێکی دی، لە بەرەبەیاندا، لە جێگایەکدا کە نەیدەزانی کوێیە، لە خەو هەستا، لەسەر زەوی و لە ناو دارودەوەنێکدا نوستبوو، کە بە هیچ جۆرێک نەیدەزانی چۆن گەیشتۆتە ئەوێ و لەوێدا کەوتووە. دەبێت ئەوەیشمان لە بیر نەچێت کە دوو سێ ڕۆژ دوای مەرگی کاترینا ئیڤانۆڤنا، یەک دوو جار تووشی سڤیدریگایلۆڤ هات، هەمیشە ئەمە لە ژوورەکەی سۆنیادا ڕووی دەدا، ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕاهاتبوو بێ هیچ مەبەستێک و تەنیا بۆ بینینی سۆنیا یەک دوو دەقیقە سەری لێبدات. بەردەوام ئەم دووانە چەند قسەیەکی سەرپێییان لەگەڵ یەکتردا دەکرد، بەڵام بۆ تاقەجارێکیش لە مەسەلە سەرەکییەکە نەدوان. وەک ئەوەی لەگەڵ یەکدا ڕێک کەوتبن کە لەو بارەیەوە تا ماوەیەک بێدەنگ بن. هێشتا تەرمی کاترینا ئیڤانۆڤنا لە تابووتەکەیدا بوو.

سڤیدریگایلۆڤ دەربارەی ناشتنی تەرمەکە تەقەلای دەدا و ڕای دەسپارد. سۆنیایش گەلێک سەرقاڵ بوو. لە دوایەکتربینیندا سڤیدریگایلوف بۆ ڕاسکۆلنیکۆڤی ڕوون کردەوە کە کاروباری منداڵەکانی کاترینا ئیڤانۆڤنای بە چاکی تەواو کردووە. بە هۆی پەیوەندی بە کەسانێکەوە و بە یارمەتیی ئەوان، هەرسێ منداڵەکەیان لە دەزگایەکی زۆر شایستەدا جێ کردۆتەوە. ئەو پارەیەی بۆی تەرخان کردبوون، زۆر بە چاکی شکایەوە، لەبەر ئەوەی هەتیوی پارەدار جێوڕێی ئاسانتر دەست دەکەوێت لەو هەتیووەی کە پارەی نەبێت. هەروەها لەبارەی سۆنیاوە دوا و گفتی دا بەو زووانە سەر لە ڕاسکۆلنیکۆڤ بدات. چونکە زۆر مەبەستیەتی و بە پێویستی دەزانێت لەبارەی هەندێک مەسەلەوە لەگەڵیا بدوێت و باری سەرنجی بزانێت. ئەم قسانە لە ڕاڕەوی نزیک بە نەردەوانەکە کران. سڤیدریگایلۆڤ

چاوی لە نێوچاوی ڕاسکۆلنیکۆڤ بڕیبوو، دوای کەمێک هێوری بە دەنگی نزم لێی پرسی:

- بەڵام ڕادیون ڕومانوڤیچ تۆ چیتە، باش نایەیتە بەرچاوم؟ ڕاستە گوێ دەگری و دەبیستی، بەڵام پێدەچێت لە هیچ تێنەگەیت! دەی با هەندێک قسە لەگەڵ یەکدا بکەین، بەداخەوەم کاری خۆم و کاری خەڵکانی دی زۆر سەرقاڵیان کردووم.

لەپڕێکدا لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

- هەموو مرۆڤێک پێویستی بە هەوایە، هەوا، هەوا، پێش هەر شتێکی تر.

لەپڕێکدا چووە دواوە، بۆ ئەوەی ڕێ بە قەشە و یارمەتیدەرەکەی بدات کە بە پلیکانەکاندا سەردەکەوتن بۆ نوێژکردن لەسەر مردووەکە، لەسەر داوای سڤیدریگایلۆڤ، بەردەوام هەموو ڕۆژێک دووجار دەهاتن و درووودیان لەسەر دەخوێند، سڤیدریگایلۆڤ ڕۆشت، ڕاسکۆلنیکۆڤ کەمێک وەستا و بیری کردەوە. پاشان لە دوای قەشەکەوە چووە ژوورەکەی سۆنیاوە و لەبەر دەرگاکەدا وەستا.

ڕێوڕەسمی نوێژ و درووودخوێندنەکە لە دۆخێکی ئارام و بەشکۆ و ماتەمینیدا بەڕێوە چوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ هەر لە سەردەمی منداڵییەوە، هەمیشە هەستی بە مردن دەکرد و لەبەرچاوی خۆیدا دەیبینی، هەستەکە سەخت و دژوار و تێکەڵ بە ترسێکی عارفانە بوو. بە تایبەتی ماوەیەکی زۆر بوو لەم ڕێوڕەسمە دوور کەوتبووەوە. بۆیە ئێستا لە جاران زیاتر هەستی بەو ترس و تۆقانە دەکرد و زۆرتر ئازاری دەچەشت. تەماشای منداڵەکانی دەکرد، هەموویان لە بەردەم تابووتەکەدا کەوتبوونە سەر چۆک و پولێچکا دەگریا، لە دوایانەوە سۆنیا لەسەرخۆ، وەک شەرم بکات، دەگریا و درووودی دەخوێند.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری کردەوە: "بەڕاست لەم ڕۆژانەدا، ئەو کچە نە جارێک تەماشای کردووم و نە بە وشەیەک لەگەڵما دواوە". خۆر ژوورەکەی تەواو ڕووناک کردبووەوە، دووکەڵی بخوورەکان وەک ئەستوون بەرەو ژوور دەکشا، قەشەکە دروودی "بەخشین"ی لەسەر خوێند. ڕاسکۆلنیکۆڤ تا کۆتایی ڕێوڕەسمەکە مایەوە، قەشەکە لە کاتی ماڵئاوایی و سەرخۆشیکردندا نیگایەکی سەیری ئەملاوئەولای خۆی کرد. دوای کۆتاییهاتنی درووود خوێندنەکە ڕاسکۆلنیکۆڤ لە سۆنیا نزیک بووەوە، سۆنیا لەپڕێکدا دەستی گرت و سەری نایە سەرشانی، ئەم هەنگاوە دۆستانەیە ڕاسکۆلنیکۆڤی سەرسام کرد و خستییە ناو دنیای بیرکردنەوەوە: چۆن دەبێت وابێت؟ چۆن سۆنیا هیچ ڕقی لێی نابێتەوە؟ چۆن نەفرەتی لێناکات؟ تەنانەت لە دەستی سۆنیادا هەستی بە لەرزین نەکرد، ئەمە ئەوپەڕی لەخۆبوردن و قوربانیدان بوو، بە لایەنی کەمەوە ئەمە ئەنجامگیرییەک بوو ڕاسکۆلنیکۆڤ لە ڕەفتاری سۆنیاوە پێی گەیشتبوو. سۆنیا هیچی نەدەوت. ڕاسکۆلنیکۆڤ دەستی گوشی و چووە دەرەوە. هەستی بە بێتاقەتی و شەکەتییەکی زۆر کرد، ئەگەر بۆی بلوایە لەو دەقیقەیەدا بڕواتە جێگایەک، جێگایەک هەر خۆی بە تاقوتەنیا بووایە، تەنانەت هەموو تەمەنی هەر لەوێدا بمایەتەوە، بێگومان خۆی بە بەختەوەر دەزانی. بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە لەم دواییەدا، هەرچەند تا ڕادەیەک بەردەوام تەنیا بوو، وەلێ بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی هەستێکی ڕاستەقینەی تەنیایی بکات. هەندێکجار دەچووە دەرەوەی شار، لە شارێیەکەوە دەچووە لاڕێیەک، تەنانەت جارێکیان لە بێشەڵانێکەوە سەری دەرهێنا، وەلێ چەندە دەوروبەری چۆڵتر بووایە، زیاتر هەستی بە کەسێکی نزیک و بێزارکەر دەکرد. کەسەکە ترسناک

نەبوو، بەڵام بێزارکەر بوو، لەبەر ئەمە بەپەلە دەگەڕایەوە شار و ناو خەڵکی. دەچووە چایخانە و مەیخانە و مەیدانی "سننایا" و بازاڕ، لەو شوێنانەدا ئاسوودەتر دەبوو.

ئێوارەیەک لە ڕیستورانێکی هەرزانبەهادا گۆرانی دەوترا، سەعاتێکی ڕێک لەوێ دانیشت و گوێی گرت، پاشان بیری کردەوە کە کاتێکی زۆر خۆشی بەسەر بردووە. بەڵام هەر دوای ئەوە دیسان خەمۆکی دایگرتەوە. دەتوت ویژدانی ئازاری دەدات، بە خۆی دەوت: "لێرە دانیشتووم و گوێ لە گۆرانی دەگرم، وەلێ بەڕاست ئەمە کاری ئێستای منە؟" بەڵام دیسانەوە بەوەی دەزانی کە هۆی بێزارییەکەی تەنیا ئەو شتە نییە، بەڵکو شتێکی ترە کە دەبوو زۆر خێرا چارەسەر بکرێت. شتێکی زۆر دیار و ئاشکرا کە وشە ناتوانێت دەری ببڕێت. شتەکان وەک گلۆڵە پێکدا چووبوون. بە خۆی دەوت: "نا، شەڕ و ململانێکە چاکترە!" دیسانەوە پۆرفیری.. یان سڤیدریگایلۆڤ.. چاکترە زووتر ملیان نەدەمێ و پەلاماریان بدەم.. بەڵێ، بەڵێ! لە ڕیستورانتەکە هاتە دەرێ و تا ڕادەیەک کەوتە لۆقە. لەپڕێکدا و بێ ئەنگێزە بیری دایک و خوشکی سەراسیمەی دەکرد. لە یەکێک لەو شەوانەدا بوو کە بەرەبەیان خۆی لە دوورگەی "کرستۆڤسکی"[1] لە نێو دەوەنەکاندا دییەوە. لە سەرما چۆقەی دانی دەهات و لەرزوتا داگیری کردبوو، پاشان بەرەو ماڵەوە کەوتە ڕێ و پێش هەتاوکەوتن گەیشت. دوای ئەوەی چەند سەعاتێک نووست، لەرزوتاکەی ڕەوییەوە، بەڵام تا درەنگوەختێک چاوی نەکردەوە. لە سەعات دووی پاش نیوەڕۆدا لە خەو هەستا.

---

[1] *krestovsky*

ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری کەوتەوە کە تەرمی کاترینا ئیڤانۆڤنا لەو ڕۆژەدا لەگۆڕ دەنرێت، خۆشحاڵ بوو کە بەشداریی لە ڕێوڕەسمی ناشتنەکەدا نەکردبوو. ناستاسیا خواردنی بۆ هێنا، بە ئیشتیهاوە نان و ئاوی خوارد و تەنانەت هەستت دەکرد زۆر هەڵپەی خواردنی بوو، بیری ڕوونتر و حاڵی لە سێ ڕۆژی پێشوو باشتر بوو. تەنانەت سەریشی لەوە سووڕما کە چۆن لەوەوبەر ئەو هەستە ترسناک و سامناکانە دەستیان بەسەردا گرتووە. لەپڕێکدا دەرگاکە کرایەوە و ڕازومیخین هاتە ژووری.

ڕازومیخین کورسییەکەی هێنایە پێشەوە، بەرامبەر بە ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەر مێزەکە دانیشت و وتی:

- ها! نان دەخوات، کەواتە نەخۆشی چی!

ڕازومیخین لەوە دەچوو نیگەران بێت و نەیشیدەویست بیشارێتەوە. زۆر بە تووڕەیی و ڕاشکاوی قسەی دەکرد، بەڵام پەلەی نەبوو، دەنگیشی بەرز نەدەکردەوە. دەبوو بزانیت کە بیرێکی تایبەتی و تەنانەت نائاسایی لە مێشکدایە، بە دەنگێکەوە کە پێداگرتنی تیا بوو، وتی:

- گوێ بگرە، من لەوێ .. نەفرەت لە هەمووتان.. وەلێ کە ئێستا دەبینم، بە ئاشکرا دەبینم، کە ناتوانم هیچ تێبگەم.. تکا دەکەم، وا تێنەگەیت هاتووم لێکۆڵینەوەت لەگەڵدا بکەم.. بۆ دۆزەخ.. خۆم نامەوێت، تازە بێم و هەموو نهێنیی تۆ ئاشکرا بکەم. تەنانەت هەرگیز نامەوێت گوێ لەو جۆرە قسانە بگرم، لەوانەیە تف ڕۆکەم و بڕۆم، من تەنیا بۆ ئەوە هاتووم کە خۆم بێ پێچوپەنا لەوە تێبگەم کە ڕاستە تۆ شێتیت؟ ئاخر دەزانیت لەبارەی تۆوە بڕوایان وایە -هەندێکیان- کە تۆ یان شێتیت یان نزیکی لە شێتییەوە. بە ڕاستی دەڵێم من خۆیشم

لەوەدا بووم بڕوا بکەم، یەکەم لەبەر ئەوەی کە هەڵسوکەوتی تۆ گەوجانەیە، تا ڕادەیەکیش هێند نامەردانەیە، کە ناتوانیت پاساوی بدەیت. دووەم لەبەر ڕەفتاری دواییت لەگەڵ دایک و خوشکتا. کە تەنیا ئاژەڵ یان بەدڕەگەزێک، ئەگەر نەڵێم شێتێک دەیتوانی ئەو جۆرە ڕەفتارەیان لەگەڵدا بکات، کە تۆ لەگەڵیاندا کردت. کەواتە دەبێت تۆ شێت بیت.

- دەمێکە ئەوانت دیووە؟

- هەر ئێستا، تۆ لەوساوە نەتبینیوون؟ پێم بڵێ تۆ لە کوێیت؟ تا ئێستا سێ جار هاتووم بۆ لات. دایکت لە دوێنێوە بە ڕاستی نەخۆشە، دەیویست بێت بۆ لات، ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنا نەیهێشت. بەڵام ئەو گوێی لێنەبوو و دەیوت: "ئەگەر نەخۆش بێت، ئەگەر ئەقڵی لەدەست دابێت. بێجگە لە دایکی کێ کۆمەکی پێدەکات؟" هەمووومان ڕێک کەوتین و هاتین بۆ ئێرە، چونکە نەماندەتوانی بە تەنیا دەستبەرداری بین، تا نزیک ژوورەکەت هەر دڵمان دەدایەوە. هاتینە ژوورەوە، تۆی لێنەبوویت، لێرەدا دانیشت، دە دەقیقە دانیشت، ئێمەیش بەسەر سەریەوە وەستاین. پاشان هەستا و وتی: "کە لە ماڵ چووبێتە دەرەوە، مانای وایە باری تەندروستیی باشە و دایکی لە یاد کردەوە. خەجاڵەتی و ئابڕوچوونە دایک لەبەر دەرگا بوەستێت و وەک دەرۆزەکەر سواڵی خۆشەویستی و دڵدانەوە بکات".

کە گەڕایەوە ماڵێ لە جێگادا کەوت، ئێستایش تای لێهاتووە، دەیوت: "دیارە کاتەکەی هەر بەشی دڵدارەکەی دەکات". دایکت بڕوای وایە سۆنیا سمیۆنۆڤنا یان دەزگیرانتە یان دۆست، منیش نایزانم، بۆیە ڕاست چووم بۆ ماڵی سۆنیا سمیۆنۆڤنا، چونکە هاوڕێ، دەمویست هەموو شتێک بە چاکی بزانم، هاتم، بینیم تابوتێک دانراوە، منداڵ

دەگری و سۆنیا سمیۆنۆڤنایش بەرگی پرسەیان پێدەگرێت. تویش لە هیچ شوێنێکەوە دیار نەبوویت. تەماشایەکم کرد، داوای لێبووردنم کرد و هاتمە دەرێ. چووم بۆ لای ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنا و چیم دیبوو پێم وت. هەموو ئەم قسانە بێمانان، نە دۆست لەئارادایە نە دەزگیران، تەنیا شیمانەی شێتیەتی لە هەمووی زیاترە. وەلێ جەنابیشت دانیشتوویت و گۆشتاوی گا هەڵدەلوشیت. لەوە دەکات سێ ڕۆژ بێت هیچت نەخواردبێت. ڕاستە شێتەکانیش خواردن دەخۆن، هەرچەندە تۆ هێشتا هیچت پێنەوتووم، بەڵام تۆ.. شێت نیت! من سوێند دەخۆم، بە هیچ جۆرێک تۆ شێت نیت. کەواتە هەمووتان بۆ دۆزەخ بڕۆن، چونکە نهێنییەکتان لەژێر سەردایە، نهێنییەکە، منیش نامەوێت بە نهێنیی ئێوەوە سەر بنێمەوە.

ڕازومیخین بەدەم قسەکانەوە لە جێگاکەی هەستا و لەسەری ڕۆشت:

- تەنیا بۆ ئەوە هاتبووم جوێنت پێبدەم، هیچ لە دڵما نەهێڵم، ئەیشزانم ئیدی چی دەکەم.

- باشە، دەتەوێت چی بکەیت؟

- بە تۆ چی گەر بمەوێت هەرچییەک بکەم؟

- دەڕۆیت خۆت سەرخۆش دەکەیت.

- تۆ چۆن.. چۆنت زانی؟

- چۆن نایزانم، هیچی ناوێت.

ڕازومیخین کەمێک بێدەنگ بوو، لەپڕێکدا بە گەرمی وتی:

- تۆ هەمیشە مرۆڤێکی زۆر ئاقڵ بوویت، هەرگیزاوهەرگیز شێت نەبوویت. ڕاستە، دەمەوێت بڕۆم و بخۆمەوە. ماڵئاوا.

هەرکە کەوتە ڕێ ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:

- ڕازومیخین، وەک لە بیرم بێت سێ ڕۆژ لەمەوبەر لەبارەی تۆوە قسەم لەگەڵ خوشکما کرد.
ڕازومیخین وەستا. تەنانەت کەمێکیش ڕەنگی پەڕی و وتی:
- لەبارەی منەوە! ئاخر.. تۆ کەی سێ ڕۆژ لەمەوبەر دیوتە؟
لە قسەکانییەوە وا دەردەکەوت کە خەریکە دڵی دەکەوێتە پەلەپەل.
- بە تەنیا هاتبوو بۆ ئێرە، لێرەدا دانیشتبوو، لەگەڵما قسەی کرد.
- ئەو؟
- بەڵێ ئەو.
- باشە تۆ چیت پێوت.. مەبەستم ئەوەیە لەبارەی منەوە؟
- پێم وت تۆ کوڕێکی زۆر چاک و شەریف و کارامەیت. بەڵام دەربارەی ئەوەی کە تۆ خۆشت دەوێت، هیچم نەوت، چونکە ئەو خۆی دەیزانێت.
- خۆی دەیزانێت؟
- پێت سەیر نەبێت! بۆ هەر کوێ بچم، هەر بەڵایەکم بەسەر بێت، تۆ دەبیتە پشت و پەنایان. ڕازومیخین، من ئەوان بە تۆ دەسپێرم، بۆیە ئەمەت پێدەڵێم، چونکە دڵنیام تۆ زۆرت خۆش دەوێت، بڕوای تەواویشم بەوەیە کە تۆ هەستوسۆزێکی پاکت هەیە. ئەوەیش دەزانم ڕەنگە ئێستا ئەویش تۆی خۆش بوێت یان خۆشی ویستبێتی. جا ئێستا خۆت بڕیار بدە ئایا پەنابردنە بەر خواردنەوە چاکە یان نا؟
- ڕودیا گیان.. بڕوانە.. ئاە.. نەفرەت لە شەیتان! بەڵام تۆ دەتەوێت بۆ کوێ بچیت؟ گوێ بگرە.. ئەگەر ئەمانە بەشێکن لە نهێنییەکە، باوا بێت، وەلێ من.. من پەی بەو نهێنییە دەبەم، بڕوای تەواویشم هەیە کە هیچ نییە بێجگە لە قسەی هیچوپووچ و بێمانا، هەموو ئەمانە تۆ خۆت لە

تەنیاییدا دروستت کردوون. دەمەوێت ئەوەیش بڵێم کە تۆ مرۆڤێکی زۆر چاکیت، بەڵێ، مرۆڤێکی ڕەندیت.

- بەڕاست دەمویست ئەوەیش بڵێم و تۆ قسەکەت پێبڕیم. تۆزێک لەمەوبەر باشت وت کە پێویست ناکات ئەو نهێنییە بزانیت. ماوەیەک واز لەو بیرۆکانە بێنە و دوودڵ مەبە. لە کاتی خۆیدا لە هەموو شتێک تێدەگەیت. واتا ئەو کاتەی پێویست بکات. دوێنێ یەکێک پێی وتم مرۆڤ پێویستی بە هەوایە. هەوا، هەوا! ئێستا دەمەوێت بڕۆم بۆ لای ئەو کەسە بۆ ئەوەی تێبگەم مەبەستی چی بووە.

ڕازومیخین ڕاماو و شپرزە وەستابوو، دەیویست بڕیارێک بدات، لەپڕێکدا بە خۆی وت: "حەتمەن لە پیلانێکی سیاسیدایە، بێگومان وایە، دەیەوێت هەنگاوێکی گرنگ بنێت، گومانی تێدا نییە، بێجگە لەمە هیچی تر نییە و.. دونیایش دەیزانێت.."

پاشان بەدەم پچڕپچڕیی وشەکانەوە، وتی:

- کەواتە ئاڤدوتیا ڕومانۆڤنا دێت بۆ لات. تۆیش دەتەوێت ئەو کەسە ببینیت کە وتوویەتی مرۆڤ زۆر پێویستی بە هەوایە، بە هەوا.. کەواتە.. ئەو نامەیە.. پەیوەندیی بەم قسەیەوە هەیە..

ڕازومیخین دواڕستەی بە شێوەیەک کۆتایی پێهێنا، کە دەتوت قسە لەگەڵ خۆیدا دەکات.

- نامەی چی؟

- ئەمڕۆ نامەیەکی پێگەیشت زۆر نیگەرانی کرد، زۆر.. ویستم لەبارەی تۆوە قسەی لەگەڵدا بکەم بەڵام بێدەنگی کردم، دوایی وتی ڕەنگە بەم زووانە لە یەکدی جیا بینەوە، ئینجا بە گەرمی و لە خۆوە کەوتە سوپاسکردنی من، پاشان ڕاست چووە ژوورەکەی و دەرگاکەی بەست.

ڕاسکۆلنیکۆڤ دالغەی لێدابوو، پرسی:
- نامەی پێگەیشتبوو؟
- بەڵێ، نامە، بۆ نایزانیت؟ هوم.
هەردووکیان بێدەنگ بوون.
- ڕادیون، خواحافیز.. من هاوڕێ.. ڕۆژانێک بوو کە.. بەڵام، خواحافیز، ڕۆژێک لە ڕۆژان منیش.. باشە خواحافیز، دەبێت منیش بڕۆم، ناخۆمەوە، ئیتر پێویست ناکات..
ڕازومیخین پەلەی بوو، بەڵام لەو کاتەدا کە چووبووە دەرەوە و خەریک بوو لە دوای خۆیەوە دەرگاکە دابخات. لەپڕێکدا دەرگاکەی دیسان کردەوە و لە کاتێکدا کە لە شوێنێکی دەڕوانی، وتی:
- بەڕاست! کوشتنەکەت لە بیرە، ئەوەی کە پۆرفیری.. مەبەستم پیرێژنەکەیە؟ باشە، کەواتە با بزانیت بکوژەکەیان دۆزیوەتەوە. تاوانبارەکە خۆی دانی پێدا ناوە و هەموو بەڵگە و شایەتەکانی دەرخستووە، یەکێکە لەو کرێکارانەی بۆیەیان دەکرد.. ئینجا بزانە.. ئەگەر لە بیرت بێت.. ئەوانەی من بەرگریم لێدەکردن.. لە بیرتە؟ چ دیمەنێکی شەڕ و پێکەنینیان لەسەر پلیکانەکان لەگەڵ هاوڕێکەیدا پێک هێنابوو، لەو کاتەدا کە دەرگاوان و دوو شایەتەکەیش لە پلیکانەکانەوە سەردەکەوتن. هەر بە دەستی ئانقەست ئەمەیان دروست کردبوو بۆ چەواشەکردنی خەڵکەکەی ئەوێ، جا بڕوانە! چ زرنگییەک، چ زەینێکی ئامادە و بەتوانا لەم تووتکەسەگەدا هەیە! باوەڕ ناکەیت. بەڵام خۆی هەموو شتێکی ڕوون کردۆتەوە و دانی پێدا ناوە، من چەندە هەڵە بووم! باشە، من وا دەزانم لە خۆدزینەوە و فێڵبازیدا بلیمەتە و لە ڕێونکردنی دادوەردا دەگمەنە. بەهەرحاڵ، پێویست بە سەرسووڕمانی زۆر ناکات! بۆ نابێت مرۆڤی لەم بابەتەیش هەبێت!

بەڵام کە خۆی پێنەگیرا و دانی بە تاوانەکەدا نا، ئەمە زیاتر جێبڕوای منە و ئەمیان لە ڕاستییەوە نزیکترە!.. وەلێ من. من خەڵەتابووم، ئامادەبووم لە پێناویاندا گیانی خۆم ببەخشم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ نیگەرانیی پێوە دیاربوو، پرسی:

- حەز دەکەم پێم بڵێی تۆ ئەمەت لە کوێوە زانی؟ بۆ ئەمەندەیش مەسەلەکەت لا گرنگە؟

- ئا، بۆ لام گرنگە! پرسیارێکی سەیرە!.. من ئەمەم لە پۆرفیری و خەڵکی تر بیستووە.. هەر زیاتر لەوەوە..

- لە پۆرفیرییەوە؟

- بەڵێ، لە پۆرفیرییەوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ ترسا و پرسی:

- چی.. چی پێوتیت؟

- زۆر بە چاکی بۆی شی کردمەوە، شیکردنەوەیەکی سایکۆلۆژییانە، بە شێوازەکەی خۆی.

- شیکردەوە، خۆی بۆی ڕوون کردیتەوە؟

- بەڵێ، بەڵێ، خۆی، خواحافیز، دوایی شتی تریشت بۆ باس دەکەم، وەلێ ئێستا کارم هەیە، پێشتر جۆرێکی دی.. وام بیر دەکردەوە.. باشە دەی، گرنگ نییە، دوایی.. ئیتر هیچ هۆکارێک نییە بۆ مەیخواردنەوە، تۆ بەبێ مەی مەستت کردم، ڕودیا گیان، من مەستم. بێ شەراب مەستم، باشە، ماڵئاوا، دەگەڕێمەوە، زۆر زوو..

ڕازومیخین چووە دەرێ، لەو کاتەدا کە بە هێوری لە نەردەوانەکانەوە دەچووە خوارێ بڕوای تەواوی هەبوو کە: "هیچ گومانی تیا نییە کە لە پیلانێکی سیاسیدایە، حەتمەن، حەتمەن. خوشکەکەی تێوە گلاندووە، ئەم کارە لەگەڵ خووڕەوشتی ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنادا زۆر ڕێک

دەکەویت، ئیستا بە نهێنی پێک دەگەن.. خودی دونیاییش ئاماژەیەکی بەمە دا، گەلێک لە قسە و وشە و ئاماژەکانی ئەوەیان دەردەخست. ئەگینا ئەم هەموو بەدحاڵیبوونە چۆن لێک دەدرێتەوە؟ هوم.. خۆیشم لە گومانکردنەوە نزیک بووم.. ئاه، خودایا! خەیاڵم لە چی دەکردەوە! سەرم پڕ ببوو، بەڵێ، جۆرێک بوو لە بەدبینی، من بەرانبەر بە ڕودیا گوناهبارم! بەڵام خۆی منی بە هەڵەدا برد، ئەو ئێوارەیە، لە ڕاڕەوەکەدا و نزیک بە چراکە، ئاه.. چ بیرێکی قێزەون و ناقۆڵام تێگەڕا؟ ئافەرین نیکۆلا بۆ دانپیانانت، ئیتر ئێستا، هەموو ڕووداوەکانی پێشوو بە چاکی ڕوون دەبنەوە، نەخۆشیی ئەوسای ڕودیا، هەموو هەڵسوکەوت و ڕەفتارە سەیرەکانی، تەنانەت پێش ئەوەیش، ئەو کاتەی لە زانکۆ بوو، بەردەوام مۆن و خەمۆک بوو.. باشە، بەڵام ئەی ئەو نامەیە چۆن؟ نهێنییەک لەمەیشدا هەیە! نامەکە لە کوێوەیە؟ وا دەزانم.. هوم.. لە هەمووی دەکۆڵمەوە".

پاشان بیری لە دونیا و ئەو قسەوباسانە کردەوە، کە پەیوەندییان بەوەوە هەبووە، دڵی بە ترپە کەوت و لەپڕێکدا بەپەلە کەوتە ڕێ.

کە ڕازومیخین لە ژوورەکە چووە دەرەوە، ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستا لە پەنجەرەکە نزیک کەوتەوە، لە پێشا بەرەو گۆشەیەک و پاشان بەرەو گۆشەیەکی تری ژوورەکە هەنگاوی نا، وەک ئەوەی مەودای ژوورە تەنگەکەی فەرامۆش کردبێت وابوو.. دیسان لەسەر قەرەوێڵەکە دانیشتەوە، لەوە دەچوو تەواوی گیانی تازە بووبێتەوە: "دیسانەوە کێشە، کەواتە ڕێگەچارەیەک پەیدا بووە! بەڵێ، ڕێگەچارەیەک هەیە". کەمیی هەوا و هەستی هەناسە بەتەنگهاتن ئازاری دەدا و تەنانەت لەوەدا بوو بێهۆش بێت، لەو کاتەوە کە لە ماڵی پۆرفیری نیکۆلای دیبوو، ئەو هەستی خەفەبوون و بەتەنگهاتنەی تێگەڕابوو، دوای ئەو

دیمەنەی نیکۆلا، ئەو ڕۆژەیش کە لەگەڵ سۆنیادا قسەی کردبوو، تەواو بە پێچەوانەی ئەوەوە کە پێشتر بیری لێدەکردەوە، شکابووەوە.." لەپڕێکدا ڕاسکۆلنیکۆڤ هەرەسی هێنابوو، بە تەواوی، خۆی لای سۆنیادانی پێدا نا، لە خۆیەوە و بێ ئەوەی ناچار کرابێت، لە ناخی دڵەوە، دانی پێدا نا کە ئەو کێشەیەی قورسایی لەسەر دڵی داناوە، ناتوانێت بە تەنیا هەڵیبگرێت. بەڵام ئەی سڤیدریگایلوف؟ سڤیدریگایلۆڤ مەتەڵێکە بۆ خۆی، ڕاستە سڤیدریگایلۆڤ تووشی دوودڵیی کردووە، بەڵام بە تەواوی لەلایەکی ترەوە. ڕەنگە لەگەڵ سڤیدریگایلوفیشدا تووشی شەڕێک ببێت. ڕەنگە خودی سڤیدریگایلوف ڕێگەچارەکەی بێت، بەڵام پۆرفیری بە تەواوی شتێکی ترە، تازە پۆرفیری خۆی باسەکەی لای ڕازومیخین کردۆتەوە، لە ڕووی دەروونزانییەوە کۆڵیویەتەوە. دیسانەوە لە سایکۆلۆژیەتە نەفرەت لێکراوەکەیەوە دەستی پێکردووە. بەڵام ئەم پۆرفیرییە؟ دوای ئەوەی پێش هاتنی نیکۆلا لە نێوان ئەم و ئەودا ڕووی دا و، پاش ئەوەی نیکۆلای هاتە ژووری، دەشێ بۆ دەقیقەیەک بڕوا بەوە بکات کە نیکۆلا تاوانبارە؟ ئایا ئەو دیمەنە بێجگە لە تاکە ئەنجامگیریەکی ڕاست هیچ لێکدانەوەیەکی تر هەڵدەگرێت؟" لەم ڕۆژانەی دواییدا چەندینجار وردە دیمەنی گفتوگۆکەی لەگەڵ پۆرفیریدا بیر دەکەوتەوە و بە بەرچاویدا تێدەپەڕی، بەڵام بەیادهێنانەوەی تەواوی دیمەنەکە هەرگیز لە توانایدا نەبوو. ئەوەی لەو ماوەیەدا لە نێوان ڕاسکۆلنیکۆڤ و پۆرفیریدا ڕووی دابوو، لە قسە و ئاماژە و نیگاکردنی یەکدی و ئەو وشانەی بە جۆرە تۆنێک وترابوون، هەموو ئەمانە بەرئەنجامێک بوون کە لە دوای ئەوەوە نیکۆلا "کە پۆرفیری هەر لە قسە بەراییەکانیەوە لە هەقیقەتەکەی گەیشتبوو"، نەیدەتوانی بڕوای پۆرفیری لەق بکات.

"دەبینیت! تەنانەت ڕازومیخینیش لە بەدگومانی نزیک کەوتبووەوە.. دیمەنی پارەوەکە، کە لە نزیک چراکەوە ڕووی دا، هەروا بەلاش نەبوو، بەڵکو وای لێکرد بکەوێتە دوای پۆرفیری.. بەڵام بۆ پۆرفیری ویستوویەتی چەواشەی بکات؟ بۆ دەیەوێت سەرنجی ڕازومیخین بە لای نیکۆلادا ڕابکێشێت؟ ئامانجی چییە؟ بێگومان مەبەستێکی لە دواوەیە، بەرژەوەندییەکی خۆی تێدایە، بەڵام چییە؟ ڕاستە لە دوای ئەو بەیانییەوە ماوەیەک تێپەڕیووە، ماوەیەکی زۆریش، وەلێ لە پۆرفیرییەوە هیچ هەواڵێک نییە، بێگومان ئەمە بە چاک ناگەڕێت.."
ڕاسکۆلنیکۆڤ کڵاوەکەی هەڵگرت و بەدەم بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە لە ژوورەکەی هاتە دەرەوە. ئەوە تاکە ڕۆژێک بوو، بە درێژایی هەموو ئەو ماوەیە، کە بە تەواوی هەست بە هۆشیاریی خۆی بکات. بیری کردەوە: "دەبێت کار لەگەڵ سڤیدریگایلۆڤدا یەکلایی بکرێتەوە، تا زوویشە ئەمە بکرێت، وا دەزانم ئەو چاوەڕێیە من بچم بۆ لای". لەو چرکەساتەدا ڕق و بێزارییەکی وا لە دڵی پڕ ئازاری ڕاسکۆلنیکۆڤ گەڕا، کە ڕەنگە ویستبێتی لەو کاتەدا، یەکێک لەو دووانە بکوژێت: سڤیدریگایلوف یان پۆرفیری، هیچ نەبێت هەستی کرد کە نەک ئێستا، بەڵکو لە ئاییندەدا توانای ئەو کارەی دەبێت. لە دڵی خۆیدا وتی: "دەبینین، دەبینین".

هەر کە دەرگای داڵانەکەی کردەوە. لە ناکاوێکدا لووتی بە لووتی پۆرفیرییەوە تەقی. پۆرفیری بۆ لای ئەو دەهات. ڕاسکۆلنیکۆڤ وەک لە شوێنی خۆیدا وشک بووبێت وابوو، بەڵام تەنیا بۆ چرکەساتێک و بەس، سەیر لەوەدا بوو کە ئەو لە بینینی پۆرفیری زۆر سەری سووڕ نەما و تەنانەت تا ڕادەیەکیش لێی نەترسا، تەنیا تەزوویەکی پێدا هات، بەڵام زۆر زوو هاتەوە سەرخۆی "ڕەنگە ئەمە کۆتایی کارەکە بێت!

بەڵام چۆن ئاوا بە بێدەنگی، وەک پشیلەیەک هاتە پێشێ و من هیچم گوێ لێنەبوو؟ تۆ بڵێی لەبەر دەرگاکە گوێی نەگرتبێت؟"

پۆرفیری پتروڤیچ بە پێکەنینەوە وتی:

- ڕادیون ڕومانوڤیچ چاوەڕێی میوان نەبوویت! ماوەیەکە دەمویست سەرت لێبدەم، ئێستا کە بیرەدا تێپەڕیم، وتم بۆچی بۆ ماوەی پێنج دەقیقە نەیەم و هەواڵت نەپرسم، وابزانم دەتەوێت بڕۆیت بۆ جێگایەک؟ من دواتان ناخەم، تەنیا ئەگەر مۆڵەتم بدەیت، جگەرەیەک بکێشم.

- فەرموو، پۆرفیری پیترۆڤیچ، فەرموو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کورسییەکی بۆ دانا، بە ڕووکەش هێند خۆشیی لە میوانەکەی هات و ڕێزی گرت، ئەگەر بیتوانیایە خۆی ببینێت بێگومان سەری لە خۆی سووڕ دەما. دوا توانا و هێزی خۆی بەکارهێنا بۆ شاردنەوەی هەستی پێشووی. ڕێ دەکەوێت هەندێکجار مرۆڤ بۆ ماوەی نیو سەعات تووشی ترسێکی تۆقێنەر بێت لە بەردەم چەتەیەکدا، تا ئەو ساتەی چەتەکە چەقۆ دەخاتە سەر ملی، ئەوسا لەپڕێکدا هەرچی ترس هەیە لە لەشیا نامێنێت. ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕێک بەرانبەر بە پۆرفیری دانیشت، بێ ئەوەی چاوی لێ بتروکێنێت، تەواو لێی ڕاما.

پۆرفیری چاوی تەنگ کرد و جگەرەیەکی داگیرساند:

"دەی، فەرموو قسە بکە، قسە بکە، ئاخر بۆ نایڵێیت، بۆ قسە ناکەیت؟"

ڕاسکۆلنیکۆڤ گەلێک زۆری لە خۆی کرد تا ئەو وشانە نەڵێت، کە دەتوت لە سنگیا پەنگیان خواردۆتەوە و دەیانەوێت بکەونە سەر زاری..

## ٢

سەرئەنجام دوای ئەوەی پۆرفیری پیترۆڤیچ مژی لە جگەرەکەیدا و دووکەڵەکەی ڕادا، کەوتە قسە:

- داخ لە دەست جگەرە! ژەهرە، ژەهرێکی تەواوە بۆ خۆی، بەڵام ناتوانم دەستبەرداری بم، دەکۆکم، گەرووم دەخورێ و تووشی تەنگەنەفەسی بووم، دەزانیت، دەیشترسم، لەم ڕۆژانەدا چووم بۆ لای دوکتۆر (ب...) ئەو بە لایەنی کەمەوە نیو سەعات لە هەر نەخۆشێک دەڕوانێت، وەلێ هەر ئەوەندەی منی بینی، دایە پێکەنین: بیستەکەکەی لە گوێ ناو بە پشتیدا کێشام، پاشان وتی: "با پێت بڵێم جگەرەکێشان خراپە بۆت، سیەکانت گەورە بوون". باشە، بەڵام چۆن دەستی لێهەڵبگرم؟ بە چی قەرەبووی بکەم؟ مەی ناخۆمەوە، ئەمە سەرچاوەی کێشەکەیە، هە، هە، هە. بەڵێ خەوشی من ئەوەیە مەیخۆر نیم، ئاخر هەموو شتێک ڕێژەییە، ڕادیون ڕومانوڤیچ. هەموو شتێک ڕێژەییە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە بێزارییەوە بیری کردەوە: "چی دەکات، ئایا دەیەوێت بکەوێتەوە سەر کەڵەک و کڵۆکەکانی پێشووی؟"

لەپڕا دیمەنی دوادیداری هەردووکیانی هاتەوە بەرچاو و هەستی ئەو ساتەوەختانە وەک شەپۆل دڵیان داگرت.

پۆرفیری پیترۆڤیچ لەو کاتەدا کە چاوی بە ژوورەکەدا دەگێڕا، کەوتەوە دوای قسەکانی:

- دەزانیت، سێ ڕۆژ لەمەوبەر، سەر لە ئێوارەیەک هاتم بۆ لات، بەڵام تۆ لێرە نەبوویت، هاتمە ئەم ژوورە، ئەو ڕۆژەیش هەر وەک ئەمڕۆ بێرەدا تێدەپەڕیم، بیرم کردەوە وا چاکە سەری لێبدەم، هاتمە ژوورەوە، دەرگای ژوورەکەتان بە تەواوی کرابووەوە، لەملاوئەولام

ڕوانی، چاوەڕێم کرد، وەلێ تەنانەت کارەکەرەکەیشتانم نەدی و چوومە دەرێ. تۆ لە ژوورەکەتدا ئۆقرە ناگریت!
دەموچاوی ڕاسکۆلنیکۆڤ گرژ و گرژتر بوو، وەک ئەوەی پۆرفیری بیری ئەوی خوێندبێتەوە، لەسەر قسەکانی ڕۆشت:
- هاتووم ڕادیون ڕومانوڤیچی بەڕێز، داوای لێبووردنت لێبکەم، لەبارەی ڕەفتاری خۆمەوە، ڕوونکردنەوەیەکم هەیە.
بەدەم قسەکردنەوە دەستێکی خۆشەویستانەی بە ئەژنۆی ڕاسکۆلنیکۆڤدا کێشا، بەڵام تا ڕادەیەک دەموچاوی هەمان حاڵەتی جیدی و ڕامانی هەبوو، تەنانەت ڕاسکۆلنیکۆڤ وای هاتە بەرچاو کە خەم دەموچاوی داپۆشیووە، ڕاسکۆلنیکۆڤ هەرگیز ئەوەی بە بیردا نەهاتبوو کە پۆرفیری خاوەنی دەموچاوێکی وابێت.
- ڕادیون ڕومانوڤیچ، دوادیدارمان دیمەنێکی زۆر سەیری تیا ڕوودا. ڕاستە لە یەکەم دیداریشدا هەر دیمەنەکە سەیر بوو، بەڵام ئەوسا.. وەلێ ئێستا ئیدی هەموو شتێک تێپەڕیووە! دەزانیت، ڕەنگە من بەرانبەر بە تۆ زۆر ناهەقیم کردبێت، من هەست بەوە دەکەم، لە بیرتە، ئەو کاتەی لە یەکتری جیا بووینەوە، دەمارت شەکەت و ئەژنۆت دەلەرزی. منیش وەک تۆ دەمارم شەکەت و ئەژنۆم کەوتبووە لەرزین. دەزانیت، ئەوەی لە نێوانماندا ڕووی دا، حاڵەتێکی شایستە و لایەق نەبوو. بەڵام ئێمە هەرچۆنێک بێت، کەسانێکی شایستەین، مەبەست ئەوەیە، هەرچۆن بێت، لە پێش هەر شتێکدا ئێمە کەسانێکی شیاوین، نابێت ئەوە لە یاد بکرێت، ئاخر لە بیرتە کار گەیشتە چ ئاستێک.. تەواو بارێکی ناجۆر هاتە پێش.
ڕاسکۆلنیکۆڤ سەری بڵند کرد و چاوی بە پۆرفیرییەوە ئەبڵەق بوو، بە سەرسامییەوە لە خۆی پرسی: "چی دەوێ، من بە چی دەزانێت؟"

پۆرفیری پترۆڤیچ کەمێک سەری بە لادا خست و چاوی لە زەوی بڕی، وەک ئەوەی نەیەوێت لەمە زیاتر بە ڕوانینەکەی نێچیرە کۆنەکەی بشڵەژێنێت، بە جۆرێک کە بڵێیت دەستی لە فڕوفێڵەکەی جارانی کێشاوەتەوە، لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو:

- من بۆ ئێستا وای بە چاک دەزانم کە ڕاستوڕەوان لەگەڵ یەکتردا بدوێین، بەڵێ، ئەو بەدحاڵیبوون و دیمەنانە با دووبارە نەبنەوە، ئەوسا نیکۆلا گرفتەکەمانی چار کرد، ئەگەر ئەو نەبووایە، من نەمدەزانی سەری بەسەرهاتەکە لە کوێوە دەردەچێت. ئەو ڕۆژە، ئەو کابرا پیشەکارە نەفرەت لێکراوە، ماوەیەک لە پشت تیغەی ژوورەکەی منەوە گوێی گرتبوو، تۆ دەتوانیت وێنای بکەیت؟ بێگومان تۆ دەیزانیت و منیش خۆم دەیزانم کە ئەو کابرایە دوای ئەوەی لای منەوە هاتۆتە دەرێ، هاتووە بۆ لای تۆ، بەڵام ئەوەی کە تۆ ئەوسا خەیاڵت بۆی دەچوو، وا دەرنەچوو: من نەمناردبوو بە دوای کەسدا، هیچ فەرمانێکیشم نەدابوو. دەپرسیت بۆ هیچم نەکردبوو؟ چی بڵێم؟ تەواوی کارەساتەکە گێژ و وڕی کردبووم، تەنانەت بە زەحمەتیش توانیم بنێرم بە دوای دەرگاوانەکاندا (بێگومان تۆ لە کاتی تێپەڕینتا دەرگاوانەکانت دیبوو) لەو کاتەدا خێرا وەک بروسکە شتێکم بە بیردا هات.. تۆ دەزانیت ڕادیون ڕومانوڤیچ، من لەوکاتەدا تەواو دڵنیا بووم، لەگەڵ خۆمدا بیرم کردەوە: "لێگەڕێ بۆ ماوەیەک شتێکم لە دەست بچێت، لەباتیی ئەوە شتێکی دی تەواو دەگرم و ناهێڵم لە دەستم دەربچێت" تۆ ڕادیون ڕومانوڤیچ، زۆر زوو توورە دەبیت، سروشتی تۆ وایە، بەڵێ، ئەمە تایبەتمەندیی ڕەوشت و خووی تۆیە، من وا دەزانم، شانازیشی پێوە دەکەم، کە تا ڕادەیەک لەوە گەیشتووم تۆ خاوەنی ئاکار و دڵێکی بەهاداریت. چاکە، هەڵبەتە تەنانەت من خۆیشم

لەو شوێنەدا نەمتوانی پێشبینیي ئەوە بکەم کە شتێکی وا ڕوو دەدات. یەکێک هەستێ و هەرچی هەیە و نیەی خۆیەتی، ئاشکرای بکات، ڕاستە بەسەرهاتی وا، بەتایبەتی کاتێک مرۆڤ بە تەواوی سەبری لەبەر بڕابێت، دەشێت ڕوو بدات، بەڵام ئەمە زۆر دەگمەنە، من ئەمەیشم دەزانی، بەڵام بیرم کردەوە و وتم: نا، من بە شتێکی بچووک زۆر بچووک، زۆر زۆر بچووکیش قایلم، بەڵام شتێک بێت هەستی بکەیت و بەرجەستە بێت، نەک دیسانەوە لەسەر بنەمای سایکۆلۆژی. بیرم دەکردەوە، ئەگەر یەکێک تاوانبار بێت، بێگومان دەتوانیت بەڵگەیەک یان شتێکی دیاری لێ بەدەست بێنین. تەنانەت لەم مەسەلەیەدا دەشێ بە تەمای ئەنجامی گەلێک چاوەڕواننەکراو بێت. زیاد لە هەر شتێک ڕادیون ڕومانوڤیچ، من لەو کاتەدا حسابم بۆ ڕەوشت و خووی تۆ دەکرد! لەو شوێنەدا گەلێک ئومێدم پێت بوو.
سەرئەنجام ڕاسکۆلنیکۆڤ بێ ئەوەی بە چاکی دەرکی پرسیارەکەی کردبێت، کەوتە گنەگن:
- ئاخر، تۆ.. ئاخر تۆ بۆ بەم جۆرە قسەم لەگەڵ دەکەیت؟
لە ناو کۆمەڵێک گومان و گریمانەدا، لە خۆی پرسی: "مەبەستی چییە، تۆ بڵێی بە ڕاستی من بە بێتاوان بزانێت؟"
- بۆ بەو جۆرە قسە دەکەم؟ هاتووم شتەکان ڕوون بکەمەوە، چونکە ئەوە بەشێکە لە ئەرکە پیرۆزەکەم، دەمەوێت هەموو شتێکت بە تەواوی پێ بڵێم، ئەو ناکۆکییەی لە نێوان من و تۆدا ڕووی دابوو، ڕادیون ڕومانوڤیچ، من ئازاری تۆم زۆر داوە، بەڵام من کێوی نیم، چونکە منیش باش لەوە دەگەم کە بەرگەگرتنی ئەم هەموو کارەساتە، بۆ کەسێکی خەمبار بەڵام لووتبەرز و بەتوانا و بێتاقەت، بەڵێ.. بەتایبەتی بێتاقەت، تا چ ڕادەیەک دژوارە! بەهەرحاڵ، من تۆ بە

مرۆیەکی بێئەندازە شەریف دەزانم، کە تەنانەت دەتوانێت ببێتە پیاوێکی زۆر مەزن، هەرچەندە من لەگەڵ هەموو بیروباوەڕێکتا نیم، بە ئەرکی خۆیشمی دەزانم کە لە پێشەوە ڕاستوڕەوان و بە تەواوی بڕواوە ئەمەت پێبڵێم، چونکە نامەوێت بە هیچ جۆرێک تەفرەت بدەم، لەبەر ئەوەی تۆم ناسیووە و هەستم بە پەیوەندییەکی خۆشەویستی کردووە. ڕەنگە گاڵتەت بەم قسانەم بێت، هەقی خۆتە، دەزانم لە یەکەم نیگاتەوە تۆ منت خۆش نەویستووە، هەرچەندە هیچیش ڕووی نەدابوو، چۆنت دەوێت، وا بیری لێبکەرەوە، بەڵام دەمەوێت ئێستا بە هەموو توانامەوە، ئەو ئاسەوارە ناشیرینەی لە تۆدا بەجێم هێشتووە، بیسڕمەوە، ئەوەیش بسەلمێنم کە منیش مرۆڤێکم هەست و ویژدانم هەیە. زۆر بە ڕاستگۆییەوە ئەمەت پێدەڵێم.

پۆرفیری پیترۆڤیچ بە ویقارەوە بێدەنگ بوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستی بە هێرشی ترسێکی تر کردەوە. بیری لەوە کردەوە کە پۆرفیریش بە بێتاوانی بزانێت، بۆیە لەپڕێکدا ترسی لێنیشتەوە.

پۆرفیری کەوتەوە قسە:

- ڕەنگە پێویست نەکات چۆنیەتیی ڕووداوەکە، بە وردی و وەک خۆی چۆنە، باس بکەم، تەنانەت وا دەزانم زیادیشە، بێجگە لەوە کە لە توانای مندا نییە، لەبەر ئەوەی بەڕاست چۆن بتوانم هەموو لایەنەکانی مەسەلەکە بە وردی باس بکەم؟ لە سەرەتادا دەمگۆیەک داکەوت، دەمگۆکە چۆن و لە کوێ و و لە کێوە بوو؟ بە چ هۆیەکەوە هاتە سەر تۆ، دیسانەوە بە لای منەوە ئەم باسانەیش هەر زیادن. لە لایەن منەوە کارەکە بە ڕێکەوت پێش هات، مەبەستم ئەوەیە لە پێشهاتێکەوە کە دەشێ ڕوو بدات یان ڕوو نەدات. چ پێشهاتێک؟ هوم، وا دەزانم پێویست بە وتن ناکات، هەموو ئەمانە، واتا هەم دەمگۆ و هەم

پێشهاتەکە لەو شوێنەدا بۆ من بوو بە بیرۆکەیەک، بە ڕاستی دانی پێدا دەنێم، چونکە کە کار گەیشتە دانپیانان، دەبێت مرۆڤ ڕاشکاوانە دانپیانانەکەی ئەنجام بدات. من یەکەم کەس بووم تۆم تاوانبار کرد. هەموو نووسینی پیرێژنەکە لەسەر ئەو شتانەی بە بارمتە لای دانرابوون و شتی تری لەو بابەتانە، قسەی بێمانان و کەس بە پولێکیان ناکرێت، بە ڕێکەوتیش توانیم بە وردی ئاگاداری ئەو دیمەنە بم کە لە بەشی پۆلیس ڕووی دابوو، ئەمەیش هەر بە ڕێکەوت بوو. بەڵام نەک ئەوەی هەر ئاوا بەرگوێم کەوتبێت، نا، بەڵکو ئەوەی بۆی گێڕاومەتەوە، یەکێکی خاوەن کەسایەتی و گرنگ بوو، کە بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت، دیمەنەکەی بە شێوەیەکی هێند سەیر پیشان دا، کە زیاتر لە زەینی خۆیدا بەرجەستەی کردبوو، هەموو ئەم شتانە پێکەوە یەکانگیر بوون، بەڵێ یەکیان گرت، بەڕێز و ئازیز، ڕادیون ڕومانوڤیچ، باشە، چۆن دەبێت مرۆڤ بۆ شتێکی تایبەت نەچێت؟ "هەرگیز نە لە سەد کەروێشک ئەسپێک دروست دەکرێت، نە لە سەد گومانیش بەڵگەیەکی ڕاستی". ئەمە پەندێکی ئینگلیزییە. پەندێکە لە هزرێکی تەندروستەوە هاتووە. بەڵام ئەی مەیلەکان، چی لەگەڵ مەیلدا دەکەیت! کێ دەتوانێت بەسەریا زاڵ بێت؟ دادوەری لێکۆڵینەوەیش لە دواییدا هەر مرۆڤە، لێرەدا بیری ئەو وتارەم کەوتەوە، کە لە گۆڤارێکدا نوسیبووت، لە بیرتە لە یەکەم دیدارماندا بە دوورودرێژی لە بارەیەوە قسەمان کرد. لە سەرەتادا گاڵتەم پێکردیت، لەبەر ئەوەی کە دەمویست سەری قسەت لەگەڵدا بکەمەوە تا دانی پێدا بنێیت، دووبارەی دەکەمەوە، ڕادیون ڕومانوڤیچ، تۆ زۆر کەمحەوسەڵەیت و زوو تووڕە دەبیت، بێجگە لەمانە ئازا و لووتبەرز و جیدیت.. لەڕادەبەدەریش هەستت دەوروژێت.. پێشتر دەمێک بوو ئەمانەم

دەزانی، گشت ئەو هەست و مەبەستانەی لە وتارەکەتدا هەبوو، پێیان ئاشنا بووم، وتارەکەتم، وەک وتاری هاوڕێیەکم خوێندەوە، ئەو وتارە زادەی شەوانێکی بێخەوی و نائومێدی بوو، ئەو کاتانەی دڵت لە خورپە و ترپەدا بوون و هەستە گەرمەکانیشت سەرکوت کرابوون. وەلێ ئەو هەستە توند و غرورە چەپێنراوانە لە لاودا مەترسی هەیە. ئەوسا گاڵتەم پێدەکردیت. بەڵام ئێستا پێت دەڵێم کە ئەو هەستانەم زۆر خۆش دەوێت، مەبەستم ئەوەیە بەگشتی حەزم بە ئەزموونگەریی لاوانە، لە دووکەڵ و تەمێک دەچێت لە ناو تەپوتۆزدا هەستی پێبکەیت، وتارەکەت بێبنەما و زادەی خەیاڵی خۆت بوو، بەڵام ڕاستگۆییەکی لەڕادەبەدەری تیا دەبینرا، فیزی گەنجی و خۆبەدەستەوەنەدان.. بوێرییەک کە سەرچاوەکەی نائومێدییە. وتارەکە سەنگین و خەماوییە، ئەمە باشە، وتارەکەتم خوێندەوە و نامە لاوە.. کە خستمە لاوە، هەر ئەو کاتە بیرم کردەوە: "کاری ئەم پیاوە هەروا ئاسان تەواو نابێت". باشە، ئێستا خۆت بیڵێ. بە هەموو ئەم پێشەکییانەو ئەوەی بەدوایدا هات، چۆن دەتوانیت ئەو ئەنجامگیرییە نەکەیت! خودایا! چی بڵێم؟ دەتوانم چی بسەلمێنم؟ لەو شوێنەدا تەنیا بیرم لەوە کردەوە چی لەو وتارەدا هەیە؟ زانیم وتارەکە ناکاتە هیچ بەڵگەیەک، واتا هیچ، هیچ شتێک ناسەلمێنێت، بۆیە زانیم بەدواداچوون و حەماسەت نواندن، بە هیچ جۆرێک کاری یەکێکی وەک من نییە: ئێستا نیکۆلام بە هەموو بەڵگەیەکی سەلمێنەرەوە لەبەردەستایە. بتەوێ یان نا، بەڵگەن، بەڵگەی تەواو سەلمێنەر. بۆیە دەبوو منیش بگەڕێمەوە سەر لایەنی دەروونی، چونکە ئەوە پێویستیی منە، بە خۆم وت: مەسەلەکە بە نیسبەت ئەوەوە مەسەلەی ژیان و مەرگە. بۆ ئێستا هەموو ئەمانەت بۆ باس دەکەم؟ بۆ ئەوەی ڕاستییەکە بزانیت، بە گیان و دڵ لەسەر ئەو

دڵڕەقییەی ئەو ڕۆژە لەگەڵما کردیت، بڕیار نەدەیت و چاوپۆشیم لێبکەیت. من ئەمە بە ڕاستی دەڵێم. ڕەفتارم لە دوژمنایەتییەوە نەبوو. هە، هە، هە! تۆ چۆنی لێک دەدەیتەوە، ئەو کاتەی هاتم بۆ ماڵتان، بۆ لێکۆڵینەوە هاتبووم یان نا؟ هاتبووم، هە، هە، هە، هاتبووم، ئەو کاتەی تۆ نەخۆش بوویت و لە ناو جێگادا کەوتبوویت، بە شێوەی ڕەسمی نەهاتبووم، وەڵێ هاتم، کونوقوژبنی ژوورەکەتم پشکنی، هەر لە سەرەتای گومانکردنەکەوە ئەوەم کرد. بەڵام بێهودە بوو. بە خۆم وت: "ئەم پیاوە خۆی دێت بۆ لام، خۆی دێت و بەم زووانەیش دێت چونکە تاوانبارە، حەتمەن دێت، ئەگەر تاوانبار یەکێکی تر بێت، نایەت، بەڵام ئەگەر ئەم بێت هەر دێت".
لە بیرتە چۆن جەنابی ڕازومیخین دڵرەقانە قسەی لەگەڵ کردیت؟ ئێمە خۆمان ئەوەمان تەگبیر کرد بۆ ئەوەی بتخرۆشێنین، بێ ئەوەی پێبزانێت وامان لێکرد خۆی بۆ نەگیرێت و سەرکۆنەت بکات، چونکە خودی ڕازومیخین مرۆڤێکە توانای شاردنەوەی ڕق و بێزاریی خۆی نییە. تووڕەبوون و بوێرییە توندەکەی تۆ، لە پێش هەر شتێکدا سەرنجی زامیوتوفی بەڕێزی ڕاکێشا، یەعنی هەر ئەو کاتەی کە لە ڕیستورانەکەدا لەپڕا هاوارت کرد "من کوشتوومە" ئەمە ئازایەتییەکی شێتانە بوو. من لای خۆمەوە بیرم کردەوە کە ئەگەر تاوانباریش بێت، بەرەنگارییەکی سەرسەختانە دەکات. بەڵێ ئەو کاتە وام بیر کردەوە، چاوەڕێم کرد. بە هەموو توانامەوە چاوەڕێم کرد، بەڵام کۆڵت بە زامیوتوفی نەگبەت دا.. ئێستا قسەمان لەسەر ئەوەیە کە ئەم سایکۆلۆژییەتە نەفرەتییە هەمیشە دوو ڕووی هەیە. بەڵام من هەر چاوەڕێم کردیت تاوەکو خوا ناردیتی، هاتیت، دەزانیت دڵم چۆن لێی دەدا! ئاە، ئاخر تۆ بۆ لەو کاتەدا هاتیت؟ پێکەنینەکەیشت! لە بیرتە کە

هاتیتە ژوورەوە چۆن پێکەنیت؟ دەزانیت من لەو کاتەدا هەموو شتێکم وەک ئاوی ڕوون دەبینی. بێگومان ئەگەر لەو بارە تایبەتییەدا چاوەڕێم نەکردیتایە، پێکەنینەکەت سەرنجی ڕانەدەکێشام، بەڵێ، ئینجا بزانە کە مرۆڤ لە حاڵەتێکی تایبەتیدا بێت، چی بەسەر دێت!
ئەو ڕۆژە، ڕازومیخینی بەڕێزیش.. ئاخ، ئەی بەردەکە! بەردەکەت لە بیرە، ئەو بەردەی شتەکانت لە ژێریا شاردەوە؟ بەڵێ، وا دەزانم ئێستا لە شوێنێکدایە و بە چاو دەیبینم، لە سووچی بێستانێکدا، گوایە بە زامیوتوفت وتبوو لە بێستانێکدا و پاشانیش بە خۆمت وت، وایە؟ کە کەوتینە لێکۆڵینەوەی وتارەکەت، خۆیشت ڕاوبۆچوونەکانی ناویت ڕوون کردەوە، ئەوسا هەر وتەیەک لە وتەکانت دوو واتای لەخۆ گرت. دەتوت لە دوای هەر وتەیەکەوە مانایەکی تری نهێنی هەیە! بەڵێ، ڕادیون ڕومانوڤیچ، بەم شێوەیە گەیشتمە دواقۆناغ و سەرم بەر بەردەکە کەوت و هاتمەوە هۆش خۆم. وتم، نا، ئەمە چ بۆچوونێکە! ئاخر ئەگەر یەکێک بیەوێت، لێکدانەوەیەکی تری بۆ بکات. دەتوانێت بە پێچەوانەی هەموو ئەمانەی منەوە لێکی بداتەوە، ڕەنگە ڕاستتر و شیاوتریش بێت. بەڵێ، من دانی پێدا دەنێم. دەشیا زۆر شیاوتر بێت. ڕەنگە بزانیت چەند ئازارم پێوە چەشتووە! بیرم کردەوە: "نا، نا، تاقە بەڵگەیەکم بەسە!.." کاتێکیش لەم سەروبەندەدا هەواڵی زەنگەکەم بیست، خەریک بوو ببووریمەوە، گیانم کەوتە لەرزین، بیرم کردەوە، ئەمە ئەوەیە کە دەمویست، ئەمەیان بەڵگەی تەواوە. ئیتر پێویستم بە بەڵگاندن نەما، ئەسڵەن بەڵگە پێویست بە بەڵگە ناکات. ئامادەبووم هەزار ڕۆبڵ بدەم، لە گیرفانی خۆم، تەنیا بۆ ئەوەی بە چاوی خۆم بتبینم چۆن لەگەڵ ئەو وردەفرۆشەدا سەد هەنگاو ڕۆیشتیت، دوای ئەوەی بەرەوڕوو پێی وتیت "پیاوکوژ" کەچی تۆ بە درێژایی ئەو سەد

شەقاوە نەتتوانی هیچی لێبپرسیت! ئەی ئەو تەزووەی بە مۆرەغەی پشتتا هات؟ ئەی ئەو زەنگەی لە کاتی وڕێنەکردندا ناوت دەهێنا؟ بەم جۆرە ڕادیون ڕۆمانۆڤیچ، بۆ دەبێت سەیرت پێبێت کە من ئەو یارییەم لەگەڵدا کردوویت؟ پاشان تۆ بۆ لەو کاتەدا هاتیت بۆ لام؟ لەوە دەچێت یەکێک هەڵیفڕاندبیت. خۆ ئەگەر نیکۆلا من و تۆی لە یەکتر جیا نەکردایەتەوە، ئەوسا.. ئەی تۆ نیکۆلات لە بیرە؟ باشت لە بیرە؟ هەروەک هەورەبروسکەیەک لەپڕێکدا پەیدابوو، هەورەبروسکە لە هەورێکی تاڵ و تێرەوە، تیرێکی ئاگراوی بوو، دای بە بەردەمی مندا، ئەی من چۆنم پێشوازی لێکرد؟ قسەکانی کە وەک تیر دابارین، نەیانهەژاندم، هیچ بڕوام پێنەکرد، خۆیشت پێت زانی، چۆن دەبوو! بەڵام دوای ڕۆیشتنی تۆ، کاتێک کە وەڵامی هەندێک پرسیاری منی لەبارەی بەسەرهاتەکەوە ڕاستوڕەوان دایەوە، سەرم سووڕما، وەلێ ئەوسایش بە ئەندازەی پوولێکی قەڵب نرخم بۆ قسەکانی دانەنا، بێئەندازە بڕوام بە بۆچوونەکانی خۆم هەبوو، بە خۆم وت: نا، نا، ببوورە برا، نیکۆلا هیچ پەیوەندییەکی بە مەسەلەکەوە نییە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:
- کەمێک لەمەوبەر ڕازومیخین پێی وتم تۆ هێشتا هەر نیکۆلا بە تاوانبار دەزانیت، ئەویشت لەوە دڵنیا کردووە کە..
هەناسەی گیرا و قسەکانی بۆ تەواو نەکرا، بەوپەڕی شپرزەیی و نیگەرانییەوە، گوێی لە قسەی یەکێک گرتبوو کە بە چاکی دەیناسی و خۆی بەدەستەوە نەدەدا، دەترسا لەوەی بڕوای پێبکات، بۆیە هەر بڕوای نەکرد. بە هەموو توانای هەوڵی ئەوەی بوو ڕوونتر و وردتر لە وتە بەپێچوپەناکانی تێبگات.

پۆرفیری پیترۆڤیچ وەک لە پرسیارەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ خۆشحاڵ بووبێت، دوای ئەو هەموو بێدەنگییەی، هاواری کرد:

- جەنابی ڕازومیخین! هە، هە، هە! ئاخر دەبوو ئەویش کەلا بخرێت، چونکە دوو کەس باشە، بەڵام جێی سێیەم نابێتەوە. ڕازومیخینی بەڕێز بە دەرد ناخوات، بە مەسەلەکەیش نامۆیە. کە هاتە لام، وا ڕەنگی هەڵبزڕکابوو... دەی ئەو خوای لەگەڵ.. بۆ ئەویش بکەوێتە ناو ناوانەوە! بەڵام لەبارەی نیکۆلاوە، ئایا حەز دەکەی بزانیت چ جۆرە کەسێکە، واتا بەو جۆرەی کە من تێگەیشتووم؟ پێش هەر شتێک ئەو منداڵە و هێشتا باڵق نەبووە، ترسنۆک نییە، نا، بەڵکو لە هونەرمەند دەچێت، ڕاست دەڵێم، پێکەنینت پێنەیەت، سادەیە، بەرانبەر بە هەموو شتێک هەستیارە، دڵی ناسکە و خەیاڵاوییە، گۆرانی دەڵێت، سەمایش دەکات، دەڵێن حیکایەتخوانێکە لە هەموو لایەکەوە دێن و لە دەوری کۆ دەبنەوە، دەڕواتە قوتابخانە، هەر لە هیچە هێند پێدەکەنێت، خەریکە لە هۆش خۆی بچێت. هەندێکجار ئەوەندە دەخواتەوە دنگ دەبێت، نەک لەبەر خودی خواردنەوە، بەڵکو جاری وا هەیە سەرخۆش دەبێت، چونکە خەڵکی تر دەرخواردی دەدەن، وەک منداڵان، ڕێکەوتووە بە سەرخۆشی دزی بکات، بەڵام خۆیشی پێی نازانێت، چونکە دەڵێت: "ئەگەر شتێکت لەسەر زەوی هەڵگرت، ئەوە دزی نییە". بە ڕاست دەزانیت کە ئەو لە ڕاسکۆلنیکۆڤەکانە[1]، نەک بەو مانایەی بە تەواوی لەوان بێت، بەڵام کورتبینیی ئەوانی هەیە. لە ناو

---

[1] ئەم زاراوەیە بەو مەسیحییانە دەوترا، کە ڕووسی بوون و پەیڕەویان لە ڕێورەسمی کۆنی مەسیحیەکانی روس دەکرد، پێچەوانەی نوێخوازی پیتەری گەورە بوون.

کەسوکارەکەیدا هەندێکیان وێڵگەرد بوون. خۆیشی ماوەیەک لەمەوبەر، دوو ساڵی تەواو، لە گوندا موریدی پیرێک بووە، من هەموو ئەمانەم لە نیکۆلا و هاوشارییەکانی "زارایسک"ی ئەوەوە زانیووە. هێشتا ئەمانە هیچ نین! تازە بە تازە دەیویست بەرەو بیابان سەری خۆی هەڵبگرێت، زۆریش جەختی دەکرد. شەوانە ڕوو لە خوا دەلالایەوە، کتێبە ئایینییە کۆنەکانی دەخوێندەوە، ناوی لێنابوون کتێبی "ڕاستی" و بەردەوام بوو لە خوێندنەوە. پاشان پتروزبورگ کاریگەرییەکی ترسناکی لەسەری دانا. بە تایبەتی ژن و خواردنەوە. هەڵبەتە زۆر هەستیارە و زوو کاری لێدەکرێت، بۆیە پیری گوندەکەی لە یاد کرد. ئاگادارم کە هونەرمەندێکی شێوەکار بایەخی دایە و هاتوچۆیان لەگەڵیەکدا پەیدا کرد. تا ئەم کارەساتە ناخۆشە ڕووی دا، ترسی لێنیشت و ویستی پەت هەڵبخات و خۆی بخنکێنێت، هەڵبێت، باشە تۆ ئەڵێی چی لەگەڵ ئەو بۆچوونەی خەڵکیدا کە بەرانبەر بە دادگا هەیەتی، هەندێک تەنیا وشەی "دادگا" لەرزی لێدێنێت، کێ لەمە بەرپرسیارە! هیوادارم دادگا تازەکان شت لە جێگای خۆیدا دابنێن، خۆزگا، خوا بکات. باشە، وا تازە لە زینداندا پیرەکەی هاتۆتەوە بیر و کتێبی پیرۆز دەخوێنێتەوە، دەزانیت، ڕادیون ڕومانوڤیچ، بۆ هەندێک کەس وشەی "ئازارچەشتن" چ مانایەکی هەیە؟ نەک بەو مانایەی لەباتیی کەسانی دی ئازار بچێژن، بەڵکو تەنیا بۆ خۆیان ئازار بچێژن و بتوانن خۆیانی لەبەردا بگرن. بەتایبەتی ئەگەر ئەو ئازارە لە لایەن دەوڵەت و دەستەڵاتەوە بێت، لەم ماوەیەی مندا، زیندانییەکم ناسی گەلێک هێور و بێدەنگ بوو، ساڵێکی تەواو لە زیندانا بوو، هەموو شەوێک لە پاڵ زۆپاکەدا ئینجیلی دەخوێندەوە، کە دەیخوێندەوە، ئاگای لە هیچی تر نەدەما، دەزانیت ڕۆژێک چی کرد؟

لەپڕێکدا و بێ هیچ هۆیەک بەردێکی پەیدا کرد و گرتییە بەڕێوەبەری بەندیخانە، بێ ئەوەی بەڕێوەبەرەکە هیچ ئازارێکی پێگەیاندبێت. چۆنیش بەردەکەی تێگرت؟ وای تێگرت کە نزیکەی مەترێک لەولاوە کەوتە سەر زەوی و نەیویست بەر بەڕێوەبەرەکە بکەوێت. باشە، دیارە ئەو کەسەی کە زیندانی بێت و بیەوێت دەستدرێژی بکاتە سەر بەڕێوەبەری بەندیخانەکەی، دەبێت چی بەسەر بێت! بەو ڕێگەیە ئەو کەسە "ئازارچەشتنی"ی بۆ خۆی دابین کرد. ئێستا من وا دەزانم کە نیکۆلاش دەیویست جۆرێک لەو "ئازارچەشتنە" بەدەست بێنێت. من ئەمە بە بڕواوە دەڵێم و بەڵگەم هەیە، بەڵام ئەو نازانێت کە منیش دەیزانم. باشە، چۆن، تۆ باوەڕ ناکەیت کە لە نێو ئەم نەتەوەیەدا خەڵکانێکی زۆر سەیر هەبن؟ من دڵنیات دەکەم کە لەو بابەتە زۆرن. دیسانەوە کاریگەریی پیرە شێخەکەی بۆ زیندوو بۆتەوە، بەتایبەتی کە بیر لە هەڵواسینی خۆی دەکاتەوە، وەلێ ئەو خۆی هەموو شتێکم بۆ باس دەکات. سەرم لێدەدات، بڕوا دەکەیت سوور بێت لەسەر ئەم قسانە؟ ڕاوەستە، بەم زووانە حاشا لە قسەکانی دەکات. بەڵێ، من چاوەڕێم کە بێت و لە دانپیانانەکانی پەشیمان بێتەوە. من ئەم نیکۆلایەم بە دڵدا چووە، بۆیە بە وردی لێکۆڵینەوەی دەربارە دەکەم. تۆ چیت بە خەیاڵدا دێت هە، هە، هە! وەڵامی زۆر لۆژیکییانەی هەندێک پرسیاری داوەمەتەوە. دیارە زانیاریی تەواوی بەدەست هێناوە و باش خۆی بۆ ئامادە کردووە. وەلێ لەبارەی هەندێک پرسیارەوە زمانی تەتەڵەی کرد. هیچ نازانێت، ئاگای لێی نییە و خۆیشی نازانێت کە نازانێت. نا، بەڕێز گیان، ڕادیون ڕومانۆڤیچ، ئەو تاوانە کاری نیکۆلا نییە، ئەمە کارێکی سەیر و تەمومژاوییە، کاری ئەم قۆناغەیە، لە پێشهاتەکانی ئەم سەردەمەی ئێمەیە، سەردەمێک کە دەروونی

مرۆڤایەتی تووشی خرۆشان و پەشۆکاوی هاتووە، سەردەمێکە دروشمی "خوێن پاکسازی" ڕەواجی پەیدا کردووە. کارێکە تایبەت بە سەردەمێکەوە کە تەواوی ماناکانی ژیانی بە ئاسانی تیا لێک دەدرێتەوە. ئەو خەیاڵ و ئارەزووانەی لە کتێبەکانەوە وەرگیراون، ئەو دڵەی تیورە فەلسەفییەکان دەمارگیریان کردووە، هەموو کاریگەرییان هەیە. لێرەدا بڕیاری سەخت بەڵام زۆر تایبەتی لەئارادایە، بڕیارێک درا، بەڵام دوایی وەک لەسەر چیایەکەوە غلۆر بووبێتەوە، یان لەسەر منارەیەکەوە کەوتبێتە خوارێ، وەک ئەوەی بەپێی خۆی نەچووبێت بۆ کردنی تاوانەکە، تەنانەت لە بیری چووە دەرگاکە لە پشت خۆیەوە پێوە بدات، کەچی دوو کەسی کوشت. کوشتنەکەی لەسەر تیزێکی خۆی ئەنجام دا، کوشتی و کەچی نەیتوانی پارەکە بەرێت، ئەوەیش کە بردی، لەژێر بەردێکدا شاردییەوە. دەتوت ئەو هەموو ئازار و سەختییەی لە پشت دەرگاکەوە چەشتی، کاتێک لە دەرگا دەدرا و دەنگی زەنگەکە بەرز دەبووەوە، هیچی وانەبووە، بۆیە کە پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵە چۆڵەکەی، بەدەم تاووڕێنەوە دەنگی زەنگەکەی وەبیر خۆی دەهێنایەوە، حەزی پێبوو تەزووی سەرماکەی پشتی جارێکی دی هەست پێبکاتەوە. باشە، دەتوانین بڵێین ئەمە لە ئەنجامی نەخۆشییەوە بووە، بەڵام ئەی ئەوەی کە خەڵکی کوشتووە و خۆیشی بە مرۆڤێکی شەریف دادەنێت چۆن! لە خەڵکی بێزارە، وەک فریشتە بە ڕێدا دەڕوات! نا، بەڕێز ڕادیون ڕومانوڤیچ، ئەو تاوانە نیکۆلا نەیکردووە، هەرگیز.

دوای ئەو قسانەی کە زیاتر لە داوای لێبوردن و هەڵە و دانپیانان دەچوو، وشەکانی کۆتایی زۆر چاوەڕواننەکراو بوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ

وەک تیرێکی بەرکەوتبێت، هەموو گیانی کەوتە لەرزین. پاشان بێ ئەوەی بتوانێت خۆی بگرێت، بە دەنگی گیراوەوە وتی:
- ئەی.. کەواتە.. کێ.. کوشتوویەتی؟
پۆرفیری پیترۆڤیچ کە خۆی وا پیشان دا پرسیارەکە کتوپڕ و سەیرە، پاڵی دایە کورسییەکەوە، بە دەنگێک کە دەتوت بڕوا بەوە ناکات کە گوێی لێبووە، وتی:
- یانی چی کێ کوشتوویەتی؟
پاشان بە دڵنیاییەوە بە هێواشی وتی:
- تۆ کوشتووتن، ڕادیون ڕومانوڤیچ، تۆ خوێنڕێژەکەیت...
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەر قەرەوێڵەکە هەستا، چەند چرکەساتێک وەستا و بێ ئەوەی هیچ بڵێت، دیسان دانیشتەوە، دەموچاوی هەڵبزڕکا، پۆرفیری دڵسۆزانە لەسەرخۆ وتی:
- دیسانەوە لێوت، وەک جاری پێشوو هاتەوە لەرزین.
دوای کەمێک بێدەنگی وتی:
- ڕادیون ڕومانۆڤیچ، لەوە دەچێت باش لە قسەکانم نەگەیشتبیت بۆیە وا سەرت سووڕماوە. من بە تایبەتی بۆ ئەوە هاتووم کە هەموو شتێکت پێبڵێم و پەردە لەسەر کارەکە لابدەم.
ڕاسکۆلنیکۆڤ وەک منداڵی ترساو کە لە کاتی تاوانێکدا دەستگیر کرابێت، بە هێوری وتی:
- من نەمکوشتووە.
پۆرفیری بە دڵنیایی و جیدییەوە وتی:
- نا، ڕادیون ڕۆمانۆڤیچ، تۆ کوشتووتە، تەنیا تۆ و کەسی تر نا.
هەردووکیان بێدەنگ بوون، بێدەنگییەکی دورودرێژ و سەیر، نزیکەی دە دەقیقەی خایاند، ڕاسکۆلنیکۆڤ پاڵی بە مێزەکەوە دا، بێدەنگ بە

پەنجەی قژی سەری بڵاو دەکردەوە. پۆرفیری دانیشتبوو چاوەڕێی دەکرد. لەپڕێکدا ڕاسکۆلنیکۆڤ بە سووکایەتییەوە لێی ڕوانی.

- پۆرفیری پیتروڤیچ، دیسانەوە هاتیتەوە سەر حیکایەتی کۆن! جارێکی تریش هەمان شێواز و هەمان تاس و هەمان حەمام، بەڕاست تۆ تاقەتت ناچێت؟

- ئاە، لێگەڕێ. من چی لە شێوازی خۆم بکەم! ئەگەر شایەتگەلێک ئێستا لێرەدا بوونایە، باسێکی تر بوو، بەڵام وا ئێستا هەردووکمانین و بە جووتە قسە دەکەین، خۆیشت دەزانیت من نەهاتووم وەک کەروێشک بتدەمە بەر و ڕاوت بکەم، باوەڕ دەکەیت یان نا، دانی پێدا بنێیت یان نا بۆ من یەکسانە، من بڕوای تەواوم هەیە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تووڕەییەوە وتی:

- جا ئەگەر وایە بۆ هاتوویت؟ من دیسانەوە پرسیارەکەی پێشوت لێدەکەمەوە: ئەگەر من بە تاوانبار دەزانیت بۆ نامگریت و بمخەیتە بەندیخانەوە؟

- باشە، ئەمەیش بۆ خۆی پرسیارێکە! خاڵ بە خاڵ وەڵامت دەدەمەوە: یەکەم: ئاوا یەکسەر گرتنی تۆ لە قازانجی من نییە..

- بۆ لە قازانجت نییە، ئەگەر بڕوای تەواوت هەیە، کەواتە هەقتە..

- ئا، بڕوای تەواوی من چ بایەخێکی هەیە؟ چونکە هەموو ئەمانە لە ڕاستیا بەشێکن لە گریمانەی خۆم، پاشان دەتەوێت بچیتە زیندانەوە بۆ ئەوەی ڕەحەت و سەحەت لێی دابنیشیت؟ خۆیشت ئەمە دەزانیت بۆیە وا جەختی لەسەر دەکەیت. بۆ نموونە دەتەوێت ڕووبەڕووی ئەو کوڕەت بکەمەوە، تۆ پێی بڵێیت: "تۆ سەرخۆشی یا نا؟ کێ بە ڕێکەوت منی لەگەڵ تۆدا دیووە؟ من وەک سەرخۆشێک تۆم گرت و لە ڕاستیشدا تۆ مەست بوویت". باشە، من ئەوسا دەتوانم چی بە تۆ

بڵێم؟ بە تایبەتی کە قسەی تۆ زیاتر لە ڕاستییەوە نزیکە تا قسەی ئەو، چونکە وتەی ئەو تەنیا ڕاستییەکی سایکۆلۆژیی تیایە، ئەوەیش لەگەڵ ڕواڵەتیا ڕێ دەکەوێت. بەڵام تۆ نیشانەکە دەپێکیت، چونکە ئەو بەدرەگەزە ئارەقخۆرە و هەموو کەسێکیش ئەوە دەزانێت. بێجگە لەمە، من خۆم ڕاستگۆیانە، چەند جارێک دانم پێدا نا، وتم مەسەلەی دەروونزانی دوو سەری هەیە، یەکێکیان گەورەتر و ڕاستترە لەوی دی. لەگەڵ ئەوەیشدا من تاکو ئێستا شایەتێکم بەسەرتەوە نییە، وەلێ بەهەرحاڵ، من بۆ گرتنت هاتوومەتە ئێرە.

- هەرچەندە کارێکی یاسایی نییە -بۆ ئەوەی بەرەوڕوو هەموو شتێکت پێبڵێم. بە کورتی و پوختی دەمەوێ پێت بڵێم -ئەمەیش هەر یاسایی نییە- کە گرتنی تۆ لە قازانجی من نییە.. چاکە، دووەم بۆ ئەوە هاتوومەتە لات کە..

- فەرموو، فەرموو، دووەم (هێشتا ڕاسکۆلنیکۆڤ هەناسەبڕکێی بوو).

- بۆ ئەوەی کە.. وەک پێشتریش پێم وتبوویت، بە ئەرکی خۆم زانی کە داوای لێبوردنت لێبکەم. نامەوێت بە دڕندەم بزانیت، بە تایبەتی کە من پەیوەندییەکی دڵسۆزانەم لەگەڵ تۆدا هەیە. بڕوا دەکەیت یان نایکەیت ئارەزووتە. هەر لەبەر ئەوە، سێیەم بە پێشنیازێکی ڕێکوڕەوانەوە هاتووم کە بێیت و خۆت بەدەستەوە بدەیت. ئەم کارە بۆ تۆ گەلێک سوودی دەبێت، بۆ منیش چاکترە، چونکە خەیاڵم ئاسوودە دەبێت، چاکە، ئایا پێشنیازێکی ڕاستودروستە یان نا؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بۆ چرکەساتێک داما.

- گوێ بگرە، پۆرفیری پیتروڤیچ، تۆ خۆت دەڵێیت ئەم قسانە تەنیا لە باری دەروونییەوە دەشێ ڕاست بن، هەر لەو بنەمایەوە قەناعەتت

پەیدا کردووە، کەچی پەنا دەبەیتە بەر بەڵگاندنێکی بیرکارانە، باشە، ئەی ئەگەر تۆ هەڵە بوویت، ئەوسا چۆن؟

- نا، ڕادیون ڕومانوڤیچ، من هەڵە ناکەم، بەڵگەیەکم بە دەستەوەیە، ماوەیەک لەمەوبەر کەوتە بەردەستم، خوا بۆی ناردم.

- ئەو بەڵگەیە چییە؟

- پێت ناڵێم، ڕادیون ڕومانوڤیچ، بەهەرحاڵ، ئێستا ئیدی ناتوانم کارەکە لەمە زیاتر دوابخەم، دەتگرم، بڕیاری خۆت بدە، ئیتر هەڵوێستی تۆ بۆ من گرنگ نییە، بەڵام من تەنیا لەبەر خاتری تۆ.. خوا دەیزانێت، ڕادیون ڕۆمانۆڤیچ، بۆ خۆت باشترە کە دان بە تاوانەکەتدا بنێیت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ زەردەخەنەیەکی تەوساوی کرد و وتی:

- ئاخر، ئەمەی تۆ دەیڵێیت، نەک پێکەنینهێن، بەڵکو گەوجانەیشە. باشە، گریمان من تاوانبارم –کە هەرگیز من ئەمە ناڵێم– باشە، بۆ بێم لات و دانی پێدا بنێم؟ لە کاتێکدا کە تۆ خۆت ئێستا وتت لە بەندیخانەدا، بۆ خۆم "دەحەسێمەوە؟"

- ئای باوکە، ڕادیون ڕومانوڤیچ، وشەکانم بە تێگەیشتنی خۆت لێک مەدەرەوە. ڕەنگیشە تەواو ئەو "حەسانەوەیە" نەبێت! ئاخر، ئەمەیش تێزێکە، تێزێکی تایبەت بە خۆم. ئەی دەسەڵاتی. من چییە؟ تەنانەت دەشێ ئێستا خۆیشم شتم لە تۆ شاردبێتەوە، ئاخر، ناکرێت هەرچییەک هەیە، من بیڵێم و تۆیش بە ئارەزووی خۆت بەکاری بێنیت. هە، هە، هە! دووەم، چۆن دەڵێیت دانپێدانان چ سوودێکی هەیە؟ ئایا دەزانیت دوای خۆبەدەستەوەدان و دانپیانان چەند لە سزادانەکەت دێتە خوارێ؟ ئاخر، تۆ لە کەیدا دێیت، لە چ وەختێکدا؟ خۆت بیری لێبکەرەوە، کاتێک دێیت کە یەکێکی تر کوشتنەکەی گرتۆتە ئەستۆی

خۆی و کارەکە بە تەواوی شێواوە؟ من سوێندت بە خودا بۆ دەخۆم بە جۆرێک کارەکەت بۆ ڕێک دەخەم، کە خۆت بیرت لێنەکردبێتەوە، هەموو ئەو بەڵگانەی لەسەر بنەمای دەروونناسی دروست بوون، دەیانڕوخێنم، گشت گومانەکان پووچ دەکەمەوە، بە جۆرێک تاوانەکەت لەوەوە سەرچاوە بگرێت، کە تووشی کێشەیەکی دەروونی هاتوویت، بە ویژدانیشەوە دەڵێم کە ئەمە وایە. ڕادیون ڕومانوڤیچ، من پیاوێکی شەریفم و بەڵێنم دەبەمە سەر.

ڕاسکۆلنیکۆڤ خەمبار و بێدەنگ سەری داخست، ماوەیەک بیری کردەوە، وەلێ لە دواییدا زەردەخەنەیەکی کرد، زەردەخەنەکەی ئەمجارەی شەرمن و خەمبارانە بوو. بە شێوازێک کە نەیەوێت هیچ لە پۆرفیری بشارێتەوە، وتی:

- پێویست ناکات، ئەوە ناهێنێت، من پێویستم بە بەخشندەیی تۆ نییە!

پۆرفیری بە گەرمی و لە خۆوە هاواری لێهەستا!

- من لەمە دەترسام، دەترسام ئەو بەخشندەییەمان قبووڵ نەکەیت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە نیگایەکی غەمبارانەی پڕ ماناوە لێی ڕوانی.

پۆرفیری لەسەر قسەکانی ڕۆشت:

- لە ژیان وەڕز مەبە، هێشتا زۆرەکەی لە بەردەمتایە، چۆن پێویستت بە بەخشین نییە! چ کابرایەکی سەرسەختیت!

- چیم لە بەردەمدایە؟

- ژیان! بۆ تۆ پێغەمبەریت، چی دەزانیت؟ بگەڕێ، دەیدۆزیتەوە، دەشێت خوا لەوێ چاوەڕێت بێت، بێجگە لەمە تۆ هەتاهەتایە لە زینداندا نابیت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ پێکەنی:

- بەڵێ، سزاکە سووک دەکەن..

- چۆن؟ دیارە شەرمی بۆرژوازیانە ترساندوتی؟ ڕەنگە ترسابیتی و بە خۆت نەزانیبێت، چونکە لاویت! بەڵام نابێت بترسیت.. یان لە ئامادەبوون و دانپیانان دەترسیت!

ڕاسکۆلنیکۆڤ وەک ئیتر هەر نەیەوێت قسە بکات، بە بێزاری و تەوسەوە لەبەر خۆیەوە وتی:

- گرنگ نییە.

دیسانەوە کەمێک هەستا، وەک ئەوەی بیەوێت بچێتە دەرێ، بەڵام دووبارە بە نائومێدییەوە دانیشتەوە.

- لات گرنگ نیە! تۆ بەگومانیت، وا دەزانیت من دڵنەواییەکی فێڵبازانەت لێدەکەم، وا دەزانیت زۆر ژیاویت؟ ئەی زۆر لە ژیان تێگەیشتوویت؟ تێزێکت داهێنا و شەرمت پێدێت کە سەرنەکەوتیت و ئاسایی کەوتە سەر ئاو، بە ڕاستی زۆر خراپ کەوتە سەر ئاو، وەلێ بەهەرحاڵ، تۆ مرۆڤێکی بەد و لەدەستدەرچوو نیت، بە هیچ جۆرێک تۆ بەد نیت، تۆ پێشتر هیچت ئەزموون نەکردووە، یەکژەمی گەیاندووتەتە دواقۆناغ، دەزانیت من تۆ بە چی دەزانم؟ بە یەکێک لەوانەت دەزانم کە ئەگەر بڕوا بە خوا یان بە هەر شتێک بهێنیت، دوای ئەوە ئەگەر جگەریشتان دەربکێشن، تۆ هەر خۆت دەگریت و بە زەردەخەنەوە لە خوێنڕێژەکانت دەڕوانیت. باشە، کەواتە ئەو بڕوایە پەیدا بکە بۆ ئەوەی بژیت. ماوەیەکی زۆرە تۆ پێویستت بە گۆڕینی هەوا هەیە. باشە، خەم و ئازار چەشتنیش کارێکی باشە، ئازار بچێژە، دەشێت نیکۆلا لەسەر هەق بێت کە دەیەوێت ئازار بچێژێت، دەزانم باوەڕ ناکەیت، بەڵام زۆر قووڵی مەکەرەوە، بێ بیرکردنەوە، ڕاستوڕەوان خۆت بدەرە دەست ژیان و پەشیمان مەبە، ژیان دەتگەیەنێتە کەنار و لەسەر پێی خۆت دەوەستیت، کامە کەنار؟

چوزانم؟ بەڵام باوەڕم وایە کە تۆ زۆر دەژیت. دەزانم تۆ قسەکانی من وا وەردەگریت کە چەند ڕستەیەکن و لەبەرم کردوون، وەلێ دەشێ لە ئاییندەدا بیری خۆتیان بخەیتەوە، کاتێک کە سوودیان لێدەبینیت، هەر لەبەر ئەوەیشە کە دەیانڵێم. هەر باشیشە کە پیرێژنێکت کوشتووە، ئەگەر تیۆرێکی ترت دابهێنایە، ڕەنگە کارێکت بکردایە، کە سەد ملیون جار لەمە خراپتر بووایە. ئێستا ئەمە سوپاسی خوای دەوێت، تۆ چوزانیت، ڕەنگە خودا بە هۆی ئەنگێزەیەکەوە ئاگادارییت بکات. تۆ دڵت گەورەیە، بەڵام کەمتر بترسە، تۆ لەو کارە گەورەیەی کە دەتەوێت بیکەیت دەترسیت؟ مەترسە، ئیتر ترس شەرمەزارییە، هەر کە هەنگاوت هەڵهێنا، خۆت ڕابگرە، ئیدی لێرەوە مەسەلەکە دادپەروەری و ویژدانە، ویژدان چیت پێدەڵێت بیکە. من دەزانم تۆ بێباوەڕیت، بەڵام ژیان ڕابەریت دەکات، لە دواییدا خۆت چێژ لەم بەسەرهاتە دەبینیت، وەلێ لە ئێستادا هێشتا هەوات کەمە، هەوا، هەوا.

ڕاسکۆلنیکۆڤ تەزوویەکی پێدا هات و هاواری کرد:

- ئاخر، باشە تۆ کێیت؟ تۆ چیت تا خۆت بکەیت بە پێغەمبەر؟ لە کام لووتکەی هێورەوە ئەم ئامۆژگارییە پێغەمبەرانەیەم پێدەگەیەنیت؟

- من کێم؟ مرۆڤێکم کۆتایم هاتووە، بێ کەم و زیاد، مرۆڤێک ڕەنگە هەست و بەزەییەکی تیا مابێت و شتێکیش بزانێت. بەڵام مرۆڤێکی تەواوبوو، کە ڕۆژانی بەسەر چووە. وەلێ تۆ، شتێکی تریت، خوا بۆ ئاییندە ژیانی بۆ تۆ فەراهەم هێناوە -کێ چووزانێت، ڕەنگە دەربارەی تۆیش هەموو ئەمانە وەک تەم و دووکەڵێک چ ئەنجامێکیان نەبێت- باشە، چ خەوشێکی هەیە کە تۆیش ببیت بە بەشێک لەو خەڵکە؟ بە ڕاستی بۆ ئەو ژیانەی لەدەستت چووە، پێویست ناکات داخی

لێبخۆیت، بە تایبەتی تۆیش، بەم دڵەتەوە؟ قەیدی چییە ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆر کەس نەتبینێت؟ مەسەلەکە کات نییە، بەڵکو مەسەلەکە خودی خۆتیت، ببە بە خۆر، ئەوسا هەموو کەسێک دەتبینێت، خۆر دەبێت پێش هەر شتێک بە ڕاستی خۆر بێت. بۆ دیسانەوە زەردەخەنەت کەوتە سەر لێو: لەبەر ئەوەی من شیلەرانە[1] دەبێژم؟ گرەو دەکەم وا دەزانیت دەمەوێت لاست بدەم! باشە، دەشێت وایش بێت. هە، هە، هە! ڕادیون ڕومانوڤیچ، هەقتە بڕوا بە قسەکانم نەکەیت، دەشێت هەر بڕوام پێنەکەیت، بەڵام ئەمە خودی خۆمم، پێی قایلم، تەنیا دەمەوێت ئەوەیش بڵێم کە تۆ بۆت هەیە بڕیار بدەیت کە ئایا من پیاوێکی بەد و خراپم یان شەریفم.

- بە تەمای کەی بمگریت؟

- دەتوانم دەرفەتی یەک دوو ڕۆژت بدەمێ بە ئازادی بگەڕێیت، بیر بکەیتەوە، هاوڕێی بەڕێز، لە خوا بپاڕێیتەوە. ئەمەیان بۆ تۆ چاکترە. بە خودا بۆ خۆت باشترە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ زەردەخەنەیەکی سەیری هاتێ و وتی:

- ئەی ئەگەر هەڵاتم چۆن؟

- نا، هەڵنایەیت، جووتیارێک هەڵدێت، یان کەسێک کە نۆکەری بیری خەڵکی تر بێت، لەو بیروباوەڕە تازانەی بڵاو بوونەتەوە، ئەویش هەڵدێت. چونکە هەر ئەوەندەی بەسە تۆ ئاماژەیەکی بۆ بکەیت بۆ ئەوەی تاماوە چیت بوێت بڕوات پێبکات. بەڵام تۆ ئیدی بڕوات بە تیۆرەکەی خۆت نەماوە. ئیتر لە پای چی هەڵدێیت؟ بە ڕاستی هەڵاتن چ

---

[1] Schiller شاعیری ناوداری رۆمانتیکی ئەڵمانی کە لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا ژیاوە

کەڵکێکی هەیە؟ هەڵاتن نەگبەتی و چەرمەسەری لە دوایە، تۆ پێویستیت بە ژیانی سەقامگیر و پێگەیەکی تایبەتی خۆت هەیە، هەروەها پێویستت بە هەوایەکی گونجاوە، ئایا هەڵاتن هەوای گونجاوە بۆ تۆ؟ ڕایش بکەیت، هەر دەگەڕێیتەوە، تۆ بەبێ ئێمە پێت ناکرێت، لە کاتێکدا ئەگەر من لە کۆشکێکدا زیندانیت بکەم، دوای مانگێک و دوان و سیان لەپڕێکدا قسەکانی منت بیر دەکەوێتەوە و خۆت دێیتەوە بۆ لام، چۆنیش دێیت، لەوانەیە خۆیشت بڕوا نەکەیت، سەعاتێکیش لە پێش وادەکەدا دێیت، تەنانەت خۆیشت نازانیت کە بۆ دانپیانان هاتوویت. بڕوای تەواویشم هەیە کە بیر لەوە دەکەیتەوە خۆت لەبەر "ئازار"دا بگریت. ئێستا بڕوا بەم قسانەم ناکەیت، بەڵام بێگومانم کە پاشان بڕوا دەکەیت، چونکە "ئازارکێشان" ڕادیون ڕومانوڤیچ، کارێکی گەورەیە. وا مەزانە قەڵەو بووم و بە ڕووکەش حەز بە ژیانی خۆش دەکەم، ئەمە گرنگ نییە. بە وتەکانم پێمەکەنە، من دەزانم لە ئازارچەشتندا بیرۆکەیەکی گرنگ لەئارادایە، نیکۆلا ڕاست دەکات، نا، ڕادیون ڕومانویچ، تۆ هەڵنایەیت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە جێگاکەی هەستا و کڵاوەکەی هەڵگرت، پۆرفیری پیتروڤیچیش هەستا.

- خەیاڵی گەڕانت هەیە؟ ئێوارەیەکی قەشەنگە، ئەگەر نەیکاتە زریان، بیشیکات چاکتر، ئاووهەوا فێنکتر دەبێت.

ئەویش کڵاوەکەی خۆی هەڵگرت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تۆنێکی وشک بەڵام بە جەختەوە وتی:

- پۆرفیری پیتروڤیچ، وا نەزانیت من ئەمڕۆ دانم بە هەموو شتێکدا ناوە، تۆ پیاوێکی سەیریت، منیش هەروەک کونپشکنی گوێم لە قسەکانت گرت، بەڵام دانم بە هیچدا نەناوە، ئەمەت لە بیر نەچێت.

- زۆر باشه، دەزانم و له یادی ناکەم، دەبینیت چەند پەشۆکاویت. نیگەران مەبە، هاورێی بەرێز، ویست ویستی تۆیە، کەمێک بگەڕێ، بەڵام تا ڕادەیەک نابێت زۆر برۆیت.

پاشان بە دەنگێکی لەسەرخۆ وتی:

- بە ڕاستی داواکارییەکیشم لێت هەیە، داوایەکی کەمێک ناخۆش بەڵام گرنگ: ئەگەر بە ڕێکەوت - هەرچەندە من بڕوام بەمە نییە و لە تۆیشی ڕانابینم- ئەڵێم ئەگەر بە ڕێکەوت هاتیتە سەر ئەوەی لەم چل پەنجا سەعاتەدا بە جۆرێکی تر کۆتایی بە کارەکە بهێنیت، بۆ نموونە، خەیاڵ لەوە بکەیتەوە کە بە دەستی خۆت خۆت بکوژیت -هەرچەندە ئەمە بۆچوونێکی بێمانایە بەڵام داوای لێبوردن دەکەم- یاداشتێکی کورت و پوخت بنووسە، تەنیا دوو دێڕ و بەس، شوێنی بەردەکە دیاری بکە، ئەمەیان شەریفترە، چاکە، خوات لەگەڵ، ئومێدی بیری چاک و کاری چاکت بۆ دەکەم.

پۆرفیری کە تۆزێک چەمابووەوە و دەتوت لە ڕوانینی ڕاسکۆلنیکۆڤ پارێز دەکات، چووە دەرێ، ڕاسکۆلنیکۆڤ چووە لای پەنجەرەکەوە، زۆر بێئارام و تووڕە چاوەڕێی کرد تا پۆرفیری دوور کەوتەوە و گەیشتە سەر شەقامەکە، پاشان خۆیشی بەپەلە لە ژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوە.

## ٣

ڕاسکۆلنیکۆڤ پەلەی ئەوەی بوو چەندە زووتر سڤیدریگایلوف ببینێت. دەبێت چ ئومێدێکی بەم زەلامە بێت، خۆیشی ئەمەی نەدەزانی، بەڵام لەو پیاوەدا توانایەکی شاراوە هەبوو، کە ئەمی خستبووە ژێر

دەسەڵاتی خۆیەوە، لەبەر ئەوەیش کە دەرکی بەمە کردبوو، ئیتر ئارامی نەدەگرت. بە تایبەتی لە ئێستادا کە کاتی هاتبوو.
لە ڕێگەدا پرسیارێک ئازاری دەدا: "ئایا سڤیدریگایلۆڤ چووە بۆ لای پۆرفیری؟" تا ئەو شوێنەی ئەقڵی بڕی دەکرد، دەیتوانی سوێند بخوات کە نەخێر نەیبینیووە. بەڵام بەردەوامیش لە بیرکردنەوەدا بوو. هەموو ئەو دیدارانەی خۆی لەگەڵ پۆرفیریدا کردبوونی، دەیهێنایەوە یاد و وردەکاری تیا دەکردن: "نا، یەکتریان نەدیووە، نەخێر".
"باشە ئەگەر تا ئێستا ئەمە ڕووی نەداوە، ئەی ئاخۆ بۆ لەمەودوا سەر لە پۆرفیری دەدات یان نا؟"
بەهەرحاڵ ڕاسکۆلنیکۆڤ گەیشتە ئەوەی کە سڤیدریگالوف ناڕواتە لای پۆرفیری، بەڵام بۆ ناچێت؟ هیچ بەڵگەیەکی پێنەبوو، ئەگەر بەڵگەیشی پێبووایە، نەیدەویست بە دوایدا بگەڕێت و زەحمەتی خۆی بدات. شتێکی سەیر بوو، بیرکردنەوەیەکی زۆر سادە، هەموو ئەمانە ئازاریان دەدا، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەمانە لە خەمەکانی تری ئاسانتر بوون. ئەوەی سەیر بوو، ئەم چارەنووسە ڕاستەوخۆیەی ئێستای، لەسەر ئاستێکی کەم نەبێت، بایەخێکی وای نەبوو، زۆر بە جیدیش بیری لێنەدەکردەوە، بەڵام مەسەلەیەکی دی دەیهێنایە ژاروژەنگ، کە زۆر گرنگ و گەورەتر بوو، شتێک پەیوەندیی بە خودی خۆیەوە هەبوو نەک کەسی تر، شتێک جیاواز لەوانی دی و گەلێک پڕ بایەختر. لەگەڵ ئەمانەیشدا هەستی بە شەکەتیی ڕۆحی خۆی دەکرد. هەرچەندە ئەم بەیانییە بیری لە ڕۆژەکانی پێشتر چاکتر بوو.
باشە، دوای ئەو هەموو ڕووداوە، ئەوە دەهێنێت، بکەوێتە دوای چارەسەرکردنی ئەو کێشە بچووکانەی کە جارێکی دی هاتوونەتەوە ڕێگەی؟ بۆ نموونە، دەهێنێت پیلانێک ڕێک بخات تا نەهێڵێت

سڤیدریگایلوف بڕوات بۆ لای پۆرفیری؟ ئایا پێویستە کاتی خۆی بۆ له نهێنی گەیشتنی یەکێکی وەک سڤیدریگایلوف بە فیڕۆ بدات؟
ئای چەندە لەم جۆرە شتانە بێتاقەت بووە!
لەگەڵ گشت ئەمانەیشدا زۆر پەلەی لای سڤیدریگایلوفی بوو، ڕەنگە چاوەڕێی شتێکی لێبکات، یان ڕێنمایی یان چارەسەرێک؟ ئاخر، خنکاو دەست بۆ تەڵە پووشێک دەبات، دەشێت چارەنووس یان غەریزەیەک ئەم دووانەی لە یەکدی نزیک کردبێتەوە؟ یان ڕەنگە لە ئەنجامی شەکەتی و نائومێدییەوە بێت، یان لەوانەیە پێویستی بە سڤیدریگایلوف نەبێت و کەسێکی تری مەبەست بێت، بەڵام وا ئێستا تەنیا ئەوی هاتۆتە بەردەست، ڕەنگە پێویستی بە سۆنیا بێت؟ وەلێ ئێستا بۆچی بڕوات بۆ لای سۆنیا؟ بۆ ئەوەی جارێکی دی بیخاتەوە گریان؟ پاشان سۆنیا بۆ ئەم ترسناکە، سۆنیا نموونەی فەرمانێکە هەڵناوەشێتەوە و بڕیارێکە ڕەت ناکرێتەوە. لێرەدا یان ڕێگەی سۆنیا ڕاستە یان ڕێگەی ئەو، لەم بارە تایبەتەدا، بەرگەی بینینی سۆنیای نەدەگرت، نا، کەواتە وا چاکتر نییە سڤیدریگایلوف بەسەر بکاتەوە؟ ڕاسکۆلنیکۆڤ نەیدەتوانی لە ناخی خۆیدا نکۆڵی لەوە بکات کە ماوەیەکی زۆرە، لەبەر هەرچییەک بێت، پێویستی بەو پیاوەیە، بەڵام چ شتێکی هاوبەش لە نێوان ئەم دوانەدا هەیە؟ لە چیدا لە یەکتر دەچن؟ تەنانەت لە تاوانبارییشدا دوو سروشتی جیاوازن. پاشان، سڤیدریگایلوف کابرایەکی گەلێک بێزراو و تا ڕادەیەک سووک و ڕسوایە، فێڵباز و کەڵەکچی و دڵڕەقە، چەندان ناوی خراپی بە دواوەیە، ڕاستە بۆ منداڵەکانی کاترینا ئیڤانۆڤنا دەستی لە خۆی بەردابوو، بەڵام کێ چووزانێت چی لەژێر سەردایە و بە چ مەبەستێک دەیکات؟ ئەم زەلامە بەردەوام پیلان و نەخشەی لەژێر سەردایە.

لەم ڕۆژانەدا، هەمیشە بیرۆکەیەکی دی لە زەینی ڕاسکۆلنیکۆڤدا ڕەنگی دەگرت و گەمارۆی دەدا، بیرۆکەیەکی ئەمەندە بەئازار بوو، کە بەردەوام هەوڵی دەدا لە خۆی دوور بخاتەوە، هەندێکجار وای بیر دەکردەوە کە: سڤیدریگایلوف بەردەوام بە دوامەوەیە، تا ئەم چرکەساتەیش هەر بە دوامەوەیە، سڤیدریگایلوف لە نهێنیی من گەیشتووە، پیلان لە دژی دونیا دادەڕێژێت، تۆ بڵێی هێشتا هەر وا بیر بکاتەوە؟ بێگومان هێشتا هەمان نەخشەی هەیە، بە تایبەتی کە ئێستا ئاگاداری نهێنییەکەیەتی و دەستەڵاتی بەسەر ئەمدا پەیدا کردووە، ناشێ ئەمانە لە دژی سۆنیا بەکار بهێنێت؟

ئەم بیرۆکەیە تەنانەت هەندێکجار لە خەویشدا ئازاری دەدا، وەلێ ڕۆژێک لە ڕۆژان، تەنانەت لە یەکەم دیداریشیاندا، وەک ئێستا کە بۆ لای سڤیدریگایلۆڤ دەڕوات، ئاوا بە ئاشکرا و ڕوونی بەرجەستە نەبووە، تەنانەت کە بیری لێدەکردەوە، تووڕە دەبوو، لەم حاڵەدا هەموو شتێک، تەنانەت باری خۆیشی گۆڕانی بەسەردا دەهات، بۆیە دەبێت خێرا ڕازەکەی خۆی بە دونیا بڵێت، ڕەنگە وایش پێویست بکات کە خۆی بداتە دەستەوە، بۆ ئەوەی نەک دونیا هەنگاوێکی نادروست بنێت. نامە؟ ئەم بەیانییە دونیا نامەیەکی بەدەست گەیشتبوو، لە پترۆزبورگدا دەبێت لە کێوە نامەی پێبگات. (مەگەر تەنیا لە لۆژین)ەوە؟ بەڵام ڕازومیخین لەوێ ئاگادارییەتی، هەرچەندە ڕازومیخین هیچ شتێک نازانێت، بڵێی وا چاکتر بێت کە لای ڕازومیخینیش دان بە تاوانەکەیدا بنێت؟ ڕەنگە ئەمەیان باشتر بێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە وەڕزی بیری لەمە کردەوە، لە دڵی خۆیدا وتی: "هەرچۆنێک بووە، دەبێت زۆر زوو سڤیدریگایلوف ببینم، سوپاس بۆ خودا کە ئەم مەسەلەیە پێویستی بە وردەکاریی زۆر نییە، بەڵکو

گەوهەری مەسەلەکە گرنگە، وەلیٰ ئەگەر.. ئەگەر سفیدریگایلوف خەیاڵی لە شتێک دابێت.. یان بیەوێت پیلانێک بۆ دونیا بچنێت. لەم حاڵەتەدا..

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە ماوەی ئەم مانگەدا، ئەمەندە هەڵچوون و گرفت ماندوویان کردبوو، ئیدی توانای ئەوەی نەمابوو چارەسەر بۆ کێشەکان بدۆزێتەوە و وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە، تەنیا شتێک کە بیری لێکردەوە، ئەوە بوو نائومێدانە لەبەر خۆیەوە وتی: "وا بڕوات دەیکوژم".

هەستی کرد بارێکی گرانی بەسەر دڵەوەیە، لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا وەستا بۆ ئەوەی بزانێت لە کوێوە هاتووە و بۆ کوێ دەچێت، چاوی بە دەوروبەری خۆیدا گێڕا، لەسەر شەقامی س.. سی چل هەنگاوێک لە شەقامی "سننایا"وە کە بەجێی هێشتبوو، تەواوی نهۆمی دووی ساختمانەکەی دەستی چەپی ڕێستۆرانتێکی هەرزانبەهای لێبوو، گشت پەنجەرەکانی خرابوونە سەر پشت. لە هاتوچۆی ئەوانەوە کە لە پەنجەرەکانەوە دەردەکەوتن، دیار بوو ڕێستۆرانتەکە پڕە لە خەڵک، لە تەلاری ڕێستۆرانتەکەوە دەنگی گۆرانی، فلووت، ڤیۆلۆن و تەپڵ ئەو ناوەی پڕ کردبوو، قیژەوهاواری ژنانیش دەهاتە بەرگوێ، ڕاسکۆلنیکۆڤ ویستی بگەڕێتەوە، سەرەتا سەری لەوە سووڕما کە بۆ خۆی پێچاوەتە ئەو شوێنەوە. لەپڕا لە پەنجەرەیەکی کراوەوە چاوی بە سڤیدریگایلوف کەوت، لە پاڵ پەنجەرەیەکدا، لە پشت مێزێکی چا خواردنەوە، سەبیلەکەی بە ددانی گرتبوو، دانیشتبوو، ئەمە تا ڕادەیەکی زۆر سەرسامی کرد، سڤیدریگایلوف بێدەنگ و بە وردی کەوتبوە تەماشاکردنی. ڕاسکۆلنیکۆڤ زوو بە سەرسامییەوە هەستی کرد سڤیدریگایلۆڤ دەیەوێت بە شێوەیەک کە نەبینرێت، لەسەرخۆ

هەستێت و بڕوات. ڕاسکۆلنیکۆڤ خێرا وا خۆی نیشان دا کە ئەمیش ئەوی نەبینیووە، بەدەم بیرکردنەوەوە تەماشای شوێنێکی تر دەکات، هەرچەندە لە ڕاستیدا بە تیلەی چاو هەر لێی دەڕوانی، بە نیگەرانییەوە دڵی کەوتبووە پەلەپەل. بە ڕاستی، سڤیدریگایلوف دیار بوو کە نەیدەویست ئەو ببینێت: سەبیلەکەی لە لێوی کردەوە و ویستی خۆی ون بکات، وەلێ کە هەستا و کورسییەکەی لابرد، گومانی نەما کە ڕاسکۆلنیکۆڤ لێی دەڕوانی و چاودێریی دەکات. لە نێوان ئەم دووانەدا، ئێستا دیمەنێک هاتبووە گۆڕێ وەک یەکەم دیداریان لە ماڵی ڕاسکۆلنیکۆڤدا، ئەو کاتەی ڕاسکۆلنیکۆڤ خەوتبوو، زەردەخەنەیەکی فێڵبازانە کەوتە سەرلێوی سڤیدریگایلوف و تا هات زیاتر بوو. هەردووکیان دەیانزانی کە هەریەکەیان لە چاودێریکردنی ئەوی تردایە. سەرئەنجام سڤیدریگایلوف دایە قاقای پێکەنین و هاواری کرد:

- دەی، دەی، ئەگەر پێت خۆشە وەرە ژوورەوە، من لێرەم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە پلیکانەی ڕێستۆرانتەکەدا سەرکەوت، سڤیدریگایلوفی لە ژوورێکی زۆر بچووکدا بینی کە کەوتبووە پشتەوە، یەکێک لە پەنجەرەکانی ژوورەکە نزیک بە هۆڵێکی گەورە بوو، لە هۆڵەکەدا، بە دەوری بیست مێزی بچووکدا، بازرگان و کارمەند و کەسانی تری هەمە جۆر، لە ناو هەراوزەنای گۆرانیبێژاندا کە هەموو پێکەوە دەیانوت، سەرقاڵی چاخواردنەوە بوون. لە لایەکەوە دەنگی لەیەکتردانی گۆی بلیارد دەهاتە گوێ. لەسەر مێزەکەی سڤیدریگایلوف، قاپێک شەمپانیا و نیوەپێکێکی تێکراوی لەسەر بوو. لە ژوورەکەدا منداڵێک ئۆرگۆنی دەژەند، کچێکی قەڵەو، گۆناسوور، تەنوورەیەکی ڕێڕێ لەبەردا و کڵاوێکی قردێلاوی لەسەردا دەبینرا. کچەکە گۆرانیی دەوت و تەمەنی لە هەژدە ساڵیدا بوو، لەگەڵ دەنگی

به کۆمەڵی گۆرانیبێژەکاندا کە لە ژوورەکەی پاڵیانەوە دەهات، کچەکە بە دەنگێکی گڕەوە لەگەڵ مۆسیقاکەدا گۆرانییەکی میللیی بێتامی دەوت.

هەر کە ڕاسکۆلنیکۆڤ چووە ژوورەوە، سڤیدریگایلوف گۆرانییەکەی بە کچەکە بڕی، وتی:

- باشە، ئیتر بەسە.

کچەکە خێرا بێدەنگ بوو، بە ڕێزەوە خۆی کۆ کردەوە و چاوەڕێ ما، پێشتر گۆرانییە بێتامەکەی بە جیدی و ڕێزەوە دەوت.

سڤیدریگایلوف بانگی کرد:

- ئاها فلیپ، پێکێکی تر بێنە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:

- مەی ناخۆمەوە.

- بە ئارەزووی خۆت، بۆ تۆم داوا نەکردبوو. کاتیا، بنۆشە، ئیتر من ئەمرۆ پێویستیم پێت نییە، بڕۆ.

بەدەم قسەکانەوە سڤیدریگایلوف پەرداخێکی پڕ لە شەراب کرد، لەگەڵ گەڵایەکی یەک ڕۆبڵیدا بەرەو لای کچەکەی کردەوە، کاتیا یەکژەمی پێکەکەی، وەک ژنانی دی، واتا بێ ئەوەی لە لێوی بکاتەوە، بە بیست قومی بچووک هەڵدا. پارەکەی هەڵگرت، دەستی سڤیدریگایلۆڤ، کە خاوەن دەستەکە زۆر بە ویقارەوە ڕێگەی ماچکردنی دا، ماچ کرد و لە ژوورەکە چووە دەرێ. کوڕە لاوەکەیش بە سازەکەیەوە دوای کەوت، ئەم دووانەیان لە کۆڵانەکانەوە هێنابووە ئەوێ. هێشتا هەفتەیەک بەسەر ژیانی سڤیدریگایلوفدا لە پترۆزبورگدا تێنەپەڕیبوو. وەلێ وەک لە ماڵی خۆیدا بێت، دەستی بەسەر دەوروبەریدا کێشابوو. فیلیپ، پێش خزمەتی ڕێستۆرانتەکەیش ببوو

بە "هاوڕێ"ی و بە ڕێزەوە نۆکەریی بۆ دەکرد. دەرگای ژوورەکە بەرەو هۆڵەکە دادەخرا، سڤیدریگایلوف وەک ماڵی خۆی تیا دەمایەوە، هەرچییەکی بویستایە تیایدا دەکرد، هەندێک ڕۆژی بە تەواوی لەوێ بەسەر دەبرد، ڕێستۆرانتەکەیش تا بڵێی پیسوپۆخڵ بوو، تەنانەت ڕێستۆرانتێکی پلە دوویش نەبوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ دەستی پێکرد:

- دەهاتم بۆ لای تۆ، بە دواتدا دەگەڕام، بەڵام چۆن ئاوا لە پڕێکدا، لە دوای شەقامی "سێننایا"وە کەوتمە سەر ئەم شەقامە؟ من هەرگیز ڕێم ناکەوێتە ئێرە، ئاسایی لە "سێننایا"وە بە لای ڕاستدا دەسووڕێمەوە، بێجگە لەمە ئێرە بەرەو لای ماڵی ئێوە ناچێت. بەڵام هەر کە سووڕامەوە، تۆم بینی! شتێکی سەیرە!

- بۆ بە کورتی ناڵێیت پەرجۆ(موجیزە)یە.

- نا ڕەنگە هەر ڕێکەوت بێت.

سڤیدریگایلوف بە پێکەنینەوە وتی:

- ئەم خەڵکە سەیرن، ئەگەر بڕوایشیان بە پەرجۆ هەبێت، کەچی هێشتا دانی پێدا نانێن! ئاخر، تۆ خۆت دەڵێیت "ڕەنگە" هەر ڕێکەوت بێت، ڕادیون ڕومانوڤیچ، تۆ ناتوانیت وێنای بکەیت کە ئەم خەڵکە لە باری بیروباوەڕی شەخسییانەوە چەندە ترسنۆک و پارێزکارن، مەبەستم تۆ نییە، تۆ خاوەنی بیروباوەڕی خۆتی و لێیشی ناترسیت، لەبەر ئەمەیشە کە سەرنجی ئێمەت بۆ لای خۆت ڕاکێشاوە.

- تەنیا لەبەر ئەمە؟

- هەر ئەوە بەسە.

لەوە دەچوو سڤیدریگایلوف وروژابێت، بەڵام زۆر کەم، چونکە نیوپێک شەرابی خواردبووەوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:
- وا دەزانم پێش ئەوەی بەو شتەی من بزانیت، کە تۆ ناوی ڕای شەخسیی لێدەنێیت، هاتیت بۆ لام.
- وایە، ئەوسا مەسەلەکە جیاواز بوو، هەر کەسە و ڕێوڕەوشتی خۆی هەیە. وەلێ لەبارەی مۆجزەوە، دەمەوێت بڵێم کە ڕەنگە تۆ لەم دوو سێ ڕۆژەدا خەوتبیت، چونکە من خۆم ئەم ڕێستۆرانتەم بۆ تۆ باس کردووە. هیچ پەرجۆیەک لەئارادا نییە کەوا تۆ ڕاست هاتوویتەتە ئێرە. خۆم ناونیشانی تەواوی ڕێگا و شوێنی ئێرەم بە درێژی پێوتوویت. تەنانەت پێم وتبوویت لە چ سەعاتێکدا دەتوانیت لێرە بمبینیت، لە بیرتە؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە سەرسامییەوە وتی:
- لە بیرم نەماوە.
- باوەڕ دەکەم، دوو جار بۆم باس کردوویت. دیارە ناونیشانەکە خۆبەخۆ لە یادەوەریتاندا ماوەتەوە. بۆیە هەر لە خۆوە بێ ئەوەی بە خۆت بزانیت، بەپێی ئەو ناونیشانەی بۆم هەڵدابوویت، بەرەو ئێرە هاتوویت. تەنانەت ئەو کاتەی کە قسەم بۆ دەکردیت، بڕوام نەدەکرد لە من تێگەیشتبیت، تۆ ئاگاداری خۆت نیت ڕادیون ڕومانوڤیچ، شتێکی تریش: دەزانم لە پتروزبورگدا زۆر کەس هەیە کە بە ڕێگادا دەڕۆن، لەگەڵ خۆیاندا قسە دەکەن. ئەمە شاری نیمچەشێتەکانە، ئەگەر ئێمە خاوەنی زانست بووینایە، پزیشک، پارێزەر، فەیلەسووف، هەریەکێک لەوانە لە بواری پسپۆڕی خۆیدا، دەیانتوانی لە پتروزبورگدا لێکۆڵینەوەی زۆر بەنرخ ئەنجام بدەن. کەم شاری وەک پتروزبورگ هەیە کە بەم ڕادەیە کاریگەرییەکی هێند تاریک و نامۆ و بەئازار بخاتە سەر ڕۆحی مرۆڤ. ئەمە تەنیا بە ئاسەواری ئاووهەوا مەزانە.

لەبەر ئەوەی ئێرە مەڵبەندی بەڕێوەبردنی هەموو ڕووسیایە، دەبێت کاریگەریی بەسەر گشت وڵاتەوە هەبێت. وەلێ ئێستا قسەمان لەسەر ئەمە نییە، بەڵکو قسە لەسەر ئەوەیە کە تا ئێستا چەندین جار من هەر لە پەناوە چاودێریی تۆم کردووە. کە لە ماڵەکەت دێیتە دەرەوە، سەرت بەرز ڕادەگریت، دوای بیست هەنگاو، وردەوردە سەرت دادەخەیت و دەستت دەخەیتە پشتت، تەماشا دەکەیت، بەڵام زۆر بە ئاشکرا دیارە کە نە بەردەمی خۆت و نە دەوروبەرت نابینیت، دوایی لێوت دەکەوێتە جووڵە، لەگەڵ خۆتدا قسە دەکەیت، لەو ماوەیەدا هەندێکجار دەست بەردەدەیت، چۆن لەگەڵ قسەکانتا بگونجێت دەیانجوڵێنیت، ئینجا لە ناوەڕاستی ڕێگەکەدا دەوەستیت، بۆ ماوەیەکی درێژ دەوەستیت، ئەمەیان کارێکی زۆر خراپە، ڕەنگە بێجگە لە من کەسانی تریش سەرنجی ئەمەیان دابێت، ئەمە هیچ بە سوودی تۆ ناگەڕێت. لە ڕاستیدا بۆ من مەسەلەیەک نییە، چونکە خۆ من چارەسەرت ناکەم، بێگومان لە مەبەستم تێدەگەیت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کە بە وردی لێی ڕامابوو پرسی:

- تۆ دەزانیت بە دوامەوەن و چاودێریم دەکەن؟

سڤیدریگایلوف تاس بردیەوە و وەڵامی دایەوە:

- نا، هیچ نازانم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ دەموچاوی دا بەیەکدا و لەسەرخۆ وتی:

- باشە، کەواتە با لەبارەی منەوە قسە نەکرێت، وازم لێبێنن.

- باشە، باست ناکەین.

- پێم بڵێ، ئەگەر تۆ هەمیشە بۆ خواردنەوە دێیتە ئێرە و دوو جار کاتت بۆ دیاری کردووم کە بێم بۆ ئێرە، ئەی بۆ کاتێک لە

شەقامەکەوە تەماشای پەنجەرەکەم کرد، خۆت ون کرد و ویستت بڕۆیت؟ من بە چاکی سەرنجم دا.
- هە، هە، هە! ئەی بۆ کاتێک لەبەر دەرگای ژوورەکەتدا وەستابووم، تۆ لەسەر قەنەفەکەت ڕاکشابوویت، چاوت نوقاند و خۆت کرد بە خەوتوو، هەرچەندە بە هیچ جۆرێک نەنووستبوویت؟ من بە چاکی سەرنجم دا.
- ڕەنگە.. هۆکارێکم هەبووبێت.. تۆ خۆت دەیزانیت.
- ڕەنگە منیش هۆکارێکم هەبووبێت، ئەگەر چی تۆ نایزانیت.
ڕاسکۆلنیکۆڤ ئانیشکی دادایە سەر مێزەکە، پەنجەی دەستی ڕاستی نایە ژێر چەناگەی و لە سڤیدریگایلوف ڕاما، چرکەساتێک تەماشای دەموچاوی کرد، کە پێشتریش هەمیشە سەری بەسووڕ دەهێنا. دەموچاوێکی سەیر کە هەر لە دەمامک دەچوو، سووروسپی، لێوی گوڵگون، ڕیشی زەرد و قژی پڕ و زەرد، چاوی زۆر شین، نیگایشی گەلێک سەنگین و بێجووڵە. لەم دەموچاوە زۆر جوانەدا کە لەگەڵ تەمەنیدا نەدەگونجا، شتێکی زۆر نادروست و نەفرەتی دەبینرا، جلەکانی قەشەنگ، هاوینە و سپی، بە تایبەتی کراسەکەی زۆر سەرنجڕاکێش بوو. لە پەنجەیەکیدا ئەنگوستیلەیەک بە نقێمێکی گرانبەهاوە دەدرەوشایەوە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەپڕێکدا، زۆر بە تووڕەیی و ڕاشکاوییەوە وتی:
- بەڕاست، دەبێت من خەمی تۆیش هەڵبگرم! من دەزانم تۆ ئەگەر بتەوێت زیان بە کەسێک بگەیەنیت، بە لامەوە ترسناکترین کەسیت بۆ من، وەلێ من ئیتر نامەوێت لەمە زیاتر زەبوون بم، هەر ئێستا بۆت دەردەخەم بەو ڕادەیەی تۆ بیری لێدەکەیتەوە، من ئەوەندە خۆمم مەبەست نییە، کەواتە ئەوە بزانە من بۆیە هاتووم، ڕاستوڕەوان پێت

بڵێم، ئەگەر هێشتا، هەمان خەیاڵی پێشووت، لەبارەی خوشکمەوە لەژێر سەردایە، بۆ ئەم مەبەستەیش دەتەوێت هەر چۆنێکە کەڵک لەو نهێنییە وەربگریت کە لەم دوواییەدا زانیووتە. من پێش ئەوەی ڕەوانەی زیندانم بکەیت، دەتکوژم. ئەم قسانەم سێودووی تیا نییە و خۆیشت دەیزانیت دەتوانم ئەوەی دەیڵێم بیکەم.

دووەم ئەگەر دەتەوێت شتێکم پێبڵێیت –ئاخر بە درێژایی ئەم ماوەیە هەستم دەکرد دەتـەوێت شتێکم پێبڵێیت– کەواتە خێرا بیڵێ. چونکە کات بە بەریەوە نەماوە و ڕەنگە زوو بەسەر بچێت.

سڤیدریگایلوف کە بە کونپشکنییەوە لێی دەڕوانی، پرسی:

– بەڵام، بۆ کوێ، بۆ ئەوەندەت پەلەیە؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ڕوویەکی مۆن و بێئارامییەوە وتی:

– هەرکەسە بەرەو ڕێگە و ئامانجی خۆی.

سڤیدریگایلوف بە زەردەخەنەوە وتی:

– تۆ ئێستا خۆت داوای ئەوەت لێکردم بە ڕاشکاوی قسەت لەگەڵدا بکەم، بەڵام وەڵامی یەکەمین پرسیاری من نادەیتەوە، بەردەوام تۆ لە خەیاڵی ئەوەدایت کە من نەخشەیەکم هەیە و لەبەر ئەوە بە گومانەوە تەماشام دەکەیت، باشە، ئاشکرایە بۆ یەکێک کە لەم بارەی تۆدا بێت، زانینی ئەم شتە زۆر ئاسانە، وەلێ هەرچەندە من زۆر حەز دەکەم لەگەڵ تۆدا تەبا بم، لەگەڵ ئەوەیشدا خۆم سەخڵەت ناکەم ئەو باوەڕەی تۆ بڕەوێنمەوە. بە خودا سوێند دەخۆم کە ئەم دەردەسەرییە ناهێنێت. پاشان من نەمویستووە لەسەر مەسەلەیەکی تایبەتی لەگەڵ تۆدا بدوێم.

– ئەی بۆ تاقیبم دەکەیت؟ ئاخر، تۆ خۆت نەتوت بە دوامەوە بوویت.

- تەنیا لەبەر ئەوەی تۆ خۆت شیاوی سەرنجدان و کونپشکنیت، من حەزم بەو حاڵەتە خەیاڵاوییەی تۆ بوو، هەر لەبەر ئەمە و بەس، بێجگە لەمە، تۆ برای ژنێکیت زۆر سەرنجی ڕاکێشاوم، هەر لەویشەوە چەندجارێک دەربارەی تۆ شتم بیستووە، گەیشتوومەتە ئەو ئەنجامەی کە تۆ گەلێک کاریگەریت بەسەریەوە هەیە. جا بۆ ئەمە کەمە؟ هە، هە، هە! هەر لەم بارەیەوە دان بەوەدا دەنێم کە پرسیارەکەت بۆ من هەندێک ئاڵۆزە و گرانە وەڵامی بدەمەوە، باشە، بۆ نموونە تۆ تەنیا بۆ کارێک نەهاتوویتەتە لای من، بەڵکو مەبەستێکی تازەت هەیە، وانییە؟ وایە، نا؟

سڤیدریگایلوف بە زەردەخەنەیەکی فێڵبازانەوە لەسەر مەبەستەکەی پێی داگرت:

- باشە، ئێستا دوای ئەم قسانە، ئەوە بزانە کە منیش، ئەو کاتەی لە ناو شەمەندەفەردا بەرەو ئێرە دەهاتم، هیوام تۆ بوویت، بەڵکو قسەیەکی تازەم پێبڵێیت و بتوانم سوودت لێوەربگرم، بڕوانە ئێمە هەردووکمان چەندە دەوڵەمەندین.

- دەتەوێت چ سوودێک ببینیت؟

- بڵێم چی؟ چووزانم، نابینیت من لە چ میوانخانەیەکی سووکدا هەموو کاتی خۆم بەسەر دەبەم و پێیشم خۆشە، مەبەستم ئەوە نییە پێم خۆش بێت، بەڵام، ئیتر دەبێت لە شوێنێکدا بژیت، دەی، بۆ نموونە ئەم کاتیا کلۆڵە، بینیت؟.. خۆزگا هیچ نەبێت زۆرخۆر بوومایە، یان لە خۆراکی میوانخانە گەورەکان چێژم ببردایە، بەڵام من دەتوانم چی بخۆم! (بە پەنجەی ئاماژەی بۆ سووچێک کرد، لەوێدا لەسەر مێزێکی بچووک، لە دەفرێکی کانزاییدا، پاشماوەی گۆشتێکی دزێوی لەگەڵ پەتاتەدا دی) سڤیدریگایلۆڤ لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو:

- بەڕاست تۆ نانت خواردووە؟ من تۆزێکم خواردووە، ئیتر ناتوانم، شەرابیش هەر ناخۆمەوە، بێجگە لە شەمپانیا، ئەویش شەوی پێکێک و سەریشم پێی دەیەشێت. ئێستا کە داوای شەمپانیام کرد، بۆ ئەوە بوو کەمێک بێمەوە سەر خۆم، چونکە دەمەوێت بڕۆم بۆ شوێنێک، بۆیە زەوقێکم هەیە. هۆی ئەوەی کە کەمێک لەمەوبەر، وەک منداڵە قوتابی خۆم شاردەوە، ئەوەبوو کە بیرم لەوە کردەوە تۆ خەریکم دەکەیت و دوام دەخەیت، بەڵام وا دەزانم (سەعاتەکەی دەرهێنا) دەتوانم سەعاتێک لەگەڵتابم، ئێستا سەعات چوارونیوە، باوەڕم پێدەکەیت؟ خۆزگا پیشەیەکم هەبووایە، بۆ نموونە خاوەن موڵکێک یان باوک، یان ئەفسەر، وێنەگر، ڕۆژنامەنووس.. بەڵام هیچ، هیچ، هیچ پسپۆڕییەکم نییە، ئەمە هەندێکجار وەڕزم دەکات، بە ڕاستی لە بیری ئەوەدا بووم کە تۆ من فێری شتێک بکەیت.

- ئاخر، تۆ کێیت؟ بۆ هاتوویت بۆ ئێرە؟

- من کێم؟ تۆ دەیزانیت، یەکێکم لە پیاوماقووڵان، دوو ساڵ لە سوپادا سەربازی سوارە بووم، دوایی لێرە، واتا لە پتروزبورگدا کەوتمە سووڕانەوە، ئینجا لەگەڵ مارفا پتروڤنادا بووین بە هاوسەر و لە گوندا نیشتەجێ بووین، ئەمەیە ژیاننامەی من.

- دەڵێن گوایا قومارچیت؟

- نا، قوماری چی؟ من دەستبڕم، قومارچی نیم.

- کەواتە تۆ دەستبڕیت کردووە؟

- بەڵێ، ئەویشم کردووە.

- کەواتە زۆرت تێهەڵدان خواردووە؟

- بەڵێ، ڕووی داوە، ئەی چۆن؟

- چاکە، لەوانە بوو داوای مەیدانداریت لێبکەن و بکوژرێیت تیایدا.. ئەمە خوێن دێنێتە جۆش.
- من شەڕ ناکەم، ئەوەیش بزانە لە فەلسەفە نازانم، دانی پێدا دەنێم کە زیاتر لەبەر خاتری ئافرەت هاتوومەتە ئێرە.
- تۆ تازە مارفا پتروڤنات بە خاک سپاردووە؟
سڤیدریگایلوف بە پێکەنینەوە ڕاشکاوانە وتی:
- باشە، بەڵێ، بۆ نابێت؟ پێدەچێت لە باسکردنی ژندا، خراپ لە قسەکانی من تێگەیشتبیت؟
- مەبەستت ئەوەیە من بێئابڕوویی بە خراپ دەزانم یان نا؟
- بێئابڕوویی؟ شتێکی سەیرت هێنایە گۆڕێ، بەڵام من دەمەوێت بە جۆرێکی ڕێکوپێک وەڵامت بدەمەوە. پێشەکی بەگشتی لەبارەی ژنەوە قسە دەکەم و وەڵامت دەدەمەوە، دەزانیت حەزم لە چەنەبازییە، بیڵێ: بزانم بۆ دەبێت من جڵەوی ئارەزووەکانم بکەم؟ بۆ واز لە ژن بهێنم؟ لە کاتێکدا کە من حەزم لێیە؟ هیچ نەبێت ئەمەیش سەرگەرمکردنێکە.
- کەواتە تۆ تەنیا بۆ ڕابواردن و بێئابڕووییکردن هاتویتەتە ئێرە؟
- باشە، چ عەیبێکی هەیە؟ با بڵێین بۆ بێئابڕوییە! مادامەکی تۆ بەم وشەیەوە نووساویت. بەڵام من بەهەرحاڵ، حەزم لە پرسیاری ڕاستوڕەوانە. لەم بێئابڕووییەدا، لایەنی کەم شتێک هەیە، شتێکی نەگۆڕ و جێگیر کە لەگەڵ سروشتا دەگونجێت و دەستکردی خەیاڵ نییە، شتێکە وەک پشکۆیەکی گەشاوە لە خوێندایە و بەردەوام پریشک دەهاوێت، زۆر دەخایەنێت، تەنانەت ساڵانی تەمەنیش ناتوانێت بیکوژێنێتەوە. ئێستا دانی پێدا بنێ، ئەمەیش خۆی جۆرێک نییە لە سەرقاڵی؟

- ئەمە ئەوە نییە دڵی خۆتی پێ خۆش بکەیت، ئەمە نەخۆشییە و نەخۆشییەکی ترسناکیشە.

- ڕاستە، منیش دەڵێم نەخۆشییە، وەک هەر شتێک لە سنووری ئاسایی خۆی تێپەڕێت، لەم کارەدا دەبێت بە ناچاری لەو سنوورە تێپەڕیت. وەلێ یەکەم لەم بوارەدا هەر کەسەو خۆیەتی، ئەم بەو جۆرە و ئەویتر بە جۆرێکی دی دەیکات. دووەم لە هەموو کارێکدا پێویستە سنوور هەبێت، هەرچەندە ئەمەیان سووک و ڕسوایە، بەڵام باشە چی بکەین؟ ئەگەر ئەمەیش نەبێت، ناچارین خۆمان بکوژین، من ئەوەم قبووڵە کە مرۆڤی شەریف دەبێت هەست بە مەلوولی و بێزاری بکات. بەڵام ئیتر..

- تۆ دەتوانیت خۆت بکوژیت؟

سڤیدریگایلوف بە بێزارییەوە وتی:

- چ پرسیارێکە! تکایە لەم لایەنەوە قسەم بۆ مەکە.

ڕستەی دوایی بەپەلە و تەنانەت بێ هیچ سەروبنکردنێک وت کە لە وتەکانی پێشوویدا ئەمە دەردەکەوت، تەنانەت دەموچاویشی تێک چوو:

- من دانی پێدا دەنێم کە ئەمە لاوازییەکە لە مندا و قابیلی بەخشین نییە، چی بکەم، لە مەرگ دەترسم و حەز ناکەم باسی بکەیت، دەزانیت من تا ڕادەیەک لە سۆفی دەچم.

- ئاە! ئەوە تارمایی مارفا پتروڤنایە، هێشتا هەر سەرت لێدەدات؟

سڤیدریگایلۆڤ بە تووڕەیی وتی:

- واز لەوە بهێنە، لە پتروزبورگدا هێشتا ڕووی نەداوەتەوە، بەهەرحاڵ، بۆ دۆزەخ، نا، چاکترە قسە لەسەر ئەم.. بەڵام، هوم!

بەداخەوە درەنگە و ناتوانم لەگەڵتا بمێنمەوە، قسەی تازەم پێبوو پێتی بڵێم.

- هەر پەیوەندیی بە ژنەوە هەیە؟

- بەڵێ، ژن پێشهاتێکە بە ڕێکەوت ڕوو دەدات.. ئەوە نییە کە تۆ دەیزانیت.

- باشە، بەڵام ئەم زەلکاوە هیچ کارت تێناکات؟ توانای ئەوەت نەماوە بیوەستێنیت؟

- داوای توانام لێدەکەیت؟ هە، هە، هە! ئەوەندەی تر منت سەرسام کرد، ڕادیون ڕۆمانۆڤیچ، هەرچەندە پێشتریش دەمزانی وا دەبێت، تۆ دەربارەی بێئابڕوویی و ڕەفتارجوانی قسە دەکەیت؟ تۆ شیلەریت، تۆ ئایدیالستیت، هەموو شتەکان وەک خۆیانن و ئەگەر وا نەبووایە دەبوو سەیرم لێبێت. وەلێ لەگەڵ ئەمانەیشدا، بە ڕاستی هەر جێی سەرسوورمانە.. ئاە، بەداخەوە کە کاتم نییە، چونکە تۆ خۆت چاکترین بابەتی کونپشکنی و سەرنجدانیت. بەڕاست تۆ شیلەرت خۆش دەوێت؟ من زۆرم خۆش دەوێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە بێزارییەوە وتی:

- تۆ زۆر خۆت بە شت دەزانیت.

سڤیدریگایلوف دایە قاقای پێکەنین و وەڵامی دایەوە:

- نا، نا، بە خودا، من ناڵێم وانییە، با خۆیشم بە شت بزانم، ئەگەر خۆبەشتزانین زیانێکی نەبێت، بۆ نەیزانم، من حەوت ساڵ لە گوندێکدا لەگەڵ مارفا پتروڤنادا ژیاوم، بۆیە ئێستا کە دەستم گەیشتۆتە ئاقڵێکی وەک تۆ، کەسێکی زیرەک و سەرنجڕاکێشی بێوێنەی وەک تۆ، خۆشحاڵم قسەت لەگەڵدا بکەم. بەتایبەتی کە ئەو نیوپێکەیشم

خواردۆتەوە و کەمێک لێی داوم. بەڵام ئەو شتەی منی شپرزە کردووە.. وەلێ وا چاکترە نەیڵێم و بێدەنگ بم.

سڤیدریگایلوف لەپڕێکدا ترسی لێنیشت و وتی:

- بۆ کوێ دەڕۆیت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە کاتی هەستاندا بوو، لە هاتنەکەی ئێرەی خۆی، بێتاقەت و دڵی گیرابوو، بە تەواوی بڕواوە، سڤیدریگایلوفی بە پیاوێکی تا بڵێی زۆڵ و سووک و ڕسوا دایە قەڵەم، کە لەسەر ئەم زەوییە بژی.

سڤیدریگایلوف جەختی کرد:

- ئای! دانیشە، نارۆیت، هیچ نەبێت چایەک داوا بکە، باشە، فەرموو دابنیشە. ئیتر شەش و بێش ناڵێم، مەبەستم شتی خۆمە، دەمەوێت شتێکت بۆ باس بکەم، دەتەوێت بۆت بگێڕمەوە چۆن ژنێک ڕزگاری کردم؟ ئەمە وەڵامی یەکەم پرسیاری تۆیشە، چونکە ئەو ژنە خوشکی تۆ بوو. دەتوانم بۆت بگێڕمەوە؟ وەختەکەیش دەکوژین.

- باسی بکە. بەڵام هیوادارم کە تۆ..

- نارەحەت نەبیت، بەدەر لە هەموو شتێک، ئاڤدوتیا ڕومانۆڤنا تەنانەت بۆ کەسێکی پووچ و سووک و ڕسوای وەک منیش جێگای ڕێزێکی زۆر قووڵە.

## ٤

سڤیدریگایلۆڤ کەوتەوە قسە:

- ڕەنگە بزانیت (هەر چەندە من خۆم ئەمەم بۆ باس کردوویت) کە من لێرە، لەبەر قەرزارییەکی زۆر خرامە بەندیخانەوە، بێ ئەوەی بتوانم بە هەر ڕێگەیەک بێت ئەو برە پارەیە بدەمەوە. پێویست بەوە

ناکات باسی ئەوەت بۆ بکەم کە چۆن مارفا پتروڤنا ئازادیی منی کڕییەوە. ئایا ئەوە دەزانیت ژن کە یەکێکی خۆش ویست، ئیتر ئەقڵی لەدەست دەدات؟ مارفا پتروڤنا ژنێکی شەریف و تا ڕادەیەکیش بەئاوەز بوو، هەرچەندە هیچی نەخوێندبوو، بیهێنە بەرچاوت، ئەم ژنە پاکیزە و زۆمدار (حەسوود)ە، ئامادە بوو دوای ئەو هەموو شەڕ و سەرزەنشتیانە، جۆرە پەیمانێک لەگەڵما ببەستێت، کە بە درێژایی ژیانی هاوسەریمان لێی لانەدا و نکۆڵیی لێنەکرد. دەمەوێت ئەوە بڵێم کە ئەو بە تەمەن زۆر لە من گەورەتر بوو، خووی پێوە گرتبوو هەمیشە شتێکی بۆنخۆشی وەک دەنکەمێخەکی دەخستە دەمییەوە، وەلێ من لە گەمژەیی و لە هەمان کاتیشدا بە ڕاستگۆییەوە، بێ پێچوپەنا توانیم پێی بڵێم کە من ناتوانم لەگەڵ ئەودا تەواو بەوەفا بم، ئەم دانپێدانانە ڕقی هەستاند، بەڵام لای خۆیشییەوە تا ڕادەیەک ئەو ڕاشکاوییەی منی پەسەند کرد: بیری کردەوە: "مادامەکی خۆی لە پێشەوە ئەمە دەڵێت، کەواتە نیازی ئەوەی نییە ناپاکیم لەگەڵدا بکات". باشە، ئەمە بۆ ژنێک کە ئیرەیت پێبەرێت، گەلێک گرنگە. دوای ئەوەی فرمێسکی زۆری ڕشت، لە نێوانماندا بەڵێننامەیەکی زارەکی بەسترا: یەکەم من هەرگیز لە مارفا پتروڤنا جیا نەبمەوە و هەر مێردی بم، دووەم بەبێ مۆڵەتلێوەرگرتنی ئەو بۆ هیچ جێگایەک نەچم، سێیەم ژنێک نەکەم بە دۆستی هەمیشەیی خۆم. چوارەم لەباتیی ئەوانە، چاوپۆشیم لێبکات کە هەندێکجار خۆی ژێر بە ژێر مۆڵەتم بدات چاوبازی لەگەڵ کارەکەرەکاندا بکەم. پێنجەم خوا نەکات عاشقی ژنێک ببم کە لە چینی خۆمان بێت. شەشەم، ئەگەر خوانەکردە، ڕۆژێک لە ڕۆژان، عەشقێکی قووڵ و گەورە لە سەری دام، دەبێت ڕاستییەکە بە مارفا پتروڤنا بڵێم. لەبارەی ئەم دوانوختەیەوە، دەبێت ئەوە بڵێم کە

مارفا پترۆڤنا زۆر پێی ئاسوودە بوو. ئەو ژنێکی ئاقڵ بوو، بۆیە نەیدەتوانی لەبارەی منەوە هیچ شتێک لەوە زیاتر بزانێت، کە من پیاوێکی داوێنپیس و هەوەسبازم و نازانم عەشقی ڕاستەقینە لە کوێوەیە، وەلێ ژنی زرنگ و ژنی زۆمدار دوو شتی جیاوازن، هەموو نەگبەتییەکەیش لێرەدایە، پاشان ئەگەر تۆ بتەوێت دەربارەی هەندێک کەس بە بێلایەنی قسە بکەیت، دەبێت لە پێشەوە دەستبەرداری هەندێک بیروباوەڕی باو و هەندێک دابونەریت ببیت، کە دەوری خەڵک و شتەکانی دەوروبەریان داوین. من بۆم هەیە زیاد لە هەر کەسێکی دی بڕوام بە ڕاوبۆچوونی تۆ هەبێت. ڕەنگە تا ئێستا، گەلێک شتی پێکەنیناوی و بێمانات لەبارەی مارفا پترۆڤناوە بیستبێت، لە ڕاستیا ئەویش هەندێک خووی زۆر پێکەنینهێنی هەبوو. وەلێ ڕەپوڕاست دەڵێم کە من پەشیمانم لەو هەموو دەردوخەفەتەی بەوم دابوو، باشە، ڕەنگە ئەم کورتەباسە یادکردنەوە و ستایشێکی شیاو بێت لە مێردێکی دڵسۆزەوە بۆ ژنێکی زۆر ناسک و دلۆڤان، لە کاتی شەڕو ناکۆکیماندا من زۆرجار بێدەنگ دەبووم، تووڕە نەدەبووم و ئەم ڕەفتارە جوامێرانەیە تا ڕادەیەک بەردەوام ئەنجامی باشی لێدەکەوتەوە، کاری لێدەکرد و تەنانەت لای پەسەند بوو، هەندێکجار ڕێک دەکەوت کە تەنانەت شانازیشی پێوە دەکردم، لەگەڵ ئەمانەیشدا نەیتوانی لە بەردەم چیرۆکەکەی نێوان من و خوشکتا خۆی بگرێت، نازانم چۆن قایل بوو ئەم سەرکێشییە بکات و کچێکی ئاوا جوان بۆ پەرستاری بهێنێتەماڵەوە؟ من وای بۆ دەچم کە مارفا پترۆڤنا ژنێک بوو زوو دەخرۆشا و بەهەستوسۆز بوو. لە ڕاستیا خۆشی ویستووە، تەواو دڵی بە خوشکت داوە و شەیدای بووە. بێ لەوە، ئاڤدۆتیا ڕۆمانۆڤنایش، نازانم بڕوا دەکەیت یان نا؟ بەڵام ئەو خۆی

دەستپێشخەریی کرد؟ ئایا بڕوا دەکەیت کە لە سەرەتادا مارفا پتروڤنا لەو بێدەنگییە بەردەوامەی من لەبارەی خوشکتەوە تەنانەت تووڕە بوو، چونکە من لە ئاست ئەو قسە بەردەوامانەی لەبارەی خۆشەویستیی ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤناوە دەیکرد، خوێنسارد بووم و گوێم پێنەدەدا، من خۆیشم نەمدەزانی چی دەوێت! دیارە مارفاپتروڤنا، وردودرشتی ئەو شتانەی پەیوەندییان بە منەوە هەبووە، بۆ ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنای باس کردووە. مارفا پتروڤنا بەداخەوە ڕەوشتێکی ناخۆشی هەبوو، هەرچی نهێنیی ژیانی من و خۆی هەبوو، بۆ هەموو کەسێک، بێ ئاوارتەکردن، دەگێڕایەوە و سکاڵای لەدەست دەکردم، ئیتر چۆن دەبوو ئەم هاوڕێ خۆشەویست و جوانە تازەیەی لەو شتانە ئاگادار نەکات؟ لە خەیاڵی مندا ئەو دووانە چ گفتوگۆیەکی تریان نەبووە بێجگە لە باسوخواسی من، بێگومان ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنا ئاگاداری هەموو نهێنی و لایەنە تاریکەکانی ژیانی من بووە.. گرەویش دەکەم ئەگەر تۆیش شتێکی لەو بابەتانەت نەبیستبێت؟

- بیستوومە، تەنانەت لۆژین گوناهی کوشتنی منداڵەکەی خستە ئەستۆی تۆ، ئایا ئەمە ڕاستە؟

سڤیدریگایلۆڤ بە بێزاری و وەڕزبوونەوە لە وەڵامدانەوەیەکی ڕاشکاوانەی پرسیارەکە هەڵات و وتی:

- تکایە هەر دەستی تێوە مەدە، ئەگەر بتەوێت بە ڕاستی دەربارەی ئەو مەسەلە سووک و ڕسوایە شتێک بزانیت، من ڕۆژێکی دی بە وردی بۆت باس دەکەم، وەلێ ئێستا..

- دەربارەی نۆکەرێکی لادێییش کە کاری بۆ کردوون، هەندێک شتی وت، گوایە تۆ گوناهێکت بەرانبەری کردووە.

سڤیدریگایلوف دیسانەوە خۆی پێنەگیرا و قسەی بە ڕاسکۆلنیکۆڤ بڕی، وتی:
- تکایە لێی گەڕێ!
وەلێ ڕاسکۆلنیکۆڤ کە تەواو ڕقی هەستابوو، وتی:
- ئایا ئەوە هەر هەمان ئەو نۆکەرە نەبوو، کە دوای مردنی ژنەکەت هاتبوو بۆ ئەوەی پایپەکەت بۆ چاک بکات؟ لە بیرتە، خۆت بۆت باس کردووم؟
سڤیدریگایلۆڤ بە وردی لە بەرانبەرەکەی ڕوانی، ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستی کرد کە لە نیگاکەیدا بروسکەیەکی گاڵتەجاڕانە دەدرەوشێتەوە. بەڵام سڤیدریگایلوف خۆی گرت و بەوپەڕی ئەدەبەوە وەڵامی دایەوە:
- بەڵێ، خۆی بوو، من وای دەبینم ئەم مەسەلانە تۆیان زۆر کونپشکن و نیگەران کردووە، لە دەرفەتێکی گونجاودا، بە ئەرکی خۆمی دەزانم لە هەر بارەیەکەوە بێت، کونپشکنیەکانت نەهێڵم و قایلت بکەم. نەفرەت لە شەیتان، من بە ڕاستی وای دەبینم کە لە دواییدا هەندێک کەس بە شاعیرم تێبگەن. تۆ خۆت بیڵێ، دەبێت من تا چەند سوپاسگوزاری مارفا پتروڤنا بم کە چەند شتی نهێنیی منی بۆ خوشکت گێڕاوەتەوە. لەبارەی کاریگەریی قسەکانییەوە من ناتوانم هیچ داوەریەک بکەم، وەلێ هەرچۆنێک بێت، لە ڕوویەکەوە لە بەرژەوەندیی من شکاوەتەوە..
لەگەڵ ئەو هەموو بێزارییەی کە ئاڤدوتیا ڕومانوڤنا بەرانبەر بە من پەیدای کردبوو، لەگەڵ دەموچاوە گرژومۆنە هەمیشەییەکەی مندا، کەچی هەر بەزەیی بە مندا، بە منی لەدەستچوودا دەهاتەوە. کاتێک دڵی کچێکی جوان هەستی ئەو بەزەییەی تێدەکەوێت، ئەوە دیارە مەترسییەک ڕووی لە کچەکە کردووە. ئەوسا حەتمەن تێدەکۆشێت

ئەو کەسە "ڕزگار" بکات، بیهێنێتەوە سەر خۆی، زیندووی بکاتەوە، ئامانجی پاکیزەتری تیا دروست بکات، بۆ ژیان و کاری نوێ گیانێکی پێببەخشێت. باشە، ئاشکرایە کە دەشێت چ حەز و ئارەزوویەکی لەم بابەتە بێتە گۆڕێ، بۆیە زوو هەستم کرد باڵندەکە دەیەوێت بەپێی خۆی بەرەو داوەکە بچێت. منیش لای خۆمەوە چاوەڕێم کرد. وا بزانم بڕۆت هێنانەوە یەک. ڕادیون ڕومانوڤیچ؟ هیچ دەرنەچوو، وەک تۆ لێی حاڵی بوویت، چیرۆکەکە سەری نەگرت (نەفرەت لە شەیتان، زۆرم خواردۆتەوە!) دەزانیت، هەمیشە لەو سەرەتایەدا، داخم دەخوارد کە بۆ چارەنووسی خوشکت، نەکەوتۆتە سەدەی دووەم یان سێیەمی زاینەوە، لە شوێنێکدا کچی میرێکی دەوڵەمەند، یان کچی حاکمێک یان والییەکی ئاسیای بچووک بووایە. ئەوسا بێگومان دەبووە یەکێک لەو ژنانەی کە بەرگەی هەموو ئازارێکی دەگرت و کاتێک ئاسنی سوورەوەبوویان بکردایە بە مەمکیدا، پێدەکەنی. خۆی بە تایبەتی بە دوای چارەنووسێکی وا دەکەوت، خۆ ئەگەر لە سەدەی چوارەم و پێنجەمدا بووایە، پەنای دەبردەبەر بیابانی میسر و سیساڵی لەوێ بەسەر دەبرد، ڕەگی ڕووەکی دەخوارد و بە خەون و خەیاڵ دەژیا. چونکە تینووی کارەساتە و چاوەڕێی ئەوەیە لەباتیی یەکێکی تر خۆی بکاتە قوربانی و تا بتوانێت زووتر ئەم کارە بکات. خۆ ئەگەر تووشی بەڵایەکی وا نەبێت، ڕەنگە خۆی لە پەنجەرەیەکەوە فڕێ بداتە خوارێ، من شتێکم لەبارەی کەسێکەوە بیستووە بە ناوی جەنابی ڕازومیخینەوە[1]، دەڵێن لاوێکی ئاقڵە (ئەمە لە ناوی

---

[1] مانای وشەی "ڕازومیخین" هزرمەند و خاوەنی ئاوەزە. وشەی رازوم بە مانای ئەقڵە-و-.

خێزانەکەیەوە دیارە و بێگومان قوتابییە) کەواتە لێگەڕێ با ئەو ئاگاداری لە خوشکت بکات، بەکورتی، پێدەچێت من لە ئەقڵی ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنا تێگەیشتبم و شانازیشی پێوە دەکەم. وەلێ لەو کاتەدا، واتا لە سەرەتای ئاشنایەتیدا، خۆت دەزانیت کە مرۆڤ بەردەوام هەندێک سەرکێش و کورتبینە، بیرکردنەوەی هەڵەیە و هەقیقەت بە ئاوەژووی دەبینێت. نەفرەت لە شەیتان، ئاخر ئەم کچە بۆ ئەوەندە جوانە؟ من بێگوناهم!

بەکورتی لەو بەراییەدا، مەیل و ئارەزوویەکی وام تێگەڕا، کە نەدەمتوانی بەری لێبگرم.

ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنا گەلێک پاکیزەیە، تا ڕادەی بڕوانەکردن. (لە بیرت نەچێت، ئەوەی من دەربارەی خوشکت دەیزانم و پێتی دەڵێم ڕاستییە، ڕەنگە تا ڕادەی بیماری پاکیزە بێت، لەگەڵ ئەوەیشدا کە بیرێکی کراوە و قووڵی هەیە، ئەمەیش زیانی پێدەگەیەنێت) هەر لەو ماوەیەدا کچێک بە ناوی پاراشا، پاراشای چاوڕەش کە تازە لە گوندەوە هێنابوویان و ببوو بە کارەکەرمان و تا ئەوساتە من نەمدیبوو، هاتە گۆڕێوە. زۆر جوان، بەڵام تا بڵێی گەمژە بوو: ڕۆژێک ئەم کچە بە فرمێسک و هاوار دنیای پڕ کرد، ئەمە ئابڕووچوونێک بوو، ڕۆژێک دوای نانی نیوەڕۆ. ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنا بەتایبەتی لە دالانێکی نێو درەختی باخەکەدا منی دۆزییەوە، بە پەرۆشەوە داوای لێکردم دەست لە پاراشای داما و هەڵبگرم، وابزانم ئەوە یەکەمین قسەی دووبەدووی ئێمە بوو. بێگومان من بە شانازییەوە داواکەیم بەجێ هێنا. هەوڵم دا خۆم بە زوڵملێکراو و شەرمندە بخەمە بەرچاو

بە کورتی، بە چاکی ڕۆڵی خۆمم بینی. لەوساوە پەیوەندیمان بەست و بە نهێنی دیدارمان دەکرد، ئامۆژگاریی دەکردم و پەندی دادەدام،

ئاوات و پاڕانەوە و تەنانەت فرمێسکی دەڕشت، بەڵێ فرمێسک، باوەڕ دەکەیت؟ بڕوانە کچێک بۆ ئەوەی پڕوپاگەندە بۆ مەزنی و ڕوناکبیریی بکات، تا کوێ دەڕوات! هەڵبەتە من هەموو گوناهەکانی خۆمم خستە ئەستۆی ڕێکەوت، خۆیشم وا پیشان دا کە تینووی ڕووناکیم، پاشان گەورەترین و دڵنیاترین ڕێگەم لەبەر گرت، کە دڵی ژنی پێ بەدەست دێت، ڕێگەیەک هەرگیز کەس فریوو نادات. بێ ئاوارتەکردنیش کاری لە هەموو ژنێک کردووە. ئەو ڕێگەیە بریتییە لە پیاهەڵدان و زمانلووسی. لە دنیادا هیچ شتێک بە ئەندازەی ڕاستگۆیی و ڕاشکاوی سەخت و دژوار نییە، هیچ شتێکیش بە ئەندازەی پیاهەڵدانی نارەوا ئاسان نییە، ئەگەر لە ڕاستگۆیی و ڕاشکاوی وتندا تەنیا یەک لە سەدی درۆ بێت، یەکسەر نارێکییەکە دەردەکەوێت و کارەساتێک ڕوو دەدات، بەڵام ئەگەر لە مەرایی و پیاهەڵداندا هەمووی درۆ بێت، هێشتا هەر خۆشە و چێژ بە گوێگرەکەی دەبەخشێت، هەرچەندە مەراییەکە بە ئاشکرا ناڕاستیش بێت، هێشتا بە لای ئەو کەسەوە کە بۆی کراوە، نیوەی ڕاستە، ئەمە بۆ هەموو کەسێک، لە هەر چین و لە هەر ئاستێکی شارستانیدا بێت وایە. کەسانی ئاسایی هەر یەکەو بە ڕێی خۆی، ناتوانم پێنەکەنم، کاتێک کە ویستم ژنێکی بەڕێز، دڵسۆز بۆ مێرد و منداڵەکانی، فریوو بدەم، چەندە سووک و ئاسان بە دەستمەوە هات! لە کاتێکدا کە ژنەکە بە ڕاستی پاک و خودانی گەورەیی بوو، هیچ نەبێت بە شێوازی خۆی، شێوازی من لەگەڵیدا بریتی بوو لەوەی کە خۆم بەرانبەر بە پاکیزەیی و گەورەیی ئەو بە بچووک و زەلیل دابنێم و کڕنووشی بۆ بەرم، بێئەندازە مەراییم بۆ دەکرد، هەر ئەوەندەی دەستگوشینێک یان نیگایەکی تایبەتی پێ ڕەوا ببینیمایە، لە بەردەمیدا سەرکۆنەی خۆم دەکرد کە بە زۆر ئەوەم دەست کەوتووە.

حەتمەن ئەو بەرگریی دەکرد، بە سەختی هەڵوێستی دەنواند، خۆ ئەگەر من تا ئەو ڕادەیە ڕسوانە بوومایە، هەرگیز هیچم دەست نەدەکەوت، بە خۆمم دەوت: ئەو بەوپەڕی سادەیی و بێگوناهییەوە هەرگیز چاوەڕێی ئەوە نەبووە من داوی بۆ دابنێم، بێ ئەوەیش بە خۆی بزانێت و گومان بکات.. خۆی داوە بە دەستمەوە. بە کورتی، ئەوەی دەمویست، پێی گەیشتم، خانمەکەیش بڕوای تەواوی بە خۆی هەبوو کە بێتاوانە و پاکیزەیە و ئەرکی خۆی بە پاکی بەجێ هێناوە، ئەگەر هەڵەیشی کردبێت، ڕێکەوت پێی کردووە. نازانیت چ تووڕەبوونێک تووڕە بوو، کاتێک لە دواییدا پێم وت –ئەمەم بە تەواوی بڕواوە پێوت– کە ئەویش وەک من حەزی بەو تاموچێژە بووە.

مارفا پتروڤنای داماویش گەلێک دەستخەڕۆی پیاهەڵدان بوو، خۆ ئەگەر بمویستایە، بێگومان دەمتوانی هەر لە سەردەمی ژیانی خۆیدا هەموو سەروەت و سامانەکەی بکەم بە ناوی خۆمەوە (بەڕاست چەندە شەراب دەخۆمەوە و قسە دەکەم!) هیوادارم پێت ناخۆش نەبێت ئەگەر ئێستا پێت بڵێم کە هەمان ئەو کاریگەرییانە لە ئاڤدوتیا ڕومانۆڤنایشدا وردەوردە دەرکەوت. بەڵام من گەوج و خۆنەگر بووم و کارەکەم تێک دا، ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنا چەند جارێک، بە تایبەتی لە یەکێک لەو جارانەی دواییدا، بە بێزارییەکی زۆرەوە لە نیگاکانی چاومی ڕوانی. نازانم باوەڕ دەکەیت یان نا؟ بە کورتی، بەردەوام ڕوانینەکانم پڕ بوون لە بڵێسەی ئارەزوویەکی نامەردانە، کە ئەوی دەترساند و قەڵسی دەکرد. پێویست بە درێژدادڕی ناکات، لە یەکدی دابڕاین، وەلێ جارێکی تر گەوجایەتیم کردەوە، کەوتمە گاڵتەپێکردنی هەموو ڕاوێژ و ئامۆژگارییەکانی، ئەم کارەم زۆر بە خراپی کرد.

پاراشا دیسانەوە هاتەوە سەر شانۆ، بە تەنیا ئەویش نا، بە کورتی، بوو بە شاری لووت، ئاخ، ئەگەر تۆ، ڕادیون ڕومانوڤیچ، تەنیا بۆ تاقەجارێک لە هەموو تەمەنتدا، چاوی خوشکتت بدیایە کە چۆن داگیرسابوون، بڕوانە، گرنگ نییە کە ئێستا من مەستم و پێکێک شەرابم نۆشیووە، ئەوەی من دەیڵێم ڕاستە، بڕوا بکە تەنانەت لە خەویشدا نیگاکانیم دەبینی، نەمدەتوانی گوێ لە خشەخشی کراسەکەی بگرم. لە ڕاستیدا وام بیر دەکردەوە کە لە هۆش خۆم چووم، پێشتر هەرگیز ئەوەم بە خەیاڵدا نەگەڕابوو کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ببووریمەوە، هەرگیز بۆ ئەوە نەدەچووم کە تا ئەو ڕادەیە ناڕەحەت بم، بۆیە دەبوو ئاشت ببینەوە، وەلێ ئەمەیشیان کاری نەکردەبوو، دەزانیت من ئەوسا چیم کرد؟ نازانیت کە تووڕەیی مرۆڤ بەرەو چ بێئەقڵییەک دەبات! ڕادیون ڕومانوڤیچ، هەرگیز لە تووڕەییدا هەنگاو بەرەو کارێک نەنێیت. من دەمزانی کە ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنا هەژار و دەستکورتە (ئاخ، ببوورە، نەمدەویست وا بڵێم.. وەلێ مەگەر چ جیاوازییەکی هەیە ئەگەر دەربڕینەکە مانای تەواوی گەیاندبێت؟) بە ئارەقەی ناوچاوی دەژی و خەرجیی دایک و براکەیشی لە ئەستۆی ئەودایە (ئاخ، نەفرەت لە شەیتان، دیسان دەموچاوت دایەوە بە یەکدا) باشە، بڕیارم دا هەرچی پارەم هەیە، بۆی پێشنیاز بکەم و بیدەمێ، (ئەو کاتە سی هەزار ڕۆبڵم هەبوو) بەو مەرجەی هەر هیچ نەبێت بۆ ئێرە، بۆ پترزبورگ، لەگەڵما هەڵبێت، ئامادە بووم لێرە سوێندی بۆ بخۆم کە هەتاهەتایە خۆشم بوێت و بەختەوەری بکەم، هەرچییەکی تریشی بوێت. باوەڕ دەکەیت، من ئەوەندە شەیدا بووم، تەنانەت ئەگەر پێی بوتمایە مارفا پتروڤنا بکوژە یان ژەهرخواردی بکە بۆ ئەوەی ببمە ژنت، بێ سێودوو داواکەیم بە ئەنجام دەگەیاند، وەلێ هەموو

شتەکان شکستیان خوارد و بوونە هۆی کارەسات. تۆ دەزانیت، خۆیشت دەتوانیت لەوە بگەیت، کە چ ڕقێک چۆکی لەسەر دانام کاتێک بیستم مارفا پتروڤنا ئەو کابرا هیچوپووچە، لۆژینی دۆزیوەتەوە و هیچی وای نەماوە لەگەڵ خوشکتا زەماوەند بکات. لە ڕاستیدا ئەمە هیچ جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ ئەو پێشنیازەدا، کە من لەو بارەیەوە کردبووم، وانییە؟ وایە؟ هەست دەکەم بە پەرۆشەوە گوێت بۆ قسەکانم شل کردووە.. لاوێکی ڕەندیت..

سڤیدریگایلۆڤ بێئارامانە مشتی بە مێزەکەدا کێشا، ڕەنگی دایسابوو. ڕاسکۆلنیکۆڤ چاک دەیزانی ئەو پێکە، یان ئەو پێکونیوە شامپانیایە کە سڤیدریگایلوف بە وردەقوم خواردبوویەوە، کاریگەرییەکی زۆر خراپی بەسەرییەوە هەبوو. بۆیە بڕیاری دا دەرفەت لە دەست نەدات، گەلێک لە سڤیدریگایلوف بەدگومان بوو، بێ ئەوەی بیەوێت بیشارێتەوە کە ڕەنگە سڤیدریگایلۆڤ بێتاقەت بکات، ڕێکوڕەوان پێی وت:

- کەواتە، ئیدی هیچ گومانێک لەوەدا نییە کە تۆ بۆیە هاتوویت بۆ ئێرە، چونکە شتێکت لەژێر سەردایە پەیوەندیی بە خوشکمەوە هەیە.

سڤیدریگایلوف کە لە ناکاوێکدا هاتبووەوە سەر خۆی، وتی:

- ئاخ، لێگەڕێ، خۆم پێم وتیت.. پاشان خوشکت هەر نایەوێت من ببینێت.

- منیش گومانم لەوەدا نییە کە ڕقی لێتە، بەڵام مەسەلەکە ئەمە نییە.

- کەواتە تۆ بێگومانی کە ئەو منی ناوێت؟ (سڤیدریگایلوف چاوی داگرت و بە تەوسەوە پێکەنی) ڕاست دەکەیت، منی خۆش ناوێت، بەڵام هەرگیز بەوەی لە نێوان ژن و مێرد، یان دۆست و دەزگیراندا ڕوو دەدات، بڕوا مەکە. لەم مەسەلانەدا بەردەوام شتێک هەیە کە

بێجگە لەو دووانە خۆیان کەسی تر نایزانێت. تۆ لەو باوەڕەدایت کە ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنا لە بینینم بێزار بێت؟
- لە هەندێک وشە و ئاماژەی ناو قسەکانتا، وا تێدەگەم تۆ هێشتا دیدێکی تایبەتی و نیازێکت دەربارەی دونیا هەیە، بێگومان هەردووکیان ئامانجگەلێکی قێزەونن.
- چۆن! من شتی وام بەسەر زماندا هاتووە؟
سڤیدریگایلۆڤ ئەم ڕستەیەی لەپڕێکدا بە ترسێکی منداڵانەوە وت، بەڵام لەبارەی ئەو سیفەتەوە کە درابووە پاڵ ئامانجەکانی، هیچی بەسەر خۆیدا نەهێنا.
ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:
- ئاخر، ئەو قسانە هەنووکە لە دەمتەوە هاتنە دەرێ، وەلێ بۆ ئێستا وا لەپڕێکدا ترسایت؟
- من بترسم؟ لە تۆ بترسم؟ دەبێت تۆ لە من زیاتر بترسیت، هاوڕێی ئازیز. بە ڕاستی چیرۆکێکی سەیرە.. بەڵام بە ڕاستی من مەستم، خۆم دەیزانم، نزیک بوو شتی تریش بڵێم، شەراب وێڵکە، ئادەی ئاوم بۆ بێنە!
بەدەم قسەکانەوە بوتڵەکەی گرت و بە ئاسانی لە پەنجەرەکەوە فڕێی دایە خوارێ. فلیپ ئاوی بۆ هێنا.
سڤیدریگایلوف لە حاڵێکدا خاولیی تەڕ دەکرد و دەیخستە بان سەری، وتی:
- ئەمانە هەموو قسەی بێمانان، من دەتوانم بە وشەیەک دەمکوتت بکەم و هەرچی بەدگومانیت هەیە، بیدەمە دواوە، بۆ نموونە دەزانیت من بەم زووانە ژن دێنم؟
- تۆ پێشتریش ئەمەت پێوتووم.

- پێم وتوویت؟ لە بیرم نەماوە، وەلێ ئەوسا هێشتا تەواو دڵنیا نەبووم، چونکە بوکێم نەدیبوو، بەڵام بڕیارم دابوو، وا ئێستا ئیتر دەزگیراندارم و مەسەلەکە کۆتایی پێهاتوە. ئەگەر کارگەلێکی پەلە نەبوونایە، حەتمەن لەگەڵ خۆمدا ئەمبردیت بۆ لای، چونکە حەز لە ڕاوبۆچوونی تۆ دەکەم. نەفرەت لە شەیتان! تەنیا دە دەقیقەم ماوە، دەبینیت، تەماشای سەعات بکە، وەلێ دەمەوێت ئەمەت بۆ باس بکەم، چونکە چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشە، ژنهێنانی من ڕووداوێکی زۆر دەگمەنە. چییە؟ دیسانەوە دەتەوێت بڕۆیت؟

- نا، ئیتر ناڕۆم.

- چۆن، هەر ناتەوێت بڕۆیت؟ دەبینین، ڕاستە دەتبەم بۆ ئەوێ و دەزگیرانەکەمت پیشان دەدەم. بەڵام ئێستا نا، دەبێت تۆ زۆر زوو بکەویتە دوای کاری خۆت. تۆ بە لای ڕاستدا، من بە لای چەپدا. تۆ ئەو خاتوو ڕسلیخە دەناسیت؟ ئەو ڕسلیخەی لە خانووەکەیدا دەژیم، ها؟ گوێت لێمە؟ نا، چیت بە بیردا دێت، ئەمە ئەو ژنەیە کە دەڵێن لە چلەی زستاندا بووە بە هۆی ئەوەی کچۆڵەیەک خۆی فڕێ بداتە ئاوێکەوە و بخنکێت. باشە، گوێت لێمە، ئەو ژنە ئەم کارەی بۆ ڕەخساندووم، پێم دەڵێت: "تۆ بەم حاڵەی ئێستاتەوە بێزار دەبیت و حەوسەڵەت نامێنێت، کەمێک خۆشی بدەرە خۆت". لە ڕاستیدا، من پیاوێکی خەمۆک و ماندووم، زیان بە کەس ناگەیەنم، تۆ وا دەزانیت شادمانم؟ نا، من خەمبارم، لە سووچێکدا دادەنیشم، جاری وا هەیە سێ ڕۆژی تەواو ناتوانن بمهێننە قسە. وەلێ ڕسلیخ، با پێت بڵێم بەرەڵایەکە بۆ خۆی، دەزانیت چی لەژێر سەردایە: وا بیر دەکاتەوە دوای ماوەیەک تاقەتم لە ژنەکەم دەچێت، بەرەڵای دەکەم و دەڕۆم.. ئیتر ژنەکەم دەکەوێتە بەردەستی، ئەوسا دەیخاتە گەڕ، بۆ کەسانی

وەک ئێمە و لە ئێمەیش گرنگتر، پێی وتم باوکی کچە کارمەندێکی نەخۆشی خانەنشین کراوە، سێ ساڵە لە جێگادا کەوتووە و ناتوانێت پێ بجووڵێنێتەوە. دەڵێت دایکی ئاقڵە. براکەیشی لە شارێکدا کارمەندە و یارمەتیی کەسوکارەکەی نادات. کچێکی تریان شووی کردووە و سەریان لێنادات. وەک خۆیان کەم بن، منداڵی دوو خزمی نزیکی خۆیان هێناوە و بەخێویان دەکەن. ئێستا کچەکەیان بێ ئەوەی خوێندنی تەواو کردبێت، لە قوتابخانە هێناوەتە دەرەوە. واتا کچە بچووکەکەیان، مانگێکی دی تەمەنی دەگاتە شانزە ساڵ و ئەوسا دەیدەن بە شوو، یانی دەیدەن بە من، من و ڕسیلخ چووین بۆ لایان، زۆر پێکەنینهێن بوو، بەم جۆرە خۆم ناساند: موڵکدارێکی ژنمردوو، لە خێزانێکی ناودار، پەیوەندیی کۆکی دەوڵەمەندانە. چاکە، ئیدی چ خەوشێکی هەیە ئەگەر من تەمەنم پەنجا ساڵ و ئەو شانزە ساڵان بێت؟ کێ لەم شتانە دەپرسێت؟ ئایا مێردێکی گونجاو نیم؟ بەڵکو مێردێکی ناوازەیش؟ هە، هە، هە! خۆزگا دەتبینی چۆن لەگەڵ باوک و دایکیدا دەدوام! دەبوا پارە بدەیت بۆ ئەوەی لەو شوێنەدا من ببینیت. کچەکە هات و لەسەر ئەژنۆ دانیشت. ئینجا تۆ بیهێنە بەرچاوت کە هێشتا کچەکە جلی کورتی لەبەردایە. خونچەیەکی دەمنەکراوەیە، سوور دەبێتەوە و دادەگیرسێت، وەک شەبەقی سوور (بێگومان پێشتر مەسەلەکەیان پێوتبوو) هیچ لەبارەی دەموچاوی ژنەوە ناڵێم، بەڵام لە دیدی مندا ئەم شانزە ساڵییە، ئەو چاوە هێشتا منداڵانەیە، ئەو فرمێسکە شەرمنانەیە، جوانترن لە خودی جوانی. بێجگە لەوەی کە جوانییەکەی بە ڕاستی لە جوانیی وێنە دەچێت. قژی زەردی پەخش و پەرێشان، لێوی گۆشتن و سوور و پێی بچووک.. ئیدی جوانییەکی سەیر! دوای یەکترناسین من پێم وتن لەبەر هۆی خێزانی، دەبێت

پەلەی تیا بکەین، بۆیە ڕۆژی دوایی، واتا سێ ڕۆژ لەمەوبەر، مارەم کرد. لەوساوە هەر ڕۆژێک بچم بۆ ئەوێ، خێرا دەیخەمە سەر ئەژنۆم و لێی ناگەڕێم.. کوڵمی سوور دادەگەڕێ و منیش لە ماچکردنی ناکەوم. هەڵبەتە دایکیشی پێی دەڵێت کە من مێردیم و کارەکە دەبێت بەو شێوەیە بەڕێوە بچێت. بە کورتی تا بڵێی خۆشە، ئەم حاڵەتەی ئێستای دەزگیرانی زۆر لەو کاتە خۆشترە، کە دەبیتە مێرد. لێرەدا سروشت و هەقیقەت لەئارادایە. (ئەم ڕستەیەی بە فەڕەنسی وت) هە، هە، هە! یەک دوو جاریش قسەم لەگەڵ کردووە، بە هیچ جۆرێک کچێکی گەلۆر نییە، هەندێکجار بە دزییەوە سەیرم دەکات و وەک ئاگر دەمسوتێنێت، بەڕاست دەزانیت دەموچاوی هەر لە مریەمی ڕافاییل دەچێت، ئاخر، وێنەی مریەمی کڵێسەی سیکتین[1] گەلێک سەرسامکەرە. وێنەی ژنێکی خەمبار و سادە، ئایا تۆیش هەروا نەهاتۆتە بەرچاوت؟ دەموچاوی دەزگیرانەکەیشم هەر لەو دەچێت. هەر کە مارەم کرد، ڕۆژی دوایی بایی هەزار و پێنج سەد ڕۆبڵ شتم بۆ کڕی: خشڵێکی ئەڵماس، تاقمێک مرواری، پێویستی خۆئارایشتکردنی زیوی گەورە کە هەموو شتێکی جۆراوجۆری تێدابوو. ڕووی گەشایەوە، ڕووی ئەم مریەمە، دوێنێ کە لەسەر ئەژنۆم دامنیشاند، بەڵام کارەکەم زۆر لە خۆڕابینینەوە کرد، کچۆڵەکە سوور بووەوە و فرمێسک کەوتە ناوچاوی. بەڵام بەسەر خۆی نەهێنا، کە ئاوا هەڵایساوە. بۆ

---

[1] سیکتین: کڵێسەیەکی بەناوبانگی ڤاتیکانە، لەسەردەمی پاپاسیکتی چوارەمدا دروست کراوە، گەلێک وێنەی زەیتی تیایە، کە بەناو بانگترینیان هی مایکڵ ئانجیلۆیە، گەلێک دیمەنی ئاینی تێدایە لە ڕۆژی دروستبوونی گەردوونەوە تا قیامەت. —و—

چرکەساتێک لە ژوورەکە چوونە دەرەوە، من و کچەکە هەر ئاوا بە تەنیا ماینەوە. لەپڕێکدا باوەشی بە ملمدا کرد (لە خۆیەوە، ئەمە یەکەمجار بوو) بە دەستە بچووکەکانی لە ئامێزی گرتم و بە خۆیەوە نووساندم، ماچی دەکردم و سوێندی دەخوارد کە ژنێکی گوێڕایەڵ و بەوەفا و میهرەبان بێت بۆم، بەختیارم بکات. هەموو ژیانی بۆ من تەرخان بکات، هەموو چرکەساتێکی ژیانی بکات بە قوربانی بۆم. لەباتیی ئەوە تەنیا یەک شت لە من داوا دەکات: ڕێزی بگرم، تەنیا ڕێزگرتنی و هیچی دی. هیچ دیاری و خەڵاتێکی ناوێت. بڕوا بکە، بیستنی دانپێدانانێکی وا لە تەنیاییدا، لە لایەن فریشتەیەکی شانزە ساڵییەوە کە شەرمی منداڵانە دەموچاوی سوور و لە چاویشیدا شەوقێک دەدرەوشایەوە.. بەڵێ، بڕوا بکە تا بڵێی ئەمە سەرنجڕاکێش و دڵفڕێن بوو، وشەی دڵفڕێن لێرەدا نرخێکی هەیە، ها! نیەتی؟ باشە، گوێم لێبگرە، وەرە لەگەڵما بچین بۆ لای دەزگیرانەکەم.. بەڵام ئێستا نا!

- بەگشتی ئەم جیاوازییە ترسناکەی لە نێوان تەمەن و ڕوناکبیریتاندا هەیە، بووەتە هۆی ئەوەی کە زۆر ئارەزووی بکەیت. بەڵام بەڕاست تۆ بیر لە هاوسەریەتییەکی بەم جۆرە دەکەیتەوە؟

- ئەی بۆ؟ بێگومان، دەبێت هەموو کەسێک بیر لە خۆی بکاتەوە، ئەو کەسە لە هەموو کەسانی دی چاکتر دەژی، کە بتوانێت لە خەڵکی دی باشتر خۆی بخەڵەتێنێت هە، هە، هە! پێم بڵێ بۆ تۆ ئێستا خۆت نوقمی مەزنایەتی کردووە؟ ئاخر بەزەییەک، گیانە، من پیاوێکی گوناهبارم هە، هە، هە!

- بەهەرحاڵ، تۆ یارمەتیی منداڵەکانی کاترینا ئیڤانۆڤنات دا.. بەڵام.. ئەو یارمەتیدانە بێمەلامەت نییە.. من ئێستا لە هەموو شتێک تێگەیشتم.

سڤیدریگایلۆڤ دایە پێکەنین و وتی:

- بەگشتی من منداڵم زۆر خۆش دەوێت، دەتوانم لەم بارەیەوە چیرۆکێکی سەیرتان بۆ بگێڕمەوە کە تا ئێستایش بەردەوامە: هەر لە یەکەم ڕۆژی هاتنمەوە کەوتمە ناو کابارییەکانەوە. دوای ئەوەی حەوت ساڵ بوو نەمبینیبوونەوە. دیارە دەزانیت کە من زۆر پەلەم نییە بۆ بینینی هاوڕێ و دۆستە کۆنەکانم، هەڵبەتە ئەوەندەی بتوانم خۆمیان لێ دوور دەخەمەوە و نامەوێت تووشی ئەو پەتایە ببمەوە. دەیشزانیت، ژیان لەگەڵ مارفا پتروڤنا لە گوندا و یادکردنەوەی هەموو ئەو شوێنە نهێنییە گەورە و بچووکانە کە ئەگەر یەکێک بیانزانێت گەلێک شتیان لێوە فێر دەبێت، تا سەر ئێسک ئازاریان پێدەگەیاندم. نەفرەت لە شەیتان. خەڵکی لێرە بەدمەستی دەکەن، لاوە ڕوناکبیرەکان لە بێکاریدا لە خەون و خەیاڵی مەحاڵدا زەحمەت دەکێشن و گریمانەی سەیر سەیر بۆ خۆیان ساز دەکەن. کەس نازانێت جوولەکەکان لە کوێوە پەلاماری ئێرە دەدەن و دەست بەسەر پارەوپوولدا دەگرن، خەڵکانی تریش کەوتوونەتە ناو بەرەڵایی و گەندەڵییەوە. هەر لە سەعاتە بەراییەکانی هاتنمەوە بۆ ئێرە بۆنی ئاشنایەتیی شارم کردەوە. شەوێک ڕێگەم کەوتە ئاهەنگێکی سەماکردنەوە: کابارەیەکی ترسناک بوو، من حەزم لە کابارەیە، بە تایبەتی ئەگەر کەمێک پیس و گەندە بێت، باشە، سەمای "کانکان"یان دەکرد، کە زۆر سەیر و بێوێنە بوو، تەنانەت منیش لە سەردەمانی خۆمدا نەمدیبوو. بەڵێ، لەو لایەنەوە پێشکەوتن بەدی دەکرێت. لەپڕێکدا کچۆڵەیەکی تەمەن سیانزەساڵەم بینی، بەرگێکی جوانی لەبەردا بوو، لەگەڵ پیاوێکی لێزاندا سەمای دەکرد، لە بەرانبەردا لاوێکی تریش سەمای دەکرد، دایکی کچۆڵەکە لە پاڵ دیوارێکدا و

لەسەر کورسییەک دانیشتبوو. تۆ بیری لێبکەرەوە دەبێت چ سەمایەک بووبێت! کچۆڵەکە بێزار بوو، سوور داگەڕا و سەرئەنجام وەک لە شتێک وەرز بووبێت، دەستی بە گریان کرد. سەماکەرە لێزانەکە لە ئامێزی گرت، سووڕی دا، هەڵیدا و گرتییەوە، هەموو ئەوانی دی دایانە قاقای پێکەنین. من خەڵکی ئەم شارەی ئێوەم لەم جۆرەساتانەدا زۆر خۆش دەوێت. تەنانەت لەو جۆرە کابارانەیشدا، پێدەکەنن و هاوار دەکەن "هەقی خۆیشیانە، دەبێت وابێت، باشە ئەی بۆ منداڵ دەهێننە ئەو جۆرە شوێنانە!" وەلێ بە من چی، من کارم بەوەوە نییە چاک دەکەن یان خراپ. ئەوان بۆ دڵخۆشیی خۆیان ئەوە دەکەن. من یەکسەر جێی خۆم دۆزییەوە و چووم لە پاڵ دایکی کچۆڵەکەدا دانیشتم، باسی ئەوەم کرد کە منیش تازە هاتوومەتە ئەم شارە، ئەم خەڵکەیش بێئەدەب و دڵڕەقن و ناتوانن چاک لە خراپ جیا بکەنەوە. تێمگەیاند کە من پارەیەکی زۆرم هەیە و پێشنیازی ئەوەیشم بۆ کرد کە بە گالیسکەکەی خۆم بیانگەیەنمە ماڵەکەیان. ئەم کارەم کرد و بووین بە ناسیاوی یەکتر. (ماڵەکەیان لە ژوورێکی بچووکی ناچیزدا بوو کە بە کرێ گرتبوویان). ژنەکە پێی وتم کە ئەم ئاشنایەتییەی من، بۆ خۆی و کچەکەیشی مایەی شانازییەکی گەورەیە. لەوەیش گەیشتم کە هیچ پارەوپوولێکیان نییە، بۆ ئەوە هاتوون لە دەزگایەکدا کارێکیان دەست بکەوێت. پێم وتن بە خۆم و سامانەکەمەوە لە خزمەتیاندام. ئەوەیشم زانی کە بە هەڵە کەوتوونەتە ناو ئەو کابارەیەوە. وایانزانیوە لەوێ کچەکە فێری سەما دەبێت. پێشنیازم بۆ کردن کە یارمەتییان بدەم لە پێگەیاندنی کچۆڵەکە و فێرکردنی زمانی فەڕەنسی و سەماکردنیشدا. بە پەرۆشەوە پێشنیازەکەیان قبووڵ کردم و

شانازییان پێوە کرد. تا ئەمڕۆیش دۆستایەتیمان بەردەوامە.. دێیت بچین بۆ لایان، بەڵام نا ئێستا نا.

- واز لەم چیرۆکە بێتام و ڕسوایانە بێنە، ئەی پیاوی داوێنپیس و نامەرد.

- شیلەر، تۆ شیلەری ئێمەیت، لە شیلەر بڕوانە (بە فەرەنسی کەوتە قسە) ئای مەزنایەتی، دەبێت لە کوێدا هێلانەت کردبێت؟ دەزانیت، من هەر بە دەستی ئانقەست ئەم چیرۆکانەت بۆ دەگێڕمەوە، بۆ ئەوەی گوێم لە هاوار و نارەزاییەکانت بێت، تاموچێژی خۆشیان هەیە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تووڕەییەوە وتی:

- بێگومان وایە، بۆ لەم چرکەساتەدا من خۆیشم خۆم بە مەسخەرە نازانم؟

سڤیدریگایلوف پڕ بە گەرووی دایە قاقای پێکەنین، پاشان فیلیپی بانگ کرد، حسابەکەی دایە، لە جێگاکەی هەستا و وتی:

- زۆر سەرخۆشم، قسەی چاکمان کرد، هەستم بە خۆشی کرد.

ڕاسکۆلنیکۆڤیش بەدەم هەستانەوە هاواری کرد:

- بێگومان، بۆ هەست بە خۆشی ناکەیت! یەکێکی پاشەڵپیسی وەک تۆ، کە ئەم جۆرە ڕووداوانە بگێڕێتەوە، بە تایبەتییش ئەگەر نەخشەیەکی پۆخڵی لەم بابەتانەی لەژێر سەردا بێت، بۆ هەست بە خۆشی نەکات! بەتایبەتی لە ساتێکی وادا و بۆ یەکێکی وەک منیشی باس بکات.. بە ڕاستی تاموچێژی زۆری بۆ تۆ هەیە!

- باشە، ئەگەر وابێت...

سڤیدریگایلۆڤ بە جۆرە سەرسامییەکەوە لە ڕاسکۆلنیکۆڤی ڕوانی، لەسەر قسەکانیشی بەردەوام بوو:

- ئەگەر وا بێت، کەواتە تۆیش تەواو ڕەشبینیت، ئامادەگییەکی زۆریشت بۆ ئەوە تێدایە، دەتوانیت گەلێک شت بکەیت.. باشە، ئیتر بەسە، زۆر بە داخەوەم کە قسەمان کەم کرد، وەلێ وازت لێناهێنم.. کەمێک بۆم ڕاوەستە..

سڤیدریگایلۆڤ لە ڕێستۆرانتەکە چووە دەرێ. ڕاسکۆلنیکۆڤیش بەدوایدا ڕۆشت، وەلێ سڤیدریگایلۆڤ هێند مەست نەبوو، تەنیا بۆ چرکەساتێک گرتبووی، وردەوردە سەرخۆشییەکەی نەدەما. مەسەلەیەکی زۆر گرنگ لە دالغەی دابوو، زۆر گرنگ، برۆی هاتبوونەوە یەک، چاوەڕوانیکردنی ئەو شتە نیگەران و وەڕزی کردبوو، ڕەفتاری لەگەڵ ڕاسکۆلنیکۆڤدا، لە چرکەکانی دواییدا، لەپڕا گۆڕا و تا دەهات زبر و گاڵتەجاڕانەتر دەبوو. ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستی بە هەموو ئەمانە کرد و نیگەران بوو. لەبەرچاویدا سڤیدریگایلۆڤ بەدگومان دەهاتە بەرچاو. بۆیە بڕیاری دا بکەوێتە دوای، هەردووکیان گەیشتنە سەر شۆستەکە.

- تۆ بە لای ڕاستدا، منیش بە لای چەپدا، یان ئەگەر پێت خۆشە با بە پێچەوانەوە بێت، خوات لەگەڵ، ئازیزم، بە ئومێدی دیدار.

بەدەم قسەکانەوە سڤیدریگایلوف بە لای ڕاستدا، بەرەو "سێنایا" تێی کێشا.

## ٥

ڕاسکۆلنیکۆڤ کەوتە دوای سڤیدریگایلۆڤ، کە ئاوڕی دایەوە، هاواری کرد:

- ئەمە یانی چی؟ وابزانم پێم وتیت کە..

- یانی ئەوەی کە من لێت نابمەوە.

- چیی؟
هەردووکیان وەستان، بۆ چرکەساتێک وا لە یەک ڕامان، دەتوت هەریەکەیان لەگەڵ ئەوی تردا خۆی هەڵدەسەنگێنێت.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تووڕەییەوە وتی:
- لە هەموو ئەو چیرۆکانەدا کە بە نیوە سەرخۆشی گێڕاتنەوە، بە تەواوی گەیشتمە ئەو ئەنجامەی: کە نەک تەنیا وازت لە پیلانێکی نامەردانە بەرانبەر بە خوشکم نەهێناوە، بەڵکو لە جاران زیاتر خۆت سەرقاڵی کردووە، ئاگادارم ئەم بەیانییە خوشکم نامەیەکی بەدەست گەیشتووە، تۆ بەسەر پێوە خۆت ناگریت.. ڕەنگە توانیبێتت لەم ماوەیەدا ژنێک بۆ خۆت بسازێنیت. وەلێ ئەمە هیچ نییە، من دەمەوێت خۆم تەواو دڵنیا بم..
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەوە دوودڵ بوو کە بتوانێت ئەوەی دەیەوێت، بە ڕاستی بیهێنێتە دی و چۆن دڵنیایی پەیدا بکات.
سڤیدریگایلۆڤ وتی:
- ئاوا! حەز دەکەیت بانگ بکەمە پۆلیس؟
- بیکە.
دیسانەوە بەرانبەر بە یەکتری وەستان، دەموچاوی سڤیدریگایلۆڤ گۆڕا، دوای ئەوەی لەوە بێگومان بوو کە هەڕەشەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ ناترسێنێت. لەناکاوێکدا سیمایەکی گەلێک شاد و دۆستانەی لەخۆ گرت و وتی:
- زەلامێکی سەیریت! نەمویست لەبارەی کێشەکەی خۆتەوە قسەت لەگەڵدا بکەم، هەرچەندە لەوەدایە کونپشکنی دڵم وێران بکات، شتێکی خەیاڵییە، دامنابوو بۆ جارێکی تر، بەڵام تۆ لەوانەیت کە مردوویش دەهێننە قسە.. باشە، وەرە با بڕۆین، بەڵام با لەوێیشەوە پێت بڵێم کە

دەبێت ئێستا بۆ چرکەساتێک بڕۆمە ماڵێ تا پارە لەگەڵ خۆمدا بهێنم. ئینجا دەرگای ژوورەکەم کلیل دەکەم، گالیسکەیەک دەگرم، بۆ شەو بەسەربردن دەرۆم بۆ دوورگەکان، ئیتر تۆ لەگەڵ مندا بۆ کوێ دێیت؟

- منیش وەک تۆ دەڕۆمەوە ماڵێ، نەک بۆ ماڵی تۆ، بەڵکو بۆ لای سۆنیا سمیونۆڤنا، بۆ ئەوەی داوای لێبووردنی لێبکەم کە ناتوانم لە ناشتنی تەرمی دایکیدا ئامادە بم.

- ئارەزووی خۆتە. وەلێ سۆنیا سمیونۆڤنا لەماڵەوە نییە، گشت منداڵەکانی بردۆتە لای خانمێک، لای پیرێژنێکی گەلێک بەڕێز، بۆ لای دۆستێکی دێرینی من، کە بەڕێوەبەری هەتیووخانەیەکە. من وەک پیشەکی پارەیەکی باشم بۆ هەرسێ منداڵەکەی کاترینا ئیڤانۆڤنا داوەتێ، کە زۆری پێ خۆش بوو، هەروەها هەندێک پارەیشم هەروا داوە بە دەزگاکەی، پاشان چیرۆکی سۆنیا سمیۆنۆڤنایشم بە وردی بۆ گێراوەتەوە بێ ئەوەی هیچی لێبشارمەوە. ئەمە کارێکی زۆری تێکرد، بۆیە وا بڕیارە کە هەر ئەمڕۆ سۆنیا سمیونۆڤنایش بڕوات بۆ ئەو ئوتێلەی کە ئەو خانمەی لێیە، دوای ئەوەی لە هاوینەهەوارەکانەوە گەڕاوەتەوە بۆ ئێرە.

- گرنگ نییە، لەگەڵ ئەمانەیشدا سەرێکی هەر لێدەدەم.

- چۆنت پێ خۆشە با وابێت، بەڵام من هاوڕێی ڕێگەت نیم، هەرچەندە ئەوە پەیوەندیی بە منەوە نییە، باشە، وا گەیشتین، ئەمە ماڵەکەیە. بەڵام حەز دەکەم بزانم، من بڕوای تەواوم هەیە کە بۆیە تۆ لە من بەدگومانی، چونکە زۆر دڵنەواییم کردیت و نەمویست بە پرسیاری جۆراوجۆر ماندووت بکەم.. تێدەگەیت؟ تۆ ئەمەت بە لاوە نائاسایی

بوو، گرەو دەکەم کە وایە، باشە، تۆیش با لەمەودوا ئاگات لە دڵی خەڵکی بێت!
- لە پشت دەرگایشەوە گوێ بگریت!
سڤیدریگایلۆڤ پێکەنی:
- وایە! زۆر سەرم لەوە سووڕ مابوو کە دوای ئەو هەموو قسانە، کەچی تۆ هێشتا ئەو مەبەستەت نەدرکاندبوو! هە، هە، هە! هەرچەندە من شتێکی زۆر کەموکورتم لەوە دەستگیر بوو کە تۆ.. ئەو کاتە بۆ سۆنیا سمیونۆڤنات باس دەکرد. بەڵام جا چی بووە؟ بۆ نابێت من پیاوێکی دواکەوتوو بم و لە هیچ تێنەگەم. گەورەی بەڕێز، بە خودا سوێندت دەدەم، هاوڕێ، کە تێم بگەیەنیت، شتی تازەی ئەم سەردەمەم فێر بکەیت.
- تۆ گوێت لە هیچ نەبووە، درۆ دەکەیت.
- نا، مەبەستم ئەمە نییە، نا (هەرچەندە هەندێک شتم گوێ لێبووە) مەبەستم ئەوەیە کە تۆ بەردەوام لە ئاهوناڵەکردندایت! شیلەرەکەی ناخت نارەحەتە، تۆ ئێستا دەڵێیت نابێت کەس لە پشت دەرگاوە گوێ بگرێت. جا ئەگەر ئەمە وایە، کەواتە فەرموو خۆت بڕۆ بۆ لای پۆلیس و پێیان بڵێ حاڵ لەمە و حیکایەت لەوە، کارەساتێکم بەسەر هاتووە و هەڵەیەکی بچووک کەوتۆتە تیورەکەمەوە. خۆ ئەگەر قەناعەتی تەواویشت بەوە هەیە کە نابێت لە پشت دەرگاوە بوەستیت و گوێ بگریت، بەڵام دەشێت پیرێژنی نەگبەت بگریت و چۆن خۆت دەتەوێت بیکوژیت، لەم حاڵەتەدا لە هەموو شت باشتر ئەوەیە ڕوو لە ئەمریکا یان هەر جێگایەکی تر بکەیت و بڕۆیت، لاوۆ هەڵبێیت، هێشتا کات بەبەریەوە ماوە، من بە دڵسۆزییەوە ئەمەت پێدەڵێم، پارەت نییە؟ من خەرجیی سەفەرەکەت دەکێشم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە بێزارییەوە قسەکانی پێبڕی و وتی:
- من هەرگیز بیر لەمە ناکەمەوە.
- تێدەگەم، بەهەرحاڵ زەحمەتی خۆت مەدە، ئەگەر مەبەستت نییە، پێویست بە قسەکردن ناکات. من دەزانم چ مەسەلەیەک داوێنگیرتە: مەسەلەی ئاکاریی؟ مەسەلەی تایبەتی و شەخسی؟ ئەمانە هەموو بخەرە لاوە، تازە لە کوێ بە کەڵکی تۆ دێن؟ هە، هە، هە! وەلێ ئەگەر وایە، کەواتە ئەی بۆ خۆت لەو تەڵەزگەیەدا گیر داوە، مرۆڤ نابێت دەست بۆ کارێک بەرێت، کە نەتوانێت بیکات، باشە، خۆت بکوژە، ڕەنگە حەزی لێنەکەیت؟
- دەڵێی هەر لە خۆوە دەتەوێت ڕقم هەستێنیت، بۆ ئەوەی وازت لێبهێنم..
- کابرایەکی سەیریت! بەڵام ئێمە وا گەیشتین، فەرموو لە پلیکانەکان سەرکەوە، بڕوانە ئەوە ڕێی ماڵی سۆنیا سمیونۆڤنایە، بڕوانە، کەس لەوێ نییە، باوەڕ ناکەیت؟ لە کاپەرناومۆڤ بپرسە، کلیلی دەرگاکەی دەدات بەوان، ئەمەیش خودی خانمی کاپەرناومۆڤ ها؟ چی؟ (کەمێک گوێی گرانە) ڕۆیشتووە؟ بۆ کوێ؟ باشە، ئێستا گوێت لێبوو؟ لە ماڵەوە نییە، ڕەنگە تا شەوی درەنگیش نەگەڕێتەوە، باشە، کەواتە وەرە لەگەڵ مندا، تۆ خۆیشت هەر ئەمەت دەویست، ئیدی لە ماڵی خۆمانین، خاتوو ڕسڵیخ لەوێ نییە، ئەم ژنە هەمیشە دەجووڵێت، وەلێ ئافرەتێکی باشە، بڕوات هەبێت.. ئەگەر کەمێک ئاقڵتر بوویتایە، سوودت لێدەبینی، دەی، بڕوانە، من لەسەر مێزەکەم ئەم پارانە هەڵدەگرم (تەماشاکە چەندی تریشم هەیە). بەهەرحاڵ، ئەمڕۆ یەکێک لەم گەڵایانە ورد دەکرێتەوە، باشە، بینیت؟ ئیتر نابێت کاتمان بە هەدەر بدەین، دەرگای نووسینگە و ماڵەوەم دادەخەم، وا ئێستا لە

پلیکانەکان دێینە خوارێ و دەڕۆین، حەز ئەکەیت گالیسکەیەک بگرین؟ ئاخر، من بەڕۆم بۆ دوورگەکان، حەز بە سواربوون ناکەیت؟ من ئەم گالیسکەیە دەگرم و بەرەو "یگالین" دەڕۆم، چۆن؟ نایەیت؟ ماندوویت؟ با پێکەوە سوار بین، خراپ نییە، پێدەچێت باران ببارێت، گرنگ نییە، چەتری گالیسکەکە هەڵدەدەین.

سڤیدریگایلۆڤ چووبووە ناو گالیسکەکەوە و دانیشتبوو، ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری کردەوە کە بە لایەنی کەمەوە، بەدگومانییەکەی بۆ ئەو چرکەساتە ڕەوا نییە، بێ ئەوەی بە وشەیەک وەڵامی بداتەوە، پشتی هەڵکرد و بەرەو "سێننایا" بەڕێ کەوت. ئەگەر هەر بەدەم ڕێگەوە ئاوڕی بدایەتەوە، سڤیدریگایلۆڤی دەبینی چۆن تەنیا دوای سەد هەنگاو پارەی بە گالیسکەوانەکە دا، دابەزی و بە پێ بەڕێ کەوت. وەلێ ئیتر ڕاسکۆلنیکۆڤ هیچی لێ دیار نەبوو، چونکە کەوتبووە پێچێکی نەدیووی شەقامەکەوە. بە بێزارییەکی سەختەوە دەیویست لە سڤیدریگایلۆڤ دوور بکەوێتەوە. لەپڕێکدا خۆبەخۆ هاواری کرد: "چۆن توانیم، تەنیا بۆ چرکەساتێک، چاوەڕێی شتێک لەم زەلامە بکەم، ئەم زەلامە داوێنپیس و نامەرد و بێژیییە!" بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە بڕیارێکی زۆر بەپەلە و سەرپێیی ڕاسکۆلنیکۆڤ بوو. لە هەموو ئەو بارەی سڤیدریگایلۆڤدا شتێک هەبوو، ئەگەر نهێنییش نەبێت، شتێکی سەیر و سەرنجڕاکێش بوو. بەڵام لە هەموو ئەو بەسەرهاتەدا، ئەوەی پەیوەندیی بە دونیاوە هەبێت، ئەو ڕاستییە بوو کە ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تەواوی لەوە دڵنیا بوو کە سڤیدریگایلۆڤ هەروا بە ئاسانی دەست لە یەخەی خوشکی ناکاتەوە، بیرکردنەوە و لێکدانەوەی ئەو مەسەلانە باری ڕاسکۆلنیکۆڤی لە توانا بەدەر گرانتر دەکرد.

وەک باری ئاسایی خۆی، کە بە تەنیا مایەوە، دوای بیست هەنگاو ڕۆیشتن، کەوتە ناو بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە، کە گەیشتە سەر پردەکە، لە پاڵ نەردەوانەکەدا وەستا و لە ئاوەکە ڕاما، ئاگای لەوە نەبوو کە ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنا لە نزیکییەوە تەماشای دەکات.
ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەو کاتەی پێی نایە سەر پردەکە، بە لایدا تێپەڕی، بەڵام نەیبینی، دونیا هەرگیز بەو حاڵەتە سەیرەوە، کاکی لە شەقامەکاندا نەدیبوو، بۆیە دڵی گوشرا و ترسێک ئەوکی گرت. وەستا و نەیدەزانی بانگی بکات یان نا؟ لەپڕێکدا سڤیدریگایلۆڤی بینی کە بەپەلە لە بەری "سننایا"وە دەهات. بەپارێز و وەک بڵێی بە نهێنی ڕێگەکەی دەبڕی، نەهاتە سەر پردەکە، بەڵکو لە پاڵیدا، لەسەر شۆستەکە وەستا، نەیدەویست هەرچۆنێک بووە ڕاسکۆلنیکۆڤ پێی بزانێت. ماوەیەک بوو دونیای دیبوو و بە دەست ئاماژەی بۆ دەکرد. کچەکە وای هاتە بەرچاو کە ئەو داواکارە بانگی براکەی نەکات و وەک خۆی لێی بگەڕێ، بەڵکو ئەم خۆی بڕوات بۆ لای سڤیدریگایلۆڤ.
دونیا چوو بۆ لای، لەسەرخۆ بە پاڵ کاکیدا تێپەڕی و لە سڤیدریگایلۆڤ نزیک بووەوە. سڤیدریگایلۆڤ بە ئەسپایی وتی:
- پەلە بکە، نامەوێت ڕادیون ڕومانوڤیچ ئاگای لەم دیدارەمان بێت، دەمەوێ پێت بڵێم کە لە ئوتێلێکی نزیک بە ئێرە من و ئەو پێکەوە دانیشتبووین، خۆی هاتبوو بە دوامدا، زۆر بە زەحمەت لە دەستی هەڵاتم، ئاگاداری ئەو نامەیەیە، کە من بۆ تۆم ناردووە و گومانی تیا دروست کردووە. بێگومان، تۆ پێت نەوتووە؟ ئەی ئەگەر تۆ نیت، ئەی کێ پێی گوتووە؟
دونیا قسەکانی پێبڕی:

– ئێستا ئێمه له پێچی شەقامەکە تێپەڕیووین، ئیتر کاکم نامانبینێت، با پێت بڵێم من لەمە زیاتر لەگەڵ تۆدا دوور ناکەومەوە. چیت هەیە لێرەدا بیڵێ، لەسەر شەقامیش هەموو شتێک دەوترێت.

– یەکەم: بە هیچ جۆرێک ئەمە لەسەر شەقامدا ناوترێت. دووەم: دەبێت گوێ لە قسەی سۆنیا سمیۆنۆڤنایش بگریت. سێیەم: دەمەوێت بەڵگەنامەیەکت پیشان بدەم.. بە کورتی ئەگەر ناتەوێت لەگەڵما بێیت بۆ ماڵەوە، منیش هیچت بۆ باس ناکەم و هەر ئێستا دەڕۆم، ئەوەیشت لە بیر نەچێت کە من نهێنییەکی زۆر گرنگی کاکە خۆشەویستەکەتم لایە.

دونیا وەستا و دوودڵ بوو، بە وردی لە سڤیدریگایلۆڤ ڕاما.

سڤیدریگایلۆڤ بە هێوری وتی:

– لە چی دەترسیت؟ ئێرە شارە و گوند نییە، تۆ لە گوندا زیاتر زیانت بە من گەیاندووە تا من بە تۆ، لێرە..

– سۆنیا سمیۆنۆڤنات ئاگادار کردووە؟

– نا، تاقە وشەیەکم پێنەوتووە و بڕوایش ناکەم ئێستا لە ماڵەوە بێت، وەلێ بە زۆری پێدەچێت لەوێ بێت. چونکە ئەمڕۆ خزمێکی ناشتووە. ئەمە ڕۆژی چوون بۆ میوانی نییە. تا ماوەیەکی دیاریکراو ناتوانم لەم بارەیەوە هیچ بە کەس بڵێم، تەنانەت پەشیمانم کە بە تۆم وت، چونکە بچووکترین هەڵە گەورەترین ڕسوایی لە دوایە. بڕوانە، من لێرەدا دەژیم، لەم خانووەدا، وا ئێستا لە پاڵیداین، ئەوەیش پاسەوانەکەیە، من زۆر چاک دەناسێت، وەک دەبینیت سڵاوم لێدەکات و ڕێزم دەگرێت، دەبینێت خانمێکم لەگەڵدایە، بێگومان مەبەستیەتی بتناسێت و دەموچاوت لە یادەوەریی خۆیدا بهێڵێتەوە، لەم مەسەلەیەشدا، ئەگەر

به ڕاستی تۆ له من بەدگومانیش بیت، هەر دڵنیاییەکە بۆ تۆ. بمبەخشە وا به زبری لەگەڵتا دەدوێم. خۆم ژوورێکم له کرێگرتەکان گرتووە. لەگەڵ سۆنیا سمیونوفنادا یەک دیوارمان هەیە. ئەویش ژوورێکی بە کرێ گرتووە، هەموو ئەم قاتە کرێگرتەن، بۆ وەک منداڵ دەترسیت؟ یان دیارە من ئەوەندە ترسناکم؟

سڤیدریگایلۆڤ ئەمەی وت و زەردەخەنەیەکی خۆشەویستی و دڵنیاییکردنی خستە سەر لێوی. بەڵام ئەمەندە شپرزە و پەشۆکاو بوو، کە نەیدەتوانی بە چاکی ڕۆڵی نواندنەکە ببینێت، دڵی زۆر توند لێی دەدا، هەناسەی بەتەنگ هاتبوو، بۆ ئەوەی شپرزەییەکەی خۆی بشارێتەوە، دەیویست بە دەنگی بەرز بدوێت. وەلێ دونیا هەستی بەو پەشۆکانە زۆرە نەکرد، چونکە تۆمەتبارکردنی بەوەی کە وەک منداڵ دەترسێت یان لەبەرچاویدا ئەو سامی هەیە، هەستی بریندار کرد. بۆیە بە دەنگێکی بەڕووکەش هێور و بەڕووە ڕەنگ تەواو پەڕیووەکەیەوە وتی:

- هەر چەند من دەزانم تۆ پیاوێکی.. بێناموسیت، بەڵام من لێت ناترسم، فەرموو پێشکەوە.

سڤیدریگایلۆڤ له بەردەم ژوورەکەی سۆنیادا وەستا.

- ڕێگەم پێدەدەیت بزانم لەماڵەوەیە؟ نا، لەوێ نییە، بەداخەوە، وەلێ من بزانم ڕەنگە زۆر زوو بگەڕێتەوە. چوونەدەرەوەکەی تەنیا بۆ بینینی خانمێکە بۆ ئەوەی لەبارەی هەتیووەکانەوە قسەی لەگەڵدا بکات. دایکی منداڵەکان مردووە، من کارەکەم لە ئەستۆ گرت و هاوکاریم کردوون. ئەگەر سۆنیا سمیۆنۆڤنا تا دە دەقیقەی تر نەگەڕایەوە، گەر بتەوێت هەر ئەمڕۆ دەینێرم بۆ لات. باشە. ئەمە ماڵەکەمە، ئەم دوو ژوورە، لە پشتەوە، خاوەن خانووەکە، خاتوو

ڕسلیخ دەژی. ئێستا تەماشای ئێرە بکە، بەڵگەنامەی زۆر گرنگت پیشان دەدەم: لە ژووری نوستنەکەمەوە، ئەم دەرگایە، دەچێتەوە سەر دوو ژووری چۆڵوهۆڵ کە ئامادەن بۆ بەکرێدان، ئەو دووانەن، دەبێت زۆر بە وردی لێیان بڕوانیت..
سڤیدریگایلوف دوو ژووری تا ڕادەیەک گەورە و بە موبیلەی گرتبوو، دونیا بە گومانەوە تەماشای دەوروبەری خۆی دەکرد، بەڵام نە لەو شتانەی کە لە ژوورەکاندا بوون و نە لە ڕێکخستنیاندا، شتێکی وای نەبینی شیاوی سەرنجلێدان بێت. وەلێ دەشیا شتی تر سەرنجی ڕابکێشێت: بۆ نموونە ماڵەکەی سڤیدریگایلۆڤ لە نێوان دوو ماڵی تری چۆڵدا بوو، لە ڕاڕەوەکەوە ڕاستەوخۆ نەدەهاتیتە ناو ژوورەکانی ئەوەوە، بەڵکو لە هەردوو ژووری خاوەن ماڵەکەوە دەهات، کە تا ڕادەیەک چۆڵ بوون. سڤیدریگایلۆڤ لە ژووری نووستنەکەیەوە، بە کردنەوەی دەرگایەکی داخراو، ئەو ژوورە چۆڵانەی پیشانی دونیادا کە ئامادە کرابوون بۆ بەکرێدان. دونیا لەبەر دەرگاکەدا وەستا، نەیدەزانی سڤیدریگایلۆڤ بۆ ئەم شتانەی پیشان دەدات، سڤیدریگایلۆڤ خێرا کەوتە ناو جەرگەی باسوخواسەکەوە:
- وەرە تەماشای ئێرە بکە، ئەم ژوورە گەورەیە، لەم دەرگایە بڕوانە، بە کلیل داخراوە، کورسییەک لە تەنیشت دەرگاکەوەیە، کورسییەک بۆ دوو ژوور، ئەم کورسییە من هێناومە تا بە چاکی و بەبێ ماندووبوون گوێ بتەکێنم، ڕێک لە پشت ئەم دەرگایەوە مێزەکەی سۆنیا سمیونۆفنایە، ئەو لێرەدا دانیشتبوو، لەگەڵ ڕادیون ڕومانوڤیچدا قسەی دەکرد، منیش لێرەدا بووم، لەسەر ئەم کورسییە دانیشتبووم، بە دزییەوە گوێم هەڵخستبوو، دوو ڕۆژ لەسەر یەک، هەر ڕۆژەی

دوو سەعات ئەم بەرنامەیە بەردەوام بوو، بێگومان بە هەندێک شتم زانی، تۆ دەڵێی چی؟
- لەپشت دەرگاکەوە گوێت گرتبوو؟
- بەڵێ، بە دزییەوە گوێم گرتبوو، وەرە با ئێستا بڕۆین بۆ ژوورەکەی خۆم، ئێرە تەنانەت جێگای دانیشتنیش نییە.
سەرلەنوێ ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنای بردەوە بۆ یەکەم ژوور، کە لە تەلار دەچوو، داوای لێکرد لەسەر کورسییەکە دابنیشێت، خۆیشی لەوسەری مێزەکەوە دانیشت. بەڵام چاوی هەمان ئەو بڵێسەیەی تیا دەبریسکایەوە، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دونیای تۆقاندبوو. دونیا تەزوویەکی پیدا هات، جارێکی دی بە بەدگومانییەوە لە دەوری خۆی ڕوانی، دیار بوو نەیدەویست بەدگومانییەکەی دەربکەوێت، وەلێ دووری و چەپەکیی ماڵەکەی سڤیدریگایلۆڤ شپرزە و دوودڵی کردبوو، پێی خۆش بوو هیچ نەبێت لێی بپرسێت کە ئایا خاوەن ئاپارتمانەکە لە ماڵە؟ بەڵام گیانی خۆبەزلزانییەکەی نەیهێشت پرسیارەکە بکات. بێجگە لەوە، داخ و خەمێکی دی کە لەوە گەورەتر بوو ترسی لە خۆی هەبێت و لە دڵیدا شەپۆلانی بوو، بە سەختی ئازاری دەدا. پاشان، ئەو نامەیەی بە دەستییەوە بوو، خستییە سەر مێزەکە و کەوتە قسە:
- فەرموو، ئەمە نامەکەتە، ئایا ئەوەی نووسیوتە شیاوی کردنە؟ تۆ ئاماژەت داوەتە تاوانێک کە کاکم کردبێتی. ئاماژەکەت ئاشکرا و ڕوونە و ناتوانیت لێی پەشیمان ببیتەوە، بەڵام حەز دەکەم بیزانیت کە پێش ئەمەیش من ئەو حیکایەتە گەوجانەیەم بیستبوو، کە بڕوا بە تاقە وشەیەکی ناکەم، ئەمە بەدگومانییەکی پووچ و ساختەیە، ئاگاداری چیرۆکەکەم و دەزانم چۆن و بە چ مەبەستێک هەڵبەستراوە، تۆ هیچ

بەڵگە و شایەتێکت لا نییە، تۆ بەڵێنت داوە بیسەلمێنیت: کەواتە بیڵێ. بەڵام پێشەکی ئەوە بزانە کە من بە هیچ شێوەیەک بڕوام بە تۆ نییە، هیچ.

دونیا بەپەلە و بێ پشوودان قسەکانی تەواو کرد، بۆ چرکەساتێکیش دەموچاوی سوور داگەڕا.

سڤیدریگایلۆڤ وتی:

- باشە ئەگەر بڕوام پێناکەیت ئەی بۆ بە تەنیا هاتوویتەتە لام؟ کەواتە بۆ هاتوویت؟ هەر لەبەر کونپشکنی؟

- بێزارم مەکە، قسە بکە، بیڵێ.

- من لەوە بێگومانم کە تۆ کچێکی بوێر و ئازایت، بە خودا، من وامدەزانی داوا لە بەڕێز ڕازومیخین دەکەیت لەگەڵتا بێت. وەلێ ئەو نە لەگەڵتا و نە لە نزیکتەوە بوو، باش تەماشای ئەو ناوەم کرد، ئەمە ئازایەتیی تۆیە، چونکە دەتویست بە سوودی ڕادیون ڕومانوڤیچ بشکێتەوە. بەهەرحاڵ، هەموو شتێکی تۆ شایانی پەرستنن.. بەڵام لەبارەی براکەتەوە بڵێم چی؟ تۆ خۆت هەر ئێستا ئەوت بینی، چۆن بوو؟

- ئەوە تاقە بەڵگە نییە بۆ ئەوەی تۆمەتباری بکەیت.

- نا، تاقە بەڵگە نییە، وەلێ دەکرێت قسەی خۆی بکرێت بە بەڵگە، دوو ئێوارە، لەسەر یەک هاتە ئێرە بۆ لای سۆنیا سمیۆنۆڤنا، پیشانم دایت لە کوێدا دانیشتبوون، لە بەردەم ئەو ئافرەتەدا دانی بە هەموو شتێکدا نا، پیاوکوژە، ئەو ژنە سووخۆرەی کوشتووە کە خۆی وەک بارمتە شتی لا داناوە و پارەی لێوەرگرتووە. هەروەها خوشکی پیرێژنەکەیشی کوشتووە. ژنێکە ناوی لیزاڤێتایە، بە ڕێکەوت لە کاتی کوشتنی خوشکەکەیدا هاتۆتە ژوورەکەوە، بەو تەورەی لەگەڵ خۆیدا

بردویەتی، هەردووکیانی کوشتووە. بۆ ئەوە کوشتونی تا پارە و سامانەکەیان بدزێت و ئەوەیشی کرد. پارە و هەندێک شتی هەڵگرت، خۆی تەواوی ئەم حیکایەتەی بۆ سۆنیا سمیۆنۆڤنا باس کرد، کە تاقەکەسێکە ئاگاداری ئەم تاوانە بێت. بەڵام سۆنیا سمیونۆڤنا نە بە قسە و نەبە کردەوە بەشداریی لە تاوانەکەدا نەکردووە. بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆر ترسا، وەک ئەم ترسەی ئێستای تۆ، خەمت نەبێت، ڕاستیی لێنالێت.

دونیا چون مردوو لێوی سپی هەڵگەڕا، لەبەر خۆیەوە وتی:

- مەحاڵە، مەحاڵە، بچووکترین بەڵگە بۆ کردنی ئەو کارە لەئارادا نییە، بچووکترین بەڵگە نییە.. درۆیە! درۆ.

- شتومەکی پیرێژنەکەی دزیووە و ئەمەیش هۆکاری کارەکەیەتی. پارە و خشڵی بردووە، ڕاستە بەپێی قسەکانی خۆی سوودی نە لەو پارانە و نە لە شتەکان وەرنەگرتووە، بەڵکو بردوونی لەژێر بەردێکدا دایناون، تا ئێستایش هەموو شتەکان لەوێدان، هۆیەکەیشی ئەوەیە کە نەیوێراوە کەڵکیان لێببینێت.

- ئاخر ئەقڵ ئەوە دەبڕێت بتوانێت دزی بکات؟ تەنانەت بیریشی لێبکاتەوە؟

دونیا ئەم قسانەی بە دەنگی بەرز کرد و لە جێگاکەی هەستا:

- باشە، تۆ ئەو دەناسیت، دیووتە، دەشێت دز بێت؟

دەتوت لە سڤیدریگایلۆڤ دەپاڕێتەوە و تەواوی ترسەکەی خۆی لەبیر چۆتەوە.

- ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنا، لێرە هەزاران، تۆ بڵێ ملیونان جۆر خەڵک هەن، دزە و دەدزێت، دەیشزانێت دزیەتی کارێکی دزێوە. من لەبارەی پیاوێکی شەریفەوە بیستوومە کە گالیسکەیەکی پۆستی ڕووت

کردۆتەوە، کێ چووزانێت، ڕەنگە بە خەیاڵی خۆی کارێکی باشی کردبێت، ئەگەر یەکێکی دی ئەمەی پێبوتمایە، بێگومان منیش وەک تۆ بڕوام نەدەکرد، بەڵام ناتوانم درۆ لەگەڵ گوێچکەمدا بکەم، براکەت هەموو هۆکارەکانیشی خستە بەردەمی سۆنیا سمیۆنۆڤنا، ئەو ژنە بێچارەیە لە پێشدا بڕوای بەوە نەدەکرد کە دەیبیست، بەڵام لە دواییدا کە بە چاوی خۆی بینی، ئیتر گومانی نەماو تەوا و بڕوای کرد. ئاخر، هیچ نەمایەوە براکەت بۆی باس نەکات.

- هۆکارەکان چین؟

- مەسەلەکە دورو درێژە ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنا، چۆن پێتی بڵێم؟ ئەو بڕوای بە گریمانەیەک هەیە، وەک بڵێی زوڵم و تاوانکردن بۆ تاقەجارێک ڕەوایە، بە مەرجێک لە پێناوی ئامانجێکی شەریفدا بێت.. بەو مانایەی کارێکی ناڕەوا و سەد کاری چاکە. پاشان، بۆ لاوێکی بەهرەدار و خاوەن کەسایەتی، زۆر ناخۆشە وا تێگەیشتبێت، ئەگەر بۆ نموونە تەنیا سێ هەزار ڕۆبڵی هەبووایە، تەواوی کار و ئامانج و ژیانی ئاییندەی دەگۆڕا، بەڵام بەداخەوە، ئەو سێ هەزار ڕۆبڵەی لە دەستا نییە. بێجگە لەمانە، ئەنجامی ڕقێک کە برسیەتی بۆی دروست کردبوو، ژوورە تەنگ و تاریکەکەی، بەرگە شڕووڕەکانی، ئاگاداریی لەو پێگە کۆمەڵایەتییەی تیایەتی.. هەروەها دەبێت باسی ئەو بارە نالەبارەی بکەین کە دایک و خوشکی تێیدان. وەلێ لەمانە زیاتر خولیای ناوبانگ دەرکردن، غرور و دیسانەوە خەونە تایبەتییەکانی، خودا دەزانێت، ڕەنگە نیازپاکیشی لەگەڵدا بووبێت. تکایە وا نەزانیت من تۆمەتباری دەکەم، پەیوەندیی بە منەوە نییە. لێرەدا گریمانە و تێزە تایبەتییەکانی خۆیشی دەور دەبینن کە وەک خۆت دەیزانیت، بریتین لەوەی کە: مرۆڤایەتی دەکرێت بە دوو بەشەوە، بەشێکیان کەرەسەی

خاون و بەشەکەی تریان بلیمەتن، ئەم بەشەیان هزرمەندن و لە سەروو یاساوەن، بە پێچەوانەوە ئەوان یاسا بۆ کەسانی تر، بۆ مرۆڤە کەرەسە خاوەکان، بۆ مێگەلەکە دادەنێن. ئەمەیش تێزێکە وەک هەموو تێزەکانی دی. ئەو گەلێک شەیدای ناپلیۆن بوو. لە ڕاستیدا ئەو ڕایە زۆر سەرنجی ڕاکێشاوە، کە گەلێک لەو کەسانەی بلیمەتن، گوێ بە زوڵمی تاکەکەسی نادەن. بەڵکو هەر بیری لێناکەنەوە و بەسەریدا باز دەدەن. لەوە دەچێت ئەو خۆی بە بلیمەت زانیبێت، یان بۆ ماوەیەک ئەو یەقینەی هەبووە، ئازاری زۆری چەشتووە و ئێستایش دەیچێژێت، چونکە توانیویەتی تیورەیەک دابهێنێت، بەڵام نەیتوانیووە ئەنجامی بدات و لەسەری بڕوات، کەواتە بلیمەت نییە. بۆیە تا ئێستا زەحمەت دەکێشێت، باشە، ئەمە بۆ لاوێکی مەغرور سووکایەتییە. بەتایبەتی لەم سەردەمەی ئێمەدا کە..

- ئەی ئازاری ویژدان چۆن؟ تۆ هیچ هەستێکی چاکە و ئاکاریی لەودا بەدی ناکەیت! باشە، ئەو وایە؟

- ئاخ، ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنا، ئێستا هیچ بەسەر هیچەوە نەماوە، بێجگە لەوەی کە تاکو ئێستا چ ڕژێمێکی چاک و پاک نەهاتۆتە گۆڕێ، ڕووسەکان وەک وڵاتە پانوبەرینەکەیان خاوەنی گیانی کراوەن. خەڵکەکەی زۆر حەزیان لە خەیاڵکردنەوە و ئاژاوەیە، بەڵام گیان کراوەیی بێ بلیمەتی مەترسی لە دوایە. لە بیرتە دوو بە دوو گەلێک باسی لەم بابەتانەمان کردووە، ئەو شەوانەی پێکەوە لە گوند، پێش نانخواردن لە باخەکە دادەنیشتین تۆ سەرزەنشتی منت دەکرد چونکە بیرم کراوەیە و کێ چووزانێت!! ڕەنگە هەر لەو کاتەدا کە ئەو قسانەمان دەکرد، براکەت لێرە بە پاڵکەوتنەوە خەریکی تێزەکەی بووبێت. ئاخر، ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنا، توێژە ڕووناکبیرەکەی ئێمە گوێ بە

داب و نەریتی پیرۆز نادات. بەڵکو هەندێک کەس هەر چۆنێک بێت، لە ناو کتێبەوە چەند شتێک دەهێنێت و بۆ خۆی پەیڕەویی لێدەکات، یان بە شێواوی لە قسەی ئەم و ئەوەوە شتێک هەڵدەکڕێنێت. وەلێ ئەمە زیاتر لە ناو زانایاندا باوە، تۆ دەزانیت گەمژەی وایان تیایە خەڵکی ئاسایی ناو کۆمەڵگا شەرمی پێدێت پەیڕەوییان لێبکات. بە کورتی، تۆ بەگشتی لە بیروڕای من گەیشتوویت. من بە هیچ جۆرێک کەس تاوانبار ناکەم. چۆنم هەروا دەمێنمەوە و خۆیشم هەڵناقورتێنمە کاری خەڵکەوە. من و تۆ لەم بارەیەوە گەلێک قسەمان کردووە، تەنانەت من بەوە بەختەوەر بووم کە تۆ بایەخت بە بیروڕاکانم دا.. ئاڤدوتیارۆمانۆڤنا، تۆ ڕەنگت زۆر هەڵبزڕکاوە.

- من ئەو گریمانەیەی کاکم خوێندۆتەوە، وتارێک بوو لە گۆڤارێکدا، دەربارەی ئەو کەسانەی ئازادن هەر کارێک بکەن.. ڕازومیخین وتارەکەی بۆ هێنام.

- جەنابی ڕازومیخین؟ وتاری براکەت؟ لە گۆڤارێکدا؟ ئایا بەڕاست وتاری لەو بابەتە هەیە؟ من نەمزانیووە. ڕەنگە زۆر سەرنجڕاکێش بێت! بەڵام تۆ بۆ کوێ دەچیت؟ ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنا.

دونیا بە دەنگی نزم وەڵامی دایەوە:

- دەمەوێت سۆنیا سمیونۆڤنا ببینم، دەبێت لە کوێوە بڕۆیت بۆ لای؟ ڕەنگە هاتبێتەوە، دەمەوێت هەر ئێستا بیبینم، دەبێت ئەو..

ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنا نەیتوانی قسەکانی تەواو بکات، بە تەواوی هەناسەی گیرا.

- سۆنیا سمیونۆفنا تا شەو ناگەڕێتەوە، من بزانم وایە، دەبوو زوو بێتەوە، کە تا ئێستا نەهاتۆتەوە مانای وایە درەنگ دەگەڕێتەوە.

دونیا خەریک بوو لە پێستی خۆی دەربچێت، وا هەڵچووبوو کە نەیتوانی خۆی بگرێت، بەسەریدا قیژاندی.
- ئا، کەواتە تۆ درۆزنیت، من دەزانم.. تۆ درۆزنیت.. هەرچییەکت وت هەمووی درۆ بوو.. من بڕوا بە تۆ ناکەم، هەرگیز بڕوات پێناکەم..
دونیا لەوەدا بوو ببوورێتەوە، بەسەر ئەو کورسییەدا کەوت، کە سڤیدریگایلۆڤ بەپەلە بۆی هێنا..
- ئاڤدوتیا ڕۆمانوڤنا چیتە؟ وەرەوە سەر خۆت، ئەوە ئاو، قومێک ئاو بخۆرەوە.
کەمێک ئاوی بە سەروچاویدا کرد، دونیا ڕاپەڕی و بە هۆش خۆی هاتەوە.
سڤیدریگایلۆڤ برۆی هێنانەوە یەک و بە خۆی وت:
- زۆر کاری لێکردووە.
پاشان پێی وت:
- ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنا، ورە بەرمەدە، ئەوە بزانە کە براکەت گەلێک هاوڕێی هەیە، ئێمە ڕزگاری دەکەین، لەم میحنەتەی دەردێنین. پێت خۆشە بیگەیەنمە هەندەران؟ پارەم هەیە و بە سێ ڕۆژ بلیتی بۆ پەیدا دەکەم. وەلێ لەبارەی کوشتنەکەوە، ئەو دەتوانێت بۆ لەمەودوا کاری زۆر چاک بکات و گوناهەکەی بسڕێتەوە، دڵنیا بە، ڕەنگە پیاوێکی گەورەیشی لێدەربچێت، چۆنیت؟ هەست بە باشی دەکەیت؟
- ناپیاو، هێشتا دەمکەیتە مەسخەرەی خۆت! وازم لێبهێنە..
- بۆ کوێ؟ دەتەوێت بۆ کوێ بچیت؟
- دەڕۆم بۆ لای، لە کوێیە؟ دەیزانیت؟ ئەی بۆ ئەم دەرگایە قفڵە؟ ئێمە لێرەوە هاتین و ئێستا دەرگاکە داخراوە. چۆن دەرفەتت هێنا و داتخست؟

- ئاخر، نەدەبوو ئەم قسانە بکەین و دەرگایش کرابێتەوە و دەنگمان بڕواتە دەرەوە. من بە هیچ جۆرێک گاڵتەجاڕی بەخەرج نادەم، تەنانەت لەم جۆرە قسانەیش بێزار بووم، ئاخر، تۆ دەتەوێت بەم حاڵەوە بۆ کوێ بچیت؟ دەتەوێت خۆی بەدەستەوە بدات، ئەگەر بچیت بۆ لای، ڕقی هەڵدەستێت و دەڕوات خۆی بەدەستەوە دەدات. ئەوە بزانە کە لە کەمیندان بۆی و بە دوایەوەن، ئەگەر بچیت، دەبیتە هۆی دەستگیرکردنی، ڕاوەستە، من خۆم ئێستا بینیم و قسەم لەگەڵیدا کرد. هێشتا هیوای ڕزگاربوونی هەیە. ڕاوەستە و ئارام بگرە، دابنیشە، با پێکەوە بیری لێبکەینەوە، بۆیە تۆم هێناوەتە ئێرە تا بە تەنیا لە کێشەکە بدوێین و بێنەوبەردەی لەسەر بکەین. باشە، دەتۆ دابنیشە.

- تۆ چۆن دەتوانیت ڕزگاری بکەیت؟ ئەوە دەکرێت؟

دونیا دانیشت و سڤیدریگایلۆڤیش لە پاڵیا دانیشت، چاوی کەوتبووە درەوشانەوە، وا شپرزە ببوو هەندێکجار لە باسەکە دەردەچوو، تەنانەت هەندێک لە وشەکانی بە چاکی پێنەدەوترا. دونیا لە تاوا خۆی لێ دوور خستەوە، ئەویش هەموو لەشی دەلەرزی، لەسەرخۆ پێی وت:

- تۆ.. بە تاقەوشەیەکی تۆ ئەو ڕزگاری دەبێت. من.. من ڕزگاری دەکەم. من پارەم هەیە و هاوڕێم هەیە. ڕاست لێرە دەری دەکەم و گوزەرنامە بۆ خۆیشم دەردێنم، دوو گوزەرنامە دەردێنم.. یەکێکیان بۆ ئەو و ئەوی تریان بۆ خۆم، هاوڕێم هەن.. کەسانی زۆر دڵسۆزم هەن.. دەتەوێت؟ بۆ تۆیشی دەردێنم.. بۆ دایکیشت.. ڕازومیخینت بۆچییە؟ من وەک ئەو تۆم خۆش دەوێت.. تا ئەوپەڕی خۆشەویستی، لێگەڕێ با داوێنی کراسەکەت ماچ بکەم، لێگەڕێ، لێگەڕێ، خۆم لەبەر خشەخشی کراسەکەتدا ناگرم، هەر پێم بڵێ فلانە کار بکە، دەیکەم.

چی مەحاڵە دەیکەم، تۆ بڕوات بە چی هەیە، منیش بڕوای پێدێنم، من هەموو کارێک، ئامادەم هەموو کارێک بکەم. بەم جۆرە لێم مەڕوانە، وا لێم مەڕوانە، دەزانیت دەمکوژیت..

سڤیدریگایلۆڤ کەوتبووە وڕێنەکردن، لەپڕێکدا تێک چوو، دەتوت بەسەریاندا کێشاوە. دونیا لە جێگاکەی ڕاپەڕی و بەرەو لای دەرگاکە چوو، بە هەردوو دەستی دەرگای ڕاوەشاند، وەک داوای یارمەتی لە یەکێک بکات بە هەموو توانایەوە کەوتە هاوارکردن:

- بیکەنەوە! بیکەنەوە! بۆ نایکەنەوە؟ کەسی لێنییە؟

سڤیدریگایلۆڤ هەستا و هاتەوە سەر خۆی، زەردەخەنەیەکی بەدکارانە و گاڵتەجاڕانەی خستە سەرلێوە هەڵلەرزیوەکانی، بە دەنگێکی لەسەرخۆ و پچڕپچڕەوە وتی:

- کەسی لێنییە، خاوەن ماڵەکە چووەتە دەرێ و هاوار هاواریش دادت نادات. بێهودەیە و بەبێ هۆ خۆت نارەحەت دەکەیت.

- کلیلەکە لە کوێیە؟ زوو دەرگاکە بکەرەوە، بەدڕەوشت!

- کلیلەکەم ون کردووە و نایدۆزمەوە.

- کەواتە، ئەمە بە زۆر ئەتککردنە!

دونیا وەک مردوو ڕەنگی پەڕی، خۆی خستە سووچێکەوە، پەنای بردە بەر پشت مێزێک کە لەوێدا بوو. ئیتر هاواری نەکرد، بەڵام چاوی بڕییە دوژمنەکەی و هەموو توانای خستە سەر بچووکترین جووڵەی، سڤیدریگایلوفیش جووڵەی لێبڕابوو، لە سووچێکی تری ژوورەکەدا بەرانبەر بەو وەستابوو، تەنانەت بە ڕووکەش بەسەر خۆیدا زاڵ ببوو، وەلێ دەموچاوی وەک پێشوو بێڕەنگ و زەردەخەنە گاڵتەجاڕییەکەیشی لە ڕووی نەدەبڕا.

- ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنا، تۆ ئێستا وشەی "زۆر"ت بەکار هێنا، ئەگەر مەسەلەکە زۆرە، تۆ خۆت داوەری بکە، من هەموو شتێکم تەگبیر کردووە، سۆنیا سمیۆنۆڤنا لە ماڵ نییە، لێرەوە تا ماڵی کاپەرناومۆڤ پێنج ژوورە و هەموویشیان داخراون، پاشان من دوو ئەوەندەی تۆ بەهێزم، بێ لەمەیش ترسێکم نییە، چونکە تۆ ناتوانیت شکات لە من بکەیت: دەتەوێت براکەت ڕسوا بێت؟ ئەسڵەن کەس بڕوا بە قسەکانت ناکات، باشە، هاتنی کچێکی جوان بۆ لای پیاوێکی زگورت بە چی پاساو دەدرێت؟ بۆیە تەنانەت ئەگەر براکەیشت بکەیتە قوربانی، هێشتا هەر ناتوانیت هیچ بکەیت. ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنا، سەلماندنی دەستدرێژی گەلێک سەختە.
دونیا لەبەر خۆیەوە بە تووڕەیی وتی:
- نامەرد!
- چی ئەڵێی بیڵێ، بەڵام لە بیرت نەچێت ئەوانەی پێم وتیت تەنیا پێشنیاز بوون، من دەزانم تۆ لەسەر هەقیت: دەستدرێژیکردن کارێکی نامەردانەیە، وەلێ بۆ ئەوە وتم کە تووشی ئازاری ویژدان نەبیت. تەنانەت ئەگەر.. ئەگەر بە ویستی خۆت قایل بیت، وەک پێشنیازم بۆ کردیت، کە براکەت ڕزگار بکەیت، لەو حاڵەتەدا تۆ ملکەچی هەلومەرجێک، یان تەنانەت زۆرێک (ئەگەر ناچار بین ئەم وشەیە بەکار بهێنین) دەبیت. بیر لەوە بکەرەوە کە چارەنووسی براکەت و دایکت لە دەستی تۆدایە، بەڵام من دەبمە نۆکەرت.. هەموو تەمەنم.. لێرەدا دادەنیشم و چاوەڕوانیت لێدەکەم..
سڤیدریگایلۆڤ هەشت هەنگاو لەولای دونیاوە لەسەر قەنەفەکە دانیشت، کچە هیچ گومانی نەما کە ئیتر ئەو بڕیارێکی داوە و پەشیمان نابێتەوە، بەتایبەتی کە ئەم باشی دەناسی..

لەپڕێکدا دونیا دەمانچەیەکی لە گیرفانی خۆی دەرهێنا، دەستی بە دەمانچەکەوە لەسەر مێزەکە دانا.
سفیدریگایلۆف لە جێگاکەی ڕاپەڕی، لە کاتێکدا کە بە سەرسامییەوە هاواری لێهەستا، زەردەخەنەیەکی نەگریسانەیشی کرد:
- ئا! هەرئاوا! جا خۆ ئەم کارە بە تەواوی ڕەوتی مەسەلەکە ئاوەژوو دەکات. ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنا، تۆ کارەکەمان زۆر ئاسان دەکەیت! باشە، ئەم دەمانچەیەت لە کوێ هێناوە؟ ناشێ کاری ڕازومیخین بێت؟ سەیرە ئەمە دەمانچەی منە، هاوڕێی دێرینەمە، دەزانیت چەند بە دوایدا گەڕاوم! دیارە ئەو وانانەی بە شانازییەوە لەبارەی نیشانپێکانەوە لە گوندا فێرم کردوویت، بەخەسار نەچوون.
- ئەمە دەمانچەی تۆ نییە، بەڵکو هی مارفا پتروڤنایە، کە نامەردانە کوشتت. لەوماڵەدا تۆ هیچت نەبوو، من کاتێک ئەم دەمانچەیەم هەڵگرت، کە زانیم تۆ چ نیازپیسێکیت و دەتەوێت چی بکەیت. ئەگەر لە خۆت ڕاببینیت و تەنانەت هەنگاوێک هەڵبێنیت، سوێند دەخۆم دەتکوژم.
دونیا لەوپەڕی تووڕەیی و هەڵچووندا بوو، دەمانچەکەی هێنابووە سەرپێ.
سفیدریگایلۆف کە لە شوێنەکەی خۆیدا بە پێوە وەستابوو، پرسی:
- ئەی براکەت چی لێدەکەیت؟ ئەم پرسیارەت لە کونپشکنییەوە لێدەکەم.
- بڕۆ خەبەری لێبدە! نەجووڵێیت، نزیک نەبیتەوە، ئەگینا پێتەوە دەنێم، تۆ ژنەکەتت ژەهرخوارد کرد، من دەیزانم، تۆ خۆت پیاوکوژیت..
- لەو باوەڕەدایت من مارفا پتروڤنام ژەهرخوارد کردبێت؟

- بەڵێ، تۆیت، تۆ خۆت ئاماژەیەکی وات دامێ، لەبارەی ژەهرەوە شتێکت پێوتم.. من دەیزانم، تۆ خۆت چوویت و کڕیت.. هەموو شتێکت ئامادە کرد.. تەنیا کاری تۆیە.. تۆ پیاوکوژیت.. نامەرد!

- ئەگەر ئەم قسەیە ڕاستیش بێت، لەبەر خاتری تۆ کردوومە.. تۆ هۆکاری ئەم کارەیت.

- درۆ دەکەیت، من هەمیشە نەفرەتم لە تۆ کردووە، هەمیشە..

- نا! ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنا، لەوە دەچێت لە بیرت نەمابێت چۆن لە گەرمەی پەند و ئامۆژگارییەکانتا بەسەرمدا دەچەمایتەوە، دەسووتایت و دەبرژایت.. لە چاوانتا خۆشەویستیم دەخوێندەوە، ئەو شەوەت لە بیرە، لەبەر مانگەشەودا، هوزارەکە چ بانگێکی هەڵدابوو؟

لە ڕقا چاوی دونیا پڕیشکی دا و هاواری کرد:

- درۆ دەکەیت، بوختان هەڵدەبەستیت!

- درۆ دەکەم؟ ڕەنگە درۆم کردبێت، باشە با درۆ بێت، نابێت ئەم شتانە وەبیر ژن بێنیتەوە (زەردەیەکی هاتێ) دەزانم پەنجە بە پەلەپیتکەکەدا دەنێیت، جوانی کێوی، دەی، بمکوژە.

دونیا دەمانچەکەی ڕاست کردەوە، وەک مردوو ڕەنگی سپی داگەڕابوو، لێوە چکۆڵە ڕەنگبووردووەکەی کەوتبووە لەرزین، بە چاوە گەورە و ڕەشەکانی کە وەک ئاگر پرشنگیان لێدەبووەوە، لە سڤیدریگایلوفی دەڕوانی. بڕیاری خۆی دابوو، تەنیا چاوەڕێی جووڵانەوەیەکی ئەوی دەکرد. سڤیدریگایلۆڤ لە هەموو ژیانیدا ئەوی بەو جوانییەی ئێستاوە نەدیبوو. ئەو بڵێسەیەی لە کاتی هەڵبڕینی دەمانچەکەدا لە چاوی دونیاوە دەدرەوشایەوە، دەیسووتاند، دڵی تەواو گوشرابوو. سڤیدریگایلۆڤ هەنگاوێکی هەڵهێنا و دەمانچە ناڵەی

کرد، فیشەکەکە بەناو قژیدا چیغی کردو لە دیوارەکەدا جێگیر بوو. سڤیدریگایلۆڤ وەستا و بەکاوەخۆ دایە پێکەنین.
- مێشهەنگێک پێوەی دام. ڕاست بەرەو تەپڵی سەرم! ئای، ئەوە چییە؟ خوێنە!
دەستەسڕی لە گیرفانی دەرهێنا تا ئەو تیلماسکە خوێنەی بە لاجانگی ڕاستیدا لەسەرخۆ هاتبوە خوارێ، پاکی بکاتەوە. لەوە دەچوو فیشەکەکە کەمێک لە پێستی سەری ڕوشاندبێت.
دونیا دەمانچەکەی دانەواند و لە سڤیدریگایلۆڤی ڕوانی، نەک لە ترسا، بەڵکو بەوپەڕی سەرسامییەوە، دەتوت خۆیشی نازانێت چی کردووە یان چی ڕووی داوە.
سڤیدریگایلۆڤ بەدەم زەردەخەنەکەی سەرلێوەیەوە، لەسەرخۆ بەڵام بە خەمبارییەوە وتی:
- باشە، نەتپێکا، دەی جارێکی تر، چاوەڕێم، ئەگینا پێش ئەوەی بیهێنیتەوە سەرپێ، دەتوانم بتگرم.
دونیا تەزوویەکی پێداهات، خێرا میلی هێنایەوە و ڕووی دەمانچەکەی کردەوە سڤیدریگایلۆڤ. بەڵام نائومێدانە وتی:
- وازم لێبێنە، سوێند دەخۆم کە دیسان پێتەوە دەنێم.. دەتکوژم.
- باشە، سەیر نییە.. ناکرێت لە دووری سێ هەنگاوەوە نەیکوژیت، ئەی ئەگەر ئەمجارەیش نەتپێکام.. چی دەکەیت؟
بەدەم قسەکانەوە چاوی کەوتنە بڵێسە و دوو هەنگاوی تر هاتە پێشێ، دونیا پەنجەی بە پەلەپیتکەکەدا ناو چرکاندی، بەڵام نەتەقی.
- باشت نەهێناوەتە سەرپێ، قەیدی نییە، هێشتا فیشەکێکی تری تێدایە، دەمانچەکە چاک ڕابکێشە، چاوەڕێم.

سڤیدریگایلۆڤ دوو هەنگاو لەولایەوە وەستابوو، چاوەڕێی دەکرد، نیگای بڕیبووە کچەکە، نیگایەکی ئاگراوی و بەئالۆش، پڕ لە جەخت و بڕیاری کێوییانە.

دونیا دەرکی کرد کە سڤیدریگایلۆڤ مردنی لا خۆشترە لە دەستبەرداربوونی ئەو "کەواتە.. گومانی تێدا نییە، ئەمجارەیان کە سڤیدریگایلۆڤ دوو هەنگاو لێی دوورە، هەر دەیکوژێت.."

لەپڕێکدا دونیا دەمانچەکەی فڕێ دا، سڤیدریگایلۆڤ هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵکێشا و بە سەرسووڕماوییەوە وتی:

- فڕێت دا!

دەتوت هەستی بەوە کردووە کە بارێکی گران لەسەر دڵی لاچووە، ئەو بارە گرانە تەنیا ئەوە نەبوو کە هەستی مردن بێت، هەر چەندە تۆزێک لەوەوبەر ئەو هەستەیشی هەبوو، بەڵکو هەستی ڕزگاربوون بوو لە شتێک کە ئازار و سوێی زیاتر و دژوا تر بوو، هەستێک بوو خۆیشی نەیدەزانی سەروبەری لە کوێدایە.

سڤیدریگایلۆڤ لە دونیا نزیک کەوتەوە، لەسەرخۆ باوەشی بە کەمەریدا کرد. دونیا هیچی نەوت. بەڵام لە کاتێکدا کە سەرتاپای لەشی وەک گەڵای بەر ڕەشەبا کەوتبووە لەرزین، بە چاوی پڕ لە پاڕانەوەوە لێی دەڕوانی. سڤیدریگایلۆڤ ویستی شتێک بڵێت، وەلێ لێوی هەڵنەهاتەوە و وشەیەکی بۆ نەوترا.

دونیا لێی پاڕایەوە و وتی:

- لێم گەڕێ!

سڤیدریگایلۆڤ تەزووی تێگەڕا، چونکە دونیا شێوەی وتنەکەی وەک جاران نەبوو، بەڵکو ئەمجارەیان بە زمانی تاکی بەرانبەر دواندی، لەسەرخۆ لێی پرسی:

- خۆشت ناوێم؟
دونیا بە سەر ئاماژەی "نەخێر"ی بۆ کرد.
سڤیدریگایلۆڤ بە نائومێدییەکی فرەوە لەسەرخۆ وتی:
- ئەی.. ناتەوێت هەرگیز خۆشت بوێم؟ .. هەرگیز..
دونیا بە هێواشی وتی:
- هەرگیز.
بۆ چرکەساتێک، شەڕێکی سست و ترسناک لە دەروونی سڤیدریگایلۆڤ گەڕا، بە جۆرێک لە دونیای دەڕوانی، کە ناتوانیت باسی بکەیت، لەپڕێکدا دەستی کێشایە دواوە، ڕووی وەرگێڕا و خێرا بەرەو لای پەنجەرەکە چوو، وەستا، ماوەی چرکەساتێکی برد.
- ئەوە کلیلەکە..
سڤیدریگایلۆڤ کلیلەکەی لە گیرفانی چەپی پاڵتاوەکەی دەرهێنا، لە پشت خۆیەوە لەسەر مێزەکە داینا، بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە یان تەماشای دونیا بکات وتی:
- کلیلەکە هەڵبگرە و تا زووە بڕۆ.
سڤیدریگایلۆڤ دیسانەوە بێ ئەوەی تەماشای دواوە بکات، دووبارەی کردەوە و وتی:
- تا زووە، تا زووە!
وشەی "تا زووە" زەنگێکی ترسناک بوو. دونیا هەستی پێکرد، بەپەلە کلیلەکەی هەڵگرت و بەرەو لای دەرگاکە ڕۆشت، کردیەوە و لە ژوورەکە دەرپەڕی.
دواى چرکەیەک، وەک شێت لە خۆوە بەرەو ڕووباری س.. ڕێگەی پردەکەی لەبەر گرت.

سڤیدریگایلۆڤ سێ دەقیقە لە پاڵ پەنجەرەکەدا وەستا، پاشان بە هێوری ئاوڕی دایەوە، تەماشای دەوروبەری خۆی کرد و بە ئەسپایی دەستی بە تەوێڵیدا هێنا. زەردەخەنەیەکی سەیری کەوتە سەر لێو، زەردەخەنەیەکی پڕ لە خەم و پەشیمانی، زەردەخەنەیەکی لاوازی پڕ لە نائومێدی. خوێنەکە بەسەر دەستییەوە وشک هەڵاتبوو، بە تووڕەییەوە لە خوێنەکەی ڕوانی، پاشان خاولییەکی تەڕ کرد و لاجانگی پاک کردەوە. لەپڕێکدا دەمانچەکەی دونیای هاتە بەرچاو کە نزیک بە دەرگاکە کەوتبوو. هەڵی گرت و بە وردی لێی ڕوانی، دەمانچەیەکی کۆنی بچووکی گیرفان بوو کە سێ فیشەکی دەخوارد. هێشتا دوو فیشەک و تەرەقەیەکی تیا مابوو، دەکرا جارێکی تریش بیتەقێنێت، بیری کردەوە، دەمانچەکەی خستە گیرفانی، کڵاوەکەی هەڵگرت و لە دەرگا بەدەر کەوت.

## ٦

سڤیدریگایلۆڤ تا سەعات دەی شەوی لە ڕێستۆرانت و کابارە جۆربەجۆرەکاندا بەسەر برد و هەموویان گەڕا، لە یەکێکیاندا کاتیای دۆزییەوە، کە دیسانەوە گۆرانییەکی باوی دەوت، گۆرانییەکە باسی پیاوێکی زۆردار و بەدڕەوشتی دەکرد، کە "دەستی بە ماچکردنی کاتیا کردبوو".

سڤیدریگایلۆڤ شەرابی بە کاتیا، بە مۆسیقارەکە، بە گۆرانیبێژەکان، بە گارسۆن و دوو کارمەندی تریش دا. بۆیە لەگەڵ ئەم دووانەدا بەتایبەتی نزیک کەوتبووەوە، چونکە هەردووکیان لووتیان لار بوو، لووتی یەکێکیان بە لای ڕاستدا و لووتی ئەوی تریان بەرەو لای چەپ لار ببووەوە. ئەمە سەرنجی سڤیدریگایلۆڤی ڕاکێشابوو، پاشان ئەو

دووانه بردیانه باخێکی ڕابواردنەوە، سڤیدریگایلۆڤ خەرجی و پارەی چوونەژوورەوەی بۆ دان، لە باخەکەدا تەنیا درەختێکی سنەوبەری باریکی سێ ساڵە هەبوو، لە پاڵیدا سێ دەوەنی تریش. سەکۆیەکی تیا کرابوو بە ناوی "وێستگە"، کە لە ڕاستیدا جێگای مەیفرۆشتن بوو. هەروەها چایشی تیا دەفرۆشرا. چەند مێزێکی سەوزی بچووک و کورسیی تیا دانرابوو. تیپێکی گۆرانیوتن بە گۆرانیی ناخۆش ناخۆش و کابرایەکی سەرخۆشی ئەڵمانی خەڵکی مونیخ، بە لووتێکی سوورو دەموچاوێکی زۆر خەماوییەوە کە لە کۆستە باییەکانی سێرک دەچوو، دانیشتوانیان سەرگەرم دەکرد، دوو کارمەندەکە لەگەڵ هەندێکی تری وەک خۆیاندا پێکدا هەڵپژان و خەریک بوو بکەونە لێدانی یەکدی. سڤیدریگایلۆڤیان بۆ داوەری هەڵبژارد، چارەکەسەعاتێک خەریکیان بوو، وەلێ ئەوان دابوویانە هەراوزەنایەک، کەس سەری لە کێشەکەیان دەرنەدەکرد. پێدەچوو یەکێکیان شتێکی دزی بێت، خێرا فرۆشتبێتی بە جوولەکەیەکی ئەو ناوە، بەڵام دوای فرۆشتنەکە نەیویستبێت پارەکە لەگەڵ هاوڕێکانیدا بەش بکات. دوایی دەرکەوت کە شتە دزراوەکە کەوچکی چای وێستگەکە بووە، ئەوانیش پێیانزانی و کێشەکە بەرەو تەنگژە و ئاڵۆزی چوو، سڤیدریگایلۆڤ پارەی کەوچکەکەی دا، هەستا و لە باخەکە چووە دەرێ، نزیک سەعات دەبوو، بە درێژایی ئەو ماوەیە تەنانەت دڵۆپێک شەرابی نەخواردبووەوە، تەنیا لەسەر سەکۆکە داوای چایەکی کردبوو، ئەمەیشیان هەر لەبەر پاراستنی نەریتی جێگاکە.. هەواکەی خەفەکەر بوو، دڵی بە تەنگ دێنا، لە نزیک سەعات دەدا پەڵە هەورە ڕەشەکان لە هەموو لاوە یەکیان گرت. ئاسمان دایە بروسکە و باران دای کرد، ئاوەکە دڵۆپ دڵۆپ نەدەباری، بەڵکو بە لێزمە خۆی بە زەویدا

دەکێشا، بروسکەکان دنیایان ڕووناک دەکردەوە و هێند خێرا بەدوای یەکدا دەهاتن، کە تۆ تەنیا پێنجت بۆ دەژمێردرا. سڤیدریگایلۆڤ کە سەرتاپای لەشی تەڕ بووبوو، گەیشتەوە ماڵێ، دەرگای لەسەر خۆی بەست، چەکمەجەی مێزەکەی کردەوە، هەرچی پارەیەکی هەبوو، دەریهێنا و چەند کاغەزێکی دڕی، پارەکانی خستە گیرفانی، ویستی جلەکانی بگۆڕێت. بەڵام کە لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوەی کرد و گوێی لە زریان و دەنگی باران بوو، دەستێکی بێدەربەستانەی ڕاوەشاند، کڵاوەکەی هەڵگرت و چووە دەرەوە. بێ ئەوەی دەرگای ژوورەکە دابخات، ڕاست بەرەو لای سۆنیا کەوتە ڕێ، ئەو لە ژوورەکەیدا بوو، سۆنیا بە تەنیا نەبوو، چوار منداڵی کاپەرناونۆڤ لە چواردەوری بوون. سۆنیا سمیۆنۆڤنا چای دەدانێ، لەسەرخۆ و بەڕێزەوە پێشوازی لە سڤیدریگایلۆڤ کرد، بە سەرسامییەوە تەماشای جلە تەڕەکانی کرد و هیچی نەوت. بەڵام منداڵەکان زۆر ترسان و بەپەلە هەڵاتن.

سڤیدریگایلۆڤ لەسەر مێزەکە دانیشت و داوایشی لە سۆنیا کرد لە نزیکییەوە دابنیشێت. سۆنیا بە شەرمەوە قبووڵی کرد.

سڤیدریگایلۆڤ وتی:

- سۆنیا سمیونۆڤنا، لەوانەیە من بڕۆم بۆ ئەمریکا، پێدەچێت ئەمە دواجاری یەکتربینینمان بێت، هاتووم چەند ڕاسپاردەیەکت پێبڵێم. باشە، تۆ ئەمڕۆ ئەو خانمەت بینی؟ وایە؟ چی پێوتوویت هەمووی دەزانم. پێویست بە وتنەوەی ناکات (سۆنیا جووڵا و سوور بووەوە) ئەم جۆرە کەسانە بیرکردنەوەیەکی تایبەتییان هەیە. ئەوەی پەیوەندیی بە خوشک و برا بچووکەکەتەوە هەیە، کاریان بە ئەنجام گەیشتووە، ئەو پارەیەی بۆ هەر یەکێکیان پێویستە، بە ناوی

خۆیانەوە و بە جیا داومەتە دەستێکی ئەمین و بەڵگەیشم وەرگرتووە. چاکترە ئەو بەڵگانە بۆ ڕۆژی پێویست لای تۆ بن. فەرموو ئەوە بەڵگەکانە. باشە، ئەو کارەمان تەواو. ئەمەیش سێ چەکی سێ هەزار ڕۆبڵی کە ساڵانە قازانجی دێتە سەر بۆ خۆت. بەڵام تکات لێدەکەم ئەمە لە بەینی خۆماندا بێت و کەسی تر پێی نەزانێت، تەنانەت ئەگەر شتیشت بەرگوێ کەوت. تۆ پێویستت بەم پارانە دەبێت، چونکە ئەم ژیانەی تا ئێستا تۆی تیا بوویت، سۆنیا سمیونۆڤنا، ژیانێکی بێکەڵکە، بە تایبەتی کە ئیتر ناچار نابیت وا بژیت.

سۆنیا خێرا وتی:

- خۆم، هەتیووەکان و دایکە کۆچکردووەکەیش، هەموومان سوپاسگوزاری یارمەتی و دڵسۆزیی تۆین.. هەرچەندە تا ئێستا سوپاسی تەواوم نەکردوویت، بەڵام وای تێمەگە کە..

- بەسە، ئەوەندە بەسە.

- لە ڕاستیا دەربارەی ئەم پارەیە، ئارکادی ئیڤانۆڤیچ، من زۆر سوپاست دەکەم، بەڵام ئاخر، من ئیدی پێویستیم پێی نییە، من ئیتر تەنیام و دەتوانم خۆم بژێنم، وا تێمەگە من پێی نەزانم، بەڵام کە تۆ ئەمەندە چاکەخوازیت، کەواتە ئەم پارانە..

- ئەم پارانە، سۆنیا سمیونۆڤنا، پارەی خۆتن، تکایە، ئیتر قسەی ناوێت، چونکە کاتم نەماوە، ڕۆژێک دێت سوودی لێببینیت، ڕادیون ڕومانوڤیچ تەنیا دوو ڕێگەی لە بەردەمدایە: یان فیشەکێک بەسەری

خۆیەوە بنێت، یان ڕێگەی "ڤلادیمروڤکا"[1] لەبەر بگرێت. (سۆنیا ترسی لێنیشت، تەماشای کرد و لەرزی). مەترسە من هەموو شتێک دەزانم، خۆی پێی وتووم، بەڵام من زمانم شڕ نییە، ئەمە بۆ کەس ناگێڕمەوە، تۆ ئەو ڕۆژە ئامۆژگارییەکی چاکت کرد، کە بڕوات و خۆی بەدەستەوە بدات. ئەم کارە زۆر لە قازانجیەتی. باشە، ئەگەر سیبریا هاتە پێش، ئەو دەڕوات و تۆیش دوای دەکەویت، وایە؟ نا؟ باشە، ئەگەر وابێت، کەواتە گومانی تیا نییە کە پێویستتان بە پارە دەبێت، ئەو پارەیەی بە تۆم داوە، وەک ئەوە وایە بەویشم دابێت، هەروەها بەڵێنت بە ئامالیا ئیڤانۆڤنا داوە ئەو قەرزەی لەسەر خێزانەکەتانە تۆ بەوی بدەیتەوە، من ئەمەم بیستووە، سۆنیا سمیونۆڤنا، تۆ چۆن بەڵێنی وا پەلە دەدەیت؟ ئاخر، خۆ تۆ قەرزاری ئەو ژنە ئەڵمانییە نیت، بەڵکو کاترینا ئیڤانۆڤنا قەرزاریەتی. تۆ دەبێت چ نرخێک بۆ ئەو ژنە دانەنێیت. بەڵام لەم دنیایەدا ژیان وا بەڕێوە ناچێت. باشە، جا ئەگەر سبەی یان دوو سبەی یەکێک لەبارەی منەوە پرسیاری لێکردیت (حەتمەن ئەم پرسیارە دەکەن)، باسی هاتنی ئەمڕۆی من، یان ئەو پارەیەی داومە پێت، هەرگیز بە کەسی نەڵێیت، دەی، ئیتر ماڵئاوا.

(سڤیدریگایلۆڤ لەسەر کورسییەکە هەستا) پێش ئەوەی بڕوات وتی:

- سڵاوم بە ڕادیون ڕومانوڤیچ بگەیەنە. لە ڕاستیا، باشترە پارەکە بۆ ماوەیەک لای ڕازومیخینی بەڕێز بە ئەمانەت دابنێیت، جەنابی ڕازومیخین دەناسیت؟ بێگومان دەیناسیت، پیاوێکی خراپ نییە، هەر

---

[1] ڤلادیمروڤکا (Vladimirovka) شارێکە لە سیبریا، ئەوانەی فەرمانی کاری قورسیان بەسەردا دەدرێت، ڕەوانەی ئەوێ دەکرێن. "ڕێگای ڤلادیمروڤکا" واتا زیندان —و—

که دەرفەتت بوو، بەیانی یان.. پارەکەی بۆ بەرە، تا ئەو کاتە باش تاقەتی بکە.

سۆنیایش لەسەر کورسییەکە هەستا و بە ترسەوە لێی ڕوانی، زۆری پێ خۆش بوو شتێک بڵێت یان پرسیارێک بکات، بەڵام لە سەرەتادا پرکێشیی نەکرد، دواییش نەیدەزانی چۆن دەست پێبکات:

- چۆن، تۆ چۆن.. ئاوا.. بەم بارانە دەتەوێت بڕۆیت؟

- خەیاڵی سەفەری ئەمریکا و لە باران ترسان؟ هە، هە، هە! ماڵئاوا، سۆنیا سمیۆنۆڤنای ئازیز، بژیت و تەمەندرێژ بیت. تۆ خەمی خەڵکی تر هەڵدەگریت. بەڕاست: ڕێزم بۆ ڕازومیخین هەیە، پێی بڵێ: ئارکادی ئیڤانۆڤیچ سڤیدریگایلۆڤ سڵاوت لێدەکات. پێی بڵێیت ها.

سڤیدریگایلۆڤ ڕۆشتە دەرێ، سۆنیای بە سەرسامی و ترس و هەستی بەدگومانییەکەوە بەجێ هێشت.

پاشان دەرکەوت کە هەر هەمان شەو، نزیک سەعات دوانزە، سڤیدریگایلۆڤ دیدەنییەکی چاوەڕواننەکراو و سەیری تری هەبووە: باران هەر دەباری، سڤیدریگایلۆڤ بە لەشی تەڕەوە، سەعات یانزە و بیست دەقیقەی شەو، چوو بۆ ماڵە گەنیلەکەی دەزگیرانەکەی، ماڵەکە دەکەوتە شەقامی سێی دوورگەی "ڤاسیلوڤسکی"[1]یەوە، لە دەرگاکەی دا، ماوەیەکی پێچوو تا دەرگاکەیان لێکردەوە، لە سەرەتادا شپرزەیی و ناڕەحەتییەکی بۆ هەموویان دروست کرد، وەلێ ئارکادی ئیڤانۆڤیچ ئەگەر بیویستایە دەیتوانی بە هۆی بەهرەی هەڵسوکەوت و مامەڵەی چاکییەوە هەموو ناخۆشییەک چارەسەر بکات. بۆیە کەسوکاری کچەکە، کە زۆریش تێگەیشتوو بوون، هەستی ئەوەی کە دەشێت

---

[1] *Vassilyevesky*

سڤیدریگایلۆڤ ئەمەندە سەرخۆش بێت نەزانێ چی دەکات، زۆر زوو لە بیریاندا سڕایەوە. باوکی کچەکە، کە پیرێکی نەخۆشی لەپێکەوتوو بوو. بە سواری کورسییە چەرخدارەکەیەوە هێنایانە لای سڤیدریگایلۆڤەوە. دایکی بوکێ کە زۆر تێگەیشتوو و هەستیار بوو، لەسەر ڕێوشوێنی خۆی کەوتە پرسیارگەلێکی زۆر دوور لە مەسەلەکە (ئەم ژنە هەرگیز پرسیاری ڕاستەوخۆی لەبارەی شتێکەوە نەدەکرد، بەڵکو هەمیشە لە پێشدا زەردەخەنەیەکی بۆ دەکرد و دەستی هەڵدەگلۆفت، ئینجا بۆ ئەوەی باش لە شتەکە بگات، بۆ نموونە بۆ ئەوەی بزانێت کەی ئارکادی ئیڤانۆڤیچ زەماوەندەکەی دەکات، زۆر بە وردی و پەرۆشەوە پرسیاری دەربارەی پاریس و ژیانی ئەوێ لێدەکرد. ئەوسا وردەوردە دەیهێنایە سەر شەقامی سێی دوورگەی ڤاسیلیڤسکی). دەبوو لە کات و شوێنی تردا سڤیدریگایلۆڤ زۆر بە ڕێز و بێدەنگییەوە گوێی لێبگرتایە. بەڵام بۆ ئەمجارەیان ئارکادی ئیڤانۆڤیچ زۆر بێزار و وەڕەز بوو، بۆیە، بۆ ئەوەی قسەکەی پێببڕێت، داوای کرد خێرا دەزگیرانەکەی ببینێت، هەرچەندە پێیان وت خەوتووە، بەڵام بە ناچاری ئامادە بوو، ئارکادی ئیڤانۆڤیچ ڕێکوڕەوان پێی وت، لەبەر کارێکی گەلێک گرنگ دەبێت بۆ ماوەیەک پتروزبورگ بەجێ بێڵێت، بۆیە هەندێک چەکی بۆ هێناوە کە بڕی پارەکەی پانزە هەزار ڕۆبڵە، تکای لێکرد وەک دیارییەک لێی وەربگرێت، چونکە ئەو لە پێش ماوەیەک لەوەوبەرەوە ئەوەی وەک دیاریی پێش زەماوەند بۆ ئامادە کردبوو. بێگومان هیچ پەیوەندییەکی لۆژیکی لە نێوان دیاری و سەفەری کوتوپڕ و هاتنی بەم شەوە باراناوییە و ئەو ڕوونکردنەوانەی دای، نەبوو. وەلێ کارەکە بە ئاسانی بەڕێوە چوو. تەنانەت ئاهوناڵە و پرسیار و سەرسامیش کە لەم جۆرە حاڵەتانەدا

دێنە گۆڕێ، گەلێک کەم بوو. لەباتیی ئەوە سوپاسگوزاریەکی زۆر گەرموگوڕ، لەگەڵ فرمێسکی دایکە گەلێک ئاقڵەکەدا یەکیان گرت. ئارکادی ئیڤانۆڤیچ هەستا، پێکەنی. دەزگیرانەکەی ماچ کرد، دەستی بە ڕوومەتیدا هێنا، جەختیشی کرد کە بەم زووانە دەگەڕێتەوە، لەبەر ئەوەیش کە لە چاوی کچەکەدا نیگای کونجکۆڵیی بینی، کونجکۆڵییەک هەرچەندە منداڵانە بوو، بەڵام گەلێک پرسیاری بێدەنگی دەوروژاند، ڕاما و جارێکی دی ماچی کردەوە، هەر لەو کاتەیشدا کە سەرێک کەوتە دڵییەوە، چونکە زانی بۆ پاراستنی دیارییەکە لە لایەن ئەو دایکە بەئاوەزەوە دەخرێتە ناو سندووقێکەوە و بە کلیل دادەخرێت.

سڤیدریگایلۆڤ وەدەرکەوت و هەموویانی لە سەرسامیدا گیر دا، وەلێ دایکە هەستیارەکە یەکسەر بە دەنگێکی زۆر نزم بەڵام خێرا، گەلێک لەو مەسەلانەی چارەسەر کرد کە ببوونە هۆی مەترسی و سەرسامییەکەیان. بەوەی کە سڤیدریگایلۆڤ کەسایەتییەکی گرنگە. پیاوێکی زۆر دەوڵەمەندە و بە گەلێک کاری گەورە و پەیوەندییەوە بەستراوەتەوە، خوا خۆی دەزانێت چی بە خەیاڵدا هاتووە، بۆیە بە پێویستی زانیووە بڕوات، بە پێویستیشی زانیووە ئەم پارانە بدات و دای. ئیتر ئەمە سەرسووڕمانی نەگەرەکە. هەڵبەتە ئەو هەموو تەڕبوونەی مایەی سەرسامییە، بەڵام ئینگلیزەکان لەوەیش سەیرترن، لە ڕاستیدا کەسانی گرنگ باکیان بەوە نییە خەڵکی چییان پێدەڵێن و شەرمیشیان پێنایەت. ڕەنگە ئەم ڕەفتارەی تەنیا لەبەر ئەوە بووبێت کە ئەم لە کەس ناترسێت. بەهەرحاڵ، گرنگ ئەوەیە لەم بارەیەوە لەگەڵ کەسدا قسە نەکرێت و کەس نەیزانێت، چونکە خوا خۆی دەیزانێت ڕووی ئایندە لە کوێیە. دەبێت پارەکەیش تا زووە لە

جێگایەکدا دابنرێت و کلیل بدرێت. باش بوو ئەم ماوەیەیش فیدۆسیا[١] هەر لە مۆبەق بوو، زۆر زۆر گرنگە بە هیچ جۆرێک هیچ شتێک بەو ژنۆکەیە، ڕسلیخ و بە کەسی تریش نەوترێت و.. هتد.. هتد..
بەدەم قسەکردنەوە دوو سەعات دانیشتن، بێگومان بوکێ دەمێک بوو، لەگەڵ سەرسامی و کەمێک خەمباریدا، خەوی لێکەوتبوو، سڤیدریگایلۆڤیش هەر لەو کاتەدا کە شەو لە نیوەیدا بوو، لە پردەکەوە بەرەو پتروزبورگ تێپەڕی. باران خۆشی کردبووەوە، بەڵام با دەیلووراند. سڤیدریگایلۆڤ لەرزی لێهاتبوو، بۆ چرکەیەک تەماشایەکی کونجکۆڵییانە و نیگایەکی پرسیارکەرانەی لە ئاوە ڕەشەکەی ڕووباری "نیڤای بچووک" کرد. وەلێ خێرا هەستی بەوە کرد کە وەستانی لەسەر ئاوەکە لەرزی لێدێنێت. بۆیە گەڕایەوە و بەرەو شەقامی (س) بەڕێ کەوت.
سڤیدریگایلۆڤ ماوەیەکی زۆر یانی نیو سەعاتی ڕێک، بەو شەقامە دووورودرێژەدا گەڕا، چەند جارێک لە تاریکیدا پێی لەو شۆستەیە هەڵکەوت، کە تەختەڕێژ کرابوو، بە پەرۆشەوە بە دوای شتێکدا دەگەڕا کە کەوتبووە لای ڕاستی شەقامەکەوە. لە کۆتایی شەقامەکەدا کە ماوەیەک لەمەوبەر بە سواری گالیسکە پێیدا تێپەڕیبوو، میوانخانەیەکی گەورەی لە دار دروستکراوی دیبوو. ئەوەندەی لە بیری مابێت، ناوی میوانخانەکە شتێکی وەک "ئاندریا نوپڵ" بوو، بە هەڵە نەچووبوو، ئەم میوانخانەیە و لەم شوێنە تەریکەدا، هێند دیار و ئاشکرا دەینواند، کە مەحاڵ بوو نەدۆزرێتەوە، تەنانەت لە شەوی ئەنگوستەچاویشدا، لەو بینا دار و درێژەدا کە کۆنی ڕەش دای

[١] *Fedossia*

گیڕابوو، ئەگەرچی درەنگ وەختیش بوو، ڕووناکییەک و هاتوچۆیەک بەرچاو دەکەوت. سڤیدریگایلۆڤ چووە ژوورەوە، لە کابرایەکی شڕۆڵە کە بەرەو ڕووی دەهات، داوای ژووری کرد. کابرای شڕۆڵە کە بە سڤیدریگایلوفدا هەڵیڕوانی، تەکانێکی خوارد و ڕاست بەرەو ژوورێکی چەپەکی برد، کە کەوتبووە کۆتایی ڕاڕەوەکەوە، ژوورێکی تەنگەبەر و لەژێر نەردەوانێکدا، ژووری تری چۆڵ نەبوو، هەمووی پڕ بوو، کابرای شرۆڵە تەماشایەکی بەپرسیاری کرد، سڤیدریگایلۆڤ پرسی:

- چاتان هەیە؟

- بەڵێ، دەتوانین ئامادەی بکەین.

- چی ترتان هەیە؟

- گۆشتی برژاوی گوێرەکە، ڤۆدکا و مەزە.

- گۆشتی گوێرەکە و چام بۆ بێنە.

بەسەرسامییەوە پرسی:

- هیچی ترت ناوێت؟

- نەخێر، هیچ!

نۆکەرەکە بە نائومێدییەوە بەجێی هێشت.

سڤیدریگایلۆڤ بە خۆی وت: "ڕەنگە شوێنێکی باش بێت، چۆن ئەمەم نەزانیووە؟ بێگومان دیمەنی کەسێکم هەیە کە لە کابارە یان جێگایەکی لەو بابەتە گەڕابێتەوە و لە ڕێگەدا تووشی گاشەیەک هاتبێت. لەگەڵ ئەمەیشدا وا چاکە بزانم ئەوانە کێن کە شەوانە لێرە ڕۆژ دەکەنەوە".

ژوورەکەی پشکنی، قەفەزێک بوو بۆ مۆمێکی داگیرساند و وردتر ژوورەکەی پشکنی، قەفەزێک بوو بۆ خۆی، ئەمەندە بچووک بوو، تەنانەت یەکێکی وەک سڤیدریگایلۆڤ نەیدەتوانی بە چاکی بالای تیاڕاست بگرێت. ژوورەکە پەنجەرەیەکی

هەبوو، جێخەوێکی زۆر پیس، مێزێکی بۆیەکراو و کورسییەک. دیوارەکانی لەو تەختەدارە کەڵەکەکراوانە دەچوو، کە بزمارەکانی لێک ترازابێت، کاغەزە دیوارییەکان بێئەندازە دڕابوون و تۆزوخۆڵیان لەسەر کەڵەکە ببوو، تەنانەت بێجگە لە ڕەنگی زەرد هیچ وێنەیەکیان تیا دیاری نەدەدا. بەشێک لە دیوار و بنمیچەکە لار و گێڕ و بەرەوخوار داکەوتبوو، تەواو وەک ئەو ژوورانەی بەدار و تەنەکە دروست دەکرێن. پلیکانەکانیش هەر بەو لاری و چەماوەییەوە لەوێوە دەچوونە سەرێ.

سڤیدریگایلۆڤ مۆمەکەی لەسەر مێزەکە دانا، لەسەر قەرەوێڵەکە دانیشت و دایە بیرکردنەوە. بەڵام دەنگێکی سەیر و بەردەوام کە هەندێکجار دەبوو بە هاوار و بەرز دەبووەوە، لە ژوورێکی تەنیشتییەوە سەرنجی ڕاکێشا. لەوساوە کە هاتبووە ژوورەکەوە، ئەو دەنگە نەیدەبڕییەوە، گوێقوڵاغ بوو، یەکێک جوێنی دەدا و بەدەم گریانەوە سەرکۆنەی یەکێکی تری دەکرد. بەڵام تەنیا دەنگێک دەهات.

سڤیدریگایلۆڤ هەستا، بەدەست بەری لە ڕووناکایی مۆمەکە گرت، لەپڕێکدا لە درزی دیوارەکەوە ڕوناکاییەک سەرنجی ڕاکێشا، لێی نزیک بووەوە و کەوتە تەماشاکردن. لە ژوورێکدا کە کەمێک لە ژوورەکەی ئەم گەورەتر بوو، دوو پیاوی تێدا بوو، یەکێکیان کە قژی لوول و سوورفل بوو، وەک یەکێک وتار بخوێنێتەوە، بێجووڵە وەستابوو، بۆ ئەوەی هاوسەنگی خۆی ڕابگرێت، هەردوو قاچی بڵاو کردبووەوە. بە سنگی خۆیدا دەکێشا و بە توندی سەرزەنشتی ئەوی تری دەکرد، کە کەسێکی نابووت و خوێڕییە و هیچ پایەیەکی کۆمەڵایەتیی نییە. ئەو لە زەلکاو دەری هێناوە و دەتوانێت فڕێی بداتەوە ناوی. تەنیا خودایش ئەم ڕاستییانە دەزانێت. پیاوە

سەرکۆنەکراوەکە لەسەر کورسییەک دانیشتبوو، لە کەسێکی دەکرد بیەوێت بپژمێت و کەچی بە هیچ جۆرێک نەتوانێت. هەندێکجار سەرنجێکی پەرێشان و ساڤیلکانەی قسەکەرەکەی دەدا. بەڵام لەوە دەچوو نەزانێت مەسەلە چییە و باس لە چی دەکرێت. لەسەر مێزەکە مۆمێک دەسووتا و گەیشتبووە کۆتایی، هەروەها قاپێک ڤۆدکا کە لە تەواوبووندا بوو، لەگەڵ چەند پیاڵە و نان و پەرداخ و خەیاری سوێرکراو، قۆری و پیاڵەکە کە هێشتا لانەبرابوون و پێدەچوو دەمێک بێت چایەکەیان خواردبێتەوە، لەسەر مێزەکە دەبینران.

دوای سەروبنکردنی وردی دیمەنەکە، سڤیدریگایلۆڤ بێ ئەوەی هەست بە هیچ بکات، لە درزی دیوارەکە دوور کەوتەوە و دیسانەوە لەسەر تەختی نووستنەکە دانیشتەوە.

کابرای شرۆڵە کە بە گۆشتی گوێرەکە و چایەوە گەڕایەوە، نەیتوانی خۆی بگرێت و جارێکی دی لێی نەپرسێت کە: "هیچی تری ناوێت؟" کە وەڵامەکەی بە نەخێر درایەوە لە ژوورەکە چووە دەرێ. سڤیدریگایلۆڤ بۆ ئەوەی گەرم بێتەوە، پەلاماری چایەکەی دا و پەرداخێکی نا بەسەرەوە، بەڵام نەیتوانی هیچ بخوات، چونکە دڵی گیرابوو. لەوە دەچوو تای لێهاتبێت، پاڵتاو و چاکەتەکەی داکەند، خۆی لە لێفەکەوە پێچا و لەسەر تەختەکە ڕاکشا، کەمێک بێتاقەت بوو، کەوتە بیرکردنەوە: "ئەگەر تەندروست بم، چاکتر"، زەردەخەنەیەکی کرد. هەوای ژوورەکە خەفەکەر بوو، مۆمەکە تەواو کز بووبوو. لە دەرەوە با گڤەی دەهات، لە سووچێکی ژوورەکەدا مشکێک ملۆمووشی دەکرد، تێکڕا هەموو ژوورەکە بۆنی مشک و چەرمی لێدەهات. ڕاکشا بوو دەتوت خەون دەبینێت: بیرێک جێی بیرێکی تری دەگرتەوە، وای بۆ دەچوو زۆر حەزی پێبێت سەرقاڵی بیرۆکەیەک

بێت. بیری کردەوە: "دیارە لە بن پەنجەرەکەدا باخێکی گەورە هەیە. با درەختەکانی هێناوەتە دەنگ، لە شەودا چەندم ڕق لە دەنگی درەختە، لە تاریکی و زریاندا هەستێکی ناجۆر بەرکی مرۆڤ دەگرێت!" ئەوەی بیر کەوتەوە کاتێک بە پاڵ پارکی "پتروفسکی"دا دەڕۆیشت، بە بێزارییەکی زۆرەوە گوێی لەو دەنگە دەگرت. هەروەها یادی پردی.. س.. و "نیڤای بچووک"ی کەوتەوە، وەک ئەو کاتەی بەسەر ڕووبارەکەوە وەستابوو، هەستی بە سەرما کرد. بیری کردەوە: "هەرگیز، لە تەمەنی خۆمدا حەزم لە ئاو نەبووە، تەنانەت لە تابلۆیشدا". دیسانەوە کتوپڕ کەوتەوە ناو بیرێکی سەیرترەوە، بە تەوسەوە پێکەنی: "ئاخر دەبوو لەم کاتەدا مەسەلەی جوانی و ئاسوودەیی چ بایەخێکی لای من نەبێت، کەچی وا ئێستا بە تایبەتی گرنگی دەدەمێ، وەک ئەو ئاژەڵەی بەدوای لانەیەکدا دەگەڕێت بۆ خۆی.. دەبوو من لە ئێستادا بەرەو پارکی پتروفسکی بچم، بەڵام شەو تاریک و ئاووهەوایش ساردە. هە، هە، هە! دیارە حەزم لە هەستێکی بەتام و خۆشە.. بەڕاست بۆ مۆمەکە نەکوژێنمەوە؟" مۆمەکەی کوژاندەوە، لەبەر ئەوەی ڕووناکی لە درزەکەوە دەرنەدەکەوت، وای بە بیردا هات کە دراوسێکانی نووستبن، بە خۆی وت: "مارفا پتروڤنا، ئێستا کاتێکی گونجاوە بۆ ئەوەی بێیت، دنیا تاریکە، جێگاکە گونجاوە و ساتەوەختێکی دەگمەنیشە، پێویستە بێیت، بەڵام نایەیت.."

لە ناکاوێکدا، نەیزانی چۆن بیری کەوتەوە کە سەعاتێک پێش ئەنجامدانی بڕیارەکەی لەبارەی دونیاوە، بە ڕاسکۆلنیکۆڤی وتبوو با ڕازومیخین ئاگاداری دونیا بکات "لە ڕاستیدا پێدەچوو وەک ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی، زیاتر ئەو قسەیەم بۆ خۆنواندن کردبێت. زۆڵێکە بۆ خۆی، ئەم ڕاسکۆلنیکۆڤە! ڕەنگە لە ئاییندەدا لێزانتر دەربچێت،

دیاره لەو کاتەدا کە هەوای لاویەتی لەسەریدا نامێنێت، وەلێ هەنووکە زۆر دڵی بە ژیان خۆشە. لەم لایەنەوە هەموو خەڵکیی بەدن. نەفرەتیان لێبێت، ئەوە کێشەی خۆیانە بە من چی! چاویان دەردەهات!" خەوی لێنەدەکەوت، وردەوردە تارمایی دونیای لێدەرکەوت و لەرزی لێهات. کە کەمێک هاتەوە سەر خۆی، وتی: "نا، ئیتر ئەمە بە دەردی من ناخوات، دەبێت بیر لە شتێکی تر بکەمەوە. سەیر و پێکەنیناوییە! هەرگیز بەرانبەر بە هیچ کەسێک ڕقئەستوور نەبووم، تەنانەت هەرگیز حەزم بە تۆڵەسەندن نەکردووە، ئەمەیش کارێکی خراپە، حەزم لە شەڕ نەکردووە و تووڕەیش نەبووم، ئەمەیشیان هەر نیشانەی خراپییە، بە ڕاست ئەمجارەیان چ جۆرە بەڵێنێکم پێدا، نەفرەت لە شەیتان! بەڵام شیمانەی ئەوە زۆر بوو کە بمکات بە پیاوێکی تر.." دیسانەوە بێدەنگ بوو، کەوتە دانەجیرە، تارمایی دونیا دووبارە هاتەوە سەرینی، دونیا کە دوای تەقاندنی یەکەم فیشەک، تەواو تۆقیبوو، دەمانچەکەی هێنابووە خوارێ و وەک مردوو تەماشای ئەمی دەکرد، بۆ ئەم ئەوە دەرفەتێک بوو کە هیچ نەبێت دووجار لە ئامێزی بگرێت، ئەگەر ئەم نەبووایە، ئەو بەرگرییشی نەدەکرد. بیری کەوتەوە چۆن لەو چرکەساتەدا دڵی بەو کیژە سووتا و هەناوی جۆشی خوارد.. ئاە.. نەفرەت لە شەیتان! ئەم بیرۆکانە چین، پێویستە لێیان دوور بکەومەوە، دوور!

وردەوردە خەریک بوو ئاگای لە خۆی دەبڕا، لەرزوتاکەی کەم دەبووەوە. لەناکاوێکدا، شتێک لەژێر لێفەکەوە بەسەر دەست و قاچیدا ڕای کرد، ڕاپەڕی و وتی: "ئاە، نەفرەت لە شەیتان، وا بزانم مشکە، چونکە گۆشتەکەم لەسەر مێزەکە داناوە". هیچ حەزی لەوە نەبوو لێفەکە لادا و هەستێ و سەرمای بێت. بەڵام دیسانەوە شتێک بەسەر

پێیەوە کەوتەوە ڕاکردن، خێرا لێفەکەی لابرد و مۆمەکەی داگیرساند. تایەکە لەرزی لێهێنابوو، بەسەر جێگاکەیدا نووشتایەوە تا بزانێت چییە. هیچی نەبینی، لێفەکەی تەکاند و لەپڕا مشکێک کەوتە ناو جێگاکەی. سڤیدریگایلۆڤ ویستی مشکەکە بگرێت، مشکەکە لەسەر تەختەکە نەدەهاتە خوارێ، بە هەموو لایەکدا گێژی دەخوارد، لەژێر پەنجەیەوە دەیفرتاند و بە قۆڵیدا هەڵدەگەڕا، لەپڕێکدا خۆی لەژێر سەرینەکەدا شاردەوە، سەرینەکەی فڕێ دایە سەر زەوی. هەستی کرد شتێک چووە بنهەنگڵیەوە و بەسەر لەشیدا کەوتە ڕاکردن، پاشان چووە ژێر کراسەکەیەوە و لەوێوە بەرەو پشتی ڕۆشت. تەزوویەکی تووڕەیی بە لەشیدا گەڕا و لە خەو ڕاپەڕی.
ژوورەکەی تاریک و لەسەر جێگاکەی نوستبوو، لێفەکەیشی وەک پێشتر لە خۆی پێچابوو، لەژێر پەنجەرەکەوە با لوورەی دەهات. بە بێزارییەوە بیری کردەوە: "چ خەونێکی گەڕۆڵە!"
سڤیدریگایلۆڤ هەستا، لە پاڵ تەختی نووستنەکەدا، پشتی لە پەنجەرەکە کرد و دانیشت، بە خۆی وت: "وا چاکترە هەر نەنووم" لەلای پەنجەرەکەوە هەستی بەسەرما و شێ کرد، بێ ئەوەی لە شوێنەکەی هەستێت، لێفەکەی لە خۆی ئاڵاند و مۆمەکەی داگیرساند. بیری لە هیچ نەکردەوە و نەیشیدەویست بیر بکاتەوە، وەلێ گەلێک وێنای جۆربەجۆری بە بەرچاودا دەگوزەری، بیرۆکەی پچڕپچڕی بێسەرەتا و بێکۆتایی. وەک ئەوە وابوو لە حاڵەتی خەون و بێداریدا بێت. دەشێت سەرما و تاریکی و شێ، یان ئەو بایەی لەژێر پەنجەرەکەوە دەیلووراند و درەختەکانی ڕادەوەشاند، حاڵەتێکی خەونیی، یان ئارەزوویەکی تەژی تیا دروست کردبێت. لەبەرچاویدا هەمیشە گوڵ بەرجەستە دەبوو، دیمەنێکی ناوازەی جەژنێکی ڕووناک

و گەرم، زۆر گەرمیش. ئەو ڕۆژە لە ڕۆژی جەژنی "گیانی پاک"[١] دەچوو. کۆشکێکی شکۆمەندی دەوڵەمەندانە، لە جۆری کۆشکە ئینگلیزییەکان کە لەناو گوڵجاڕێکی پڕ لە بۆنی خۆشدا نقوم بووبوو، دەوروبەری کۆشکەکە باخچەی ڕەنگاوڕەنگ و لە پێشیشیدا ڕووەکی جۆراوجۆری هەڵزناوی پڕ لە گوڵی سوور ڕازاندبوویەوە. بە درێژایی نەردەوانەکە ڕوناک و فێنک و فەرشی زۆر جوانی لێداخرابوو. گوڵدانی چینی گوڵی زۆر دەگمەنی تیا دانرابوو، ئەو باقە نێرگزە سپی و ناسکانەی کە لە گوڵدانە پڕ لە ئاوەکاندا بوون بەتایبەتی سەرنجی سڤیدریگایلۆڤیان ڕاکێشابوو، گوڵە بۆندارەکان، سەری خۆیان لە قەدی درێژ و سەوزەوە بەرەوخوار لار کردبووەوە. سڤیدریگایلۆڤ حەزی دەکرد لەو گوڵانە دوور نەکەوێتەوە. لە پلیکانەکانەوە سەرکەوت و چووە تەلارەکەوە. لەوێشدا، لە هەموو گۆشەیەکی تەلارەکەدا، لە بەردەم پەنجەرەکاندا، لە پاڵ ئەو دەرگا کراوانەوە کە بەسەر هەیوانێکی گەورەدا دەیانڕوانی و خودی هەیوانەکەیش هەموو پڕ لە گوڵ بوو. زەویی ژوورەکانیش بە گیایەکی تازە و بۆنخۆش فەرش کرابوو، پەنجەرەکان کرابوونەوە، شەماڵێکی خۆش و فێنک دەهاتە ژوورەکەوە. چۆلەکە لەژێر پەنجەرەکاندا جیکەجیکیان دەکرد، لە ناوەڕاستی تەلارەکەدا، لەسەر مێزێک کە بە ئەتڵەس داپۆشرابوو، تابووتێک دەبینرا، لەناو تابووتەکەدا پارچە ئاوریشمێکی سپی و ئەستوور بە قەدکراوی داخرابوو، دەوری تابووتەکە گوڵێکی زۆری پێدا هاتبووە خوارێ. کچۆڵەیەک بە بەرگی تۆڕی سپییەوە کە توند دەستی لەسەر سنگی دانابوو —ئەو دەستانەی دەتوت لە مەڕمەڕ

---

[١] جەژنی مەسیحییەکانە، نزیکەی پەنجا ڕۆژ دوای جەژنی هەستانەوەی عیسایە.

تاشراون- له تابووته‌كه‌دا نوقمی گوڵ بوو. قژه په‌خش و زه‌ردباوه‌كه‌ی ده‌توت ئاورنگی لێكه‌وتووه، تاجێكی گوڵی سووریان له‌سه‌ر نابوو، لایه‌كی ده‌موچاوی كه وه‌ك سه‌هۆڵ به‌ستبووی، ئه‌ویش هه‌ر له مه‌ڕمه‌ڕی تاشراوی ده‌كرد، وه‌لێ زه‌رده‌خه‌نه‌ی لێوه هه‌ڵبزڕكاوه‌كانی خه‌مێكی زۆری بێكۆتایی نه‌ك منداڵانه به‌ڵكو شكۆمه‌ندییه‌كی تایبه‌تیان ده‌دایه.
سڤیدریگایلۆڤ ئه‌م كچۆڵه‌یه‌ی ده‌ناسی، پاڵ تابووته‌كه نه وێنه‌ی پاكیزه‌كان و نه مۆمی داگیرساو هه‌بوون، هیچ سروود و دروودێكیش نه‌ده‌بیسترا. كچۆڵه‌كه خۆی له ئاودا خنكاندبوو، له چوارده ساڵییش تێنه‌په‌ڕیبوو. به‌ڵام له‌و ته‌مه‌نه‌دا وا دڵیان شكاندبوو، كه په‌نا بۆ مردن به‌رێت. سووكایه‌تێكی پێكرابوو، كه تا هه‌تایه دڵی بناڵێنێ، سووكایه‌تییه‌ك كه ویژدانی منداڵانه‌ی و گیانه فریشته‌ئاساكه‌ی به ناهه‌ق پڕ له ترس و وێرانی بكات. كه‌س نه‌بوو گوێ له‌و ئاهوناڵه نائومێدانه‌یه‌ی بگرێت، كه له شه‌وێكی تاروماردا، له نێو تاریكایی و سه‌رما و شێی سه‌ره‌تای به‌هار و گڤه‌گڤ و لووره‌لووری زریاندا ون بووبوو.
سڤیدریگایلۆڤ به‌ئاگا هاته‌وه، له‌ناو جێگاكه‌ی هه‌ستا و به‌ره‌و لای په‌نجه‌ره‌كه ڕۆشت. كلۆمه‌كه‌ی دۆزییه‌وه و كردییه‌وه. بایه‌كی توند و تووڕه هێرشی هێنایه ناو ژووره بچووكه‌كه‌یه‌وه، ده‌موچاوی و سنگی كه ته‌نیا كراسێكی له‌به‌ردا بوو، كه‌وتنه به‌ر پروشه‌ی به‌فر، ژێر په‌نجه‌ره‌كه له شتێكی وه‌ك باخ ده‌چوو، باخێك كه به ڕۆژ گۆرانیی تیا بوترێت و میوانه‌كان له‌سه‌ر مێزه چكۆڵه‌كان چا بخۆنه‌وه، ئێستا له دره‌خت و ده‌وه‌نه‌كانه‌وه ئاو ده‌هاته ناو په‌نجه‌ره‌كه‌وه، دنیا له تاریكیدا له ژێرزه‌مین ده‌چوو. ته‌نانه‌ت ئاسان نه‌بوو بزانیت ئه‌و تارماییانه

چین کە لە شت دەچوون. سڤیدریگایلۆڤ کە چەمابووەوە و ئانیشکی دادابووە کەنار پەنجەرەکە، بۆ ماوەی پێنج دەقیقە، بێ ئەوەی لابچێت، تەماشای تاریکییەکەی دەکرد. لەو شەوە ئەنگوستەچاوەدا، لەناکاوێکدا، دەنگی تۆپبارانێک هات و دووبارەیش بووەوە.
سڤیدریگایلۆڤ لە دڵی خۆیدا وتی: "ئەمە بۆ ئاگادارکردنەوەیە، ئاو سەردەکەوێت و بەرەبەیان ئەو شوێنانەی لە شەقامەکاندا نزمن، دایدەپۆشێت، سەرداب و ژێرزەمینەکان پڕ دەبن لە ئاو، ئەوسا جرج دەکەونە سەرئاو و خەڵکیش لە نێو ئەو باوبۆرانەدا دەکەونە بۆڵەبۆڵ و جوێندان، خرتکەوپرتکە تەڕەکانیان دەگوێزنەوە بۆ قاتی سەرەوە، بەڕاست سەعات چەندە؟"
لەو کاتەدا کە سڤیدریگایلۆڤ لەم بیرکردنەوەیەدا بوو، لەو نزیکانەوە سەعاتێکی دیوار، لەسەرخۆ و بە توندی سێ جار لێیدا، "ئا، سەعاتێکی تر دنیا ڕووناک دەبێتەوە، چاوەڕێی چیم؟ هەر ئێستا دەڕۆمە دەرەوە، ڕاست بەرەو باخەکە، لەوێ شەخەڵێک هەڵدەبژێرم کە باران زۆر تەڕی کردبێت، هەر ئەوەندەی شانی مرۆڤی بەربکەوێت، ملیۆنان دڵۆپەئاو بەسەریا بڕژێت.." لە پەنجەرەکە دوور کەوتەوە و دایخست، مۆمی داگیرساند، چاکەت و پاڵتاوەکەی لەبەر کرد، کڵاوی لەسەر نا، بە مۆمەکەوە هاتە ڕاڕەوەکە تا ئەو کابرا شرۆڵەیە بدۆزێتەوە، کە لە پەنا و پەسێر و ناو خاکەڕۆکەکاندا نووستووە. بۆ ئەوەی پارەی میوانخانەکەی بداتێ و بڕوات "باشترین کاتە، لەم دەرفەتە چاکتر نارەخسێت".
ماوەیەکی زۆر بە ڕاڕەوە درێژ و باریکەکەدا ڕۆیشت و کەسی نەبینی، ویستی بە دەنگی بەرز هاواری یەکێک بکات، لەپڕێکدا، لە سووچێکی تاریکدا، لە نێوان دۆڵابێکی کۆن و دەرگایەکدا، شتێکی

سەیری بەرچاو کەوت، شتێکی زیندوو. بە مۆمەکەوە دانەوی، منداڵێکی بینی کچێکی تەمەن پێنج ساڵ جلێکی تەڕوسپیی وای لەبەردا بوو، کە لە پەڕۆی حاجەت پاککردنەوە دەچوو، کچەکە هەڵدەلەرزی و دەگریا، لەوە نەدەچوو لە سڤیدریگایلۆڤ ترسابێت، بەڵکو بە سەرسامییەکی کرەوە بەدەم هەنسکدانەوە چاوە ڕەشەکانی خۆی تێبڕی، وەک ئەو منداڵەی کە بۆ ماوەیەک گریاوە و ئیدی لە گریان کەوتووە، ئاسوودەیی تێگەڕاوە و لەپڕێکدا کەوتۆتەوە هەنسکدان. ڕووی کچە منداڵەکە هەڵبزڕکابوو، لە سەرما وشک هەڵاتبوو، بەڵام چۆن گەیشتۆتە ئێرە؟ دیارە خۆی لێرەدا شاردۆتەوە و بە درێژایی شەوەکە نەنووستووە.

سڤیدریگایلۆڤ کەوتە پرسیارلێکردنی. کچەکە ئاهێکی تێگەڕا، خێرا بە زمانە منداڵانەکەی خۆی شتێکی بۆ باس کرد، لە قسەکانیدا چەند وشەیەکی دەربارەی دایکی کرد: (دایە، من ئەکوشێت) دایکم دەمکوژێت چونکە فنجانەکەم "شقانوە" شکاندووە. کچە منداڵەکە لە قسەکردن نەدەکەوت، بە زەحمەت لە هەموو چیرۆکەکەی دەگەیشتیت: کە دایکی خۆشی ناوێت و پێدەچێت دایکی چێشتلێنەری ئەوێ و هەمیشە مەستیش بێت، ئەمەندەیشی لە کچەکەی داوە، کە تۆقاندوویەتی، دیار بوو کچەکە فنجانی دایکی شکاندووە و لە ترساندا هەر ئەو شەوە هەڵاتووە، ماوەیەک لە باخەکەدا ماوەتەوە، لەژێر باراندا، خۆی شاردۆتەوە، پاشان پەنای هاوردۆتە ئێرە و لە پشت دۆڵابەکەوە بە دزییەوە خۆی شاردۆتەوە، هەموو شەوەکە لەم سووچەدا، بەگریان و لەرزینەوە، لە شێ و تاریکی و لە ترسی ئەوەی کردوویەتی و دەبێت لێدانێکی چاک بخوات، دانیشتووە. سڤیدریگایلۆڤ گرتییە باوەشی و هێنایە ژوورەکەی خۆی. لەسەر

تەختەکەی داینا و ڕووتی کردەوە. پێڵاوە دڕاوەکانی کە بەبێ گۆرەوی لە پێیدا بوون، ئەمەندە تەڕببوو، دەتوت هەموو شەوەکە لە قوڕاودا بووە. دوای ڕووتکردنەوەی لە ناو جێگاکەیدا خەواندی و لێفەکەی وا بەسەریدا کێشا، کە تەنانەت سەریشی بە دەرەوە نەما، منداڵەکە زوو خەوی لێکەوت، دوای ئەنجامدانی ئەم کارانە سڤیدریگایلۆڤ بە ڕوویەکی ترشوتاڵ و هەستێکی تاروتووڕەوە. لەپڕا بە خۆی وت: "دیسانەوە کارم بۆ خۆم دۆزییەوە! کەریەتی!" مۆمەکەی بە ڕقەوە هەڵگرت تا هەرچۆنێک بووە کابرا شڕۆڵەکە بدۆزێتەوە و زووتر دەربازی بێت. لە کاتی کردنەوەی دەرگاکەدا بیرێکی ناخۆش بەرۆکی گرتەوە: "ئەی کچۆڵەکە!" گەڕایەوە تا بزانێت خەوتووە یان نا و چۆنیش خەوتووە.

بە ئاستەم لێفەکەی لابرد، کچەکە لە شیرینەخەودا بوو، ژێر لێفەکە گەرم داهاتبوو، گۆنا ڕەنگپەڕیووەکەی جارانی سوور داگەڕابوو، بە لایەوە سەیر بوو، سوورییەکەی لەوە تۆخترو زیاتر بوو کە ئاسایی بە دەموچاوی منداڵانەوەیە، بە خۆی وت "سووریی تالێهاتنە" ڕاست وەک ئەوە وابوو پێکێک شەرابت دابێتێ. لێوە تەنکە سوورەکانی دەسووتان. بەڵام یانی چی؟ لەپڕێکدا وای هاتە بەرچاو گەمژۆڵی درێژ و ڕەشی کچەکە دەجووڵێ و تەکان دەخوات، وەک ئەوەی ڕوانینێکی سووسەکەر و بەفێڵ لەژێر مژۆڵەکانەوە کە لە هی منداڵ ناچێت، چاوی لێدابگرێت. پێدەچوو کچۆڵەکە نەنووستبێت و خۆی کردبێتە خەوتوو، بەڵێ، هەروایە، لێوە چکۆڵەکانی بە زەردەخەنە کرانەوە، لالێوی جووڵەی تێکەوت، وەک بیەوێت خۆی بگرێت و پێنەکەنێت. وەلێ وا ئێستا ئیتر خۆی پێنەگیرا و کەوتە پێکەنین، پێکەنینێکی دیار و ئاشکرا. لەو دەموچاوەدا کە لە دەموچاوی منداڵ نەدەچوو، هەست

به چاوقایمی و بێئابڕوویی دەکرا، ئەمە بێڕەوشتییە، ئەمە ڕووی ژنێکی جوانە لە ژنە خۆفرۆشەکانی فەڕەنسا، ژنێکی وەک "کامیلیا"[1] ئیدی بێشەرمانە نیگایەکی ئاگرینی تێدەگرێ، بەرەو لای خۆی ڕادەکێشێ و پێدەکەنێ.. شتێکی گەلێک قێزەون و سووک لە پێکەنین و چاوانی ئەو منداڵەدا دەردەکەوت. لەو دەموچاوەیشدا کە ناپاکی و بێڕەوشتیی لێدەچووڕا. سڤیدریگایلۆڤ بە سەرسامییەوە کەوتە ورتەورت: "چۆن؟ منداڵێکی تەمەن پێنجساڵانە! ئەمە.. چ مانایەکی هەیە؟" وەلێ وا کچۆڵەکە لە ناکاوێکدا، بەو ڕووە داگیرساوەیەوە، خۆی بۆ هەڵدەنێ و دەستی بۆ درێژ دەکات. سڤیدریگایلۆڤ لەو کاتەدا کە دەستی بۆ لێدانی بەرز کردەوە، هاواری لێهەستا: "هەی نەفرەتی!" و لەو چرکەساتەدا لە خەوەکەی ڕاپەڕی.

هێشتا لەسەر تەختی خەوەکە ڕاکشابوو، لێفەکەی لە خۆی ئاڵاندبوو، مۆمەکە نەدەسووتا، لە پەنجەرەکەوە کازیوە لە دەرکەوتندا بوو. سڤیدریگایلۆڤ وتی: "ئەمشەو هەمووی مۆتەکە بوو".

بە تووڕەیییەوە نیوە خێزێکی بۆ کرد، هەستی کرد هەموو ئێسکەکانی شکاون و دێشێن. دەرەوە تەمتومانێک دایگرتبوو کەس هیچی نەدەبینی. نزیک سەعات پێنج بوو. خەوێکی باشی کردبوو. هەستا، چاکەت و پاڵتاوە هێشتا تەڕەکەی لەبەر کرد. دوای ئەوەی دەستی بەر دەمانچەکەی گیرفانی کەوت، دەری هێنا و زامنی کرد. پاشان دانیشت، دەفتەرێکی یاداشتی لە گیرفانی دەرهێنا، لەسەر یەکەم لاپەڕە

---

[1] چیرۆکی (غادە کامیلیا)ی ئەلکسەندەر دۆماسی کوڕ، (١٨٤٨) و ئەو شانۆگەریەی بەم ناوەوە ناونراوە، لەو کاتەدا لە ڕووسیادا گەلێک ڕەواجی هەوبوە، ناوی کامیلیا وەک لەشفرۆشێکی بە نامێ هاتووە. —و—

کە زوو دەهاتە بەرچاو، بە خەتێکی گەورە چەند دێڕێکی نووسی، دوای ئەوەی خوێندییەوە، لە کاتێکدا کە پاڵی بە مێزەکەوە دا، کەوتەوە بیرکردنەوە. دەمانچە و دەفتەری یاداشتەکە هەر لەوێدا و لە نزیک ئانیشکییەوە کەوتبوون، مێشە لە خەو هەستاوەکان، پەلاماری ئەو گۆشتەی سەر مێزەکەیان دەدا کە هیچی لێنەخورابوو. ماوەیەک تەماشای کردن، دوایی بە دەستی ڕاستی کە ئازاد بوو، ویستی مێشێک بگرێت، ماوەیەک خۆی پێوە خەریک کرد، بەڵام هیچی بۆ نەکرا، پاشان کە لە خۆی بەئاگا هات چۆن سەرگەرمی کارەکە بووە، هاتەوە سەر خۆی و تەزوویەکی پێدا هات، هەستا و بڕیاری چوونە دەرەوەی دا، دوای دەقیقەیەک چووە سەر شەقامەکە، تەمتومانێکی شیرئاسا لەسەر شارەکە بڵاو بووبووەوە.
سڤیدریگایلۆڤ بەسەر پیادەڕەوە دارینە پیس و لینجەکەدا دەڕۆشت، بەرەو ڕووباری "نیڤای بچووک" دەچوو. لەبەرچاویدا "نیڤای بچووک" کە بە درێژایی شەو لافاوی کردبوو، هەروەها دوورگەی "پترۆڤسکی" و تووڵەڕێگە و گژوگیای تەڕ و درەخت و شەخەڵەکان، دیمەنێکی دڵگیریان هەبوو. لە دواییدا هەمان شەخەڵی پێشوو دەرکەوت، بە تووڕەییەوە کەوتە تەماشاکردنی ماڵەکان بۆ ئەوەی خۆی لەو بیرکردنەوانە بدزێتەوە، نە ڕێبوار و نە گالیسکەیەک لەسەر شەقامەکە دەبینرا، خانووە بچووکە دارینەکان کە زەرد داگەڕابوون، لەگەڵ پەنجەرە داخراوەکاندا پیس و داماو دەیاننواند، سەرما و شێ وا چووبوونە ناو لەشیەوە کە لەرزی لێهاتبوو، کە جارجارە نووسینی دووکانەکانی دەبینی بە وردی دەیخوێندنەوە، تا گەیشتە کۆتایی شەقامە بە دار فەرشکراوەکە، سڤیدریگایلۆڤ لەوێدا خانوویەکی گەورەی بە بەرد دروستکراوی بینی. سەگێکی پیسی گەڕۆڵ کە کلکی

لە ناوگەڵی نابوو، لە پێشییەوە دەڕۆشت. پیاوێکی تەواو مەست کە لە مردووی دەکرد و پاڵتاوی لەبەردا بوو، درێژ درێژ لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا کەوتبوو.

سڤیدریگایلۆڤ سەیرێکی کرد و تێپەڕی. لەلای چەپەوە بورجێکی بەرزی لێدەرکەوت، بیری کردەوە: "هە، شوێنێکی باشە، ئیتر بۆ بڕۆم بۆ دوورگەی "پتروڤسکی"؟ هیچ نەبێت شایەتێکی ڕەسمی لێیە.." بەم بیرۆکە تازەیەی خۆی زەردەخەنەیەکی هاتێ. پاشان بەرەو کۆڵانی.. دایکێشا.

خانووە بەرزەکە لە وێدا بوو، لە پاڵ دەرگا داخراوەکانیدا، پیاوێکی بالاناوەند کە پاڵتاوێکی سەربازیی ڕەنگ خۆڵەمێشی لەبەردا و کلاوێکی مسینی لە بابەتی کلاوی "ئاخیل"[1]ی لەسەردا بوو، شانی بە دەرگاکەوە دابوو. تەماشایەکی خەواڵوانەی سارد و بێبایەخی سڤیدریگایلۆڤی کرد کە لێی نزیک کەوتبووەوە. بە دەموچاویەوە هەمان ئەو خەم و ڕاڕاییە دەبینرا، کە زۆر لە کۆنەوە، بە ڕووی گشت جوولەکەکانەوە، بێ ئاوارتەکردن، دەبینرا. هەردووکیان، سڤیدریگایلۆڤ و کابراکە، بۆ ماوەیەک لە یەکتر ڕامان. سەرئەنجام ئاخیل بەلایەوە ئاسایی نەبوو کە کەسێکی لەخۆبەئاگا سێ هەنگاو لەولایەوە بەرانبەری وەستابێت، چاوی تێبڕیبێت و هیچ نەڵێت. کابرا بێ ئەوەی بجوڵێت، یان خۆی تێک بدات. پێی وت:

- ها: لێرە چی دەکەیت؟

---

[1] لە کەسایەتییە سەرەکیەکانی ئەلیازەی هومیرۆسە. لە شەڕی تەروادەدا هیکتۆری کوشت، خۆی تەنیا بەوە دەکوژرا کە تیرێکی ژەهراوی لە پاژنەی بدرێت و باریس ئەمەی کرد. ناوی ئاخیل ڕەمزی ئازایەتییە. -و-

سڤیدریگایلۆڤ وەڵامی دایەوە:
- هیچ، براله، سڵاو.
- ئێرە شوێنی ئەوە نییە.
- من برادەر، بەرەو وڵاتێکی دوور ئەچم.
- بۆ وڵاتی دوور؟
- بۆ ئەمریکا.
- بۆ ئەمریکا؟
سڤیدریگایلۆڤ دەمانچەکەی دەرهێناو ئامادەی کرد، ئاخیل برۆی سەرخست و بە زەحمەتێکەوە وتی:
- ئەم .. یا .. یارییە یانی چی، ئەمە ئەو جێگایە نییە.
- ئاخر بۆ جێی نییە؟
- چونکە جێی نییە.
- باشە، برادەر، بۆ من جیاوازیەکی نییە. ئێرە شوێنێکی باشە، ئەگەر پرسیاریان لێ کردیت، بڵێ چووە بۆ ئەمەریکا.
سڤیدریگایلۆڤ دەمانچەکەی خستە سەر لاجانگی ڕاستی خۆی، ئاخیل شڵەژا، چاوی لە جاران زیاتر کرایەوە و وتی:
- ئاخر، لێرەدا قەدەغەیە.. ئێرە جێگای ئەوە نییە.
سڤیدریگایلۆڤ پەنجەی بەپەلە پیتکەکەدا نا.

## ٧

لە ئێوارەی هەمان ڕۆژدا، دوای سەعات شەش، ڕاسکۆلنیکۆڤ چوو بۆ ماڵی دایکی و خوشکی، واتا بۆ ئەو ماڵەی کە ڕازومیخین لە ئاپارتمانەکەی باکالایڤدا بۆی گرتبوون، دەبوو لە شەقامەکەوە بچێتەوە سەر پلیکانەکان. ڕاسکۆلنیکۆڤ هەنگاوی دوودڵیی دەنا، لەوە

دەچوو لە چوونە ژوورەوە ڕاڕا بێت، بڕوات؟ یان نا؟ بەڵام بڕیاری نەگەڕانەوەی دابوو. بە خۆی وت: "بەهەرحاڵ، ئەوان تا ئێستا هیچیان نەزانیووە، دەمێکیشە بەوە ڕاهاتوون کە من بە پیاوێکی سەیر و نامۆ بزانن.." جلەکانی سەریان بە سوور دینا، سەرتاپای پیس و چڵکن، هەموو شەوەکە لەژێر باراندا و بە تەواوی قوڕ و چڵپاوی پیا هەڵپژابوو. دەموچاوی لە شەکەتی و خراپی ئاووهەوا و داهێزرانی جەستە و شەڕی بیستوچوار سەعاتەی لەگەڵ خۆیدا تا ڕادەیەک بڕستی لێبڕیبوو. خوا خۆی دەیزانی هەموو شەوی ڕابوردووی چۆن بە تەنیا و لە کوێ گوزەراندبوو. بەڵام لەباتیی ئەوە بڕیاری ئەنجامدانی کارەکەی دابوو.

لە دەرگایدا، دایکی کردیەوە، دونیا لە ماڵ نەبوو، کارەکەرەکەیش هەر لەوێ نەبوو. لە سەرەتاوە پولخێریا ئەلکساندرۆڤنا خۆشی و سەرسامی زمانیان لەگۆ خست. پاشان دەستی گرت و بردییە ژووری، خۆشحاڵییەکەی ئەمەندە زۆر بوو، کە زمانی خستە تورتەتورت:

- باشە، ئاخری هەر هاتی. ڕودیا گیان، تووڕە مەبە کە ئاوا گەمژانە، یەعنی بە گریانەوە پێشوازیم لێکردیت. لە ڕاستیدا من پێدەکەنم، ناگریم، وا دەزانیت دەگریم؟ نا، خۆشحاڵم، تەنیا ئەوەیە کە من خوویەکی خراپم هەیە و فرمێسکم لە خووە دادەبارێت. لەوەتەی باوکت مردووە، من بۆ هەموو شتێک گریانم دێت. دابنیشە ئازیزم. بێگومان ماندوویت، خۆم دەزانم، بۆ ئەوەندە چڵکنوپلکنیت!

ڕاسکۆلنیکۆڤ وتی:

- دایکە، بە درێژایی دوێنێشەو لەبەر باران بووم..

پولخێریا ئەلکساندرۆڤنا قسەکەی پێبڕی:

- نا، نا، وا دەزانیت هەر بە هەمان ڕەوشتی کۆنی ناجۆری خۆم لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکەم؟ نا، مەترسە، ئێستا هەموو شتێک دەزانم، فێری داب و نەریتی ئێرە بووم. خۆیشم دەزانم ئەمەی ئێرە چاکترە، بۆ هەمیشە بە خۆم وت: من هەقم بەسەر بیروباوەڕی تووە چییە، بۆ لێت بپرسم؟ خوا دەزانێت چ نەخشە و کارێکت لەسەردایە و چ بیرێکت بە مێشکا دێت: بۆ دەبێت من لە بنهەنگڵت بکوتم تا بزانم بیر لە چی دەکەیتەوە! ئاخر.. ئای خودایا! من ئەم هەموو بێنەوبەردەیەم لە چی، شێتم! ڕودیا، ئەو وتارەی لە گۆڤارەکەدا نووسیبووت، بۆ جاری سێیەم خوێندمەوە، دیمیتری پرۆکفیچ بۆی هێنام، کە بینیم دامام، بیرم کردەوە: "چەندە گەوجم!.. چ بیرێک ئەوی سەرقاڵ کردووە! مەسەلەکە بە تەواوی ئاشکرایە، بیرمەندەکان هەمیشە وان، لەوانەیە بیری تازەی لەسەردا بێت و سەرقاڵی سەروبنکردنیان بێت، کەچی من بێم و بێزاری بکەم و ئازاری بدەم!" دەزانیت، من وتارەکەت دەخوێنمەوە، بەڵام زۆر شتی لێ تێناگەم، ئەمە سەیر نییە، چونکە من لەو ئاستەدا نیم.
- دایکە گیان، وتارەکەم پیشان بدە.
ڕاسکۆلنیکۆڤ گۆڤارەکەی وەرگرت و چاوێکی خێرای بە وتارەکەی خۆیدا خشاند، هەرچەندە ئەمە لەگەڵ حاڵوبارە هەنووکەییەکەیدا زۆر جیاواز و ناجۆر بوو، بەڵام هەمان ئەو هەستە خۆش و شیرینەی پێدا کاتێک نووسەرێک بۆ یەکەمجار بەرهەمی چاپکراوی دەبینێت، بێجگە لەوەی ئەگەر نووسەرەکە تەمەنیشی لە بیست و سێساڵیدا بێت. بەڵام ئەمە تەنیا چرکەساتێکی خایاند، دوای خوێندنەوەی چەند دێڕێک، برۆی هێنانەوە یەک و وەڕسییەکی توند دڵی گوشی. هەموو

دژواری و ململانێ دەروونییەکانی ئەم چەند مانگەی دوایی خۆی هاتەوە بیر، بێزار بوو، بە تووڕەییەوە وتارەکەی لەسەر مێزەکە دانا.

- بەڵام ڕودیا، من بەم هەموو نەزانینەی خۆمەوە دەتوانم بڵێم تۆ لە ئاییندەیەکی نزیکدا، ئەگەر نەبیتە کەسایەتییەکی زۆر گەورەی زانستی، دەبیتە یەکێک لە هەرە دیارەکانی ئەو بوارە. لەگەڵ ئەمانەیشدا چەند سووکن ئەوانەی کەوا بیر دەکەنەوە تۆ تێک چوویت و ئەقڵت لەدەست داوە. هە، هە، هە! ئاخر تۆ نازانیت، بەڵام ئەمە بیرکردنەوەی ئەوانە. کرمە قێزەونەکان! جا ئەوان چی لە ئەقڵ دەزانن! ئاخر، دونیایش، دونیایش خەریک بوو بڕوا بکات، باشە ئەمە دەکرێت؟ بەڵێ، باوکی خوالێخۆشبویشت دووجار وتاری بۆ گۆڤارێک نارد، جارێکیان شیعرەکانی (من دەفتەری شیعرەکانیم لایە، ڕۆژێک پیشانتی دەدەم) جارێکی تر چیرۆک، من خۆم داوام لێکرد پاکنووسی بکەم، نازانیت چەند پارامەوە بەڵکو بۆی بڵاو بکەنەوە، وەلێ نەیانکرد، دەزانیت ڕودیا، من شەش حەوت ڕۆژ لەمەوبەر، کە تەماشای جل و ژیان و خواردن و ماڵەکەتم کرد، خەریک بوو دڵم بتەقێت. بەڵام ئێستا دەزانم کە ئەمجارەیشیان چەندە گەوج بووم، چونکە ئەگەر بتەوێت، دەتوانیت بەو ئەقڵ و توانایەوە هەموو شتێک بەدەست بهێنیت. وەلێ دیارە تۆ حەزت بەوە نییە، کاری زۆر گەورەترت لە پێشە..

- دایکە، دونیا لە ماڵەوە نییە؟

- نەخێر، ڕودیا، زۆربەی کات لە دەرەوەیە و من بە تەنیا بەجێ دەهێڵێت، دیمیتری پرۆکفیچ خوا تەمەنی درێژ بکات، سەرم لێدەدات، لەگەڵمدا دادەنیشێت و زۆرت باس دەکات. ئازیزەکەم، تۆی خۆش دەوێت، زۆریش ڕێزت لێدەگرێت. لەبارەی خوشکتەوە، نامەوێت بڵێم

ڕێزم لێناگرێت، چونکە ئەو خوویەکی تایبەتی خۆی هەیە و منیش خووی خۆم، بەڵام ئەو زۆر نهێنی لە من دەشارێتەوە، قەیدی نییە، من هیچم نییە لە ئێوەی بشارمەوە. لەوە دڵنیام کە دونیا زۆر وریا و زرنگە، من و تۆیشی زۆر خۆش دەوێت.. لەگەڵ ئەمانەیشدا نازانم کۆتایی بە چی دەگات. باشە، ڕودیا، بەم هاتنەت تەواو دڵخۆش بووم، بەڵام ئەو درەنگ کەوتووە، کە هاتەوە پێی دەڵێم، دەڵێم کاکت هات و تۆ لێرە نەبوویت، ئەی تۆ لە کوێ بوویت؟ ڕودیا، زۆر نازمان هەڵمەگرە، ئەگەر توانیت سەرمان بدە، ئەگەر نەتتوانی چار نییە، چاوەڕێت دەبم، ئاخر، دەزانم تۆ منت زۆر خۆش دەوێت، ئەوەندە بۆ من بەسە، بەرهەمەکانت دەخوێنمەوە، لەبارەتەوە شت لە کەسانی دی دەبیستم، خۆیشت جارجارە سەرێک دەدەیت تا هەواڵم بپرسیت، ئیدی لەمە زیاتر چی؟ ئێستایش بۆ ئەوە هاتوویت دڵی دایکت بدەیتەوە، ئەمە بە چاکی دەبینم..

لێرەدا پولخێریا ئەلکساندرۆڤنا لەپڕێکدا دایە گریان، وەلێ زوو لە جێگاکەی هەستا و هاواری کرد:

- دیسانەوە کەوتمەوە گریان.. گوێ مەدەرێ، ئیدی گەوجایەتییەکەی خۆمە، باشە بۆ دانیشتووم؟ قاوەمان هەیە و بۆم نەهێناویت.. بڕوانە خۆپەسەندیی پیرێژنانە یانی چی! هەر ئێستا، ئێستا.

- دایە گیان، لێگەڕێ، من ئێستا دەڕۆم، بۆ ئەوە نەهاتووم، تکات لێدەکەم گوێم لێبگرە.

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا بە شەرمەوە لێی نزیک بووەوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لەناکاوێکدا زۆر بە دڵپڕیەوە، بە جۆرێک کە دەتوت بیر لە قسەکانی ناکاتەوە و هەڵیان ناسەنگێنێت. پرسی:

- دایکە گیان، هەرچییەک پێش بێت، هەرچییەکم لە بارەوە ببیستێت، هەرچییەک خەڵک دەربارەی من بیڵێت، هەروەک ئێستا خۆشت دەوێم؟

- ڕودیا، ڕودیا، تۆ چیتە؟ باشە تۆ چۆن دەتوانیت پرسیاری وام لێبکەیت؟ ئاخر، کێ دەربارەی تۆ شت بە من بڵێت؟ من بڕوا بە کەس ناکەم، هەر کەسێک بێت بۆ لام، دەری دەکەم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەر بە هەمان شێوازەوە بەردەوام بوو:

- من هاتووم دڵنیات بکەم کە هەمیشە تۆم خۆش دەوێت، ئێستایش پێم خۆشە کە بە تەنیاین، پێم خۆشە کە تەنانەت دونیایش لێرە نییە، هاتووم ڕێکوڕەوان پێت بڵێم، هەرچەندە ئەمە بۆ تۆ ناخۆشە، بەڵام با ئەوە بزانیت کە کوڕەکەت تۆی لە خۆی خۆشتر دەوێت، ئەوەی لەبارەی منەوە بەبیری تۆدا دێت، کە دڵڕەق بم و تۆم خۆش نەوێت، هەمووی درۆیە. هەرگیز لەو خۆشەویستییە کەم ناکات.. باشە، ئەمەیان بەسە، پێم باش بوو ئەمە بڵێم و بەوەیش دەست پێبکەم..

پولخێریا ئەلێکساندروڤنا باوەشی پێدا کرد و بە سنگییەوەی نووساند و لەسەرخۆ کەوتە گریان. پاشان وتی:

- ڕودیا، چیتە، نازانم، هەموو ئەم ماوەیە من وام دەزانی کە بە ئێمە قەڵسیت. وەلێ ئێستا بە هەموو بارێکدا هەست دەکەم کە نەگبەتییەکی گەورە چاوەڕێتە، بۆیە وا ئازار دەچێژیت، ماوەیەکە من پێشبینیی ئەمە دەکەم. ڕودیا بمبوورە کە ئەم باسەم کردەوە، هەمیشە بیری لێدەکەمەوە و شەو ناخەوم، بە درێژایی دوێنێشەو خوشکت وڕێنەی دەکرد و ناوی تۆی دەهێنا، هەندێک وشەم بیست، بەڵام باش لێی تێنەگەیشتم. تا بەیانی لە یەکێک دەچووم کە بەرەو سێدارەی بەرن،

چاوەڕێی شتێک بووم، دڵم خەبەری دابوو کە شتێک ڕوو دەدات. ڕودیا، ڕودیا. باشە بۆ کوێ دەچیت؟ نیازی سەفەرت هەیە؟
- بەڵێ.
- منیش لە بیری ئەوەدا بووم، ئاخر، ئەگەر بە پێویستی بزانیت منیش لەگەڵتا دێم. دونیایش هەروا، دونیا تۆی خۆش دەوێت، تۆی زۆر خۆش دەوێت. با سۆنیا سیمونوڤنایشمان لەگەڵدا بێت. ئەگەر پێویست بێت. بڕوانە من ئامادەم بە کچی خۆمی دابنێم، دیمیتری پرۆکفیچ هاوکاریمان دەکات بۆ ئەوەی پێکەوە بین... بەڵام.. ئاخر.
دەتەوێت بۆ کوێ بچیت؟
- خودا حافیز دایە گیان.
پولخێریا ئەلکساندرۆڤنا وەک ئەوەی کوڕەکەی بۆ هەمیشە لەدەست بچێت، هاواری کرد:
- چۆن! هەر ئەمڕۆ!
- ناتوانم لەوە زیاتر دوا بکەوم، درەنگ کەوتووم. دەبێت بڕۆم..
- ئەی من؟ دەتوانم لەگەڵتا بێم؟
- نا، تۆ بۆم بپاڕێرەوە و کڕنووش بۆ خودا بەرە، بەڵکو نزاکەت گیرا بێت.
- کەواتە لێگەڕێ با نیشانەی خاچت بۆ بکێشم و دوعای خێرت بۆ بکەم. وەرە، ئاوا، ئاوا، خودایا، چی بکەین؟
بەڵێ، ڕاسکۆلنیکۆڤ شادمان بوو، زۆر بەوە شادمان بوو کە کەسی لێنەبوو و لەگەڵ دایکیا بە تەنیا بوو. وەک ئەوەی بە پێچەوانەی هەموو ئەو ماوە زۆرەوە کە ئازار و مەینەتی بەرکی بەر نەدەدا، لەپڕێکدا دڵی نەرم بووبێت. بەرانبەر بە دایکی کەوتە سەر چۆک، هەردوو پێی ماچ کرد و لە ئامێزی یەکتردا دەستیان بە گریان کرد،

ئیدی پولخێریا ئەلکساندرۆڤنا نە تووشی سەرسامی هات و نە پرسیاری لێکرد، ماوەیەک بوو هەستی بەوە کردبوو کە کوڕەکەی تووشی بەڵایەکی گەورە دەبێت، ئێستا ئەو چرکەساتەیە کە هاتۆتە پێشێ.
بەدەم گریانەوە وتی:
- ڕودیا، ئازیزم، کوڕی گەورەم. تۆ ئێستا بە تەواوی لە منداڵیت دەچیت، ئەوسایش وەک ئێستا دەهاتیتە لام، لە ئامێزت دەگرتم و ماچت دەکردم، تەنانەت ئەو کاتانەی کە لەگەڵ باوکتا بووین و تووشی کێشە و ناخۆشییەک دەهاتین، بوونی تۆ ئاسوودەیی پێدەبەخشین. کە باوکتم بە خاک سپارد، لە بیرتە چەندجار، لە ئامێزی یەکتریدا، تەواو وەک ئێستا، لەسەر گۆڕەکەی گریاین؟ لەبەر ئەوەی ماوەیەکە دەگریم، بۆیە دڵی دایکایەتیم هەستی بە مەترسییەک کردووە. هەست بە ڕوودانی کارەساتێک دەکەم، من هەر ئەو کاتەی بۆ یەکەمجار تۆم بینییەوە، لەو شەوەدا، لە بیرتە، ئەو کاتەی تازە گەیشتبووینە ئێرە، تەنیا لە نیگاتەوە هەستم بە هەموو شتێک کرد، هەر ئەوسا دڵم داچڵەکی، ئەمڕۆیش کە دەرگاکەم لێکردیتەوە و بینیمیت، بە خۆمم وت ئەمە ساتە شوومەکەیە. ڕودیا، ڕودیا، خۆ تۆ ئێستا ناڕۆیت؟
- نا.
- دێیتەوە؟
- بەڵێ... دێمەوە.
- ڕودیا، نارەحەت مەبە، من تەنانەت ناوێرم پرسیارت لێبکەم، دەزانم کە ناتوانم، بەڵام هەر تەنیا دوو وشەم پێبڵێ: بۆ کوێ دەچیت، شوێنەکە زۆر دوورە؟

- زۆر دووره.
- باشه لەویٚ چی هەیه، ئەرکێک، کارێکی تایبەتی؟
- هەرچییەک که خوا بیدات.. تەنیا دوعام بۆ بکه...
ڕاسکۆلنیکۆڤ بەرەو لای دەرگاکه چوو، بەڵام دایکی گرتی، به نیگایەکی نائومێدانەوه چاوی له ناوچاوی بڕی، له ترسا دەموچاوی گۆڕا بوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بەدەم پەشیمانییەکی قوڵەوه له هاتنەکەی وتی:
- بەسه، دایکه گیان بەسه.
- بۆ هەتاهەتایه، باشه. خۆ تۆ سەفەری هەتاهەتایی ناکەیت؟ ئاخر، تۆ دێیتەوه، بەیانی دێیتەوه؟
- دێمەوه، دێمەوه، ماڵئاوا.
هەرچۆنێک بوو خۆی لەدەست دەرباز کرد.
سەرلەئێوارەیەکی ئاووهەوا خۆشی پاکوبێگەرد بوو، هەر له بەیانییەوه دنیاکەی خۆش دەینواند. ڕاسکۆلنیکۆڤ دەگەڕایەوه بۆ ماڵەکەی، پەلەی بوو. دەیویست هەموو کارەکانی تا خۆرئاوابوون تەواو بکات و حەزی به بینینی کەس نەبوو، که بەرەو ژوورەکەی خۆی به نەردەوانەکەدا سەردەکەوت، سەرنجی دا ناستاسیا سەماوەرەکەی واز لێهێنا، به وردی کەوته تەماشای و چاوی لێنەدەتروکاند. پرسیاری له خۆی کرد: "نەکا کەسێک هاتبێت بۆ لام؟" به بێزارییەوه بیری له پۆرفیری کردەوه. وەلیٚ که گەیشته ژووریٚ و کردیەوه، دونیای بینی. به تاقی تەنیا دانیشتبوو و له بیرکردنەوەیەکی قوڵدا بوو، دیار بوو ماوەیەکی زۆر بوو چاوەڕێی دەکرد. ڕاسکۆلنیکۆڤ لەبەر دەرگاکەدا وەستا، دونیا لەسەر قەنەفەکه به ترسەوه هەستا و بەرانبەر به کاکی ڕاوەستا، بەو نیگا بێجووڵەیەوه،

که لە کاکی ڕاما بوو، مانای ترس و ئازارێکی بێکۆتایی دەگەیاند. هەر لەو نیگایەوە ڕاسکۆلنیکۆڤ تێگەیشت کە دونیا ئاگاداری هەموو شتێکە.

بە دوودڵییەوە لە دونیای پرسی:

- چاکە بێم بۆ لات یان بڕۆم؟

- ئەمڕۆ هەمووی لای سۆنیا سیمۆنۆڤنا بوم، هەردووکمان چاوەڕێت بووین، وامان دەزانی هەر سەرێک دەدەیت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ چووە ژوورێ و خۆی بەسەر کورسییەکەدا کێشا.

- دونیا، هەست بە بێهێزی دەکەم، زۆر شەکەتم، بەڵام پێم خۆش بوو لە ئێستادا بە چاکی خۆم بگرم.

بە دوودڵییەوە لە دونیای ڕوانی.

- باشە، تۆ هەموو دوێنێشەو لە کوێ بوویت؟

- باش لە بیرم نییە، بڕوانە خوشکێ، دەمویست دوابڕیاری خۆم بدەم، چەند جارێک بە کەنار ڕووباری "نیڤا"دا تێپەڕیم، ئەمەم لە بیرە، دەمویست هەر لەوێدا کارەکە کۆتایی پێبێت.. بەڵام...

نەمتوانی بڕیارەکەم ئەنجام بدەم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ وشەکانی کۆتایی لەژێر لێوەوە وت و دیسانەوە بە دوودڵییەوە لە دونیای ڕوانی.

- سوپاس بۆ خودا، بە ڕاستی ئێمەیش لەو نیازە دەترساین، من و سۆنیا سیمونوڤنا. وا دیارە هێشتا تۆ باوەڕت بە ژیان ماوە. سوپاس بۆ خودا، سوپاس بۆ خودا.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە تەوسەوە زەردەیەک گرتی.

- بڕوام پێی نەبوو، بەڵام تۆزێک لەمەوبەر من و دایکم باوەشمان بە یەکتریدا کرد و گریاین. من بێبڕوام، کەچی داوام لە دایکم کرد بۆم

بپاڕێتەوە و نزام بۆ بکات. خوا خۆی دەیزانێت چی دەبێت، دونیا، من لەم بارەیەوە هیچ نازانم.
دونیا بە سەرسامییەوە هاواری کرد:
- تۆ لای دایە بوویت؟ پێت وت؟ چۆن وێرات پێی بڵێیت؟
- نەخێر، پێم نەوت... هەر نەچووم بە لای ئەو شتەدا، بەڵام ئەو زۆر شت دەزانێت. شەو گوێی لە وڕێنەی تۆ بووە. بۆیە بڕوای تەواوم هەیە کە نیوەی بەسەرهاتەکە دەزانێت. سەردانەکەم کارێکی باش نەبوو، ئەسڵەن نازانم بۆ چووم، دونیا، من پیاوێکی بەدم.
- پیاوێکی بەدیت و ئامادەیت بڕۆیت ئازار بچێژیت؟ چونکە دەتوانیت بیچێژیت، دەتەوێت بڕۆیت؟
- بەڵێ، دەڕۆم، هەر ئێستا دەڕۆم، تەنیا بۆ ڕزگاربوون لەم خەجاڵەتییە ویستم خۆم بدەم بەدەم ئاوەکەوە تا بخنکێم، دونیا، ئەو کاتەی لەسەر ئاوەکە وەستا بووم، بیرم کردەوە ئەگەر تا ئەم دەقیقەیە خۆم بە پیاوێکی بەهێز زانیبێت، کەواتە نابێت لەو خەجاڵەتییەیش بترسم، ئەمە شانازی بەخۆوەکردنە، دونیا، وانییە؟
- بەڵێ، شانازی بەخۆوەکردنە، ڕودیا.
وەک ئەوە وا بوو بڵێسەیەک لە چاوە خامۆشەکانی ڕاسکۆلنیکۆڤەوە کەوتبێتە درەوشانەوە. پێی خۆش بوو کە هێشتا ئەو شانازییەی تیا ماوە. پاشان بە زەردەخەنەیەکی سەیرەوە چاوی لە ناوچاوی خوشکی بڕی و پرسی:
- خوشکێ، تۆ وا دەزانیت من لە بینینی ئاوەکە ترسابم؟
دونیا بەبێزارییەوە هاواری کرد:
- ئاخ، بەسیەتی، ڕودیا.

دونیا مەلوول دانیشتبوو لە براکەی دەڕوانی، لەپڕێکدا ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستا.

- درەنگە، ئێستا دەڕۆم و خۆم بەدەستەوە دەدەم، بەڵام نایشزانم بۆ دەمەوێت وا بچم خۆم بەدەستەوە بدەم!

بێدەنگییەکی دوو دەقیقەیی ئەو ناوەی داگرت، ڕاسکۆلنیکۆڤ دانیشتبوو، سەری دانەواندبوو و لە زەوییەکەی دەڕوانی. دونیا لەوبەری مێزەکەوە فرمێسکی دەڕشت و بە گۆنایدا دەهاتە خوارێ.

- خوشکێ، دەگریت، دەتوانیت دەستم بۆ درێژ بکەیت؟

- بۆ گومانت لەمە هەیە؟

بەدەم قسەکردنەوە دونیا توند لە ئامێزی گرت و بە خۆیەوە قرساند، ماچی کرد و وتی:

- دەتەوێت بە ئازارچەشتن نیوەی تاوانەکەت بسڕیتەوە؟

لەپڕێکدا ڕاسکۆلنیکۆڤ بەتووڕەییەکی بێوێنەوە قیژاندی:

- تاوان؟ کامە تاوان؟ ئەوە تاوانە کە ئەسپێیەکی پیس و زیانبەخشم کوشتووە؟ پیرێژنێکی سووخۆر کە کەڵکی بۆ کەس نییە! هەر کوشتنی چل گوناهت لە کۆڵ دەکاتەوە. کەسێک خوێنی هەژاران بمژێت. ئایا ئەمە تاوانە؟ من بیر لەوە ناکەمەوە و نایشمەوێت لێی پاک ببمەوە. چییە لە هەموو لایەکەوە باس لە "تاوان، تاوان" دەکەن؟ ئێستا گەوجی و ترسنۆکی خۆم دەبینم، ئێستا کە بڕیارم داوە بەرگەی ئەم سەرشۆڕییە بێهودەیە بگرم! تەنیا سووکی و بێتواناییە کە ئەم بڕیارەم پێدەدات، یان ڕەنگە لەبەر بەرژەوەندییەک بێت... وەک پۆرفیری پێشنیازی بۆ دەکردم.

دونیا نائومێدانە هاواری لێهەستا:

- کاکە، کاکە، چۆن وا دەڵێیت! ئاخر، تۆ خوێنت ڕشتووە!

ڕاسکۆلنیکۆڤ لەوەدا بوو لەپێستی خۆی بێتە دەرەوە، وتی:
- هەموو کەسێک ئەو خوێنە دەڕێژێت، خوێنێکە بەردەوام وەک ڕووبار دەڕوات، خوێنێکە کەسانی دی وەک شامپانیا دەیڕێژن و لە پاداشیدا لە "کاپیتۆلا"[1] تاجی مەزنییان لەسەر دەنێن، خوێنڕێژەکان بە فریادڕەسی مرۆڤایەتی ناو دەبرێن. باشە، تۆ قووڵتر بیر بکەرەوە و چاکتر بڕوانە، من خودی خۆم چاکەی خەڵکیم مەبەست بووە، ویستوومە سەدان و هەزاران کاری چاکە بکەم، لەباتیی ئەو گەوجایەتییەی کە لەڕاستیدا گەوجایەتیش نییە، بەڵکو تەنیا لێنەزانینە. چونکە هەموو بیرۆکەکە هەرگیز هێندە گەمژانە نەبووە وەک ئێستا دوای شکستخواردن دەردەکەوێت، هەموو شتێک کە سەرنەکەوت و تێک شکا، ئیتر دەکرێتە کاری گەوجانە. من ویستم بەو گەوجایەتییە - ئەگەر وابێت- ئازاد بم و پێویستم بە کەس نەبێت، یەکەم هەنگاو بنێم، کەرەسە بەدەست بێنم، پاشان، هەموو شتێک بە قازانجێکی زۆرەوە فەراهەم دێت و بەرژەوەندی گشتیی تیا ڕەچاو دەکرێت، بەڵام من.. لە یەکەم هەنگاودا تێکەوتم، چونکە من... ترسنۆکم! ئەمە کرۆکی مەسەلەکەیە! لەگەڵ ئەمانەیشدا من لەگەڵ بۆچوونی تۆدا نیم لەبارەی خۆمەوە. ئەگەر سەربکەوتمایە، تاجتان لەسەردەنام، بەڵام ئێستا لە داوم دەنێن.
- ئەمە ڕاست نییە، مەسەلەکە شتێکی ترە، کاکە، تۆ دەڵێی چی؟

---

[1] کاپیتۆلا (capitole) بە ناوی بەناوبانگترین بەرزایی رۆمایە، لەسەردەمی دێریندا لەسەر لووتکەکەی پەرستگای ژوپیتەری خوای خواکان هەبووە. هەموو ئەو سەردارانەی لە شەڕدا سەردەکەوتن و دەگەڕانەوە، لەوێدا ئاهەنگیان بۆ دەگێڕان (و. ن).

- چۆن! جیاوازییەکە لە شێوەدایە، لەباری جوانکاریەوە من پابەندی هیچ ڕێسایەک نەبووم، باشە، من تێناگەم بۆ تۆپبارانکردنی خەڵکی دوای گەمارۆدانی، شێوە و یاسای جوانتر و بەڕێزتری هەیە؟ بایەخدان بە جوانکاری یەکەم نیشانەی بێتواناییە... هەرگیز، هەرگیز ئەوەندە بە ڕوونی هەستم بەم ڕاستییە نەکردووە وەک ئێستا هەستی پێدەکەم، هەرگیز بە ڕادەی ئێستا بڕوام بە بێتاوانیی کارەکەم نەبووە. هەرگیزاوهەرگیز لەسەر بیروباوەڕی خۆم ئەمەندە دڵنیا و بەبڕوا نەبووم.

دەموچاوە ڕەنگ پەڕیوو پەژموردەکەی سوور داگەڕا، بەڵام لە دواوشەکانیدا، بە ڕێکەوت نیگای بەرچاوی دونیا کەوت، لە نێوچاوی دونیادا ئەمەندە ئازار و خەمی خۆی بینی، کە بێ ئەوەی پێبزانێت هاتەوە سەر خۆی. بەهەرحاڵ، هەستی کرد کە ئەو بووەتە هۆی داماویی ئەو دوو ژنە نەگبەتە، هەرچییەک ڕوو بدات ئەو هۆکاری بووە..

- دونیای ئازیزم، ئەگەر تاوانبارم لێم خۆش ببە (بەڵام هەرگیز نابێت بمبەخشیت- ئەگەر تاوانبار بم) ماڵئاوا... قسەکردن بەسە، کاتی ڕۆیشتنە، مەکەوەرە دوام، تکات لێدەکەم، من سەردانێکی ترم هەیە. باشترە هەر ئێستا بچیتەوە بۆ لای دایکم، هیوادارم ئەمە بکەیت. ئەمە دواتکا و گەورەترین تکامە کە لێتی دەکەم. هەرگیز تەنیای مەکە، من لە حاڵەتێکی ئەوەندە شپرزەدا بەجێم هێشت، بڕواناکەم خۆی بگرێت، یان دەمرێت یان شێت دەبێت. لەگەڵیدا بە. ڕازومیخینتان لەگەڵدا دەبێت، پێم گوتووە. بۆم مەگری، هەوڵ ئەدەم تا ماوم ئازا و شەریف بم، هەرچەندە پیاوکوژم، ڕەنگە ڕۆژێک لە ڕۆژان ناوم ببیستیت، من

نابم بە هۆی سەرشۆڕیتان، دەیبینیت بۆت دەسەلمێنم.. وەلێ ئێستا ماڵئاوا.
ڕاسکۆلنیکۆڤ پەلەی تەواوکردنی قسەکانی بوو، بەڵام لە دواقسە و بەڵێنەکانیدا، دیسانەوە لە چاوانی دونیادا حاڵەتێکی تایبەتی دی.
- باشە، بۆ ئەوەندە فرمێسک دەڕێژیت؟ مەگری، مەگری، ئاخر خۆ ئێمە بۆ هەمیشە لەیەکدی جیا نابینەوە... ئاخ، بەڕاست، ڕاوەستە، لە بیرم چوو...
ڕاسکۆلنیکۆڤ لە مێزەکە نزیک کەوتەوە، کتێبێکی گەورەی تۆزوخۆڵ لێنیشتووی هەڵگرت. کردیەوە، لە نێوان لاپەڕەکانیدا وێنەیەکی بچووک کە لەسەر پارچە عاجێک بە ڕەنگی ئاوی نیگار کرابوو. دەرهێنا، ئەمە وێنەی کچی خاوەن ماڵەکە، دەزگیرانە کۆنەکەی خۆی بوو، کە بەدەم تاوە مرد. وێنەی ئەو کچەی دەیویست بڕوات بۆ دێر. بۆ چرکەساتێک لە دەموچاوە خەمبارەکەی ڕاما، پاشان ماچی کرد و دایە دەستی دونیاوە، بەدەم بیرکردنەوەوە وتی:
- لەگەڵ ئەودا زۆر لەسەر ئەم مەسەلەیە دواوم، تەنیا لەگەڵ ئەودا، گەلێک لەو شتانەی لە دواییدا بە بارێکی خراپ شکانەوە، لە منی بیستبوو.
پاشان ڕووی لە دونیا کرد و وتی:
- دڵنیا بە، ئەویش وەک تۆ، هاو ڕای من نەبوو، خۆشحاڵم کە ئیدی ئەو نەماوە. گرنگ ئەوەیە کە هەموو شتێک دەگۆڕێت، ئێستا لە ڕابوردوو.
لێرەدا دیسانەوە دەنگی بەرز کردەوە و گەڕایەوە سەر خەمە کۆنەکەی:

– هەموو شتێک، هەموو شتێک دەگۆڕێت، بەڵام ئایا من ئامادەگیم تێدایە؟ دەمەوێت؟ دەڵێن ئەزموون بۆ من پێویستە، باشە ئەم هەموو ئەزموونە بۆچی باشە؟ سوودی چییە؟ ئایا ئەو کاتە باشتر تێدەگەم کە هێز و توانام نامێنێ و پیر دەبم، دوای بیست ساڵ زیندانی و کاری قورس کە ئەوسا خەم و ئازار دامدەڕزێنێت و تەواو بێئەقڵ دەبم؟ باشە ئیتر ئەو کاتە ژیان بە کەڵکی چی من دێت؟ ئێستا بۆ بەم ژیانە قایل بووم؟ ئاخ، سەرلەبەیانی ئەمڕۆ کە لەسەر ڕووباری "نیڤا" ڕاوەستا بووم، زانیم چەندە چرووک و ترسنۆکم!

سەرئەنجام هەردووکیان هاتنە دەرەوە، دونیا ئازاری دەچەشت، بەڵام کاکی خۆش دەویست، لێی جیا بووەوە، هێشتا پەنجا هەنگاوێک دوور کەوتبووەوە، ئاوڕی دایەوە تا جارێکی دی براکەی ببینێتەوە. هێشتا ڕاسکۆلنیکۆڤ نەکەوتبووە نەدیوی. بەڵام کە گەیشتە سەر پێچی ڕێگەکە، ئەویش ئاوڕی دایەوە. بۆ دواجار نیگای هەردووکیان یەکی گرت. وەلێ کە ڕاسکۆلنیکۆڤ دونیای بینی تەماشای دەکات، بەدەست ئاماژەیەکی تووڕەیی بۆ کرد، بۆ ئەوەی ڕێگەکەی لەبەر بگرێت و ئەمیش خێرا بە پێچەکەدا تێی کێشا.

دوای چرکەساتێک لەو دەستجوڵاندنە ڕکنەی بەرانبەر بە دونیا شەرمی هات. بە خۆی وت: "من بەدخووم، خۆم دەزانم، بەڵام ئەگەر شایان نیم، بۆ ئەوەندە خۆشیان دەوێم! خۆزگا تەنیا خۆم بوومایە، ئەوسا نە کەس خۆشی دەویستم و نە منیش هەرگیز کەسم خۆش دەویست، ئەوسا ئەم بەسەرهاتە ڕووی نەدەدا. بەڕاست دوای پانزە یان بیست ساڵی ئایندە، ڕۆحی من ئەوەندە پاکیزەیی تیا دەبێت کە بە خۆشحاڵییەوە ڕووبەڕووی خەڵکی بوەستم، بلاڵێمەوە و بگریم و لە هەموو بۆنەیەکدا خۆم بە ڕسوا دابنێم؟ بەڵێ، بێگومان، بێگومان، هەر

لەبەر ئەم هۆکارەیە کە ئەوان دەمنێرنە تاراوگە، ئەوان داواکاری ئەمەن... ئێستا ئەوان لە شەقامەکاندا پیاسە دەکەن. بەڵام هەریەکەیان لە ڕاستیدا بەدڕەوشتن، لەوەیش خراپتر، گێلن. وەلێ ئەگەر ڕەوانەی تاراوگەم نەکەن، هەموو ئەوانە ڕقی داوێنپاکی شێتیان دەکات. ئاخ، چەند قێزەونن!"

ڕاسکۆلنیکۆڤ کەوتە بیرکردنەوە و ڕامانەوە کە: "بە چ ڕێگەیەک دەتوانێت لە دواییدا بەرانبەر بە هەموو ئەوانە بێ سێودووکردن خۆ بەدەستەوە بدات؟ واتا ویژدانی بدۆڕێنێت؟ ئەی بۆ نا؟ هەردەبێت وا بکات، بۆ بیست ساڵ کۆیلایەتییەکی بەردەوام بە تەواوی مرۆڤ وردوخاش ناکات؟ ئاو بەرد کون دەکات. کەواتە ئەی بۆ، بۆ دەبێت بەم هەموو ئازار و ڕەنجەوە بژیم، بۆ بڕۆم بۆ ئەوێ، لە کاتێکدا خۆیشم بزانم کە بەسەرهاتەکە بەو جۆرەیە، وەک لە کتێبێکدا نووسرابێت وا ئەنجام دەدرێت، نەک بە هیچ جۆرێکی تر".

ڕەنگە لە دوێنێشەوەوە ئەمە سەدەمین جاری بێت کە ئەم پرسیارە لە خۆی بکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا هەر بەرەو پێشەوە دەڕۆیشت.

## ٨

کە ڕاسکۆلنیکۆڤ چووە ژوورەکەی سۆنیاوە، دنیا دابوویە تاریکی، تەواوی ئەو ڕۆژە سۆنیا بە نیگەرانییەکی ترسناکەوە چاوەڕێی کردبوو، دونیایشی لەگەڵدا بوو، دونیا بۆ ئەوە هاتبووە لای، چونکە قسەکانی دوێنێشەوی سڤیدریگایلۆفی لە یاد مابوو کە وتبووی "سۆنیا بە ڕووداوەکە دەزانێت". ئێمە لێرەدا لە وردەکاریی قسەکان، فرمێسکەکانی ئەو دوو ئافرەتە، ڕادەی نزیکبوونەوەی هەردووکیان لە یەکتری، نادوێین. دونیا لەو دیدارەدا لایەنی کەم بەوە دڵخۆش بوو کە

براکەی بە تەنیا نابێت: سۆنیا یەکەم کەس بوو کە ڕاسکۆلنیکۆڤ هاتە لای و دانی بە تاوانەکەدا نا، بێ ئەوەی پێش ئەو لای هیچ کەسێکی دی درکاندبێتی. سۆنیای بەو مرۆڤە دانابوو کە دەتوانێت پەنای بۆ بەرێت، بۆیە سۆنیایش بڕیاری دابوو دوای بکەوێت، چارەنووس بۆ هەر شوێنێکی بەرێت ئەو لەگەڵیدا بێت. دونیا چ پرسیارێکی نەکردبوو، چونکە دەیزانی مەسەلەکە هەر وا دەکەوێتەوە، تەنانەت دونیا بە ڕێز و پێزانینێکی تایبەتییەوە تەماشای سۆنیای دەکرد. بە جۆرێک کە سەرەتا سۆنیا شەرمی پێهات و بێتاقەت بوو، لەوەدا بوو بگری. چونکە خۆی بە شیاوی ئەوە نەدەزانی تەماشای دونیا بکات، هەڵوێستە جوانەکەی دونیا، لەو کاتەدا کە بۆ یەکەمین جار لای ڕاسکۆلنیکۆڤ یەکتریان بینی و دونیا زۆر بە ڕێزەوە سڵاوی لێکرد، ئیتر لەوساوە، بۆ هەمیشە، لە ناو دڵی سۆنیادا وێنەیەکی هەرەجوان و پیرۆزی دونیا نەخشی بەستبوو.

دونیا لەوە زیاتر خۆی پێنەگیرا و سۆنیای بەجێ هێشت، بۆ ئەوەی سەر لەماڵی ڕاسکۆلنیکۆڤی برای بدات و چاوەڕێی هاتنەوەی بێت. چونکە ئەو لای خۆیەوە وای دانابوو کە یەکەمجار هەر دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی. سۆنیا کە بە تەنیا مایەوە، بیری کردەوە کە لەوانەیە ڕاسکۆلنیکۆڤ خۆی بکوژێت، بۆیە ترسا و خەمی لێنیشت، دونیایش هەر لەوە دەترسا، وەلێ هەردووکیان، بە درێژایی ئەو ڕۆژە، بەردەوام بەڵگە و پاساوی زۆریان بۆ یەکتر دەهێنایەوە، کە مەحاڵە ئەو کارە بکات. بۆیە لەو لایەنەوە، ئەو ماوەیەی لەگەڵ یەکدا بوون، زۆرتر هەستیان بە ئارامی و دڵنیایی دەکرد. بەڵام کە لە یەکتر دوور کەوتنەوە، هەردووکیان تەنیا بیریان لەوە دەکردەوە. سۆنیا بیری کردەوە کە سڤیدریگایلۆف دوێنێ پێی وتبوو ڕاسکۆلنیکۆڤ

دوو ڕێگەی لەبەردەستایە "سیبریا یان..." سۆنیا ئەوەیشی دەزانی کە ڕاسکۆلنیکۆڤ چەندە شکۆمەندە و شانازی بە خۆیەوە دەکات و بڕوای بە ئایینیش نییە، پاشان نائومێدانە بیری کردەوە: "تۆ بڵێی ترس لە مردن ژیانی لا خۆشەویست بکات؟"

خۆر لە ئاوابووندا بوو. سۆنیا بە خەمبارییەوە لە پاڵ پەنجەرەکەدا وەستابوو و تەماشای دەرەوەی دەکرد، بەڵام بێجگە لە دیوارێکی گەورە و ڕەشی دراوسێکەیان هیچی تری نەدەبینی. سەرئەنجام کە سۆنیا بە تەواوی بڕوای بە مردنی ئەو کلۆڵە هێنا، ڕاسکۆلنیکۆڤ خۆی بە ژووورێدا کرد..

لە ناخی دڵییەوە هاوارێکی شادمانیی لێهەستا، بەڵام کە تەماشای ڕاسکۆلنیکۆڤی کرد، ڕەنگ لە ڕووی پەڕی. ڕاسکۆلنیکۆڤ زەردەخەنەی کرد و وتی:

- باشە، هاتووم بۆ خاچەکانت، سۆنیا، تۆ خۆت منت بەرەو ڕێگەی هاتونەهات ناردووە، کەچی کە ئێستا کاتی ئەنجامدانی کارەکە هاتووە، تۆ دەترسیت؟

سۆنیا بە سەرسامییەوە لێی ڕاما، وتەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤی سەیر هاتە پێشچاو و تەزوویەک بە لەشیدا گەڕا. وەلێ دوای چرکەساتێک تێگەیشت کە وتەکانی، تۆنی دەنگی، هەموو دەستکرد بوون. لە کاتی قسەکردندا تەنانەت ڕاسکۆلنیکۆڤ ڕووی لە لایەکی تر بوو، دەتوت دەترسێت تەماشای ناوچاوی بکات.

- بڕوانە سۆنیا، بیرم کردەوە کە ڕەنگە ئەم کارەیان بۆ من باشتر بێت. لەم مەسەلەیەدا هەلومەرجێکی تایبەتی هەیە کە.. باسکردنی درێژە دەکێشێت و پێویست ناکات.. بەڵام دەزانیت ئەو تەنیا شتە چییە کە ڕقم هەڵدەستێنێت؟ من لەوە تووڕە و جاڕزم کە ئەم هەموو

کەروگایە لە دەورم خڕ دەبنەوە، چاوم تێدەبڕن و پرسیارگەلێکی گەمژانەم لێدەکەن و دەبێت وەڵامیشیان بدەمەوە، هەموو بە پەنجە ئاماژەم بۆ دەکەن... ئاە... دەزانیت ناچم بۆ لای پۆرفیری، زۆر ئازاری داوم، چاکترە بچم بۆ لای پورخی هاوڕێم. چەند سەیری پێدێت! چ کاریگەرییەکم لەسەری دەبێت! بەڵام دەبێت زۆر هێور بم، بەم دواییە زوو هەڵدەچم، باوەڕ دەکەیت، من ئێستا دەستم هەڵهێنایەوە و هەڕەشەم لە خوشکم کرد، تەنیا لەبەر ئەوەی ڕاوەستا تا بۆ دواجار بمبینێت؟ ئەمە هەڵوێستێکی کێویانەیە! ئاخ... چ زەلکاوێکە! باشە، خاچەکان لە کوێدان؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە حاڵەتێکی ئاساییدا نەبوو، تەنانەت نەیدەتوانی بۆ چرکەساتێک لە شوێنێکدا بحەوێتەوە، یان هەستی لە نوختەیەکدا کۆ بکاتەوە، بیرەکانی پێکدا دەهاتن و تێک دەچڕژان، قسەی بێسەرەوبەرەی دەکرد و کەمێک دەستی دەلەرزی.

سۆنیا بێدەنگ دوو خاچی لە چەکمەجەیەک دەرهێنا، یەکێکیان لە دار و ئەوی تریان لە مس دروست کرابوون، لە پێشدا بۆ خۆی و پاشان بۆ ڕاسکۆلنیکۆڤ وێنەی خاچی کێشا، خاچە دارینەکەیشی کردە ملی ئەو.

- ئەمە ئەو مانایە دەگەیەنێت کە من ئامادەم تەواوی سزا و خاچی خۆم لە ئەستۆ بگرم، هە، هە، هە! وەک ئەوەی تا ئێستا ئازارم کەم کێشا بێت! خاچە دارینەکە واتا خاچی خەڵکانی ئاسایی، بەڵام خاچە مسینەکە کە خاچی لیزاڤیتا بوو، بۆ خۆتت هەڵگرت. پیشانم بدە، دیارە لەو ساتەدا لە ملی ئەودا بووە... من بە دوو خاچی تری وەک ئەمانە دەزانم، یەکێکیان لە زیو دروست کراوە و ئەوی تریان لە شێوەی وێنەیەکدایە. من هەر ئەو کاتە فڕێم دایە سەر سنگی پیرێژنەکەوە، بۆ

ئێستا باش بوون، خۆزگا بمکردنایەتە ملم... لەوە دەچێت قسەی بێسەروبەر بکەم و کاری سەرەکیم لە بیر چووبێت، هەستم پەرت بووە!... بڕوانە سۆنیا، ڕاستیی بۆ ئەوە هاتووم کە پێت بڵێم و بزانیت... باشە دەی... من تەنیا بۆ ئەمە هاتووم- هوم، وام دەزانی دەتوانم لەمە زیاتر شت بڵێم- ئاخر، تۆ خۆت هانت دام کە بڕۆم، باشە، وا ئێستا لە زیندانم دەنێن و ئاواتەکەت دێتە دی. کەواتە ئەی بۆ دەگریت؟ تۆیش؟ لێگەڕێ، بەسە، ئاخ، چۆن بەرگەی ئەم هەمووە بگرم!

لەگەڵ ئەوەدا هەستێکی تازە لە هەناوی ڕاسکۆلنیکۆڤدا چەکەرەی کرد، لەبینینی سۆنیا دڵی گیرا، بە خۆی وت: "ئەی ئەمەیان چی؟ من بۆ ئەو چیم؟ بۆ دەگری، بۆ وەک دایکم یان دونیا ڕەفتارم لەگەڵدا دەکات؟ یان وەک ئەوەی دایەنم بێت!"

سۆنیا بە دەنگێکی لەرزۆک و شەرمنەوە لێی پاڕایەوە:

- هیچ نەبێت جارێک لە خودا بپاڕێرەوە.

- چەندت پێخۆشە ئەوەندە دەپاڕێمەوە، لە ناخی دڵمەوە سۆنیا، تەواو لە ناخی دڵمەوە...

لە ڕاستیدا دەیویست شتێکی دی بڵێت، ڕاسکۆلنیکۆڤ چەند جارێک نیشانەی خاچی بۆ خۆی کێشا، سۆنیا سەرپۆشەکەی خۆی هەڵگرت و دای بەسەر ڕاسکۆلنیکۆڤدا، قوماشێکی گەورە و سەوز بوو، بێگومان، هەمان ئەو قوماشە بوو، کە مارمیلادۆڤ باسی دەکرد "قوماشی خێزان". ئەمە بە خەیاڵی ڕاسکۆلنیکۆڤدا هات، بەڵام نەیپرسی، هەستی کرد گەلێک پەست و بێتاقەتە و زۆریش نیگەرانە، لەم حاڵەتە ترسا، لەپڕێکدا سەری لەوە سوڕما کە سۆنیا دەیەوێت

لەگەڵیدا بێت. بە تووڕەییەوە، لە کاتێکدا کە بەرەو لای دەرگاکە دەچوو، هاواری کرد:

- چی دەکەیت؟ تۆ بۆ کوێ دەچیت؟ بمێنەرەوە، بمێنەرەوە، من بە تەنیا دەڕۆم.

لە چوونەدەرەوەیشدا لەسەرخۆ وتی:

- خۆ پێویستم بە سوپایەک نییە!

سۆنیا لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستا، تەنانەت ڕاسکۆلنیکۆڤ خواحافیزیشی لێنەکرد، ئیدی لە بیری کردبوو، بیرۆکەیەکی ئاگرین هێنابوویە جۆشوخرۆش، لەو کاتەدا کە لە پلیکانەکانەوە دەهاتە خوارێ، لە خۆی پرسی: "لە ڕاستیدا وایە، دەبوو وا بێت؟ ئیتر نابێت بوەستم و خەریکی ڕێکخستنی هەموو شتێک بم و.. بۆ ئەوێ نەچم؟" لەگەڵ ئەوەیشدا هەر ڕێگەی دەبڕی، لە ناکاوێکدا تەواو هەستی کرد کە پرسیارلەخۆکردن بێهودەیە، کە گەیشتە سەر شەقامەکە، بیری کەوتەوە کە خواحافیزیی لەگەڵ سۆنیادا نەکردووە، ئەو لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا، لە تاو هاواری ئەم نەیوێراوە بجووڵێت، بە سەرپۆشە سەوزەکەیەوە هەر لەوێ ماوەتەوە، ڕاسکۆلنیکۆڤ بۆ چرکەساتێک وەستا، لەو ساتەدا بیرێکی کتوپڕ بەسەریدا هات، وەک ئەوەی بیرۆکەکە تا ئەو چرکەساتە چاوەڕوانی کردبێت تا بە تەواوی لە پەلوپۆی بخات. "باشە، من ئێستا بۆ چووم بۆ لای سۆنیا؟ پێم وت بۆ کارێک هاتووم، کامە کار؟ ئەسڵەن چ کارێکم نەبوو! بۆ ئەوەی ڕۆیشتنەکەمی پێبڵێم، باشە، ئینجا چی؟ چ پێویستی دەکرد! ئایا خۆشم دەوێت؟ نا. نا. ئاخر من وەک سەگ ڕاوم نا، ئەی پێویستم بە خاچەکانی بوو؟ ئاە... من بە تەواوی کەوتوومەتە زەلکاوەکەوە، نا، من خوازیاری فرمێسکەکانی بووم، دەمویست ترسولەرزەکەی ببینم،

تەماشای دڵی بکەم چۆن بە ئازار دێت و دەترەکێت! دەبوو خۆم بە شتێکەوە خەریک بکەم، شتێک کە دوام بخات، تەماشای دەموچاوی مرۆڤێک بکەم، تا ئەوەندەم بوێری تێبگەڕێت کە پشت بە خۆم ببەستم، ئەوەی دەیبینم بیری لێبکەمەوە. من مرۆڤێکی بچووکم، سووک و چروکم!"

بە کەناری ڕووبارەکەدا ڕۆیشت، ئیتر ڕێگەکە کۆتایی هاتبوو، کە گەیشتە پردەکە، وەستا، لە ناکاوێکدا لەسەر پردەکەوە بەرەو لایەکی دی سووڕی خوارد و ڕووی لە "سننایا" کرد.

بە پەرۆشەوە لە ڕاست و چەپی خۆی دەڕوانی، بە وردی لە شتەکان ڕادەما، وەلێ توانای ئەوەی نەبوو هەستی خۆی لەسەر شتێک ڕابگرێت. هەموو شتەکان بە بەردەمیدا تێدەپەڕین و ون دەبوون.

بیری کردەوە:

"هەفتەیەک، یان مانگێکی تر، من لە گالیسکەیەکی تایبەتیدا، لەگەڵ چەند گیراوێکی تردا، لەسەر ئەم پردەوە بەرەو جێگایەکی نادیار دەبەن، دەبێت لەو کاتەدا من چۆن لەم ڕووبارە بڕوانم؟ ئایا ئەوەم لە بیر دەمێنێت کە چۆنم بینیووە؟ ئەوەیش ئاگادارییەکە، ئاخۆ لەو کاتەدا چۆن پیتەکانی دەخوێنمەوە؟ لێی نووسراوە "کۆمپانیا" ئایا ئەم پیتی "ک"م لە بیر دەمێنێت بۆ ئەوەی دوای مانگێکی دی دیسان لێی بڕوانمەوە، ئەم پیتی "ک" وەک ئێستا دەبینمەوە؟ ئەی لەو کاتەدا چ هەست و بیرێکم دەبێت؟"... خودایا، چ شتگەلێکی سووک و بێمانان، ئەم هەموو دەردەسەرییانەی ئێستای من! بێگومان هەموو ئەمانە سەرنجڕاکێشن... هەڵبەتە وەک خۆیان، هە، هە، هە! ئەمانە چین بە بیرمدا دێن! دەڵێی گەڕاوەمەتەوە بۆ منداڵی، لە خۆمەوە شت دروست دەکەم، باشە، بۆ شەرم لە خۆ دەکەم؟ ئاە، چ پاڵەپەستۆیەکە! دیارە

ئەو زەلامە قەڵەوە ئەڵمانییە، ئەمەی کە خۆی بە مندا دەکێشێت، ئەی دەزانێت خۆی بە مندا کێشاوە؟ ئەم پیرێژنەی مندالّی لە باوەشدایە و داوای یارمەتی دەکات. سەیرە! لەوانەیە من لە خۆی بە بەختەوەرتر بزانێت! هەرچەندە گاڵتەجارییە، بەڵام چۆنە شتێکی بدەمێ، سەیرە، پێنج کوپیکم لە گیرفاندایە، لە کوێوە هاتووە؟".

- وەرە، وەرە، بگرە، دایکە گیان.

پیرێژنە سواڵکەرەکە بەدەم گریانەوە دەنگی هەڵبڕی:

- خوا دەست بە باڵتەوە بگرێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ چووە ناو مەیدانی "سننایا"وە، گەلێکی بە لاوە ناخۆش و نارەحەت بوو کە ڕووبەڕووی خەڵکەکە دەڕۆیشت، بەڵام هەر دەبوو بەرەو ئەولایە بڕوات، کە خەڵکەکە تیایدا ئاپۆرەیان دابوو. بۆ ئەوەی بە تەنیا بێت، ئامادە بوو هەموو قوربانییەک بدات، وەلێ دەیزانی بۆ تاقە دەقیقەیەکیش تەنیایی بە خۆوە نابینێت. لە نێو ئاپرەی خەڵکەکەدا کابرایەکی سەرخۆش کردبوویە هەراوزەنا، دەیویست سەما بکات، بەڵام بەردەوام خۆی پێنەدەگیرا و دەکەوتە سەر زەوییەکە. ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ناویاندا ڕێگەی بۆ خۆی دەکردەوە. بۆ چەند چرکەساتێک لە سەرخۆشەکەی ڕوانی، پاشان لەناکاوێکدا پێکەنینێکی کەم و خێرای هاتێ و بە تەواوی لە یادی کرد. تەنانەت نەیدەبینی، هەرچەندە هێشتا هەر لێی دەڕوانی. لە دواییدا بێ ئەوەی بزانێت لە کوێدایە، خۆی لە خەڵکەکە دوور خستەوە. کە گەیشتە ناو مەیدانەکە، لەپڕێکدا بیرۆکەیەکی بۆ هات، هەموو هەست و بیری داگیر کرد. لەناکاوێکدا وتەکانی سۆنیای بیر کەوتەوە: بڕۆرە سەر یەکێک لە چوار ڕێگەکان. سڵاو بۆ خەڵکەکە بکە، زەوییەکە ماچ بکە، چونکە گوناهت بەرانبەر بە زەوی کردووە، بە دەنگی بەرز کە خەڵکی

هەمووی گوێی لێبێت بڵێ: "من پیاوکوژم" کە ئەو ڕستانەی بیر هاتەوە، هەموو لەشی کەوتە لەرزین، ئەو خەم و ئازارە زۆرانەی بە درێژایی ئەم ماوەیە، بەتایبەتی کە لەم ساتانەی دواییدا تووشی هات، ئەمەندە شەکەتیان کردبوو، کە بێ سێودوولێکردن خۆی دایە. دەست ئەو بیر و هەستە تازانە. ئەم هەستە لە پەلامارێک دەچوو، لە ناو دڵیدا وەک پزیسکێک هەڵگیرسا و لەپڕا بوو بە بڵێسە و هەموو گیانی گرتەوە، دوایی هەستی بە سۆز و خۆشەویستییەک کرد و فرمێسک لە هەردوو چاوییەوە دارژایە خوارێ. هەر لەو شوێنەدا کە لێی وەستا بوو، کەوتە سەر زەوییەکە.

لە ناوەڕاستی مەیدانەکەدا کەوتە سەر ئەژنۆ، بۆ خەڵکەکە چەمایەوە، زەوییە پیسەکەی بە تاسە و شادمانییەوە ماچ کرد، ئینجا هەستایەوە و جارێکی دی سڵاو و ڕێزی بۆ خەڵکەکە کردەوە.

لاوێک کە لە پاڵیدا وەستا بوو، وتی:

- ئای کە سەرخۆشە!

دەنگی پێکەنین لە دەوروبەرییەوە بەرز بووەوە.

یەکێک لەوانەی نیوەسەرخۆش بوو وتی:

- هەڤاڵان، دەیەوێت بچێت بۆ قودس، بۆیە ماڵئاوایی لە منداڵ و نیشتمانەکەی دەکات. سڵاو لە هەموو کەس دەکات. پتروزبورگی پایتەخت و زەوییەکەی ماچ دەکات.

سێیەم کەس وتی:

- هێشتا گەنجە

یەکێکی دی بە خورتی وتی:

- لە خانەدانەکانیشە.

- ئەمڕۆ سەر لەوە دەرناکەیت کامە خانەدانە و کامە نا.

گشت ئەم قسە و سەرنجانە وایان لە ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد کە هەردوو وشەی "من پیاوکوژم" کە لەوەدا بوو لەسەر زمانییەوە بێنە دەرەوە، لە جێگای خۆیاندا مەڵاس بخۆن. وەلێ بە هێوری، بەرگەی هەموو ئەو هەراوزەنایەی گرت، بێ ئەوەی ئاوڕ بۆ دواوە بداتەوە، ڕاست لە پشت شەقامەکەوە بەرەو لای پۆلیس بەڕێ کەوت. هەر بەدەم ڕێگەوە تاپۆیەک بەرانبەری دەرکەوت. وەلێ بە لایەوە سەیر نەبوو، هەستی کرد کە دەبێت هەروا بێت، ئەو کاتەی لە "سننایا" دووجار تا زەوییەکە چەمایەوە، لە لای چەپیەوە، لە دووری پەنجا هەنگاوێکەوە، سۆنیای بینی، ئەو خۆی لە پشت یەکێک لە کوختە دارینەکانی مەیدانەکەوە شاردبووەوە، دیار بوو بە درێژایی هەموو ئەو ڕێگە ناخۆشە ئەو بە دوایەوە بووە. لەو چرکەساتەدا ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستی کرد و تێگەیشت کە سۆنیا لە ئێستاوە بۆ هەمیشە لەگەڵیدا دەبێت و دوای دەکەوێت، تەنانەت ئەگەر بۆ ئەوپەڕی دنیاش بێت و بۆ هەر جێگایەک کە چارەنووس بۆی بنێرێت، بەمە دڵی هەژا... بەڵام تازە گەیشتبووە دووڕیانەکە و کار لە کار ترازا بوو.

زۆر بێباکانە چووە ناو ساختمانەکەوە، دەبووایە بڕواتە نهۆمی سێیەمەوە، بە خۆی وت: "دەبێت بچمە سەرەوە". تێکڕا وای بە بیردا هات کە تا ئەو ساتە هێشتا دەرفەتی لەبەردەستایە، هێشتا زۆری ماوە و دەتوانێت لەبارەی گەلێک شتەوە بیروباوەڕی بگۆڕێت.

دیسانەوە هەمان پیسی، هەمان توێکڵ و پاشماوەی خواردن لەسەر پلیکانەکان فڕێ درابوون، دەرگای ماڵەکان تەواو لەسەر پشت و دیسانەوە هەمان ئەو مۆبەقانەی کە بۆگەنیان لێهەڵدەستا. ڕاسکۆلنیکۆڤ لەو جارەوە ئیتر نەهاتبووەوە بە ئێرەدا. پێی سڕ ببوو،

بەڵام بە لارەلارە دەڕۆیشت، تۆزێک وەستا تا هەناسەیەکی تازە بدات و بێتەوە سەر خۆی، بۆ ئەوەی "پیاوانە" بڕواتە ژووریَ.
لەپڕێکدا کەوتە هەڵسەنگاندنی بزاوتەکانی و بەخۆی وت: "ئاخر، ئەمە بۆ؟ لەپای چی؟ کە من بمەوێت پێکەکە تا دوادڵۆپ هەڵدەم، ئیتر هەرچۆنێک بێت چ جیاوازییەکی هەیە؟ چەند بەدتر، چاکتر".
لەو ساتەدا تاپۆی ئیلیا پتروڤیچ پورخی هاتە بەرچاو، بەڕاست من ئێستا بۆ لای ئەو دەچم؟ ئایا ناکرێت بڕۆم بۆ لای یەکێکی دی؟ ناکرێت بچم بۆ لای نیکۆدیم فومیچ، ئەی چۆنە بگەڕێمەوە بۆ لای لێکۆڵەرەوەکەی خۆم و بڕۆمە ماڵەکەی، بۆ ئەوەی هیچ نەبێت خۆمانە کارەکە ئەنجام بدرێت؟... نا، نا، پێویستە بچمە لای پورخ، لای پورخ، کە من بمەوێت پێکەکە هەڵدەم، دەبێت تا دوادڵۆپ بە سەرییەوە بنێم..".
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە جەستەی سارد و خۆلەدەستدانەوە، دەرگای دەفتەرخانەکەی کردەوە، ئەم جارەیان خەڵکی کەم لێبوو، تەنیا دەرگاوانێک و پیاوێکی ڕەمەکی لەوێدا وەستابوون. پاسەوانەکەیش لە جێگای خۆی نەجووڵا.
ڕاسکۆلنیکۆڤ چووە ژوورێکی تر و بە خۆی وت: "هێشتا دەرفەتی ئەوەم ماوە کە هیچ نەڵێم" لە ژوورەکەدا پۆلیسێک کە کاری نوسینی دەکرد، بە بەرگی نافەرمییەوە، کارەکانی ڕێک دەخست، تا لە پشت مێزی نووسینەوە خەریکی کاری خۆی بێت، لە سووچێکی تری ژوورەکەدا نووسەرێکی دی دانیشتبوو. زامیوتوف لەوێ بوو، نیکۆدیم فومیچ لەوێ نەبوو.
ڕاسکۆلنیکۆڤ پرسیاری لە یەکێکی پاڵ مێزی نووسین کرد، وتی:
- کەسی لێنییە؟

- کێت دەوێت؟
لە ناکاوێکدا دەنگێکی ئاشنا بەرز بووەوە:
- بەه، بەه، دەمێکە نە دەتبینم و نە هەواڵت دەزانم... بۆن بۆنی دۆستە... نازانم چیرۆکە رووسییەکە چۆنە! رێز و سڵاوم.
راسکۆلنیکۆڤ مووچرکی پێدا هات، پورخ بەرانبەری وەستا بوو، ئەو لەپڕێکدا لە سێیەم ژوورەوە هاتە دەرێ، راسکۆلنیکۆڤ بە خۆی وت: "ئەمە چارەنووسەکەیە، ئەگینا بۆ لێرەیە؟"
ئیلیا پتروڤیچ کەوتەوە قسە:
- هاتوویت بۆ لای ئێمە؟ بۆ؟
دیار بوو زۆر رووی خۆش بوو، رەنگە تۆزێکیش هەڵچووبێت:
- ئەگەر بۆ کارێک هاتوویت، هێشتا کات زووە، خۆیشم هەر بە رێکەوت ئێستا هاتووم... وەلێ باشە، دەتوانم چیت بۆ بکەم، من دانی پێدا دەنێم... کە... بمبوورە... ناوەکەت...
- راسکۆلنیکۆڤ.
- تەواوە، بێگومان راسکۆلنیکۆڤ، بەڕاست دەتوانیت وێنای بکەیت کە من لە بیرم نەمابوویت! تکایە زۆر بە کەمتەرخەمیشم مەزانە... رادیون را... را... دیڤونیچ، ناوەکەت راستە؟
- رادیون رومانوڤیچ.
- بەڵێ، بەڵێ، رادیون رومانوڤیچ، رادیون رومانوڤیچ، منیش دەمویست وای بڵێم، تەنانەت چەند جارێکیش هەواڵم پرسیت، دانی پێدا دەنێم، زۆر داخم پێخوارد کە بەو جۆرە لەگەڵتا جوڵاینەوە... دوایی بۆیان باس کردم، تێگەیشتم کە تۆ لاوێکی ئەدیب و تەنانەت زانایت، بەڵام وەک دەڵێن ئەمە یەکەم هەنگاوتانە... ئای خودایا... ئاخر، کامە ئەدیب و زانا لە سەرەتادا، کاری سەیروسەمەرە ناکات!

من و ژنەکەم هەردووکمان ڕێز لە ئەدەبیات دەگرین، ژنەکەم هەر تەواو شەیدای ئەدەبە... ئەدەب و هونەر... دەشێت مرۆڤ لە خۆیدا نەجیب بێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە بە ئەقڵ و زانست و بلیمەتی بە دەستی بهێنێت. ئەم کڵاوە، باشە، مانای کڵاو سەرپۆشە، دەتوانم لە پێشانگای "تسیمرمان" بیکڕم، بەڵام ئەی ژێرکڵاوەکە چییە و ئەوە چییە کە کڵاوەکە دایپۆشیووە، من ناتوانم ئەمەیان بکڕم... لە ڕاستیدا من دەمویست بێم بۆ لات و شتەکانت بۆ ڕوون بکەمەوە، بەڵام بیرم کردەوە: ڕەنگە، ڕەنگە... وەلێ بۆ لێت ناپرسم کە بەڕاست کارێکت هەیە؟ دەڵێن کەسوکارت هاتووە، وایە؟

- بەڵێ، دایکم و خوشکم.

- من بە خۆشی و شانازییەوە خوشکتم بینی، کچێکی ڕوناکبیرە و گەلێک قەشەنگە، دانی پێدا دەنێم کە من پەشیمانم لەوەی ئەوسا بەیەکدا هەڵشاخاین، ئیدی ڕێکەوتێک بوو، بەڵام ئەوسا، لە کاتی بوورانەوەی تۆدا، بە چاوی گومانەوە تەماشام کردبێتی، ئەوە لە دواییدا زۆر بە ئاشکرا هۆکاری بوورانەوەکە دەرکەوت. دەمارگیری و تێنەگەیشتنی من بوو، من لە توورەییت تێدەگەم، ڕەنگە بە هۆی هاتنی خێزانەکەتەوە ماڵەکەتان بگۆڕیت وایە؟

- نـ... نا، منیش... هاتووم بپرسم... وامدەزانی لێرە زامیوتوفم دەست دەکەوێت.

- ئا، بەڵێ، ئاخر، ئێستا ئێوە بوونەتە هاوڕێ، بیستوومە، باشە، زامیوتوف لێرە نییە، نایشیدۆزیتەوە، بەڵێ، ئێمە ئەلکساندەر گریگوریڤیچمان لەکیس چوو. لە دوێنێوە ئیدی لەم بەشەدا کار ناکات، وازی هێناوە... لەکاتی وازلێهێنانیشدا، قسەی زبری کرد و جوێنی پێداین، بە جۆرێک کە... بێحورمەتیی کرد... کوڕێکی سەرچڵە، تەنانەت

جێی ئومێدمان بوو، بڕوانە، ئەمەیش لاوە ڕەندەکانی ئێمە! لەوە دەچوو بیەوێت تاقیکردنەوە بکات، وەلێ ئێمە دەزانین، ئەوەندەی بەسە خۆی بگرێت و قسەی زل زل بکات. تاقیکردنەوەکە بەم ئەنجامە دەگات. ئاخر، ئەو نە وەک تۆ وایە نە وەک ڕازومیخینی هاوڕێت، کار و پیشەی ئێوە زانستە، شکستخواردن لە ڕێگەتان لانادات، دەتوانین بڵێین، بۆ ئێوە هەموو خۆشییە فریوودەرەکانی ژیان، هیچە، تۆ پیاوێکی خەڵوەتیت، دەستت لە دنیا شتووە و حەزت بە تەریکییە... تۆ سەروکارت لەگەڵ کتێب و قەڵەم و لێکۆڵینەوەی زانستیدایە... ڕۆحی تۆ ئەمانەی گەرەکە، خۆیشم تا ڕادەیەک... تۆ سەفەرنامەی "لیڤینگستون"[1]ت خوێندۆتەوە؟

- نەخێر.

- من خوێندومەتەوە، لەم ڕۆژانەدا نەهلیستییەکان لە زیادبووندان. باشە، دیارە لەبەرچییە، ئاخر، ئەمە چ دەوروزەمانێکە، لە تۆ دەپرسم؟ وەلێ من لەگەڵ تۆدا... ئاخر، بێگومان تۆ نەهلیستی نیت! حەزدەکەم وەڵامێکی ڕوون و بێ پێچوپەنام بدەیتەوە.

- نـ... نا.

- نا؟ دەتوانیت لەگەڵمدا زۆر بە ڕاشکاوی ڕای خۆت دەرببڕیت، شەرمی پێناوێت، لە تەنیایدا چۆنیت هەر وابە، کارمەندی شتێکە و... شتێکی ترە... ها، تۆ واتدەزانی دەڵێم "هاوڕێیەتی" نا، بۆچوونەکەت وا

---

[1] لیڤینگستون (livingstone): داڤید لیڤینگستون گەشتیارێکی ئینگلیزییە، گەشتی بە ناوەڕاست و باشووری ئەفریقادا کردووە. بە ناوی "دۆزینەوەکانی ناو ئەفریقای ناوەند" ساڵی ١٨٦٥ لە لەندەن بڵاو کراوەتەوە. ساڵی ١٨٦٧ نیکولاستراخوفی هاوڕێی دوستویفسکی کردوویەتی بە ڕووسی –و–.

دەرنەچوو. هاوڕێیەتی نالێم، وەلێ هەست بە ئەرکی مرۆڤایەتی، هەست بە مرۆدۆستی و عەشقی خودای مەزن. دەشێت من کارمەندی دەوڵەت بم و کاری ڕەسمی بکەم، بەڵام پێویستە لەسەرم هەمیشە مرۆڤ بم و هەست بە مرۆڤایەتی بکەم و ئاگاداریشی بم، بۆ نموونە، تۆ ئێستا باسی زامیوتۆفت کرد، ڕەنگە زامیۆتوف لە شوێنێکی بەدناودا، لەسەر شێوازی فەڕەنسیەکان بیکات بە هەراوهوریا، تەنیا لەبەر ئەوەی پێکێک شامپانیا، یان ئارەقی خواردۆتەوە... بەڵێ، ئەمە زامیوتوفەکەی تۆیە، بەڵام من، ڕەنگە بتوانم بڵێم بە دڵسۆزییەوە کار دەکەم و سۆزە مەزن و باڵاکان دامدەگیرسێنن. پاشان من خاوەنی پلەوپایەی خۆمم و کارێکم بەدەستە. ژنم هێناوە و منداڵم هەیە، ئەو ئەرکە بەجێ دەهێنم، کە دەکەوێتە ئەستۆی هاونیشتمانییەک و مرۆڤێک. بەڵام مۆڵەتم بدەرێ بپرسم ئەو کێیە؟ هەڵسوکەوتی من لەگەڵ تۆدا ڕەفتاری کەسێکە لەگەڵ مرۆڤێکی ڕوناکبیردا، بەڕاست لەم دواییەدا ژمارەی مامان زۆری زیاد کردووە!

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە سەرسامییەوە لێی ڕوانی، قسەکانی ئیلیا پتروڤیچ، کە دەتوت تازە لەسەر سفرەی خوێندنەوەوە هێنابوونی، لە گوێیدا وەک کۆمەڵێک وشەی بێمانا زرنگانەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا هەرچۆنێک بوو لە هەندێکیان تێگەیشت. لە حاڵەتێکی پرسیارئامێزدا وەستابوو و نەیدەزانی ئەم بەزمە کەی کۆتایی دێت.

ئیلیا پتروڤیچ لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو:

- مەبەستم لەو ژنانەیە کە قژیان دەبڕن، ناوم ناون مامان و بڕوایشم وایە کە ناوەکە پڕ بە پێستیانە، هە، هە، هە! لە زانکۆ دەخوێنن. توێکاری دەکەن. باشە، تووخوا پێم بڵێ، ئەگەر نەخۆش بکەوم، یەکێک لەو ژنانە دەهێنم بۆ چارەسەرکردنم؟ هە، هە، هە!

ئیلیا پتروڤیچ پێدەکەنی و بە قسە خۆشەکانی خۆی زۆر قایل بوو.
- با بڵێین ئەوانە زۆر تینووی فێربوون و ڕوناکبیرین، باشە، کە بوونە ڕوناکبیر و فێر بوون، ئیتر بەسە، وەلێ زامیوتوف زیادەڕۆیی دەکات. ئاخر بۆ دەبێت سووکایەتی بە مرۆڤی شەریف بکرێت؟ وەک ئەوەی زامیوتوفی بێچاووڕوو دەیکات؟ من لە تۆ دەپرسم بۆ دەبێت سووکایەتی بە من بکات؟ خۆکوژی چەندە زیادی کردووە، ناتوانیت وێنای بکەیت، ئەمانە دواپوولیان خەرج دەکەن و خۆیان دەکوژن، کچ، کوڕ، پیر... هەر ئەمڕۆ بەیانی لەبارەی پیاوێکی تازەهاتووەوە ئاگادار کراین.. جەنابی نیل پاڤلیچ، ئەو بەڕێزەی ئاگادار کراین لە شەقامێکی پتروزبورگدا خۆی کوشتووە، ناوی چییە؟
لە ژوورێکی تەنیشتیدا، بە دەنگێکی گیراو و کەمتەرخەمانە یەکێک وەڵامی دایەوە:
- سڤیدریگایلۆڤ.
ڕاسکۆلنیکۆڤ لەرزی و هاواری کرد:
- سڤیدریگایلۆڤ! سڤیدریگایلوڤ خۆی کوشتووە!
- چۆن؟ تۆ سڤیدریگایلۆڤ دەناسیت؟
- بەڵێ... دەیناسم... تازە هاتۆتە ئێرە.
- وایە، تازە هاتووە، ژنەکەی مردووە، کەسێکی هەڵەشە و سەرەڕۆیە. لە ناکاوێکدا خۆی کوشتووە، لە بارێکی زۆر ناهەمواردا، چەند وشەیەکی لە دەفتەرێکدا نووسیووە کە بە بیرو هۆشێکی تەواو تەندروستەوە دەمرێت، داوایش دەکات کەس لە مردنیدا تاوانبار نییە. دەڵێن دەوڵەمەندە، تۆ لە کوێوە دەیناسیت؟
- من... دەیناسم، خوشکم لەماڵیاندا پەرستار بووە.

- سەیرە، سەیرە! کەواتە دەتوانیت لەبارەیەوە زانیاریمان بدەیتێ، تۆ هەستت پێنەدەکرد.

- دوێنێشەو بینیم... شەرابی دەخواردەوە... ئاگام لە هیچ نەبوو.

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستی کرد بارێکی گرانی لەسەرە و خەریکە لەژێریدا دەپلیشێتەوە.

- لەوە دەچێت دیسان ڕەنگت هەڵبزڕکابێت، هەوای ئێرە گەلێک خەفەخانە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ کەوتە ورتەورت:

- بەڵێ، دەبێت بڕۆم، ببوورە بێزارم کردیت...

- نا، هەرگیز، لە خزمەتتام، خۆشحاڵت کردم، زۆر شادمانم کە پێت بڵێم...

ئیلیا پتروڤیچ تەنانەت دەستیشی بۆ خواحافیزی درێژ کرد.

- من دەمویست.... تەنیا... هاتبووم بۆ لای زامیوتوف...

- دەزانم، دەزانم، شادمانت کردم.

ڕاسکۆلنیکۆڤ زەردەخەنەیەکی کرد و وتی:

- من... گەلێک شادمانم... خوات لەگەڵ.

چوە دەرەوە، لارەلارەی بوو، سەری بە جۆرێک گێژی دەخوارد نەیدەزانی بەسەر پێوە وەستاوە یان نا، لە کاتێکدا دەستی ڕاستی بە دیوارەکەوە گرتبوو، لە نەردەوانەکە دابەزی، وای هاتە بەرچاو کە دەرگاوانێک، دەفتەرێکی بەدەستەوە، بەرەو ژوورێکی پۆلیس دەچوو، بەرانبەر بەم هات و خۆی پێدا کێشا، سەگێک لە قاتی خوارەوە دەوەڕی، ژنێک بەردێکی گرتە سەگەکە و هاوارێکی لێکرد، کە گەیشتە خوارەوە، چووە ناو سالۆنەکە، لەوێ، نزیک بە دەرگای دەرەوە

سۆنیای بینی، ڕەنگی پەڕیوو وەک مردوو وەستا بوو، بە ترس و سەرسامییەوە تەماشای ئەمی دەکرد.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بەرانبەری وەستا، دەموچاوی کچەکە ئازار و نائومێدیی لێدەباری. سۆنیا دەستی ڕاوەشاند، زەردەخەنەیەکی ناهەمواری کەوتە سەر لێو، ڕاسکۆلنیکۆڤ وەستا، زەردەخەنەیەکی هاتێ و سەرلەنوێ بەرەو سەرەوە، بۆ دەفتەرخانەکەی پۆلیس کە تۆزێ لەو پێش لەوێ بوو، گەڕایەوە.
ئیلیا پتروڤیچ دانیشتبوو، پەڕە کاغەزەکانی بەردەمی سەروخوار دەکرد. هەمان ئەو پیاوەی کە تۆزێک لەمەوبەر، لەکاتی سەرکەوتنی پلیکانەکاندا خۆی پێداکێشا بوو، لەوێ بوو.
ئیلیا پتروڤیچ کە بینی، هاواری لێکرد:
- ها؟ خۆتیت؟ هیچت لە بیر چووە؟ باشە ئەوە چیتە؟
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە لێوی سپی داگەڕاو و ڕوانینێکی وشکەوە لەسەرخۆ لێی نزیک کەوتەوە، چووە پاڵ کورسییەکەی، دەستی نایە سەر، ویستی شتێک بڵێت، وەلێ نەیتوانی، تەنیا دەنگێکی بێمانای لێوە هات.
ئیلیا پتروڤیچ وتی:
- نەخۆشیت، فەرموو، دابنیشە، لەسەر کورسییەکە دابنیشە، ئاوی بۆ بهێنن.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بەسەر کورسییەکەدا کەوت، بەڵام چاوی لە ڕووی ئیلیا پتروڤیچ هەڵنەبڕی کە سەرسامی دایگرتبوو، هەردووکیان، بۆ چرکەساتێک لە یەکتریان ڕوانی و چاوەڕێ بوون، ئاوەکەیان بۆ هێنا.
ڕاسکۆلنیکۆڤ بە هێوری ئاوەکەی دایە دواوە، لەسەرخۆ بەڵام زۆر بە ڕوونی وتی:

- ئەوە من بووم کە ژنە سووخۆرەکە و لیزاڤیتای خوشکیم بە تەور کوشت و شتەکانیانم دزی.
ئیلیا پتروڤیچ دەمی داچەقاندبوو، لە هەموو لایەکەوە خەڵکەکە هاتن و دەوریان گرتن.
ڕاسکۆلنیکۆڤ دانپێدانانەکەی دووبارە کردەوە.

## ١

سیبریا، لەسەر کەنارێکی چۆڵی ڕووبارێکی پانوپۆڕدا، شارێک هەیە یەکێکە لە مەڵبەندەکانی بەڕێوەبردن لە ڕووسیادا، لەو شارەدا قەڵایەک و لە ناو قەڵاکەیشدا زیندانێک هەیە، کەسێک بە ناوی ڕادیون ڕاسکۆلنیکۆڤەوە، نۆ مانگە لەو زیندانەدایە، فەرمانی گرتنەکەی پلەدووە، کە بریتییە لە دوورخستنەوە و کاری گران پێکردن. لەو ڕۆژەوەی تاوانەکەی تیا ئەنجام داوە تا ئێستا، نزیکەی ساڵونیوێک تێپەڕیووە.

دادگاییکردنەکەی بەبێ کێشە و دەردەسەری بەڕێوە چوو، چونکە تاوانبارەکە جەختی لەسەر دانپێدانانەکەی خۆی کرد و بە ڕوونی و وردییەوە دووبارەی کردەوە، بێ ئەوەی پێچوپەنا بخاتە کارەکەوە، بێ ئەوەی سوودی خۆی لەبەرچاو بگرێت، بێ ئەوەی بەڵگەیەکی درۆ بخاتە ڕوو، بێ ئەوەی بچووکترین ڕووداوی فەرامۆش کردبێت، تا دوانوختە، تەواوی بەسەرهاتی کوشتنەکەی گێڕایەوە. نهێنیی بارمتەکانی خۆی ڕوون کردەوە –ئەو قوتووەی بە کانزایەک چواردەوری گیرابوو و بە دەست پیرێژنە کوژراوەکەوە بوو– بە

درێژی باسی ئەوەی کرد کە چۆن کلیلەکانی لە گیرفانی کوژراوەکە دەرهێناوە. لە کلیلەکان دوا و چۆنیەتیی سندوقەکەی پیرێژن و ئەو شتانەی لە ناویدا بوون، تەنانەت بە جیاجیا ناوی هەندێک لەو شتانەی هێنا، کوشتنە نابەجێکەی لیزاڤێتایشی ڕوون کردەوە. باسی ئەوەی کە چۆن کوخ لە دەرگای داوە، دوای ئەویش چۆن قوتابیەک هاتووە و لە دەرگاکەی داوە. هەموو ئەو گفتوگۆیانەی لە نێوان ئەو دووانەدا کرابوون، گێڕانییەوە. پاشان هاتە سەر ئەوەی چۆن دوای ئەنجامدانی تاوانەکە بە ڕاکردن لە پلیکانەکان هاتۆتە خوارێ و گوێی لە هەراوزەنای نیکۆلاو دیمیتری بووە. چۆن لە ماڵە چۆڵەکەدا خۆی شاردۆتەوە و پاشان گەڕاوەتەوە ژوورەکەی خۆی. لە کۆتاییدا ناونیشانی ئەو بەردە گەورەیەی هەڵدا، کە لە شەقامی "ڤازنسنکی" لەژێر دەروازەیەکدایە و پارە و کیفە ڕەشەکەیان لەژێریدا دۆزییەوە. بە کورتی، بە پاککراوی هەموو شتەکان خرانە ڕوو. لێکۆڵەر و دادوەرەکان گەلێک لەوە سەرسام بوون کە کیفی پارە و شتەکانی لەژێر بەردێکدا شاردۆتەوە بێ ئەوەی سوودیان لێببینێت، وەلێ زیاتر لەوە سەریان سووڕما کە نەک تەنیا شتە دزراوەکانی بە درێژی لە بیر نەبوو بەڵکو لە ژمارەیشیاندا هەڵەی دەکرد. بە تایبەتی کە تاقە جارێک کیفی پارەکەی نەکردۆتەوە و نەیدەزانی چەندی تیا بووە، - پێدەچوو کیفەکە سێسەدوحەفتا ڕۆبڵ و سێ پارچەی بیست کوپیکیی تیا بووبێت، لەبەر زۆرمانەوەیان لەژێر بەردەکەدا، هەندێک لە دراوە کاغەزییەکان کە لەسەرەوە دانرابوون زیانیان پێکەوتبوو- دادوەرەکان ماوەیەکی زۆر هەوڵیاندا لەوە تێ بگەن کە بۆچی تاوانبارەکە تەنیا لەم نوختەیەدا درۆ دەکات، لە کاتێکدا لە هەموو مەسەلەکانی تردا خۆبەخۆ و بە ڕاستودروستی دانیان پێدا دەنێت؟

سەرئەنجام هەندێکیان –بەتایبەتی سایکۆلۆژییەکان- ئەوەیان سەلماند کە ڕەنگە تەماشای ناو کیفەکەی نەکردبێت، ئەوەیشیان ڕوون کردەوە کە ئەو نەیزانیووە ناو کیفەکە چی تیایە، بەڵکو هەروا بردویەتی و خستوویەتە ژێر بەردەکەوە. بۆیە گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە خودی تاوانەکە لە ئەنجامی نۆرەشێتییەکی کاتییەوە بووە کە چرکەساتێکە لە "مونومانیا"، واتا کوشتن و دزین بێ ئەوەی ئامانجی دووری لە دواوە بێت و حساب بۆ سوود و قازانج کرابێت.

لەو بارەیەوە پەنایان بردەبەر تێزێکی تازە دەربارەی تێکچوونی کاتیی ئەقڵ، کە لەو ڕۆژانەدا دەیانویست ئەو تێزە بەسەر هەندێک تاوانباردا ئەنجام بدەن، بێجگە لەمەیش، ئەو بیرپەرتی و نائومێدییەی بۆ ماوەیەکی زۆر ڕاسکۆلنیکۆڤی داگرتبوو، چەند کەسێک شایەتییان لەسەر دا، وەک دکتۆر زوسیموف، کۆنە هاوڕێکانی، خاوەن خانووەکە و کارەکەرەکە، هەموو ئەمانە یارمەتیدەری ئەو ڕایە بوون کە ڕاسکۆلنیکۆڤ نە لە بکوژ دەچێت و نە لە دز و ڕێگر، بەڵکو ئەم شتێکی ترە، کە جیاوازە لە تاوانباری ئاسایی. لەبەر ئەوەی خودی تاوانبارەکە تا ڕادەیەک بە هیچ جۆرێک بەرگریی لەخۆی نەکرد، ئەمەیش بوو بە هۆی ئەوەی کە لایەنگرانی ئەو تێزە زۆر تووڕە بن. تەنانەت کاتێک پرسیاری ئەوەی لێکرا کە هۆی خەڵککوشتن و دزیکردنی چی بووە، ڕاسکۆلنیکۆڤ تا ڕادەیەک بە ڕوونی و وردەکارییەوە وەڵامی دایەوە، کە ئەنگێزەی کارەکەی باری ژیان، هەژاری، بێتوانایی، ئارەزوومەندییەتی بۆ هەنگاونان و جێپێ خۆشکردن بۆ ژیانی ئایندە بووە، کە دەیتوانی بە هۆی سێ هەزار ڕۆبڵەوە کە بەهیوا بوو لای ژنە کوژراوەکە دەستی بکەوێت، دەهاتە دی. بڕیاری کوشتنەکەی لە ئەنجامی مێشکپووچی و بێغیرەتی و

ڕقێکەوە بووە، کە هاوسەنگ بووە لەگەڵ هەژاری و شکستخواردنەکانیدا. لە وەڵامی ئەو پرسیارەیشدا کە چی وای لێکردووە دان بە تاوانەکەدا بنێت، بێ سێودوو وەڵامی دایەوە: پەشیمانییەکی ڕاستگۆیانە، هەموو قسەکانیشی تا ڕادەیەک بە زمانی زبر دەوت...

لەگەڵ ئەوەیشدا دوافەرمانی دادگا لەسەر تاوانەکە زۆر لەوە سوکتر بوو کە چاوەڕێ دەکرا، ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێت کە خودی تاوانبار نەک نەیدەویست تاوانەکە لەسەر خۆی نەهێڵێت و ڕزگاری بێت، بەڵکو ئارەزووی لێبوو چەند بتوانێت زیاتر خۆی تاوانبار بکات. سەروبەندی مەسەلەکە بە هەموو تایبەتمەندی و نائاساییەکانییەوە لەبەرچاو گیرا. حاڵەتی نەخۆشی و نەبوونی تاوانبار پێش ئەنجامدانی تاوانەکە بچووکترین گومانی بۆ نەهێشتنەوە. ئەو حاڵەیش کە ڕاسکۆلنیکۆڤ لە شتە دزراوەکان هیچ سوودێکی نەدیبوو، تا ڕادەیەک درایە پاڵ ئەوەی کە هەستی بە پەشیمانی کردووە و لە لایەکی تریشەوە پەیوەندیی بە حاڵەتی ناسروشتیی ئەقڵیەوە هەبووە کە لە کاتی ئەنجامدانی تاوانەکەدا تووشی هاتووە. بە ڕێکەوت کوشتنەکەی لیزاڤیتایش تا ڕادەیەک ئەم بەڵگەیەی دوایی دەسەلماند: کەسێک دوان دەکوژێت، کەچی لە بیری دەچێت دەرگاکە کراوەتەوە! بێجگە لەوەی کە ئەم خۆبەدەستەوەدان و دانپیانانە لە کاتێکدایە کە بە هۆی دانپیانانێکی درۆی نائومێدێکی تری وەک نیکوڵاوە، لێکۆڵینەوەکە گەلێک ئاڵۆزی تێکەوتبوو، کە لەم حاڵەتەدا تاوانباری ڕاستەقینە نەک هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە، بەڵکو تەنانەت بەدگومانیشیی لێناکرێت — پۆرفیری پتروڤیچ بەڵێنەکەی خۆی بە چاکی بردە سەر- هەموو

ئەمانە بوون بە هۆی ئەوەی کە دادگا فەرمانی سزادانەکەی سووک بکات.

بێجگە لەمانە، هەندێک پێشهاتی چاوەڕواننەکراو ڕوویان دا کە زۆر لە قازانجی تاوانباردا بوون، ڕازومیخینی خوێندکاری پێشوو، کەس نەیدەزانی لە کوێوە چەند بەڵگەیەکی هێنابوو ئەوەیان دەسەلماند کە تاوانبار، کاتێک قوتابیی زانکۆ بوە، بەو دەرامەتە کەمەی لەبەر دەستیدا بووە، بۆ ماوەی شەش مانگ یارمەتی هاوڕێیەکی خۆی داوە، کە هەژار بووە و تووشی نەخۆشی سیل هاتووە، کە هاوڕێ جوامێرەکەی مردووە، ئینجا ڕاسکۆلنیکۆڤ کەوتۆتە هاریکاریکردنی باوکە نەخۆش و پیرەکەی ئەو قوتابیە (هەر لە تەمەنی سیانزە ساڵییەوە ئەو قوتابییە هەژارە تاقەکەسێک بووە یارمەتیی باوکی داوە و ژیاندویەتی). پاشانیش ڕاسکۆلنیکۆڤ ئەو پیرەمێردەی بردۆتە خەستەخانە، کە دوای ماوەیەک مردووە، ڕاسکۆلنیکۆڤ بە پارەی خۆی کفنودفنی کردووە. هەموو ئەم هەواڵانە کاریگەرییەکی باشی لەسەر چارەنووسی ڕاسکۆلنیکۆڤدا هەبوو. خاوەن ماڵە کۆنەکەی ڕاسکۆلنیکۆڤ کە دایکی دەزگیرانە کۆچکردووەکەی بوو، واتا خاتوو زارنیتسینای بێوەژن، ئەویش لای خۆیەوە شایەتیی دا کە کاتێک ئەوان لە خانوویەکی تردا بوون لە دەوروبەری شەقامی "پێچی پێنجەم"، ڕاسکۆلنیکۆڤ لە شەوێکی ئاگربەربوونەوەدا دوو منداڵی لە ماڵێکدا ڕزگار کردبوو، کە کەمێک سووتابوون، خۆیشی لەو کارەدا ئازاری پێگەیشتبوو، زۆر بە وردی و لە ڕێگەی چەند شایەتێکەوە بە چاکی لەم مەسەلەیە کۆڵرایەوە، بە کورتی، بەسەرهاتەکە بەو شێوەیە کۆتایی پێهات کە تاوانبار، بە هۆی ڕێزلێگرتن و خۆبەدەستەوەدان و دانپێدانانی بە تاوانەکەیدا و هەندێک خاڵی دی کە سزاکەی سووک

دەکرد، دادگا فەرمانی تەنیا هەشت ساڵ گرتنی بەسەردا دا لەگەڵ کاری گران پێکردنی پلەدوودا.
هێشتا سەرەتای دادگاییکردنەکە بوو کە دایکی ڕاسکۆلنیکۆڤ نەخۆش کەوت. دونیا و ڕازومیخین توانیان بە درێژایی دادگاییکردنەکە بیبەنە دەرەوەی پترۆزبورگ. ڕازومیخین شارێکی هەڵبژارد کە لەسەر ڕێگەی ئاسن و نزیک بە پترۆزبورگ بوو، بۆ ئەوەی بتوانێت بەردەوام ئاگاداری بەسەرهاتەکانی نێو دادگا بێت و لە هەمان کاتیشدا بتوانێت هەندێکجار ئاڤدوتیا ڕۆمانۆڤنا ببینێت.
نەخۆشییەکەی پولخێریا ئەلێکساندرۆڤنا کەمێک سەیر و هاوزەمان بوو لەگەڵ حاڵەتی تووڕەیی و تێکچوونی مێشکیدا، دونیا، پاش گەڕانەوەی لە دوادیداری کاکی، دایکی لەوپەڕی نەخۆشی و تا و وڕێنەکردندا بینی، هەر لەو شەوەدا دونیا لەگەڵ ڕازومیخیندا ڕێکەوت، لە وەڵامی پرسیاری دایکیدا لەبارەی ڕاسکۆلنیکۆڤەوە، چی بڵێت. تەنانەت چیرۆکێکیان دروست کرد گوایا ڕاسکۆلنیکۆڤ بۆ ئەنجامدانی کارێکی تایبەتی، کە پارە و ناوبانگی لێ دەست دەکەوێت، ناچار بووە بەرەو شوێنێکی هەرە دووری سنووری ڕووسیا سەفەر بکات. بەڵام هەردووکیان سەریان لەوە سووڕما کە پولخێریا ئەلێکساندرۆڤنا، دەربارەی ئەم مەسەلەیە نە ئەوسا و نەدوایی پرسیارێکی نەکرد. بە پێچەوانەوە خۆی چیرۆکێکی بەداروباری لەبارەی سەفەرە کتوپڕەکەی کوڕەکەیەوە ڕازاندبووەوە. بەدەم فرمێسکڕشتنەوە باسی ئەوەی دەکرد چۆن ڕودیا بۆ خوداحافیزی لێکردنی هاتۆتە لای، ئاماژەی بەوە دەدا کە تەنیا ئەو لە گەلێک کاروبار و نهێنیی کوڕەکەی ئاگادارە و دەزانێت ڕودیا دوژمنی زۆر سەرسەختی هەن. بۆیە ناچارە خۆی بشارێتەوە، وەلێ دەربارەی

کاری ئاییندەی کوڕەکەی، کەمترین گومانی نەبوو کە دوای سەرکەوتن بەسەر هەندێک لەو کارە دژوارانەدا، ئاییندەیەکی ڕووناکی لە بەردەمدایە. تەنانەت ڕازومیخینی لەوە دڵنیا دەکرد کە کوڕەکەی لە ئاییندەدا دەبێتە یەکێک لە پیاوانی گەورەی دەوڵەت. بەڵگەیشی وتارەکەی و بەهرە ئەدەبیە درەوشاوەکەیەتی، بەردەوام ئەو وتارەی دەخوێندەوە، تەنانەت هەندێکجار بە دەنگی بەرز دەیخوێندەوە و تا ڕادەیەک بەدەمیشیەوە خەوی لێدەکەوت. لەگەڵ ئەمانەیشدا هەرگیز لە شوێنی ڕاسکۆلنیکۆڤی نەدەپرسی، هەرچەندە دەیزانی ئەوانەی دەوروبەری خۆیان لەو باسە گێل دەکەن، ئەمەیش لە خۆیدا دەشیا بەدگومانیی تێدا دروست بکات. وردەوردە بێدەنگییە سەرسوڕهێنەرەکەی پولخێریا ئەلێکساندرۆڤنا لەبارەی هەندێک کاروبارەوە ترس و نیگەرانی لای دونیا و ڕازومیخین دروست کرد. بۆ نموونە تەنانەت سکاڵای ئەوەی نەدەکرد کە بۆ کوڕەکەی نامەی بۆ نانێرێت. لە حاڵێکدا ئەو کاتەی لە شارە بچووکەکەی خۆیدا دەژیا، تەنیا بەهیوای گەیشتنی نامەی ڕودیای ئازیزەوە ژیانی بەسەر دەبرد. حاڵەتەکە نەدەزانرا چییە و دونیایشی نیگەران کردبوو. لەوە ترسا نەکا دایکی لەبارەی چارەنووسی سامناکی کوڕەکەیەوە هەستێکی کردبێت، لەبەر ئەوە ناپرسێت نەک هەواڵێکی ترسناکتر ببیستێت. تێکڕا دونیا چاک ئەوەی دەزانی کە پولێخریا ئەلێکساندرۆڤنا توانای ئەوەی نییە داوەرییەکی ڕاستودروست لەسەر مەسەلەکان بکات.

لەگەڵ ئەمانەیشدا دووجار وا ڕێک کەوت کە خودی پولێخریا ئەلێکساندرۆڤنا قسەکانی بە جۆرێک هێناوبرد کە مەحاڵ بوو لە وەڵامدانەوەیدا ئاماژەی بە شوێنی ئێستای ڕودیا نەکرێت. چونکە وەڵامەکان تەمومژاوی بوون و گومانیان تیا دروست دەکرد، بۆیە

لەپڕێکدا خەمێکی زۆر دایدەگرت، گرژ و بێدەنگ و تا ماوەیەک هەروا دەمایەوە. پاشان دونیا زانی درۆکردن و پاساوی جۆربەجۆر هێنانەوە کارێکی نادروستە، تەواو گەیشتە ئەو ئەنجامەی کەوا چاکترە لەبارەی هەندێک شتی تایبەتیەوە بێدەنگ بێت. وەلێ وردەوردە زیاد لە جاران ڕوون بووەوە کە دایکە بێچارەکە چاوەڕێی پێشهاتی گەلێک ترسناک دەکات. دونیا قسەی کاکی بیر کەوتەوە کە: دایکی لە شەوی پێش ڕۆژە شوومەکەدا و لەو دیمەنەدا کە لەگەڵ سڤیدریگایلۆفدا بۆی پێش هات، گوێی لە وڕێنەکردنی دونیا بووە. ئاخۆ بە ڕاستی دەشێت لەو کاتەدا گوێی لە شتێک نەبووبێت؟ زۆرجار ڕێک کەوتووە، دوای چەندین ڕۆژ یان هەفتەی بێدەنگییەکی ترسناک و فرمێسکی هێور، نەخۆشەکە بە جۆرێکی نائاسایی تووشی هەڵچوون و هیستیریا دەهات و لەناکاوێکدا بە دەنگی بەرز و بێبڕانەوە، لەبارەی کوڕەکەی و ئومێد و ئارەزووەکانییەوە دەدوا... هەندێکجار خەیاڵەکانی زۆر سەیر بوون، ئەوان دڵیان دەدایەوە، قسەکانیان دەسەلماند- ڕەنگە خۆیشی هەستی بەوە کردبێت کە لەبەر ئەو وا دەکەن- بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا هەر قسەی دەکرد...

دوای پێنج مانگ لە دانپێدانانی تاوانبار بە کارەکەیدا، بڕیاری دادگای بەسەردا درا. ڕازومیخین چەندە دەرفەتی هەبووایە، بۆ سەرلێدانی دەچوو بۆ زیندان، سۆنیایش هەروا، کە کاتی لێکدابڕانیش گەیشت، دونیا سوێندی بۆ کاکی خوارد کە ئەمە دابڕانی یەکجاری نییە. هەروەها ڕازومیخینیش سوێندی بۆ خوارد. لە بیری لاویەتی و پڕ لە جۆشوخرۆشی ڕازومیخیندا، پڕۆژەیەک تا دەهات زیاتر گەڵاڵە دەبوو، کە لە سێ چوارساڵی داهاتوودا، ئەوەندەی بکرێت، زەمینەی دەرامەتێک بۆ خۆی فەراهەم بهێنێت، هەندێک پارە پاشەکەوت بکات و

بڕوات بۆ سیبریا، چونکە زەوی ئەوێ زۆر بەپیتە و دەستی کار و سەرمایە کەمە. هەر لەو شارەدا کە ڕودیا دەژی، ئەوانیش لەوێ نیشتەجێ بن.. هەموویش پێکەوە ژیانێکی نوێ بۆ خۆیان دەست پێبکەن.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە دوارۆژەکاندا گەلێک خەمبار بوو، بەردەوام هەواڵی دایکی دەپرسی و زۆر لێی دەترسا، دونیا گەلێک بەمە نیگەران بوو، کاتێک زانی دایکی نەخۆشە، تەواو تێک چوو، لەو ماوەیەدا زۆر کەم قسەی لەگەڵ سۆنیادا دەکرد. سۆنیا بە هۆی ئەو پارەیەوە کە سڤیدریگایلۆف بۆی دانابوو، دەمێک بوو خۆی ئامادە کردبوو دوای ئەو کاروانە زیندانییە بکەوێت کە ڕاسکۆلنیکۆڤیان لەگەڵدایە. لەو لایەنەوە هیچ قسەیەک لە نێوان ئەو و ڕاسکۆلنیکۆڤدا نەکرابوو. وەلێ هەردووکیان دەیانزانی مەسەلەکە هەروا دەشکێتەوە، لە دواماڵئاواییدا ڕاسکۆلنیکۆڤ زەردەخەنەیەکی سەیری کەوتە سەرلێو، کاتێک لە دەمی خوشکی و ڕازومیخینەوە ئەو جەخت و دڵنیاییکردنەوەی بیست کە دەربارەی بەختەوەریی هەموویان دووبارەیان دەکردەوە دوای ئەوەی لە تاراوگە دەگەڕێتەوە، ئەو پێشبینیی دەکرد لە ئەنجامی ئەو نەخۆشییەوە دایکی بەم زووانە دەمرێت. سەرئەنجام لەگەڵ سۆنیادا ڕێگەی تاراوگەیان لەبەر گرت.

دوای دوو مانگ دونیا و ڕازومیخین زەماوەندیان کرد، زەماوەندێکی بێدەنگورەنگ. لە نێوان ئەوانەدا کە بانگهێشت کرابوون، پۆرفیری پترۆڤیچ و زوسیموفیان تیابوو. لە هەموو ڕۆژانی دواییدا ڕازومیخین سیمای پیاوێکی بەبڕوا و خاوەن بڕیاری هەبوو، دونیا بڕوای کوێرانەی پێی هەبوو، کە ڕازومیخین گشت بڕیارەکانی بەجێ دێنێت و نەیدەتوانی بڕوا نەکات کە پیاوێکە خاوەن ئیرادەیەکی ئاسنینە، لە

لایەکی ترەوە ڕازومیخین سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە خوێندنی زانکۆ، بۆ ئەوەی ڕشتەکەی تەواو بکات. هەردووکیان نەخشەی ئاییندەی خۆیان دەکێشا، هەردووکیان ئەوەیان خستبووە بەرچاو کە دوای پێنج ساڵ هەر دەبێت بگەنە سیبریا، تا ئەو کاتەیش هەموو ئومێدێکیان بە سۆنیا بوو...

پولخێریا ئەلێکساندرۆڤنا بە زەماوەندی دونیا و ڕازومیخین خۆشحاڵ بوو، درووودی بۆ خوێندن، بەڵام دوایی خەم دایگرت و نائومێدتر بوو، بۆ ئەوەی دڵخۆش بێت، ڕازومیخین چیرۆکی قوتابییە نەخۆشەکە و باوکە پیرەکەی، چیرۆکی سووتان و لەناوجێکەوتنی پاری ڕودیا، واتا ئەو کاتەی کە دوو منداڵەکەی لە دەست مردن ڕزگار کرد، بۆ گێڕایەوە. هەردوو گوزارشتەکە لەڕادەبەدەر پولخێریا ئەلێکساندروڤنایان گەشاندەوە، هەرچەندە ئەقڵی کەمێک تێک چووبوو، بەڵام بەردەوام لەو باسانەی دەکرد، تەنانەت لەسەر شەقامەکانیشدا خەڵکی دەگرت و باسەکەی بۆ دەگێڕانەوە (هەرچەندە دونیا هەمیشە لەگەڵیدا بوو) لە ناو گالیسکە و پیشانگا و هەر جێگایەکی تردا دەربارەی کوڕەکەی و وتارەکەی و یارمەتی قوتابییەکە و سووتانی لە کاتی ئاگرکەوتنەوەدا، باسەکەی بۆ خەڵکی دەکرد، دونیا نەیدەزانی چۆن دایبمرکێنێت و هێوری بکاتەوە. چونکە بێجگە لەوەی ئەو هەڵچوونە ڕۆحییەی کاری دەکردە سەر تەندروستیی دایکی و مەترسیی هەبوو، لەوەیش دەترسا کە لەوانەیە یەکێک بە هۆی تازەیی دادگاییکردنەکەوە ناوی ڕاسکۆلنیکۆڤ بهێنێت و قسەی لەسەر بکات.

پولێخریا ئەلێکساندرۆڤنا تەنانەت ناونیشانی دایکی ئەو دوو منداڵەی دۆزیبیەوە، کە لە سووتان ڕزگاریان بووبوو، دەیویست هەرچۆنێک بووە، بڕوات و بیبینێت. سەر ئەنجام پەشێوی و تێکچوونەکەی دایە

مەترسی، لەپڕێکدا دەگریا، زۆرجار تا دەیگرت و دەکەوتە وڕێنە، سەرلەبەیانییەک کتوپڕ دەنگوی ئەوەی کرد کە بەم زوانە ڕودیا دەگەڕێتەوە، دەیگوت لە بیریەتی چۆن لە کاتی ماڵئاواییدا ڕودیا پێی وتووە دوای نۆ مانگ دەبێت ئەم چاوەڕێی گەڕانەوەی بێت. بۆیە کەوتبووە ڕێکوپێکخستنی ماڵ و ئامادەی پێشوازیکردنی بوو. ژوورێکی بۆ کوڕەکەی ڕازاندبووەوە –ژوورەکەی خۆی– مۆبیل و پەردە و شتەکانی تری پاک کردەوە. دونیا نیگەران بوو، بەڵام دەنگی نەکرد، تەنانەت یارمەتیی دایکی دا لە ڕێکخستن و ڕازاندنەوەی ژووری کاکیدا، دوای ڕۆژێک لە خەیاڵی بەردەوام و ئارەزووی خۆش و فرمێسکی نەبڕاوە، پولێخریا ئەلێکساندرۆڤنا شەو نەخۆش کەوت، لە بەرەبەیاندا تای لێهات و کەوتە وڕێنەکردن. نەخۆشیی پەرکەم لێی دیاری دا و دوای دوو هەفتە مرد.

لە کاتی وڕێنەکردنەکانیدا وتەی وای بە دەمدا دەهات، نیشانەی ئەوە بوون کە زیاد لەوەی کچەکەی و زاواکەی دەیزانن، ئەو لە چارەنووسی شوومی کوڕەکەی زۆرتر ئاگادارە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ تا ماوەیەکی زۆریش نەیزانی دایکی مردووە، هەرچەندە لە سەرەتای نیشتەجێبوونیانەوە لە سیبریا نامەیان لەگەڵ پترۆزبورگدا دەگۆڕییەوە. ئەم کارە هەموو مانگێک سۆنیا بە ڕێکوپێکی ئەنجامی دەدا، نامەی بۆ ڕازومیخین دەنارد و وەڵامی دەدرایەوە، لە سەرەتادا نامەکانی سۆنیا بە لای دونیا و ڕازومیخینەوە سارد و وشک دەهاتنە بەرچاو و بە هیچ جۆرێک قایلی نەدەکردن، وەلێ لە دواییدا هەردووکیان دڵنیابوون کە هەرگیز لەوە چاکتر نانووسرێت، چونکە لە نامەکاندا بە وردی و تێروتەسەلی ئاگاداری باری ژیان و چارەنووسی برا بەدبەختەکەیان دەبوون.

نامەکانی سۆنیا پڕ بوون لە گوزارشتی ژیانی ڕۆژانە، باسی زۆر سادە و وردی ژیانی تاراوگە و ئەو کارە گرانانەی بەسەر ڕاسکۆلنیکۆڤدا سەپێنرابوون، لە نامەکاندا نە باس لە ئاواتی ڕاسکۆلنیکۆڤ دەکرا نە لە خەونەکانی ئاییندەی و هەست و سۆزە تایبەتییەکانی. لەباتیی دەرخستنی باری ڕۆحی و دەروونیی ئەو، تەنیا گوزارشت لە بەسەرهاتەکانی دەکرا، واتا: ئەو قسانەی ڕاسکۆلنیکۆڤ دەیکردن، زانیاری ورد دەربارەی تەندروستی، ئەو شتانەی لە کاتی بینیندا دەیویستن یان داوای لە سۆنیا دەکرد کە پێیان بگەیەنێت و شتی تریش. هەموو ئەم هەواڵانە بە دووروودرێژی گوزارشتیان لێدەکرا. لە ئەنجامدا دونیا وێنەیەکی ڕوون و ئاشکرای برا نەگبەتەکەی خۆی بە وردی دەبینی، کە هیچ جێگای گومانی بۆ نەدەمایەوە، چونکە ئەوەی هەبوو، بریتی بوو لە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر.

دونیا و مێردەکەی لە نامەکاندا، بەتایبەتی لەبەراییدا، دڵنیا نەبوون. سۆنیا بەردەوام هەواڵی ئەوەی دەدانێ کە ڕاسکۆلنیکۆڤ هەمیشە مرومۆچ و کەمدووە، تەنانەت هەمووجارێک لە بیستنی هەواڵی ناو نامەکانی ئەوان بێدەربەستە و گوێی پێنادات. دەینووسی کە هەندێکجار ڕاسکۆلنیکۆڤ هەواڵی دایکی دەپرسێ، کە سۆنیا هەستی کرد ئەو ڕاستییەکەی پێشبینی کردووە، ئەمیش هەواڵی مەرگی دایکی پێوتووە، بەڵام زۆری بە لاوە سەیر بووە کە هەواڵەکە هیچ کاریگەرییەکی وای لەسەر دانەناوە، بەهەرحاڵ، وا هاتبووە بەرچاوی سۆنیا. هەر لەو نێوەندەدا، سۆنیا وای ڕاگەیاندبوو، کە هەرچەندە بە ڕووکەش ڕاسکۆلنیکۆڤ خۆی دەخواتەوەو گۆشەگیرە، وەلێ لەگەڵ ئەوەیشدا ڕاستودروست لە ژیانی تازەی خۆی دەڕوانێت. بە چاکی لە

حاڵوباری خۆی تێدەگات. چاوەڕێی ئەوەیش نییە بەم زووانە چارەنووسی باش بێت و چ ئاواتێکی نابەجێی نییە -ئاسایی وەک هەر زیندانییەک- هیچ سەریشی لەوە سوور نەماوە کە ئێستای هیچ لە ڕابوردووی ناکات. هەروەها سۆنیا دەینووسی تەندروستیی ڕاسکۆلنیکۆڤ زۆر باشە، ڕاست دەڕواتە سەر کار، نە ڕاڕایە و نە بێزار، نە جەختی درۆزنانەیشی لەسەر دەکات. لەبارەی خواردنەوە تا ڕادەیەک بێدەربەست و ساردە، وەلێ خۆراکیان بێجگە لە ڕۆژانی یەکشەممە و پشووەکان، ئەمەندە خراپ و بێکەڵکە، کە ڕاسکۆلنیکۆڤ خۆی داوای هەندێک پارە لە سۆنیا دەکات تا هەموو ڕۆژێک چای بۆ خۆی پێبکڕێت. بێجگە لەوە، داوای لە سۆنیا کردووە خەمی نەخوات و نیگەرانی نەبێت، چونکە بە دڵنیاییەوە بایەخپێدانی زۆری بێتاقەت و تووڕەی دەکات.

سۆنیا بۆی نووسیبوون کە ڕاسکۆلنیکۆڤ و زیندانییەکانی تر هەموویان لە یەک جێگادا پێکەوەن. ئەو خۆی ناو زیندانەکەی نەدیووە، بەڵام وەک بیستوویەتی، گەیشتۆتە ئەو ڕاستییەی کە شوێنەکە تەنگە، پیسە و هیچ مەرجێکی تەندروستیی تیا نییە، ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەر سەکۆیەک دەخەوێت و لبادێک لەژێریدا ڕادەخات، نایەوێت جێگایەکی تر بۆ خۆی پەیدا بکات. ئەم دژواری و ژیانە هەژارانەیە هەرگیز زادەی بیرێکی دیاریکراو و بڕیارێکی تایبەتی نییە. بەڵکو تەنیا لە بێدەربەستی و لە پشتگوێخستنی چارەنووسی خۆیدایە.

سۆنیا بە ڕاشکاوی دەینووسی کە ڕاسکۆلنیکۆڤ لە سەرەتادا نەک تەنیا خۆشیی لە دیدارەکانی نەهاتووە، بەڵکو تا ڕادەیەکیش زۆر پێی ناخۆش بووە. لەگەڵیدا کەم دواوە و بە زبری مامەڵەی کردووە، وەلێ

له دواییدا خووی بەو دیدەنییانەوە گرتووە و تەنانەت وەک پێویستیی لێهاتووە. بە جۆرێک لە کاتی نەخۆشکەوتنی سۆنیادا کە بۆ چەند ڕۆژێک نەیتوانیبوو سەری لێبدات، ڕاسکۆلنیکۆڤ خەم دایگرتبوو. دیدارەکانیان لە ڕۆژانی پشوودا، لە پشت شیشە ئاسنینەکانی زیندان، یان بۆ چەند دەقیقەیەک لە ژووری پاسەوانەکاندا ئەنجام دەدرێت. لە ڕۆژانی ئاساییدا سۆنیا لە کاتی کارکردندا، لە کارگە، یان لە کارخانەی خشتدروستکردندا، یان لە ئەمبارەکانی پاڵ ڕووباری 'ئێرتیش'دا دەچوو بۆ لای.

سۆنیا لەبارەی خۆیەوە دەینووسی: توانیویەتی لە شارەکەدا هەندێک دۆست و ئاشنا پەیدا بکات، سەرگەرمی بەرگدرووونە، لەبەر ئەوەیش کە تا ڕادەیەک لە شارەکەدا بەرگدروو نییە، بۆیە گەلێک ماڵ پێویستیان پێی هەیە. بەڵام سۆنیا ئەوەی نەنووسیبوو کە بە هۆی ئەوەوە ڕاسکۆلنیکۆڤ لە لایەن بەڕێوەبەری بەندیخانەوە پشتیوانیی لێکراوە و ئەرکی کەمتر کراوەتەوە و خواردنی باشتر بووە.

سەرئەنجام هەواڵێک گەیشت کە ڕاسکۆلنیکۆڤ لە هەموو زیندانییەکان تەریک و دوورەپەرێزە. تەنانەت لە نامەکانی دوایی سۆنیادا دونیا هەستی بە نیگەرانی و شپرزەیی کرد، زانیی زیندانییەکان ڕاسکۆلنیکۆڤیان خۆش ناوێت، هەمیشە بە درێژایی ڕۆژ بێدەنگە و ڕەنگ بە ڕوویەوە نەماوە. لەپڕێکدا سۆنیا لە دوانامەیدا نووسی کە ڕاسکۆلنیکۆڤ زۆر نەخۆشە و لە نەخۆشخانەی زیندانەکەدا تیمار دەکرێت...

## ٢

ماوەیەکی زۆر بوو ڕاسکۆلنیکۆڤ نەخۆش بوو، بەڵام نە سەختیی ژیانی ناو بەندیخانە، نە کاری بەزۆر، نە بەدخۆراکی، نە سەرتاشین و نە کۆنەپۆشی، هیچ کام لەوانە نەبوونە هۆی ڕەنج و ئازاردانی. بە پێچەوانەوە تەنانەت خۆشیی لە کارکردن دەهات:
کە لە ئەنجامی کاری سەختەوە لەشی شەکەت دەبوو، دەیتوانی هیچ نەبێت چەند سەعاتێک خەوێکی خۆش بکات، خواردنیش، ئەو شۆربا کەلەرمەی پڕ بوو لە سیسرک، چ گرنگییەکی بۆی هەبوو؟ لە سەردەمی خوێندکاریدا هەندێکجار ئەوەیش دەست نەدەکەوت. بەرگی گەرم و لەگەڵ ئەو جۆرە ژیانەدا بە تەواوی دەگونجا، هەستی بە زنجیری پێی نەدەکرد، دەبێت شەرمی بەوە بێت کە سەری تاشراوە، یان چاکەتەکەی دوو ڕەنگە؟ ئەی لە کێ شەرم بکات؟ لە سۆنیا؟ سۆنیا لێی دەترسا، کەواتە چۆن دەبێت شەرمی لێبکات؟ ئەی کەواتە نهێنییەکە لە چیدایە، ئەو تەنانەت شەرمی لە سۆنیایەک دەکرد، کە لە دەست ڕەفتاری ناقۆڵا و بێزراوی ئازاری دەچەشت، ئەو کە هەستی بە شەرم دەکرد، لەبەر ئەوەنا کە سەری تاشرابوو یان زنجیری لە پێدا بوو. نا، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە کەرامەتی بە سەختی بریندار کرابوو، ئەمەیش بوو بە هۆی نەخۆشکەوتنی، لە ڕاستیدا ئەو زۆر بەوە بەختەوەر دەبوو ئەگەر بیتوانیایە خۆی بە تاوانبار بزانێت. ئەگەر وابووایە، دەیتوانی بەرگەی هەموو شتێک، تەنانەت خەجاڵەتی و ڕسوایی بگرێت. بەڵام چەند لەبارەی خۆیەوە داوەرییەکەی سەخت و دڵڕەقانە بێت، هێشتا ویژدانی خۆگر و چ تاوانێکی گەورەی لە ڕابووردووی گومان نەدەبرد، تاقەتاوانی ڕەنگە ئەوە بێت کە

(نیشانەکەی نەپێکاوە) ئەمەیش ئاساییە و لە هەموو کەسێک ڕوو دەدات. ڕاسکۆلنیکۆڤ شەرمی بەوە دەهات کە کوێرانە تێکەوتبوو، گەوجانە دەستی دابوویە، نائومێدانە، بە هۆی قەدەرێکی کوێرەوە خۆی لەدەست دابوو. بۆیە دەبێت بە ناچاری خۆی بە دەست "گەوجایەتییەوە" بدات و سەری بۆ دابنەوێنێت، بۆ ئەوەی هێور بێت و ئاسوودەیی بۆ بگەڕێتەوە.
ئەوەی لە دنیادا بۆی مابووەوە، نیگەرانییەکی بێپاساو و بێئامانجی ئێستا بوو، قوربانیدانێکی بەردەوامیشە لە ئاییندەدا، ئەمانە بەچی دەچن! چ کەڵکێکی هەیە ئەگەر بە خۆی بڵێت دوای هەشت ساڵ تەمەنی دەگاتە سیودوو ساڵ و دەتوانێت ژیانێکی نوێ دەست پێبکات! ئەی بۆ بژی؟ چ ئامانجێکی لە پێشە؟ چ مەبەستێک هەیە بۆی تێبکۆشێت؟ ژیان تەنیا بۆ مانەوە؟ بەڵام ئەو لە ڕابووردووی تەمەنیدا هەزاران جار ئامادە بووە خۆی بکاتە قوربانی لەپێناوی بیروباوەڕێکدا، لە پێناوی ئامانجێک و تەنانەت لە ڕێگەی ئارەزوویەکدا. بوونی ڕووت هەرگیز بە لای ئەوەوە بەس نەبووە، ئەو هەمیشە خولیای زیاتری هەبووە، ڕەنگە توانای ئەو خولیایە تەنیا لەوەوە هاتبێت، کە لەو سەردەمەدا ئەو خۆی بە مرۆڤتر دانابێت و ئەوەی بە خۆی ڕەوا دیووە بۆ کەسانی تری بە ڕەوا نەزانیبێت. ئەگەر چارەنووس پەشیمانی بکردایەتەوە، پەشیمانییەکی سوتێنەر کە دڵی تێک بشکێنێت و خەوی لێبتۆرێنێت، پەشیمانییەک کە لە ئەنجامی ئازارەکانیدا سێدارە و خنکانی نێو ئاوی بهێنێتە بەرچاو. بێگومان ئەو پەشیمانییە بەختەوەری دەکرد، ئازار و فرمێسک جۆرێکن لە ژیان، بەڵام ڕاسکۆلنیکۆڤ لەو تاوانە پەشیمان نەبوو، کە کردبووی.

ئەگەر پەشیمان بووایە، لایەنی کەم دەیتوانی لە گەوجایەتییەکەی خۆی تورەبێت، هەروەک چۆن پێشتر لە کردەوە نادروست و گەلۆرانەکەی کە دواجار کێشایانە نێو بەندیخانە، توورە بوو. وەلێ ئێستا، لە زیندانەدا، دوای ئەوەی دەتوانێت "زۆر بە ئازادی" بیر لەو کردەوانە بکاتەوە و لێیان بکۆڵێتەوە، بە هیچ شێوەیەک ئەو کارانە نە بە گەمژەیی دادەنێت و نە بە ناشیرین، وەک پێشتر لە رۆژە شوومەکاندا وای دەبینین.

بە خۆی دەوت: "بۆ دەبێت بیروڕای من لەو بیر و تێزانە گەمژانەتر بن، کە لە سەرەتای ئافەریدەبوونەوە لەم گەردوونەدا هەبوون و بەر یەکتر کەوتوون؟ پێویستە بە چاوێکی کراوە و ئازاد و سەربەخۆ لە بیروڕا کۆنەکانی دی بڕوانین، بۆ ئەوەی تێبگەین بە هیچ جۆرێک بیروڕاکانی من ئەوەندە سەیروسەمەرە نین... ئەی گومڕاکان! ئەی بیرمەندان! بۆ لە ناوەڕاستی ڕێگەدا دەوەستن!"

دیسان دەیوت: "باشە ئاخر بۆ کارەکەی من لە ڕوانگەی ئەوانەوە هێند نەگریسە؟ لەبەر ئەوەی زوڵمە؟ زوڵم یانی چی؟ من ویژدانم ئاسوودەیە، هەڵبەتە لە دیدگای مافەوە تاوانێک کراوە... هەڵبەتە بە ڕووکەش یاسا بەزێنراوە و خوێن ڕژاوە، باشە، ئەگەر مەسەلەکە ڕووکەشیی یاسایە، فەرموو سەرم ببڕن... با ببڕێتەوە.

بەم پێودانگە بێت، گەلێک لە فریادڕەسە مرۆڤایەتییەکان کە دەسەڵاتیان بە میراتی بۆ نەماوەتەوە، بەڵکو خۆیان بەدەستیان هێناوە، دەبوو هەر لە یەکەم هەنگاویاندا سەریان بپەڕێنن. وەلێ ئەوان هەنگاوی خۆیان ناو گەیشتنە هەوار، بۆیە ئێستا لەسەر "هەقن"، بەڵام من بە ئامانج نەگەیشتم، کەواتە هەقی ئەوەم نییە ئەو ڕێگەیە بەخۆم بدەم".

تاقەتاوانێک کە ڕاسکۆلنیکۆڤ بە خۆی ڕەوا دەبینی، ئەوە بوو کە باش بیری لە کارەکە نەکردۆتەوە، سەری خۆبەدەستەوەدانی نەوی کردووە و دانی بە تاوانەکەیدا ناوە.

هەروەها خەیاڵی ئەوەیش ئازاری دەدا کە بۆ لەو کاتەدا خۆی نەکوشت؟ بۆ کە لەسەر ڕووبارەکە وەستابوو، خۆبەدەستەوەدان و دانپێدانانی بە باشتر زانی؟ بەڕاست خۆشەویستیی ژیان ئەمەندە بەهێزە و وەڕزبوون لێی ئەمەندە گران و دژوار؟ ئاخر، سڤیدریگایلۆف کە زۆر ڕقی لە مەرگ بوو، توانی بەسەر ڕقەکەیدا زاڵ بێت.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بە خەم و پەژارەیەکی زۆرەوە بەردەوام ئەم پرسیارەی لە خۆی دەکرد، لەوە نەدەگەیشت ئەو کاتەی بەسەر ڕووبارەکەوە بوو، ڕەنگە دەربارەی خۆی و بیروبۆچوونەکانی هەستێکی ناڕاستی بووبێت. دەرکی نەدەکرد کە لەوانەیە ئەو هەست و پێشبینییە لە ئایندەدا وەرچەرخانێک لە ژیانیدا دروست بکات و هۆکارێک بێت بۆ ڕابوون و گەشەسەندنی بیری تازە تیایدا.

لەم مەسەلەیەدا گومانی لەوە دەکرد کە تەنیا هۆکار غەریزە بووە و ئەم نەیتوانیووە بەسەریدا زاڵ بێت، بێتواناییەکەیشی تەنیا لە لاوازی و ترسنۆکییەوە سەری هەڵداوە. لە زیندانییەکانی هاوڕێی دەڕوانی، سەری لەوە سووڕ دەما کە هەموویان چەندە ژیانیان خۆش دەوێت و بەهای بۆ دادەنێن. بە تایبەتی وای دەهاتە بەرچاو کە لە زینداندا ژیانیان لا خۆشەویست و بەهادارترە وەک لە کاتی ئازادیدا. هەندێک لەوانە بەرگەی چ ئازار و ئەشکەنجەیەکی ترسناکیان گرتووە. بەتایبەتی ڕێگرەکانیان! ئاخۆ بە ڕاستی ڕووناکیی خۆر، دارستانی چڕ، کانییەکی ساردی لاڕێ کە لە سێ ساڵ لەمەوبەرەوە لە بیریاندا

مابوو، ئەمەندەیان لا گرنگ بێت کە وەک ژوانی دڵدار خەونی پێوە ببینن؟ گژوگیای سەوزی دەوروبەری کانییەکە، ئاوازی باڵندەی ناو بێشەکان، ئەمەندە شوێنی حەزو ئارەزوویان بێت؟ ڕاسکۆلنیکۆڤ چەند قووڵتر لەمە ڕادەما، تێگەیشتنی لا سەختتر دەبوو.
لە زینداندا، لەو ژینگەیەدا، گەلێک شت هەبوون سەرنجی نەدەدان، هەرگیز نەیشیدەویست سەرنجیان بداتێ، دەتوت بە چاوبەستراوی دەژی، بینینی دەوروبەری دەرد و ئازاری زیاد دەکرد. وەلێ زۆر شتیش هەبوو کە سەری بەسوور دەهێنا، بێ ویستی خۆی شتگەلێکی دەبینی کە پێشتر بە خەیاڵیدا نەدەهاتن: بەهەرحاڵ، ئەوەی زیاد لە هەر شتێکی دی سەرسامی دەکرد، ئەو هەڵدێرە ترسناکە بوو، کە کەوتبووە نێوان ئەو و خەڵکەکەی ترەوە و بڕینی مەحاڵ بوو. وای دەهاتە بەرچاو کە ئەو لەگەڵ ئەوانی تردا لە دوو نەتەوەی جیاوازن. بە گومان و دوژمنایەتییەوە لە یەکیان دەڕوانی. ڕاسکۆلنیکۆڤ هۆی ناتەباییەکەی دەزانی و تێی گەیشتبوو، وەلێ پێشتر هەرگیز ئەوەی بە بیردا نەهاتبوو، کە هۆکارەکان تا ئەو ڕادەیە قووڵ و گرنگ بن. لە بەندیخانەکەدا پۆلۆنی تیابوو کە بە هۆی کاری سیاسییەوە پەرت کرابوونە ئەوێندەرێ. ئەوانە ڕێکوڕاست وەک شوان و بەندە لەوانی تریان دەڕوانی و سووک تەماشایان دەکردن. وەلێ ڕاسکۆلنیکۆڤ نەیدەتوانی ئەوە بکات. بە چاکی دەیبینی کە ئەو شوانانە لە زۆر لایەنەوە لە پۆلۆنییەکان ئاقڵترن. هەر لە ناو زیندانییە ڕوسەکانیشدا کەسانێک هەبوون ئەوانیش سووکایەتیان بە هاوڕێ ڕووسەکانی تر دەکرد، لەوانە کۆنە ئەفسەرێک و دوو قوتابی، ڕاسکۆلنیکۆڤ دەیزانی ئەوانیش هەڵەن.

بەڵام خودی ڕاسکۆلنیکۆڤ کەس خۆشی نەدەویست و تەواو لێی تەریک بوون. لەو دواییەدا تەنانەت هەستی دەکرد کە ڕقیان لێیەتی، ئەمە بۆ؟ خۆیشی نەیدەزانی. هەندێکیان، کە زۆر لە ڕاسکۆلنیکۆڤ تاوانبارتر بوون، گاڵتە و سووکایەتییان پێدەکرد، تاوانەکەیان بە تیزوپێکەنینەوە باس دەکرد، پێیان دەوت:

- تۆ گەورەیت! کەی کاری تۆ بوو تەور هەڵبگریت، هەرگیز، ئەوە کاری پیاوی گەورە نییە!

هەفتەی دووەمی ڕۆژی "ڕۆژووی گەورە" ئەویش لەگەڵ هەموو ئەوانی تردا ناچاربوو ڕێوڕەسمەکە بەجێ بهێنێت. لەگەڵ ئەوانی دیدا چوو بۆ کڵێسە و نوێژی کرد. خۆیشی نەیزانی چۆن شەڕەکە هەڵگیرسا. هەموویان پێکەوە و دڵڕەقانە پەلاماریان دایە و هاواریان کرد:

- تۆ کافریت، تۆ بڕوات بە خودا نییە، هەقە بتکوژن.

ئەو هەرگیز لەگەڵیاندا باسی خودا و ئاینی نەکردبوو، بەڵام ئەوان دەیانویست وەک کافرێک بیکوژن. ئەو هیچی نەکرد و بێدەنگ بوو. یەکێک لە بەندییەکان زۆر بە ڕق و تووڕەییەوە ویستی پەلاماری بدات، ڕاسکۆلنیکۆڤ هێور و بێدەنگ وەستا، نە برۆی هێنانە یەک و نە گرییەک کەوتە نێوچاوی. پاسەوانێک زوو کەوتە نێوانیان، ئەگینا خوێنی تیا دەڕژا.

مەسەلەیەکی تریش لای ڕاسکۆلنیکۆڤ هەبوو، کە چارەسەر نەدەکرا: ئەویش ئەوە بوو بۆ هەموویان ئەوەندە سۆنیایان خۆش دەویست، سۆنیا بەدەستهێنانی دڵی ئەوانی مەبەست نەبوو، ئەوان بە دەگمەن دەیانبینی، تەنیا هەندێکجار لە کاتی کارکردندا، یان بۆ دەقیقەیەک کە بۆ بینینی ڕاسکۆلنیکۆڤ دەهات، کەچی هەموویان سۆنیایان دەناسی،

دەیانزانی کەوتۆتە دوای ڕاسکۆلنیکۆڤ، دەیانزانی لە کوێ و چۆن دەژی، سۆنیا پارەی پێنەدەدان و خزمەتی تایبەتی نەدەکردن، تەنیا جارێک نەبێت لە جەژنی لەدایکبوونی مەسیحدا نان و شیرینیی بۆ هەموو بەندییەکان هێنابوو، لەگەڵ ئەوەیشدا وردەوردە پەیوەندییەکی زیاتر لە نێوان ئەوان و سۆنیادا دروست بوو، نامەی ئەوانی بۆ کەسوکاریان دەنارد و نامەکانی لە پۆست دەنا، خزم و کەسوکاریان کە دەهاتنە شارەکەوە، لەسەر ڕاسپاردەی زیندانییەکان شتومەک و تەنانەت ئەو پارەیەی بۆیان دەهێنان، دەیاندایە دەستی سۆنیا، ژن و دڵدارەکانیان سۆنیایان دەناسی و دەچوونە لای، کە لەسەر کار دەچوو بۆ لای ڕاسکۆلنیکۆڤ، یان گروپەکی زیندانییەکانی دەبینی کە دەڕۆیشتن بۆ سەر کار، هەموویان لە بەرانبەریدا کڵاوی ڕێزیان بۆ دادەگرت و سڵاویان لێدەکرد. ئەو بەندییە دڵڕەق و داخلەدڵانە بەو بوونەوەرە گچکە و لاوازەیان دەگوت: "دایکە گیان، سۆنیا سمیونۆڤنا، خەمخۆرەکەمان" سۆنیا زەردەخەنەی بۆ دەکردن و سڵاوی دەسەندنەوە. هەموویان تەنانەت حەزیان لە ڕێڕۆیشتنەکەی بوو، ئاوڕیان دەدایەوە بۆ ئەوەی لە دواوە تەماشای بکەن کە چۆن دەڕوات. تاریفیان لێدەکرد، تەنانەت بە چکۆلەییەکەیشیدا هەڵیاندەدا. بە کورتی، نەیاندەزانی چی بدۆزنەوە تا پیایدا هەڵبدەن، تەنانەت هەندێکیان داوای چارەسەرکردنی نەخۆشییان لەو دەکرد.

ڕاسکۆلنیکۆڤ هەموو ڕۆژەکانی ڕۆژوو و جەژنی لە خەستەخانە بەسەر برد. لە کاتی چاکبوونەوەیدا خەونەکانی خۆی دەهێنایەوە یاد، ئەو خەونانەی لە کاتی تالێهاتن و وڕێنەدا دیبوونی. لە کاتی نەخۆشییەکەیدا خەونی دەبینی، کە هەموو دنیا دەبێتە قوربانیی نەخۆشییەکی شووم و ترسناک، کە لەوەوپێش نەبینراوە.

نەخۆشییەکە لە قووڵایی ئاسیاوە بەرەو ئەورووپا هاتووە. دەبێت هەموو خەڵک بمرن، تەنیا هەندێکی زۆر کەمی هەڵبژاردە نەبێت، نەخۆشییەکە جۆرێکی تازەی مشەخۆریی میکرۆسکۆبیە، کە وەک خۆرە لە جەستەی مرۆڤەکان دەدات. بەڵام ئەو بوونەوەرە میکرۆسکۆبییانە خاوەن ئەقڵ و ئیرادە بوون، ئەو مرۆڤانەی تووشی دەهاتن، زۆر زوو شێتوهار دەبوون. وەلێ ئەوەندەی ئەو تووشبووانە خۆیان بە ئاقڵ و خاوەنی هەقیقەت دەزانی، هەرگیز کەسی تر خۆی بەوە نەزانیووە. هەرگیز گومانیان لەوە نەبووە کە ڕا و تیۆری زانستی و ئایدیای ئاکار و ئایینیان ڕاست نەبێت. گوند و شار و گەلێک نەتەوە دووچاری ئەم نەخۆشییە دەهاتن و شێت دەبوون، هەموو لە نێو ترس و دوودڵیدا دەژیان و لە یەکتر تێنەدەگەیشتن. هەریەکە بڕوای بەوە بوو کە ڕاستی تەنیا لای ئەوە و بینینی خەڵکی دی کێشەی بۆ دروست دەکات. لە سنگی خۆی دەدا، دەگریا و دەستی هەڵدەگلۆفت. نەیاندەزانی چۆن داوەریی خەڵکی بکەن و بڕیار لەسەر ئەوە بدەن کە کامە چاکەیە و کامە خراپەیە. نەیاندەزانی کێ تاوانبارە و کێ بێتاوانە، لە نێو ڕقێکی بێمانادا یەکتریان دەکوشت، بۆ لەناوبردن لەشکریان ڕێک دەخست، بەڵام کە سوپاکان بەڕێ دەکەوتن، لەپڕا دەکەوتنە گیانی یەکتر، ڕیزیان دەترازا و پەلاماری یەکدییان دەدا، یەکتریان سەردەبڕی و پارچەپارچەیان دەکرد و دەیانخوارد، لە شارەکاندا بە درێژایی ڕۆژ زەنگی مەترسی لێدەدرا، خەڵکەکە بانگهێشت دەکران. وەلێ کێ و بۆچی کۆ دەبوونەوە؟ کەس نەیدەزانی و هەموو نیگەران بوون، خەڵکەکە دەستبەرداری پیشە ئاساییەکانیان بووبوون. چونکە هەر کەسەو باری سەرنج و زاراوەی خۆی پێشنیاز دەکرد و نەیاندەتوانی ڕێک بکەون. کاری کشتوکاڵ

تەواو وەستابوو، لێرەولەوێ هەندێک کۆمەڵەیەکیان دروست دەکرد، پێکەوە لەسەر شتێک هاودەنگ دەبوون و سوێندیان دەخوارد جیا نەبنەوە، بەڵام زۆر زوو دەستیان بە کارێک دەکرد، کە جیاواز بوو لەوەی لەسەری ڕێک کەوتبوون، یەکتریشیان تاوانبار دەکرد و دەکەوتنە کوشتن و بڕینی یەکدی. ئاگر بەردەبووەوە و قاتوقڕی دەستی پێدەکرد، هەموو شتێک لەناو دەچوو، کەس نەدەما، لە سەرانسەری دنیادا تەنیا چەند کەسێک دەرباز دەبوون، ئەو هەڵبژاردانەی دەبوو بنیاتی خەڵکی تازە و ژیانی تازە بنێن، سەر زەوی پاک و نوێ بکەنەوە، بەڵام کەس ئەوانەی لە هیچ شوێنێکدا نەدیبوو، نە قسەی بیستبوون و نە گوێی لە دەنگیان بووبوو.

ئەوەی ئازاری ڕاسکۆلنیکۆڤی دەدا، ئەوە بوو کە ئەم وڕێنە بێمانایانە، دەرد و خەفەتێکی وایان لە هەناویدا دروست دەکرد، کە شوێنەواریان تا ماوەیەکی گەلێک زۆر نەدەبڕایەوە.

هەفتەی دووەمی دوای جەژن، ڕۆژانێکی فێنکی بەهار بوو، پەنجەرەی خەستەخانەکە کرایەوە –پەنجەرەکان شیشی ئاسنیان پێوە بوو، پاسەوانەکان لەژێریدا هاتوچۆیان دەکرد– لە هەموو ئەو ماوەیەدا کە ڕاسکۆلنیکۆڤ نەخۆش بوو. سۆنیا توانی تەنیا دووجار سەردانی بکات. دەبوو هەموو جارێکیش مۆڵەتی تایبەتی وەربگرێت و ئەمەیش ناخۆش و دژوار بوو. وەلێ زۆرجار دەهاتە حەوشەی خەستەخانەکە و ژێر پەنجەرەکە. بەتایبەتی دوای خۆرئاوابوون. تەنیا بۆ ئەوەی چەند دەقیقەیەک لە حەوشەکەدا بوەستێت و لە دوورەوە تەماشای پەنجەرەکە بکات. ئێوارەیەکیان، کە ڕاسکۆلنیکۆڤ تا ڕادەیەک چاکتر بووبوو، خەوی لێکەوت، کە لە خەو هەستا، بە ڕێکەوت ڕۆیشتە لای پەنجەرەکەوە، لەپڕێکدا لە دوورەوە لە بەردەم دەرگای

خەستەخانەکەدا سۆنیای بینی وەستابوو، لەوە دەچوو چاوەڕێی شتێک بێت، ڕاسکۆلنیکۆڤ وەک تیرێک بەر دڵی کەوتبێت، تەزوویەکی پێدا هات و لە پەنجەرەکە دوور کەوتەوە. بۆ بەیانی سۆنیا نەهات و بۆ دوو بەیانیش هەر نەهات. ڕاسکۆلنیکۆڤ هەستی کرد بە پەرۆشەوە چاوەڕوانیەتی.

پاشان لە خەستەخانە دەرچوو، کە گەڕایەوە زیندان لە بەندییەکانی بیست کە سۆنیا سیمونوڤنا نەخۆشە، لەماڵەوە کەوتووە و لە ژوورەکەی ناڕواتە دەرەوە.

ڕاسکۆلنیکۆڤ گەلێک نیگەران بوو، چەند جارێک خەڵکی نارد بۆ هەواڵپرسینی، زانی نەخۆشییەکەی مەترسیی نییە، سۆنیایش کە لای خۆیەوە زانی ڕاسکۆلنیکۆڤ بۆی پەرۆشە و نیگەرانیەتی، چەند دێڕێکی بە قەڵەم بۆ نووسی و ئاگاداری کرد کە تەندروستیی زۆر باشە، تەنیا سەرمای بووە و بەم زووانە، زۆر زوو بۆ بینینی دێتە سەر کار بۆ لای.

ڕاسکۆلنیکۆڤ لە کاتی نامە خوێندنەوەکەدا دڵە کوتێی پێکەوتبوو.

ئەم بەیانییەیش دنیا پاکوبێگەرد بوو، بەرەبەیان، سەعات شەش ڕاسکۆلنیکۆڤ بەرەو شوێنی کارەکەی، کە لە کەناری ڕووباردا بوو، بەڕێ کەوت، لە یەکێک لە ئەنبارەکانی ئەوێدا کوورەی پوختکردنی گەچ و خشتدروستکردن هەبوو، تەنیا سێ کرێکاریان لە بەندییەکان بۆ ئەوێ ناردبوو، یەکێکیان لەگەڵ پاسەوانێکدا بۆ هێنانی هەندێک کەلوپەل گەڕایەوە قەڵاکە. دووەمیان سەرقاڵی کۆکردنەوەی تەختەودار بوو بۆ بەگەڕخستنی کوورەکە، ڕاسکۆلنیکۆڤیش لە ئەنبارەکە هاتە دەرێ و بەرەو کەنارەکە چوو. لەسەر یەکێک لەو نیرگانە دانیشت، کە لە پاڵ ئەنبارەکەدا دانرابوون، کەوتە

تەماشاکردنی ڕووبارە چۆڵ و پانوبەرینەکە، مرۆڤ دەیتوانی لەو کەنارە بەرزەوە دەشتێکی زۆر فراوان ببینێت، لەوبەریشەوە گۆرانییەک بە ئاستەم دەهاتە بەرگوێ، لەوێ، لەو دەشتە بێکۆتاییەدا، لەبەر ڕووناکیی خۆردا خەیوەتی ڕەشی کۆچەرییەکان بە حاڵ دەبینران، ئەوێ پڕ بوو لە ئازادی، خەڵکانێک لەوێدا دەژین کە هیچ لە دانیشتوانی ئێرە ناکەن. دەتوت لەوێ زەمان وەستاوە و هێشتا سەردەمی برایمی پێغەمبەر و شوانییەکەیەتی.

ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەنگوسەنگ، بێ ئەوەی لە هیچی تر بڕوانێت، دانیشتبوو تەماشای ئەو دیمەنەی دەکرد، بیری تێکەڵ بە خەیاڵ و خەون دەبوو، بیری لە هیچ نەدەکردەوە، وەلێ خەمێک ئازاری دەدا و نیگەرانی دەکرد. لەناکاوێکدا سۆنیا لە بەردەمیدا قوت بووەوە، بە ئەسپایی هاتە نزیکییەوە و لە پاڵیدا دانیشت، هێشتا زۆر زوو بوو، بەیانییەکی سارد، سۆنیا پاڵتاوێکی کۆن و ڕزیووی لەبەردا و شاڵێکی سەوزی لە خۆیەوە پێچابوو، هێشتا ئاسەواری نەخۆشییەکە بە ڕوویەوە دیار بوو: لاواز و ڕەنگهەڵبزڕکاو. زەردەخەنەیەکی ناسک و شادمانانەی بۆ ڕاسکۆلنیکۆڤ کرد، بەڵام هەروەک جاران بە دوودڵییەوە دەستی بۆ درێژ کرد. ئەو هەمیشە بە دوودڵییەوە دەستی بۆ درێژ دەکرد و جاری وایش هەبوو هەر دەستی نەدەدایە. وەک لەوە بترسێت کە ڕاسکۆلنیکۆڤ دەستی بداتە دواوە. هەمیشە وا دەردەکەوت کە ڕاسکۆلنیکۆڤ بە ناچاری و بێزارییەوە دەستی بداتێ و بەردەوام بە ڕق و تووڕەییەوە پێشوازیی بکات، هەندێکجاریش لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە دەچوو بۆ بینینی ڕاسکۆلنیکۆڤ بێدەنگییەکی ناشیرینی لە خۆ دەگرت. هەندێکجار سۆنیا لە بەردەمیدا دەلەرزی، پاشان بە خەمێکی زۆرەوە لێی جیا دەبووەوە، بەڵام ئەمجارەیان

دەستیان لە یەکتر نەدەبووەوە، ڕاسکۆلنیکۆڤ تەماشایەکی خێرای سۆنیای کرد، هیچی نەوت، بەڵام چاوی لە زەوی بڕی، هەردووکیان تەنیا بوون. کەس نەیدەبینین، پاسەوانەکەیش لەو کاتەدا دوور کەوتبووەوە.

چی ڕووی دا، خودی ڕاسکۆلنیکۆڤیش نەیزانی! وەلێ لە ناکاوێکدا دەتوت شتێک ئەوی لە جێگاکەی بەرز کردەوە و خستی بەسەر پێی سۆنیادا. دەگریا و ئەژنۆی سۆنیای لە باوەش گرتبوو، لە سەرەتادا سۆنیا تۆقی و ڕەنگ بە ڕوویەوە نەما، لە شوێنەکەی هەستا و بەدەم لەرزینەوە لە ڕاسکۆلنیکۆڤی ڕوانی. وەلێ زۆر زوو، لە چاوتروکانێکدا، لە هەموو شتێک تێگەیشت، بەختەوەرییەکی بێسنوور لە چاویدا درەوشایەوە، ئیتر لەوە گەیشت و گومانی نەما کە ڕاسکۆلنیکۆڤ خۆشی دەوێت، زۆر خۆشی دەوێت. ئەمە ئەو چرکەساتەیە دڵخوازەیە کە دەبوو بگات.

دەیانویست لەگەڵ یەکدا قسە بکەن و نەیاندەتوانی، فرمێسک لە چاویاندا قەتیس مابوو، هەردووکیان ڕەنگیان زەرد و لاواز بوون. بەڵام لەو ڕووە بێڕەنگ و نەخۆشانەدا. پرشنگێک دەدرەوشایەوە لێوانلێو لە ئایندەیەکی تازە و ژیانێکی نوێ، ئەو دووانە خۆشەویستی زیندووی کردبوونەوە، دڵی هەریەکەیان سەرچاوەی ژیانێکی بێکۆتایی لە دڵی ئەوی تردا تەقاندبووەوە.

بڕیاریان دا چاوەڕێ بن و ئارام بگرن، دەبوو تا حەوت ساڵی تر لە سیبریادا بمێننەوە، بەرگەی ڕەنج و ئازارێک بگرن کە لە کێشدا نییە، بەڵام کۆتاییەکەی بەختەوەریەکی بێسنوورە. ڕاسکۆلنیکۆڤ سەرلەنوێ ژیابووەوە، خۆی بەمەی دەزانی و بە هەموو بوونی

تازەی خۆیەوە هەستی پێدەکرد. وەلێ سۆنیا، ئەی سۆنیا لەپێناوی ڕاسکۆلنیکۆڤدا نەدەژیا؟

ئەو شەوە، کە دەرگای زیندانیان داخست، ڕاسکۆلنیکۆڤ لەسەر جێگاکەی ڕاکشابوو و بیری لە سۆنیا دەکردەوە. بۆی دەرکەوت تەنانەت ئەو بەندییانەی پێشتر دوژمنایەتیان دەکرد، ئێستا بە چاوێکی ترەوە لێی دەڕوانن. تەنانەت خۆیشی کەوتە قسەکردن لەگەڵیاندا و ئەوانیش بە میهرەبانییەوە وەڵامیان دایەوە. ئەو ئێستا ئەمەی بە بیردا هات. بەڵام ئاخر، هەر نەدەبوو وابێت، نەدەبوو ئێستا هەموو شتێک بگۆڕێت؟

ڕاسکۆلنیکۆڤ بیری لە سۆنیا دەکردەوە، بیری کەوتەوە کە چۆن هەمیشە ئازاری داوە و دڵی ڕەنجاندووە، دەموچاوە ڕەنگپەڕیوو و لاوازەکەی هاتەوە بیر، بەڵام ئیدی ئەو یادەوەرییانە بێتاقەتیان نەدەکرد. دەیزانی بە خۆشەویستییە هەرە قووڵەکەی قەرەبووی هەموو ئەو ئێش و ژانانە دەکاتەوە.

پاشان ئێش و ژانی ڕابردوو چییە! هەموو شتێک، تەنانەت تاوانکارییەکەی، فەرمانی زیندانیکردن و تاراوگەکەی، لە ئێستادا کە هەستی جۆشاوە، سەیر دەهاتنە بەرچاوی و دەتوت هەموو ئەوانە تەنانەت پەیوەندییان بەوەوە نییە. بەگشتی، لەو شەوەدا ڕاسکۆلنیکۆڤ نەیدەتوانی بە دووروودرێژی و بەردەوام بیر بکاتەوە و هەموو هەست و هۆشی لە نوختەیەکدا کۆ بکاتەوە. لەو کاتەدا هەرگیز ئەو توانایەی نەبوو، کە چارەی گرفتێکیش بکات. ئەو تەنیا هەستی دەکرد و هیچی دی. لەباتیی فەلسەفاندن، ژیان هاتبووە گۆڕێ و دەبوو لە ویژدانیدا شتێکی تەواو تازە ئافەریدە بێت.

ئینجیلیک لەژێر سەرینەکەیدا بوو، لە خۆوە هەڵی گرت، کتێبەکە هی سۆنیا بوو، هەمان ئەو کتێبەی سۆنیا لەبارەی زیندووبوونەوەی ئیلیازرەوە لەوێدا بۆی خوێندبووەوە. لە سەرەتای دوورخستنەوە و زیندانییەکەدا، ڕاسکۆلنیکۆڤ وا بیری دەکردەوە کە سۆنیا بە باسوخواسی ئاینەکەی سەری گێژ دەکات. باسی ئینجیلی بۆ دەکات و دنەی خوێندنەوەی ئەو جۆرە کتێبەی دەدات. کەچی سەیر ئەوەیە سۆنیا بۆ تاقەجارێکیش لەو بارەیەوە قسەی نەکرد، تەنانەت بۆ جارێکیش پێشنیازی ئەوەی بۆ نەکرد کە ئینجیل بخوێنێتەوە. خودی ڕاسکۆلنیکۆڤ، کەمێک پێش نەخۆشکەوتنەکەی، داوای ئەو کتێبەی لە سۆنیا کردبوو، ئەویش بێدەنگ بۆی هێنابوو، وەلێ تا ئێستا ڕاسکۆلنیکۆڤ کتێبەکەی نەکردبووەوە، هەنووکەیش هەر نەیکردەوە، بەڵام وەک بروسکە بیرێکی بەسەردا هات:

"تۆ بڵێی بیروباوەڕی ئێستای ئەو وەک بیروباوەڕی من نەبێت؟ هەر هیچ نەبێت هەست و ئارەزووەکانی..."

سۆنیایش بە درێژایی ئەو ڕۆژە ئەوەندە شپرزە و نیگەران بوو، کە شەو نەخۆش کەوت. وەلێ ئەمەندە بەختیار بوو تەنانەت ترسی لە بەختەوەرییەکەی هەبوو. حەوت ساڵ، تەنیا حەوت ساڵ! لەو سەرەتای هەست بە بەختەوەریکردنەدا، هەردووکیان وایان هەست دەکرد کە ئەو حەوت ساڵە تەنیا حەوت ڕۆژە. ڕاسکۆلنیکۆڤ نەیدەزانی کە ژیانی نوێ بەخشیشێک نییە هەر ئاوا بیدرێتێ، بەڵکو دەبێت بە نرخێکی گران بەدەستی بهێنێت، دەبێت هەوڵ و تێکۆشانی گەورەی بۆ بکات...

ئیتر لەم قۆناغەدا چیرۆکێکی تازە دەست پێدەکات. چیرۆکی بەرەبەرە گۆڕانی مرۆڤێک، چیرۆکی زیندووبوونەوەی لەسەرخۆی، چیرۆکی تێپەڕینی لە دنیایەکەوە بۆ دنیایەکی تر، چیرۆکی ئاشنابوونی بە هەقیقەتێکی نوێ، کە تا ئێستا تەواو لێی بێئاگا بووە. دەشێت ئەمانە ببن بە کەرەسەی چیرۆکێکی تازە. بەڵام ئەم چیرۆکەی ئێستامان لێرەدا کۆتایی پێدێت.

Fyodor Dostoyevsky

# Crime and Punishment

Translated by: Reouf Bêgerd

ڕۆمانی "تاوان و سـزا" بەرهەمی ئەزموون و بیروباوەڕی دۆستۆیڤسکییە، کە دوای دە ساڵ ژیان لە سیبریا، زیندان و کاری قورس و پاشان دەستبەسەربوون و مانەوەی لەوێدا، لە ساڵی 1866دا نووسیویەتی. زۆربەی بیروڕا فەلسەفی و کۆمەڵایەتـی و سیاسـی و ئایینییەکانی ئەو سـەردەمەی ڕووسـیا، کە چینە جیاوازەکان و لاوانی ئەوسـای سەرقاڵ کردبـوو، لـە ڕێـی کەسـایەتی و بەسـەرهاتەکانەوە دەرخراون. بەتایبەتی لە کاراکتەری سەرەکیی ڕۆمانەکەدا، کە ڕاسکۆڵنیکۆڤە و تەوەری کێشە و ڕەهەندە فرەلایەن و بۆچوونە جیاوازەکانە.






دیزاینی بەرگ: ئازاد سورخی